ئاستانە





# فەلسەفە
## لەنێوان ئیسلام و خۆرئاوا

نووسینی: صلاح الدين أحمد



نـــاوی نووســـــەر     : صلاح الدين أحمد

دیزاینی ناوەوە و بەرگ : ڕێکخراوی ئاستانە

نۆبـەتی چــــاپ     : یەکـــەم ٢٠٢٣

تیـــــــراژ          : ١٠٠٠ دانــــــــە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (١٣٢٠) ی ساڵی ٢٠٢٣ پێدراوە

# فەلسەفە لەنێوان ئیسلام و خۆرئاوادا

نووسینی:
صلاح الدين أحمد



# پێشەکی

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

زۆر دەمێکە خەفەت لە فەلسەفە دەخۆم، چونکە هەر کتێبێک دەستم بۆی دەبرد (لە عەرەبییەکان و کوردییەکان)یان زمانەکەی زۆر قورس بوو، یان زۆر درێژ بوو، یان وەرگێڕانەکەی زۆر سەقەت بوو، یان مەنهەجی نەبوو، یان ڕوون و ڕەوان نەبوو و تێکەڵ و پێکەڵ بوو، یان هەستت دەکرد بۆ فەیلەسووفێک نووسراوە، یان ....، لە بەرەنجامی ئەم هەموو خەفەتانە دەستمدایە نووسینی ئەم کتێبە، هەرچەندە من بانگەشەی ئەوە ناکەم خۆم هەموو ئەمانەم کۆتایی پێ هێنابێت، بەڵام دەتوانم بڵێم گرێی دڵم بوویەوە بەم کتێبە، هەرچەند ئێستاش ماویەتی، سەرەتا پێش ئەوەی دەست پێ بکەم، پەیوەندیم بە چەند برادەرێکەوە کرد کە پسپۆڕییان (ئیختیساسیان) فەلسەفەیە و داوام لێکردن هەستن بەم کارە، چونکە بۆشاییەکی زۆر هەیە لەم بوارەدا، بەڵام هیچیان وەڵامی ئەرێنییان نەدایەوە و دەستیان پێ نەکرد، بۆیە هەرچۆنێک بێت بەو زەخیرە سنووردارەی خۆمەوە دەستم بەم کارە قورسە کرد، قورسترین شتی ئەوەبوو بەشێکی ئەم بابەتە پسپۆڕی کاری من نەبوو، بەڵام بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکە هەرچۆنێک بێت دەستمدایە و قۆڵم لێ هەڵماڵی.

## بەربەستەکانی بەردەمم

١. کەمی سەرچاوەی ڕوون و زمانخۆش و سادە و ئاسان.

٢. نەبوونی دەستەواژەی گونجاو لەبەرانبەر دەستەواژەی عەرەبی و ئینگلیزی و ...، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زمانی کوردی لەم بوارەدا هەژارە، بۆیە هەندێکجار ناچاربوومە عەرەبییەکە دابنێم.

٣. دەستەوەستانی لەبەرانبەر دارِشتن و ڕاڤەکردن و گەیاندنی هەندێک بابەتەدا، لە هەندێک شوێندا چەندان دێڕ و لاپەڕەم نووسیوە، بەڵام دوایی لامبردووە و ڕەشمکردووەتەوە، چونکە زانیومە خوێنەر بەئاسانی لێی تێناگات و بابەتەکە بەجوانی ناگات.

## ئامانج لە نووسینی ئەم کتێبە

١. ئاسانکاری و سادەکردنەوەی بابەتە فەلسەفییەکان

٢. گەیاندنی فەلسەفە بۆ ئاستی سەرەتایی و ناوەندی، چونکە کتێبی فەلسەفی بۆ ئەم ئاستە زۆر کەمە، هەرچەندە ئەم کتێبە بۆ ئاستی بەرزیش زۆر سوودبەخشە

٣. بەراورد لەنێوان فەلسەفەی خۆرئاوا و فکری ئیسلامی.

بەڵام بە پلەی یەکەم مەبەستمان ئاسانکاری و بەمەنهەجیکردنی بابەتە فەلسەفییەکانە.

## تایبەتمەندی ئەم کتێبە

١. سادەیی، ئاسانی، ڕەوانی، زمانی خۆماڵی دوور لە قورسکاری و دەستەواژەی ناڕوون، بەشێوەیەک، هەندێ کەس ئەگەر نیەتەکەمان نەخوێنێتەوە، ڕەنگە ڕەخنە لە زمان سادەییەکەی بگرێت و پێیوابێت لە بازنەی فەلسەفە چۆتە دەر، بەڵام لە ڕاستیدا ئامانجی هەرە سەرەکی ئێمە بریتیبوو لە خستنەڕووی فەلسەفە و مێژووی فەلسەفە و تەوژم و ڕێباز و ئاڕاستە و بابەت و تیۆرە فەلسەفییەکان بە زمانێکی سادە، بەشێوەیەک، ئەوانەی تاوەکو ئێستا دەستیان نەگەیشتووە بە فەلسەفە لەم ڕێیەوە دەستیان پێی بگات و لە بەراوردی ئیسلام و فەلسەفەش بێبەش نەبن و بە بیروبۆچوونی فەیلەسوفان و ئایدیا و فکری ئیسلامیش شاد ببن.

٢. کورتی و پوختی، زۆربەی زۆری بابەتەکانمان بەشێوەی مەتن نووسیوە و نەمانتوانیوە زۆر تەفسیلی پێدەین، چونکە ویستوومانە زۆربەی بابەتە سەرەکییەکانی فەلسەفە باس بکەین، ئەگەر بە تەفسیلی نووسیبان، زۆر زۆر درێژ دەبوویە و چاپکردن و خوێندنەوەی زۆر قورس دەبوو.

٣. دابەشکاری، بۆ ئاسانکاریی خوێنەر و لێتێکەڵنەبوونی، کتێبەکەمان لەسەر دوو ئاستدا دابەشکردووە، ئاستی یەکەم: هەرسێ مەبحەس و بابەت و تەوەرە سەرەکییەکەی فەلسەفە: مەعریفە (زانین)، وجود (بوون)، قیەم (بەهاکان). ئاستی دووەم: شێوە مێژووییەکەی، لە پێش یۆنانەوە تاوەکوو سەردەمی هاوچەرخ. ئەمە جگە لە پێشەکییەکی تێروتەسەل بۆ ناساندنی فەلسەفە و پەیوەندی بە بابەتەکانی تری وەک زاستی کەلام و ئیسلام و ...

٤. خستنەڕووی قوتابخانە و فەیلەسووفە بەناوبانگەکان، هەوڵمانداوە زۆربەی تەوژم و قوتابخانە و مەزهەبە سەرەکییەکانی فەلسەفە بخەینەڕوو، هاوکات لەگەڵ فەیلەسووفە بەناوبانگ و خاوەن قوتابخانەکان.

## پێناسەی فەلسەفە لە ڕووی زاراوەوە:

پێناسەکردنی فەلسەفە شتێکی قورسە، هەتا وای لێهاتووە هەندێک لە نووسەران وتویانە مەحاڵە پێناسەی فەلسەفە بکەیت، پێناسەی فەلسەفە زۆر زۆرە، چونکە پێناسەی فەلسەفە بەپێی فەیلەسووف و کات و سەردەم و شوێن و بابەتەکانی فەلسەفە دەگۆڕێت، بەڵام ئێمە بەشێک لە پێناسەکان دەهێنین. بۆ نموونە:

### ١. سەردەمی پێش سوقرات:

فەلسەفە بریتی بووە لە تێڕامان و لێکۆڵینەوە لە بوون و گەردوون و سروشت، بۆیە گرنگییەکەیان بریتی بوو لە زانینی ئەسڵی ئەم گەردوونە، ئاخۆ لە چی دروستبووە، بیروڕایان جیاواز بوو، بۆ نموونە:

«تالیس» دەیوت: ئەسڵی بوون ئاوە.

«ئەنەکسیمەندر»یش دەیوت: ئەسڵی بوون ماددەیە[1].

«ئەناسکیمنس» دەیوت: ئەسڵی بوون هەوایە.

«ئەمبادوکلیس» دەیووت: ئەسڵی گەردوون ئاگر و هەوا و گڵ (خاک) و ئاوە.

لەگەڵ چەندین پێناسە و بیروڕای فەیلەسووفانی دیکەش، کەواتە: فەلسەفە لە پێش سوقرات لە ئەسڵی بوونی دەکۆڵییەوە.

### ٢. سەردەمی سۆفستاییەکان و سوقرات و ئەرستۆ:

فەلسەفە لە سەردەمی سۆفستاییەکان و سوقڕاتدا کورت هەڵاتبوو لە:

---

(١) ئەنەکسیمەندریش دەیوت: ئەسڵی بوون شتێکی بێشکڵ و دیارینەکراوە کە ئەو خۆی ناوی «ئاپایرۆن»ی لەسەر دادەنا. ئەپایرۆنیش لە زمانی یۆنانیدا واتە: دیارینەکراو، بێسنوور، ناکۆتا.

«مرۆڤ»، «حەقیقەت»، ڕاستی»،«حەق»، «دادگەری»، «خێر» و «شەڕ»دا، هەر بۆیە سوقڕات بەوە بەناوبانگە کە فەلسەفەی لە ئاسمانەوە دابەزاندە سەر زەوی و تایبەتی کرد زیاتر بە مرۆڤ و بابەتەکانی خێر و شەڕ و... هتد.

پێناسەی سوقڕات (٤٦٩ - ٣٩٩ پ. ز) بۆ فەلسەفە: گەڕانی ئەقڵە بە دوای نێوەڕۆکی ئەو شتانەی دەمانگەیێننە چاکە.

**٣. ئەفلاتوون (٤٥٧ - ٣٤٧ پ.ز):**

پێناسەی ئەفلاتوون بۆ فەلسەفە: گەڕانە بۆ کرۆکی بوونەکان و یاسا جوانەکان تا یەکەم بەدیهێنەریان بناسرێت، شەرەفی سەرکردایەتی هەموو زانستەکانی هەیە.

**٤. ئەرستۆ (٣٨٤ - ٣٢٢ پ.ز):**

پێناسەی ئەرستۆ بۆ فەلسەفە: زانستێکی بیردۆزییە بۆ بنەما و هۆکارە سەرەتاییەکان.

فەلسەفە لە لای ئەرستۆ زۆر زۆر فرەوان بوو، تا وای لێهات یەکسان بوو بە زانست، واتا: زانستەکانی هەمووی لەخۆ دەگرت.

دابەشکاری ئەرستۆ بۆ فەلسفە:

١- الفلسفة النظرية، الحكمة النظرية، العلم النظري، فەلسەفەی بیردۆزیی نەزەڕی،کە سێ بەش دەگرێتەوە:

(الطبيعيات) سروشت، وەک: فیزیا و کیمیا و بایەلۆجی و فەلەک و ... هتد.

(الرياضيات) ڕیازیات، وەک حیساب و ئەندازیاری و... هتد.

(الإلهيات) ئیلاهیات بە دوو واتا بەکارهاتووە، (عام، گشتی)، کە بوون دەگرێتەوە، (خاص، تایبەت) کە ناسینی خودا دەگرێتەوە.

٢- الفلسفة العملية، الحكمة العملية، العلم العملى، فەلسەفەی کردەیی، ئەویش سێ بەش دەگرێتەوە:

(الأخلاق) ڕەوشت، کە بۆ ڕێکخستنی تاکە.

(الاقتصاد) ئابووری، بۆ ڕیکخستنی خێزان.

(السياسة) سیاسەت، بۆ ڕێکخسنی شار و دەوڵەت.

کەواتا لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە فەلسەفە لای ئەرستۆ ماناکەی زۆر فراوانە، بە شێوەیەک کە زانست و غەیری زانستیش دەگرێتەوە.

**سەردەمی دوای ئەرستۆ**

لە دوای ئەرستۆوە فەلسەفە جۆرێک لە چەقبەستوویی بەخۆیەوە بینی، هەربۆیە فەیلەسووفانی دوای ئەرستۆ شتێکی وا گرنگیان نەهێنا شایەنی باس بێت، بەڵکوو زیاتر تەقلیدی پێش خۆیان بوو بەشێوەی جیاجیا، هەر لەم سەردەمەدا بوو دوو قوتابخانە سەریان هەڵدا، ئەوانیش بریتیبوون لە «ئەپیکۆریەکان و ڕەواقیەکان»، فەلسەفە لە سەردەمی ئەواندا لە دەوری مرۆڤ دەسووڕایەوە، لەڕووی ئەخلاق و سلووک و بەختەوەری و خۆشبەختی و هۆکارەکان لەم ژیانەدا، هەروەها نرخی مرۆڤ لەم ژیانەدا، هەرچەندە ئەم دوو قوتابخانەیە لە میتۆد و فیکردا جیاوازبوون[1].

**٥. فاڕابی (٨٣٧ - ٩٥٣ ز):**

پێناسەی فەلسەفە لای فاڕابی: زانینی ئەو بوونانەیە کە هەن بەو شێوەیەی کە هەن،هەروەها زانستێکی کۆکەرەوەیە کە وێنەیەکی تێروتەسەلی بوونەوەر

---

(١) بۆ ئەو پێناسەو بابەتانە بگەڕێوە بۆ: دراسات في الفلسفة اليونانية، ب١، ل٦٦. الفلسفة اليونانية، كريم متي، ل٢٣. مقدمة في الفلسفة العامة، ل٢٢.

دەبەخشێتە مرۆڤ.[1]

**٦. ئیبن سینا (٩٨٠ - ١٠٣٧ ز):**

پێناسەی ئیبن سینا بۆ فەلسەفە: وەستانە لەسەر ڕاستیی هەموو شتەکان بەو ئەندازەیەی دەگونجێت مرۆڤ لەسەری بوەستێت.

**٧. ئیبن ڕوشد (١١٢٦ - ١١٩٦):**

پێناسەی ئیبن ڕوشد بۆ فەلسەفە: سەرنجدانە لە بوونەوەر لە لایەنی بەڵگەبوونییەوە لەسەر بەدیهێنەرەکەی.

**٨. ڕینێ دیکارت (١٥٩٦ - ١٦٥٠):**

پێناسەی دیکارت بۆ فەلسەفە: فەلسەفە وەک درەختێک وایە ڕەگەکەی مێتافیزیکە (ئەودیو سروشت)، قەدەکەی فیزیکە، لق و پۆپەکانی کە لەو قەدە دەردەچن هەموو زانستەکانن، کە دەگەڕێنەوە بۆ سێ زانستی سەرەکی: زانستی پزیشکی، ماتماتیک، ئەخلاق.

کەواتە وەک بینیمان فەلسەفە پێناسە و واتاکەی جیاواز بوو بەپێی فەیلەسووف و سەردەمەکان.

بەڵام بەشێوەیەکی گشتی فەلسەفە لە زۆربەی کتێبە فەلسەفیەکاندا و لەو سەردەمەدا دابەشدەکرێت بۆ سێ بابەتی سەرەکی:

١. فەلسەفەی بوون، بوونناسی (الوجود) (Ontology) (ئۆنتۆلۆژیا).

٢. فەلسەفەی ناسین و زانین، تیۆری زانین (المعرفة) (Epistemology) (ئیپستمۆلۆژیا).

٣. فەلسەفەی قیەم و ئەخلاق و بەهاکان، بەهاناسی (الأخلاق والقیم)

---

(١) كتاب الكندی إلی المعتصم فی الفلسفة الأولی، ل٧٧

(Axiology) (ئیکسیۆلۆژیا).

**هەروەها چوار بابەتی دیکەشمان هەن کە ئەوانیش بە بابەتی فەلسەفی گرنگ دادەنرێن بەتایبەت لەو سەردەمەدا:**

١- فەلسەفەی یاسا (فلسفة القانون).

٢- فەلسەفەی ئایین (فلسفه الدین).

٣- فەلسەفەی مێژوو (فلسفه التاریخ).

٤- فەلسەفەی زمان (فلسفة اللغة).

## لق و بابەتە سەرەکییەکانی فەلسەفە

سەرەکیترین بوارەکانی خوێندن لە فەلسەفەدا ئەمانەی خوارەوەن:

مێتافیزیک: لێکۆڵینەوەیە لە سروشتی بوون و جیهان.

تیۆری زانین (تیۆری مەعریفە) (مەعریفەتناسی): گرنگی بە سروشت و مەودای مەعریفەت دەدا.

فەلسەفەی ئەخلاق: گرنگی بەو پرسیارانە دەدا کە مرۆڤەکان دەبێت چۆن هەڵسوکەوت بکەن یان ئەوەی کە ئاخۆ وەها پرسیارگەلێک وەڵامدارن یان نا.

جوانیناسی: سەروکاری هەیە لەتەک جوانی، هونەر، چێژ، هەستپێکردن، تام و سۆزدا.

لۆژیک: لێکۆڵینەوەیە لە شێوە گونجاوەکانی بەڵگاندن (الاستدلال).

فەلسەفەی سیاسی: لێکۆڵینەوەیە لە حوکوومەت و پەیوەندیی تاکەکان و کۆمەڵ لەگەڵ دەوڵەتدا، هەروەها حوکمڕان و حوکمڕانی چاک.

فەلسەفەی زەین: سەروکاری هەیە لەتەک سروشتی زەین و پەیوەندیی لەگەڵ لەشدا.

فەلسەفەی زمان: پرسینەوەیە لە سروشت، سەرەتاکان و بەکاربەریی زمان.

فەلسەفەی ئایین: ئەو لقە لە فەلسەفەیە کە ڕووی پرسیارەکانی خۆی لە ئایین دەکات.

جگە لەوانە، زۆربەی بابەتە زانستییەکان فەلسەفەی خۆیانیان هەیە، بۆنموونە فەلسەفەی زانست، فەلسەفەی بیرکاری، فەلسەفەی لۆژیک، فەلسەفەی یاسا، فەلسەفەی مێژوو یاخود زۆر شتی ژیان ...

## تیۆر و باس و مەبحەسی مێتافیزیک (مبحث الوجود)

تیۆر و مەبحەسی مێتافیزیک ئەو لقە لە فەلسەفەیە کە گرنگی بە سروشتی بوون و جیهان دەدا. بە کەسێک کە لە تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکانی پێکهاتەی جیهان دەکۆڵێتەوە دەوترێت مێتافیزیکزان یان زانای مێتافیزیک.

وشەی مێتافیزیک لە دوو وشەی یۆنانی پێک هاتووە کە لکێنراون بە یەکەوە: مێتا (μετά- بە واتای «چی هەیە لەپشتەوەی یان دواوەی» و فیسیکا مانای «سروشت».هەردوو وشەکە بە مانای «دواوەی سروشت یان ئەودیوی سروشت» لێرەدا، «فیزیکی» ئاماژەیە بە کارەکانی ئەرستۆ لەسەر ماددە. پێشگری مێتا پاش مردنی و لە کاتی کۆکردنەوە و پێداچوونەوە و ڕێکوپێککردنی بەرهەمەکانی لەلایەن کەسانی ترەوە خرایە سەرەتای ناوی ئەو بابەتانەی کە لەدوای بابەتەکانی سەبارەت بە سروشت و فیزیکەوە دانرابوون. ئەرستۆ بۆخۆی بەو بابەتانەی نەوتبوو مێتافیزیک، بەڵام هەندێک جار وەکوو "فەلسەفەی یەکەم" ناویانی بردبوو.

مێتافیزیک خۆی چەند لقێکی تری لێ دەبێتەوە کە لە هەموویان ئاشناتر ئانتۆلۆژی یان بوونناسی‌یە. بوونناسی لێکۆڵینەوە لە خودی بوون (وجود)، وەک ئەوەی کە هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵینەوەش لەوە دەکات کە شتەکان لە جیهاندا چەند جۆرن و چ پەیوەندییەک هەیە لەنێوان جۆرەکاندا. هەروەها مێتافیزیکزانان هەوڵ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو بیروڕایانە دەدەن کە بەهۆیانەوە مرۆڤەکان لە جیهان و ئەوەی تێدایە، تێدەگەن، وەکوو: بوون، سامان، جێ، کات، هۆیەتی و هتد.

پێش پەرەگرتنی زانستی مۆدێرن، بەشێک لە مێتافیزیک بە ناوی فەلسەفەی سروشتی ڕاسپێردرابوو بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە زانستییەکان. وشەی (science = زانست) هەتا یەک یان دوو سەدە لەمەوبەر بەکار نەدەهێنرا. میتۆدی زانستی وای لە فەلسەفەی سروشتی کرد کە بەپێچەوانەی فەلسەفەکانی تر ببێت بە چالاکییەکی لەسەر تاقیکردنەوە و ئەزموون بنەڕەتنراو و لە کۆتاییی سەدەی هەژدەیەم بەم لاوە ناوی ببێت بە زانست. هۆی ئەم ناوگۆڕینە ئەوە بوو کە فەلسەفەی سروشتی بەتەواوی لە ئەوتر بوارەکانی فەلسەفە جیا بکرێتەوە. دوای ئەوە، واتای مێتافیزیک بوو بە تاوتوێکردنی سروشتیبوون بە شێوەی نائەزموونی.

## تیۆر و باس و مەبحەسی زانین (تیۆری مەعریفە) (نظرية أو مبحث المعرفة)

تیۆر و مەبحەسی زانین (تیۆری مەعریفە)،مەعریفەتناسی، ئێپیستێمۆلۆژی (بە ئینگلیزی: Epistemology، بە عەرەبی: نظرية المعرفة) لە لقەکانی فەلسەفەیە کە گرنگی بە سروشت و سنوورەکانی زانین دەدات. مەعریفەتناسی خۆی ڕووبەڕووی ئەم پرسانە دەکاتەوە:

زانین چییە؟

زانین چۆن بەدەست دێت؟

مرۆڤ چی دەزانێت؟

ئەو شتە کە ئێمە دەزانین، چۆن دەیزانین؟

زۆرینەی گفتوگۆکان لەم گۆڕەپانەدا وردبوونەتەوە لەسەر شیتەڵکاریی سروشتی زانین و ئەوەی کە زانین چۆن گرێدراوە بە تێگەیشتنەکانی دیکەوە، لەوانە: دروستی باوەڕ و پاساوهێنانەوە. لەگەڵ واتای بەرهەمهێنانی زانینیشدا سەروکاری هەیە و هەروەها لەگەڵ گومانکاری لە بانگەشە جۆربەجۆرەکانی مەعریفەتدا.

وشەی «ئێپیستێمۆلۆژی» (Epistemology) لە یۆنانییەوە وەرگیراوە: epistēme - ἐπιστήμη، «زانین، زانست» + λόγος، لۆگۆس.

## تیۆر و باس و مەبحەسی بەهاکان (مبحث القيم)

تیۆر و مەبحەسی بەهاکان، (بەئینگلیزی: Ethics یان Moral Philosophy) بەشێکە لە فەلسەفە کە ئەرکی وەڵامدانەوەی دروست و نادروست، خێر و شەڕ و حەق و ڕاستی و جوان و ناجوانی لە ئەستۆدایە.

فەلسەفەی بەهاکان (مبحث القيم) دابەش دەبێت بۆ سێ بابەت و زانستی سەرەکی:

١. **بەهای ڕاستی و حەق**: کە زانستی لۆژیک (علم المنطق) لێی دەکۆڵێتەوە.

٢. **بەهای خێر و چاکە**: کە زانستی ڕەوشتناسی (علم الاخلاق) لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکات.

٣. **بەهای جوانی**: کە زانستی جوانیناسی (علم الجمال) لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکات.

کەواتە دەتوانین بڵێین: فەلسەفە ئەم بەشانە دەگرێتەوە:

## جۆرەکانی فەلسەفە بەپێی سەردەمەکان (قۆناغەکانی فەلسەفە):

١. فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتی کۆن

٢. فەلسەفەی یۆنانی

٣. فەلسەفەی سەدەی ناوەڕاست (مەسیحی)

٤. فەلسەفەی سەدەی ناوەڕاست (ئیسلامی)

٥. فەلسەفەی ئەورووپی لە سەردەمی ڕێنیسانس (ڕاپەڕین، نەهزە)دا

٦. فەلسەفەی نوێی ئەورووپی

٧. فەلسەفەی هاوچەرخ

## جۆرەکانی فەلسەفە بەپێی ئایین:

١. فەلسەفەی ئایینی

٢. فەلسەفەی نائایینی

## جۆرەکانی فەلسەفە بەپێی بیردۆزی (نظری) و کردەیی (عملی):

١. فەلسەفەی بیردۆزی (الفلسفة النظرية)

٢. فەلسەفەی کردەیی (الفلسفة العملية)

## جۆرەكانی فەلسەفە لە ڕووی ئیلحادی و نائیلحادی:

١. فەلسەفەی ئیلحادی بێباوەڕ

٢. فەلسەفەی نائیلحادی باوەڕدار (مەرج نییە ئایینی بێت، دەكرێت بەس بڕوای بە خودا هەبێت).

## جۆرەكانی فەلسەفە لە ڕووی ماددی و ناماددی:

١. فەلسەفەی ماددی، بە واتای ڕەتكردنەوە و وەلانانی هەموو شتێک و بیر و فیكرێک كە مادده بەرهەم نەهێنێت و سوود و قازانجی ماددی و بەرهەستی نەبێت، وەک مەزهەبی پۆزەتیڤیزم (وەزعی).

٢. فەلسەفەی ناماددی (ڕۆحی)، كە تەركیزی زیاتر لەسەر ڕۆح و ئەو پەڕ ماددەیە، نەوەک مادده و سوود و قازانجی ماددی.

**كەواتە دەتوانین بڵێین فەلسەفە بەم شێوەیە هاتووە:**

١. بیركردنەوە و بەدواداچوون بۆ بوون و ئەسڵی بوون و گەردوون، سەردەمی پێش سوقرات، واتا سەردەمی (تالیس)[1].

٢. گرنگیدان بە مرۆڤ و سەرنج خستنە سەر مرۆڤ، سەردەمی سوقرات.

٣. تێكەڵكردن و تێكەڵ بوونی فەلسەفە بە زانست، لەخۆگرتنی هەموو زانستەكان، سەردەمی ئەرستۆ.

٤. تێكەڵ بوونی فەلسەفە بە ئایین، سەردەمی سەدەی ناوەڕاستی فەلسەفەی

---

(١) كە دەڵێین سەردەمی تاڵیس، مەبەستمان فەلسەفەیە بەشێوەیەكی مەنهەجی و تێڕوانینی فەلسەفییانە، ئەگەرنا زۆر پێش تاڵیس ئەم بابەتانە تاووتوێ كراون و قسەیان لە بارەوە كراوە، چونكە خۆ مێژووی مرۆڤایەتی لە سەردەمی تاڵیسەوە دەست پێ ناكات! بەڵكوو زۆر پێش تاڵیس و فەلسەفەی یۆنانی ئەم بابەتانە و غەیری ئەوانەش قسە و بیركردنەوەیان لەبارەوە كراوە.

مەسیحی و فەلسەفەی ئیسلامی، وەک: ئۆگستین و کیندی و فارابی و ئیبن سینا و... هتد، لەو سەردەمەدا هەوڵی بە فەلسەفاندنی بابەتە ئایینییەکان دراوە.

٥. جیاکردنەوە و دوورخستنەوەی ئایین لە فەلسەفە، دوای شۆڕشی فەڕەنسی.

٦. ماددیبوون و هەستیبوون و بەرەو ئیلحاد چوون، وەک مارکس.

٧. دوورکەوتنەوە لە ماددیبوون و تەرکیز خستنە سەر ئەخلاق و عەقڵ، وەک کانت.

٨. تەرکیز خستنە سەر قازانج و سوود، دوورکەوتنەوە لەو بیر و فیکرانەی عەمەلی و کردەیی نین و دوورن لە واقیع و سوود و قازانجی ماددی، ڕێبازی وەزعی و براگماتیکی، وەک: ئۆگست کۆنت و جۆن دیوی.

٩. فەلسەفەی جوانی، زانست، یاسا، ئایین، مێژوو و... هتد.

١٠. فەلسەفەی زمان

بەکورتی: فەلسەفە واتا بیرکردنەوە و بەدواداچوون و پرسیارکردن دەربارەی خۆم، خودا، خەڵک ، کۆمەڵگە، بوون، گەردوون، ژیان، مردن، خێر، شەڕ، جوانی، ناشیرینی، باش، خراپ، تاک، خێزان، کۆمەڵگە، سیاسەت، ئابووری، ئەخلاق، ئایین، ئیلحاد، دادگەری، ستەم، واجب، ممکن، ئەستەم، سروشت، هۆش ، ئەقڵ، فیکر، زانست، ناسین، خەیاڵ، مێژوو، یاسا، عیشق، خۆشەویستی، پەیوەندی، زمان، هونەر و ... هتد.[1]

---

(١) بۆ ئەم باسانەی ڕابردوو بگەڕێوە بۆ:
موسوعة الفلسفة والفلاسفة للدكتور عبد المنعم الحفنيى. والمعجم الفلسفي، المصطلح الفلسفي عند العرب، للدكتور عبد الأمير الأعصم. ومعجم الفلاسفة، جورج طرابيشي. والمعجم الفلسفي، جميل صلبيا. والمعجم الفلسفي عبد المنعم الحنفي. والمعجم الفلسفي، مجمع اللغة العربية. والمعجم الفلسفي مراد وهبة. والفلسفة الحديثة، أحمد السيد رمضان. والفلسفة الحديثة من عصر النهضة وحتى التنوير، سواد سواف تاتاركيفتش. وتاريخ

## پەیوەندی نێوان زانستی کەلام و فەلسەفە

## پێناسەی زانستی کەلام

زانستی کەلام پێناسەی جۆراوجۆری بۆ کراوە هەم بەپێی سەردەمەکان هەم بەپێی زاناکانی ئەم بوارە.

بەڵام دەتوانین بڵێین جوانترین پێناسە ئەمەیە:

زانستی لێکۆڵینەوە و چەسپاندن و جێگیرکردنی بیروباوەڕ و عەقیدەی ئیسلامییە، بە هێنانەوە و خستنەڕووی بەڵگە و لادان و ڕەواندنەوە و نەهێشتنی گومان.(١)

کەواتە بەم پێیە زانستی کەلام دوو شت دەگرێتەوە: جێگیرکردن و بەڵگەهێنانەوە لەگەڵ لادان و ڕەواندنەوە و نەهێشتنی گومانەکان لەسەر بیروباوەڕی ئیسلامی.

## بابەتەکانی زانستی کەلام

بابەتی زانستی کەلام سێ بابەتی سەرەکییە:

١. **ئیلاهیات**: واتە هەمووە ئەو بابەتانەی پەیوەست بە خودی خودای گەورە، بۆنموونە: بوونی خودا.

٢. **نبوات**: واتە هەموو ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە پێغەمبەریەتی و پێغەمبەرانەوە هەیە.

---

الفلسفة اليونانية، يوسف كرم. وتاريخ الفلسفة الأوروبية في العصر الوسيط، يوسف كرم. وتاريخ الفلسفة الحديثة، يوسف كرم. وفلسفة الشريعة، الدكتور مصطفى الزلمي. ودراسة في الفلسفة اليونانية والإسلامية، الدكتور صالح الرقب.

(١) المواقف للإيجي، ب ١، ل ٣٥.

٣. **سمعيات**: هەموو ئەو بابەتانەی بە بیستن دەزانرێن و زانینیان بە سەمع و بیستن لە خوا و پێغەمبەرەوە نەبێت نازانرێن، بۆنموونە دۆزەخ و بەهەشت و چۆنیەتییان و ...

## بەڵگەکانی زانستی کەلام

زانستی کەلام بۆ سەلماندنی بابەت و مەبەست و بیروڕاکانی پشت بە دوو سەرچاوە و بەڵگەی سەرەکی دەبەستێت: ئەقڵ و نەقڵ، کە قورئان و سوننەیە.

## پەیوەندی زانستی کەلام و عەقیدە

لەبارەی پەیوەندی نێوان کەلام و عەقیدە سێ ڕامان هەیە:

١. زانستی کەلام خودی زانستی عەقیدەیە.

٢. زانستی کەلام بەهیچ شێوەیەک زانستی عەقیدە نییە و لێک جیان.

٣. عەقیدە نە زانستی کەلامە و نەغەیری کەلامیشە، لای ئەم ئاراستەیە زانستی کەلام پەیوەستە بە عەقیدە لەم ڕووەی کە پارێزگاری لە عەقیدە دەکات و شوبهە و گومانەکان دەڕەوێنێتەوە.

ئێمە پێمان وایە زانستی کەلام لە عەقیدە فراوانترە، زانستی کەلام عەقیدەش لەخۆ دەگرێت، بەڵام بە فراوانتر و تێکەڵ کردنی بە لایەنی عەقڵی و فەلسەفی و لۆژیکی و زمانەوانی، کەواتە دەکرێت بڵێین ڕای یەکەم و سێیەم تێکەڵ بکەین، چونکە لەو ڕووەی زانستی کەلام بنەماکانی ئایین و عەقیدە لەخۆ دەگرێت و بەڵگەیان بۆ دەهێنێتەوە ئەوە ڕێک عەقیدەیە و جیاوازییان نییە، بەڵام لەو ڕووەی کە تێکەڵ دەبێت بە فەلسەفە و فەلسەفەکاری و عەقڵکاری و لۆژیک

ئەوە ناکرێت بە خودی عەقیدە لێکی بدەینەوە، کەواتە کەلام خودی عەقیدەیە بەڵام بە فراوانتر.

## هۆکاری ناونانی زانستی کەلام بەم ناوە

چەند ڕایەکمان هەیە دەربارەی ناونانی زانستی کەلام بەم ناوە

١. زانایانی کەلام (موتەکەللیمەکان) قسەیان دەربارەی شتانێک کردووە و لە شتانێکدا دواون کە پێشینانیان لەم شتانەدا قسەیان نەکردووە و نەدواون لێیان، بۆنموونە باسی خەلقی قورئان و ناو و سیفەتەکانی خودای گەورە و قەزا و قەدەر و...

٢. گرنگترین و باوترین بابەت کە جیاڕایی لێ کەوتووەتەوە بابەتی «فەرمایشت و قسەی خودا» (کلام الله)، «بەدیهێنراوی قورئان» (خلق القران) بووە، هەر بۆیە ئەم زانستە بەم بابەتە مشتومڕ و جیاڕا لەسەر ناونرا.

٣. توانای قسەکردن و گفتوگۆ دەبەخشێت لەبارەی چەسپاندنی بابەتە عەقیدەیی و فیکرییەکان و گفتوگۆکردن لەگەڵ دژەکاندا.

٤. چونکە بابەتەکانی ئەم زانستە بە (الکلام فی کذا وکذا) واتە: "دوان لە فڵان بابەت و فڵان بابەت" دەست پێدەکات.

٥. چونکە ئەم زانستە بە قسەکردن و دوان و گفتوگۆ لە نێوان لایەنە جیاوازەکاندا دێتەکایەوە.

٦. چونکە لە هەموو زانستەکانی تر زیاتر جیاوازی و ڕاجیایی و کێشمەکێش هەڵدەگرێت، ئەمەش پێویستی بە قسەکردن و گفتوگۆکردنە لەبارەیانەوە.

٧. بنەما و ئەساسەکەی بریتییە لە کەلام و قسەکردن و هیچ جۆرە کار و کردەوەیەکی تێدا نییە.

## ناوەکانی زانستی کەلام

زانستی کەلام زیاد لە ناوێکی هەیە

١. بیروباوەڕی ئیسلامی (العقيدة الاسلامية).

٢. فیقهی مەزن و گەورە (الفقه الاكبر): ئەم ناوە یەکەمجار ئیمامی ئەبوو حەنیفە بەکاری هێناوە، ئێمە دوو جۆر فیقهمان هەیە: فیقهی مەزن و گەورە کە عەقیدە و بیروباوەڕە، فیقهی بچووک کە ئەحکامی فیقهی و فەرعییە، کەواتە فیقهـ و تێگەیشتن لە بیروباوەڕ و عەقیدە ئەسڵ و بنچینەیە، فیقهـ و تێگەیشتن لە ئەحکامی فیقهی فەرع و جوزئە.

٣. زانستی بنەماکانی ئایین (اصول الدين): بۆیە وای پێ دەوترێت، چونکە هەڵدەستێت بە ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی بنەماکانی بیروباوەڕ و عەقیدە.

٤. زانستی یەکخواناسی و یەکخواپەرستی (التوحيد): بۆیە بەم ناوە ناودەبرێت، چونکە یەکخواناسی و یەکتاپەرستی ناودارترین و گرنگترین بابەت و بەشی ئەم زانستەیە.

٥. زانستی کەلام: هۆکاری ئەم ناونانەشمان ڕوون کردەوە.

## دوو جۆرەکەی زانستی کەلام

ئێمە ئەگەر سەیری ڕابردوومان بکەین دوو جۆر میتۆد و مەنهەج دەبینین لای زانایانی زانستی کەلام:

١. زانستێکی کەلامی عەقڵی و نەقڵی بەڵگەدار بە وەحی و عەقڵێکی سەلیم و دوور لە ڕۆچوون و توانەوە لەناو فەلسەفەی یۆنانی و ئیغریقی و لۆژیکی ئەرستی، هەروەها دوور لە تەعقید و قورسکاری و فەلسەفاندن.

٢. زانستێکی کەلامی ڕۆچوو لەناو فەلسەفەی یۆنانی و ئیغریقی و لۆژیکی

ئەرِستی،قاڵ بووە لە تەعقید و قورسکاری و فەلسەفاندن.

ئێمە لێرەدا مەبەستمان جۆری یەکەمی زانستی کەلامە کە بەم شێوەیەیە:

١. تایبەتمەندی خۆی دەپارێزێت و وەحی و عەقڵی سەلیم دەکاتە سەنتەر و چەق و بنچینە.

٢. ڕۆناچێت لە فەلسەفەیەکی وشک و موعەققەد و لۆژیکێکی ئەرستۆیی.

٣. کاری سەرەکی لێکۆڵینەوە و بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر بنەماکانی ئایین و عەقیدە و وەڵامدانەوەی گومان و شوبهەکان.

## جیاوازی کەلام و فەلسەفە

١. کەلام[1] (عەقیدە)، هێڵە گشتییەکانی ڕەببانییە و لەخواوەیە و لەڕێی وەحیەوە گەیەنراوە بە مرۆڤ.

بەڵام فەلسەفە بەشەرییە و لە مرۆڤ خۆیەوە سەرچاوەی گرتووە.

٢. کەلام (عەقیدە) هێڵە گشتییەکانی وەک بوونی خوا و ڕۆژی دوایی و...، جێگیر و نەگۆڕن و بەپێی کەس و شوێن و کات و ژینگە و...، ناگۆڕێن.

بەڵام فەلسەفە هیچ شتێکی جێگیری تێدا نییە و هەمووی قابیلی گۆڕانە بەپێی کەس و شوێن و کات و سەردەم.

٣. کەلام (عەقیدە) پشت بە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی دەبەستێت، بەڵام

---

(١) کەلام لێرەدا وەک هاومانای (عەقیدە) بەکارمان هێناوە، بەڵام ئەگەر وەک مەعریفەی دینی بەکاری بێنین، ئەوە بەدڵنیاییەوە قبووڵی هەڵەی هەیە و جیاوازە لە دین، واتە دەبێتە تێگەیشتن بۆ دین، نەک خودی دین، بەڵام ئەگەر وەک هاومانای عەقیدە بەکارمان هێنا (کە یەکێکە لە ناوەکانی) ئەوە دەبێتە خودی دین. عەقیدەش مەبەستمان لەو بنەما گشتی و نەگۆڕانەیە کە لە ڕێی وەحییەوە هاتوون.

فەلسەفە مەگەر فەلسەفەیەکی ئایینی بێت ئەگەرنا پشت بە وەحی و نەقڵ نابەستێت.

٤. کەسی فەیلەسووف دێت لەڕێی عەقڵەوە بنەما فیکرییەکانی خۆی بنیات دەنێت، واتە هیچ سنوورێکی پێشوەختەی بۆخۆی دانەناوە، بەڵام موتەکەللیم کە دێت بیردەکاتەوە، بنەمای فکری دامەزراوە و سنوورێکی هەیە، بۆنموونە پێش ئەوەی بێت بڕوای بەخوا هەیە، ئینجا دێت گفتوگۆی ناو و سیفەت و ... دەکات.

٥. فەیلەسووف مەرج نییە بگات بە حەقیقەت و شتێکی دڵنیایی، بۆی هەیە تا دەمرێت بەگومان بێت لە هەموو شتێک، بەڵام موتەکەللیم وانییە، یەقینی لەسەر زۆر شت هەیە، با لە هەندێک شتی فەرعی و لاوەکیش گومانی هەبێت.

٦. کەلام گەڕانە بەدوای حەقیقەتێکی ئایینی، بەڵام فەلسەفە گەڕانە بەدوای حەیقیقەتدا، گرنگ نییە حەقیقەتێکی ئایینییە یاخود نائایینی.

بەکورتی هێڵە گشتییەکانی کەلام، دینی و ئایینی و سنووردار و جێگیر و یەقینیین، بەڵام فەلسەفە سنووری نییە و جێگیر و یەقینیش نییە و ئەگەر ئایینییش نەبێت سەرچاوەی بەهیچ جۆرێک نەقڵی و ئایینی نییە.

## زانست و فەلسەفە

زانست و فەلسەفە لە سەردەمی کۆندا و بەتایبەت لەسەردەمی ئەرستۆدا بەیەک چاو سەیر کراوە و زانستەکانیش لەژێر بازنەی فەلسەفەدا جێیان کرابوویەوە، بەڵام لە ڕاستیدا جیاوازییان هەیە.

## زانست چییە؟

زانست مانا بنەڕەتییەکەی بریتییە لە زانین، واتە زانین و زانیاری دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو، بۆنموونە: فیزیا، کیمیا، زمان، ئایین، ئەخلاق، گەردووناسی، ... هتد، زاناش ئەو کەسەیە کە زانیاری دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو هەبێت و تێیدا قاڵ بووبێتەوە.

بەڵام زانست لە سەردەمی ئەمڕۆ و لە جیهانی پێشکەوتووی ئێستادا ماناکەی جیاوازە لە مانا فراوانەکەی پێشوو و تەنیا شتانێک دەگرێتەوە کە ئەزموون کراوبن و لە ڕێگەی تاقیکردنەوە و تاقیگە و ئەزموونی ماددی ڕاستەوخۆی هەستییەوە بەدەست هاتبن.

کەواتە مەفهوومی زانست لەئێستادا و لەسەردەمی نوێدا جیاوازە لە مانا فراوانە کۆنەکە.

## جیاوازی نێوان زانست و فەلسەفە

١. زانست پشت بە ئەزموون و تاقیکردنەوە و گریمانە دەبەستێت، بەڵام فەلسەفە پشت بە بیرکردنەوەی عەقڵی و فکری و سەرنج و تێڕامانی عەقڵی ڕووت دەبەستێت نەوەک ئەزموون و تاقیکردنەوە.

٢. بابەت و بنەڕەتی زانست ماددەی هەستپێکراوە، بەڵام هی فەلسەفە زیاتر پشت ماددەیە و کەمتر مامەڵەی لەگەڵ ماددەدا، ئەگەرچی لە ماددەش دەکۆڵێتەوە، چونکە بوون (وجود)ە، فەلسەفەش کاری سەرەکی لێکۆڵینەوەیە بە بوون، بەڵام وەک زانست نییە هەموو سەرنجی بەس لەسەر ماددەی هەستپێکراو بێت.

٣. فەلسەفە بەزۆری کاری پرسیارکردنە، بەڵام زانست هەوڵدەدات وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە، بەڵام زۆرجار وەڵامی زۆرێک لە پرسیارە فەلسەفییەکانی

پێ نییە، چونکە پرسیارەکانی فەلسەفە بەشێکی زۆری هی ئەودیو ماددە و سروشتە.

٤. زانست یاسا و ڕیسا و بنەمای جێگری تێدایە کە زانایان لەسەری کۆکن، بەڵام لە فەلسەفەدا شتێکی نەگۆڕی کۆدەنگی لەسەر نییە لەنێوان فەیلەسووفاندا.

٥. زانست لە شتێکی دیاریکراو دەکۆڵێتەوە، بەڵام فەلسەفە لە هەموو بوون دەکۆڵێتەوە و گشتگیرە.

٦. زانست لەکوێ کۆتایی هات، فەلسەفە لەوێوە دەستپێدەکات.

## سەرهەڵدانی فەلسەفە

فەلسەفە ئەگەر بە مانا فراوانەکەی وەریبگرین کە بریتییە لە بیرکردنەوە و تێڕامان و بەدواداچوون و پرسیارکردن، دەگەڕێتەوە بۆ دروستبوونی یەکەم مرۆڤ و سەرەتاکانی مرۆڤایەتی و ژیانی مرۆڤ. بەڵام ئەگەر بە واتایەکی تەسکتر وەریبگرین، دوو بۆچوونمان هەیە:

**بۆچوونی یەکەم:** پێیان وایە فەلسەفە لە ڕۆژهەڵاتەوە سەریهەڵداوە و شارستانیەتی ڕۆژهەڵات خاوەنییەتی، وەک: میسر و فارس و بابل و چین و هیند و ... هتد. هەربۆیە چەندان فەیلەسووف هەبوون کە بابەتەکانی فەلسەفەیان تاوتوێ کردووە، بۆنموونە لە میسر: «بتاح حتب و أبور» لە چین: «لاوتسە، کونفوشیوس، مانسیوس و ...، لە فارس:«زرادشت، مانی و مزدک»، لە هیند:«بوذا، سیکیا مونی و کابیلا»

**بۆچوونی دووەم:** پێیان وایە فەلسەفە لە یۆنانەوە سەری هەڵداوە و یەکەم فەیلەسووفیش (تالیس)ە، یەکەم کەسیش کە زاراوەی فەلسەفەی بەکارهێناوە هەر لە یۆنان بووە کە (فیساگۆرسە).

بەڵام دەتوانین بۆچوونی سێیەمیشی بۆ زیاد بکەین، کە پێیوایە فەلسەفە بە مانا کرداریی و فراوانەکەی لە ڕۆژهەڵاتەوە سەریهەڵداوە، بەڵام بەمانا تایبەتەکەی لە یۆنانەوە سەریهەڵداوە، چونکە فەلسەفە دەبێت خاوەنی میتۆد و ڕێبازی تایبەت بەخۆی بێت، کە ئەمەش دیارە لە یۆنان بووە نەک لە خۆرهەڵات، یان هەندێک دەڵێن کە ئەو میتۆدانەی لە ڕۆژهەڵاتدا هەبوون، زیاتر میتۆدی ئایینی بوون تاوەکوو فەلسەفی، بەڵام ئەوەی یۆنان فەلسەفی بوون.

## میتۆدی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە و نووسینی پەرتووکی فەلسەفی

بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆر میتۆدی توێژینەوە و نووسینی پەرتووکی فەلسەفیمان هەیە:

١. میتۆدی نووسینەوەی مێژوویی

٢. میتۆدی نووسینەوەی بابەتی

## یەکەم: میتۆدی نووسینەوەی مێژوویی

ئەم جۆرەیان ڕیزبەندی مێژوویی و کاتی سەردەمییە، واتە دێت لەسەرەتای پەیدابوونی فەلسەفەوە توێژینەوە دەکات بەپێی سەردەمەکان تاوەکوو ئەمڕۆ، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتی کۆن

٢. فەلسەفەی یۆنانی

٣. فەلسەفەی سەدەی ناوەڕاست (مەسیحی)

٤. فەلسەفەی سەدەی ناوەڕاست (ئیسلامی)

٥. فەلسەفەی ئەورووپی لە سەردەمی ڕێنیسانس

٦. فەلسەفەی نوێی ئەورووپی

٧. فەلسەفەی هاوچەرخ

## دووەم: میتۆدی نووسینەوەی بابەتی

ئەم میتۆدەیان بەپێی سەردەم ناڕوات، بەڵکوو بەپێی بابەتەکانی فەلسەفە دەڕوات، واتە بابەتێک دێنێت ئینجا بۆچوونی قوتابخانە و فەیلەسووفەکان لەسەری باس دەکات، بابەتە سەرەکییەکانی فەلسەفەش دابەش دەبن بۆ سێ بابەت و مەبحەسی سەرەکی:

١. فەلسەفەی بوون، بوونناسی (الوجود) (Ontology) (ئۆنتۆلۆژیا).

٢. فەلسەفەی ناسین و زانین، تیۆری زانینن، مەعریفەتناسی (المعرفة) (Epistemology) (ئیپستمۆلۆژیا).

٣. فەلسەفەی قیەم و ئەخلاق و بەهاکان، بەهاناسی (الأخلاق والقيم) (Axiology) (ئیکسیۆلۆژیا).

هەریەکێک لەم بابەتانەش چەندان لقی تریان لێ دەبێتەوە دەبنە دەیان بابەتی جیاواز.

## گرنگی و سوودی فەلسەفە

١. هۆشیاری و ئاگاییە دەربارەی بیرکردنەوە و بەدواداچوون و پرسیارکردن دەربارەی خود خودا، خەڵک، کۆمەڵگە، بوون، گەردوون، ژیان، مردن، خێر، شەڕ، جوانی، ناشیرینی، باش، خراپ، تاک، خێزان، کۆمەڵگە، سیاسەت،

ئابووری، ئەخلاق، ئایین، ئیلحاد، دادگەری، ستەم، واجب، ممکن، ئەستەم، سروشت، هۆش ، ئەقڵ، فیکر، زانست، ناسین، خەیاڵ، مێژوو، یاسا، عیشق، خۆشەویستی، پەیوەندی، زمان، هونەر و ... هتد.

٢. شارەزابوونە لەو کەلەپوور و توراسە فراوانە.

٣. بەرچاوڕوونییە دەربارەی بیر و هزرە لادەرەکان و خۆپاراستنە لێیان.

٤. فراوانکردنی بیر و هۆش و بیرکردنەوە و تێڕوانین و تێڕامان.

٥. دۆزینەوەی چارەسەری کێشە و ئاریشەکان.

## پەیوەندی نێوان فەلسەفە و ئایین (ئیسلام)

فەلسەفە واتە: بیرکردنەوە و بەدواداچوون و پرسیارکردن دەربارەی خۆم، خودا، خەڵک، کۆمەڵگە، بوون، گەردوون، ژیان، مردن، خێر، شەڕ، جوانی، ناشیرینی، باش، خراپ، تاک، خێزان، کۆمەڵگە، سیاسەت، ئابووری، ئەخلاق، ئایین، ئیلحاد، دادگەری، ستەم، واجب، ممکن، ئەستەم، سروشت، هۆش، ئەقڵ، فیکر، زانست، ناسین، خەیاڵ، مێژوو، یاسا، عیشق، خۆشەویستی، پەیوەندی، زمان، هونەر و... هتد

کەواتە مادام فەلسەفە ئەوەبێت کە باسمان کرد، دەرکەوت کە فەلسەفە بێلایەنە و پەیوەستە بە مرۆڤەکان و بیرکردنەوەکان، بۆیە بەپێی کەسەکان و بیروباوەڕ و مەزهەب و ئایینەکاندەگۆڕێت.

ئیسلامیش وەکوو بەرنامەیەکی گشتگیر هەموو بابەت و مەبحثەکانی فەلسەفەی تێدایە و جێی دەبێتەوە، بەڵام بە تێگەیشتن و بیروباوەڕ و تێڕوانینی خۆی.

کەواتە ئیسلام دژی فەلسەفە نییە، بەڵام فەلسەفەیەکی گشتگیر، ڕێکوپێک، عەقڵی، ڕۆحی، کردەیی، گوفتاری، تاکی، خێزانی، کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووری هەیە و خاوەن تێڕوانین و فەلسەفەی تایبەت بە خۆیەتی.

فەلسەفە واتە بیرکرنەوە و تێڕوانین و بیر و فکر، جا ئەگەر ئەو بیرکردنەوەیە لە چواچێوەی ئیسلام بێت و تێکنەگیرێتلەگەڵی و دژایەتی نەکات، ئەوا دەبێت بە فەلسەفەیەکی ئیسلامی. ئەگەریش بەپێچەوانەوە بوو، دژی ئیسلام بوو و لەگەڵیدا تێکگیرا و نەگونجا و لە پرەنسیپە گشتییەکان لایدا، ئەوا دەبێتە فەلسەفەیەکی غەیرە ئیسلامی. جا ئەو کاتیش ئەگەر لە چوارچێوەی ماددیەتدابوو، دەبێتە فەلسەفەیەکی ماددی. ئەگەر لە چوارچێوەی مارکسی بێت، دەبێتە فەلسەفەیەکی مارکسی. ئەگەر لە چوارچێوەی مەسیحیدا بوو، دەبێتە فەلسەفەیەکی مەسیحی، ئەگەر لە چوارچێوەی...

ئیسلام ئایینە، ئایینیش پێناسە و تایبەتمەندی خۆی هەیە، بۆیە ئێمە لێرەدا چەند پێناسەیەک باس دەکەین:

ئایین وەک دکتۆر عەبدوڵلا دراز دەڵێت: "دانراوی خودایە, ڕێنمونی خەڵک دەکات بۆ ڕێگای ڕاست لە عەقیدە و بیروباوەڕدا، ڕێنمونیان دەکات بۆ خێر و باشە و چاکە لە سلووک و ڕەوشت و مامەڵە و هەڵسوکەوتدا."

«ئەلتهانوی» دەفەرمووێت: "ئایین دانراوی خودایە، دەستی خاوەن عەقڵەکان دەگرێت بۆ خۆشگوزەرانی و چاکسازی لە دونیا و سەفرازی لە دواڕۆژدا، بە ویست و هەڵبژاردەی خۆیان."

هەروەها «شیشرون» دەڵێت: "ئایین ئەو ئامڕازەیە کە مرۆڤ دەبەستێتەوە بە خودا و دەیگەیەنێت بەخودا."

فەلسەفەشمان بە درێژی باسکرد.

**دەتوانین بڵێین ئایین دابەش دەبێت بۆ سێ جۆر:**

١. ئایینێکی خودایی پارێزراوی کۆکەرەوەی هەموو ئایینەکانی پێش خۆیەتی، کە ئەمە بەس ئیسلام دەگرێتەوە.

٢. ئایینێکی خودایی دەستکاریکراوی گۆڕاو و شێوێنراو، وەک مەسحییەت و جوولەکە.

٣. ئایینێکی مرۆڤی (فەلسەفی)، کە دەستکردی مرۆڤە، وەک بوودایی و کۆنفۆشیۆس.

بۆیە ئێمە لێرەدا زیاتر مەبەستمان لە ئایین، ئیسلامە؛ وەک ئایینێکی خودایی پارێزراوی دەستکارینەکراو، بەڵام ئەوانی تر یان خودایی نین، یان لە ئەسڵدا خودایین بەڵام دەستکاریکراون و بەتەواوی شێوێنراون.

## جیاوازی ئیسلام و فەلسەفە

١. مەبەستی ئیسلام ڕێنموونی عەقڵ، ڕۆح، جەستە، کردار، گوفتار، تاک، خێزان، کۆمەڵگە، دەوڵەت و جیهانە بۆ باشی و چاکی و خۆشگوزەرانی و... هتد، لە دونیا و دواژدا.

بەڵام فەلسەفە مەبەستی زیاتر زانین و ناسین و بەدواداچوون و پرسیارکردنە.

یان دەتوانین بڵێین: مەبەستی ئیسلام زانین و ناسین و ئیمانە، بەڵام فەلسەفە مەبەستی زانین و ناسینە، مەرج نییە بەرە و ئیمانت بەرێت، هەندێکجار بەرەو بێباوەڕیت دەبات.

٢. ئیسلام سەرچاوەکەی لە خوداوەیە، بەڵام فەلسەفە مرۆڤییە، ئەنجامی بیرکردنەوە و بەدواداچوونی مرۆڤە.

٣. ئیسلام گشتییە وبۆ هەموو خەڵک، هەموو کات، هەموو شوێنو هەموو قۆناغێکی ژیانە، بەڵام فەلسەفە گشتی نییە.

٤. ئیسلام گشتگیرە و هەموو بوارەکان دەگرێتەوە (فکر، ڕۆح، جەستە، تاک، خێزان...) بەڵام فەلسەفە بەشێوەیەکی گشتی وا نییە، هەر فەلسەفەیەک تایبەتە بە شتێک و لە شتێکی دیاریکراو دەکۆڵێتەوە.

٥. ئیسلام واقیعییە و لەگەڵ سەردەمەکان و بارودۆخەکاندەگونجێت، بەڵام مەرج نییە فەلسەفەوابێت، چونکە مرۆڤییە، تێڕوانینی مرۆڤە و زادەی عەقڵیەتی بۆ شوێن و کات و بارودۆخێکی دیاریکراو، بۆیە هەندێکجار نەک واقیعی نییە، بەڵکوو دژی واقیعە و بەتەواوی ڕەتیدەکاتەوە. نەک هەرئەوە، جاری وا هەیە هەرچی واقیعە بە درۆری دەخاتەوە و پێی وایە خەون و خەیاڵە، وەک سوفستائییەکان.

٦. ئیسلام نەزەری و کردارییە، بەڵکوو بەشی زۆری عەمەلی و کردەیییە، بەڵام فەلسەفە زیاتر نەزەری، فکری، بیردۆزی و زیهنییە.

٧. فەلسەفە _ بەشێوەیەکی گشتی _ قەواعید و مەبادئ و بنەمایەکی وای نییە، بەڵکوو هەمووی قابیلی گۆڕانە، بەڵام ئیسلام بنەما و مەبادئ و نەگۆڕی هەیە، کە کەس ناتوانێت دەستی بۆ ببات و بیخاتە ژێر گۆڕان و...

٨. بنەما نەگۆڕەکانی ئیسلام گۆڕانیان بەسەردا نایەت هەرچەند کات و شوێن و باردۆخ و کەسەکان بگۆڕێن، بەڵام فەلسەفە وانییە و بەردەوام لەگۆڕاندایە.

٩. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا فەلسەفە پرسیار دەکات و ئیسلام وەڵام دەداتەوە.

١٠. ئیسلام (وەک ئایین و بنەماکانی، نەک فەرموودەی هەڵبەستراو و لاواز، یان توراس و ڕای ئەم زانا و ئەو زانا) تێکناگیرێت لەگەڵ عەقڵ، ڕۆح، جەستە، تاک، خێزان و... هتد، بەڵام فەلسەفە هەندێکجار تێکدەگیرێت.

١١. ئیسلام پشت دەبەستێت بە عەقڵ و وەحی و هەست و ئەزموون (تەجربە)،

بەڵام فەلسەفە بەشێوەیەکی گشتی پشت بە عەقڵ دەبەستێت.

**١٢.** ئیسلام ڕوکن و بنەمای ئەساسی بریتییە لە بوونی خودا، بەڵام فەلسەفە مەرج نییە وابێت، دەکرێت شتێک نەبێت بەناوی خوداوە، وەک فەلسەفە ناباوەڕییەکان (دەهری و ماددییەکان).

**١٣.** بوونی پێغەمبەر و پەیامهێن ڕوکن و بنەمای ئەساسییە لە ئیسلامدا، پەیامبەر وەک هەڵبژێردراوی خودا و گەیەنەری پەیامی خودا و ڕوونکەرەوە و ڕێنمونیکاری خەڵک بەرەو خودا، بەڵام فەلسەفە مەرج نییە وابێت، مەگەر فەلسەفەیەکی ئایینی بێت.

**١٤.** بوونی وەحی ڕوکن و بنەمای سەرەکییە لە ئیسلامدا، واتە: خودا پەیامی ناردووە بۆ تاک و بۆ...، بەڵام مەرج نییە فەلسەفە وابێت، مەگەر فەلسەفەیەکی ئایینی بێت.

**١٥.** ڕوکن و بنەمای سەرەکی ئیسلام بریتییە لە بوونی ڕۆژی دوایی (قیامەت)، کە لەو ڕۆژەدا خەڵکی لێپرسنەوە و لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت، بەڵام مەرج نییە لە فەلسەفەدا وابێت، مەگەر فەلسەفەیەکی ئایینی بێت.

**١٥.** ئیسلام تەشریعی تێدایە کە لە دوو بەشی سەرەکی پێک دێت:

**یەکەمیان:** پەیوەندی مرۆڤە بەخوداوە، کە خۆی لە پەرستشەکان (العبادات) دا دەبینێتە وەک نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات و...، ئیسلام گرنگییەکی زۆری پێداوە و بەرنامە و سیستەمێکی تایبەتی بۆ داناوە هەم لەڕێی قورئان و هەم لەڕێی سوننەت و پاشان هەم لەڕێی زانایان و دانانی زانستێک بەناوی (فیقهـ) (علم الفقه الإسلامی) کە بە سەدان و هەزاران پەرتووکی لەبارەیەوە نووسراوە و هیچ شتێکی شاراوە نەماوە قسەی تێدا نەکردبێت. کەواتە ئیسلام ئەو بەشەی مرۆڤیشی پشتگوێ نەخستووە، بەڵکوو زۆر بەجوانی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودای گەورەی ڕێک خستووە.

**دووەمیان:** کە بریتییە لە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان خۆیان (المعاملات)، ئیسلام زۆر بەجوانی و ڕێکوپێکی بەرنامەی بۆ داناوە، بە شێوەیەک کە هیچ شتێکی تێدا نییە لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤایەتی و عەقڵ و سروشت و فیترەت و ڕۆح و ناخی مرۆڤدا نەگونجێت. ئەم بەرنامە و گرنگیپێدانە هەم لە قورئان هەم لە سوننەت و هەم لە زانستی (فقهـ) بوونی هەیە، بۆنموونە ئەو یاسایانەی ئەوڕۆ باون و کاریان پێدەکرێت لە جیهاندا هەموویان زۆر جوانتر و باشتر و ڕێکوپێکترو تێروتەسەلتر بوونیان هەیە لە ئیسلامدا، بۆنموونە: یاسای باری کەسێتی (قانون الاحوال الشخصیە). یاسای دارایی (القانون المالی). یاسای تاوانکاری (القانون الجنائی)....

**١٦.** ئیسلام هەندێک بنەمای ڕەوشتی هەیە کە گشتییە و ناگۆڕێت، بەڵام فەلسەفە وانییە _ بەشێوەیەکی گشتی _، ڕەوشت بەپێی فەیلەسووف و شوێن و کات و...، دەگۆڕێت، هەتا زۆر جار وای لێدێت ڕەوشت بوونی نامێنێتوەک لە ناباوەڕیدا، یان دەبێتە شتێکی نیسبی و ڕێژەیی، کە بەپێی کەس و باردۆخەکان دەگۆڕێت و ڕەوشتی نەگۆڕ و سابت بوونی نامێنێت.

**١٧.** بەشێکی سەرەکی ئیسلام ڕۆح و بابەتە ڕۆحییەکانە و هەوڵدانە بۆ ڕزگارکردنی و خاوێن کردنەوەیی و پاراستنی، بەڵام مەرج نییە فەلسەفە وابێت، بەتایبەت ئەگەر فەلسەفەیەکی ماددی و ناباوەڕی بێت، ئەوا ڕۆح بوونی هەر نییە و شتێک بوونی نییە بەناوی ڕۆحەوە و بەتەواوی پشتگوێ خراوە.

بۆیە ئیسلام بەرنامەیەکی تێروتەسەل و جوانی هەیە بۆ ڕێنمونی کردن و ئاراستەکردنی ڕۆح و دڵ و دەروون، ناتەواوی و کەموکوڕی و بۆشاییەکانی بۆ پڕدەکاتەوە. بۆیە هیچ شتێک نابینی لە ئیسلامدا کە لەگەڵ ڕۆح و ناخ و دڵ و دەروون و فیترەت و خوڕەوشت و ئاکاری مرۆڤدا نەگونجێت و تێک بگیرێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە قورئان و سوننەتە، هەروەها هەبوونی زانستێک بەناوی زاستی پاککردنەوەی ڕۆح و دڵ و دەرون (علم تزکیة النفس) یان زانستی

ڕەوشت (علم الاخلاق)، کە ئیش دەکات لەسەر ئەوەی مرۆڤ خۆی بڕازێنێتەوە بە هەمووڕەوشت و سیفەتێکی جوان و باش لە ناوەوەو لە دەرەوەی خۆیدا، خۆی داڕنێت و دوورکەوێتەوە لە هەموو خوڕەوشت و ڕەوشت و سیفەتێکی ناشیرن و خراپ لە ناوەوە ودەرەوەی، کەواتە ئیسلام ئەو بەشە سەرەکییەی تری مرۆڤی پشتگوێ نەخست و گرنگییەکی تەواوی پێداوە و ڕێنمایی تەواوی کردووەو بۆشاییەکانی پڕکردووەتەوە و هیچ شتێکی تێدا نییە کە تێکبگیرێت لەگەڵیدا. بۆیە ئەو بەشەش کە جوان وڕێکوپێک بوو ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی ئەرێنی و جوان و باشی دەبێت لەسەر گوفتار و ڕەفتار.

**١٨.** ئیسلام ڕوون و ئاشکرایە و بێ گرێ و گۆڵە لە شتە نەگۆڕەکانی، بەڵام هەندێکجار فەلسەفە ئەوەندە ناڕوون و ئاڵۆز (موعەقە) دە، فەیلەسووفەکانیش لێی تێناگەن.

**١٩.** ئیسلام میانڕەوە، دوورە لە کەمڕەوی و زیادەڕەوی، بەڵام فەلسەفە زۆرجار تووشی کەمڕەوی و زیادەڕەوی دەبێت، وەک ماددی و میسالی و شیوعی و سەرمایەداری...

**٢٠.** ئیسلام مرۆڤدۆستەو لەگەڵ مرۆڤ دێتەوە، بەڵام زۆر جار فەلسەفە دەبێتە دژی مرڤ و لە دژی دەوەستێتەوە و زیانی بۆی هەیە، وەک فەلسەفەی مارکسی کە ئەوەندە مافی کۆمەڵگەی زاڵکردووە، تاکی لەبیرکردووە و مافی خواردووە و پێشلکردووە، یان سەرمایەداری ئەوەندە تاکی زاڵکردووە و پیرۆزی کردووە، کۆمەڵگەی لەبیرکردووە و کردوویەتیبە قوربانی تاکە هەلپەرست و خۆسەپێن و چاوچنۆکەکان.

**٢١.** ئیسلام سنووردانەرە، لە زۆر شوێندا سنوور بۆ مرۆڤ دادەنێتلە بواری:

فکری و عەقیدەیی، ڕەوشتی و سلووکی، کردار و گوفتار و مامەڵە.

بەڵام فەلسەفە _ بەشێوەیەکی گشتی _ وانییە و سنووری نییە، نازانێت

پیرۆز چییە و سنوور چییە -مەگەر فەلسەفەیەکی ئایینی بێت- بەڵکوو هەر دەڕوات و سنووری نییە.[١]

## سێ تیۆرییە بنەڕەتییەکەی فەلسەفە

هەر لەسەرەتای فەلسەفەوە تاوەکوو ئەمڕۆ، واتە لە شەش سەدە پێش زایینەوە، کە دەکاتە بیست و شەش سەدە، فەلسەفە سێ تیۆریای سەرەکی بەخۆیەوە بینیوە کە چوارەمی نییە، سەدان قوتابخانە و فەیلەسووف لەژێر ئەم سێ تیۆریایەدا کاریان کردووە، هەر بۆچوون و ڕایەکییان هەبێت، لەکۆتاییدا دەچنەوە سەر ئەم سێ تیۆڕیایە، ئەوانیش ئەمانەن:

**یەکەم: تیۆریای ماددی، ئەزموونی، واقیعی، هەستی، پۆزەتیڤیزم (وەزعی)**

هەموویان ناون بۆ یەک ناوەڕۆک، با لە جوزئیاتیشدا جیاواز بن، بەشێوەیەکی گشتی کۆکن لەسەر خاڵ و بنەما گشتییەکان.

پوختەی بۆچووونی ئەم تیۆریایە بریتییە لە: سەنتەربوونی ماددە و سەربەخۆبوونی، عەقڵیش تەنیا ئاوێنەیەکە بۆ وێناکردنی ئەو شتانەی کە

---

(١) تێبینی
١. ئەوەی باسمان کرد دەربارەی ئیسلام، ئەوە وەک ئەسڵی دین و وەحی و پەیامی خودایی، نەوەک فەرموودەی زەعیف و توراس و قسەی ئەو زاناو ئەم زانا...
٢. ئەوەی باسمان کرد زەمی فەلسەفە نییە، بەڵکوو بەراوردێکە لە نێوان فەلسەفە و ئیسلام.
٣. ئەو بابەتە بەشێوەیەکی سادە نووسیومانە کە هەموو کەسێکی خوێندەوار لێ تێ بگات، چونکە گەورەترین کێشەی بابەتە فەلسەفەییەکان ئەوەیە ئەوەندە قورس دەکرێن کەم کەس لێیا تێدەگات، بۆیە سادەکردنەوەی بابەتەکان لەم سەردەمەدا زۆر پێویستە چونکە لە زۆر ڕووەوە جیاوازە لە ساڵان و سەردەمانی پێشوو، هەر بۆنموونە ئەو لۆژیکەی (منطق) ەی لە حوجرەکان دەخوێنرا و دەخوێنرێت ئەوەندە قورس کرا بوو، کەم کەس دەیتوانی وەک خۆی لێی تێبگات، یان (أصول الفقه، علم الکلام، النحو، الصرف، البلاغة)، ... بۆیە زۆر پێویستیمان بە سادەکردنەوەی زانستەکان و بابەتە فکری و فەلسەفییەکان هەیە، ئەگەرنا وای لێدێت کەم کەس دەستی پێیان دەگات.

هەستەکان وەریدەگرن و دەیان گەیەنن، عەقڵ تەنیا ڕەنگدانەوە و دەنگدانەوەی واقیع و ماددەیە و بەس.

**پوختەی بیر و ڕای تیۆریای ماددی، ئەزموونی، واقیعی، هەستی، وەزعی**

١. گەردوون پێک هاتووە لە یەک پێکهاتە کە بریتییە لە ماددە، غەیری ماددە و سروشتی هەستپێکراو شتێکی دیکە بوونی نییە.

٢. نکۆڵی کردن لە هەموو غەیبیات و شتە پەنهانەکان، هەرچی ئەودیو سروشت و ماددە و واقیع بێت بوونی نییە، نکۆڵیکردن لە خودا[١]، واتە ئەوانە بڕوایان بە دروستکار و بەڕێوەبەری گەردوون نییە، دەڵێن: بە هیچ شێوەیەک خودا گەردوونی دروست نەکردووە بەڵکوو گەردوون:

ا- هەر هەبووە

ب- بۆ خۆی خۆی هێناوەتە بوون.

ج- بە ڕێکەوت دروست بووە.

د- سروشت ئەم گەردوونەی هێناوەتە بوون.

هـ- ئەم گەردوونە خەون و خەیاڵە و لە واقیعدا بوونی نییە.

ماددییەکان و ئەزموونگەراکان بەشێوەیەکی گشتی بڕوایان بە یەکێک لە مانە هەیە.وە هەروەها نکۆڵی لە سەرجەم ئایین و پێغەمبەران و وەحی و ڕۆح و زیندووبوونەوە و کتێبە ئاسمانییەکان دەکەن، چونکە وەک ئاماژەمان پێدا ئەوان بڕوایان بە خودا نییە، کەواتا ئاشکرایە باوەڕیان بە خودا نییە تا بگاتە سەر لق و پەلەکانی باوەڕداری و ئایین و کتێبە ئاسمانییەکان، چونکە ئەمانە هەموویان ناماددی و هەستپێنەکراو و ئەزموون نەکراون، نەک هەر ئەمە بەڵکوو پێیان وایە ئایین و پێغەمبەران شتێکی خوڕافی و ناڕاستە و بۆ خەڵکی

(١) ئەوە بەشێوەیەکی گشتی، ئەگەرنا ماددی هەیە بڕوای بە خودا هەیە، جا ئەو خودایە یان دوای گەردوون دروستبووە! یان لەگەڵ هاتنەدی بوونەوەرەکان! یان ...!

ساویلکە و نەزان و نەفامە، تەنیا بۆ خەڵەتاندنی مرۆڤ و مرۆڤایەتی هاتووە. نەک هەر ئەوەش، بەڵکوو ئایین بە سەرچاوەی گێلکردنی مرۆڤایەتی دەزانن، وەک مارکس دەڵێت: "الدين أفيون الشعوب)"، واتا: ئایین تریاکی گەلانە و بۆ سەرخۆشکردن و مەستکردنی نەتەوەکان و مرۆڤ و مرۆڤایەتی دروستکراوە. دیارە پێناسەکەیان لە تێڕوانینیان لە ئایینی مەسیحیەت و ئینجیل و قەشە و کڵێساوە سەرچاوەی گرتووە و دواتریش ئەو جیهانبینییەیان بەسەر سەرجەم ئایینەکاندا گشتاندووە. ئەم تیۆریایە بۆ هەموو شتێک تەفسیر و ڕاڤەی ماددی دەکات، بۆنموونە ئایین:

١- مارکسییەکان دەڵێن: ئایین و خودا داهێنراوی سەرمایەدارەکانە بۆ چەوساندنەوەی چینی هەژار، بۆ ئەوەی بە ناوی ئایین و خوداوە بەکاریان بهێنن و بیانچەوسێننەوە و لێیان بەهرەمەندبن.

٢- هەندێکی دیکە پێیان وایە خودا و ئایین بەرهەم و زادەی ترسن، دەڵێن: پێش هەزاران ساڵ لەمەوبەر مرۆڤ لە ترسی لافاو و بورکان و هەورە تریشقە و بروسک و گێژەڵووکە و باران و بوومەلەرزە و ڕووداوەکانی دیکە کە مرۆڤ دەسەڵاتی نەشکاوە بەسەریاندا پەنای بردووەتە بەر ئەودیو سروشت و خودا، بڕوایان وا بۆ دروست بووە کە خودایەک یان چەند خودایەک هەن کە بتوانن ڕزگاری بکەن، واتا بەم پێیەش بێ مرۆڤ خودا و ئایینی دروست کردووە.

٣- هەندێکی دیکە دەڵێن: خودا و ئایین لە ئەنجامی نەزانییەوە سەریان هەڵداوە، بۆ نموونە کاتێک مرۆڤ دیاردەیەکی سروشتی بینیوە، هەوڵی داوە هۆی پەیدابوونی بدۆزێتەوە، جا کاتێک نەیتوانیوە هۆکەی بدۆزێتەوە، پەنای بردووەتە بەر ئەودیو سروشت و هێزێکی دەرەکی، ئیتر خودا و ئایین بەم شێوەیە پەیدابوون و هاتوونە نێو کۆمەڵگە و مرۆڤایەتییەوە.

٤- هەندێکی دیکە دەڵێن: خودا و ئایین بە پاڵنەری جنسی (سێکس) پەیدابوون، وەک فرۆید کە هەموو دیاردەکانی ژیانی مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ پاڵنەرە ئارەزووییەکانی مرۆڤ.

٥- هەندێکی دیکە دەڵێن: خودا و ئایین پیاوانی ئایینی و کاهینەکان دایانهێناوە، بۆ چەوساندنەوەی خەڵک و سوود وەرگرتن لێیان.

٦- بەشێکیان دەڵێن: خودا و ئایین لە ئەنجامی ئەوەوە پەیدا بوون، کە مرۆڤە سەرەتاییەکان خۆیان پەیوەست کردووە بە ڕۆحی مردووەکانەوە، کاتێک هەندێکیانیان بینیون لە خەودا وایان زانیوە کە ئەو ڕۆحانە دەسەڵات و کاریگەرییان هەیە بەسەر ژیانی دونیادا، بۆیە هەوڵی ڕازیکردنیان داون بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لە زەرەر و زیانیان و لەپاشاندا هەندێک دروشمی دیاریکراویان داهێناوە، قوربانیان بۆ کردوون، بە هیوای ئەوەی یارمەتییان بدەن و خۆشبەختیان بکەن و بیانپارێزن، بۆیە بەم پێیە ئایین سەرچاوەکەی بریتییە لە عیبادەت کردن بۆ پێشینان و مردووان.

٧- هەندێکی دیکە دەڵێن: خودا و ئایین دەستکردی کۆمەڵگەن، ئەوە کۆمەڵگەیە خودا و ئایینی دروست کردووە، کە کۆمەڵناسی فەڕەنسی (دۆرکهایم) بە دامەزرێنەری ئەم بیردۆزە دادەنرێت.

٨- بەشێکیشیان ئەوە دەخەنە ڕوو کە ئایین و خودا مردووە[1] و هەموو ئەوەی ئەمڕۆ هەیە بەس زانستە و پێویستیمان بە هەبوونی خودا نییە[2]، دەشڵێن: هەموو ئەو پرسیارانەی هەمانە لە زانستی دەکەین نەک لە ئایین، ئەگەر ئەمڕۆ زانست وەڵامەکەی نەزانی، ئەوا بەدڵنیاییەوە لەگەڵ گەشەی مرۆڤایەتیدا سبەی وەڵامەکەمان وەردەگرینەوە لەنێو خودی زانستدا.

٣. ماددییەکان و ئەزموونگەراکان پێیان وایە ئەخلاق نیسبی و ڕێژەییە و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت، بەمەش هەر کەس لە ئاست خۆی و کۆمەڵگەکەی بۆ ئەخلاق دەڕوانێت، کەواتە نەگۆڕی ئەخلاقی و بنەمای ئەخلاقی لای ئەوان نییە.[3] ئەمەش کاریگەری نێگەتیف

---

(١) قسەی نیتچەیە.

(٢) قسەی ستیڤن هاوکینگە.

(٣) الموسوعة الميسرة فى الأديان والمذاهب المعاصرة، (٨٠٥)، صراع مع الملاحدة، عبدالرحمن حسن حبنكة الميدانى (١٥٠)، كواشف زيوف فى المذاهب الفكرية المعاصرة

و سەرلێتێکدەری بۆ زۆربەی کۆمەڵگەکان پێشنیار کردووە، خۆ ئەگەر هات و ئەوەی مولحیدان پێیان ئاساییە و بۆ خۆیان بە ڕەوای دەبینن بوو بە یاسا و لە وڵاتان جێبەجێ بوو، ئەوە کارەساتی مرۆیی ڕوودەدات و دەبێتە کاری سەرپێیی و هیچ بەهایەک بۆ هیچ هەبوویەک لەنێو هیچ کۆمەڵگەیەکدا نامێنێتەوە، ئەوەتا ئەوان هیچ پێیان شەرم نییە کە مومارەسەی هەوا و ڕەگەز و ئارەزووی خۆیان لەگەڵ خوشک و دایک و کەسە نزیکەکانی خۆیان بکەن و گۆشتی منداڵ بکوڵێنن و لەگەڵ گیانداران دەست تێکەڵاو بکەن و ئەوەی بووە مایەی ئاسوودەییان دەستی بۆ بەرن، ئەگەر ئاسوودەیی ئەوان لەسەر شانی بەدبەختی چواردەوریش بێت، بەڵام ئەوەی باسکرا وەک فیکر، ئەگەرنا مەرج نییە هەموویان بە کردار بیکەن یان هەموویان بەکردەیی باوەڕیان پێبێت.

٤. زانست ئەو زانستەیە کە ئەزموونی و بێت نەوەک تیۆری و نەزەری، پێیان وایە هەر شتێک لە ڕێی دۆزینەوەی زانستییەوە نەزانرێت و دەرنەکەوێت، بڕوای پێناکرێت، هەر شتێک لە ڕێگەی تاقیگە و زانستە جیاوازەکان نەدۆزرێتەوە، بوونی نییە، هەر بۆیە خودا دەخەنە بەر ئەو پێوەرە زانستییانە، بۆیە باوەڕی پێناهێنن، لای ئەوان یاسا گەردوونییەکان خودان، بۆیە «داوکینز» ڕێبەری گەورەی مولحیدەکانی ئەم سەردەمە دەڵێت: "ئەگەر دەڵێن خودا بریتییە لەو سیستەمانەی ئەو بوونەوەرە بەڕێوەدەبات، ئەوا ئێمەش بڕوامان بەو خودایە هەیە، بەڵام پێمانوایە ئەو سیستەمانە پێویستیان بەوە نییە لێیان بپاڕێینەوە بۆ ئەوەی بە هانامانەوە بێن!"

٥. سەرچاوەی مەعریفە و زانین تەنیا هەست و میتۆد و مەنهەجی ماددییە و غەیری هەست و ماددە و ئەزموون هیچ شتێکی دیکە جێگەی متمانە پێکردن نییە بە عەقڵیشەوە، عەقڵ تەنیا بۆ لێکدانەوەی ئەمانەیە.

---

(٥١١).

٦. زۆربەی ماددی و ئەزموونگەراکان بۆ ڕاڤەی گەشەسەندنی ژیان بڕوایان بە تیۆری داروین هەیە و پێیان وایە زیندەوەران بە پەرەسەند بەمرۆ گەیشتوون و هیچ هێز و دەسەڵاتێکی دەرەکی لە دەرەوەی مادده و بوون و گەردوون کاریگەری نەبووە و بوونی نییە، بەڵکوو بۆخۆی گەشەی سەندووە و پەرەی سەندووە!

نموونەی ئەم تیۆریایە لە کۆندا: قوتابخانەی سروشتگەرا سەرەتایی و کۆتاییەکانی یۆنان، سوفستائییەکان، ڕەواقییەکان، ئەبیقۆرییەکان ...

نموونەی ئەم تیۆریایە لە سەردەمی نوێدا: هەموو قوتابخانە ماددییە ئەزموونییەکان، داروینییەکان، مارکسییەکان، وجودییەکان، وەزعییە مەنطیقییەکان، فۆریدییەکان، براگماتییەکان، قوتابخانەی کۆمەڵایەتی ئوگست کۆنت و دۆرکایم.

**دووەم: تیۆریای میسالی، عەقڵی، مێتافیزیکی، ڕۆحانی**

هەموو ئەمانە ناون بۆ یەک ناوەڕۆک، ئەگەرچی لە جوئیاتیشدا جیاواز بن.

ئەم تیۆریایە بڕوای وایە بنەڕەت و بنەمای زانین بریتییە لە عەقڵ، واتە جیهانی دەرەوە و ماددی حەقیقەتی نییە، بەڵکوو تەنیا بریتییە لە ئەفکار و تەسەوڕات و بوونێکی سەربەخۆی نییە، واتە سەربەخۆ نییە لە عەقڵ، کەواتە ئەولەویەت بۆ ڕۆح و عەقڵە بە پێچەوانەی تیۆریای ماددی[١].

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێبازەکانی ناو ئەم تیۆریایە جیاوازن لە زۆر شتدا، بۆنموونە قوتابخانەی میسالی زێدەڕۆکار و ڕۆچوو دان بەهیچ شتێک دانانێت غەیری ئەفکار و تەسەوڕات، واتە حەقیقەتی واقیعی حەقیقەتێکی ڕۆحییە و

---

(١) بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین کە خوودی عەقڵانییەکانیش دوو جۆرن، هەیانە بڕوای بە ڕۆح هەیە، هەشیانە بڕوای پێی نییە.

هەرچی حەقیقەتی ماددییە بوونی نییە، ئینجا هەر لەناو ئاڕاستەی ڕۆحیدا هەمانە ئیمانداره و هەمان بێئیمان و مولحید و ناباوەڕ، هەشمانە لەو نێوەندەدایە و باوەڕی بە یەکێتی بوون هەیە (وحدة الوجود).

ئەم قوتابخانە و تیۆرییە بە تیۆریای (خوابڕیاردەرەکان) ناودەبرێت، کە دابەشە دەبن بۆ چەند گرووپ و ئاڕاستەیەکی جیاواز:

هەندێک دەڵێن: یەک خودا بوونی هەیە و بەس، ئەوانە بە قوتابخانەی تەوحید و خوا بەیەکگران ناو دەبرێن.

هەندێک دەڵێن: زیاتر لە خودایەک بوونی هەیە، ئەوانە موشریک و هاوبەش دانەرانیان پێدەڵێن.

هەندێک دەڵێن: خودا و بوون و گەردوون یەک شتن ئەوانە خاوەنی قوتابخانەی یەکێتی بوونن (وحدة الوجود).

هەندێک بڕوایان تەنیا بە خودا هەیە و بەس، واتە باوەڕیان بە وەحی و پەرتووکی ئاسمانی و پێغەمبەریەتی و پێغەمبەران و دوارۆژ نییە.

پوختەی بۆچوونی تیۆریای میسالی

١. مادده بوونێکی سەربەخۆی نییە لە دەرەوەی عەقڵ، بەڵکوو بەس ئەفکار و تەسەوڕات و هەستپێکراوە و بەس.

٢. ئەولەویەتی حەقیقەت بۆ بۆ فیکرە نەک بۆ مادده.

٣. سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە و زانین بریتییە لە عەقڵ و بەشە ناوەکییەکەی مرۆڤ، ڕۆح، جەهەری ڕۆحانی، وە هەستەکان و هەستەوەرەکان جێی متمانە نیین.

٤. بەشی زۆری ئەم تیۆریایە باوەڕدارە و باوەڕی بە غەیب و پەنهان هەیە.

### سێیەم: تیۆریای ڕەخنەیی (نقدی) و میانڕەو و ناوەندگیر (وسطی)

ئەم تیۆریایە بەشێوەیەکی گشتی کۆکردنەوەی هەردوو تیۆریاکەی پێشووترە، واتە ماددی و میسالی.

تیۆریای ڕەخنەیی (نقدی) و میانڕەو و ناوەندگیر (وسطی) هەوڵی وەرگرتنی جوانی و حەقی هەردوولا دەدات و هەڵەی هەردوو لاش بەلا دەنێت. ماددی و میسالی و عەقڵ و ئەزموون و مێتافیزیک و واقیع کۆدەکاتەوە.

ئەم تیۆریایە بە تیۆریای دوانەیی (ثنائی) ناودەبرێت، چونکە هەستەکان و ڕۆح، مادده و ڕووکەش لەیەک جیادەکەنەوە و پێیان وانییە مادده و عەقڵ و ڕۆح و ئەزموون و واقیع تێکبگیرێن.

نموونەی ئەم تیۆریایە لە کۆندا ئەرستۆ و لە نوێدا دیکارت و کانت و هەموو فەلسەفە ناوەندگیر و میانڕەوەکانن، هەروەها فەلسەفەی ئیسلامی و بەشێکی بەرچاوی فەلسەفەی مەسیحی.(١)

## هەڵوێستی فکری ئیسلامی دەربارەی تیۆرکانی فەلسەفە

ئیسلامیش بەهەمان شێوە لەم بوارەشدا میانڕەو و ناوەندگیرە و بڕوای بە هەموو سەرچاوەیەکە کە مرۆڤ بگەیەنێت بە یەقین و زانست و ڕاستی و حەقیقەت. بۆیە تیۆریای ماددی و میسالی ڕەت دەکاتەوە، لە بەرانبەردا دان بە عەقڵ و ڕۆح و مادده و واقیع و ئەزموونیش دادەنێت، بەڵام هەر یەکەیان بە ئەندازە و سنووری خۆی بێ کورت ڕەوی و کەمڕەویی و زێدەڕۆیی، واتە نایەت وەک ماددییەکان بەس دان بە مادده بنێت و غەیری مادده و هەست و ئەزموون و زانستی ئەزموونی هەموو شتێک ڕەت بکاتەوە، ناشبێت وەک میسالییەکان بەس ڕۆح و عەقڵ و بیر و هۆش بکاتە سەنتەر و مادده و ئەزموون و واقیع بکاتە شتێکی لاوەکی یان غەیرە حەقیقی یان ... .

---

(١) قضايا فلسفية فى ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين السيد صالح، ل ٦٧ _ ٧٤.

# تیۆری زانین (تیۆری مەعریفە) (مەعریفەتناسی) (نظرية المعرفة)

بەشێوەیەکی گشتی فەلسەفە لە زۆربەی کتێبە فەلسەفییەکاندا و لەو سەردەمەدا دابەش دەکرێت بۆ سێ بابەتی سەرەکی:

١. فەلسەفەی بوون، بوونناسی (الوجود) (Ontology) (ئۆنتۆلۆژیا).

٢. فەلسەفەی ناسین و زانین، تیۆری زانین، مەعریفەتناسی (المعرفة) (Epistemology) (ئیپستمۆلۆژیا).

٣. فەلسەفەی قیەم و ئەخلاق و بەهاکان، بەها ناسی (الأخلاق والقيم) (Axiology) (ئیکسیۆلۆژیا).

**تیۆری مەعریفە (نظرية أو مبحث المعرفة)**

تیۆری مەعریفە، ئێپیستێمۆلۆژی یان بیردۆزی زانین (بە ئینگلیزی: Epistemology، بە عەرەبی: (نظرية المعرفة) لە لقەکانی فەلسەفەیە کە گرنگی بە سروشت و سنوورەکانی زانین دەدات. مەعریفەتناسی خۆی ڕووبەڕووی ئەم پرسانە دەکاتەوە:

زانین چییە؟

زانین چۆن بەدەست دێت؟

مرۆڤ چی دەزانێت؟

ئەو شتەی کە ئێمە دەیزانین، چۆن دەیزانین؟

زۆرینەی گفتوگۆکان لەم گۆڕەپانەدا وردبوونەتەوە لەسەر شیتەڵکاریی سروشتی زانین و ئەوەی کە زانین چۆن گرێدراوە بە تێگەیشتنەکانی دیکەوە، لەوانە: دروستی باوەڕ و پاساو هێنانەوە. لەگەڵ واتای بەرهەمهێنانی زانینیشدا سەروکاری هەیە و هەروەها لەگەڵ گومانکاری لە بانگەشە جۆربەجۆرەکانی مەعریفەتدا.

وشەی «ئێپیستێمۆلۆژی» (Epistemology) لە یۆنانییەوە وەرگیراوە: episteme - ἐπιστήμη، «زانین، زانست» + λόγος، لۆگۆس.

## پێناسەی تیۆری مەعریفە

تیۆری مەعریفە بریتییە لە سەرەکیترین بەشی فەلسەفە کە لێکۆڵینەوە دەکات دەربارەی سروشت و سەرچاوە و هۆکار و ئامراز و سنوور و بەها و بایەخی مەعریفە و زانین.

## مێژووی تیۆری مەعریفە

فەلسەفە پێش سەردەمی «سوقرات» بریتی بووە لە تێڕامان و لێکۆڵینەوە لە بوون و گەردوون و سروشت، بۆیە گرنگییەکەیان بریتی بوو لە زانینی ئەسڵی ئەم گەردوونە، ئاخۆ لە چی دروستبووە، بیروڕایان جیاواز بوو، بۆ نموونە: «تالیس» دەیوت: ئەسڵی بوون ئاوە. «ئەنەکسیمەندر»یش دەیوت: ئەسڵی بوون «ئاپایرۆن»ە. «ئەناسکیمنس» دەیوت: ئەسڵی بوون هەوایە. «ئەمبادوکلیس» دەیوت: ئەسڵی گەردوون ئاگر و هەوا و گڵ و ئاوە. لەگەڵ چەندین پێناسە و بیروڕای فەیلەسووفانی دیکەش، کەواتە: فەلسەفە لە پێش سوقرات لە ئەسڵی بوونی دەکۆڵییەوە. دوایی لە سەردەمی سۆفستاییەکان و سوقڕاتدا فەلسەفە

لە سروشتەوە گوازراوە بۆ مرۆڤ، هەربۆیە لەو سەردەمەوە سەرەتاکانی تیۆری مەعریفە بەدەرکەوت، ئەوان لەو شتانەیان دەکۆڵییەوە: مرۆڤ، حەقیقەت و ڕاستی، حەق، دادگەری، خێر و شەڕ، هەر بۆیە سوقرات بەوە بەناوبانگە کە فەلسەفەی لە ئاسمانەوە دابەزاندە سەر زەوی و تایبەتی کرد زیاتر بە مرۆڤ و بابەتەکانی خێر و شەڕ و و مەعریفە ... هتد، هەربۆیە پێناسەی سوقڕات (٤٦٩ - ٣٩٩ پ. ز) بۆ فەلسەفە بریتیبوو لە: گەڕانی ئەقڵ بە دوای نێوەڕۆکی ئەو شتانەی دەمانگەیێنن بە چاکە. سوقرات هات وەڵامی سوفستائییەکانی دایەوە و بەڵگەکانی تێکشکاندن و سەروەری عەقڵی وەک سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە سەلماند، دوایی لەبارەی هەستەکانەوە کەوتنە ڕاجیایی و هەندێکیان بەگومانەوە سەیریان دەکرد وەک ئەفلاتوون، هەندێکیشیان بەسەرچاوەی گرنگ و سەرەکی سەیریان دەکرد و بەرگریان لێ دەکرد وەک ئەرستۆ.

لەپاش سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ گەنگەشە دەربارەی تیۆریای مەعریفە و زانین و سنوورەکانی و سروشتەکەی بەردەوامبوو، هەتا ڕەواقی و ئەپیکۆرییەکان هاتن و ئەوانیش بڕیاری یەقینی بوونی مەعریفە هەستییەکانیان دا، بەڵام ئەپیکۆر (٢٧٠ پ.ز) زیاتر گرنگی بە لایەنی ئەخلاق و ڕەوشت دەدا.

دوایی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بارودۆخەکە گۆڕا و ئایینیشی هاتە ناو و وەک سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە دادەنرا، هەربۆیە بابەتی عەقڵ و نەقڵ و هاتە گۆڕێ و فەیلەسووفە مەسیحییەکان بەرگرییەکی سەرسەختییان لە مەسیحییەت دەکرد و وەک سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە دەیانناساند، هەر لەو سەردەمە بوو فەیلەسووفی بەناوبانگ قەشە ئۆگستین (٤٣٠ ز) هات و وتی: عەقڵ بەتەنیا ناتوانێت بگات بە مەعریفەی حەقیقی، بەڵکوو ئەوە دەقی پیرۆزە ئەو توانایەی هەیە، بۆیە ئەو عەقڵی بەکاردەهێنا بۆ بەرگریکردن لە ئایین، یەکەمجار ئیمان ئینجا عەقڵ، هەربۆیە دەیوت: "ئیمان بێنە بۆئەوەی عاقڵ ببی و عەقڵ بەکار بهێنیت."

دوای ئۆگستین قەشە تۆما ئەکوینی (١٢٧٤ ز) هات و ویستی ئەم کێشەی عەقڵ و نەقڵە چارەسەر بکات و وتی: نەقڵ ساحە و سنووری خۆی هەیە و عەقڵیش ساحە و سنووری خۆی هەیە و هیچیان تێک ناگیرێن.

دوای ئەمانیش فەیلەسووفە موسڵمانەکان هاتن و تیۆریای مەعریفە یەکێک لە بابەتە سەرەکییەکانیان بوو، لە گرنگترینیان: کیندی (٢٦٠ ز) فارابی (٣٣٩ ز) ئیبن سینا (٤٢٧ ز) ....، چەندان کتێب و نووسینیشان نووسی دەربارەی مەعریفە و پەیوەندی نێوان عەقڵ و نەقڵ، بۆنموونە کتێبە بەناوبانگەکەی ئیبن ڕوشد (فصل المقال فيما بين الشريعة والحكمة من الاتصال).

دوای ئەمانیش زانایانی کەلام و عەقیدە و ئوسوڵی فیقە هاتن و چەندان کتێب و نووسراویان دەربارەی ئەم بابەتە نووسی و مەعریفەتناسی یەکێک بوو لە بابەتە سەرەکییەکانی پەرتووکەکانیان، بۆنموونە (درء تعارض العقل والنقل) ی ئیبنوو تەیمییە (٧٢٨ ز)، بەشێک لە کتێبەکانی (المغنی) ی قازی عبد الجبار (٤١٥ ز)، (أصول الدين)ی بەغدادی (٤٢٩ ز)، (تبصرة الأدلة)ی نەسەفی (٥٠٨ ز)، و (المواقف)ی ئیجی (٧٥٦ ز)، و (برهان)ی جوەینی (٤٧٨ ز).

نەک هەر زانایانی ئوسووڵ و کەلام بەڵکوو زانایانی فەرموودە و زاستی زاراوەناسی فەرموودەش ئەم بابەتەیان بەشێوەیەک لە شێوەکان باسکردووە، بۆنموونە: (الكفاية فی علم الرواية) ی خەتیبی بەغدادی (٤٦٣)، (علوم الحديث) ی ئیبنو سەڵاحی شارەزوری (٦٤٣ ز ).

کەواتە بۆمان دەرکەوت تیۆریای مەعریفە لە هەرسێ سەردەمی یۆنانی و ناوەڕاستی مەسیحی و ئیسلامیدا بەشێوەی ناسەربەخۆ هەبووە و زانایان و فەیلەسووفان باسیان کردووە، بەڵام لەسەردەمی نوێدا تیۆریای مەعریفە بەشێوەیەکی سەربەخۆ هاتە مەیدان و زۆرترین شوێنی لە فەلسەفەدا داگیر کرد و بوو بە بابەتی سەرەکی فەلسەفە و فەیلەسووفان و سەدان و هەزاران

پەرتووکی بە زمانە جیاوازەکان لەسەر نووسرا، یەکەم کەسیش کە پەرتووکی تایبەتی لەسەر نووسی بریتیبوو لە فەیلەسووفی بەریتانی جۆن لوک (١٧٠٤ ز) بەناوی «وتارێک دەربارەی هۆش و عەقڵی مرۆڤ».

دوای جۆن لوک سەدان زانا و فەیلەسووف پەرتووک و لێکۆڵینەوەیان نووسی دەربارەی تیۆریای مەعریفە بە دەیان زمانی جیاواز.[1]

## بابەتە سەرەکییەکانی تیۆریای مەعریفە

١. ئیمکانی مەعریفە، ئایا مەعریفە و زانین مومکین و گونجاوە و لە توانای مرۆڤدایە؟ ئەگەر مومکینە سنوورەکەی تاکوێیە؟ ئایا گوماناوییە یان یەقینی؟ ئەی ئەگەر مومکین نییە جێگرەوەی چییە؟

٢. ئامرازی دەستختی مەعریفە کامەیە؟ ئایا بەس ماددە و هەست و ئەزموونە؟ یان عەقڵ و ڕۆحە؟ یان هەردووکیانە بەیەکەوە.

٣. سروشتی مەعریفە چۆنە؟ ئایا سروشتێکی ماددی و هەستی و واقیعی و ئەزموونی هەیە یان میسالی و ڕۆحی و وەحی و ئیلهام و تیژبیری (هەستەزانی) (الحدس) و نۆڕین (الکشف) یان هەردووکیان بەیەکەوە.

٤. سەرچاوەی مەعریفە کامەیە؟ مەعریفە لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە و سەرچاوە دەگرێت؟ ئایا لە فیترەتەوە سەرچاوە دەگرێت؟ واتە مەعریفەی پێشوو (المعرفة القبلية) بوونی هەیە؟ یان مرۆڤ کە لەدایک دەبێت بە نەزانی لەدایک دەبێت و لە پاشاندا لە ڕێگەی وەرگرتن و بەدەستهێنان (الاكتساب) لە هەست و ئەزموون و واقیعەوە شتەکان دەزانێت و وەردەگرێت؟

٥. بەهای مەعریفە و سنوورەکانی. ئەگەرچی زۆربەی توێژەرانی بواری مەعریفە

---

(١) مدخل إلى نظرية المعرفة، أحمد الكرساوي، ل: ٢٧ _ ٣٤. زۆر سوودمان لەم پەرتووکە بینیوە بۆ نووسینی بابەت و بەشی (تیۆری مەعریفە).

پێیان وایە نابێت زانستی لۆژیک تێکەڵ بە تیۆریای مەعریفە بکرێت، بەڵام لەبەرانبەردا هەندێک لە زانایانی تر پێیان وایە دەکرێت و دەنگونجێت ئەو بابەتانەی کە لە مەعریفەوە نزیکن تێکەڵ بکرێن، چونکە هەردووکیان مەبەستیان گەیشتنە بە حەقیقەت، بۆیە زۆربەی فەیلەسووفە موسڵمانەکان و زانایانی کەلام و عەقیدە کاتێک باسی تیۆریای مەعریفەیان کردووە لەگەڵیشدا باسی لۆژیکییان کردووە وەک پێوەرێک بۆ وەرگرتن و جیاکردنەوەی مەعریفە ...

**تیۆریای مەعریفە چوار بابەتی سەرەکی لەخۆ دەگرێت:**

**یەکەم:** ئیمکانی مەعریفە

**دووەم:** سروشتی مەعریفە

**سێیەم:** سەرچاوەکانی مەعریفە

**چوارەم:** ئامرازەکانی مەعریفە

# ئیمکانی مەعریفە

ئیمکانی مەعریفە یەکێکە لە بابەتە سەرەکییەکانی مەعریفەناسی، چونکە وەڵامی ئەوە دەداتەوە کە ئایا مرۆڤ ئیمکان و توانای هەیە مەعریفە و زانین بەدەست بهێنێت؟ ئایا ڕاستی ڕەها بوونی هەیە و مرۆڤ دەتوانێت پێی بگات؟

ئەم بابەتە لەسەرەتای فەلسەفەدا بابەتێک نەبوو فەیلەسووفان لێی بکۆڵنەوە، چونکە وەک باسمانکرد سەرەتای فەلسەفە بە لێکۆڵینەوە لە سروشت و گەردوون دەستی پێکرد و کاری گەڕان بوو لە بنەچەی بوون و مادده و گەردوون، بەڵام دواتر و لەسەردەمی سوفستائییەکان و سوقرات ئەم بابەتە هاتە بەرباس و گفتوگۆ و قسەی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا و هەر لەم سەردەمەشەوە دوو قوتابخانەی سەرەکی لە بابەتی ئیمکانی مەعریفە هاتە کایەوە، ئەوانیش:

١. گومانگەراکان (الشكاك)، کە گومانیان لە هەموو شتێک دەکرد و پێیان وابوو مرۆڤ ناتوانێت بگات بە زانین و مەعریفە یان یەقین، ئەمانیش دابەشبوون بۆ چەندان گرووپ و قوتابخانەی جیاواز جیاواز، بەڵام هێڵە گشتییەکانیان یەک شت بوو. ئەوانە سوفستائییەکانن.

٢. باوەڕگەراکان (الاعتقاديون) یان یەقین گەراکان، ئەوانە بڕوایان وابوو کە مرۆڤ لە توانای دایە بگات بە یەقین و دڵنیایی و زانین. ئەمەش سوقرات پێشڕەوی دەکردن و زۆر بە سەرسەختی دژی سوفستائییەکان وەستایەوە.

ئەم دوو ئاڕاستەیە لە سەردەمی سوقرات و سوفستائییەکان بە درێژایی و مێژوو بوونیان هەبووە، بەڵام بە جۆر و شێوازی جیاواز.

## گومانگەراکان (الشكاك)

گومانگەراکان (الشكاك)، گومانیان لە هەموو شتێک هەیە و پێیان وایە مرۆڤ ناتوانێت بگات بە زانین و مەعریفە یان یەقین، کەواتە ئەوان دەزانن کە نازانن! کەوایە خودی قسەکەی خۆیان بەڵگەیە لەسەر خۆیان، چونکە خۆیان بڕیاری ئەوەیان داوە کە نازانن، کەواتە دەزانن کە نازانن، کەوایە زانینیان هەبوو! هەتا هەیانە دەڵێت: گومانم لە گومانی خۆشم هەیە، واتە گومانی هەیە کە گومان دەبات و لە گومانەکەی خۆشی بە گومانە ئایا گومانی هەیە یان نا! نەک هەر ئەوەندە بەڵکوو زۆرێکیان گومانیان لە بوونی خۆشیان هەبووە، کە ئایا بوونیان هەیە یان نا، ئێ کەسێ گومانی لە بوونی خۆی هەبێت چۆن گومان لە خودا و بوون و گەردوون و ... ناکات؟ بە دڵنیاییەوە لە هەموو شتێک بەگومان دەبێت و زۆرجاریش بەرەو یەقین دەڕوات لەوەی کە هیچ شتێک بوونی نییە بە خۆشییەوە!

ئەمانە دابەش دەبن بۆ چەندان گرووپ و قوتابخانەی جیاواز جیاواز، بەڵام هێڵە گشتییەکانیان یەک شتە، گرووپەکانیان:

گومانگەرای ڕەها، یان گومانگەرای مەزهەبی

گومانگەرای سوفستائی

گومانگەرای (متۆدی) مەنهەجی

گومانگەرای نازانمکار

بەڵام زۆرێک لە توێژەران لە دوو قوتابخانەدا جێیان دەکەنەوە

گومانی ڕەها

گومانی میتۆدی (مەنهەجی) یان (فەلسەفی)

## گومانی ڕەها

گومانی ڕەها گومانێکە متمانەی بە هیچ سەرچاوە و ئامرازێکی مەعریفە نییە و زانین و مەعریفەی شتەکان لای شتێکی ئەستەم و مەحاڵە، گومانی لە هەموو شتێک هەیە و یەقین بوونی نییە لەلای، گومان لەلای ئامانجە نەک ئامراز بۆ گەیشتن بە حەقیقەت، بە گومان دەستپێدەکات و بە گومانیش کۆتایی دێت، ئەم قوتابخانەیە پێی وایە هەوڵ و تێکۆشانی مرۆڤ بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و مەعریفەیەکی یەقینی شتێکی پڕوپووچ و بێسوود و بێئەنجامە.

لەو فەیلەسووفانەی ئەو بۆچوونەیان هەبووە فەیلەسووفی سۆفستائی (گۆرگیاس_ ٣٨٠ پ.ز) کە بۆچوونی خۆی بەم شێوەیە دەربڕیوە:

١. هیچ شتێک بوونی نییە.

٢. ئەگەر هەشبێت مرۆڤ ناتوانێت پەی پێببات و بیانزانێت.

٣. ئەگەر گریمان زانیشی و پەیشی پێبرد، ئەوا ناتوانێت بیگەیەنێت و گوزارشت لەو مەعریفەیە بکات کە پێی گەیشتووە و بیگەیەنێت بە خەڵکانی دیکە.[١]

هەروەها فەیلەسووفی یۆنانی (بیرۆن _ ٢٧٥ پ. ز) گومانی لە هەموو شتێک هەیە، وەک دەڵێت: پێویستە متمانەمان بە عەقڵ و هەستەکان نەبێت و ڕا و بۆچوونمان نەبێت، پێویستە لەیەک کاتدا شتەکان ڕەت بکەینەوە و بیشیان سەلمێنین، یان نە ڕەت بکەینەوە نە بسەلمێنین.[٢]

ئەگەر سەیری زانای ئیسلام و زانستی کەلام بکەین ئەم قوتابخانەیان دابەشکردووە بۆ سێ گرووپ:

١. **نکووڵیکارییەکان (العنادیة):** ئەوانە پێیان وایە هیچ شتێک بوونی نییە و

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف الكرم، ل: ٦٤.

(٢) مصادر المعرفة في الفكر الديني والفلسفي، د. عبد الرحمن بن زيد الزنيدي، ل: ٦١.

هەمووی خەون و خەیاڵە، کەواتە ئەوان دڵنیان و بێگومانن کە نازانن! دەزانن کە نازانن!سەرەتای ئەم گرووپە دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسووفی سۆفستائی (گۆرگیاس ـ ٣٨٠ پ.ز) کە دەیوت: هیچ شتێک بوونی نییە. ئەگەر هەشبێت مرۆڤ ناتوانێت پەیان پێببات و بیانزانێت. ئەگەر گریمان زانیشی و پەیشی پێبرد ئەوا ناتوانێت بیگەیەنێت و گوزارشت لەو مەعریفەیە بکات کە پێی گەیشتووە و بیگەیەنێت بە خەڵکانی دیکە.(١)

٢. **لایمنییەکان (خودڕایی) (العندیة)**: لایمنییەکان ئەوانەن دەڵێن: لای من ئەو شتە بەو شێوەیەیە، لای تۆش هەرچۆنە کێشە نییە و هی هەردووکیشمان هەر ڕاستە، کەواتە لای ئەوان مەعریفە پەیوەندی بە خودی شتەکانەوە نییە، بەڵکوو پەیوەندی هەیە بە خودی کەسەکان، واتە لای من و لای تۆ و لای ئەوی تر و ...، ئەم جۆرەش بیرێکی مەعریفە ڕوخێنەرە و هەر لەسەردەمی یۆنانەوە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت بوونی هەیە، پێی دوترێت (نسبیة الحقیقة) واتە ڕێژەبوونی حەقیقەت و ڕاستی، واتە هیچ حەقیقەتێکی ڕەها بوونی نییە و هەمووی نسبیی و ڕێژەییە، ئەم بیرۆکەیە بنەمایەکی سەرەکیی ئیلحادیشە، چونکە لە ئیلحادیشدا تەنیا باوەڕبوون بە ئیلحاد ڕەهایە، ئەگەرنا هەموو شتێک: ئەخلاق، حەقیقەت، جوانی، ... هتد، ڕێژەیی و نسبییە.

٣. **نازانمکارییەکان (اللاأدریة)**: نازانمکار (لائەدری) کەسێکە کە بڕوای وایە ناتوانێت دان بە بوونی هیچ شتێکدا بنێت، هەروەها ناشتوانێت نەفی بکات، لەبەرئەوەی کەسی نازانمگەرا خۆی یەکلایی نەکردووەتەوە و نازانێت بەڵگەکانی هەبوون بەهێزترن یان نەبوون و لەمەڕ باسەکە نەگەیشتووەتە هیچ ئەنجامێک.

نازانمکارییەکان (لائەدرییەکان) دەربارەی ئیمان و مێتافیزیک دەڵێن: شتە مێتافیزیکییەکان و نادیارەکان و بەرهەست نەبووەکان و شتەکانی ئەودیو سروشت هیچ ڕێگەیەکیان نییە بۆ جێگیرکردن و ئیسپاتکردنیان، هەروەها ناشتوانرێت نەفی بکرێن، کەواتا باشترین ڕێگە ئەوەیە کە بڵێین: نازانین و

---

(١) تاریخ الفلسفة الیونانیة، یوسف الکرم، ل: ٦٤.

خۆمانی لێ ببوێرین و بەڵگە لەسەر هەبوون یان نەبوونی نەهێنینەوە، چونکە ڕەنگە هەر دوو لا بە بڕوادار و بە بێباوەڕ و مولحید بەڵگەی خۆیان هەبێت، بۆیە لە دیدی ئەوان لەوانەیە بەڵگەکانی هەردووکیان یەکسان بن، بۆیە حوکم بە هیچ لایەکیاندا نادەن و لایەنگیری هیچ کامێکیان ناکەن نە بە ئیسپات نە بە نەفی.

بیرۆن بە ڕێبەر و خاوەن ڕێبازی نازانمکارییەکان دادەنرێت.

## گومانی باوەڕی (شک إیمان)

ئەم گرووپەش ناوی خۆی بەخۆیەوەیە، چونکە گومان دژی ئیمان بەکار ناهینن بەڵکوو بەپێچەوانەوە بۆ گەیشتن بە ئیمان بەکاری دەهێنن، ئەم جۆرە گومانە هەستەکان ڕەتناکاتەوە، بەڵام بڕوای تەواویشی پێی نییە و پێوایە عەقڵ و هەست بەبێ ئیمان و باوەڕ ناگەن بەیەقین.

ئەم گومانە لە مەسیحیەتەوە سەریهەڵدا کاتێک پێیان وابوو مرۆڤ لەبنەڕەتەوە تاوانبارە بە هۆی تاوانی باوکییەوە (ئادەم)، واتە کە تاوانی کردووە ئیدی بەم تاوانەی هەموو نەوەکانی تاوانبارکردووە هەموو مرۆڤێک بە تاوانباری لەدایک دەبێت! کەواتە هەموو مرۆڤێک بە ناپاکی و تاوانباری لەدایک دەبێت و فیترەتەکەی پاک نییە، کەوابوو مرۆڤ ناتوانێت بەتەواوی ڕاستییەکان بزانێت، ئەگەر بشیانزانێت ئەوە هەموو حەقیقەت نییە، دواجار هەرچۆنێک بێت مەعریفەی مرۆڤ مەعریفەیەکی ناتەواوە و پێویستی بە بەگومانە بەرانبەر عەقڵ و هەستەکان و بە ئیمان و باوەڕ نەبێت ناتوانین بگەین بە حەقیقەت!

بەڵام لە ئیسلامدا هەموو کەسێک بە پاکی لەدایک دەبێت، وەک پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرموێت: (ما من مولود إلا يولد على الفطرة

فأبواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه)[١]، واتا: هەموو مرۆڤێک لەسەر فیترەتی پاک و ڕاستەقینە دروستدەکرێت و لە دایکدەبێت، بەڵام دەوروبەر و دایک و باوک لەسەر ئەم فیترەتە لای دەدەن و دەیکەنە جوو و نەصرانی و مەجوسی. پاشان لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنیدا مرۆڤ لە دەسەڵاتی خودا تێدەگات ئەگەر هەر لە تەنیاییشدا بێت و ئاراستەش نەکرێت بەرە و لای خوداناسی و بەڵگە و توێژینەوەکان لەسەر ئەم باسە زۆر و زەبەندەن.

لێرەشەوە بەشێک لە زانایانی دەروونناسی دەڵێن: چوار شت لە مرۆڤدا زگماک و خوداڕسک و فیترین و لەگەڵ سروشتی مرۆڤدان کە بریتین لە: زانستخوازی، جوانی خوازی، چاکەخوازی و خوداپەرستی.

لە تێڕوانینی ئیسلامدا کەس تاوان و هەڵەی کەس هەڵناگرێت، تاوەکوو مرۆڤ هەڵە و گوناهی باوکی (ئادەم) هەڵبگرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: {لَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ}[٢] واتە: «هیچ کەسێکی تاوانبار تاوانی کەسێکی دیکە هەڵناگرێت»[٣].

## گومانی شوێنکەوتووەکان

جۆرێکی تری گومان گومانی شوێنکەوتووان و تەقلدییەکانە، واتە ئەوانەی پێیان وایە مرۆڤ نەلەڕێی عەقڵییەوە نە لەڕێی هەستەکانییەوە توانای گەیشتن بە حەقیقەتی نییە، بەڵکوو پێویستی بەوەیە شوێنەکەوتە و موقەللیدی کەسێکی تر بێت، ئەمە لەناو هەموو نەتەوە و ئایین و ... بەشێوەیە لەشێوەکان هەیە، بۆنموونە ئیسماعلییەکان کە گرپێکی ناو شیعەکان بوون، پێان وابوو مرۆڤ توانای

---

(١) متفق عليه: البخاري ١٢٩٢، ومسلم: ٦٩٢٦.

(٢) الأنعام ١٦٤.

(٣) نظرية المعرفة بين القرآن والفلسفة، د. راجح الكردي، ل: ٩١ _ ١٠٠.

گەیشتن بە زانینی نییە تەنیا لەڕێی ئیمامی مەعسوم و پارێزراوەوە نەبێت، واتە ئیمامی مەعسوم توانای گەیشتن بە زانین و ڕاستی هەیە و بەس، ئەویش دەیگەیەنێت بە مەعسومێکی تر ... کەواتە خەڵکی هەموو دەبێت خۆیان تەقلیدی ئەوان بکەن و شوێنیان بکەون بۆ گەیشتن بە زانین و حەقیقەت چونکە خۆیان ناتوانن.[١]

## گومانی هەندەکی (شک جزئی)

گومان یان هەندەکییە یان هەمووەکی، واتە یان باوەڕی بەهیچ شتێک نییە و گومانی لە هەمووی هەیە، یان باوەڕی بەهەندێک شت هەیە، بەڵام بە هەندێکی تری نییە، واتە گومانی لە هەندێک شت هەیە و بڕوای پێ نیین، بۆنموونە:

**١.** نکووڵی کردن لە غەیبیات، واتە هەرچی بەرهەست نییە و غەیبییە باوەڕی پێی نییە، بەڵام بڕوای بە هەموو ئەو شتانە هەیە کە ماددی و بەرهەستن، وەک دەیڤید هیوم و کارناپ و قوتابخانەی پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی (وەزعی مەنطیقی) و هەموو ماددی و ئەزموونگەراکان. ئەوانە هەموویان بڕوایان بە ماددە و ئەزموون و واقیع هەیە و بەس، هەرچی بەرهەست نییە و ماددی و نییە و ئەزموونی نییە جێی باوەڕ نییە.

**٢.** نکووڵی کردن لە واقیعی دەرەکی (خارجی) بۆ شتەکان، لەوانەی کە ئەم بۆچوونەیان هەیە (جۆرج بارکلی) یە، کە باوەڕی بە جیهان و بوونێکی سەربەخۆ نییە لە دەرەوەی زیهنمان، واتە ئەوەی هەیە هی زیهن و عەقڵمانە و بەس، بۆیە دەڵێت: "شتە هەستپێکراوەکان هیچیان بوونیان مەگەر لە عەقڵ و نەفسدا بێت"[٢]، کەواتە ئەوەی هەیە لە عەقڵ و زیهندایە، ئەوەی کە بووە بە پاڵنەری

---

(١) نظرية المعرفة بين القرآن والفلسفة، د. ڕاجح الكردی، ل: ٨٩ _ ٩٧.

(٢) المحاورات الثلاث بين هيلاسوفيلونوس، باركلی، ١٠٤.

ئەم قسەیە و وای لێکردووە ئەم قسەیە بکات، بریتی بووە لەوەی کە پێی بووە ئەگەر دانبنێین بە ماددە ئەوە سەردەکێشێت بۆ بێباوەڕی و ئیلحاد، بۆیە ئەم فەلسەفەیەی ئەو باوەڕی پێیەتی پێی وایە یارمەتیمان دەدات کە باوەڕ بە بوونی خودا بکەین، کەواتە مەبەستەکەی بەرپەرچدانەوەی ئیلحاد و پشتگیری کردنی ئیمان بووە و پێی وایە بەم نکووڵی کردنەی لە واقیعی خاریجی ئەم دوو ئامانجە دەپێکێت.

**٣.** نکووڵی کردن لە سەبەبیەت و هۆکار و ئەنجام (السببية)، واتە هەموو پەیدابوویێک پەیداکەرێکی هەیە، هەموو دروستکراوێک دروستکەرێکی هەیە (لكل حادث محدث)، هەموو هۆکردێک (بەرهۆ، معلول) هۆکارێک (علة)ێکی هەیە. ئەم نکووڵی کردنەکەش دوو جۆرە:

**یەکەم:** نکووڵی لە هەموو جۆرە سەبەبیەتێک دەکات و بە هیچ جۆرێک باوەڕی پێی نییە و لەسەر بنەمایەکی ئیلحادی ناباوەڕی دامەزراوە، وەک بەشێک لە فەیلەسووفە ناباوەڕە مولحیدکان، کەواتە بەم پێیە هیچ ئەنجامێک پێویستی بە هۆکار نییە و گەردوون و بوونیش پێویستیان بە هۆکار و دروستکەر نییە.

**دووەم:** داندەنێت بە سەبەبیەتی گشتی و سەبەبیەتی تایبەت ڕەتدەکاتەوە و لەسەر بنەمایەکی ئیمانی دامەزراوە, بۆ پاراستنی ئیمان و دەستەڵاتی خودا ئەوەیان هەڵبژاردووە، ئەمە ڕای ئەشعەرییەکان و بەشێک لە فەیلەسووفە ڕۆژئاواییەکانە وەک نیکولا مالبرانش (١٧١٥ م) کە شوێنکەوتەی دیکارت بوو و جۆرج بارکلی و غەیری ئەوانیش.

کەواتە ئەم ئاڕاستەیە هەموو جۆرە سەبەبیەتێک ڕەت دەکاتەوە و دژی عەقڵ و ئیمان دەوەستێت.

ئاڕاستەیەکیش سەبەبیەتی گشتی بڕیار دەدات وەک «هەموو پەیدابوویێک پەیداکارێکی هەیە، هەموو دروستکراوێک دروستکەرێکی هەیە (لكل حادث محدث)»، بەڵام بڕوایان وایە هەموو سەبیەتە جوزئییەکانی وەک ئاگر و سووتان

و چەقۆ و بڕین و ...هەموو ئەوانە تەنیا کارەکتەرێک دەستەڵاتی خودایە و بەس.

ئاڕاستەی یەکەم بەزۆری بۆ پاڵپشتی ئیلحاد و ناباوەڕییە، ئاڕاستەی دووەم بۆ پاڵپشتی خودا و ئیمانە.

بەڵام ئەگەر سەیری قورئان بکەین، پڕیەتی لە پاڵپشتی سەبەبیەت و هۆکار و ئەنجام و دەیان و سەدان بەڵگەی تێدایە بۆ پشتگیری کردنی، بەڵام هەموویشی لەژێر دەستەڵات و ویستی خودادایە و دەبێت بۆ هەموو شتێک مەرجەکان بێنەجێی و ڕێگرییەکانیش لابچن، بەڵام دەشکرێت ئەگەر ویستی خودای لەسەر نەبێت ئەم یاسایە تێک بشکێت، وەک ئاگرەکەی ئیبراهیم (علیه السلام) کە نەیسووتاند.

زۆرێک لە مولحیدان و ناباوەڕان باوەڕیان بە یاسای سەبەبیەت نییە بۆ باوەڕبوون بە خودا، ئەو یاسایەی دەڵێت: هەموو دروستکراوێک دروستکارێکی هەیە.

لە کۆندا ئەم بەڵگەیە لای موتەکەللیمینی موسڵمانان بوونی هەبووە و ئێستاش لە چوارچێوەیەکی دیکەدا و لە لای زانا و نووسەرە ڕۆژئاواییەکانیش بوونی هەیە بە ناوی بەڵگەی گەردوونی کەلامی، کە تەنانەت وەک ڕێزێکی بۆ موتەکەللمین هەر ناوە ئینگلیزییەکەشیان لە ناوە عەرەبییەکەوە هێناوە، (Kalam Cosmological Argument)، کە لە بنچینە و ئەنجام پێک دێت و دەڵێت:

- هەموو بەدیهێنراوێک بەدیهێنەرێکی هەیە، یاخود هەموو پەیدابووێک پەیداکارێکی هەیە (لکل حادث محدث).

- گەردوون نەبوو پاشان بەدیهات و پەیدا بوو.

- کەواتا گەردوون بەدیهێنەری هەیە.

بەشی یەکەمی یاساکە بە کۆی دەنگ لەسەر زەوی لەسەری ڕێککەوتوون مەگەر ئەو بەرەیە نەبێت کە ئاماژەمان پێدا و هەموو کاتێک نکووڵیکارن و سەر بۆ ڕاستی و عەقڵ و لۆجیکیش دانانەوێنن، لە بەشی دووەمی یاساکەدا حەقیقەتێکی دیکە لە سەرچاوەی حەقیقەتی یەکەمەوە ئاراستە کراوە بۆ هەر کەسێک لەسەر کڵێشەی بنەمایی و پاکییە ژیرییە مرۆییەکە لانەچووبێت باوەڕی پێی هەیە و هیچ کات لەگەڵ ئاوەزیدا تێک ناگیرێت، چونکە بنەمای دووەمی بەڵگەی کەلامی گەردوونی پێویستی بە یاریدەکردنی زانست و فیزیا و تەنانەت بایۆلۆژیشە، بۆ هەر کەسێک دەست و پەلی لە لایەن مێشکێکی خراپ و نابەرپرسیارەوە دەستبەسەر و ڕام نەکرابێت دەتوانێت دەستبەرێت بۆ بابەتە زانستییەکان و خۆی لە وەڵامێکی گونجاو و ڕاستەقینەدا لە شێواز و کات و سەردەمی دروستبوونی گەردوون و یاسا و نەگۆڕە گەردوونییەکان ببینێتەوە.

چونکە هەموو کایەکان کایەی عەقڵی و لۆجیکین و ناکرێت و هیچ مرۆڤێکی خاوەن ئەقڵ نکووڵی لێ بکات، چونکە نەگونجاوە شتێک دروستکرابێت و پەیدابووبێت، بەڵام دروستکار و پەیداکەری نەبێت!

بەو ئەنجامەش دەتوانین خشتەی بنەمای سێیەم بکەینەوە ئەنجام و وەڵام و دەستمان لە حەقیقەتە ئاشکرا و عەقڵییە ڕەهاکە گیرببێت، ئەوەش ئەوەیە کە خودایەک و هێزێکی دەرەکی بوونی هەبووە و تەکانی بە جووڵەی نەجووڵاوی بنەڕەتی و نەبوونی گەردوون و ژیان داوە تا بێتە بوون.

دەکرێت ئەوە بڵێین: کە هیچ کەس ناتوانێت نموونەیەک بهێنێت کە بەبێ هیچ یاسادانەر و بزوێنەر و هێزێکی دەرەکی هاتبێتە بوون. با بیربکەینەوە بزانین دەتوانین؟ تێڕابمێنە لە هەموو ئەو شتانەی کە لە دەوروبەرتن، لە پەڕتووک، باڵەخانە، ئۆتۆمبێل و مۆبایل ... هتد، هیچیان بەبێ دروستکار و پەیداکار دروست نەبوون و پەیدانەبوون، کەواتا ئەگەر باڵەخانەیەک یان خانوویەک یان

پێنووسێک یان دەرزییەک یان ... هتد، لە خۆوە و بەبێ دروستکەر دروست نەبن ئەوا زۆر ناجۆر و ناڕەوایە بانگەشەی لەخۆوە دروستبوون و هاتنە گەڕیانی گەردوون و ژیان بکەین؟!

کەمتر لەوەش ناکرێت ڕیکلام بکەین بەوەی کە تەنیا یەک خانە یان زیندەوەرێکی تاک خانەش لە کەشوهەوای ٣/٥ بلیۆن ساڵی لەمەو پێشی زەوی و لەو کەشوهەوا نەگونجاوە هاتبێتە بوون، ئەگەر چی بۆسەلماندنی ئەوەش چەندین هەوڵی نەپساو و بەردەوام لە مێژوودا بوونی هەبووە و ویستویانە ئەوە ڕوون بکەنەوە کە چۆن یەکەم خانە هاتە بوون، بەڵام هەم ئۆپارین و هەمیش هەوڵەکەی میللەر و یوری بێبەرهەم بوو کە لە چل و پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو هەوڵیان دەدا ڕوونی بکەنەوە کە چۆن و بۆچی یەکەم خانە خۆڕسکانە هاتە بوون.

دیارە زۆر نالۆژیکی نائەقڵانییە کە باوەڕمان وابێت نوکی تیژی دەرزییەک پەیدا نابێت تاوەکوو کەسێک نەیهێنێتە بوون، بەڵام سادە و ئاسان دەستی سوودفە و بێسەروبەری و هەڕەمەکی بۆ ئەم زەوی و خۆر و گەردوونە ڕادەکێشیت.

دەبینین ئیلحاد چەند بیرۆکەیەکی هەیە دژی ئەم یاسایە کە هەموویان گریمانەی نالۆژیکی و نازانستی و نائەقڵانین، ئەم گریمانانەش بریتین لە:

١. گەردوون بەڕێکەوت (سوودفە) دروستبووە.

٢. گەردوون سروشت دروستیکردووە.

٣. گەردوون هەر هەبووە و ئەزەلییە.

٤. گەردوون خۆی خۆی دروستکردووە.

٥. گەردوون خەون و خەیاڵە و حەقیقەتی نییە.

لە بابەتێکی سەربەخۆدا باسی ئەم گریمانانە دەکەین.

## گومانی میتۆدی (الشک المنهجی)

گومانی میتۆدی یان زانستی ئەو گومانەیە کە مرۆڤ خۆی دروستی دەکات بۆ پاڵفتەکردن و گوڵبژێرکردن و هەڵبژاردنی ئەو زانیارانەی لایەتی، کەواتە گومانێکی دوستکراوە بە مەبەستی گەیشتن بە حەقیقەت و ڕاستی و یەقین، کەواتە گومانێکی ئەرێنی و بنیاتنەرە و نەرێنی ڕووخێنەر نییە، چونکە ئەم گومانە کاتییە و مرۆڤ خۆی دروستی دەکات بەمەستی گەیشتن بە مەعریفەیەکی یەقینی و ڕاستگۆیانە و زانستی و خۆخاڵی کردن لە هەموو مەعریفە و زانیارییەکی نادروست و نایەقینی و گوماناوی.

سەرەتای ئەم جۆرە گومانە بەشێوەیەکی ناسەربەخۆ و بەئەندازەیەکی کەم لە سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆوە هاتووە، واتە ئەمان بەجۆرێک لە جۆرەکان پەیوەندییەکیان دروستکردووە لەنێوان گومان و یەقین و مەعریفەدا، بەڵام وەک میتۆد و مەنهەجی مەعریفی دیار و سەربەخۆ نەیان وتووە، تاوەکوو قەشە ئۆگستین هات و سێ ساڵ گومانی بەکارهێنا بۆ گەیشتن بە یەقین، ئەوەش دوای ئەوەی خوێندنەوەی بۆ پەرتووکی (المقالات الاکادمیة)ی شیشرۆن (٤٣ م) کرد، لە بەناوبانگترین بیرمەند و فەیلەسووفان لە جیهان و شارستانییەت و فکری ئیسلامیدا کە بە دامەزرێنەری حەقیقی گومانی میتۆدی دادەنرێت بریتییە لە ئیمامی غەزالی، کە گومانی بەکارهێنا بۆ گەیشتن بە مەعریفەی یەقینی (هەرچەندە هەندێک دەڵێن گومانەکەی ئەو بە دەستی خۆی نەبووە لائیرادی بووە و بۆی پەیدابووە، بەڵام هەرچۆنێک بێت هەر بە دامەزرێنەری دادەنرێت) ئیمامی غەزالی سەرەتا گومانی لە هەستەکان پەیدابوو، پاشان گومانی لە عەقڵیش پەیدابوو، تا وای لێهات سیقە و یەقینی بەهیچ شتێک نەما، بەڵام دواتر وەک خۆی دەڵێت: "خودا شیفای بۆ ناردم و نورێکی خستە دڵمەوە و ڕزگارم بوو لەم گێژاوە و یەقینم پەیدابۆوە لەبەرانبەر شتە بەدیهی و زەروورییە عەقڵییەکان (الضرورات العقلیة)، ئەمەش هەمووی نورێکی خوایی بوو

و منی ڕزگار کرد".[١]

ئەمە لەسەردەمانی پێشووی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی، بەڵام لەسەردەمی نوێدا فەیلەسووفی بەناوبانگی فەڕەنسی «دیکارت» (١٦٥٠م) بە دامەزرێنەری گومانی میتۆدی دادەنرێت، دیکارت ویستی فەلسەفەکەی لەسەر بنەمایەکی یەقین و پتەو بنیات بنێت، بۆیە گومانی بەبەهێزترین هۆکاری یەقین زانی و لە گومانەوە دەستی پێکرد بۆ گەیشتن بە مەعریفەیەکی یەقینی، لە سەردەمی دیکارتدا شکگەراکان زۆر بەهێزبوون بە سەرکردایەتی «مێشێل مۆنتانی» (١٥٩٢ م)، هەربۆیە دیکارت ویستی بە هەمان ڕێچکەی ئەوان وەڵامیان بداتەوە، بۆیە سەرەتا گومانی کرد لەو مەعریفەیەی کە لە منداڵیدا وەریگرتووە و بە بەدیهی زانیوە، پاشان هەستەکانی ڕەتکردنەوە و وەک سەرچاوەی مەعریفە هەژماری نەکردن چونکە دەیوت هەندێک جار هەستەکان فێڵمان لێدەکەن، هەرشتێکیش یەکجار فێڵی کرد، زۆر نزیکە هەموو جارانی تریش فێڵ بکات، پاشان گومانی لە عەقڵ و خەیاڵیش کرد، هەر بەوە نەوەستا و گەیشت بەوەی کە گومانی لە خودی خۆیشی کرد، لەدوای ئەو هەموو گومانە یەک لەدوای یەکانە دیکارت هەست دەکات خۆی جۆرێک لە بیرکردنەوە و تێڕامان پەیڕەو دەکات، بۆیە دەڵێت: "من گومان دەکەم کەوایە من جۆرێک لە بیرکردنەوە و تێڕامان دەکەم"، کەوایە خودی گومان کردنەکە بەڵگەیە لەسەر بیرکردنەوە و بوونی خۆم، نەک هەر ئەوە بەڵکوو ئەگەر گومان لە گومانەکەشم بکەم هەر بەڵگەیە لەسەر بیرکردنەوە، دوایی گەیشتە وتە بەناوبانگەکەی کە دەڵێت: "من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم"[٢]

---

(١) المنقذ من الضلال، الغزالی، ١١٣.

(٢) دکتۆر عەلی حسێن جابری لە کتێبەکەیدا (دروس فی الفکر الفلسفی الإسلامی) لە لاپەڕە (١٠٠) دا دەڵێت: (ئەم وتەیەی دیکارت: أنا أفکر إذن أنا موجود) لە هزری (ئیبن سینا) باس و خواسەکانی وەرگیراوە.

کەواتە «دیکارت» لە گومانەوە دەستپێیدەکات بۆ گەیشتن بە یەقین، گومان لەخۆی ئینجا لە هەموو شتەکانی تر، دواییش سەلماندنی بوونی خۆیی و خودا و بوون و گەردوون و حەقیقەت و مەعریفە.

دیکارت لەم گەشتەیدا بەسێ قۆناغدا تێپەڕی:

**قۆناغی گومان:**

لەم قۆناغەدا گومانی لە هەستەکان و عەقڵ دەکرد و پێی وابوو هەردووکیان زۆرجار فریوت دەدەن و فێڵت لێدەکەن و بەرەو ڕاستی و یەقینت نابەن، کەواتە ئەو گومانی لەپێناو گوماندا نەبوو، بەڵکوو گومانی لەپێناو گەیشتن بوو بە حەقیقەت و مەعریفەی یەقینی، چونکە لەم سەردەمەی ئەویشدا گومانگەراکان و پیاوانی ئایینی و دەستەڵاتی ئایینی و کەنیسە دژی عەقڵ و زانست و بیرکرنەوە دەوەستانەوە و ڕێگر بوون لە بیرکردنەوە و زانست و مەعریفە!

**قۆناغی بیرکردنەوە و لێکجیاکردنەوە:**

وەک باسمان کرد دیکارت وتی: "من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم"، کەواتە قۆناغی وەستان لە گومانی جێهێشت و گومانی کردە بەڵگە لەسەر بیرکردنەوە و بیرکردنەوەشی کردە بەڵگە لەسەر بوونی و دوایی گەیشت بە بوونی خۆیی و خودا و بوون و گەردوون.

دیکارت لەم قۆناغەیدا جیاکاری و لێکجیاکردنەوەی بەکارهێنا، واتە جیاکردنەوە مەعریفە و زانیارییەکان، بۆیە لە نامەیەکیدا بۆ هاوڕێکەی (میلاند) دەڵێت: "ئەگەر سەبەتە سێوێکت لابوو، هەندێکیان بۆگەن و هەندێکیان ساغ بوون، بۆگەنەکان ساغەکانیشیان بۆگەن کرد، چی دەکەیت بۆئەوەی سێوە بۆگەنەکان فڕێ بدەیت و ساغەکان بهێڵیەوە؟ هیچ ڕێگەیەت نییە غەیری بەتاڵکردنی سەبەتەکە لە هەموو سێوەکان و پاشان پشکنینی دانە دانەی

سێوەکان، تاوەکوو ئەوەی ساغە بیخەیە ناو سەبەتەکە و ئەوەشی بۆگەن و ڕزیو و خراپە فڕێی بدەی. کەواتە دیکارت لەم ڕێیەوە (گومان و پاڵفتە کردن) دەیەوێت بگات بە مەعریفەی یەقینی.

## قۆناغی گرەنتی خودایی:

قۆناغی گرەنتی خودایی واتە ئەو مەعریفەیەی خودا لە دەروونی هەموو مرۆڤێکیدا چاندووە، واتە ئەو فیترەتە پاکەی خودا هەموو مرۆڤەکانی لەسەر دروستکردووە، دیکارت لە وتەکانیدا بە ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات کە نووری خوایی و خوداناسی بەرەو خودناسی و مەعریفەناسیت دەبات.

## دیکارت و بوونی خودا

«ڕینێ دیکارت» فەیلەسووف و فیزیایی و زانای بیرکاری فەڕەنسی (١٥٩٦-١٦٥٠م) کە بە باوک و ڕابەری فەلسەفەی نوێ ناسراوە، دەڵێت:

من لەگەڵ ئەوەی هەست بە کەموکوڕیی خۆم دەکەم، بەڵام لە هەمان کاتدا هەست بە بوونی زاتێکی زۆر گەورە و کامڵ دەکەم کە دەمبینێ، ناچارم باوەڕم وا بێت کە ڕواندن و چەسپاندنی ئەو هەستە لە زاتی مندا بەهۆی ئەو زاتە کامڵەوەیە، کە هەر چی سیفەتی کەماڵ و تەواوی هەیە لەودا هەیە، ئەو زاتەش (خودا)یە.

کەواتە ڕینێ دیکارت خودی خۆی دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودا، واتا پەنا ناباتە بەر دەرەوەی خۆی و گەردوون، بەڵکوو خۆی دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودای گەورە، چونکە دەڵێت: من ئەو هەموو کەموکوڕییەم هەیە، بەردەوام هەست بەو کەموکوڕییەی خۆم دەکەم، بەڵام لە هەمان کاتدا هەست بە زاتێکی زۆر گەورە و کامڵ دەکەم، کە دیارە ئەو هەستکردنە لە خۆوە نییە، بەڵکوو دەبێت هێزێکی دەرەکی لە دەرەوەی خودی خۆم ئەو هەستەی لەنێو مندا

ڕواندبێت و چەسپاندبێتی، ئەگەرنا ئەو هەستە چۆن لە خۆوە دروستدەبێت؟ کەواتا ئەو زاتە کامڵ و تەواوە بریتییە لە خودای گەورە کە ئەو زاتە تەواوە ئەو هەستەی لای من دروستکردووە کە هەست بە زاتی کامڵ و تەواویی ئەو بکەم.

هەر بۆیە دیکارت دەڵێت: کە تەماشا دەکەم، هەست دەکەم بە هەبوونی بوونێک، کە لەوپەڕی تەواویدایە، دوایی بیردەکەمەوە، ئایا دەبێت ئەو هەستەم، ئەو هەستکردنەم بەو بوونە تەواوە لە کوێوە هاتبێت؟

تەماشای خۆم دەکەم، دەکەومە گومانەوە، خۆم نوقسانی و ناتەواویم هەیە، کەواتا: ناگونجێت ئەو هەستکردنەم بەو بوونە تەواوە، لە منەوە هاتبێت، چونکە خۆم ناتەواوم، ناتەواوی تەواو (کامل)ی لێوە نایەت! ئایا ئەو هەستە لە دەوروبەرمەوە هاتووە؟! تەماشای شتەکانی دەوروبەریشم دەکەم، ئەوانیش بە هەمان شێوە، هەر ناتەواون و ناڕێکوپێکن.

کەواتە: نابێت لەوانیشەوە هاتبێت.

کەواتە: ئەو هەستەی من بەرانبەر بە بوونێکی تێروتەواو، کە ئەوپەڕی زانیاری و ئەوپەڕی حیکمەت و ئەوپەڕی دەسەڵات و ئەوپەڕی هەموو سیفەتێکی گەورەیی (جلال) و تەواوی (کمال) و جوانی (جمال) هەیە لە خودی بوونی ڕەها و ڕاستەقینەوە هاتووە، کە خودای گەورەیە (سبحانە وتعالی).

کەواتە دیکارت خودی خۆی و خودی خودا دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودا و پەنا ناباتە بەر دەرەوەی زاتی خودا بۆ سەلماندنی خودی خودا.

لەکۆتاییدا دیکارتیش وەک هەر مرۆڤ و زانا و فەیلەسووفێکی دیکە ڕاست و هەڵەی هەیە، بەڵام لەکۆتاییدا توانی تەکانێک بدات بە فەلسەفەی ئەورووپی و دووری خاتەوە هەم لە گومانگەراکان هەم لە زۆرێک لە بیروباوەڕوە پووچەکانی سەردەمی خۆیی هەم لە دەستەڵاتە دینییە داپڵۆسنەرەکە.

## جیاوازی نێوان گومانی مەزهەبی و گومانی مەنهەجی

١. گومانی مەزهەبی بە گومان دەست پێدەکات و بە گومانیش کۆتایی دێت، واتە سەری لە یەقینەوە دەرناچێت، بەڵام گومانی مەنهەجی بە گومان دەست پێدەکات و بە یەقین کۆتایی دێت.

٢. گومانی مەزهەبی هەر لەسەرەتاوە مەبەستی گەیشتن بە یەقین نییە، بەڵکوو گومان لەپێناو گوماندا دەکات، بەڵام گومانی مەنهەجی مەبەستی گەیشتنە بە مەعریفەی یەقینی.

٣. گومانی مەزهەبی سنوورێکی نییە لێی بوەستێت، بەڵکوو هەر دەڕوات و هیچ بنەما و نەگۆڕێکی لەلا نییە و ناشبێت، بەڵام گومانی مەنهەجی سنووری هەیە و لە شوێنێکدا دەوەستێت، بۆ نموونە دیکارت گومانی نەبوو لەوەی کە گومان دەکات، بۆیە ئەو یەقینەی بەوەی کە ئەو گومان دەبات بردی بەرەو بیرکردنەوە و یەقین، بەڵام گومانی مەزهەبی گومانی هەیە لە گومانیش!

٤. گومانی مەزهەبی زاڵە بەسەر کەسەکەدا و زۆرجار لەدەستی خۆی نامێنێت، بەڵام گومانی مەنهەجی مرۆڤ خۆی دروستی دەکات بۆ گەیشتن بە یەقین.

٥. گومانی مەزهەبی هیچ مەبەستێکی نییە غەیری لەبن هێنانی یەقین، بەڵام گومانی مەنهەجی مەبەستی بنیاتنانی مەعریفەیە لەسەر بناغەیەکی پتەو و حەقیقی.

لەکۆتاییدا ئەوەی ماتەوە کە ئاماژەی پێبدەین بابەتی هۆکار و پاڵنەرەکانی گومان و گومانگەرانە، هۆکار و پاڵنەرەکانی گومان و گومانگەراکان زۆرن، لەوانە: پاڵنەری قازانج و بەدەستخستنی دەستەڵات و پارە، وەک ئەوەی سەردەمی سوفستائییەکان، کە هەندێک توێژەر پێیان وایە سوفستائییەکان وەنەبێت بەهیچ شێوەیەک بڕوایان بە عەقڵ و هەست نەبووبێت، بەڵکوو بۆ دەستخستنی مادده و خەڵک فێرکردنی گفتووگۆ و موناقەشە کردن بووە، واتە ئەوان ئەم گومانکردنەیان وەک پیشە بەکارهیناوە، بۆنموونە وەک موحامی و پارەزێرەک کە

بەم هۆیەوە گرەوی خۆیان لەو کەسە بردووەتەوە کە کێشەی لەگەڵ کەسێکی تردا هەبووە.

یەکێ لە هۆکار و پاڵنەرەکانی دیکەی گومان بریتییە لە بێباوەڕی و ئیلحاد، چونکە کە گومان لە هەموو شتێک کرا، ئیدی سەردەکێشێت بۆ گومان کردن لە خودا و پێغەمبەر و دواڕۆژ و ....، دوایی باوەڕی بەهیچیان نامێنێت.

یەکێ لە هۆکار و پاڵنەرەکانی دیکەی گومان بریتییە لە نەزانی، واتە کە شتێک نازانێت و ناشزانێت چۆن چارەسەری بکات، دێت بەهانەی گومان بەکاردێنێت و خۆی ئارام دەکات بەم بیانووە.

# باوەڕگەراکان (الاعتقادیون)

وەک لەپێشەوە باسمانکرد دووجۆر تێڕوانینی سەرەکیمان هەیە دەربارەی ئیمکان و توانای مرۆڤ بۆ دەستخستنی زانیاری و مەعریفە:

١. **گومانگەراکان (الشكاك)**، کە گومانیان لە هەموو شتێک دروست دەکرد و پێیان وابوو مرۆڤ ناتوانێت بگات بە زانین و مەعریفە یان یەقین، ئەمانیش دابەشبوون بۆ چەندان گرووپ و قوتابخانەی جیاواز جیاواز بەڵام هێڵە گشتییەکانیان یەک شت بوو.

٢. **باوەڕگەراکان (الاعتقادیون)**، یان یەقین گەراکان، ئەوانە بڕوایان وابوو کە مرۆڤ لە توانای دایە بگات بە یەقین و دڵنیایی و زانین.

باوەڕگەراکان (الاعتقادیون) پێچەوانەی ئاراستەی گومانگەراکان (الشكاك) ن، چونکە گومانگەرا ڕەهاکان دەڵێن: مرۆڤ ناتوانێت بگات بە مەعریفە و یەقین، گومانی ڕەها گومانێک کە متمانەی بە هیچ سەرچاوە و ئامرازێکی مەعریفە نییە و زانین و مەعریفەی شتەکان لای شتێکی ئەستەم و مەحاڵە، گومانی لە هەموو شتێک هەیە و یەقین بوونی نییە لەلای، گومان لەلای مەبەستە نەک ئامراز بۆ گەیشتن بە حەقیقەت، بە گومان دەستپێدەکات و بە گومانیش کۆتایی دێت، ئەم قوتابخانەیە پێی وایە هەوڵ و تێکۆشانی مرۆڤ بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و مەعریفەیەکی یەقینی شتێکی پڕوپووچ و بێسوود و بێئەنجامە.

لەو فەیلەسووفانەی ئەو بۆچوونەیان هەبووە فەیلەسووفی یۆنانی (گۆرگیاس_ ٣٨٠ پ.ز) کە بۆچوونی خۆی بەم شێوەیە دەربڕیوە:

١. هیچ شتێک بوونی نییە.

٢. ئەگەر هەشبێت مرۆڤ ناتوانێت پەی پێببات و بیزانێت.

٣. ئەگەر گریمان زانیشی و پەیشی پێبرد، ئەوا ناتوانێت بیگەیەنێت و گوزارشت لەو مەعریفەیە بکات کە پێی گەیشتووە و بیگەیەنێت بە خەڵکانی دیکە.[١]

هەروەها فەیلەسووفی یۆنانی (بیرۆن _ ٢٧٥ پ. ز) گومانی لە هەموو شتێک هەبوو، وەک دەڵێت: پێویستە متمانەمان بە عەقڵ و هەستەکان نەبێت و ڕا و بۆچوونمان نەبێت، پێویستە لەیەک کاتدا شتەکان ڕەت بکەینەوە و بیشیان سەلمێنین، یان نە ڕەت بکەینەوە نە بسەلمێنین.[٢]

بەڵام باوەڕگەراکان (الاعتقادیون) پێیان وایە مرۆڤ لەتوانایدایە بگات بە مەعریفە و یەقین، بەڵام ئەمانیش ڕاجیاییان هەیە لە سنووری مەعریفە و ڕێگاکانی دەستخستنی، هەربۆیە بوون بە چەندان گرووپ و ڕێباز، بەڵام هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن مرۆڤ توانای زانین و ناسین و گەیشتن بە مەعریفەی هەیە.

سوقرات یەکەم کەس بوو لەبەرانبەر سوفستائییەکاندا وەستایەوە و هەوڵی سەلماندنی ئیمکانی مەعریفە و توانای مرۆڤی دا بۆ زانین و ناسین و مەعریفە و توانای عەقڵ، چونکە سوفستائییەکان بڕوایان نە بە عەقڵ بوو نە بە هەستەکان و پێیان وابوو هەردووکیان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێن و هەردووکیان مرۆڤ فریو دەدەن، کەواتە چارەسەر ئەوەیە بڕوایان پێنەکەین! سوقرات هات وتی: ئێمە شتی بەدیهی و یاسای عەقڵی نەگۆڕمان هەیە و عەقڵ توانای گەیشتن بە مەعریفەی هەیە، پاشان ئەفلاتوون و ئەرستۆ و ... هاتن هەمان بەرگرییان لە عەقڵ کرد و دژی ئەم ئاڕاستە گومانگەرا ڕەها ڕووخێنەرە وەستانەوە، ئەم ڕەوتە بەردەوام بوو تاوەکوو ئیسلام هات و ئەویش

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف الكرم، ل: ٦٤.

(٢) مصادر المعرفة فى الفكر الدينى والفلسفى، د. عبد الرحمن بن زيد الزنيدى، ل: ٦١.

بەهەمان شێوە جەختی لە توانای سنووورداری مرۆڤ کرد بۆ زانین و ناسین و مەعریفە و ڕۆڵی بۆ عەقڵ گێڕایەوە و دژی ڕەوتی گومانگەرا وەستایەوە، ئەم ڕەوتە هەر بەردەوامبوو و تا گەیشتە دیکارت و ئەویش لە کۆتایی گەیشتەکەیدا گەیشتە ئەم دەرەنجامە و هەموو ئاراستە و ڕەوت و فکرەکەی بۆ سەلماندنی عەقڵ و توانای مەعریفی مرۆڤ بوو، کەواتە بەدرێژایی مێژوو ڕەوتی باوەڕگەرا زۆرینە بوون و هەمیشە لەبەرانبەر ڕەوتی گومانگەراکاندا وەستانەوە، ئەگەریش دوورتر بچین هەر لەسەرەتای مرۆڤایەتییەوە ئەم ڕەوتە زاڵ بووە و بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانیش (دروودی خوای لەسەر بێت.) پڕبووە و لە یەقین و یەقین بەخشین و بانگەوازی بۆلای یەقین و مەعریفە و دوورخستنەوەی خەڵکی لە گومان و گومانگەرایی و خۆونکردن و ڕێ لێونبوون و گومڕابوون و سەرلێشێواوی.

بەڵام ئەوەشمان بیرنەچێت کە زۆربەی زۆری فەلسەفە نوێکان لە ئەوروپادا لەکۆتاییدا زیندووکەرەوەی فەلسەفەی سوفستائی بوون و ڕێبازی گومان و گومانگەراییان زیندووکردۆتەوە و هەوڵیانداوە هەموو شتێک بەگومانەوە سەیر بکەن و هیچ شتێکی نەگۆڕ نەمێنێت و هەمووی ببێتە نسبی و ڕێژەیی، وەک پراگماتی و وجودی و وەزعی مەنطقی و مارکسی و ...

## ئیمکانی مەعریفە لە قورئان و فکری ئیسلامیدا

قورئان زۆر زۆر گرنگی بە عەقڵداوە، بە شێوەیەک عەقڵ وەک ناو (اسم) نەهاتووە لە قورئاندا، بەڵکوو ئەوەی هاتووە بەشێوازی کردار هاتووە، وەک (عقلوه - يعقلون - نعقل - يعقلها - تعقلون).

موشتەقاتی عەقڵ (٤٩) جار لە قورئانداهاتووە.

چەند ئایەتێک دەربارەی عەقڵ و هاندان بۆ خستنەکاری:

* ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ وَأَنْتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾. [البقرة: ٤٤]

* ﴿فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾. [البقرة: ٧٣]

* ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا﴾. [الحج: ٤٦]

* ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ﴾. [الأنفال: ٢٢]

* ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ [آل عمران: ١٩٠]

* ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ [البقرة: ١٦٤]

* ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [الجاثية: ١٣]

«هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێناوە، هەموویشی تێکڕا بەخشش لەلایەن ئەو زاتەوە، بەڕاستی ئا لەو بەخشش و دیاردانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆرهەن بۆ کەسانێک کە بیربکەنەوە و تێبفکرن.»

* ﴿وَهُوَ الَّذِي أَنْشَأَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ [الأنعام: ٩٨]

«هەر ئەو زاتە ئێوەی لە تاکە کەسێک بەدیهێناوە، سەردەمێک (بەشێکتانی لە پشتی باوکتاندا) نیشتەجێ کردبوو (کە گوێزرانەوە بۆ ناو سکی دایکتان) ئەو

شوێنە ئێوەی گرتەخۆ (تا تیایدا نەشونما بکەن، یاخود بۆ ماوەیەک ئێوەی لەسەر ڕووکاری زەوی دانا، دوایی لە توێیدا شاردنیەوە تا ڕۆژی قیامەت) بەڕاستی ئێمە نیشانە و بەڵگەی زۆرمان (لەسەر دروستکردنی ئێوە و دروستکاری خۆمان هێناوەتەوە) بۆ کەسانێک کە تێی بفکرن و وردبین بن.»

کەواتە قورئان پڕیەتی لە مەدح و ستایشی عەقڵ و هاندان بۆ بەکارهێنانی و زەمکردنی ئەوانەی عەقڵ ناخەنەکار و بیرناکانەوە و تێناگەن.

٢. قورئان زەمی ئەو کەسانە دەکات کە عەقڵ بەکار ناهێنن و بیرناکەنەوە، وەک دەفەرمووێت:

* ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [البقرة: ١٧١]

* ﴿وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ اتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْقِلُونَ﴾ {المائدة: ٥٨]

* ﴿وَلَٰكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۖ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [المائدة: ١٠٣]

* ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [الأنفال: ٢٢]

* ﴿أَفَأَنْتَ تُسْمِعُ الصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا لَا يَعْقِلُونَ﴾ [يونس: ٤٢]

* ﴿وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [يونس: ١٠٠]

* ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا﴾ [الحج: ٤٦]

* ﴿قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [العنكبوت: ٦٣]

* ﴿وَمَنْ نُعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ ۖ أَفَلَا يَعْقِلُونَ﴾ [يس: ٦٨]

* ﴿قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا لَا يَمْلِكُونَ شَيْئًا وَلَا يَعْقِلُونَ﴾ [الزمر: ٤٣]

* ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [الحجرات: ٤]

* ﴿تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [الحشر: ١٤]

* ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ وَأَنْتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ [البقرة: ٤٤]

* ﴿كَذَٰلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ [البقرة: ٧٣]

کەواتە قورئان ئەگەر زەمی کەسێک یان گەلێک بکات دەفەرموویت کە عەقڵ بەکارناهێنن و بیرناکەنەوە.

هەروەها زۆر باسی تێگەیشتن دەکات و زەمی ئەو کەسانەش دەکات کە تێناگەن و نایانەوێت تێبگەن.

* ﴿فَمَالِ هَٰؤُلَاءِ الْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾ [النساء: ٧٨]

* ﴿انْظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ﴾ [الأنعام: ٦٥]

* ﴿قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ [الأنعام: ٩٨]

* ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَا يَفْقَهُونَ بِهَا﴾ [الأعراف: ١٧٩]

* ﴿وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَفْقَهُونَ﴾ [الأنفال: ٦٥]

* ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ﴾ [التوبة: ٨١]

* ﴿وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾ [التوبة: ٨٧]

* ﴿صَرَفَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَفْقَهُونَ﴾ [التوبة: ١٢٧]

* ﴿وَجَدَ مِنْ دُونِهِمَا قَوْمًا لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا﴾ [الكهف ٩٣]

* ﴿فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ [الفتح: ١٥]

* ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَفْقَهُونَ﴾ [الحشر: ١٣]

* ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾ [المنافقون: ٣]

* ﴿وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ﴾ [المنافقون: ٧]

کەواتە خودای گەورە فەرمان دەکات بە تێگەیشتن و زەمی ئەوانە دەکات کە تێناگەن یان نایانەوێت تێبگەن یان عەقڵ و بیرکردنەوە بەکارناهێنن.

نەک هەر ئەوە، بەڵکوو بیرکردنەوە و تێڕامان و تێگەیشتن و وردبوونەوە واجبن؛ چونکە ئەگەر ئەوانە نەبن، خودناسی، خەڵکناسی، خوداناسی، بوونناسی و ئایینناسی بوونیان نامێنێت یان ئەگەر هەشبن ناتەواو و لادەرن.

-خودای گەورە بیرکردنەوە و بەکارهێنانی عەقڵییواجب کردووە لەسەر مرۆڤ، وەک دەفەرمووێت:

﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنْفُسِهِمْ ۗ مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ﴾ [الروم ٨]

«ئایا ئەوە لە ناخی خۆیاندا بیرێکیان نەکردووتەوەکە خودا ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە تەنیا بە حەق و سنووردار نەبێت دروستی نەکردوون؟ لە ڕاستیدا زۆربەی خەڵکی بێباوەڕن بە گەیشتنە خزمەتی پەروەردگاریان.»

* بۆیە ئەگەر لە قورئان وردببینەوە، ئەوا هانمان دەدات بو بیرکردنەوە لە:

١. بوونەوەر و گەردوون

٢. بیرکردنەوە لە خۆمان

٣. بیرکردنەوە لە مێژوو و سەرەنجامی خراپەکاران و ستەمکاران

- بەبێ بەکارهێنانی عەقڵ، ناتوانین لە وەحی خودای گەورە تێبگەین، ئەوەتا خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [النحل: ٤٤]

«ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاند، تا بۆ خەڵکی ئەوە ڕوون بکەیتەوە کە بۆیان هێنراوەتە خوارەوە، بۆئەوەی بیرێک بکەنەوە» هەروەها دەفەرموویت: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ [البقرة: ٢٤٢]

«ئاوا خودای گەورە ئایەتەکانی بۆتان ڕوون دەکاتەوە، بەڵکوو تێبگەن.»

- عەقڵ بنەما و بناغەی تەکلیفی خوداییە، واتە ئەگەر کەسێک عەقڵی نەبێت یان لە دەستی دابێت یان ئاگای لێنەبێت، ئەوا هیچی لەسەر نییە و هیچ شتێکی لێناگیرێت، هەروەک پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەفەرموویت:

«رِفع الْقلَم عَن ثلَاثَة: عَن النَّائِم حَتّى يَسْتيْقِظ، وَعَن الصَّبِي حَتّى يَحْتلِم، وَعَن الْمَجْنوْن حَتّى يعقل».[1]

واتە: گوناهـ لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە:

١. نووستوو، تاوەکوو بەخەبەر دێت.

٢. منداڵ، تاوەکوو باڵغ دەبێت.

٣. شێت، تاوەکوو عەقڵی دێتەوە بەرخۆی.

کەواتە کەسێک عەقڵی نەبێت یان لەدەستی دابێت یان ئاگای لێنەبێت وعەقڵی لای خۆی نەبێت، هیچی لەسەر نییە.

- خاڵێکی تر کە بەڵگەیە لەسەر گرنگیدانی ئیسلام بە عەقڵ و دژ نەبوونی بۆ

---

(١) أخرجه الترمذي (١٤٢٣)، والنسائي في }السنن الكبرى)) (٧٣٤٦)، وأحمد (٩٥٦) حسَّنه البخاري كما في }العلل الكبير)) للترمذي (٢٢٦)، وقال الترمذي: حسن غريب من هذا الوجه ولا نعرف للحسن سماعا عن علي، وصحح إسناده أحمد شاكر في تحقيق }المسند)) (١٩٧/٢)، وصححه الألباني في }صحيح سنن الترمذي)) (١٤٢٣) وأخرجه من طريق آخر أبو داود (٤٤٠٣)، والبيهقي (٥٢٩٢)، والخطيب في }الكفاية)) (ص٧٧) صححه الألباني في } صحيح سنن أبي داود)) (٤٤٠٣).

عەقڵ بریتییە لەو هەموو ئیختیلاف و جیاوازی و ئیجتیهادە، بۆ نموونە لە فیقهـ (شافعی) (حنفی) (حنبلی) (مالکی) ....، هەیە.

لە عەقیدەدا: ئەشعەری، ماتوریدی، سەلەفی، أهل الحدیث، موعتەزیلە، مورجیئە ... هتد، هەیە.

هەروەها لە ڕووی فکری و فەلسەفی و تصوفی و سیاسی و...، ئەو هەموو ئیختلاف و قوتابخانە و جیاوازیە هەیە، کەواتە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ڕێدان بە بیرکردنەوە و عەقڵ بەکار هێنان.

- بەڵگەیەکی تر بوونی ئەو هەموو پەرتووک و نووسراوانەن، کە بە ملیۆنان پەرتووک نووسراوە، لەسەر زانستە شەرعی و ئیسلامییەکان، وەک تەفسیر، عەقیدە، فکر، فەلسەفە، کەلام و ...هتد.

- بەڵگەیەکی تر، بوونی ئەو هەموو زانا و بیرمەند و فەیلەسووف و موفەسیر و موتەکەلیم و ...هتد.

- بەڵگەیەکی تر، بوونی ئەو شارستانییە گەورەیە لە بوارە جیاوازەکانی ئەندازیاری و پزیشکی و ماتماتیک و جوگرافیا و مێژوو ... هتد.

- هەبوون و ناردنی پێغەمبەران بۆ ڕزگارکردنی عەقڵ و فکری خەڵک بووە لە خورافیات و شتی پڕوپووچ و ناحەقی بۆ حەق و ڕاستی و خودناسی و خوداناسی و خەڵکناسی و بوونناسی.

بۆیە لە کۆتاییدا، نابێت بە هیچ جۆرێک عەقڵ و وەحی تێک بگیرێن، چونکە عەقڵی سەلیم لەگەڵ نەقڵی سەحیح تێک ناگیرێن، هەروەها مەعقوول نییە سەرچاوەی هەردووکیان خودا بێت، بەڵام تێکیش بگیرێن.

هەربۆیە ئەوسەر بۆ ئەمسەری قورئان هاندانە بۆ بیرکردنەوە و عەقڵکاری و بەدواکەوتنی مەعریفە و زانست و زانیاری، ئەگەر مەعریفە ئیمکانی نەبێت ئەم

فەرمان و هاندانانە لەپای چی؟! ئینجا ئەگەر مەعریفە بوونی نەما یان کەوتە گومانەوە ئیدی هەموو بنەما ئایینی و عەقڵیی و ئەخلاقییەکان لەبن دێن و خوداناسی و وەحی و ئەخلاق و ... بوونیان نامێنێت.

بابەتی ئیمکانی مەعریفە بابەتێکی ئەوەندە ئاڵۆز نییە کە پێویستی بە چارەسەر بێت، چونکە گومان کردن لەوەی کە تۆ دەتوانی بیربکەیەوە و بگەی بە مەعریفە و زانین و یان شتە بەڵگەنەویست و بەدیهییەکان دژی سروشت و خوودی مرۆڤە، چونکە هەموو مرۆڤێک ئەگەر خۆی لانەدات دەزانێت کە هەندێ شتی بەڵگەنەویست و بەدیهی هەن کە هەموو مرۆڤێک دەیانزانێت، هەموو مرۆڤێک توانای بیرکردنەوە و گەیشتن بە مەعریفەی هەیە، ئەمە هەموو بە پێچەوانەی سوفستائی و گومانگەراکان کە بە هیچ شێوەیەک بڕوایان بەمە نییە.

هەربۆیە زۆرێک لە زانایان وتویانە ئەم جۆرە کەسانە بەم قسانەیان نکووڵی لە عەقڵ و خوودی خۆشیان دەکەن، کەوایە پێویست ناکات لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا گفتوگۆ بکرێت و دەبێت پشتگوێ بخرێن و گوێیان پێنەدرێت.

هەندێکی تر دەڵێن: پێویستە بسووتێندرێن یان لێیان بدرێت یان پارە و سامانیان لێبسەنرێت، هەرکاتێکیش شەکوا و گلەییان کرد، ئەوە دیارە خۆیان وەڵامی خۆیانیان داوەتەوە، دیارە گەیشتوون بە مەعریفەیەک و بەخۆهاتوونەوە.

هەندێکی تریش لە زانایان هاتوون وەڵامی گومان و شوبهەکانیانیان داوەتەوە، جا هەندێک بەدرێژی و هەندێکی تریش بەکورتی.

بەڵام ئەگەر سەیری خودی قورئانیش بکەین کە زیاتر لە (٣٠٠) جار باس و خواسی عەقڵی کردووە. ئەگەر سەیری پەرتووکە کەلامی و عەقیدەییەکانیش بکەین دەبینین سەرەتای باسەکانیان بە ڕەخنەگرتن لە سوفستائییەکان و گومانگەراکان دەست پێدەکات، ئەوەتا ئیمامی نەسەفی (٥٣٧ ک) لەسەرەتای

پەرتووکەکەیدا دەفەرموێت: (حقائق الاشياء ثابتة والعلم بها متحقق خلافا للسوفسطائية) واتە: "حەقیقەت و ڕاستی شتەکان جێگیرە و زانین و پەی پێبردنیشیان هاتۆتەجێی و هەیە بەپێچەوانەی بۆچوونی سوفستائییەکان."

نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو زانایانی ئیسلام عەقڵ و زانستیان بەیەکەوە بەستۆتەوە، هەتا گەیشتووە بەوەی هەندێکیان بڵێن: عەقڵ زانستە و ناکرێت لێک جیابکرێنەوە، دەڵێن: ناکرێت عاقڵێک هەبێت و زانستی بە شتەکان نەبێت، یان زانا بێت و عاقڵ نەبێت، ئەم زانستە عەقڵییە زانست نییە بە شتە هەستپێکراوەکان، چونکە شێت و ژیاندارانیش ئەوەیان هەیە، بەڵکوو زانست بە بابەتە گشتییە (الأمور الكلية) و بەدیهی و بەڵگەنەویستەکان.

بۆیە ئیمامی ئەشعەری دەفەرمووێت: (إن العقل علوم خاصة)[1] واتە: عەقڵ زانستە تایبەتەکانە، کەواتە بەم شێوەیە زانایانی موسڵمان هەموو ئەو کەسانەی نکووڵی لە زانست و مەعریفە دەکەن دەکەنە دەرەوە لە بازنەی ئیسلام.

هەر لەم بارەیەوە زانایانی کەلام پەرتووکەکانیان بە (النظر) دەست پێدەکەن، چونکە (النظر) ڕێگەی گەیشتنە بە شتە نەزانراوەکان، (النظر) لای ئەمان یەکسانە بە تیۆریای مەعریفە لای فەیلەسووفان، هەر لەم باسەدا باسی بەڵگە و زانست و مەعریفە و یەقین و گومان و .... دەکەن.

کار گەیشتووە بەوەی زۆرێک لە زانایانی کەلام پێیان وایە ئەگەر مرۆڤ بە (النظر) و تێڕامان و بیرکردنەوە و بەدواداچوونەوە نەگات بە خودا ئیمانەکەی وەرگیراو نییە لای خوای گەورە، کەواتە مەعریفە نەک شتێکی مومکینە بەڵکوو واجب و پێویستیشە و هەرکەسێک لەوێوە نەگات بە خودا، ئیمانەکەی وەرگیراو نابێت.

---

(١) المحصل للرازي (١٥١).

بەڵام ئەوەندەش هەیە کە لە تێڕوانینی ئیسلامدا دوو جیهان هەیە، یەک: جیهانی بینراو و هەستپێکراو کە زانیاری لەبارەوە بەدەست دەهێنرێت، جیهانی غەیب و پەنهان و شاراوە، جیهانی بینراو و هەستپێکراو بەڕێگەی عەقڵ و هەست و ئەزموون زانیاری لەبارەوە پەیدا دەکرێت و پەی پێدەبرێت، بەڵام جیهانی پەنهان و غەیب ئیللا دەبێت لەڕێگەی وەحیەوە بێت، وەک جیهانی بەرزەخ و دوای مردن و بەهەشت و دۆزەخ و فریشتەکان و ڕۆژی دوایی و بابەتە وردەکان پەیوەست بە خودا و ...

هەروەها وەک لەپێشتردا باسمان کرد ئیمامی غەزالی بناغەی گومانی میتۆدی (مەنهجی) دانا و زۆر بە چڕی لەبەرانبەر گومانگەراکان وەستایەوە.

ئینجا فەیلەسووفە موسڵمانەکانیش: کیندی، ئیبن سینا، فارابی، ئیبن ڕوشد، ...هتد، لەبەرانبەر تەوژمی گومانگەرایی وەستانەوە و کاری باشیان لەسەر کرد.

کەواتە ئیسلام بە قورئان و سوننە و ڕای زانایانییەوە لەگەڵ مەعریفە و بەدواداچوون و چوون بەرەو یەقینە.

ئەوەی باسکرا ئەوە دەسەلمێنێت کە ئیسلام دژی گومانی ڕەهایە (الشک المطلق) و دژی دەوەستێتەوە، ماوەتەوە گومانی میتۆدی (الشک المنهجی) واتە: بەکارهێنانی گومان وەک مەنهەج و میتۆد بۆ گەیشتن بە ڕاستی و حەقیقەت.

گومانی مەنهەجی و میتۆدی وەک باسمانکرد کەسەکە خۆی بۆخۆی دروستی دەکات بە مەبەستی گەیشتن بە حەیققەت و مەعریفە و یەقین، واتە شتێک نییە بۆی هاتبێت بەبێ ویستی خۆی، چونکە ئەو جۆرە گومانەی بەبێ ویست دێت و دەبێتە وەسوەسە و بەرەو نەخۆشی دەڕوات جیاوازە و هیچ شتێکی لەسەر نییە چونکە کەسەکە لەدەستەڵاتی خۆیدا نەماوە، ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەو جۆرە گومانەیە کە مرۆڤ خۆی دێت دانە دانەی زانیاری و باوەڕەکانی دەخاتە بەر نەشتەری گومانەوە و گومان لە هەموو بیروباوەڕ و مەبەدەئەکانی دروست

دەکات و بەچاوی گومانەوە دەڕوانێتە هەموو شتەکانی، وەک ئەوەی دیکارت کردی، واتە شتێک نییە تووشی بووبێت و بێ ویستی خۆی هاتبێت، بەڵکوو هەموو خۆی بۆخۆی دروستی کردووە، سەبارەت بەم جۆرەیان بەشێوەیەکی گشتی گومان بۆخۆ دروستکردن و خۆخستنە ناو گومانەوە کارێکی باش نییە و ڕەنگە بەسەرلێشێواوی لێی بێیەوە دەرەوە، وەک خودا دەفەرموێت: ﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ يَلْعَبُونَ﴾ [الدخان: ٩]. واتە: لەگەڵ ئەم هەموو بەڵگە و نیشانە گەورە و گرنگانەدا، خوانەناسان لە گومان و دوودڵیدا ڕۆچوون و سەرگەرمی گەمە و یارین. بەڵام ئەگەر کەسەکە لەخۆی دڵنیابێت یان بزانێت کە گومانی بۆ دروست دەبێت یان نەگەیشتبێتە یەقینی تەواوی، ئەوە کێشەی تێدا نییە و سەرەنجامەکەی بە یەقین تەواو دەبێت ئەگەر مەبەستی گەیشتن بە یەقین بێت و هەواو نەفس و ئارەزوی تێکەڵ نەبێت.

دەتوانین جیاکارییەکیش بکەین لەنێوان کەسی پێگەیشتوو و کەسی ناپێگەیشتوودا، چونکە ئەو کەسانەی بناغەیەکیان هەیە جیاوان لەوانەی هیچ بناغەیەکیان نییە و ڕەنگە تەواو تەواو بزربن و ڕۆبچن و غەرق بن لەناو گومان و گومان دروستکردندا.

لە قورئانیشدا باسی ئەم بابەتە کراوە

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾ [الحجرات ٦].

«ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناون ئەگەر کەسێکی متمانەپێنەکراو هەواڵێکی گرنگی بۆ هێنان، خێرا بڕوای پێ مەکەن، بەڵکوو سەرنج بدەن، لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە، نەوەکوو ئازارو ناخۆشی و گیروگرفت بۆ خەڵکی دروست بکەن بەنەزانی، جا دوایی پەشیمان ببنەوە لەو کارەی کە پێی هەستاون.»

کەواتە گومان کردن لە زۆر شوێندا و بەتایبەت لە بابەتی هەواڵ و قسە و

حوکم و ... هتد، پێویستە و دەبێت بەچاوی گومانەوە بڕوانرێتە شتەکان.

فەرموودەناسانیش هەمان ڕێگایان گرتۆتەبەر بۆ وەرگرتنی حەدیس و فەرموودە و بووە بە یاسایەکی گشتی لە زانستی فەرموودە و فەرموودەناسیدا، کە نابێت لەسەر بنەمای سیقە و متمانە و ... فەرموودە وەربگیردرێت و دەبێت لەسەرەتادا بەچاوێکی گومانەوە لە فەرموودەکە بڕوانرێت تاوەکوو دەگاتە پلەیەک کە گومانەکانی لەسەر هەڵدەماڵرێن.

کەواتە تێڕوانینی ئیسلام تێڕوانینێکی میانڕەو و ناوەندگیرە و نە ئەوەیە گومان لە هەموو شتێک بکات و هیچ شتێک لەلای یەقین نەبێت، نە ئەوەشە گومان نەکات، بەڵکوو بڕوای بە یەقین و گومانە لەشوێنی خویاندا.

# سەرچاوەکانی مەعریفە

دوای ئەوەی هەردوو قوتابخانەی گومانگەرا و باوەڕگەرامان باسکرد، باسی ئەوەشمان کرد کە باوەڕگەراکان باوەڕیان بەوە هەیە مرۆڤ دەتوانێت بگات بە مەعریفە و زانین، ئێستا کاتی ئەوەیە باسی ئەوە بکەین ئایا سەرچاوەکانی بەدەستهێنانی مەعریفە و زانین کامانەن، چونکە ئەوانەی باوەڕیان بە زانین و مەعریفەش هەیە ڕاجاییان هەیە لە چۆنیەتی گەیشتن بە مەعریفە و زانین و سەرچاوەکانی.

هەندێک دەڵێن: بە هەستەکان و ئەزموون دەگەین بە مەعریفە.

هەندێک دەڵێن: بە عەقڵ دەگەین بە مەعریفە.

هەندێک دەڵێن: بە (حەدس) و بۆهاتن و لایەنی باتینی و ڕۆحی دەگەین بە مەعریفە.

هەندێک دەڵێن: بە وەحی دەگەین بە مەعریفە.

هەندێک دەڵێن: بە کۆکردنەوەی ئەمانەی سەرەوە دەگەین بە مەعریفە.

کەواتە قوتابخانە و گرووپ و ئاراستە و فەیلەسووفەکان ڕاجیاییان هەیە لە سەرچاوەکانی گەیشتن بە مەعریفە و زانین و هەیانە تەنیا باوەڕی بە یەکێکیان هەیە و هەشیانە باوەڕی بە دوو یان زیاتر هەیە، باسی گومانگەراکانیشمان کرد کە باوەڕیان بە هیچیان نییە.

## قوتابخانە و ڕێبازی عەقڵگەرا

قوتابخانەی عەقڵگەرا لەبارەی سەرچاوەی مەعریفە پێی وایە تاکە سەرچاوە بۆ مەعریفە و بەدەستهێنانی زانین بریتییە لە عەقڵ و بەس، دوور لە هەستەوەرەکان و ئەزموون و وەحی و ...، واتە عەقڵ بەتەنیا لە توانایدایە بگات بە مەعریفەی یەقینی.

ئاراستەی عەقڵگەرا دەڵێن خۆمان ڕادەستی هەستەکان ناکەین، چونکە هەستەکان زۆرجار فێڵمان لێ دەکەن و نامانگەیەنن بە مەعریفەی یەقینی، ئەوەتا جاری وا هەیە قەڵەمێک لە ئاودا بە شکاوی دەبینی، بەڵام کە لە ئاوەکە دەیهێنیەدەرەوە دەبینی نەشکاوە، یان لە کەشێکی گەرمادا لە دوورەوە تراویلکەیەک دەبینی، وادەزانی ئاوە، کە لێی نزیک دەبیەوە دەبینی هیچ ئاوێکی لێ نییە، یان تام کردن و بۆنکردن و ...، زۆرجار وەک خۆی شتەکەت پێناگەیەنن و دەتخەنە هەڵەوە. کەواتە بەم پێیە ناکرێت تەسلیمی هەستەوەرەکان بین و دەبێت تەواو بگەڕێینەوە بۆ عەقڵ.

بنەمایەکی گشتی قوتابخانەی عەقڵگەرا بریتییە لە زانینی پێشوەختە (المعرفة القبلية) واتە هەموو مرۆڤێک لە سروشت و فیترەت و زگماکی خۆیدا زانینی خۆی هەیە و هەندێک شتی گشتی دەزانێت، کە هیچیان لە ئەزموون و هەستەکانەوە بەدەست نەهاتوون، سەرەتاکانی ئەم ڕایە دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسووفی یۆنانی «ئەفلاتوون» کە هەمان ڕای هەبووە، ئەمەش وەک وەڵامێک بۆ سوفستائییەکان کە بڕوایان بە مەعریفەی یەقینی و سابیت و جێگیر نەبوو، بەڵام ئەفلاتوون بڕوای بەوەبوو کە هەموو مرۆڤێک زانینی پێشوەختەی هەیە و لە نەفس و فیترەتیدا چێنراوە. ئەفلاتوون بڕوای وایە زانین بیرکەوتنەوەیە و نەزانین لەبیرچونەوە، چونکە مرۆڤ پێش لەدایک بوونی لە جیهانی ئایدیاکان (عالم المثل) دا ژیاوە، ئەم جیهانەش جیهانێکی حەقیقی و

ڕاستەقینەیە، لەوێدا هەموو ڕاستییەکانی بەچاوی خۆی بینیوە، پاشان مرۆڤ دابەزیوەتە جیهانی ماددە کە جیهانێکی خەیاڵی و ناحەقیقییە و شوێنکەوتەی جیهانی ئایدیاکانە، بەلەدایکبوونی لەگەڵ جەستەدا یەکی گرتووە و ڕاستییەکانی بیرچووەتەوە، کەواتە ئەو زانینە فیتری و زگماکییە ئێستا بیرکەوتنەوەی جیهانی ئایدیاکانە کە جیهانێکی حەقیقی و ڕاستەقینەیە.

لەبەرانبەر ئاراستەی فیتریدا ئاراستەی ئیکتیسابی هەیە، واتە زانین و مەعریفە شتێکی بەدەستهاتووە نەک پێشوەختە و فیتری و بەدیهی، ئەمەش لەسەردەمی یۆناندا ئەرستۆ ڕێبەرایەتی کردووە.

کەواتە ئاراستەی فیتری، ئەفلاتوون ڕێبەڕایەتی کردووە لە سەردەمی یۆناندا.

ئاراستەی ئیکتیسابی و بەدەستهاتوو و ئەزموونی و هەستەوەری، ئەرستۆ ڕێبەڕایەتی کردووە.

دواتر زانایانی ئیسلام و فەیلەسووفان لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا هەمان ڕایان هەبووە کە مەعریفە بەشێکی فیترییە، چونکە پێیان وابوو ناسینی خودا و بنەما گشتییە ئەخلاقییەکان فیتری و زگماکین، کەواتە ئەوەش ڕێک ئەو زانینە پێشوەختەیە کە ئەفلاتوون و فەیلوسەفە عەقڵانییەکان باوەڕیان پێی بوو، لە فەیلەسووفە موسڵمانەکان کە بە زەقی باسیان کردووە ئیمامی غەزالی و ئیبن سینا، غەیری ئەمانیش هەن، بەڵام لەناو مەیدانە فەلسەفییەکەدا ئەوان زەقن لەو باسەدا.

لەبەرانبەر ئاراستەی فیتریدا ئاراستەی ئیکتیسابیشمان هەیە کە ئیخوان سەفایە، ئەوانیش وەک ئەڕستۆ پێیان وایە مەعریفە ئیکتیسابییە و لە ئەزموون و هەستەکانەوە بەدەست دێت.

دواتر لەسەردەمی نوێدا دیکارت هات و وەک ڕێبەری قوتابخانەی عەقڵانییەت لە سەردەمی نوێدا

هەمان بۆچوونی خستەڕوو، چونکە ئەمیش وەک ئەفلاتوون ڕێبەری وەڵامگۆی گومانگەراکان بوو، هەمان بۆچوونیشی هەبوو دەربارەی بوونی خودا و پێی وابوو فیترییە و چێنراوە لە ناخیدا وەک لە باسەکانی پێشوودا باسمان کرد.

**بنەمای ئەفکار و بیرکردنەوەکان لەلای دیکارت سێ جۆرە:**

**١. ئەفکارە ناڕوونەکان (أفكار غامضة)**

ئەفکارە ناڕوونەکان (أفكار غامضة) بریتین لەو ئەفکارانەی کە لە مەوجود و شتە دەرەکییە ماددییەکان و هەستەوەرەکانەوە بەدەست دێن، بۆنموونە ڕەنگ و دەنگ و ساردی و گەرمی و ...، ئەم جۆرە ئەفکار و بیرانە جێی متمانە و ئیعتیبار نیین، چونکە سەرچاوەکەیان هەستەکانن و هەستەکانیش زۆرجار هەڵە دەکەن و بەهەڵەماندا دەبەن، کەواتە ناکرێت وەک سەرچاوەی مەعریفە و زانین سەیریان بکەین.

**٢. ئەفکارە داهێنراوەکان (أفكار مختلقة)**

ئەفکارە داهێنراوەکان (أفكار مختلقة) ئەو ئەفکار و بیرانەن کە خەیاڵ دروستیان دەکەن، بۆنموونە بزنێکی باڵدار، دەریایەک جیوە، یان ...، ئەم جۆرە ئەفکار و بیرانەش هیچ بەهایەکیان نییە، چونکە لەبنەڕەتەوە بوونیان نییە.

**٣. ئەفکاری فیتری و زگماکی (أفكار فطرية)**

ئەفکاری فیتری و زگماکی (أفكار فطرية) بریتین لەو ئەفکارانەی کە بەدیهی و زگماکی و پێشوەختەن و لەهەستەکان و هەستەوەرەکان و ماددە و ئەزموونەوە بەدەست نەهاتوون. ئەم ئەفکارانە لای دیکارت ئەفکاری ڕوون و بێ گرێوگۆڵن، چونکە سەرچاوەکەیان خودایە و خودا چاندوونی لەناخی مرۆڤدا و قابیلی فێڵ و هەڵخەتاندن نین، چونکە خودا پاکە لەو شتانە، کەواتە ئەوەی لەویشەوە

سەرچاوەی گرتبێت، هەر وایە.[1]

دوای دیکارت هەریەک لە سپینۆزا (١٦٧٧م) و مالبرانش (١٧١٥م) و لایبنیتز (١٧١٦م) هەمان ڕایان هەبوو.

بەڵام وەک دواتریش باسی دەکەین ئاراستەی ئەزموونگەراییش لەسەدەی نوێدا هەبوو، وەک جۆن لۆک و دێڤید هیوم و ...

کەواتە قوتابخانەی عەقڵگەرا لەبارەی سەرچاوەی مەعریفە پێی وایە تاکە سەرچاوە بۆ مەعریفە و بەدەستهێنانی زانین بریتییە لە عەقڵ و بەس، دوور لە هەستەوەرەکان و ئەزموون و ...، واتە عەقڵ بەتەنیا لە توانایدایە بگات بە مەعریفەی یەقینی، ئەم ڕێباز و قوتابخانەیەش کە بنەماکەی عەقڵ و عەقڵگەراییە پێی دەوترێت ئایدیالیزم و میسالی (مثالی)، لەبەرانبەریشدا ئاراستە و قوتابخانەی ماددی و ئەزموونگەرایی هەیە کە پێی دەوترێت «ماتریالیزم».

ئەم دوو قوتابخانەیە ڕیشەکەیان بە شێوەیەکی دیار و مەنهەجی دەگەڕێتەوە بۆ ئەفلاتوون و ئەرستۆ، یەکەمیان میسالی و دووەمیان ماتریالیزمی.

دواتر لە هەموو سەردەمەکاندا ئەم دوو قوتابخانە و تەوژم و ئاراستەیە بوونیان هەبووە تا دەگاتە ئەمڕۆ.

## قوتابخانە و ڕێبازی ئەزمونگەرای هەستگەرا

دوای ئەوەی ئەفلاتوون و دیکارت و هاوشێوەکانیان باوەڕیان بە هەستەکان نەکرد و بە سەرچاوەی مەعریفەیان نەدەزانی و پێیان وابوو ئەوەی لە هەستەکانەوە وەردەگیردرێت گوماناوییە و جێی متمانەی نییە ...، قوتابخانەی ئەزمونگەرای

---

(١) التأملات فی الفلسفة الأولی، دیکارت، ل ١٣٧ _ ١٣٨.

هەستگەرا هاتوو، هەست و ئەزموون و ماددەی کردە سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە و زانین و پێی وایە ناگونجێت هیچ جۆرە بۆچوون و فکرێک دروست ببێت بەبێ هەست و هەستەوەرەکان و ئەزموون، هەربۆیە ئەوەی هەستی نەما زانین و زانستیشی نامێنێت، لەلای هەستگەراکان هەموو ئەفکارەکان بەرهەمی هەستەکانن، ئەوە ئەزموونی هەستییە وێنەی هەموو شتەکان لە زیهن و عەقڵدا دەکێشێت بۆ جیهانی دەرەکی، کەواتە عەقڵ ڕەنگدانەوەی ماددە و هەست و ئەزموونە بەپێچەوانەی قوتابخانەی عەقڵگەرا.

ڕیشەی ئەم قوتابخانەیە بەشێویەکی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەرستۆ، کە وتی: "ئەگەر ئێمە هەستەکان لەدەست بدەین، ئەوە بەدڵنیاییەوە زانین لەدەست دەدەین"[1].

بەڵام دەبێ ئاگاداری ئەوە بین کە ئەم قوتابخانەیەش جۆر و ئاراستەی جیاوازی تێدایە، هەیە بەڕەهایی ماددی و ئەزموونگەرایە، هەشە بەم ئەندازەیە نییە، واتە هەیانە زیاتر ڕۆڵی عەقڵ دەبینێت، هەشیانە بەڕەهایی ڕۆڵی عەقڵ بەلادەنێت و تەنیا وەک خزمەتکارێکی هەستەکان دەیبینێت.

بۆنموونە خودی ئەرستۆ کە ئەم قسەیە دەکات مەبەستی ئەوە نییە هەست و ئەزموون هەموو شتێکە، نەخێر، هەربۆیە لەلای ئەرستۆ بەڵگە عەقڵییە بەدیهییەکان بەرهەمی هەستەکان نیین، بەڵکوو بەرهەمی خودی عەقڵن. کەواتە ئەرستۆ هەستگەرایەکی ڕەها نییە، بەڵام ڕیشەی هەستگەرایی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو[2]، پاشان ئەم قوتابخانەیە بەئەندازەی جیاواز لە هەست و ئەزموون و ماددەدا ڕۆچوون و تا گەیشت بە ماددیە ڕەهاکان، کە غەیری ماددە باوەڕیان بە هیچ شتێکی تر نییە و پێیان وایە عەقڵ کاغەزێکی سپییە و هەست

---

(١) منطق أرسطو، تحقيق: عبدالرحمن بدوي، ل ٢/ ٣٨٥.

(٢) موقف ابن تيمية من المعرفة القبلية وشيء من آثاره الفلسفية، يوسف سمرين، ل ١٢.

و ئەزموون نەخشەی لەسەر دەکێشێت و عەقڵ و فیترەت هیچ ڕۆڵێکیان نییە و ئەوەی هەیە ماددە و ئەزموون و هەستەکانن و بەس.

قوتابخانەی ئەزمونگەرا بە شێوەیەک لەشێوەکان بەدرێژایی فکر و فەلسەفە بوونی هەبووە، ئەوەتا ئیخوانو سەفاش لە مێژووی ئیسلامیدا هەمان ڕای ئەرستۆیان هەبووە، ئەم قوتابخانەیهگەشەی کرد تا لەسەردەمی نوێدا بەشێوەی تیۆریایەک هاتە مەیدان لەسەر دەستی کۆمەڵە فەیلەسووفێک، دیارترینیان جۆن لۆک (١٧٠٤م) و دێڤید هیۆم (١٧٧٦ م)، جۆن لۆک بە دامەزرێنەری ڕاستهقینەی قوتابخانەی ئەزموونگەرای هەستگەرا دادەنرێت، چونکە یەکەم کەس بوو توێژینەوەیەکی تایبەت لەسەر تیۆریای مەعریفە بنووسێت، بە ناوی «وتارێک لەسەر عەقڵی مرۆڤ» لەوێدا جۆن لۆک وەڵامی دیکارتی دایەوە دەربارەی بیرۆکە فیتری و زگماکی و پێشوەختەکان و پێی وابوو بەهیچ شێوەیەک مرۆڤ زانیاری پێشوەختەی نییە و هەموو زانیارییەکان لە هەستەکانەوە وەردەگرێت و عەقڵی وەک پەڕەیەکی سپی وایە و هیچی لەسەر نییە و هەستەکان نەخشەی لەسەر دەکێشن و زانیارییەکانی بۆ دەنێرن.

دوای جۆن لۆک دێڤید هیۆم هات و هەمان فەلسەفەی هەستگەرای بیاتنا و دوو پەرتووکی نووسی بە ناوەکانی «وتارێک دەربارەی سروشتی مرۆڤ» و «توێژینەوە دەربارەی زیهنی مرۆڤ»، ئەویش هەمان ڕای هەبوو و پێی وابوو بۆ ڕاستی هەر بیر و فکرێک دەبێ بگەڕینەوە بۆ هەستەکان، چونکە سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە بریتییە لە هەستەکان، ئەوە هەستەکانن بیرۆکەکان دروست دەکەن، کەواتە بۆ ڕاستیان دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەزموون و هەستەکان و بەوەوە بیانپێوین.

## قوتابخانەی هەستگەرا لەلای جۆن لۆک

جۆن لۆک لە پەرتوکەکەیدا «وتارێک لەسەر عەقڵی مرۆڤ» وەڵامی دیکارت دەداتەوە و نکۆڵی لە زانینی پێشوەختە و فیتری دەکات، پێی وایە هەموو زانیارییەکانی ئێمە لە ئەزموون و هەستەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە، عەقڵیش پەڕەیەکی سپیە و هەستەکان زانیاری تێدا دەنەخشێنن، بەڵگەش بە مرۆڤە سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتی و منداڵ دەهێنێتەوە، کە هیچ بنەمایەکی فیتری عەقڵی لەلایان بوونی نییە[1].

لەبەشی دووەمی پەرتووکەکەیدا سەرچاوەی بیرۆکە و ئەفکارەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ دوو سەرچاوە:

١. هەستکردنی ڕاستەوخۆ: بۆنموونە کاتێک پرتەقاڵێک لەبەرانبەرتە تۆ ڕەنگ و شێوە و بۆنەکەی بەتەواوی هەست پێدەکەی، پاش ئەم هەستکردنە، ڕاستەوخۆ دەگوازرێتەوە بۆ عەقڵ، کەواتە عەقڵ ڕەنگدانەوەی هەستەکان بوو.

٢. تێڕامانی باتینی و ناوەکی: وەک وێناکردن و بیرکردنەوە و بیرکەوتنەوە، ئەمەشیان بەهەمان شێوە سەرچاوەکەی هەستەکانن و بەبێ ئەو بوونیان نابێت و هەمووی ڕەنگدانەوە و بەرهەمی هەستەکانە.

کەواتە عەقڵ لای جۆن لۆک کارتێکراوە نەک کارکەر، واتە ناتوانێت هیچ بیرۆکەیەک گەڵاڵە بکات بەبێ وەرگرتنی لە هەستەکانەوە.

### جۆرەکانی مەعریفە لای جۆن لۆک

١. **مەعریفەی حەدسی و بۆهاتوو:** مەبەست لێی ئەو مەعریفە بەدیهییە بەڵگەنەویستانەیە کە لە خودی خۆیاندا زۆر ڕوونن، واتە ئەوەندە ڕوونن عەقڵ

---

(١) تاریخ الفلسفة الغربية، رسل، ل ١٧٨.

ڕاستەوخۆ دەرکیان دەکات بەبێ پەنابردنەبەر هیچ بەڵگەیەک.

٢. **مەعریفەی بورهانی بەڵگەیی:** مەبەست لێی ئەو مەعریفەیە کە بۆ گەیشتن پێی پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە یان بیرۆکە و ئەفکاری دیکە هەیە.

٣. **مەعریفەی هەستی:** ئەو مەعریفەیەیان پشت بە هەستەکان دەبەستێت.

هەربۆیە دەڵێت: مەعریفە بەخودی خۆمان مەعریفەیەکی حەدسییە، مەعریفە بە بوونی خودا مەعریفەیەکی بورهانی و بەڵگەییە، مەعریفە بەو شتانەی بەلای هەستکردنەوەن مەریفەیەکی هەستییە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە داننانی جۆن لۆک بە مەعریفەی حەدسی داننانە بە عەقڵ و تواناکانی بەڵام لە سنوورێکی دیاریکراودا، کەواتە جۆن لۆکیش بەتەواوی و بەڕەهایی ڕۆڵی عەقڵی بەلاوە نەناوە و بە جۆرێک لەجۆرەکان ڕۆڵی پێ داوە، هەرئەوەش بوو وای لە بێرتراند ڕاسل کرد پێی وابێت جۆن لۆن دژیەکی هەیە لە بیر و وتەکانیدا، چونکە سەرەتا هەموو مەعریفەیەک دەگەڕێنێتەوە بۆ هەستەکان، بەڵام دوایی دێت دان بە مەعریفەی حەدسیدا دەنێت، کە دیارە ئەمە بەڕای ڕاسل دژیەکییەکی تەواوە[1].

کەواتە هەستگەرایی جۆن لۆک لە هی ئەرستۆ خەستتر بوو، بەڵام هێشتا نەگەیشتۆتە لوتکە، دوایی لەسەر دەستی دەیڤید هیۆمدا گەیشتە لوتکە و هەستگەراییەکی ڕەها و تەواو هاتە کایەوە.

## قوتابخانەی ئەزمونگەرای هەستگەرا لەلای دێڤید هیۆم

دێڤید هیۆم (١٧٧٦ م) بە گرنگترین سمبول و ڕێبەری قوتابخانەی ئەزمونگەرای هەستگەرا دادەنرێت، چونکە ئەوەی فەیلەسووفە هەستگەراکانی

---

(١) تاريخ الفلسفة الغربية، رسل، ل ١٨١.

پێش خۆی نەیانوت ئەو وتی، ئەو بۆشایی و کەلێنە غەیرە ئەزموونییە هەستگەراییە مابووەوە لە سەردەمی جۆن لۆک ئەویشی پڕکردەوە، هەبۆیە قوتابخانەی هەستگەرای ئەزموونگەرا لەسەر دەستی هیۆم گەیشتە لوتکە و هەر بۆشاییەکی مێتافیزیکی مابێتەوە نەیهێشت و دایماڵی لە هەموو جۆرە مەعریفەیەکی ناهەستی و نائەزموونی.

بەڵگەی سەرەکیش لەلای هیۆم بریتییە لەوەی کە سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە ئەزموون و هەستەکانن، هەرکەسێک هەستەکان لەدەست بدات، ئەوە بەدڵنیاییەوە فکریش لەدەست دەدات و ناتوانێت وێنای شتەکان بکات.

ئەزموونگەرایی و هەستگەرایی هیۆم گەیشتە ڕادەیەک یاسا هۆکاری (السببية) ڕەتبکاتەوە، بەبەڵگەی ئەوەی ئەم یاسا هەستپێکراو نییە، بۆنموونە کاتێک دەبینی تۆپێک دەجووڵێت و بەر تۆپێکی تر دەکەوێت و ئەویش دەجوڵێنێت، لە تێڕوانینی هیۆم ئەم ڕووداوە هەر ئەوەندەیە کە تۆپێک جووڵاوە و بەر تۆپێکی دیکە کەوتووە و جووڵاندوویەتی، کەواتە لێرەدا (بە تێڕوانینی هیۆم) هیچ شتێکی ئەزموونی هەستپێکراومان نەبینی بە ناوی هۆکارەکی (السببية) بەڵکوو تەنیا دوو جووڵەی یەک لەدوای یەکەکەمان بینی، بەم پێیەی هیۆم یاسای هۆکارەکی تەنیا شتێکی زیهنییە و مێشک دروستی دەکات، ئەگەرنا لەواقیعدا هیچ بنەمایەکی نییە، چونکە ئەزموونکراوی هەستپێکراو نییە.

دوای هیۆم فەیلەسووفی نەمساوی (ئەرنست ماخ) (١٩١٦ م) هەمان ڕای هەبوو و یاسای هۆکارەکی ڕەتکردەوە، بەڵگەکەی ئەوەبوو لەژێر ئەزموونداجێی نابێتەوە.

دوای ئەمانە «ئەنگلز» لە پەرتووکی «دژی دۆهرنگ» و «لینین» لە پەرتووکی «ماددیگەرایی و قوتابخانەی ئەزموونگەرای ڕەخنەیی» وەڵامی دانەوە[1].

---

(١) الموسوعة الفلسفية، وضع لجنة من العلماء والأكاديميين السوفياتيين، بإشراف روزنتال ويودين، ل ٤٢٧ _ ٤٢٨.

لەسەدەی بیست قوتابخانەی پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی (وەزعی مەنطیقی) هاتە مەیدان، کە درێژکراوەی ئەزموونگەرایی هیۆم بوو، یەکەم دەرکەوتنیشی لەسەر دەستی «موریتس شلیک» ( ١٩٣٦ م) کە سەرپەرشتی کۆبوونەوەی ڤێنای کرد لەساڵی (١٩٢٩ م) لە دیارترین ئەندامەکانیشی «کارناپ» (١٩٧٠ م) و «کۆرت گۆدل» (١٩٧٨ م)، ئەمانە بنەمای (هاتنەجێ) (تحقق) یان دانا، کە پوختەی ئەمەبوو: هەر بیرۆکە و وتە و ... نەتوانین بە ئەزموون و هەست بیسەلمێنین، ئەوە شتێکی پڕوپووچە و هیچ ئیعتیبارێکی بۆ ناکرێت، ئەوەی ماناداربێت دەبێت بە ئەزموون بسەلمێنرێت، ئەگەرنا بوونی نییە[1].

## قوتابخانە و ڕێبازی ڕەخنەگەرا

دوای ئەوەی فەلسەفە دوو قوتابخانەی سەرەکی بەخۆیەوە بینی، ئەوانیش عەقڵگەرا و هەستگەرا، قوتابخانەیەکی تریش هاتە مەیدانەوە بە ناوی «ڕەخنەگەرا»، ئەم قوتابخانەیە ویستی عەقڵ و هەست بەیەکەوە کۆبکاتەوە و هیچیان پشتگوێ نەخات، ویستی ئەو دژیەکییەکەی کە لەنێوان هەست و عەقڵدا دروستکراوە نەیهێڵێت و تێکی بشکێنێت، کەواتە ڕەخنەکانی ئاراستەی هەردوو قوتابخانەی (عەقڵگەرا و هەستگەرا کرد.

دیارترین فەیلسووف کە کاری گەورەی لەسەر کرد، ئیمانوێڵ کانت (١٨٠٤ م) بوو، کانت لەسەرەتادا فەیلەسووفێکی عەقڵگەرا بوو، کاریگەر بوو بە «بلیبنتز» و «ڤۆلف»، پاشان لە ساڵی (١٧٦٥م) کاریگەر بوو بە قوتابخانەی ئەزموونگەرا، لەپاش ئەم قۆناغەش قۆناغێکی نوێی دەستپێکرد بە ناوی ڕەخنەگەرایی، ئەمەشی لە ساڵی (١٧٧٠) بەدواوە بوو، هەر لەم قۆناغەشدابوو، پەرتووکە

---

(١) مشكلات الفلسفة، ماهر عبد القادر محمد علي، ل ١١٢.

بەناوبانگەکەی نووسی بە ناوی «ڕەخنە لە عەقڵی پەتی»[١].

پوختەی فەلسەفەی کانت ئەوەیە کە: مەعریفە لە ئەزموونکردنەوە پەیدانابێت، بەڵکوو لەگەڵ ئەزموونکردنەوە دەست پێدەکات، ئەم زانیاریانەی لە ئەزموون و هەستەوە دێن، پێویستیان بە ڕێکخەر و قالب و چوارچێوەیەک هەیە بۆئەوەی لەخۆیان بگرێت، ئەم چوارچێوە و قالبانەش بریتین لە بنەما عقڵییە بەدیهییە گشتییە زگماکییە پێشەکییەکان، واتە ئەم بنەمایانە لە فیترەتەوە هەن و بەدیهی و بەڵگەنەویستن، کەواتە ئەو مەعریفانەی لەڕێی ئەزموونەوە دێن، دەبێت بەم یاسا عەقڵییە گشتیانە ڕێکبخرێن، کەواتە کۆکردنەوەی عەقڵ و ئەزموون، نەوەک یەکیان بەتەنیا[٢].

کەواتە ئەمە پێچەوانەی قوتابخانەی عەقڵگەرای «ئەفلاتوون و دیکارت و ...» و ئەزموونگەرای «ئەرستۆ و جۆن لۆک و دێڤید هیۆم» بوو.

نموونەیەک بۆ کۆکردنەوەی هەست و عەقڵ لای کانت: پرتەقاڵێک لەبەردەممان بێت، بە چەند هەستێک دەتوانین هەستی پێبکەین، بەدەست دەتوانین دەستی لێبدەین و هەست بە توێکڵەکەی بکەین، بەچاویش ڕەنگەکەیی و شێوەکەی دەبینین، بە لوتیش بۆنی دەکەین و بە زمانیش تام، هەمووو ئەمانە بە تێکەڵی و پەرتەوازەییەوە دەچنە ناو مێشک و پێویستیان بە لێکدانەوە و جیاکاری و کۆکردنەوە هەیە، هیۆم پێی وایە ئەم کۆکردنەوە و لێکدانەوە و گرێدانەی مێشک بۆ هەمووو بەشەکانی خودکارییە و ڕاستەوخۆ وێنەی پرتەقاڵە لە مێشکدا دروست دەبێت، بەڵام کانت پێی وایە ئەو لێکدانەوە و گرێدانەوە عەقڵ دەیکات، کەواتە هەم هەست و هەم عەقڵ وێنەی پرتەقاڵەکەی لە مێشکماندا دروستکرد، چونکە تەنیا بۆن یان ڕەنگ یان

---

(١) تاريخ الفلسفة، فردريک کوبلستون، ٦/٢٦٢.

(٢) نقد العقل المحض، إيمانويل كانت، ل ٥٢.

شێوە یان تام ناتوانێت ئەم وێنەیە لە مێشکدا دروستبکات، ئەوە عەقڵ دێتە مەیدان و وێنەی ئەم پرتەقاڵە دروستدەکات و هەستەکان لێک گرێدەدات.

لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە کانت نە هەستگەرایە نە عەقڵگەرا، بەڵکوو هەردووکیانە بەیەکەوە و ڕەخنەی لە هەردوو ئاراستەکە هەیە.

## قوتابخانە و ڕێبازی پراگماتیزم

پراگماتیزم ناوی ڕێبازێکی فەلسەفەیە کە لە ئەمریکا سەریهەڵداوە، ناوەکە یەکەمجار «چارلس پێر» (١٩١٣م) بەکاریهێناوە و بناغەی فەلسەفەکەی داڕشتووە، وتارێکیشی نووسی بە ناوی «چۆن وابکەین هزر و ئەفکار و بیروکەکانمان ڕوون بن؟»، لەدواییدا لەلایەن «ولیام جەیمس» (١٩١٠ م) کراوە بە ناونیشانی ئەم ڕێبازە، «جۆن دیوی»یش ڕۆڵی باشی هەبووە لە دامەزراندنی.

وشەکە لە پڕاگما (PRAGMA) وەرگیراوە، کە خۆی یۆنانیی و لاتینییە و بەواتای کار دێت، بۆیە مرۆڤی پڕاگماتی بە کەسێک دەوترێت کە سەرگەرمی گەڕان بێت بەدوای سوودبەخشدا و خەریکی کار و کارکردن بێت و کەسێکی کردەیی و کردەکی بێت.

پوختەی فەلسەفەی پڕاگماتیزم: هەموو پڕاگماتیییەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە پێوەری ڕاستەقینە بۆ دیاریکردنی حەقیقەت بریتییە لەو بەرووبووم و کاریگەریانەی لەدوایەوە پەیدا دەبێت، ڕاستی هەموو بیرۆکە و ئەفکارەکانیش بەو سوودە دەپێورێت کە لێیەوە پەیدا دەبێت، واتە سوود و قازانج سەنتەرن، لەم ڕووەوە هاوڕایە لەگەڵ تەوژمی ئەزموونگەرا کە بەس پشتی بە ئەزموون و هەست و واقیع دەبەست و بەس، ئەزموونگەرا مەعریفە دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕیشەکەی کە لێیەوە پەیدابووە، واتە دەگەڕێتەوە بۆ دواوە، بەڵام پڕاگماتیزم

وانییە، سەیری بەرووبووم و ئەنجام و کاریگەری و سوودی ئەفکارەکان دەکات، واتە چیان لێ پەیدا دەبێت و سوود و کاریگەرییان چییە، کەواتە پڕاگماتیزم کاری بە هیچ شتێکی ئەفکار و مەعریفە نییە، چۆنە و چۆن بووە و ...، کاری بەوەیە بەروبووم و ئەنجام و سوودەکەی چییە[1].

بەڵام جۆن دیوی شێوەیەکی ترمان لە پڕاگماتیزم نیشان دەدات، کە پێی دەوترێت (الذرائعیة) (الاداتیة) واتە ئامراز، کەواتە بەم پێیە مەعریفە تەنیا ئامرازە بۆ ئیش و کار و بەس، بیر بیرۆکە و فکری ڕاست ئەویە کە دەتبات بەرەو چارەسەرکردنی کێشەکان[2].

## قوتابخانە و ڕێبازی سۆفیگەری و حەدسی و ڕۆحی

سەرچاوەی مەعریفە لەلای قوتابخانەی حەدس و سۆفیزمەوە جیاوازە لە قوتابخانەکانی تر، چونکە وەک لەپێشودا باسمان کرد، قوتابخانەی عەقڵگەرا پشت بە عەقڵ دەبەستێت، قوتابخانەی هەستگەرای ئەزمونگەرا پشت بە هەست و ئەزموون دەبەستێت، قوتابخانەی ڕەخنەگەرا پشت بە هەردووکیان دەبەستێت، بەڵام قوتابخانەی سوفیزمی حەدسی ڕۆحی سەرچاوەی مەعریفەکەی جیاوازە، چونکە پشت بە حەدس و کەشف و ئیلهام دەبەستێت. حەدس (سوسە) بریتییە لە خێراچوونی زیهن و مێشک بەرەو ئەنجامەکان. کەشفیش واتە شارەزابوون و بەئاگابوون لەو شتانەی لەپشت پەردەوەن، لە مانا پەنهانەکان و کاروبارە ڕاستەقینەکان. ئیلهامیش واتە خرانە ناو دڵ و دەروون بەشێوەی هەڵڕژان و فەیض، یان ئەو زانیارییەیە کە دەخرێتە دڵ و دەروون.

واتە زانین و مەعریفە هیچ هۆکارێکی یەقینی نییە وەک عەقڵ و هەستەکان

---

(١) البراجماتیة، ولیم جیمس، ل ٧٦.

(٢) مدخل جدید إلی الفلسفة، عبد الرحمن بدوي، ل ١٤٨.

و ئەزموون، ئەوەی بەسەرچاوە دادەنرێت بریتییە لەوەی کە دەخرێتە ناو دڵ و مێشکەوە بەبێ هیچ پێشەکی و هۆکارێک، بەبێ بەڵگەهێناوە و عەقڵکاری، هەست و عەقڵیش بەسەرچاوە دانانرێن.

حاڵەتی کەشف و ئیلهام و حەدس شتانێکن بەبێ هەوڵ و کۆشش نایەنەجێ، پێویستییان بە هەوڵ و کۆشش و پاڵتفتەی دڵ و دەروون هەیە، دەبێت چەندان پلە ببڕێت ئینجا دەتوانێت بگات بەم پلانە. کەواتە حەدس واتە سافی و ڕوونی عەقڵ و دڵ و دەروون، بە شێوەیەک کەسەکە ڕاستەوخۆ و زۆر بەخێرایی و بەکەمترین کات دەگات بە مەعریفەکە، حەدسیش لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، هەیە حەدسی هەر نییە (ئەوە کەسێکی دەبەنگ و گێژە) هەیە حەدسی لە هەندێک شت هەیە و لە هەندێکی دیکەدا نییەتی، هەیشە لە هەموو شتێکدا هەیەتی، ئینجا خێرایی حەدسیش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت.

ئیمامی غەزالی ئاماژە بۆ چەند خاڵی گرنگ دەکات لەبارەی حەدسەوە.

١. حەدس بۆ کەسێک پەیدانابێت کە تەواو تەواو بێ پەیوەندییە لەگەڵیدا، بەڵکوو دەبێت ئەم کەسە گرنگیپێدانی هەبێت بۆ ئەم بابەتە. بۆنموونە کەسێک بوارەکەی بواری تیۆری و نەزەری بێت، ناکرێت حەدسی هەبێت لە بابەتە زانستی و ئەزموونییەکانی وەک فیزیا و کیمیا و ...

٢. حەدس لەگەڵ ئەوەی مەعریفەیەکی یەقینییە، بەڵام یەقینییەکەی زیاتر لەلای ئەو کەسەیە کە خاوەنی حەدسە و ئەزموون و مومارەسەی لەگەڵیدا هەیە، لەلای ئەو یەقینی حەدس زیاترە لە یەقینی ئیستدلال و بەڵگەهێنانەوە، بەڵام لەلای ئەو کەسانەی ئەزموون و مومارەسەیان لەگەڵ حەدسدا نییە، ئەو یەقینە دەرناکەوێت و بوونی نییە یان کەمە[1].

---

(١) مقدمة الفلسفة الإسلامية، د. عمر التوتي الشيباني، ل ١٥٠.

جیاوازی لەنێوان حەدس و ئیلهامیشدا هەیە، چونکە حەدس واتە سافی و تیژی و پاکی و خێرایی زیهن، بەڵام ئیلهام مەعریفەیەک نییە لە ئەنجامی زیهنەوە بێت، بەڵکوو مەعریفەیەکی ویجدانی قەلبی باتینییە کە لەسەرووی مرۆڤەوە دێت و چەندان ڕێوشوێنی خۆی هەیە و بەئاسانی بەدەست نایەت، کەواتە حەدس لە زاتی مرۆڤەوە هەڵدەقووڵێت و زادەی زیهنە، بەڵام ئیلهام لەدەرەوەی مرۆڤەوە دێت.

حەدس لە فەلسەفەی ڕۆژئاوادا نزیکە لە حەدسی فکر و فەلسەی ئیسلامی، چونکە ئەوانیش دەڵێن: حەدس واتە: مەعریفەیەکە ڕاستەوخۆ دەدرێت بە شێوەیەک قابیلی تەحیلیل و شیکردنەوە نییە. بەڵام ئەوان لەکاتی جێبەجێکردندا تێکەڵییەک دەکەن لەنێوان حەدس و هەستدا، هەربۆیە حەدس لای ئەوان ناڕوونییەکی تێدایە و دابەشی دەکەن بۆ چەندان جۆر، بۆنموونە: حەدسی هەستەکی، حەدسی عەقڵی، حەدسی نەفسانی، ...

ڕێبەری ئەم قوتابخانەیە لە فەلسەفەی نوێدا فەیلەسووفی فەڕەنسی هێنری بەرجەسۆن (١٩٤١ م) بوو، لەکاتێکدا هات تەوژمی ماددیگەری و هەستگەرایی و ئەزموونگەرایی باڵی کێشابوو بەسەر زۆربەی شوێنەکاندا و زانستە سروشتییەکان بە میتۆدە ئەزموونگەراییەکەی بەتەواوی هەموو شوێنێکی تەنیبوو، ڕاڤەی ماددیش بۆ هەموو دیاردە ناماددی و مرۆییەکان دەکرا، هەربۆیە لەم کەش و بارودۆخەدا هێنری بەرجەسۆن هات و وەک پەرچەکردارێک دژی ئەو هەموو ماددیگەریی و ئەزموونگەراییە وەستایەوە و ئاڵای قوتابخانەی حەدسی و باتینی ڕۆحی هەڵگرتوو و چەندان پەرتووکیشی لەبارەیەوە نووسی، بۆنموونە (منبعا الاخلاق والدین) و (بحث في المعطيات المباشرة للوعي) و (التطور المبدع).

## قوتابخانەی کەشفی و عیرفانی و تەسەوفی لە فکری ئیسلامیدا

ئەم قوتابخانەیە قوتابخانەیەکی ئاڵۆز و سەختە و ئەمیش دوو ئاراستەی هەیە:

### ١. ئاراستەی کەشفی ئیلهامی سۆفی عیرفانی

ئەم ئاراستەیە پێی وایە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) حەقی ڕوونکردۆتەوە و گەیاندوویەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت هاوتا بێت لەگەڵ ئەوەی ڕۆح و دەروون پێی دەگات، ئەگەر دژ بوەستێتەوە لەگەڵ کەشف، ئەوە دەبێت یان تەئویل بکرێت یان بسپێردرێت بە خودا، ڕێگای بەدەستهێنانی کەشفیش بریتییە لە جیهادی نەفس و دڵ دەروون و پاککردنەوە و پاڵفتەکردنی.

کەشف واتە: واتا و مانا و مەعریفە کە بەبێ بیرکردنەوە و تێڕامان بەدەست دێت، لەڕێگەی تەزکیەی نەفس و دڵ و دەروون، کە بە چەندان ڕێگە بەدەست دێت.

### ٢. ئاراستەی ئیشراقی فەلسەفی:

ئەم ئاراستەیە پشت بە کەشف دەبەستێت بەڵام بەلایەنی فەلسەفی و ڕووتکردنەوەی دەروون لە لایەنی ماددی، نەک لەڕێی خۆبرسی کردن و ...

کەواتە ئەم ئاراستەیە تێکەڵەیەکە لە کەشف و ڕۆحانییەت لەگەڵ عەقڵ و فەلسەفە، واتە تێکەڵ کردن کەشف و عیرفان بە فەلسەفە.

فاڕابی و ئیبن سینا ئیبن طوفەیل و سوهرەوەردی (٥٨٧ ک) ئەم ئاراستەیان تەبەننی کردووە، بەتایبەت سوهرەوەردی کە بەردی بناغەی دانا و چەسپاندی.

بەڵگە و پشت پێبەستراو لای ئەم ئاراستەیە بریتییە لە کەشف و فەیزی نورانی کە هەڵدەڕژێتە ناو دەرونییانەوە لەڕێی دەروون و فەلسەفەوە، وەحی و

دەق سەرچاوەی یەکەم نیین، بەڵکوو دەبێت وەحی و دەقەکانیش بەم کەشف و فەیزە نورانییە فەلسەفیانە بپێورێن.

هەروەها قوتابخانەی حیکمەتی موتەعالیەش کە دامەزرێنەرەکەی سەدرەددینی شیرازییە «مەلا سەدرا» کەشف بە سەرچاوەی یەقینی و سەرەکی دەزانێت.

## سەرچاوەکانی مەعریفە لە قورئان و فکر و فەلسەفەی ئیسلامیدا

تێڕوانین و هەڵوێستی ئیسلام دەربارەی سەرچاوەکانی مەعریفە تێڕوانینێکی میانڕەوانە و ناوەندگیرانەیە و لەسەر ئەم سێ کۆڵەکەیە وەستاوە:

١. ئیسلام دان بە هەموو ئامراز و سەرچاوەیەک دادەنێت کە مرۆڤ بگەیەنێت بە مەعریفە و زانین و زانست و سوودی بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی هەبێت.

٢. ئیسلام هیچ کام لە سەرچاوەکانی مەعریفە ڕەتناکاتەوە، عەقڵی عەقڵانییەکان و ئەزموون و هەستی ئەزموونگەرا و هەستگەراکان و ئیلهام و حەدسی حەدسگەرا و ئیلهامگەراکان، لە تێڕوانینی ئیسلامدا هەموویان دانپێدانراون، لەگەڵ ئەمەشدا سەرچاوەیەکی ئیلاهی دیکەی زۆر بەهێز و گەورەشی داناوە کە وەحییە.

٣. ئیسلام بۆ هەموو سەرچاوەکان شوێن و بابەتی تایبەت بەخۆیانیانی بۆ داناوە، بۆنموونە هەست و ئەزموونی بۆ ماددیات و هەستپێکراوەکان داناوە، عەقڵی بۆ ناماددی و پشت ماددە داناوە، وەحیشی بۆ بابەتانی سەرووی هەست و ئەزموون و ماددە و عەقڵ داناوە، ئیلهامیشی وەک سەرچاوەیەکی تایبەت داناوە بۆ کەسانێکی تایبەت.

خوای گەورە دەربارەی هەرسێ سەرچاوە سەرەکیەکە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلَ

لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ﴾[١].

واتە: خودا دەزگای بینین و بیستن و تێگەیشتنی پێ بەخشیون ...

(الْأَفْئِدَةَ): واتە عەقڵ و هێزی تێگەیشتن و بیرکردنەوە، کەواتە ئەمە عەقڵ.

(وَالْأَبْصَارَ): واتە بنین، ئەمەش هەست و ئەزموون دەگرێتەوە، چونکە بینین سەرچاوەی سەرەکی ئەزموون و زانستە.

(السَّمْعَ): واتە بیستن، مەبەست لێی وەحییە، چونکە وەحی لەڕێی بیستنەوە پێمان دەگات و شتێکی سەمعییە.

کەواتە دانی نا بەسێ سەرچاوە سەرەکییەکە کە: عەقڵ و ئەزموون (هەست) و وەحییە، لەگەڵ ئەمانەشدا سەرچاوەیەکی دیکەی زۆر گرنگ هەیە کە زۆر زۆر گرنگە _ بەڵام بەداخەوە زۆر کەم باسی لێوەدەکرێت _ ئەویش بریتییە لە فیترەت (زگماک)، فیترەت و زگماک پانتاییەکی فراوان و گرنگی هەیە لە فکری ئیسلامیدا، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «ما من مولود إلا يولد على الفطرة ...»[٢]، واتە: «هەموو مرۆڤێک لەسەر فیترەتی پاک دروست دەکرێت و لەدایکدەبێت ...

### ١. هەست و ئەزموون

قورئان پێنج هەستەکانی وەک سەرچاوەیەکی گرنگ هەژمار کردووە و بەردەوام هانمان دەدات بۆ بەکارهێنانیان لەپێناو بەدەستخستنی مەعریفە و زانین و زانست، نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو زۆر زەمی ئەوانە دەکات کە بەکاریان ناهێنێنن، بۆنموونە ﴿وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى الْهُدَىٰ لَا يَسْمَعُوا وَتَرَاهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ

---

(١) [الملك: ٢٣]

(٢) متفق عليه: البخاری ١٢٩٢، ومسلم: ٦٩٢٦.

وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ﴾[1].

«خۆ ئەگەر بانگیان بکەیت بۆ ڕێبازی هیدایەت، ئەوا (بانگەوازت) نابیستن (چ جای ئەوەی یارمەتیشت بدەن)، تۆ دەیانبینیت ئەوان سەیرت دەکەن، لەکاتێکدا کە نابینن.»

قورئان پڕیەتی لە باسکردن و بەکارهێنانی گوێ و چاو، چونکە دوو سەرچاوەی سەرەکی مەعریفەن و هەر مرۆڤێک بەجوانی و چاکی بەکاریان نەهێنێت دەبێتە مرۆڤێکی کەڕ و کوێر. خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِن مَّكَّنَّاكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم مِّن شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾[2].

سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە دەسەڵات و توانایيەکی وامان بەخشی بە قەومی (عاد)، کە بە ئێوەمان نەبەخشیووە، هەروەها هۆکارەی بیستن و بینین و لێکدانەوەشمان پێدابوون، مخابن هۆکارەکانی بیستن و بینین و لێکدانەوە سوودی پێنەگەیاندن! ئەمەش لەبەر ئەوەبوو چونکە بە بەڵگە و نیشانەکانی خوا بێباوەڕ بوون و بەرپەچیان دەدایەوە ... ئەو سزایەی کە گاڵتەیان پێی دەهات، داوێن گیریان بوو، لێی دەرباز نەبوون.

﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾[3].

«سوێند بە خوا بێگومان ئێمە زۆر لە پەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ دروست

---

(١) [الأعراف: ١٩٨]

(٢) [الأحقاف: ٢٦]

(٣) [الأعراف: ١٧٩]

کردووە، ئەوانە دەزگای دڵیان هەیە و کەچی حەقی پێ تێناگەن، چاویشیان هەیە کەچی حەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی حەقی پێ نابیستن، ئا ئەوانە وەکوو ئاژەڵ وان (لە شوێنکەوتنی ئارەزوودا) بەڵکوو ئەوانە وێڵ تریشن، ئا ئەوانە هەر غافڵ و بێئاگان لە حەق.»

﴿وَهُوَ الَّذِي أَنْشَأَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ۚ قَلِيلًا مَا تَشْكُرُونَ﴾(١).

«هەر ئەو زاتەیە کە (دەزگای) بیستن و بینین و لێکدانەوەی پێ بەخشیوون، کەچی زۆر کەمتان سوپاسگوزارن.»

کەواتە هەستەکان و ئەزموون پانتاییەکی گەورەیان هەیە لە تێڕوانینی قورئاندا، نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە سەرەتای مەعریفە و زانین و سەرچاوەی سەرەکی هەستەکان، ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾(٢).

«خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێک بزانن، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و تێگەیشتنی بۆ دابین کردوون، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.»

بەڵگەیەکی تر بۆ گرینیگیدانی قورئان بە هەستەکان و کردنیان بە سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە و زانین، ئەو هەموو هاندانەی قورئانە بۆ ڕوانین و بیرکردنەوە و تێڕامان لە دیاردە هەستەکییەکان، بۆنموونە بیرکردنەوە لە مرۆڤ و ژیاندار و ڕووەک و دەریا و باران و با و ئەستێرە و ئاسمان و ... هەموو ئەوانەی دەکەونە بەر هەستەکان، قورئان بەسەدان ئایەت باسی لێوە کردوون، بەس ئایەتە گەردوونییەکان (٧٥٠) ئایەتن، بۆنموونە:

---

(١) [المؤمنون: ٧٨]

(٢) [النحل: ٧٨]

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّماواتِ والأَرْضَ وجَعَلَ الظُّلُماتِ والنُّورَ﴾

﴿وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾

﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِيَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾.

﴿وما يَسْتَوِي الْبَحْرانِ هذا عَذْبٌ فُراتٌ سائِغٌ شَرابُهُ وهذا مِلْحٌ أُجاجٌ﴾

﴿ومِنْ آياتِهِ اللَّيْلُ والنَّهارُ والشَّمْسُ والْقَمَرُ﴾

قورئان سروشت و بوون و گەردوونی وەک سەرچاوەی سەرەکی زانین و مەعریفە هەژمار کردووە، هەربۆیە پڕیەتی لە هاندان بۆ تێڕامان و وردبوونەوە لێی، وەک ئەو ئایەتانەی ڕابردوو و دەیان و سەدانی تر.

کەواتە بۆمان ڕوون بۆوە کە ئەزموون و هەست سەرچاوەن لە تێڕوانینی ئیسلام و قورئاندا، بەڵام تاکە سەرچاوە نییە، وەک ماددیگەرا و ئەزموونگەرا و هەستگەراکان دەڵێن، بەڵکوو یەکێکە لە سەرچاوەکان، چونکە هەست و ئەزموون بۆ ماددیات و هەستپێکراوەکانە و سەرچاوەیە بۆ زانین و مەعریفەی ماددی و ئەزموونی و هەستێکی وەک زانستەکانی فیزیا و کیمیا و گەردووناسی و زیندەزانی و بایەلۆجی و ... هتد، کەواتە هەست بۆ هەستپێکراوەکانە و یەکێکە لە سەرچاوەکان نەک تاکە سەرچاوە، چونکە لە تێڕوانینی ئیسلامدا نە بوونەوەر و نە مرۆڤیش تەنیا ماددی نیین، کەواتە دەبێت سەرچاوەی تریش هەبن بۆ زانینی ئەودیو ماددە، کە عەقڵ و وەحیین. کەواتە هەستەکان و ئەزموونیش سنووردارن و سنوورەکەیان بەس ماددیات و هەستپێکراوەکانە، نەوەک ناهەستی و ناماددییەکان و هەموو شتێک، وەک هەستگەرا و ماددیگەراکان دەیڵێن.

## ٢. عەقڵ

وەک باسمان کرد لە بابەتەکانی پێشوودا، ڕۆڵ و گرنگی زۆری هەیە لە قورئاندا، عەقڵ بە شێوازی ناو لە قورئاندا نەهاتووە، بەڵکوو (٤٩) جار بەشێوازی کردار هاتووە، ئەوەش بۆئەوەیە کە دەبێت بەکاربهێنرێت، هەربۆیە ئەگەر قورئان زەمی یەکێک بکات، دەفەرمووێت: عەقڵ بەکارناهێنێت و بیرناکەتەوە، عەقڵ بە شێوازی جیاواز زیاتر لە (٣٠٠) جار هاتووە لە قورئاندا.

لەگەڵ ئەو هەموو گرنگیدانەی قورئان و ئیسلام بە عەقڵ، بەڵام سنووردارە و سنووری خۆی هەیە، وەک وتمان ئیسلام نە عەقڵگەرایە نە ماددیگەرا، واتە خۆی کورتهەڵناهێنێت لە یەکێکیاندا، بۆیە عەقڵیش سنووری خۆی هەیە، چونکە سەرچاوەی سەرەکی عەقڵ هەستەکانن، هەستەکانیش هەموویان سنووری خۆیانیان هەیە، بنین و بیستن و ... تا سنوورێک توانایان هەیە و ملیۆنان و ملیاران شت هەیە ناتوانن هەستی پێ بکەن، کەوایە عەقڵیش سنووردارە و ڕەها نییە، وەک تاکە سەرچاوەش نییە، چونکە دەبێت لێک بدرێت لەگەڵ هەست و ئەزموون و ماددە و وەحی.

## ٣. وەحی و هەواڵ و نەقڵی ڕاست

هەواڵ بەدرێژایی مێژوو یەکێ بووە لە سەرچاوەکانی مەعریفە و زانین، چونکە زۆربەی شتەکان لەم ڕێیەوە گیشتووە و دەگات بە خەڵک، بۆنموونە پەرتووک و وێنە و نەخشە و خەریتە و ...، بۆنموونە وەختی خۆی کە وتراوە وڵاتێک هەیە بە ناوی چین یان ڕوسیا یان ....، کەس نەیبینیوە بەچاوی خۆی، بەڵام خەڵک ئەوەندەی باسکردووە و هەواڵی لەبارەوە دراوە، بووە بە شتێک کە ئەگەری ناڕاستبوونی تەواو تەواو لێداماڵراوە، کەواتە خەبەر و شایەتیدان و هەواڵی ڕاست سەرچاوەی سەرەکی زۆرێک لە مەعریفەکانە، بەتایبەت ئایین و فەلسەفە ئایینییەکان، هەربۆیە ئەگەر بڕوانینە پەرتووکە کەلامییەکان ئەوە زۆر

بەڕوونی دەبنین لەژێر ناونیشانی (الخبر الصادق)دا، واتە هەواڵی ڕاست، کەواتە زانا موسڵمانەکان بە چەندان سەدە پێش فەیلەسووفە ڕۆژئاواییەکان باسی ئەم بابەتەیان کردووە ...

لە تێڕوانینی فکری ئیسلامیدا هەواڵ جۆری زۆرە، هەربۆیە زانستێکی سەربەخۆ هەیە بە ناوی زانستی فەرموودەناسی، کە ئەمیش دەیان بابەت و زانستی دیکەی سەربەخۆی هەیە، گرنگی تایبەت دەدات بە مەرجی وەرگرتنی هەواڵ و فەرموودە و وتە و قسە.

**بە شێوەیەکی گشتی هەواڵەکانیان دابەشکردووە بۆ دوو جۆری سەرەکی**

١. **موتەواتیر:** ئەو هەواڵەیە کە خەڵکێکی زۆر گێڕاویانەوە و مەرج و شەرتەکانی بەتەواوی تێدایە، بەشێویەک ئەگەری ناڕاستبوونی نییە.

٢. **ئاحاد:** ئەو هەواڵەیە خەڵکێکی سنووردار گێڕاویانەوە و ئەگەری ناڕاستی هەیە. بەڵام ئەمەش جۆری زۆرە و هەیانە زۆر لە یەقینەوە نزیکە و هەشیانە دوورە.

کەواتە هەوڵ و خەبەری ڕاستیش یەکێکە لە سەرچاوەکانی مەعریفە و زانین.

### ٤. ئیلهام

یەکێکی دیکە لە سەرچاوەکانی مەعریفە لە فکری ئیسلامیدا بریتییە لە ئیلهام، ئیلهام نزیکە لە حەدسەوە، بەڵام جیاوازیشی هەیە، چونکە حەدس واتە سافی و تیژی و پاکی و خێرایی زیهن، بەڵام ئیلهام مەعریفەیەک نییە لە ئەنجامی زیهنەوە بێت، بەڵکوو مەعریفەیەکی ویجدانی قەلبی باتینییە کە لەسەرووی مرۆڤەوە دێت و چەندان ڕێوشوێنی خۆی هەیە و بەئاسانی بەدەست

نایەت، کەواتە حەدس لە زاتی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێت و زادەی زیهنە، بەڵام ئیلهام لەدەرەوەی مرۆڤەوە دێت. بەڵام لەوەدا لێک نزیکن کە هەردووکیان ڕاستەوخۆ دێن بۆ مرۆڤ بەبێ هەوڵ و کۆششی فکری، هەردووکیشان بەخێرایی دەتبەن بەرەو ئەنجام.

هەڵوێست بەرانبەر ئیلهام ڕاجیایی تێدایە، هەندێ ئەوەندەی بەرز دەکەنەوە دەیبەنە سەرووی عەقڵ و نەقڵەوە، هەندێکیش هیچ جۆرە سەنگێکی بۆ دانانێن، بەڵام هەردووکیان هەڵەن، هەڵوێستی ڕاست ئەوەیە کە ئیلهام وەرگیراو و سەرچاوەیە بەو مەرجەی دژی عەقڵ و وەحی نەبێت، بەڵام سەرچاوەی سەرەکی بریتییە لە عەقڵ و هەست و وەحی، ئیلهام زیاتر بۆ کەسی ئیلهام دیو بەڵگەیە تا خەڵکانی تر، کەواتە دەتوانین بڵێین سەرچاوەیەکی خودییە نەک سەرچاوەیەکی گشتی، دەشکرێت دوای دەرچوونی لە عەقڵ و هەست و وەحی بە سەرچاوەیەکی گشتیش وەربگیردرێت.

کەواتە لێرەوە دەرکەوت کە تیۆری مەعریفە و زانین لە ئیسلامدا تیۆریایەکی تەواوکاری بێکەلێنە.

# سروشتی مەعریفە

دوای ئەوەی زانیمان مەعریفە مومکینە و مرۆڤ دەتوانێت زانینی هەبێت، پرسیارێک دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە، ئایا سروشتی ئەم مەعریفەیە چییە، ئایا زانراوەکان بوونێکی سەربەخۆیان هەیە لە دەرەوەی مێشک و عەقڵی مرۆڤدا؟ یان تەنیا بیرۆکە و وێنای مێشک و عەقڵن، بەواتایەکی تر جیهانی دەرەوە و مادده ئەسڵن یان مێشک و عەقڵ؟

بەدرێژایی مێژووی فەلسەفە دوو ئاراستە سەرەکی هەبووە دەربارەی ئەم بابەتە:

١. واقیعی دەرەوە و خاریجی و هەستپێکراو (وەک دار و بەرد و ئاو و ڕووەک و ئاژەڵ و ...) بوونی سەربەخۆیان هەیە، ئەوە ئەوانن سەرچاوەی هەست و وێناکانمانن. ئەمە تەوژم و ئاراستەی واقیعییە.

٢. واقیعی دەرەوە بوونێکی سەربەخۆی نییە لەدەرەوەی مێشک و عەقڵی مرۆڤدا، واتە ئەوە عەقڵە بوون دەدات بە شتە دەرەکییەکان، نەک شتە دەرەکییەکان سەرچاوەی هزر و عەقڵ بن. ئەمەش تەوژم و ئاراستەی میسالییە.

هەر یەکێک لەم دوو ئاراستەیەش لقی تری لێدەبێتەوە.

## قوتابخانە و ڕێبازی واقیعگەرا (ڕیالیزم)

واقیعی دەرەوە و خاریجی و هەستپێکراو (وەک دار و بەرد و ئاو و ڕووەک و ئاژەڵ و ...) بوونی سەربەخۆیان هەیە، ئەوە ئەوانن سەرچاوەی هەست و

وێناکانمان، جا زەینی مرۆڤ پەی پێببات یان نا، بۆنموونە تۆ هەست بەم شاخە بکەی یان نا، شاخ بوونی هەر هەیە، یان تۆ دەرکی درەخت بکەی یان نا درەخت بوونی هەیە، کەواتە واقیعی دەرەوە ناوەستێتە سەر دەرک و زەین و مێشکی تۆ، بەڵکوو خودی خۆی بوونی هەیە بەبێ وەستانە سەر تۆ.

ئەم ڕێبازەش دوو لقی لێ دەبنەوە:

## ١. واقیعگەرای سادە

ئەم ئاراستەیە پێ یوایە

١. واقیعی خاریجی و دەرەکی بوونێکی سەربەخۆی هەیە لەدەرەوەی زەین و مێشکی مرۆڤ.

٢. واقیعی خاریجی و دەرەکی ئەسڵی هەموو فکرێکن.

٣. مەعریفە واتە کۆپی شتەکانی دەرەوەی زەین و مێشکی مرۆڤ، واتە مێشکی مرۆڤ تەنیا وەک ئاوێنەیەکە یان وەک کامێرایەکە، کاری بەس وێنەگرتنی واقیعی خاریجییە بەبێ زیاد و کەم، واتە مرۆڤ ڕێک وێنەگرێکە و هیچی تر.

٤. هیچ شتێک لە عەقڵدا بوونی نییە مادام لە واقیعی درەوەدا بوونێکی هەستپێکراوی نەبێت.

٥. داننەنان بەهیچ شتێک ئەگەر هەستپێکراو نەبێت، هەروەها نکۆڵی کردن لە هەموو غەیبیات و ئەودیو هەستەکان[١].

بۆیەش پێی دەوترێت واقیعگەرای سادە، چونکە بڕوای بەهیچ شتێک نییە کە هەستپێکراو نەبێت، هەروەها بەوەی کە زۆرجار واقیعی دەرەوە تەواو

---

(١) قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين السيد صالح، ل ١٢٠.

تەواو پێچەوانەی حەقیقەتی شتەکەیە، بۆنموونە واقیع وێنەی ئاوێکمان بۆ دەگوازێتەوە، بەڵام کە لێی دەچینەپێش دەبینین سەراب (تراویلکە) بووە و ئاو نەبووە، یان لە دوورەوە باڵندەیەک دەبینی بە شێوەیەک وێنای دەکەی، بەڵام کە نزیک دەبێتەوە لێت شتێکی ترە، هەم ڕەنگی هەم قەبارەکەی ...، یان بۆنموونە کە مادده دەبینی، وادەزانی وەستاوە، بەڵام زانست ئێستا سەلماندوویەتی کە مادده لە جووڵەی بەردەوامدایە. زۆر شتی دیکەش ...[1].

## ٢. واقیعگەرای ڕەخنەگرانە

ئەم ئاراستەیەش پێی وایە کە واقیعی دەرەوە و خاریجی و هەستپێکراو بوونی سەربەخۆی هەیە، ئەوە ئەوانن سەرچاوەی هەست و وێناکانمان، جا زەینی مرۆڤ پەی پێ ببات یان نا، پێی وایە هەستەکان درکی حەقیقەتی شتەکان دەکەن، بەڵام پێویستە بخرێنە ژێر ڕەخنە و تاقیکردنەوە لەژێر ڕۆشنایی یاسا زانستییەکان، وایە مادده شتێکی حەقیقییە و بوونێکی واقیعی سەربەخۆی هەیە لەدرەوەی مێشکی مرۆڤ، بەڵام درککردنی هەستەکان کاری مێشک و زەینە، چونکە ئێمە دوو شتمان هەیە

**یەکەمیان:** هەستی دەرەکی.

**دووەمیان:** عەقڵ، کە کاری لێکدان و لێکدانەوە و کۆکردنەوە و ... ئەوەی لە هەستەکانەوە هاتووە بۆ مێشک.

بۆنموونە کە پرتەقاڵێک لەبەردەممان بێت، بە چەند هەستێک دەتوانین هەستی پێ بکەین، بە دەست دەتوانین دەستی لێ بدەین و هەست بە توێکڵەکەی بکەین، بە چاویش ڕەنگەکەیی و شێوەکەی دەبنین، بە لوتیش

---

(١) انهيار الشيوعية أمام الإسلام، د. سعد الدين السيد صالح، ل ١٠٩.

بۆنی دەکەین و بە زمانیش تام، هەموو ئەمانە بە تێکەڵی و پەرتەوازەییەوە دەچنە ناو مێشک و پێویستیان بە لێکدانەوە و جیاکاری و کۆکردنەوە هەیە، چونکە شتانێکی جیاوازن (قەبارە، ڕەنگ، تام، بۆن، شێوە)[1].

## جیاوازی واقیعگەرای سادە و ڕەخنەگرانە

١. واقیعگەرای ڕەخنەگرانە ڕۆڵ دەدات بە عەقڵ و نایکات بە ئاوێنەی واقیعی خاریجی و دەرەکی و هەستەکان، بەڵام واقیعگەرای سادە عەقڵ دەکات بە ئاوێنە و کامێرای هەستەکان و واقیعی خاریجی و مرۆڤیش دەکات بە وێنەگر.

٢. واقیعگەرای ڕەخنەگرانە خۆی ڕادەستی واقیعی خاریجی ماددی ناکات بەبێ تاقیکردنەوەیەکی ڕەخەگرانە، بەڵام واقیعگەرای سادە ڕاستەوخۆ تەسلیمی دەبێت و هیچ کۆمێنتێکی نییە لەسەر ئەو شتانەی هەستەکان گواستوویانەوە.

٣. واقیعگەرای ڕەخنەگرانە دەرچەیەکی هێشتووەوە بۆ دانان بە هەستپێنەکراوەکان لە میانەی هەڵێجانی عەقڵی، بەڵام واقیعگەرای سادە هیچ دەرچەیەکی نەهێشتووەتەوە[2].

## قوتابخانە و ڕێبازی میسالی (ئایدیالیزم)

میسالی پێچەوانەی واقیعییە، چونکە واقیقی بڕوای بە بوونی سەربەخۆ و بابەتیانەی واقیعی خاریجی و شتەکان هەبوو لەدەرەوەی مێشک و زەینی مرۆڤ،

---

(١) تمهيد للفلسفة، د. محمود زقزوق، ل ١٣٧.
نظرية المعرفة، د. محمد فتحي الشنيطي، ل٩٧.
نظرية المعرفة، د. زكي نجيب محمود، ل ٨٥.
قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين السيد صالح، ل ١٢٠ _ ١٢١.

(٢) قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين السيد صالح، ل ١٢١ _ ١٢٢.

بەڵام میسالی بەپێچەوانەوە و بڕوای بە بوونی سەربەخۆ و بابەتیانەی واقیعی خاریجی و شتەکان نییە لەدەرەوەی مێشک و زەینی مرۆڤدا، واتە دانانێت بە شتێک لەدەرەوی عەقڵدا، کەواتە ئەوەی عەقڵ دەرکی نەکات بوونی نییە، بەم پێیەش مەعریفە و وجود، زانین و بوون دەبنە یەک شت، زانینی هەر شتێک بوونەکەیەتی، زانین و بوون دوو ڕووی یەک دراون، کەواتە بەم پێیە سروشتی مەعریفە هەمان سروشتی بوونە، بۆنموونە تۆ کاتێک سەیری گڵۆپی ماڵەکەی خۆت دەکەی، بینین و هەستکردنی تۆ بۆ خودی گڵۆپەکەیە، کەواتە لێرەدا ئەوە نییە بڵێی شتێکی سەربەخۆ هەیە لەدەرەوەی مێشکمدا و وێنەیەکیش لەدەرەوە، بەڵکوو هەموو بوونی گڵۆپەکە بریتییە لەو وێنەیەی کە لە مێشکدایە و بەس.

ڕێبازی میسالی ئایدیالیزم چەند جۆرێکی هەیە:

## ١. ئایدیالیزمی (میسالی) مەوزوعی و بابەتی

ئایدیالیزمی (میسالی) ئەفلاتوون ڕێبەرایەتی دەکات، پێی وایە زانراوە عەقڵییەکان بوونێکی سەربەخۆ و بابەتیانەیان هەیە لە جیهانێکی سەربەخۆ کە جیهانی «ئایدیاکان»ە، (عالم المثل)، کەواتە ئەم جیهانە باڵایە بوونی هەیە، جا ئێمە هەستی پێ بکەین یان نا، خوداش بەدیهێنەریەتی، ئەم جیهانە سەربەخۆ باڵایە پێویستی بە دەرک و مێشک و زەینی ئێمە نییە و حەقیقیە و بوونی سەربەخۆی هەیە. کەواتە ئایدیالیزمی (میسالی) بابەتی (مەوزوعی) ئەفلاتوون ناکرێت بڵێین نکۆڵی واقیعی خاریجی دەکات، چونکە بەشێویەک لەشێوەکان دانی پێدادەنێت، ئەگەر بە دەستەواژەی سێبەر و تارماییش بێت، چونکە پێی وایە ئەم جیهانە هەستپێکراوەی ئێمە سێبەری جیهانە حەقیقەکەیە (جیهانی ئایدیا، فۆرم) (عالم المثل) کەواتە ئەو بڕوای بە واقیعی خاریجی هەیە بە شێوەیەک لە شێوەکان.

## ٢. ئایدیالیزمی (میسالی) زاتی و خودی

جۆرج بارکلی ڕێبەری ئەم ئاراستەیەیە، پێی وایە ئەوشتەی کە هەیە و مەوجودە بریتییە لەوەی کە دەرک دەکرێت و پەی پێدەبرێت، واتە دێت جیهانی دەرەوە و دەرککردنەکەی لێک گرێدەدات و بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە، واتە هەرچی مەوجودە و بوونی هەیە بریتییە لە بیرۆکەیەک لە زەین و مێشکدا و بەس، هەروەها هەرچی هەستی پێ نەکرێت و دەرک نەکرێت، بوونی نییە. یان دەبێت هەستکەر بێت یان هەستپێکراو (دەرککار و دەرککراو)، یان دەبێت دەرککراوبێت یان دەرککەر، هیچ شتێکی مەوزوعی و بابەتی و سەربەخۆ بوونی نییە لەسەرووی دەرککردنەوە، کەواتە ماددە ئەوەیە کە لەناو مێشکماندایە، ئەو فکرە و بیرۆکەیەیە کە ئێمە دایدەنێین بۆ ماددە، بەم پێیەش نکۆڵی لە بوونی ماددە دەکات بەسەربەخۆیی، هەروەها نکۆڵی لە جیهانی ماددی دەکات بەسەربەخۆیی و بێ دەرککردن، کەواتە بوونی شتەکان پەیوەستە بە دەرکردنیان. کەواتەبوون لای بارکلی بریتییە لە دەرککردن، ئەوەی هەیە بریتییە لەوەی کەدەرکی پێ دەکەین[1].

بارکلی لە گفتوگۆی سێیەمدا لە پەرتووکەکەی «سێ گفتوگۆ لە نێوان هیلاس و فیلۆنۆس»دا تاوتوێی ئەم بابەتە دەکات و دەڵێت: "لە خاوەنی باخچەکە بپرسە بۆچی باوەڕ بە بوونی بەڕوو لە باخچەکەیدا دەکات، ئەوا پێت دەڵێت: بۆیە پێموایە بوونی هەیە، چونکە دەیبینم و هەستی پێدەکەم و دەستی لێ دەدەم، واتە دەرکی دەکات و پەی پێدەبات، پاشان لێی بپرسە بۆچی بڕوات وایە کە درەختی پرتەقاڵ لە باخچەکەتدا بوونی نییە، ئەوا وەڵامت دەداتەوە چونکە نایبینێت لە باخچەکەیدا"، کەواتە ئەوەی باخەوانەکە باوەڕی پێی بوو ئەوەبوو کە دەرکی دەکرد و دەیبینی، کەواتە بوونی شتەکانی بەستەوە بە دەرککردن، نەک هەرئەوەندە بەڵکوو دەرکی کردە بەدیهێنەریش، چونکە شتە ماددییەکان

---

(١) من فلسفتنا، د. محمد باقر الصدر، ل ١١٢.

بوونیان بەئەندازەی پەیپێبردنە.

بەڵام نابێت واش تێبگەین کە بارکلی پێی وایە ئەوەی ئێستا پەی پێنەبەم، بوونی نییە، نەخێر، چونکە زۆر شت هەیە ئێستا دەرکی ناکەیت و نایبینی، بەڵام پێشتر بینیوتن و دەرکت کردوون، کەواتە هەموو ئەوشتانە دەچنە چوارچێوەی بوونەوە، چونکە دەرپێکراوبوونە.

ئەوەی بە «جەوهەری ماددی» ناودەبرێت، بەبۆچوونی بارکلی بوونی نییە، بەڵکوو ئەفسانەیەکی بەتاڵ و بۆشە، هیچ پێویست ناکات بڵێی خودا ماددەی خولقاندووە و مرۆڤیش لە ڕێگەی هەست و هزرەکانییەوە ماددە دەناسێت، بەڵکوو خودا ڕاستەخۆ و بێئامراز بیر و وێنەی دەربارەی ماددە و جیهان لەناو مرۆڤدا خولقاندووە، بۆیە بارکلی دەڵێت: "جیهان گوتاری خودایە بۆ خەڵکی" بیر و ئەفکارەکانی مرۆڤ نە ڕەنگدانەوەی ماددەیە و نە هی شتەکان، بەڵکوو گفتارێکی سەربەست و واڵایە کە خودا ڕاستەوخۆ بەبێ نێوانکاری و بەبێ هیچ هۆکار و ئامرازێکی دیکە بە عەقڵی مرۆڤی ڕاگەیاندووە.

ڕاڤەی ئەم ڕایەی بارکلی ڕەنگە ئاسان نەبێت، چونکە ئێمە ئەگەر جیهان بەسەر دوو بەشدا دابەش بکەین: جیهانی بینراو و هەستپێکراو و جیهانی نەبینراو و هەستپێنەکراو، ئایا گرفتی گەورەمان بۆ دروست نابێت ئەگەر بڵێین بوونی هەر شتێک پەیوەستە بە دەرککردنەوە؟! چونکە هەموومان دەزانین کە جیهانی گەردیلە جیهانێکی نەبینراوە، بەڵام ناشتوانین ڕەتی بکەینەوە، چونکە زانست سەلماندوویەتی.

یان مەرج نییە دەرکی هەموو مرۆڤەکان وەک یەک بێت، زۆر شت هەیە خەڵکێکی زۆر کەم نەبێت دەرکیان ناکات.

فەیلەسووفێکی وەک «فختە»یش، هەمان ڕای هەیە، پێی وایە هەموو ئەو شتانەی بوونیان هەیە ئێمەین، نەک شتێکی تر، هەموو مەعریفەی ئێمە

واتە مەعریفەی خودی خۆمان، هەرچی حەقیقەت هەیە کە تووشی دەبین لە گەردووندا ئەوە لە هێنانەدی خود و زاتی خۆتە، واتە بەس بە نسبەت تۆوە بوونی هەیە، ئەگەرنا بوونێکی سەربەخۆی نییە لە دەرەوەی مێشک و زەینی تۆدا، کەواتە زات و غەیری زات، خود و غەیری خودی کردە یەک شت، لەکۆتاییشدا بەس دان بە خوددا دەنێت نەک ناخود و غەیری خودی کەسەکان، واتە واقیعی خاریجی و دەرەوە.[1]

## ٣. ئایدیالیزمی (میسالی) ڕەخنەیی

کانت هات هەردوو ئاراستەکەی پێشووی ڕەتکردەوە، چونکە وتی مەعریفە نە میسالییەکی ڕەهایە، نە بابەتی و مەزوعی و سەربەخۆیەکی تەواو، بەڵکوو هەردووکیەتی بەیەکەوە، واتە هەم هەستەکانە، کە وێنەی جۆراجۆرمان بۆ دەگوازێتەوە لە جیهانی هەستەوە، هەم عەقڵیشە کە دێت ئەم وێنە گوازراوانە لێک دەدات و کۆیان دەکاتەوە و پەیوەندییان لەنێواندا دروست دەکات، بەڵام ئەم کارەشی بە هاوکاری بەڵگەنەویستە زگماکییەکان و بەدیهەییەکانە (پێش ئەزموونییەکان) (کات و شوێن و کاتیگۆرییەکان (المقولات) (گوتەزا) [2].

کەواتە بەم پێیە مەعریفە و زانین تێکەڵەیەکە لە خود و بابەتدا، لە زات و لە مەوزوعدا، زاتییە لە سوورەتەکەیدا، مەوزوعییە لە ماددەکەیدا، کانت بەم ڕایە کودەتایەکی مەعریفی بەرپاکرد، چونکە ئەو وتی شتەکان هەمووی بەدەوری فکردا دەخولێنەوە و لە سنووری فکر و بنەما فیتری و زگماکییەکان دێن و دەچن، بەپێچەوانەی واقیعییەکان کە دەیان وت فکر و هزر بەدەوری شتەکاندا دەخولێتەوە و بەپێی ئەم دەجووڵێتەوە.

---

(١) قصة الفلسفة الحديثة، د. أحمد أمين وزميله، ل ٢١٦.

(٢) من فلسفتنا، د. محمد باقر الصدر، ل ١٣٧.

کەواتە کانت لە لایەکەوە ئایدیالیزمییە (چونکە بڕوای بە بەڵگەنەویستە زگماکییەکان و بەدیهەییەکانە (پێش ئەزموونییەکان) (کات و شوێن و کاتیگۆرییەکان (المقولات) هەیە، چونکە ئەمانە پێش ئەزموون کردن بەشێوەی زگماکی بوونیان هەیە)، لەلایەکی دیکەشەوە ڕیالیزمییە، (چونکە باوەڕی بە جیهانی دەرەوە هەیە، کە هەستەکان ڕەوانەی مێشکی دەکەن، بەڵام دەرککردنی جیهانی ڕیالیزمی بەبێ بنەما ئایدیالیزمە زگماکییەکان ئەستەمە.)

لەڕاستیدا فەلسەفەی کانت زیاتر دەشکێتەوە بەلای ئایدیالیزمی خودیدا (میسالی زاتی)، چونکە لەگەڵ ئەوەی داندەنێت بە بوونی شتەکان لە خودی خۆیاندا، بەڵام پێی وایە مەعریفە پێیان شتێکی ئەستەمە، وەک ئەوەی بڵێیت هیچ شتێک نییە، کەواتە بەم پێیە مەعریفە لای ئەو بەرەو زات دەچێت نەک مەوزوع، ئەگەر بە ئەندازەیەکی کەمیش بێت.

## ٤. ئایدیالیزمی (میسالی) ڕەها

ئەم ڕێبازە (شلنگ) داینا و هیگڵ گەیاندییە لوتکە.

شلنگ هات خود و خودا و بوونی کردە یەک شت، واتە مرۆڤ خۆی، لەگەڵ خودا، لەگەڵ بوونی دەرەوە و واقیعی خاریجی یەک شتن، شلنگ دەڵێت: عەقڵی ڕەها بریتییە لە یەکگرتن و تێکەڵبوونی تەواوەتی لەنێوان خود و خودا و شتەکاندا. خۆی دەکات بە دوو بەشەوە: جیهانی حەقیقی و واقیع لەگەڵ جیهانی میسالی و عەقڵی، دەیەوێت ئەم دوو بەشە تێکەڵ بکات، بۆیە بە فەلسەفەی شلنگ دەوترێت «فەلسەفەی لێکدان و تێکەڵ کردن»[1].

هیگڵ هات و وتی: حەقیقەتی کۆتایی کە بنەمای هەموو حەقیقەتەکانە

---

(١) قصة الفلسفة الحديثة، د. أحمد أمين وزميله، ل ٢٣٣.

بریتییە لە عەقڵ (ڕۆح)، کۆڵەکەی حەقیقەت بریتییە لە فکر، هەربۆیە پێویستە هەموو شتێک بە ڕاڤەیەکی عەقڵی ڕاڤە بکرێت. واقیع و فکر یەک شتن.

هیگڵ تەئکیدی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە بەکارهێنانی سیستەمی لۆژیکی بەشێوازێکی ورد و دەقیق دەمانگەیەنێت بە فیکر و هزری ڕەها.

میسالی ڕەها ئاڕاستەیەکی فەلسەفییە، کە پێیوایە عەقڵی ڕەها یان عەقڵی خودایی بوونی هەیە لە سروشت و بووندا، (عەقڵی خودایی شاراوەیە لە سروشتدا، سروشتیش لە هەموو جووڵە و گەشەیەکیدا ملکەچە بۆ ئەم ڕەهایە، ئەم ڕەهایە جووڵەکەی تێکەڵی جووڵەی بوون بووە، بەشێوەیەک جووڵەکەی بووە بە سەرچاوەی جووڵەی سروشت و بوون، ئەم جووڵەیەی دیاردە سروشتییەکان تەنیا و تەنیا ڕەنگدانەوەی جووڵە و گەشەی (ڕەها)ن.

هەربۆیە هەندێک لە توێژەران میسالی ڕەها لەلای شلنگ و هیگڵ بە نزیک لە وەحدەتولوجود (یەکێتی بوون) لێکدەدەنەوە، کە مەبەستیشیان پشتیوانی کردن بووە لە بیروباوەڕ و عەقیدەی مەسیحییەت، کە دەڵێت: "خودا لە مەسیح و بووندا توایەوە و ئاوێتە بوو".[١]

هیگڵ پێی وایە خودا کە ویستوویەتی خۆی بسەلمێنێت، هاتووە خۆی هێناوەتە سەر بوونی مرۆڤ، پاشان جارێکی دیکە چووەتەوە ناو حەقیقەتی خۆی.

هیگڵ مێژوو دابەش دەکات بۆ سێ قۆناغی سەرەکی:

١. قۆناغی بوونی موجەرەد، پێش دروست کردنی بوون و توانەوەی تێیدا.

٢. قۆناغی بوونی سروشتی و توانەوە تێیدا، توانەوەی خودا لە مەسیحدا.

٣. پاشان قۆناغی بوونی ڕۆحی دوای لە خاچدانی.

---

(١) قصة الفلسفة الحديثة، د. أحمد أمين وزميله، ل ٢٥٥.

## ٥. ئایدیالیزمی (میسالی) فیزیایی

دوای تێڕوانینێکی دوورودرێژی فیزیا و داننان بە سەربەخۆبوونی مادده و بابەتی بوونی، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستدا و دوای پشکنینی مادده و دەرکەوتنی بەشە وردەکانی ناوی، ئەوەی بۆ ڕوونبۆوە، کە مادده ئەوە نییە کە لە واقیعی دەرەوە دەیبینین، کە وا هەست دەکەی واقیعێکی سەربەخۆ و تەواو ماددی و بابەتی هەیە، بەڵکوو مادده هێزێکی (طاقة) هەستپێنەکراوە، هەتا گەیشت بەوەی «کارلس بیرسۆن» بڵێت: مادده ناماددییە و لە جووڵەی بەردەوامدایە.

بەمشێوەیە لە سەدەی بیستدا، مادده نزیک بۆوە لە فکرێکی ڕووت، بەڵکوو لای زانایان بوو بە کردەیەکی بیرکاری و ڕێژەیەک لە ڕێژەکان کە بە پێوەرە بیرکارییەکان دەپێورێت[1].

## هەڵوێستی قورئان و فکری ئیسلامی دەربارەی سروشتی مەعریفە

لە فکری ئسلامیدا جیاکاری ناکرێت لە نێوان و خود و بابەتەدا (الذات والموضوع)، بەڵکوو لێرەدا ئێمە واقیعێکی سەربەخۆمان هەیە لەدەرەوەی عەقڵ و هۆش و مێشک و زەیندا، بەڵام گومان لەوەدانییە کە ئەم واقیعە هەموو حەقیقەت و ڕاستی ناگەیەنێت، بەڵکوو پێویستی بەدوو شتی سەرەکی تر هەیە، یەک: هەستەکان، دوو: زاتێکی عاقڵ کە دەرکی بکات و هەستەکان لێکبداتەوە و کۆیان بکاتەوە، دەتوانین بەڵگە بەم ئایەتە قوئانییە بێنینەوە:

﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [النحل: ٧٨]

---

(١) من فلسفتنا، د. محمد باقر الصدر، ل ١١٧.

واتە: «خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێک بزانن، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و تێگەیشتنی بۆ دابین کردوون، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.»

کەواتە دەتوانین لەژێر ڕۆشنایی قورئان و ڕاوبۆچوونی زانایان ئەم سێ بنەمایە بخەینەڕوو بۆ بابەتی سروشتی مەعریفە:

١. شتەکان و ماددە حەقیقەتی جێگیری خۆیانیان هەیە بەبێ ڕەچاوکردنی دەرکردن وپەی پێبردنی عەقڵ، واتە عەقڵ پەیان پێ ببات یان نا، دەرکیان بکات یان نا، ئەو شتانە بوونیان هەیە و جێگیرن.

٢. دەرککردنی ئێمە بۆ شتەکان مەرج نییە هەموو کاتێ تەواو تەواو هاوتای ئەسڵی شتەکان بێت، واتە ناکرێ بۆ هەموو کەسێک و بۆ هەموو شتێک و لە هەموو حاڵەتێکدا بڵێین مەعریفەکە هاوتای حەقیقەتە خاریجییەکە و واقیعەکەیە، بەڵام هیچ بەربەستێکیش نییە کە مرۆڤ بگات بە حەقیقەتی شتەکان و دەبێت هەر بشگات، دەبێت ئەوپەڕی توانای خۆی بەکاربێنێت بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی شتەکان، لێرەوە فکری ئسلامی ناوەندگیر بوو لەنێوان هەردوو قوتابخانەی میسالی و واقیعی، چونکە میسالییەکان دوورن لە دونیا و واقیع و بینراو و هەستپێکراو، هەموو شتێکیان لە خودی مرۆڤ و هۆش و عەقڵەکەی کورت هەڵێناوە و پێیان وایە ئەوەی هەیە لە عەقڵەوەیە نەک لە واقیع، لەگەڵ ئەوەی واقیعی خاریجی شتێکی هەستپێکراو و نکۆڵی لێنەکراوە و ناکرێ نکۆڵی لێبکرێت، چونکە هەمووی بەڵگەی بەهێزە لەسەر بوونی خودا.

واقیعییەکانیش هەموو شتێکیان لە واقیعی خاریجی کورت هەڵێناوە و نکۆڵی لە هەموو شتێک دەکەن کە بەرهەست و هەستپێکراو نەبێت، بۆنموونە غەیبیات، هەتا گەیشت بەوەی بێن نکۆڵی لەسەربەخۆیی عەقڵ بکەن، چونکە پێیان تەنیا ئاوێنەی ماددەیە و بەس. کەواتە یەکێکیان ماددی و ئەویتر عەقڵی.

بەڵام ئیسلام هات دانی نا هەم بە واقیع و جیهانی ماددی، هەم بە جیهانی

ڕۆحی و نامادی و عەقڵ، چونکە هەردووکیان بوونی سەربەخۆیان هەیە و تەواوکاری یەکترن، هەروەک خودا دەفەرموویێت:

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ [فصلت: ٥٣]

واتە: «ئێمە لە ئاییندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەردا و لە خودی خۆیشیاندا (بێگومان ئاشکرایە کە لەسەردەمی زانستیدا چەندە نهێنییەکانی بوونەوەر ئاشکرا بووە.زاناکان بە گشتی و زاناکانی ئەستێرەناسی سەرگەردانن لە وردەکاری و دامەزراوی و گەورەیی و فراوانی ئەم گەردوونە، هەروەها لە ئاڵۆزی جەستەیی و عەقڵیی و دەروونی نادەروونی ئادەمیزاد)، ئەمەش بۆ ئەوەی تا چاک بۆیان ڕوون بێت و دڵنیا بن کە ئەو زاتە حەق و ڕاست و ڕەوایە.»

کەواتە هەڵوێستی فکری ئیسلامی میانڕەوترین هەڵوێستە و ناوەندگیری هەردوو ئاراستەکەیە.

**مەعریفە لە فکر و فەلسەفەی ئیسلامیدا لەسەر دوو کۆڵەکەی سەرەکی وەستاوە:**

١. تەوحید و تاکانەیی خودا و گەڕان بەدوایدا، چونکە چەقی مەعریفەی ئیسلامی بریتییە لە خودایەکی تاکانە.

٢. دژایەتیکردنی گومان و گومانگەرایی و ڕۆچوون تێیدا، واتە مەعریفەی ئیسلامی هەوڵی بۆ دامەزراندنی مەعریفەی یەقینییە و ئیمانیش لەسەر بنەمای یەقین نەبێت دانامەزرێت، بۆیە لە فکری ئیسلامیدا یەقین و ئیمان زۆرجار بەیەک شت دەربڕدراون.

## تایەتمەندییەکانی تیۆری مەعریفە لە فکر و فەلسەفەی ئیسلامیدا

١. واقیعیبوون، واتە حەقیقەتی دەرەکی و خاریجی بوونی سەربەخۆی هەیە لەدەرەوەی مێشک و عەقڵدا.

٢. دیاریکردنی سەرچاوە سەرەکییەکانی مەعریفە بە: عەقڵ و هەست و وەحی.

٣. دروستکردنی پەیوەندی تەواوکاری لەنێوان هەرسێ سەرچاوە سەرەکییەکەی مەعریفە (عەقڵ و هەست و وەحی) و نەهێشتنی دژیەکییەکان لەنێوانیاندا.

٤. گەڕاندنەوەی مەعریفەی نایەقینی بۆ مەعریفەی یەقینی و یاسا و بنەما عەقڵیی و فیترییە گشتییە یەقینییەکان و زانست و ئەزموونی سەلمێنراو.

٥. تەواوکاری نێوان سەرچاوەکانی مەعریفە، تەواوکاری لەنێوان عەقڵ و هەست و هەست و عەقڵ و عەقڵ و نەقڵ و نەقڵ و عەقڵ، زانست و عەقڵ و نەقڵ بەیەکەوە.

٦. بەکارهێنانی گومان وەک ئامراز نەک وەک ئامانج، نەگشتاندنی گومان بۆ هەموو کەس و ئاست و بابەتێک.

٧. لەسەرووی هەموویەوە مەعریفە و زانین و زانست لە ئیسلامدا ئامانج نییە بەڵکوو ئامرازە بۆ کار و کردەوە، واتە ئیسلام جیاکاری ناکات لەنێوان مەعریفە و عەمەلدا، واتە مەعریفەیەکی ناکردەیی و ناعەمەلی نییە، بەڵکوو مەعریفەی بۆ خزمەت و بۆ کردەوە دەوێت.

٨. مەعریفەی مرۆڤ مەعریفەیەکی ڕێژەییە: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾[1]. واتە: «لە سەروو هەموو خاوەن زانست و زانیارێکەوە زانا و شارەزاتر هەیە.» ﴿وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾[2]. واتە: «هیچتان پێ نەبەخشراوە لە عیلم و زانست تەنیا شتێکی کەم نەبێت.»

---

(١) يوسف ( ٧٦ ).

(٢) الاسراء ( ٨٥ ).

٩. دڵنیایی و یەقین بنەمای مەعریفەیە، گومان و دوودڵیش ڕەتکراوەیە، ﴿إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنْفُسُ﴾(١). واتە: «ئەوانە تەنیا شوێنی گومان و ئارەزووی دەروونە نەخۆشیەکانیان دەکەون.»

١٠. خودی مەعریفە و بنەما گشتییەکان ناکرێت ڕێژەیی بن، چونکە ئەگەر وابێت ڕێک دەبێتە سەفسەتە و ڕێبازی سوفستائییەکان و هیچ حەقیقەتێکی جێگیر و نەگۆڕ بوونی نامێنێت، هیچ ئەخلاق و ڕەوشت و بەها بوونی نامێنێت و هەمووی دەکەوێتە ژێر گومان و ڕێژەییبوونەوە، ئەمەش بە داڕووخانی فکری و ئەخلاقی و ... کۆتایی دێت.

١١. جیاوازی و ڕاجیایی مەعریفی و فکری شتێکی ئاسایی و ڕێپێدراوە با لە شتە ئایینییەکان بێت، یان تێگەیشتن لە دەق و قورئان و فەرموودە، ئەمەش بە قورئان و فەرموودە و ڕاوبۆچوونی زانایان و مێژوو سەلماوە.

---

(١) النجم ٢٣.

# باسی بوون (مبحث الوجود)

وەک باسمان کرد فەلسەفە لە سێ بابەتی سەرەکی دەکۆڵێتەوە

١. فەلسەفەی بوون، بوونناسی (الوجود) (Ontology) (ئۆنتۆلۆژیا).

٢. فەلسەفەی ناسین و زانین، تیۆری زانین، (المعرفة) (Epistemology) (ئیپستمۆلۆژیا).

٣. فەلسەفەی قیەم و ئەخلاق و بەهاکان، بەها ناسی (القیم والأخلاق) (Axiology) (ئیکسیۆلۆژیا).

فەلسەفە لە سەردەمی پێش (سوقرِات)دا بریتی بووە لە تێڕامان و لێکۆڵینەوە لە بوون و گەردوون و سروشت، بۆیە گرنگییەکەیان بریتی بوو لە زانینی ئەسڵی ئەم گەردوونە، ئاخۆ لە چی دروستبووە، بیروڕایان جیاواز بوو، بۆ نموونە:

«تالیس» دەیوت: "ئەسڵی بوون ئاوە."

«ئەنەکسیمەندر»یش دەیوت: "ئەسڵی بوون «ئاپایرۆن»."[1]

«ئەناسکیمنس» دەیوت: "ئەسڵی بوون هەوایە."

«ئەمبادوکلیس» دەیووت: "ئەسڵی گەردوون ئاگر و هەوا و گڵ (خاک) و ئاوە."

لەگەڵ چەندین پێناسە و بیروڕای فەیلەسووفانی دیکەش، کەواتە:

---

(١) ئەنەکسیمەندریش دەیوت: ئەسڵی بوون شتێکی بێ شکڵ و دیارینەکراوە کە ئەو خۆی ناوی (ئاپایرۆن)ی لەسەر دادەنا. ئەپایرۆنیش لە زمانی یۆنانیدا واتە: دیارینەکراو، بێسنوور، ناکۆتا.

فەلسەفە لە پێش سوقرات لە ئەسڵی بوونی دەکۆڵیەوە و فەلسەفەیەکی تەواو وجودی بوو، چونکە کورت هەڵاتبوو لە خوێندنەوەی وجود و بوون، بەڵام دواتر لە سەردەمی سۆفستاییەکان و سوقراتدا فەلسەفە کورت هەڵاتبوو لە: مرۆڤ، حەقیقەت و ڕاستی، حەق، دادگەری، خێر و شەڕدا، هەر بۆیە سوقرات بەوە بەناوبانگە کە فەلسەفەی لە ئاسمانەوە دابەزاندە سەر زەوی و زیاتر تایبەتی کرد بە مرۆڤ و بابەتەکەکانی خێر و شەڕ و... هتد.

پێناسەی سوقرات (٤٦٩ - ٣٩٩ پ. ز) بۆ فەلسەفە: گەڕانی ئەقڵە بە دوای نێوەڕۆکی ئەو شتانەی دەمانگەیێننە چاکە. دوای ئەمانیش ئەفلاتوون (٤٥٧ - ٣٤٧ پ.ز) پێناسەی بۆ فەلسەفە بریتیبوو لە: گەڕانە بۆ کرۆکی بوونەکان و یاسا جوانەکان تا یەکەم بەدیهێنەریان بناسرێت، شەرەفی سەرکردایەتی هەموو زانستەکانی هەیە. دواتر ئەرستۆ (٣٨٤ - ٣٢٢ پ.ز) پێناسەی فەلسەفەی بەم شێوەیە کرد: زانستێکی بیردۆزییە بۆ بنەما و هۆکارە سەرەتاییەکان. هەربۆیە فەلسەفە لە لای ئەرستۆ زۆر زۆر فرەوان بوو، تا وایلێهات یەکسان بوو بەزانست، واتا: زانستەکانی هەمووی لەخۆ دەگرت.

بابەتی بوون زۆر فراوانە، چونکە هەموو هەبوویێک دەگرێتەوە، هەموو ئەو شتانەی پەیوەستن بە بوونەوە، سروشت و ئەودیو سروشت دەگرێتەوە، باسی ئەوە لەخۆدەگرێت ئایا ئەم بوونە بوونێکی ماددیە یان نامادی و ڕۆحی، یان هەردووکیان، سەرەتای بوون چۆن بووە؟ ئەسڵی بوون چی بووە؟ ئەم بوونە خالق و دروستکاری هەیە یان نا؟ بوونواجب (واجب الوجود)، بوونموموکن (ممكن الوجود)، بوونمەحاڵ (مستحيل الوجود)، کات و شوێن و هۆ (العلة)، بەرهۆ (المعلول)، جەوهەر، عەرەز، هیولا، سورەت، ماددە، فکر، نەفس، پەیدابوو (الحادث)، کۆن، بێ سەرەتا (القديم) و .... چییە؟ پەیوەندی خودا بە بوون وبوونەوەر و گەردوونەوە چییە؟ لەگەڵ چەندان بابەتی تری گرنگ ....

مێژوونووسانی فەلسەفە «باسی بوون» و «مێتافیزیکا: واتە ئەودیو سروشت»

بە یەک شت دادەنێن و پێیان وایە یەک شتن، بەڵام ئەرستۆ پێشنیاری کردووە بابەتی بوون بە «فەلسەفەی یەکەم» ناوبنرێت، ئەوەش بۆئەوەی لە فەلسەی دووەم جیاببێتەوە کە «زانستی سروشتە» واتە ویستوویەتی سروشت و ئەودیوسروشت لێکجیابکاتەوە، بەڵام ئەم پێشنیارەی ئەرستۆ نەهاتەجێی و زۆری نەبرد و دوای مردنی یەکێک لە قوتابییەکانی «ئەندرۆنیکۆس ئەلرودسی» کە لە هەمان کاتدا تاوتوکاری فەلسەفەکەشی بوو هات و «میتافیزکا»ی بەکارهێنا بۆ ئەو بوارەی ئەرستۆ ناوی نابوو «فەلسەفەی یەکەم».

وەڵامی پرسیارەکان دەربارەی بوون و وجود جۆراوجۆرن بەپێی فەیلەسووف و بەپێی قوتابخانە فەلسەفییەکان دابەشبوونە بۆ چەندان قوتابخانە و تەوژم و ئاراستە جیاواز.

بۆنموونە پرسی پەیوەندی نێوان هۆشیاری (الوعی) و مادە، ئایا کامەیان لەپێشترە و ئەسڵە؟ هۆشیاری یان مادە، سروشتی پەیوەندی نێوان مادە و هۆش چۆنە؟ ئایا «هۆشیاری دەربارەی جیهان» لەگەڵ «جیهان» خۆیدا ڕێک وێکدێتەوە؟ ئایا «هۆشیاری» دەتوانێت بەڕاستی و وردییەوە وێنەی جیهان بداتەوە؟

فەیلەسووفان هەر لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ دابەشبوونە بۆ دوو ئاراستەی سەرەکی.

ماددییەکا: پێیان وایە مادە ئەسڵە «هۆشیاری» لاوەکییە، واتە هەموو شتەکان ماددین و پشت بە مادە دەبەست.

میسالییەکان: پێیان وایە «هۆشیاری» ئەسڵە و لەپێشترە لە مادە، تاکە ڕاستەقینە بریتییە لە «هۆشیاری»، زانین و مەعریفەش ڕەنگدانەوەی مادە نییە، بەڵکوو تەنیا پەیبردنی خودی هۆشیارییە.

لێرە ئێمە کەمێک بە درێژی باسی ئەم دوو ئاراستە فەلسەفییە سەرەکییە دەکەین

## یەکەم: ئاڕاستە و ڕێبازی ماددی (ماتریالیزم)

ماددی، ئەزموونی، واقیعی، هەستی، وەزعی، هەموویان ناون بۆ یەک ناوەڕۆک با لە جوزئیاتیشدا جیاواز بن، بەشێوەیەکی گشتی کۆکن لەسەر خاڵ و بنەما گشتییەکان.

پوختەی بۆچوونی ئەم تیۆریایە بریتییە لە: سەنتەربوونی ماددە و سەربەخۆبوونی، عەقڵیش تەنیا ئاوێنەیەکە بۆ وێناکردنی ئەو شتانەی کە هەستەکان وەریدەگرن و دەیان گەیەنن، عەقڵ تەنیا ڕەنگدانەوە و دەنگدانەوەی واقیع و ماددەیە و بەس. نموونەی ئەم تیۆریایە لە کۆندا: قوتابخانەی سروشتگەرا سەرەتایی و کۆتاییەکانی یۆنان، سوفستائییەکان، ڕەواقییەکان، ئەبیقۆرییەکان ...

نموونەی ئەم تیۆریایە لە سەردەمی نوێدا: هەموو قوتابخانە ماددییە ئەزموونییەکان، داروینییەکان، مارکسییەکان، وجودییەکان، وەزعییە مەنطیقییەکان، فۆریدییەکان، پراگماتییەکان، قوتابخانەی کۆمەڵایەتی ئوگست کۆنت و دۆرکایم.

فەلسەفەی ماددیگەرایی بە ئەندازەی فەلسەفە کۆنە و هەر لەسەرەتاکانی دەرکەوتنی فەلسەفەی یۆنانییەوە چەکەرەی کردووە و بە ئەندازەی جیاواز خۆی دەرخستووە بە درێژایی مێژوو و ئێساشی لەگەڵدابێت، بەڵام لەسەردەمی کۆندا و لەسەرەتاکانی فەلسەفەی یۆنانییەوە ڕاڤەیەکی ماددی بۆ گەردوون و بوون دەکرا، هەریەکە و ڕایەکی هەبوو، هەبوو دەیوت ئەسڵی بوون ئاوە، یان ئاگر، یان خۆڵ و خاک، یان هەوا، یان هەموویان بەیەکەوە، بەڵام ماددیگەرایی لەلای «دیمۆکریتس» (٣٦١ - ٤٧٠ پ. ز) بەتەواوی دەرکەوت، چونکە ئەو پێی وابوو، هەموو بوونەوەرەکان لە جەوهەرە تاکییەکان پێکدێن، کە بۆشاییەک نێوانیان جیادەکاتەوە، ئەمەش بریتییە لە بەشەکییە ژمارە ناکۆتاییەکان،

ئەگەری دابەشکردن هەڵناگرن و دابەش نابن، بە دوو سیفەتی بنەڕەتیش جیادەکرێنەوە، ئەوانیش: شێوە و بڕ، بە شێوەیەکی میکانیکی دەبزوێن، لە جووڵەکەیانەوە لەسەر شێوەی جیاواز کودەبنەوە و لەمەشەوە وێنەی هەمەجۆر پەیدا دەبێت، لێرەشەوە بوونی شتەکان پەیدادەبن، واتە پێکهاتنیان، خۆ ئەگەر ئەم جەوهەرانە لەیەکتر جیابوونەوە و ترازان، ئەوا هەڵوەشانەوە و تێکچوون و خراپبوونی شتەکان ڕوودەدات، واتە هەڵوەشانەوەی بوونەوەرەکان، تەنانەت دەروون (النفس) بە ڕای «دیمۆکریتس»، لەم جەوهەرە مادديیانە پێکدێت، بەڵام جەوهەرەکانی نەفس و دەروون جووڵەیان خێراترە و وردترن و شێوەیان لووسترە.

بەڵام زۆری نەبرد و سوکرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ هاتن و دژی ئاراستەی ماددیگەرایی وەستانەوە، هەرچەندە ئەرستۆش بە شێوەیەک لە شێوەکان ماددییە، بەڵام وەک دیمۆکریتسیش نابێت.

دوای ئەمانە ئەبیکۆر (٢٧٠ پ. ز) و لۆکریتیۆسی شاعیری ڕۆمانی کاریان بۆ زیندووکردنەوە ڕێبازی ماددیگەری کرد.

بەڵام لە سەدەکانی ناوەڕاست و لە فەلسەفەی مەسیحی و ئیسلامیدا بەتایبەتی ئەم تەوژمە وردەوردە خامۆش بوو، تاوەکو سەدەی حەڤدەیەم و دیسانەوە سەریهەڵدایەوە، بەڵام ئەم جارەیان لەژێر ناوی زانست و فیزیادا، ئەم تەوژمی ماددییە هەم زانایانی گرتەوە هەم فەیلەسووفان، بۆنموونە: گالیلۆ و نیوتن و هۆبز و دێڤید هیۆم و مارکس و ...، هەموو ئەم هێز و گرووتینەی پەیداشی کرد بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ بانگەشەی زانست و پشتیوانەکانی، وەک زانستی جیۆلۆجی و فیزیا و بایەلۆژی، هاتن تیۆری پەرەسەندنی داروینیشیان بەکارهێنا و هەموو زیندەواران و عەقڵ و هۆش و مرۆڤیان گەڕاندەوە بۆ ماددەی کەڕ و کوێر و بێ ژیان و گیان!

**پوختەی بیر و ڕای تیۆریای ماددی، ئەزموونی، واقیعی، هەستی، وەزعی[1]**

١. گەردوون پێک هاتووە لە یەک پێکهاتە کە بریتییە لە ماددە، غەیری ماددە و سروشتی هەستپێکراو شتێکی دیکە بوونی نییە.

٢. نکووڵی کردن لە هەموو غەیبیات و شتە پەنهانەکان، هەرچی ئەودیو سروشت و ماددە و واقیع بێت بوونی نییە، نکووڵیکردن لە خودا، واتە ئەوانە بڕوایان بە دروستکار و بەڕێوەبەری گەردوون نییە، دەڵێن: بە هیچ شێوەیەک خودا گەردوونی دروست نەکردووە بەڵکوو گەردوون:

ا- هەر هەبووە

ب- بۆ خۆی خۆی هێناوەتە بوون.

ج- بە ڕێکەوت دروستبووە.

د- طەبیعەت و سروشت ئەم گەردوونەی هێناوەتە بوون.

هـ- ئەم گەردوونە خەون و خەیاڵە و لە واقیعدا بوونی نییە.

ماددییەکان و ئەزموونگەراکان بەشێوەیەکی گشتی بڕوایان بە یەکێک لە مانە هەیە. هەروەها نکووڵی لە سەرجەم ئایین و پێغەمبەران و وەحی و ڕۆح و زیندووبوونەوە و کتێبە ئاسمانییەکان دەکەن، چونکە وەک ئاماژەمان پێدا ئەوان بڕوایان بە خودا نییە، کەواتا ئاشکرایە باوەڕیان بە خودا نییە تا بگاتە سەر لق و پەلەکانی باوەڕداری و ئایین و کتێبە ئاسمانییەکان، چونکە ئەمانە هەموویان نامادی و هەستپێنەکراو و ئەزموون نەکراون، نەک هەر ئەمە بەڵکوو پێیان وایە ئایین و پێغەمبەران شتێکی خوڕافی و ناڕاستە و بۆ خەڵکی ساویلکە و نەزان و نەفامە، تەنیا بۆ خەڵەتاندنی مرۆڤ و مرۆڤایەتی هاتووە.

---

(١) ئەمە ماددی ئیلحادییە، ئەگەرنا ئێمە ماددی باوەڕداریشمان هەیە، کە بڕوای بە خودا یان ئایین یان ئەخلاق یان ....، هەیە، کەواتە ئەم بنەمایانە هی هەموو ماددییەکان نییە.

نەک هەر ئەوەش، بەڵکوو ئایین بە سەرچاوەی گێلکردنی مرۆڤایەتی دەزانن، وەک مارکس دەڵێت: (الدين أفيون الشعوب)، واتا: "ئایین تریاکی گەلانە" و بۆ سەرخۆشکردن و مەستکردنی نەتەوەکان و مرۆڤ و مرۆڤایەتی هاتووە و دروستکراوە، دیارە پێناسەکەیان لە تێڕوانینیان لە ئایینی مەسیحیەت و ئینجیل و قەشە و کڵێساوە سەرچاوەی گرتووە و دواتریش ئەو جیهانبینییەیان بەسەر سەرجەم ئایینەکاندا گشتاندووە. ئەم تیۆریایە بۆ هەموو شتێک تەفسیر و ڕاڤەی ماددی دەکات.

٣. ماددییەکان و ئەزموونگەراکان پێیان وایە ئەخلاق نیسبی و ڕێژەییە و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک و لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت، بەمەش هەر کەس لە ئاست خۆی و کۆمەڵگەکەی بۆ ئەخلاق دەڕوانێت، کەواتە نەگۆڕی ئەخلاقی و بنەمای ئەخلاقی لای ئەوان نییە.[1] ئەمەش کاریگەری نێگەتیف و سەرلێتێکدەری بۆ زۆربەی کۆمەڵگەکان پێشنیار کردووە، خۆ ئەگەر هات و ئەوەی مولحیدان پێیان ئاساییە و بۆ خۆیان بە ڕەوای دەبینن بوو بە یاسا و لە وڵاتان جێبەجێ بوو، ئەوە کارەساتی مرۆیی ڕوودەدات و ئەبێتە کاری سەرپێیی و هیچ بەهایەک بۆ هیچ هەبوویەک لەنێو هیچ کۆمەڵگەیەکدا نامێنێتەوە، ئەوەتا ئەوان هیچ پێیان شەرم نییە کە مومارەسەی هەوا و ڕەگەز و ئارەزووی خۆیان لەگەڵ خوشک و دایک و کەسە نزیکەکانی خۆیان بکەن و گۆشتی منالّ بکوڵێنن و لەگەڵ گیانداران دەست تێکەڵاو بکەن و ئەوەی بووە مایەی ئاسوودەییان دەستی بۆ بەرن، ئەگەر ئاسوودەیی ئەوان لەسەر شانی بەدبەختی چواردەوریش بێت، بەڵام ئەوەی باسکرا وەک فیکر، ئەگەرنا مەرج نییە هەموویان بە کردار بییکەن یان هەموویان بەکردەیی باوەڕیان پێببێت.

---

(١) الموسوعة الميسرة فى الأديان والمذاهب المعاصرة، (٨٠٥)، صراع مع الملاحدة، عبدالرحمن حسن حبنكة الميدانى (١٥٠)، كواشف زيوف فى المذاهب الفكرية المعاصرة (٥١١).

٤. زانست ئەو زانستەیە کە ئەزموونی بێت نەوەک تیۆری و نەزەری، پێیانوایە هەر شتێک لە ڕێی دۆزینەوەی زانستییەوە نەزانرێت و دەرنەکەوێت بڕوای پێناکرێت، هەر شتێکیش لە ڕێگەی تاقیگە و زانستە جیاوازەکان نەدۆزرێتەوە بوونی نییە، هەربۆیە خودا دەخەنە بەر ئەو پێوەرە زانستییانە، بۆیە باوەڕی پێناهێنن، لای ئەوان یاسا گەردوونییەکان خودان، بۆیە «داوکینز» ڕێبەری گەورەی مولحیدەکانی ئەم سەردەمە دەڵێت: "ئەگەر دەڵێن خودا بریتییە لەو سیستەمانەی ئەو بوونەوەرە بەڕێوەدەبات، ئەوا ئێمەش بڕوامان بەو خودایە هەیە، بەڵام پێمانوایە ئەو سیستەمانە پێویستیان بەوە نییە لێیان بپاڕێینەوە بۆ ئەوەی بە هانامانەوە بێن!"

٥. سەرچاوەی مەعریفە و زانین تەنیا هەست و میتۆد و مەنهەجی ماددیە و غەیری هەست و مادده و ئەزموون هیچ شتێکی تر جێگەی متمانە پێکردن نین بە عەقڵیشەوە، عەقڵ تەنیا بۆ لێکدانەوەی ئەمانەیە.

٦. زۆربەی ماددی و ئەزموونگەراکان بۆ ڕاڤەی گەشەسەندنی ژیان بڕوایان بە تیۆری داروین هەیە و پێیان وایە زیندەوەران بە پەرەسەندن بەمرۆ گەیشتوون و هیچ هێز و دەستەڵاتێکی دەرەکی لەدەرەوەی مادده و بوون و گەردوون کاریگەری نەبووە و بوونی نییە، بەڵکوو بۆ خۆی گەشەی سەندووە و پەرەی سەندووە!

## دووەم: ئاراستە و ڕێبازی میسالی (ئایدیالیزم)

میسالی پێچەوانەی واقیعگەراییە، چونکە واقیعگەرایی بڕوای بە بوونی سەربەخۆ و بابەتیانەی واقیعی خاریجی و شتەکان هەبوو لەدەرەوەی مێشک و زەینی مرۆڤ، بەڵام میسالی بەپێچەوانەوە و بڕوای بە بوونی سەربەخۆ و بابەتیانەی واقیعی خاریجی و شتەکان نییە لە دەرەوەی مێشک و زەینی مرۆڤدا،

واتە داننانێت بە شتێک لەدەرەوی عەقڵدا، کەواتە ئەوەی عەقڵ دەرکی نەکات بوونی نییە، بەم پێیەش مەعریفە و وجود، زانین و بوون دەبنە یەک شت، زانینی هەر شتێک بوونەکەیەتی، زانین و بوون دوو ڕووی یەک دراون، کەواتە بەم پێیە سروشتی مەعریفە هەمان سروشتی بوونە، بۆنموونە تۆ کاتێک سەیری گڵۆپی ماڵەکەی خۆت دەکەی، بنین و هەستکردنی تۆ بۆ خودی گڵۆپەکەیە، کەواتە لێرەدا ئەوە نییە بڵێی شتێکی سەربەخۆ هەیە لەدەرەوەی مێشکمدا و وێنەیەکیش لەدەرەوە، بەڵکوو هەموو بوونی گڵۆپەکە بریتییە لەو وێنەیەی کە لە مێشکدایە و بەس.

ڕێبازی میسالی ئایدیالیزم چەند جۆرێکی هەیە:

١. **ئایدیالیزمی (میسالی) مەوزوعی و بابەتی**

٢. **ئایدیالیزمی (میسالی) زاتی و خودی**

٣. **ئایدیالیزمی (میسالی) ڕەخنەیی**

۴. **ئایدیالیزمی (میسالی) ڕەها**

۵. **ئایدیالیزمی (میسالی) فیزیایی**

هەموو ئەمانەمان بەدرێژی باسکردن.

### سوفستائییەکان

سوفستائییەکان یەکێک لەو تەوژمە فەلسەفەیانەن کە تێڕوانینی خۆیانیان هەبووە بۆ بوون و وجود، بۆنموونە فەیلەسووفی یۆنانی «گۆرگیاس_ ٣٨٠ پ.ز» بۆچوونی خۆی بەم شێوەیە دەربڕیوە:

١. هیچ شتێک بوونی نییە.

**٢.** ئەگەر هەشبێت، مرۆڤ ناتوانێت پەیان پێ ببات و بیانزانێت.

**٣.** ئەگەر گریمان زانیشی و پەیشی پێبرد، ئەوا ناتوانێت بیگەیەنێت و گوزارشت لەو مەعریفەیە بکات کە پێی گەیشتووە و بیگەیەنێت بە خەڵکانی دیکە.[١]

هەروەها فەیلەسووفی یۆنانی «بیرۆن _ ٢٧٥ پ. ز» گومانی لە هەموو شتێک هەبوو، وەک دەڵێت: پێویستە متمانەمان بە عەقڵ و هەستەکان نەبێت و ڕا و بۆچوونمان نەبێت، پێویستە لەیەک کاتدا شتەکان ڕەت بکەینەوە و بیشیان سەلمێنین، یان نە ڕەت بکەینەوە نە بسەلمێنین.[٢]

ئەگەر سەیری زانایانی ئیسلام و زانستی کەلام بکەین ئەم قوتابخانەیان دابەشکردووە بۆ سێ گرووپ:

١. نکووڵیکارییەکان (العنادیة): ئەوانە پێیان وایە هیچ شتێک بوونی نییە و هەمووی خەون و خەیاڵە، کەواتە ئەوان دڵنیان و بێگومانن کە نازانن! دەزانن کە نازانن! سەرەتای ئەم گرووپە دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسووفی یۆنانی «گۆرگیاس_ ٣٨٠ پ.ز» کە دەیوت: هیچ شتێک بوونی نییە. ئەگەر هەشبێت مرۆڤ ناتوانێت پەیان پێیبات و بیانزانێت. ئەگەر گریمان زانیشی و پەیشی پێبرد ئەوا ناتوانێت بیگەیەنێت و گوزارشت لەو مەعریفەیە بکات کە پێی گەیشتووە و بیگەیەنێت بە خەڵکانی دیکە.[٣]

٢. لایمنییەکان (خودڕایەکان/ڕای کەسی) (العندیة): لایمنییەکان ئەوانەن دەڵێن: لای من ئەو شتە بەو شێوەیەیە، لای تۆش هەرچۆنە کێشە نییە و هی هەردووکیشمان هەر ڕاستە، کەواتە لای ئەوان مەعریفە پەیوەندی بە خودی شتەکانەوە نییە، بەڵکوو پەیوەندی هەیە بە خودی کەسەکان، واتە لای من و

---

(١) تاریخ الفلسفة الیونانیة، یوسف الکرم، ل: ٦٤.

(٢) مصادر المعرفة فی الفکر الدینی والفلسفی، د. عبد الرحمن بن زید الزنیدی، ل: ٦١.

(٣) تاریخ الفلسفة الیونانیة، یوسف الکرم، ل: ٦٤.

لای تۆ و لای ئەوی تر و ....، ئەم جۆرەش بیرێکی مەعریفە ڕوخێنەرە و هەر لەسەردەمی یۆنانەوە تائێستاشی لەگەڵدا بێت بوونی هەیە، پێی دوترێت (نسبية الحقيقة) واتە ڕێژەبوونی حەقیقەت و ڕاستی، واتە هیچ حەقیقەتێکی ڕەها بوونی نییە و هەمووی نسبیی و ڕێژەییە، ئەم بیرۆکەیە بنەمایەکی سەرەکیی ئیلحادیشە، چونکە لە ئیلحادیشدا تەنیا باوەڕبوون بە ئیلحاد ڕەهایە، ئەگەرنا هەموو شتێک: ئەخلاق، حەقیقەت، جوانی، ... ڕێژەیی و نسبییە.

٣. نازانمکارییەکان (اللاأدرية): نازانمکار (لائەدری) کەسێکە کە بڕوای وایە ناتوانێت دان بە بوونی هیچ شتێکدا بنێت، هەروەها ناشتوانێت نەفی بکات، لەبەرئەوەی کەسی نازانمگەرا خۆی یەکلایی نەکردووتەوە و نازانێت بەڵگەکانی هەبوون بەهێزترن، یان نەبوون و لەمەڕ باسەکە نەگەیشتووەتە هیچ ئەنجامێک.

نازانمکارییەکان (لائەدرییەکان) دەربارەی ئیمان و مێتافیزیک دەڵێن: شتە مێتافیزیکییەکان و نادیارەکان و بەرهەست نەبووەکان و شتەکانی ئەودیو سروشت هیچ ڕێگەیەکیان نییە بۆ جێگیرکردن و ئیسپاتکردنیان، ناشتوانرێت نەفی بکرێن. کەواتا باشترین ڕێگە ئەوەیە کە بڵێین: نازانین و خۆمانی لێ ببوێرین و بەڵگە لەسەر هەبوون یان نەبوونی نەهێنینەوە، چونکە ڕەنگە هەر دوو لا بە بڕوادار و بە بێباوەڕ و مولحید بەڵگەی خۆیان هەبێت. بۆیە لە دیدی ئەوان لەوانەیە بەڵگەکانی هەر دووکیان یەکسان بن، بۆیە حوکم بە هیچ لایەکیاندا نادەن و لایەنگیری هیچ کامێکیان ناکەن نە بە ئیسپات نە بە نەفی.

بیرۆن بە ڕێبەر و خاوەن ڕێبازی نازانمکارییەکان دادەنرێت (نازانمکارییەکان (اللاأدرية)).

## بنەڕەتی بوون

ئایا بنەما و بنەڕەتی بوون یەکێکە یان یان زیاترە لە یەکێک و زۆر و زەبەندە و جۆراوجۆرە؟

بە شێوەیەکی گشتی بۆ وەڵامی ئەم پرسە دابەشبوون بۆ چەند ئاراستەیەکی جیاواز.

## بۆچوونە سەرەکییەکان دەربارەی بنەڕەتی بوون

**تاکخوازەکان (الواحديون):** ئەم ڕێبارە پێی وایە بنەڕەت و بنەما و وجود و بوون دەگەڕێتەوە بۆ یەک جەورهەر، بەڵام ئەم ئاراستەیەش لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی ئاخۆ ئەم یەک جەوهەرە چییە و سروشتی چییە و چۆنە دابەش دەبن بۆ دوو ئاراستەی تر:

أ. **یەکیانەی ماددی (الواحدية المادية):** ئەمانە پێیان وایە بنچینە و بنەڕەت و بنەمای بوون و وجود بریتییە لە «تاکە جەوهەرێکی مادیی، جەوهەرێکی تاکی ماددی»، ئینجا دەربارەی ئەم تاکە جەوهەرەش ڕاجیاییان هەیە، بۆ نموونە لە لە کۆنەکان: تاڵیس دەیوت: ئەسڵ و بنەڕەتی بوون «ئاو»ە، ئەناکسیمینس دەیوت: «هەوا»یە، لە سەردەمی نوێدا لودفیگ فیۆرباخ پێ یوایە هەموو ئەوەی هەیە بریتییە لە «مادده و جەستە» یەک، کە ژمارەیەک ڕەهەندی هەیە.

ب. **یەکیانەی ڕۆحی (الواحدية الروحية):** ئەمانە پێیان وابوو ئەسڵ و بنەڕەتی بوون و وجود بریتییە لە «تاکە جەوهەرێکی ناماددی، جەوهەرێکی تاکی ناماددی» لەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەبووە لە کۆنەکان: ئەکسانۆڤان، زینۆنی ئیلی، لە نوێیەکانیش: ردولف هیرمان لوتزە، هیگڵ، تۆماس گرین.

**٢. ڕێبازی زۆرییتی (زەبەندی و جۆراوجۆری) (مذهب الكثرة والتعدد):** ئەم ڕێبازە پێی وایە بنەڕەت و بنچینەی بوون و وجود دەگەڕێتەوە بۆ «چەندەها

جەوهەری زۆر و جۆراوجۆر» نەک تەنیا جەوهەرێک وەک ڕێبازی یەکەم، بەڵام دەربارەی چییەتی و سروشتی ئەم جەوهەرانە دابەش بوونە بۆ دوو ئاراستەی تر:

**أ. زۆری و زەبەندی ماددی (مذهب الكثرة المادية):** ئەم ئاراستەیە پێی وایە بنەڕەت و بنچینەی بوون و وجود «چەندان جەوهەری ماددی»یییە، واتە بنەڕتی بوون تاکە جەهەرێک نییە و بەس، بەڵکوو چەندین جەوهەرە، فرە جەوهەرە، لە فەیلەسووفە کۆنەکان کە ئەم ڕایەی هەیە: ئەمبادۆکلیس، کە بوون و وجود بۆ چوار توخمی بنەڕەتی دەگەڕێنێتەوە: ئاو، هەوا، خاک، ئاگر. واتە وەک ڕێبازی «تاک جەوهەر» نییە، بیگەڕێنێتەوە تەنیا بۆ یەک بنەڕەت، هەروەها «دیمۆکریتس و لۆکیبۆس»یش سەر بەم ئاراستەیەن، چونکە بوون دەگەڕێننەوە بۆ «بەشەکییە ماددییە بچوکەکان» (الجزئيان المادية الصغيرة) کە پێیان دەوت (Atoms) واتە ئەو گەرد و بەشانەی کە دابەش نابن، لە فەیلەسووفە نوێکانیش کە ئەم ڕایەیان هەیە «تۆماس هۆبز و ولیەم جیمس».

**ب. زۆری و زەبەندی ڕۆحی (مذهب الكثرة الروحية):** ئەمانە پێیان وایە بنەڕەت و بنەمای بوون و وجود بریتییە لە «چەندین جەوهەری نامادی ڕۆحی»، واتە بنەڕەت و بنچینەی بوون یەک جەوهەری نامادی نییە، بەڵکوو چەندان جەهەری ناماددییە، بۆنموونە فەیلەسووفی ئەڵمانی (لایبنیتز) ئەم ڕایەی هەیە و پێی وایە بوون لە جەوهەرە سادە ڕۆحییەکان پێکهاتووە، واتە «هێزەکان» یان (یەکەکانی وزە، وحدات للطاقات) وەک بڵێی (گەردە ڕۆحییەکان، ذرات روحية) ناویان «مۆنادەکان»ە، (Monads).

**٣. دووانەکییەکان (الثنائية):** ئەم ڕێبازە بنەڕەت و بنەچەی هەموو بوون و وجود و بوونەوەر بۆ «دوو جەوهەر»ی لێک جیاواز دەگەڕێننەوە، واتە پێیان وایە بوون بنەڕەتەکەی دوو جەهەری سروشت جیاوازە، وەک: «مادده، ڕۆح»

یان «هزر، فکر» و «عەقڵ»، لەکاتێکدا جەوهەری یەکەم «مادده» سروشتی وایە دەکشێت، بەڵام جەوهەری دووەم کە «ڕۆحە یان فکر و هزر یان عەقڵ» سروشتەکەی وایە کە «وەعی و ئاگایی» هەیە، واتە پەی بە شتەکان دەبات و خاوەن دەرککردنە، بۆنموونە لە فەیلەسووفانی کۆن کە ئەم ڕایەیان هەبووە ئەفلاتوونە؛ ئەفلاتوون پێی وابووە بنەڕەتی بوون هەم ماددییە هەم ناماددی، جیهانی ماددی و هەستپێکراو لەگەڵ جیهانی ناماددی و نموونە بەرزەکان و ئایدیال (عالم المثل)، هەروەها ئەرستۆش باوڕی بە هەمان بۆچوون هەیە و پێی وایە جیهان دوو بنەڕەتی سەرەکی هەیە «هیولا و وێنە» (الهيولى والصورة). لە فەیلەسووفە نوێکانیش، دیارترین فەیلەسووف کە ئەم ڕایەی هەیە دیکارتە؛ دیکارت پێی وایە بنەڕەتی بوون مادده و هزرە، مادده درێژدەبێتەوە و دەکشێت، هزریش ئاگایی هەیە[1].

## پوختە

بوون (وجود) لە زۆر ڕووەوە لێی دەڕوانرێت

١. لەڕووی بوونەوە ئایا بوون هەیە یان نا زۆربەی خەڵک و فەیلەسووف و ڕێباز و قوتابخانە فەلسەفییەکان باوەڕییان پێیەتی، بەڵام هەندێک ئاڕاستەی نامۆش هەیە وەک بەشێک لە سوفستائییەکان (نکووڵیکارییەکان (العنادية)) کە دان نانێن بە بوون، یان بەڕێژەییدانی پێدادەنێن (لایمنییەکان (العندية))، یان هەر نازانن هەیە یان نا.

٢. لەڕووی بنەڕەتی بوونەوە سێ ئاڕاستەی سەرەکی هەیە: ماددییەکان (ماتریالیزمەکان) بڕوایان وایە بنەڕەتی بوون ماددییە، ئەوانیش دوو جۆربوون،

---

(١) الفلسفة لمن يريد، د. نبيل عبد الحميد، ل ٤٠ _ ٤١.

هەروەها میسالییەکان (ئایدیالیزمەکان) پێیانوایە بنەڕەتی بوون شتێکی ناماددییە ئەوانیش بەهەمان شێوە دوو جۆربوون، ئاڕاستەی سێیەمیش پێیوایە بنەڕەتی بوون هەم مادییە هەم ڕۆحی (فکری و عەقڵی) ناماددی.

٣. لەڕووی باوەڕبوون بە بەدیهێنەری وجود و بوونیش بە شێوەیەکی گشتی (٨) جۆر هەڵوێستمان هەیە، یان دەتوانین بڵێین: (٨) ڕێباز و مەزهەب، دوایی لە باسی خوادا باسی لێوە دەکەین.

# جەوهەر و عەرەز (الجوهر والعرض)

جەوهەر لە سادەترین واتایدا واتە: ئەوشتەی بۆ بوونی پێویستی بە غەیری خۆی نییە، بنەما و ئەسڵ و ئەساس و بنەڕەتی هەموو شتەکانە[1].

فەیلەسووفان ئەسڵی بوون (وجود) دەگەڕێننەوەبۆ یەک جەوهەر یان دوو جەوهەر، هەروەک لە باسەکانی پێشوتردا باسمانکرد:

١. تاکخوازەکان (الواحدیون):

أ. یەکیانەی ماددی (الواحدیة المادیة)

ب. تاکیانەی ڕۆحی (الواحدیة الروحیة)

٢. ڕێبازی زۆرییێتی (زەبەندی و جۆراوجۆری) (مذهب الکثرة والتعدد)

أ. زۆری و زەبەندی ماددی (مذهب الکثرة المادیة)

ب. زۆری و زەبەندی ڕۆحی (مذهب الکثرة الروحیة)

٣. دووانەکییەکان (الثنائیة)[2]

## دوو تێڕوانینە سەرەکییەکەی بەرامبەر جەوهەر

١. تێڕوانینێک پێی وایە جەوهەر ئەزەلی و ئەبەدییە، واتە سەرەتا و کۆتایی نییە. واتە هەر لەگەڵ خوادا هەبووە، بەڵام ئەوەندە هەیە قەدیمی و بێسەرەتایی

---

(١) منطق أرسطو، ب ١، ل ٨.

(٢) الفلسفة لمن یرید، د. نبیل عبد الحمید، ل ٤٠ _ ٤١.

خودا پێش جەوهەرە لەڕووی هۆ و بەرهۆوە (العلة والمعلول).

٢. تێڕوانینەکەی تر پێی وایە جەوهەر هەم سەرەتای هەیە، هەم کۆتایی، دروستکاریشی هەیە و ئەم دروستکارەش بە حەقیقی پێش ئەم جەهەرەیە، چونکە سەرەتای نییە، بەڵام جەوهەر سەرەتای هەیە، هەر شتێکیش سەرەتای هەبوو، مانای وایە دروستکراوە. هەر شتێکیش دروستکراو بوو، پێویستی بە دروستکار هەیە، کەواتە بوون و گەردوون سەرەتایان هەیە و دروستکراون و پێوستیشیان بە دروستکار هەیە.

## جەوهەری فەرد (جەوهەری تاکانە)

بیرۆکەی جەوهەری فەرد ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسووفی یۆنانی «دیمۆکرتس»، ئەو بڕوای وابووە سەرچاوەی هەموو بوون «ئەتۆم»ە (ذرة)، بەڵام لە هەمان کاتدا بڕوای بە ئەزەلیبوونی ئەم ئەتۆمانە هەیە و پێی وایە سەرەتایان نییە.

بەڵام بیرۆکەی جەوهەری دروستکراو و سەرەتا هەبوو دەگەڕێتەوە بۆ زانایانی کەلامی ئیسلامی، ئەوان هاتن لە بەرانبەر بیرۆکەی جەوهەری ئەزەلی و ئەتۆمی ئەزەلیدا بیرۆکەی جەوهەری فەردیان دانا، ئەوەش بۆ سەلماندنی دروستکراوی بوون و پێویستی بە دروستکار و خودا، چونکە کە سەلما سەرەتای هەیە، ڕاستەوخۆ دەسەلمێت کە دروستکراوە، کە سەلماش دروستکراوە، ڕاستەوخۆ دەسەلمێت کە دروستکاری هەیە.

زانایانی کەلام پێیان وایە تۆ هەر تەن و جسمێک بگریت، دابەش دەبێت تا دەگاتە بەشێک (جوزئێک) کە قبوڵی دابەش بوون ناکات، واتە لەوێوە دابەشبوون دەوەستێک، کە وەستا واتە ئەمە کوتاییە و خاڵی کۆتاییە و دروستکراوە، بەڵام

ئەرستۆ و دیموکریتس پێیان وایە ئەم دابەشبوونە هەر بەردەوامە هەتاهەتایە، واتە (الی ما لا نهایة)، واتە وەستانی نییە لە خاڵێکدا، کە وەستانی نەبوو، واتە ئەزەلییە، کە ئەزەلی بوو، واتە پێویستی بە دروستکار نییە.

## جەوهەری فەرد لەنیوان کەلام و فەلسەفەی ماددی ئەزەلیدا

١. لە فەلسەفەی ماددی ئەزەلیدا جەوهەری فەرد ئەزەلی و بێسەرەتایە، جا ئەوانیش دوو جۆرن، یان ناباوەڕ و مولحید، واتە بڕوایان بە خودا نییە، چونکە مادده و جەوهەری فەرد ئەزەلین، یان باوەڕدارن، بەڵام جەوهەری فەرد لە کەلام و فکر و عەقیدەی ئیسلامیدا سەرەتای هەیە و ئەزەلی نییە، پێویستی بە خودا هەیە بۆ هاتنەبوونی.

٢. ئەتۆم و جەوهەر پێویستی بەردەوامیان بە خودا هەیە، بۆ هاتنەبوون و ڕاوەستان و پارێزران و بوونیان لەلای زانایانی کەلام، بەڵام لە فەلسەفەی ماددی ئەزەلیدا ئەمە پێویست نییە.

٣. لە فەلسەفەی ماددی ئەزەلیدا حەڕەکە و جووڵەی ئەم ئەتۆم و جەوهەرانە ئەزەلییە، هەروەها ئەم ئەتۆمانە تەنیا حەڕەکەیان هەیە بەبێ ئەوەی ئەم حەڕەکە و جووڵە ڕاوەستانی لە پێشەوە بووبێت، واتە لەوەتای هەبوونە هەر جووڵاون، بەڵام لەلای زانایانی کەلام ئەم ئەتۆم و جەوهەری فەردە سەرتا ڕاوەستاو بوونە، دوایی دەستیان کردووە بە جووڵە، کەواتە جووڵەکە ئەزەلی نییە، کەوابوو ماددەش ئەزەلی نییە[1].

کەواتە جەوهەری فەرد لە کەلام و فکری ئیسلامیدا جیاوازە لە فەلسەفەی یۆنانی و ماددیی ئەزەلی، دیاترین جیاوزیش:

---

(١) قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين السيد صالح، ل ١٧١ _ ١٧٢.

سەرەتا و دروستکراوی

لەناوچوون و فەوتان

لەلای زانایانی کەلام هەموو بوونەوەر یان جەوهەرە یان عەرەز

عەرەز واتە ئەو بوونەی وەستاوە بە غەیری خۆیەوە و خۆی بەتەنیا ڕاناوەستێت و دەرناکەوێت.

یان وەک ئەشعەرییەکان دەڵێن: سیفەتە بۆ غەیری خۆی، یان حاڵ و سیفەتی جەوهەر[1].

بۆنموونە ڕەنگەکان، هەموو ڕەنگێک عەرەزن، بۆنموونە سەیارەکی سپی، سپیەکە عەرەزە.

یان جووڵەی ئۆتۆمبێل، خودی ئۆتۆمبێلەکە جەوهەرە، بەڵام جووڵەکەی عەرەزە، چونکە ئەم جووڵەیە بە ئۆتۆمبێلەکەوە وەستاوە و بەبێ ئەو بوونی نابێت.

کەواتە عەرەز بەخۆیەوە نەوەستاوە وەک جەوهەر، بەڵکوو بە غەیری خۆیەوە وەستاوە و پێویستی بەغەیری خۆی هەیە بۆ هاتنەبوون و هەبوونی.

هەندێک لە فەیلەسووفە مولحیدەکان نکووڵی لە عەرەز دەکەن، بەمەبەستی نکۆڵی کردن لە خودا، چونکە کە عەرەزت سەلماند، دەبێت خودابسەلمێنیت، زانایانی کەلام دەڵێن عەرەز پەیدابووە (حادث)، کەواتە هەر شتێک پەیدابوویێکی پێوەبەند بێت خۆشی پەیدابوویە، کەواتە جەوهەر و ماددەش پەیدابوون، چونکە عەرەز بەندە بە ماددە و جسمەوە، کە ئەو پەیدابوو (حادث)، جیسم و ماددە و جەوهەریش دەبنە پەیدابوو.

---

(١) التصور الذري، د. منى أحمد، ل ٤٦.

هەر بۆیە زانایانی کەلام زۆر جەخت لەوە دەکەنەوە کە جەوهەر ناکرێت و نابێت خاڵی بێت لە عەرەز، کە خاڵی نەبوو لە عەرەز، خاڵیش نابێت لە پەیدابوو، کە خاڵی نەبوو لە پەیدابوو، کەواتە خۆشی پەیدابووە.

# هەیولا و سوورەت (الهیولا والصورة)

هەیولا دەستەواژەیەکی یۆنانییە، واتە: ئەسڵ و مادده.

سوورەتیش واتە: شێوە و شکڵ و شێواز کە مادده لەیەکتری جیادەکاتەوە.

بۆنموونە بەرد و دار و ئاسن و زێڕ و زیو جیاوازن لە یەکتر.

زێڕ بازنە و گوارە و ئەڵقە و .... لێ دروست دەکرێت، کە هەموویان لە شکڵ و شێوەدا لە یەکتری جیاوازن.

داریش مێز و کورسی و کتێبخانە و .... لێ دروست دەکرێت، کە ئەویش دووبارە لە ڕووی شکڵ وشێوەوە لە یەکتری جودان.

ماددەی هەموو شتەکان دەبێتەوە یەک، چونکە هەموویان ئەو شتانەن کە لە بووندا هەن، وەک ئاو و خۆڵ و ...، کە زانست تا ئێستا لە سەد دانەی تێپەڕاندووە، بەڵام شێوە و شکڵیان دەگۆڕێت.

بەم پێیە «هیولا» مادده خامەکەیە، کە هەموو شتەکان لەوەوە پەیدا دەبن.

ئەم گونجاوییەی هیولا بۆ شکڵ و شێوە وەرگرتن ئەرستۆ ناوی ناوە (بالقوة)، بەڵام دوایی کە شکڵ و شێوە وەردەگرێت پێی دەڵێت (بالفعل)[1].

ئەرستۆ پێی وایە ئەم هیولایە جەوهەرێکی سەربەخۆیە و پەیوەست نییە بە سووڕەتەوە و ئەزەلی و ئەبەدیشە، بەڵگەشی بۆ ئەمە ئەوەیە: ئەگەر هیولا ئەزەلی نەبێت کەواتە حادیس و پەیدابووە، کە پەیدابوو بوو، کەواتە پێویستی بە

---

(١) فی الفلسفة الإسلامية وصلاتها باليونانية، د. عوض الله حجازي، ل ٧٠.

ماددەیەکی دیکە هەیە، چونکە پێی وایە هەموو پەیدابوویێک دەبێت ماددەی لە پێشەوە بێت و لەوەوە دروست بێت، کەواتە تەسلسول و زنجیرەی بێکۆتا دێتە کایەوە، کە شتێکی مەحاڵ و ئەستەمە، کەواتە ماددەی هەموو تەن و جسمەکان ئەزەلییە، گەردوون و جیهانیش لەم تەن و جسمانە پێک دێت، هەر شتێکیش لە شتی ئەزەلی پێک بێت ئەزەلییە، کەواتە جیهان (عالم) ئەزەلییە[1].

زانایانی کەلام هاتن فکرەیەکیان داهێنا بۆ ڕەتکردنەوەی فکرەکەی ئەرستۆ، وتیان: دەبێت تەلازوم و پەیوەندی و لێکدان (التلازم والاضطراد) هەبێت لە نێوان «هیولا و سورەت»دا، یان «جەوهەر و عەرەز»، وتیان: هیچیان بەبێ هیچان بوونیان نابێت، هیچیشیان بەبێ تەن و جسم دەرناکەون و نایەنەبوون، کەواتە ئەم هیولا و سوورەتە لێکدراون، هەموو لێکدراوێکیش پێویستی بە لێکدەر هەیە کە ئەم دووانە لێکبدات و بەیەکیانەوە ببەستێتەوە کە خودایە.

ئینجا ئەگەر بڕوات بە ئەزەلیبوونی هیولا هەبێت، ئەوەی لێدەکەوێتەوە کە چەند شتێکی ئەزەلی بوونیان هەبووە (تعدد القدماء) لەگەڵ خوادا، دیارە ئەمەش شیرک و هاوبەشدانانێکی تەواوە.

کەواتە جەوهەر (هیولا) بەبێ عەرەز (سورەت) نابێت، هەردووکیان پەیوەستن بەیەکەوە و لێکدراون، ئەم دوو لێکدراوەش بەدڵنیاییەوە پێویستیان بە لێکدەر هەیە کە خودایە.

## گەردوون لەنێوان بێسەرەتایی و بەدیهێناندا

هەر لە کۆنەوە یەکێک لە گریمانەکانی لێکدانەوەی گەردوون بریتی بووە لەوەی کە کۆمەڵێکی خەڵکی باوەڕیان وابووە کە گەردوون بێسەرەتایە، تەنانەت

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم، ل ٨٠.

هەندێک بەبێ کۆتاشیان زانیوە، بەڵام لەگەڵ گەشەکردنی زانستدا بەرەبەرە ئەم بیرۆکەیە پووکاوەتەوە و پاشەکشەی کردووە، کە ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لە وەڵامەکانی زانستی فیزیا بۆ نادروستی ئەم گریمانەیە:-

١- بیردۆزی فرەوان بوونی گەردوون:- کە دەڵێت: گەلە ئەستێرەکان و تەنە ئاسمانییەکان بەخێراییەکی بەرز لە یەکتر دوور دەکەونەوە، ئەمەش دوای تێبینییەکانی ئیدوارد هاڤل (١٩٢٩).

ئەگەر گەردوون ئەزەلی بووایە ئیستا نە ئەستێرە و نە هیچ تەنێکی دیکە لە ئاسماندا نەدەبینرا.

٢- یاسای دووەمی داینەمیکی گەرمی:- هەمیشە گەرمی لە تەنە پلە گەرمی بەرزەکانەوە دەچێت بۆ تەنە پلە گەرمی نزمەکان، تا هاوسەنگی گەرمی بەدیدێت و هەرگیز بە پێچەوانەوە نابێت. ئەگەر گەردوون ئەزەلی بووایە ئێستا جیاوازی گەرمی لە گەردووندا بوونی نەدەبوو و ئەستێرەکان وزەیان نەدەما و گەردوون هەر لە ئەزەلەوە دەفەوتا.

٣- تیشکدانی تەنە تیشکدەرەکان:- توخمە تیشکدەرەکان بەردەوام تیشکدەدەن تا دەگەنە هاوسەنگی و دەگۆڕێن بۆ توخمی دیکەی جێگیر. ئەگەر گەردوون ئەزەلی بووایە، ئێستا هیچ توخمێکی تیشکدەر نەدەبوو کە ئێمە لەسەر زەوی هەمانە.

٤- بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە:- پێش ١٣،٨ملیار ساڵ لەمەوبەر ماددەی گەردوون لە خاڵێکدا کۆبووبۆوە کە چڕی و پلەی گەرمییەکی لە ڕاددەبەدەر بەرزی هەبوو، پاشان وردە وردە چڕی کەم دەکات و فرەوانبوون ڕوودەدات، پلەی گەرمییەکەشی کەم دەکات.

ئەم بیردۆز دەیسەلمینێت کە گەرمی سەرەتای هەیە و تەمەنێکی دیاریکراوی

هەیە کە ناتوانرێت بوترێت: بێسەرەتایە[1]

### تێبینییەکی گرنگ

بیرۆکەی جەوهەری فەرد: «جوهەرێک کە سەرەتایەکی هەیە و کۆتاییشی دێت، جەوهەرێکی کە هیچی دیکە دابەش نابێت» تەواو یەکدێتەوە لەگەڵ بیردۆزی «تەقینەوە گەورەکە» (Big bang) (الانفجار العظیم)دا.

## پوختەی بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە (big bang) (الانفجار العظیم)

ئەم گەردوونە پێش (١٣٨,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) سێزدە ملیار و هەشت سەد ملیۆن ساڵ لەمەوبەر، تاکێکی زۆر زۆر بچووک بووە، کە هیچ ئەندازەیەکی فیزیایی ناتوانێت بیپێوێت، پێیی دەڵێن: ئەتۆمی سەرەتایی، یان تاکی گەردوونی (مفردة الکون)، یان هێلکەی گەردوونی (بیضة الکون)، یان تۆوی گەردوونی (بذرة الکون)، بە ئینگلیزی پێی دەڵێن: (singularity) «سینگلاریتی»، ئەم (singularity)یە چڕی و گەرمییەکەی زۆر زۆر بووە، دوایی لەو (singularity)ە گەردوون هاتووەتە بوون، کە پێش ئەو (singularity)ە شتێک نەبووە بە ناوی «ماددە، کات، شوێن»[2].

کەواتە ئەم (singularity)هەم ماددە بووە هەم وزەی لەخۆ گرتووە، پاش تەقینەوەکە بەشەکانی ئەتۆم پەیدابوون، پاشان لەو پارچانە ئەتۆمەکانی هایدرۆجین و هیلیۆم پەیدابوون، پاشان لەو ئەتۆمانەش «تۆزی گەردوونی»

---

(١) ئیلحاد وەک خۆی، صلاح الدین أحمد، چاپی دووەم، ل ١٢٨ _ ١٢٩.

(٢) ئەتۆمی سەرەتایی، یان تاکی گەردوونی (مفردة الکون)، یان هێلکەی گەردوونی (بیضة الکون)، یان تۆوی گەردوونی (بذرة الکون)، بە ئینگلیزی پێی دەڵێن: (singularity) (سینگلاریتی)، یەکسانە بە جەوهەری فەرد (الجوهر الفرد) کە زانایانی کەلام باسیانکردووە.

پەیدابوو، پاشان لەو تۆزەش گەلەستێرەکان پەیدابوون، پاشان دانە دانەی ئەستێرەکان دروستبوون، بۆیە لەو کاتەوە گەردوون بەردەوام لە فرەوانبوون و گەشەدایە، پاش ئەو تەقینەوەیە کات و شوێن پەیدا بوون، چونکە بەبێ ماددە کات و شوێن بوونیان نییە.

وەک زانایان باسی دەکەن ئەو (singularity)ە، بەم شێوەیە بووە:

• لە ڕووی گەرمییەوە (١٠) توان (٣٢) پلەی (کالڤن) گەرم بووە.

• لە ڕووی کاتەوە (١٠) توان (-٤٣) چرکە، کاتی پێچووە کە تەقیوەتەوە.

• لە ڕووی قەبارەوە (١٠) توان (-٣٥)ی مەترێک بووە.

دوایی ئەو (singularity)ە تەقیوەتەوە و فرەوانبووە و سەرەنجام ئەو گەردوونەی لێ دروستبووە.

خاوەنی بیردۆزی «تەقینەوە گەورەکە» (big bang) (الانفجار العظیم) بریتییە لە زانای بەلجیکی «جورج لو میتەر» کە لە ساڵی (١٩٢٧) ئەو گریمانەیەی دانا بۆ دروستبوونی گەردوون، پاشان زانایان و نێوەندە زانستییەکان گرنگی زۆریان پێدا تا گەیشتە ئەوەی ئەمڕۆ.[1]

١-گۆڕانی ماددە بۆ وزە:- لە ئەستێرەکاندا بەهۆی گۆڕانکاری توخمەکان و تەقینەوەی ناوەکی وزەی گەرمی و ڕووناکی بەرهەم دێت.

---

(١) بۆ پوختەی ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ کتێبی (شموع النهار، إطلال على الجدل الدينى الإلحادى المعاصر فى مسألة الوجود الإلهى) الدكتور عبدالله بن صالح العجيرى، لاپەڕە (١١٦ - ١١٧).

هەروەها بگەڕێنەوە سەر ئەو سەرچاوە ئینگلیزیانە:

http://www.astro./20190418123026/https://web.archive.org/web
ucla.edu/~wright/cosmology_faq.html
082-2014=https://www.jpl.nasa.gov/news/news.php?release
https://www.pbs.org/wgbh/aso/databank/entries/dp27bi.html

بۆنموونە: لە خۆردا گۆڕانی ١٪ی بارستاییەکەی لە گازی هایدرۆجین بۆ هیلیۆم دەبێتە هۆی مانەوەی بە درەوشاوەیی بۆ ماوەی ١ ملیار ساڵ.

ئەگەر گەردوون ئەزەلی بووایە، هیچ ئەستێرەیەک نەدەما و تەواوی بارستاییەکانیان لە توخمێکەوە بۆ توخمێکی دیکە دەگۆڕا و خامۆش دەبوون.

٢- بۆئەوەی شتێک بێسەرەتا بێت پێویستە بێنیاز بێت لە غەیری خۆی، پێشتر باوەڕ وا بوو کە مادده بچووکترین بەشی بریتییە لە گەردیلە، کە بێسەرەتایە و پێویستی بە غەیری خۆی نییە، بەڵام فیزیای نوێ وەڵامی ئەمەشی دایەوە بەوەی کە گەردیلە پێکدێت لە ئەلیکترۆن و ناوک، پاشان ئەوانە بەبێ سەرەتا دادەنران، بەڵام سەلمێنرا کە ناوک لە پرۆتۆن و نیترۆن پێکدێت و ئەوانیش لە کوارک پێکدێن و کوارکیش لە یەکەی بچووکتر و ئەم زنجیرەیە بەردەوامە بە پێشکەوتنی زانست[1].

---

(١) ئیلحاد وەک خۆی، صلاح الدين أحمد، چاپی دووەم، ل ١٢٩ _ ١٣٠.

# بوونواجب (الواجب)، بوونمومکین (الممکن)، بوونمەحاڵ (المستحیل)

ئەگەر بڕوانینە بوون (وجود) لە سێ شتان زیاتر بەدی ناکەیت، یان بوون دابەش دەبێت بۆ سێ بەشی سەرەکی:

١- **هەبوونی پێویستە (بوونواجب، بوون پێویست) (واجب الوجود)**، واتە هەبوونی واجبە و ناکرێت نەبێت و عەقڵ تەسەور و وێنای نەبوونی ناکات وەک: بوونی خودای گەورە.

٢- **هەبوونی مومکین و گونجاو (بوونمومکین، بوون شیاو) (ممکن الوجود)** واتە: دەگونجێت هەبێت، دەشگونجێت نەبێت، واتا هەبوونەکەی مومکینە وەک هەبوونی گەردوون.

٣- **هەبوونی مەحاڵە (بوونمەحاڵ، بوون ئەستەم) (مستحل الوجود)** واتە: ناکرێت بوونی هەبێت و ناگونجێت، بۆ نموونە کۆبوونەوەی دووشتی دژ و پێچەوانەی یەکتری لە یەک کات و شوێندا بۆ نموونە «عدم و وجود» بۆ نموونە بڵێیت: ئەو شتە هەیە و نییە لەیەک کاتدا!

کەواتە بوون (وجود) لەو سێ بەشە دەرناچێت یان (واجب الوجود)ە یان (ممکن الوجود)ە یان (مستحل الوجود)ە.

(واجب الوجود)ە کە دیارە کە ناکرێت نەبێت، کە خودای گەورەیە، چونکە خودای گەورە سەرچاوەی بوون و دروستکەرییەتی، ئەگەر ئەو نەبووایە، بوون (وجود) گەردوون (کون) و ئەوەی کە تێیدایەتی بە هیچ شێوەیەک ئاوەها نەدەبوو، چونکە نەبوو (عدم) ناتوانێت خۆی خۆی بێنێتە بوون، ئایا هیچ عاقڵێک

قسەی وا دەکات، بڵێ نەبوو دەتوانێت خۆی خۆی بێنێتە بوون؟ کەواتە هەموو نەبووییێک پەیداکەر و دروستکارێکی هەیە، پەیداکەر و دروستکاری هەموو بووون خودای گەورەیە.

ئینجا بە نیسبەت (ممكن الوجود)ەکە، وەک وتمان هەموو بوون (وجود) دەگرێتەوە جگە لە خودا، بۆیە وا دەڵێین چونکە (ممكن الوجود) واتا دەکرێت هەبێت و دەکرێت نەبێت، دەکرا هەبێت دەکرا نەبێت، واتا بوونەکەی نەبوونی لە پێش بووە، هەر شتێکیش نەبوونی لە پێش بوونەکەی بێت دیارە (ممكن الوجود)ە، دیارە زانست سەلماندوویەتی کە گەردوون سەرەتای هەیە، ئەوەتا مولحیدەکانیش بڕوایان بە «تەقینەوە گەورەکە» (Big Bang) (الانفجار العظيم) هەیە، ئەوەتا یەکێکی وەک «ستیڤن هۆوکینگ» دەڵێت: پێش سێزدە ملیار و حەوت سەد ملیۆن ساڵ (١٣،٧٠٠،٠٠٠،٠٠٠) گەردوون یەک یەکەی گەردوونی بووە و تەقیوەتەوە، دەڵێت: پێش ئەوکاتە نە ماددەنە کات نە شوێنبوونیان نەبووە، کەواتە سەلما کە گەردوون ئەزەلی نییە و سەرەتای هەیە، هەر شتێکی سەرەتای هەبێت (ممكن الوجود)ە، کە ئەویش بوون و نەبوونی یەکسانە، واتا: دەکرێت هەبێت و دەشکرێت نەبێت، بۆ نموونە هەر یەکێک لە ئێمە دەکرا هەبێت، دەشکرا نەبێت، کەواتە هەموو (ممكن الوجود)ەکان بوونیان مومکینە و هیچیان (واجب الوجود) نین، چونکە هەموویان سەرەتایان هەیە، بەڵام هەر هەموویان پێویستیان بە (واجب الوجود) هەیە بۆ ئەوەی بوونەکەیان زاڵ بکەن بەسەر نەبوونەکەیاندا و بێنە بوون، چونکە ئەو (واجب الوجود)ە سەرەتای نییە کەواتە پێویستی بە (واجب الوجود)ێکی تر نییە، چونکە وتمان هەر شتێک سەرەتای نەبوو، پێویستی بە (واجب الوجود) نییە بۆ هاتنەبوونی، چونکە هەر هەبووە، ئەگەریش ئەو (واجب الوجود) پێویستی بە (واجب الوجود) ێکی تر هەبێت، ئەوکات ئەو (واجب الوجود)ە (واجب الوجود) نامێنێت و دەبێتە (ممكن الوجود)، ئەوکات ئەو (واجب الوجود)ەی پێش ئەو پێویستی بە (واجب

الوجود)ێکی تر هەیە، ئەوکات ئەویش نابێتە (واجب الوجود) کەواتە ئەو زنجیرە ناعەقڵانییە بەردەوام دەبێت، لە کۆتاییدا (واجب الوجود) ێکمان دەست ناکەوێت، کە (واجب الوجود)یشمان دەست نەکەوت، ئەوکات بوون (وجود) پەیدا نابێت و هەر بە نەبوو (عدم) دەمێنێتەوە، کە ئەوەش دژی عەقڵە.

کەواتە هەموو (ممکن الوجود)ێک پێویستی بە (واجب الوجود)ێک هەیە، گەردوونیش بە هەموو ئەوەی لە ناویدایە (ممکن الوجود)ە، کەواتە: گەردوون پێویستی بە (واجب الوجود)ە کە خودای گەورەیە.

کەواتە لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە خودای گەورە (واجب الوجود)ە.

گەردوون بەوەی کە تێیدایە هەر هەمووی (ممکن الوجود)ە.

نەبوونی خودا (مستحل الوجود)ە، چونکە ناکرێت نەبێت، کە نەبووایە، گەردوونیش نەدەبوو، کە گەردوون هەیە دیارە کە (واجب الوجود)یش هەیە و واجبەکە هەبێت.[1]

---

(١) النجاة، ابن سینا، ل ٣٨٣.
المحصل، فخر الدین الرازی، ل ٩٣.
معالم الفلسفة الإسلامية، محمد جواد مغنية، ل ٣٨.
قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، ل ١٩٧ _ ١٩٨.

# کات و شوێن (الزمان والمكان)

یەکێک لە بابەتە هەرە گرنگەکانی فەلسەفە کات و شوێنە. کە نزیکترین شتە لە مرۆڤەوە و مرۆڤی دەورەداوە و لەناویەتی بەناچاری. هەموو ساتەکانی ژیانت درکی پێ دەکەیت و ئێمە دەزانین لەناو کات و شوێندا دەژین. بەڵام ئەم کات و شوێنە چییە؟! ڕاستە لێمانەوە نزیکە، بەڵام تێگەشتن لێی پێویستی بە خۆماندووکردنە. هەر بۆیەش فەیلەسووفان و زانایانی سروشتی چەندەها تیۆری جیاجیایان لەسەر ئەم باسە هەبووە. گرنگی ئەم باسەش لەوەدایە، نزیکترین شتە لە مرۆڤ، ڕێگایەکە بەرەو تێگەشتنت لە واقیع. وردی ئەم باسە بە شێوەیەکە هەندێک لە فەیلەسووفان هەر بوونی زەمان ڕەتدەکەنەوە. هەندێکیان بوونی مەکانیش ڕەتتدەکەنەوە.

فەیلەسووفان دابەش دەبن بۆ دوو گرووپەوە لەم باسە: ئەوانەی باوەڕیان وایە زەمان و مەکان بوونێکی حەقیقییە، ئەوانەشی باوەڕیان بەوەیە بوونێکی خەیاڵی عەقڵییە.

ئەوانەی پێیان وایە واقیعییە:

ڕای یەکەم: ئەفلاتوون، لەلای ئەفلاتوون وایە زەمان و مەکان ماهییەتێکی سەربەخۆن. لە واقیعدا بە شێوەی ماددە ڕەنگدەدەنەوە. لە سەرچاوەیەکی بەرزترەوە کە جیهانی ئایدیاکانە هاتووە. لەلای ئەفلاتوون ئەو شتانەی بیرۆکەیەکن لە عەقڵدا، تەنیا بیرۆکەیەکی خەیاڵی نین. بەڵکوو عەقڵت درک بە جیهانی فۆرمەکان دەکات. لەوێوە بیرۆکەکان سەرچاوە دەگرن. بۆیە لەلای ئەفلاتوون زەمان و مەکان بوونییەتێکی واقیعی جێگیریان هەیە. نەوەکوو

بیرۆکەیەکی خەیاڵاوی بن و ناوێکی بێبنەما بن. لەڕێی بەڵگەکانی بۆ جیهانی ئایدیاکان، بە هەمان شێوە ئەفلاتوون کات و شوێن تەفسیر دەکات. لەلای ئەفڵاتوون پێناسەکان لە جیهانێکی سەربەخۆ دان. نەک ل نێو شتەکان یان وەسفکردنی شتەکان.

ڕای دووەم: ئەرستۆتالیس، بە ڕەتکردنەوەی جیهانی ئایدیاکان ئەرستۆ بەپێچەوانەی ئەفلاتوونەوە دەڵێت شتێک بوونی نییە بە ناوی جیهانی ئایدیا، بەڵکوو تەنیا یەک جیهان هەیە. جیهانی مادده و جیهانی ئایدیا یەک شتن. بۆیە لەلای ئەو جەوهەرێک نییە لە جیهانێکی دیکەدا. بەڵکوو خودی ئەوەیە کە دەبیندرێت. ئەرستۆ لە تیۆرەکەیدا ئەوە شی دەکاتەوە ڕێژەی جووڵەی فەلەکەکان بریتین لە کات، واتا عەرەزێکە. شوێنیش بریتیە لە گۆڕەپانێکی جێگیر کە ماددەکان تێیدان. ئەرستۆ دەیگوت: "چ جۆرە ماهییەتێک دەبێت جودا بێت لەو شتەی کە وەسفی پێ دەکەیت؟" واتا ناکرێت لە جیهانێکی تردا پێناسەی ئەم جیهانە بکرێت. بەلکوو لەنێو جیهاندا پێناسەکان بوونیان هەیە[١].

ڕای بارکلی: بارکلی باوەری وابوو کە مادده بوونی نییە، بەڵکوو ناکرێت مادده هەبێت. بۆیە ڕێچکەکەی ناونرا بە نامادەگەرایی. بەپێچەوانەی ماددەگەرایی باوەڕی بەوەیە هەموو شتێک «ڕۆحییە» یان بڵێین «عەقڵییە» بارکلی هەموو وجودێکی وەها سەیردەکرد[٢]. هەروەها دوژمنێکی سەرسەختی نیوتن بوو، تەنانەت بە کافر بانگی کردووە[٣]. کتێبێکی هەیە بە ناوی «وتارێک ئاراستەی بیرکاریزانێکی کافر». لەوێدا دژی بیرۆکەی ئەرستۆیی بۆ کات و شوێن وتار دەدات.

---

(١) تاريخ الفلسفة، فريدريك كوبلستون، ب١، ل١٩١-٥٠٧.

(2) Brown, S. (2012). British Philosophy and the Age of Enlightenment: Routledge History of Philosophy Volume 5. Routledge.

(3) Berkeley, G. (1754). The Analyst, Or, A Discourse Addressed to an Infidel Mathematician... J. and R. Tonson and S. Draper.

ڕایەکی سەیر و سەمەرەش هەیە دەربارەی کات ئەبو بەرەکاتی بەغدادی پێشنیازی کردووە دەڵێت: ڕێژەی وجود بریتیە لە کات. بەڵام ئەوە گرنگە بزانین چ شتێک بوون دەپێوێت؟ چەندییەتی بۆ بوون چی مانایەکی هەیە؟ بۆنموونە ئایە دەتوانین بڵێین دیوارێک ئەوەندە بوونەی هەیە؟ یان مرۆڤێک بۆنموونە ١٢ بوونی هەیە؟ بۆیەش بە ڕایەکی سەیر و سەمەرە ناسراوە.

تاقمی دووهەم پێیان وایە کە کات و شوێن لە زەینی مرۆڤدایە نەک واقیع:

لەوانەی کە ئەم قسەیان کردووە:

زینۆنی ئیلی: قوتابی بارمەنیدس بوو، بارمەنیدس لای وابوو کەوا جووڵە بوونی نییە. بەلام خەڵکی گاڵتەیان بەم بانگەشە دەهات. بۆیە زینۆن کە قوتابیەکەیەتی لەسەر بابەتی جووڵە و کات و شوێن تەحەدایەکی ئاراستەی فەیلەسووفان کرد کە تا ئیستاش گفتوگۆی لەسەر دەکریت. زینۆن دەیگوت کەوا لەنێوان هەر کات و شوێنێک بێکۆتا ژمارە هەیە. بوونی بێکۆتاش مەحاڵە کەواتە بوونی کات و شوێن مەحاڵە. بیهێنە بەرچاوت لەنێوان خۆت و یەک مەتر بەردەمت بێکۆتا دابەشبوون هەیە، وەکوو لە بیرکاریدا دەزانین لەنێوان یەک و دوودا بێکۆتا ژمارە هەیە. کەواتە بەپێی زینۆن بۆئەوەی جووڵە بکەیت یان لەناو کاتدا بیت، دەبێت بێکۆتا کۆتایی بێت کە ئەمەش دژیەکە و مەحاڵە. بۆ دەربازبوون لەمە لەلای ئەمان هەموو شتەکان یەک بوون واتا جوداییەک نەبوو لەبەینی من و تۆ و ئەرز و ئاسمان. بەڵکوو هەموویان یەک بوون بە مانای وشە. لێرەوە وەحدەتولوجودی ماددی هاتە کایەوە[1].

ڕای ئیمانوێل کانت: کانت پێی وایە کە واقیعیکی دەرەکی هەیە. بەڵام ئەوەی ناوی دەنێین زەمان و مەکان لێکدانەوەی عەقڵە بۆ حەقیقەت. نەک حەقیقەت خۆی بێت. وەکوو شەرتێکە بۆ مەعریفە. لەدوای کانت زۆربەی

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم، ل ٤٦-٤٩.

فەیلەسووفانی مۆدێرنە هەمان بۆچوونیان هەبووە. ئەم بیرۆکەیە گەشتە کایەی سیاسیشەوە کە بوو بە بەهانەیەک بۆ لیبراڵیزم، بەبیانووی ئەوەی کەس حەق نازانێت، پێویستە بیروباوەڕی یەکدی قبووڵ بکەین.

ڕای سێیەم: کەلامزانان، ئەمان تا ڕادەیەک بیرۆکەی ئەرستۆیان دەربارەی کات قبووڵە. لەڕاستیدا دەڵێن خودی گۆڕانکاری کاتە، واتا هەر لە ئەرستۆ جودان. چونکە ئەرستۆ دەڵێت ڕێژەی جووڵە بریتیە لە کات، واتا چەندییەتی جووڵە. زیاتر دەربارەی شوێن ڕایان جودایە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕەتکردنەوەی هەیولا لەلای ئەمان. کەلامزانان لایان وایە کە تەنیا تێکەڵکردنێک ڕوویداوە لەنێوان سێ دووری ماددە و شوێن، واتا شوێن لە ڕاستیدا هەر ماددەیەکە سێ دووریەکەی خۆیدا جێی دەبێتەوە. بەڵام مرۆڤ لێی تێک دەچێت وادەزانێت لە شتێکی دیکە دایە، لە ڕاستیشدا تەنیا ماددەکە وجودی هەیە و تەواو. واتا : شوێن تەنیا سەرلێشێواوی مرۆڤە، وا دائەنێت ئەگەر ماددەیەک لە جێیەکەوە بگوازیتەوە بۆ جێیەکی دیکە بەناو شتێکدا ڕۆشتووە کە ماددە لەسەریەتی. لەڕاستیشدا تەنیا ماددەکە بوونی هەیە و تەواو.

ڕای ئەنیشتاین: ئەنیشتاین لە بیرۆکەکانیدا کاریگەری کانت بەسەریەوە دیارە، بە ئاشکرا ئەنیشاتاین کات بە «وەهم» وەسف دەکات. پێی وایە کات و شوێن هەردووکی تێکەڵەیەکن. واتا بەشێکن لەیەکتری و شایەنی پێوان نین. لای ئەنیشتاین کات و شوێن وەکوو پێخەفێک وان ماددە دەیچەمێنێتەوە.

### تیۆریەکانی کات لەم سەردەمەدا

لە ئێستادا دوو تیۆری دەربارەی کات هەیە تیۆری ئەی (A) و تیۆری بی (B) لە بابەتە لاهووتی و فەلسەفیەکاندا بە شێوەیەکی یەکجار بەرفراوان بەشدارن. ڕاجیایی نێوانیان لە بوونی داهاتوو و ڕابردوو دایە.

تیۆری ئەی (A) بانگەشەی ئەوە دەکات کە کات بەو شێوەیەی هەیە هەستی پێدەکەین. واتا ڕابردوو بوونی نەما دوای ئەوەی بەجێمان هێشت. هەروەها داهاتوو بوونی نییە تا خۆمان دروستی نەکەین. ئەمان سەیری کات دەکەن وەکوو شتێکی نوێبووە و جیا جیا لە هەموو سەردەمێک. هەموو ساتێک کاتێکی جیاوازی هەیە.

بەپێچەوانەوە تیۆری بی (B) بانگەشەی ئەوە دەکات کە ڕابردوو و داهاتوو و ئێستا بەیەکەوە بەهەمان سات بوونیان هەیە. واتا کات وەکوو جێگایەک وایە کە ڕابردوو و داهاتوو تەنیا جووڵەیەکە تێیدا. نەک کات بجووڵێت و بگۆڕێت. لە فەلسەفەی ئیسلامیشدا هەمان بیرۆکە دەدرێتە پاڵ ئیبنو عەرەبی[1].

(1) Power, S. E. (2021). Philosophy of time: A contemporary introduction. Routledge.

# هۆ و بەرهۆ (العلة والمعلول)

لەڕووی هزریەوە مەعقولە دەستت لە ئاگرێک بدەیت نەسوتێت. چونکە پەیوەندیەکی هەمیشەیی لەنێوانیاندا نییە. بەڵام فەیلەسوفان و زۆربەی موعتەزیلە و ماددیەکان، باوەڕیان بەوەیە لەڕێی ئەوەی سروشت بە خواوە نەبەستراوە، لەڕووی هزرەوە مەعقولە کە وابێت، بەڵام تەنیا وەهمێکە. لەواقیعدا لەبەرئەوەی جیهان بنچینەی سەربەخۆی هەیە. ئەم پەیوەندی سووتان و ئاگرە، زەروریی و پێویستیە. وە هەریەکە لە هۆکارە سروشتیەکان توانای خۆی هەیە لە بەرهەمهێناندا.

موعتەزیلە لەبەر پابەندبوون بە ئازادی هەڵبژاردنی مرۆڤەوە، ئەم مەزهەبەیان هەڵبژاردووە. چونکە لایان وایە، لە خودا ناوەشێتەوە دەسبخاتە کار و کردەوەی مەخلوقەکانی. هەروەها فەیلەسوفان لەڕێی باوەڕبوون بە دێرین بوونی جیهان، ئەو بڕیارەیان داوە. لەلای ئەمانە ناکرێ یاساکانی گەردوون بشکێندرێت. لەبەر ئەوەی پێویستە. لەلای موعتەزیلەش بەربەست خەلق دەکرێ بۆ تێکشکاندنی یاساکان. دەنا هەرگیز ئاگر جیانابێتەوە لە سوتاندن.

لەلای ئەشعەریەکانیش وایە کەوا پەیوەندیەکی پێویست نییە لەنێوان بەرهەمهێن و بەرهەمهێندراو، هۆ و بەرهۆ (العلة والمعلول)دا. بەڵکوو قودرەتی خودا ئەم بۆشاییە عەقڵیە دەکاتە زەروری، چونکە ویستی خوایە دایمە بەوشێوەیە بێت، کەی موعجیزەشی بوێت ئەو پەیوەندیە پێچەوانە دەکاتەوە. ئەشعەریەکان پێیانوایە ئەگەر بوترێ پەیوەندیەکی حەتمی و پێویست و زەووری لەنێوان بەرهەمهێن و بەرهەمهێندراو، هۆ و بەرهۆ (العلة والمعلول) دا هەیە، ئەوکات بێ پێویستی لە خودا دێتەکایەوە، چونکە مادام هەموو شتەکان بە سرووشتی خۆیان پەیوەندی هۆ و بەرهۆ و سەبەب و موسەبەبیان

هەبێت، کەواتە شوێنێک نامێنێتەوە بۆ خودا، هەروەها پێیانوایە ئەگەر ئەم پەیوەندییە پەیوەندییەکی حەتمی بێت ئەو کات ئیرادە و ویستی خودا ملکەچ دەبێت بۆ زنجیرەیەک لە هۆ و بەرهۆ، هەروەها دەبێتە هۆی نکوولّی کردن لە موعجیزاتی پێغەمبەران، چونکە موعجیزە یاسا گەردوونیەکان و یاساکانی بوون تێکدەشکێنێت، ئەمەش بەپێی یاسای حەتمیبوونی پەیوەندی نێوان هۆ و بەرهۆ و سەبەب و موسەبەب شتێکی مەحاڵ و ئەستەمە.

ئیمامی غەزالی هەڵوێستێکی زانستی لەم بارەیەوە هەیە و پێیوایە ناکرێ یاسای هۆکاریەتی ڕەت بکرێتەوە لە خودی خۆیدا، بەڵکوو پێیوایە ئەمە یاسایەکی بەدیهی و بەڵگەنەویستە[1]. غەزالی جیاکاری کردووە لەنێوان عەقڵ و هەستدا، پێیوایە تەلازوم و پەیوەندی لەنێوان هۆ و بەرهۆ (العلة والمعلول) دا زەرورەتێکی عەقڵیە نەوەک هەستەکی، بۆیە دەکرێ هەندێجار لە ڕووی واقیعی و هەستیەوە وا دەرنەچێت[2]. هەر لێرەوەیە غەزالی هێرش دەکاتە سەر فەیلەسوفە موسڵمانەکان (ئەوانەی بە ئەرستۆ کاریگەر بوون) و دەڵێت: هۆکاری یەکەم لە هەموو شتەکاندا خودایە، هۆکارە ماددیەکان لەگەڵ ئەوەی کار لە بەرهۆیەکان (مسببات) دەکەن، بەڵام ئەم کاریگەرییە لە خودی شتەکانەوە نیە، سروشتی نیە، زادەی سروست و خودی خۆیان نیە، بەڵکوو هەمووی بە قودرەت و توانای خودایە، ئەو خودایە دەتوانێت ئەم تایبەتمەندییە هەڵگرێت و ئەم یاسایە تێکبشکێنێت ئەگەر بیەوێت، بۆیە پەیوەندی نێوان هۆ و بەرهۆ (الأسباب والمسببات) دەنگونجێ نەیەتەجێ _ وەک گریمانەیەکی عەقڵی _ لەسەر بنەمای توانای خوایی ڕەها، لەگەڵ ئەوەی نەهاتنەجێی یاساکە شتێکی مەحاڵ و ئەستەمە لەڕووی واقیعیەوە، چونکە ئەگەر نەهاتنەجێی یاساکە شتێکی مومکین بایە خوای گەورە فێری دەکردین و پێی ڕادەگەیاندین[3]. لێرەوە

---

(١) الاقتصاد فی الاعتقاد، ل١٦.

(٢) تهافت الفلاسفة، الغزالی، ل٢٣٩.

(٣) المعجزة والاعجاز، د. سعد الدین السید صالح، ل٥٤.

ئیمامی غەزالی هەماهەنگیەکی دروستکرد لەنێوان زانست و عەقڵ و ئاییندا.

کەواتە هۆ و بەرهۆکان (العلل والمعلولات) ملکەچ نیین بۆ زەرورەتێکی حەتمی _ وەک ئەوەی ئەرستۆ دەڵێت[1] _ بەڵکوو هەموو هۆ و بەرهۆکان (العلل والمعلولات) ملکەچن بۆ یاسای: (ما شاء الله کان، وما لم یشأ لم یکن) واتە: (ئەوەی خوا بیەوێت دەبێت و بووە، ئەوەشی نەیەوێت نەبووە و ناشبێت)، کەواتە هەموو شتێک لەژێر ویستی خودایە نەوەک یاساکانی گەردوون و بوون، هەرچەندە ئەم یاسایانەش دەستکردی خودان و لانادەن لە یاسا گشتییەکە، مەگەر بۆ ویستێکی وەک موعجیزە.

دیڤید هیوم پێیوایە یاسای سەبەبیەت هیچ بنەمایەکی نیە، نە لە عەقڵ و نە لە هەست و ڕووە ماددی و بەرهەست و بەرجەستەییەکەوە، ئەوەی هەیە فێڵێکی خەیاڵاوییە و بەس، ئەم فێڵە خەیاڵیە پەیوەندی نێوان شتەکان دروست دەکات، بەڵام لە بنەڕەتدا هیچ پەیوەنییەکی حەقیقی لەنێوانیاندا نیە[2]!

وە هەندێک لە فیزیازانانی سەردەم بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە باوەڕیان بە هۆکاریەتی نیە. هایزنبێرگ کە لە جوڵەدا شوێنکەوتەی دیدگاکانی زینۆنی ئیلی بووە. بانگەشەی ئەوەی کردووە فیزیای کوانتەم، پێویستیەکی بە یاسای هۆکاریەتی نەهێشتووە[3].[4]

---

(١) من تاريخ الفكر الفلسفي، أرسطو، د. محمد أبو ريان، ل٧٨.

(٢) تاريخ الفلسفة الحديثة، يوسف كرم، ل١٧٥.

(٣) جلاب فتيحة. قلامين صباح. الأسس والأبعاد الفلسفية لمبدأ الارتياب في فيزياء الكم عند هيزنبرغ وانعكاساتها على الابيستيمولوجيا العقلانية المعاصرة، الاكاديمية للدراسات الاجتماعية و الانسانية.

محمد باسل الطائي، محمد سعيد الصباريني، and آمال رضا ملكاوي. "مفهوم السببيَّة في الفيزياء المعاصرة وعند المتكلمين المسلمين." (٢٠١٠).

الطائي، and محمد باسل. "الطبع والسببية عند الباقلاني." Dirasat: Human & Social Sciences ٣٣, no. ٢ (٢٠٠٦).

(٤) قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، ل ١٩٤ _ ١٩٦.

# دێرینیەتی و بەدیهاتن (القدم والحدوث)

یەکێکی دیکە لە بابەتە گرنگەکانی فەلسەفە بریتیە لە (دێرینیەتی و بەدیهاتن (القدم والحدوث) )، ئەم بابەتە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە ئایە ئەو ماددە و گەردوون و گەرد و گەردیلە و...، لە نەبوونەوە هاتۆنە بوون؟ یاخوود هەر هەبوونە لە ئەزەل و قەدیمەوە؟ لەکۆنەوە کێشە لەم بابەتەدا لەنێوان زۆرێک لە فەیلەسوفان و کەلامناسان هەبووە. بۆیە دابەشبونە بەسەر چەندەها بیرورای جیاجیا.

بەشێک لە بیرمەندان و فەیلەسوفان پێیانوایە گەردوون لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون. بەشێکی دیکەش دەڵێن ناکرێت لە نەبوونی ڕەهاوە (العدم المطلق) هاتبێتە بوون.

ئەوانەی پێیان وایە گەردوون لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون:

**یەکەم:** کەلامزانان و موتەکللیمەکان، باوەڕیان وایە لە نەبوونی ڕەهاوە گەردوون هاتۆتە بوون، لەبەر ئەوەی لای ئەوان شتێک نییە بەناوی (هەیولا) کە ماددەیەکی بێ پارچە و شێوە و ناونیشانە. بەڵکوو پارچەیەکی دابەشنەبوو هەیە کە پێی دەڵێن (جوهر الفرد). هەرچەندە (ئیبنوحەزم) و (مامۆستا مەلا باقر البالکی) ئەم دوو دونیابینەیان بە دژبەیەک نەدیوە. لەلای ئەوان دەکرێ هەم (هەیولا) هەبێت، هەم دێرین نەبێت و بەرهەم هاتبێت.

کەلامزانان وتوویانە، لەبەر هەبوونی ئەم پارچانە کە پەرەپێدانێک بوو لەلایەن کەلامزانانەوە بۆ تیۆری گەردیلەیی (ئەبیقۆر) کرا. دەبێت گەردوون هاتبێتە بوونەوە لە نەبوونی ڕەهاوە. ئەمەش ڕای گشتیانە.[1]

---

(١) وجيه احمد، الوجود والعدم بين الأشاعرة و المعتزلة.

**دووەم:** ئەفلاتوون، لەلای شوێنکەوتووانی ئەفلاتوون وابووە کەوا باوەڕنەبوون بە سەرەتای گەردوون، نکووڵی کردنە لە بوونی خودایەکی بەدیهێنەر. ئەرستۆش بەپێچەوانەی مامۆستاکەی، باوەڕی وایە کە بەدیهێنەر بەبێ ئیرادەیەک گەردوون دروستدەکات[١]. بەڵام ئەفلاتوون وەکو حەکیمی ڕۆمی ئەڵێت (لەدوای گەشتەکەی بۆ میسر و هاوەڵیکردنی کۆمەڵێک لە پەیامبەران، باوەڕی بە ئیرادە و ویستی خوای گەورە هەبووە و وتوویەتی خوا گەردوونی دروستکردووە بە ئیرادە و ویستی خۆی، بە جوانترین شێوەش ڕێکی خستووە چونکە خودا تەواوە و خێر لەوەوە سەرچاوە دەگرێت).[٢]

**سێیەم:** ڕای ئەرستۆ و مەشائیەکان و هەندێ لە فەیلەسوفە موسڵمانەکانی وەک ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد و فارابی. ئەرستۆ پێیوابووە مادام خودا کامڵە و هیچی پێویست نیە، کەواتە بە موتڵەقی یەکە، شتێکیش بە موتڵەقی یەک بوو ناکرێت نە لە هزر دا نە لە دەرەوەی هزر فرە ڕەهەند بێت. بۆیەش ناچارە کەوا گەردوون دروستکات نەوەکو هەڵبژاردەیەک بێت لەبەردەمی دا. لەهەمان کاتدا لەژێر کاریگەری زینۆنی ئیلی دا ئەم وتەیە سەرچاوەی گرتووە. چونکە ئەرستۆ بەپێی قسەکانی ئەو تیۆری هەیولای دامەزراند، کە بنەمایەکە بۆ دێرین بوونی جیهان.

**چوارەم:** ڕای فیزیازانان و نیوتن، نیوتن لێرەدا شوێنی ئەرستۆ کەوتووە. لای وابووە کە کات شوێن بێ کۆتا درێژ دەبنەوە. لەبەر ئەوەی گەر شوێن بێ کۆتا نەبێت، هێزی کێشکردن هەموو گەردوونی تێک ئەقوپاندەوە. لەبەر ئەوەی گەردوون ئەزەلیە. ئەبوا ئێستا بوونی نەبایە. بۆیەش ئەبێ شوێن بێ کۆتا بێت. ئەمە ڕای نیوتنە[٣]. فیزیازانانی ئێستاش بێبەش نین لەم جەدەلە. هەندێکیان

---

(١) تهافت التهافت، ابن رشد، ل١٢١.

(٢) الحكيم الرومي ، الحكمة الإلهامية، مخطوط.

(٣) لەگەڵ ئەوەی ئەم بۆچوونە لە نیوتەوە نەقڵ کراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نیوتن باوەڕدابووە و باوەڕی بە خودا هەبووە، نیوتن پێیوابوو خودا دروستکەرێکی زۆر گەورەیە و ناکرێ نکووڵی لێ بکرێت، هەتا ئەو ڕادەیەی خۆی بە یەکێک لەو کەسانە دادەنا کە خودا هەڵی بژاردووە بۆ تێگەیشتن لە پەرتووکی پیرۆز.

لایان وایە کە گەردوون خۆی خۆی دروستکردووە لەڕێی گەشتکردن بە کاتەوە[1]، بەم شێوەیەی گەردوون دەڵێن شێوەی گۆت لی. کە لەلایەن دوو زاناوە بەناوی، ڕیچارد گۆتت و لیان لییەوە پێشنیار کراوە. بەڵام لەڕووی زانستیەوە قورسایی خۆی هەڵنەگرتووە، چونکە فیزیازانان باوەڕیان وایە بە گشتی کە گەشتی کات بۆ ڕابردوو مەحاڵە. هەشە باوەڕی وایە گەردوون خۆی دووپات دەکاتەوە لە زنجیرەیە بێکۆتا وەکو ڕۆجەرپێرنۆس باسی دەکات. بەمە ئەڵێن مۆدێلی CCC یان (Conformal cyclic cosmology)[2]. بۆ سەلماندنی ئەزەلی نەبوونی مادده بگەڕێوە بۆ بابەتی (تەقینەوە گەورەکە) لەوێدا بەدرێژی باسمانکرد کە زانست دژی ئەزەلیبوونی ماددەیە.

---

(1) Gott III, J.R. and Li, L.X., 1998. Can the universe create itself?. Physical Review D, 2)58), p.023501.

(2) Penrose, R., 2010. Cycles of time: an extraordinary new view of the universe. Random House

# ئەودیو سروشت (ما بعد الطبیعة)

## باسی خودا

باسی خودا و بەتایبەت بوون(وجود)ی خودا، یەکێکە لە بابەتە هەرە گەرمەکانی فەلسەفی بوون و (وجود)، هەر لە کۆنەوە تاوەکوو ئەمرۆ، هەڵوێستەکانیش لە بەرانبەریدا جیاوازن، دەتوانین دابەشیان بکەین بۆ (٨) ڕێباز و مەزهەب[1].

**پوختەی تێڕوانینە فکری و فەلسەفییەکان بەرامبەر خودا**

١- الألوهية ٢- الربوبية ٣- الإلحاد ٤- اللاأدرية ٥- الشيئية ٦- اللاأكتراثية ٧- وحدة الوجود ٨- السوفسطائية

**خودایی (الألوهی) (Theism)**

باوەڕدارانی ئەم ڕێبازە باوەڕیان وایە خودا بریتییە لە زاتێکی تەواو کە هەموو سیفەتێکی تەواوی هەیە، ئەم زاتە (خودایە) پەیام و پەیامبەری ناردووە، هەروەها بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیە، کەواتە دەتوانین بڵێین: مەزهەبی ئولوهی بڕوای بە چوار شتی سەرەکی هەیە:

١- بڕوابوون بە خودا، وەک دروستکاری گەردوون و بەڕێوەبەری گەردوون

٢- بڕوابوون بە پەیام و وەحی و پەرتووکی ئاسمانی

٣- بڕوابوون بە پێغەمبەرێک کە لە لایەن خوداوە نێردراوە بۆ مرۆڤایەتی.

---

(١) براهين وجود الله، سامی عامری، ل (٥٧) و دواتر، میلیشیا الإلحاد (مدخل لفهم الإلحاد الجديد) - عبدالله بن صالح العجيری ، ل (٧٠).

٤- بڕوابوون بە زیندووبوونەوە و ڕۆژی دوایی

دیارە ئەوانە بریتیین لە شوێنکەوتووانی ئایینە ئاسمانییەکان، وەک ئیسلام و مەسیحییەت و جوولەکە.

## ڕوبووبییەکان (الربوبية، Deism)

ئەم ڕێبازە (مەزهەبە) بڕوای بە زاتێکە کە بریتییە لە خودا، کە ئەم گەردوونەی دروستکردووە و ئەندازەی گرتووە و ڕێکی خستووە و خستویەتییە سەر سیستەمێکی ڕێک بە شێوەیەک کە پێویستی بە ئاڕاستەکردن و ڕێنموونیکردن نەبێت، وەکوو کاتژمێر، کە دروستدەکرێت پاشان خاوەنەکەی لێی دەگەڕێت ئەویش بەپێی ئەو سیستەمەی کە تێیدایە کاردەکات بەبێ ئەوەی پێویستی بە ئاڕاستەکردن بێت.

## جیاوازی ئولوهی و ڕوبووبی:

١- ئولوهی بڕوای بە وەحی خودایی و پەرتووکی ئاسمانی هەیە، بەڵام کەسی ڕوبووبی بڕوای بە پەیامی خودایی و وەحی و پەرتووکی ئاسمانی نییە، بەڵکوو ئەوان بڕوایان بە وەحی گشتی (الوحی العام) هەیە، کە بریتییە لە ڕاستییەکانی ئەقڵ و ئاماژە گەردوونییەکان، واتە سەرچاوەی زانیاری لای ئەوان بریتییە لە ئەقڵ و زانست، لەو دەرهاویشتەی کە لە گەردوون و ژیانەوە دەستمان دەکەوێت، بۆیە ئەوان پێیان وایە کە ئەوە ئەقڵ و زانستن خۆشبەختی و کامەرانی بە مرۆڤ و مرۆڤایەتی دەدەن، نەوەک وەحی و پەیامی خودایی.

٢- ئولوهی بڕوای بە پێغەمبەری نێردراو هەیە کە لە لایەن خوداوە نێردراوە، بەڵام کەسی ڕوبووبی بە هیچ شێوەیەک بڕوای بە پێغەمبەر و پێغەمبەرایەتی نییە، واتە: بڕوایان بەوە نییە کە خودا پەیوەندی هەبێت لەگەڵ یەکێک لە مرۆڤەکان، هەر بۆیەش بڕوایان بە موعجیزە و هەموو ئەو بەڵگانەی دیکەش نییە کە پێغەمبەران لەگەڵ خۆیان هێناویانە.

٣- ئولوهی خاوەن ئایینە، بەڵام ڕوبووبی هیچ ئایینێکی نییە، پێیانوایە ئایین هی خەڵکی ساویلکە و نەزانە و لە بێدەسەڵاتی و بێزانستی خەڵکانی سەردەمی کۆن سەرچاوەی گرتووە، دەشڵێن: ئایین تەنیا ئامرازێکە بۆ جووڵاندنی عەطف و سۆزی خەڵک و ڕاکێشانیان بۆ دەسکەوتی دنیایی و ماددی.

٤- ئولوهی بڕوای بە ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە و لێپرسینەوەی دوارۆژ هەیە، بەڵام زۆرێک لە ڕوبووبییەکان بڕوایان بەڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە نییە.

### بێباوەڕی (الالحاد، Atheism)

ئەم ڕێبازە (مەزهەبە) باوەڕی بە هیچ خودا و بەدیهێنەر و دروستکارێک نییە کە ئەم گەردوونەی لە نەبوونەوە دروستکردبێت وەک باوەڕداران باوەڕیان وابوو، ناباوەڕانی کۆن پێیانوابوو ماددە ئەزەلی و هەر هەبووە و پێویستی بە هێزێکی دەرەکی نییە بۆ ئەوەی بیهێنتە بوون، بەڵام لە دوای تەکانی دووەمی فیزیا و هاتنە کایەی فیزیای سەردەمی دوای ئەنیشتاین ئەم بیروڕایە لە گۆڕنرا و سیناریۆی جیاوازیان بۆ بیروبۆچوونەکانیان داهێنا، هەتا بە زمانی حاڵ نکووڵی لە هەبوونی خودا بکەن و واز لە باوەڕی تەقلیدی کۆنی خوداباوەڕی بهێنن، کە لە سیناریۆ هەرە بەهێزەکان بۆ گەردوون فرەگەردوونییە و ڕەگەکەی بە سوودفە و ڕێکەوت پاڵپشتی دەکرێت، سیناریۆی هەبوونی ژیانیش پەرەسەندنە کە ڕەگەکەی سازش کردن و خۆگونجاندنیانە لەگەڵ دەروبەر (البقاء لمن انسب و اصلح).

بۆیە ئەوان باوەڕیان وا نییە کە کەسێک سەرپەرشتی گەردوون بکات و بەڕێوەیبەرێت یان پەیام و وەحی و پێغەمبەر و ئایین بنێرێت یان زیندووبوونەوە هەبێت، ئەوان هەموو ئەمانە ڕەتدەکەنەوە و بەتەواوی دژی دەوەستنەوە[1].

---

(١) ئیلحاد جۆری زۆری هەیە، ئێمە لە پەرتووکی (ئیلحاد وەک خۆی) دا ٣٦ جۆری ئیلحادمان باسکردووە.

## نازانمگەرایی (اللاأدرية، Agnosticism)

نازانمگەرا (لاأدری) کەسێکە کە بڕوای وایە ناتوانێت دان بە بوونی خودادا بنێت، هەروەها ناشتوانێت نەفی بکات، لەبەرئەوەی کەسی نازانمگەرا خۆی یەکلایی نەکردووەتەوە و نازانێت بەڵگەکانی هەبوون بەهێزترن یان نەبوون و لەمەڕ باسەکە نەگەیشتووەتە هیچ ئەنجامێک.

نازانمگەراکان (لائەدرییەکان) دەڵێن: شتە مێتافیزیکییەکان و نادیارەکان و بەرهەست نەبووەکان و شتەکانی ئەودیو سروشت هیچ ڕێگەیەکیان نییە بۆ جێگیرکردن و ئیسپاتکردنیان و ناشتوانرێت نەفی بکرێن، کەواتا باشترین ڕێگە ئەوەیە کە بڵێین: نازانین و خۆمانی لێ ببوێرین و بەڵگە لەسەر هەبوون یان نەبوونی نەهێنینەوە، چونکە ڕەنگە هەر دوو لا بە بڕوادار و بە بێباوەڕ بەڵگەی خۆیان هەبێت، بۆیە لە دیدی ئەوان لەوانەیە بەڵگەکانی هەردووکیان یەکسان بن، بۆیە حوکم بە هیچ لایەکیاندا نادەن و لایەنگیری هیچ کامێکیان ناکەن نە بە ئیسپات نە بە نەفی.

### شتگەرا (الشيئية، letsism)

ڕێبازی شتگەرا (الشيئية) واتا: شتێک (شیئ) هەیە، بۆیە ئەم مەزهەبە ناڕوونییەکی تێدایە، ئەم ڕێبازە لە مەزهەبی ڕوبووبی نزیکە، بەڵام وەک ئەو نییە بەتەواوی، چونکە ڕوبووبی بڕوای بە زاتێکی دروستکاری خاوەن سیفەتی زاتی ڕوون هەبوو، بەڵام شتگەرا (الشيئية) ناڕوونییەکی تێدایە، چونکە هەندێک کات بڕوایان نزیکە لە ڕوبووبی بەوەی کە ئەو شتە هێزێکی گەورەی دەرەکییە، بەڵام زۆر جاریش مەفهومەکەی نزیکە لە فریشتە یان هێزێکی ڕووت لە زات و سیفەت، بۆیە بەپێی سەرژمێرییەک کە لە ئەورووپا کراوە لە ساڵی (٢٠١٠) ٨٠٪ بڕوایان وا بووە کە (ڕۆحێک یان هێزی ژیان) هەیە کە بە لای ئەوانەوە ئەوە

بریتییە لە خودا.[1]

ئەم ڕێبازە (مەزهەبە) زیاتر بەهۆی تەمبەڵی مەعریفی سەریهەڵداوە لە ڕۆژئاوا، چونکە زۆربەیان خۆیان سەرقاڵ ناکەن بە مانا گەورە گەردوونییەکان یان پرس و پرسیارە گەورەکان و تێگەیشتن لە واتای ژیان و ئامانجەکانی و هۆکاری هاتنەبوونمان، چونکە ئەوان بەتەواوی ڕۆچوون لە ژیانی ماددی و دوورکەوتوونەتەوە لە لایەنی ڕۆحی و گرنگیدان پێی، بۆیەش دەبینین لە ڕووی ڕۆحی و دەروونییەوە بەتەواوی تێکشکاون و تووشی گەورەترین بۆشایی (فەراغ) ی ڕۆحی و دەروونی هاتوون، بە شێوەیەک زۆرترین ڕێژەی خۆکوشتن لەوێیە، لەگەڵ ئەوەی لە زۆربەی بوارەکانی ژیان کێشەیان نییە و زۆربەی هۆکارەکانی ژیانیان بۆ فەراهەم هاتووە.

### بێموبالات و گرنگینەدەر (اللاااکتراثیة - Apatheis)

بێموبالات و گرنگینەدەر بریتییە لەو کەسەی کە هیچ گرنگییەک نادات بەم بابەتانە، بۆیە ئەم ڕێبازە (مەزهەبە) هەڵوێستێکی کردەییە لە بابەتی بوونی خودا، ئەوانە بەتەواوی تێڕامان لەم بابەتەیان پشتگوێ خستووە و پێیان وا نییە ئەم بابەتە جێی گرنگیپێدان و خۆ خەریککردن بێت، بۆیە ئەوان لەسەر زەوی دەژین وەک بڵێی: خودا هەر بوونی نییە، ئەوان تێڕامان و خۆ خەریککردنیان و گرنگی دانیان تەنیا بۆ شتە ماددی و سوودبەخش و چێژ بەخشەکان هەیە، کاریان بەوە نییە خەریکی شتێک بن کە بوونی نییە و سوودی نییە و چێژبەخش نییە وەک خۆیان دەڵێن.

### یەکێتی بوون (وحدة الوجود- pantheism)

جۆرێکی دیکەشمان هەیە پێیان وایە خودا و گەردوون یەکێکن، واتا خودا

---

(١) د سامی عامری- براهین وجود الله – ٢٠١٨ – لاپەڕە ٦٨

گەردوونە و گەردوون خودایە، شتێک نییە لە دەرەوەی گەردوون و سروشت بە ناوی خوداوە، بەڵکوو ئەوەی کە هەیە خودا و گەردوونە، واتە هەردووکیان یەک شتن.

## سۆفستائی (السوفسطائية، sophism)

سوفستائییەکانیش سێ جۆری سەرەکییان هەیە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەوانەن کە بڕوایان بە حەقیقەتی بوون نییە و بوون و نەبوونی گەردوون بێمانایە و دەڵێن: بوون و گەردوون خەون و خەیاڵە و هیچ شتێکی ڕاستی بوونی نییە، هەتا بڕوایان بە بوونی خۆشیان نییە، ئەوانە لەنێو سوفستائییەکان بە (عندية) بەناوبانگن. کەواتە کەسێک بڕوای بە بوون و نەبوونی خۆی نەبێت، چۆن باوەڕی بە خودا هەیە؟!

کەواتە لێرەوە بۆمان دەرکەوت هەڵوێست بەرانبەر بوونی خودا جۆراوجۆرە، بەڵام ناباوەڕی بەدرێژایی مێژوو و مێژووی فەلسەفە هەوادارێکی وای نەبووە، بۆیە ئەگەر فەیلەسووفە بێباوەڕەکان سەرمێژری بکەی، بە پەنجەی دەستان دەژمێردرێن، هەربۆیە کاتێک لە زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان دەگەڕێیت بۆ یەکەم مولحید، چاوت بە ناوی «دایاگۆڕاسی میلۆسی» (Diagoras of Melos) دەکەوێت کە فەیلەسووف و سۆفیستێکی سەدەی پێنجەمی پێش زایینە کە خەڵکی «مێلۆس»ی یۆنان بوو، هەرچەندە ئەو هیچ شتێکی لەسەر خۆی نەنووسیوە، بەڵام سەرگوزەشتەی بێباوەڕییەکەی وا دەردەخەن کە کەسێکی باوەڕبەخۆ بوو و بێزار و زۆر ناسراو بووە، نهێنییەکانی ڕێوەڕەسمی ئێلیوسینیانی[1] بۆ هەمووان ئاشکرادەکرد و وەک شتێکی ئاسایی نیشانیدەدا.

وادیارە ئاشکراکردنی نهێنییەکانی ڕێوەڕەسم و نەریتە پیرۆزەکانی بۆ مەبەستێکی دیاریکراو کردووە تاوەکو هاوسەردەمانی بەهۆش بهێنێتەوە،

---

(١) Eleusinian Mysteries- کۆمەڵە نهێنییەکی پیرۆزی ئایینی ئەو کاتە بوون.

یەکێک لە بەناوبانگترین چیرۆکەکانی بریتییە لەوەی کە هاوڕێیەکی پێی دەڵێت: وا بیردەکەیتەوە کە خوداکان گرنگی بە مرۆڤەکان نادەن لەم وێنانەدا نایبینی کە چۆن چەندان خەڵک بە پاڕانەوە لە خودا لە تووڕەیی زریانی دەریاکاندا ڕزگاریان دەبێت و بەرەو بەندەرێکی سەلامەتیان دەبات، دایاگۆڕاس وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: بەڵێ ڕاستە بەڵام ئەی چی دەربارەی ئەو کەسانەی کە کەشتییەکانیان نووقمبووە و لە شەپۆلەکاندا تیاچوونە.[١]

هەر لە دەوربەری ساڵانی ٤١٥ پێش زایین بوو کە شاعیر دایاگۆڕاسی میلۆسی بە تۆمەتی ناباوەڕی تۆمەتبار کرا کە پێشتر ڕایگەیاند بوو کە نەبوونی سزا بۆ جەور و ستەم سەلمێنەری ئەوەیە کە هیچ خودایەک نییە[٢]، جەور و ستەم وەک سەربڕین و قەسابخانەی میلۆسییەکان بە دەستی ئەسینابییەکان لە ٤١٦ پێش زایین.

ئەسینابییەکان بەم قسەیە هەڵچوون و بە شتێکی کەسی و سیاسیان لێکدایەوە زیاتر لەوەی شتێکی ئایینی بێت، بۆیە دادگای ئەسینا لە ٤١٦ پێش زایین سزای قورسی دانا بۆ بێباوەڕەکان و ئەوانەی کە سووکایەتییان بە نهێنییەکانی «ئێلیوسینیان» کردووە کە لە تۆمەتی ئەم سووکایەتییە «ئەلسیبایتیس» و ئەوانی دیکە تێوەگلابوون، «دایاگۆڕاسیش» هەر لەم تۆمەتەوە گلابوو، بەڵکوو هی ئەو زیاتریش بوو کە دەستگیر کرابوو بە تۆمەتی سووتاندنی داری پەیکەری هێرقل[٣] بۆ لێنانی شێلم، دواتریش وا دەردەکەوێت

---

(١) Jennifer Hecht، Doubt: A History: The Great Doubters and Their Legacy of Innovation، لە ساڵی ٢٠١٠ لە Harper Collins، بڵاوکراوەتەوە، لاپەڕە ٩.

(٢) دیارە مەبەست لێی دەستەواژەی کێشەی شەڕە کە بۆچی مرۆڤەکان تووشی ناخۆشی و سەختی دەبن و هەندێک جار ژیانیان لێ تاڵ دەبێت و ئاژاوە و بەدبەختی وماڵوێرانی بەسەریاندا دێت.

(٣) Hercules کوری خوداوەند زیۆس کە خۆشی یەکێکە لە خوداوەندەکانی یۆنان

دایاگۆڕاس توانیویەتی ڕابکات.[1]

ڕەنگە جیا لە دایە گۆڕاسی میلۆس ئەوەش ڕەوابێت کە بوترێت یەکەم مولحید لە هیندستان بووە چونکە بەشێک لە مێژووناسان وای لێک دەدەنەوە کە یەکەم مولحیدی مێژووی مرۆڤایەتی کەسێک بووە بە ناوی «سومیخا» کە تەنانەت پێش تالیسیش بووە، دەشوترێت سومیخا کەسایەتی نییە، بەڵکوو قوتاخانەیەکی ناباوەڕی بوون و بڕوایان بە خودا نەبووە، جیا لەوەش ئەپیکۆر(Epicurus) یەکەم فەیلەسووفە بەڕوونی دژایەتی خودا دەکات و ئارگومێنتی لە دژ دەکات.

بەڵام بە شێوەیەکی گشتی توێژەران کۆک نین و ناتوانین مێژوویەکی دیاریکراو بۆ ئیلحاد (ئیلحاد بە واتای ئینکاریکردن لەبوونی خودا، نەوەک لادان لەڕێی ڕاست) دیاری بکەین و بڵێین: ئەم ساڵە یاخود ئەم سەردەم و کات و ساتە بە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیلحاد دادەنرێت، ئەوەش لەبەر نەبوونی کۆدەنگی لەسەری.

ئەوەی کە ڕوونە و نکۆڵی لێناکرێت ئەوەیە کە سەدەی حەڤدەهەم لە ئەورووپا ئیلحاد بەئاشکرا بانگەشی بۆ دەکرا و ناباوەڕان چوست و چالاک بووبوون و هەوڵ و سیمینار و کۆڕو کۆبوونەوەیان دەکرد.

بەڵام باوەڕداری سەنتەر بووە لە مێژوودا، تا ناباوەڕی چونکە:

١- مرۆڤ لە بنچینەدا لەسەر زگماک و خوداڕسک (فیترەت) دروستکراوە، هەر وەکوو پێغەمبەر g دەفەرمووێت: «ما من مولود إلا يولد على الفطرة فأبواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه»[2]، واتا: «هەموو مرۆڤێک لەسەر فیترەتی پاک

---

(١) John Mackinnon Robertson، A history of freethought، ancient and modern، to the period of the French revolution، لە ساڵی ١٩٣٦لە Watts &; Company، بڵاوکراوەتەوە لاپەڕە ١٧٣ (Volume ١ )

(٢) متفق عليه: البخاری ١٢٩٢، ومسلم: ٦٩٢٦.

و ڕاستەقینە دروستدەکرێت و لەدایکدەبێت، بەڵام دەوروبەر و دایک و باوک لەسەر ئەم فیترەتە لای دەدەن و دەیکەنە جوو و نەصرانی و مەجووسی.»
پاشان لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنیدا مرۆڤ لە دەسەڵاتی خودا تێدەگات ئەگەر هەر لە تەنیاییشدا بێت و ئاراستەش نەکرێت بەرە و لای خوداناسی، بەڵگە و توێژینەوەکانیش لەسەر ئەم باسە زۆر و زەبەندەن.

لێرەشەوە بەشێک لە زانایانی دەروونناسی دەڵێن: چوار شت لە مرۆڤدا زگماک و خوداڕسک و فیترین و لەگەڵ سروشتی مرۆڤدان کە بریتین لە: زانستخوازی، جوانی خوازی، چاکەخوازی، خوداپەرستی.

**٢-** مێژوونووسان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە دینداری و خوداناسی ئەسڵن و مێژوویان لەگەڵ مێژووی مرۆڤ و مرۆڤایەتیدایە، بۆ نموونە قسەیەکی بەناوبانگی مێژوونووسی گەورەی یۆنانی «پلۆتارک» هەیە دەڵێت: "زۆر شارمان لە مێژوودا بینیوە بەبێ قەڵا، شوورە، کۆشک و تەلار و قوتابخانە، بەڵام هەرگیز شارێکمان نەبینیوە بەبێ پەرستگا."

هەروەها فەیلەسووفی فەڕەنسی «هێنری برگرسۆن» دەڵێت: "کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دوور لە زانست و هونەرو فەلسەفە ژیانیان بەسەربردووە، بەڵام هەرگیز هیچ کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی نەبووە دوور لە ئایین ژیانیان بەسەربردبێت".[١]

**٣-** فەیلەسووفە بەناوبانگەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بڕوایان بە بوونی خودا هەبووە بۆ نموونە: سوقڕات، ئەفلاتوون، ئەرستۆ، ڤۆلتێر، فاڕابی.[٢]

١-مێژوونووسی گەورە «ویل دیۆرانت» لە کتێبی (قصة الحضارة)دا دەڵێت: "هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەو بیروباوەڕە کۆنە ڕاست و دروستە کە دەڵێت: ئایین دیاردەیەکە کە هەموو مرۆڤایەتی گرتۆتەوە. واتە: خوداناسی شتێکی

---

(١) الدين، بحوث ممهد لدراسة تاريخ الأديان، عبدالله دراز، (٨٣).
(٢) االإسلام يتصدى للغرب الملحد، الدكتور محمد نبيل النشواني (١١).

گشتی بووە، ئیلحاد ئەگەر هەشبووبێت شتێکی تاکە کەسی بووە و نەبووە بە دیاردە و خاوەن قوتابخانە و کۆمەڵە و مەزهەب."

**ناوی بەناوبانگترین فەیلەسووف و زاناکان کە لە کۆن و نوێدا مولحید بوون:**

دیمۆکریتس، ئەپیکۆر، تۆماس هۆبز، دایڤد هیوم، شۆپنهاوەر، کارڵ مارکس، فیورباخ، نیچە، سپنسەر، بێرتراند ڕاسل، ستیڤن هاوکینگ، ڕیچارد داوکینز،کریستۆڤەر هیچنز، لۆڕانس کراوس، سام هاریس، دانیێل دێنیت.[١]

کارڵ مارکس (١٨١٨ - ١٨٨٣) پێی وایە، کە «دیموکریتس» یەکەم ئەقڵی مەوسوعی بووە لەنێو یۆنانییەکاندا، هەروەها «لینین» (١٨٧٠ - ١٩٢٤) دەڵێت: دیموکریتس جوانترین بانگەوازکاری ماددیەت (ماتریالیزم) بووە لەجیهانی کۆندا.[٢]

لە دوای ئەو لە سەدەی چوارەمی پێش زایینیدا (٣٤١ - ٢٧٠ پ.ز) فەیلەسووفی یۆنانی «ئەپیکۆر» دامەزرێنەری «قوتابخانەی ئەپیکۆری» بە دووەم فەیلەسووفی مولحید دادەنرێت،[٣] کۆمەڵێک پرسیاری گوماناوی دەربارەی خودا و شەڕ و خراپە وروژاندووە، بۆ نموونە دەیگوت:

• ئەگەر خودا دەیەوێت ڕێگری لە شەڕ بکات، بەڵام لە توانایدا نییە؟ کەوابێت توانای بەسەر هەموو شتێکدا نییە.

• ئەگەر دەتوانێت ڕێگری لە شەڕ بکات، بەڵام نایەوێت؟ کە وا بێت شەڕانییە و خودایەکی چاک نییە.

---

(١) ئیلحاد وەک خۆی، صلاح الدين أحمد، ل ١١ _ ١٥.

(٢) وهم الإلحاد، أ. د. عمرو شريف (٣).

(٣) كواشف زيوف فی المذاهب الفكرية المعاصرة، عبدالرحمن حسن حبنكة الميدانی (٤٤٣).

• ئەگەر دەتوانێت و دەشیەوێت ڕێگری لە شەڕ بکات؟ بەڵام ئاگای لە شەڕەکان نییە، ئەوە خودایەکی بێئاگا و نازانیارە.

• کەوابێت ئەی شەڕ لە کوێوە هاتووە؟

• ئەگەر خودا نایەوێت و ناشتوانێت ڕێگری لەشەڕ بکات و ئاگای لە شەڕەکانیش نییە، کە وا بێت بۆچی قسە لەسەر خودایەکی وەها بێدەسەڵات بکەین؟[1][2]

لە دوای سەردەمی یۆنانییەکان سەردەمی ڕۆمانییەکان دێت، کە دیارە لەو سەردەمەشدا ئیلحاد بە مانای ئینکاری بوونی خودا نەبووە، بەڵکوو ئەوەی کە بووە، خودای خێر و خودای شەڕ یان خودای ئاسمان و خودای زەوی بوون، دواتر لە مێژووی شارستانییەتی عەرەبیدا ئەوەی کە هەبووە ئینکاریکردنی ڕۆژی دوایی و چەند چەمکێکی جیاواز بووە نەوەک ئینکاریکردن لە بوونی خودا.[3]

هەروەک قورئان باسی کردووە: ﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُمْ بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ مَا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّا أَنْ قَالُوا ائْتُوا بِآبَائِنَا إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ اللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾[4]

دیارە کە ئەمانە بە (الدهريين) دەهرییەکان ناسراون.

بەڵام دواتر کە ئیسلام هات بەتەواوەتی بیری ئیلحاد هەرەسی هێنا، ئەوەی کە باسیش دەکرێت دەربارەی «ئەبووبەکری ڕازی و ئیبن ڕاوەندی و ... هتد» ئەوانە هیچیان ئینکاری بوونی خودایان نەکردووە، بەڵکوو ڕەخنەیان لە

---

(١) بۆ وەڵامەکەی بگەڕیوە بۆ پەرتووکی (ئیلحاد وەک خۆی. صلاح الدين احمد) باسی شەڕ.

(٢) ئەم بیانووەی ئەپیکۆر باسی کردووە هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت پرسێکی گرنگە و یەکێکە لە بەهێزترین بیانووەکانی مولحیدان، هەتا وای لێهاتووە بە «بورهانی شەڕ، بەڵگەی شەڕ» ناسراوە.

(٣) ئیلحاد وەک خۆی. صلاح الدين احمد، ل ١٨ _ ١٩

(٤) الجاثية: ٢٤ – ٢٦.

پێغەمبەرایەتی و چەند حوکم و چەمکێکی نێو ئایینی ئیسلام گرتووە.[1]

کەواتا ئەوەی کە هەبووە لە مێژووی نوێدا، زۆرینەی مێژوونووسان پێیان وایە کە دەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی فەڕەنسی لە ساڵی (١٧٨٩ز)، دواتریش لە کاتی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ساڵی (١٩١٧ز) ڕووسیا زیاتر پەرەیسەند، هەروەها شتێکی زانراوە کە ئەم قۆناغە قۆناغێکی تا بڵێی ناتەندروست بوو، کڵێسا دەستی خستبووە نێو هەموو کایەکانی ژیان، ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستی و سەربازی، کڵێسا و پیاوانی ئایینی بەتەواوی دژی خەڵک و چینی هەژار و فەیلەسووف و زاناکان بوون و هەموویانیان چەوساندبوونەوە و ڕێگەیان بە هیچ بەرەوپێشچوونێکی زانستی و فیکری و فەلسەفی نەدەدا، بۆیە دەبینین لەو سەردەمەوە چەندان فەیلەسووفی مولحید پەیدابوون، وەک: نیتچە، کارل مارکس ... هتد، دوایی خەڵکیش پشتگیریکردن و شوێنیان کەوتن.

دەتوانین بڵێین: لە کۆتاییەکانی سەدەی (١٧) تاوەکوو سەدەی (١٩) ئیلحاد لە ئەورووپا بەتەواوەتی پەرەیسەند و گەشەیکرد، بوو بە خاوەنی چەندان قوتابخانەی فیکری و فەلسەفی و زانستی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی، کە بە هەموو شێوەیەک ئینکارییان لە بوونی خودا دەکرد، بۆ ئەمەش زۆر سوودیان لە ڕۆڵی خراپی کەنیسە و پیاوانی ئایینی مەسیحی و خورافیاتی نێو ئینجیل و کتێبە ئایینییەکان بینی.

سەبارەت بە مێژووی ئیلحاد لە جیهانی ئیسلامی و لە مێژووی نوێدا، دەگەڕێتەوە بۆ دوای چارەکی یەکەمی سەدەی (١٩) کاتێک جیهانی ئیسلامی بەتەواوی بە ڕووی ڕۆژئاوادا کرایەوە و داگیرکاری ئینگلیز و دەستکاری کردنی جیناتی مامەڵەی کەلتووری و ئەخلاقییانەی کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکان کەوتە

---

(١) سير أعلام النبلاء، الذهبي (١٤/ ٥٩-٦٥)، وإخبار العلماء بأخبار الحكماء، القفطي (٢٠٧)، وسير أعلام النبلاء، الذهبي (١٤/ ٣٥٤).

سەر سکەی جێبەجێ کردن و دوای جێهێشتنی وڵاتیش وازیان لە خێر و بێر و لە هەوڵدان بۆ لەقاندنی بنچینە کەلتوری و ئایینی و ئەخلاقییەکانی نێو کۆمەڵگە هەر نەهێنا.

ئەوەش بڵێین: کە ژمارەیەکی زۆر قوتابی ڕوویانکردە ئەورووپا بۆ خوێندن، پاشان بەهۆی ڕوانین لە شکستی کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکان و بەزیووی ناخی خۆیان و تەواو نەبوونی ئەزموون و زانیاری لەمەڕ شارستانییەتەکان، کەوتنە ژێر کاریگەری فیکر و فەلسەفەی ئیلحادەوە، دواتر کە دەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان و لەژێر ناوی کرانەوە و ئەقڵانییەت و پێشکەوتن پەرەپێداندا، سەرەتا ڕاستەوخۆ بانگەشەی ئیلحادیان نەدەکرد، چونکە دەیانزانی کە فیکرێکی نامۆیە بە کۆمەڵگەکانیان، بەڵکوو لە ڕێگەی ئەم بانگەشانەوە پەرەیانپێدەدا.

وڵاتانی تورکیا و میسر دوو نموونەی زۆر زەقن کە ئیلحاد تێیاندا بە ڕێژەیەکی بەرچاو گەشەی کرد و چەندان بیرمەند و پشتیوان و دامەزراوە و کتێب و نووسین و بڵاوکراوەیان هەبوو، دواتریش هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئیلحاد بوونی هەیە و بانگەشەکار و پشتیوانی خۆی هەیە، کە زیاتر لە ڕێگەی ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە فیکری خۆیان بڵاودەکەنەوە.

زۆرێک لە توێژەران پێیانوایە کە سەردەمی زێڕینی ئیلحاد کۆتایی پێهاتووە کە لەسەدەی حەوت دەستیپێکرد و لە ساڵی (١٩٩١ز) بە داڕووخانی یەکێتی سۆڤیەتی کۆتایی پێهات. هەر بۆیە لە یاسای زۆربەی زۆری وڵاتانی جیهان ئایین لە دەستوور و ئاڵا و دروشمدا جێگیرکراوە و بە تەواوی ڕێز لێگیراوە.

بەڵام ئەوەی لە دوای ساڵی دوو هەزارەوە هەیە و دەیەوێت خۆی بسەپێنێت و خۆی جێگیر کات، ئیلحادی زانستییە، کە بە ناوی فیزیک و ... قسە دەکات، بەڵام لە هەمان کاتیشدا زانست لەگەڵی نییە، ئەوەی کە هەیە قسەکردنە بە ناوی زانست و بانگەشەکردن و چەواشەکارییە و بەس.

**بۆیە دەتوانین بەم شێوەیە مێژووی ئیلحاد پۆلێن بکەین:**

١. سەردەمی پێش یۆنان

٢. سەردەمی یۆنان

٣. سەردەمی سەدەی نێوەڕاستی مەسیحی

٤. سەردەمی ئیسلام

٥. سەردەمی نوێ و ڕێنساس و شۆڕشی فەڕەنسی

٦. سەردەمی یەکێتی سۆڤیەت

٧. سەردەمی داڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت

٨. سەردەمی نوێ و بە زانستی کردنی ئیلحاد

## بوونی خودا وەک بابەتێکی فەلسەفی وجودی

هەر لە سەرەتای دروستبوونی مرۆڤەوە یەکێک لە پرسیارە وجودییەکان بریتی بووە لە بوونی خودا، بۆیە ئێمەش لێرەدا بەپێویستی دەزانین بیتوێژینەوە.

لەپێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە هەڵوێستی خەڵک و فەیلەسووفان چەند جۆرێکە دەربارەی بوونی خودا: خودایی (الألوهی) (Theism)، ڕوبووبییەکان (الربوبیة، Deism)، بێباوەڕی (الالحاد، Atheism)، نازانمگەرایی (اللاأدریة، Agnosticism)، شتگەرا (الشیئیة، letsism, بێموبالات و گرنگینەدەر (اللااکتراثیة - Apatheis)، یەکانەیی بوون (وحدة الوجود- pantheism)، سۆفستائی (السوفسطائیة، sophism).

وەک وتمان: فەلسەفە واتا بیرکردنەوە و بەدواداچوون و پرسیارکردن

دەربارەی خۆم، خودا، خەڵک، کۆمەڵگە، بوون، گەردوون، ژیان، مردن، خێر، شەڕ، جوانی، ناشیرینی، باش، خراپ، تاک، خێزان، کۆمەڵگە، سیاسەت، ئابووری، ئەخلاق، ئایین، ئیلحاد، دادگەری، ستەم، واجب، ممکن، ئەستەم، سروشت، هۆش، ئەقڵ، فیکر، زانست، ناسین، خەیاڵ، مێژوو، یاسا، عیشق، خۆشەویستی، پەیوەندی، زمان، هونەر و ... هتد

کەواتا بەو پێیەی باسمان کرد فەلسەفە هیچ پەیوەندییەکی بە ئیلحادەوە نییە، فەلسەفە واتە: بیرکردنەوە و تێڕامان و بەدواداچوون و پرسیارکردن، کەواتە فەلسەفە شوێنکەوتەی خاوەنەکەیەتی، ئەگەر کەسەکە مولحید بێت، فەلسفە و بیرکردنەوەکەی دەبێتە فەلسەفەیەکی ئیلحادی، ئەگەر کەسەکە باوەڕدار بێت، دەبێتە فەلسەفەیەکی باوەڕدار، ئەگەر کەسەکە موسڵمان بێت و لە چوارچێوەی ئیسلام بیربکاتەوە، دەبێتە فەلسەفەیەکی ئیسلامی، ئەگەر ... هتد.

کەواتا فەلسەفە بێلایەنە نە ئیماندارە نە مولحیدە، بەڵکوو ئەوە کەسەکەیە دەیکاتە مولحید یان باوەڕدار.

بۆیە ئەگەر دیقەتی مێژوو بدەین، فەیلەسووفە مولحیدەکان بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، بەڵام ئیماندارەکان -مەبەستم لە ئیماندار موسڵمان نییە، مەبەستم ئەوانەی بڕوایان بەخودا هەبووە - زۆر زۆرن، بۆ نموونە: سوقرات، ئەفلاتوون، ئەرستۆ، فارابی، ئیبن سینا، ئیبن ڕوشد، دیکارت، کانت، ... هتد.

## بەڵگەکانی بوونی خودا لە نێوان عەقڵ و فەلسەفە و زانست و لۆژیکدا

وەک باسمانکرد هەر لە سەرەتای دروستبوونی مرۆڤەوە یەکێ لەپرسیارە وجودییەکان بریتی بووە لە بوونی خودا، بۆیە ئێمەش لێرەدا بەپێویستی دەزانین بیتوێژینەوە و بەڵگەکانی لەسەر باس بکەین.

### ١- بەڵگەی دروستکردن و بەدیهێنان

«هەموو دروستکراوێک دروستکارێکی هەیە.»

پوختەی بەڵگەی دروست کردن و بەدیهێنان (دلیل الخلق):

هەموو دروستکراوێک دروستکەرێکی هەیە (لکل مخلوق خالق).

هەموو پەیدابووێک پەیداکەرێکی هەیە (لکل حادث محدث).

یان: گەردوون سەرەتایەکی هەیە.

هەر شتێک سەرەتای هەبێت، دروستکراوە و دروستکاەری هەیە.

کەواتە: گەردوون دروستکراوە و دروستکەری هەیە.

ئەو یاسایە یاسایەکی عەقڵییە و هیچ مرۆڤێکی خاوەن عەقڵ ناتوانێت نکووڵی لێ بکات، چونکە ناکرێت شتێک دروستکرابێت و پەیدابووبێت، بەڵام دروستکار و پەیداکەری نەبێت!

بۆ نموونە، بیربکەوە و تێرابمێنە لە هەموو ئەو شتانەی کە لە دەوروبەرتن، لە خانوو، باڵەخانە، ئۆتۆمبێل و مۆبایل و .... هتد، هیچیان بەبێ دروستکار و پەیداکار دروست نەبوون و پەیدانەبوون، کەواتە ئەگەر باڵەخانەیەک یان خانوویەک یان پەرتووکێک یان پێنووسێک یان دەرزییەک یان ...، لە خۆوە و بەبێ دروستکەر دروست نەبن، ئەی باشە ئەو هەموو گەردوونە بەو هەموو

گەورەییەوە چۆن بەبێ دروستکەر دروست دەبێت؟!

باشە تۆ هەر شتێک پێت بڵێم کێ دروستی کردووە لەو شتانەی لە دەوروبەرتن و لەبەر دەستن، ڕاستەوخۆ دەڵێی فڵان کەس یان فڵان کۆمپیانیا، ئەی باشە ئەو زەوییە، ئەو خۆرە، ئەو مانگە، ئەو کۆمەڵەی خۆرە، ئەو کەهکەشانانە، ئەو گەردوونە، کێ دروستی کردوون؟!

باشە مەعقولە و لۆژیکییە نوکە دەرزیەک پەیدا نابێت، تاوەکوو کەسێک نەیهێنێتە بوون، بەڵام ئەم زەوی و خۆر و گەردوونە بەبێ دروستکار و بەبێ پەیداکار بێنە بوون و پەیدا ببن!

بۆ زانیاریتان هیچ کەسێک ناتوانێت یەک کەوچک یان یەک گرام لە ماددەیەک بەرهەم بهێنێت!

دەبینین ئیلحاد چەند بیرۆکەیەکی هەیە دژی ئەم یاسایە کە هەموویان گریمانەی نالۆژیکی وِ نازانستی و ناعەقڵانین، ئەم گریمانانە بریتین لە:

١. گەردوون بەڕێکەوت (سوودفە) دروستبووە.

٢. گەردوون، سروشت دروستی کردووە.

٣. گەردوون، هەر هەبووە و ئەزەلییە.

٤. گەردوون خۆی خۆی دروستکردووە.

٥. گەردوون خەون و خەیاڵە و حەقیقەتی نییە.

**١- گەردوون بەڕێکەوت (سدفە) دروستبووە.**[1]

---

(١) ویلیام دیمبسکی فەیلەسووف و لاهووتی و بیرکاریزانی بەناوبانگی ئەمەریکی، هەستا بە دانانی چەمکی سنووری ئەگەری گەردوونی، ئەویش بە هەژمارکردنی سنووره گەردوونییەکان بەم شێوەیە:
١ – تەمەنی گەردوون =

پێش هەموو شتێک با بزانین (صدفة) چییە؟

(صدفة) واتە: لەپڕ، لەناکاو[1]، بۆنموونە تۆ دەڵێی: من لەماڵەوە چوومە دەرەوە لەپێش ماڵەکەم تەصادوفی کاک موحەممەدم کرد، یان دەڵێیت: لەناکاو بە کاک موحەممەد گەیشتم، یان دەڵێیت: سەیارەیەک لەولاوە هات سەیارەیەکیش لەملاوە هات و تەصادوفی یەکتریان کرد، کەواتە لەو حاڵەتانەدا هیچ شتێکی تازە پەیدا نەبووە، کاتێک (صدفة) ڕوودەدات کە(مادده، کات، شوێن) هەبن، بۆنموونە کە من تەصادوفی کاک موحەممەدم، کرد من هەبووم، کاک محمدیش هەبوو، کاتێکیش هەبوو کە تەصادوفی یەکترمان کرد تێیدا،

---

٢ – ژمارەی تەنۆلکە سەرەتاییەکان کە گەردوونیان لێ پێکهاتووە.
٣ – ئەوپەڕی جووڵەی گونجاو بۆ ئەو تەنۆلکە سەرەتاییانە لە چوارچێوەی تەمەنی گەردوون دیمبسکی بەم شێوەیە گەیشتووە بە پێوانەکەی:
١ – کۆی تەنۆلکە سەرەتاییەکان لە گەردووندا ١٠٨٠ ئەمە بەپێی ئارسەر ئیدینگتون، بەڵام هەندێکی تر ئەو تەنۆلکانە بە ١٠٨٩ دادەنێن.
٢ – بچووکترین یەکەی شوێن کە بگونجێت ڕووناکی پێدا تێپەڕێت ڕێژی پلانکە، کە یەکسانە بە ١٠-٣٣ سانتیمەتر. بچوکترین یەکەی کاتیش کە ڕووناکی پێویستییەتی بۆ ڕۆیستن، کاتی پلانکە، کە یەکسانە بە ١٠-٤٤ چرکە. هەڵگەڕاوەی ئەم کاتە = ١٠٤٤.
بچووکترین کات کە ڕووداوێک تێیدا ڕووبدات کاتی پلانکە کە یەکسانە بە ١٠٤٤ بە نزیکەیی بۆ هەموو ڕووداویک، هیچ ڕووداوێک ڕوونادات لە گەردووندا خێراتر لە یەکەی کاتی پلانک.
٣ – ژمارەی چرکەکان لە کاتی ڕوودانی تەقینەوە گەورەکەوە ١٣،٧ ملیار ساڵ، کەڕەتی ٣٦٥ ڕۆژ، کەڕەتی ٢٤ کاتژمێر، کەڕەتی ٦٠ خولەک، کەڕەتی ٦٠ چرکە = ١٠١٧ چرکە.
بە لێکدانی ئەو سێ ئەگەرە دەگەینە گەورەترین ژمارە کە ناگونجێت ڕێکەوت تێی پەڕێنێت:
١٠١٧ کەڕەتی ١٠٤٤ کەڕەتی ١٠٨٩= ١٠١٥٠
دەبینین ئەگەری ڕوودانی هەرشتێک بە ڕێکەوت گوزارشتە لە ١ بۆ بڕی هەوڵەکان و ڕووداوە هەمەکییەکان بۆ هەموو تەنۆلکەکان لە گەردووندا، کە موتابیقی ژمارە ١٠١٥٠ یە، واتە ئەگەری ڕوودانی ڕووداویکی دیاریکراو پێویستە ئەو بڕە تینەپەڕێنێت، واتە ئەگەر، ئەگەری ڕوودانی لەو ڕێژەیە زیاتر بوو یان بگاتە ئەو ڕێژەیە، ئەوە ئەستەمە ڕووبدات، واتە ١ بۆ ١٠١٥٠ بوو ئەو ڕووداوە ئەستەمە ڕووبدات، لەویش زیاتربوو ئەستەمە ڕووبدات. (مرۆڤە بێویستەکان، ل ٥١٩-٥٢٠. ئاڤار قەرەداغی.)

(١) سوودفە لە زاراوەی فەلسەفیدا واتە: شتێکی بێ هۆ (علة)، کە دیارە هەموو عەقڵێکی ساغ و سەلیم نکووڵی لێدەکات، چونکە هەموو بەرهۆیەک پێویستی بە هۆکارێک هەیە، کەواتە مولحیدان مەبەستیان لە سوودفە شتیکی پەیدابووی بێ هۆ و هۆکارە.

هەروەها شوێنێکیش هەبوو کە تێیدا تەصادوفی یەکترمان کرد، کەواتە ئەگەر بپرسم کوانێ (صدفة)ەکە، دەتوانیت پێم بڵێیت؟! نەخێر، ناتوانیت. چونکە(صدفة) شتێکی زیهنییە و هیچ بوونێکی سەربەخۆی نییە لە جیهانی دەرەوەدا.

باشە کەواتە مادام (صدفة) بوونێکی زیهنی بێت و لە دەرەوەی «ماددە، کات، شوێن» بوونی نەبێت، چۆن دەتوانین بڵێین گەردوون بە(صدفة) هاتووەتە بوون؟ چونکە بەقسەی زانا بێباوەڕەکانیش بێت (وەک سیڤن هۆوکینگ)، گەردوون پێش سێزدە ملیار و حەوت سەد ملیۆن ساڵ(١٣٧٠٠٠٠٠٠٠٠) بوونی نەبووە، پاشان هاتووەتە بوون، کەواتە پێش ئەو کاتە «ماددە، کات، شوێن» بوونیان نەبووە، کەواتە مەجالێک بۆ (صدفة) نەمایەوە، چونکە(صدفة) بەبێ «ماددە، کات، شوێن» وێنا (تصور) ناکرێت، وەک باسمانکرد.

کەواتە لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە ئەو ئەگەرە ئەسڵ و ئەساسی نییە و تەنیا فێڵێکە و قسەیەکی بێبنەمایە.

ئەگەر هەر بەردەوام بوو لەو نامەعقولییە و هەر بڕوای بە(صدفة) هەبوو لە دەرەوەی «ماددە، کات، شوێن» و گوتی کە گەردوون بە(صدفة) و ڕێکەوت و لەناکاو دروستبووە و هاتووتە بوون، دەڵێین: باشە، ئەی کێ دروستیکرد و هێنایە بوون؟ چونکە بەو قسەیەی کە دەیکات ڕزگاری نابێت لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو یاسایە، چونکە هەموو ژیرێک و عاقڵێک، دەزانێت نەبوو(عدم) بەبێ کاریگەری دەرەکی (المؤثر الخارجی) نایەتە بوون و دروست نابێت.

باشە ئەگەر یەکێک ئەو ناماقوولییە بکات و بڵێت: ئەو مۆبایلەی دەستت پێش (٢) ساڵ لەمەوبەر بە(صدفة) بەڕێکەوت لەناکاو دروستبوو، بەبێ هیچ کاریگەرییەکی دەرەکی، ئایا بەشێتی نازانیت؟!

تۆ دەپرسی: باشە چۆن دەکرێت لەخۆوە و لەناکاو شتێک بێتە بوون؟!

ئێمە داوا دەکەین یەک نموونەمان بۆ بێنن کە شتێک لەخۆیەوە و لەپڕ بەبێ هیچ کاریگەرییەکی دەرەکی بێتە بوون، دەفەرموون نموونەیەکمان بۆ بێنن، دەفەرموون گرامێک لە ماددەمان بۆ بێنن کە لەخۆوە و لەناکاو بە (صدفة) بێتە بوون.

باشە ئێوە دەڵێن سێزدە ملیار و حەو سەد ملیۆن ساڵ لەمەوبەر بچووکترین بەشی ماددە هاتە بوون بەبێ هیچ هێزێکی دەرەکی کە خودایە، باشە ئێمەش دەڵێین فەرموون ئێستا بە هەموو مرۆڤایەتی و بەو هەموو پێشکەوتنە زانستیەی کە زۆر شانازی پێوەدەکەن و پێتانوایە هەموو شتێکە، فەرموون شتێکمان بۆ دروستبکەن بەبێ هیچ هێزێکی دەرەکی یان گرامێک ماددەمان بۆ دروستبکەن، یان دەرزیەکمان بۆ دروستبکەن، بەبێ هیچ هێزێکی دەرەکی.

**٢- سروشت گەردوونی دروست کردووە**

سەرەتا با بزانین سروشت چییە؟ سروشت وەک فەرهەنگی ئۆکسفۆرد پێناسەی کردووە بریتیە لە: پێکهاتەکانی وەک: زیندەوەران، نازیندووەکان، ڕووەک، ئاژەڵەکان و ... هتد.

کەواتە سروشت بۆ خۆی بریتییە لە دروستکراوەکان، کەواتە ناکرێت هەر ئەو دروستکراوانە بۆ خۆیان ببنە دروستکاری خۆیان یان غەیری خۆیان.

**٣- گەردوون هەر هەبووە**

ئەم گریمانەیە بەهێزترین گریمانەی ناباوەڕەکان بوو، بەڵام کە بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە (Big Bang) (الانفجار العظیم) دۆزرایەوە، ئەم گریمانەیە بەتەواوی هەرەسی هێنا, چونکە بەپێی بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە، گەردوون لە خالێکی زۆر زۆر بچووکەوە پەیدابووە، کە پێشتر بوونی نەبووە، ئەوەش پێش سێزدە ملیار و حەوت سەد ملیۆن ساڵ لەمەوبەر ڕوویداوە، «ستیڤن هۆوکینگ»

کە گەورەترین زانای فیزیایی ئەم سەردەمە بوو و بێباوەڕیش بوو دەڵێت: پێش ئەم تەقینەوەیە «ماددە، کات و شوێن» بوونیان نەبووە، کەواتە دەرکەوت کە گەردوون سەرەتای هەیە، هەر شتێکیش سەرەتای هەبێت، دروستکاری هەیە.

بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە:- پێش ١٣،٨ملیار ساڵ لەمەوبەر ماددەی گەردوون لە خاڵێکدا کۆبووەوە کە چڕی و پلەی گەرمییەکی لە ڕاددەبەدەر بەرزی هەبوو، پاشان وردە وردە چڕی کەم دەکات و کشان ڕوودەدات و پلەی گەرمییەکەشی کەم دەکات.[1]

ئەم بیردۆزە دەیسەلمێنێت کە گەرمی سەرەتای هەیە و تەمەنێکی دیاریکراوی هەیە کە ناتوانرێت بوترێت بێسەرەتایە.

**پوختەی بیردۆزەی «تەقینەوە گەورەکە»**

**(Big bang) (الانفجار العظیم):**

ئەم گەردوونە پێش (١٣٧٠٠٠٠٠٠٠٠)[2] سێزدە ملیار و حەوت سەد ملیۆن ساڵ لەمەوبەر، تاکێکی زۆر زۆر بچووک بووە، کە هیچ ئەندازەیەکی فیزیایی ناتوانێت بیپێوێت، پێی دەڵێن: ئەتۆمی سەرەتایی، یان تاکی گەردوونی، یان هێلکەی گەردوونی، یان تۆوی گەردوونی (مفردة الکون) (بیضة الکون) (بذرة الکون)، بە ئینگلیزی پێیدەڵێن: (singularity) «سینگلارتی»، ئەم (singularity) یە چڕی و گەرمییەکەی زۆر زۆر بووە، دوایی لەوەوە (singularity) گەردوون هاتووەتە بوون، کە پێش ئەو (singularity) شتێک نەبووە بەناوی «ماددە، کات و شوێن».

کەواتە ئەم (singularity)یە هەم ماددە بووە و هەم وزەی لەخۆ گرتووە و

---

(١) تاریخ أکثر موجز للزمن، ستیفن هوکینج، (٧٧ - ٨٣).

(٢) تاریخ أکثر موجز للزمن، ستیفن هوکینج، ولیونرد ملونیدوف (١٧٧).

پاش تەقینەوەکە بەشەکانی ئەتۆم پەیدابوون، پاشان لەو پارچانە ئەتۆمەکانی هایدرۆجین و هیلیۆم پەیدابوون، پاشان لەو ئەتۆمانەش «تۆزی گەردوونی» پەیدابوو، پاشان لەو تۆزەش گەلە ئەستێرەکان پەیدابوون، پاشان دانە دانەی ئەستێرەکان دروستبوون، بۆیە لەو کاتەوە گەردوون بەردەوام لە فراوانبوون و گەشەدایە، پاش ئەو تەقینەوەیە کات و شوێن پەیدابوون، چونکە بەبێ ماددە کات و شوێن بوونیان نییە.

وەک زانایان باسی دەکەن ئەو (singularity)یە، بەم شێوەیە بووە:

١. لە ڕووی گەرمییەوە (١٠) توان (٣٢) پلەی (کالْڤن) گەرم بووە.

٢. لە ڕووی کاتەوە (١٠) توان ( - ٤٣) چرکە، کاتی پێچووە کە تەقیوەتەوە.

٣. لە ڕووی قەبارەوە (١٠) توان ( - ٣٥) ی مەترێک بووە.

دوایی ئەو (singularity) تەقیوەتەوە و لێککشاوە و سەرەنجام ئەو گەردوونەی لێ دروستبووە.

کەواتە ئەم (singularity)یە هەم ماددە بووە و هەم وزەی لەخۆ گرتووە و پاش تەقینەوەکە بەشەکانی ئەتۆم پەیدا بوون، پاشان لەو پارچانە ئەتۆمەکانی هایدرۆجین و هیلیۆم پەیدا بوون، پاشان لەو ئەتۆمانەش «تۆزی گەردوونی» پەیدابوو، پاشان لەو تۆزەش گەلە ئەستێرەکان پەیدابوون، پاشان دانە دانەی ئەستێرەکان دروستبوون، بۆیە لەو کاتەوە گەردوون بەردەوام لە فراوانبوون و گەشەدایە، پاش ئەو تەقینەوەیە کات و شوێن پەیدابوون، چونکە بەبێ ماددە کات و شوێن بوونیان نییە.[١]

خاوەنی بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە (big bang) (الانفجار العظيم) بريتييە

---

(١) تاريخ موجز للزمان، ستيف هوكنج (٥٢ - ٥٦)، والقضية الخالق، لی ستروبل (١٤٧ - ١٥٢)، العلم وجود الله، جون لينكس (١١٨ - ١٢٠)، براهين وجود الله، سامی عامری (٣٩٧ - ٣٩٨)،

لە زانای بەلجیکی «جورج لو میتەر» کە لە ساڵی (١٩٢٧) ئەو گریمانەیەی دانا بۆ دروستبوونی گەردوون، پاشان زانایان و ناوەندە زانستییەکان گرنگی زۆریان پێ دا تا گەیشتە ئەوەی ئەمڕۆ.[1]

### ٤- گەردوون بۆخۆی خۆی دروستکردووە

ئەوە وەک ئەوە وایە بڵێی: ئەم پەرتووکە خۆی خۆی دروستکردووە! یان ئەو مۆبایلە خۆی خۆی دروستکردووە! ئەمەش ئەستەمە, چونکە کە دروستکراو بێت واتە نەبووە و دواتر هاتووەتە بوون، کە دروستکاریش بێت، واتە بوونی هەبووە، دیارە بوون و نەبوونیش لە یەک ساتدا کۆ نابنەوە.

### ٥- گەردوون خەون و خەیاڵە و ڕاستەقینە نییە

ئەو گریمانەیە شایەنی وەڵامدانەوە نییە، چونکە پێچەوانەی خوداڕسک و ژیری و مامەڵەی مرۆڤە، چونکە کاتێک منداڵ بۆ شیر دەگری، داوای شتێک دەکات کە لەڕاستیدا بوونی هەیە، هەر بۆیە خەون و خەیاڵ تێری ناکات.

کەواتە یەک ڕاستی ماوەتەوە، ئەویش ئەوەیە: ئەو گەردوونە دروستکراوە، هەموو دروستکراوێکیش دروستکاری هەیە، کە خودای گەورەیە و هەموو سیفەتی (جلال وکمال وجمال)ی هەیە واتە: هەرچی سیفەتی گەورەیی و تەواوی و جوانی هەیەتی.

---

(١) هەروەها بۆ پوختەی ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ کتێبی (شموع النهار، إطلال على الجدل الدينى الإلحادى المعاصر فى مسألة الوجود الإلهى) الدكتور عبدالله بن صالح العجيرى، لاپەڕە(١١٦ - ١١٧).
هەروەها بگەڕێنەوە سەر ئەو سەرچاوە ئینگلیزیانە:
https://web.archive.org/web/20190418123026/http://www.astro.ucla.edu/~wright/cosmology_faq.html
https://www.jpl.nasa.gov/news/news.php?release=082-2014
https://www.pbs.org/wgbh/aso/databank/entries/dp27bi.html

## ٢- بەڵگەی ڕێکسازی و ڕێکخستن

**بەڵگەی ڕێکخستن دەڵێت: «هەموو ڕێکخراوێک ڕێکخەرێکی هەیە.»**

• گەردوون لە بچووکترین بەشییەوە تاوەکوو دەگاتە گەورەترین بەشی هەمووی ڕێکخراوە.

• هیچ ڕێکخراوێک بە بێ ڕێکخەر نابێت.

• گەردوون ڕێکخراوە.

• کەواتە: گەردوون ڕێکخەری هەیە (کە خوای گەورەیە)(١)

کەواتە ئەگەر دروستکراوەکان بەڵگەبن لەسەر بوونی خودا، ئەوە ڕێکسازی و ڕێکخراوی زیاتر بەڵگەیە، چونکە هەر شتێک ڕێکخراو بێت و ڕێکسازی تێدا کرابێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە پێویستی بە هێزێکی دەرەکی هەیە تاوەکوو ڕێکی بخات.

بۆیە بڕوانە:

مادده، مرۆڤ، ژیانداران، ڕووەک، زەوی و گەردوون، هەر هەموویان بە جوانترین و ڕێکوپێکترین شێوە دروست کراون و هیچ نارێکی و کەموکوڕی و ناشیرینییەکیان تێدا بەدی ناکەیت، بە جۆرێک ئەگەر هەر کامێک لەوانە تۆزێک لەو ڕێکسازییە لە دەست بدەن و نەمێنێت، دەبینین بەتەواوی سیستمی ژیان تێک دەچێت و هەر کامێک لەوانە قبووڵی نارێکی ناکەن.

کەواتە دەپرسین کێ ئەوانەی لە بچووکترین شتەوە تاوەکوو گەورەترین شت ڕێکخستن؟ ئایا دەکرێت مادده خۆی خۆی ڕێک بخات؟!

---

(١) ئەو بەشە (کە خوای گەورەیە) لە خودی بەڵگەکەدا نییە، بەڵام ئەگەر بەدوایدا بڕۆین دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە تاکە دروستکەر و ڕێکخەر و ئەندازەگیر و .... خودای گەورەیە.

ئایا مادده عەقڵی هەیە تاوەکوو خۆی ڕێک بخات و ژیاندار، ڕووەک، زەوی، ئاسمانەکان و گەردوون ڕێک بخات؟!

ئایا مۆبایلێک بەبێ هێزێکی دەرەکی ڕێک دەخرێت؟ تاوەکوو بڵێین مادده و گەردوون خۆیان خۆیانیان ڕێکخستووە؟!

باشە ئەگەر باڵەخانەیەک یان کۆشکێک یان خانوویەکی جوان و قەشەنگ و ڕێکخراو ببینی و پرسیار بکەیت و بڵێیت: کێ ئەمەی دروست کردووە و جوان و ڕێکی خستووە؟ ئەویش بڵێت: خۆی خۆی دروستکرد و جوان کرد و ڕێکخست، یان لەخۆوە و لەناکاو و کتوپڕ و بەڕێککەوت و بە (صدفة) وای لێ هات و جوان و قەشەنگ و ڕێکخراو ڕێکساز بوو! ئایا بە شێتی نازانیت؟!

هەربۆیە ئەگەر کەمترین تێکچوون لەو ڕێکسازییە ڕووبدات لە مادده یان مرۆڤ یان ژیانداران یان ڕووەک یان خۆر و گەردوون، ئەوا ژیان دەکەوێتە مەترسییەوە و نامێنێت و تێک دەچێت، کەواتە کێ زانیی مادده و مرۆڤ و ژیاندار و ڕووەک و گەردوون پێویستیان بەو ڕێکسازی و بەو ڕێکخراوەییە هەیە؟! کێ پێی وت ئەگەر وانەبێت و بەو شێوەیە نەبێت و ئەو ڕێکسازییەی تێدا نەبێت، ئەوا نابێت و گەردوون و ژیان تێک دەچن؟

تۆ ئەگەر تەنیا یەک خانەی مرۆڤ وەربگریت، کە بارستەکەی یەک لەسەر ملیاری گرامێکە (یەک نانۆ) واتە گرامێک بکەیە ملیارێک بەش ئەو جار یەک بەش لەو ملیارە بریتییە لە بارستەی خانە، ئەو خانەیە ئەوەندە بەڕێکی خودای گەورە دروستیکردووە، کە تاوەکوو ئێستاشی لەگەڵ بێت کە زانست چەندە پێشکەوتووە نەیانتوانیوە یەک خانە دروست بکەن و ناشتوانن، باشە دەپرسین کێ ئەو خانەیەی بەو شێوەیە ڕێکخستووە کە هەموو مرۆڤایەتی کۆببێتەوە نەتوانن یەک خانە دروستبکەن؟!

بۆیە (مایکڵ دانتۆن Michael Denton) زانای بایەلۆژی هاوچەرخ،

دەربارەی خانە دەڵێت: "بۆ ئەوەی لە ڕاستی ژیان تێبگەین بەو شێوەیەی کە زانستی بایەلۆژی دەریخستووە، پێویستە بێین خانەیەکی زیندوو هەزار ملیۆن جار گەورە بکەین، بە ڕاددەیەک وەک باڵۆنێکی گەورە و زەبەلاح دەربکەوێت کە بتوانێت شارێکی گەورەی وەک نیۆرک یان لەندەن دابپۆشێت، جا کە لەو خانەیە نزیک دەبینەوە بۆ ئەوەی بزانین چییە و چی تێدایە، دەبینین ملیۆنەها دەرگای تێدایە کە لێوەی بچینە ژوورەوە، جا ئەگەر بۆمان ڕێککەوت لە یەکێک لەو دەرگایانەوە بچینە ژوورەوە ئەوا جیهانێکی گەورەی تەکنەلۆژیا دەبینین کە لە وردی و ئاڵۆزیدا سەرساممان دەکات."

باشە دەپرسین ئەوە یەک خانە وەهایە، لە کاتێکدا هەر مرۆڤێک لە سەد ترلیۆن خانە پێکدێت، باشە کێ ئەو خانە و خانانەی بەو شێوەیە ڕێکخستنکە هەموو مرۆڤایەتی بەو هەموو پێشکەوتنە زانستییەوە نەتوانن یەک خانە دروستبکەن و ڕێکیبخەن؟ دەفەرموون، خانەیەکمان بۆ دروستبکەن و ڕێکیبخەن، باشە ئێوە ناتوانن بە باڵەخانەیەک یان ژوورێکی ڕێکخراو بڵێن ڕێکخەری نییە، ئەی چۆن دەتوانن بڵێن ئەو هەموو گەردوونە بەوەشەوە کە لەناویدا ڕێکخراوە، ڕێکخەری نییە؟!

## ٣- بەڵگەی ئەندازەگیریی

بەڵگەی ئەندازەگیری دەڵێت: «هەموو ئەندازەگیراوێک، ئەندازەگیرێکی هەیە.»

**پوختەی بەڵگەی ئەندازەگیری:**

- ئەندازەگیراو ئەندازەگیری هەیە.
- گەردوون لە بچووکترین بەشیەوە تاوەکوو گەورەترین بەشی، هەر هەموو

ئەندازەی گیراوە.

• هیچ ئەندازەگیراوێکیش بەبێ ئەندازەگیر ناکرێت و نابێت.

• کەواتە: گەردوونیش ئەندازەگیری هەیە (کە خوای گەورەیە).

ئەندازەگیری (تقدیر) ئەوەیە هەر شتێک بە ئەندازە و ڕێکوپێکی و حیسابکاری دروست بکرێت، بە جۆرێک لەگەڵ کات و شوێن و بارودۆخ و دروستکراوەکانی دەوروبەری بگونجێت و، لەگەڵ خۆی و دەوروبەری تێک نەگیرێت، هاوسەنگی تەواوی هەبێت لەگەڵ هەموو شتەکان.

بۆیە ئەگەر بڕوانیە بچووکترین بەشی ماددە تاوەکوو دەگاتە گەورەترین بەشی گەردوون بە هەموو یەکە و پێکهاتەکانیەوە، هەر هەمووی ئەندازەی تایبەت بە خۆی بۆ دانراوە، بە شێوەیەک کە ئەگەر ئەندازەکان تۆزقاڵێک تێکبچن ئەوا گەردوون بەخۆی و پێکهاتەکانی و ئەوەی تێیدایە، هەر هەمووی تێکدەچوو و ژیان کۆتایی پێدەهات.

کەواتە حەقی خۆیەتی بپرسین ئەو ئەندازانە کێ دایناون و کێ ئەندازەی گرتوون؟!

ئایا هیچ ئەندازەگیراوێک هەیە ئەندازەگیری نەبێت؟!

تۆ ئەگەر خواردنێک یان شەربەتێک یان ماستاوێک یان ....، ئامادە بکەیت بێگومان دەبێت بە ئەندازە شتەکانی تێ بکەیت، ئەگەرنا تێک دەچێت، باشە ئەگەر خواردنێک کەسێک ئەندازەی پێکهاتەکانی نەگرێت، دروست نابێت و ئەگەر دروستیش ببێت بە کەڵک نایەت، ئەی باشە کێ ئەندازەی گەردوون و پێکهاتەکانی گرت؟!

ئایا ماددە عەقڵی هەیە تا بتوانێت خۆی ئەندازەی خۆی بگرێت؟

ئەگەر بڵێیت: بەڵێ، ئەوکات منیش دەڵێم ئەو خواردنە بۆخۆی دروست بووە و ئەندازەی پێکهاتەکانیشی بەبێ هیچ هێزێکی دەرەکی ئەندازەی گیراو هاتەبوون.

**چەند نموونەیەکی کەم لەسەر ئەندازەگیری:**

١- خانەی مرۆڤ، مرۆڤ لە سەد ترلیۆن خانە پێکهاتووە، هەر خانەیەکیش لە سەد ترلیۆن گەردیلە پێکهاتووە، خانە چەندان پێکهاتەی تێدایە، وەک :ناوک، کرۆمۆسۆم، بۆهێل، تفتی فۆسفاتی، ئەدینین، سایتۆسیم، گرانین، نیوکلۆتاید ... هتد.

خانە بەو بچووکییەوە ئەندازەگیرییەکی زۆر زۆری تێدایە، بە شێوەیەک ئەگەر بێت و تۆزقاڵێک لەو ئەندازەگیرییەی تێکبچێت، ئەوا خانە دروست نابێت و تێکدەچیت، ئەگەر خانە دروست نەبوو و تێکچوو، ئەوا شانە دروست نابێت و تێکدەچێت. ئەگەر شانە دروست نەبوو و تێکچوو، ئەوا ئەندام دروست نابێت و تێک دەچێت. ئەگەر ئەندام دروست نەبوو و تێکچوو، ئەوا کۆئەندام دروست نابێت و تێک دەچێت. ئەگەر کۆئەندام دروست نەبێت و تێک بچێت، ئەوا جەستە دروست نابێت و تێکدەچێت، کەواتە مرۆڤ و مرۆڤایەتی دروست نابن یان بە سەقەتی و تێکچوویی دروست دەبن!

کێ ئەو ئەندازەیەی گرت؟!

٢- «ستیڤن هۆوکینگ» کە بەناوبانگترین زانای سەردەمە، چەند ساڵێکە مردووە، لە پەرتووکی «مێژوویەکی کورتی کات» لاپەڕە (١٢١) دا دەڵێت: "فراوانبوونی گەردوون، خێراییەکی زۆر وردە، بە ئەندازەیەک کە ئەگەر لە چرکەی یەکەمی دەرکەوتنی گەردووندا، ئەو فراوانبوونەی گەردوون، کەمتر بووایە لە بەشێک لە سەر ملیۆن ملیار بەش (١/ ١،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) یان دەتوانین بڵێین: بەشێک لەو هەزار ترلیۆنەش، ئەوا گەردوون بە سەر خۆیدا دەڕووخا، بەر لەوەی بگاتە ئەو حاڵەتەی ئێستای."

یانی: فراوانبوونی گەردوون دەبوو هەر بەو شێوەیە بێت، بە هیچ شێوەیەک نەدەبوو نە سستتر و خاوتر و نە خێراتریش بێت، باشە ئێمە دەپرسین کێ ئەو ئەندازە وردەی دانا؟![1]

کێ ئەندازەی ئەو خێراییەی بەو شێوەیە گرت؟!

کێ وتی و ماددەی فێرکرد، کە ئەگەر خێراتر بێت، گەردوون دروست نابێت، ئەگەر هێواشتریش بێت، هەر دروست نابێت؟!

**٣-** ئەندازەگیری لە نێوان بارستایی (کتلة)ی نیوترۆن و ئەلیکترۆن، بارستایی ئەلیکترۆن بە ئەندازەی (٢، ٪) ، ٢/١٠٠٠)ی بارستایی نیوترۆنە، ئەو بارستاییبە، دەبوو تۆزقاڵێک لەوە زیاتر و کەمتر نەبێت، بۆئەوەی گەردیلە دروست ببێت، ئەگەر بارستایی ئەلیکترۆن تۆزقاڵێک لەوە کەمتر بووایە یان زیاتر بووایە، نەدەگونجا گەردیلە دروست ببێت،ئەگەر گەردیلە دروست نەبووایە، گەردیش دروست نەدەبوو، ئەگەر گەردیش دروست نەبووایە، مادده دروست نەدەبوو، ئەگەر ماددەش دروست نەبووایە گەردوون بە هەموو پێکهاتەکانییەوە دروست نەدەبوو، بە مرۆڤیشەوە.

دەپرسین کێ ئەو ئەندازەگیرییەی کرد؟!

مادده خۆی ئەو عەقڵ و هۆشەی هەبووە کە بزانێت ئەگەر ئەندازەی نیوترۆن و ئەلیکترۆن وا نەبێت، گەردیلە و گەرد و مادده و گەردوون دروست نابن؟!

باشترە بڵێین: مادده ئەندازەگیرە کە هیچ سیفەتێکی عەقڵ و هۆش و ....، نییە، یان بڵێین خوای گەورە کە هەموو سیفەتە گەورە و تەواوەکانی هەبن؟!

**٤-** ئەندازەگیری نێوان ڕێژەی هێزی کەهرۆموگناتیسی و هێزی کێشکردن، ڕێژە و ئەندازەی نێوانیان بریتییە لە یەک لەسەر دە توان چل (١/١٠٤٠) واتە ژمارەی دە (١٠) چل سفری بۆ دابنێ، یەک لەسەر ئەو ژمارەیە، بریتییە لە

---

(١) مێژوویەکی کورتی کات، ستیڤن هۆوکینگ، لاپەڕە (١٢١).

هێزی کێشکردن، یانی هێزی کاهرۆمۆگناتیسی زۆر زۆر زۆر بەهێزترە لە هێزی کێشکردن، چونکە ئەو هێزی کاهرۆموگناتیسییە ئەو هەموو ماددە و ئەستێرە و هەسارە و کەهکەشانانەی بەیەکەوە بەستوون، ئەگەر هێزی کاهرۆموگناتیسی بەو بەهێزیەوە و بەو ڕێژەیە و بەو ئەندازەیە نەبێت، ئەوا تەنۆلکە و گەرد و گەردیلەکان بەیەکەوە نالکێن.

بۆیە «ماکس تیگمارک» زانای گەردووناسیی ئەمریکی دەڵێت: "ئەگەر هێزی کەهرۆمگناتیسی (٤/٪) بێهێزتر بووایە لەو ڕێژە و ئەندازەیەی ئێستای، ئەوا خۆر لە کاتی دروستبوون دەتەقییەوە و هەروەها ئەگەر ڕێژەکەی زیاتریش بووایە، بەهەمان شێوە، ئەستێرە و کەهکەشانەکان، یان هەر دروست نەدەبوون و یەکسەر دەتەقینەوە، یان بەو شێوەیەی ئێستایان نەدەبوون."

هەروەها ئەو زانا گەردووناسە ئەمریکییە دەڵێت: "نەگۆڕەکانی سروشت وەک دێتە بەرچاو، زۆر بە گرنگی و بایەخ پێدان و وردەکارییەوە، لە ئاستێکی دیاریکراودا دانراون، بۆ نموونە: ئەگەر هێزی ناوەکی بێهێز لەوەی کە ئێستا لەسەریەتی کەمتر بووایە، ئەوا گازی هایدرۆجین دروست نەدەبوو و ئەم گەردوونەی ئێمە تەنیا بە شێوەی تۆز و خۆڵێکی گەردوون دەمایەوە و ئەگەر تۆزێک بەهێزتریش بووایە لەوەی کە ئێستا هەیە، ئەوا تەنۆلکەکانی (نیوترۆن Neutrinos-) نەیاندەتوانی لە ئەستێرە مەزنەکان (سوپەرنۆڤا -Supernova) دەربازیان بێت و بە گەردووندا بڵاوببنەوە و ئەو کاتەش ئەو توخمانەی کە پێویستن بۆ دروستبوونی ژیان لەسەر زەوی، دروست نەدەبوو. سەرەنجام:

ئەو توخمانەی کە ژیان پەکی لە سەریان کەوتووە، بە تایبەتی کاربۆن، دروست نەدەبوو.

٥- ئەندازەگیری نێوان هێزەکانی گەردوون:

گەردووناس و فیزیازانەکان دەڵێن: چوارجۆر هێزی سەرەکی هەیە لە

گەردووندا:

١- هێزی کێشکردن (القوة الجاذبية)

٢- هێزی کەهرۆموگناتیسی (القوة الكهرومغناطيسية)

٣- هێزی ناوەکی بێهێز (القوة النووية الضعيفة)

٤- هێزی ناوەکی بەهێز (القوة النووية القوية)

ئێمە لێرەدا لەبەر درێژبوونەوە ناتوانین باسی ئەو هێزانە بکەین، ئەگەر نا ئەو هێزانە ئەوەندە ئەندازەگیرییان تێدا کراوە و ئەوەندە بەوردی و هاوسەنگی ڕێکخراون، ئەگەر هاتبا تۆزقاڵێک لەو هێزانە لە ئەندازەی خۆیان زیاد بکەن یان کەم بکەن ئەوا گەردوون هەر هەمووی بەسەر یەکدا دەڕووخێت و ژیان کۆتایی پێدێت.

دەپرسین: کێ ئەندازەی ئەو هێزانەی بەو وردییە و ئەندازەییە گرت؟![1]

٦- ئەندازەگیری لە ناو خۆردا، خۆر بە شێوەیەکی زۆر زۆر ورد ئەندازەی گیراوە، بە شێوەیەک ئەگەر ئەندازەی ئەو پێکهاتە و ماددە و وزە و چڕی و ...، تێک بچێت، خۆر ناتوانێت ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات، ئەگەر نەشتوانێت ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات، ڕاستەوخۆ ژیان لەسەر زەوی بە مرۆڤ و ژیاندار و ڕووەکەوە کۆتایی دێت.

بۆ نموونە، ئەندازەی دووری خۆر لە زەوییەوە سەد و پەنجا ملیۆن (١٥٠،٠٠٠،٠٠٠) کیلۆمەتر لە ئێمەوە دوورە، ئینجا ئەگەر دووتر بووایە، ئەوکات تیشک و وزە و گەرمی پێویست و نەدەگەیشت بە زەوی و هەروەها زەوی زۆر زۆر سارد دەبوو، دەبوو بە بەستەڵەک، دوایی ژیان لەسەر زەوی نەدەما، ئەگەر نزیکتریش بووایە، ئەوا گەرمی و وزە و تیشکی زیاد لە پێویست بەر زەوی

---

(١) بۆ ئەم نموونانە و دەیانی دیکە بگەڕێوە بۆ کتێبی: (عيادة الملحدين) د. هيثم طلعت.

دەکەوت و سەرەنجام زۆربەی پێکهاتەکانی زەوی و دەسوتان و دەبوون بە خۆڵە مێش و ژیان لەسەر زەوی کۆتایی پێ دەهات[1]!

باشە دەپرسین، کێ ئەندازەی پێکهاتەکانی ناوەوەی خۆری دانا بەو ئەندازەیەی کە ئێستا هەیە؟! کێ ئەندازەی دووری و نزیکی خۆری دانا لە زەوییەوە؟!

ئایا مادده و گەردوون و خۆر خۆیان دەیانزانی کە زەوی پێویستی بەو شێوە لە ئەندازەگیرییە هەیە؟!

٧- زەوی پێنج جۆر خولانەوەی هەیە، هەر یەکەیان بە ئەندازەیەک:

١- خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا، بۆ دروستبوونی شەو و ڕۆژ (٢٨) کم، لە خولەکێکدا.

٢- خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا، بۆ دروست بوونی وەرزەکان، (٣٠) کم لە چرکەیەکدا.

٣- خولانەوەی زەوی لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا بە دەوری خرۆکەی دانیشتوودا، بەخێرایی (٢٠) کم لە چرکەیەکدا.

٤- خولانەوەی زەوی لەگەڵ کۆمەڵەی خۆر و خرۆکەی دانیشتوو بە دەوروی چەقی کاکێشاندا، بە خێرایی (٢٦) کم لە چرکەیەکدا.

٥- خولانەوەی زەوی لەگەڵ کاکێشاندا، بە خێرایی (٩٨٠) کم لە چرکەیەکدا[2].

باشە ئەندازەی ئەو سووڕانەوانە کە بە ئەندازەیەکە، نابێت نە کەمتر بێت نە زیاتر بێت، کێ داینا و ئەندازەی گرت؟!

---

(١) السماء، د. زغلول النجار، ل ٤٤١.

(٢) الارض، د. زغلول نجار، ل ٢٧٤ _ ٢٧٥.

٨- دووری نێوان زەوی و مانگ سێ سەد و هەشتا هەزار (٣٨٠،٠٠٠) کم، ئەگەر نزیکتر بووایە ئەوا پەستانی زەریا و دەریاکان ئەوەندە بەرزدەبوویەوە کە هەموو زەوی دەکەوتە ژێر ئاوەوە، ئەگەر دوورتریش بووایە پەستان کەم دەبوویەوەو ئەوکات هەڵکشان و داکشانی زەریا و دەریاکان نەدەما و لە ئەنجامدا باران بارین نەدەما!

٩- ئەندازەی پێکهاتەکانی بەرگە هەوای زەوی، (٧٨٪) نایترۆجین، (٢١٪) ئۆکسجین، (١٪) ئۆرگۆن و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاوە.

ئەگەر بەرگە هەوا ئەندازەی پێکهاتەکانی بەو شێوەیە نەبووایە، بە هیچ شێوەیەک ژیان لەسەر زەوی نەدەبوو و نەدەگونجا.

باشە کێ ئەو ئەندازە وردەی دانا و ئەندازەی گرت؟!

١٠- لاشەی مرۆڤ، ئەگەر باسی ئەندازەگیری لاشەی مرۆڤ بکەین دەبێت سەدان و هەزاران پەرتووکی لە بارەوە بنووسین، چونکە لاشەی مرۆڤ هەر هەمووی بە ئەندازەگیرییەکی زۆر زۆر زۆر ورد ئەندازەی گیراوە، بە شێوەیەک ئەگەر تۆزقاڵێک لەو ئەندازەیە تێکبچێت، مرۆڤ ژیانی لە دەست دەدات یان دەکەوێتە مەترسییەوە. ئەندازەی خوێ، شەکر، پرۆتین، چەوری، خوێن، پلازما... هەر هەمووی بە ئەندازەیەکە کە مرۆڤ پێویستییەتی.

بۆ نموونە خوێن (٥٥٪) پلازمایە، (٤٥٪) خڕۆکەی سوور و خڕۆکەی سپی و خەپلەکانە.

باشە کێ ئەو ئەندازەیەی پێدان؟ خۆ ئەگەر تۆزقاڵێک ئەو ئەندازەیە تێک بچێت ژیانی مرۆڤ دەکەوێتە مەترسییەوە، یان بەتەواوی کۆتایی پێدێت.

یان بۆ نموونە پلەی گەرمی لاشەی مرۆڤ (٣٥،٥)ە کە ئەندازەیەکە، نابێت کەمتر و زیاتر بێت.

یان بۆ نموونە ئەندازەی ڕۆیشتنی خوێن بۆ بەشەکانی لاشە:

١- (٢٥٪) بۆ ڕیخۆڵەکان دەڕوات.

٢- (٢٠٪) بۆ گورچیلەکان دەڕوات.

٣- (١٨٪) بۆ ماسولکەکان دەڕوات.

٤- (١٣٪) بۆ مێشک دەڕوات.

٥- (٧٪) بۆ پێست دەڕوات.

٦- (٥٪) بۆ دڵ دەڕوات.

٧- (١٢٪) بۆ بەشەکانی تری لاشە دەڕوات.

باشە کێ ئەو ئەندازەیەی دیاریکرد و ئەندازەی گرت؟

١١- ئەندازەی لاشەی ژیانداران کە ملیاران جۆری جیاوازیان هەیە، هەر هەمووشیان ئەندازەی پێکهاتەی لاشەیان بە شێوەیەکە کە ناکرێت نە زیاتر بێت نە کەمتر.

باشە کێ ئەندازەی پێکاهاتەی ملیاران ژیانداری گرت؟!

١٢- ئەندازەی پێکهاتەی ملیاران جۆری ڕووەکی جیاواز جیاواز، کە هەر یەکەیان بە ئەندازەی پێویستی خۆی ئەندازەی پێکهاتەکانی گیراوە؟

باشە کێ ئەندازەی پێکهاتەی ملیاران جۆر ڕووەکی جیاواز جیاوازی گرت؟!

١٣- ئەندازەی پێکهاتەی بەشە جیاوازەکانی خودی زەوی لە ئاو و خۆڵ و ئاسن و... کە ناکرێت نە زیاتر بن نە کەمتر بن!

١٤- ئەندازەی قەبارەی زیندەوەران، یان ئەندازەی قەبارە و ڕەنگ و تام و بۆن و...ی ڕووەکەکان، کە هەر هەموویان بە قەبارە و ڕەنگ و بە تام و بۆنی خۆیان دەردەکەون، بەبێ لادان لەو ئەندازەیەی بۆیان دیاریکراوە، یان قەبارەی لاشەی زیندەوەران.

١٥- ئەگەر ئەندازەی خۆڵ بەو شێوەیە نەبووایە، ڕووەک نەدەبوو، بۆ نموونە ڕەقتر یان نەرمتر بووایە.

١٦- ئەندازەی هەوا، کە نە زۆر خەستە نە زۆر سووکە.

١٧- ئەندازەی باران بارین، کە ئەگەر کەمتر بووایە یان زیاتر، ئەوا ژیان نەدەما لەسەر زەوی.

ئەمانەش بەشێکن لە نەگۆڕە فیزیاییەکانی گەردوون کە بەبێ ئەندازەگیر هەرگیز پەیدانابن*(١).

- Universal physic - constants :

١- نەگۆڕی کیش G : 6.67384×$10^{-11}$ $m^3 \cdot kg^{-1} \cdot s^{-2}$

٢- نەگۆڕی پلانک h : 6.626 069 57 × $10^{-34}$ J·s

٣- نەگۆڕی گازی R : 8.314 4621 $J \cdot K^{-1} \cdot mol^{-1}$

٤- نەگۆڕی فارادای F :96 485.3365 $C \cdot mol^{-1}$

٥- بارستایی ئەلەکترۆن me : 9.1096 x $10^{-31}$ kg

٦- بارستایی پرۆتۆن mp: 1.672 621 777 x $10^{-27}$ kg

٧- بارستایی نیوترۆن mn: 1.6726 x $10^{-27}$ kg

٨- خێرایی ڕووناکی: 299792.458 m/s

٩- نەگۆڕی لۆسکمیدت : 2.686 7805 × $10^{25}$ $m^{-3}$

١٠- بارگەی ئەلەکترۆن $e^-$ : 1.60217646 X $10^{-19}$ C

١١- نەگۆڕی ئاڤۆگاردۆ N: 6.02214179 X 10^23 $Mol^{-1}$

---

(١) سەرچاوە : https://physics.info/constants/

١٢- نەگۆڕی بۆلتزمان K : 1.380 $6488 \times 10^{-23}$ $J \cdot K^{-1}$

١٣- نەگۆڕی پای π : 3.14159265358979328346 2

١٤- بارگەی پڕۆتۆن P : 1.6022 X C

١٥- نەگۆڕی کۆڵۆم kc : 8,990,000,000 $N.m^2 / C^2$

١٦- نەگۆڕی لۆگاریتم $e^{-1}$: 2.718281828

١٧- نەگۆڕی نەگەیاندن : 8.854 187 13 18 $817 \times 10^{-12}$ $F \cdot m^{-1}$

١٩- نەگۆڕی موگناتیسی: $4\pi \times 10^{-7}\ N \cdot A^{-2} = 1.256637061 \times 10^{-6}\ N \cdot A^{-2}$

٢٠ - نەگۆڕی ڕێژەی زێڕین phi : 1.61803398875

ئەندازەگیری ئەوەندە زۆرە کەس ناتوانێت هەمووی باس بکات، ئێمەش هەر وەک باسکردنێکی خێرا هەندێک شتمان باسکرد، وەک نموونە هێنانەوە، ئەگەرنا ئەو بابەتانە ئەگەر سەدان و هەزاران پەرتووکی لەسەر بنووسرێت، هێشتا تەواو نابن.

ئەوە دڵۆپێک بوو لە دەریای ئەندازەگیری[1].

**ئەنتۆنی فلۆ**

زانای بەریتانی ئەنتۆنی فلۆو(Antony Flu)[2] دوای ٨٠ ساڵ لە تەمەن

---

(١) بۆ زانیاری بڕوانە: عیادة الملحدین، د. هیثم طلعت. الأرض، السماء، د. زغلول النجار، مبادئ علم الفلك الحدیث، د. عبد العزیز بكری أحمد. الموسوعة العلمیة الشاملة. معجزة خلق الانسان، هارون یحیی. بیولجیا الانسان، د. حمید أحمد الحاج. الانسان من الابداع الی البعث، د. زغلول النجار.

(٢) ئەنتۆنی فلو (١٩٢٣- ٢٠١٠) یەکێک بوو لە هەرە لایەنگرە سەرسەختەکانی ناباوەڕی تاساڵی ٢٠٠٤ دواتریش باوەڕی هێنا بە خودای ئەرستۆ، کتێبێکی نووسی بە ناوی لێرە خودایەک هەیە.

https://www.youtube.com/watch?v=Sp0s8-8-Ovg

و نزیکەی پەنجا ساڵ لە ناباوەڕی و لە ساڵی (٢٠٠٤)دا دەستی لە ناباوەڕی هەڵگرت، لە کۆتا ساڵەکانی ژیانی باوەڕی بە بوونی خودا هێنا، سێ ساڵ بەر لە مردنەکەی لەساڵی (٢٠٠٧) لە کتێبەکەیدا بە ناوی (There is a GOD) «خودایەک هەیە» بە جیهانی وت کە: ئیتر من چیتر لەبەرەی ناباوەڕی نامێنم و بڕیاری باوەڕبوون بە خودا دەدەم.

دوای ئاشکرا کردنی باوەڕەکەشی هەڵلایەکی جیهانی گەورە لەسەری نرایەوە، زۆرێک لەزانا هاوپیشەکانی سەرسام بوون و لە حاڵی تێنەدەگەیشتن، هەندێکیشیان دەستیان کرد بە تۆمەت بەخشینەوە، تەنانەت ڕیچارد داوکینز (Richard Dawkins)[١] دادەبەزێتە سەری و دەڵێت: "ئەوە دارمانی فکرییەتی و ئەو بەرگە نەگرتنەیە کە پێشتر هەوڵی بۆ ئەدا خۆی لێبپارێزێت"[٢]، هەروەها دەڵێت: "ڕەنگە کاریگەری کتێبەکانی (Michael Behe)ی[٣] لەسەر بێت"، کە ڕەنگە مەبەستی داوکینز ئەوەی بێت خۆشباوەڕ بووە و نەیتوانیوە ڕاوبۆچوونی خۆی بپارێزێت.

ئینجا ئەنتۆنی فلۆوی تازە خوداباوەڕ لە ڤیدۆیەکدا بە زمانی خۆی دان بەوەدا دەنێت کە تۆپەکە لە گۆڕەپانی باوەڕداراندایە، چونکە لە هەموو بار و زروفێکدا دەبێت ئەو کەسە داوای بەڵگەی لێبکرێت کە بانگەشەی هەبوونی شتێک دەکات نەک ئەو کەسەی کە بانگەشەی نەبوونی دەکات، بەڵام لە باسی بوون و نەبوونی خودادا پێچەوانە بۆتەوە، ئەوە ئاتیستەکانن و ئەوانەن کە باوەڕیان بەبوونی خودا نییە دەبێت بەڵگە بهێننەوە، کەواتا یاسای بەڵگەسازی لای ئەنتۆنی فلۆ و لە باسی هەبوونی خودادا ڕێڕەوێکی پێچەوانەی وەرگرتووە.

---

(١) زانای بایەلۆژی بەریتانی بێباوەڕی ناودار خاوەنی کتێبی (GOD Delusion)، لەم ڕۆژانەدا زیاتر وەک زمانحاڵی خوداناباوەڕان و دژی سەرجەم ئایینەکان لێدوان دەدات.

(2) https://www.youtube.com/watch?v=IU8NmXTMIH8

(٣) Michael Behe، زانایەکی ئەمەریکی کیمیای زیندووە ئیستاش لە ژیان دا ماوە و خاوەنی کتێبی (God، Intelligent Design & Fine-Tuning) (تصميم الذكي)یە.

لە ڕاستیدا لەو کاتەوەی مرۆڤ بووە هەر ئەو بیروباوەڕە ئیمانییەی لەگەڵ بووە هەموو کات خۆی لە ژێر ئەو هەستانەدا پیشان داوە کە خودا لە پەنایدا ئەدرەوشێتەوە، بۆیە وا دەردەکەوێت خوداباوەڕی بنچینە بێت نەک خوداناباوەڕی، چونکە هەموو کاتێک کردارە سروشتییەکان لە خودی مرۆڤ گەورەتر بوون، یان بە لایەنی کەمەوە گەورەتر دیار بوون، مرۆڤ دەستی نەشکاوە بەسەریان، بەمەش مێژوویەکی باوەڕی و دژایەتیکردنی باوەڕی دوورودرێژ بەسەر تەمەنی مرۆڤایەتیدا دەشەکێتەوە.

لە کۆتاییدا ئەنتۆنی فلۆ خۆی دان بەوەدا دەنێت لەبەر پێنج بابەتی سەرەکی قایلە بەوەی خودایەک و هێزێکی سێهەم لە دەرەوەی گەردوون بوونی هەبێت:

١- بوونەوەر سەرەتایەکی هەیە و لە نەبوونیشەوە هاتووەتە بوون، هەر شتێکیش سەرەتایەکی هەبێت و نەبوو بووبێت، ئەوا دروستکراوە، هەموو دروستکراوێکیش پێویستی بە دروستکەرە.

٢- بوونەوەر لەسەر کۆمەڵێک یاسای نەگۆڕ بەڕێوە دەڕوات.

٣- ژیان بە هەموو وردەکاری ئامانجدارییەوە لە ماددەی نازیندوو دروست نابێت.

٤- گەردوون بە هەموو ئەو یاسا و بوونەوەرانەی تێیدایە زەمینەسازییان کردووە بۆ پێشوازیکردن لە مرۆڤ.

٥- ئەقڵ تایبەتمەندی مرۆڤە، توانای بەرزی عەقڵی مرۆڤ، ناکرێت بەرهەمی ڕاستەوخۆی کرداری کارۆکیمایی بێت.

دوای ئەوە ئەنتۆنی فلۆ دەڵێت: "گەیشتمە ئەو قەناعاتەی کە هیچ ڕێگرێک نییە بۆ تەفسیرکردنی ئەو هەموو توانا ئەقڵییانە، ئەوە نەبێت پەنا بۆ دنیای پشت ئەو بوونە ماددییە ببەین، بۆیە دەبێت بە شوێن بەڵگەیەدا بڕۆین بۆ هەر کوێی بردین، ئەوە منیش بەڵگە ئەقڵییەکان بەرەو لای خودایان بردم.

ئەو خودایە ماددە نییە، گۆڕانی بەسەردا نایەت، دەسەڵاتی ڕەهای هەیە، زانستی ڕەهای هەیە، ژیانی ڕەهای هەیە، زاتی پڕ لە خێرە، بەڵام بڕوام بەوە نییە کە بەرجەستە ببێت لە کەسێکدا بۆ نموونە مەسیح."[١]

«ولیەم جەیمس»یش ڕاشکاوانە[٢] دەڵێت: خودا یەکەمە و گەردوون دووەمە مرۆڤ سێیەم، واتا: خودا بابەتە و زیاتر گرنگە تا مرۆڤ، سەرەڕای ئەوەشی کە مرۆڤ دەیەوێت لە هەموو وردەکارییەکانی خۆی و چواردەوری و هەموو ئەو شتانەش بزانێت کە هەست دەکات کاریگەرییان هەیە لەسەری. بۆیە جەیمس دەشڵێت: هەموو مرۆڤێک لە ناخی خۆیدا هەست بە شتێکی گەورە دەکات کە لە هەموو شتەکانی دیکە بەهێزترە.

## ٤- بەڵگەی ڕێنموونی

**بەڵگەی ڕێنموونی دەڵێت: «هەموو ڕێنموونیکراوێک، ڕێنموونیکەرێکی هەیە.»**

بڕوانە ئەم گەردوونە لە گەردیلەیەکەوە تا دەگاتە کەهکەشانەکان کە هەموویان ڕێنموونیکراون بەو شێوەی کە لەگەڵیان دەگونجێت، بۆنموونە دار سێوێک ڕێنموونی کراوە کە تام و بۆن و ڕەنگی سێو هەڵمژێت لەناو گڵدا جا چەندان جۆری سێومان هەیە بچووک، گەورە، ترش، شیرین، زەرد، سوور، سەوز، دەبینین هەر یەکەیان بەو شێوەیە سێوەکە دەدات کە هەیە، باشە کێ ڕێنموونی کرد؟!

یان بڕوانە زەوی و خۆر، کێ ڕێنموونی کردوون بەم شێوەیە و بەم ئەندازەیە

---

(١) رحلة عقل، أ. عمر شريف، (٧٥) کە ڕاستەخۆ لە کتێبی (there is a god).

(2) (January11،1842- August26،1910) William James، Essays in Radical Empiricism (ERE)، published from 1905-1904

بخولێنەوە؟!

کێ ڕێمووونی ئەو هەموو ژیاندارانەی کرد، لە باڵندە و خشۆک و دڕندە و گۆشتخۆر و ڕووەک و خۆر و ...هتد؟! کەواتە ناکرێت ئەوانە ڕێنموونیکاریان نەبێت وەک بێباوەڕی دەڵێت!

ئەگەر بمانەوێت نموونە بهێنینەوە لەسەر بەڵگەی ڕێنموونی، دەبێت هەموو گەردوون بکەینە بەڵگە لە بچووکترین بەشیەوە تاوەکوو گەورەترین بەشی، بەڵام ئێمە لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوە چەند نموونەیەک دێنینەوە، وەک دڵۆپێک لە دەریایەک:

١- خانە، خانە وەک باسمان کرد لە پێشەوە، خانە جیهانێکی زۆر زۆر ئاڵۆزە، بە شێوەیەک زانست تاوەکوو ئێستا بە تەواوی پەی پێ نەبردووە و نەیتوانیوە یەک خانە دروست بکات.

خانە توانای بەرهەمهێنانی نوسخەیەکی تازەی هەیە، هەروەها توانای خۆکوشتنی هەیە، هەروەها توانای پەیوەندی کردنی هەیە لەگەڵ خانەکانی تری لاشەدا، بۆیە خانە هەر بۆخۆی هەڵدەستێت بە دروستکردنی خۆی، پاشان چەند خانەیەک یەکدەگرن و پەیوەندی بەیەکەوە دەکەن بۆ دروستکردنی شانە، پاشان شانەش پەیوەندی دەکات بە شانەی ترەوە بۆ دروستکردنی ئەندام، پاشانیش بە چەند ئەندامێک کۆئەندام پێک دێنن، پاشان بە هەموویان جەستەی تەواوی مرۆڤ پێک دێنن.

باشە دەپرسین کێ ڕێنموونی ئەو خانانەی کرد و فێری کرد؟!

ئایا بۆ خۆیان ئەو شتانە دەزانن؟!

هەموو خانەیەک لە جەستەماندا بە دابەشبوون زیاد دەکات و پێویستە ئەو ترشی (DNA)ی کە هەیەتی لە ناوکی خانەکاندا لە کاتی دابەشبووندا کۆپی

بکرێت و لەبەری بگرێتەوە، ئەو پرۆسەی دابەشبوونە بە ئەنجام دەگەیەنرێت بە پێی یاسایەکی ورد و سیستەمێکی زۆر ورد کە هیچ هەڵە و کەم و کوڕییەک قەبووڵ ناکات، کارەکە بە شێوەیەکی لولپێچییە کە لە سی ملیار پیت پێکهاتووە و بە ناوەندی کۆکردنەوە و هەڵگرتنی زانیاری دادەنرێت و ئەنزیمی هێلێکە پێک بۆ ناوەندی دابەش بوون لەسەرەتای پرۆسەی دابەشبوونەکەدا و کۆتایی پرۆسەکە بە دابەشبوونی گەردی (DNA) بۆ دوو شریت دێت، پرۆسەی دابەشکردنەکەش بە ئەنجام دەگات لە ماوەی تێکشکاندنی بەندە هایدرۆجینەکانی نێوان جووتەکانی دوو شریتەکە، لە کۆتاییدا (DNA)ەکە دابەش دەبێت بۆ دوو شریتی وەک یەک.

(DNA) هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی کارەکەی لە کاتێککی گونجاودا، بەبێ ئەوەی دواکەوتن و تەمبەڵی، یان سستی، یان پشتگوێ خستن و بەبێ بچووکترین هەڵە، کە شایەنی باس بێت، بە بێ ڕوودانی هیچ هەڵەیەک، ئەگەرچی سادەش بێت، بەڵام ئێستا ڕۆڵی (DNA - Polymerase) دێتە پێشەوە کە فرمانەکەی تەواو کاراییە و هەڵدەستێت بە لکاندنی دوو بەشە دابەشبووەکە بە دوو بەشی نوێی پەیدابوو، لە کۆتایشدا بەرهەمهێنانی گەردێکی (DNA) نوێ کە بەتەواوی لە (DNA)ە کۆنەکە دەچێت، ئەمە بەبێ هیچ کەمکردنێک لە (DNA)یە کۆنەکەدا، بەڕاستیش ئەمە بە واتای وشە کۆپی کردنەیە.

دەپرسین، ئایا کێ ڕێنموونی خانەی کرد و فێری کرد بۆئەوەی ئەو پرۆسە وردە ئەنجام بدات بەبێ هیچ هەڵەیەک لە کات و شوێنی گونجاودا؟!

·جەستەی مرۆڤ بە نزیکەی لە سەد ترلیۆن (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) خانە پێک دێت، هەر خانەیەک لە مرۆڤدا ١٠٥ گێگابایت داتا و زانیاری تێدایە، ١٠٥ * ١٠٠ ترلیۆن = ١٠,٥٠٠ ترلیۆن گێگابایت زانیاری هەیە لە جەستەی مرۆڤدا، هەمووشمان دەزانین قەبارەی یەک پەیکەی (CD) لە زانیاریدا = ٧٠٠ مێگابایت،

کەواتە زانیاری جیناتی جەستەی مرۆڤ لە ناو خانەکاندا جێگای دەبێتەوە لە (٢١٤،٢٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) دوو سەد و چواردە ترلیۆن و دوو سەد بیلیۆن پەیکەی (CD). جا بێگومان ئەو زانیاریانە لە کاتی دابەشبوونی خانەدا دەگوازرێنەوە بۆ خانە نوێیەکان.

بۆیە دەبینین هەندێک لە زانایان بەو شێوەیە وەسفی ئەو گواستنەوەیە دەکەن: ترشی (DNA) کە بانکێکی زانیاری مەزنە و هەموو زانیارییەکانی پەیوەست بە بوونەوەرە زیندووەکە لە خۆ دەگرێت، ئەگەر بمانەوێت ئەو زانیارییانە بگۆڕین بۆ پیت و ڕیز، دەبینین کە لە سێ ملیار پیت پێک دێت و ئەوەش بەسە بۆ پڕکردنەوەی ڕووبەری یەک ملیۆن پەڕە لە پەڕەکانی فەرهەنگێک، ئەوەش بەسە بۆ پێکهێنانی فەرهەنگێکی (١٠٠٠) هەزار بەرگی، لەوەشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە لەبەرگرتنەوەی یەک گەردی (DNA) یەکسانە بە لەبەرگرتنەوە و کۆپیکردنی یەک ملیۆن پەڕە، یان فەرهەنگێکی هەزار بەرگی، ئەو پڕۆسەی لەبەرگرتنەوە بە تەنیا (٢٠) بۆ (٨٠) خولەک دەخایەنێت. باشە کێ ڕێنموونی خانەی کرد و فێری کرد کە لە ماوەی (٢٠) بۆ (٨٠) خولەکدا یەک ملیۆن پەڕە، یان فەرهەنگێکی هەزار بەرگی کۆپی بکات بەبێ هیچ هەڵەیەک؟!

٢- کێ ڕێنموونی خوێنی کرد بچێت بۆ هەموو بەشەکانی جەستەی مرۆڤ و خۆراک و ئۆکسجینیان بۆ بەرێت پاشان پاشەڕۆکانیش لەگەڵ خۆی بهێنێتەوە؟!

کێ خڕۆکە سپییەکانی ڕێنموونی کرد بەرگری لە جەستە بکەن؟!

کێ ڕێنموونی (خەپلەکان)ی کرد، کاتێکک شوێنێک بریندار دەبێت بچێت بۆ ئەو شوێنە و خوێنەکە بمەیێنێت؟!

کێ گەدەی ڕینموونی کرد خواردن هەرس بکات و ترش بڕژێنێت بەسەر خواردندا بۆ شیکردنەوەی؟!

کێ ڕێنموونی چاو، گوێ، زمان، گورچیلە، جەرگ، سپڵ و ... هەد، کرد و فێری کردن؟!

٣- کێ ڕێنموونی دار و درەخت و ڕووەکی کرد؟!

- کێ ڕێنموونی دار سێوی کرد کە سێو بدات؟ لە کاتێککدا ئەو سێوە لە باغێکدایە کە جۆرەها میوەی تری تێدایە، هەموویان بەرهەمی یەک گڵ و یەک ئاو و یەک هەوا و یەک ژینگەن، چەندان دار لە تەنیشت یەک ڕوواون بەڵام هەر یەکەیان بەرووبوومی خۆی دەدات، کێ ڕێنموونی ئەو دار سێوەی کرد کە سێو بدات، یان سێوی بچووک یان هی گەورە، یان سەوز، یان زەرد و سوور یان شیرین یان تفت بدات؟ چەندان جۆر دار سێومان هەیە هەر یەکەیان سێوی خۆی دەدات.

- کێ رینموونی دار خورما و قەسپی کرد کە بەجۆرێک بن، هەندێک لە سەرچاوەکان دەڵێن نزیکەی (١٠٠٠) هەزار جۆر خورمامان هەیە، کێ ڕینموونی ئەو دارەی کرد کە هەریەکەیان بە شێوە و تامێکن؟!

- کێ ڕێنموونی هەناری شیرینی کرد تامی شیرین هەڵبمژێت، هەناری ترش تامی ترش هەڵبمژێت، هەناری مێخۆش تامی شیرین و ترش هەڵبمژێت و تێکەڵیان بکات؟!

- کێ ڕێنموونی شووتی کرد کە دەرەوەی ڕەق بێت و ناوەوەی هەموو ئاو بێت؟!

- کێ ڕێنموونی پرتەقاڵی کرد توێکڵەکەی ڕەقتر بێت لە توێکلێ لالەنگی؟!

- کێ ڕێنموونی گەنم و جۆر و فاسۆلیا و نۆک و نیسک و کەرەوز و سلق و ... هتد کرد؟!

ئایا دەکرێت بڵێین ئەوانە هەموویان لە خۆیانەوە فێربوون؟!

ئایا مادده بۆ خۆی عەقڵێکی وای هەیە کە بتوانێت ئەو هەموو دار و درەخت و ڕووەکانە ڕینموونی بکات و فێریان بکات و نەهێڵێت هیچیان تووشی هەڵەبن و هەر یەکەیان بە ڕەنگ و تام و بۆن و قەبارەی جیاوازەوە بێنە بوون؟!

٤- کێ ڕێنموونی ژیانداران دەکات؟!

بۆ نموونە:

کێ ڕێنموونی (مارماسی) دەکات؟!

ئەو جۆرە مارانە کاتێک لە ناو گۆم و ڕووبارە جۆراوجۆرەکاندا پێ دەگەن و دەست بە کۆچ کردن دەکەن، لەو کۆچەیاندا هەزارەها میل ڕێگا دەبڕن تا دەگەنە ئۆقیانووس و قووڵایی زۆر قووڵی باشووری (بەرمودا) لەوێ گەرا دادەنێن و دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان.

بەڵام بێچووەکانیان کە هیچ کەرەسەیەکیان نییە ڕێی پێ دەربکەن، هیچ نەخشەیەکیان پێ نییە، هیچ ئامێرێکی شوێن دۆزینەوەیان پێ نییە، دایکیشیان لەلایان نەماوە تا لەگەڵ خۆیان بیانباتەوە و چاوساغیان بکات، چاویان کردووەتەوە و خۆیان لە ناو دەریایەکی بێبنی بێپایاندا دیوەتەوە، کەچی ئەو تووله مارانە ڕێگای کەناری دەریا دەگرنە بەر و دەگەڕێنەوە بۆ نیشتیمانی خۆیان، بۆ ئەو شوێنەی دایکیانی لێوە هاتووە، بۆ گۆم و ڕووبارەکان.ئەو مارماسیانە بەرەنگاری تەوژمە بەهێزەکان دەکەن، لەبەرانبەر باران و بای بەهێزدا خۆڕاگیر دەکەن، بەسەر شەپۆلی گەورەی دەریاکاندا زاڵ دەبن، بە ڕێگایەکدا دەڕۆن کە لەوەوپێش نەیان دیوە و شارەزای نین، لەگەڵ ئەوەدا دەگەنە شوێنی خۆیان، ئەو ئاوەی دایکیانی لێوە هاتووە، بێ ئەوەی جارێک ڕووبدات ماسییەکی ئەفریقایی لە ئاوێکی ئاسیاییدا، یان مارماسییەکی ئەوروپایی لە ئاوێکی ئەمریکاییدا، یان بە پێچەوانەوە ڕاو بکرێت. دەپرسین کێ ئەو مارماسی و ماسیانەی ڕێنموونی کردن و فێری کردن؟ لە کاتێککدا دایکەکانیشیان لەگەڵ نەماوە و هیچ ئارازێکی

تریش نییە کە ڕێنموونیان بکات.

کێ ڕێنموونی ڕێوی کرد و فێری کرد؟!

کاتێکک برسیی بوو خۆی ڕابکێشێت و لەسەر پشت درێژ ببێت بۆئەوەی وا پیشان بدات کە مردووە و هەناسە لە خۆی ببڕێت و لەناوەوە گلی بداتەوە، تاوەکوو باڵندە و ژیانداران بێنە سەری و وابزانن مردووە و بێنە سەر کەلاکەکەی و بیخۆن، بەڵام ئەو لە ناکاو پەلاماریان دەدات و دەیانگرێت؟

کێ مێیەی فیلی فێرکرد لە کاتی زانیدا بچێتە ناو ئاوەوە؟!

چونکە فیل ناتوانێت بە ڕاکیشان و چیچکانەوە بزێت، دەبێ بە پێوە بێت، ئەگەر لە وشکانیدا بە پێوە بزێت لەوانەیە بێچووەکەی بکەوێت بە زەویدا و بمرێت، لەبەر ئەوە دەچێتە ناو ئاوەوە، تا لە کاتی زانیدا ئازار و زیان بەر بێچووەکەی نەکەوێت، هەروەها چڵک و پیسی ناو ڕەحمیشی پێوە نامێنێت و خاوێن دەبێتەوە. کەواتە کێ ڕینموونی فیلی کرد و فێری کرد؟!

کێ مێینەی دڕندەی ڕێنموونی کرد و فێری کرد؟!

کاتێک بەچکەکەی بوو بەرزی بکاتەوە و چەند ڕۆژێک بیدات بە هەوادا و بەولاولادا بیفڕێنێت تاوەکوو مێرووله و مێش و مەگەز تێی نەئاڵێن و لێی کۆنەبنەوە، چونکە لەو کاتەدا بێچووەکە وەک پارچە گۆشتێکی سوور وایە، دەترسێت مێرووله و مێش و مەگەز تێی بئاڵێن و لێی کۆببنەوە، بەردەوام هەڵی دەگرێت و دایدەنێت، لەولاوە دەیبات بۆ ئەولا، تا خۆی دەگرێت و هێز پەیدا دەکات.کێ ئەو دڕندەیەی فێر کرد؟ لە کاتێککدا ئەو دڕەندەیە بێچووی هەموو ژیانداران دەخوات، بەڵام ئەوەندە بەخەمە بۆ بێچووەکەی خۆی، کێ ئەو ڕێنموویيەی کرد و فێری کرد؟

کێ شێری ڕێنموونی کرد و فێری کرد کە بە ڕێدا ڕۆیشت و هەستی کرد

کەوتوونەتە شوێنی و شوێن پێی هەڵدەگرن، کلکی دێنێ بە شوێن پێیەکانیدا، تا شوێنەواری نەمێنێت و دیار نەبێت، کێ ڕێنموونی کرد؟

کێ ڕێنونی مێروولەی سپی کرد؟!

ملیۆن و نیوێک (١،٥٠٠،٠٠٠) مێروولەی سپی کۆ دەبنەوە، هەرچەندە نابینا و کوێریشن، پێکەوە هاوکاری دەکەن و خانووێکی چوار مەتری بەرز دروست دەکەن، مێروولەی سپیی لە وڵاتی ئێمە نیە، لە وڵاتی ئێمە تەنیا دوو جۆر مێروولەمان بینیوە: مێروولەی ڕەش و سوور، بەڵام مێروولەی سپی هەیە، لە هەندێک لە وڵاتان، بۆ نموونە: لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هەیە، ئینجا ئەو خانووە چوار مەتر (٤م) بەرزە، کە مێروولەی سپی دروستی دەکەن و ئەم شوێنانەی تێدان:

١- شوێنی تایبەتی شاژنی تێدایە.

٢- شوێنی کشتوکاڵی تێدایە.

٣- شوێنی عەمبارکردن و زەخیرەکردنی تێدایە.

٤- ڕاڕەوی هەوا گۆڕینی تێدایە و ... هتد.

کێ ڕێنموونی هەنگی کرد ؟!

هەنگ: لە شێوەی شەش پاڵوو (مسدس)دا، خانەکانی شانەکەی خۆی دروست دەکات، چونکە گونجاوترین شێوەی ئەندازەییە وکەمترین شوێن خەسار نابێت، بەڵام ئەگەر چوارگۆشەیی، یان لاکێشەیی، یان بازنەیی، یان سێگۆشەیی بووایە، لێی زایە دەبوو، بەڵام شێوەی شەشپاڵوو، هەموویان دەچنە ناو یەک و بۆشایی نابێت لەنێوان گۆشەکاندا.

هەڵبەتە ژیانی هەنگ ئەگەر لێی بکۆڵینەوە، هەر تەواو نابێت! کە چۆن هەنگوین دەکات؟ چۆن شیلەی گوڵان دەمژێت؟ لەناو خۆیاندا چۆن

کاروبارەکانیان دابەش کردووە و چۆن مامەڵە دەکەن؟ ئەگەر زیندەوەرێکی زیانبەخش ڕوویان تێ بکات، چی لێ دەکەن؟! ئنجا ئەوانەیان کە نەخۆش دەبن، یان ئەوانەیان کە پیس دەبن، دەچن بە شوێنێکی پیسەوە دەنیشن، دوایی چۆن سزایان دەدەن و دەریان دەکەن لە خانەکەیان؟ لە ژیانی هەنگدا وردەکاریی زۆر زۆر هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا ناتوانین باسی بکەین.

کێ ڕێنوونی ماسییە پاککەرەوەکان دەکات؟!

هەندێک جۆرە ماسیی دەچنە نێو زاری ماسییە گەروەکان و پاکی دەکەنەوە، نەهەنگ و ماسییە گەورەکان، کرم و بەکتریا و زیندەوەری زیانبەخش، لەسەر ددان و زاریان پەیدا دەبێت، ئینجا ماسیی گچکە دەچن ئەو زیندەوەرە زیانبەخشانە، دەخۆن، واتە: ئەوەی کە بۆ ماسیی گەورەکان زیانبەخشە، بۆ ئەوان دەبێتە خۆراک و دەچن دەیخۆن و زیانیشیان لێ نادەن، ماسییە گەورەکان ماسییە گچکەکان ناخۆن، واتە: ڕێککەوتنێکی پێشوەختەیان لە بەیندا هەیە، بەڵکوو ماسییە گەورەکان دەچنە لای ماسی گچکەکان، ئەو شوێنەی ماسییە گچکەکانی لێن و خۆیان بە جۆرێک پێشان دەدەن و دەگۆڕن، کە جێی مەترسییان نەبن و دەمیشیان بۆ دەکەنەوە، ئەو ماسییە گچکانەش دەچنە نێو زاریان و پاکی دەکەنەوە.

نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو جۆرە باڵندەیەک ڕێککەوتووە، لەگەڵ ژیاندارانی وەک کەرکەدەن و هەندێک ژیانداری دیکەی گەورەدا، زاریان دەکەنەوە و ئەوانیش دەچنە ناو زاریان و زاریان پاک دەکەنەوە، واتە: ئەوەی کە لە دەمیان دایە بۆ ئەوان دەبێتە خۆراک، بۆ ئەو ژیاندارە گەورانەش دەبێتە مایەی پاککردنەوە و ئاسوودەبوونیان.

کێ ڕێنوونی گەرای نێو قۆزاخە کرد؟!

هەندێک گەرا، یەکسەر قۆزاخەکان (شرانق) کە لێیان دێنە دەرێ، بە وردە

بەردی زۆر گچکە، خۆیان دادەپۆشن، چونکە زیندەوەری گچکەن وبە ئاسانیی دەخورێن و زەفەریان پێ دەبردرێت، بۆیە بە وردە بەردی گچکە، خۆیان دادەپۆشن، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر و لە سەرەتای تەمەنیانەوە، چونکە جارێ تەمەنیان بچووکە و ئەزموونی ژیانیان نییە، تاکوو بوترێت: فێری بوون! بەڵکوو خودای مشوورخۆر و بەخشەر، فێری کردوون، چونکە: ناتوانن ڕابکەن و بەرگری لە خۆیان بکەن! بۆیە خودا فێری کردوون، بەو وردە بەردە گچکانە خۆیان دابپۆشن وخۆیان بشارنەوە، تاکوو پارێزراو بن.

کێ ڕێنوونی قرژاڵەکانی دەریا دەکات؟!

قرژاڵەکانی دەریا -کە بێگومان قرژاڵیش جۆری زۆرن و ئەمانە جۆرێکیانن- ئنجا ئەم جۆرەیان پارچە ڕووەکەکان دەبڕێت، یاخود مادددەیەکی شلی چەسپ دەردەدا، تاکوو لق و پۆپی گیا و گۆڵ بەخۆیەوە بلکێنێت، یان پارچە ئیسفەنج، کە لە ناو دەریادا هەیە، دەیبڕێت و دەیکاتە پۆشەر، بۆئەوەی خۆی پەنها بکات لە دوژمنەکانی، ئەمەش وەک تاکتیکی سەربازیی کە سەربازەکان جاری وایە بە درەخت خۆیان دادەپۆشن، بۆئەوەی دوژمن لە دوورەوە کە تەماشا دەکات، نەیانبینێت و بچنە نزیکی دوژمن و زەفەری پێ بەرن، خودای پەروەردگار ئەوەشی فێری قرژاڵی دەریا کردووە، کە مرۆڤ بە ئاسانی پێی ناگات.

کێ ڕێنونی هەزار پێ (أُخطبوط) کرد؟!

(أُخطبوط): بە کوردی (هەزار پێ)ی پێ دەڵێن، ژیاندارێکی دەریاییە، خۆی بڵاودەکاتەوە و پێی زۆرن، ئنجا هەندێک ماسی عادەتیان وایە قۆزاخەکان (أصداف) دەخۆن، بۆیە (أُخطبوط) زۆر قۆزاخان لە خۆی دەئاڵێنێت و لە خۆیان کۆدەکاتەوە، تاکوو ماسییەکان هان بدات بە تەماعی خواردنی قۆزاخەکان، نیزیک ببنەوە، ئنجا کە لێی نزیک بوونەوە، ئەو ماسییانە بۆی دەبنە ژەمێکی خۆش و بەلەززەت و دەیانگرێت و دەیانخودات، تەماشا بکەن! ئوخطبووطیش

چ تاکتیکێک بەکاردێنێت!

کێ ڕێنونی باڵندەی زێڕین کرد؟!

لە «باتاکۆنیا»، کە ناوچەیەکە، جۆرێک باڵندە هەیە پێی دەگوترێت: باڵندەی زێڕین، لە کاتێکدا مەترسیی نیزیک دەبێتەوە لە هێلانەکەی، لەبەرئەوەی دەسەڵاتی نییە بەرگری لە خۆی بکات، خۆی دوور دەخاتەوە و خۆی وەک باڵندەی باڵشکاو پێشان دەدا، کە بە ئاسانیی ڕاو دەکرێت، خۆی بە لایەکی دادەخات و دەڕوا دەڕوا بە لۆژە لۆژ و بە باڵشکاویی، ئەو دڕندەیەش بەدوای دەکەوێت، بە تەماعی ئەوەی بیگرێت و بیخوا، هەتا لە هێلانەکەی دووری دەخاتەوە، ئنجا کە لە هێلانەکەی دووری خستەوە، خۆی دەخاتەوە حاڵەتی ئاسیی و دەفڕێت، بەو شێوەیە هێلانەکەی خۆیی و هێلکەکانی دەرباز دەکات، ئیدی واز لەو نواندن (تمثیل)ە دێنێت، کە تەنیا مەبەستی پێی ئەوە بوو کە بەچکەکانی، یاخود هێلکەکانی و هێلانەکەی، سەلامەت بن.[1]

کەواتە:

• ڕێنموونیکراو ڕێنموونیکاری هەیە.

• ڕینموونیکراو بەبێ ڕێنموونیکار نابێت.

گەردوون لە بچووکترین بەشییەوە تاوەکوو گەورەترین بەشی، ڕێنموونی کراوە و فێرکراوە کە چۆن دەبێت و چۆن نابێت.

• کەواتە مادام گەردوون بە هەموو پێکهاتەکانیەوە ڕێنموونی کراوە و ڕێنموونی کراویش بەبێ ڕێنموونیکار نابێت، کەواتە ئەم گەردوونە ڕێنموونی کراوە و ڕێنموونیکارێکی هەیە کە خودای گەورەیە.

---

(١) بۆ ئەم نموونانە بگەڕێوە بۆ پەرتووکی (عیادة الملحدین) و (الردعلی الملحدین العرب) د. هیثم طلعت.

## ٥- بەڵگەی وەڵامدانەوە

ئەم بەڵگەیە دەڵێت: «وەڵامدراوە، وەڵامدەرەوەی هەیە.» بڕوانە ئەم گەردوونە هەر شتێک پێویستی بەهەر شتێک بێت بۆ مانەوە و وەستان و ڕاوەستانی، خودای گەورە پێیداوە و وەڵامی داواکاریەکەی داوەتەوە، بڕوانە مرۆڤ ئەوەی کە پێویستیەتی لەناو جەستە و لە دەرەوەی جەستەی لە زەویدا و لە دەرەوەی زەوی پێیدراوە و وەڵامیدراوەتەوە. پێویستی بە چاوە بۆ بینین، پێیدراوە؛ پێویستی بە گوێیە بۆ بیستن، پێیدراوە؛ پێویستی بە زمانە بۆ قسەکردن، پێیدراوە؛ پێویستی بە گەدەیە بۆ خواردن هەرسکردن، پێیدراوە؛ پێویستی بە ئاوە، بە هەوایە، بە ئاگرە، بە بەرگە هەوای زەوی، بە خۆر، بە مانگ، بە سووڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆی و بەدەوری خۆر، هەر هەموویانی پێدراوەو وەڵامی دراوەتەوە.

بروانە ژیانداران هەر هەموویان پێویستیان بەچی هەبێت، وەڵامیاندراوەتەوە. باڵندە پێویستی بەباڵە بۆ فڕین، وشتر پیویستی بەوەیە بەرگەی گەرما و نەبوونی ئاو بگرێت بۆ مانەوەی (٨) ڕۆژ، بەرگەی برسێتی بگرێت، زمانی بە شێوەیەک بێت بەرگەی دڕک و چقڵی بیابان بگرێت، سمەکەی و قاچەکانی و ... هتد، پێڵووی چاوی ڕوونە بۆئەوەی بتوانێت لەکاتی با هەڵکردندا دایانخات، دەتوانێت کونە لووتەکانی دابخات لەکاتی تەپ و تۆزدا. کەواتە کێیە وەڵامی ئەو هەموو داواکاری و پێداویستییەی گەردوون و مرۆڤ و ژیاندار و بێژیان و ... هتد داوەتەوە؟!

## ٦- بەڵگەی چاودێری

ئەم بەڵگەیە دەڵێت: «چاودێریکراو، چاودێریکاری هەیە.» بڕوانە ئەم گەردوونە لە گەردیلەیەکەوە تاوەکوو دەگاتە کەهکەشانێک، هەمووی لەژێر

چاودێری دایە و بەردەوام چاودێری دەکرێت، باشە ئەگەر یەکێک نەبێت چاودێری بکات، دەبێت چی بەسەر بێت؟!

باشە ئەگەر سەیارەیەک، خواردنێک، ... چاودێری نەکەی تێکدەچێت و دەفەوتێت. ئەی ئەو هەموو گەردوونە گەورەیە ئەگەر یەکێک نەبێت چاودێری بکات، دەبێت چی بەسەر بێت؟

## ٧- بەڵگەی جووڵە

بەڵگەی جووڵە دەڵێت: «جووڵێنراو، جوڵێنەری هەیە.»

باشە ئەو هەموو گەردوونە کێ دەیجووڵێنێت و هەڵدەسووڕێنێت؟!

باشە تەشییێک هەتا نەیجووڵێنی ناجووڵێت، ئەی ئەم گەردوونە ئەگەر یەکێک نەبێت، کێ دەیجووڵێنێت و هەڵیدەسووڕێنێت؟!

## ٨- بەڵگەی مشوورخۆری

ئەم بەڵگەیە دەڵێت: «مشوور لێخوراو، مشوورخۆری هەیە.»

بڕوانە ئەم گەردوونە لە گەردیلەیەکەوە تا دەگاتە کەهکەشانێک، هەمووی سات بە سات مشووری لێ دەخورێت، کێ ئەم مشوورە دەخوات ئەگەر خودای گەورە نەبێت؟!

## ٩- بەڵگەی سیستم

ئەم بەڵگەیە دەڵێت: «سیستم، سیستمدانەری هەیە.»

واتە هیچ سیستمێک نییە لەخۆوە هاتبێت، بۆنموونە سیستمی مۆبایل و تەلەفۆن و ئۆتۆمبێل و ئینتەرنێت و ... هتد. ئەی باشە سیستمی گەردوون، مرۆڤ، ژیاندار، بێژیان، زەوی، هەسارەکان، ئاو، هەوا، هێزەکانی کێشکردن، کەهرۆموگناتیسی، هێزی ناوەکی لاواز، ناوەکی بەهێز ...، کێ ئەم سیستمانەی دانان؟!

## ١٠- بەڵگەی هەماهەنگی گەردوونی

ئەم بەڵگەیە دەڵێت: «هەماهەنگی لەنێوان دوو شتدا پێویستی بە هێزێک هەیە بۆئەوەی ئەم هەماهەنگییە دروست بکات.»

بڕوانە ئەم گەردوونە هەر هەمووی هەماهەنگە لەگەڵ یەکتری، بڕوانە مادده، پڕۆتۆن، نیترۆن، ئەلیکترۆن و ...، بڕوانە بەشەکانی جەستەی مرۆڤ، بڕوانە بەشەکانی زەوی، بڕوانە هەماهەنگی نێوان زەوی و خۆر، زەوی و مانگ، زەوی و کۆمەڵەی خۆر، زەوی و هەموو گەردوون؛ دەبینی هەر هەموویان هەماهەنگن لەگەڵ یەکتری. ئەگەر تۆزقاڵێک ئەم هەماهەنگیە تێکبچێت، گەردوون و ژیان تێکدەچن و نامێنن! بۆنموونە بڕوانە هەماهەنگی مرۆڤ و ڕووەک هەماهەنگییەکی زۆر زۆر دەبینین، چونکە مرۆڤ ئۆکسجین هەڵدەمژێت و دووانە ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدات، ڕووەکیش بە پێچەوانەوە، دووانە ئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەمژێ و ئۆکسجین دەردەدات بە پێچەوانەی مرۆڤەوە.

دەپرسین کێ ئەم هەماهەنگییەی دروستکرد؟!

## ١١_ بەڵگەی «نەداری شتێک، ئەو شتەی پێی نابەخشرێت.»

نەداری شتێک ناتوانێت ئەو شتە ببەخشێت، باشە کەسێک زانستی نەبێت دەتوانێت خەڵک فێر بکات؟

کەسێک زمانی ئینگلیزی نەزانێت، دەتوانێت بە خەڵکی بگەیەنێت و فێریان بکات؟

کەسێک یەک دیناری پێ نەبێت، دەتوانێت پارە ببەخشێت؟! بێگومان نەخێر. ئەی باشە دەپرسین ئایا ماددە ویست، حەز، ئارەزوو، خۆشەویستی، ڕقلێبوونەوە، ژیان و ...، ئەوانەی هەن تاوەکوو بیانبەخشێت؟

ئێستا ئێمە لێرەدا چەند شتێک باس دەکەین کە بە هیچ جۆرێک پەیوەندییان بە ماددەوە نییە و لە دەرەوەی ماددەن:

بۆ نموونە: ژیان، ویست، غەریزەکان، ئامانج و مەبەست، جوانی خوازی، چاکە خوازی، زانست خوازی، خوداناسی، ڕێکسازی، ڕێنموونی کردن، ئەندازەگیری، وەڵامدانەوەی داواکاری، عەقڵ و هۆش، ڕقلێبوونەوە، ڕەوشت، شەرمکردن، فیداکاری، ئارامگرتن، تێگەیشتن، دڵسۆزی، بڕیاردان، هیوا، پشت بەستن، خۆنەویستی، ئازار، لێبووردەیی، بەزەیی، قەناعەت، بیرکردنەوە، خەمخۆری، جددییەت، حیکمەت و دانایی، ئینتیما، ڕێز، کێبڕکێ، زانست، ئیرەیی، عوجب، خۆبەگەورەزانی، خراپەکاری، ترسنۆکی، ئازایەتی.

ئەمانە هیچیان پەیوەندییان بە ماددەی کەڕ و کوێرەوە نییە، ئەی باشە لە کوێوە هاتن؟! باشە ماددە بۆ خۆی ئەو شتانەی نییە، ئەی چۆن دەتوانێت بیانبەخشێت؟!

## ١٢- بەڵگەی ملکەچی و دەستەمۆیی

ئەم بەڵگەیە دەڵێت: «ملکەچی و دەستەمۆیی، ملکەچکار و دەستەمۆکاری هەیە.»

بڕوانە ئەم گەردوونە هەر هەمووی ملکەچ و دەستەمۆیە و ناتوانێت بە هیچ جۆرێک لەو شتە لابدات کە بۆی دیاریکراوە. باشە دەپرسین چ هێزێک ئەم گەردوونەی لە گەردیلەیەکەوە تاوەکوو کەهکەشانێک ملکەچ و دەستەمۆ کرد؟! بە شێوەیەک نەتوانێت تۆزقاڵێک لابدات.

## ١٣- بەڵگەی: «هەر شتێک بوون و نەبوونی یەکسان بێت، بەبێ زاڵکەرێک لایەکیان زاڵ نابێت بەسەر ئەوی تریاندا.»

پوختەی ئەم بەڵگەیە:

هەر شتێک بوون و نەبوونی یەکسان بێت، بەبێ زاڵکەر لایەکیان زاڵ نابێت بەسەر ئەوی تریاندا، وەک «تەرازوو» هەردوو لای یەکسانن، هەتا شتیک لە لاکەی تریان دادەنێیت کە قورستر بێت، لایەک زاڵ نابێت بەسەر لایەکەی تردا، کەواتە هەتا شتێکی دەرەکی نەیەت ئەو دوو لایە هەر وەک یەک دەمێننەوە. کە زاڵکەرێک هات، ئینجا لایەکیان زاڵ دەبێت، ئەگەرنا ئەو دوو لایەکە یەکسانە و هەر بە یەکسانی دەمێننەوە و هیچ لایەکیان بەسەر لاکەی تریاندا زاڵ نابێت، کەواتە شتێک هەبوون و نەبوونی یەکسان بێت، دەبێت زاڵکەر هەبێت، هەبوونەکە زاڵ بکات بەسەر نەبووەکەدا بۆئەوەی ئەو نەبووە بێتە بوون. ئەگەر ا هەرگیز ئەو نەبووە نایەتە بوون و بوونەکە ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر نەبووەکەدا.

لە پێشەوە سەلما کە گەردوون و بوونەوەر سەرەتای هەیە، هەتا بە قسەی

بێباوەڕەکان خۆیان، گەردوون پێش سێزدە ملیار ساڵ لەمەوبەر هاتووەتە بوون، هەروەک «ستیڤن هۆوکینگ» ئاماژەی بۆ کردووە، وەک دەڵێت: پێش ئەوکاتە، واتا پێش تەقینەوە گەورەکە، هیچ شتێک بوونی نەبووە، نە ماددە، نە شوێن، نە کات، واتا گەردوون نەبووێکی ڕەها بووە، (عدم مطلق)، باشە کەواتە لەو کاتەدا گەردوون بوون و نەبوونی یەکسان بووە. واتا دەکرا هەبێت، دەکرا نەبێت، واتا (ممکن الوجود) بووە نەک (واجب الوجود)، باشە مادام بوون و نەبوونی یەکسان بووە، کێ بوونی (وجود) زاڵ کرد بەسەر نەبووندا (عدم)؟! ئایا بوون (وجود) بەبێ زاڵکەرێک بۆ خۆی دەتوانێت زاڵ ببێت بەسەر نەبوو (عدم)دا؟!

ئایا ئەو سەیارەی کە هەتە، پێش سەد (١٠٠) ساڵ بوونی نەبووە، پاشان هاتە بوون، واتا پێش ئەوەی بێتە بوون، بوون و نەبوونی یەکسان بووە، واتا: دەکرا هەبێت، دەکرا نەبێت، ئەی باشە کێ بوونی ئەو سەیارەی زاڵ کرد بەسەر نەبوونەکەیدا؟! ئایا بۆ خۆی خۆی زاڵ کرد؟! لە کاتێکدا خۆی نەبوو بووە! ئایا نەبوو دەتوانێت خۆی خۆی بێنێتە بوون؟! واتا سەیارەیەک خۆی خۆی بێنێتە بوون، بەبێ هیچ هێزێکی دەرەکی.

## ١٤- بەڵگەی: «بە هیچ جۆرێک «نەبوو» (عدم) بەبێ هێزێکی دەرەکی ناتوانێت خۆی خۆی بێنێتە بوون.»

ئێمە دەپرسین پێش سێزدە ملیار و حەو سەد ملیۆن ساڵ گەردوون نەبوو بووە، وەک ستیڤن هۆوکینگیش ئاماژەی پێ داوە، باشە ئەم نەبووە چۆن خۆی خۆی هێنا بوون؟! کەواتە بەدڵنیاییەوە ئەم نەبووە ناتوانێت خۆی خۆی بێنێتە بوون مەگەر هێزێکی دەرەکی نەبێت کە بریتییە لە خودای پەروەردگار. ئەگەرنا وەک ئەوە وایە بڵێیت: ئەم ئۆتۆمبێلە پێش (١٠) ساڵ لەمەوبەر نەبووە، بەڵام دوایی خۆی خۆی هێنا بوون!

دووبارە ناباوەڕی دژی عەقڵ وەستایەوە!

## ١٥- بەڵگەی ڕەوشت

ئەم بەڵگەیە دەڵێت: «ڕەوشتی مرۆڤ شتێکی بابەتی و سەربەخۆیە و خۆی لە خۆیدا دروستی نەکردووە.»

پوختەی ئەم بەڵگەیە:

بەڵگە ڕەوشتی بریتییە لە بەڵگە هێنانەوە بە هەبوونی چەند شتێکی ڕەوشتی کە هەندێک شت بە باش و جوان و چاک دەزانێت، هەندێک شتی تریش بە خراپ و ناشیرین و بێزراو دەزانێت، ئەوە لەسەر بنەمایەکی سەربەخۆ کە هیچ پەیوەندییەکی بە زەوقی کەسی یان عادەت و عورفەوە نییە، کەواتە ئەو ڕەوشتانە ڕەوشتی بابەتین (الأخلاق الموضوعی) و سەربەخۆن و هێزێکی دەرەکی لە دەرەوەی مادده لە ناو دڵ و دەروون و ناخ عەقڵ و هۆشی مرۆڤدا سەپاندوویەتی و چاندوویەتی، ئەو چەسپێنەر و چێنەرە ئەگەر هەبێت، دیارە حەتمەن خوای پەروەردگارە؛ ئەگەرنا مادده بۆ خۆی ڕەوشتی لە کوێ بوو تاوەکوو ڕەوشت ببەخشێت؟! وەک پێشتر باسمان کرد (فاقد الشئ لا يعطيه) واتا: نەبوویی شتێک ناتوانێت ئەو شتە ببەخشێت.

بۆ نموونە کێ لە دڵی مرڤیدا چاند و چەسپاندنی کە:

١- دادگەری، ڕاستگۆیی، ئەمانەت پارێزی و چاکەکردن، بەزەیی هاتنەوە، میهرەبانی، دڵسۆزی، یارمەتیدان، لێبووردەیی، عیزەت، ... هتد، باشن؟!

٢- ستەم، درۆ، خیانەت، ... هتد، خراپن؟!

کەواتە کێ ئەو هەست و ڕەوشتانەی لە مرۆڤدا چاندن؟ بۆ نموونە چ شتێک وا لە مرۆڤ دەکات حەزی بە ڕاستگۆیی و دادگەری و ئەمانەت پارێزی و ... هتد بێت؟ چ شتێک وا لە مرۆڤ دەکات ڕقی لە ستەم و درۆ و خیانەت و ... هتد بێت؟

جا ئەوەی کە زۆر سەیرە، زۆرجار ئەو شتە لە زیانی مرۆڤیشە بەڵام هەر دەیکات، بۆ نموونە دەفتەرێک دۆلاری دۆزیوەتەوە، یان کەسێک دە دەفتەر دۆلاری لا داناوە، بەڵام ئەو ڕاستگۆیە و خیانەت ناکات. لەگەڵ ئەوەی لە چاوی مرۆڤ وایە ئەگەر ئەو دە دەفتەر دۆلارە ببات و خیانەت بکات، قازانج دەکات، بەڵام ئەو مرۆڤە شتێک لە ناخیدا هەیە کە ڕێی پێ نادات، ئایا ئەو هەستە کێ دروستی کرد؟! ماددە دەتوانێت ئەو هەستە دروست بکات؟! یان کەسێک هەیە دەتوانێت ستەم بکات و قازانجێکی زۆر بەدەست بهێنێت بە هۆی ئەو ستەمەیەوە، بەڵام شتێک لە ناخیەوە هاوار دەکات و ناهێڵێت ئەوکارە بکات، ئەگەرچی ڕەنگە ئەگەر ستەمەکە بکات، بە سەدان ملیۆن دۆلار قازانج بکات و بەدەستی بهێنێت.

یان زۆر جار مل دەدات بۆ بڕیارێک کە زیانییەتی بەڵام تەنیا بۆ چەسپاندنی دادگەری وادەکات، واتا ناخی داوای دادگەری دەکات، لەگەڵ ئەوەی کە زەرەریشیەتی، ئایا کێ ئەو هەستە دادگەرییەی لە دڵدا چەسپاند؟! ماددە دەزانێت دادگەری چییە تاوەکوو لە ناخی مرۆڤدا بیچەسپێنێت؟!

یان زۆر جار کەسێک بەهۆی ڕاستگۆییەوە قازانجێکی زۆر لەدەست دەدات، یان زەرەرێکی زۆر زۆر دەکات، بەڵام هەستێک لە ناخییەوە هاوار دەکات دەڵێت: درۆ مەکە، چونکە نارەوشتییە، زۆر جار بە درۆیەک ڕەنگە بە دەیان دەفتەر دۆلار قازانج بکات، یان زەرەر لەسەر خۆی لاببات، بەڵام ئامادە نییە درۆیەکە بکات، ئایا ماددە دەزانێت ڕاستگۆیی چییە تاوەکوو بیبەخشێت بە مرۆڤ؟!

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی ڕەوشتە بابەتییە نەگۆڕەکان چەند سیفەتێکیان هەن:

١- **گشتیبوون**، واتا ئەو جۆرە ڕەوشتە گشتییە و هەمەلایەنە و هەموو مرۆڤەکان

تێیدا بەشدارن بەبێ جیاوازی، واتا ئەگەر فیترەتی ئەو کەسە تێک نەچووبێت و لەسەر فیترەت مابێتەوە، ئەوا حەزی بە دادگەری و ڕاستگۆیی و ئەمانەت پارێزری و میهرەبانی و... هەیە، هەروەها ڕقی لە ستەم و درۆ و خیانەت و دڵرەقیە. کەواتە هەموو مرۆڤەکان تێیدا بەشدارن و ئەو ڕەوشت و سیفاتانە گشتین لە نێوان هەموو مرۆڤەکان و بەپێی کەس، کات، شوێن، بارودۆخ، ژینگە ، سەردەم و کۆمەڵگاکان ناگۆڕێت.

٢- **پێویستیان بە فێرکردن نییە،** واتا: ئەو ڕەوشت و سیفاتانە پێویستییان بە فێرکردن نییە بە شێوەیەکی گشتی، مەبەستمان وردەکاری ئەو ڕەوشتانە نییە، مەبەستمان خودی خۆیانە، کەواتە مرۆڤ پێویستی بەوە نییە فێری دادگەری بکرێت، بۆیە منداڵێک ئەگەر تۆزێک فامی کردبێت، بێ ئەوەی فێرکرابێت دژی ستەمە، بۆ نموونە شتێک بدە بە یەکێکیان بەڵام مەیدە بە ئەوی تریان، دەبینین پێی ناخۆشە و تووڕە دەبێت، یان زیاتر بدەی بەو و کەمتر بدەی بەم، دەبینی پێی تووڕە دەبێت و پێی ناخۆش دەبێت، بێ ئەوەی فێرکرابێت دادگەری چییە و ستەم چییە، یان کەسێک ستەم لە باوکی بکات لە بەردەمی ئەو، ئەگەر یەکەم جاربێت ئەو حاڵەتە ببینێت و فێریش نەکرابێت، دەبینین پێی ناخۆشە و تووڕە دەبێت و دەگری.

**٣- ئەو هەست و سیفەت و ڕەوشتانە ئەگەر هەل و مەرجی گونجاوییان بۆ نەڕەخسێت لە گەشەکردن دەوەستن و گەشە ناکەن و بەرەو نەمان ون بوون دەچن،** (بالفعل) واتا بە کردەیی، بەڵام (بالقوة) بە حاڵەتی توانایی و ئامادەبوون، هەر هەن، هەر ئامادەن و نامرن، هەروەک پێغەمبەر (ص) دەفەرمووێت: «مامن مولود إلا يولد على الفطرة، فأبواه يُهودانه أو ينصِّرانه أو يُمَجِّسانه» متفق عليه، البخاري، برقم (١٢٩٢)، ومسلم برقم (٦٩٢٦)، عن أبي هريره.

واتا: «هەموو منداڵێک لەسەر زگماک و سروشت و فیترەتی خواناسی لەدایک دەبێت، بەڵام دوایی باوک و دایکی دەیکەنە جوولەکە، یان دەیکەنە نەسرانی، یان دەیکەنە مەجووسی.»

کەواتە ژینگە و بارودۆخ کاریگەری دەبێت لەسەر لاوازکردنی ئەو هەست و سیفەت و ڕەوشتانە و کەمیان دەکات و ونیان دەکات و خامۆشیان دەکات بەڵام هەرگیزا و هەرگیز نامرن و کاتێک هەردێت دەربکەون.

٤- ئەو سیفەت و ڕەوشت و هەستانە، دەکرێت کپ بکرێن، بەڵام بە تەواوی نامرن. (بالقوة) هەر دەمێنن، بۆیە دەبینن هەیە درۆزنە، ستەمکارە، خیانەتکارە، وەنەبێت ڕاستگۆیی و دادگەری ئەمانەت لە دڵ و دەروونیدا نەمابێت، نەخێر (بالقوة) ماون، بەڵام خەفەکراون و کپی کردووون، بەڵام هەر هەست دەکات کە کارێکی هەڵە دەکات.

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی ئەو چوار سیفەت و تایبەتمەندییانەی هەن ڕەوشت و خوڕەوشتی بابەتی.

کەواتە مادام ئەو ڕەوشت و سیفەتانە بەو شێوەیە بن، گشتین و پێوستیان بە فێرکردن نییە، هەربۆیە پێویستە سەرچاوەکە ئەو سێ سیفەتانەی هەبن:

١- توانای ڕەها، واتا: دەبێت تواناکەی توانایەکی ڕەها بێت، چونکە ئەو بەها (قیەمە) ڕەوشتیانە و ئەو هەست و سیفەتانە بە کردەیی بوونیان هەیە لای هەر هەموو خەڵک و گشتین لە نێوان هەموو مرۆڤ و مرۆڤایەتی وکۆمەڵگە جیاوازەکان و شوێنە جیاوازەکان. کەواتە مەحاڵە و ئەستەمە کە سەرچاوەی مرۆڤ بێت یان کۆمەڵگایەک لە کۆمەڵگاکان بێت، چونکە ئەو کەسە دەبێت ئەو توانایەی هەبێت کە ئەو ڕەوشت و هەست و سیفەتانە بگشتێنێت، هەروەها شتێکی حاشا هەڵنەگرە کە کەس ناتوانێت ئەو کارە بکات، کەواتە تەنیا خوای گەورە مایەوە، کە ئەو کارەی کردبێت و بیکات.

٢- زانستێکی ڕەها و گشتی، واتا سەرچاوەی ئەو ڕەوشت و سیفەت و هەستانە دەبێت زانستێکی ڕەهای هەبێت و گشتی بێت و بگات بە هەموو خەڵک، چونکە گشتاندنی ئەو ڕەوشت و سیفەت و هەستانە و کردنیان بە

یاسایەکی گشتی بەدڵنیاییەوە زانستێکی ڕەهای دەوێت کە ئەو زانستە ئەوەندە گشتی بێت، ئیحاتەی هەموو کەس و حاڵەکان بکات و بیانگرێتەوە، کەواتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت سەرچاوەی ئەوانە ناکرێت غەیری خوا بێت، چونکە هیچ کەسێک ئەو جۆرە زانستەی نییە کە بتوانێت هەموو کەس و بارودۆخ و کات و شوێن و کۆمەڵگە و ژینگە جیاوازەکان بگرێتەوە بەبێ جیاوازی، شتی وا هەرگیز ناکرێت و نابێت، کەواتە ئەوەی خاوەن ئەو جۆرە زانستە بێت تەنیا خودای پەروەردگارە.

٣- حیکمەت و دانایی ڕەها، واتا سەرچاوەی ئەو ڕەوشت و سیفەت و هەستانە دەبێت خاوەن حیکمەت و داناییەکی ڕەها بێت، بە شێوەیەک تەواو تەواو یەک بێتەوە لەگەڵ فیترەت و سروشتی مرۆڤ و خاوەن ویست و داناییەکی وەها بێت کە ئامانجدار و مەبەستدار بێت، بەرەو ئاڕاستەیەکی وا بڕوات کە سەد لە سەد لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤایەتی بێتەوە و تێک نەگیرێت، بۆیە لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە ناکرێت سەرچاوەی ئەو هەموو ڕەوشتە جوان و گونجاو و پەسەندانە مادده بێت، چونکە مادده نە زانستی هەیە، نە توانای هەیە، نە حیکمەت و دانایی هەیە کە بتوانێت ئەوانە لەناو ناخی مرۆڤدا بچێنێت و بچەسپێنێت، بەیەک ئاڕاستە ئاڕاستەی هەموو مرۆڤ و مرۆڤایەتی بکات لەگەڵ جیاوازی کات و شوێن و سەردەم، کۆمەڵگە و ژینگە و...، کەواتە کێ ئەوانەی چاند؟!

دەتوانین بەڵگەی ڕەوشتی بەو شێوەیە کورت بکەینەوە:

١- پەیوەستکاری ڕەوشتی بوونی هەیە.

٢- ناکرێت ئەو پەیوەستکارە سروشت و مادده بێت.

٣- ناکرێت ئەو پەیوەستکارە پاڵنەری کۆمەڵایەتی بێت.

٤- ناکرێت ئەو پەیوەستکارە غەیری کەسی بێت (شخص)، واتا دەبێت کەسێک

بێت کە پەیوەستی بکات.

٥- پەیوەستکاری ڕەوشتی پێویستە سەرچاوەیەکی شەخسی بێت و ئەو سەرچاوەیە هێز و زانست و داناییەکی زۆر زۆری هەبێت کە بتوانێت لەناو ناخی مرۆڤدا بیسەپێنێت و بیچەسپێنێت و بیڕوێنێت.

دەتوانین کورتتری بکەینەوە، بەم شێوەیە:

١- ئەگەر خوا نەبێت، بەها (قیەم)ی ڕەوشتی بابەتی بوونی نابێت.

٢- قیەمی ڕەوشتی بابەتی بوونی هەیە.

٣- کەواتە: خوا بوونی هەیە.

کەواتە ناوەڕۆکی بەڵگەی ڕەوشتی بە باش و خراپیەوە، ناکرێت لە ئەندامێکی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتبێت، ناشکرێت لە ویست و هەڵبژاردەی زەوقی کەسییەوە سەرچاوەی گرتبێت، ناشکرێت لە عادەت و عورف و کۆمەڵگە و ئابووری ... سەرچاوەی گرتبێت. چونکە ئێمە گوتمان دەبێت سەرچاوەکە زانست و توانا و حیکمەتی ڕەهای هەبێت. ئێ دیارە کە هیچ کام لەوانە و غەیری ئەوانەش ئەو تایبەتمەندییەیان نییە، کەواتە تاکە ڕێگەچارە و تاکە تەفسیر بۆ ئەو ڕەوشتانە ئەوەیە کە بڵێین:

ڕاستییەکی گەردوونیی جەوهەریی بەرز هەیە بەسەر هەموو شتە ماددییەکاندا لە ناویشیاندا مرۆڤ، ئەوانە هەر هەموویان تەسەوری کەماڵی خوای گەورەن، کە دڵ و دەرون و ناخ و فیکر و عەقڵ و سروشتی مرۆڤی لەسەرئەم ڕەوشتانە دامەزراندووە و تێیدا چاندووە و پەیوەستی کردووە.

**تێبینی**: فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمانی «کانت» یەک بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر بوونی خوای گەورە، ئەویش بریتییە لە بەڵگەی ڕەوشتی.

## ١٦. بەڵگەی وجودی (بوونی مرۆڤ خۆی)

عەقڵی مرۆڤ هەر کە ئەندێشەی شتێکی گەورە بکات، ئەوا ئەندێشەی شتێکی گەورەتر لەو دەکات، چونکە وەستان لە پلەیەکدا کە بێتوانایی و دەستەوسانی تێدا بێت پێویستی بە هۆ هەیە. عەقڵی مرۆڤیش هۆی بێتوانایی و دەستەوەسانییە کە نازانێت، چونکە هەر شتێکی تەواو و کامڵ هەبێت ئەوا عەقڵی مرۆڤ هەوڵی گەیشتن دەدات بە شتێک لەو تەواوتر و کامڵتر، تا دەگاتە کۆتاییەکان، کە ئامانج و مەبەستی کامڵبوونی ڕەهایە و نە زیاد و نە کەم دەبێت، ئەو بوونە کامڵە ڕەهایە بەبێ چەند و چوون هەیە، چونکە وێناکردنی بە عەقڵ و ئەندێشە کردنی کەمترە لە بوونە ڕاستەقینەکەی، چونکە لەڕاستیدا بوونی هەیە، لەبەرئەوە سیفەتی کامڵی ڕەهای لێ دەستێنرێتەوە، بەهۆی نەبوونی بوونەکەی، بەو هۆیە نابێتە خاوەنی هیچ پلەیەکی کامڵ و تەواو، بەڵکوو تەنیا کەم و کورتی ڕەها دەمێنێتەوە کە کامڵی نییە، جا تەنیا وێنە و ئەندێشەکردنی ئەو کامڵە بەڵگەی بوونەکەیەتی.

ڕینێ دیکارت، فەیلەسووف و فیزیازان و زانای بیرکاری فەڕەنسی (١٥٩٦-١٦٥٠ز) کە بە باوکی فەلسەفەی مۆدێرنە ناسراوە، دەڵێت:

"من لەگەڵ ئەوەی هەست بە کەموکوڕیی خۆم دەکەم، بەڵام لە هەمان کاتدا هەست بەبوونی زاتێکی زۆر گەورە و کامڵ دەکەم کە دەمبینێت، ناچارم باوەڕم وابێت کە ڕواندن و چەسپاندنی ئەو هەستە لە زاتی مندا بەهۆی ئەو زاتە کامڵەوەیە، کە هەرچی سیفەتی کەماڵ و تەواوی هەیە لەودا هەیە، ئەو زاتەش «خودا»یە."

کەواتە ڕینێ دیکارت خودی خۆی دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودا، واتا: پەنا ناباتە بەر دەرەوەی خۆی و گەردوون، بەڵکوو خۆی دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودای گەورە، چونکە دەڵێت: من ئەو هەموو کەموکوڕییەم هەیە، بەردەوام

هەست بەو کەموکورییەی خۆم دەکەم، بەڵام لە هەمانکاتدا هەست بەزاتێکی زۆر گەورە و کامڵ دەکەم، کە دیارە ئەو هەستکردنە لەخۆوە نییە، بەڵکوو دەبێت هێزێکی دەرەکی لە دەرەوەی خودی خۆم ئەو هەستەی لەناو مندا ڕواندبێت و چەسپاندبێتی، ئەگەرنا ئەو هەستە چۆن لە خۆوە دروست دەبێت؟ کەواتە ئەو زاتە کامڵ و تەواوە بریتییە لە خودای گەورە، ئەو زاتە تەواوە ئەو هەستەی لای من دروستکردووە کە هەست بەزاتی کامڵ و تەواویی ئەو بکەم.

هەر بۆیە دیکارت دەڵێت: "کاتێک سەیر دەکەم، هەست بە هەبوونی بوونێک دەکەم، کە لەوپەڕی تەواویدایە، دوایی بیردەکەمەوە، ئایا دەبێت ئەو هەستەم، ئەو هەستکردنەم بەو بوونە تەواوە، لەکوێوە هاتبێت؟ سەیری خۆم دەکەم، دەکەومە گومانەوە، خۆم نوقسانی و ناتەواویم هەیە. کەواتە ناگونجێت ئەو هەستکردنەم بەو بوونە تەواوە لە منەوە هاتبێت. چونکە خۆم ناتەواوم، ناتەواوی تەواو(کامل)ی لێوە نایەت! ئایا ئەو هەستە لە دەورو بەرمەوە هاتووە؟! تەماشای شتەکانی دەوروبەریشم دەکەم، ئەوانیش بەهەمان شێوە، هەر ناتەواون و نارێک و پێکن.

کەواتە: نابێ لەوانیشەوە هاتبێت.

کەواتە: ئەو هەستەی من بەرانبەر بە بوونێکی تێر و تەواو، کە ئەوپەڕی زانیاری و ئەوپەڕی حیکمەت و ئەوپەڕی دەستەڵات و ئەوپەڕی هەموو سیفەتێکی (جلال) گەورەیی، (کمال) تەواوی و (جمال) جوانی هەیە لە خودی بوونی ڕەها و ڕاستەقینەوە هاتووە، کە خودای گەورەیە -سبحانە وتعالی-.

کەواتە دیکارت خودی خۆی و خودی خودا دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودا و پەنا ناباتە بەر دەرەوەی زاتی خودا بۆ سەلماندنی خودی خودا.

## ١٧_ بەڵگەی زگماک (الفطرة)

زگماک، فیترەت، واتا: ئەو سروشتەی خودای گەورە مرۆڤی لەسەر دروستکردووە.

پوختەی بەڵگەی زگماک (الفطرة) لەسەر بوونی خودا:

مرۆڤ ئەگەر وازی لێبهێنرێت بەبێ مامۆستا و فێرکار و پەروەردەکار هەست بەبوون و هێزێکی دەرەکی دەکات کە ئەو گەردوون و بوونەوەری دروستکردووە, ڕێکیخستووە, ئەندازەی گرتووە, ڕێنموونی کردووە, وەڵامی هەموو داواکارییەکانی دەداتەوە و چاودێری دەکات و ئاگای لێ دەبێت و ... هتد.

کەواتە فیترەت و زگماک بریتییە لەو هەستەی کە مرۆڤ بەبێ فێرکردن و ئاڕاستە کردن هەستی پێدەکات، لێی جیا نابێتەوە ئەگەر چی لاوازیش ببێت، وەک زانستخوازی و چاکەخوازی و جوانیخوازی و غەریزەکان. بۆیە ئەگەر وا دابنێی مرۆڤێک لە دەشتاییەک لەدایکبووە و دووربووە لە فێرکردن و پەروەردەکردنی دەوروبەر و کۆمەڵگا، لەپاشاندا گەورەبوو و باڵغ بوو، ئەوا چۆن هەست بە شتی جوان دەکات و هەست بە چاکەکاری دەکات و هەست بە خراپی ستەم و خیانەت و...، دەکات، هەروەها چۆن هەست بە غەریزەکان دەکات، ئاواش هەست بە هێزێکی دەرەکی دەکات کە خودای گەورەیە، کە ئەو گەردوونەی دروستکردووە و ڕێکیخستووە.

کەواتە هەروەک چۆن دەزانێت پێویستی بە خواردنە بۆ تێربوونی، پێویستی بە ئاوە بۆ تینوێتی شکانی، پێویستی بە سێکسە بۆ تێرکردنی شەهوەت و ئارەزووی و غەیری ئەوانەش لە هەموو جۆرەکانی غەریزە، ئاواش هەست بە دروستکەرێک دەکات کە دروستی بکات. پرسیار دەکات لە کوێوە هاتووم؟ بۆچی هاتووم؟ بۆ کوێ دەچم؟ من کێم؟ کێ منی دروستکردووە؟ دەبێ چی بکەم؟ سەرەنجامی ئەو گەردوونە چۆن دەبێت؟ ... هتد.

بۆیە وەک زانایانی دەروونناس دەڵێن: چوار شتی فیتری و خوارِسکیمان هەن، کە لەگەڵ سرووشی مرۆڤدا تێکەڵ بوون و لێی جیانابنەوە، ئەو چوار شتە فیتری و زگماکە بریتین لە:

١- زانستخوازی ٢- چاکەخوازی

٣- جوانیخوازی ٤- خوداناسی

کەواتە ئەوانە سیفەتگەلێکن کە هەموو مرۆڤایەتی تێیدای بەشدارن، بۆ نموونە: هەموو کەسێک کە تۆزێک فامی کرد پرسیار دەکات و بەدوای شتدا دەگەڕێت و هەموو مرۆڤێک چاکەخوازە، بۆنموونە دایک سۆزی هەیە بۆ ڕۆڵەکەی. هەموو مرۆڤێکیش حەزی بە جوانییە و ڕقی لە ناڕێکییە، بە هەمان شێوە هەموو مرۆڤێک هەست بە هێزێکی دەرەکی دەکات و حەزی لە ملکەچیە بۆ ئەوە، هەست دەکات پێویستی پێیەتی، ئەگەر هەلومەرجی بۆ بڕەخسێت و ژینگەی دەوروبەری تێکی نەدەن، ئەگەر هەر نەبێت لەکاتی ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمەدا هەست بەو هێزە دەکات و پەنای بۆ دەبات.

کەواتە بۆمان دەرکەوت خوداناسی شتێکی زگماکی و فیتری و ڕۆحییە کە خودای گەورە لەناو دڵ و دەروون و ڕۆح و بیر و هۆشی مرۆڤدا چاندوویەتی. هەروەک چۆن غەریزەکان و زانستخوازی و چاکەخوازی و جوانیخوازی چاندووە، بە هەمان شێوە خوداناسیشی چاندووە. هەروەک چۆن مرۆڤ خودا وای دروستکردووە کە گەدەی بەتاڵ بوو هەست بە برسێتی بکات ئەگەرنا لە برسان دەمرد و هەستی نەدەکرد، ئاواش وای دروستکردووە کە ڕۆحی برسی ببێت بۆ بەرەو خوداچوون، خوداپەرستی، عەوداڵبوون، موشتاق بوون، خۆشەویستی، ڕێز و سام، سەرسامبوون بەرانبەر بە خودای پەروەردگار.

هەر بۆیە ئەگەر سەرنج بدەینە نیشانە و تایبەتمەندییەکانی هەستە ڕۆحی و خوارِسکی و زگماکیەکان، دەبینین هەموویان بەسەر خوداناسیدا جێبەجێ

دەبن، بۆیە ئەگەر بڕوانینە ئەو هەستانە دەبینین چوار تایبەتمەندییان هەیە:

١- گشتیبوون

٢- پێویستیان بە فێرکردن نییە.

٢- دەگونجێت کپ بکرێن.

٤- ئەگەر هەلومەرجی گونجاوییان بۆ نەڕەخسێت، مەرج نییە گەشە بکەن.

دەبینین هەر چواریان جێبەجێ دەبن بەسەر خوداناسیدا، چونکە خوداناسی گشتییە و هەموو مرۆڤ و مرۆڤایەتی تێدا هاوبەشن بە جیاوازی ڕەنگ، زمان، ڕەگەز، شوێن، کات، ژن، پیاو، خوێندەوار، نەخوێندەوار، زانا، نەزان، هەژار، دەوڵەمەند و... هتد، هەروەها پێویستیشی بە فێرکردن نییە. ئەگەر کەسێک لە شوێنێک بێت کە هیچ کەسی لێ نەبێت و هیچ مامۆستا و پەروەدەکار و فێرکاریشی نەبێت، دەبینین هەست بەو هەستە دەکات. هەروەها دەکرێت کپیش بکرێت، وەک بێباوەڕەکان کە کپیان کردووە، بەڵام ناتوانن ڕیشەکێشی بکەن، چونکە لەکاتی ناخۆشیدا پەنادەبەنە بەر خودا، بۆیە پەندێکی خۆرئاوایی هەیە دەڵێت: "هیچ بێباوەڕێک لە خەندەقەکاندا نییە"، هەروەها ئەو هەستە خوداناسییە،ئەگەر هەلومەرجی بۆ نەڕەخسێت، گەشە ناکات و پێش ناکەوێت، بەڵام دووبارە هەر ڕیشەکێش ناکرێت.

بۆیە ئەو قسەیەی فەیلەسووفی بەناوبانگی فەڕەنسی ڕینێ دیکارتە کە زانای فیزیا و بیرکاریشە، هەروەها بە باوکی فەلسەفەی مۆدێرنە ناسراوە (أبو الفلسفة الحديثة) کە دەڵێت: من لەگەڵ ئەوەی هەست بە کەموکوڕییەکی زۆر دەکەم لە ناخمدا بەڵام لە هەمان کاتدا هەست بە زاتێکی زۆر گەورە و تەواو و کامڵ دەکەم، کە هەست دەکەم ناچارم دەکات بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بهێنم، دڵنیام ئەو هەستەی کە لام دروستبووە و ڕۆچووە لە ناخمدا ئەو زاتە کامڵە لە ناخمدا چاندوویەتی، کە ئەو زاتە لوتکەی کامڵی و تەواوییە و

ڕازاوەیە بە هەموو سیفەتە جوانەکان، کەواتە دیکارت خودی خۆی ناخی خۆی نەفسی خۆی دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودای گەورە و دەڵێت: "هەر ئەو زاتە گەورەیە کە ئەو هەستەی لە ناخمدا چاندووە، ئەگەرنا لە خۆوە ئەو هەستە چۆن دروستدەبێت؟"، هەروەها دەڵێت: "نەفسم بە دوای کامڵەوەیە چونکە ناقس و ناتەواوە، هەروەها دەڕوانمە دەوروبەرم هەر هەمووی جۆرێک لە کەموکوڕی تێدایە و کامڵی موطلەق و ڕەها نین، کەواتە ئەو زاتە کامڵە کە کامڵێکی تر لە سەرووی ئەوەوە نییە و بریتییە لە خودا."[١]

کەواتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت خواڕسکبوون و زگماکبوونی خودا لای فەیلەسووفە گەورەکان و زانا گەورە و ناودارەکانیش بوونی هەیە و ڕەگی داکوتاوە و گەیشتووە بەوەی تەنیا و تەنیا ئەو هەستە قووڵە فیترەییە بکرێتە بەڵگە لەسەر بوونی خودا، هەروەکوو لای ڕینێ دیکارت بینیمان.

ئەگەر بڕوانینە مێژوویش، دووبارە مێژوویش بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر زگماک (فیترەت)ی بوونی خودای گەورە، چونکە وەک وتمان تایبەتمەندی شتە فیترییەکان بریتییە لە گشتیبوون، بۆیە وەک باسمان کرد مێژوونووسی گەورەی یۆنانی «پلۆتارک» دەڵێت: "لە مێژوودا گەڵێک شارمان بینیوە بەبێ قەڵاو قوللە، شاریشمان بینیوە بەبێ کۆشک و تەلار، زۆر شاریشمان دیوە بەبێ قوتابخانە، بەڵام هەرگیز شارێکمان نەبینیوە بەبێ پەرستگا."[٢]

هەروەها فەیلەسووفی فەڕەنسی «هینری بێرگسۆن» دەڵێت: "کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەبووە دوور لە زانست و هونەر و فەلسەفە ژیانیان بەسەر بردووە، بەڵام هەرگیز هیچ کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی نەبووە دوور لە ئایین ژیانیان بەسەر بردبێت."[٣]

---

(١) وجود الله، الدكتور يوسف القرضاوی، (١٩)

(٢) الدين، بحوث ممهد لدراسة تاريخ الأديان، عبد الله دراز، (٨٣).

(٣) الدين، بحوث ممهد لدراسة تاريخ الأديان، عبد الله دراز، (٨٣).

هەروەها مێژوونووسی گەورە «ویل دیورانت» لە پەرتووکی (قصة الحضارة) دا دەڵێت: "هەتا ئێستاش ئەو بیروباوەڕە کۆنە ڕاست و دروستە کە پێی وایە ئایین دیاردەیەکە هەموو مرۆڤایەتی گرتووەتەوە"[١]

کەواتە شتێک کە فیتری و زگماکی و خوارِسکی نەبێت، چۆن لە ناخی هەموو تاکێکدا وا دەڕوێت بە درێژایی مێژوو، بە جیاوازی ڕەگەز و کات و شوێن و کۆمەڵگاو زانا و نەزان و ... هتد؟!

ئێمە لێرەدا باسی پێنج شت دەکەین کە دووبارە فیترین و لە سەرووی مرۆڤەوە سەپێنراون بەسەر مرۆڤدا کە ناتوانین بەهیچ جۆرێک تەفسیری ماددیانەی بۆ بکەین.

**یەکەم:** شتە زەرووریيە عەقڵییەکان، سەرەتا عەقڵییە یەکەمەکان (المبادئ العقلية الاولية):

مەبەست لەو جۆرە ئەو شتانەن کە عەقڵ ڕاستەوخۆ و یەکسەر قبووڵیان دەکات بەبێ چەند و چوون، بۆ نموونە:

١- دوو شتی دژ بەیەک، لە یەک کات و شوێندا بەیەکەوە کۆنابنەوە (اجتماع النقيضين مستحيل). بۆ نموونە: بوون و نەبوون (الوجود والعدم)، واتا: ناگونجێت بڵێیت: ئەو شتە هەیە لە هەمان کاتیشدا نییە!

٢- دوو کۆ دوو دەکاتە چوار: (٢+٢=٤) یان چوار کۆ چوار دەکاتە هەشت (٤+٤=٨).

٣- بەش لە هەموو کەمترە (الجزء أقل من الكل):

بۆنموونە بەشێکی سەیارەیەک بچووکترە لە هەموو سەیارەکە، منداڵێکی

---

(١) بۆ نووسینی ئەم بابەتە (بەڵگەی زگماک) زۆر سوودم لە کتێبی (شموع النهار، إطلال على الجدل الديني الإلحادي المعاصر في مسألة الوجود الإلهي) الدكتور عبد الله بن صالح العجيري، بینیوە، لاپەڕە (٣٩-٨٥).

بچووکیش ئەمە دەزانێت.

٤- هەموو پەیدابوویەک پەیداکەرێکی هەیە (لكل حادث محدث).

**دووەم: ڕەوشت**

ڕەوشت یەکێکی ترە لە شتە فیترییەکان کە هەرگیز ناتوانرێت تەفسیری ماددی بۆ بکرێت. هەر بۆیە هەرچی بێباوەڕە لە بەرانبەر ئەوەدا دەستەوەستانە و نازانێت چۆن وەڵام بداتەوە، هەر ئەوەیە کە «کانت» فەیلەسووفی گەورەی ئەڵمانی کردوویەتی بە بەڵگە لەسەر بوونی خودا، بۆ نموونە کێ لە ناخی مرۆڤدا ڕواندی و جێگیری کرد، کە دادگەری، ڕاستگۆیی، ئەمانەت پارێزی باشن، بەڵام ستەم، درۆ، خیانەت خراپن؟!

ئایا ماددە دەتوانێت ئەوانە لە مرۆڤدا بچێنێت و بچەسپێنێت؟! بۆ دیارە ماددە بۆ خۆی ئەوانەی هەن؟! کەواتە ئەوانە شتانێکی تەواو تەواو خوارِسک و زگماک و فیترین.

**سێیەم: غەریزەکان**

غەریزەکان یەکێکی ترن لە شتە فیترییەکان، بۆنموونە سۆزی دایک، باشە کێ وای لە دایک کرد سۆزی هەبێت؟ کێ وای لە دڕندەکان کرد سۆزیان هەبێت هەر هەموویان؟ کێ وای لە شێر و پڵینگ کرد ئەوەندە سۆزی هەبێ کە بێچووەکە بوو تا چەند ڕۆژێک هەڵیبگرێت بە دەمیەوە بێت و ئەولاو ئەملای پێبکات؟ لە ترسی ئەوەی مێش و مەگەز و ... بیخۆن؟ کێ ئەو سۆزەی پێ بەخشی کە خۆی برسی بکات بۆ تێرکرنی بێچووەکانی؟ ئایا ماددە سۆزی هەیە تاوەکوو بیبەخشێت؟!

**چوارەم: هەست کردن بە ئازادی و سەربەستی**

یەکێکی تر لە شتە زگماک (فیترییە)کان بریتییە لە ویست و ئازادی

و سەربەستی و ئیرادە، کە خودای گەورە داویەتی بە مرۆڤ، پێویستی بە فێکردن نییە و گشتییە و هەموو مرۆڤەکان تێیدا بەشدارن. باشە ئەگەر مرۆڤ دەستکردی مادده و سروشت بێت، ئەی ئەو ئیرادە و ئازادییەی لە کوێوە هێنا؟ ئەگەر مرۆڤ زادەی مادده و سروشت با، نەدەبوو ئیرادە و ویست و ئازادی هەبێت، ئەی کە هەیەتی لە کوێوەی هێنا؟ کەواتە ئیرادە و ئازادیش فیترین و خودا لەناو مرۆڤدا چاندوونی.

**پێنجەم:** هەستکردن بە ئامانجداری:

یەکێکی تر لە شتە فیترییەکان بریتییە لە هەستکردن بە ئامانجداری، بۆنموونە هەر کە فامی کردەوە، دەپرسێت: "لە کوێوە هاتووم؟ بۆ چی هاتووم؟ بۆ کوێ دەچم؟ من کێم؟ دەبێت چی بکەم؟ کێ ئەو گەردوونەی دورستکردووە؟ سەرەنجامی گەردوون چۆن دەبێت؟

کەواتە کێ ئەو ئامانجدارییە و ئەو پرسیارانەی لەناو ناخی مرۆڤدا چاند؟ ئایا مادده دەتوانێت ئەو پرسیارانە لەناو ناخی هەموو مرۆڤێکدا بچێنێت و بیگشتێنێت بەسەر هەموویاندا؟

بۆ دیارە مادده بۆ خۆی ئامانجدار و پرسیارکەرە؟ سروشت ئامانجی هەیە؟ تاوەکوو ئامانج بە مرۆڤ ببەخشێت ؟!

کەواتە هەر هەستی خوداناسی نییە کە فیتری و زگماکی و خوداپڕسکییە، بەڵکوو ئەوانەی کە باسمانکردن فیترین و سەرچاوەکەیان خودای پەروەردگارە، هەر بۆیەش ئەوانە هەموویان گشتین و پێویستیان بە فێرکردنیش نییە، کەواتە لێرەوە بۆمان دەرکەوت ئیمان شتێکی فیتری و زگماکییە و خودای گەورە لە ناوخۆی مرۆڤدا چاندوویتی وەک هەموو شتە فیترییەکانی تر.[٥]

بۆیە ئێستا ئێمە لێرەدا چەند شتێک باس دەکەین کە بە هیچ جۆرێک

پەیوەندییان بە ماددەوە نییە و لە دەرەوەی ماددەن:

١- ژیان

٢- ویست

٣- غەریزەکان

٤- ئامانج و مەبەست

٥- جوانیخوازی

٦- چاکەخوازی

٧- زانستخوازی

٨- خوداناسی

٩- ڕێکسازی

١٠- ڕێنموونی کردن

١١- ئەندازەگیری

١٢- وەڵامدانەوەی داواکاری

١٣- عەقڵ و هۆش

١٤- ڕقلێبوونەوە

١٥- ڕەوشت

١٦- شەرمکردن

١٧- فیداکاری

١٨- ئارامگرتن

١٩- تێگەیشتن

٢٠- دڵسۆزی

٢١- بڕیاردان

٢٢- هیوا

٢٣- پشت بەستن

٢٤- خۆنەویستی

٢٥- ئازار

٢٦- لێبووردەیی

٢٧- بەزەیی

٢٨- قەناعەت

٢٩- بیرکردنەوە

٣٠- خەمخۆری

٣١- جیددییەت

٣٢- حیکمەت و دانایی

٣٣- ئینتیما

٣٤- ڕێز

٣٥- کێبڕکێ

٣٦- زانست

٣٧- ئیرەیی

٣٨- عوجب (بەخۆسەرسامبوون)

٣٩- خۆبەگەورەزانی

٤٠- خراپەکاری

٤١- ترسنۆکی

٤٢- ئازایەتی

زۆر شتی تریش

ئایا ماددە ئەوانەی هەن؟! ئەگەر نییەتی -کە نییەتی- چۆن دەتوانێت بیانبەخشێت؟! کەواتە ئەوانەی نین و ناتوانێت بیانبەخشێت و نەشیتوانیوە، ئەی لە کوێوە هاتوون؟![1]

---

(١) بۆ هەموو بەڵگەکانی بوونی خودا بگەڕیوە بۆ هەردوو پەرتووکمان: ئیلحاد وەک خۆی. بوونی باڵا (٣٠) بەڵگەی عەقڵی، زانستی، لۆژیکی، فەلسەفی، زگماکی، لەسەر بوونی خودا.

# باس و خواسی خودا و خوایەتی (الالوهیة) لەلای فەیلەسوفان

باس و خواسی خودا و بیرکردنەوە لێی پەیوەست تەنیا بە فەیلەسووفان، بەڵکوو هەر لەسەرەتای هاتنەبوونی مرۆڤەوە، مرۆڤ بیری لەوە کردۆتەوە، کێ منی هێناوەتەبوون؟ کێ خاوەنی منە؟ کێ ئەم بوون و گەردوونەی خولقاندووە، بۆکوێ دەچم؟ بۆچی هاتووم؟ بۆ ...؟ بۆ ...؟

کەواتە باسی خوا پەیوەستە بە خودی مرۆڤەوە، جا زانا بێت یان نەزان، ئینجا پێغەمبەران یەکەم کەسێک بوون واتای خوایان بۆ خەڵک ڕوونکردووەتەوە لەژێر ڕۆشنایی وەحی و پەیامی خواییدا.

فەیلەسووفان و هی یۆنان بەتایبەتی، دوای ماوەیەکی زۆر هاتن و لەم بابەتەیان کۆڵییەوە، بەڵام دەتوانین بڵێین فەیلەسووفان و فەیلەسووفە یۆنانییەکان بەتایبەتی هاتن خستیانە ناو چوارچێوەیەکی فەلسەفییەوە، یەکەم کەسیش کە بەڕوونی باسی ئەو بابەتەی کردبێت، سوقرات بوو.

بەڵام لەکۆتاییدا ئەوەمان بیرنەچێت کە خودا زۆرجار لەلای فەیلەسووفان جیاوازە لە خودای ناو وەحی، خودای ناو وەحی ڕوونە و ئەوەی پێویستە لەبارەیەوە باسکراوە، بەڵام ئەوەی لای فەیلەسووفان جیاوازە، (ئەگەرچی لە هەندێک شتیشدا وەک یەک بن)، چونکە ئەوەی لای فەیلەسووفان لەکۆتاییدا تێگەیشتنی مرۆڤێکە بۆ خودا، خوداش شتێکی مێتافیزیکی ئەو سروشتە و شتێکی بەرهەستی ئەزموونکراو نییە، بۆیە زانست پێبوونی وا ئاسان نییە.

## خودا لەلای سوقرات

سوقرات یەکێک بووە لەو کەسانەی بەڵگەی هێناوەتەوە بۆ بوونی خودا، بڕوای تەواوی پێی بووە، پێی وابووە، خودا خودایەکی خێر و باشە، هیچ عەقڵێک ناتوانێت بگات پێی بەتەواوی، هیچ وەسفێکیش ناتوانێت وەسفی بکات، هیچ شتێکیش لەوەوە دەرناچێت مەگەر جوانی و باشی، بە هیچ شتێکیش لە دروستکراوەکانی ناچێت، نە لە قسە نە لە کردەوەدا، خودا تاکە و بێ هاوەڵە، ناگۆڕێت، پێویستە لەسەر مرۆڤ فەرمانەکانی خودا جێبەجێ بکات ئەگەرچی ماندوویەتی و ناڕەحەتیشی تێدابێت.[١]

سوقرات کە باسی خودا دەکات، باسی خودای تاکانە دەکات، یان باسی خودایەتی دەکات (الالوهیة) نەک (الالهة)، واتە ئەو باسی خواکان ناکات، چونکە بڕوای بە شیرک هاوبەش دانان نییە بۆ خودا، لەگەڵ ئەوەی سەردەمی ئەو سەردەمی شیرک و هاوبەشدانان بووە، چەندان خودای پەرستراو هەبوون. نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو سوقرات نەهیشی کردووە لە پەرستش بۆ بتەکان، هەرگیز نەکەوتووەتە ژێر هەژموونی شیرک و هاوبەش دانان.[٢]

کەواتە سوقرات بڕوای بە خودای تاکانە هەبووە و بەڵگەشی بۆ هێناوەتەوە و بەرگریشی لێکردووە و دژی شیریکیش وەستاوەتەوە.

## خودا لەلای ئەفلاتوون

ئەفلاتوون یەکەم فەیلەسووف بووە باسی لە خودا کردووە وەک بوونێکی سەربەخۆ لە بوون و گەردوون، واتە ئەو پێی وابووە خودا لەگەڵ ئەوەی هەیە

---

(١) الفلسفة اليونانية، محمد بيصار، ل ٨٢ – ٨٣.
في الفلسفة الاسلامية، د. محمد السيد نعيم، ل ٤٦.
(٢) عيون الأنباء في طبقات الأطباء، ابن أبي أصيبة، ١٧.

و هیچ گومانی تێدا نییە، ئینجا جیاوازیشە لە مادده و گەردوون، واتە شتێکە لەدەرەوەی گەردوون و مادده. پێش ئەفلاتوون فەلسەفە کورتهەڵاتبوو لە ڕاڤەی گەردوون و هەموو شتێکیان دەبردەوە لای مادده و واقیعی ماددی، بەڵام ئەفلاتوون پێی وایە خودا لەسەرووی ماددەوەیە، کەواتە خودا لەلای ئەفلاتوون بوونی هەیە.[١]

## بەڵگەی بوونی خودا

ئەفلاتوون دوو بەڵگەی سەرەکی دەهێنێتەوە لەسەر بوونی خودا:

١. بەڵگەی جووڵە، ئەفلاتوون پێی وایە جووڵە حەوت جۆرە

جووڵەی بازنەیی، جووڵەی ڕاست بۆ چەپ، چەپ بۆ ڕاست، لە پێشەوە بۆ دواوە، لەدواوە بۆ پێشەوە، لەسەرەوە بۆ خوارەوە، لەخوارەوە بۆ سەرەوە، جا جووڵەی گەردوون جووڵەیەکی بازنەیی و ڕێکخراوی ئەندازەگیراوە، ئەم جووڵەیەش ناکرێ لەخودی خۆیەوە بێت، بەڵکوو بەرهۆیە بۆ هۆیەکی عاقڵ کە خودایە و وای کردووە جووڵەی جیهان و گەردوون جووڵەیەکی بازنەیی بێت بەدەوری خۆیدا و وای کردووە لە شەش جۆرەکەی دیکەی جووڵە نەبێت و سیستەمەکە تێک نەچێت، کەواتە جووڵە و لەناویشدا جووڵەی بازنەیی و ڕێکخراو بەڵگەیە لەسەر بوونی خودا.

٢. بەڵگەی ڕێکسازی و سیستەم، واتە ئەم گەردوون و جیهانە هەمووی لەسەر سیستەم و ڕێکسازییەکی زۆر سەرسوڕهێنەر دەڕوات، کەواتە ناکرێت ئەم هەموو ڕێکسازییە لەخۆیەوە بێت، حەتمەن دەستەڵاتێکی زۆر گەورە و جوان لە پشتییەوەیە کە خودایە.[٢]

---

(١) فی تاریخ الفلسفة الیونانیة، د. محمد السید نعیم، ل ١٠٧ _ ١١٥.
الملل والنحل، الشهرستانی، ب٢ ل ١٤٦.

(٢) تاریخ الفلسفة الیونانیة، یوسف کرم، ل ٨١.

## سیفەتی خودا

ئەفلاتوون بڕوای وایە خودا تاکە، ڕێکساز و مشورخوری هەموو شتەکانە، ڕۆحێکی عاقڵە، یەک پارچە جوانی و خێر و دادگەری و تەواوی کەماڵە، جێگیرە و نەگۆڕە، ڕاستگۆیە و درۆ ناکات، شوێن و کات دەورەی نادەن، ئامادەیی بەردەامی هەیە، مشوورخۆری بوونەوەر و گەردوونە.

نەک هەر ئەوەندە بەڵکوو پێیوایە بوونی خودا و تەواویەکەی ئەوەندە بەڵگەنەویستە، نکۆڵی لێکردنی تاوانە و دەبێت دەوڵەت سزای بۆ دانێت، بۆیە پێی وایە هیچ گەلێک ناتوانێت بەهێزبێت هەتا بڕوا بەخودا دەهێنێت، ئینجا باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەبووە، چونکە پێی وابووە، باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی هێز و ئازایەتیمان پێدەبەخشێت لەبەرانبەر مردندا، هەتا ئەگەر وامان دانا، نە خودا هەیە و نە ڕۆژی دوایی، ئەوە لەکۆتاییدا هەر هیوا و خۆشەویستییە.[1]

کەواتە ئەفلاتوونیش وەک مامۆستاکەی (سوقرات) بڕوای بە بوونی خودا و سیفەتەکانی هەبووە.

## خودا لەلای ئەرستۆ

زۆرێک لە توێژەرانی فەلسەفە پێیان وایە ئەرستۆ بڕوادار بووە و بڕوای بە خودا هەبووە، ڕاستە ناتوانرێت نکۆڵی لەوە بکرێت کە ئەرستۆ باوەڕی بە شتێک هەبووە وەک زەرورەتێکی عەقڵی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خودایەی کە ئەرستۆ باسی دەکات جیاوازە لەو خودایەی وەحی و دین باسی دەکەن، چونکە ئەرستۆ پێی وایە خودا (جووڵێنەری یەکەمە) خودا جووڵێنەرە و خۆی ناجووڵێت

---

(١) قصة الحضارة، ویل دیورانت، ل ٣٨.
الفلسفة الیونانیة، محمد بیصار، ل ١٠٥ - ١٠٦.

و جێگیرە، ئەزەلی و ئەبەدییە، سەرەتا و کۆتایی نییە، دوورە لە هەموو نەقس و ناتەواوییەک، لێکدراو نییە و بەش بەش نییە، بێ پێویستە لە هەموو بوون و بوونەوەر، ئەم جوڵێنەری یەکەمە لە ڕووی کاتەوە لەپێش بوونەوەر و ماددەوە نییە، چونکە وەک باسمان کرد ئەرستۆ باوەڕی بە ئەزەلیبوون و بێسەرەتایی ماددە هەیە.[١]

## پەیوەندی خودا بە جیهان و بووونەوە

ئەرستۆ پێیوایە هیچ پەیوەندییەک لەنێوان خودا و گەردووندا نییە، جووڵاندنی خوداش جووڵاندنێکی حەقیقی و ڕاستەقینە نییە، بەڵکوو هەر ئەوەیە کە گەردوون تامەزرۆی خودا دەبێت و دەخرۆشێت و دەجووڵێت.[٢]

واتە خودا وەک «مەعقوول» و مەعشووق وایە، «مەعقوولە» چونکە عەقڵێکی ڕووتە، کارەکەشی عەقڵاندنە، مەعقوول و بیرلێکراوەکەش خودی خۆیەتی نەک شتێکی تر، چونکە خۆی تەواوترین شتەکانە و غەیری ئەو هەموو شتەکانی دیکە ناتەواون، کەواتە خودا بەس ئاگای لە خۆیەتی، خۆی عاقل و مەعقوول و عەقلە، واتە هەموویان یەک شتن.[٣]

## زانستی خودا

ئەرستۆ پێی وایە خودا زۆر گەورەترە لە گەردوون تاوەکوو زانستی بە گەردوون هەبێت، خودا تەواوی ڕەهایە ناکرێت زانستی بەشتێک هەبێت کە ناتەواوە! کەواتە بەس ئاگای لەخۆیەتی، چونکە هیچ شتێک لەخۆی کامڵتر نییە کە زانستی پێی هەبێت، پێی وایە ئەگەر زانستی بە شتێک هەبێت کە ناتەواوە کەواتە خۆشی ناتەواوە و کامڵ نییە! بۆیە بۆئەوەی خودا کامڵێکی ڕەها

---

(١) الفلسفة اليونانية، د. محمد بيصار، ل ١٣٠ _ ١٣١.

(٢) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم، ل ١٨١.

(٣) فى الفلسفة اليونانية، د. محمد السيد نعيم، ل ٧٤.

بێت، دەبێت دووربێت لە ناکامڵ و نابێت پەیوەندی پێوە هەبێت، بۆیە یاسا بەناوبانگەکەی دانا (عقل وعاقل ومعقول) واتە عەقڵێکی ڕەهایە، عاقلیشە، بەس تەعەقول و بیریش لەخۆی دەکاتەوە و بەس.(١)

هەر بەم هۆیەوە ئەرستۆ تووشی ڕەخنە و هێرشی زۆر بووەوە، هەم لەلایەن قوتابی و یارانی هەم لەلایەن نەیارەکانییەوە.(٢)

پەیدابووونی بوونەوەر لە خوداوە وەک پەیدابوونی گەرمییە لە ئاگر، یان ڕووناکییە لە خۆر، بەبێ زانستی ئاگر و خۆر، ئەمەش ئاوایە، واتە ئەم بوونە لە خوداوە پەیدا بووە بەبێ ویست و زانستی خودا.

گەردوون و ماددەش ئەزەلی و ئەبەدین، چونکە خودا ئەزەلی و ئەبەدییە، هۆ (العلة) ئەزەلی و ئەبەدییە، کەواتە بەرهۆش (المعلول) دەبێت ئەزەلی و ئەبەدی بێت، چونکە پەیوەستن بەیەکەوە، بەرهۆ دەمێنێتەوە تا هۆ مابێتەوە، «هۆ»یش هەر دەمێنێتەوە، کەواتە بەرهۆش دەمێنێتەوە بە ئەبەدی.

بەکورتی و بەکوردی، خودا لەلای ئەرستۆ جیاوازە لە تێگەیشتنە ئایینەکە و پێیوایە خودا هیچ پەیوەندییەکی بە بوونەوەرەوە نییە و زانستیشی پێی نییە و شتێکە عەقڵ داخوازی دەکات بەڵام تا ئەو شوێنەی عەقڵ دەیەوێت، دوایی هیچ ڕۆڵێکی نامێنێت و دەبێتە بوونێکی عەقڵی بێ کاریگەر و دوور لە بوونەوەر و گەردوون.

---

(١) فى الفلسفة اليونانية، د. محمد السيد نعيم، ل ٧٦.

(٢) فى الفلسفة اليونانية، د. محمد السيد نعيم، ل ٧٧.

## پوختەی تێڕوانینی ئیسلام بۆ خودا و پەیوەندی بە بوون و وجودەوە

١. دروستکار و بەڕێوەبەر و ئەندازەگیر و ڕێکخەر و ...ی گەردوون و بوون و بوونەوەر تەنیا یەکێکە کە خودای تاکانەیە، واتە یەک خودا هەیە لە هەموو ڕووەکانەوە بێ هاوەڵ و شەریکە لە هەموو ڕوویێکەوە، تەنیا ئەویش زاڵ و دەستەڵاتدارە بەسەر گەردووندا و لەژێر دەستەڵاتی خۆیدایە و هیچ شتێک لەژێر دەستەڵاتی ئەو دەرناچێت.

٢. بوون دروستکراوە و سەرەتای هەیە و خودای گەورە دروستی کردووە.

٣. لە بچووکترین بەشی گەردوونەوە تاوەکوو دەگات بە گەورەترین بەشی گەردوون دروستکراوی خوای گەورەیە، چونکە مرۆڤ ناتوانێت، گەردیلەیەکیش لە نەبوونەوە دروست بکات، کەواتە ئەگەر خودا دروستی نەکردبێت، لەکوێوە هاتووە؟!

٤. ڕێکخەر و ئەندازەگیر و بەڕێوەبەر و چاودێریکار و ...ە و بوون و گەردوون و بوونەوەر لەژێر دەستەڵاتی خوادایە، چونکە هەموو ئەمانە لەخۆیانەوە نابن و ناکرێت دروستکراو و دروستکەری نەبێت، ناکرێت ڕێکخراو ڕێکخەری نەبێت، ناکرێت ئەندازەگیراو ئەندازەگیری نەبێت، ناکرێت چاودێریکراو چاودێریکەری نەبێت، ناکرێت ...

٥. خودا بەرزترین نموونەی تەواوی و جوانی و ڕێکییە، وەسفدارە بە هەموو سیفەتێکی جوان و تەواو و گەورە (جمال، جلال، کمال).

٦. خودا دوورە لە هەموو ناتەواوییەک، لە هەموو ناشیرنییەک، لە هەموو پێویستییەک، لە هەموو کەموکوڕییەک.

٧. خودا هاووێنە و هاوشێوەی نییە، بێهاوتا و بێوێنەیە، هیچ شتێک لەو ناچێت و لە هیچ شتێکیش ناچێت.

٨. دروستکراوەکانی خودا دوو جۆرن، بینراو و نەبینراو، هەستپێکرا و هەستپێنەکراو.

**٩.** خودا مرۆڤ و گەردوونی بێهودە دروست نەکردووە، گەردوونی بۆ مرۆڤ دروستکردووە، مرۆڤیشی بۆ تاقیکردنەوە و بەهرەمەندبوون لە نیعمەتەکانی خودا و ئاوەدانکردنەوەی زەوی و ناسینی خودا دروستکردووە.

**١٠.** مرۆڤ و گەردوون و بوون و بوونەوەر وەک درستکراوی خودا، دەکرێت بخرێنە بەرباسی زانستی و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت، هەموو شتێکیش لەمانە قابیلی قسە لەسەرکردنن، لەکۆتاییدا ئەمانە هەموویان دروستکراوی خودان، ئیدی بۆ گەڕان بەدوایاندا و لێکۆڵینەوە لێیان دەیان دەقمان هەیە کە هانی ئەوە دەدات، بۆیە دەرگا لەسەر پشتە بۆ باس و خواسی زانستی، بەڵام زانستی بن، نەوەک نازانستی و بەزانستیکراو، وەک ئەوەی زۆرجار دێن بەناوی فیزیا و کیمیا و بایەلۆژی و گەردوونناسی و ... خودا لە باسەکان دەخەنە دەرەوە.

**١١.** گەردوون سەرەتا و کۆتایی هەیە و ڕۆژێک دێت کۆتایی پێدێت و مرۆڤیش ڕۆژێک دێت زیندوو بکرێتەوە و حیساب و کیتابی لەگەڵدا بکرێت.

# تیۆری فۆڕمەکان (ئایدیاکان)
# نظرية المثل (الصور والافكار)

بۆچی ئەفلاتوون ئەم تیۆریایەی هێنا؟

چونکە دوو تیۆری سەرەکی وابەستەن بە تیۆری فوڕمەکان، ئەوانیش تیۆری مەعریفە و تیۆری بوون (وجود)ن.

چونکە لەلای ئەفلاتوون زانست و مەعریفەی ڕاستەقینە بریتییە لە زانست بە (ماهيات) (حقائق) «ڕاستەقینەکان» بەو شتانەی ڕاستن و کەماڵ و تەواوی ڕەهایان هەیە، بۆنموونە زانستبوون بە (مرۆڤ، انسان) زانستە بە ماهییەت و حەقیقەتی مرۆڤ، نەک بە فڵان و فڵان ....، کەواتە مەعریفە کاتێک مومکینە کە ماهییەت و حەقیقەتی جێگیر هەبێت، ئەم ماهییەتە جێگیرەش کە ڕاستییەکی ڕەهایە لەم جیهانەدا بوونی نییە، بەڵکوو لە جیهانی فۆڕمەکاندایە، جیهانی (ئایدیاکان) المثل (الصور الافكار)، کەواتە ئێمە ئەگەر بمانەوێت بگەڕێیین بۆ ماهییەتی شتەکان، ئەوا لەم جیهانە ماددییەدا دەستمان ناکەوێت، چونکە ئەم جیهانە جیهانێکی ماددی ناقیس و ناتەواوە، بۆنموونە بگەڕێ بۆ ماهییەتی مرۆڤ، ئایا لە هەموو سەر زەوی دەتوانیت بیدۆزییەوە؟

کەواتە ئەوەی ئێمە لەم جیهانەدا دەیبنین بریتییە لە ئەفراد و تاکەکانی ئەم ماهییەتانە، نەک خودی ماهییەتەکان، چونکە هەموو شتێک لە جیهانی فۆڕمەکاندا ماهییەتی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەوەی ئێرە تەنیا فەرد و وێنە و نموونەی ئەم ماهییەتانەن، نەک خودی ماهییەتەکان.

کەواتە لە ڕووی تیۆری مەعریفەوە دەبێت جیهانی فۆڕمەکان هەبێت، کە

جیهانی ماهییەتی جێگیرە.

لەڕووی تیۆری بوون و وجودیشەوە، دەبێت جیهانی فۆڕمەکان هەبێت، چونکە ئەم جیهانە ماددییەی ئێمە بەردەوام لە جووڵە و گۆڕاندایە، ئەم گۆڕان و جووڵەیەش دەبێت ئامانجێکی هەبێت، کە بریتییە لە تاکانەیەکی جێگر، ئەم بوونە تاکە جێگیرەش بریتییە لە ماهییەت.

کەواتە لێرەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە تیۆری فۆڕمەکان لەسەر دوو کۆڵەکە وەستاوە

١. زانستی ڕاستەقینە

٢. بوونی ڕاستەقینە

کەواتە دوو ئامانج هەیە، گەیشتن بە زانستی ڕاستەقینە، گەیشتن بە وجودی ڕاستەقینە، هەردووکیشیان لەڕێی ئەم جیهانە ماددیە ناحەقیقییەوە بەدەست نایەت، بەڵکوو لە جیهانی فۆڕمەکان (ئایدیاکان)دا بەدەست دێت کە ماهییەتی هەموو شتێک لەوێیە.

فەلسەفەش ئەم دوو بەشە سەرەکییەیە (مەعریفە) و (وجود).

کەواتە مادام مەعریفەی حەقیقی هەبێت، کەواتە وجودی حەقیقیش هەیە، وە هەروەها مادام وجودی حەقیقی هەیە، کەواتە مەعریفەی حەقیقیش هەیە. کەواتە هەردووکیان پەیوەستن بەیەکەوە.

ئەم تیۆریایەی ئەفلاتوون بۆ گونجاندنی دوو ڕێبازەکەی پێش خۆی بووە

١. هێراکلیتۆس، کە پێی وابووە بوون لە گۆڕانی بەردەوامدایە.

٢. پارمێندیس، کە پێی وابووە بوون جێگیرە و تاکانەیە و واحیدە.

ئەفلاتوون هات وتی: بەڵێ ئەم بوونە جۆراوجۆرە، بەڵام ئامانجاکەی یەکە.

ئەم بوونە دەگۆڕێت و لەگۆڕاندایە، بەڵام ئامانجەکەی جێگیرە. جێگیری و تاکانەییش (وەحدەت) لە حەقیقەتدایە، حەقیقەتیش بریتییە لە ئایدیاکان و هەر لەویشدایە بەتەنیا، ئایدیاش بریتییە لە ماهییات.

کەواتە هەموو تیۆریاکەی ئەفلاتوون بۆ ڕاڤەی تیۆری زانین و بوون بوو.

بەڵام بێینە سەر ئەوەی ئایا ئایدیا یان فۆڕم خۆی چییە؟

چییەتی فۆڕمەکان

دوو ڕاڤە هەیە:

١. دەڵێت: ئەم فۆڕمانە بوونێکی ماددییان هەیە.

٢. دەڵێت: بوونی ماددییان نییە، بەڵکوو ئەفکارن لە عەقڵ و زانستی خوادا، یان لە عەقڵی مرۆڤدا، ئەوانە خوداناس بوون، پێیان بووە ئەم فۆڕمانە لە خودا یان زانستی خودادان، ئەوانەشی خوداناس نەبوون، پێیان وایە لە عەقڵی مرۆڤدان.

بەڵام ئەم ڕایە هەردووکیان ڕەخنەی زۆریان هاتە سەر، تاوەکوو گەیشتن بەوەی بڵێن ئەم جیهانی فۆڕمە، لە جیهانێکی بەرز لە جیهانی ماددەدایە، واتە لەسەروی ئەم جیهانە جیهانێکی تر هەیە کە ماهییەتی هەموو شتێکی تێدایە.

پەیوەندی ئەم جیهانە ماددیەش بە جیهانی فۆڕمەکان پەیوەندییەکی هاوبەشییە، ئەم پەیوەندییەش لە ڕێی عەقڵەوە دەبێت، واتە عەقڵ دەتوانێت لەم جیهانی فۆڕمە تێبگات.

### تایبەتمەندییەکانی فۆڕم (ئایدیا)

١. بوون سەربەخۆ، واتە بوونەکەیان سەربەخۆیە و لە غەیری خۆیانەوە وەریان نەگرتووە، واتە زاتی خۆیانە نەک لەدەرەوە بۆیان هاتبێت، بنەمای هەموو شتەکانن و هیچ شتێک بۆ ئەوان بنەما نیین، پشت بەهیچ شتێک نابەستن

لە غەیری خۆیان و شتەکان پشت بەوان دەبەستن، بناغە و بنەما و بنەڕەتی سەرەتای جیهان و بوونەوەر و گەردوون و بوونن.

٢. گشتین نەک تایبەتی، بۆنموونە مرۆڤ، مرۆڤێکی تایبەت نییە، بەڵکوو حەقیقەتە گشتییەکەی مرۆڤە، ئەو ماهییەت و حەقییەتە گشتییەی هەموو مرۆڤەکان تێیدا بەژدارن.

٣. ماددی نیین، بەڵکوو واتا و مانای موجەڕڕەد و ڕووتن، واتای ڕەهان، بوونێکی سەربەخۆیان هەیە و پەیوەست نیین بەهیچ عەقڵێکەوە، ئەوەی لە عەقڵدایە -ئەگەر بەڕاست بگەڕێت و هەڵەی نەکردبێت- ئەوە تەنیا وێنەیەکی شتە حەقیقییەکەیە، نەک خود و ماهییەت و حەقیقەتی شتەکە، کە هەرشتێک تۆ دەیبینی، ئەوە وێنە و سێبەر و سووڕەتی شتەکەیە لەم جیهانە نزمەدا، بەڵام ماهییەت و حیقەتەکەی لە جیهانی باڵادایە.

٤. هەموو شتێک یەک حەقیقەت و ماهییەتی هەیە و جۆراوجۆر نابێت، بەڵکوو ئەوەی جۆراوجۆری تێداڕوودەدات بریتییە لە ئەفراد و تاکەکانی ئەم تاک حەقیقەتە، واتە ماهییەت یەکە و ئەفراد جۆراوجۆر و زۆر، بۆنموونە مرۆڤ، یان مەڕ، یان مریشک، یان جوانی، یان نابووتی و ناشیرینی، یان ....، ئەمانە هەموو لە ماهییەت و حەقیقەتدا تاکانەن، بەڵام تاکەکانی دەگۆڕێت.

٥. نەمرن، نامرن و بەهەمیشەیی دەمێننەوە، ئەوەی دەمرێت تاکەکانە نەک ماهییەت و حەقیقەتەکان، بۆنموونە شتە جوانەکان دەمرن، بەڵام خود و حەقیقەت و ماهییەتی جوانی نامرێت، وەک پێناسەکان، پێناسەی مرۆڤ حەقیقەتێکی هەمیشەیی هەیە، کاریگەر نابێت بەو شتانەی بەسەر تاکەکانی مرۆڤدا دێن، واتە ئەوەی دەگۆڕێت نموونەی ئەم جیهانەن، نەک حەقیقەت و ماهییەتی جیهانی باڵا.

٦. جەوهەری شتەکانن، چونکە پێناسە سیفەتە جەوهەرییەکان دەگرێتەوە،

پێناسە بە جەوهەر دەکرێت، بۆنموونە ئەگەر بمانەوێت پێناسەی مرۆڤ بکەین، دەڵێین: زیندوویەکی بیرکەرەوەیە (حیوان مفکر)، واتە لێرەدا بیرکردنەوە (التفکیر) بنەما و جەوهەری مرۆڤە، بەڵام سیفەتە پەیدابووەکانی وەک ڕەنگ و شێوە ناچنە ناو پێناسەکانەوە، چونکە جەوهەر (الجوهر) نیین و عەرەزن (العرض).

٧. هەموو وێنەکانی کامڵ و تەواوی ڕەهان، بۆنموونە مرۆڤ، ئەو مرۆڤەی لە جیهانی فۆرم و ئایدیاکانە مرۆڤێکی کامڵ و تەواوە، بەڵام مرۆڤی ئەم جیهانە مرۆڤێکی ناکامڵ و ناتەواوە و وێنە باڵاکەی لێرە نییە.

٨. کات و شوێن و دەورەیان نادەن و گۆڕان و جووڵەیان بەسەردا نایەت، چونکە ئەگەر دەورەیان بدەن، دەبنە ماددی و موشەخخەس.

٩. مەعقوول و دەرپێکراون، واتە عەقڵ لەڕێی بەدوداچوون و لێکۆڵینەوە دەتوانێت دەرکیان بکات.[1]

ئەرستۆ ئەم تیۆرییایەی ئەفلاتوون بۆ سێ سەرچاوە دەگەڕێنێتەوە:

**١.** هێراکلیتۆس، کە پێی وابووە بوون لە گۆڕانی بەردەوامدایە، هاتووە ئەمەی بڕاندووە بەسەر شتە بەرهەست و هەستپێکراوەکان، وەک ئەوەی وتراوە: مرۆڤ دووجار لە ئاوێکدا مەلە ناکات.

**٢.** ئیلیییەکان، کە پێیان وابوو (الوجود الطلق) بوونی ڕەها هەیە، هاتووە ئەمەشی سەپاندووە و بڕاندووە بەسەر فۆڕمەکاندا.

**٣.** سوقرات، کە پێی وابووە درکپێکراوە عەقڵییەکان (المدرکات العقلیه) بوونیان هەیە.

کەواتە مادام فۆڕمەکان نەگۆڕ و بەردەوام و نەمرن، هەر ئەوانن سەرچاوەی

---

(١) قصة الفلسفة اليونانية، د. أحمد أمين وزميله، ل ١٥٦، ١٥٧.

زانین و مەعریفەی حەقیقی، نەک ئەم جیهانە ماددیە بەرهەستە کە بەردەوام لەگۆڕاندایە و دەفەوتێت و کۆتایی پێدێت، لەم جیهانەدا هیچ شتێک نابینیت لە دووکاتی بەدوای یەکدا بەردەوام بێت و یەک شت بێت، بۆنموونە ئەو ڕووبارەی خۆتی تێدا دەشۆی، لە هەموو چرکەیەکدا دەگۆڕێت، ئەو ئاوەی ئێستا مەلەی تێدا دەکەی جیاوازە لەگەڵ ئاوی دوای دوای چرکەیەکی دواتر، کەواتە ئەم جیهانە بەردەوام گۆڕاوە نابێتە سەچاوەیەکی تەواو بڕواپێکراو بۆ زانین و زانست و مەعریفە، چونکە بەردەوام لەگۆڕاندایە، مەرجیش بۆ مەعریفە نەگۆڕییە، تاوەکوو عەقڵ بتوانێت دەرکی بکات.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناتوانین بڵێین ئەم جیهانە بەرهەستە تەواو تەواو نەزانراوە و ناتوانین پێی بگەین، وەک سوفستائییەکان دەیڵێن، بەڵکوو دەتوانین بڵێین ئەم جیهانەی ئێمە وێنای جیهانی فۆڕمەکان دەکات، جا چەند نزیک بێت لە فۆڕمەکان، ئەوندە نزیکە لە حەقیقەت، چونکە فۆڕمەکان حەقیقەت و ماهییەتی شتەکانن.

بەپێی قسەکانی ئەفلاتوون بێت هەموو شتێک وێنەی ئەسڵی خۆی هەیە لە جیهانی فۆڕمەکاندا و کورتهەڵنەهاتووە بەس لەسەر شتە عەقڵییەکانی وەک جوانی و دادگەری و خێر و ...، یان بەس شتە جسمانی و ماددییەکانی وەک دار و بەرد و ئەسپ و ...، یان سیفەتەکانی وەک سپی و ڕەش و سوور و شین ...، بەڵام هەموو شتێک دەگرێتەوە، وەک سفرە و کورسی و قەنەفە و جلوبەرگ و ...، نەک هەر ئەمانە بەڵکوو شتە نابووت و خراپەکانی وەک ستەم و پیسی و ... بوونیان هەیە.

کەواتە بەکوردی و بەکورتی جیهانی ئایدیاکان و فۆڕمەکان (عالم المثل) لەلای ئەفلاتوون واتە: ئەم جیهانە بەرهەست و سروشتەی ئێمە، نوسخەیەک و کۆپییەک و وێنەیەک و ڕەنگدانەوەی جیهانی ئایدیاکانە، بۆیە هەر شتێک

ئێمە دەیبینین و هەستی پێدەکەین، ئەوە وێنە و ڕەنگدانەوەی ئەو شتەیە کە لە جیهانی ئایدیاکانە، واتە لە جیهانی ئایدیاکاندا هەموو شتێک وێنەی حەقیقی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەوێ شوێنی ماهییەت و حەقیقەت و بنەمای شتەکانە، هی ئەم دونیایە تەنیا کۆپی و نوسخەیەک و سێبەر و ڕەنگدانەوەی ئەوێیە و بەس.[١]

ئامانجەکەشی -وەک باسمان کرد لە سەرەتادا- بۆ سەلماندنی مەعریفە و وجودی حەقیقی بوو.

**تیۆریای فۆڕمەکان لە فکری ئیسلامیدا**

لە فکری ئیسلامیدا ئەگەر سەیری بکەین، بە شێوەیەکی جیاوازتر ئەوە دەبینین، بۆنموونە «لەوحولمەحفوز»، کە هەموو شتێکی تێدا تۆمارکراوە و بنەمای هەموو شتێک لەوێدایە.

هەروەها لەلای ئیبن عەرەبیش شتێک بوونی هەیە بەناوی (الاعیان الثابتة) واتە شتە جێگیرەکان، لای ئەویش بوون لەسەرەتا نەبووی ڕەها نەبووە، وجودیش نەبووە، بەڵام بەشی ئەوەندە بووە کە (کن فیکن) پێ بوترێت، واتە شتێک بووە بەڵام ناتوانین بڵێین وجودی هەبووە بە حەقیقی، بەڵام ناشتوانین بڵێین نەبووی ڕەها بووە، چونکە نەبووی ڕەها فەرمانی پێناکرێت.

یان جیهانی ئەمر و جیهانی خەلق (الامر والنهی)، ئەوانیش جۆرێک لەو شتەیان تێدایە.

یان ئەو پەیمانەی کە قورئان باسی دەکات، کە پێش هاتنەبوونی مرۆڤایەتی

---

(١) قصة الفلسفة اليونانية، د. أحمد أمين وزميله، ل ١٥٦، ١٥٧.
تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم، ل ٧٤.
مع الفلسفة اليونانية، د. محمد عبد الرحمن مرحبا، ل ١٣٢.
تمهيد للفلسفة، د. محمد زقزوق، ل ٢٤٤.

لە مرۆڤ وەرگیراوە.

لەکۆتاییدا ئەم شێوازەی کە ئەفلاتوون باسی کردووە، ناگونجێت لەگەڵ فکر و بیروباوەڕی ئیسلامی، ئەگەرچی لە هەندێک شتیشدا بەم شتانەبچێت کە باسمانکردن، چونکە ئەم جیهانە لەلای ئەفلاتوون جیهانێکی ئەزەلی و ئەبەدییە و کات و شوێنی نییە و ...، ئەم سیفەت و تایبەتمەندیانەی ئەفلاتوون باسی لێوەکردوون تەنیا بۆ خودا ڕاستن، نەک بۆ شتێکی تر، کەواتە ئەگەر ئەمانە بە زانستی خودا لێک بدرێنەوە، ئەوە شتێکی ترە، بەڵام ئەگەر وانەبێت، بەهیچ شێوەیەک ناگونجێت لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامی، چونکە ئەم تایبەتمەندی و سیفەتانە تەنیا هی خودان، نە شتی دیکە.

# تیۆری هەڵڕژان (سەرڕێژ) (دە عەقڵەکان) (نظرية الفيض)

تیۆری هەڵڕژان «سەرڕێژ» یان «دە عەقڵەکان» یەکێکە لە تیۆریە خەیاڵییەکان، ئەم تیۆرییە لە بنەڕەتەوە بۆ ئەوە پەیدابووە کە ڕاقەی دروستبوون و پەیدابوونی گەردوون بکات، ئایا ئەم گەردوونە چۆن پەیدابووە لە خواوە؟ یان خودا چۆن ئەم بوونەوەرەی هێناوەتە بوون؟ بوونەوەر و گەردوون چۆن پەیوەستە بەوەوە؟ چۆن دەیانفامێت؟ پەیوەندی خودا و بوونەوەر چۆنە و چۆن بووە؟ چۆن ئەم خودا کامڵە پەیوەستە و پەیوەندی هەیە بەم جیهان و بوونەوەرە ناکامڵە؟

بەڵام پرسیارە سەرەکییەکە ئەمەیە کە ئەم بوونەوەرە زۆرە چۆن پەیدابووە لە خودایەکی تاکانە؟ یان دەبێت بڵێین بوونەوەر یەکێکە و یەکە و خودا زۆرە و زۆرن، یان دەبێت بڵێین خودا یەکە و تاکە و تاکانەیە و جیهان و بوونەوەر زۆر و زەبەندە. بەدڵنیاییەوە دەبێت بڵێین خودا یەکێکە و بوونەوەر زۆرە، بەڵام کە وامان گووت، ئینجا پرسیارە جەوهەرییەکە دێتە ئاراوە، ئایا ئەم بوونەوەرە زۆرە چۆن پەیدا بووە لەم تاکە خودایە، چونکە لای ئەم فەیلەسووفانە یەک تەنیا یەکی لێوە پەیدا دەبێت، ئێ بوونەوەریش زۆرە و خوداش یەکە، کەواتە ئەم زۆرە چۆن لەم یەکە پەیدا بوو؟ لەکاتێکدا ئێمە وتمان نابێت زۆر لە یەکەوە دەربچێت.

ئەم تیۆرییە ئەرستۆ بناغەکەی داناوە، بەڵام دواتر «ئەفلۆتین» هات و زیاتر گەشەی پێدا، دوایی لە فەلسەفەی ئیسلامیدا فاڕابی هات و تەواو تەواو گەیاندییە لوتکە.

ئەرستۆ پێی وایە خودا زۆر گەورەترە لە گەردوون تاوەکوو زانستی بە گەردوون هەبێت، خودا تەواوی ڕەهایە ناکرێت زانستی بە شتێک هەبێت کە ناتەواوە! کەواتە بەس ئاگای لە خۆیەتی، چونکە هیچ شتێک لە خۆی کامڵتر نییە کە زانستی پێی هەبێت، پێی وایە ئەگەر زانستی بە شتێک هەبێت کە ناتەواوە، کەواتە خۆشی ناتەواوە و کامڵ نییە! بۆیە بۆئەوەی خودا کامڵێکی ڕەها بێت دەبێت دوور بێت لە ناکامڵ و نابێت پەیوەندی پێوە هەبێت، بۆیە یاسا بەناوبانگەکەی دانا (عقل وعاقل ومعقول) واتە عەقڵێکی ڕەهایە، عاقلیشە، بەس تەعەقول و بیریش لەخۆی دەکاتەوە و بەس.

پەیدابووونی بوونەوەر لە خوداوە وەک پەیدابوونی گەرمییە لە ئاگر، یان ڕووناکییە لە خۆر، بەبێ زانستی ئاگر و خۆر، ئەمەش ئاوایە، واتە ئەم بوونە لە خوداوە پەیدابووە بەبێ ویست و زانستی خودا.

ئەرستۆ پێی وایە هیچ پەیوەندییەک لە نێوان خودا و گەردووندا نییە، جووڵاندنی خوداش جووڵاندنێکی حەقیقی و ڕاستەقینە نییە، بەڵکوو هەر ئەوەیە کە گەردوون تامەزرۆی خودا دەبێت و دەخرۆشێت و دەجووڵێت.

واتە خودا وەک «مەعقوول» و مەعشوق وایە، «مەعقووله» چونکە عەقڵێکی ڕووتە، کارەکەشی عەقڵاندنە، مەعقوول و بیرلێکراوەکەش خودی خۆیەتی نەک شتێکی تر، چونکە خۆی تەواوترینی شتەکانە و غەیری ئەو هەموو شتەکانی دیکە ناتەواون، کەواتە خودا بەس ئاگای لە

خۆیەتی، خۆی عاقل و مەعقوول و عەقلە، واتە هەموویان یەک شتن.

**ئەرستۆ بەم شێوەیە ئەم بابەتە ڕووندەکاتەوە:**

ئاسمانەکان پێیانخۆش بوو ئەوەندەی دەکرێت وەک جولێنەری یەکەم (خودا) بژین، بەڵام ناتوانن، چونکە ئەوان ماددین و خودا نامادد‌ی، بۆیە هاتن

خۆیان چواند بەو و جووڵان بە جووڵانێکی بازنەیی بەردەوام، لەم جووڵەیەش گەردوون دروست بوو!

کەواتە بەم شێوەیە بنەڕەتی ئەم بنەمایە دەگەڕێتەوە بۆ ئەرستۆ، ئەو بەردی بناغەی ئەم تیۆریا خەیاڵییە هۆنراوەییەی دانا، چونکە ئەم جۆرە لە ڕاڤە بۆ خودا و گەردوون و بوونەوەر بە هەستێکی شاعیرانە و شیعری دەچێت تاوەکوو ئەوەی بە فەلسەفە بچێت.

بۆیە لێرەوە بۆمان دەرکەوت ئەم بابەتی دروستبوون و دروستکردنی گەردوونە هەر لەکۆنەوە بیر و هۆشی فەیلەسووفانی سەقاڵ کردووە و نەیانزانیوە چۆن ڕاڤەی دروستکردنی ڕاستەوخۆی گەردوون بکەن لەلایەن خوداوە.

کێشەی گەورەی ئەرستۆ لەوەدابووە کە خودای کورتهەڵێناوە لە جووڵاندن و جووڵە، ئەم جووڵەیەش جووڵەیەکی زەرووری و لائیرادی و بێ ویستی خۆی بووە، واتە شتێک نەبووە بە ئیرادە و ویستی خۆی کردبێتی، بەڵکوو وەک گەرمییە لە ئاگر، یان ڕووناکییە لە خۆر، بەبێ زانست و ویست و ئیرادەی ئاگر و خۆر، ئەمەش ئاوایە، واتە ئەم بوونە لە خوداوە پەیدابووە بەبێ ویست و زانستی خودا، ئەوەی هەبووە پەیدابوونێکی بێ ویستی بێ زانست بووە، وەک شتێکی زەروری!

بەم بیرۆکەیە بەم شێوەیە سەری هەڵدا، تاوەکوو ئەفلۆتین (سۆفی و فەیلەسووفی میسری) هات و کردی بە تیۆرێکی فەلسەفی قووڵتر.

ئەفلۆتین وتی: خودا کامڵە و لە هەموو ڕوویێکەوە تەواوە و بێ کەموکوڕییە، خودا (عقل وعاقل ومعقول)ە، خودا کە لەخۆی ڕاماوە و فکریوە و تەعەقولی لەخۆیدا کردووە، بەبێ ویست و ئیرادەی خۆی عەقڵی گشتی (القعل الكلى) لێوە دەرچووە و پەیدابووە، عەقڵی گشتیش لەخۆیی و زاتی خودا ڕاماوە و فکریوە و تەعەقولی کردووە، کە لە زاتی خودا ڕاماوە و فکریوە و تەعەقولی کردووە، نەفسی

گشتی (النفس الكليه) لێوه دەرچووه و پەیدابووه، نەفسی گشتیش وشە و کرداری عەقڵی گشتییە، ئەم نەفسە گشتییەش لەو عەقڵە گشتییەوە پەیدابووە و تەعەقول لەودا دەکات، بەهۆی ئەم تەعەقول و تێفکرینەوە بوونەوەری خوار خۆی دێنەبوون، لەوەوە نەفسە جوزئییەکان هەڵدەڕژێن و هەموو بوونەوەرەکان (ئاژەڵ، زەوی، ئاسمانەکان، ئەستێرە و هەسارەکان) دروست دەبن، ئینجا سیستەم و ڕێساشیان بۆ دادەنێت و جووڵەیەکی بازنەییش دەدات بە هەموو بوونەوەر.

کەواتە کۆی ئەم بوونەکان چوارن

الأول الواحد: یەکەمی تاک

العقل الكلي: عەقڵی گشتی

النفس الكلية: نەفسی گشتی

الموجودات المادية: بوونەوەرە ماددییەکان

کەواتە لێرەوە ئەوەمان بۆ دەرکەوت، کە ئەم هەموو هێنان و بردنە هەمووی بۆ ئەوە بووە کە ئەم یاسایە جێبەجێ بکەن کە دەڵێت: (الواحد لا يصدر منه إلا واحد) واتە: "یەک تەنیا یەکی لێوە دەردەچێ و پەیدادەبێت." کەواتە خوداش کە یەکە تەنیا یەک شتی لێوە پەیدابووە کە عەقڵی گشتییە، ئینجا دوایی بە زنجیرە شتەکانی تر پەیدابوونە، تاوەکوو گەیشتووە بە بچووکترین شتە ماددییەکان.

بەحیسابی خۆیان بەم تیۆریایە وەڵامی ئەوەیان داوەتەوە و کێشەی ئەوەی کە ئەم هەموو بوونەوەرە چۆن هاتوونە بوون لە یەک خودای تاقانە، واتە چۆن دەبێت زۆر لە یەکەوە دەربچێ و بێتەبوون.

بەم پێیە لە کۆتاییدا هەمووی دەبێتەوە یەک شت، چونکە بوونەوەرە ماددییەکان هەموویان لەکۆتاییدا دەبنەوە یەک شت و دەچنەوە سەر یەکەمی

تاقانە (الواحد الأول) کە خودایە، واتە هەموویان دەچنەوە سەر ئەو و لەودا دەتوێنەوە، وەک چۆن هەڵم لە ئاوەوە پەیدا دەبێت، پاشان دەبێتەوە بە ئاو، بەم شێوەیەش هەموو بوونەوە لە خوداوەیە و هەمووشی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، کەواتە لەوەوە وای لێدێت بڵێین یەکێتی بوون (وحدة الوجود) پەیدا دەبێت.

لەکۆتاییدا دەتوانین ڕای ئەفلۆتین بەم شێوەیەی کە خۆی وتووەتی کورتی بکەینەوە: بیرکردنەوەی خودا لە خودی خۆیی و کەمالی و تەواوییەکەی، هەڵڕژانی (فیض) لێوە پەیدابوو، ئەم هەڵڕژانە بوو بە جیهان و گەردوون و بوونەوەر، چۆن بڵێسە ڕووناکی لێوە پەیدادەبێت و ئاگریش گەرمی، چۆن ئاو هەڵقووڵانی لێوە پەیدا دەبێت و بەفریش ساردی، ئا بەم شێوەیەش تیشک و ڕووناکییەک لە خوداوە پەیدابوو کە گەردوون و بوونەوەرە.

لەپاش ئەرستۆ و ئەفلۆتین، کە بەردی بناغەی ئەم بیرۆکە و تیۆریایەیان دانا، فارابی و ئیبن سینا هاتن و ئەم تیۆریایەیان بۆ تیۆریایەکی تر بەکار هێنا، کە دەتوانین بڵێین ڕێک کۆپی تیۆریای ئەمانە بەڵام بە شێوازێکی دیکە، ئەمیش تیۆریای «دە عەقڵەکان» (العقول العشرة).

بەڵام لەکۆتاییدا ئەم تیۆریایەش بۆ ئەوە بووە تا ئەم یاسایە جێبەجێ بکەن کە دەڵێت: (الواحد لا يصدر منه إلا واحد) واتە: "یەک تەنیا یەکی لێوە دەردەچێو پەیدادەبێت." کەواتە خوداش کە یەکە تەنیا یەک شتی لێوە پەیدابووە و دوایی وردەوردە شتەکانی دیکە پەیدابوونە.

## پوختەی دە عەقڵەکان لای فارابی

عەقڵی یەکەم (عقل وعاقل ومعقول)ە، فەیز و هەڵڕژانەکەی بەم شێوەیە بووە:

عەقڵی یەکەم کە تەعەقولی کردووە ئەمانەی بە پلەبەندی و زنجیرە بەدوادا هاتوون.

عەقڵی دووەم: ئەستێرە جێگیرەکان

عەقڵی سێیەم: زوحەل

عەقڵی چوارەم: موشتەری

عەقڵی پێنجەم: مەریخ

عەقڵی شەشەم: خۆر

عەقڵی حەوتەم: گەلاوێژ

عەقڵی هەشتەم: عەتارید

عەقڵی نۆیەم: مانگ

لە عەقڵی نۆیەمەوە فەیز و هەڵڕژانی جسم و تەن و ماددە ئاسمانییەکان دەوەستن.

عەقڵی دەیەم: عەقڵی کارا یان ڕۆحی پیرۆز، جوبرائیل

لەعەقڵی دەیەمدا فەیز و هەڵڕژانی ناماددی و عەقڵی دەوەستێت.

ئەم عەقڵی کارایە بەرپرسیارە لەم جیهانەی کە ئێمەی تێدا دەژین، کە پێی دەوترێت جیهانی ژێر مانگ[1].

---

(١) دروس في الفسفة الإسلامية، د. حسن الشافعي، د. عبد الحميد مدكور، ل ١٣١ _ ١٤١.
قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين السيد صالح، ل ٢١٧ _ ٢٢١.

## تیۆریای هەڵڕژان لە تەرازووی عەقڵ و نەقڵدا

تیۆریای هەڵڕژان کە بناغەی لە ئەرستۆوە هاتوو، لەسەر دەستی ئەفلۆتین و فارابی و ئیبن سینا گەیشتە لوتکە، هیچ بنەمایەکی نەقڵی وەحی و عەقڵی زانستی لۆژیکی نییە، تەنیا خەیاڵ و تەئویلێکی بووە، بۆ خۆڕزگار کردن لە تێکگیران لە یاسایەکی دانراوی خۆیان (الواحد لا يصدر منه الا واحد) واتە: یەک تەنیا یەکی لێوە دەردەچێت و پەیدادەبێت. ئەم یاسایەش هیچ بنەمایەکی عەقڵی و نەقڵی نییە، چونکە:

١. چۆن دەکرێت خودا زانست و ئیرادە و ویست و ... هتد، نەبێت؟!

٢. ئەم خودایە چ جۆرە خودایەکە کە هیچ دەسەڵات و ویست و زانستێکی نییە لە بەرانبەر ئەم دروستکراوانەدا و هەموویان بە ویستی ئەو هاتبنە بوون؟!

٣. ئەم سەرڕژ و هەڵڕژانە (فيض)، بۆ لەم سنوورەدا وەستا و تاوەکوو عەقڵی دەیەم بەردەوام بوو؟! چ ڕێگرییەک هەیە بۆ ئەوەی هەر بەردەوام بێت.

کەواتە بە هیچ شێوەیە هیچ بنەمایەکی عەقڵی و نەقڵی نییە، خودا زانست و ویست و ئیرادەی ئەزەلی و ڕەهای هەیە، هیچ شتێکیش بێ ویست و زانستی ئەو ڕوونادات.

# نەفس و فكر و ڕۆح و پەیوەندییان بە ماددەوە

نەفس یان ڕۆح لەگەڵ ئەوەی خودی مرۆڤن و نزیکترین شتن لێیەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قورسترین و ناڕوونترین بابەتن لەلای مرۆڤ، هەربۆیە زۆرێک لەسەرچاوەکان باس لەوە دەکەن کە ڕا و قسەی زانایان دەربارەی ڕۆح و نەفس گەیشتووە بە هەزار ڕا و بۆچوون و قەول! بەڵام هێشاش شاراوەترین شتێکە بە نسبەت مرۆڤەوە، هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموویێت: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا}(١)

پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح (کە چییە و چۆنە؟) بڵێ: ڕۆح بەشێکە لە فەرمانی پەروەردگارم و بەدەست ئەوە (من نازانم چییە و چۆنە) و هیچتان پێ نەبەخشراوە لە عیلم و زانست تەنیا شتێکی کەم نەبێت.

زانایەکی وەک ئێلکەسس کاریل، کە تەمەنی خۆی لە ناسینی مرۆڤ و خانەکانیدا سەرف کرد، بەڵام لەکۆتاییدا گەیشت بەوەی بڵێت: ئێمە تەنیا چەند لایەنێکی مرۆڤ درک دەکەین و زۆر لایەن هەیە نەزانراوە و دەرک ناکرێت!

زانایان زۆر بەدوای ئەم بابەتەوە ڕۆیشتوون، بەڵام لەکۆتاییدا ئەنجامەکەی ئەوە بووە کە گەیشتوون بە هەندێک شتی سنووردار دەربارەی مرۆڤ، نەوەک هەموو بەشەکانی ....

هەربۆیە هەر لەکۆنەوە فەیلەسووفان بوون بە دوو بەشەوە:

١. ماددییەکان، ئەوانە پێیان وایە مرۆڤ تەنیا ماددەیە و شتێک نییە لەدەرەوەی

---

(١) الإسراء ( ٨٥ ).

مادده پێی بوترێت ڕۆح یان نەفس.

٢. نامادديیەکان، ئەمانە بڕوایان بە شتێکی ناماددی هەیە لەدەرەوەی لایەنە ماددییەکەی مرۆڤ، بۆنموونە سوقرات، ئەفلاتوون، ئەرستۆ، دیکارت، ...

**ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆح و نەفسیش هەیە دوو جۆرن:**

١. بۆ تێگەیشتن لە نەفس و ڕۆح دەگەڕێنەوە بۆ نەقڵ و وەحی و ئایین.

٢. بۆ تێگەیشتن لە نەفس و ڕۆح ناگەڕێنەوە بۆ نەقڵ و وەحی و ئایین، بەڵکوو دەگەڕێنەوە بۆ تێگەیشتنی خۆیان.

**دەربارەی ئەزلیبوونی ڕۆح دوو ڕا هەیە:**

١. دەڵێت: ڕۆح و نەفس ئەزەلین و هەر هەبوون.

٢. ڕۆح و نەفس پەیدا بوونە و ئەزەلی نیین.

**دەربارەی سەرەنجامی ڕۆح و نەفسیش دوو ڕا هەیە:**

١. نەفس و ڕۆح دەمرن و دەفەوتێن.

٢. نەفس و ڕۆح نامرن و نافەوتێن.

**دەربارەی شوێنی ڕۆح و نەفس دوای مردن دوو ڕا هەیە**

١. ڕۆح و نەفس دەچنە ناو جەستەیەکی دیکەوە، جا جەستەی ئاژەڵ بێت یان مرۆڤێکی دیکە.

٢. ڕۆح و نەفس ناچنە ناو جەستەی هیچ شتێکی دیکەوە، نە مرۆڤێکی دیکە، نە هیچ شتێکی دیکە، بەڵکوو تایبەت دەبێت بە خودی کەسەکان خۆیان.

## دەربارەی زیندووکردنەوەی نەفس و ڕۆحەکان

١. نەفس و ڕۆح زیندوو دەکرێنەوە و حیسابیان لەگەڵدا دەکرێت.

٢. نەفس و ڕۆح زیندووناکرنەوە و حیسابیان لەگەڵدا ناکرێت.

## دەربارەی چۆنیەتی زیندووکردنەوەی ڕۆح و نەفس

١. نەفس و ڕۆح دێنەوە گەڵ جەستە و لەگەڵیدا یەک دەگرنەوە.

٢. نەفس و ڕۆح بەتەنیا زیندوو دەکرێنەوە و نایەنەوە گەڵ جەستە.

## هەڵوێستی فکر و عەقیدەی ئیسلامی لە بارەی نەفس و ڕۆحەوە

١. نەفس ئەزەلی نییە - وەک ئەفلاتوون دەیڵێت و لە بۆچوونەکانی ئەرستۆش دەفامرێتەوە، چونکە ئەرستۆ پێی وایە شتێک نییە کە لە نەبووی ڕەهاوە هاتبێتە بوون، کەواتە نەفس و ڕۆحیش ئەزەلین - چونکە بەس خودایە کە ئەزەلی بێت، نەوەک شتی دیکە، کەواتە نەفسیش وەک هەموو شتەکانی دیکە هاتووەتە بوون و ئەزەلی نییە.

٢. ڕۆح نامرێت - وەک ئەرستۆ دەیڵێت - ئەوەی دەمرێت جەستەیە نەک ڕۆح، واتە ڕۆح دەمێنێتەوە و دوایی جارێکی دیکە دێتەوە ناو هەمان جەستە.

٣. هیچ ڕۆحێک ناچێتە ناو جەستەیەکی غەیری خۆی - وەک ئەفلاتوون و دەیان و سەدانی تر بڕوایان پێیەتی و دەڵێن: ڕۆحگۆڕکێ هەیە، واتە کە لەم جەستەیە هاتە دەر، دەچێتە جەستەیەکی دیکەوە - کەواتە هەموو کەسێک خاوەنی ڕۆحی خۆیەتی.

٤. ڕۆح و جەستە بەیەکەوە دێنەوە و جەستە کە زیندوودەکرێتەوە، ڕۆحی لەگەڵە و ڕۆژێک دادێت حیساب و لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت.

٥. ڕۆح یەکێکە لە نهێنییەکان و کەمترین شتی لەبارەوە دەزانین، ﴿وَيَسْأَلُونَكَ

عَنِ الرُّوحِ ۖ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾[1].

«پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح (کە چییە و چۆنە؟) بڵێ: ڕۆح بەشێکە لە فەرمانی پەروەردگارم و بەدەست ئەوە (من نازانم چییە و چۆنە)و هیچتان پێنەبەخشراوە لە عیلم و زانست تەنیا شتێکی کەم نەبێت.

## زیندووبوونەوەی دوای مردن

زیندوبوونەوە یەکێکی ترە لە پرسە ناکۆکی لەسەرەکان، ئێمە لێرەدا لە دوو ڕووەوە باسی دەکەین:

**یەکەم:** زیندووبوونەوە لای ئیمانداران و غەیری ئیمانداران.

**دووەم:** حەقیقەتی زیندبوونەوە چۆنە؟

### یەکەم: زیندووبوونەوە لای ئیمانداران و غەیری ئیمانداران

لەم بارەیەوە چەند ڕایەکمان هەیە:

**١.** زیندبوونەوە بە هیچ جۆرێک بوونی نییە، نە بە جەستە نە بە ڕۆح، واتە مرۆڤ کە مرد ئیدی تەواو. ئەمە ڕای بەشێک لە فەیلسووفانی کۆن و نوێیە لەگەڵ بەشێکی زۆری عەرەبی سەردەمی جاهیلی و ماددییەکان و مولحیدەکان.

**٢.** زیندووبووونەوە بەس بە ڕۆحە و جەستەی لەگەڵ نییە، واتە بەس ڕۆحی زیندوو دەبێتەوە بەبێ جەستە. ئەوەش ڕای بەشێک لە فەیلەسووفە موسڵمانەکانە، وەک فاڕابی و ئیبن سینا.

**٣.** زیندووبوونەوە بەس بۆ جەستەیە بەبێ ڕۆح. ڕای بەشێکە لە زانایانی کەلام.

**٤.** زیندووبوونەوە بۆ ڕۆح و جەستەیە بەیەکەوە. ئەمە ڕای سەلەفیەت و ئەهلی

---

(١) الاسراء ( ٨٥ ).

حەدیس و زۆرێک لە زانایانە.

هەر یەک لەمانەش بەڵگەی خۆی دێنێتەوە، بەڵام لەبەر درێژبوونەوە باسیان ناکەین.

**حەقیقەتی زیندووبوونەوە**

زیندبوونەوە حەقیقەتی خۆی هەیە، بەڵام ڕاجیایی هەیە کە ئایا ئەم زیندووبوونەوەیەی کە هەیە چۆنە؟

١. زیندووبوونەوە بۆ حەقیقەتی مرۆڤ خۆیەتی، نەک بۆ بەش بەش و دانە دانەی ئەندام و بەشەکانی مرۆڤ، چونکە هەموو مرۆڤێک خاوەنی حەقیقەتێکی خۆیەتی بەدرێژایی ژیانی، ئەم حەقیقەتە وا لە هەموو مرۆڤێک دەکات کە خۆی بێت نەک غەیری خۆی، بۆیە لە منداڵی و گەنجی و پیری، بە نەخۆشی و لەشساغی، ...، لە هەموو حاڵەتەکاندا مرۆڤ هەر خۆیەتی، هەرچەندە بارودۆخی خۆی و دەوروبەریشی بگۆڕێت.

کەواتە زیندووبوونەوە بۆ حەقیقەت و جەوهەری مرۆڤ، نەک بۆ دانەدانەی جەستە و لاشەی، ئەوە مانای ئەوە نییە جەستەی نەبێت لە قیامەتدا، نەخێر، مانای وایە زیندووبوونەوەکە بۆ حەقیقەت و جەوهەرە نەک بۆ ئەم جەستەیەی لەم ژیانەدا هەیە، چونکە هەر لە ژیانی دونیادا ئەم جەستەیە دەگۆڕێت، بەڵام هەمان مرۆڤ و جەوهەر و حەقیقەتە. هەربۆیەش لە دونیاشدا مامەڵە لەگەڵ جەوهەر و حەقیقەتی مرۆڤ و تایبەتمەندییەکانیدا دەکرێت، نەک لەگەڵ دانەدانەی ئەندامەکانی جەستەی.

٢. مرۆڤ بەتەوای لەناودەچێت، پاشان بە بەدیهێنانێکی تر دەگەڕێندرێتەوە و زیندوودەکرێتەوە، زیندووکردنەوەکە بە دروستیکردنی سەرلەنوێ دەبێت نەک گەڕاندنەوە، واتە ڕێک وەک یەکەمجارە، کە مرۆڤ لە نەبوونەوە هێندراوەتە بوون، کەواتە بەهیچ شێویەک گەڕاندنەوەی جەستەی پێشوو نییە، بەڵکوو

دروستکردنەوەیە سەرلەنوێ. ئەمە ڕای زۆرینەی زانایانی کەلامە.

**٣.** زیندوبوونەوە واتە گەڕاندنەوە و کۆکردنەوەی هەموو بەشەکانی جەستەی پێشوو، ئەمەش ڕای بەشێک لە زانایانی کەلامە.

**٤.** هەندێک لە زانایانیش بێدەنگەیان لێ کردووە و پێیان وایە حەقیقەتەکەی بەس خودا دەزانێت و ناتوانرێت پەی پێ ببرێت.

### بەڵگەکانی زیندوبوونەوە لە قورئاندا

قورئان چەند بەڵگەیەکی هێناوە لەبارەی ڕاستی زیندووکردنەوە و وەرگرتنی جەزای دادپەروەرانە بەپێی کردەوەکان، لەوانە:

١- دروستکردنی بوونەوەر لە نەبوونەوە: خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾[1] واتا: «خودای گەورە ئەو زاتەیەکە بوونەوەر لە نەبوونەوە دروست دەکات، پاشان دووبارە دوای مردنیان زیندوویان دەکاتەوە کە دیارە ئەوە بەلایەوە ئاسانتریشە.»

ئەوە پێوانەیەکی سەرەتایی عەقڵییە کە قورئان دەیهێنێتەوە بۆ ڕاستی زیندووبوونەوەی جەستەکان و وەڵامدانەوەی ئەوانەی ئینکاری لەو بابەتە دەکەن و دەڵێن شتێکی مەحاڵە.

باشە دروستکردن لە نەبووەوە قورسترە یان دروستکرنەوەی دوای دروستکردن؟!

باشە کەسێک بتوانێت لە نەبووەوە بێنێتە بوون، چۆن ناتوانێت جارێکی تر بیهێنێتەوە بوون؟

---

(١) [الروم: ٢٧]

ئەگەر وابێت، نابێت بێباوەڕەکان باوەڕیان بە خۆشیان هەبێت، چونکە نەک ئەوان بەڵکوو هەموو بوون و گەردوون لە نەبووەوە پەیدابووە، وەک زانستی فیزیا نەبوویی و سەرەتایی بوون و گەردوونی سەلماندووە.

٢- دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی: پاشان سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ بەڵگەیەکی دی، کە ئەویش دروستکردنی ئەو گەردوونە مەزن و فراوانەیە: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾(١) واتا: «دروستکرنی ئاسمان و زەوی گەورەتر و مەزنترە لە دروستکردنی مرۆڤەکان، بەڵام زۆربەی مرۆڤەکان ئەوە نازانن.»

٣- زیندووکردنەوە و سەوزکردنەوەی زەوی (لەدوای وشک بوون و زەردبوونی): یەکێکی تر لەو بەڵگانەی کە قورئان ئاماژەی پێ دەدات لەبارەی زیندووبوونەوە، بریتییە لە زیندووکردنەوەی ئەو زەوییە کە وشک و زەرد دەبێت، کاتێک باران بەسەریدا دەبارێت دووبارە زیندوو دەبێتەوە و سەوزایی و گژ و گیا دووبارە زەوی دادەپۆشێت، جا مرۆڤیش زۆر بەو زەوییە دەچێت کە لێی دروستکراوە و تێیدا دەژیێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الْأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنْزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ ۚ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾(٢)

٤- یەکساننەبوونی چاکەکاران و خراپەکاران: یەکێکی تر لەو بەڵگانەی کە قورئان دەیهێنێتە بەردەممان لەسەر زیندوبوونەوە و وەرگرتنەوەی جەزای کردەوەکان بریتییە لەوەی کە نابێت چاکەکاران و خراپەکاران یەکسان بن و وەکوو یەک بن، کە ئەوەش هەم عەقڵ و هەم فیترەت ڕەتی دەکەنەوە و بە مەحاڵی دادەنێن کەسی باش و لاڕێ وەکوو یەک بن و یەک ئەنجامیان هەبێت: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾(٣)

---

(١) [غافر: ٥٧]

(٢) [فصلت: ٣٩]

(٣)[ص: ٢٨]

# تیۆری پەرەسەندن (التطور)

پەرەسەندنی زیندەوەران و بوونەوەر هەر لەکۆنەوە بابەتێکی هەم فەلسەفی هەم زانستی بووە، کەسانێک پێیان وابووە کە زیندەوەران و بوونەوەر بە پەرەسەندن هاتوونە بوون و وردەوردە گەشەیان سەندووە تا گەیشتووە بەمرۆ، ئەم بۆچوونەش دابەشبووە بەسەر دوو ئاراستەی سەرەکیدا

١. ئاراستەیەکی ئیلحادی: واتە باوەڕیان تەنیا بە پەرەسەندن و گەشەسەندن هەیە بەبێ هیچ هێزێکی دەرەکی و نامادی.

٢. ئاراستەیەکی ئیمانی: واتە لەگەڵ باوەڕبوونیان بە پەرەسەندن و گەشەسەندن بەڵام بڕوایان بەهێزێکی دەرەکی هەیە کە لە پشت ئەم گەشەسەندنەوە بووە، واتە بەم پێیە هی ئەمانە گەشەپێدانە (تطویر) نەک گەشەسەندن (تطور)، واتە لەخۆیەوە نەبووە، وەک ئەوەی ئاراستە ئیلحادییەکە دەیڵێت.

مێژووی هەردوو ئاراستەکەش کۆنە و لە مێژووی ئیسلامیشدا نموونەی هەیە لە ئاراستەی دووەمدا.

بەڵام ئەگەرچی پەرەسەندن تیۆرییەکی بەهێزی کایە زانستییەکانە و چەندین لێکۆڵینەوە و پێداچوون و توێژینەوەی لەسەر کراوە و بەوەش پەرەیەکی باش بە بیرۆکەکە دراوە و لە ئاستی بیردۆزێکی زانستیدا لە سەرانسەری جیهان خۆی نمایشکردووە، بووەتە ماددەی بنەمای خوێندنی بەشێکی زۆری خوێندنگە و پەیمانگا و زانکۆکانی جیهان، بەڵام پەرەسەندن لە دوای پەرتووکەکەی ساڵی (١٨٥٩)ی خودی داروینەوە تا ئێستا ڕووبەڕووی چەندین ڕەخنە و سەرنج بووەتەوە، بەوەش نەتوانراوە ببێتە ڕاستییەکی زانستی و لە هەندێک بواریشدا

تا ئاستێک پاشەکشەی کردووە.

سەیر لەوەدایە کە ناباوەڕان پەرەسەندن بە داردەستی خۆیان دەزانن و پێیان وایە پەرەسەندن خودا لە زیهن و بیری تاکی کۆمەڵگەکان دەردەهێنێت، کەچی چاوەڕوانی ناباوەڕان هیچی لێ سەوز نەبوو، چونکە تا ئاستێکی باڵا پەرەسەندن و خوداباوەڕی تێک ناگیرێن و بەیەکەوە دەسوڵحێن، لە ئەگەری ڕاستبوون و ڕاستنەبوونی پەرەسەندندا هیچ زەبرێک بەر ئایین ناکەوێت.

کەلێنە زەقەکانی پەرەسەندنیش جێیەکەی لەق کردووە، بۆ ئەوەش چەندین توێژینەوەله دژی پەرەسەندن هەر وەک پشتگیرییەکانی پەرەسەندن نووسراوە و ئاماژەیان بە کەموکوڕییەکانی نێو تیۆرییەکە کردووە.

ڕەنگە ئاسان نەبێت ئەو درێژدادڕییە لە ئێرەدا باس بکەین، بەڵکوو ئاماژە بە چەند خاڵی بنەمایی و سادەی بیردۆزەکە دەکەین کە ڕەنگە کەمێک ڕەنگی تۆخی بیردۆزەکە کاڵ بکاتەوە، ئەویش بنەمای دروستبوونی زیندەوەران و هاتنە کایەی یەکەم خانەیە.

بۆ ئەوەی لە ماددەی نازیندووەوە ماددەی زیندوو دروست ببێت پێویستی بە ژمارەیەک جینە و بە ئاسانی کۆبوونەوەی ئەو جینانە بەدەست نایەت، لێرەشدا بیردۆزێک هەیە بە ناوی بیردۆزی «کەمترین ڕێژەی جینەکان»، (Minimum Gen Set Concept) کە دەڵێت:

پێویستە ئێمە بۆ یەکەمجار لە سفری جینییەوە دەستمان پێ کردبێت (واتا: هیچ جینێکمان نەبووبێت پاشان بووبین بە خاوەنی یەک جین، پاشان پەرەی سەندبێت بۆ دوو و بۆ زیاتر) تا بەو شێوە گەورەیە پەرەی سەندووە و ئەو هەموو گیاندارانە هاتوونەتە بوون.

جین: بریتییە لە شریتێکی زانیاریی سەرسووڕهێنەر کە دەتوانێت زانیارییەکی

زۆر و ورد لەخۆ بگرێت، لە سەد هەزار پیت پێکدێت کە فرمانی زیندەوەرەکە بە کۆد دەکەن.

بەگوێرەی بیردۆزی «کەمترین ئاستی جینی» ناکرێت هیچ زیندەوەرێک هەر چەندە سادەشبێت لە ٣٩٧ جین کەمتری هەبێت[١]، توێژینەوەکان ئاماژە بە ئەوە دەدەن کە ناکرێت لە سنووری کەمتر لە ٣٩٧ جین بۆ زیندەورێکی سادە دەربچین[٢]. بەرهەمهێنانی وزە پێویستی بە ٦ جین هەیە، ئەگەر بێتو یەک جین کەم بکات ئەوە وزە بەرهەم نایەت، بەمشێوەیە هیچ خانەیەک دروست نابێت و لە کۆتاییدا هیچ زیندەوەرێکیش پەیدا نابێت کە هەموو فرمانێکی جەستە ئاستی جینی خۆی هەیە.

زانایان مایکۆ پلازمایان (Mycoplasma) دۆزییەوە کە بچووکترین بەکتریای زیندووە لەسەر زەوی و خاوەنی ٤٦٨ جینە و تیرەکەی نزیکەی ٠/١ مایکرۆمەترە، بەوەش زانایانی بوارەکە گەیشتنە ئەوەی کە کەمترین ئاستی جینی بریتییە لە ٤٦٨ جین!

کەواتا دەبێت لەکاتی دروستبوونی یەکەم زیندەوەردا ٤٦٨ جینی هەبووبێت، لەکاتێکدا بەپێی پەرەسەندن یەکەم جار سفر جین بووە پاشان یەک و دوو ... هتد. ئەمەش بارێکی تەواو پێچەوانە و نەویستراوە بەنسبەت پەرەسەندن و داروینییەکانەوە، چونکە ناتوانن هیچ تەفسیرێک بۆ ئەم بارە زانستییە سەلماوە بکەن و لە پێچەوانەکەشیدا خاڵی لاوازی بیردۆزەکەیە.

ئەمە بەڵگەیەکی زۆر بەهێزە لەسەر پەیدابوونی لەناکاو، لە کۆتاییشدا لەسەر دروستبوونی سەربەخۆ.

---

(١) جۆرناڵی زانستی Nature ژمارە٦ ی مانگی یەکی ٢٠٠٦.

(٢)سەرابستانی بیردۆزی پەرەسەندن لە ڕوانگەی چەرخی کامبەری بەبەردبووەکانەوە، کۆسار ڕەئوف مەعروف (١١٢ - ١١٣).

ماددیگەراکان پێیان وایە پەرەسەندن وەڵامی ئەو هەموو جۆرە جیاوازانەی زیندەوەران دەداتەوە کە لە جیهاندا بوونی هەیە، ئەگەرچیش پەرەسەندن وەڵامی خانەی یەکەمیشی پێنادرێتەوە وەک ئاماژەمان پێدا، بەڵام با بزانین بەهای بازدان کە پەرەسەندن پشتی پێ دەبەستێت چەندە؟ ئایا بازدان دەتوانێت ئەو هەموو جۆرە لە زیندەوەران لەو تەمەنە کورتەی هەبوونی زیندەوەر لەسەر زەویدا بەدی بهێنێت کە بە لایەنی زۆرەوە ٣/٨ ملیار ساڵ لەمەو پێش یەکەم چەشنی ژیان لەسەر زەویدا دەستی کردووە بە دروستبوون[1] و بە لایەنی کەمیشەوە ئێستا زیاد لە ٧ ملیار جۆری جیاوازی زیندەوەر بوونیان هەیە.[2]

دیارە هۆی جۆراوجۆربوونی زیندەوەران لە پەرەسەندندا بریتییە لە «بازدان»، هەر لە بازدانەوە هەبوونی جۆرە جیاوازەکانی زیندەوەران بەهۆی هەڕەمەکییانە پەیدا بووە!

بازادانیش (Mutation) بریتییە لەو گۆڕانانەی کە لەنێو شریتی (DNA) یدا ڕوودەدات بەهۆی دروستبوونی هەڵەوە لە کاتی کۆپی کردنی زانیارییەکان، ئەویش لە ئەنجامی کاریگەرییە ژینگەییەکانی وەکوو تیشکی (UV) و دووکەڵی جگەرە، کە بە درێژایی ژیانمان گۆڕانکاری لە یەکێک لە تفتە نایترۆجینییەکانی شریتی (DNA) دروست دەبێت کە بریتین لە (A، C، G، T).[3]

بەپێی لێکۆڵینەوەکان بێت لە هەر ١٠٠ هەزار پیتاندنێکی هێلکە و تۆودا، تەنها چوار دانە بازدانیان بەسەردا دێت، لەم چوار دانەیەش لە سەدا ٩٩ی

---

(1) - Julian Chela-Flores، Tobias Owen، François Raulin، First Steps in the Origin of Life in the Universe: Proceedings of the Sixth Trieste Conference on Chemical Evolution، لە ساڵی ٢٠٠١ لە Springer Science & Business Media بڵاو کراوەتەوە، لاپەڕە: ٢٤١

(2) - https://www.wonderopolis.org/، How many animals are there in the world

(3) - https://www.yourgenome.org What is a mutation?

زیانی هەیە و سەدا ١ ئەگەری سوودی هەیە!

واتا لە نزیکەی ٢ بۆ ٣ ملیۆن پیتاندندا تەنها یەک بازدانی بەسوود ڕوودەدات! کە ئەم ڕێژەیەش زۆر کەمە لەچاو ئەم هەموو زیندەوەرەی بوونیان هەیە لەسەر ڕووی زەویدا کە بە ملیۆنان جۆرن، لە کاتێکدا تەنها لە ماوەی ٣/٨ ملیار ساڵ ڕوویداوە، کە لە بازادانی پەرەسەندندا تەنها لە ماوەی ١٠ ملیۆن ساڵدا نزیکەی ٣٥ جۆری زیندەوەر دروستدەبن.

بەڵام بەپێی بازدانی هەڕەمەکی بووایە، ئەوا پێویستی بە دەیان ملیار ساڵ دەبوو تا ئەم هەموو جۆرە دروست بکات و بەلای کەم دەبووا تەمەنی ژیان (٨٠ - ٩٠) ملیار ساڵ بێت نەک ٣/٨ ملیار ساڵ، تاوەکوو بەڕێککەوت ئەم جۆراوجۆرییە بەدیبێت.

ئاخر خۆ هەر بەپێی لێکدانەوەی داروینیزمەکان پەرەسەندنی ئەسپ بە تەنیا (٦٠) ملیۆن ساڵی ویستووە تا گەیشتووە بەم شێوەیەی ئێستا هەیە.

پرسیار ئەوەیە ئەگەر تەنیا زیندەوەرێک ٦٠ ملیۆن ساڵی بووێت! ئەی باشە ملیۆنان جۆر چەندی دەوێت، چونکە هەموویان بە یەکەوە پەیدا نەبوون و ئەوانەی پێشتر هۆکاری دروست بوونی ئەوانی دوای خۆیانن لە پەرەسەندندا، واتا کۆی گشتی پەرەسەندنی نێو تێکڕای زیندەوەران لە سەرەتادا بەهۆی کەمی زیندەوەرانەوە زۆر خاو بووە و ئێستاش لە خێراترین کاتیدایە بەهۆی زۆری ژمارەی زیندەوەران بەپێی خودی بیردۆزەکە.

لەو کاتە بچووکەی زەوی لەبەردەستیدایە بۆ ئەو هەموو جۆرە لە زیندەوەران و بەو بازدانە خاوەی لە کۆی ڕێژەی زیندەوەراندا هەبووە، ناکرێت بگەینە ئەوەی زیندەوەران بەو هەمەچشنییەیانەوە بەرهەمی بازدانن!

سەیر لەوەدایە بیردۆزی پەرەسەندن کاتێک قسە دەکات کە زیندەوەران

هەموویان لە کەشێکی گونجاوی ژیانیاندان و لەگەڵ ئەو ژینگەی بۆی دیزاینکراون دەگونجێن، هەمووشیان لەگەڵ دیمەنە گشتییەکەی زەوی و لەگەڵ مرۆڤیش دەگونجێن، کە ئەمەش پرسیارێکی ناخۆشەویستە بۆ بیردۆزەکە و ڕەنگە مامەڵەی پێچەوانەی پەرەسەندن بسەلمێنت و ئەوە نیشان دەدات کە گەردوون و ژیان یەک دەزگای هاوتان و هەموویان یەک ئاراستەی هێز دیزایینی کردوون.

چەندین زانایان هەوڵیان داوە بە هۆی بازدانی هەڕەمەکی زیندەوەرێکی پێگەشتوو دروستبکەن تا ئێستا سەرکەوتوو نەبوون، سەرەڕای ئەوەش زیندەوەری ناتەواو لە بەبەردبووەکاندا بوونی نییە، کە پێمان بڵێت: ڕێژەیەکی زۆر بازدانی هەڕەمەکی ڕوویداوە کە پەرەسەندن بەبەردبووەکان بە بەڵگەی بەهێزی خۆی دەزانێت.[1]

(Werner Arber) «وێرنەر ئاربەر»، زانای جینات و بایۆلۆژی گەردیی بە ڕەگەز سویسرِی، کە خاوەنی خەڵاتی نۆبڵە دەڵێت: "تا ئێستا نەزانراوە خانە چۆن دروستبووە، چونکە خانە بەش بەش پەرەناسێنێت، بەڵکوو پێویستە هەموو بەشەکانی لە یەک کاتدا بوونیان هەبێت بە یەکەوە تا کاربکات، بۆیە پێویستە دروستکەرێکی هەبێت کە هەموو بەشەکانی خانەی لەگەڵ یەکتر و لە یەک کاتدا دروستکردبێت"، دەشڵێت: "جوانی و ناوازەیی ژیان و جیهان و ئاڵۆزی زیندەوەران وای کردووە باوەڕم بە دیزایینی زیرەک هەبێت". ئەم زانایە توانیویەتی دیزایینی سیستەمێک لە زیندەوەر بدۆزێتەوە کە بەرپرسە لە دروستکردنی جینی جیاواز.

ئینجا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە جۆراوجۆربوونی زیندەوەران لە ڕێگەی دیزایینەوە دەبێت نەک هەڕەمەکی، کاتێک هەستا بە تاقیکردنەوەی بازدان

---

(١) د. عمرو شریف پەرتووکی (خرافة الالحاد)- لاپەڕە ١٩٣

لەسەر مێش بۆ نزیکەی ٨٠٠ نەوە، تاوەکوو گۆڕانکاری لە جینەکاندا ئەنجام بدەن و بەمەش بازدانی تێدا ڕووبدات و شوێنەواری پەرەسەندنی تیا بدۆزنەوە، لەم ماوەیەدا هەرگیز زیندەوەرێکی ڕێکیان دەست نەکەوت، بەڵکوو هەر ٨٠٠ نەوەکە بە ناتەواوی دەرچوون (هەندێکی بێباڵ و هەندێکیش قاچی لە سەری دەرچوو بوو!)، ئەمە دەریدەخات کە پەرەسەندنی هەڕەمەکی بێبنەمایە، بۆیە } Arber دەڵێت: "تاکە وەڵامی ئەو پرسیارانەی لە بایۆلۆژیدا تووشمان دەبێت دەربارەی «دروستبوونی خانە» و «جۆراوجۆری زیندەوەران» و «ئاڵۆزی ژیان» بریتییە لە بوونی خودایەک کە دیزایینەریەتی."

(Richard lenski)،[1] زانا و لێکۆڵەری پەرەسەندن لە زانکۆی (Michigan) هەستا بە گەڕان بۆ شوێنەواری پەرەسەندن لە بەکتریادا، بۆ ماوەی ٢١ ساڵ و توانی بگات بە ٤٠ هەزار نەوەی بەکتریا (کە بەرانبەرە بە زیاتر لە ملیۆنێک ساڵ لە تەمەنی مرۆڤایەتی)، لەم ماوەیەدا سەرەڕای دەستکەوتنی زانیاری زۆر دەربارەی پەرەسەندنی گەردی (Micro evolution) و لەم (٤٠ هەزار) نەوەیەدا ٧٥٣ بازدان ڕوویدا، هەندێکی بەسوود بوون بۆ خۆگونجاندنیان لەگەڵ ژینگە و بەشێکی زیانبەخش بوو.

دەبێت ئەوە بزانین کە (ئەمە تەنها لە تاک خانەدا، لە فرەخانەدا ئەگەری زیان زۆر زیاترە) و بازدانەکان کاریگەرییان لاوەکی و سادەیە نەک بەهێز، تەنانەت نیوەی بازدانەکانیش هەر بێلایەنن و نابنە هۆی گۆڕانکاری.[2]

لێرەدا هیچ ئاماژەیەکمان دەست ناکەوێت بۆ پەرەسەندنی جۆر (Macro evolution) کە بازدانی گەورە ڕوویدابێت و ببێتە هۆی پەیدابوونی زیندەوەری تازە، ئەمە دەیسەلمێنێت پەرەسەندنی جۆر (بازدانی گەورە) بە ڕێککەوت

---

(١) زانکۆی (میشیگان) و لێکۆڵینەوەکانی (ڕیچارد لینسکی):
MSU: SCIENTISTS WATCH EVOLUTION UNFOLD OVER 40.000 GENERATIONS
(2) - http://www.cs.unc.edu/ Population Genetics Made Simple

ئەنجام نادرێت.

هەروەها زانایان لە لێکۆڵینەوەکان گەیشتنە ئەوەی کە خۆگونجاندنی زیندەوەرانیش لە ئەنجامی لەدەستدانی هەندێک سیفەت و لەنێوبردنییەتی نەک دروستکردنی سیفەتی تازە! ئەمەش پێمان دەڵێت کە زیندەوەر بەهۆی هەڵبژاردنی سروشتی و بازدان ئاڵۆزتر نابێت، بەڵکوو سادەتر دەبێتەوە، بۆیە ئەم ئاڵۆزبوونەی زیندەوەران پێویستی بە دیزایینەرێک هەیە نەک هەڕەمەکی.

بۆیە (George Wald)زانای فسیۆلۆژی،[1] دەڵێت: "ناکرێت بڵێین سروشت زیندەوەرانی دروستکردووە و زیندەوەر خۆی خۆی بەدیهێناوە، چونکە ڕێککەوتنی گەردوون بەم شێوەیە و گونجاوبوونی بۆ ژیان مانای هەبوونی دیزایینێکی زیرەک دەدات، کە سروشتی ڕێکخستووە بۆ دروستبوونی ژیان و دواتر بۆ زیندەوەران و لە کۆتاییدا بۆ زیندەوەرێکی ئاقڵی وەک مرۆڤ کە توانای دۆزینەوەی زانستی و داهێنانی هەیە."

دواتر جۆرج دەڵێت: "ئەگەر بڵێین ژیان ڕێککەوتە، ئەوهێمە قورسترین ڕێگامان هەڵبژاردووە، یان ڕاستر بڵێین، خۆمان دەخەڵەتێنین و دەمانەوێت بە زۆرەملێ بابەتەکە لار بکەنەوە، ئەمەش لە ئەنجامی نکووڵی کردنی کوێرانە کە ڕەنگە ئامانجێک لە پشتیەوە بێت."

(Richard Dowkins)، فەیلەسووفی گەورەی ناباوەڕی و زمانحاڵی ناباوەڕیی جیهانی و زانای بایۆلۆژی دەربارەی ژیان دەڵێت: "ئەگەر پەرەسەندن بگەڕێنینەوە بۆ سەرەتا خاڵ، ئەوا هەر بەم شێوەی ئێستای لێدێتەوە و هەمان دیاردە ڕوودەدات و مرۆڤیش دووبارە بەدیدێت، ئەمەش واتا ئەگەر بازدانێک هەبێت بۆ گۆڕینی جۆرەکان ئەوهلەخۆوە و بەهەڕەمەکی ڕوونادات، بەڵکوو

---

(١) (George wald) بە ڕەگەز ئەمریکییە و زانای فسیۆلۆژییەلە زانکۆی هارفارد، کاردەکات لە بواری فرمانی ئەندامەکان و خاوەنی خەڵاتی نۆبڵە لە لێکۆڵینەوەکانی شەبەکەی چاو.

بەپێی ژینگە ڕوودەدات (واتا: ڕووداوەکانی گەردوون هەڕەمەکی نین، بەڵکوو یاسا سروشتییەکان بەڕێوەیان دەبەن)."

لێرەدا پرسیار ئەوەیە چۆن زیندەوەر گۆڕانکاری گونجاو تیایدا ڕوویدا بەبێ ئەوەی خۆی درکی پێ بکات و لە توانایدا بێت؟ توانای خۆگونجاندی لەکوێ پەیداکرد؟ یاسا سروشتییەکان لەکوێوە هاتن؟ دەکرێت یاسا هۆشیار بێت یان بەڕێککەوت پەیدابووبێت و ڕێکخستنیش ئەنجام بدات؟

ئایا دانان بە باشترین و بەهێزترین دیزایینەر، کردنەوەی گرێی سەرچاوەی دروستبوونی ژیان و گەردوون نییە؟ زانست بەو هەموو توانا ژیری و ماددی و گەشە جیهانییەی لەبەر دەستیەتی ناتوانێت بۆمان لێکبداتەوە، بۆیە باوەڕ بە هێزی دەرەکی ڕاستترین تێڕوانینە کە باوەڕداران خاوەنداری دەکەن.[1]

سەرخەرانی گریمانەی پەرەسەندن وای دەبینن کە بوونی ئەندامی گونجاو و وردکار لە جەستەدا و هەستانی بە ئەنجامدانی کارەکەی بە جوانترین و ڕێکوپێکترین شێوە لە بوونەوەرە زیندووەکاندا بەرەنجامی کردارەکانی خۆ گونجاندن و هەڵبژاردنی سروشتییە، هەر بۆیە هیچ ژیرییەک لەوەدا نییە کە بەدوای ئامانج یان مەبەست لە پشت ئەم بنیاتنانەوە بگەڕێین، یان بیر لە دروستکار (خودا) بکرێتەوە.

لە لایەکی دیکەوە، سەرخەرانی بیردۆزی دروستکردن بڕوایان وایە کە دروستکەر هەر ئەندامێکی بە مەبەست و ئامانجێکی دیاریکراو هەر بە دانایی و زانایی و حەکیمی خۆی دروستکردووە و لەبەرئەوەی کە کارگە ئەندامییەکانی وەک خانە و ئەندامە ئاڵۆزەکانی وەک چاو و مێشک و دڵ ... هتد، ڕێکخستنێکی نموونەییان هەیە، ناکرێت و ناگونجێت کە ئەم ڕێکخراوانە گۆڕابن لە پێکهاتەیەکی ناتەواوە بۆ شێوەیەک کە کارەکانی لەسەر جوانترین و تەواوترین

---

(١) پاکانەی هەبوون – موحەممەد صالح ، ل ٣٢٥

شێوە جێبەجێ بکات لە ڕێگەی پەرەسەندنەوە و بەبێ بوونی ڕێگەیەکی دیکە.

دیسان هەر بەپێی گریمانەی پەرەسەندن هیچ پێویستییەک بە جیاکردنەوەی مرۆڤ نییە لە بوونەوەرە زیندووەکانی دیکەیان ڕێزدار و گەورەتر بکرێت لە زیندەوەرانی دیکە و فەزڵی بدرێت بەسەر بوونەوەرە زیندوەکانی دیکەدا، چونکەمرۆڤ جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ لقی مەیمونەکاندا. بە واتایەکی دی مرۆڤ هیچ نییە تەنیا ئاژەڵێک نەبێت کە زیاتر زیرەک و هۆشمەندترە، بەپێی ئەم دیدەش مرۆڤەکان دەتوانن شوێن یاسا سەرەکییەکانی ئاژەڵان بکەون و ئەو کارانە ئەنجام بدەن کە ئەوان ئەنجامی دەدەن، بەم شێوەش مرۆڤەکان وردە وردە لە بەرگی بەها ڕەوشتی و باڵا و مرۆڤایەتییەکان دێنە دەرەوە بەرەو ئاژەڵبوون دەڕۆن.[١]

زانایانی بواری پەرەسەندن دەڵێن: "تاوەکوو ماوەی ٣ ملیار ساڵ تەنها زیندەوەری تاکخانە بوونی هەبوو و ئەویش لە ڕێگای دابەشبوونی خانە زیادی دەکرد (ناتوخمە زۆربوون)، لەم ماوە دوور و درێژەدا زۆر بە باشی زیندەوەر توانی پارێزگاری لە جینەکان (DNA) بکات و بێکێشە بمێنێتەوە.

بەڵام پرسیار ئەوەیە:

ئایا پەرەسەندن دەتوانێت پێمان بڵێت: بۆچی ڕەگەزی نێر و مێ سەری هەڵدا! لە کاتێکدا زیانی زۆرترە (وەک شەڕکردنی نێرەکان لەسەر مێیە و تێکچوونی جیناتی، کەمبوونەوەی چانسی زۆربوون)، ئایا ئەمە بە ڕێککەوت ڕوویدا و هەڵەیەک بوو لە پەرەسەندنی زیندەوەر؟! لە کاتێکدا کە:-

- دوو زیندەوەر لە هەمان کاتدا بە تەواوی ڕێککەوتن کە ببن بە نێر و مێ و لەگەڵ یەک بگونجێن؟! گریمان دانەیەک پەرەی سەند بە هەڕەمەکی و نێرینەی دروست کرد! دەکرێت مێینەکەش هەر بە هەڕەمەکی پەرەیسەندبێت

---

(١) پاکانەی هەبوون- موحەممەد صالح، ل ٣٣٢

و پەرەسەندنەکەشی تەواو گونجاو بێت بۆ نێرینەکە؟!

- ئینجا چۆن بە ڕێککەوت لاشەیان بە جۆرێک ڕێککەوت کە حەز بەیەکتری بکەن و هەستی یەکتر بجووڵێنن؟! چۆن ئەو هەستە ڕەگەزی و ئارەزووبازییانە دروست بوون بۆ هەردوو لا کە پاڵیان پێوە بنێت تا زۆربوون ڕووبدات؟!

- چۆن تۆوی نێرینە ئەنزیمی تایبەت بە کونکردنی دیواری خانەی هێلکەی مێیینەی دەستکەوت هەر بە ڕێککەوت و هەر بە سوودفە و بازدانی هەڕەمەکی، لە کاتێکدا نێرینە نازانێت چی دەگوزەرێت لە ناخی مێیەدا؟!

- چۆن کرۆمۆسۆمەکان لە هەردوو زیندەوەردا ڕێککەوتن لە یەک کاتدا بە هەمان ژمارە کە لەگەڵ یەکتردا بگونجێن و بەمەش پیتێن ڕووبدات؟!

ئایا ئەمانە ڕێککەوتن و بازدانێکی هەڕەمەکی و سەرکەوتوو بووە یان بریتییە لە دیزایینێکی ڕوون، کە دیزایینەر وێنەی هەردوو ڕەگەزی کێشاوە و خستووینەتە سەر سیستەم؟!

ئاخر دروستبوونی نێرە و مێیە لە سەرجەم زیندەوەراندا بە پەرەسەندن وەڵام نادرێتەوە، من پێم وایە ئەمە نەک کەلێنە، بەڵکوو شەبەقە و خزاوەتە دیواری تەندراوی پەرەسەندن، چونکە سەرجەم زیندەوەران بۆ پارێزگاریکردن لە مانەوەیان بوونە جووت و هەردووکیشیان لەگەڵ یەکتریدا دەگونجێن، ئەوە گریمان ڕازیبووین بە هەنگاوەکانی پەرەسەندن بۆ گەورەبوونی خانەیەک تا دەگاتە زیندەوەرێک، بەڵام چۆن و لە کوێ زیندەورێکی دیکەی هەمان توخم و ڕەگەز جیاوازمان (نێر و مێی یەک زیندەوەر) دەست بکەوێت تا پارێزگاری لە بەردەوامبوون و مانەوەی وەچە بکات؟!

بەڵام بەپێی بیردۆزی دروستکردن، خودای دروستکار مرۆڤی بە شێوەیەکی جیاواز بەدیهێناوە و ناوازە لە زیندەوەرانی دی بۆ ئەوەی کە دروستکەرەکەی بناسێت و باوەڕی پێ بهێنێت و پاشانیش بیپەرستێت، لەم پێناوەشدا خودای

باڵادەست چەندین بەخششی وەک ژیری و دڵ و ڕۆح و چەندان بەخششی دی پێ بەخشیون کە توانا هەستی و زانستییەکانی باشتر کردووە.

لێرەشەوە مرۆڤەکان هەست بە سیستەمێکی باڵا و دەستگرتن پێوەی دەکەن، ئەم پێویستییەش سروشتی بەرهەمهاتوو لە دروستکردنیانەوە سەپاندوویەتی بەسەریاندا، بۆ ئەوەی کە مرۆڤەکان تێر بخۆن لە هەستکردن بە باوەڕ و پەیوەستبوون هەبێت لە دڵ و دەروون و هەستیاندا -بۆ ئەم مەبەستەش پەرتووکی بینراوی خودا (گەردوون) و پەرتووکی خوێندراوی خودا (قورئانی پیرۆز) باشترین سەرچاوەیە- لەسەریان پێویستە کە یان سەرنج لە گەردوون بدەن وەک ئەوەی کە «کارێکی هونەری و بەرهەمێکی خوداییە»، نەک بەرەنجامێکی سروشتی چانس و بەختی باش.

سەرەڕای ئەوەی کە پەرەسەندن بەو ڕەگەزنامەیەوە پێشکەشکرا کە یاسایەکی جێگیری زانستییە لە زۆرێک لە وڵاتەکاندا تاوەکوو پەنجاکانی سەدەی بیستەم، بەڵام لەم ساتەدا گفتوگۆکان لەنێوان سەرخەرانی پەرەسەندن و دروستکردندا گەرم بوون، ئەمەش دوای ئەوەی دەرکەوت هەندێک لە بەبەردبووەکان کە سەرخەرانی پەرەسەندن پێشکەشیان کردبوو ساختە و لاواز بوون.

لە بارودۆخێکدا کە ئاسان نەبوو تەعبیر لە هەر بیرۆکەیەک بکرێت کە دژی پەرەسەندن بێت -«واتسۆن» و «کریک» لە ساڵی (١٩٥٣)پێکهاتەی گەردی (DNA)یان ئاشکراکرد کە پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی بناغەدارە و بە هیچ شێوەیەک پشت نابەستێت بە ڕوودانی سوودفە لە خانەکاندا، پاشان لە هەر بوونەوەرێکی زیندوو ئەم پێکهاتە نموونەییە بە شێوەیەکی خێرا و فراوان لە جیهاندا ناسرا.

بۆیە بیرۆکە و وتەکانی کۆمەڵەی دروستکردن و ئەوانەی باوەڕیان وایە کە خودا ئەو گونجاویەی دروست کردووە بە تەواوی گونجاوە و یەکدەگرێتەوە لەگەڵ

ئەو ڕاستیانەی کە زانستی سەردەم پێی گەیشتووە و لەگەڵ ئەو بارودۆخە و واقیعەی کە زیندەوەرانیش تێیدا دەژین.

هەر دۆزینەوەیەکی نوێ، لایەنێک لە لایەنە موعجیزاوییەکانی ئەم ژیان و گەردوونە ئاڵۆزە دەردەخات و لەگەڵ چەسپاوی ئەم ڕاستیانەدا دەگونجێت کە باوەڕ لەسەری بونیات دەنرێت و بە هیچ شێوەیەک سوودفە ناتوانێت بۆمان شی بکاتەوە.

پەرەسەندن لە مێژوودا گفتوگۆیەکی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا و لە نێوەندە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتییەکانیشدا، دواتر دەستکرا بە لێکۆڵینەوە لە پەرەسەندن وەک ئەوەی کە فەلسەفەیەکی بایۆلۆژی بێت، لە بەرانبەریشدا لە چەند وڵاتێک چەندین بیروبۆچوون بۆ سیستەمی خوێندنی قوتابخانەکان و پەرتووکەکانی خوێندن زیادکرا دەربارەی بیردۆزی دروستکردن، وەک تورکیا لە ساڵی (١٩٨٠)دا.

بەڵام ئەم سیستەمە بابەتییە بووە هۆی بێزارکردنی سەرخەرانی پەرەسەندن، هەر بۆیە کەوتنە هەوڵ بۆئەوەی کە بیرۆکەکە جیابکەنەوە و دایببڕن لە مەبەستە ڕاستەقینەکەی لە ڕێگەی ڕەخنەگرتن لە خوێندنی بیرۆکەی ڕاستیی دروستکردن، وەک گومان بردنیان بۆئەوەی کە ئایین پێچەوانە و دژ بەیەکە لەگەڵ بنەما گشتییەکاندا، بەخێرایی مۆرکی سیاسییان بۆ بابەتەکە زیادکرد وەک ئەوەی کە ئەمە کێشمەکێشمێک بێت لەنێوان پێشکەوتن و دواکەوتندا و بە شێوەیەک لە شێوەکان پردێکی پەیوەندییان دروستکرد لەنێوان باوەڕهێنان بە دروستکردن و دواکەوتووییدا.

بەڵام ئێمە بەرەو داهاتوویەک هەنگاو دەنێین کە تا ڕادەیەک ڕادەربڕین تێیدا بۆ ئەم پرسە بە ئازادی کارێکی قبووڵکراوە و من بڕوام وایە کە گفتوگۆی هێمنانە و یەکتر قبووڵکردن و گفتوگۆی بێدەمارگیری کە ڕێز لە ئایین و زانست بگیرێت بیرۆکەیەکی گونجاو و کۆکی لێ بەرهەم بێت و لە کۆتاییدا دڵ و مێشک

و هەست و ویستەکان لەنێو تاک و کۆمەڵگەکاندا پێی ڕازی بن.[1]

لە ئەگەری ڕاستبوونی پەرەسەندنا بەو جۆرەی داروینیستەکان لێی دەدوێن و باسی دەکەن، چەند گرفتێکی گەورە دروست دەبێت، لەوانە:

١- مرۆڤ هیچ جیاوازییەکی جەوهەری نامێنێت لەگەڵ بوونەوەرەکانی دیکەدا، سروشت ناڵێت: ئەمە مرۆڤە و ئەوە کرمە یان ڤایرۆسە، یان چەقەڵە. ئەو جیاوازیانە ناکات، یان نازانێت تا بیکات، هەمووومان وەک یەک واین، کەسمان پیرۆزتر نین لەوی دی، بەڵکوو هەمووومان لە یەک ئاستین.

لەم ڕوانگەیەوە دۆکینز گوتەنی: ژیانی من و ژیانی تۆ نە زیاترە نە کەمتر لە ژیانی چۆلەکەیەک کە لێرە و لەوێ دەفڕێت، وەک چۆن ژیانمان جیاوازیشی نییە لەگەڵ ژیانی ئەو بەکتریایەی کە لە کاتی دەستشۆردنماندا دەیکوژین، ژیانمان جیاوازیشی نییە لەگەڵ ڤایرۆسی ئایدز کە زەوی وێران کردووە.

٢- مێشکی مرۆڤ تەنها بۆ مانەوە و پەرەسەندن گەشەی کردووە، نەک گەڕان بەدوای ڕاستیدا، ئەمەش تۆماس نەیگڵ هەستی پێکرد، هەرچەند نەیگڵ بێباوەڕیشە، بەڵام دەڵێت: "ئەگەر باوەڕمانکرد تواناکانمان لە دروستکردنی باوەڕە دروستەکان، هێزێک بێت لە ئەنجامی هەڵبژاردنی سروشتییەوە هاتبێتە دی، ئەوا ڕووبەڕووی گومانێکی توند دەبینەوە بەرانبەر ئەم باوەڕانە". نەیگڵ بەڕوونی ئەوە دەخاتەڕوو کە توانا ئەقڵییەکانمان ئەگەر لە ئەنجامی هەڵبژاردنی سروشتییەوە هاتبنە دی، ئەوهناتوانین پشت بەو توانایانەمان ببەستین و دەکەونە ژێر گومانەوە.

گومانەکەی نەیگڵ لە شوێنی خۆیدایە، چونکە بەپێی ئەوە بێت، ئەقڵمان بۆ مانەوە گەشەی کردووە. لەو بارەیەوە «فرانسیس کریک» دەڵێت: "دەماغی پەرەسەندووومان لە کۆتاییدا لە ژێر پەستانی دۆزینەوەی حەقیقەتدا پەرەی

---

(١) سەرابستانی بیردۆزی پەرەسەندن لە ڕوانگەی چەرخی کامبەری بە بەردبووەکانەوە، کۆسار ڕەئوف مەعروف (٧٧-٨٥).

نەسەندووە، بەڵکوو پەرەی سەندووە هەتا ڕێژەیەک زیرەکیمان هەبێت کە بەس بێت بۆ مانەوە لە ژیاندا."

«ڕۆناڵد گییر» دەڵێت: "پەرەسەندنی مەلەکەی زیهن لە مرۆڤدا بۆ ئەوەیە مرۆڤ ڕووبەڕووی پێداویستییەکانی ئێستای ببێتەوە، بۆئەوەی لە ژیاندا بمێنێتەوە، نەک بۆ ئەوەی هەستێت بە دەرخستنی ڕاستییە گشتییەکان لە گەردووندا". هەم «کریک» و هەم «ڕۆناڵف گییر» هەردووکیان بەڕوونی ئەوەمان پێ دەڵێن کە ئەقڵی ئێمە یاخود دەماغمان تەنها بۆ یەک مەبەست پەرەی سەندووە، ئەویش مانەوەیە لە ژیان. پرسی حەقیقەت پرسێکی گرنگ نییە بە لای سروشتەوە، بەڵکوو لە بنەڕەتەوە هەر پرس نییە. «جۆن گرای» جەخت لەوە دەکاتەوە کە کاتێک پێمان وایە ئازادین و لە ڕێگەی زانستەوە کەشفی حەقیقەت دەکەین، بەڵام ئەگەر تیۆری داروین لە هەڵبژاردنی سروشتی ڕاست بێت، ئەوە ئەوەی کە ئێمە ئازادیی ویستمان هەیە و کەشفی حەقیقەت دەکەین ئەستەم دەبێت، دەماغی مرۆڤ لە خزمەتی سەرکەوتنی پەرەسەندنیدایە نەک حەقیقەت.

٣- شتێک بوونی نامێنێت بە ناوی ئازادیی ویستەوە و مرۆڤ لە ڕۆبۆتێک زیاتر نییە. بێباوەڕی دیار «ئەلیکساندەر ڕۆزینبێرگ» ئەو بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە کە پێی وایە ئەقڵ هیچ نییە دەماغ نەبێت، کە ئازادیی ویستمان لێوەردەگرێتەوە و هەر ئامانج و دیزایینێکی ڕێکخراو لە ڕەفتار و ژیانمان ڕەتدەکاتەوە.

«سام هاریس»یش لە پەرتووکۆچکەیەک بە ناوی «ئازادیی ویست» دوای ئەوەی ئەوە دەخاتەڕوو کە ویستەکانمان شوێنەواری ماددەن و ناتوانین بەهۆشیارییەوە کۆنترۆڵی بکەین، دڵخۆشە بەم دۆزینەوەیەی و بانگەشەی ئەوەش دەکات کە پێویستە خۆمان ڕزگار بکەین لە وەهمی ئازادیی ویست. ئەم ڕوانینە بەو هۆیەوە دروست بووە کە مرۆڤ لە ڕوانگەیەکی ماددی ڕووتەوە دەبینن، پێیان وایە ئێمە دەرئەنجامی چەند کارلێکێکی کیمیایین،

ڕەفتارەکانیشمان بە هەمان شێوە. «ئیدوارد سلینگرلاند» دەڵێت: "ماددیەتی داروینی لە ڕووی لۆژیکییەوە دەمانگەیەنێت بەو ئەنجامەی کە مرۆڤ کەسانێکی ئالیین (ڕۆبۆتیین)، هەروەها هەستکردنمان بە نەفس یان وەعی یان ئەوەی خاوەنی ویستی ئازادین تەنها وەهمە، بەڵام دانی پێدادەنێم وەهمێکە کە ناتوانین دووری بخەینەوە، هیچ کەس ناتوانێت بجووڵێتەوە ئیلا دەبێت وا ڕەفتار بکات کە ئازادە". «ستفن هۆکینگیش» هەمان ڕای هەیە.

٤- شتێک بە ناوی ڕەوشتەوە بوونی نامێنێت و هەرچی دەکرێت و کراوە ڕێگەپێدراو و ئاسایین، ئەگەر پەرەسەندن بەو جۆرەی بێباوەڕەکان دەیخەنەڕوو ڕاست بێت و خودا نەبێت، هەرچی خراپە و شەڕ هەیە پەرەسەندن لێی بەرپرسە. «دۆکینز» دەڵێت: "جینەکانمان گرنگی نادەن بە ئازار و موعاناتەکان، چونکە جینەکان گرنگی نادەن بە هیچ شتێک، واتای ئازار واتای خۆگونجاندنی بایۆلۆژییە، وەک جیهازێکی ئاگادارکەرەوە و پاڵنەر بۆ زیادکردنی مانەوە و زیادکردنی نەوەخستنەوە." دیسان «دۆکینز» دەڵێت: "شتە خراپەکان ڕوودەدەن، چونکە شتەکان ڕوودەدەن، جیاوازی نییە خراپن یان باشن لە ڕوانگەی ئێمەوە، هەروەها کاریگەری دانانێت لەسەر ئەگەری ڕوودانیان، هەندێک خەڵک پێیان قورسە ئەمە قبووڵ بکەن، ئەوە بە باشتر دەزانن باوەڕ بەوە بکەن کە سزایە بۆ هەڵەکانیان، یان پاداشتە بۆ باشییەکانیان، بەڵام بۆ بەدبەختی گەردوون جیاوازی ناکات لەنێوان خەڵکیدا."

«مایکڵ روس» و «ویڵسون» نایشارنەوە و پێیان وایە ڕەوشت تەنها وەهمێکە لە لایەن جینەکەنمانەوە، هەتا هەندێکمان یارمەتی هەندێکی دیکەمان بدەین، لە کۆتاییدا ڕەوشتی بەرز هۆکارێکە بۆ بەدیهێنانی سوودە کەسییەکان.

٥- ئەگەر پەرەسندن ڕاست بێت ئەوا باسکردن لە خۆشەویستی و عەشق و سۆز و ... هتد، دەبێتە گاڵتەجاڕی، «جیروم هول» دەڵێت: "ئەگەر مرۆڤ بەرپرس نەبێت لە ڕووی ڕەوشتییەوە لە کردەوەکانیان، ئەوا دادپەروەری تەنها خەیاڵێکە، ئەگەر لای مرۆڤ ئازادیی ویست بوونی نەبێت، ئەوهناتوانین

هەست بە پێناسی خۆمان بکەین و دەروونبەرز بین، لەبەرئەوەی هەموو شتێک لە لایەن ئالییەتێکی ناهۆشیارەوە ئەنجام دەدرێت". لەسەر ئەم وتەیە نانسی بیرسی ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر ئازادیی ویست وەهم بێت، ئەوهڕێز و ژیری مرۆڤ دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە، ئەوکات توانا جیاوازەکانی مرۆڤ دەکەونە ژێر پرسیارەوە، وەک داهێنان و توانا لە چارەسەری کێشەکان و خۆشەویستی و پەیوەندییەکان[1]. لەو بارەیەوە «ڕوندی بروکس» دەڵێت: "مرۆڤ کیسێکی گەورەی پێستە، پڕبۆتەوە بە گەردی زیندوو، کە بەپێی یاسا فیزیایی و کیمیاییەکان کارلێک دەکەن." لە شوێنێکی تر دەڵێت: "دەگونجێت خۆم ناچار بکەم وەک ڕۆبۆت سەیری منداڵەکانم بکەم، بەڵام لە ڕاستیدا وا مامەڵەیان لەگەڵ ناکەم خۆشەویستیم بۆیان بێمەرجە، ئەوە زۆر لەوە دوورترە بە لێکدانەوەیەکی مەنتقی پێی بگەین."[2]

## هەڵکۆڵراوەکان (بەبەردبووەکان)

پرۆفیسۆر دکتۆر «دوان تی گیش» (Prof. Dr. Duane T. Gish) لە باسی پەرەسەندنی بێبڕبڕەکان بۆ بڕبڕەدارەکان دەڵێت: "ئایا بەڵگە هەیە لەسەر ئەم وتەیە لە تۆماری هەڵکۆڵراوەکاندا؟"

کەواتا تۆماری هەڵکۆڵراوەکان (بەبەردبووەکان) سەنگی مەحەکە بۆ هەموو وتەکان دەربارەی زیندەوەران و مێژووی زیندەوەران، هەر ئەویشە دەبێت بڕیار بدات کە ئێمە چۆن دروستبووین، هەر وەکوو داروینیش هەمان باوەڕی هەیە و ڕاستی و دروستی گریمانەکەشی هەر بۆ تۆماری هەڵکۆڵراوەکان بەجێهێشتووە". کەواتا تۆماری هەڵکۆڵراوەکان بەم شێوەیە گرنگ بێت، شایەنی ئەوەیە کە پەنجەیەک بخەینە سەری و هەندێک لە بارەیەوە بزانین.

---

(١) (مرۆڤە ئالییەکان عاشق نابن). ( بحث عن الحقيقة، ص ١٤٥).

(٢) مرۆڤە بێویستەکان بەشی پێنجەم. ئاڤار قەرەداغی.

**هەڵکۆڵراو (بەبەردبوو) چییە؟**

هەڵکۆڵراو بە پێناسەیەکی گشتی، پاشماوەی پارێزراوی بوونەوەرانێکی زیندووە، کە پێش ماوەیەکی زۆر ژیاون و بەهۆی هۆکارە سروشتییەکانەوە گەیشتوون بە ئێمە. هەروەها هەڵکۆڵراوەکان بریتین لە گەیشتنی بەشێک لە بوونەوەرە زیندووەکە یان پاشماوەی ژیانی (کە بە پاشماوەی هەڵکۆڵراو ناودەبرێت) بە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان.

هەڵکۆڵراوەکان گۆڕانی زیندەوەرە مردووەکان یان ڕووەکەکانن بۆ بەشێک لە توێکڵی زەوی بەبێ تێکچوون.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەزاران هەڵکۆڵراو هەن کە هەموویان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە زیندەوەران بە شێوەیەکی لەناکاو و لەسەر تەواوترین و ئاڵۆزترین شێوە دروستبوونە.

تەنیا تۆماری هەڵکۆڵراوەکان بەسە بۆ پووچەڵکردنەوەی بانگەواز و پڕوپاگەندەی گریمانەی پەرەسەندن، کە پێی وایە گیانەوەرە وشکاوییەکان لە ماسییەکانەوە پەرەیان سەندووە، لەمانیشەوە خشۆکەکان، لەمانیشەوە باڵندەکان، چونکە تاوەکوو ئێستا هیچ هەڵکۆڵراوێک نەدۆزراوەتەوە کە ڕاستی ئەم پڕوپاگەندە بسەلمێنێت (زیندەوەری نێوەندی).

هەڵکۆڵراوەکان لە سەردەمی یۆنانی کۆنەوە جێگای بایەخی لێکۆڵەرەوەکان بووە، بەڵام تایبەتمەندبوون (اختصاص) لە زانستی هەڵکۆڵیندا لە دوای نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەوە پەیدابوو.

**دروستبوونی هەڵکۆڵراو**

هەڵکۆڵراوەکان بە مانەوەی بەشە ڕەقەکانی جەستەی زیندەوەرەکە دروستدەبن وەک ئێسک و ددان و بەرگی دەرەوەیان و نینۆک لەدوای مردنیان،

یان بەهۆی کارلێکە کیمیایی و فیزیاییەکانەوە بەشێکی لێ دەمێنێتەوە. هەڵکۆڵراوەکان وا دەناسرێن کە وێنەیەکی زیندەوەرەکەیە و دەلالەت لە زیندەوەرەکە دەکات. بەڵام هەڵکۆڵراو تەنیا بە بەبەردبوون (واتا: بوون بە بەشێک لە توێکڵی زەوییەکە و ئەو خاکەی کە تێیدایە) دروست نابێت، بەڵکوو چەند جۆرێکی دیکەی هەڵکۆڵراومان هەیە کە گەیشتوون بە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕانێک لە پێکهاتەی جەستەیاندا ڕووبدات (واتا: دەقاودەق وەکوو خۆیان ماونەتەوە)، وەک ماموثی بەستوو (جۆرە فیلێکی لەنێوچووە) لەنێو پارچەیەک لە سەهۆڵدا ماوەتەوە. هەندێک جۆری خشۆک و حەشەراتەکان کە لە ماددەی ڕاتنینج (کەتیرە)دا پارێزراون.

## جۆرەکانی هەڵکۆڵراو چین؟

لە سەدەی هەژدەدا، هەڵکۆڵراوەکان دابەشکرابوون بەسەر دوو کۆمەڵەی سەرەکیدا کە ئەوانیش ئاژەڵ و ڕووەک بوون، بەڵام بەهۆی گەشەکردنی زانستی هەڵکۆڵینەوە لە ساڵی (١٩٦٣)دا هەڵکۆڵراوەکان کران بە پێنج کۆمەڵە:

١- هەڵکۆڵراوەکانی جیهانی ئاژەڵان (Animalia)

کۆنترین نموونەیان بۆ پێش٦٠٠ ملیۆن ساڵ دەگەڕێتەوە.

٢- هەڵکۆڵراوەکانی جیهانی ڕووەک (Plantae)

کۆنترین نموونەیان بۆ بەر لە٥٠٠ ملیۆن ساڵ دەگەڕێتەوە.

٣- هەڵکۆڵراوەکانی جیهانی بەکتریا بێناوکەکان (Monera)

کۆنترین نموونەیان بۆ بەر لە ٣،٩ ملیار ساڵ دەگەڕێتەوە.

٤- هەڵکۆڵراوەکانی جیهانی بوونەوەرە تاک خانەکان (Protocticta)

کۆنترین نموونەیان بۆ بەر لە ١،٧ ملیار ساڵ دەگەڕێتەوە.

**٥- هەڵکۆڵراوەکانی جیهانی بوونەوەرە فرە خانەکان**

کۆنترین نموونەیان بۆ بەر لە ٥٥٠ ملیۆن ساڵ دەگەڕێتەوە.

**سەردەمە جیۆلۆجییەکان کامانەن؟**

سەردەمە جیۆلۆجییە جۆراوجۆرەکان بە کورتی ئەمانەن:

١- چەرخی پێش کامبەری (٤،٦ ملیار – ٥٤٦ ملیۆن ساڵ)

٢- چەرخی فانیرۆزۆیکی ( Phanerozoic Eon) لە ٥٤٦ ملیۆن ساڵ تاوەکوو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، ئەمیش دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

أ- ماوە کۆنەکان Paleozoic Era (٢٥١ - ٥٤٣ ملیۆن ساڵ)

سەردەمی کامبەری (٥٤٣ - ٤٩٠ ملیۆن ساڵ)

سەردەمی ئاردەفیشی (٤٩٠ - ٤٣٣ ملیۆن ساڵ)

سەردەمی سیلۆری (٤٣٣ - ٤١٧ ملیۆن ساڵ)

سەردەمی دیفۆنی (٤١٧ - ٣٥٤ ملیۆن ساڵ)

سەردەمی کاربۆنی (٣٥٤ - ٢٩٠ ملیۆن ساڵ)

سەردەمی بەرمی (٢٩٠ - ٢٨٤ ملیۆن ساڵ)

ب- ماوە ناوەندەکان Mesozoic Era (٦٥ - ٢٨٤ ملیۆن ساڵ):

سەردەمی تریاسی (٢٤٨ - ٢٠٦ ملیۆن ساڵ)

سەردەمی جۆراسی (٢٠٦ - ١٤٤ ملیۆن ساڵ)

سەردەمی تەباشیری (١٤٤ -٦٥ ملیۆن ساڵ)

ج- ماوەی سەردەم Cenozoic Era ( لە ٦٥ ملیۆن ساڵەوە تاوەکوو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان)

**هەڵکۆڵراوەکان بەزۆری لەکوێدا هەن؟**

هەڵکۆڵراوەکان لە سەرتاسەری جیهاندا بوونیان هەیە. هەندێک جۆری بەرد هەیە کە هەڵکۆڵراوی تێدا نادۆزرێتەوە لە بەرانبەریشدا هەندێک جۆری بەرد هەیە کە هەڵکۆڵراو یان بەبەردبووی زۆری تێدایە. هەر بۆیە زاناکان بەردەکان بەسەر سێ کۆمەڵەدا دابەش دەکەن:

بەردە گڕکانییەکان Igneous

بەردە نیشتەنییەکان Sedimentary

بەردە گۆڕاوەکان Metamorphic

بە زۆری لە بەردەکانی پۆلێنی یەکەمدا هەڵکۆڵراو نادۆزرێتەوە.

سەبارەت بە بەشی دووەمیش بە کەمی هەڵکۆڵراوی تێدایە، ئەگەریش تێیدا بدۆزرێتەوە دەبینیت کە تێکچووە و کەموکوڕی زۆرە.

لە بەشی سێیەمی بەردەکاندا، زۆربەی هەڵکۆڵراوەکان دەدۆزرێتەوە (کە ئەمیش تێکەڵەیەکە لە بەردە گڕکانی و نیشتەنییەکان) و گۆڕانکاری تێیاندا ڕوویداوە بەهۆی ئەو پەستان و پلە گەرمییە بەرزەی کە لە چینەکانی ژێرەوەی زەویدا هەیە.

**ئەو شتانە چین کە هەڵکۆڵراوەکان دەریانخستووە؟**

هەڵکۆڵراوەکانی ئەمڕۆ دوو شتمان پێ دەڵێن کە هەردووکیان پێچەوانەی پەرەسەندنە:

**یەکەم: چەسپاوی و نەگۆڕان:** هەڵکۆڵراوەکان پێمان دەڵێن کە هەموو زیندەوەران لە ساتی دروستبوونیانەوە لەسەر تەواوترین و ئاڵۆزترین شێوە هاتوونەتە بوون و هیچ جیاوازیان نییە لەگەڵ زیندەوەرانی ئەمڕۆماندا. بەم پێیەش زیندەوەران پەرەیان نەسەندووە، کەواتە ئەم خاڵە گریمانەی پەرەسەندنی هەڵوەشاندەوە.

**دووەم: پەیدابوونی لەناکاو:** هیچ جۆرێکی زیندەوەر نییە کە بە پلەبەندی (تدریجی) لە زیندوەرێکی دیکەوە پەرەی سەندبێت، بەڵکوو لەسەر شێوەیەکی تەواو لە ساتێکدا هاتووەتە بوون کە ئەمەش دیسان هەڵوەشێنەرەوەی پەرەسەندنە لە ڕەگەوە.

بە وتەی سەرخەری پەرەسەندن، «نایلس ئلدرج» (Niles Eldredge)، کۆتایی بەم بەشە دێنین کاتێک دان بەوەدا دەنێت کە هیچ تەفسیرێکیان نییە بۆ هەڵکۆڵراوە زیندووەکان، ئەمەش یەکێکە لە نهێنی گەلێک کە گریمانەی پەرەسەندن توانای تەفسیرکردنی نییە، هەر وەکوو دەڵێت: "وا دیارە کە هیچ جیاوازییەک نییە لەنێوان ئەو بوونەوەرە زیندووانەی کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەژین لەگەڵ باپیرە بە بەردبووەکانیاندا کە لە سەردەمێکی جیۆلۆجی زۆر دوور لەماندا ژیاون. هەروەها هەڵکۆڵراوە زیندووەکان بەڵگەیەکی بەهێز و بەناوبانگن لەسەر جێگیری پەیدابوون (واتا: دروستکردن) و ئێمە دەبێت نهێنی هەڵکۆڵراوە زیندووەکان ئاشکرا بکەین.[1]

**پەرەسەندن و دروستکردن هەر یەکەیان لەسەر چی بەندن و جیاوازی نێوانیان چییە؟**

کاتێک کە بەراود دەکەین لەنێوان لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکان لە بابەتی

---

(١) سەرابستانی بیردۆزی پەرەسەندن لە ڕوانگەی چەرخی کامبەری بەبەردبووەکانەوە، کۆسار ڕەئوف مەعروف (١١٧-١٢٠).

باوەڕهێنان بە گریمانەی پەرەسەندن و باوەڕهێنان بە گریمانەی دروستکردن، دەبینین و یەکسەر هەست بەوە دەکەین کە باوەڕهێنان بە پەرەسەندن چەندە وێرانکەر و مەترسیدار و کوشندەیە بۆ سروشت و ژیانی کۆمەڵایەتی، ئەمەش بەڕوونی لەم خاڵانەدا دەردەکەوێت:

هۆکاری گۆڕان کە گریمانەی پەرەسەندن پشتی پێ دەبەستێت تەنیا ڕێکەوت (سوودفە) و کارلێکە کیمیاییە هەڕەمەکی و بازدانە کوێرانەکانە.

بەڵام گریمانەی دروستکردن پێی وایە کە هیچ ڕووداوێک لە سروشتدا بەڕێکەوت و بەبێ بەرنامەڕێژیی پێشوەخت ڕوونادات.

بەپێی گریمانەی پەرەسەندن، ڕووداوەکان و پرسە بایۆلۆژییەکان لە ئەنجامی پەیوەندنی (هۆکار و بەرەنجام)ی ماددی بەیەکەوە پەیدادەبن.

بەپێچەوانەوە، بەپێی بیردۆزی دروستکردن، ناکرێت نکووڵی لە بوونی هۆکار بکرێت، بەڵام لە ڕاستیدا وێنەدانەوە و ڕەنگدانەوەی ویستی خوداییە، پاشان پێویستە وا لە هۆکارەکان بگەین و خوێندنەوەی بۆ بکەین کە بەشێکن لە هەوڵ و کۆششە کۆڵنەدەرەکانمان بۆ تێگەیشتن لە هۆکاری سەرەکی پشت دیاردە سروشتییەکان.

بەپێی گریمانەی پەرەسەندن، هەڵبژاردنی سروشتی بریتییە لە کێشمەکێشی بەهێز کە مانەوە بۆ بەهێزەکانە و مردنیش بەشی لاوازەکانە، بەڵام ڕاستییە ڕۆحییەکان، وەک: سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی و پشت بەستن و لەخۆبوردن و قوربانیدان لەپێناو یەکدیدا هیچ پێگە و ئەرزشێکی نییە. هەروەها لەبری ئەوەی بیر لە سیفەتی یارمەتی و خۆبەختکردن و گیانفیداکردن بکرێتەوە، پێویستە تەنیا بیر لە خۆمان بکەینەوە و لە خەمی خۆماندا بین نەک کەسانی دیکە. پاشان بیرۆکەی «هیچ کێشەی من نییە ئەگەر کەسانی دیکەلە برسا بمرن، مادام سکی خۆم تێرە»، بیرۆکەیەکی قبووڵکراوە و لۆژیکییە لە کاتی

باوەڕهێنان بە گریمانەی پەرەسەندن.

بەڵام بەپێی بیردۆزی دروستکردن، هەڵبژاردنی سروشتی تەنیا کێشمەکێشێک و پێشبڕکێیەک نییە لەپێناو مانەوەدا کە خۆشەویستی، سۆز و بەزەیی، هاوکاری، لەخۆبوردن و خۆبەختکردن ڕەتبکاتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە پێشبڕکێ لەپێناو مانەوەدا ڕاستە و شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام لە بەرانبەریشدا دیاردەی یارمەتی و پاراستنی یەکدی و بەزەیی -کە بەهۆی بەزەیی خوداوەیە- و گیانفیدایی و خۆبەختکردن شتگەلێکن کە ئەم کێشمەکێشەی لێ بێبەری نییە، ئەمانەش سەد لە سەد دژی هەڵبژاردنی سروشتی گریمانەی پەرەسەندنن، هەموو ڕووداوێک مەبەست و ئامانجی خۆی هەیە کە ئێمە هەمووی نازانین، بۆ نموونە: بۆ پارێزگاریکردن لە هاوسەنگی سیستەمی ژینگەیی ئاژەڵە لاواز و نەخۆشەکان و دەردەدارەکان دەبنە خۆراک بۆ ئاژەڵە بەهێزەکان، بەم شێوەیە ڕووی زەوی ناگۆڕێت بۆ زبڵدان و تۆپەڵێک لە پاشەڕۆ و بۆگەنستان، بەڵکوو بەردەوام ڕووبەرێکی باش دەمێنێتەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو دوای ڕزگاربوون لە جیلە نەخۆش و کۆنەکە، هەر بەم شێوە سووڕی خۆراک بەردەوام دەبێت.

بەپێی گریمانەی پەرەسەندن، یاساکانی سروشت -کە وای دەبینێت ژیانی لە ماددەی نا ئەندامییەوە هێناوەتە بوون- هیچ عەقڵ و هۆش و زانیاری و زانست و هێزێکیان نییە، هەر بۆیە هیچ سوود و بەرەنجامێک نییە لەوەی کە بەدوای دەسەڵاتێکی گەورەتر یان نیگارکێشەکەدا بگەڕێین، چونکەئەم یاسایانە هیچ مەبەست و ئامانجێک لە داناناتیان نییە بەم شێوەی ئێستا، بەپێی ئەم گریمانەیە ئەو هونەرمەندەی کە نەخشەی ئەم یاسایانەی داناوە هەر سروشت خۆیەتی. ئەم لۆژیکەش ئەوە پێویست دەکات کە هەر ئەندامێکی زیندەیی هەبێت، ئەوە لە ئەنجامی چالاکیگەلێک پەیدابووە کە بەڕێکەوت لەنێوان گەرد و گەردیلەکاندا ڕوویانداوە، هەروەها ئەم سیستەمە ڕێکخراوە زیندەییە وردە

لە خۆیەوە هاتووەتە بوون و هەر لە خۆشیەوە کاردەکات، پاشان کەواتا هیچ پێویستییەک نییە بۆ گەڕان بەدوای هونەرمەندێکی داهێنەر و زاناتر کە هۆکارە سروشتییەکان ژمارە و فرمانیانی داڕشتبێت و پاشان هێنابێتنییە بوون.

بەپێچەوانەی ئەمەوە، بەپێی بیردۆزی دروستکردن یاساکانی سروشت هونەرمەندەکە نین، بەڵکوو کاری هونەرین، واتا دەستکردێکی هونەرین کە هیچ عەقڵ و هەست و هۆشێکیان نییە. واتا لێرەدا دروستکارێک و ئافرێنەرێک هەیە کە ئەم «یاسا سروشتییانەی» ئافراندووە و بەرنامە داڕێژی کردوون و ئەم سیستەمە بە فرمانی ئەو دەپارێزرێت، فرمان و چۆنییەتی بەڕێوەچوونی و وردەکاری پاراستنی لەو وەردەگرێت و زادەی ئەوە، هەر ئەوە کە یاساکانی بە شێوەیەک بەرنامەڕێژکردووە کە بە باشترین و بێکەموکوڕیترین شێوە کاربکات، لەبەرئەوەی کە هەموو کۆکین لەسەر ئەوەی ناکرێت فڕۆکەیەک یان ئۆتۆمبیلێک لەخۆیەوە و بە ویستی خۆی بێتەبوون لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە و پێویستە دروستکار و بەرهەمهێنێک دروستی بکات، بە هەمان شێوە ناکرێت و ناگونجێت خانەیەک کە ملیۆنان جار لە پێشکەوتووترین فڕۆکە و ئۆتۆمبیل ئاڵۆزترە یان مێشکی مرۆڤ کە ملیاران جار لە فڕۆکە و ئۆتۆمبیل ئاڵۆزترە، بەبێ بوونی دروستکارێک و بەهۆی ڕێکەوتەوە هاتبێتە بوون

هەندێک لە ماتریالیستەکان (ماددییەکان) گومانی ئەوە دەبەن کە عەقڵ و هەستونەست شاراوەتەوە و لە گەردیلەکاندا بوونی هەیە، ئەمەش بۆ ئەوەی کارەکانیان بە شێوەیەکی نموونەیی بەپێی بەرنامە و بەبێ هەڵە جێبەجێ بکەن و ئەوەی پەیوەست بێت بە دیاریکردنی شوێن و کاتەوە جووڵەی هەموو گەردێک لەم پرۆسەیهدا جووڵەیەکی بایۆلۆژییە، بەڵکوو وا پێناسەی گەرد و گەردیلەکان دەکەن وەک ئەوەی دروستکراوێکی هەستیاری خاوەن ویست بێت.

لەلایەکی دیکەوە، باوەڕهێنان بە دروستکردن هیچ زانست و هەست و

ویستێک ناداتە پاڵ گەرد و گەردیلە، ئەمانە هیچ نین تەنیا تەنۆلکە (Particle) ێکی بێ هەست و ویست و نەزان نەبێت کە فرمانی دروستکارەکەیان بەوردی و ڕێکوپێکی جێبەجێ دەکەن هەروەها بەبێ هیچ بەرهەڵستی یان تەمبەڵی و سستییەک ئەرکەکانیان جێبەجێ دەکەن.

لەگەڵ ئەوەی گریمانەی پەرەسەندن وا خۆی دەنوێنێت و وا دێتە پێش چاو وەک ئەوەی بیروبۆچوونێک و گریمانەیەکی زانستی بایۆلۆژی بێت، بەڵام لە ڕاستیدا بنەما و ڕەهەندێکی فەلسەفی هەیە کە لەسەر بیرۆکەی ماددی و ناباوەڕی دانراوە لە ماوەی سەدە و نیوێکدا و بووە بە چەکێک کە وەک دژکارێکی باوەڕهێنان بە خودا لە ژێر ناوی زانستدا بەکاردەهێنرێت، هەر بۆیە نابێت ئێمە وەها لە پەرەسەندن بڕوانین وەک ئەوەی کە بیردۆزێکی زانستی بێت، بەڵکوو بیروباوەڕێکی دژ بە ئایین و گریمانەی بەزانستیکردنی ناباوەڕییە

بە پێچەوانەوە، باوەڕهێنان بە ڕاستیی دروستکردن تێڕوانینێکی جیهانگیری تەواوە و بنەماکەشی دەگەڕێتەوە سەر سەرچاوە ئایینییەکان، هەروەها هیچ جیاوازییەک لەنێوان گریمانەی پەرەسەندن و دروستکردندا نییە، لەوەی کە پەیوەست بێت بە «زانستی بوون»ی هەردووکیانەوە لەم دەمەی ئێستاماندا، بەڵام تاکە جیاوازی ئەوەیە کە گریمانەی پەرەسەندن تێڕوانینێک و دیدێکی جیهانگیری ناباوەڕییە و ڕاستیی دروستکردنیش دیدێکی جیهانگیری یەکتاپەرستییە.

ئاسانە سەرنجی ئەو زمانە تایبەتییە بدەین کە سەرخەرانی ئایدۆلۆژیای پەرەسەندن بەکاریدەهێنن لە کاتی لێکدانەوەیان بۆ دیاردەکانی سروشت، بۆنموونە دەڵێن: "بوونەوەرە زیندووەکە پەیدابووە"، "پەیدابووە لە ڕێگەی پەرەسەندنەوە"، "بە تێپەڕبوونی کات کاریگەریی نەما"، "لە ڕێگەی خۆ گونجاندنەوە بەدەستی هێنا"، "لە ئەنجامی هەڵبژاردنی سروشتییەوە

بەدەرکەوت"، هەموو ئەم دەستەواژانە و ئەوانی دیکەش ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە کە هیچ خوداوەند و دروستکارێک بوونی نەبێت و هاوکێشەکە هیچ پێویست بە دانانی خودا نەکات، چونکە«یاساکانی سروشت» دروستکارن.

بە هەمان شێوە سەرخەرانی بیرۆکەی دروستکردن دەستەواژەی تایبەت بە خۆیان هەیە، بۆ نموونە: "مرۆڤ لەسەر ئەم شێوەیە دروستکراوە"، "مرۆڤ لەسەر جوانترین شێوە دروستکراوە"، "لەسەر تەواوترین و ڕێکوپێکترین شێوە و دیزایین دروستکراوە و دیزایینکراوە"، "خودای مەزن توانای بێسنوورە و دەتوانێت هەموو شتێک ئەنجام بدات"، هەموو ئەم دەستەواژانەش ئاماژە بە بوونی دروستکارێک دەکەن لە ماوەی جەختکردنەوە لە ئاڵۆزی و وردی و نەخشە بۆ دارێژراوی زیندەوەراندا، لە ماوەی سەرنجدانەسەر بوونی بەرنامە و سیستەم و ڕێکخستنی شێوە لە بوونەوەرە زیندووەکان و پرۆسە سروشتییەکاندا.

سەرخەرانی گریمانەی پەرەسەندن وای دەبینن کە بوونی ئەندامی گونجاو و وردکار لە جەستەدا و هەستانی بە ئەنجامدانی کارەکەی بە جوانترین و ڕێکوپێکترین شێوە لە بوونەوەرە زیندووەکاندا بەرەنجامی کردارەکانی خۆگونجاندن و هەڵبژاردنی سروشتییە، هەر بۆیە هیچ ژیرییەک لەوەدا نییە کە بە دوای ئامانج یان مەبەست لە پشت ئەم بنیاتنانەوە بگەڕێین، یان بیر لە دروستکار (خودا) بکرێتەوە.

لە لایەکی دیکەوە، سەرخەرانی بیردۆزی دروستکردن بڕوایان وایە کە دروستکار هەر ئەندامێکی بە مەبەست و ئامانجێکی دیاریکراو بە دانایی و زانایی و حەکیمیی خۆی دروستکردووە، لەبەرئەوەی کە کارگە ئەندامییەکانی وەک خانە و ئەندامە ئاڵۆزەکانی وەک چاو و مێشک و دڵ و هەموو ئەندامەکان ڕێکخستنێکی نموونەییان هەیە، بۆیە ناکرێت و ناگونجێت ئەم ڕێکخراوانە لە پێکهاتەیەکی ناتەواوە گۆڕابن بۆ شێوەیەک کە کارەکانی لەسەر جوانترین و

تەواوترین شێوە جێبەجێ بکات لە ڕێگەی پەرەسەندنەوە و بەبێ بوونی ڕێگەیەکی دیکە، چونکەئەم گریمانە و بیرۆکەیە خۆی لە خۆیدا پێویستی بە بوونی ویست و دەستێکی زانا و دانا هەیە. ئایە دەکرێت کەسێکی ژیری بەهەست ئەندێشەی ئەوە بکات کە دوو ئەندامی دیاریکراو لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە پەرەیانسەندووە تاوەکوو بوون بەچاو یان گوێ یان مێشک بەبێ دووبارەبوونەوە، ئەمە لە کاتێکدا کە هیچ شتێک بوونی نەبووە لە سەرەتادا؟!

بەپێی گریمانەی پەرەسەندن، هیچ پێویستییەک بە جیاکردنەوەی مرۆڤ نییە لە بوونەوەرە زیندووەکانی دیکەیان ڕێزدار و گەورەتر بکرێت لە زیندەوەرانی دیکە و فەزڵی بدرێت بەسەر بوونەوەرە زیندوەکانی دیکەدا، چونکەمرۆڤ جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ لقی مەیمونەکاندا، بەواتایەکی دی: مرۆڤ هیچ نییە تەنیا ئاژەڵێک نەبێت کە زیاتر زیرەک و ژیر و هۆشمەندترە، بەپێی ئەم دیدەش مرۆڤەکان دەتوانن کە شوێن یاسا سەرەکییەکانی ئاژەڵان بکەون و ئەو کارانە ئەنجام بدەن کە ئەوان ئەنجامی دەدەن، بەوەش مرۆڤەکان وردە وردە لە بەرگی بەها ڕەوشتی و باڵا و مرۆڤایەتییەکان دێنە دەرەوە بەرەو ئاژەڵبوون.

بەڵام بەپێی بیردۆزی دروستکردن، خودای دروستکار مرۆڤی بە شێوەیەکی جیاواز و ناوازە لە زیندەوەرانی دی بەدیهێناوە بۆ ئەوەی کە دروستکارەکەی بناسێت و باوەڕی پێ بهێنێت و پاشانیش بیپەرستێت، لەم پێناوەشدا خودای باڵادەست چەندین بەخششی وەک ژیری و دڵ و ڕۆح و چەندان بەخششی دی پێ بەخشیون کە توانا هەستی و زانستییەکانی باشتر کردووە. بەهۆی ئەوەش کە مرۆڤ باشترین دروستکراوە، پێویستە جیاوازی و گەورەیی سروشتی خۆی بسەلمێنێت لە زیندەوەرانی دی لە ڕێگەی باوەڕهێنان بەدروستکار و ئافرێنەرەکەیەوە و شوێن ئەو بنەما ڕەوشتی و باڵایانە بکەوێت کە ئەو فرمانی پێدەکات، دان بنێت بە بەخشش و میهرەبانییەکانی خودا و سوپاسگوزاری خودا بکات بۆ دروستکردنی لەسەر جوانترین شێوە، دیسان لەسەر مرۆڤەکان

پێویستە کە تێگەیشتوویی و ژیری خۆیان بسەلمێنن بە داننان و هەستکردن بە بوونی خودای ئافرێنەر.

گرنگترین بەرئەنجامی باوەڕهێنان بە گریمانەی پەرەسەندن و ڕازیبوون پێی وەک ئەوەی کە دین و ئایین و بەرنامە بێت وەک هەموو دیدە جیهانگیرەکانی دیکە کاریگەریی خۆی لەسەر تاک و کۆمەڵگە هەیە، دەرگای نوێ بە ڕووماندا دەکاتەوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر زۆربەی بوارەکانی زانست، سەرەتا لە زانستی گەردوونەوە و پاشانیش بۆ زانستی کۆمەڵایەتی و لە زانستی فیزیاوە بۆ زانستی دەروونناسی. هەندێک لە بیردۆزەکان، وەک: بیردۆزی ئابووری مارکس و بیردۆزی دەروونیی فرۆید یەکیان گرتووە و هاوپەیمانییەتییەکیان پێکهێناوە لەگەڵ گریمانەی پەرەسەندندا بۆ هێرشکردنە سەر هەمان ئامانج. هەروەها ئەوانەی باوەڕیان وایە گەردوون هیچ خاوەن و پاشایەکی نییە و باوەڕیان بەوە نییە کە لە داهاتوودا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت لەسەر هەموو ئەو کارانەی ئەنجامی دەدەن، هەڵدەستن بە ئەنجامدانی هەموو کارێک بەبێ سڵکردنەوە لە هیچ شتێک و ژینگەی دەوروبەریان دەقۆزنەوە.

بەڵام ئەو باوەڕەی لەسەر یەکێک لەئایینە ئاسمانییەکان دامەزراوە و دیدە جیهانگیرەکەی لە هەموو کار و گوفتارێکیدا شوێنکەوتوویی و باوەڕهێنانەکەی ڕەنگدەداتەوە، سەرنجدانی ئەم تاکە و خەملاندنی بۆ سروشت لە هەر بوارێک لە بوارەکانی زانستدا بێت کە دەیخوێنێت لەژێر ڕۆشنایی بەها باڵا و ڕەوشتییەکاندا لێکدانەوە و خوێندنەوەی بۆ دەکات و ویژدانی لە خەوی بێئاگایی وریا دەکاتەوە. بێگومان هەر لێکۆڵینەوەیەکی زانستی کە لەم دیدەوە بەرهەمبێت سوودبەخش دەبێت بۆ هەموو مرۆڤەکان، ئەم دیدەش چەند کاردانەوە و بەرهەمێکی هەیە کە گرنگترینیان ئەمانەیە: پارێزگاریکردن لە ژینگە و پاراستنی هەموو شێوە و وێنەکانی ژیان و گرنگیدان بە مرۆڤ و سروشت بەیەکسانی و مامەڵەکردن لەگەڵیدا وەک ئەوەی کە ئەمانەتێکی خوداییە.

بە شێوەیەکی گشتی کارێکی سەخت و دەگمەنە کە گفتوگۆیەکی یەکلاکەرەوە ببینین دەربارەی گریمانەی پەرەسەندن و بیردۆزی دروستکردن لەنێوان ئەو زانایانەدا کە بیرۆکە و بۆچوونەکانیان بەپێی ئەم دوو بیرۆکەیە گەڵاڵە دەکەن، چونکەبابەتی ئەم دوو بیرۆکەیە سنووری زانست تێدەپەڕێنێت و خاوەن سروشتێکی تایبەتن کە پێویست بە تەفسیر و لێکدانەوە دەکەن. خۆ ئەگەر بابەتەکە بە شێوەیەک بووایە کە بکەوتایەتە سنوور و چوارچێوەی زانستەوە، واتا ئەگەر چۆکیان دابدایە بۆ ئەزموون (تەجروبە) و تاقیکردنەوە و تێبینییەکان، ئەوە هیچ کێشەیەک ڕووی نەدەدا. بۆ نموونە: هیچ کێشە و گرفتێکی ئەوتۆ پەیدانابێت لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ بابەتە فیزیاییەکاندا کە دەکەونە سنووری زانستەوە، وەک یاساکانی کێشکردن و فرهوانبوونی گەردوون و هێزی بەرزکردنەوەی ئاو و پەستانی هەوا، بەڵام ئێمە زۆر گفتوگۆ و موناقەشە دەبینین لەسەر بیروباوەڕ و دیدە جیهانگیرەکان. لە فیزیاشدا کارەکە بە هەمان شێوەیە کاتێک کە بابەتەکە پێوەرێکی گەردیلەیی نەبێت، وەک میکانیکی کوانتەم (کم) و ماددە دژبەیەکەکان و بوون لە بەرانبەر نەبووندا و جگە لەمانەش.

هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مرۆڤەکان هەست بە پێویستی باوەڕهێنان بە سیستەمێکی باڵا و دەستگرتن پێوەی دەکەن، ئەم پێویستییەش سروشتی بەرهەمهاتوو لە دروستکردنیانەوە سەپاندوویەتی بەسەریاندا، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان تێر بخۆن لە هەستکردن بەباوەڕ و پەیوەستبوون لە دڵ و دەروون و هەستیاندا هەبێت -بۆ ئەم مەبەستەش پەرتووکی بینراوی خودا (گەردوون) و پەرتووکی خوێندراوی خودا (قورئانی پیرۆز) باشترین سەرچاوەن- لەسەریان پێویستە یان سەرنج لە گەردوون بدەن وەک ئەوەی کە کارێکی هونەری و بەرهەمێکی خوداییە یان بەرەنجامێکی سروشتی پەرەسەندنە. لەم قۆناغەدا گرنگی هەڵوێستی کەسی زانامان بۆ دەردەکەوێت، ئەگەر زانیمان کە هەموو زانایەکی گەورەبوو لە ژینگەیەکی خێزانی و کۆمەڵایەتیی تایبەت و ئیمانیدا و

باوەڕدار بە هەندێک لە بەها و مەبدەئەکان، ئەوە هیچ کاتێک پێشبینی ئەوە ناکرێت کە ببێتە کەسایەتییەکی بابەتی لە حوکم و بڕیارەکانیدا، هەروەها ئەو زانایەی لە لۆژیکی ئیمان دەکۆڵێتەوە -کە ناوی زانای موتەدەین و باوەڕداری لێدەنرێت- لە داهاتوودا هەر ئاماژە بە دروستکار دەکات لە کاتی لێکدانەوە و تەفسیرکردنی بەرهەمی لێکۆڵینەوەکانیدا. لەکاتێکدا ئەو زانایەی کە هەموو شتێک لە دیدگای ناباوەڕییەوە سەیر دەکات، بەپێی فەلسەفەی ماددی یان دانراوەکان لێکدانەوە و تەفسیری بەرەنجامی لێکۆڵینەوەکانی دەکات. لەگەڵ ئەوەی هەموویان بە تێڕوانینێکی جیهانگیر دەژمێردرێن، بەڵام پێویستە بەڵگە و بیروبۆچوونەکانی یەکدی زۆر بەنەرمونیانی و بەڕێزەوە وەربگرین و لەلایەن هەردوو لاوە گفتوگۆیان لەسەر بکەین، نابێت هیچ لایەک دەمارگیربێت بۆ بۆچوون و بەڵگەکانی خۆی و بەرچاو تاریک نەبێت بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لە بەڵگەکانی بەرانبەر.

پێشکەشکردنی پەرەسەندن وەک ئەوەی کە بەکرداری سەلمێنرابێت یان کۆڕاییەک هەبێت سەبارەت بە هەموو بابەتەکانی پەیوەست پێوەی کارێکە کە پێچەوانەی هەموو پرەنسیپ و بنەما ڕەوشتییەکان و گفتوگۆ زانستییەکانی سەردەمە. لە واقیعدا هەر چەندە کاریگەری گریمانەی پەرەسەندن کە داروین نوێی کردووەتەوە و دایڕشتۆتەوە بەدەمەوەچوونێکی فرهوانی هەبووە و تاوەکوو ئێستاش بە جۆرێک لە جۆرەکان لە کۆمەڵگەدا لایەنگری هەیە، بەڵام دەتوانین وەڵامدانەوە و ڕیسپۆنسەکانی سەرەتا بخەملێنین، تەنانەت هەندێک لەو گومانانەی کە ئایدۆلۆژیا ئایینییەکان لە کەنیسەدا و هەندێک لە تەفسیرە زاراوەییەکانی ئینجیل چاندیان، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بێتوانایی سەرچاوە مەسیحییەکان لە پێشکەشکردنی وەڵامی پێویست و هەنووکەیی بۆ ئەم گومانە تازە چەکەرە کردووانە. بەم شێوەیەئەم گریمانەیە شوێنی خۆی لە جیهانی زانستدا بە پلەبەندی کردەوە و بەردەوام بوو لە کار و خزمەت تاوەکوو

بڕوانامەی زانستیبوونی بەدەستهێنا. لەو دەمەشدا زانا دیندارەکان بێدەنگ بوون بەهۆی ترسانیان لە تاوانبارکردنیان بە دواکەوتوویی و کەوتنە نێو ئەو گێژاوەی کە سەرخەرانی پەرەسەندن فەراهەمیان هێنابوو. ئەو سەرخەرانەی باوەڕپێکراوی و متمانەی خۆیان بەکارهێنا بۆ بە ئەنجام گەیاندنی سوود و بەرژەوەندییە کەسییەکانی خۆیان.

پەڕتووکەکانی خوێندن پڕکران لە وێنەی مەیموون کە گۆڕانێکی پلەبەندی دەردەخست لە زیندەوەرگەلێکی هاوشێوەی مەیموونەوە بۆ زیندەوەرگەلێکی هاوشێوەی مرۆڤ و پاشان مرۆڤ، وەک ئەوەی کە بەڵگەی جێگیر و سەلمێنەر هەبێت لەسەر ئەم بابەتە، ئەم وێنانە هەوڵیان دەدا ئەوە تەفسیر بکەن کە چۆن ئەو بوونەوەرە لە مەیموون چووانە کەوتوونەتە سەر پێیەکانیان دوای ئەوەی کە ڕادەوەستان لەسەر دوو دەست و دوو لاقیان (چوار پێیەکان) و چۆن ئێسکی شەویلگەی خوارەوەیان ڕێک بووەتەوە لەگەڵ سەرەوەیاندا و چۆن مووەکانیان لە ڕووی شوێن و چڕییەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، سەرەڕای ئەمەش، موناقەشە و کێشمەکێشێکی گەورە هەبوو لەسەر ئەو بوونەوەرەی کە پێشینەی مرۆڤە، ئەو بوونەوەرەی کە نێوەندگیرە لەنێوان ئەم مرۆڤدا، چونکەبەپێی ئەم بۆچوونە ئێمە لە زیندەوەرێکی هاوشێوەی مەیموونەوە هاتووین، کەواتا لێرەدا دوو زیندەوەر هەیە کە ئەوانیش هاوشێوەی مەیموون و مرۆڤن، باشە ئەی کەواتە ئەو زیندەوەرانە لە کوێن کە لەنێوان لەمەیموون چووەکە و مرۆڤدان؟ بەم زیندەوەرە نادیارانە دەوترێت: «زیندەوەرە نێوەندییەکان» یاخود «شێوەی گواستراوە»، کە تاوەکوو ئەم دەمەی ئێستاشمان هیچ زیندەوەرێکی نێوەندی نەدۆزراوەتەوە و بوونی نییە بۆ هیچ پۆلێک لە پۆلەکانی زیندەوەران و بە تایبەتیش مرۆڤ.

سەرەڕای ئەوەی کە پەرەسەندن بەو ڕەگەزنامەوە پێشکەشکرا کە یاسایەکی جێگیری زانستیی لە زۆرێک لە وڵاتەکاندا تاوەکوو پەنجاکانی سەدەی بیستەم،

بەڵام لەم ساتەدا موناقەشەکان لەنێوان سەرخەرانی پەرەسەندن و دروستکردندا گەرم بوون، ئەمەش دوای ئەوەی دەرکەوت کە هەندێک لە هەڵکۆڵراوەکان کە سەرخەرانی پەرەسەندن پێشکەشیان کردبوو ساختەو لاواز بوون.

لەم بارودۆخەدا -لە بارودۆخێکدا کە ئاسان نەبوو تەعبیر لە هەر بیرۆکەیەک بکرێت کە دژی پەرەسەندن بێت- «واتسۆن» و «کریک» پێکهاتەی گەردی (DNA)یان ئاشکراکرد، بەیانیان کرد لە ساڵی (١٩٥٣)دا، بە دۆزینەوەی پێکهاتەی لوولپێچی }DNA -کە ئەمەش پێکهاتەیەکی بەرنامەیی و سیستەماتیکە و بە هیچ شێوەیەک پشت بە ڕوودانی سوودفە نابەستێت لە خانەکاندا، پاشان لە هەر بوونەوەرێکی زیندوودا -ئەم پێکهاتە نموونەییە بە شێوەیەکی خێرا و فرهوان لە جیهاندا ناسرا و دووبارە ژیان و ڕۆحی بۆ بیردۆزی دروستکردن گێڕایەوە، لەم ساتەشدا هەندێک لە زانایان دەستیان کرد بە گەنگەشەکردنی ڕێگە و ڕێبازێکی نوێ کە دژی پەرەسەندن بوو، بزووتنەوە و جووڵانەوەیەکی دژ بە پەرەسەندن بوو، ئامانج و مەبەستیشی ئەوە بوو کە دروستکردن -کە لەڕاستیدا ئایینە ئاسمانییەکان سەلماندوویانە- بە تەواوی گونجاوە و یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئەو ڕاستییانەی کە زانستی سەردەم پێی گەیشتووە.

بە پلەبەندیش کارەکە گەیشتە ئاستێک کە هەموو دۆزینەوەیەکی زانستی گەردی و بۆماوە و کیمایی و زیندەیی و کۆرپەلەناسی و کاری ئەندامەکانی لەش و فیسیۆلۆژی ئاستی گومڕایی و سەرگەردانی ئەو زانیارییانەیان بەدەردەخست کە زانایان لایان بوو سەبارەت بە خودی دیاردەی ژیان، چونکە هەر دۆزینەوەیەکی نوێ، لایەنێک لە لایەنە موعجیزاوییەکانی لەم ژیانە ئاڵۆزەدا بەدەردەخست، لەگەڵ چەسپاوی ئەم ڕاستییانەدا کە دەرکەوتن -بە شێوەیەک ئهستهم بوو وا تەفسیری بۆ بکرێت کە بە سوودفە هاتووەتە بوون- بوونە بەربەستێک لە ڕووی پەرەسەندندا کە زۆر ئەستەم بوو لێی دەربازبێت، پاشان سەرخەرانی بیردۆزی دروستکردن توانیان یەکجارەکی لەم گێژاوە ستەمکار و خۆسەپێنەی

پەرەسەندن ڕزگاریان بێت کە لەگەڵ دەسەڵاتی پەرەسەندندا و لە سەرەتای دەرکەوتنییەوە دەستی پێ کردبوو، هەروەها ساڵ لە دوای ساڵ لێکۆڵینەوەکان کێشە و تەزویرکارییەکانی پەرەسەندنیان بەدەردەخست کە لە هەڵکشاندا بوو، پاشان هەندێک ڕێکخراو دامەزران کە پشتگیری ڕاستیی دروستکردنیان دەکرد، وەک: «دەستەی لێکۆڵینەوەی دروستکردن» لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەم شێوەیهدەنگی نارەزایی دژی گریمانەی پەرەسەندن لە لایەن ئەو زانایانەی بڕوایان بە دروستکردن هەبوو بە درێژایی سی ساڵی پێشوو بەرزکرایەوە، لە بەرانبەریشدا پێگەی بەڵگەکان کە پشتگیری پەرەسەندنی دەکرد بە شێوەیەکی بەرچاو لاواز بوو.

هەموو ئەمانەش وایکرد کە موناقەشەیەکی زۆر بە دوای خۆیاندا بهێنێن لە ڕێکخراوەکانی ڕۆژئاوادا، هەروەها دەستکرا بە لێکۆڵینەوە و خوێندنی هەر دوو بیرۆکەکە وەک ئەوەی فەلسەفەیەکی بایۆلۆژی بێت و چەندین بیروبۆچوون بۆ سیستەمی خوێندنی قوتابخانەکان و پەرتووکەکانی خوێندن زیادکرا لە هەندێک وڵاتدا، وەک: تورکیا لە ساڵی (١٩٨٠)دا، بەڵام ئەم سیستەمە بابەتییە بووە هۆی بێزارکردنی سەرخەرانی پەرەسەندن، هەر بۆیە کەوتنە هەوڵ بۆ ئەوەی کە بیرۆکەکە جیابکەنەوە و دای ببڕن لە مەبەستە ڕاستەقینەکەی لە ڕێگەی ڕەخنەگرتن لە خوێندنی بیرۆکەی ڕاستیی دروستکردن، وەک گومان بردنیان بۆ ئەوەی کە دین پێچەوانە و دژبەیەکە لەگەڵ بنەما گشتییەکاندا. بە خێرایی مۆرکی سیاسییان بۆ بابەتەکە زیادکرد وەک ئەوەی کە ئەمە کێشمەکێشێک بێت لەنێوان پێشکەوتن و دواکەوتندا و بە شێوەیەک لە شێوەکان پردێکی پەیوەندییان لەنێوان باوەڕهێنان بە دروستکردن و دواکەوتوویدا دروستکرد، بەڵام ئێمە بەرەو داهاتوویەک هەنگاو دەنێین کە تا ڕاددەیەک بە ئازادیی ڕادەربڕین بۆ ئەم پرسە کارێکی قبووڵکراوە، من بڕوام وایە کە گفتوگۆی هێمنانە و یەکدی قبووڵکردن و گفتوگۆی بێدەمارگیری کە ڕێز لە دین و زانست بگیردرێت

و وای نەبینێت کە پێچەوانە و دژ بەیەکن و بیرۆکەیەکی گونجاو و کۆکی لێ بەرهەمدێت و لە کۆتاییدا دڵ و مێشک و ڕۆح پێی ڕازی دەبن[١].[٢]

## وتووێژ و گفتوگۆ و چەند پرسیارێکی زۆر کورت دەربارەی پەرەسەندن

پەرەسەندن وەک «مایکڵ بیهی» دەڵێت: "بریتییە لە پەیدابوون و هاتنەکایەی زیندەوەرێکی سەرەتایی لە نەبوونەوە، پاشان پەرەسەندن و گۆڕانی ئەم زیندەوەرەیە بۆ زیندەوەرێکی دیکە."

کەواتە یەکەمین و گەورەترین کێشە لە پەرەسەندندا بریتییە لە مەتەڵی پەیدابوونی ژیان، وەک «ئەلیکساندەر ئۆپارین» دەڵێت: "پەیدابوونی ژیان ڕەشترین پەڵەیە لە بیردۆزی پەرەسەندندا"، لێرەوە دەڕۆین بۆ قووڵایی بابەتەکە، ئایا ئەم زیندەوەرە چۆن هاتە بوون؟ دەڵێین زیندەوەری یەکەمی زیندەوەرێکی سەرەتایی بەکتریا ئاسا بووە. زۆرباشە، بەکتریا تاکێکە لە پۆلی زیندەوەران (DNA) یان RNA)) پێک دێت، کام لەم دووانە زووتر هاتە بوون؟ چونکە ئەوەی یەکەم بەبێ دووەم دروست نابێت، ئەوەی دووەمیش بەبێ بوونی یەکەم دروست نابێت. تۆزێکی دیکەورد ببینەوە و دەگەین بەو پرسیارەی ئایا بۆماوەیی ئەم زیندەوەرانە لە چەند جینەوە هاتووەتە بوون؟ بەپێی پەرەسەندن

---

(١) سەرابستانی بیردۆزی پەرەسەندن لە ڕوانگەی چەرخی کامبەری بە بەردبووەکانەوە، کۆسار ڕەئوف مەعروف (٧٧-٨٥).

(٢) بەکورتی و بەپوختی دەکرێ بڵێین سێ بۆچوون هەیەبۆ چۆنیەتی دروستبوون و خەلق و دروستکردن و هانەبوونی بوونەوەر و زیندەوەران:
١. پەرەسەندن (تطور)
٢. دروستکردن
٣. دروستکردن لەڕێگەی پەرەسەندنەوە (تطویر).
زۆر گرنگەناگامان لەو بۆچوونەی سێیەمیش هەبێت، چونکەبەشێک لەبڕواداران و موسڵمانانیش باوەڕیان بەم بۆچوونەهەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان بەخودا هەیە، واتەپێیان وایەخودا لەڕێگەی پەرەسەندنەوەبوونەوەر و زیندەوەرانی دروستکردووە، واتەلەپشتی ئەم پرۆسەیە هێزێکی دەرەکی هەیەکەخودایە، کەواتەدەبێت بە(تطویر) گەشەپێدان، واتەخودا گەشەی پێداوە، نەوەک خۆی گەشەی سەندبێت.

دەبێت لە سفری جینییەوە هاتبێتنە بوون، بەڵام بەپێی زانستی بایۆلۆژی ئەم کارە ئەستەمە، چونکە بە کەمتر لە دەیان جین زیندەوەر ناتوانێت کارەکانی ڕابپەڕێنێت.

لێرەدا دەوەستین و زیاتر ناچینە قووڵایی بابەتەکەوە. بەشی دووەمی پەرەسەندن بریتییە لە گۆڕانی زیندەوەر بۆ زیندەوەرێکی دیکەی باشتر و بەهێزتر، باشە کەواتا میکانیزمی ئەم گۆڕانە و پەرەسەندنە چۆنە؟ ئەگەر پەرەسەندن ڕوویدابێت وەک داروین دەڵێت: پرۆسەیەکی هەنگاو بەهەنگاوە و لەم پرۆسە و هەنگاوگەلەدا هەنگاوی نێوەندی هەن، ئەی بەڵگەی ئەم هەنگاوە نێوەندییە لە کوێیە؟

یان ڕوونتر بڵێین: هەڵقەی نێوەندی لە کوێیە؟ کەمێک دەگەڕێینەوە بۆ دواوە، لە پێشەوە وتمان: پەرەسەندن گۆڕان و پەرەسەندنی زیندەوەرە بۆ باشتر، لێرەدا پرسیارێک بە بیرماندا دێت، کێ باشترەکان دیاری دەکات؟ داروینیستەکان دەڵێن: هەڵبژاردنی سروشتی. باشە، ئەی بەڵگەی ڕاستەوخۆ چییە لەسەر ڕوودان و هێزی هەڵبژاردنی سروشتی؟

پاشان هەنگاو دەنێین بەرەو بەڵگەکانی ڕوودانی خودی پەرەسەندن، یەکێک لەو بەڵگانەی هیوای داروینە و لە ڕووی لۆژیکیشەوە بە بەهێزترین و یەکلاکەرەوەترین بەڵگە هەژمار دەکرێت ئاسەواری زیندەوەرە جۆربەجۆرەکانە لە چەرخە جیۆلۆجییە جۆربەجۆرەکاندا، کە بە هەڵکۆڵراوەکان دەناسرێت. زۆربەی زۆری زیندەوەران کە نزیکەی لەسەدا (٩٥)ی لقی زیندەوەران دەگرێتەوە لە چەرخی کامبەریدا بە شێوەیەکی لەناکاو هاتوونەتە بوون! تەفسیری پەیدابوونی ئەم کۆمەڵە و بە شێوەی لەناکاو چییە؟

یەکیکی دیکەلە پرسیارە شیکارنەکراوەکان ئەوەیە ئەندامێکی وەک چاو بەمیکانیزمێک کاردەکات کە بچووکترین کەموکورتی تێیدا ڕووبدات تێک

دەچێت و کارناکات. کەواتە ئەم سیستەمە چۆن پەرەی سەندووە لەکاتێکدا چکۆلەترین کەمی قەبووڵ ناکات؟ ئەمەش بەسەر قامچی بەکتریا و میکانیزمی قەتماغەبوونی خوێن و چەندین شتی دیکەدا جێبەجێ دەبێت.

کەواتا پرسیارە شیکارنەکراوەکان ئەمانەن:

١. ژیان لە سەرەتادا چۆن هاتووەتە بوون؟

٢. ئایا کاتێک ژیان دەستی پێکرد، کام لە دوو بۆماوەکە زووتر هاتە بوون (RNA) یان (DNA)؟

٣. ئایا یەکەم زیندەوەر لە سفری جینییەوە دەستی کردبوو بە بوون؟

٤. میکانیزمی گۆڕانی پەرەسەندن چۆنە؟

٥. هەڵقەی نێوەندی کوا، لە کوێیە؟

٦. بەڵگەی ڕاستەوخۆ لەسەر هەڵبژاردنی سروشتی چییە؟

٧. تەفسیری پەیدابوونی لەناکاوی زیندەوەران لە چەرخی کامبەریدا چییە؟

٨. تەفسیری چۆنییەتی پەیدابوونی ئاڵۆزی چاو و قامچی بەکتریا چییە؟

## جیهانبینی و بوونناسی ئیسلامی

ئیسلام خاوەنی جیهانبینی خۆیەتی، دەربارەی (خودا، گەردوون و بوون، ژیان، مرۆڤ، ...).

### دەربارەی خودا

١. خودا دروستکەر و بەدیهێنەر و ڕێکخەر و ئەندازەگیری بوون و گەردوون و بوونەوەرانە.

﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ﴾ [لقمان: ١٠]

ئاسمانەکانی دروست کردووە بەبێ کۆڵەکە بەچاوی خۆتان دەیانبینن، لە زەویشدا کێوەکانی دامەزراندووە کە لەنگەری زەوییان ڕاگرتووە و (چەندەها سوودی تریان هەیە) نەوەکو ژێرە و ژووربن و لاربنەوە، جۆرەها زیندەوەر و گیانلەبەریشی تێدا بڵاو کردووەتەوە، (هەروەها دەفەرموێت): لە ئاسمانیشەوە ئاومان دابەزاند، جۆرەها ڕووەک و گژوگیای هاو جووتی بەسوود و بە کەڵک و جوان و ڕازاوەمان لە زەویدا پێ ڕواند.

﴿هَٰذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ [لقمان: ١١]

ئا ئەمەیە دروستکراوانی خوا، وەرن نیشانم بدەن بزانم ئەوانی تر جگە لەو زاتە، چیان دروست کردووە، نەخێر هیچیان دروست نەکردووە، بەڵکوو ستەمکاران هەمیشە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.

﴿قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُلِ اللَّهُ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾. [الرعد: ١٦]

(ئەی محمد صلى الله عليه وسلم بە خوانەناسان) بڵێ: کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە؟ (ئەگەر ئەوان بێ دەنگ بوون) تۆ بڵێ: الله پەروەردگاریانە، (چونکە ئەوانە کەڕ کوێر و لاڵن، لەوانەیە دان بەو ڕاستییەدا نەنێن) پاشان پێیان بڵێ: ئایا ڕەوایە جگە لەو خودایە پشت بە شتانی تر ببەستن و بیانکەنە پشتیوان و خۆشەویست، کە ئەوانە تەنانەت بۆ خۆشییان قازانج و زەرەریان بەدەست نیە؟! هەروەها بڵێ: باشە ئاخر کوێر و چاوساغ وەک یەکن؟! تاریکی

و ڕووناکی چوونیەکن؟! (دیارە خوانەناسی و نەبینینی ڕاستی کوێری و تاریکیە، ئیمان و باوەڕ و ڕاستی بینین و خواناسیش چاو ساغی و ڕووناکییە)، بەڵکوو چەند هاوبەشێکیان داناوە بۆ خوا، کەشتیان دروست کردووە وەک دروستکراوەکانی خواو جا دروستکراوەکەیان لێ شێواوە، پێیان بڵێ: الله بەدیهێنەر و دروستکاری هەموو شتێکە و ئەو زاتە تاک و تەنیا و بەدەسەڵات و بەهێز و بە توانایە.

﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾. [الأعلى: ١]

تەسبیحات و ستایشی پەروەردگاری بەرز و بڵند و پایەدارت بکە.

﴿الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ﴾. [الأعلى: ٢]

ئەو زاتەی هەموو شتێکی دروست کردووە بەجوانی و ڕێکوپێک و تێر و تەواویی کردووە.

﴿وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴾. [الأعلى: ٣]

ئەو زاتەی کە نەخشەی کێشاوە بۆ هەموو شتێک و جا ڕێنوێنیی کردووە.

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾. [الأعراف: ٥٤]

بێگومان پەروەردگارتان (الله)یە، کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەوییە لە ماوەی شەش ڕۆژدا (مەگەر هەر خۆیشی بزانێت ئەو ڕۆژانە ماوەیان چەندە).

٢. خودا تاک و تەنیا و بێ شەریک و هاوەڵە.

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾. [الإخلاص: ١]

(ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ئەی ئیماندار) بڵێ: ئەو خودای کە ناوی _ الله_ خودایەکی تاک و تەنیایە (بێ هاوەڵ و هاوتایە).

٣. خودا لە کەس نەبووە و کەسیش لەو نەبووە.

﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ [الإخلاص: ٣]

هیچ کەسی لێ نەبووە و خۆشی لە کەس نەبووە.

٤. خودا لە هیچ کەس و شتێک ناچێت، هیچ شت و کەسێکیش لەو ناچێت، بێ وێنەیە لە زات و سیفەت و کرداردا.

﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾. [الإخلاص: ٤]

هەرگیز هاوتا و هاوشێوە و دەسەڵاتدارێکی تر نییە کە لە بەرامبەرییەوە بوەستێت و هاوشانی بێت.

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾. [الشورى: ١١]

هیچ شتێک نییە لە وێنەی ئەو زاتە، هیچ شتێک لەو ناچێت (چونکە خودایە و بەدیهێنەرە، چۆن لە بەدیهێنراوەکانی دەچێت).

٥. خودا بێ نیاز و بێ پێویستە و جێی نیاز و مەبەستەکانیشە.

﴿اللَّهُ الصَّمَدُ﴾. [الإخلاص: ٢]

خوا زاتێکی پایەدار و دەسەڵاتدارە، نیازی بە کەس نییە و هەموویان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێت بەڵاو و ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازییەکانمان جێبەجێ بکات.

٦. هەموو بوونەوەر و گەردوون لەلایەن خوداوە ڕێنموونی دەکرێت و نەخشە و پلانی بۆ دادەنرێت و فێردەکرێت چۆن بێت و چۆن نەبێت.

﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَىٰ﴾. [طه: ٥٠]

پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە هەموو شتێکی بەتایبەتی و ڕێکوپێکی دروست کردووە، پاشان ڕێنوێنیی کردووە، تا بەچاکی دەوری خۆی ببینێت و (لە خزمەتی

ئادەمیزاددا بێت).

٧. خودای گەورە خاوەنی هەموو سیفەتە جوان و بەرز و تەواوەکانە.

﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾. [الأعراف: ١٨٠]

هەر بۆ خودایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دوعا و نزا بکەن و هانا و هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن، واز بهێنن لەوانەی کە لە ناوە پیرۆزەکانی خودادا لادان دەکەن و (سیفەت و ناوەکانی خوا بەکاردەهێنن بۆ غەیری خوا)، لە ئاییندەدا پاداشتی ئەو کار و کردەوانەیان وەردەگرن کە ئەنجامیان دەدا.

٨. خودا بەشێوەی بینراو و هەستپێکرانی هەستەکی و ئەزموونی و حیسی و ماددی هەستپێکراو نیە، بەڵام بەشێوەی فیتری و سروشتی پاک و عەقڵ و لۆژیک و ڕەنگدانەوەی لە بوون و گەردوون و دروستکراوەکانیدا هەستپێکراوە، چۆن خۆر لە ناو هەموو دڵۆپە ئاوێک و لە سەر هەموو گەریلەیەکدا ڕەنگدەداتەوە، بەهەمان شێوە خوداش لە هەموو گەردیلەیەکی ئەم بوونەدا ناو و سیفەتە جوان و بەرز و تەواوەکانی ڕەنگدەدەنەوە.

﴿لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾. [الأنعام: ١٠٣]

دەزگای بینایی و (بۆچوونی ئادەمیزاد) ناتوانێت ئەو زاتە ببینێت، زانیاری ئەو خودایە هەموو شتێکی گرتووەتەوە، ئاگاداریشە بەهەموو دەزگاکانی بینایی، هەر ئەوە وردبین و ئاگایە.

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾. [فصلت: ٥٣]

ئێمە لە ئاییندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە

ئاسۆکانی بوونەوەردا و لە خودی خۆیشیاندا (بێگومان ئاشکرایە کە لەسەردەمی زانستیدا چەندە نهێنییەکانی بوونەوەر ئاشکرا بووە.. زاناکان بە گشتی و زاناکانی ئەستێرەناسی سەرگەردانن لە وردەکاری و دامەزراوی و گەورەیی و فراوانی ئەم گەردوونە، هەروەها لە ئاڵۆزی جەستەیی و عەقڵیی و دەروونی ئادەرروونی ئادەمیزاد)، ئەمەش بۆ ئەوەی تا چاک بۆیان ڕوون بێت و دڵنیاین کە ئەو زاتە حەق و ڕاست و ڕەوایە، ئایا شایەتی پەرورەردگارت بەس نییە کە بێگومان ئاگا و زانایە بە هەموو شتێک؟!

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ [آل عمران: ١٩٠]

بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لە ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند ...

﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾. [آل عمران: ١٩١]

ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەو زاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشە بیردەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمانەکان و زەوی (بیردەکەنەوە لە هەموو وردەکاریەک، سەرنجی هەموو دیاردەیەک دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروست کراوانەت بێهودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکیی و بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ.

٩. خودا هیچ شتێکی بەبێ هودە دروست نەکردووە.

﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلًا ذَٰلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ﴾. [ص: ٢٧]

ئێمە ئاسمان و زەوی دروستکراوانی نێوانمان بێ هودە و هەڕەمەکەی دروست نەکردووە.

## دەربارەی مرۆڤ

مرۆڤ لە جیهانبینی و تێڕوانینی ئیسلامدا بەم شێوەیەیە:

١. مرۆڤ دروستکراوی خوای گەورەیە.

﴿خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ [علق: ٢]

ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو (لەناو منداڵداندا) دروست کردووە.

٢. مرۆڤ بەجوانترین و باشترین و تەواوترین و چاکترین شێوە دروستکراوە.

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾. [التين: ٤]

بەڕاستی ئێمە مرۆڤمان لە جوانترین شێوە و ڕێکوپێکترین شێوازدا دروست کردووە لە هەموو ڕوویەکەوە.

٣. مرۆڤ (بە هەموو ڕەنگ و زمان و شکڵ و شێوە و نەتەوە و ...) ڕێزلێگیراوە لەلایەن خوای گەورەوە.

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾. [إسراء: ٧٠]

سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووە.

٤. مرۆڤ جێنیشی خوای گەورەیە لەسەر زەوی.

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ [البقرة: ٣٠]

(ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) باسی ئەوە بکە لە دێرین زەماندا) پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت: بەڕاستی من دەمەوێت لە زەویدا جێنشینێک دابنێم (بۆ ئاوەدانی و دینداری و ناسینی من و ...).

٥. خودا چەند شتێکی داوە بە مرۆڤ کە بەم شێوەیە نەیداوە بە هیچ بوونەوەرێکی دیکە، وەک (عەقڵ، ڕووح، ئیرادە و ویست، ئازادی)، ئەوەی دراوە بە مرۆڤ نەدراوە بە بوونەوەرەکانی دیکە، بەئەندازەیەکی زۆر دیاریکراو نەبێت، هەربۆیەشە مرۆڤ گەورەترین و بەڕێزترین و بەرزترین دروستکراوی خودایە و ڕاسپێردراوە بە ئەرک و تەکلیف و ... .

٦. مرۆڤ ئەرکی لەسەرە و بە بێ هودەیی دروست نەکراوە، بەڵکوو ئەمانەتێکی گەورەی لەسەر شانە.

﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾. [الأحزاب: ٧٢]

ئێمە ئەمانەتی (عەقیدە و بیروباوڕ، ئەمانەتی سەرپشکیمان) نیشانی ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکان دا، (یاخود پێشنیارمان کرد کە ئێوە هەڵگری ئەم ئەمانەتە بن)، بەڵام هەمووان دەستیان پێوەنا و ترسان لێی (هەر پێیان چاک بوو ئاوا (مسیر بن، سەرپشک نەبن) کەچی ئادەمیزاد هەڵیگرت و گرتیە ئەستۆی، بەڕاستی زۆر ستەمکار و نەفام بوو (ئەگەر زۆرینە ڕەچاو بکەین).

٧. مرۆڤی چاک و مرۆڤی خراپ وەک یەک نین، نە لە دونیا نە لە قیامەت.

﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾ [ص: ٢٨]

نەخێر، ئەو باوەڕەیان هەڵەیە، بەڵکوو ئایا ڕەوایە پاداشتی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، وەک ئەوانە لێ بکەین

کە تۆوی خراپەیان چاندووە لە زەویدا، یاخود ئایا ئەوانەی پارێزگار و لەخواترسن وەک خراپەکاران سەیریان بکەین؟!

٨. هەموو گەردوون و بوونەوەران بۆ مرۆڤ لەبەر خاتری مرۆڤ و بۆ پاراستن و کەیفخۆشی و .... مرۆڤ دروستکراون، ئەوەش ئەوپەڕی ڕێزە بۆ مرۆڤ.

﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾. [الجاثية: ١٣]

هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێناوە، هەموویشی تێکڕا بەخششن لەلایەن ئەو زاتەوە، بەڕاستی ئا لەو بەخشش و دیاردانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێک کە بیربکەنەوە و تێفکرن.

٩. مرۆڤ ئازادە لە ژیاندا چ جۆرە بیروڕا و ئایینێک هەڵدەبژێرێت، هیچ تۆبزیی و زۆرلێکردنێکیش لە ئاییندا نیە.

﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾. [البقرة: ٢٥٦]

بەهیچ جۆرێک زۆر کردن نییە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا (دینداری بەزۆر نابێت بکرێت و دین بەزۆر نادرێت بەسەر کەسدا).

١٠. مرۆڤ لەلایەن خوداوە بەدرێژایی مێژوو پەیام و پەیامهێن و ئایینی بۆ هاتووە، کۆتا ئایینیان ئیسلامە، ئیسلامیش لەسەر ئاستەکانی (تاک، خێزان، کۆمەڵگە، دەوڵەت، مرۆڤایەتی) و (عەقیدە و فکر، ئەخلاق و سلوک و ئاکار و ئاداب، عیبادەت و پەرستش، مامەڵەی نێوان مرۆڤەکان) بەرنامەی تێروتەسەلی هێناوە.

ئەو مرۆڤانەشی حەق و ڕاستی و ئایینی ڕاستەقینەیان پێنەگەیشووە، بەهیچ جۆرێ لە بابەتە ئایینەکاندا سزای قیامەتی نادرێن. ﴿مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي

لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾. [الإسراء: ١٥]

ئەوەی هەوڵی دابێت ڕێبازی ڕاست و دروست بگرێت، ئەوە بەڕاستی بەقازانجی خۆی تەواو دەبێت و هەر خۆی بەهرە لە هیدایەتەکەی وەردەگرێت، ئەوەش گومڕا بووەو ڕێبازی سەرلێشێواوی گرتۆتەبەر، ئەوە بێگومان هەر خۆی زەرەر دەکات و گومڕاییەکەی لەسەری دەکەوێت، کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت، کەس بەرپرسیار نییە لە هەڵەی کەسانی تر، ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبەرێکی بۆ دەنێرین.

١١. مرۆڤ لە سێ بەش پێک دێت

**یەک:** عەقڵ و هۆش و فکر.

**دوو:** نەفس و ڕووح.

**سێ:** جەستە و جسم.

**بەشە سەرەکییەکانی مرۆڤ و ڕێنمایی ئیسلام بۆیان:**

**١. عەقڵ:** ئیسلام بەرنامەیەکی تێروتەسەل و جوانی هەیە بۆ ڕێنموونی عەقڵ و فکر. وەڵامی تەواوی پێیە بۆ پرسیارە عەقڵی و فکری و فەلسەفییەکان، بە شێوەیەک هیچ شتێک نابینیت لە بنەما نەگۆڕەکانی ئیسلام کە لەگەڵ عەقڵ تێک بگیرێن. بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئیسلام بەرنامە و وەڵامی تەواوی پێیە، قورئان و سوننەتە. هەروەها هەبوونی زانستێکی گرنگ و فراوان بە ناوی زانستی بیروباوەڕ (علم العقيدة الإسلامية). دواتر هەبوونی فکر و فەلسەفەی ئیسلامی، کە هەر یەکێکیان بە سەدان و هەزاران پەرتووکی لەبارەیەوە نووسراوە، بۆیە هیچ بابەتێکی عەقیدەیی، فکری، فەلسەفی و زانستی نابینیت کە زانایان و

بیرمەندان و فەیلوسووفان لێی نەدوابن و پەرتووک و توێژینەوەیان لەبارەیەوە نەنووسیبێت. هەروەک لە ئیسلامدا رێگری لە بیرکردنەوە و عەقڵ بەکارهینان نەکراوە، بەڵکوو فەرمانی بەکارهێنانی پێ کراوە. هەروەها هەموو شتێک کە زیان بە عەقڵ و بیر و هۆش بگەیەنێت، یاساغ و حەرام کراوە. بۆنموونە مادده هۆشبەرەکان. کەواتە ئیسلام بەشە سەرەکییەکەی مرۆڤی پشتگوێ نەخست کە بریتییە لە عەقڵ.

**٢. ڕۆح و ناخ:** ئیسلام بەرنامەیەکی تێروتەسەل و جوانی هەیە بۆ ڕێنموونیکردن و ئاراستەکردنی ڕۆح و دڵ و دەروون، هەروەها ناتەواوی و نارێکی و کەمکوڕی و بۆشاییەکانی بۆ پڕدەکاتەوە، بۆیە هیچ شتێک نابینی لە ئیسلامدا کە لەگەڵ ڕۆح و ناخ، دڵ و دەروون، فیترەت و خوڕەوشت و ئاکاری مرۆڤدا نەگونجێت و تێک بگیرێت. بەڵگەش لەسەر ئەمە قورئان و سوننەتە، هەروەها هەبوونی زانستێک بە ناوی زاستی پاککردنەوەی ڕۆح و دڵ و دەرون (علم تزكية النفس)، یان زانستی ڕەوشت (علم الاخلاق)، کە کار دەکات لەسەر ئەوەی پێویستە مرۆڤ خۆی بە هەموو ڕەوشتێکی جوان و باش بڕازێنێتەوە لە ناوەوە و لە دەرەوەی خۆیدا. هەروەها خۆی داڕنێت و دوورکەوێتەوە لە هەموو ڕەوشتێکی ناشرین و خراپ لە ناوەوە و لە دەرەوەی. کەواتە ئیسلام ئەو بەشە سەرەکییەی تری مرۆڤی پشتگوێ نەخست و گرنگییەکی تەواوی پێ داوە و ڕێنمایی تەواوی کردووە و بۆشاییەکانی پڕکردووەتەوە و هیچ شتێکی تێدا نییە کە لەگەڵیدا تێک بگیرێت، بۆیە ئەو بەشەش کە جوان و ڕێکوپێک بوو، ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی ئەرێنی و جوان و باشی دەبێت لەسەر گوفتار و ڕەفتار.

**٣. لاشە و جەستە و ئەندامە دیارەکان:** ئەم لایەنەش دەبێت بە دوو بەشەوە:

**یەکەم:** پەیوەندی مرۆڤ بە خوداوە

**دووەم:** پەیوەندی مرۆ ڤ بە مرۆڤەوە

**یەکەم: پەیوەندی مرۆڤە بە خوداوە:**

**خۆی لە پەرستشەکان (العبادات) دا دەبینێتە** وەک: نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات و ... هتد، ئیسلام گرنگییەکی زۆری پێداوە و بەرنامە و سیستمێکی تایبەتی بۆ داناوە، هەم لەڕێی قورئان و هەم لەڕێی سوننەت و پاشان هەم لەڕێی زانایان و دانانی زانستێک بە ناوی (فیقھ) (علم الفقه الإسلامي)، کە بە سەدان و هەزاران پەرتووکی لەبارەیەوە نووسراوە و هیچ شتێکی شاراوە نەماوە قسەی تێدا نەکردبێت. کەواتە ئیسلام ئەو بەشەی مرۆڤیشی پشتگوێ نەخستووە، بەڵکوو زۆر بەجوانی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودای گەورەی ڕێکخستووە.

**دووەم: پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان (المعاملات):**

ئیسلام زۆر بەجوانی و ڕێکوپێکی بەرنامەی بۆ داناوە، بە شێوەیەک کە هیچ شتێکی تێدا نییە کە لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤایەتی، عەقڵ، سروشت، فیترەت، ڕۆح و ناخی مرۆڤدا نەگونجێت. ئەم بەرنامە و گرنگی پێدانە هەم لە قورئان، هەم لە سوننەت و هەم لە زانستی (فقھ) بوونی هەیە. بۆنموونە ئەو یاسایانەی ئەمڕۆ باون و کاریان پێ دەکرێت لە جیھاندا، هەموویان یاسای زۆر جوانتر، باشتر، ڕێکوپێکتر و تێروتەسەلتر لە ئیسلامدا بوونیان هەیە، وەک:

١. یاسای باری کەسێتی (قانون الاحوال الشخصيه)

٢. یاسای شارستانی (القانون المدني)

٣. یاسای دادبینی (قانون المرافعات)

٤. یاسای تایبەتیی نێودەوڵەتی ( القانون الدولي الخاص)

٥. یاسای گشتیی نێودەڵەتی (القانون الدولي العام)

٦. یاسای دەستووری (القانون الدستوري)

٧. یاسای دارایی (القانون المالي)

٨. یاسای تاوانکاری ( القانون الجنائي)

بۆیە بینیمان کە ئیسلام بەرنامەی تەواو و جوان و تێروتەسەلی پێیە بۆ هەموو ئەو بوارانە، هەرشتێکیش زیانی هەبێت بۆ هەریەکێک لەم بوارانە، ئەوا یاساغ و حەرامی کردووە، هەروەها بەتەواوەتی سوود و قازانج و بەرژەوەندیی تاک و خێزان، کۆمەڵگە و گەل، نەتەوە و دەوڵەتی ڕەچاو کردووە و هیچ شتێکی دانەناوە کە زیانی بۆ ئەوانە هەبێت و تێک بگیرێت لەگەڵیاندا، بەڵکوو هەرچی سوودی هەیە بۆی داناون و ڕێگری لێ نەکردوون.

کەواتە ئیسلام: بریتییە لە پەیامێکی خودایی و سیستمێکی گشتی و یاسایێکی گشتگیر بۆ مرۆڤ، خێزان، کۆمەڵگە، گەل، نەتەوە، دەوڵەت، مرۆڤایەتی و جیهان، کار دەکات لەسەر هەرسێ بەشەکەی مرۆڤ: «عەقڵ و ڕۆح و جەستە»، یان بڵێین «عەقڵ، بیر، فکر، ناخ، ڕۆح، خوڕەوشت، کردار، گوفتار و مامەڵە»، بە شێوەیەک هەوڵ دەدات ڕێنماییەکی تەواو و ڕێکوپێک و جوانی هەموو ئەم بەشانە بکات و کەموکوڕی و ناتەواوی و ناشیرینی ئەو بەشانە نەهێڵێت و لەسەر فیترەت بیانهێڵێتەوە و پەروەردەیان بکات، بە شێوەیەک کە لە خزمەت مرۆڤ و مرۆڤایەتی و خودای گەورەدا بەکاریان بێنێت و دنیاو دوارۆژیان پێ ڕووناک بکاتەوە. ئینجا کە مرۆڤێکی بەم شێوە جوانە پەروەردە کرد، ڕاستەوخۆ خێزان و کۆمەڵگە و گەل و نەتەوە و دەوڵەت و جیهان پەروەردە دەبێت و دەکەونە سەر ڕێڕەوێکی دروست و هاوسەنگ.

بۆ هەر یەکێک لە مانەش ئیسلام ڕێنموونی و ڕێسا و یاسا و ڕاستەڕێ کردنی داناوە.

١٢. . پەیوەندییەکی تووندوتۆڵ هەیە لەنێوان ئیسلام (ئیمان) و ئەخلاقدا. ئەگەر ئێمە پێغەمبەر (د.خ) وەک بەرزترین و جوانترین نموونەی ئەخلاقی بوون وەربگرین، دەبینین دەیان و سەدان کردەوە و وتەی هەیە دەربارەی ئەخلاق و پەیوەندی بە ئیمانەوە، ئێمە لێرەدا هەندێ لە وتەکانی دەخەینەڕوو، بۆئەوەی ڕوونببێتەوە کە ئەخلاق و ئیمان دوانەیەکی لێکدانەبڕاون و پێویستە بەیەکەوەبن و لێکدانەبڕدرێن.

«الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ».[1]

«چاکە واتا جوانی ڕەوشت».

«إِنَّ اللَّهَ كَرِيمٌ يُحِبُّ الْكَرَمَ، جَوَادٌ يُحِبُّ الْجُودَةَ، وَيُحِبُّ مَعَالِيَ الأَخْلاقِ، وَيَكْرَهُ سَفْسَافَهَا».[2]

«خوای گەورە بەخشندە و بەخشندەنانی خۆش دەوێت و خێرەومەندە و خێرەومەندانی خۆش دەوێت حەزی لە ڕەوشتە بەرزەکانە و رقی لە ڕەوشتە نزمەکان دەبێتەوە».

«إن المؤمنَ لَيُدْرِكُ بحُسْنِ خُلُقِه درجةَ الصائمِ القائمِ».[3]

(بەدڵنیاییەوە ئیماندار بەهۆی ڕەوشت و ئاکاری جوانی دەگات بە پلەی ئەو کەسەی بەردەوام بەڕۆژووە و بەردەوام شەونوێژ دەکات).

«خالِقِ النَّاسَ بخُلُقٍ حَسنٍ».[4]

«لەگەڵ خەڵکدا بە ڕەوشتی جوان مامەڵە بکە».

---

(١) رواه مسلم عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سِمْعَانَ الأَنْصَارِيِّ ٢٥٥٣.
(٢) صحيح الجامع عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، (١٨٠٠).
(٣) رواه أبو داود عن عائشة، ٤٧٩٨.
(٤) رواه أحمد عن أبى ذر ٢٣٩٢، والترمذى ١٩٨٧.

«ما من شيءٍ أثقلُ في الميزان من خُلقٍ حسنٍ».[1]

«هیچ شتێک نییە لە تەرازووی چاکەکاندا قورستر بێت لە ڕەوشتی جوان».

«أكْملُ المؤمنينَ إيمانًا أحسنُهُم خلقًا».[2]

«کامڵترین و پەسەندترین ئیماندار ئەو کەسەیە کە ئەخلاق و خوڕەوشتی جوانترین و پەسەندترینە.»

«إنَّ أَبغَضَكُم إليَّ، وأَبعَدَكُم مِنِّي في الآخِرَةِ: أَسوَؤُكُم أخلاقًا»[3].

«لە ڕۆژی دواییدا بوغزاوترین و ناشیرینترین و نابووتترن و دوورترین کەس لەمن ئەو کەسەیە کە ئەخلاقی نابووترین و ناشرین ترین و خراپترینە».[4]

لە کۆمەڵە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر (د.خ) ئیمان و ئیمانداریەتی و موسڵمانیەتی و ڕەزامەندی خودا و بەهەشت و دۆزەخ و ...، دەبەستێتەوە بە ئەخلاق و ئەخلاقیبوون و سیفەت و ئاکار و کار و کردەوەی جوان و باش و بەرز، لەبەر درێژبوونەوە ناتوانین بیانهێنین.

١٣. مرۆڤ سەنتەری هەموو پەیامە خواییەکانە، بۆیە عەقڵ و ڕووح و جەستە و نامووس و نەوە و وەچە وماڵ و سەروەت و سامان و کەرامەت و ڕێز و ... پارێزاوە و هەرچیش پێچەوانەی ئەوانەبێت حەرام و زەمکراو و نەهی لێکراوە، ئەگەر سەیری قورئان بکەین دەبینین گرنگیەکی یەکجار زۆر دراوە بە مرۆڤ، بەشێوەیەک هەموو ڕەهەندەکان بگرێتەخۆ.

---

(١) رواه أبو داود عن أبى درداء ٤٧٩٩.

(٢) أخرجه أبو داود (٤٦٨٢)، والترمذي (١١٦٢)، وأحمد (٢/ ٤٧٢) واللفظ له، وحكمه حسن صحيح.

(٣) صحيح الترغيب ٢٦٦٢.

(٤) فەرمووده و ئایەت یەکجار زۆر بەڵام ئێمەبەوەندەئیکتیفمان کرد.

١٤. مرۆڤ لە خوودی خۆیدا دوو هێزی سەرەکی هەیە، هێزی شەڕانگێز و خراپەکاری، لەگەڵ هێزی ئاشتیخوازی و چاکەکاری، لە قورئاندا نەفسەکان دابەشکراون بۆ سێ جۆر:

١ - (النَّفْس الأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ) (نەفسی فەرماندەر بە تاوان). ئەوە ئەو نەفسەیە کە فەرمان بە خاوەنەکەی دەکات بەوەی خراپە و تاوان و گوناه ئەنجام بدات.

خودای گەورە ئەو جۆرەی لا خراپە و دەربارەی ئەو جۆرە لە سورەتی -یوسف:٥٣- دەفەرموێت: ﴿وَمَا أُبَرِّىءُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلاَّ مَا رَحِمَ رَبِّيَ إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە : خۆ هەرگیز پاکانە بۆ خۆم ناکەم ، چونکە نەفس و دەروون هەمیشە فەرمان بە خراپە دەدا، مەگەر کەسێك خوای پەروەردگارم خۆی رەحمی پێبکا و لە پیلان و فرت و فێڵی بیپارێزێ ، بە ڕاستی پەروەردگارم زۆر لێبووردەیە بۆ هەڵە و تاوانەکان، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە بەرامبەر بە تەوبەکاران.

٢ - النَّفْس اللَّوَّامَة (نەفسی لۆمەکار و سەرزەنشتکار). ئەوەش ئەو نەفسەیە کە وا لە خاوەنەکەی دەکات کاتێك تاوانێك دەکات یەکسەر سەرزەنشت و لۆمەی نەفسی خۆی بکات و پەشیمان دەبیتەوە، یان بەردەوام خاوەنەکانی ئەو جۆرە پەشیمانن لە ڕابردووی خۆیان.

خوای گەورە ئەم جۆرە نەفسەی لا پەسەندە و سوێندی پێ خواردووە، جا هەر کەس خاوەنی نەفسێکی ئاوەها بێ ئەوە مانای وایە ئیمان و باوەڕی سەلامەتە، خوای گەورە لە سورەتی -القیامة:٢- دەفەرموێت: ﴿وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾. واتە: سوێند دەخۆم بە نەفسی سەرزەنشتکار.

٣ - النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (نەفسی ئارام و دڵنیا و دامەزراو). ئەوەش ئەو نەفسەیە کە هەمیشە وا لە خاوەنەکەی دەکات کە دەمی بە زکر بێ و دڵی پڕ ترس لە خودا بێ و بەردەوام لە عیبادەت و کردەوەی چاك و شوێنی باش بێ.

خاوەنی ئەو جۆرە نەفسەش لە کاتی سەرەمەرگدا مژدەی بەهەشتیان پێدەدرێت، هەروەك خودای گەورە لە سورەتی -الفجر:٢٧تا٣٠- دەفەرموێت: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ارْجِعِي إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَادْخُلِي فِي عِبَادِي ﴿٢٩﴾ وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾. واتە: ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ ڕازیە، دە بچۆرە ڕیزی بەندە چاکە نازدار و بەڕێزەکانمەوە، بچۆرە بەهەشتە خۆشە ڕازاوەکەمەوە.

## دەربارەی گەردوون و بوون و بوونەوەر

گەردوون و بوون و بوونەوەر لە تێڕوانینی ئیسلامدا بەم شێوەیەیە:

١. گەردوون و بوون و بوونەوەر بەدیهێنراو و دروستکراون، واتە ئەزەلی نیین و لەلایەن خوداوە دروستکراون، وە هەروەها لە ماوەی شەش ڕۆژاندا بووە.

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾. [السجدة: ٤]

خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە لە شەش ڕۆژدا دروستی کردووە (مەرج نییە درێژی ئەو ڕۆژانە بە قەدەر درێژی شەو و ڕۆژی زەوی بێت کە بە بیست و چوار سەعات جارێک بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، چونکە هەندێک ڕۆژ هەروەک قورئان خۆی ئاماژەی بۆ دەکات هەزار ساڵە، هەندێکی تری پەنجا هەزار ساڵە).

٢. زەویی و ئاسمانەکان سەرەتا یەک شت بوون و پاشان لەیەکتری جیاکراونەوە، وەک ئەوەی کە ئێستا زانست سەلماندوویەتی و بەدرێژی لە باسی تەقینەوە گەورەکەدا باسمانکرد.

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ [الأنبياء: ٣٠]

ئایا ئەوانەی بێباوەڕ بوون نەیانبینیووە و بۆیان ڕوون نەبۆتەوە بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی یەک پارچە بوون لەوەودوا لێکمان جیا کردنەوە.

٣. گەردوون و بوون لە سەرەتادا گازێک بووە لە شێوەی دوکەڵ (ئەمەش دووبارە لەڕووی زانستیەوە سەلماوە).

﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ﴾. [فصلت: ١١]

ئینجا ویستی ئاسمان ڕێک بخات و دروستی بکات لەکاتێکدا کە دوکەڵ بوو.

٤. خودای گەورە هەموو شتێکی بە ڕێکی دروستکردووە، ئەندازەی هەموو شتێکی گرتووە و هەموو شتێکی بە ئەندازەی دیاریکراو داناوە، ئەم گەردوونە لە بچوکترین بەشیەوە تاوەکو گەورەترین بەشی هەمووی سیستماتیکە.

﴿الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ﴾. [الأعلى: ٢]

ئەو زاتەی هەموو شتێکی دروستکردووە بەجوانی و ڕێکوپێک و تێر و تەواویی کردووە.

﴿وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴾. [الأعلى: ٣]

ئەو زاتەی کە نەخشەی کێشاوە بۆ هەموو شتێک و جا ڕێنموویی کردووە.

﴿الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾. [الفرقان: ٢]

ئەو زاتەی کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی موڵکی ئەوە و هەر ئەو خاوەنیانە، کەسیشی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆیی و کەسی نەکردووە بە شەریک و هاوبەش لە مەودای موڵک و دەسەڵاتیدا، هەموو شتێکی دروستکردووە بە ئەندازە و قەبارە و شێوە و تام و بۆن و ڕەنگ و جیاوازی هەمە جۆر... هتد، نەخشەی ڕێک و پێکی بۆ هەموو شتێک داناوە (بە شێوەیەک کە پێویستیەکانی ئادەمیزاد

دابین بکەن و لە خزمەتیدا بن).

﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾

﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا مَا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِن تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ﴾. [الملك: ٣]

هەروەها ئەو زاتە ئاسمانەکانی بە حەوت چین دروست کردووە، لە نێو بەدیهێنراوەکانی ئەو خوای میهرەبانەدا هیچ نارێکی و ناتەواویەک بەدی ناکەیت، ئەی ئینسان: هەرچاو بگێڕە و سەرنج بدە بزانە هیچ درزو کەم و کووڕیەک بەدی دەکەیت؟!

٥. هەمووگەردوون ملکەچی ئەندازەگیری و ڕێکسازی و هیدایەت و سیستم و یاسای خوای گەورەیە، بۆیە قبوڵی تێکچوون و لادان و بەریەککەوتن و .... ناکات.

﴿وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾. [آل عمران:٨٣]

هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بە ڕەزامەندی بێت یان بەناچاریی تەسلیم و ملکەچی پەروەردگارن، هەمووانیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

﴿لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾. [یس: ٤٠]

نە خۆر بۆی هەیە بە مانگ بگات (لە هێڵ و ڕێڕەوی خۆی دەربچێت)، نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت، بەڵکوو هەریەکەیان لە خولگەی تایبەتی خۆیاندا مەلە دەکەن و بە ئاسانی دەسوڕێنەوە.

٦. هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە ڕامکراوی خوای گەورەن و بۆ مرۆڤ ڕامیکردوون.

﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾. [الجاثية: ١٣]

هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێناوە، هەموویشی تێکڕا بەخشش لەلایەن ئەو زاتەوە، بەڕاستی ئا لەو بەخشش و دیاردانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێک کە بیربکەنەوە و تێفکرن.

٧. بوونەوەرەکان دوو جۆرن: دیار و نادیار، بەرهەست و نابەرهەست، بەرهەستەکان وەک هەموو ئەوانەی هەستیان پێدەکەین، نابەرهەستەکانیش وەک فریشەکان، کە بەرهەست نیین، بەڵام لەڕێی وەحیەوە بڕوامان پێی هێناوە.

﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ﴾. [الحاقة: ٣٨]

سوێندم بەو شتانەی کە دەیبینن.

﴿وَمَا لَا تُبْصِرُونَ﴾. [الحاقة: ٣٩]

بەوەش کە نایبینن و نادیارن.

## دەربارەی ژیان

ژیان لە جیهانبینی و تێڕوانینی ئیسلامدا بەم شێوەیە:

١. خودا ژیانی بەدیهێناوە، شتێکی ئەزەلی نیە، بەڵکوو داهێنراوە.

﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ﴾. [الملك: ٢]

هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدیهێناوە.

﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾. [البقرة: ٢٨]

(خەڵكینە)، چۆن بێ بڕوا دەبن بە خوا لەکاتێکدا ئێوە بێ گیان بوون (لە توێی خاکدا) خوا (دروستی کردوون) و گیانی بەبەردا کردن، پاشان دەتانمرێنێت و دوایی زیندووتان دەکاتەوە، ئەوسا هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.

٢. ژیانی دونیا بایەخدارە و گرنگە و دەبێ گرنگی پێبدرێت و پشتگوێ نەخرێت، بۆیە قورئان زۆر گرنگی پێداوە، لە دوعاکاندا سەرەتا باسی دونیایە ئینجا قیامەت.

﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ [البقرة: ٢٠١]

پەروەردگارا لە دونیادا خێر و چاکە و ناز و نیعمەتمان پێ ببەخشە و، لە قیامەتیشدا لە ناز و نیعمەتەکانی بەهەشت بەهرەمەندمان بکە و، لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.

هەروەها خوای گەورە لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا﴾. [القصص: ٧٧]. بەشی خۆشت لە دونیادا بە حەڵاڵی فەرامۆش مەکە.

کەواتە ژیانی دونیا گرنگە و دەبێ گرنگیشی پێبدرێت، چونکە کێڵگەی قیامەتیشە.

٢. ژیانی دونیا لە چاو ژیانی هەمیشەیی دوارۆژ و قیامەت زۆر کەم و بێ نرخە، چونکە ئەم ژیانە ڕابواردن و تاموچێژێکی کاتیە و دەڕوات، هەروەها پڕیەتی لە ناخۆشی و نەخۆشی و ئازار و مەینەتی و ....، هەربۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَامًا وَفِي الْآخِرَةِ

عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللهِ وَرِضْوَانٌ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾. [الحديد: ٢٠]

چاک بزانن ژیانی دونیا تەنیا بریتییە لە یاری و گەمە و ڕازاندنەوە و خۆ هەڵکێشان لەنێوان یەکتریدا، هەروەها زۆرکردنی سامان و ماڵ و منداڵ، جا ئەوانە هەر هەمووی وەک بارانێکی بەپیت وایە کە ببێتە بەرهەمێکی زۆر، کشتیارەکان (جوتیارەکان) سەرسام بکات، لەوەودوا وشک ببێت و زەرد هەڵگەڕێت، پاشان وردوخاش ببێت و بکەوێت، بێگومان لەقیامەتیشدا سزای زۆر سەخت بۆ دونیا پەرستان ئامادەیە، لەولاشەوە لێ خۆشبوون و ڕەزامەندی لەلایەن خواوە ئیماندارانی چاکەخوازی لێ بەهرەوەر دەکرێت، ژیانی دونیاش دوور لەخواناسی و دینداری جگە لەوەی کە بریتیە لەرابواردنێکی کەم، شتێکی تر نییە، زۆر کەسیشی پێ غەڕا و دەستخەڕۆ دەبێت.

٣. ژیان مەیدانی تاقیکردنەوەیە بۆ دواڕۆژ، ﴿الَّذِى خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾. [الملک: ٢]

هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدیهێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکتر و پەسەندترە، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەستە بەسەر بێ باوەڕاندا، وە لێخۆشبووە لە ئیمانداران.

٤. گۆشەگیری و وازهێنان لە دونیا و دەست لە ژیان بەردان شتێکی پەسەند نییە لە ئیسلامدا بەپێی ئەو بەڵگانەی باسمانکردن.

٥. ژیان بەنرخ و بایەخدارە، بەپێچەوانەی پووچگەرایی و هیچگەرایی (العدمية) کە پێیوایە ژیان هیچ نییە و بێ نرخە، ئەم ژیانە ئەگەر بە باشی و چاکی و چاکەکاری بەڕێی بکەی ژیانێکی هەمیشەیی پڕ خێر و بەرەکەت و ناز و نیعمەتی پێ بەدەست دەهێنی.

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ﴾. [البينة: ٧]

بێگومان ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کار و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، هەر ئەوانەن چاکترین و پاکترینی خەڵکانی سەر زەوی.

﴿جَزَاؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُ﴾. [البينة: ٨]

پاداشتیان لای پەروەردگاریان بەهەشتی پڕ لە باخی چڕە (کە کۆشک و تەلارەکان تیایدا ون بوون)، چەندەها ڕووباریش بەژێر درەخت و بەبەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات و لەوێ ژیانی هەمیشەیی و بەردەوام بۆ هەتاهەتایی دەبەنە سەر، ئەوانە خوا ڕازییە لێیان، ئەوانیش لەو ڕازین (چۆن ڕازی نابن ئەی پەروەردگاری ئازیز، بەڕاستی نازانین بەچ زمانێک سوپاسگوزارت بین) بێگومان ئەو ڕێز و قەدرە بۆ ئەو کەسەیە کە لە پەروەردگاری ترساوە و فەرمانەکانی بەجێ هێناوە[١].

## ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە

لەگەڵ باوەڕبوون بە بوون و تاک و تەنیایی خودا، باوەڕدار باوەڕی بەوەیە کە خوای گەورە هەموو سیفەتێکی تەواو و کەمالی هەیە بەو شێوەیەی کە لایەق و شایستەی زاتی بەرزیەتی و پاک و بێگەردە لە هەموو کەم و کوڕییەک.

بۆیە هەرسیفەتێکی تەواو و جوان و ڕەها هەبێت، ئەوا خوای گەورە ئەو سیفەتەی هەیە بە جوانتر لەوەی عەقڵە سنووردار و کورتەکانمان پێشبینی دەکەن و بەرزتر لەوەی یاسا کورتەکانی زمان دەریدەبڕن و بەو شێوەیەی کە وەحی پێمانی ڕاگەیاندووە.

لەوەی خوارەوەدا چەند سیفەتێک باسدەکەین لەو سیفەتانەی کە تەنیا

(١) بەسوود بینین لە(ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی، م. علی باپیر، بەرگی شەشەم).

خوای گەورە هەیەتی و تەنیا هی ئەوە و کەس هاوبەشی ناکات تێیدا.

١ و٢- یەکەم و کۆتایی (الأول و الآخر)[١]: یەکەمە بەبێ سەرەتا و (نەبوونی بەسەردا نەهاتووە)، کۆتایە بەبێ کۆتا (هیچ کۆتاییێکی نییە و نەمانی بەسەردا نایەت.)

٣- زیندووە (الحی)[٢]: ژیانی هێناوەتە بوون و بە هەموو زیندەوەرەکانیشی بەخشیوە، بۆیە سەرچاوەی ژیانە، هەروەها ژیان بە هەموو زیندەوەرێک دەبەخشێت، واتا سیفەتی ژیان و زیندوویەتی هەیە بە تەواوترین و جوانترین شێوە، بەشێوەیەک مردنی لەدوا نایەت و مردن و کۆتایی هاتنی لەگەڵ نیە.

تایبەتمەندیەکانی جیاکردنەوەی زیندوویەتی بەدیهێنەری (خالق) جیهان و دروستکراوەکانی (مخلوق):

أ- زیندوویەتی خوا لە خودی خۆیەتی و لە هیچ سەرچاوەیەکی ترەوە نەهاتووە، بەڵام زیندوویەتی و ژیانی تەواوی بوونەوەران وەرگیراوە و خوای گەورە پێی بەخشیون.

ب- زیندوویەتی خوا هەمیشەییە هەر هەبووە و هەر دەشمێنێت، نە لە دەستپێکێکەوە دەستی پێکردووە و نە لە کۆتاییێکدا کۆتایی دێت، بەڵام زیندویەتی بوونەوەر بە کاتێکەوە بەستراوە و دیاریکراوە.

ج- زیندوویەتی خوا تەواو و بێ کەم و کوڕییە، ئەو شتانەی بەسەر زیندوویەتی بوونەوەر و مەخلوقاتەکاندا دێت بەسەر ئەودا نایەت، وەکوو نوستن و بێئاگایی و بێزاری و ماندووبوون.

٤- زانایە (العلیم): هیچی لێ ون و نادیار نییە و هەموو شتێک دەزانێت و ئاگادارە پێی، نهێنی لای ئەو ئاشکرایە، نادیار لەلای دیارە، بەربەستە کاتی و

---

(١) الحدید: ٣. والقصص: ٨٨.

(٢) البقرة: ٢٥٥. وطه: ١١. والفرقان: ٥٨.

شوێنییەکان لە پێشی ناوەستن و هیچ شتێکی نادیار لەلای ئەو نادیار نییە.

زانستی خوای گەورە جیاوازە لە زانستی مرۆڤ چونکە زانستی مرۆڤ کەمە و سنوردارە و بەستراوەتەوە بە کات و شوێن، کاتێک بووە نەیزانیوە و لە دوایبدا فێری بووە، بەڵام زانستی خوای گەورە هەموو شتێکی لەخۆگرتووە و تێیدایە بەهەمیشەیی (لەئەزەلەوە)، ورد و درشتەکان دەزانێت، نەبەستراوە بە کات و شوێنەوە، لەبیرچوونەوەشی بەسەردا نایەت.

٥- بەتوانا (القدیر)[1]: هیچ شتێک دەستەوەستانی ناکات و لە دەرەوەی توانای ئەو نییە، شوێنەواری توانای خوای گەورە بڵاو و دیارە لە ئاسۆکانی گەردوون و خودی مرۆڤەکان و ئاسمانەکان و زەویدا.

هەر ئەو لە هاواری کەسی ناچار و لێقەوماو دێت، ناخۆشی لادەدات و ئەو ئێسقانەی کە شیبۆتەوە زیندووی دەکاتەوە، دروستکراوەکانی وەکوو خۆی لێدەکاتەوە لەدوای مردنیان بەو شێوەیەی یەکەمجار دروستیکردوون.

٦- کاربەجێ و کارزانە (الحکیم)[2]: گەردوون و جیهانی بەو ڕێکوپێکی و بێ کەم و کوڕییە بەدیهێناوە، هیچ تێکگیران و کێشەیەک لە گەردووندا ڕوونادات و لە بەڕێوەبردنی گەردوونیشدا هیچ کەلێن و گرفت دروست نابێت.

٧- بەبەزەیی و میهرەبان و بەخشندەیە (الرحمن الرحیم)[3]: بەزەییەکەی پێش تووڕەییەکەی کەوتووە، بەزەییەکەی هەموو شتێکی گرتووەتەوە و بە هەموو شتێک گەیشتووە، هەروەکوو چۆن زانستەکەی هەموو شتێکی پڕکردووە، بەزەییەکەشی هەموو دونیای پڕکردووە، باوەڕدار و بێباوەڕ، چاکەکار و خراپەکار، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا تایبەتە بەپارێزکاران (متقین).

---

(١) غافر: ١٩. والبقرة: ٢٩. والملك ١٤.

(٢) الأنبياء: ١٦. والمؤمنون: ١١٥ _ ١١٦. والبقرة: ٣٢. وآل عمران: ٩١.

(٣) غافر: ٧. والأعراف: ١٥٦. والزمر: ٥٣.

٨و٩و١٠- بیستن و بینین و کەلامی هەیە ( السمع والبصر والکلام)[١].

**پاک و بێگەردی ڕەها بۆ خودای گەورە لە هەموو کەموکوڕییەک:**

هەروەک چۆن خودای گەورە و باڵادەست هەموو ئەو سیفەتە تەواو (کمال)ە ڕەهایانەی هەیە کە وەسفی خۆی پێ کردووە لە قورئانی پیرۆزدا بۆ ئەوەی پێی بناسین و پێی وەسف بکەین (خودای گەورە بەو سیفەتانە بناسین)، بەهەمان شێوە پاکە لە هەموو کەموکوڕییەک و دوورە لە شتی ناتەواو.

ئەو سیفەتە ناتەواو و کەموکوڕییانەی کە لە خودای گەورەدا بوونیان نییە و ڕەتی کردووەتەوە و نەفی کردووە لە خۆی: هاوەڵ (الشریک)[٢]. نەتوانین و بێتوانایی (العجز)[٣]. ماندووبوون (اللغوب)[٤]. خەوتن (النوم)[٥]. بیرچوونەوە (النسیان)[٦]. ستەم (الظلم)[٧]. (هیچ چوونیەکی و هاوشێوەیی نییە لەنێوان خوای گەورە و دروستکراوەکانیدا، واتا ناتوانرێت بەخەیاڵیش ببینرێت و وێنا بکرێت.)

هەروەها پاک و بێگەردە لە هەموو کەموکورتییەکی دیکە.

## هەندێک لە ناو و سیفەتەکانی خودای گەورە لە قورئاندا

﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾. [الحدید: ١]

---

(١) الزخرف: ٨٠. والمجادلة: ١. وفصلت: ٤٠. والشورى: ١١. ومريم: ٤٢. والنساء: ١٦٤.

(٢) الأنعام: ١٦٣. والإخلاص: ٣. والجن: ٣. والأنعام: ١٠١. والبقرة: ١١٦.

(٣) فاطر: ٤٤.

(٤) ق ٣٨.

(٥) البقرة ٢٥٥.

(٦) مريم: ٦٤. وطه: ٥٢.

(٧) فصلت: ٤٦. والنساء: ٤٠.

خودا زاتێکی باڵادەست و دانایە.

﴿لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ [الحديد: ٢]

هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر ئەو خاوەنیانە، دەژینێ و دەمرێنێ، هەر خۆی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾. [الحديد: ٣]

ئەو خوایە یەکەمینە و لەسەرەتاوە هەر هەبووە و کەس پێش ئەو نەبووە، دواهەمینە و کۆتایە، کەس دوای ئەو نامێنێت، (بەڵام ئەو هەر دەمێنێت)، هەروەها ئەو زاتە دیارە و هەموو شت بەڵگەیە لەسەر بوونی، لەهەمان کاتدا زاتی خۆی نادیارە و (بەچاوی سەر نابینرێت، بەڵام بەبینایی بیروهۆش و دڵ و دەروون ئاشکرایە)، هەر خۆیشی زانایە بەهەموو شتێک.

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾. [الحديد: ٤]

هەر ئەو زاتە خۆی، ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە.

﴿لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَى اللهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾. [الحديد: ٥]

هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ئەو زاتە خاوەنیانە، هەموو شتێکیش بۆ لای خوا دەبرێتەوە.

﴿وَهُوَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾. [الحديد: ٦]

ئەو زاتە (خودا) زانایە بەهەرچی لە دڵ و دەروون و سینەکاندایە.

﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾. [الذاريات: ٥٨]

بەڕاستی هەر خوا خۆی ڕۆزی بەخشە و خاوەنی هێز و دەسەڵاتی پتەوە.

﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ﴾ [الحشر: ٢٢]

خوا ئەو زاتەیە کە جگە لەو خودایەکی تر نییە زانایە بە هەموو نهێنی و ئاشکراکان، ئەو خودایە بەخشندە و میهرەبان و دلۆڤانە کانگای ڕەحم و بەزەییە.

﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ [الحشر: ٢٣]

خوا ئەو زاتەیە کە جگە لەو خودایەکی تر نییە پاشای هەموو بوونەوەرە، پاک و بێگەرد و پوختە، ئاشتیخواز و ئاشتی پەروەرە، ئاسایش بەخش و پەناگای ئیماندارانە، دەسەڵاتدارە و چاودێری دروستکراوەکانیەتی، باڵادەستە، خاوەنی خێری بێسنوورە، گەورەیە و خۆی بەگەورە دەزانێت، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خودایە لەوەی تینەگەیشتووان شەریک و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن.

﴿هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾. [الحشر: ٢٤]

هەر ئەو خوایە بەدیهێنەر و دروستکراوە، (لە نەبوون هەرچی بۆی بەدی دەهێنێت)، نەخشە و وێنەکێشەرە (بۆ هەموو بوون و بوونەوەر و گەردوون)، ناوە پیرۆز و جوانەکان، هەمووی شایستەی ئەون، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ستایشی ئەو دەکەن، بەڕاستی ئەو زاتە خوایەکی باڵادەست و دانایە.

﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾. [البقرة: ٢٥٥]

خوا زاتێکە جگە ئەو هیچ خودایەکی تر نییە کە شایەنی پەرستن بێت و ئەو هەمیشە زیندووە و ڕاگر و سەرپەرشتیاری (هەموو دروستکراوەکانیەتی)، نە

وەنەوز دەیگرێت و نە خەو (چونکە ڕاگر و سەرپەرشتیاری بوونەوەرە)، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە هەر ئەو زاتە خاوەنیانە، کێیە ئەوەی (دەتوانێت) تکا بکات لە لای ئەو، بەبێ مۆڵەتی خۆی، دەشزانێت چی لە ئێستا و داهاتوو و ڕابوردوودا ڕوویداوە و ڕوودەدات، هیچ کام لە دروستکراوانی زانست و زانیاری تەواویان نییە دەربارەی زانیاری و زانستەکانی ئەو، مەگەر بەوەی کە خۆی بیەوێت فێریان بکات (ئەم پێشکەوتن و زانستەی سەردەم بەشێکی کەمن لە بەخششەکانی خوا)، فەرمانڕەوایی و دەسەڵات و زانینی ئەو زاتە هەموو ئاسمانەکان و زەوی گرتووەتەوە و پارێزگارییان بەلای خواوە هیچ گران نییە و ماندووی ناکات و هەر ئەو خودایەکی بەرز و بڵند و گەورەیە.

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ [الإخلاص: ١]

(ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) ئەی ئیماندار) بڵێ: ئەو خوای کە ناوی _ الله _ خوایەکی تاک و تەنیایە (بێ هاوەڵ و هاوتایە).

﴿اللَّهُ الصَّمَدُ﴾. [الإخلاص: ٢]

خوا زاتێکی پایەدار و دەسەڵاتدارە، نیازی بە کەس نییە و هەموویان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێ بەڵا و ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێبەجێ بکات.

﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾. [الإخلاص: ٣]

هیچ کەسی لێ نەبووە و خۆشی لە کەس نەبووە.

﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾. [الإخلاص: ٤]

هەرگیز هاوتا و هاوشێوە و دەسەڵاتدارێکی تر نییە کە لەبەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت.

## پوختەی هەندێ ناو و سیفەتی خوای گەورە کە لە قورئان و سوننەتدا هاتوون:

اللّٰه: (ناوی هەرە گەورەی خوای گەورەیە، تایبەتە بە خوای گەورە و ناکرێ بەکار بهێنرێت بۆ غەیری خودا).

الرَّحْمن: (زۆر بە بەزەیی).

الرَّحِيم: (بەخشندەی بەردەوام).

المَلِك: (پادشا و خاوەنی ڕەهای هەموو شتەکان).

الْقُدُّوس: (پاک لە هەموو عەیب و کەموکوڕییەک).

السَّلَام: (بڵاوکەرەوەی سەلام و ئاشتی، بێعەیب لە هەموو عەیب و کەموکوڕی و ناتەواوییەک).

المُؤْمِن: (دڵنیاکەر، بەڕاستدانەر، دۆستەکانی دڵنیا دەکاتەوە لە سزای خۆی، بەڕاستدانەری بەڵێنەکانیەتی).

الْمُهَيْمِن: (بەسەر ڕاگەیشتوو).

الْعَزِيز: (زاڵ، دەسەڵاتدار، زاڵێک هیچ شتێک بە سەریدا زاڵ نابێت).

الْجَبَّار: (باڵادەست، ناچارکەر، جێبەجێکاری ویستەکانی، هیچ شتێک لە توانای ئەو دەرناچێت).

الْخَالِق: (دروستکەر، بنیاتنەر).

الْبَارِئ: (بەدیهێنەر، بەدیهێنەری شتەکان بەشێوەیەک هاوشێوەی نەبووە لە پێشوودا، بەتوانا لەسەر بەدیهێنانی ئەوەی ئەندازەی بۆ گرتووە و نەخشەی بۆ کێشاوە).

الْمُصَوِّر: (وێنەکێش، وێنەی هەموو بوون و بوونەوەرەکانی کێشاوە، هەموو شتێک شکڵ و شێواز و وێنەیەکی تایبەت بە خۆی پێ داوە، لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازی و زۆرییەیان).

اَلْغَفَّار: (زۆر لێبووردە).

الْوَهَّاب: (زۆر بەخشەر).

الرَّزَّاق: (زۆر ڕۆزیدەر).

الْفَتَّاح: (دەرووکەرەوە).

الْعَلِيم: (زۆر زانا).

السَّمِيعُ: (بیسەر، هەموو شتەکان دەبیستێت، دەنگە ئاشکرا و نهێنییەکان لەلای ئەو ئاشکران، دوعا وناڵە و داواکاری و... دەبیستێت).

الْبَصِير: (بینەر، هەموو شتەکان دەبینێت، ئاشکرا و نهێنی، دیار و نادیار، بچووک و گەورە...).

العدل: (دادگەر).

الْخَبِيرُ: (شارەزا، هەواڵدەر).

الْحَلِيمُ: (هێدی، ئارام، بێ هەڵەشە).

الْعَظِيمُ: (مەزن و گەورە).

الْغَفُورُ: (زۆر لێبووردە، گوناهپۆش).

الشَّكُورُ: (سوپاسگوزار، کارە کەمەکانیش لەلای ئەو زۆر دەبن، قبووڵیان دەکات و چەند قاتیان دەکات).

الْعَلِيُّ: (بەرز).

الْحَفِيظُ: (پارێزەر، پارێزەری هەموو شتەکانە).

الْحَسِيبُ: (لێپرسەرەوە، تەنیا خۆی شایستەی پشت پێ بەستنە).

الجليل: (سیفەت بەرز، وەسفدار بە هەموو سیفەتە بەرز و جوان و گەورە و تەواوەکان، پاک لە هەموو کەموکوڕییەک).

الْكَرِيمُ: (بەڕێز، ڕێزگر، خێربەخشەر، بەخشەری هەموو شتە جوان و باشەکان).

الرَّقِيبُ: (چاودێر).

الْمُجِيبُ: (وەڵامدەرەوە، وەڵامگۆ).

اَلْحَكِيمُ: (لێزان، کاربەجێ).

الْوَدُودُ: (بەندەدۆست، خۆشویستراو و مەحبووب، بەندەکانی خۆی خۆش دەوێت و بەندەکانی ئەویان خۆش دەوێت).

الْمَجِيدُ: (خاوەن شکۆ، پایەبەرز).

الباعث: (زیندووکەرەوە، نێرەر، زیندووکەرەوەی ڕۆژی دواییە، نێرەری پێغەمبەرانە بۆ مرۆڤایەتی).

الْحَقُّ: (حەق، ڕاست، پایەدار، حەق دەگەیەنێت و پشتگیری حەق دەکات و خۆشی حەقە و هەیە و حەقدۆستە، هەر خۆشی شایستە و موستەحەقی پەرستنە).

الْوَكِيلُ: (پشت و پەنا، کارپێسپێردراو، کاری هەموو گەردوون و بوونی بە خۆی سپاردووە، هەر کەسێک پشتی پێ ببەستێت بەسیەتی).

الْقَوِيّ: (بەتوانا).

الْمَتِينُ: (قایم، بەهێز).

الْوَلِيُّ: (دۆست، یاریدەدەر).

المُحيي: (ژیێنەر، ژیانبەخش، زیندووکەرەوە).

المميت: (مرێنەر).

الْحَيُّ: (زیندوو).

الْقَيُّومُ: (مشوورخۆر، مشوورگێڕ، ڕاوەستاو، ڕاوەستێنەر و ڕاگر).

الْوَاحِدُ: (یەک، یەکە و دوو نییە، یەکە و تاکە لە زات و سیفەت و کرداردا، تاکە لە خاوەندارییەتی و فەرمانڕەوایی، هیچ شتێک ناتوانێت ململانێی لەگەڵدا بکات).

الصَّمَدُ: (جێی مەبەست، جێی مەبەست و نیاز و هیوا و ئومێدەکانە و خۆشی بێنیازە لە هەموو شتێک).

الْقَادِرُ: (بەتوانا، توانادار).

الْأَوَّلُ: (یەکەمین، یەکەمی بێ سەرەتا).

الْآخِرُ: (دوامین، هەرماوە، ئەبەدی، بێکۆتا، ناکۆتا).

الْبَرُّ: (چاکەکار).

التَّوَّابُ: (زۆر تۆبەوەرگر).

العَفُو: (چاوپۆشیکەر، چاوپۆشی لە گوناهـ و تاوانەکان دەکات و دایان دەپۆشێت و دەیانسڕێتەوە).

الصبور: (ئارامگر، ئارام لەسەر گوناهـ و تاوان و بێوەفایی مرۆڤەکان دەگرێت، هیچ شتی ناکات تاوەکوو کاتی گونجاوی خۆی نەیەت)[1].

---

(١) بۆ وەرگێڕانی واتای دەقاودەقی ناوەکان سوودم لەکتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوونەتدا، م. علی باپیر) بینیوە، بابەتی ناو و سیفەتەکانی خودا بابەتێکی زۆر زۆر فراوانە، بەڵام ئێمەلێرادا تەنها وەك ژماردن باسمان کردوون و نەچووینەناو قووڵاییەکانیانەوە.

# تیۆر و مەبحەسی قیەم
# (فلسفة القيم (الأخلاق))

وەک باسمانکرد فەلسەفە لە سێ بەشی سەرەکی پێکدێت:

١. فەلسەفەی بوون، بوونناسی (الوجود) (Ontology) (ئۆنتۆلۆژیا)

٢. فەلسەفەی ناسین و زانین، زانستناسی (المعرفة) (Epistemology) (ئیپستمۆلۆژیا)

٣. فەلسەفەی قیەم و ئەخلاق و بەهاکان، بەهاناسی (الأخلاق والقيم) (Axiology) (ئیکسیۆلۆژیا).

**فەلسەفەی بەهاکان (مبحث القيم)**

فەلسەفەی بەهاکان (بەئینگلیزی: Ethics یان Moral Philosophy) بەشێکە لە فەلسەفە کە ئەرکی وەڵامدانەوەی پرسیارە سەرەتاییەکانی ئەخلاقیی لە ئەستۆیە. یان دروست و نادروست، خێر و شەڕ و حەق و ڕاستی و جوان و ناجوان.

**فەلسەفەی بەها (مبحث القيم)** دابەش دەبێت بۆ سێ بابەت و زانستی سەرەکی:

١. بەهای ڕاستی و حەق: کە زانستی لۆژیک (علم المنطق) لێی دەکۆڵێتەوە.

٢. بەهای خێر و چاکە: کە زانستی ڕەوشتناسی (علم الاخلاق) لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکات.

٣. بەهای جوانی: کە زانستی جوانیناسی (علم الجمال) لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکات.

## پێناسەی ئەخلاق

ئەخلاق لەڕووی زمانەوانییەوە واتە: ڕەوشت، ڕەفتار، ئاکار، هەڵسوکەت.

لەڕووی زاراوەوە پێناسەی یەکجار زۆری بۆکراوە، بۆنموونە: ڕەوشت و ئاکار و خوو سیفەتێکی جێگیرە لە دەروونددا، یان فیترییە یان بەدەستهاتوو، کاریگەرییەکەی یان باشە یان خراپ.[1]

## زانستی ئەخلاق و فەلسەفەی ئەخلاق

زانستی ئەخلاق: یاسا و ڕێسای گشتییە، بۆنموونە پێت دەڵێت: چاکە بکە و خراپە مەکە، دادگەربە و ستەم مەکە، ڕاستگۆبە و درۆمەکە، ئەمانەت پارێزبە و ناپاکی و خیانەت مەکە...، کەواتە زانستی ئەخلاق یاسا و ڕێسای گشتیبوون پێت دەڵێت ئەوە بکە و ئەوە مەکە.

فەلسەفەی ئەخلاق: پێت دەڵێت ئەخلاق خۆی چییە، بۆ ڕاستگۆیی ئەخلاقییە و درۆ نائەخلاقی؟ یان بۆ بەئەخلاق بم؟ ئەخلاقیبوون گرنگە؟

## سوودەکانی ئەخلاق

١. پاراستنی مرۆڤ و خێزان و کۆمەڵگە و دەوڵەت و سیاسەت و ئابووری و...، لە هەموو لادانێک و خزانی لە ڕێڕەوە ڕاستەکەی خۆیان.

٢. بڵاوکردنەوەی ئارامی و ئەمن و ئاسایش لەناو کۆمەڵگەدا.

٣. خۆشەویستی و یارمەتی و لێبوردەیی و... بنیات دەنێت و زیاد دەکات.

---

(١) الأخلاق الإسلامية، د. عبد الرحمن حسن حبنكة الميداني، ب ١ ل ١٠.

٤. فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە بەهێز و پتەو دەکات.

لەگەڵ زۆری دیکە.

## بەش و لقەکانی ئەخلاق

بە شێوەیەکی گشتی زانایانی ئەخلاق و فەلسەفەی ئەخلاق، ئەخلاق بۆ سێ زانست دابەش دەکەن، ئەوانیش:

١. ئەخلاقی پێودانگی «nornative»: ئەمەیان یاسا و ڕێسای ئەخلاقی دەخاتەڕوو، بۆنموونە چاکە ئەوەیە و خراپە ئەمە، فەزیلەت ئەمەیە و ڕەزیلەت ئەوە،...، واتە ئەمانە دیاریدەکات.

٢. ئەخلاقی وەسفی (description): ئەخلاقی ئایین و فەرهەنگ و شارستانییەتەکان و...، بۆنموونە ئەخلاقی ئیسلامی و بوزایی و کانتی و...، تەنیا وەسفی ئەخلاقییان دەکەن.

٣. ئەخلاقی شیکاری، میتا ئەخلاق، سەرووی ئەخلاق، یان ئەخلاق (metha ethic): ئەم بەشە بەشی سەرەکی فەلسەفەی ئەخلاقە، یان دەتوانین بڵێین تەنیا ئەو بەشە فەلسەفەی ئەخلاقە، ئەم بەشە پێت دەڵێت: چاکە چییە و خراپە چییە؟ بۆچی ڕاستگۆیی و دادگەریی و دەسپاکی و... باشن و ناڕاستگۆیی و ستەم و خیانەت و... خراپن؟ دروستی چییە و نادروستی چی؟ ئەمانە و چەندان پرسیاری دیکەی سەرەکی و جەوهەری کاری ئەم بەشەن.[1]

---

(١) نیگایەک بۆ فەلسەفەی ئەخلاق، موسعەب ئەدهەم، ل ٢٩. ئەویش لە (الفبای فلسفه) نایجل واربرتونی وەرگرتووە.

## سەرچاوەکانی ئەخلاق

ڕاجیایی زۆر هەیە لەنێوان زانایان و فەیلەسووفاندا دەربارەی سەرچاوەکانی ئەخلاق، بەڵام هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ دوو بۆچوونی سەرەکی:

**یەکەم:** سەرچاوەی ئەخلاق لە خودی مرۆڤ خۆیدایە.

**دووەم:** سەرچاوەی ئەخلاق لەدەرەوەی مرۆڤدایە.

یەکەمیان کە پێی وایە مرۆڤ ئەخلاق دیاریدەکات، بوون بەچەند بۆچوونێکی جیاواز:

١. نیچە پێیوایە سەرچاوەی قیەم و ئەخلاق لە سروشتی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێت، لەو غەریزانەی کە تێیدان، گرنگترینی غەریزەکان زاڵبوون و ویستی هێزە، واتە بەم پێیەی نیچە هیچ کردەوەیەک لە زاتی خۆیدا بە ئەخلاقی وەسف ناکرێت.

بۆنموونە بەهێزەکان قیەم ئەخلاقێکی وا بۆخۆیان دەخولقێنن کە لەگەڵ ویست و ئارەزووەکانیان بێتەوە، لاواز بێهزەکانیش بەهەمان شێوە قیەم ئەخلاقێکی وا بۆخۆیان دەخولقێنن کە لەگەڵ بێهێزییەکەیان بێتەوە و بیانوویان بداتێ و هەڵبێن لە واقیع.

کەواتە لەلای نیچە سەرچاوەی قیەم و ئەخڵاق لە خودی مرۆڤدایە و خۆی دەیخولقێنێت.

٢. موعتەزیلەکان و تۆما ئەکوینی پێیان وایە سەرچاوەی قیەم و ئەخلاق عەقڵی مرۆڤە، عەقڵ دیاریدەکات چ شتێک باشە و چ شتێک خراپ، چ شتێک جوان و چ شتێک نابووت و ناشیرین، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە باشی و چاکی و جوانی و خراپی و ناشیرینی و نابووتی دەگەڕێتەوە بۆ خودی شتەکان.

٣. کیرکیگۆر پێی وایە سەرچاوەی قیەم و ئەخلاق خودا و مرۆڤن بەیەکەوە، واتە

لە ئەنجامی پەیوەندی نێوان خودا و مرۆڤدا ئەم قیەم و ئەخلاقانە پەیدا دەبن.

بەشی دووەمیان کە پێیان وایە سەرچاوەی قیەم و ئەخلاق لەدەرەوەی مرۆڤەوە دێن، دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

١. ئەشعەرییەکان و دیکارت، پێیان وایە: دین، شەرع، خودا، قیەم و ئەخلاق دیاری دەکەن، واتە بۆ زانینی چاکە و خراپە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ شەرع و دین و خودا.

٢. دۆرکایم پێی وایە سەرچاوەی دیاریکردنی قیەم و ئەخلاق و چاکە و خراپە بریتییە لە کۆمەڵگە، واتە کۆمەڵگە قیەم و ئەخلاقەکان دیاریدەکات و مروڤیش شوێنیان دەکوێت و پێیانەوە پابەند دەبێت.

٣. مارکسییەکان پێیان وایە ماددە و ئابووری سەرچاوەی قیەم و ئەخلاقە و ئەوە ئابوورییە هەموو شتێک دیاردەکات.[1]

### بۆچوونی فکری ئیسلامی

ئەو سەرچاوانەی کە باسکران هەموویان کاریگەرییەکی لاوەکییان هەیە، واتە هەموویان ڕەنگە بەشێک لە کاریگەری و پاڵنەریان بەربکەوێت، بەڵام لە تێڕوانینی ئیسلامدا تاکە سەرچاوەی سەرەکی بریتییە لە فیترەتی نەگۆڕاو و خودا و ئیسلام، چونکە عەقڵ و...، بەپێی شوێن و کات و...، دەگۆڕێن، ناکرێت دەستەڵاتی ڕەهایان پێبدرێت بۆ دیاریکردنی قیەم و ئەخلاق.

کەواتە فیترەتی پاک و دین، کە هەردووکیان یەک سەرچاوەیان هەیە کە خودایە، سەرچاوەی دیاریکردنی قیەم و ئەخلاقن.

---

(١) الأخلاق النظرية، د. عبد الرحمن بدوی، ل ٣٠ _ ٩٥.
تاريخ الفسفة الحديثة، يوسف كرم، ٤٤٦.
قضايا من رِحاب الفلسفة والعلم، د. توفيق الطويل، ل ٧١.
قضايا فلسفية فى ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين، ل ٢٤٣ _ ٢٤٤.

## قوتابخانە ئەخلاقییەکان

قوتابخانە ئەخلاقییە فەلسەفییەکان زۆرن، بەڵام چوار قوتابخانەی گرنگ لە فەلسەفەی ئەخلاقدا هەن کە تاکوو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دوانیان هەبوون، ئەوانیش ئەم دوو قوتابخانەیەن:

١. قوتابخانەی وەزەیفەتگەرایی Denotologism: ئەم قوتابخانە لەسەر بنەمای وەزیفە بونیاد نراوە.

٢. ئەنجامگەرایی Teleologism: ئەمەیان لەسەر بنەمای ئەنجام بونیاد نراوە.

بەڵام لەدوای نیوەی یەکەمی سەدەی بیست، دوو قوتابخانەی دیکە پەیدابوون، کە بریتین لە:

١. قوتابخانەی ماف سەنتەر (Right- (based ethics - ئەم قوتابخانەیە لەسەر بنەمای ماف بونیاد نراوە، واتە ماف دەکاتە بنەما و سەنتەر و لەدەوری مافدا دەسووڕێتەوە.

٢. قوتابخانەی فەزیلەت سەنتەر (Right- (based ethics - ئەمەشیان لەسەر بنەمای فەزیلەتگەرایی دامەزراوە.[1]

## قوتابخانەی وەزەیفەتگەرای ئەرکگەرا

یەکەم: قوتابخانەی وەزەیفەتگەرا یان ئەرکگەرا (Denotologism): ئەم قوتابخانەیە جەخت لەسەر ئەرک و وەزیفە دەکاتەوە و پێیوایە دەبێ تمرۆڤ بە ئەرک و وزیفەی خۆی هەستێت، ئیدی دەرەنجام چی دەبێت گرنگ نییە، واتە بۆ بڕیاردان لەسەر ئەخلاقیبوون و ئەخلاقینەبوونی کارەکان دەڕوانێتە خودی

---

(١) نیگایەک بۆ فەلسەفەی ئەخلاق، موسعەب ئەدهەم، ل ٣٠. ئەویش لە (مشتاقی و مهجوری) مصطفی ملکیانی وەرگرتووە، ل ٢٥٥ _ ٢٥٧.

کارەکان، بۆنموونە کانت دەڵێت: ڕاستگۆبە ئەگەر بەهۆیەوە هەموو گەردوون لەناوبچێت! واتە لێرەدا کانت ڕووانییە خودی کارەکە، جا سەرەنجامەکەی چی دەبێت و چی نابێت، سوودی دەبێت یان زیان، ئەوە بەهیچ جۆرێک نابێت لەبەرچاو بگیردرێت.

ئەم تیۆریایە لەسەر دوو بنەمای سەرەکی وەستاوە:

**١.** هەموو ڕێسا ئەخلاقییەکان شتی عەقڵین، واتە عەقڵ دەیانسەلمێنێت.

**٢.** مادام یاسا و ڕێساکان عەقڵین، ئەرکی هەموو مرۆڤێکە لە هەموو کات و شوێنێکدا و بەبێ ڕیزپەڕ (استثناء) بەگوێیان بکات.

کەواتە بەم پێیە ئەگەر هەموو دونیا وەستا بێت لەسەر شتێکی نائەخلاقی وەک درۆ، نابێت بیڵێی، چونکە ئەمە شتێکی عەقڵی و گشتییە، کە عەقڵی و گشتی بوو ئیدی لێ لادانی ناکرێت.

بەڵام ئەم تیۆریایە چەند کێشەیەکی زۆر زەقی هەیە:

**کێشەی یەکەم:** ئەم تیۆریایە تیۆریایەکی تایبەتە و گشتی نییە، بەواتایەکی تر نوخبەگەرا و دەستەبژێرگەرایە، واتە هەموو کەس نە پێی دەکرێت، نەدەشی کات، چونکە ئەمانە زۆر کەمن، کە لانەدەن لە یاسا عەقڵییە گشتییەکان، لە سنوورە ئەخلاقییەکان، کەواتە هەر لەسەرەتاوە ئەم تیۆریایە بووبە نوخەگەرا و دەستەبژێرگەرا و شۆڕنەبۆوە بۆ ناو هەموو چین و توێژ و ئاستەکان.

**کێشەی دووەم:** ئەم تیۆریایە دژە شهودییە، واتە حیساب بۆ شتە جوزئی و بەشەکییەکانی ناو کۆمەڵگە ناکات، حیساب بۆ بارودۆخ و سیاق و...، جیاوازەکان ناکات، چونکە دەکرێت شتێک بە پێی یاسا گشتی وعەقڵییەکان شتێکی ئەخلاقی بێت، بەڵام لە سیاق و بارودۆخێکی دیاریکراودا وانەبێت، بۆنموونە کەسێک نەخۆشی دڵی هەیە و بەرگەی هەواڵ و کارەساتی لەناوکاو ناگرێت، بەڵام تۆ

بێی ڕاستەوخۆ و بێ چەندوچوون هەواڵی کوژرانی کوڕەکەی، یان وەرگەڕانی ئۆتۆبێلەکەی، یان خنکانی، یان هەر هەواڵێکی ناخۆشی لەناکاوی پێبدەی! باشە لێرەدا دەکرێت بڵێی با حەقیقەت دەرخەم و نەیشارمەوە، چونکە دەرخستنی حەقیقەت یاسایەکی گشتییە؟! نەخێر، لێرەدا هەستە شهودییەکەت دێت و پێت دەڵێت کامە گونجاوتر و ڕاستتر و باشترە. کەواتە ئەوەش یەکێکی دیکە لە کێشەکانی ئەم تیۆریایە.

**کێشەی سێیەم:** هاودژی و تێکگیرانی ئەخلاقییە گشتییەکان، بۆنموونە ڕاستگۆیی و وەفا، هەردووکیان دوو شتی ئەخلاقی بەرزن، بەڵام هەندێک جار لە کات و شوێن و بارودۆخ و سیاقی جیاوازدا تێکدەگیرێن، بۆنموونە کەسێک ڕایکردووە و هاتووە بۆلای تۆ، لەترسی ئەوەی بیکوژن، تۆش بەڵێنت پێیداوە، دوایی ئەوانەی بەدوایەوەن، دێن و دەڵێن: فڵان کەس لەلای تۆیە؟ تۆ چی وەڵام دەدەیەوە؟ ئەگەر بڵێی نەخێر، ناڕاستت وتووە، ئەگەریش بڵێی بەڵێ، وەفات نەبووە و خیانەتت لە بەڵێنەکەت کردووە، کەواتە لێرەدا ڕاستگۆیی و بەوەفابوون تێکگیران، بەڵام کامیان ڕاستە؟ کەواتە دیسانەوە بەپێی ئەم یاسایە تووشی کێشە و تێکگیران بووینەوە، کە دەربازبوون لێی ئەستەمە.[1]

## قوتابخانەی ئەنجامگەرا

تیۆریای دووەم: ئەنجامگەرایی «Teleologism»: ئەمەیان لەسەر بنەمای ئەنجام بونیاد نراوە، واتە وەک تیۆریای یەکەم نییە بڕوانێتە کردارەکان، بەڵکوو دەڕوانێتە ئەنجامی کردارەکان، دوای ئەوەی تیۆریای یەکەم وەڵامی باشی پێنەبوو، نەیتوانی کێشەکانی مرۆڤ چارەسەر بکات، نەیتوانی ڕۆڵی خۆی ببینێت - وەک «ڤنگشتاین» کە وەزیفەتگەرایی بە حیکمەتی سارد ناودەنێت،

---

(١) فەلسەفەی ئەخلاق، تەحسین حمە غریب، ل ٤٥ _ ٥٠.

چونکە تەنیا شتێکی عەقڵی نەزەری وشکە و گەرم و گوڕی تێدا نییە - تیۆریای ئەنجامگەر و سوودگەرا (پراگماتیزم) هاتەکایەوە.

ئەم تیۆریایە بۆ ناونانی هەرشتێک بە ئەخلاقیبوون و نائەخلاقیبوون دەگەڕێتەوە بۆ سەرەنجامی کارەکان، ئایا سوودیان هەیە یان نا؟ خۆشی دێنێ یان نا؟ ئازار لەکۆڵ دەکاتەوە یان نا؟ چونکە ئەوەی بەرهەستە و هەستپێکراوە ئەنجامەکانن، سوودەکانن، خۆشبەختی هێنەرەکانن.

ئەم تیۆریایەش سێ تیۆریای دیکەی لێدەبێتەوە:

**تیۆریای یەکەم: دەرەنجامگەرای خودگەرا**

چ شتێک زۆرترین سوود و قازانجی هەبێت بۆمن ئەوە ئەخلاقییە، چ شتێک زۆرترین ناخۆشی و نارەحەتی و ئازار لەکۆڵ من بکاتەوە، ئەوە ئەخلاقییە، بەپێچەوانەوەشەوە، چ شتێک زەرەر و زیان و ئازار و ناخۆشی بۆمن بێنێت، ئەوە نائەخلاقییە.

کەواتە سوود و قازانج و خۆشییەکانی من سەنتەرن.

**تیۆریای دووەم: دەرەنجامگەرایی غەیرگەرا، ئەویترگەرا**

چ شتێک زۆرترین سوود و قازانجی هەبێت بۆ زۆربەی خەڵک (بۆ کۆمەڵگە، بۆ مرۆڤایەتی) ئەوە ئەخلاقییە، چ شتێک زۆرترین ناخۆشی و نارەحەتی و ئازار لەکۆڵ زۆربەی خەڵک (کۆمەڵگە، مرۆڤایەتی) بکاتەوە، ئەوە ئەخلاقییە، بەپێچەوانەشەوە، چ شتێک زەرەر و زیان و ئازار و ناخۆشی بۆ مرۆڤایەتی بێنێت، ئەوە نائەخلاقییە.

کەواتە غەیر سەنتەرە، ئەوانی دی سەنتەرن، نەک من.

**تیۆریای سێیەم: دەرەنجامگەرای سوودگەرا**

ئەمەیان پێی وایە، شتێک ئەخلاقییە، کە بەدڵنیاییەوە دەرەنجامەکەی سوودبەخش بێت، بۆنموونە دادگەری لەلای «پراگماتیستەکان» مەرج نییە ئەخلاقی بێت، چونکە مەرج نییە هەموو جارێک سوودبەخش بێت! سوودیش لەلای ئەمان واتە چێژ، چ شتێک چێژ بەمرۆڤ بدات ئەخلاقییە! چیش ئازاری پێبگەیەنێت نائەخلاقییە.

واتە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ «سۆز»، هەربۆیە ئەو ڕەخنانەی کە دێنەسەری هەمووی ڕوو لەوە دەکەن، کە چۆن دەبێت هەموو شتێک بەرینەوە بۆلای سۆز و چێژ، چونکە ئەوەی ئێستا چێژی لێدەبینی، زۆرنزیکە دوای کەمێکی دیکە ئازارت پێبگەیەنێت.

واتە چێژ بەپێی کەس و شوێن و کات و سەردەم دەگۆڕێت، کەواتە ناکرێت بکرێتە سەنتەر و پێوەری ئەخلاق.

کەواتە ئەنجامگەراکان دەبنە سێ بەش:

١. ئەنجامگەرای خودسەنتەر

٢. ئەنجامگەرای غەیرسەنتەر

٣. ئەنجامگەرای سوودسەنتەر

**کێشەکانی ئەم تیۆریایە**

**کێشەی یەکەم: تەنیا یەک شت دەبینێت**

کێشەی گەورەی ئەم تیۆریایە ئەوەیە کە یەک شت دەکاتە پێوەر تەنیا یەک شت دەبینێت، لەکاتێکدا ئەخلاق زۆر فراوانە، بۆنموونە لەلای «خودسەنتەرەکان» یارمەتیدانی کوێرێک لەسەر شەقامێک و پەڕاندنەوەی،

چۆن ئەخلاقییە؟! لەکاتێکدا بۆی هەیە سەیارەی لێی بدات و خۆی زەرەر بکات نەک قازانج، کەواتە قازانجەکەی چی بوو؟!

یان قەرزدان بە کەسێک بەبێ زیادە لێوەرگرتن، چۆن ئەخلاقییە؟!

یان ڕزگارکردنی کەسێک کە خەریکە بخنکێت، چۆن ئەخلاقییە؟! لەکاتێکدا زۆر نزیکە خۆت بخنکێیت.

**کێشەی دووەم: ڕێژەگەرایە و ئەخلاق دەبێتە ڕێژەیی**

بەپێی ئەم تیۆریایە، هیچ ئەخلاقێکی جێگیر بوونی نامێنێت، چونکە زۆر شت هەیە بۆ کەسێک قازانجە و بۆ یەکێکی دیکە زەرەر، یان بۆ گەلێک قازانجە و بۆ گەلێکی دیکە زەرەر. بۆنموونە، داگیرکردنی وڵاتێکی دەوڵەمەند بۆ وڵاتە داگیرکارەکە قازانجە، ڕەنگە ملیۆنان لێی سوودمەند ببن، بەڵام بۆ وڵاتی داگیرکراو کارەساتە و هەموو خەڵکەکەی زەرەر دەکات، یان زۆربەی. بۆیە زۆرێک لە فەیلەسووفان پێیان وایە ئەم جۆرە فەلسەفەیە بووە هۆی جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی و داگیرکارییەکان، هی خۆم بۆخۆم و هی تۆش دەخۆم.

بۆیە کۆمەڵێک لە فەیلەسووفان لەوانەش «ڕاسڵ» ئەم تیۆریایەیان ڕەتکردەوە، ڕاسڵ دوو پەرتووکی نووسی یەکێکیان لەساڵی (١٩٢١ ز) ئەویتریان لە ساڵی (١٩٣٠ ز) لەم دوو پەرتووکەدا ئەوەی خستەڕوو، کە دەبێت ئێمە فەلسەفەی ئەخلاقی کانت زیندووبکەینەوە، بەڵام بەو مەرجەی هەندێک دەستکاری بکەین، چونکە ئێمە دەبێت یاسا و ڕێسا و بنەمای گشتی ئەخلاقیمان هەبێت، کە بۆ هەموو کات و شوێن و سەردەمەکان ببێت، بەڵام بەڕەچاوکردنی شهوود و بارودۆخ و سیاق و... کەسەکان، بۆ ئەم مەبەستە هات حەوت یاسای دانا...

کەواتە «ڕاسڵ» وەکوو «کانت» ی نەکرد، بەتەواوی لە واقیع دابڕێت،

بەڵکوو حیسابی بۆ شهوود و سیاق و بارودۆخیش کرد، بۆیە بوو بە یەکێک لە بەناوبانگترین فەیلەسووفەکانی ئەخلاق.[١]

## قوتابخانەی فەزیلەتگەرا

تیۆریای سێیەم: تیۆریای فەزیلەتگەرا

لەم تیۆریایەدا بکەر سەنتەرە، نەوەک کردار و ئەنجامی کردار، واتە دەڕوانێتە بکەری کارەکان. کەواتە بنەما ئەخلاقییەکان و کارە ئەخلاقییەکان سەنتەر نیین، چونکە بنەما ئەخلاقییەکان هی ناو کتێبەکانن، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە بکەری ئەخلاقی دروست ببن. بکەری ئەخلاقیش کاتێک دروست دەبێت، کە بنەما ئەخلاقییەکان بووبنە مەلەکە تێیدا، واتە چۆن تۆ خوێندەواری و ناتوانیت لەهەمان کاتدا نەخوێندەوار بیت، چونکە خوێندەواری بۆتە مەلەکە، بەهەمان شێوە، نەتوانیت ئەخلاقی نەبیت، نەتوانیت لە بنەما ئەخلاقییەکان لابدەیت. واتە ئەگەر بشتەوێت نائەخڵاقی بنوێنیت، هێشتا نەتوانی. هەروەک چۆن ئەگەر بتەوێت خوێندەوارییەکە لەبیرخۆن بەرییەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە ناتوانیت. دەکرێت هەڵە بکەی لە نووسیندا، بەڵام بەکەمترین سەرنجدان ڕاستەوخۆ هەست بەهەڵە دەکەیت و چاکی دەکەیەوە، بە هەمان شێوە، هەڵە دەکەیت، تووشی شتی نائەخلاقی و لادان لە بنەما ئەخلاقییەکانیش دەبیت، بەڵام بەکەمترین سەرنجدان دێیەوە سەرڕێ، چونکە ئەخلاق و بنەماکانی بوون بە مەلەکە. کەواتە ئەم تیۆریایە کار لەسەر بەمەلەکەکردنی بنەما ئەخلاقییەکان دەکات، نەک تەنیا ڕێسا ئەخلاقییەکان و کردارە ئەخلاقییەکان.

ئەو کەسەی بەردەوام سەرقاڵی خراپەکردنە و بنەما و سنوورە ئەخلاقییەکان

---

(١) فەلسەفەی ئەخلاق، تەحسین حمە غریب، ل ٥١ _ ٥٨.

دەبەزێنێت، ئەوە بزانە ئەخلاق نەبووە بە مەلەکە، واتە ئەخلاق لەلای ئەو فەزیلەت نییە.

ئەم تیۆریایە تیۆریایەکی هێز و عیشقبەخشە، تیۆریایەکی کردەیی عەمەلییە نەک تیۆری و نەزەری.

«ئەفلاتوون و ئەرستۆ و ئەکویناس» فەیلەسووفی فەزیلەتگەرابوون، بەڵام لە قۆناغی ڕۆشنگەری دوو قوتابخانەی ئەخلاقی دەرکەوتن، یەکێکیان ئەخلاقی وەزیفەگەرای «کانت»، ئەویتریان ئەخلاقی ئەنجامگەرا، کە بنەماکەی «جرێمی بێنتامی» و «جۆن ستیوارت میل» دایاننا، ئەم دوو تیۆریایە وردە وردە تیۆریای فەزیلەتگەرایان خستەکەنارەوە و لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا ئەخلاقی فەزیلەت هیچ پێگە و جێگەیەکی نەما لە واقیعدا، دوایی لە ناوەڕاستەکانی سەدەی بیستدا وردە وردە کەسانی وەک «ئەلزابیث ئانسکۆمپ» قوتابی «ڤینگشتاین» و خانم «فیلیبافوت» و... هاتنە مەیدانەوە و سوودیان لەلاوازییەکانی ئەم دوو قوتابخانەیە وەرگرت و باس و بابەتەکانی ئەخلاقی فەزیلەتیان خستەڕوو. پاش ئەمانیش خانم «ئایرس مورداک» لە کتێبی «ئەودیو سروشت وەکوو ڕێنموونییەک بۆ ئەخلاق» کە کۆمەڵێک وتاریانە و هەروەها خانم «ڕوزاینی هرتس هیرت» هاتنە ناو مەیدانەکەوە.

ئەم تیۆریایەش کێشە و گرفتی خۆی هەیە، بەڵام لەکۆتاییدا سوود و کاریگەرییە باشەکانی زۆر زیاترن.

بۆنموونە لە کێشەکانی: کەسێک کە کارێکی ئەخلاقی دەکات، بەڵام فەزیلەتی ئەخلاقی تێیدا نەبووەتە مەلەکە، ئێ باشە ئەوە ناوی چی لێ دەنێیت؟! خۆ کارەکە کارێکی ئەخلاقییە، کەواتە ئەوەندەی تەرکیز لەسەر کەسەکە دەکەن، ئەوەندە تەرکیز لەسەر ڕێسا و بنەما ئەخلاقییەکان ناکەن.

لەکۆتاییدا دەتوانین بڵێین هەموو تیۆریاکان بەشێک لە جوانی و باشییان

لایە، بەڵام هیچیشیان بێ کەموکوڕی نیین، هەر یەکێکیشیان خەڵکێک زیاتر بەکاری دێنێت، بۆنموونە ئەخلاقی ئەنجامگەرا، لەلای سیاسییەکان و خەڵکی عەوام و بازرگانەکان و سەرمایەدارەکان ویستراو و مەرغووبە، بۆنموونە کەسێکی عەوام کە کارێک دەکات، ڕێک ئەوەی دێتەبەرچاو پاداشتەکەی چییە؟ یان سیاسی و بازرگانەکان ڕێک دەڕواننە ئەنجام و سوودەکانی.

کەواتە ئێمە دەتوانین سوود لە هەموویان ببینین بە ڕەچاوکردنی واقیع و بارودۆخ و ئایین و عورف و...[1]

## ڕێبازەکانی فەلسەفەی ئەخلاق

وەک لەوەو پێش باسمان کرد، سێ تیۆریا، یان سێ قوتابخانەی سەرەکی هەبووە لە مێژووی فەلسەفەی ئەخلاقدا:

١. قوتابخانەی وەزەیفەتگەرایی (Denotologism): ئەم قوتابخانە لەسەر بنەمای وەزیفە و ئەرک بونیاد نرا.

٢. ئەنجامگەرایی (Teleologism): ئەمەیان لەسەر بنەمای ئەنجام بونیاد نرا.

٣. قوتابخانەی فەزیلەتگەرا (- Right - based ethics -)

ئەمەشیان لەسەر بنەمای فەزیلەتگەرایی دامەزرا.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەیە بەم شێوەیە دابەشی دەکات

١. تیۆریای چێژ (اللذة)

٢. تیۆریای بەختەوەری (السعادة)

---

(١) فەلسەفەی ئەخلاق، تەحسین حمە غریب، ل ٥٩ _ ٦٤.

**٣.** تیۆریای سوودگەرا (المنفعة)

**٤.** تیۆریای ئەرکگەرا (الواجب).[١]

ئێمە لێرەدا تەنیا باسی یەکەم و دووەمیان دەکەین: تیۆریای چێژ (اللذة) و تیۆریای بەختەوەری (السعادة)، چونکە تیۆریای سوودگەرا (المنفعة) مان لە تیۆریای «ئەنجامگەرا» دا بەدرێژی باسکرد، هەروەها تیۆریای ئەرکگەرا (الواجب) مان لە تێوریای «وەزیفەتگەرا» دا بەدرێژی باسکرد، هەرچەندە تیۆریای بەختەوەری و چێژیش دەچنە ناو تیۆریای ئەنجامگەراوە، بەڵام بەپێویستی دەزانم بەشێوەیەکی دیکە و بەدرێژتر باسی لێوە بکەم.

## تیۆریا و ڕێبازی چێژ

تیۆریای چێژ و چێژگەراکان پێیان وایە، هەموو زیندەوەرێک، هەموو بوونەوەرە زیندووەکان، هەر لەسەرەتای هاتنەبوونیان ئارەزووی چێژیان هەیە و خۆیان دەپارێزن لە تووشبوون بە ئەزیەت و ئازار، ئەمەش بەبێ بیرلێکردنەوە و تێفکرین، چونکە شتێکی فیتری و زگماکی و سروشتی خۆیانە.

«کالیکلیس» (٤٠٠ پ.ز) پێیوایە باشترین مرۆڤ لە چێژدا خۆی دەنوێنێت. سوفستائییەکان پێیانوابوو سروشتی مرۆڤ شەهوەت و ئارەزوو و چێژە، هەربۆیە گەیشتن بەوەی کە ئامانجی سەرەتا و کۆتایی مرۆڤ بریتییە لە چێژ و دەستخستنی چێژ.[٢]

---

(١) بۆ ڕاڤەی هەموو ئەم خاڵانە بگەڕێوە بۆ پەرتووکی: (مقدمة فی علم الأخلاق)، د. محمود حمدی زقزوق.

(٢) مقدمة فی علم الأخلاق، د. محمود حمدی زقزوق، ٧٦.

## قوتابخانەی قۆرینائییەکان

«ئەرستیب» دامەزرێنەری قۆرینائییەکان، خەڵکی شاری «قۆرینا» یە و لەوێ و لە ساڵی (٤٣٥ پ. ز) لەدایک بووە، پێیوایە مرۆڤ دەبێت هەوڵبدات چێژ هەڵبژێرێت و هەوڵی بۆ بدات، بەپێچەوانەشەوە دەبێت ڕابکات و دووربکەوێتەوە لە هەموو شتێک کە چێژی تێدانییە، یان ئەو ماندووبوونەی چێژی تێدانییە، پێی وایە هیچ پێویستییەک نییە بۆ شەرم و حەیا و حەزەر، چونکە ئەمانە هەمووی دانراوی عورف و عادەتن.

کەواتە هەموو بۆچوونەکانی ئەرستیب لەدەوری چێژی هەستەکی دەرەکی دەسووڕێتەوە، پێیوایە مرۆڤ دەبێت بەدوای چێژەوە بێت، بەڵام پێیانەوە پەیوەست نەبێت، چونکە پەیوەستبوون پێیەوە دەبێتە هۆی ئازار و قەلەقی.[1]

ئەم قوتابخانەیە ئەنجامی جیاوازی لێکەوتووەتەوە، هەندێک پێیانوایە ئیباحی و بەرەڵایی لێکەوتووەتەوە، لە نموونەی ئەوانەی ئەم ڕێبازە ئیباحییەیان هەڵبژاردووە «تیودورس ئەتیوس» (٤٠٠ پ. ز) ئەم کەسە لە قوتابخانەی ئەرستیب بووە، هەموو کارێکی بە ئەنجامەکەی دەپێوا، (واتە ئەنجامگەرابوو)، جا وەسیلە و ئامرازەکەی هەرشتێک بایە، بۆنموونە دزی و تەزویر و ساختەیی و...، هەموو ئەمانە بۆیان هەیە لەزۆر حاڵەتدا ڕێگەپێدراوبن! بۆیە گەیاندییە لوتکە لە چێژ و چێژگەرایی‌دا.[2]

کەواتە بەدەستخستنی چێژ و دوورکەوتنەوە لە ئەزیەت و ئازار کرۆکی ئەم ڕێبازە بوو.

---

(١) تاريخ االفسفة اليونانية، يوسف كرم، ٦١. مقدمة فى علم الأخلاق، د. محمود حمدى زقزوق، ل ٧٨ _ ٧٩.

(٢) تاريخ الأخلاق، د. يوسف موسى، ل ١٠٢. مقدمة فى علم الأخلاق، د. محمود حمدى زقزوق، ل ٧٩.

## قوتابخانەی ئەپیکۆری

کاتێک «ئەپیکۆر» (٣٤١ پ. ز) هات و قوتابخانەی ئەپیکۆری دامەزراند، تەواو هاوڕابوو لەگەڵ «ئەرستی» دا، لەوەی کە مرۆڤ وەک هەموو زیندەوەران بەدوای چێژەوەیە، ئەمەش شتێکی فیترییە و بەبێ بیرکردنەوە و تێڕامان دەیکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەی پێیوابوو مەبەست و ئامانجی مرۆڤ بریتییە لە چێژ، بەڵام هەندێک جاریش سەردەکێشێت بۆ چارەنووس و ئەنجامی نەخوازراو و خراپ، چونکە زێدەڕۆیی کردن لە چێژ و شەهەواتدا دەبێتە هۆی زەرەر و زیان و ئەنجامی نەخوازراو، بۆیە پێویستە دووربکەوییەوە لە هەموو چێژێک کە سەربکێشێت بۆ ئازار، قبووڵکردنی هەموو ئەزیەت و ئازارێک کە چێژێکی گەورەی لێوە بەرهەم بێت، بۆیە قوتابخانەی ئەپیکۆری لەسەر چوار یاسا بنیاترا:

١. ئەو چێژە وەربگرە کە ئازاری لەدواوە نەیەت.

٢. دووربکەوە لەو ئازارەی چێژی لەدواوە نییە.

٣. دووربکەوە لەو چێژەی بێبەشت دەکات لە چێژێکی گەورەتر، یان سەربکێشێت بۆ ئازارێک کە ئازارەکەی زیاتر بێت لە چێژەکەی.

٤. ئەو ئازارە قبووڵ بکە کە ئازارێکی گەورەترت لەکۆڵ دەکاتەوە، یان چێژێکی گەورەترت لە ئازارەکە بۆ دێنێت.[1]

ئەپیکۆر دەڵێت: زێدەڕۆیی مەکە لە خواردن نەبادا هەرسکردنەکە باش نەبێت، ئافرەت و سیاسەت و هەموو کردارە شەهوانییەکان بە سووک سەیر بکە.[2]

---

(١) تاريخ الاخلاق، ل ١٠٧.
الأخلاق النظرية ٢٤٣.
مقدمة فى علم الأخلاق، د. محمود حمدى زقزوق ل ٨٠.
(٢) المدارس الفلسفية، د. الأهوانى، ل ٨٢.

کەواتە بەم پێیە ئەپیکۆر ویستوویەتی سوودگەرایەک و چێژگەرایەکی هاوسەنگ بێت، ئەو هەموو چێژی کورت هەڵنێناوە لە چێژی حیسی و هەستی، وەک «ئەرستیب»، بەڵکوو چێژە ڕۆحییەکانیشی برەو پێداوە، بۆیە بانگەوازی کردووە بۆلای فەزیلەت، بانگەوازی دەکرد بۆ قەناعەت، بە فەزیلەی سەرەکی دادەنا، چونکە تەندروستی دەپارێزێت و ژیان درێژ دەکات، لە ژیان و تەندروستی و سەلامەتیشدا هەموو ئامرازەکانی بەختەوەری دێنەدی، هەروەها بانگەوازی بۆ هاوڕێیەتی دەکرد و پێی وابوو بەرزترین فەزیلەتە، چونکە هاوڕێ یارمەتی هاوڕێ دەدات و دەیپارێزێت و زوڵم و ستەم و دەستدرێژی و زیانی لێ لادەبات. هەروەها عەدالەت و دادگەری فەزیلەتە، چونکە مرۆڤ لە دەستدرێژی و دەپارێزێت لە ترسی کاردانەوەی کەسی بەرانبەر، حەکیم ڕەچاوی دادگەری دەکات بۆئەوەی خۆی بپارێزێت لە تۆڵەکردنەوەی بەرانبەرەکانی لێی، کەواتە هەموو کەسێک لە ئارامیدا دەژییێت، ئارامیش باشترین شتێکە مرۆڤ بەدوایدا بگەڕێت.

لەگەڵ ئەم هەموو قسە و وتانەی ئەپیکۆر، بەڵام ڕێبازەکەی بە ڕێبازێکی ئەخلاقی حەقیقی و ڕاستەقینە ناژمێردرێت، چونکە لەکۆتاییدا پێی وایە فەزیلەت کاتێ فەزیلەتە کە بتبات بەرەو چێژ و سوود و قازانج و ئارامی.

لەلایەکی دیکەوە شوێنکەوتوانی ڕێبازی ئەپیکۆری لە ڕۆمان ئەم ئەخلاقەیان شێواندکە لەسەر قەناعەت و هاوسەنگی دادگەری و دڵنیایی و ئارامی وەستابوو، بردیان بەرەو شەهوتگەرایی و ڕۆچوون لە هەواو شەهوەت و ئارەزووەکاندا.[١]

## تیۆریا و ڕێبازی چێژ لە سەردەمی مەسیحی و ئیسلامدا

لەسەردەمی مەسیحی (سەدەی ناوەڕاست) و سەردەمی ئیسلامدا تیۆریا و ڕێبازی چێژ هیچ قوتابخانە و ڕێبازێکی نەبوو، بەم شێوەیە مایەوە تاوکوو سەردەمی نوێ.

---

(١) مباحث ونظريات في علم الأخلاق، أبو بكر ذكري، ٨١.

## تیۆریا و ڕێبازی چێژ لە سەردەمی نوێدا

لەسەردەمی نوێدا تیۆریا و ڕێبازی چێژ هاتەوە مەیدان و لەسەر دەستی بیرمەندی ئیتاڵی «لاورینسیوس فللا» گەشەی کردەوەکە لەسەدەی پازدەدا ژیاوە، پێی وابوو مرۆڤ لە سروشتی خۆیدا بەدوای چێژ و بەختەوەریدا دەگەڕێت، بەڵام چێژی حەقیقی ناتوانرێت بەدەست بهێنرێت مەگەر لە بەختەوەری هەمیشەییدا نەبێت دوای مردن، بۆیە پەیوەندی دروستکرد لەنێوان چێژ و بەختەوەریدا.

لەسەدەی حەڤدەدا نوێنەرێکی دیکەی ڕێبازی چێژ هاتە مەیدان، بەناوی «جاسندی»، ئەویش بەهەمان شێوە چێژ و بەختەوەری لێکگرێدابوو.

پاشان لەسەدەی هەژدەیەمدا و لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا لە فەڕەنسا ئەم ڕێبازە هاتەوە مەیدان لەسەر دەستی کۆمەڵە فەیلەسووفێکی ماتریالیستی (ماددی) وەک: «لامتریە، هلفیتسیوس، بارۆن دی هۆڵباخ».

پاشان لەسەردەمی نۆزدەدا دووبارە سەریهەڵدایەوە لەسەر دەستی «بنتام» و شوێنکەوتووانی.

پاشان لەسەدەی بیستیشدا ئەم ڕێبازە نوێ بۆوە و هەندێک گۆڕانکاری بەسەردا هات و لەسەر دەستی نوێنەری پۆزەتیڤیزمە (وەضعییە) نوێکان «موریس شلیک» دا (١٩٣٦ ز) غەیری ئەمیش هاتەوە مەیدان.[1]

دەشتوانین ڕێبازی چێژ بەبەرجەستەکراوی لە ڕێبازی فرۆیددا ببینین.

---

(١) الأخلاق، أحمد أمین، ل ٥٩ _ ٦٠. مقدمة فی علم الأخلاق، د. محمود حمدی زقزوق، ل ٨١ _ ٨٢.

## ڕەخنە لە تیۆریا و ڕێبازی چێژ

١. ڕێبازی چێژ لەسەر خۆخۆیی و ئەنانییەت و هەڵپەکردن و خودویستی وەستاوە، بۆیە بەکەڵک ئەوە نایەت بە ڕێبازیکی فەلسەفی ئەخلاقی دابنرێت و کاری پێبکرێت، چونکە لەم نێوەندەدا هەموو بنەما ئەخلاقی و ئاکاریی و سیفەتە بەرزەکان و فەزیلەتەکان دەبنە قوربانی چێژە کەسییەکان.

٢. گەڕان بەدوای چێژ و ئەوەی پێیەوە بەندە لە خۆشبەختی، یاسایەکی خودی و نەفسییە، نەوەک یاسایەکی ئەخلاقی، چونکە بەپێی کەس و شوێن و کات و ژینگە و بارودۆخەکانیش دەگۆڕێت.

٣. مەرج نییە هەموو کاتێک چێژ باش بێت و ئازار خراپ، بەڵکوو جاری وا هەیە چێژەکە دەبێتە بەڵاو ئازارەکەش دەبێتە چێژ و خۆشی و بەختەوەری، بۆنموونە چێژی زۆرخۆری و چاوچنۆکی دەبێتە هۆی نەخۆشی و تێکدانی جەستە، زۆرجار دەبێتە هۆی نەخۆشی کوشندە و مردن، یان چێژی تۆڵەسەندنەوە خاوەنەکەی تووشی نەهامەتی و ناڕەحەتی و دەربەدەری و پەشیمانی و...، دەکات.[1]

٤. ئەگەر ئامانج بەس بووبە چێژ و شەهوەت و خۆشی ماددی، مرۆڤیش دەبێتە ئاژەڵێک وەک هەموو ئاژەڵە هەلپەرستەکانی تر.

## ئاڕاستە و تیۆریای بەختەوەری (نظرية السعادة)

لەدوای ئەوەی تیۆریا و ڕێبازی چێژ فەلسەفەکەی خۆی لەسەر چێژ بنیاتنا، ئامانجی سەرەتا و کۆتایی مرۆڤی کورتهەڵێنا لە چێژ و شەهوەت و ئارەزوو، لەبەرانبەردا تیۆریا و ڕێبازێکی دیکە هاتە مەیدان و دژی ئەم ڕێباز و تەوژمە وەستایەوە، بۆیە کۆمەڵێک لە فەیلەسووفە یۆنانییەکان هاتن وتیان خێر و باشەی ڕەها لە بەختەوەری و سەعادەتدایە نەوەک لە چێژ. بەڵام گومانیش

---

(١) مباحث ونظريات فی علم الأخلاق، أبو بكر ذكری، ل ١١٧ _ ١١٨.

لەوەدا نییە، کە هەموو مرۆڤێک بۆ بەختەوەری هەوڵدەدات، هەرچەندە هەرکەسە و بەختەوەری لە شتێکی دیاریکراودا دەبینێت.

کاتێک فەیلەسووفە یۆنانییەکان پێیانوابوو بەختەوەری خێر و باشەی ڕەهایە و خێر و باشەی گەورەیە، مەبەستیان لە بەختەوەری ئەو ئامانجە بەرز و گەورەیە بوو، کە هیچ ئامانجێکی دیکەی لەپشتەوە نییە. مەبەستیان تەنیا خێروبێر و باشەیەکی ڕێژەیی گۆڕاوی وەک چێژ نەبوو، چونکە ئەوان پێیانوابوو چێژ شتێکی جوزئی و گۆڕاو و ناجێگیرە، واتە بەردەوام لەگۆڕاندایە، وایان دەبینی کە چێژ دیاردەیەکی ئەزموونییە و بەس، بەڵام پێیانوابوو بەختەوەری شتێکی گشتی و کوللییە و بریتییە لە شتێکی عەقڵی دوور لە ئەزموون، واتە نەگۆڕ و جێگیرە و وەک چێژ نییە، بەردەوام بگۆڕێت و ناجێگیر بێت.

ئینجا چێژ خۆی تەنیا بریتییە لە ئامرازێک بۆ شتێکی دیکە کە لەدوای ئەوەوە دێت، بەڵام بەختەوەری وا نییە و لە زاتی خۆیدا ئامانجە، ئینجا چێژ تایبەتە بە ئەندامێک لە ئەندامەکانی جەستە، بەڵام بەختەوەری وانییە و بارودۆخێکی ڕۆحی و دەروونییە کە هەموو کیان و بوونی مرۆڤ دادەگرێت.(١)

بۆیە دەتوانین بەم شێوەیە جیاوازی نێوان چێژ و بەختەوەری پوخت بکەینەوە:

١. چێژ گۆڕاوە، بەختەوەری نەگۆڕ.

٢. چێژ ڕێژەییە، بەختەوەری جێگیر و نارێژەییە.

٣. چێژ بەشەکی (جوزئی) یە، بەختەوەری گشتی (کوللی) یە.

٤. چێژ دیاردەیەکی ئەزموونییە، بەختەوەری نائەزموونییە و شتێکی عەقڵیی ڕووتە.

---

(١) المشكلة الخلقية، د. زكريا إبراهيم، ١٤٢ _ ١٤٣.

٥. چێژ خۆی ئامانج نییە و ئامرازە بۆ شتێکی دیکە، بەڵام بەختەوەری خۆی ئامانجە.

٦. ئامانج پەیوەستە بە ئەندام یان بەشێکی مرۆڤ، بەختەوەری حاڵەتێکی ڕۆحی و دەروونییە و پەیوەستە بە هەموو کیانی مرۆڤەوە.

تیۆریای بەختەوەری کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە بەسەر مێژووی فەلسەفەی ئەخلاقەوە، بۆیە ئێمە هەر لە سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆوە باسی دەکەین تاوەکوو غەزالی و ئیبن میسکەوەیهی و... لە موسڵمانەکان.

## تیۆریای بەختەوەی لە فەلسەفەی یۆنانیدا

### بۆچوونی سوقرات

سوقرات یەکەم کەس بوو وتی: ئامانجی ئەخلاق بەختەوەرییە، سوقرات وەک فەیلەسووفانی دیکە نەهات گرنگی بە بابەتە گەردوونی و سروشتییەکان بدات، نەهات بڵێ ئەسڵی ئەم بوونە ئاو بووە؟ یان هەوا؟ یان ئاگر؟ یان خاک؟ بەڵکوو هات فەلسەفەکەی خۆی چڕکردەوە لە مرۆڤدا، لە مرۆڤیشدا چڕی کردەوە لە ئەخلاقدا، هەربۆیە وتە بەناوبانگەکەی هەیە کە دەڵێت: "خۆت بناسە"، بۆیە وترا: سوقرات فەلسەفەی لە ئاسمانەوە دابەزاند بۆ مرۆڤ، واتە فەلسەفەی لە سروشتەوە هێنا بەرەو زەوی.

سوقرات زۆر سەرسەختانە دژی سوفستائییەکان وەستایەوە، چونکە ئەوان بڕوایان بە حەقیقەتو ئەخلاقی جێگیر نەبوو، پێیان وابوو، مرۆڤ پێوەری هەموو شتێکە، حەق ئەوەیە کە ئەو دەیبینێت، ناحەق و باتیلیش هەر ئەوەیە کە ئەو دەیبینێت.

بەم پێیەی سوفستائییەکان، کە هیچ مەعریفە و زانینێکی جێگیر نەبێت،

کەواتە هیچ بنەمایەکی ئەخلاقی جێگیریش بوونی نییە، بەڵکوو هەمووی بەپێی کەس و شوێن و کات و سەردەم و باردۆخ و ژینگە دەگۆڕێت، سروشتی مرۆڤیش لای ئەوان تەنیا کۆمەڵە شەهوەت و ئارەزوویێکە و بەس، کەواتە ئامانجی یەکەم و کۆتایی مرۆڤیش بریتییە لە چێژ و شەهوەت و گەیشتن بە تێرکردنی چێژ و ئارەزووەکان.

سوقرات هات و وەڵامی دانەوە و وتی ئامانجی مرۆڤ بەختەوەرییە و بەختەوەریش بە زاڵبوونی عەقڵ بەسەر شەهوەت وئارەزووەکانیدا بەدەست دێت، سوقرات ویستی مرۆڤ بگەڕێنێتەوە بۆ ژیانی هاوسەنگ و دوور لە ڕۆچوون لە ئارەزووەکان و تەسلیمبوون بۆیان.

سوقرات پێیوایە لە مرۆڤدا ڕۆحێکی عاقڵ هەیە، کە زاڵە بەسەر هەستەکاندا، کەواتە ئامانجی مرۆڤ عەقڵی و ڕۆحییە و ئامانجەکەشی بەتەواوی ئیللا لە جیهانێکی دیکەدا نەبێت نایەتەجێ، کاتێت نەفس ڕزگاری دەبێت لە جەستە و سەقاڵییەکانی و تەواو خۆی یەکلا دەکاتەوە بۆ کارە سەرەکییەکەی کە فکر و هزرە، سوقرات دژی ئەوەبوو کە چێژ ئامانج و مەبەستی کاروکردەوەکانمان بێت.

سوقرات پێیوابوو خێر (الخير) فەزیلەتە، فەزیلەتیش مەعریفە وزانینە، هەرکەسێک بزانێت، دەبێتە کەسێکی بەڕێز و بەقەدر و باش، هەرکەسێکیش نەزان بێت، دەبێتە کەسێکی خراپ. فەزیلەت زانستە، ڕەزیلەت جەهل و نەزانینە. مرۆڤ هەرکاتێک خۆی بناسێت و بەرژەوەندییەکانی هەست پێبکات، بەدڵنیاییەوە دەیکات، هەرکەسێکیش شەڕ و خراپە بزانێت، خۆی لێ لادەدات بەدڵنیاییەوە، شەڕ و خراپە لە نەزانییەوە سەرچاوە دەگرێت.

بەختەوەری لەلای سوقرات لە شتێکی ماددییەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکوو بەختەوەری بریتییە لە ئارامی دەروونی و خۆشحاڵی ناوەکی مرۆڤ، ئەوەش

بە ئیعتیدال و هاوسەنگی و خۆدەربازکردن لە کۆت بەندی شتە سوودبەخشە دەرەکییەکانی وەک دەوڵەمەندی و ناوبانگ و پلە و پۆست و... دەبێت، ئەوانە بەس لە چاوی خەڵکەوە بەختەوەرین، نەوەک لە حەقیقەتدا، گەیشتن بەم جۆرە بەرزەی بەختەوەری لە تێڕوانینی سوقراتدا بە فەزیلەت دەبێت، فەزیلەتیش بریتییە لە زانستەکان، فەزیلەتی هەرە بەرز بریتییە لە حیکمەت و دانایی و زانست و فکر بۆ خێر و چاکە و باشە، فەزیلەتەکانی دیکە فەرع و لق و پۆپی ئەمەن و لەژێر ئەمەدا جێیان دەبێتەوە.[١]

کەواتە ئەگەر بەختەوەری بریتی بێت لە فەزیلەت، فەزیلەتیش بریتی بێت لە مەعریفە و زانین و زانست، ئەی بەچی بزانین ئەم کارە باشە؟ یان خراپ؟ سوقرات وەڵام دەداتەوە بەوەی کە خێر و چاکە و باشە (الخير) ئەسڵ و بنەمایەکی نەگۆڕ و جێگیری هەیە، ئێمە خێر و باشە و چاکە بە ناخ و زەمیری خۆمان دەزانین، ئەو زەمیرەی کە دەنگێکی ناوەکییە و پێمان دەڵێت ئەوە بکە و ئەوە مەکە.

ئەم بۆچوونەی سوقرات تووشی زۆر ڕەخنە هات، چونکە زانست هەبوون بە خێر و چاکە بەس نییە بۆ کردنی، هەروەها زانست هەبوون بە خراپەش بەس نییە بۆ دوورکەوتنەوە لێی. ئەمە شتێکی حاشا هەڵنەگرە و ڕەخنەیەکی بەجێیە. چونکە خراپەکار زۆرجار دەشزانێت و دەشی کات، چاکەکاریش زۆرجار دەزانێت ئەوە بەڵام نایکات.[٢]

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سوقرات فەزڵ و گەورەیی ئەوەی پێدەبڕێت کە دامەزرینەری فەلسەفە و زانستی ئەخلاقە، چونکە هەموو هەوڵەکانی چڕکردەوە

---

(١) تاريخ الأخلاق، ل ٦٩ بەدواوە.
تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم، ٥٣.

(٢) كتاب الأخلاق لارسطو، ترجمة لطفى السيد باشا، ب ١ ل ٤٩ _ ٥٠، نقلا عن تاريخ الأخلاق، ل ٧٠.

بۆ ئەخلاق و کردی بە کرۆکی فەلسەفە، خەڵکیشی بردەوە بەرەو زەمیر و ناخ، کە سەرچاوەی ئەخلاقە.

## بۆچوونی ئەفلاتوون

پاش سوقرات ئەفلاتوونی قوتابی هات و (٤٢٧ پ. ز)، هەمان بۆچوونی مامۆستاکەی سەرخست و پێیوابوو ئامانج و ئەخلاقی مرۆڤ لە فەزیلەی بەرزدایە، فەزیلەی بەرزیش بریتییە لە عەدالەت و دادگەری، دادگەریش کاتێک پەیدا دەبێت کە گونجان و ڕێککەوتن و تەوافوق لەنێوان هێزەکانی نەفسدا بێتە کایەوە، ئەمەش لەڕێی عەقڵەوە دەکرێت. کەواتە هەردووکیان دەبنە تەواوکەری یەکتری، هیچیان سەرکەشی ناکەن و لانادەن، ئەرستۆ پێیوابوو فەزیلەت ناوەندی دوو ڕەزیلەتە، بۆنموونە سەخاوەتی فەزیلەتێکە لەنێوان زێدەڕۆیی و بەهەدەردان لەگەڵ ڕەزیلی، یان ئازایەتی لەنێوان ترسنۆکی و هەڵەشەییدایە.[1]

وایە ئەفلاتوون فکرەکەی لە مامۆستاکەی وەرگرت دەربارەی بەختەوەری، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وای بۆدەچوو کە بەختەوەری دەبێت لەگەڵ دادگەری و هاوسەنگیدا دابێت، هەروەها پێی وایە لە نەفسی مرۆڤدا سێ جۆر هێز هەیە: هێزی عەقڵ، هێزی توڕەبوون، هێزی شەهوەت و ئارەزوو. لە هاوسەنگی هێزی یەکەمەوە فەزیلەتی حیکمەت و فکر و زانین و زانست پەیدا دەبێت، لە هاوسەنگی هێزی دووەمەوە فەزیلەتی ئازایەتی پەیدا دەبێت، لە هاوسەنگی هێزی سێیەمەوە فەزیلەتی داوێنپاکی پەیدا دەبێت، لە هاوسەنگی هەرسێ هێزەکەوە فەزیلەتی دادگەری پەیدا دەبێت.

---

(١) الفلسفة الخلقية، د. الطويل، ل ٦٠.
تاريخ الفلسفة اليونانية، ل ٩٩.

مەبەستی ئەفلاتوون لە دادگەری لێرەدا گونجان و ڕێککەوتن و تەوافوقە لەنێوان هێزەکانی نەفسدا، ئەمەش لەڕێی عەقڵەوە دەکرێت، کەواتە هەردووکیان دەبنە تەواوکەری یەکتری، هیچیان سەرکەشی ناکەن و لانادەن[١]، کەواتە مەبەستی لە دادگەری، دادگەری قەزائی و دادگایی نییە کە لەناو خەڵکدا باوە، چونکە ئەم جۆرە دادگەرییەی لەناو خەڵکدا باوە مەبەستیان دادگەری دادگاییە، ئەمە فەزیلەتێکی جوزئییە، کە لە دادگەرییە ئەسڵەکەوە سەرچاوە دەگرێت، کەواتە بەختەوەری لەلای ئەفلاتوون دەبێت لەگەڵ ئەم دادگەرییەدابێت، کەسی دادگەر خۆشبەختە هەرچەندە تووشی نارەحەتی و زەحمەتیش ببێت و بێبەش بێت لە چێژ و خۆشییەکان، ئەم جۆرە لە بەختەوەری لەلای ئەفلاتوون خێر و چاکەی هەرە بەرزە.[٢]

ئەو چوار فەزیلەتەی ئەفلاتوون: «حیکمەت، ئازایەتی، داوێنپاکی، دادگەری» چۆن بناغەی تاک بوون، بەهەمان شێوە بناغەی ئوممەت و نەتەوەشە، حیکمەت فەزیلەتی سەرکردەکانە، ئازایەتی فەزیلەتی سەربازەکانە، داوێنپاکی فەزیلەتی خەڵکەکەیە، دادگەریش فەزیلەتی هەمووانە، ئەم فەزیلەتانە کاری مرۆڤەکان ڕاستەڕی دەکەن و وایان لێدەکەن بەجوانترین شێوە ڕەفتار بکەن.[٣]

## بۆچوونی ئەرستۆ

ئەرستۆ لە ئەخلاقی ڕوانیوە وەک زانستێک کە لە کار و کردەوەکانی مرۆڤ دەڕوانێت و گرنگی بەوە دەدات مرۆڤ چی بکات و چی نەکات، بۆ ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤ، بۆیە پێیوایە ئەخلاق چالاکییەکی مرۆیی (ئنسانی) یە تەنیا مرۆڤ هەیەتی، چونکە هەر مرۆڤ خاوەنی عەقڵە.[٤]

---

(١) تاريخ الأخلاق، ل ٧٧ _ ٧٨.

(٢) الفلسفة الخلقية، ل ٥٨.

(٣) الأخلاق، أحمد أمين، ل ١٣٣.

(٤) تاريخ الفلسفة اليونانية، ل١٨٥. المشكلة الخلقية، ل١٤٤. مقدمة فى علم الأخلاق، ل٩١.

ئەرستۆ پێی وایە هەموو کارێک کە مرۆڤ دەیکات، پێویستە ئامانجەکەی گەیشتن بێت بە خێر (الخیر)، ئەو خێرەش دەبێت دوو مەرجی تێدابن:

١. خێرێکی تەواو تەواو بێت و لە زاتی خۆیدا، ئامراز نەبێت بۆ خێرێکی دوورتر لەخۆی، چونکە خۆی دەبێت ئەوپەڕی خێر بێت.

٢. دەبێت لەزاتی خۆیدا ئەوەندە تەواوبێت پێویستی بە خێرێکی دیکە نەبێت بۆ تەواوکردنی.

بەڵام لەگەڵ ئەوەی هەموو مرۆڤەکان مەبەستیان خێرە و بۆ خێر هەوڵدەدەن، هەمووشیان کۆکن لەسەر ئەوەی کە بەختەوەری ئامانجی ژیانە، بەڵام جیاوازن و ڕاجیان لە دیاریکردنی خێر و بەختەوەری، بەشێوەیەکی گشتی دابەشبوونە بۆ دوو گرووپ

١. پێیان وایە بەختەوەری لە شتە ماددییەکاندایە، چێژە ماددییەکان.

٢. پێیان وایە بەختەوەری لە شتە نامادییەکاندایە، وەک ناوبانگ و زانست و فکر و زانین و حیکمەت.[1]

ئەرستۆ پێی وایە بەختەوەری پەیوەستە بە حیکمەت و زانست و زانین و فکرەوە، چونکە حیکمەت (زانست و زانین و فکر) بەرزترین فەزیلەتە، چونکە حیکمەت شتێکی ئازادە و عەقڵ پێیەوە هەڵدەستێت، بەبێ ئەوەی مەبەست و بەرژەوەندی و سوودی عەمەلی و ماددی لە پشتەوە بێت، لەکاتێکدا چێژ شتێکی هاتوو و ڕۆیشتووە، گەوەرەیی و پلە و پۆستیش دێت و دەڕوات و نامێنێتەوە، پارە و سەروەت و سامانیش ئەگەری لەناوچوون و فەوتان و نەمانی زۆرە، ناوبانگیش وەستاوەتە سەر خەڵکی دیکە، کەواتە بەس حیکمەتە کە شتێکی کامڵ و تەواوە و دەمێنێتەوە و مرۆڤ بەرەو پلەی خوایەتی دەبات.

---

(١) تاریخ الفلسفة الیونانیة، ل ١٨٦ _ ١٨٧.

لێرەوە بۆمان دەرکەوت ئەرستۆ جیاکاری دەکات لەنێوان جەوهەری و عەرەزی، (جەوهەری دەمێنێتەوە، عەرەزی دێت و دەڕوات)، بەختەوەری کورتهەڵدێنێت لە خێری نەفس، چونکە نەفس کرۆکی مرۆڤە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ڕێگرییەک نییە کە خێرە دەرەکی و جەستەییەکانیش (ئەو شتانەی دەگەڕێنەوە بۆ جەستە)، بەگەورە سەیر بکرێن، وەک فەیلەسووفانی دیکەی یۆنان.[1]

## بۆچوونی قوتابخانەی ڕەواقییەکان

لەدوای فەلسەفەی ئەسینا، دوو قوتابخانەی سەرەکی سەریان هەڵدا:

ئەپیکۆرییەکان

ڕەواقییەکان

ئەم دوو قوتابخانەیە گرنگی زۆریان دەدا بە لایەنی ئەخلاقی، بەڵام بەدوو ئاراستەی جیاواز، هەردوکیشیان کێبڕکێیان بوو بۆ بانگکردنی خەڵکی بۆ لای سەعادەت و بەختەوەری.

ڕەواقییەکان فەلسەفەکەیان بنیاتنا لەسەر قوتابخانەی کەلبییەکان، کە پێیانوابوو بەختەوەری بریتییە لە ڕاکردن لەچێژ، ئەپیکۆرییەکانیش فەلسەفەکەیان بنیاتنا لەسەر قوتابخانەی قۆرینائییەکان کە پێیان وابوو بەختەوەری بریتییە لە دەستخستنی چێژ و ڕۆچوون تێیدا.

قوتابخانەی ڕەواقییەکان لەسەر دەستی زینۆن (٢٦٤ پ. ز) دامەزرا، کە لە دەوروبەری ساڵەکانی (٣١٢ پ.ز) لە قوبرسەوە هات بۆ ئەسینا، هات بەسەر قوتابخانەکاندا دەگەڕا، زینۆن لەسەردەمێکدا هات، کە ئەسینا بەتەواوی

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية، ل ١٨٧ _ ١٨٨. المشكله الخلقية، ل ١٤٥.

ڕۆچووبوو لە بەدئەخلاقیدا، بۆیە زۆر لە دژی ئەپیقۆرییەکان وەستایەوە، پێوەستاوبوو بۆ دژایەتی کردنی ڕێبازی چێژگەراکان، بۆ کاتێکی دوورودرێژ، ڕێباز و قوتابخانەی ڕەواقییەکان هەر لەسەدەی سێیەمی پێش زایینەوە بەردەوامبوو تاوەکوو کۆتایی سەدەی دووەمی زایینی.

ڕەواقییەکان هاتن فەزیلەت و بەختەوەرییان لێک گرێدا، بەختەوەریش لەلای ئەوان لە سێ فەزیلەتدا کورتهەڵدێت:

١. کۆنترۆڵ (زەبت) ی دەروون (نەفس).

٢. هاوسەنگی لە چێژدا.

٣. حیکمەت و زانست و زانین و فکر.

لەسەر حەکیمیش پێویستە هەموو نارەحەتی و زەحمەت و ئازارەکان قبووڵ بکات پڕبەدڵی.

بەڵام ئەگەر تووشی نەهامەتی و زەحمەتییەک بوو و نەیتوانی بەرگەی بگرێت، ئەوە دەتوانێت خۆی بکوژێت، هەربۆیە زینۆن لە ساڵی (٢٦٤ پ. ز) خۆی کوشت، وەسیەتیشی دەکرد بۆ خۆکوشتن و ڕزگاربوون لە ئازارەکان، هەرچەندە ئەوە دژیش دەهاتەوە لەگەڵ ئەو بنەمایەی کە دایاننابوو (ئارام بگرە لەسەر ناخۆشییەکان).

کەسی ڕەواقی هەمموو غەمی دەوڵەمەندی و چێژ نییە، بەڵکوو هەمی ئەو ئەوەیە کە بە حەکیمی و زانایی و گەورەیی بژییت، جا گرنگ نییە، هەژارە یان دەوڵەمەندە، ڕێزلێگیراوە یان ڕێزلێنەگیراو.

ڕۆژئاواییەکان دەستەواژەی «ڕەواقی» بۆ کەسێک بەکاردێنن، کە کەسێکی ئارام و لەسەرخۆ بێت، هەرچەندە تووشی ئەزیەت و ئازار و مەترسی و نارەحەتی و زەحمەتیش ببێتەوە، هەربۆیە فەلسە و فکر و ڕێنمایی ڕەواقییەکانی

کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر ژیانی مەسیحییەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بۆیە توێژەران پێیانوایە یەکێک لە پاڵنەرە بەهێزەکانی ڕەهبانییەتی مەسیحی بریتییە لە کاریگەری ڕەواقییەکان.

هەتا هەندێک لە توێژەران پێیان وایە ڕەواقییەکان کاریگەرییان هەبووە لەسەر سۆفییە موسڵمانەکانی سەدەی ناوەڕاست، بەڵام پێناچێ بەڵگەیەکی وایان هەبێت.[1]

## تیۆریای بەختەوەری لە فەلسەفەی ئیسلامیدا

تیۆریای بەختەوەری پانتاییەکی فراوانی داگیرکردووە لە فەلسەفەی ئیسلامیدا، تاوەکو گەیشتووە بەوەی کە فەیلەسووفێکی ئیسلامی نابینی باسی لێوە نەکردبێت بە شێوەیەک لە شێوەکان.

فارابی و ئیخوانوسەفا ئیبن میسکەوەیهی و ئیبن باجە و ئیبن توفەیل و غەزالی ... باسیان لێوە کردووە، هەمووشیان قسەی خۆیانیان هەبووە لەو بارەیەوە، بەڵام ئێمە لەبەر درێژبوونەوە قسە و بۆچوونی دوو دانەیان وەردەگرین (ئیبن میسکەوەیهی و غەزالی).

## بۆچوونی ئیبن میسکەوەیهی

ئیبن میسکەوەیهی (٤٢١ ە / ١٠٣٠ م) یەکێکە لە فەیلەسووفە موسڵمانەکان کە گرنگییەکی زۆری داوە بە بابەتە ئەخلاقییەکان و فەلسەفەی ئەخلاق، هەربۆیە کتێبە بەناوبانگەکەی (تهذیب الاخلاق) ناوبانگێکی زۆری پەیداکرد،

---

(١) مقدمة فی علم الأخلاق، ل ٩٤ _ ٩٦.

هەوڵی داوە فەلسەفەی یۆنانی تێکەڵ بە ڕێنماییەکانی ئیسلام و فکر و فەلسەفەی ئیسلامی بکات.

ئیبن میسکەوەیهی بۆچوونی ئەفلاتوونی وەرگرت دەربارەی هێزە نەفسییەکان و چوار فەزیلەتەکە، کە حیکمەت و داوێنپاکی و ئازایەتی و دادگەرییە، ئیبن میسکەوەیهی پێی وایە بەختەوەری تەنیا لە فەزیلەتداکورت هەڵنەهاتووە وەک سوقرات و هاوشێوەکانی دەیڵێن، بەڵکوو بەختەوەری بە شێوەیەکی گشتی بە کۆکردنەوەی هەردوو بەشەکەی حیکمەت دەبێت، حیکمەتی تیۆری (نەزەری) و حیکمەتی عەمەلی (کردەیی)، بە فەلسەفەی نەزەری دەتوانرێت بۆچوونە ڕاستەکان وەربگری و بگەی بەو زانستانەی کۆتاییەکەیان زانستی خوداییە، ئەگەر مرۆڤ بتوانێت ئەوە بکات، ئەوە سەرلێشێواوییەکەی نامێنێت و دڵی دادەمەزرێت و ئارام دەبێت، حەق و ڕاستیشی بۆ ڕوون دەبێتەوە، بەم شێوەیە دەگات بە چێژێک کە هیچ جێژێک ناگات پێی ...، بە حیکمەت و فەلسەفەی عەمەلی و کردەییش دەگات بە گەیشتن بە پلە و شێوە و شێوازێکی ئەوەندە بەرز و جوان و باش کە برازێتەوە بە کار و ئەخلاقی جوان و ئەخلاقە جوانەکان پەیڕەو بکات، بەم شێوەیە مرۆڤ لەکۆتاییدا دەگات بە کەمالی ئەخلاق.

کەواتە ئەگەر مرۆڤ گەیشت بە هەر دوو بەشەکەی حیکمەت و فەلسەفە، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەگات بە بەختەوەری تەواو و کامڵ.

ئاینەکانیش هەر بۆ ئەمە هاتوون، هەربۆیە ئیبن میسکەوەیهی دەڵێت: خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆ ئەم دوو بەشەی حیکمەت ناردووە، بۆئەوەی خەڵکی هانبدەن بۆ ئەم دوو ئامانجە بەرزە[1].

پێوەری خێر لەلای ئیبن میسکەوەیهی بریتییە لە سروشتی مرۆڤ، مرۆڤ سروشتی خۆی هەیە کە بریتییە لە نەفسی عاقڵ، مرۆڤ کاتێک باش و چاک

---

(١) تهذيب الأخلاق، ابن مسكويه، ل ١٧ ـ ٤٠.

و بەختەوەر دەبێت، ئەگەر کارە مرۆڤییەکانی کرد و لە مرۆڤ بوون و سروشتی خۆی لاینەدا[١].

ئیبن میسکەوەیهی بەهەموو شێوەیەک دژی ئەوەیە بەختەوەری کورتهەڵبهێنرێت لە چێژە ماددییەکاندا، چونکە ئەمە بۆچوونی نەزان و عەوام و خەڵکی ڕەشۆکییە، ئەوانەی بەهەشتیش بە مانایەکی ماددی و چێژگەرایی وەردەگرن و کاری بۆ دەکەن[٢].

بەختەوەری تەواو لە تێڕوانینی ئیبن میسکەوەیهیدا بریتییە لە حیکمەت و فەلسەفە و فکر و زانین و زانست، لەو کاتەدا ئەو مرۆڤە پەیوەست دەبێت بە خوای گەورەوە، شتێک ناکات بێ فەرمانی خودا بێت، هەرچی دەیکات دەیەوێت لە خودا نزیک بێتەوە، هەرگیز تەسلیمی شەهەوات و ئارەزووە لادەرەکانی نابێت کە بێفەرمانی ئەون، ئاوڕ لە شتێکیش ناداتەوە کە دووری خاتەوە لە بەختەوەری، بە شێوەیەکی لێدێت دڵگران نابێت لەسەر لەدەستدانی خۆشەویستانی و خەفەت ناخوات لەسەر لە دەستدانی داواکراوەکەی[٣].

هەموو ئەم بەختەوەرییە کاتێک بەدیدێت، کە نەفس لە جەستەی جیاببێتەوە و جێی بهێڵێت، بچێتە قۆناغێکی دیکە کە ئەم نەفسەی بوونێکی زۆر بەرزتری هەبێت لەو بوونەی ئێستای لەو ژیانە دونیاییەدا، لەو کاتەدا بەدڵنیاییەوە دەگات بەوەی کە هەموو ئەوەی بە بەختەوەری دادەنرێت لەم دونیا کەم و نزم و بێنرخەدا، هیچ نرخ و قیمەتێکی نییە، ئەوەش ناهێنێت مرۆڤ ئاوڕیان لێ بداتەوە.

کەواتە بەم شێوەیە بینیمان کە ئیبن میسکەوەیهی سەرەڕای ئەوەی زۆرێک

---

(١) تاريخ النظريات الأخلاقية، لأبي بكر ذكرى، ل ٣٠.

(٢) تهذيب الأخلاق، ل ٤٣ _ ٤٤.

(٣) تهذيب الأخلاق، ل ٨٧ _ ٨٨.

لە بۆچوونەکانی فەلسەفەی یۆنانی وەرگرتووە، بەڵام لە کۆتاییدا بەختەوەری تەواوی بەستووەتەوە بە کردنی هەموو ئەو شتانەی دەبنە ڕەزامەندی خودا و وازهێنانیش لە هەموو ئەو شتانەی دەبنە نارِازیبوونی خودا.

## بۆچوونی ئیمامی غەزالی

بەختەوەری لەلای ئیمامی غەزالی (٥٠٥ هـ / ١١١١ م) خۆی دەبینێتەوە لە خێری بەرز و تەواودا، وەک هەمان بۆچوونی ئەرستۆ، بەڵام ئەوەی جێی پرسیارە ئەوەیە، ئایا ئەم خێرە هەرە بەرزە چییە و کامەیە لە تێڕوانینی ئیمامی غەزالیدا، یان با بڵێین خێر (الخیر) بە گشتی کامەیە و لە پاشاندا خێرە بەرز و تەواوەکە کامەیە؟

ئیمامی غەزالی لە کتێبی (میزان العمل)[1]دا، باسی خێر و باشە و چاکەکان دەکات لەم ژیانەدا، لە پاشاندا هەموویان دەگەڕێنێتەوە بۆ چوار جۆر:

١. خێرەکانی نەفس: کە بریتیین لە بنەماکانی فەزیلەت، ئەوانیش چوارن: حیکمەت، داوێنپاکی، ئازایەتی، دادگەری.

٢. خێری جەستە: تەندروستی، جوانی، هێز، تەمەن درێژی.

٣. خێری دەرەکی: ماڵ و سامان، ئەهل و نزیکان و خزم، عیززەت و سەربەرزی، جوانی و باشی تێکەڵی و خزمایەتی و مامەڵە.

٤. خێر و فەزیلەتە تەوفیقییەکان: هیدایەت، خودا، ڕوشد و ڕێنموونی و ڕێنیشاندانی خودا، ڕاستەڕێ کردن و ڕاست پێکان و ڕاست پیشیاندان لەلای خوداوە و پشتیوانی خودا.

کەواتە بەم پێیەی غەزالی کۆی فەزیلەتەکان دەبنە شازدە فەزیلەت و خێر.

---

(١) میزان العمل، الغزالي، ل ٢٩٤.

ئەم خێر و فەزیلەتانە کە هەندێکیان پێویستییان بە هەندێکی دیکەیە، هیچیان نابنە خێر و فەزیلەتە بەرزەکە (الخير الاعلى)، بەڵکوو ئەوەی فەزیلەتە بەرزەکە (الخير الاعلى) کەیە، بریتییە لە بەختەوەری دوارِۆژ، ئەو بەختەوەرییەی کۆتایی نییە و هیچ جۆرە غەم وخەفەت و نارِەحەتی و زەحمەتی و نەزانی و هەژاری و ... تێدا نییە[1]، یان بڵێین مانەوەیەکی بێکۆتا، دڵخۆشییەکی بێ خەفەت، زانستێکی بێ نەزانی، دەوڵەمەندییەکی بێ هەژاری، ئەم بەختەوەرییە بەختەوەری حەقیقییە، بەڵام ئەو بەختەوەرییەی دیکە لە ناو خەڵکدا باوە و پێی دەڵێن بەختەوەری، ئەوە یان بە هەڵە پێی دەڵێن بەختەوەری، چونکە چێژێکی کاتییە و هیچ یارمەتیدەر نییە بۆ قیامەت و دوارِۆژ، یان ئەوەتا وەک مەجازێک بەکاری دێنن، چونکە زۆر بەختەوەری ئەم دونیایە هەیە، دەتگەیەنێت بە بەختەوەری دوارِۆژ، هەر شتێکیش بتگەیەنێت بە خێر وبەختەوەری پێی دەوترێت خێر و بەختەوەری[2].

کەواتە بەختەوەری لە چێژدا نییە کە نەزانەکان بەردەوام هەوڵی بۆ دەدەن، نەک هەر ئەو چێژە دونیاییانە، بەڵکوو چێژەکانی بەهەشتیش کە خوای گەورە بۆ بەهەشتیانی ئامادەکردووە بە بەختەوەری حەقیقی هەژمار ناکرێت[3].

ئیمامی غەزالی پێی وایە رِێگەی گەیشتن بەم بەختەوەری و سەعادەتە بریتییە لە زانست و کردەوە (العلم والعمل).

زانست بۆیە مەرجە: چونکە بەهۆی زانستەوە نەفس دەگاتە کەماڵ و تەواوی و دەبێتە ئەهل و شایستەی فەیز و رِژانی رِەحمەتی خودا، رِژانێک بەهۆیەوە مرۆڤ حەقیقەتە خواییەکانی بۆ رِوون دەبێتەوە و کەشف دەبێت، ئەم رِژانی رِەحمەتە لەلایەن خوداوە بۆ نەفس، ئامانجێکی داواکراوە، رِێک

---

(١) ميزان العمل، الغزالي، ل ٢٩٤.

(٢) ميزان العمل، الغزالي، ل ٣٠٤ _ ٣٠٥.

(٣) فلسفة الأخلاق في الإسلام، د. محمد يوسف موسى، ١٦٧.

خودی بەختەوەرییە بۆ نەفس لەدوای مردن.

کار و عەمەلیش بۆیە مەرجە: چونکە مەبەست لە کردەوە دەستخستنی فەزیلەتەکانە، شکاندنی شەهوەت و ئارەزووەکانە، بە شێوەیەک نەفس سەرقاڵ نابێت پێیانەوە و دەچێت بەرەو جیهانی بەرزی خودایی.

ئەم دوو تیۆریایە (چێژ و بەختەوەری) لەسەردەمی نوێدا بە شێوەیەکی دیکەوە هاتنەوە مەیدان، بەڵام لە بەرگێکی تەواو ماددی و نەفعی و سوودگەرادا، کە لە باسی ئەنجامگەرادا بەدرێژی باسمانکرد، بۆیە باسی ناکەینەوە[1].

## هۆکارەکانی بەختەوەری لەتێڕوانینی ئیسلامدا

هۆکارەکانی بەختەوەری لە تێڕوانینی ئیسلامدا یەکجار زۆرن و پانتاییەکی یەکجار فراوانیان گرتووە، بەڵام ئێمە لێرەدا چەند دانەیەکیان لێ باس دەکات

**یەکەم: باوەڕبوون بە خودا (ئیمان)**

لە باوەڕدا مرۆڤ تەنیا نییە و خاوەنی هەیە کە خودایە، بەوەش باوەڕ ئامانجی دەبێت و ئومێد لەسەر خودا هەڵئەچنێت، وە بەو پێیەش کە خودا لە زیهنی تاکدا بوونی هەبوو و باوەڕی بە زیندووبوونەوە و دووبارە ژیانکردن و لێپرسینەوە هەبوو، ئەوا مرۆڤ کائینێکی پڕاوپڕ ئەخلاقی و ماقووڵ دەردەچێت و لە سزای خراپەکانی دەترسێت و دڵی بە چاکەکانی خۆش دەبێت.

ئەگەر هاتوو کەسەکە ئایینداریێکی باوەڕ پتەو بوو، ئەوە کەمترین زیان بە ژینگە مرۆییەکەی خۆی دەگەیەنێت و باوەڕەکەی وەک کۆت لە پاڵنەرە شەڕەنگێزییەکانی دەئاڵێت و ڕێی لێدەگرێت تا دەست بۆ نەویستراو و

---

(١) مقدمة في علم الأخلاق، ١٠١ _ ١٠٢.

قێزەونەکان درێژ بکات، دیارە ڕوونە مەبەستمان نییە بڵێین: ئەوەی ئاییندار بوو، ئەوە هەبوویەکی تەواو ئەخلاقی و بێکەموکورتییە، بەڵکوو دەشێت هەندێک جار ناباوەڕێک لە خوداباوەڕێک ئەخلاقیتر بێت، بەڵام بە شێوەیکی گشتی باوەڕداران و ئاییندارات ئەخلاقی و قبووڵکراوترن تا ناباوەڕان، ئەسڵەن ناباوەڕان و مولحیدان لێیان نایەت ئەخلاقی بن، چونکە باوەڕداران بنەما ئەخلاقییەکانیان لە خوداوە وەرگرتووە، بەڵام ناباوەڕان هیچ بنەما و ئەخلاقنامەیەکیان نییە.

**کاریگەرییەکانی ئیمان لەسەر مرۆڤ، مرۆڤایەتی، تاک، خێزان، کۆمەڵگە، سیاسیەت و ئابووری و... هتد.**

دۆزینەوەی خود و وننەبوونی، ئارامی و چەسپاویی فیکری، ئارامی و چەسپاویی دەروونی و ڕۆحی، ئارامی و چەسپاویی جەستەیی، ئارامی و چەسپاویی خێزانی، ئارامی و چەسپاویی کۆمەڵایەتی، ئارامی و چەسپاویی ئابووری، ئارامی و چەسپاویی سیاسی، ئارامی و چەسپاویی نەتەوەیی، ئارامی و چەسپاویی جیهانی، گەشبینی، هەبوون و پەیداکردن و پاراستنی ڕەوشت، وەڵامدانەوەی فیترەت و سروشتی مرۆڤ، وەڵامدانەوە و ڕێزگرتن لە عەقڵ، چاکەکاری، زیندوویەتی دڵ و دەروون و پاراستنی لە مردنی و لاوازبوونی، هەستی بەرپرسیارێتی، نەرم و نیانی و بێفیزی، سەربەرزی و عیززەت، غیرەت و چاونەترسی و ئازایەتی، بەخشین و قوربانیدان، دوورکەوتنەوە لە خۆپەرستی و ئەنانیەت، دڵسۆزی (الإخلاص)، ئازادی، دوورکەوتنەوە لە خۆپەرستی و خەڵک پەرستی و شت پەرستی، زامنبوونی ژیانێکی زۆر خۆش لە دونیا و دوارۆژدا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودای گەورە.

**دووەم: باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی**

**فەلسەفەی باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی**

باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی و ڕۆژی زیندبوونەوە فەلسەفە و حیکمەتی خۆی

هەیە و کاریگەری گەورەی هەیە لەسەی ژیانی تاکەکان، لەوانە:

هەستکردن بە چاودێری و لێپرسینەوە و لێپیچینەوە، وەک خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ﴾[١].

«جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەک خێر و چاکەی ئەنجام دابێت، دەیبینێتەوە» ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾[٢].

«ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەک شەڕ و خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە.»

دامەزرانی بیروباوەڕ بە دادگەری خودای گەورە, هاوسەنگی پاراستن لە نێوان دونیا و قیامەتتدا، ڕاستکردنەوە و ڕێکخستنی ڕەوشت و سلووک، بڵاوکردنەوەی ڕۆحی هاوکاری و یارمەتیدانی یەکتری، ژیان بەهیوا و ئومێدەوە، کە مرۆڤ زانی ژیانی حەقیقی لێرە نییە و ئێرە کاتییە، حەتمەن بە ئومێد و هیوایێکەوە دەژیێت، ئارامگرتن لەسەر ناخۆشییەکان، هەستکردن بە تەعویز و پاداشت لە بەرانبەر چاکەکان، کوشتنی خۆپەرستی و خۆخۆیی، بڵاوکردنەوەی هەستی بەرپرسیارییێتی.

**سێیەم: باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر**

باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر وا لە مرۆڤ دەکات هەردەم بەورە بێت و نەڕووخێت.

**چوارەم: ڕوانین بۆ خوار خۆت لە شتە مادديیەکاندا**

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت: «انْظُرُوا إِلَى مَنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ، وَلَا تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ، فَهُوَ أَجْدَرُ أَنْ لَا تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْكُمْ»[٣].

---

(١) الزلزلة ٧.

(٢) الزلزلة ٨.

(٣) رواه مسلم عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ٢٩٦٣.

«سەیری لە خۆتان بەرەو خوارتر بکەن وە سەیری لە خۆتان بەرزتر مەکەن، ئەمە شیاوترە بۆ ئەوەی کە بەبێڕێزی سەیری ئەو نیعمەتانە نەکەن کە خودا پێی بەخشیون.»

ئەگەر دەتەوێت بەختەوەربی هەمیشە لە شتە ماددییەکاندا بڕوانە خوار خۆت و لە شتە مەعنەوییەکانی وەک ئیمان و زانست و...، بڕوانە سەرووی خۆت، بۆیە بەس لە ئیمان و زانست و شتە مەعنەوییەکاندا دەبێت بڕوانینە سەرووی خۆمان، بەڵام لە شتە ماددییەکاندا نا، ئەوە مانای هەوڵنەدان و دانیشتن نییە، بەڵام چەندیشت بەقسمەت بوو و دەستت کەوت -لەدوای هەوڵ و ماندووبوونی تەواو- قەناعەتی پێ بکە و بڕوانە خوار خۆت کە بە ملیۆنان کەس لە تۆ هەژارتر و دەردەدارتر هەیە، کەواتە یاساکە بەم شێوەیەیە: بڕوانە خوارخۆت و قەناعەتت هەبێت، ئیدی تۆ دەوڵەمەندی.

**پێنجەم: هەموو شتێکی باش و چاک و خاوێن و سوودبەخش بۆ عەقڵ و فکر و ڕۆح و جەستە**

بۆنموونە هاوسەری باش و چاک، وەک پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت: «الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ»[١].

«دونیا خێر و خۆشییە، چاکترین خێر و خۆشی دونیا ئافرەتێکی چاکە.»

خۆشی و بەختەوەری دونیا زۆرن، بەڵام تۆ بەتامترینیان هەڵمەبژێرە، بەڵکوو باشترین و بەخێرترینیان هەڵبژێرە، ئافرەتی ساڵیحە و باش و ئاقڵ و تەبیعەت خۆش و تێگەیشتوو یەکێکە لە بەهێزترین هۆکار و ئامرازەکانی بەختەوەری.

**شەشەم: دەوڵەمەندی دڵ و دەروون**

وەک پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: «لَيْسَ الغِنَى عَنْ

---

(١) رواه مسلم عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرو ١٤٦٧.

كَثْرَةِ العَرَضِ، وَلَكِنَّ الغِنَى غِنَى النَّفْسِ»[١].

«دەوڵەمەندی بە شتی زۆر نییە -بە ماڵی زۆر نییە-، بەڵکوو دەوڵەمەندی بە دڵ و دەروونە.»

دەوڵەمەندی پێوەرەکەی ماددی نییە، بەڵکوو مەعنەوییە، چونکە تۆ هەرچەند لەڕووی ماددییەوە دەوڵەمەند بیت، کە لە ناختدا دەوڵەمەند نەبووی هەر هەژاری، نەتبینیوە زۆرێک لە دەوڵەمەندەکان دڵیان چەندە هەژارە؟! ئێ کەواتە دڵ و ناخ دەوڵەمەندی گرنگە.

**حەوتەم: پاراستنی زمان و دامێن**

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرموێت: «مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الجَنَّةَ»[٢].

«هەر کەسێک گرێنتیم بداتێ لە -پاراستنی- نێوان دوو ڕیشەکەی وە نێوان دوو قاچەکانی ئەوا من گرێنتی بەهەشتی دەدەمێ»

کێشە و شەڕ و ئاشووب و ناخۆشی و نەهامەتی دوو سەرچاوەی سەرەکی هەن: یەک: زمان، دوو: ئارەزووی جینسی. کەواتە بە کۆنترۆڵکردنی ئەم دووانە دەیان و هەزاران ڕێگا دادەخرێن و سەدان و هەزاران شەڕیش دەکوژێنەوە، یان هەر هەڵناگیرسێن.

**هەشتەم: بەهێزی**

وەک پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرموێت: «الْمُؤْمِنُ القَوِيُّ، خَيْرٌ وَأَحَبُّ إلى اللهِ مِنَ المُؤْمِنِ الضَّعِيفِ»[٣]. «باوەڕداری بەهێز و پێچەسپاو و

---

(١) رواه البخاري عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ ٦٤٤٦.

(٢) رواه البخاري عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْد ٦٤٧٤.

(٣) رواه مسلم عن أبى هريرة ٢٦٦٤.

بەتوانا باشتر و خۆشەویسترە لە لای خوای گەورە لە باوەڕداری لاواز و بێتوانا و لەرزۆک و بێهێز.»

بەهێزبە، بەڵام لە هێزە مەعنەوییەکانەوە دەست پێبکە، هێزی ڕۆحی و هزری ئینجا جەستەیی، چونکە مرۆڤ بە مەعنەوییات و ڕۆحیەوە مرۆڤە، ئەگەرنا دەبێتە ئاژەڵێکی دڕەندە، کەواتە بەهێزبوونی مەعنەوی و کەسایەتی، ئینجا جەستەیی، کەسایەتییەکی بەرز و بەهێزی لێ دروست دەبێت.

**نۆیەم: بەرپرسیاریەتی**

وەک پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت: «كلُّكم راعٍ وكلُّكم مسؤولٌ عن رعيتِهِ»[1].

«هەمووتان بەرپرسن بەرانبەر ئەو کەسانەی لەژێر دەستتانن و سەرپەرشتییان دەکەن.»

خۆگۆڕین پێش خەڵک گۆڕین، واتە گەڕانەوە بۆ خود پێش گەڕانەوە بۆ خەڵک و ئەوانی دی، واتە سەرەتا لە خۆمانەوە دەست پێبکەین و هەوڵبدەین خۆمان بگۆڕین و گۆڕانکاری لە خۆماندا بکەین، کە وامان کرد ئیدی گۆڕینی ئەوانی دیش ئاسان دەبێت و گۆڕینی خۆمان بەسەر ئەوانەوە دەدرەوشێتەوە و گۆڕانکاری ڕیشەیی دروست دەبێت، بەڵام لەبیرکردنی خود و خۆسەرقاڵکردن بە ئەوانی دیکە غەیری خۆلەناوبرن شتێکی دی نییە، چونکە ئەگەر هەر یەکەمان لە ئاست خۆیەوە خۆی بگۆڕێت ئیدی کۆمەڵگە هەموو باش دەبێت، کەواتە ئەگەر هەریەکەمان هەست بە بەرپرسیارییەتی بکات، هیچ کێشەیەک نامێنێت و بەختەوەری باڵدەکێشێت بەسەر هەمووماندا.

---

(١) أخرجه البخاري (٢٥٥٤)، ومسلم (١٨٢٩)، وأبو داود (٢٩٢٨)، والترمذي (١٧٠٥)، والنسائي في }السنن الكبرى)) (٩١٧٣)، وأحمد (٥١٦٧) واللفظ له.

**دەیەم: تەزکیە و خۆپاک ڕاگرتن**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا﴾(١)

«بەڕاستی ئەو کەسە سەرفرازە کە نەفسی پاک و پوختە کردووە و ئیمان و ترسی خوای تیادا ڕواندووە.»

﴿وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾(٢)

«بێگومان نائومێد بوو ئەو کەسەی نەفسی خۆی ناپوخت کرد و ئالوودەی گوناهـ و تاوان و خراپەی کرد.»

تەزکییە دوو واتای هەیە:

پاککردنەوە و پاکبوونەوە. گەشەپێدان و گەشەسەندن

بەم پێیە تەزکییە واتە پاککردنەوە و گەشەپێدانی نەفس.

**تەزکییەی نەفسیش واتە:**

«ڕزگارکردن و پاککردنەوە» ی هەر نۆ ئەندامە سەرەکییەکەی مرۆڤ: مێشک، دەم، چاو، گوێ، دڵ، دەست، گەدە، دامێن و قاچ لە خراپە و شتە پیس و زیانبەخشەکان و ئەخلاقە نابووت و دزێوەکان.

«گەشەپێدانیان» بە ڕاهێنانی مێشک، دەم، چاو، گوێ، دڵ، دەست، گەدە، دامێن و قاچ لەسەر چاکە و شتە پاک و بەسوودەکان و ئەخلاقە بەرز و جوانەکان.

بە پرۆسەی تەزکییە هەم مرۆڤ پاکدەبێتەوە و هەم بەرەکەتیش دەکەوێتە ژیانی و گەشە دەسێنێت.

---

(١) [الشمس: ٩].

(٢) [الشمس: ١٠].

کەواتە دەتوانین بڵێین تەزکییە دوو شتە:

١. خۆ دارنین و خۆ خاڵی کردن (التخلية): واتە خۆ دارنین لە هەموو سیفەتە ناشیرین و خراپەکان و ئەخلاقە نابووت و دزێوەکان لە ناوەوە و لە دەرەوە، هەم دڵ و دەروون و مێشک هەم ئەندامە دیارەکانی تر.

٢. خۆ ڕازاندنەوە (التحلية): واتە خۆ ڕازاندوە بە هەموو سیفەتە جوان و باشەکان و ئەخلاقە بەرز و جوانەکان لە ناوەوە و لە دەرەوە، هەم دڵ و دەروون و بیر و عەقڵ، هەم ئەندامە دیارەکانی تر.

## سوود و چێژ لە فکری ئیسلامیدا

سوود و چێژ دوو شتی خوازراوی فتری زگماکی مرۆڤن، هەموو مرۆڤێک بە ئەندازەی جیاواز بەدوایدایاندا دەگەڕێت، ئیسلامیش وەک ئایین و پەیامێکی خودایی، تەواو تەواو ڕەچاوی ئەو بابەتەی کردووە، چونکە ئیسلام خواردنی هەرسێ بەشە سەرەکییەکەی مرۆڤی تێدایە: ڕۆحی، عەقڵی، جەستەیی.

خوا گەورە دەفەرموویێت: ﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾(١)

«ئەی نەوەی ئادەم، خۆتان بڕازێننەوە بە پۆشاک لەبەر کردن، لەکاتی هەموو نوێژ و چوونە ناو مزگەوتێکدا، بخۆن و بخۆنەوە (لە ناز و نیعمەتەکان) بەڵام زیادەڕەوی مەکەن، چونکە بەڕاستی خوا لە سنوور دەرچووان و زیادەڕەوانی خۆش ناوێت.»

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾(٢).

---

(١) الاعراف (٣١).

(٢) المائدة (٨٧).

ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە، ئەو ناز و نیعمەتە چاکانەی کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوون لە خۆتانی حەرام مەکەن و لە سنوور دەرمەچن و دەستدرێژی مەکەن، چونکە بەڕاستی خوا دەست درێژکارانی خۆشناوێت.

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ﴾[١].

«ئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینە و خاوەنێتی ئاڵتوون و زێڕو زیووی زۆروزەبەندە و ئەسپی چاک و ڕەسەن و (هۆکاری هاتووچۆ) هەروەها ماڵات و زەوی و زاری کشتوکاڵ بۆ خەڵکی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە هەمووی نازو نیعمەتی ژیانی دنیان، خوایش (بۆ چاکان) شوێنی گەڕانەوەی ڕازاوە و خۆشی لای خۆی ئامادە کردووە (کە بەهەشتە).»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا﴾[٢]

«بەشی خۆشت لە دنیادا بەحەڵاڵی فەرامۆش مەکە.»

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، لەکۆتاییدا ئەم سوود و چێژانە کۆتاییان دێت، بۆیە ناکرێت هەموو هیوایەکیان لەسەر هەڵبچێنرێت و ئامانجی و یەکەم و کۆتایی و ببێتە سوود و چێژ، وەک خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَامًا ۖ وَفِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ ۚ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾[٣].

«چاک بزانن ژیانی دنیا تەنیا بریتیە لەیاری و گەمەو ڕازاندنەوەو خۆهەڵکێشان

---

(١) آل عمران (١٤).

(٢) القصص (٧٧).

(٣) الحديد (٢٠).

لەنێوان یەکتریدا، هەروەها زۆرکردنی سامان و ماڵ و منداڵ، جا ئەوانەهەر هەمووی وەک بارانێکی بەپیت وایە کەبڕێتە بەرهەمێکی زۆر، کشتیارەکان سەرسام بکات، لەوەودوا وشک ببێت و زەرد هەڵگەڕێت، پاشان وردوخاش ببێت و بکەوێت، بێگومان لەقیامەتیشدا سزای زۆر سەخت بۆ دنیا پەرستان ئامادەیە، لەولاشەوە لێ خۆشبوون و ڕەزامەندی لەلایەن خواوەئیماندارانی چاکەخوازی لێ بەهرەوەر دەکرێت، ژیانی دنیاش دوور لەخواناسی و دینداری جگەلەوەی کەبریتیە لەرابواردنێکی کەم، شتێکی تر نیە، زۆر کەسیشی پێ غەڕاو دەستخەڕۆ دەبێت.»

هەروەها پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت: «احْرِصْ على ما يَنفَعُک»[1].

«سووربە لەسەر هەموو ئەو شتانەی سوودبەخشن.»

پێوەرێکی گرنگ هەیە بۆ کارکردن: هەمیشە سەرقاڵی کارێک بە کە سوود بە خۆت و خەڵک و نیشتمان و وڵات و تاک و خێزان و کۆمەڵگە دەگەیەنێت، دووربە و خۆت خەریک مەکە بە کارێک کە سوودی بۆ خۆت و غەیری خۆت نییە، چونکە خەسارەتمەندی دونیا و قیامەتە، ئینجا ئەگەر وردبینەوە لە فەرموودەکە، دەفەرمووێت: «سووربە لەسەر هەموو ئەو شتانەی سوودبەخشن» نەیفەرمووە بیکە، دەفەرمووێت: سووربە، کەواتە بەس کردن نییە، بەڵکوو سووربوونیشە.

لە چەندین شوێنی دیکەشدا باسی چێژ و خۆشی کردووە، بۆنموونە: «الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ»[2].

«دونیا خێر و خۆشییە، چاکترین خێر و خۆشی دونیاش ئافرەتێکی چاکە.»

---

(١) مسلم ٢٦٦٤.

(٢) رواه مسلم عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ١٤٦٧.

خۆشی و بەختەوەری دونیا زۆرن، بەڵام تۆ بەتامترینیان هەڵمەبژێرە، بەڵکوو باشترین و بەخێرترینیان هەڵبژێرە، باشترینیشیان ئافرەتە، بەڵام ئافرەتی ساڵیحە و باش و ئاقڵ و تەبیعەت خۆش و تێگەیشتوو.

یان دەفەرموویت: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ البَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ»[١]

«ئەی کۆمەڵی گەنجان هەر کەسێک توانای ژنهێنانی هەیە با ژن بهێنێت.»

یان دەفەرموویت: «لا حَسَدَ إلَّا في اثنَتَينِ: رجُلٌ آتَاهُ اللّٰهُ مالًا فسَلَّطَهُ علَى هَلَكَتِه في الحَقِّ، ورَجُلٌ آتاهُ اللّٰهُ حِكْمةً فهُوَ يَقْضِي بها ويُعَلِّمُها»[٢]

«ئیرەیی (غبطة) لە دوو شتدایە: کەسێک خوای گەورە ماڵ و سامانی پێداوە و لە چاکە و چاکەکاریدا بەکاری دێنێت، کەسێکیش خوای گەورە حیکمەت و دانایی و زانست و تێگەیشتنی ڕاست و قورئانی پێداوە و جێبەجێی دەکات و حوکمی پێ دەکات و خەڵکیش فێر دەکات.»

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، کە لە دەیان شوێندا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) باسی چێژ و سوود و خێر و خۆشی کردووە، ئاگاداریشی لەبارەوە داوە، کە ڕۆنەچین تێیدا بۆئەوەی تیانەچین، وەک دەفەرموویت:

«إنّ ممَّا أخَافُ علَيْكُم مِن بَعْدِي، ما يُفْتَحُ علَيْكُم مِن زَهْرَةِ الدُّنْيَا وزِينَتِهَا»[٣].

«یەکێ لەو شتانەی کە ترسم هەیە لێی دوای من لەناوتان بەرێت و ڕۆتان بچێنێت لە دونیادا بریتییە لەو خۆشی و گەشی و نازونیعمەتەی دونیا.»

خۆشییەکانی دونیا ئەگەر زۆر بەوریاییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا نەکرێت کارەسات دەخولقێنن و مرۆڤ دەکەن بە کۆیلەی خۆیان و غەرقی دەریای بێبنی

---

(١) رواه البخاري ٥٠٦٦.

(٢) البخاري ١٤٠٩ ومسلم ٨١٦.

(٣) متفق عليه، البخاري ١٤٦٥، ومسلم ١٠٥٢.

خۆیانیان دەکەن، لەدواییدا مرۆڤ دەبێتە ئاژەڵێکی هەوەس و ئارەزووباز و خۆویست و خەڵکنەویست و خوانەویست، دەبێتە ماددیخوازێکی دڕ و بێویژدان و بێڕەوشت و هەموو غەم و هەممێکی دەبێتە تێرکردنی ئارەزووەکانی با لەسەر حیسابی هەموو دونیا و مرۆڤایەتیش بێت.

بۆیە هەرشتێک سوودبەخش و چێژدار بێت و سوود و قازانجی بۆ خەڵک هەبێت، ئیسلام حەرامی نەکردووە و ڕێگری لێ نەکردووە، بەڵکوو ڕێشی بۆ کردووەتەوە و هانیداوە، هەربۆیە دژی ڕەهبانییەت و هاوسەرگیری نەکردن و وازهێنان لە دونیا و... بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هاتووە چوارچێوەی بۆ داناوە و ڕێسادار و یاساداری کردووە، بۆ ئەوەی لە نیعمەتەوە نەبنە نیقمەت، بۆنموونە هەندێک لەو مەرج و ڕێسا و یاسا و ڕێ و شوێنانە:

١. هەموو سوود و چێژێک دەبێت پاک و خاوێن بێت و پیس نەبێت.

٢. هەموو سوود و چێژێک دەبێت هاوسەنگی تێدا بکرێت و نابێت زێدەڕۆیی و ڕۆچوونی تێدابێت.

٣. نابێت سوود و چێژ لەسەر حیسابی ئەوانی تر بێت، نابێت ستەم و زوڵم و قۆرخکاری و....، تێدابێت.

٤. هەموو سوود و چێژێک لە خودی خۆیدا ئامانج نییە، بەڵکوو ئامرازە بۆ شتێکی مەعنەوی گەورەتر لەخۆی.

٥. نابێت بە ناوی سوود و چێژەوە، عەقڵ و جەستە و ڕۆح و مەعنەویات و خێزان و کۆمەڵگە و... هتد، تێکبدرێت و لێکهەڵبوەشێنرێت.

٦. نابێت بەناوی سوود و چێژ داگیرکاری بکرێت و سەروەری و ئابووری و....، وڵاتان بخرێتە ژێر پۆستاڵی سوود و چێژ و سوودگەرا و چێژگەراکان، وەک ئەوەی لە سیستەمی سەرمایەداریدا دەیبینین.

٧. لە کاتی تێکگیرانی سوودی گشتی و سوودی تایبەتی و کەسیدا، سوودی

گشتی پێش دەخرێت.

سەبارەت بە سوودی خودی و تاکەکەسی و سوودگەرایی خودی (تیۆریای سوودی تایبەتی و کەسی)، ئیسلام بەهیچ جۆرێک دانی پێدانانێت ئەگەر لەسەر حیسابی ئەوانی دیکە و خەڵک بێت، واتە سنووردارە و ڕێ بەوە نادات کە دەڵێت: "هی خۆم بۆخۆم و هی تۆش دەخۆم، " بۆیە پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرموویت: «المسلم أخو المسلم، لا يَظلمه، ولا يَخذُلُه، ولا يَكذِبُه، ولا يَحقِره»[1].

«موسڵمان برای موسڵمانە، ستەمی لێ ناکات، سەرشۆڕی ناکات، بەسووکی سەیری ناکات.»

دەفەرموویت: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ، وَتَرَاحُمِهِمْ، وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى»[2].

«نموونەی ئیمانداران لە دۆستایەتی و بەزەیی و خۆشەویستییان بۆ یەکدی وەک لاشەیەک وایە، ئەگەر ئەندامێکی ئێش و ئازاری هەبێت ئەوا هەموو لاشەی لە پێناویدا بێخەو دەبێت و تا دەیگرێت.»

کەواتە نابێت پەیوەندییەکان هەموو بە ماددی بکرێن، پەیوەندی برایەتی و خۆشەویستی و... زۆر لە پەیوەندی ماددی و ماددیگەرایی گەورەترە.

سەبارەت بە سوودی گشتی (تیۆریای سوودی گشتی) ئیسلام لەگەڵیەتی بەڵام تا ئەو کاتەی ئەخلاق و بەهای تێدابێت و بۆ بەرژەوەندی چینێک یان کۆمەڵێک یان نەتەوەیەک یان ڕەگەزێک نەبێت بەتەنیا، واتە دەبێت بەرژەوەندی کۆی گشتی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و جیهانی تێدابێت، نەک ئەوەی ئێستا دەکرێت،

---

(١) رواه مسلم عن أبي هريرة.

(٢) رواه مسلم عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ٢٥٨٦.

هەندێک وڵات کۆدەبنەوە بۆ خوێنمژینی وڵاتان و نەتەوەکانی دیکە، دەیان سەدان ئەنجومەن و ڕێکخرا و هۆکاریان دروستکردووە بۆئەوەی یاسای دارستان جێبەجێ بکەن و بەهێزەکان لاوازەکان بخۆن! بەڵام لە ئیسلامدا وا نییە و هەموو مرۆڤایەتی و کەس و کاری یەکترن و دەبێت لەسەر بنەمای ئەخلاق و برایەتی و خۆشەویستی و ڕاستگۆیی و.... پەیوەندییەکان بنیات بنرێن: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ...﴾[1]. واتە: «ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لەنێر و مێیەک دروستکردووە (کە باوکەئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە...»

کەواتە کاتێک ئیسلام باسی سوودی گشتی دەکات، بە چاویلکەیەکی ماددی لێی ناڕوانێت، بەڵکوو لەسەر بنەمای خۆشەویستی و یارمەتیدان و قوربانیدان و... بۆیەکتری بنیاتی دەنێت.

## ڕێژەییبوون و ڕەهاییبوونی ئاکار و ئەخلاق

هەر لەکۆنەوە ئەم بابەتی (ڕێژەییبوون و ڕەهاییبوونی ئاکار و ئەخلاق) یەکێک بووە لە بابەتە کێشە لەسەرەکانی ناو فەلسەفە و فەیلەسووفان، کەوتوونە ڕاجیاییەوە، کە ئایا ئەخلاق و ئاکار ڕێژەییە و بەپێی کەس و شوێن و کات و بارودۆخ و ژینگە و ...، دەگۆڕێت؟ یان نەخێر ناگۆڕێت و شتێکی ڕەها و گشتییە و هەموو مرۆڤەکان تێیدا بەژدارن و ڕێژەیی نییە و بەپێی کەس و کات و شوێن و ...، ناگۆڕێت.

هەندێک لە فەیلەسووفان، وەک «پرۆتاگراس» لە کۆنەکان و «تۆماس هۆبز» لە نوێیەکان، پێیان وایە بەپێی کات و شوێن و سەردەم و شارستانی و ...، دەگۆڕێت.

---

(١) الحجرات (١٣).

لەولاشەوە هەندێکی دیکە لە فەیلەسووفان وەک «ئەفلاتوون» لەکۆنەکان و «کانت» لە نوێیەکان، پێیان وایە بنەما ئەخلاقییەکان ڕەهان بۆ کات و شوێن و سەردەم و کەسەکان.

ڕێژەگەراکان ناتوانن بەرانبەر ئەم یاسا و ڕێسایانە هیچ وەڵامێکی بەجێ بدەنەوە:

**یاسای یەکەم:** ڕێژەگەراکان ناتوانن کەسانی دیکە بە ئەنجامدانی نادروست و هەڵە تاوانبار بکەن.

چونکە تۆ ئەگەر بڕوات بە ڕێژەیی ئەخلاق هەبێت، هیچ شتێکی نەگۆڕ و گشتی نامێنێت، بۆنموونە بڕوابوون بە ڕێژەیی ستەم و ناپاکی و درۆ و ڕەگەزپەرستی و هەموو شتێکی نابووت و خراپ و زیانبەخش، ئەوکات کەسی بەرانبەر بۆی هەیە پێت بڵێ ئەوە لای تۆ وایە لای من وا نییە!

**یاسای دووەم:** ڕێژەگەراکان ناتوانن لەمەڕ بابەتی شەڕ شتێک بڵێن. چونکە داننان بە بوونی شەڕدا، داننانە بەبوونی یاسا و ڕێسای ئەخلاقی، ئەگەرنا کێ دەڵێ شەڕە و خراپە، ئەوکات کەسی بەرانبەر بۆی هەیە بڵێت ئەوە لای تۆ شەڕە، لای من شەڕ نییە!

**یاسای سێیەم:** ڕێژەگەراکان ناتوانن سەرزەنشتی هیچ کەسێک بکەن، یان سوپاسی بکەن و پیرۆز و نەمری بکەن.

باشە ئەگەر پێوەر و یاسایەکی گشتی و ئەخلاقی نەبێت، بە چ پێوەرێک سوپاسی کەسێک دەکەی لەپای کارێکی، یان سەرزەنشتی دەکەی؟! ئەوکات سوپاس و سەرزەنشت هیچ بەهایەکی نامێنێت، ئەگەریش سوپاسی یەکێک بکەی لەسەر دادگەرییەکەی، یان سەرزەنشتی بکەی لەسەر ستەم و زوڵمەکەی، دیارە دانتناوە بە یاسایەی ئەخلاقی نەگۆڕ، ئەگەرنا ئەو سوپاس و سەرزەنشتەت

لەکوێ هێنا؟!

**یاسای چوارەم:** ڕێژەگەراکان ناتوانن باسی ماناداری ئەخلاقییان هەبێت.

چونکە کە هیچ یاسایەکی ئەخلاقی نەبێت، هەموو شتەکان بەچاک و خراپەوە یەکسان دەبن، ناتوانیت شتێک بەسەر شتێکی دیکەدا زاڵ بکەی.

**یاسای پێنجەم:** ڕێژەگەراکان ناتوانن هیچ شتێک بە نادادپەوەری یان بێویژدانی یان نائەخلاقی یان ...، وەسف بکەن.

چونکە ئەگەر ئەخلاق گۆڕاو بێت و ڕێژەیی بێت، لەکوێ حەق بە خۆت دەدەیت ئەو شتە بە نادادگەری یان بێویژدانی یان نائەخلاقی وەسف بکەیت؟!

## پێوەرە ئەخلاقییەکان

کاتێک دەتەوێت حوکم لەسەر شتێک بدەیت بەوەی ئەخلاقییە یان نائەخلاقی، خێرە یان شەڕ، باشە یان خراپ، پێویستت بە پێوەرێک هەیە، بابەتی پێوەرە ئەخلاقییەکان یەکێکە لە گرنگترین بابەتەکانی زانست و فەلسەفەی ئەخلاق.

تێڕوانینەکان بۆ ئەم بابەتە جیاوازن.

هەیە بۆ کارەکانی خۆیی و غەیری خۆشی دەگەڕێتەوە بۆ عورف و عادەت، ئەو عورف و عادەتەی کە لەناو کۆمەڵگەکەی خۆیدا باوە، بۆیە ئەوەی عورف و عادەتەکەی پێی باش بێت، ئەویش پێی باشە، ئەگەریش پێی خراپ خراپ بوو، ئەویش پێی خراپ دەبێت.

هەیە یاسا وەزعی و دانراوەکان دەکاتە پێوەر بۆ ئەخلاقیبوون و نائەخلاقیبوون، بۆ پێوانی کارەکانی خۆیی و غەیری خۆی.

هەیە کار بەهیچ شتێک ناکات غەیری ڕا و بۆچوونی خۆی.

هەیە پێی وایە پێوەر بریتییە لە فکر و تێڕوانین و بەدواداچوونەکانی خۆی.

هەیە ئایین و وەحی دەکاتە پێوەر.

## پێوەری عورف و عادەت

عورف و عادەت بریتییە لەو شتانەی لەناو خەڵک و کۆمەڵگەدا بەردەوام دووبارە دەبنەوە، بە شێوەیەک وای لێدێت دەبنە شتێکی جێگیر و داکوتراو و ڕۆچوو بەناو خەڵکدا.

عورف و عادەتیش جۆری زۆرە: چاک، خراپ، گشتی، تایبەت، ...

**بۆ عورف و عادەت بەکەڵکی ئەوە نایەت بکرێتە بنەمای ئەخلاقی؟**

١. بنەمای ئەخلاقی دەبێت گشتی و عام بێت و بەپێی کات و شوێن و ...، نەگۆڕێت، بەڵام عورف شتێکی گۆڕاو و ناجێگرە، هەموو نەتەوە و ئوممەتێک عورفی خۆی هەیە، نەک هەر ئەوە، بەڵکوو قەبیلە و هۆزەکانیش عادەت و تەقالیدی خۆیانیان هەیە، کەواتە هەموو ئومەتێک و نەتەوەیەک و هۆز و ناوچە و ...، عورف و عادەتی خۆی هەیە، ئەمانەش هەموویان بەردەوام لە گۆڕاندان بەپێی شوێن و کات و ...، بۆیە زۆر شت هەیە جاران خەڵکێک بە چاکی زانیوە، بەڵام ئێستا نابووتترین و نامرۆڤانەترین شتە، بۆنموونە زیندەبەچاڵکردنی کچان و بەکۆیلەکردنی مرۆڤ و ....، لەجاراندا هەبووە و شانازیشان پێوە کردووە، بەڵام ئێستا لە هەر مرۆڤ و نەتەوە و ... بپرسی پێت دەڵێت ئەوانە شتانێکی نائەخلاقین.

کەواتە لەکوێ دەکرێت عورف و عادەت بکرێتە پێوەری هەڵسەنگاندای ئەخلاق؟!

٢. لە زۆربەی شوێنەکاندا عورف و عادەت لەسەر بنەمایەکی دژ بە زانست و واقیع و دین و عەقڵ و لوژیک و ئەخلاق دامەزراوە، کەواتە لەکوێ دەکرێ عورف و عادەت بکرێتە پێوەری هەڵسەنگاندنی ئەخلاق؟!

٣. ئەگەر خەڵک بەردەوام و لە هەموو شتێکدا کەوتنە دوای عورف و عادەتەوە، پێشکەوتن نامێنێت و ڕاوەستان و جمود باڵ دەکێشێت بەسەر خەڵکدا، ناتوانن خۆیان ڕزگار بکەن و پێشبکەون و دەربازبن لە شتی دواکەوتوو و ...

## پێوەری یاسا

یاسای وەزعی و دانراو کۆمەڵە ئەمر و نەهییەکە کە مرۆڤ دایناوە، هەموو نەتەوە و ئوممەت و دەوڵەتێکیش یاسای تایبەت بەخۆی هەیە، بۆیە ناکرێت بکرێتە بنەمایەکی گشتی بۆ هەموو شوێن و کات و نەتەوەکان، بۆیە ئێمە لێرەدا وەک نموونە یاسا بەراورد دەکەین لەگەڵ ئایین و شەریعە:

١. شەریعەت سەرچاوەی سەرەکی وەحییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا عەقڵ و ئیجتیهاد ڕۆڵی کارا و بنیاتنەریان هەیە، بەڵام یاسا سەرچاوەکەی عەقڵی مرۆڤە.

٢. شەریعەت بەهیچ جۆرێک ناکرێت بەرژەوەندیی کەسی تێبکرێت، بەڵام یاسا زۆرجار بەرژەوەندیی کەسی و بنەماڵەیی و مەزهەبی و ...، تێدەکرێت.

٣. شەریعەت گشتییە و بۆ کات و شوێن و باردۆخێکی دیاریکراو نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەچاوی هەموو شوێن و کات و باردۆخەکانیش دەکات و نادیدەیان ناگرێت و پەراوێزیان ناخات، بەڵام یاسا گشتی نییە و تایبەتە بە کات و شوێن و باردۆخەکان.

٤. شەریعەت نەگۆڕ و گۆڕاوی هەیە بەڵام یاسا هەمووی قابیلیەتی گۆڕانی هەیە.

٥. شەریعەت یان بڵێین ئایین گشتگیرە بۆ هەموو بوارەکانی ژیان بەڵام یاسا وانییە.

٦. شەریعەت پێش ڕووکەش، ناخ و ناوەوەی مەبەستە و کاری تێدەکات، بەڵام یاسا بەس لە ڕووکەشدا ڕۆڵی هەیە و هیچ پەیوەندییەکی بە ناخەوە نییە.

٧. شەریعەت بۆ دونیا و قیامەتە و هەردووکیان ڕەچاو دەکات، بەڵام یاسا بەس گرینیگی بە دونیا دەدات.

٨. شەریعەت پاداشت و سزای هەیە، پاداشت بۆ باشەکان، سزا بۆ خراپەکان، بەڵام یاسا بەس سزای هەیە.

٩. شەریعەت جیاوازی ناکات هەمووان لەئاستیدا یەک ئاستن و جیاکاری بۆ کەس نییە، بەڵام لەیاسادا پارێزبەندی هەیە و دەکرێت هەندێکیان نەگرێتەوە[1].

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئێمە نکۆڵی لە سوودەکانی یاسا ناکەین، چونکە سوودی زۆری هەیە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی خەڵکی و دەوڵەتان بەیەکەوە، بۆ پاراستنی مافەکانی مروڤ و هێنانەکایەی ئەمن و ئاساییش و ئارامی و ... لە کۆمەڵگەدا، هەروەها سزادانی دەستدرێژی کاران و تاوانباران و ...، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەراورد ناکرێت لەگەڵ ئیسلام و ئایین، ناشکرێت و ناگونجێت بکرێتە یاسایەکی گشتی بۆ هەڵسەنگاندنی ئەخلاق و ئاکار و ڕەوشت و مامەڵە.

## پێوەری بۆچوونی تاکە کەسی

وەک باسمانکرد سوفستائییەکان پێیان وابوو مرۆڤ پێوەری هەموو شتێکە، بڕوایان بە حەقیقەت و ئەخلاقی جێگیر نەبوو، پێیان وابوو، مرۆڤ پێوەری هەموو شتێکە، حەق ئەوەیە کە ئەو دەیبینێت، ناحەق و باتیلیش هەر ئەوەیە کە ئەو دەیبینێت.

---

(١) المدخل لدراسة الشريعة الإسلامية، د. مصطفى الزلمي، ل ١٥.

بەم پێیەی سوفستائییەکان، کە هیچ مەعریفە و زانینێکی جێگیر نەبێت، کەواتە هیچ بنەمایەکی ئەخلاقی جێگیریش بوونی نییە، بەڵکوو هەمووی بەپێی کەس و شوێن و کات و سەردەم و باردۆخ و ژینگە دەگۆڕێت، سروشتی مرۆڤیش لای ئەوان تەنیا کۆمەڵە شەهوەت و ئارەزوویێکە و بەس، کەواتە ئامانجی یەکەم و کۆتایی مرۆڤیش بریتییە لە چێژ و شەهوەت و گەیشتن بە تێرکردنی چێژ و ئارەزووەکان.

بۆیە ناکرێت بۆچوونی تاکە کەسیش بکرێتە پێوەری ئەخلاقی، چونکە تێڕوانینەکان بەردەوام لەگۆڕندان، ئێستا شتێکی پێ باشە، بەیانی پێی خراپە، چونکە کات و شوێن و بارودۆخ و تێڕوانین و سەرچاوەکانی بیرکردنەوە بەردەوام لەگۆڕاندان.

## پێوەری وەحی و ئاسمانی

وەحی ئاسمانی (ئیسلام) شایەنە بۆ بەپێوەر دانان، چونکە:

١. سەرچاوەی سەرەکی وەحییە.

٢. بە هیچ جۆرێک ناکرێت بەرژەوەندیی کەسی تێبکرێت.

٣. گشتییە و بۆ کات و شوێن و بارودۆخێکی دیاریکاو نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەچاوی هەموو شوێن و کات و بارودۆخەکانیش دەکات و نادیدەیان ناگرێت و پەراوێزیان ناخات.

٤. نەگۆڕ و گۆڕاوی هەیە.

٥. یان بڵێین ئایین گشتگیرە بۆ هەموو بوارەکانی ژیان.

٦. پێش ڕوکەش، ناخ و ناوەوەی مەبەستە و کاری تێدەکات.

٧. بۆ دونیا و قیامەتە و هەردووکیان ڕەچاو دەکات.

٨. پاداشت و سزای هەیە، پاداشت بۆ باشەکان، سزا بۆ خراپەکان.

٩. جیاوازی ناکات، هەمووان لە ئاستیدا یەک ئاستن و جیاکاری بۆ کەس نییە.

## پێوەری سروشتی مرۆڤ

سروشت و زگماکی مرۆڤ ئەگەر تێکنەدرابێت و لێڵ نەکرابێت، دەکرێت بکرێتە پێوەری ئەخلاقی، بۆنموونە هەموو کەسێک بە سروشتی خۆی دەزانێت کە زوڵم وستەم و خیانەت و درۆ خراپن، دەشزانێت کە دادگەری و ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزی و وەفا و ... باشن، کەواتە ئەگەر مرۆڤ تێکنەدرابێت لە ناخی خۆیدا کۆمەڵە یاسا و پێوەرێکی نەگۆڕ و گشتیی ئەخلاقی دەستدەکەوێت، وەک ئەو شتانەی باسمان کردن، بەڵام ئەوە مانای بێپێویستی نییە لە ئایین، چونکە ئایین هەم دێت جەخت لەوانە دەکاتەوە، هەمیش هاندانی لەسەر دەکات، هەمیش زۆر شتی دیکە هەیە ڕوونی دەکاتەوە، هەمیش زۆر یاسای ئەخلاقی دیکە هەیە مرۆڤەکان تێیدا ڕاجیان، ئایین دێت زۆرێک لەو شتانە یەکلا دەکاتەوە و یاسای گشتی دادەنێت و پاداشت و سزاش دیاریدەکات بۆ دونیا و قیامەت.

لەگەڵ ئەوەی کە باسیشمان کرد، خاڵێکی دیکەی زۆر گرنگ هەیە، ئەویش بریتییە لە حیساب کردن بۆ حاڵەتی ئیستیثناء و ڕیزپەڕ، بۆنموونە ڕاستگۆیی و وەفا، هەردووکیان دوو شتی ئەخلاقی بەرزن، بەڵام هەندێک جار لە کات و شوێن و بارودۆخ و سیاقی جیاوازدا تێکدەگیرێن، بۆنموونە کەسێک ڕایکردووە و هاتووە بۆ لای تۆ، لەترسی ئەوەی بیکوژن، تۆش بەڵێنت پێیداوە، دوایی ئەوانەی بەدوایەوەن، دێن و دەڵێن: فڵان کەس لەلای تۆیە؟ تۆ چی وەڵام

دەدەیەوە؟ ئەگەر بڵێی نەخێر، ناڕاستت وتووە، ئەگەریش بڵێی بەڵێ، وەفات نەبووە و خیانەتت لە بەڵێنەکەت کردووە، کەواتە لێرەدا ڕاستگۆیی و بەوەفابوون تێکگیران، بەڵام کامیان ڕاستە؟

کەواتە ئایین دێت شەرحی ئەو شتانەت بۆ دەکات و پێت دەڵێت لەکوێ ئیستثناء هەیە و لە کوێ نییە، هەروەها ...، بەڵام لەکۆتاییدا مرۆڤ و حەق و دادگەری و ... سەنتەرن، بە ڕەچاوکردنی بارودۆخ و ...

## ئەخلاق وەک بەهێزترین بەڵگەی بوونی خودا

ئەم یاسایە دەڵێت: «ڕەوشتی مرۆڤ شتێکی بابەتی و سەربەخۆیە و خۆی لە خۆیدا دروستی نەکردووە.»

پوختەی ئەم بەڵگەیە:

بەڵگەی ڕەوشتی بریتییە لە بەڵگە هێنانەوە بە هەبوونی چەند شتێکی ڕەوشتی کە هەندێک شت بە باش و جوان و چاک دەزانێت، هەندێک شتی تریش بە خراپ و ناشیرین و بێزراو دەزانێت، ئەوە لەسەر بنەمایەکی سەربەخۆ کە هیچ پەیوەندییەکی بە زەوقی کەسی یان عادەت و عورفەوە نییە، کەواتە ئەو ڕەوشتانە ڕەوشتی بابەتین (الأخلاق الموضوعی) و سەربەخۆن و هێزێکی دەرەکی لە دەرەوەی ماددە لە ناو دڵ و دەروون و ناخ عەقڵ و هۆشی مرۆڤدا سەپاندوویەتی و چاندوویەتی، ئەو چەسپێنەر و چێنەرە ئەگەر هەبێت، دیارە حەتمەن خوای پەروەردگارە؛ ئەگەرنا ماددە بۆ خۆی ڕەوشتی لە کوێ بوو تاوەکوو ڕەوشت ببەخشێت؟! وەک پێشتر باسمان کرد (فاقد الشئ لا یعطیه) واتا: نەبوویی شتێک ناتوانێت ئەو شتە ببەخشێت.

بۆ نموونە کێ لە دڵی مرۆڤیدا چاند و چەسپاندنی کە:

١- دادگەری، ڕاستگۆیی، ئەمانەتپارێزی و چاکەکردن، بەزەیی هاتنەوە، میهرەبانی، دڵسۆزی، یارمەتیدان، لێبووردەیی، عیزەت،... هتد، باشن؟!

٢- ستەم، درۆ، خیانەت،... هتد، خراپن؟!

کەواتە کێ ئەو هەست و ڕەوشتانەی لە مرۆڤدا چاندن؟ بۆ نموونە چ شتێک وا لە مرۆڤ دەکات حەزی بە ڕاستگۆیی و دادگەری و ئەمانەتپارێزی و... بێت؟ چ شتێک وا لە مرۆڤ دەکات ڕقی لە ستەم و درۆ و خیانەت و... بێت؟

جا ئەوەی کە زۆر سەیرە، زۆرجار ئەو شتە لە زیانی مرۆڤیشە بەڵام هەر دەیکات، بۆ نموونە دەفتەرێک دۆلاری دۆزیوەتەوە، یان کەسێک دە دەفتەر دۆلاری لا داناوە، بەڵام ئەو ڕاستگۆیە و خیانەت ناکات. لەگەڵ ئەوەی لە چاوی مرۆڤ وایە ئەگەر ئەو دە دەفتەر دۆلارە ببات و خیانەت بکات، قازانج دەکات، بەڵام ئەو مرۆڤە شتێک لە ناخیدا هەیە کە ڕێی پێ نادات، ئایا ئەو هەستە کێ دروستی کرد؟! ماددە دەتوانێت ئەو هەستە دروست بکات؟! یان کەسێک هەیە دەتوانێت ستەم بکات و قازانجێکی زۆر بەدەست بهێنێت بە هۆی ئەو ستەمەیەوە، بەڵام شتێک لە ناخیەوە هاوار دەکات و ناهێڵێت ئەوکارە بکات، ئەگەرچی ڕەنگە ئەگەر ستەمەکە بکات، بە سەدان ملیۆن دۆلار قازانج بکات و بەدەستی بهێنێت.

یان زۆر جار مل دەدات بۆ بڕیارێک کە زیانییەتی بەڵام تەنیا بۆ چەسپاندنی دادگەری وادەکات، واتا ناخی داوای دادگەری دەکات، لەگەڵ ئەوەی کە زەرەریشیەتی، ئایا کێ ئەو هەستە دادگەرییەی لە دڵدا چەسپاند؟! ماددە دەزانێت دادگەری چییە تاوەکوو لە ناخی مرۆڤدا بیچەسپێنێت؟!

یان زۆر جار کەسێک بەهۆی ڕاستگۆییەوە قازانجێکی زۆر لەدەست دەدات، یان زەرەرێکی زۆر زۆر دەکات، بەڵام هەستێک لە ناخییەوە هاوار دەکات دەڵێت: درۆ مەکە، چونکە ناڕەوشتییە، زۆر جار بە درۆیەک ڕەنگە بە دەیان

دەفتەر دۆلار قازانج بکات، یان زەرەر لەسەر خۆی لاببات، بەڵام ئامادە نییە درۆیەکە بکات، ئایا ماددە دەزانێت ڕاستگۆیی چییە تاوەکوو بیبەخشێت بە مرۆڤ؟!

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی ڕەوشتە بابەتییە نەگۆڕەکان چەند سیفەتێکیان هەن:

**١- گشتیبوون**، واتا ئەو جۆرە ڕەوشتە گشتییە و هەمەلایەنە و هەموو مرۆڤەکان تێیدا بەشدارن بەبێ جیاوازی، واتا ئەگەر فیترەتی ئەو کەسە تێک نەچووبێت و لەسەر فیترەت مابێتەوە، ئەوا حەزی بە دادگەری و ڕاستگۆیی و ئەمانەت پارێزی و میهرەبانی و... هەیە، هەروەها ڕقی لە ستەم و درۆ و خیانەت و دڵرەقییە. کەواتە هەموو مرۆڤەکان تێیدا بەژدارن و ئەو ڕەوشت و سیفاتانە گشتین لە نێوان هەموو مرۆڤەکان و بەپێی کەس، کات، شوێن، بارودۆخ، ژینگە، سەردەم و کۆمەڵگاکان ناگۆڕێت.

**٢- پێویستیان بە فێرکردن نییە**، واتا: ئەو ڕەوشت و سیفەتانە پێویستییان بە فێرکردن نییە بە شێوەیەکی گشتی، مەبەستمان وردەکاری ئەو ڕەوشتانە نییە، مەبەستمان خودی خۆیانە، کەواتە مرۆڤ پێویستی بەوە نییە فێری دادگەری بکرێت، بۆیە منداڵێک ئەگەر تۆزێک فامی کردبێت، بێ ئەوەی فێرکرابێت دژی ستەمە، بۆ نموونە شتێک بدە بە یەکێکیان بەڵام مەیدە بە ئەوی تریان، دەبینین پێی ناخۆشە و تووڕە دەبێت، یان زیاتر بدەی بەو و کەمتر بدەی بەم، دەبینی پێی تووڕە دەبێت و پێی ناخۆش دەبێت، بێ ئەوەی فێرکرابێت دادگەری چییە و ستەم چییە، یان کەسێک ستەم لە باوکی بکات لە بەردەمی ئەو، ئەگەر یەکەم جاربێت ئەو حاڵەتە ببینێت و فێریش نەکرابێت دەبینین پێی ناخۆشە و تووڕە دەبێت و دەگری.

٣- ئەو هەست و سیفات و ڕەوشتانە ئەگەر هەلومەرجی گونجاوییان بۆ نەڕەخسێت لە گەشەکردن دەوەستن و گەشە ناکەن و بەرەو نەمان و ونبوون دەچن، (بالفعل) واتا بە کردەیی، بەڵام (بالقوة) بە حاڵەتی توانایی و ئامادەبوون،

هەر هەن، هەر ئامادەن و نامرن، هەروەک پێغەمبەر (ص) دەفەرمووێت «مامن مولود إلا یولد على الفطرة، فأبواه یهودانه أو ینصرانه أو یّمَجسانه»[1].

واتا: «هەموو منداڵێک لەسەر زگماک و سروشت و فیترەتی خواناسی لەدایک دەبێت، بەڵام دوایی باوک و دایکی دەیکەنە جوولەکە، یان دەیکەنە نەسرانی، یان دەیکەنە مەجووسی.»

کەواتە ژینگە و بارودۆخ کاریگەری دەبێت لەسەر لاوازکردنی ئەو هەست و سیفات و ڕەوشتانە و کەمیان دەکات و ونیان دەکات و خامۆشیان دەکات، بەڵام هەرگیزا و هەرگیز نامرن و کاتێک هەر دێت دەربکەون.

**٤**- ئەو سیفەت و ڕەوشت و هەستانە، دەکرێت کپ بکرێن، بەڵام بە تەواوی نامرن. (بالقوة) هەر دەمێنن، بۆیە دەبینن هەیە درۆزنە، ستەمکارە، خیانەتکارە، وەنەبێت ڕاستگۆیی و دادگەری ئەمانەت لە دڵ و دەروونیدا نەمابێت، نەخێر (بالقوة) ماون، بەڵام خەفەکراون و کپی کردوون، بەڵام هەر هەست دەکات کە کارێکی هەڵە دەکات.

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی ئەو چوار سیفات و تایبەتمەندییانەی هەن ڕەوشت و خوڕەوشتی بابەتین.

کەواتە مادام ئەو ڕەوشت و سیفەتانە بەو شێوەیە بن، گشتین و پێوستیان بە فێرکردن نییە، هەربۆیە پێویستە سەرچاوەکە ئەو سێ سیفەتانەی هەبن:

١- توانای ڕەها، واتا: دەبێ تواناکەی توانایەکی ڕەها بێت، چونکە ئەو بەها (قیەمە) ڕەوشتیانە و ئەو هەست و سیفەتانە بە کردەیی بوونیان هەیە لای هەر هەموو خەڵک و گشتین لە نێوان هەموو مرۆڤ و مرۆڤایەتی وکۆمەڵگا جیاوازەکان و شوێنە جیاوازەکان. کەواتە مەحاڵە و ئەستەمە کە سەرچاوەی مرۆڤ بێت یان کۆمەڵگایەک لە کۆمەڵگاکان بێت، چونکە ئەو کەسە دەبێت ئەو

---

(١) متفق علیه، البخاری، برقم (١٢٩٢)، ومسلم برقم (٦٩٢٦)، عن أبی هریرة.

توانایەی هەبێت کە ئەو ڕەوشت و هەست و سیفەتانە بگشتێنێت، هەروەها شتێکی حاشا هەڵنەگرە کە کەس ناتوانێت ئەو کارە بکات، کەواتە تەنیا خوای گەورە مایەوە، کە ئەو کارەی کردبێت و بیکات.

٢- زانستێکی ڕەها و گشتی، واتا سەرچاوەی ئەو ڕەوشت و سیفات و هەستانە دەبێت زانستێکی ڕەهای هەبێت و گشتی بێت و بگات بە هەموو خەڵک، چونکە گشتاندنی ئەو ڕەوشت و سیفات و هەستانە وکردنیان بە یاسایەکی گشتی بەدڵنیاییەوە زانستێکی ڕەهای دەوێت کە ئەو زانستە ئەوەندە گشتی بێت، ئیحاتەی هەموو کەس و حاڵەکان بکات و بیانگرێتەوە، کەواتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت سەرچاوەی ئەوانە ناکرێت غەیری خوا بێت، چونکە هیچ کەسێک ئەو جۆرە زانستەی نییە کە بتوانێت هەموو کەس و بارودۆخ و کات و شوێن و کۆمەڵگە و ژینگە جیاوازەکان بگرێتەوە بەبێ جیاوازی، شتی وا هەرگیز ناکرێت و نابێت، کەواتە ئەوەی خاوەن ئەو جۆرە زانستە بێت تەنیا خودای پەروەردگارە.

٣- حیکمەت و دانایی ڕەها، واتا سەرچاوەی ئەو ڕەوشت و سیفەت و هەستانە دەبێت خاوەن حیکمەت و داناییەکی ڕەها بێت، بە شێوەیەک تەواو تەواو یەک بێتەوە لەگەڵ فیترەت و سروشتی مرۆڤ و خاوەن ویست و داناییەکی وەها بێت کە ئامانجدار و مەبەستدار بێت، بەرەو ئاراستەیەکی وا بڕوات کە سەد لە سەد لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤایەتی بێتەوە و تێکنەگیرێت، بۆیە لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە ناکرێت سەرچاوەی ئەو هەموو ڕەوشتە جوان و گونجاو و پەسەندانە ماددە بێت، چونکە ماددە نە زانستی هەیە، نە توانای هەیە، نە حیکمەت و دانایی هەیە کە بتوانێت ئەوانە لەناو ناخی مرۆڤدا بچێنێت و بچەسپێنێت، بەیەک ئاراستە ئاراستەی هەموو مرۆڤ و مرۆڤایەتی بکات لەگەڵ جیاوازی کات و شوێن و سەردەم، کۆمەڵگە و ژینگە و...، کەواتە کێ ئەوانەی چاند؟!

دەتوانین بەڵگەی ڕەوشتی بەو شێوەیە کورت بکەینەوە:

١- پەیوەستکاری ڕەوشتیبوونی هەیە.

٢- ناکرێت ئەو پەیوەستکارە سروشت و مادده بێت.

٣- ناکرێت ئەو پەیوەستکارە پاڵنەری کۆمەڵایەتی بێت.

٤- ناکرێت ئەو پەیوەستکارە غەیری کەسی بێت (شخص)، واتا دەبێت کەسێک بێت کە پەیوەستی بکات.

٥- پەیوەستکاری ڕەوشتی پێویستە سەرچاوەیەکی شەخسی بێت و ئەو سەرچاوەیە هێز و زانست و داناییەکی زۆر زۆری هەبێت کە بتوانێت لە ناو ناخی مرۆڤدا بیسەپێنێت و بیچەسپێنێت و بیڕوێنێت.

دەتوانین کورتتری بکەینەوە، بەم شێوەیە:

١- ئەگەر خوا نەبێت، بەها (قیەم) ی ڕەوشتی بابەتی بوونی نابێت.

٢- قیەمی ڕەوشتی بابەتی بوونی هەیە.

٣- کەواتە: خوا بوونی هەیە.

کەواتە ناوەڕۆکی بەڵگەی ڕەوشتی بە باش و خراپیەوە، ناکرێت لە ئەندامێکی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتبێت، ناشکرێت لە ویست و هەڵبژاردەی زەوقی کەسییەوە سەرچاوەی گرتبێت، ناشکرێت لە عادەت و عورف و کۆمەڵگە و ئابووری... سەرچاوەی گرتبێت. چونکە ئێمە گوتمان دەبێت سەرچاوەکە زانست و توانا و حیکمەتی ڕەهای هەبێت. ئێ دیارە کە هیچ کام لەوانە و غەیری ئەوانەش ئەو تایبەتمەندییەیان نییە، کەواتە تاکە ڕێگەچارە و تاکە تەفسیر بۆ ئەو ڕەوشتانە ئەوەیە کە بڵێین:

ڕاستییەکی گەردوونی جەوهەری بەرز هەیە بەسەر هەموو شتە ماددییەکان لە ناویشیاندا مرۆڤ، ئەوانە هەر هەموویان تەسەوری کەماڵی خوای گەورەن،

کە دڵ و دەروون و ناخ و فیکر و عەقڵ و سروشتی مرۆڤی لەسەرئەم ڕەوشتانە دامەزراندووە و تێیدا چاندووە و پەیوەستی کردووە.

**تێبینی:** فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمانی «کانت» یەک بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر بوونی خوای گەورە، ئەویش بریتییە لە بەڵگەی ڕەوشتی.

## ئیلحاد و ئەخلاق

بە دڵنیاییەوە ئەخلاق و خێر و شەڕ و چاکە و خراپە لەنێو زیهن و ئەندێشەی تاکی ناباوەڕدا ڕێژەیین و هیچیان بە ڕەهایی نین، بە واتایەکی دیکە ئەخلاق و هەموو ئەو هێزە ژیانبەخشانەی دیکەش لە شوێن و جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی دیکە دەگۆڕێن و دەشێت هەمووشیان لە جێگایەکدا بوونیان نەبێت، بەوەش دەگەینە ئەوەی کە ئەخلاق وەک کایە سەرەکییەکە دەکرێت لە کۆمەڵگەیەکی ئیلحادیدا بە هیچ شێوەیەک بوونی نەبێت و تاکەکان دوور لە هەموو ئەخلاقەکان بژین، جا ئەخلاقەکە هەر کۆمەڵگە و کەلتوورێک سەپاندبێتی یان لە بیروباوەڕ و ئەندێشەی تاک و هەستکردن بە باشە و چاکەوە هاتبێت.

ئەوە مرۆڤە لێرەدا چاکە و خراپە و شەڕ و خێر دیاری دەکات بەپێی بەرژەوەندی خۆی، چی پێی خۆشە و باشە دەیکات هەرچەند خراپ و نائەخلاقی بێت، چونکە لای ئەو خۆشە و باشە، ئەو باش دەزانێت خراپەکان خراپن و زیانبەخشن و دەزانێت فڵان کار خراپە و ناشیرینە و نائەخلاقییە و زەرەری هەیە، بەڵام حەزەکانی زاڵن و وای پیشان دەدات کە ئەو خراپەکان خراپ نابینێت و لای هەندێک لە مرۆڤە ئاییندارە پابەندەکان بەشێک لە کارەکان خراپ و بەشەکەی دیکە باشن.

ئەم قسەیەش بەڵگەی زۆر و گەورەی ناوێت و دەکرێت لە قسەی گەورە

مولحیدان و دەمڕاستانی جیهانی ئیلحاد قسەکان وەربگرین، هەروەک «داوکینز» دەڵێت: "مرۆڤ تەنیا چڵکێکی کیمیاییە."

بۆیەش لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت مرۆڤ لە ڕوانگەی ئیلحادەوە بەرهەمی سروشت و ماددەیە، ماددە و سروشتیش خاڵین لە ئەخلاق و بەهای باڵا و مەعنەوییەت، لەوێشەوە مرۆڤ وەک هەر هەبوویەکی دیکە کائینێکی ماددی و بەرهەمی سروشتە، کەواتا ئەویش وەک سەرجەمیان نائەخلاقییە و لەسەری پێویست نییە کە خۆی پابەند بکات بە هیچ ڕەوشت و چاکەیەکەوە.

بۆیە هیچ ڕێگرییەک نییە لە دەستبردن بۆ هەر شتێک کە ئارەزووەکانی تێر کات، کەواتا ئیلحاد جیاوازی نێوان سەگ و پشیلە و مرۆڤ و ئەمیبا ناکات و هیچ پێوەرێکیش نییە بۆ جیاوازیکردن لەنێوانیاندا، چونکە هەموویان بەرهەمی سروشت و ماددە و پەرەسەندنن، ماددەش سۆز و ڕەحم و بەزەیی و ڕاستگۆیی و دادپەروەری و ئەمانەتپارێزی و چاکەکاری و چاکەخوازی و یارمەتی ئەوانی دیکە نازانێت، هەر بۆیە سێکس بە هەموو جۆرەکانییەوە ڕێگەپێدراوە، ئەگەر لەگەڵ دایک و خوشک و کەسە نزیکەکانیش بێت، یان خراپەکاری و دەست درێژی و... هتد.

مرۆڤەکان لە ناخیاندا هەست بە بوونی چاکە و خراپە دەکەن و دەزانن چی خراپە و چی چاکە، ئاسان و سادە دەتوانن لە یەکیان جیا بکەنەوە، ئەمە بە بۆچوونی ئیلحاد تەنیا بازدانێکی جینی و هەڕەمەکییە کە وای لێکردووە گومان ببات ئەمە خێرە و ئەم خێرە خەیاڵاوییەی خۆش بوێت، ئەمەش شەڕە و ڕقی بێت لەم شەڕە خەیاڵاوییە.

کاتێک داوکینز پرسیاری لێکرا کە ئایا باوەڕت بەوە هەیە دەستدرێژی سێکسی هەڵە بێت؟ شتێکی تەواو لە خۆڕایی و بێبنەمایە وەک ئەو واقیعەی کە بە پێنج پەنجە گەشەمان کردووە، لە بری شەش پەنجە؟

لە وەڵامدا دەڵێت: بەڵێ دەتوانم ئەو قسەیە بکەم. واتا: دەکرا پەرەسەندن ڕێڕەوێکی دیکە بگرێت کە لە ئەنجامدا هەستی مرۆڤ دەستدرێژی سێکسی بە هەڵە نەزانێت پێی شتێکی باش و گونجاو بێت.

بەم پێیە بابەتەکە شتێکی تەواو بێبنەمایە و ناگونجێت وەسفی هیچ کام لەو دوو هەستە بکرێت بەوەی دەستدرێژی سێکسی هەڵەیە یان پەسەندە، ناتوانرێت وەسف بکرێت کە ڕەوایە یان ناڕەوایە، چونکە ئەو هەستە تەنیا و تەنیا بەرهەمی هەڕەمەکی و ڕێکەوتە، کەواتا هەست و خواستی ئەخلاقی لای مولحید سەرچاوەکەی نازانرێت و ناتوانرێت وەسف بکرێت بە ڕەوا یان ناڕەوا، هەروەها هیچ لێپرسینەوەیەکی لەسەر نییە، کەواتا کەس ناتوانێت بەڕەهایی بڵێت: ئەوە باشە یان ئەوە خراپە. هەر بۆیە دوکتۆری مولحید «دان بارکەر» دەڵێت: "دەستدرێژی سێکسی ڕەنگە شتێکی ئەخلاقی بێت ئەگەر پێویستمان پێی ببێت."

هەروەها لە پرۆفیسۆری مولحید «لۆرانس کراوس» یان پرسی: بۆچی کاری نەشیاو لەگەڵ دایک و خوشک بە هەڵە دەژمێردرێت؟

ئەویش وتی: "ڕوون نییە لام ئەوە هەڵە بێت."

هەروەها پرۆفیسۆری مولحید «پیتەر سینگەر» دەڵێت: "زۆر ئاساییە مرۆڤ و ئاژەڵ پەیوەندی سێکسی ببەستن کە ڕازیکەر بێت بۆ هەر دوو لا."[1]

هەر ئەو پرۆفیسۆرە پشتیوانی کوشتنی لەدایکبووە تازەکان دەکات کە

---

(١) کاتێکیش «ستوبلفیلد» دەستدرێژی کردە سەر دی جی و بە ١٢ ساڵ زیندانی حوکم درا، سینگەر و جیف ماکماهان بەرگرییان لە ستوبلفیلد کرد، سینگەر و ماکماهان هەردووکیان ئەوە دەخەنە ڕوو کە کاتێک کەسێک نەتوانایی هەیە و توانای ئیدراکی کەمە و ناتوانێت لە ڕازیبوون بگات، کە دەستدرێژی دەکرێتە سەر ڕەنگە پێی خۆشبێت. بە لای سینگەرەوە دەستدرێژی سێکسی بۆ سەر خاوەن پێداویستی ئەقڵی و جەستەیی لە بنەڕەتدا بە دەستدرێژی دانانرێت، ئەگەر هاتوو ئەو خاوەن پێداویستییە لە چەمکی ڕازیبوون تێنەگات. (مرۆڤە بێویستەکان، ل ٤٣٩. ئاڤار قەرەداغی)

تووشی کەمئەندامی بوون، ئەگەر لە بەرژەوەندی خۆیان و دایک و باوکیان بێت!

هەروەها «دیڤید سیلڤەرمان» سەرۆکی کۆمەڵەی مولحیدەکانی ئەمریکی لە دیبەیتێکدا بەئاشکرا وتی: "هەموو بەها ئەخلاقییەکان ڕێژەیین، هیچ ئەخلاقێکی ڕەها بوونی نییە! " پێیان وت: کەواتە لەسەر ئەو بنەمایە سزادانی منداڵ و خواردنیان بۆنموونە هەڵە نییە بەڕەهایی، بەڵکوو بەلای کەسێکی دیاریکراو هەڵەیە، وایە؟! سلیڤەر دانی بەمەدانا.

بۆیە تێڕوانینی ئیلحاد بۆ دەستدرێژی سێکسی و سێکس لەگەڵ ئاژەڵاندا یان لەگەڵ منداڵاندا یان لەباربردن و لەنێوبردنی کەمئەندامەکان و خواردنی گۆشتی منداڵ ئاساییە. هەموو ئەمانە شتی ڕێژەیین و کەس ناتوانێت بەڕەهایی بڵێت: خراپن یان باشن، بەڵکوو بەپێی کەس و بارودۆخ دەگۆڕێت.

بۆیە دەبینین لە ئیلحاددا هەموو شتێک ئاساییە و هیچ سنوور و لەمپەر و بەربەستێک نییە لەبەردەم نائەخلاقیبوون و خراپەکاریدا.

هەر بۆیە لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت: خیانەتی زەوجی و خواردنی گۆشتی منداڵی دوژمنەکەت زۆر ئاساییە.

هەروەها یەکێکی دیکە لە ڕێبەرانی ئیلحاد کە «سام هاریس» ە، دەڵێت: "زۆر ئاساییە ژن لەگەڵ هەر کەسێک ڕابوێرێت."

ئەمانەش هەموویان لەبەرئەوەن کە ئیلحاد پێناسەی نییە بۆ چاکە و خراپە، بەڵکوو دەڵێت: چاکە ئەوەیە کە تۆ پێت چاکە یان زۆرینەی خەڵکی یان زانست، خراپەش ئەوەیە کە تۆ پێت خراپە یان زۆرینە یان زانست، بەڵام بە ڕاستی ئەمە قسەیەکی زۆر زۆر بێبنەمایە، چونکە ئەگەر تۆ بۆ خۆت بڕیار بدەی یان زۆرینە، ئەوە بەدڵنیاییەوە چیت پێخۆشە ئەوە دەکەی بەبێ گوێدانە بەرانبەر و کۆمەڵگە و هیچ یاسا و ڕێسایەکی ئاسمانی و زەمینی، دەرگایەکی زۆر فرەوانی ئەنانییەت،

خۆپەرستی، ئارەزووپەرستی وماڵوێرانی تاک و کۆمەڵگە و دەوڵەت و... هتد، لێ دەکەوێتەوە.

هەر ئەم فیکرەشە کە وای لە مرۆڤ و سیاسەتی ئێستای جیهان کردووە کە هیچ سنوورێک نەهێڵنەوە و هەموو سنوورەکان ببەزێنن و ئەو هەموو کاولکاریی و ماڵوێرانییە تووشی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و جیهان بکەن، ئەوە زۆرینەیە کە زۆر جار بڕیار لە داگیرکاری و وێرانکردنی ژێرخان و سەرخانی وڵاتانی بێدەسەڵات دەدەن و وێرانیان دەکەن بەبێ هیچ بەزەیی و ئەخلاقێک، ئەگەر بشڵێیت: لە زانست وەریدەگرین هەر بێبنەمایە، چونکە یەکەمیان: زانست لە شتە ناماددیەکان ناکۆڵێتەوە، بۆیە زۆر جار ناتوانێت بڕیار بدات، دووەمیان: بەها ئەخلاقییەکانیش زۆربەیان مەعنەوی و نامادین، بۆ نموونە: ئەنانییەت و خۆپەرستی و درۆکرن و حەسوودی و خیانەت، یان بۆ نموونە: کوشتنی کەسانی کەمئەندام کە بوونە ئەرک بەسەر کۆمەڵگە و ئیلحاد و زانست و ئەقڵیش ڕێی لەنێوبردنیان دەدەن، چونکە دەڵێن زەرەریان هەیە و بارن بۆ مرۆڤ، بەڵام ئایا ئەخلاقییە؟!

هەر بۆیە «ڕیچارد داوکینز» دەڵێت: "نە چاکە هەیە نە خراپە، بەڵکوو ئێمە هەموومان بۆ مۆسیقای (DNA) خەریکی سەماکردنین.»

ئەگەر دەشڵێن: ئەقڵ بڕیاردەرە، دیسانەوە زۆر بێبنەمایە، چونکە ئەقڵ دەکەوێتە ژێر کاریگەری هەوا و ئارەزوو و بەرژەوەندی تاکەکەسی و خۆپەرستی و خۆسەپێنی، باشە ئەوەی ئەمریکا دەیکات بەرانبەر بە هەموو جیهان لەو هەموو قۆرخکارییە و داگیرکاری و ماڵوێرانی و کاولکاری و ئەوەی نازییەکان کردیان بەرانبەر بە جوولەکەکان یان ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت کردی بەرانبەر موسڵمانان و غەیرە موسڵمانان، ئەمە جگە لەو وەحشیگەرییەی کردیان لە شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی.

هەموو ئەمانە ڕوودەدەن کاتێک عەقڵی ئەوان بوونی هەبووە، بۆیە ناکرێت عەقڵ بنامەیەکی ئاقڵانە بێت بۆ ڕەوشتنامەیەکی یەکلاکەرەوە کە سەرجەم مرۆڤەکان لەسەری بڕۆن.

هەروەها لە ڕوویێکی دیکەشەوە، خۆ ئەگەر بشوترێت سەرچاوەکەی ئەقڵە، ئەوا دیسان خۆ بنەما ئەقڵییە نەگۆڕەکانیش هەر دەچنە نێو بنەما فیتڕییە مرۆییە خواکردییەکە، کەواتا ماددە و سروشت ناتوانن بنەمای ئەقڵی و ئەخلاقییەکان داڕێژن و بیانچێنن و بیان گشتێنن؟

## بۆ ئیلحاد دژی ئەخلاقە؟!

به کورتی بۆ ئیلحاد ئەخلاقی تێدا نییە؟![1]

١- مرۆڤ لای ئەوان ماددەیەکی پیسە، وەک «ستیڤن هۆوکینگ» دەڵێت، یان چڵکێکی کیمیاییە، وەک «ڕیچارد داوکینز» دەڵێت.

٢- مرۆڤ بەشێکە لە سروشت و بە بازدانێکی جینی هەڕەمەکی گەیشتووە بەو حاڵەی ئێستای، ئەوە ئەوەیە وای لێکردووە بە هەندێک شت بڵێت: چاک و بە

---

(١) بۆ زانینی سەرچاوەی ئەو وتانەی کە هێنامانن بگەڕێنەوە بۆ (منتدى التوحيد) بەتایبەت نووسەرێک بە ناوی: (محمد الباحث)، بە ناونیشانی (فضائح إلحادية وأخلاق داروينية إجرامية) واتا: (شورەییە ئیلحادییەکان و ڕەوشتە داروینییە تاوانبارەکان)، وە هەروەها کتێبی (شموع النهار وإطلال على الجدل الديني الإلحادي المعاصر في مسألة الوجود الإلهي) ی، دوکتۆر عبد الله العجيري، لاپەڕە (٦٦) بەدواوە،
https://www.conservapedia.com/List_of_atheist_shooters_and_serial_killers
https://www.conservapedia.com/Atheistic_Sweden_and_rape
http://www.internationalskeptics.com/forums/showthread.php
https://www.youtube.com/watch?v=rlH33btuhdM
https://youtu.be/5a_sZgZCTX0
http://www.mrctv.org/
http://m.youtube.com/watch?v=VZJ3tEGc2BM
http://m.youtube.com/watch?v=8lOL12MvXXQ

هەندێکی دیکەش بڵێت: خراپ، بەڵام دەکرێت وا نەبێت.

٣- ئەخلاق هەر هەمووی ڕێژەییە و ئەخلاقی ڕەهامان نییە، واتا هیچ شتیک نییە بەڕەهایی بوترێت باشە یان خراپە.

٤- خاوەنی نییە، وەک باوەڕدار کە هەردەم هەستبکات خاوەنی هەیە و چاوی لێیەتی و چاودێری دەکات.

٥- بڕوای بە زیندووبوونەوە نییە، بۆیە ئەوەی پێی دەکرێت و حەزی لێیەتی دەیکات هەر چەند خراپ و نائەخلاقیش بێت. هەر بۆیە ڕۆماننووسی گەورەی ڕووسی «دۆستۆیڤسکی» دەڵێت: "ئەگەر خودا نەبێت، هیچ شتێک قەدەغە نییە."

٦- مرۆڤ لە چوارچێوەی ئایینی ڕاست و پەیامی خوداییدا نییە، تاکوو چاکە و خراپەی بۆ دیاری بکات و پێوەی پەیوەست بێت، بەمەش هیچ قەید و بەند و بەستنەوەیەک مرۆڤ ناگرێتەوە و مرۆڤ بە هیچ ڕەوشتنامەیەکەوە پابەند نییە، بەڵکوو هەموو ئەوەی هەیە حەز و ویستەکانیەتی و ئەوان ڕێگای بۆ دیاری دەکەن.

١-لێرەوە مرۆڤ دەبێتە هەبوویەکی لە ڕادەبەدەر دڕندە، چونکە دڕندەکان دڕەندەن، بەڵام عەقڵ و توانا جەستەییەکانیان زۆر سنووردارە و ناتوانن وەک مرۆڤ کاری دڕندانە بکەن، بەڵام کاتێک مرۆڤ لە مرۆڤبوون کەوت و حەزە ئاژەڵییەکان بەسەریدا زاڵ بوون، ئەوە دڕندەیەکی سەیر دەردەچێت.

بۆیە یان ئەوەتا تاکی مولحید دەڵێت: چاکە و خراپە و ئەخلاقی و نائەخلاقی بوونی نییە، کە بینیمان ئەم ڕایە چەند دژی ئەقڵ و فیتڕەت و زانست و مرۆڤ و مرۆڤایەتییە.

یانیش دەڵێت: باش و خراپ هەیە و ئەخلاقبوونێکی بابەتی و ڕەهای هەیە، ئەو کات تووشی تێکەوتنێکی خراپی دژ بە ئایدیاکەی دەبێتەوە، ئەویش وەڵامی

ئەو پرسیارەیە کە ئاخۆ کێ وات لێدەکات کە پابەند بی بەو ئەخلاقانەوە؟! چونکە ئەو کات ئەخلاق دەبێتە شتێکی سەلمێنراو و بابەتی و دەرەکی و سەربەخۆ، خۆ ئەگەر بڕوایان بە ئەخلاقی باشیش هەبێت، ناتوانن دەریخەن، چونکە پاڵنەری خودا و چاودێری و لێپرسینەوەیان نییە. ئەگەر شتێکیشیان پێ خراپ بێت، هەر ناتوانن لێی بگەڕێنەوە، چونکە دووبارە هەوا و نەفس ئارەزوو لێیان ناگەڕێت، هیچ ڕێگرییەکیش بوونی نییە وەک خودا و چاودێری خودایی و لێپرسینەوە و زیندووبوونەوە.[1]

باوەڕداران هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی دەبێت شوێنکەوتەی ڕەوشت بن، بۆیەش سەرچاوە جیاوازەکانی ڕەوشت بەکاردەهێن کە دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕی باوەڕدارەکە، بەڵام ئەم کۆدەنگییەی باوەڕداران بۆ پیادەکردنی ڕەوشت بە مانای خودی پیادەکردنەکە نایەت، بەڵکوو بەشێکیش لە باوەڕداران پەیڕەوی حەز و پاڵنەرە شەڕانییەکەی ناخیان دەکەن، بەمەش لە کۆی گشتی مرۆڤایەتیدا، بە درێژایی مێژوو ملیۆنان خەڵک لە شەڕ و تێک هەڵچوونەکاندا کوژراون، کە یاسای بنەڕەتی بۆ ئەم کارە ئەوە بووە کێ دەسەڵات و هێز و قەڵا و چواردەور و تواناکانی قایمتر بوون، دەستیان درێژ کردووە بۆ چواردەور، بگرە لەمپەڕ بۆ ئەو پەڕی سەرزەویش بەگوێرەی تواناکانیان هێرشیان کردووە.

داوکینز لە (God Delusion The)دا دەڵێت: جەنگ و وێرانکارییە گەورەکان لەسەر دەستی ئایینەکان ڕوویداوە، باشترین چارەسەریش ئەوەیە کە مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی گشتی واز لە ئایین و بیروباوەڕ بهێنێت. بەڵام داوکینز لە بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆنیدا کە پرسیاری لێدەکەن دەربارەی ئەو جەنگ و کوشتارەی کە ستالین و ناباوەڕانی دیکەی جیهانی دروستیان کرد، ناتوانێت هیچ وەڵامێک بداتەوە، تەنیا دەڵێت کە ستالین کەسێکی مەیخۆر بوو، بۆیە تووشی ئەو هەڵە گەورانە بووە!

---

(١) پاکانەی هەبوون- موحەممەد صاڵح - چاپی یەکەمی ٢٠٢٠

قسەیەکی بەهێزی سام هاریس هەیە کە ڕوونکردنەوەیەکی باشی بیروباوەڕی ئیلحادییە بەرانبەر باوەڕداران و دەڵێت: "هەندێک باوەڕ زۆر مەترسیدارە، بۆیە ئەگەر خاوەنی ئەو باوەڕانە بکوژرێن و لەنێو ببرێن ئەوا کارێکی ئەخلاقییە."[1]

بۆیە گەواهی ناباوەڕان بۆ ئەو کوشتارەی باوەڕداران کردوویانە بەهۆی باوەڕەکەیانەوە و باوەڕی ناباوەڕان بۆ لەنێوبردنی خاوەنی هەندێک لە باوەڕەکان! ئاڵۆزی دروست دەکات ئەگەر لە بەرانبەر کردەوە کوشتاریەکەی ناباوەڕان و ئیلحاددا هەڵنەسەنگێنرێت، ئەمەش ڕەواجدان نییە بە هەر جۆرە کوشتنێک کە ڕەنگە لەنێو مرۆڤایەتیدا لەسەر دەسەڵات و باوەڕ ئەنجام بدرێت، بەڵام پاکانەیەکی ڕەوایە بۆ تێگەیشتن لەو بانگەشەیەی ناباوەڕان و باوەڕدارانیش دەربارەی ڕەوشتنامە و ئاشتی و ئازادی بەرزیان کردووەتەوە.

نموونە ناباوەڕییەکان کارەساتسازێنن و کۆمەڵکوژی گەورە و سامناکیان ئەنجامداوە، وەک: کۆمەڵکوژییەکانی ستالین و ماوتسی تۆنگ سیتۆن کە ملیۆنان کەس لەسەر دەستی ئیلحادەکەی ئەوان کوژراون، جێی سەرنجە کە قوربانییەکان لە مێژوودا ئەو کاتانە زیاتر و کارەسات ئامێز و دڵڕەقانەتر بوون کە ئاتیستەکان ڕابەر و سەرکردەبوون.[2]

بۆیە لێکۆڵەران پێیان وایە کە پەیوەندییەکی توند لەنێوان تاوانکارییەکان و ناباوەڕیدا هەیە، بۆیەش نووسەری ئەمریکی «دینیش د سەوزا»[3] دەنووسێت: "مرۆڤی ناباوەڕ لەو شوێنەوە تووشی تاوانکاری دەبێت کە پێی وایە داهێنەری ڕەوشتەکان خۆیەتی نەوەک خودا، بە بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا و زانست خەڵکی

---

(١) M. Pava، Jewish Ethics as Dialogue: Using Spiritual Language to Re-Imagine a Better World، لە ساڵی ٢٠٠٩ لە Springer بڵاوکراوەتەوە، لاپەڕە ١١٨

(٢) لە کتێبی (Morality Without God?) لە نووسینی (Walter Sinnott-Armstrong) لە ساڵی ٢٠٠٩ لە (Oxford University Press) بڵاوکراوەتەوە، لاپەڕە ٢٨

(٣) (dinesh d'souza) نووسەری ئەمریکی بەڕەگەز هیندی (١٩٦١)

لە خودا ڕادەکەن، لێرەشدا بەهەشتی عالمانییەتیان لەسەر زەویدا دروست کردووە. ئەگەر کەسانێکیش (وەک جوولەکەکان) کە گەلێکی کۆنی سەر زەوین بوونیان هەبوو، دەبێت لەنێو ببرێن! بۆ ڕازاندنەوەی بەهەشتە دروستکراوەکە، هەر ئەوەش بەرهەمی دەستی ستەمکاریی ناباوەڕانە، هەرکەسیش ئیعتیزاریان بۆ بهێنێتەوە، ئامادەیان دەکات بۆ کوشتوبڕی زیاترکە هەموویان جەخت لەسەر قسەکەی «فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی» دەکەن کاتێک دەڵێت: «ئەگەر خودایەک بوونی نەبێت، هەرچی دەکەی بیکە و ئازادیت."

لەم چوارچێوەیەشدا مامۆستای پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی زانکۆی کیلی بەریتانی «ناڤید شەیک» (Naveed S Sheikh)، توێژینەوەیەکی کرد بە ناونیشانێکی سەرنجڕاکێش بە ناوی «ژمارەی کوژراوان» کە تیایدا باسی هەموو ئەو جەنگانە دەکات کە لە سەردەمە جیاوازەکاندا ڕوویانداوە لەسەر دەستی دەوڵەت و بیروباوەڕە جیاوازەکان. لەنێو توێژینەوەکەی ئەودا ئەو جەنگانە هەژماردەکرێن کە ژمارەی کوژراوان لە ١٠ هەزار زیاتربن، لە سەرەتای بەرواری زایینییەوە هەتاکوو ساڵی ٢٠٠٨ لە سەرجەم شارستانییەتە جۆراوجۆرەکاندا.

ناڤید سەرجەم ئایین و ژیارییە جۆراوجۆرەکانی کرد بە ٧ بەشی سەرەکییەوە کە لە ماوەی ٢٠٠٨ ساڵدا ٢٧٦ ڕووداوی جۆراوجۆر ڕوویداوە، کە ئەنجامەکە بەم شێوەیە بوو[1]:

لەسەر دەستی ئایینی مەسیحی زۆرترین کەس کوژراوە لەسەر زەویدا، لە دوای ئایینی مەسیحیش ناباوەڕان دێن کە زیاد لە ١٠٠ ملیۆن کەس لەسەر دەستیان کوژراوە، هەر توێژینەوەکە ئاماژە بە ئەوەش دەکات کە کۆی گشتی کوژراوان لە ژێر دەستی فەرمانڕەوایەتی ئیلحاددا دەگاتە ١٥٠ ملیۆن کەس.

---

(1) https://www.aljazeera.net/
الالحاد والعنف.. كيف صنع ملحدون أهم مجازر العالم وحروب؟ ٢٠١٨.

| | |
|---|---|
| شارستانییەتەکان | کوژراو ٪ |
| مەسیحی | ٪٣٠/٧٣ |
| مەسیحی | ٪١٥/١٩ |
| مولحیدان | ٪٢١/٦٤ |
| چین | ٪١٨/٦٤ |
| بدائی (مرۆڤە سەرەتاییەکان) (Primitive) | ٪٧/٨٧ |
| ئیسلام | ٪٥/٥٢ |
| بوزی | ٪٠/٤١ |

ئەمەش لەگەڵ ئەو پڕوپاگەندە ساختەیە یەک ناگرێتەوە کە دەڵێن: «ناباوەڕی و سەلامەتی، یان ئاشتی و ناباوەڕی» بۆیە مێژوو و ئێستاش پێمان دەڵێن ئیلحاد بێتاوان نییە!

ئەم دڵڕەقییە ڕەنگە لەوەوە سەرچاوە بگرێت کە ناباوەڕان تێڕوانینێکی ڕوونیان بۆ ڕەوشت نییە، پێیان وا نییە یاسا ڕەوشتییەکان و ئەخلاقنامەکان بەهایەکیان هەبێت، بەڵکوو لە ئاستی بەرزی ناباوەڕیدا هەموو ڕەوشت بەستراوەتەوە بە کلتوورەوە کە ئەوەی لای من ڕەوشتە لای ئەو ڕەوشت نییە، ئەوەشی لێرە باشە لەوانەیە لە شوێنێکی دیکە خراپ بێت! ئیتر بەهایەک نامێنێتەوە بۆ ڕەوشت و دەکرت هەموو کارەکانمان باش و خراپ بن لە یەک کاتدا و بەپێی شوێن بگۆڕێت.

ئەمەش بەوە پشتی ئەستوورە کە ناباوەڕی پێودانگی نییە تا لەسەری بڕوات، تەنیا حەزەکان ڕەوشتن، ئەگەر پێویستیان بە تێرکردنی حەزەکانیان بوو، ئەوە دەتوانن هەرچی بۆیان کرا بیکەن وەک خۆیان دەڵێن.

سێ تێڕوانینی گرنگ لای ناباوەڕان بۆ ڕەوشت هەیە، کە (Expressivism) و (Error Theory) و (Realism)ن، کە ماناکانیان بەم شێوەیەیە[1]:-

(Expressivism) تیۆری دەربڕین: بەها ڕەوشتییەکان هیچ مەرجێکی ڕاستیبوونیان تێدا نییە و دادگایی ڕەوشتی هیچ بەهایەکی ڕاستی هەڵناگرێت، (ئەمەش واتا: هەر تاکێک ئازادە لە پیادەکردنی کارە ڕەوشتییەکانی و نابێت دادگایی بکرێت لەسەر دەستدرێژییە ڕەوشتییەکانی)، یەکێک لە پەرەپێدەرانی ئەم تێڕوانینە فەیلەسووفی ماددیگەرایی ئەلفرەید ئەیەرە (Alfrid j. Ayer).

(Error theory) تیۆری هەڵە: کە پێی وایە لێکدانەوە و تێڕوانینە ڕەوشتییەکان هیچی ڕاست نییە و هەڵەی خەیاڵ سەرچاوەکەیەتی.

(moral realism) تیۆری ڕیالیزم (واقع): کە پێی وایە چەسپاوی بوونی نییە و دەکرێت هەموو بەهایەکی ڕەوشتی ڕاست بێت یان هەڵە (واتا: بەپێی شوێن و کات دەگۆڕێت).

### ڕاستییەکی بەهادار

باوەڕداران باوەڕەکەیان ناچاری کردوون پابەندی ڕەوشتەکان بن و مەرجێکی سەرەکی باوەڕەکەیانە، بەڵام ناباوەڕ و ئاتیستەکان هیچ پێودانگ و ڕێسایەکیان نییە تا بیانبەستێتەوە بە جۆرێک لە ڕەوشتەکانەوە، خۆیان دەڵێن: ئەخلاق ئەوەیە کە حەزت لێیەتی و بۆت ئەجام دەدرێت، ئەوە خۆیانن دەڵێن: سنوورێک نییە تا ئازادییەکان ببەستێتەوە، دەڵێن: دەبێت مرۆڤ خۆی نەخاتە نێو کەلێنی هیچ یاسایەکەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر هەر کۆمەڵگەیەک پابەندی ئەم بەندە ئیلحادییە بێت و واز لە سەرجەم یاساکان بهێنێت ئەوا بەزووی دادەڕمێت و لەنێو دەچێت، چونکە بەشە شەڕانییەکەی مرۆڤ دەبێت یاسای بۆ دابنرێت و

---

(١) (Moral Error Theory) لە نووسینی (Wouter Floris Kalf) کە لە لاپەڕە ١٧٧و ١٧٨ی ساڵی ٢٠١٨ لە چاپخانەی (Springer) لە چاپدراوە.

ڕێک بخرێت، ئەمەش بەڵگە نەویستە و ئاشکرایە.

داوکینز لە گفتوگۆکەیدا لەگەڵ «هاریس»دا دەڵێت: "زانست ناتوانێت ئەوە یەکلا بکاتەوە کە کامە ڕەوشتە و کامەش نارەوشتییە، بەڵکوو ئەوە جێدەمێنێت بۆ تاکەکانی کۆمەڵگە."[١]

داوکینز زیاتر دەڕوات و دەڵێت: "ڕاستە هەموو بەها ئەخلاقییە ڕەهاکان لە ئایینەوە سەرچاوەیان نەگرتووە، بەڵام زۆر زەحمەتە بتوانیت بەرگری لە هیچ ڕەوشتێکی ڕەهایی بکەیت بەبێ ئایین."[٢]

هەر لەبەرئەوەشی داوکینز کۆڵی ئیلحادی سەدەی ٢١ی لە کۆڵناوە، زیاتر لەسەری دەوەستین، چونکە دانپێدانانێکی باشی ئیلحادی و پێناسەیەکی جوانی ڕەوشتی ناباوەڕان دەکات و دەڵێت: "چ شتێک ڕێگریمان لێ دەکات لەوەی بڵێین: هیتلەر شتێکی باشی نەکردووە؟"[٣]

لە گفتوگۆیەکی دیکەدا دیسان داوکینز دەڵێت: "عەقڵی مرۆڤ هەر بە سوودفە پەرەی سەند! دەشتوانین داهاتووی خۆمانی پێ ببینین و سەرئەنجامە دوورەکانیشی پێ بخەملێنین، بۆیە دەشتوانین هەموو ژیانمان بۆ تێرکردنی حەز و خۆپەرستییەکانمان بەسەربەرین و تەنیا خزمەتی خۆمان بکەین."[٤]

ئەمەش تەنیا دیوە تیۆرییەکەی ئەخلاقی ناباوەڕی بوو، ئەگەر بچینە سەر دیووە کردارییەکەی، ئیلحاد و مولحید تووشی کێشەی گەورەتر دەبن، لەو هەموو کارە نارەوشتییانەی پێشکەشی کۆمەڵگەی دەکەن، ئەمە گەواهیدان

---

(١) عبد الله بن صالح العجيرى، شموع النهار، ٢٠١٦، لاپەڕە ٦٦

(٢) عبد الله بن صالح العجيرى، شموع النهار، ٢٠١٦، لاپەڕە ٦٦

(٣) Gary Haitel، Origins and Grand Finale، لە ساڵی ٢٠١٤ لە iUniverse بڵاوکراوەتەوە، لاپەڕە٥٤

(٤) عبد الله بن صالح العجيرى، شموع النهار، ٢٠١٦، لاپەڕە ٦٧

نییە بۆ ئەوەی بڵێین: هەموو باوەڕدارێک پاکژ و بەڕەوشتە، بەڵکوو لانی کەم باوەڕدار لۆمەکراو و دزێوە، ئەگەر کاری دژ بە باوەڕەکەی بکات و پەیڕەوی ئەخلاقنامەکە نەکات کە باوەڕی پێیەتی، بەڵام لە بەرانبەردا وەک داوکینز وتی: ئەخلاق و ئیلحاد هیچ خزماتییەکیان نییە و زۆر دوورن لە یەکەوە، ئیتر ناچینە سەر بەڵگەکان تەنیا لۆژیک ئاشنامان دەکات بەوەی کەسێک کە پەیڕەوی هیچ ڕەوشتێک ناکات، زۆر نزیکترە بۆ بێڕەوشتی تا کەسێک پەیڕەوی ڕەوشتنامەیەک بکات کە ڕەوشتنامەی باوەڕییە، ئەگەرچیش جار جارەیەک لێی لابدات.

بۆیە لە گفتوگۆکەی «لۆرانس کراوس» و «هەمزە تزورتزس» کە پرسیار دەکرێت لە لۆرانس کراوس مولحیدی گەورەی جیهانی: "چ شتێک وات لێدەکات بڵێیت: داوێنپیسی لەگەڵ کەسە نزیکەکانتدا کارێکی هەڵەیە؟!" پرسیارەکە بۆ ئەوە دەکرێت کە کراوس لۆژیک بەکاربهێنێت لە وەڵامەکەیدا! بەڵام کراوس زۆر بە بوێری، لە ناخی ئیلحادێکی ڕاستەقینەوە دەڵێت: "بۆ من ڕوون نییە کە هەڵەیە." هەر ئەم وەڵامەی کراوسیش ئەسڵی ڕەوشتی ناباوەڕییە.[1]

با تەواو ڕاشکاو بین، ناباوەڕان لە ئاستی هەرە نزمی ڕەوشتیدان، کە ڕێگە دەدەن بۆ پڕکردنەوەی ئارەزووە سێکسییەکان ڕوو لە ئاژەڵانیش بکرێت، ئەمکارەش بە کارێکی ئاسایی دەزانن، بە مەرجی ئەوەی مافی ئاژەڵەکە بدەیت!

ئاخر بۆیە لە پاش تەمەنێکی زۆر لە خزمەت کردن، زمانحاڵی ناباوەڕی ڕیچارد داوکینز دەڵێت: "نەبوونی باوەڕ بە خودا لە بیروڕای مرۆڤایەتیدا پاڵنەرە بۆ ستەمکردن و نەمانی ڕەوشت."

کەواتە مولحید جیهانبینییەکی ڕووناکی نییە و تێڕوانینەکانی تێکەڵوپێکەڵن، لەگەڵ ڕەوشت و تەنانەت کەلتوورە جیاوازەکانیش ناگونجێت، لەبەرئەوەی

---

(1) https://www.youtube.com، Lawrence Krauss vs Hamza Tzortzis - Islam vs Atheism Debate

سەرچاوەی ڕەوشتی نییە و نازانێت چۆن هەنگاو هەڵبگرێت.

هۆکاری دووفاقی و ناڕوونییەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ فشاری ئارەزووەکانی لە لایەک کە داوای تێرکردنی حەزەکان دەکات و لە لایەکی دیکەوە لەبەر فشاری باوەڕە ناخییەکەی کە بۆ وازهێنان لە ناباوەڕی هەڵی دەنێت، بەمەش خراپ لێێ دەسووڕێت و ناتوانێت گرێکان بکاتەوە.

بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییەش ناچار پەنا دەبەنە بەر ئەو جێگرەوە ماددی و بوونیانەی ناباوەڕە شارەزاکان دایان ناوە، تا خۆیان و ئەوانی دیکەشی پێ ڕازی بکەن، بۆ ئەوەی لە نکووڵیکردن لە هەمبەر بوونی خوادا سەردانەخەن و قسە و وەڵامیان پێبێت، هەر وەک: بۆ ڕوونکردنەوەی ژیان و گەردوون پەنا بۆ سیناریۆ جیاوازەکان دەبەن، کە خستمانە سەر پەڕەی سپی و نەیانتوانی ژیان و گەردوونمان بۆ لێک بدەنەوە، هەروەها لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ڕوو لە ئایدۆلۆژیای فرۆید و دۆرکایم دەکەن و لە ڕووی سیاسی و سیستەمە سیاسییەکانەوە هانا دەبەنە بەر ماکیاڤیلی و ڕۆسۆ، تەنانەت توانای شیکردنەوەی بیروباوەڕەکەیانیشیان بەباشی نییە، ئەمە هەمووی بۆ ئەوەیە کە ڕا بکەن لە باوەڕ و لە خودا.

### مولحیدەکان خۆشەویست نین

لەبەرئەوەشی توێژینەوە تازەکان باش لەو ڕەوشە ناجۆرەی ناباوەڕان شارەزان و دەزانن کە مرۆڤی مولحید کێشەی قەلەقی و بێهیوایی و نامتمانەیی هەیە، ناتوانن بهێڵن ببنە کاربەدەست، تەنانەت لە هەندێک لە توێژینەوەکاندا ناباوەڕان وەک کۆمەڵکوژ و ستەمکار دەناسێنن، ئەمەش لەبەرئەوەی هیچ شتێک نییە بتوانێت ئەخلاقی هەوەس و ئارەزووی ناباوەڕ ڕاست بکاتەوە، دیارە کە ناباوەڕیش شوێن دەروونی خۆڕسک ناکەوێت تا خوارییە هەوەسییەکان دەمکوت بکرێن، بۆیە کردەوەی ناباوەڕان لە زۆربەی وڵاتەکان پەسەند نین و ئەگەرچیش ژمارەیان کەم نییە، بەڵام خەڵکانی خۆشەویست نین و ئەوانی

دیکە لێیان دەترسن، بۆیە پێویستە خەڵکی لەوە تێبگەن کەبەهای ناباوەڕی هێندە مەزن نییە.

ئەوەتا:

• لە حەوت ویلایەتی ئەمریکادا ناباوەڕ بۆی نییە ئیش بکات لە شوێنە حکومییەکاندا، خەڵکی مرۆڤە ناباوەڕەکانیان خۆش ناوێت و سڵیان لێ دەکەنەوە.[1]

• لە ئیرلەندا ناباوەڕ بۆی نییە مامۆستا بێت و لە قوتابخانە دەرس بە قوتابی بڵێتەوە.[2]

• لە یۆنان ناباوەڕان لە سەر ناباوەڕییان دادگایی دەکرێن.

چونکە ئەوان باش دەزانن ئەخلاق و مامەڵەی ناباوەڕ کێشەی هەیە، لە ڕاستگۆیی ناباوەڕ هەمیشە گومانیان هەیە، چونکە وابەستەی هیچ پێوەرێک نین، هەر کات بۆیان گونجاو ئامرازەکان بەردەست بوون، ئەوەی لەدەستیان هات و گونجا لەگەڵ ئارەزووە شرۆشۆڵەکان ئەنجامی دەدەن.

## ئیمان و ئەخلاق

بەپێچەوانەی تەوژمە ناباوەڕییەکە کە دەیوت: مرۆڤ و سروشت و ماددە هەر یەک شتن و مرۆڤ چڵکێ کیمیاییە و ماددەیەکی پیسە، ئیمان پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ ڕەوشتدا هەیە، چونکە لای باوەڕداران مرۆڤ دروستکراوی خودای گەورە و ڕێز لێگیراو و هەڵبژاردەی خودایە لە تەواوی ئایینەکاندا، هەموو باوەڕدارەکان بە نائایینییەکانیشەوە جیاوازییەکی تەواو دەکەن لەنێوان مرۆڤ

(1) https://www.vice.com/en_us/، Atheists Are Banned From Holding Public Office In Seven US States

(2) https://www.thejournal.ie/، What is it like to be an atheist in Ireland?

و شتەکانی دیکەدا.

لە باوەڕدا مرۆڤ تەنیا نییە و خاوەنی هەیە کە خودایە، بەوەش باوەڕ ئامانجی دەبێت و ئومێد لەسەر خودا هەڵدەچنێت، بەو پێیەش کە خودا لە زیهنی تاکدا بوونی هەبوو و باوەڕی بە زیندووبوونەوە و دووبارە ژیانکردن و لێپرسینەوە هەبوو، ئەوا مرۆڤ کائینێکی پڕاوپڕ ئەخلاقی و ماقووڵ دەردەچێت و لە سزای خراپەکانی دەترسێت و دڵی بە چاکەکانی خۆش دەبێت.

ئەگەر هات و کەسەکە ئایینداریکی باوەڕ پتەو بوو، ئەوە کەمترین زیان بە ژینگە مرۆییەکەی خۆی دەگەیەنێت و باوەڕەکەی وەک کۆت لە پاڵنەرە شەڕەنگێزییەکانی دەهاڵێت و ڕێی لێدەگرێت تا دەست بۆ نەویستراو و قێزەونەکان درێژ بکات، دیارە ڕوونە مەبەستمان نییە بڵێین: ئەوەی ئاییندار بوو، ئەوە هەبوویەکی تەواو ئەخلاقی و بێکەموکورتییە، بەڵکوو دەشێت هەندێک جار ناباوەڕێک لە خوداباوەڕێک ئەخلاقیتر بێت، بەڵام بەشێوەیکی گشتی باوەڕداران و ئایینداران ئەخلاقی و قبووڵکراوترن تا ناباوەڕان، ئەسڵەن ناباوەڕان و مولحیدان لێیان نایەت ئەخلاقی بن، چونکە باوەڕداران بنەما ئەخلاقییەکانیان لە خوداوە وەرگرتووە، بەڵام ناباوەڕان هیچ بنەما و ئەخلاقنامەیەکیان نییە.

## ئەخلاقی ئیسلامی

بنەمای ئەخلاقی ئیسلامی قورئان و سوننەتە، بۆیە ئەگەر لێیان بڕوانین گەوهەر و یاسا و بنەمای زۆر جوان و ناوازە دەبینین، کە لێرەدا چەند دانەکیان لێ باس دەکەین.

## ئەخلاق لە تێڕوانینی پێغەمبەردا (د.خ)

پێغەمبەر (د.خ) وەک بەرزترین و جوانترین نموونەی ئەخلاقی بوون دەیان و سەدان کردەوە و وتەی هەیە دەربارەی ئەخلاق و پەیوەندی بە ئیمانەوە، ئێمە لێرەدا هەندێ لە وتەکانی دەخەینەڕوو، بۆئەوەی ڕوونببێتەوە کە ئەخلاق و ئیمان دوانەیەکی لێکدانەبڕاون و پێویستە بەیەکەوەبن و لێکدانەبڕدرێن.

«الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ»[1].

«چاکە واتا جوانی ڕەوشت»

«اِنَّ اللَّهَ كَرِيمٌ يُحِبُّ الْكَرَمَ، جَوَادٌ يُحِبُّ الْجُودَةَ، وَيُحِبُّ مَعَالِيَ الأَخْلاقِ، وَيَكْرَهُ سَفْسَافَهَا»[2].

«خوای گەورە بەخشش مەندە و بەخششمەندانی خۆش دەوێت و خێرەومەندە و خێرەومەندانی خۆش دەوێت حەزی لە ڕەوشتە بەرزەکانە و ڕقی لە ڕەوشتە نزمەکان دەبێتەوە.»

«إن المؤمنَ لَيُدْرِكُ بحُسْنِ خُلُقِه درجةَ الصائمِ القائمِ»[3].

«بەدڵنیاییەوە ئیماندار بەهۆی ڕەوشت و ئاکاری جوانی دەگات بە پلەی ئەو کەسەی بەردەوام بەڕۆژووە و بەردەوام شەونوێژ دەکات.»

«خالِقِ النَّاسَ بخُلُقٍ حَسنٍ»[4]

«لەگەڵ خەڵکدا بە ڕەوشتی جوان مامەڵە بکە»

---

(١) رواه مسلم عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سِمْعَانَ الأَنْصَارِيِّ ٢٥٥٣.

(٢) صحيح الجامع عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ(١٨٠٠).

(٣) رواه أبو داود عن عائشة ٤٧٩٨.

(٤) رواه أحمد عن أبى ذر ٢٣٩٢، والترمذى ١٩٨٧.

«ما من شيءٍ أثقلُ في الميزان من خُلقٍ حسنٍ»[1]

«هیچ شتێک نییە لە تەرازووی چاکەکاندا قورستر بێت لە ڕەوشتی جوان»

«أكْملُ المؤمنينَ إيمانًا أحسنُهُم خلقًا»[2]

«کامڵ ترین و پەسەندترین ئیماندار ئەو کەسەیە کە ئەخلاق و خوڕەوشتی جوانترین و پەسەندترینە.»

«إنَّ أَبغَضَكُم إليَّ، وأَبعَدَكُم مِنِّي في الآخِرَةِ: أَسوَؤُكُم أخلاقًا»[3]

«لە ڕۆژی دواییدا بوغزاوترین و ناشیرینترین و نابووتترن و دوورترین کەس لەمن ئەو کەسەیە کە ئەخلاقی نابووتترین و ناشرین ترین و خراپترینە.»[4]

## سیستەمی ئەخلاق و ڕەوشت لە ئیسلامدا

## تایبەتمەندییەکانی سیستەمی ڕەوشتی لە ئیسلامدا

١. گشتگیر و گشتیی و هەمەلایەنە، هەموو بوارەکانی تاک و خێزان و کۆمەڵگە و دەوڵەت دەگرێتەوە، هەروەها هەموو کات و شوێن و بارودۆخ و سەردەمەکان دەگرێتەوە.

٢. ڕوونکراوە و بێ گرێ و گۆڵە.

٣. نەگۆڕە و بەپێی بەرژەوەندیی کەس و کات و شوێن و باردۆخەکان ناگۆڕێت.

---

(١) رواه أبو داود عن أبى درداء ٤٧٩٩.

(٢) أخرجه أبو داود (٤٦٨٢)، والترمذي (١١٦٢)، وأحمد (٢/ ٤٧٢) واللفظ له، وحكمه حسن صحيح.

(٣) صحيح الترغيب ٢٦٦٢.

(٤) فەرموودەو ئایەت یەکجار زۆر بەڵام ئێمەبەوەندەئیکتیفمان کرد.

٤. بۆ هەموو شوێن و کات و سەردەمەکانە.

٥. واقیعییە.

٦. ناوەندگیر و وەسەتی و میانڕەوە.

٧. جیهانییە.

٨. پەیوەستە بە ئیمان و بیروباوەڕ و عیبادەتەوە و لێی جیانابێتەوە.

٩. کردەیی و عەمەلییە.

١٠. پەیوەستە بە ئامڕاز و مەبەستەکان نەوەک بەتەنیا یەکێکیان.

١١. پەیوەستکەر و ئیلزامکەرە.

١٢. عیبادەتە و خاوەنەکەی لەسەری پاداشت وەردەگرێت.

## ناوەندگیریی ئیسلام لە ئەخلاق و ڕەوشتدا

ئیسلام تێڕوانینێکی ناوەندگیری هەیە بۆ ڕەوشت، چونکە ئێمە چەند تێڕوانینێکمان هەیە بۆ ڕەوشت، تێڕوانینێکی میسالی و خەیاڵی تێڕوانینێکی نیسبی و ڕێژەیی و ماددی. میسالی وخەیاڵییەکان وەک فریشتە لە مرۆڤ دەڕوانن و دەیانەوێت مرۆڤ ببێتە فریشتە، ماددییەکانیش ڕەوشت لایان ڕێژەییە و بەپێی کات و شوێن و سەردەم دەگۆڕێت، هیچ ڕەوشتێکی نەگۆڕ بوونی نییە! بەڵکوو بەرژەوەندی پێوەرە! بەڵام ئیسلام وا نییە و لەو نێوەندەدایە، مرۆڤ لە ئیسلامدا نە فریشتەیە نە ئاژەڵ، بەڵکوو دروستکراوێکی ڕێزلێگیراوە کە عەقڵی هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا شەهوەت و ئارەزوو و پێداویستی نەفسی و جەستەییشی هەیە.

خاڵێکی تر بریتییە لە ژیانی دونیا، هەیە ژیانی دونیا لای هەموو شتێکە و

ئێرە کۆتایی شتەکانە و پێی وایە بەس ئێرە جێی بایەخە، هەشە ژیانی دونیای پێ هیچ نییە و هیچ بایەخێکی بۆ دانانێت.

## گشتگیری ئەخلاق و ڕەوشت لە ئیسلامدا

ئیسلام بەرنامەیەکی تێروتەسەل و جوانی هەیە بۆ ڕێنموونی کردن و ئاراستەکردنی ڕۆح و دڵ و دەروون و ڕەوشت، ناتەواوی و نارێکی و بۆشاییەکانی بۆ پڕدەکاتەوە، بۆیە هیچ شتێک نابینی لە ئیسلامدا کە لەگەڵ ڕۆح و ناخ و دڵ و دەروون و فیترەت و خوڕەوشت و ئاکاری مرۆڤدا نەگونجێت و تێک بگیرێت. بەڵگەش لەسەر ئەمە قورئان و سوننەتە، هەروەها هەبوونی زانستێک بە ناوی زانستی پاککردنەوەی ڕۆح و دڵ و دەرون (علم تزكية النفس) یان زانستی ڕەوشت (علم الاخلاق)، کە ئیش دەکات لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ خۆی بڕازێنێتەوە بە هەموو خوڕەوشت و سیفەتێکی جوان و باش لە ناوەوەو لە دەرەوەی خۆیدا و دوورکەوێتەوە لە هەموو ڕەوشت و سیفەتێکی ناشیرن و خراپ لە ناوەوە و لە دەرەوەی. کەواتە ئیسلام ئەو بەشە سەرەکییەی تری مرۆڤی پشت گوێ نەخست و گرنگییەکی تەواوی پێ داوە و ڕێنمایی تەواوی کردووە و بۆشاییەکانی پڕ کردووەتەوە و هیچ شتێکی تێدا نییە کە تێک بگیرێ لەگەڵیدا، بۆیە ئەو بەشەش کە جوان و ڕێکوپێک بوو ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی ئەرێنی و جوان و باشی دەبێت لەسەر گوفتار و ڕەفتار.

## چەند نموونەیەک لە گشتگیری ڕەوشتی ئیسلامی

**١. ڕەوشتی ئیسلام بۆ تاک لە هەموو ڕووەکانەوە:**

أ. لە ڕووی جەستە و پێداویستییەکانییەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا

بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾[1]

«ئەی نەوەی ئادەم، خۆتان برازێننەوە بە پۆشاک لەبەرکردن، لەکاتی هەموو نوێژێک و چوونە ناو مزگەوتدا، بخۆن و بخۆنەوە (لە ناز و نیعمەتەکان) بەڵام زیادەڕەوی مەکەن، چونکە بەڕاستی خوا لەسنووردەرچووان و زیادەڕەوانی خۆش ناوێت.»

هەروەها پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت.) دەفەرموویت: «ان لبدنک علیک حقا.» واتە: «جەستە مافی بەسەر تۆوەیە.»

ب. لەڕووی عەقڵەوە: ﴿قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾[2]

«پێیان بڵێ: سەیر بکەن و سەرنج بدەن: خوا چی دروست کردووە لە ئاسمانەکان و زەویدا، کەچی بەڵگە و نیشانەو ئاگادارییەکان سوودیان نییە بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕ ناهێنن و (ڕێبازی ئیمان ناگرنە بەر.)»

ج. لە ڕووی نەفسەوە: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا﴾[3].

«بەڕاستی ئەو کەسە سەرفرازە کە نەفسی پاک و پوختە کردووە و ئیمان و ترسی خوای تیادا ڕواندووە.»

﴿وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾[4]

«بێگومان نائومێد بوو ئەو کەسەی نەفسی خۆی ناپوخت کرد و ئاڵوودەی گوناهـ و تاوان و خراپەی کرد.»

---

(١) [الاعراف : ٣١ ].

(٢) [یونس : ١٠١].

(٣) [الشمس: ٩].

(٤) [الشمس: ١٠].

کەواتە ڕەوشتی ئیسلامی جەستە و ناخ و نەفس و ئەقڵی گرتەوە.

**٢. ڕەوشتی ئیسلام بۆ خێزان**

أ. پەیوەندی نێوان منداڵ و دایک و باوک: بۆ دایک و باوکان: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا﴾[1] «ئێمە فەرمانمان بە ئادەمیزاد داوە کە چاکەکار و چاک ڕەفتار بێت لەگەڵ دایک و باوکیدا.»

بۆ منداڵان: ﴿ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ۚ إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا﴾[2].

«نەکەن منداڵەکانتان لە ترسی گرانی و برسییەتی بکوژن (چونکە پەروەردگارتان ڕۆزی بەخش و میهرەبانە)، ئێمە ڕزق و ڕۆزی دەبەخشین بەوانیش و بە ئێوەش، چونکە بەڕاستی کوشتنی ئەوان گوناهـ و تاوانێکی زۆر گەورەیە.»

ب. پەیوەندی هاوسەران: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ ۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۚ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰ أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾[3]

«ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، دروست نییە بۆتان ژنان بە زۆر بکەنە میراتی خۆتان و دەستیان بەسەردا بگرن، (وەکوو کەلوپەلی تری ناوماڵ)، ناچاریان مەکەن تا هەندێک مارەییتان بۆ بگەڕێننەوە، مەگەر ئەوان گوناهێکی ئاشکراو دیار ئەنجام بدەن، هاوژینییان بەجوانی لەگەڵدا بەرنە سەر، خۆ ئەگەر خۆشتان نەویستن و لێیان بێزار بوون، ئەوە دوور نییە و دەشێت حەزتان لە شتێک نەبێت و خوا بیکات بە مایەی خێروبێری زۆرو بێسنوور.»

---

(١) [الاحقاف: ١٥].

(٢) [الاسراء: ٣ ].

(٣) [النساء: ١٩].

ج. پەیوەندی نێوان خزمان: ﴿وَآتِ ذَا الْقُرْبَىٰ حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا﴾[1]

«مافی خزم و خوێشان بەجێ بهێنە و پەیوەندییەکان (لە چوارچێوەی شەرعدا چاودێری بکە) هەروەها مافی هەژارانیش (بە یارمەتیدانیان بەگوێرەی توانا) ئەنجام بدە هەروەها مافی ڕێبواریش (بە دەستگیرۆیی و ڕێ نیشاندان) جێبەجێ بکە، دەست بڵاویش مەبە و ماڵ و سامانت بەفیڕۆ مەدە.»

**٣. ڕەوشتی ئیسلام بۆ کۆمەڵگە**

أ. ئادابی کۆمەڵایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَىٰ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾[2]

«ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە هیچ ماڵێکی تر جگە لە ماڵەکانی خۆتان هەتا کارێک نەکەن کە ئەوان ئاگاداربن (وەکوو زەنگ لێدان یان لە دەرگادان) پاشان کە مۆڵەتدران، سەلام بکەن لە خەڵکی ماڵەکە، ئەوە چاکترە بۆتان و بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن، هەوڵ بدەن لە یادتان بێت و ئەو شێوازە فەرامۆش نەکەن (کاتی لەبار و گونجاو هەڵبژێرن بۆ سەردانەکانتان، بۆئەوەی میوان و خاوەن ماڵ دڵیان بەیەک بکرێتەوە.)»

ب. لە ڕووی ئابووری و مامەڵە و بازرگانییەوە: ﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ﴾[3]

{هاوار و ئاه و ناڵە بۆ تەرازووبازەکان، بۆ ئەوانەی کە لەکێشان و پێواندا لە کڕین و فرۆشتندا تەرازووبازی و فێڵ دەکەن (یان لە هەڵسەنگاندنی خەڵکیدا ڕاست ناڵێن.)}

---

(١) [الاسراء: ٢٦].

(٢) النور ( ٢٧ ).

(٣) [الْمُطَفِّفِينَ: ١].

﴿الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ﴾(١)

«ئەوانەی کاتێک شت لە خەڵکی دەکڕن بە تەواوی لێیان وەردەگرن.»

﴿وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾(٢)

«بەڵام کاتێک شتیان بۆ دەپێون یان دەکێشن لێی دەدزنەوە و کەمیان دەدەنێ و فێڵیان لێ دەکەن.}

ج. لە ڕووی سیاسی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ۚ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾(٣).

«بێگومان خوا فەرمانتان پێ دەدات کە هەموو ئەمانەتەکان (سپاردەکان) بگەڕێننەوە دەست خاوەنەکانیان و هەر کاتێکیش دادوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا، دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بکەن، چونکە بەڕاستی خوا بەجوانی و چاکی و تەواوی ئامۆژگاری و فەرمانتان پێ دەدات، بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام بیسەر و بینایە.»

**٤. لەبارەی ئاژەڵ:** پێغەمبەر (د. خ) دەفەرمووێت: «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإحْسَانَ علَى كُلِّ شيءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فأحْسِنُوا القِتْلَةَ، وإذَا ذَبَحْتُمْ فأحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ»(٤)

«خوای گەورە چاکەکاری و چاکبوونی لەگەڵ هەموو شتێکدا پێویست کردووە، هەر بۆیە ئەگەر ئاژەڵتان سەربڕی جوان بیکوژنەوە و (هەوڵی کەمترین ئازار و ئەزیەت بدەن، ئەگەر سەرتان بڕین جوان و باش سەیریان ببڕن)،

---

(١) [الْمُطَفِّفِينَ: ٢].
(٢) [الْمُطَفِّفِينَ: ٣].
(٣) [النساء: ٥٨].
(٤) رواه مسلم عن شداد بن أوس ١٩٥٥.

چەقۆکەیان بۆ تیژ بکەن و پێش سەربڕینیش ئاو و خواردنیان بدەنێ و بە تینوویی و برسییەتی سەریان مەبڕن، کە بردتانن بۆ شوێنی سەربڕین بەجوانی و نەرمونیانی بیانبەن، سەربڕینەکەش وا بکەن کەمترین ئازاری هەبێت بەوەی کە بە خێرایی چەقۆکەی بەسەردا بێنی و ئەزیەتی نەدەی.»

«اتقوا في البهائم المعجمة، فاركبوها صالحة، وكلوها صالحة»[1]. واتە: «لەخوا بترسن لە بەرانبەر ئاژەڵە بێزمانەکان کە ناتوانن قسە بکەن، هەروەها جوان لێیان بخوڕن و سواریان بن، جوانیش بیانخۆن و سەریان بڕن.» لە شوێنێکی تردا دەفەرمووێت: «چەقۆکەیان بۆ تیژ بکەن و ئەگەر تینویان بوو پێش سەرِ بڕین ئاویان بدەن.»

**٥. ڕەوشتی ئیسلام پەیوەست بە گەردوون:** ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ﴾[2]

«بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لە ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند.»

**٦. ڕەوشتی ئیسلام پەیوەست بە خوای پەروەردگار:** ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ [الفاتحة: ٢]

«سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە و بۆ خوایە، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە.»

﴿الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾

«بەخشندەی میهرەبان، کانگای ڕەحمەت و میهرەبانییە.»

﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾

---

(١) رواه البخاري.

(٢) [آل عمران: ١٩٠].

«خاوەن و سەرداری ڕۆژی پاداشت و سزایە (پادشای ڕۆژی قیامەتە کە دادپەروەری ڕەها و بێسنووری تێدا بەرپا دەکات)»

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾

«خوایە، تەنیا هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دنیاماندا، بەکەسی تر لە بەندەکانت ناکرێت).»

﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾(١)

«خوایە بەردەوام ڕێنموویيمان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازە ڕاست و دروستە کە ئیسلامە.»

**هەندێک ئایەتی قورئانی دەربارەی ئەخلاق و ئاکار و ڕەوشت**

﴿وَلَا تَنسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ﴾ [البقرة: ٢٣٧]

«چاکە و فەزڵی نێوانتان لە بیر مەکەن.»

﴿وَالصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ وَأُحْضِرَتِ الْأَنفُسُ الشُّحَّ﴾ [النساء: ١٢٨]

«ئاشتەوایی و ڕێککەوتن چاکتر و باشترە لە لێکترازان و...»

﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ﴾ [النحل: ٩٠]

«خودای گەورە فەرمان بە دادگەری دەکات.»

﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ ۖ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا﴾ [الإسراء: ٣٤]

«وەفا بکەن بە بەڵێن و پەیمان، چونکە بەڕاستی بەرپرسیارن بەرانبەر بەڵێن

---

(١) [الفاتحة: ٢_ ٦]

و پەیمانەوە.»

﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ﴾ [المائدة: ٢]

«یارمەتی یەكدی بدەن لەسەر چاكە و چاكەكاری و خۆپارێزی و خوداپەرستی.»

﴿وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ [المائدة: ٢]

«یارمەتی یەكتری مەدەن لەسەر گوناه و تاوان و خراپەكاری و دوژمنكاری و دوژمنایەتی یەكدیكردن.»

﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا﴾ [الفرقان: ٦٣]

«بەندەكانی خودای میهرەبان ئەو كەسانەن كە بەهێمنی و زۆر بەجوانی بەسەر زەویدا دەڕۆن.»

﴿وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ﴾ [الأعراف: ٨٥]

«شتی خەڵك سوك مەكەن و بەبێ نرخی تەماشای مەكەن.»

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا﴾ [آل عمران:٢٠٠]

«ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! خۆڕاگر و ئارام بن، خۆڕاگری و ئارامی بەسەرخۆتاندا بهێنن و ئارامی و خۆڕاگری لەناو خۆتاندا بڵاوبكەنەوە.»

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ﴾ [التوبة: ١١٩]

«ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! لە خودا بترسن و پارێزكار بن، هەوڵبدەن هەمیشە لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن.»

﴿وَلَا تَجَسَّسُوا﴾ [الحجرات: ١٢]

«جاسووسی بەسەر یەكترەوە مەكەن.»

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَىٰ أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَىٰ أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوا أَنْفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ ۖ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ ۚ﴾ [الحجرات: ١١]

«ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هیچ کەس و هیچ هۆز و گەلێک گاڵتە بەکەس و گەل و هۆزێکی تر نەکات و زەلیلی نەکات، چونکە لەوانەیە ئەوان چاکتر بن لەمان، ژنانیش با گاڵتە بەیەکدی نەکەن و یەکتر زەلیل نەکەن، چونکە لەوانەیە ئەوان لەمان چاکتر بن. سووکایەتی بەخۆتان مەکەن و یەکتری عەیبدار مەکەن (چونکە سووکایەتی بە یەکتر سووکایەتییە بە خۆتان) هەروەها ناو و ناتۆرەی ناشیرین بۆ یەکتر دامەتاشن، ئای کە چەند ناشیرینە ناو و ناتۆرەی خراپ لەدوای باوەڕهێنان و موسڵمان بوون.»

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾ [الحجرات: ١٢]

«ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان زۆر بپارێزن لە گومانی خراپ، لە ڕاستیدا هەندێک لەو گومانانە گوناهو تاوانن.»

﴿مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ﴾ [غافر: ١٨]

«لە ڕۆژی دواییدا هیچ دڵسۆز و پشتیوانێک بۆ ستەمکاران نییە، کەس تکاکار و خەمخۆریان نییە، تاوەکوو قسەکەی ڕەواجی هەبێت و تکای لێ وەربگیرێت.»

﴿لَا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ﴾ [النساء: ١٤٨]

«خودا حەز ناکات لە قسەی ناشیرین و نابەجێ و ناو و ناتۆرە وتن و جنێودان و سووکایەتی کردن.»

﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ [لقمان: ١٨]

«ڕووت وەرمەگێڕە لە خەڵکی و (لووتبەرز مەبە و بەچاوی سووک سەیریان مەکە)، بەسەر زەویدا بەناز و فیزەوە مەڕۆ، بەڕاستی خودا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە خۆهەڵکێش و فەخر فرۆش و فیزاوین.»

﴿وَيْلٌ لِكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾ [الجاثية: ٧]

«هاوار و قوربەسەری و ڕەنجەڕۆیی تەنیا بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە زۆر درۆزن و بوختانچی و تاوانبارن.»

﴿وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ﴾ [الحجرات: ١٢]

«لە پاشەملە باسی یەکتری بە خراپە مەکەن، ئایا کەستان خۆشی دێت لەوەی گۆشتی برای خۆی بەمردوویی بخوات؟! دیارە کاری واتان زۆر پێ سەخت و ناخۆشە.»

﴿وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾ [البقرة: ٨٣]

«قسەی جوان بکەن بەرانبەر خەڵکی و لەگەڵ خەڵکیدا.»

﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ [المؤمنون: ٩٦]

«هەوڵبدە بە چاکترین و جوانترین شێوە پاڵ بە هەڵە و نارێکی و خراپەکاری بنێیت و لای بەری.»

﴿وَلَا تُسْرِفُوا ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ [الأنعام: ١٤١]

«زێدەڕۆیی مەکەن، چونکە خودای گەورە زێدەڕۆکەرانی خۆشناوێت.»

﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ [النساء: ١٩]

«هاوژینییان بەجوانی لەگەڵدا بەرنەسەر (لەگەڵ خێزانەکانتان)»

﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ﴾ [النحل: ١٢٥]

«بانگەواز بکە بۆ لای پەروەردگارت بە حیکمەت (داناییيەوە).»

﴿وَلَا تَمْنُنْ تَسْتَكْثِرُ﴾ [المدثر: ٦]

«منەت مەکە (بەسەر کەسدا) چاکە و بەخشینەکانت بە زۆر مەزانە لە کاتێکدا بەتەمای زیاتر بیت.»

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ [الصف: ٢]

«ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بۆچی شتێک دەڵێن و ئەنجامی نادەن؟ بۆچی گوفتارتان دژی کردارتانە؟»

﴿وَلَا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ﴾ [الأعراف: ٢٠٥]

«لە بێئاگایان مەبە (ئەوانەی دڵیان غافڵە).»

﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا﴾ [الأحقاف: ١٥]

«ئێمە فەرمانمان بە ئادەمیزاد داوە کە چاکەکار و چاک ڕەفتار بێت لەگەڵ دایک و باوکیدا.»

## هەندێک فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ)دەربارەی ئەخلاق و ئاکار و ڕەوشت

لە کۆمەڵە فەرموودەیەکدا پێغەمبەر (د.خ) ئیمان و ئیمانداریەتی و موسڵمانیەتی و ڕەزامەندی خودا و بەهەشت و دۆزەخ و...، دەبەستێتەوە بە ئەخلاق و ئەخلاقیبوون و سیفەت و ئاکار و کار و کردەوەی جوان و باش و بەرز:

«الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ»[١]

«موسڵمانی -تەواو- ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە زمان و لە دەستی سەلامەت بن.»

«لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ»[٢]

«ئیمانی هیچ یەکێک لە ئێوە تەواو نابێت تاوەکوو چی بۆ خۆی پێ خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت.»

«لَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، وَلَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثٍ»[٣]

«ڕقوکینە بەرانبەر بە یەکتری مەنوێنن, ئیرەیی بە یەکتری مەبەن، پشت لەیەکتر هەڵمەکەن, ببن بە برای یەکتر، دروست نییە بۆ هیچ موسڵمانێک پشت بکات لە براکەی لە دوای سێ ڕۆژ.»

«الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ القِيَامَةِ»[٤]

«زوڵم و ستەم دەبێتە تاریکایی لە ڕۆژی دوایی دا.»

---

(١) رواه البخاري عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْن عَمْرو ١٠.
(٢) رواه البخاري عَنْ أنَس ١٣.
(٣) رواه مسلم عَنْ أَنَس بْن مَالك ٢٥٥٨.
(٤) رواه البخاري عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْن عُمَرَ ٢٤٤٧.

«لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ»[١]

«ئەو کەسەی قسە دەهێنێت و دەبات -دووزمانی دەکات- ناچێتە بەهەشت.»

«لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعٌ»[٢]

«ناچێتە بەهەشتەوە ئەو کەسەی کە -پەیوەندی خزمایەتی- پچڕاندبێت.»

«اليَدُ العُلْيَا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلَى، فَاليَدُ العُلْيَا: هِيَ المُنْفِقَةُ، وَالسُّفْلَى: هِيَ السَّائِلَةُ»[٣]

«دەستی بەرز باشترە لە دەستی نزم، دەستی بەرز ئەو دەستەیە کەوا -بۆخوا- دەبەخشێت، دەستی نزم ئەو دەستەیە کەوا سواڵ دەکات.»

«إِنَّ الرِّفْقَ لَا يَكُونُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ، وَلَا يُنْزَعُ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ»[٤]

«نەرموونیانی لە هەر شتێکدا هەبێت ئەوا جوان و چاکی دەکات، لە هەر شتێکدا نەما ئەوا ناشرین و خراپی دەکات.»

«مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ»[٥]

«هەر کەسێک لە ئێوە خراپەیەکی بینی ئەوا با بە دەست بیگۆڕێت, ئەگەر نەیتوانی با بە زمان بیگۆڕێت, ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ پێی ناخۆش بێت, ئەوە لاوازترینی ئیمانە.»

---

(١) رواه مسلم عَنْ حُذَيْفَةَ ١٠٥.
(٢) رواه البخاري عَنْ جُبَيْرَ بْنَ مُطْعِم ٥٩٨٤.
(٣) رواه البخاري عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ١٤٢٩.
(٤) رواه مسلم عَنْ عَائِشَةَ ٢٥٩٤.
(٥) رواه مسلم ٤٩.

«لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ, الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ»[(١)]

«ناچێته بەهەشتەوە هەر کەسێک مسقاڵە زەڕەیەک خۆبەگەورەزانینیی لە دڵدا هەبێت, خۆبەگەورەزانین ئەوەیە کە حەق ڕەتبکەیەوە و وەری نەگریت و خەڵکی بە کەم بزانی.»

«إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ»[(٢)]

«ناچێته بەهەشتەوە هەر کەسێک مسقاڵە زەڕەیەک خۆبەگەورەزانینی لە دڵدا هەبێت» «بێگومان خودا جوانە و جوانیشی خۆش دەوێت.»

«لَيْسَ الْمُؤْمِنُ الَّذِى يَشْبَعُ وَجَارُهُ جَائِعٌ إِلَى جَنْبِهِ وَهُوَ يَعْلَمُ بِهِ»[(٣)]

«ئەو کەسە ئیماندار نییە کە وا خۆی تێرە و دراوسێکەی بە لاشانییەوە برسییە و ئەمیش پێی دەزانێت.»

«ِنَّ اللَّهَ تَعالىَ عَفُوٌّ يُحِبُّ الْعَفْوَ»[(٤)]

«خوای گەورە لێبووردەیە و حەزی بە لێبووردنە.»

«مَنْ يَكُنْ فِي حَاجَة أَخِيْهِ يَكُنِ اللّٰهُ فِي حَاجَتِهِ»[(٥)]

«هەر کەسێک لە هەوڵی جێبەجێکردنی پێداویستی براکەیدا بێت، ئەوا خوای گەورەیش لە جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی ئەودایە.»

---

(١) رواه مسلم عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ٩١.

(٢) رواه مسلم عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ٩١.

(٣) صحيح الـجامع الصغير رقم: (٥٥٠٥) وصحيح الأدب الـمفرد رقم: (١١٢) وسلسلة الأحاديث الصحيحة عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، رقم (١٤٩).

(٤) حيث رقم (١٧٧٩) في صحيح الجامع عن إبن مسعود عن عبدالله بن جعفر.

(٥) حديث رقم (٦٦١٨) في صحيح الجامع عن جابر.

«لا يَسْتَقِيمُ إِيمانُ عبدٍ حتى يَسْتَقِيمَ قلبُهُ، ولا يَسْتَقِيمُ قلبُهُ حتى يَسْتَقِيمَ لسانُهُ»[١]

«ئیمانی هیچ کەسێک ڕاست و تەواو و ڕێکوپێک نابێت هەتاوەکوو دڵی ڕاست و ڕێکوپێک و تەواو نەبێت، دڵیشی ڕاست و ڕێک و تەواو نابێت تاوەکوو زمانی ڕاست و ڕێک نەبێت.»

«مَن ظَلَمَ قِيدَ شِبْرٍ طُوِّقَهُ مِن سَبْعِ أَرَضِينَ»[٢]

«هەرکەسێک بستێک زەوی بەستەم داگیر بکات ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەکی ئەوەندە سەخت دەدرێت وەک ئەوەی هەر حەوت چینەکەی زەوی لە مل بپێچن و تەوقی بکەن.»

«مَن لا يَرْحَمِ النَّاسَ، لا يَرْحَمْهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ»[٣]

«هەر کەسێک ڕەحم بە خەڵکی نەکات، خوای گەورەش ڕەحمی پێناکات.»

«ومَن كانَ يُؤْمِنُ باللَّهِ واليَومِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أوْ لِيَصْمت»[٤]

«هەرکەسێک باوەڕی بە خوای گەورە و ڕۆژی دوایی هەیە، ئەگەر قسەی باش دەزانێت ئەوە با بیکات؛ ئەگەرنا با بێدەنگ بێت.»

«من حسنِ إسلامِ المَرءِ تركُه ما لا يعنيه»[٥]

«یەکێک لە جوان پابەندبوونی موسڵمان بە ئیسلامەوە بریتییە لە وازهێنان لەو شتانەی پەیوەندی بە ئەوەوە نییە و شایەنی گرنگیپێدانی ئەو نین.»

---

(١) مسند احمد و صحيح الترغيب عن أنس بن مالك ٢٥٥٤.

(٢) متفق عليه عن عائشة.

(٣) رواه مسلم عن جرير بن عبد الله ٢٣١٩.

(٤) رواه البخاري عن أبي هريرة ٦١٣٦.

(٥) أخرجه الترمذي (٢٣١٧)، وابن ماجه (٣٩٧٦) عن أبي هريرة.

«مَن كانَ يُؤْمِنُ باللَّهِ واليَومِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ.»[١]

«هەرکەسێک بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێزی میوانی بگرێت.»

«تَبَسُّمُکَ فِي وَجْهِ أَخِيکَ لَکَ صَدَقَةٌ»[٢]

«زەدەخەنە و ڕووخۆشیت بۆ بەرانبەرەکانت بە چاکە و خێر هەژمار دەکرێت.»

«الكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ»[٣]

«گوتنی قسەی باش و خۆش و ڕێک و بەسوود خێر و چاکەیە.»

«من لم يشكرِ النَّاسَ لم يشكرِ اللَّهَ»[٤]

«هەرکەسێک سوپاسی خەڵک نەکات، سوپاسی خوای گەورەش ناکات.»

«مَنْ كان سهْلًا هيِّنًا لَيِّنًا، حرَّمَهُ اللّهُ على النَّارِ»[٥]

«هەرکەسێک مامەڵە و تەبیعەتی ئاسان و خۆش بێت و نەرمونیان بێت، خوای گەورە ئاگری دۆزەخی لەسەر قەدەغە دەکات.»

«استوصُوا بالنِّساءِ خيرًا»[٦]

«ئامۆژگاریتان لێبێت دەربارەی ئافرەتان، زۆر ئاگاتان لێیان بێت.»

«خيرُكُم خَيرُكُم لأَهْلِهِ وأَنا خيرُكُم لأَهْلي»[٧]

---

(١) رواه البخاری عن أبی هريرة ٤٣٦٣.

(٢) رواه ابن حبان عن أبی ذر ١٩٥٦.

(٣) رواه البخاری ٢٩٨٩، ومنسلم ١٠٠٩ عن أبی هريرة.

(٤) رواه أحمد عن أبی هريرة، ٢٢٢.

(٥) رواه الحاكم عن أبی هريرة ٤٣٥.

(٦) أخرجه البخاري (٥١٨٦)، ومسلم (١٤٦٨) عن أبي هريرة.

(٧) الترمذي ٣٨٩٥.

«باشتریتان ئەوەیە کە بۆ ئەهلەکەی باشترینە، منیش باشترینتانم بۆ ئەهلەکەی خۆی.»

«وخيارُكُم خيارُكُم لنسائِهِم»[1]

«باشترینتان باشترینتانە بۆ ژن و هاوسەرەکەی.»

«كلُّكم راعٍ وكلُّكم مسؤولٌ عن رعيتِهِ»[2]

«هەمووتان بەرپرسن بەرانبەر ئەو کەسانەی لەژێر دەستتانن و سەرپەرشتییان دەکەن.»

«إنَّ أَبغَضَكُم إليَّ، وأَبعَدَكُم مِنِّي في الآخِرَةِ: أَسوَؤُكُم أخلاقًا»[3]

«لە ڕۆژی دواییدا بوغزاوترین و ناشیرینترین و نابووتترن و دوورترین کەس لە من ئەو کەسەیە کە ئەخلاقی نابووتترین و ناشرینترین و خراپترینە.»

«مَن قَتَلَ نَفْسًا مُعاهَدًا لَمْ يَرِحْ رائِحَةَ الجَنَّةِ»[4]

«هەر کەسێک پەیمانپێدراوێک بکوژێت -بەبێ تاوان- بۆنی بەهەشت ناکات.»

هەموو ئەم ئایەت و فەرموودانە بەڵگەن لەسەر گرنگیدانی زۆری ئیسلام بە ئەخلاق و پەیوەستکردنی بە ئیمان و دوارۆژ و ڕەزامەندی خودا.

---

(١) أخرجه أبو داود (٤٦٨٢)، والترمذي (١١٦٢)، وأحمد (٢/ ٤٧٢) واللفظ له، وحكمه حسن صحيح.

(٢) أخرجه البخاري (٢٥٥٤)، ومسلم (١٨٢٩)، وأبو داود (٢٩٢٨)، والترمذي (١٧٠٥)، والنسائي في ﴿السنن الكبرى)) (٩١٧٣)، وأحمد (٥١٦٧) واللفظ له.

(٣) صحيح الترغيب ٢٦٦٢.

(٤) البخاري ٣١٦٦.

## تەزکیەی نەفس وەک کرۆکی ئەخلاقی ئیسلامی

### تەزکیەی نەفس

### تەزکیە دوو واتای هەیە:

١. پاککردنەوە و پاکبوونەوە

٢. گەشەپێدان و گەشەسەندن

بەم پێیە تەزکیە واتە پاککردنەوە و گەشەپێدانی نەفس.

تەزکیەی نەفسیش واتە:

«ڕزگارکردن و پاککردنەوە»ی هەر نۆ ئەندامە سەرەکییەکەی مرۆڤ: مێشک، دەم، چاو، گوێ، دڵ، دەست، گەدە، دامێن و قاچ لە خراپە و شتە پیس و زیانبەخشەکان و ئەخلاقە نابووت و دزێوەکان.

«گەشەپێدانیان» بە ڕاهێنانی مێشک، دەم، چاو، گوێ، دڵ، دەست، گەدە، دامێن و قاچ لەسەر چاکە و شتە پاک و بەسوودەکان و ئەخلاقەبەرز و جوانەکان.

بەپرۆسەی تەزکییە هەم مرۆڤ پاک دەبێتەوە و هەم بەرەکەتیش دەکەوێتە ژیانی و گەشە دەسێنێت.

کەواتە دەتوانین بڵێین تەزکییە دوو شتە:

١. خۆ دارنین و خۆ خاڵی کردن (التخلية): واتە خۆ دارنین لە هەموو سیفەتە ناشیرین و خراپەکان و ئەخلاقە نابووت و دزێوەکان لە ناوەوە و لە دەرەوە، هەم دڵ و دەروون و مێشک هەم ئەندامە دیارەکانی تر.

٢. خۆ ڕازاندنەوە (التحلية): واتە خۆ ڕازاندوە بە هەموو سیفەتە جوان و باشەکان و ئەخلاقە بەرز و جوانەکان لە ناوەوە و لە دەرەوە، هەم دڵ و دەروون و بیر و عەقڵ، هەم ئەندامە دیارەکانی تر.

## میکانیزم و ڕێگاکانی تەزکییەی نەفس:

١. لێپێچینەوە و لێپرسینەوە (المحاسبة): واتە بەردەوام لێپێچینەوەی نەفسی خۆت بکەی هەم لەسەر گوناهـ و تاوان و ئەخلاق و سیفەتی نابووت و دزێو، هەم لەسەر کەمتەرخەمی لە خۆ ڕازاندنەوە بە ئەخلاقی بەرز و جوان و عیبادەت و پەرستشدا.

٢. گوێ پێنەدان و نەچوونە ژێربار (المخالفة): واتە هەرکاتێک نەفس فەرمانی پێ کردی بە شتێکی خراپ، بە گوێی نەکەیی و نەچیە ژێرباری.

٣. مەرج دانان (المشارطة): واتە مەرج لەسەر خۆت دانێی شتە باشەکان بکەی و خۆت بەدووربگری لە شتە خراپ و دزێوەکان.

٤. چاودێری کردن (المراقبة): واتە چاودێری خۆت بکەی و بزانی تاچەند ئەوشتانە جێبەجێ دەکەی، تاچەند فەرمانەکانی خوا جێبەجێ دەکەیی و خۆت بەدوور دەگری لە شتە خراپ و دزێوەکان.

## ئازادی و جیاوازی و ویست (ئیرادە) لە فکری ئیسلامیدا

جەبرگەرایی ڕیشە میژوویی و فەلسەفییەکەی زۆر کۆنە، لەناو موسڵمانانیشدا بوونی هەبووە، ناویان «جەبرییەکان، جەبرگەراکان» بووە، جەبرگەراکان ئەوانە بوون پێیان وابوو مرۆڤ مەخلوقێکی تەواو تەواو مەجبوور و زۆرلێکراو و قوڕمیشکراوە، پێیان وابوو مرۆڤ تەنیا ڕۆڵی جێبەجێکردن دەگێڕێت و هیچ ویست و ئیرادەیەکی نییە! پێیان وابوو ئیرادە و ویست و توانا تەنیا و تەنیا هی خودایە و بەس! شتێک نییە بە ناوی ویست و ئازادی و ئیرادەی مرۆڤ!

## جیاوازی ئایینی و سیاسی و فکری

ڕەوایی ئەم جیاوازیانە و هەبوونیان لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامی و موسڵماناندا، بە دڵنیاییەوە هەبوونیان ڕەوایە و نابێت ڕێگرییان لێبکرێت چونکە:

١. خوا و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) مۆڵەتیان داوە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ [الكهف: ٢٩]، واتە: «جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافر و بێباوەڕ بێت.» کەواتە خودای گەورە ڕێی داوە و سەرپشکی کردوون، هەروەها پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێت.) ڕێی داون و لەگەڵیاندا ژیاوە و پەیمان و بەڵێنیشی لەگەڵدا بەستوون.

٢. ئەگەر ڕێگا بە جیاوازیی ئایینی و فکری نەدرێت، هیچ واتایەک بۆ تاقیکردنەوەی خوایی نامێنێت و ئەوکات خەڵکێکی دووڕوو و مونافیق پەیدا دەبێت، کە دیارە دووڕوو زۆر مەترسیدارترە لە بێباوەڕ و نابێت هەرگیز ببینە هۆکارێک بۆ سەرهەڵدانی ئەم جۆرە کەسانە، بەڵکوو ئازادیان بکەین.

٣. زۆرلێکردن لە ئاییندا بەهیچ شێوەیەک دروست نییە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ [الكهف: ٢٩] واتە: «جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافر و بێباوەڕ بێت. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ [البقرة: ٢٥٦] واتە: «بەهیچ جۆرێک زۆرکردن نییە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا (دینداری بەزۆر نابێت بکرێت و دین بە زۆر نادرێت بەسەر کەسدا.)»

٤. لەبەرانبەر ئازادی و جیاوازی قبووڵکردندا ستەم و زۆرداری و زۆرەملێ هەیە، کە دیارە ئەمەش دووبارە دوورە لە ڕۆحی ئیسلام.

٥. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) و هاوەڵان و مێژوو و کۆمەڵگەی پێغەمبەر و کۆمەڵگەی موسڵمانان، ئەوا فرەیی و ئازادی و جیاوازی ئایینی و فکری دەبینین و ئەم جیاوازیانە هەرگیز ڕێیان لێ

نەگیراوە.

٦. ئەگەر بڕوانینە خودی گەردوونیش کە دروستکراوی خودایە، دووبارە جیاوازی و فرەیی دەبینین و لە هەموو شوێنێکی ئەم گەردووونەدا بەرجەستە بووە، کەواتە ڕێگری کردن لە فرەیی و جیاوازی ڕاوەستانە لە دژی فیترەتی خۆت و بوون و گەردوون.

## ئازادی ڕادەربڕین لە مێژووی ئیسلامیدا(١)

ئازادی ڕادەربڕین بانگەشەیەکی زەقی زۆربەی ڕەوت و فکرە نوێکانی ئەمڕۆیە کە بەو بانگەشەیە بەرانبەریان دەکەنە تاوانبار و خۆیان دەکەنە مافدەر بە جۆرێک زۆرجار بە بیانووی کۆتبوونی بیروڕاوە سنوورە گشتی و ڕەواکانی ئازادی ڕادەربرینیش تێدەپەڕێنرێن، ئەمڕۆش زۆرینەیەک بە زمانی بڕەر و گوێی کەڕکردوو و چاوی داخراوەوە کەوتوونەتەوە وێزەی کەمفامان یان دەروون بەزیوانی موسڵمان و جگە لە موسڵمانانیش تا داخی ناو دڵیان بەرانبەر ئیسلام و موسڵمانان برێژن، بۆیە هەوڵماندا کورتە باسێک لەسەر ئازادی ڕادەربڕن لە مێژووی ئیسلامیدا بخەینەروو.

ڕێبازی پێغەمبەرانی پێش موحەمەد (دروودی خوای لەسەر بێت.) و مێژووی دوورودرێژیان لە ئیسلامدا بە پوختی و لە چەند وێستگەیەکی دیاردا خراوەتە ڕوو. لە سەردەمی پێغەمبەرانی پێشوودا بەرفراوانی بیروڕا هێندە بووە کە ئەمە پەیامی پێغەمبەران بووە (ئێوە کاری خۆتان بکەن، ئێمەش کاری خۆمان دەکەین (فَاعْمَلُوا إِنَّا عَامِلُوْنَ) بۆ ئەو ئازادی ڕادەربڕینە و دەروازە بەرفراوانەش دەرگای پەیامی خوایی وا کراوە بووە تا بە بەرانبەر بڵێن ﴿تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ

---

(١) نهاد جلال حبيب الله

وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ اللهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ﴾[1] بەرانبەر بەمەش دوژمنان و نەیارانی پەیامی خوایی هەمیشە بۆ بێدەنگکردنی ئەو زمانانەی بە دڵی ئەوان نادوێن شمشێر و پەتی سێدارەیان بەکارهێناوە، بۆیە کاتێک زەکەریا و یەحیا (علیهما السلام) بە دڵی ئەوان نەدوان، شمشێر هاتە ئارا. کاتێک ئیبراهیم شتێکی وت جیا لە وتەی ئەوان، ئاگری بۆ تاودرا. کاتێک عیسا (علیه السلام) بیرێکی نوێی خستە ڕوو با تەنانەت ئەوپەڕی ئاسانکاریش بێت ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾[2] ئەو کات خاچی بۆ سازدرا. بەڵام ئەمە هەڵوێستی پێغەمبەران نەبوو کاتێک ڕای جیاوازیان دەدەی، ئەوەتا کاتێک مووسا (علیه السلام) پەیامی ڕاستی خوا دەگەیەنێت و خوا سەریدەخات پاش چوونی چل ڕۆژەی کە هاتەوە هەرچەندە بینی سامری سەری لە خەڵک شێواندبوو بەڵام شمشێری بۆ بەرز نەکردەوە و ئاگری بۆ تاو نەدا و خاچی بۆ ساز نەدا، بەڵکوو ڕاو بڕیاری خۆی لەسەر نیشاندا، ئەمە لە کاتێکدا پێشتر مووسا (علیه السلام) کاتێک ڕای جیاوازی لەبەردەم فیرعەوندا دەربڕی فیرعەون هەوڵیدا بە بەڵگە بێدەنگی بکات و سەربکەوێت، کەچی کاتێک زانی حەق لای مووسایە (علیه السلام) خێرا هەڵمەتی بردە بەر هەڵواسین و سووتاندن و بڕین بەبێ ئەوەی تەنانەت چەکێکی لە ڕوودا هەڵگیرا بێت.

بە کورتی، پەیڕەوی ناو مێژووی پێغەمبەران لە ئازادی ڕادەربڕیندا لەم ڕێبازەدا خۆی دیوەتەوە (ئێوە هەنگاوی خۆتان بنێن ئێمەش هەنگاوی خۆمان دەنێین)، چونکە هەرکەس ترسی نەبێت لە کەموکورتی پەیام و بیروڕای خۆی باکی نییە لە بوونی ڕای جیاواز بە مەرجێک سنووری ڕەوای ئازادی ڕادەربڕین نەشکێنێت، واتە هێڵە بنەڕەتییەکان تێنەپەڕێنرێن، هەر بۆیە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللهِ فَيَسُبُّوا اللهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ

---

(١) آل عمران: ٦١.

(٢) آل عمران: ٥٠.

كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[1] واتە: (ئەی ئیمانداران) نەکەن جوێن بدەن بەو بت و شتانەی کە (نەفامان) هاواری لێدەکەن و دەیپەرستن بێجگە لەخوا، نەوەکو ئەوانیش بەناحەق و بەنەفامی جوێن بدەن بەخوا، (چونکە ئەوانە) نایناسن و قەدری نازانن.

واتە: سنووری بنەڕەتی ڕای جیاواز با هەڵەی تەواویش بێت، نابێت لە مشتومڕی ڕەوا دەربچێت، ئەگەر نا دەبێت قبووڵی هەڵەی بەرانبەر بکرێت. هەر بۆیە ئازادی ڕادەربڕینی پەیامی خوایی ڕێی نەداوە قسە بوترێ بە بتەکانی بتپەرستان بەڵکوو تەنیا بەڵگەخوازی نەقڵی و عەقڵی لەپێش بووە، ئەمە سەبارەت بە مێژووی پێغەمبەران و پەیامە ئاسمانییەکانی پێش ئیسلام.

سەبارەت بە مێژووی ئیسلامی، ئەوا لە چەند بوارێکەوە باسی ئازادی ڕادەربڕین دەکەین، لەوانەیە ئەم باسکردنە جیاوازبێت لە باسکردنەکانی دیکە، چونکە ئازادی ڕادەربڕن کورت ناکەینەوە لە وتە و نووسینی مەزهەب و ئایین و ڕەوتە جیاجیا فرەلایەنەکانی ناو مێژووی ئیسلامی، بەڵکوو ڕادەربڕینی کرداریش دێنینە ناو باسەوە. بۆنموونە کاتێک کۆمەڵێک جوولەکە ساختەی بەڵگەنامەیی لای ئیبن تەیمییە دەکەن و ئەویش بە بەڵگەوە ساختەکەیان ئاشکرا دەکات و بەرانبەر بەمەش هیچ سزایەک نادرێن، ئەمە لە وتەدا شتێکی وا بەدی ناکەین، بەڵام لە کرداردا ئەو ئازادیە ڕادەربڕینە بەدی دەکەین کە لە ناو دەوڵەتێکدا کە بیری تۆ ڕکەبەر و نەیارە هەوڵ بدەیت ساختەی یاسایی و بەڵگەنامەیی لە بەرانبەردا بگریتە بەر و ترست نەبێت دەم و دەس و بیرکۆت بکرێیت.

ئەو مەیدان و بوارانەی سەبارەت بە ئازادی ڕادەربڕین لە مێژووی ئیسلامیدا دەیانخەینە ڕوو بریتین لەمانە:

**یەکەم:** ئازادی ڕادەربڕینی ئایینی

---

(١) الأنعام ١٠٨

دووەم: ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی

سێیەم: ئازادی ڕادەربڕینی فکری (نووسین و لایەنە ڕاگەیاندنییەکانی)

*یەکەم: ئازادی ڕادەربڕینی ئایینی: بەگشتی سرووشتی ئایینە ئاسمانییەکان و دانراوە مرۆییەکانیش وابووە کە هەرکامیان هاتووە هەوڵی گۆڕان و گۆڕینی داوە لە پەیامی پێشوودا. ئیدی ئەوانەی ئاسمانی بوون، بە دوو شێوە گۆڕانیان دەکرد لە پەیامی پێشوودا.

١-گۆڕین بە پێی بڕیاری خوایی وەک عیسا (علیه السلام) بە فەرمانی خوا هەوڵ دەدات گۆڕین بکات لە پەیامی مووسادا (علیه السلام)، بەو جۆرەی خوا بۆی دیاریکردووە ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾[1] ئەم گۆڕانانەش تەواوکەر بوون بۆ پەیامی پێشوویان نەک تێکشێنەر و لەناوبەر وەک لە فەرمایشتی سەحیحی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت.) هاتووە و کاری پێغەمبەران دەشوبهێنێت بە بینایەک کە دروستیانکردووە و خشتێکی سووچێکی ماوە و ئەوەش کاری پێغەمبەرانە (علیهم السلام).

٢-ئەو گۆڕانکاریەی کە پەیڕەوکەرانێک یان شوێنکەوتوانێک یان دوژمنانێکی پەیامی ئەوکات یان پەیامی پێشوو ئەنجامیان داوە و پاڵنەرەکەش کەمفامی یان ڕق و کینە یان نەزانی بووە کە دواجار بوونەتەوە مایەی سەرلێشێوانی خەڵکی، خواش لەبارەیانەوە دەفەرمووێت: ﴿یحرفون الكلم عن مواضعه﴾. خەڵکی حیجازیش (قوڕەیش بەتایبەت) لەو نێوەندەدا پەیامی پاکی حەنیفیان شێواندبوو. کاتێکیش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) هات لە دژی وەستان و هەوڵیاندا پەیامەکەی سەرکوت بکەن، بەمجۆرە سەرەتای توندڕەوی دژ بە ئازادی ڕادەربرین بەرانبەر پەیامی ئیسلامی دەرکەوت، بۆ ئەمەش ئەم هەنگاوانەیان گرتنەبەر:

---

(١) آل عمران: ٥٠.

١- سووکایەتیکردن بە ئایینی ئیسلام و شوێنکەوتووان و ڕێبەرەکەشی.

٢- چەوساندنەوەی شوێنکەوتووان.

٣- ڕێگرتن لە بانگەواز کردن بۆ ئیسلام.

٤- گەمارۆدانی ئابووری و شەهید کردنی ئەندامەکانی.

٥- دەرکردنی کەسەکان و هەوڵی شەهیدکردنی پێغەمبەرەکەی.

٦- هەڵمەتی سەربازی و پیلانی هاوپەیمانی دژ بە ئیسلام.

بەرانبەر بەمە بانگەوازی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت.) بۆ شتانێ بوو کە پەیامە ئاسمانییەکانی پێشوو داوایان دەکرد، هەروەها پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت.) بە چاوی سۆز و دڵ بۆسووتان سەریری دەکردن و نەک توندی لە دژ بەکارنەهێنان بەڵکوو هێندە نەرمی نواند و هەوڵی ڕێنموونی بۆ نیشاندەدان کە لە چەند قوناغێکدا ئاگاداریکردنەوە، ئەمەش سەرەتای پەیامی ئیسلام بوو بۆ ئایینەکانی دی.

﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾[1]. واتە: (ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) بڵێ: ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانەکراوە وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەیەکەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لە نێوان ئێمەش و ئێوەشدا (ئەویش ئەمەیە): جگە لە (الله) کەسی تر نەپەرستین، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین، هیچ لایەکمان لاکەی ترمان (بەپیرۆز و فەرمانڕەوا دانەنێین) لەجیاتی ئەو زاتە و نەیپەرستین (خۆ ئەگەر لەم بانگەوازدا) سەرپێچیان کردو گوێیان پێنەدا، ئەوە پێیان بڵێ: کە ئێوە بەشایەت بن کە ئێمە موسڵمانین و ملکەچی فەرمانی پەروەردگارین. ئەگەریش

---

(١) آل عمران ٦٤

ئەمەیان نەویست داوای گفتوگۆ مشتومڕی نێوان هەر دوو لای دەکرد.

﴿فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ اللهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ﴾[١].

واتە: (دوای ئەوەی کە هەموو ئەو ڕاستیانەت پێگەیشت دەربارەی عیسا)، جا ئەگەر کەسانێک هەر موجادەلەیان کردوو لەسەری ڕۆیشتن و شتی نارەوایان دەربارەی عیسا وت، تۆیش پێیان بڵێ: وەرن با کوڕانی ئێمە و کوڕانی ئێوە، ئافرەتانی ئێمە و ئافرەتانی ئێوە، خۆمان و خۆشتان بانگ بکەین و ئامادەبین (لە شوێنێکی تایبەتدا)، پاشان لە خوا بپاڕێنەوە و ئینجا داوا بکەین نەفرین و لەعنەتی خوا داببارێتە سەر درۆزنەکانکە دەوڵەتی ئیسلامیش دامەزرا پەیامی یەکلایی خۆی دەربڕی.

﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾[٢]. واتە: بەهیچ جۆرێک زۆر کردن نییە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا (دینداری بەزۆر نابێت بکرێت و دین بەزۆر نادرێت بەسەر کەسدا).

بەڵکوو جگە لە ئازادی تاکە کەسی بیروڕا ئازادی بە کۆمەڵیشی پێدان وەک لە دەستووری مەدینەدا ئەوە بەدیدەکەین لە چەند بەندێکی دەستوورەکەدا هاتووە کە جوولەکەکان دەستووری خۆیانیان بۆ کێشەکانی خۆیان هەیە و ئایینی خۆیان بۆ خۆیانە و مافی پەرستش و بیروباوەڕ و چارەسەری کێشە ناوخۆییەکانیان هەیە، بەشداری سیاسی و ئابووری و هتد... یان بۆ هەبوو و مافی تەواوی هاوڵاتیبوونیان لە دەوڵەتی مەدینەدا هەبووە وەک موسڵمانان. تا دواجار کەوتنە پیلانگێڕان دژ بە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت.) و دەوڵەتی ئیسلامی و لەو یاسایە لایاندا کە خۆیان بڕیاریان لەسەری هەبوو،

---

(١) آل عمران ٦١

(٢) البقرة: ٢٥٦.

ئەویش پاراستنی بەرژەوەندی گشتی دەوڵەت بوو، بۆیە دوای ئەو ناپاکییە بە پێی قۆناغ و ئاستی ناپاکییەکەیان دەستە دەستە سزای خۆیان وەرگرت.

واتە ئیسلام ئەو پەڕی ئازادی دەبەخشێت تا ناپاکی بێتە مەیدان، ئەو کات بەپێی ناپاکییەکە دەرکردن و پێ چۆڵ کردن و کوشتن سزای ناپاکان دەبوو تا سنوورە گشتییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی پێ پەشێو نەبن، هەروەک لە هەموو دەوڵەت و یاسایەکی هەر پارچەیەکی جیهاندا لە هەر ماوەیەکی مێژووییدا سزای توند بۆ ناپاکان بە دەسەڵات هەبووە، وەسیەتەکانی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێت.) سەبارەت بە نەبەزاندنی سنوورە ڕێپێدراوەکانی ئازادی ڕادەربرین بنەمایەک بوو بۆ فکرو دەستووری ئیسلامی دواتری ناودەوڵەت و کۆمەڵگە ئیسلامیەکان. بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) نەیهێشت لەسەر بنەمای ئازادی ڕادەربڕین چاڵە ئاگرینەکان و قامچییەکانی ستەم وەک خۆیان بن، بۆنموونە بتەکانی ناو دەوڵەتی ئیسلامی لەناوبردن و لەگەڵ لێبوردنی بۆ هەموو ستەمکارەکان بەڵام نەیهێشت لەسەر سیستمی ستەمکاری خۆیان بڕۆن. بەڵام لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا بنەمای گشتی پەیڕەوی ئایینی بریتی بووە لە (فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر).

لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدینیشدا ئازادی ڕادەربڕین لە چوارچێوەی دەستووری ئیسلامیدا بەردەوام بوو، ئەوە بوو باری ناوخۆ هەمان ئازادی ئایینی هەبوو، کاتێکیش بزووتنەوەی فتوحات ئەنجامدرا لەسەر ئەو بنەمایە بوو: بانگەواز بۆ ئیسلام، ئەگەر نەیانویست، پێدانی سەرانە لەبری پاراستنیان لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامیەوە. ئەگەرنا و بەوانە ڕازی نەبوون و گرفتیان لەبەردەم بانگەواز بۆ ئیسلامدا هەبووایە، ئەو کات هێزی چەکداری بەکاردەهات. بەڵام ڕێگری ئایینی بوونی نەبوو، تەنانەت هێماکانی ئایینەکان ماونەتەوە، بەڵکوو هەوڵیانداوە گومانەکانی بەردەم ئازادی ئایینیش نەهێڵن، وەک ئیمامی عومەر کاتێک چوویە قودس لە کڵێسای مەسیحیدا نوێژی نەکرد نەک موسڵمانان

ئەوە بکەنە بیانوو تا سنووری ئازادییان ببەزێنن و ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەوێ بکەنە مزگەوت. لەو بەڵێننامەشیدا کە بۆی نووسین تیایدا هاتبوو (الأمان علی حیاتهم و کنائسهم وصلبانهم لا یضار أحد منهم ولا یرغم بسبب دینه)، یان ئەو مەجوسیانەی هێنرانە مەدینە ئایینی خۆیان واز لێ نەهێنا و ناچاریش نەکران بە موسڵمانبوون. هێماکانی گۆڕستان و پەیکەری خواوەندەکانی زەردەشت و پەرستگاکانیان و خاچەکانی مەسیح مانەوە و لەوپەڕی ئاستی ئازادی ئایینیاندا بوون.

لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەویدا لەسەرەتادا کە ئیمامی موعاویە ڕێبەری دەوڵەت بوو، ئەو ئازادیە وەک خۆی مایەوە، بەڵام بەرەبەرە سنوورەکە لە چەند لایەنێکەوە بەرتەسککرایەوە تا ئەوەی سەرانەیان دادەنا لەسەر ئەو کەسانەی سەرانەیان لەسەر بوو و دواتر موسڵمان ببوون هەر سەرانەیان لەسەر لانەدەبرا، چونکە ئەوەیان بە فێڵ دەزانی بەرانبەر بە دەوڵەتی ئیسلامی، بەڵام زوو بە زوو خەلیفەی ناوداری ئومەوی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بارەکەی گێڕایەوە بۆ ڕێڕەوی خۆی و ئازادییە لێسەندراوەکانی دانەوە بە خەڵک، لەگەڵ ئەوانەشدا ئازادییە ئایینەکان لە سەردەمی ئومەویدا بەرفراوان بوون و مانەوەی پەیکەرە ئایینییەکان و جیاوازییە ئایینییەکان هەبوون. هاوکات موعتەزیلە لەسەر دەستی واصلی کوڕی عەتا دروستکرا کە خوێندکاری حەسەنی بەسری بوو و دواتر ڕەوتی موعتەزیلی گرتەبەر، لە هەمان مزگەوت و لە پاڵ بازنەکەی حەسەنی بەسریدا وانەی خۆی دەوتەوە و ئەو ڕەوتەش ڕێی لێ نەگیرا تا دواجار لە سەردەمی مەئموونی عەبباسیدا گەیشتە لووتکەی دەسەڵات (لە دەوڵەتی عەبباسیدا).

لە دەوڵەتی ئومەویدا ئازادی ئایینی ناموسڵمانان دەروازە و سنووری بەرفراوان بووە تا ئەو ئاستەی دەگەیشتە مەیدانە سیاسیە چەکدارییەکەی، ئەوکات چەک بەرانبەر بە چەک هەڵدەگیرا، لە هیچ دەسەڵاتێکی کۆن و نوێ و هاوچەرخیشدا

ڕێگا نەدراوە بە بەرهەڵستکاری چەکداری، بۆیە کاتێک ئازادی ئایینی دەقۆزرایەوە بۆ هەڵوێستی دژایەتی چەکداری، ئەوکات دەسەڵاتی ئومەوی بەرانبەر بەوە چەک و هێزی بەکاردەهێنا وەک ئەو چەند بەرهەڵستکارییە چەکدارییەی لەو ماوەیەدا ڕوویاندا کە هەندێکیان بۆ چاکسازی بوون وەک ڕاپەرینی ئیمامی حوسەین، هەندێکیشیان ناپەسەند بوون وەک مەعبەدی جوهەنی و شۆڕشە شیعییەکان.

سەبارەت بە سەردەمی عەباسیی، ئەوا لە دوو لایەنەوە باسی ئازادی ئایینی دەکرێت:

١-ئازادییە ئایینییەکانی جگە لە ئیسلام: لێرەدا فراوانترین ماوەی ئازادی ئایینی بەدیدەکرێت بە جۆرێک ئەهلی کیتاب دەستیان دەکرد بە نووسین و بڵاوکردنەوەی ئایینی خۆیان و پەرستگاکانیان کراوە و ڕازاوە بوون و کەسایەتییەکان بەشداری فرەلایەنەیان هەبوو، تەنانەت کەسانی مەسیحی دەگەیشتنە پلەی وەزیری و کەسانی جوولەکە نووسەری نزیکی کۆشک بوون، کەسانی مەجووسی لە تاو ڕێ لێ نەگیرانیان هێندە دەرفەتیان هەبوو تا کەوتنە کۆبوونەوە و پەیڕەوی بزاڤی چەکداری وەک بابەکی خوڕەمی و چەندێکی دی، مەسیحی و جوولەکەکان لە بازاڕدا دیار و کارابوون و جەژن و پەیڕەوە ئایینەکانیان زۆر سەربەستانە بوون، بەڵکوو لەناو مێژووی عەبباسیدا نابینرێت لێدانێک هەبووبێت بەرانبەر مەسیحی و جوولەکەکان، تەنانەت ئەو جوولەکانەی لەلایەن خاچپەرستانی ڕۆژئاواوە دەردەکران، لەلایەن موسڵمانانەوە ئامێزیان بۆ کرایەوە. ئەگەریش لێرەدا نموونە بێنینەوە پێویستمان بە نووسینێکی سەربەخۆ دەبێت، چونکە ناموسڵمانەکان بە ڕاشکاوانە ئەم شایەتییە دەدەن.

٢-ئازادییە مەزهەبییەکانی ناو ئیسلام: لێرەشدا هەمان یاسای پێشوو پەیڕەو دەکرا، ئازادی تەواوی مەزهەبی هەبوو تا کاتێک چەک و هێزی بەرهەڵستکاری

چەکداری نەبووایە، بەڵام لە چەند وێستگەیەکی دیاریکراودا ژمارەیەک لادان و سنووربەزێنی دەبینین، بەڵام ماوە ئازادییەکە، ماوە لادانەکەی تەواو داپۆشیبوو، بۆنموونە مەزهەب و ڕەوتەکان لەم ماوەیەدا دەرکەوتن، ئەوانەی بە بیری یۆنان کاریگەر بوون، ئەو بیرەیان دەهێنا و بانگەوازیان بۆ دەکرد. وەڵامدەرەوەکانیشیان هەمان دەرفەتیان هەبوو، بۆنموونە لە مینبەری مزگەوتدا و بە ئامادەیی ژمارەی بەرچاوی خەڵک ڕێبەری موعتەزیلە لەگەڵ ئیمامی ئەشعەریدا مشتومڕ دەکەن کەسیشیان ڕێگرییان لێ نەکراوە، یان شیعەکان نووسینەکانیان بڵاوکردوونەتەوە و تەنانەت وەزیریان هەبووە، بەڵکوو ئەمە گوتاری دەسەڵاتی ئیسلامی بوو «خەڵکینە پەیامی خۆتان بخەنە ڕوو و ئەو پەیامەش بێنن کە پێی کاریگەرن. زانایانی ئیسلامی، ئێوەش لە سەرچاوەی نەبڕاوە و کامڵی قورئان و سوننەتەوە وەڵامیان بدەنەوە.»

لە سەردەمی عوسمانیدا مەیدانەکە هێندە فراوانکرا کە هەندێک جار سنووری ڕێنمایی ئیسلامی دەبەزاند، بەڵکوو کار گەیشتە ئەوەی مەسیحی و جوولەکەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەستە و تاقم دروست بکەن و دەرفەتی ئازادی ئایینی بقۆزنەوە و بکەونە پیلانگێڕان دژ بە دەوڵەتی عوسمانی. مەزهەبەکانیش -بەدەر لە شیعە- هەمان ئازادییان هەبوو، بەڵام دواجار پیلانی نیازخراپی مەسیحییە ئەرمەنەکان و جوولەکەکانی ناو دەوڵەت و گەندەڵی فرەلایەنی تووشبوو بە دەوڵەتی عوسمانی دەستی داگیرکەریان هێنا تا خاکی موسڵمانان بگرن و ئەمجار ئەوان ڕێ بگرن لە ئازادی موسڵمانان لە خاکی خۆیاندا و دەسەڵاتی ئەڵقە لەگوێی بیرسەپێنی دیکتاتۆر بکەنە گەورەی موسڵمانان.

بەرانبەر بەم ئازادییە ئایینەی جیهانی ئیسلامی با نموونەیەکی کورتی ئازادی ئایینی لە جیهانی ڕۆژئاوای خاچپەرستی ئەو کاتەدا وەربگرین کە بەرانبەر بە جوولەکەکان چییان دەکرد.

جوولەکەکان لە ئیسسپانیای مەسیحی شاریان دامەزراندبوو و بوونیان هەبوو و خۆیان جیا گرتبوو وەک لە شارەکانی ئەلیسان و ئەلبیرا و قورتوبە و ئیشبیلیە و مەلقا و هتد، بەڵام لە ساڵی ٣٠٣ زایینییەوە (پێش هاتنی ئیسلام) مەسیحییەکان کەوتنە سووکایەتی کردن بە جوولەکە تا خۆراک و ماڵ و تێکەڵی دوور بگرن لە جوولەکە، دواتر لە ساڵی ٥٨٩ز پاشا ڕیکاردۆ بڕیاریدا هەر کۆیلەیەکی مەسیحی لای جوولەکە بێت بەبێ پرس و بێ بەرانبەر ئازاد بکرێت، کەچی لەو کاتەدا لە مەدینە سەلمانی فارسی کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت.) پێی دەفەرموو: (سلمان منا أهل البيت) کۆیلەی جوولەکەیەک بوو، کاتێ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت.) ویستی ئازادی بکات کابرای جوولەکە داوای شتێکی خەیاڵی کرد، بەڵام پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت.) ئەو لاسارییەی کابرای جوولەکەی نەکرد بە هۆکاری بەزاندنی سنووری ئازادی جوولەکە و سەلمان بە کۆیلەیی مایەوە تا داواکەی کابرای جوولەکە جێبەجێ کرا.

دواتر لە سەردەمی پاشا سبوتی مەسیحیدا بڕیاردرا جوولەکەکان یان دەبێت ببن بە مەسیحی یان دەبێ وڵات بەجێ بهێڵن، ناچار هەندێکیان بە ڕووکەش بوونە مەسیحی و هەندێکی دیکەش وڵاتیان بەجێهێشت، کەچی مەسیحییەت وازی لێنەهێنان و وتی دەبێت سەرلەنوێ تەعمید بکرێن و گۆشتی بەراز بخۆن تا دڵنیا بن لە بوونیان بە مەسیحی، پەیڕەوی ئایینی جوولەکە بە ڕەسمی قەدەغە کرابوو. ئەو جوولەکانەش بە جوولەکەیی مابوونەوە سامانیان دەستی بەسەردا گیرا، کەچی لە جیهانی ئیسلامیدا بازاڕی سەربەخۆیان هەبوو.

لە سەردەمی ئیرفیحدا بڕیاردرا جوولەکە ببنە مەسیحی یان نەک تەنیا سامانیان دەبردرێ بەڵکوو دەبێت لە ماوەی ساڵێکدا وڵات بەجێبهێڵن. لە سەردەمی ئەخیکادا بڕیاردرا هەرچی جوولەکە هەیە بە کۆیلە بگیرێ و منداڵەکانیان جیابکرێنەوە و بکرێن بە مەسیحی، لە ناوچەکانی سەرویشدا

کاتێک هەڵمەتی خاچی هات بۆ جیهانی ئیسلامی داخی دڵی خۆی ڕشت بە جوولەکە، جوولەکەکان کە ڕایاندەکرد دەچوون بۆ ناو خاکی ئیسلامی لە ئەندەلووس، بەڵام کە مەسیحییەکان ئەندەلووسیان گرت کەوتنەوە وێزەی جوولەکە و چوار هەزار جوولەکەیان لەیەک کاتدا کوشتن. ئەو جوولەکانەش بە ناچاری دەبوون بە مەسیحی و بە (مارانوس و لەعنەت لێکراو یان ناپاک یان دووڕوو) ناو دەبران، بەڵام دواتر لە ساڵی ١٤٨٣ز دادگاکانی پشکنینی مەسیحی جوولەکەکانیان بەوانیشەوە کوشت کە ببوون بە مەسیحی، لە ساڵی ١٤٩٣ز بە تەواوی لە ئیسپانیا دەرکران بۆ پورتوگال و لەوێوە پاش دوو ساڵ دەرکران و خوار چواردە ساڵەکانیان هێشتنەوە تا بکرێن بە مەسیحی.

لە بەشی سەرەوەی ئەورووپاش لە ساڵی ١٢٦٢ز تەنیا لە لەندەن پێنج هەزار جوولەکە کوژران، لە ١٢٧٩ز ڕەشەکوژییەکی دیکەیان ئەنجامدا، لەساڵی ١٢٩٠ز لەسەر دەستی ئیدواردی یەکەم لە ئینگلتەرا دەرکران، دواتر لە وڵاتی دیکەی ئەورووپا دەرکران، بەڵکوو ئەو جارەیان تا سەدەی بیستەمیش بەردەوام بوو. بەرانبەر بەمە جوولەکە لە وڵاتی ئیسلامیدا سەربەستی زۆری هەبوو، تەنیا شتێک لەسەری بوو پێدانی سەرانە بوو کە بڕەکەی لەگەڵ بڕی زەکاتی موسڵماناندا یەکسان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا خزمەتی سەربازی لەسەر نەدەما، بەرانبەر بەوە چەند مەرجێک بۆ جوولەکە دانرابوون وەک ڕێزگرتنی ئیسلام و بە سووک ناونەبردنی، دەست نەبردن بۆ ئابڕووی موسڵمان، هاوسەرگیری نەکردن لەگەڵ کچ و ژنی موسڵماندا، بەشدارینەکردن لە ئاژاوەنانەوەدا، لانەدانی موسڵمانان بە ڕەسمی لە ئایینی ئیسلام، ئەو ڕەخنانەش کە دەدرێنە پاڵ مێژووی ئیسلامی بەوەی سووکایەتی بە ئەهلی زیممە کراوە بەوەی جلی تایبەت بپۆشن و چەکیان پێ نەبێت و... هتد ئەمانە لای کەسانێک بە سووکایەتی دادەنرێن بۆ ئەهلی زیممە، لای کەسانێکیش بە ئیجابی سەیرکراوە بەوەی تا جیا و دیار بن و موسڵمانان لەگەڵیان بەریەک نەکەون و بیانناسنەوە. لەبەر ئەوەش کە بەڵگەی

سەریحی لەسەر نییە، بۆیە لە مێژووی ئیسلامدا تەنیا لە چەند وێستگەیەکی کورت و دیاری کراودا پەیڕەو کراوە، چونکە ئەوان توانیویانە بنووسن و بانگەواز بۆ بیری خۆیان بکەن و دەربکەون و بچنە پۆستە گەورەکانەوە وەک یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کندی کە یەکێک بوو لە دیارترین فەیلەسووفە جوولەکەکانی ناو جیهانی ئیسلامی. بەڵکوو مێژوونووس ئارڵۆند پێی وایە بەهۆی تێکەڵی هاوسەرگیرییەوە نزیکی لە نێو موسڵمان و جوولەکەکاندا هەبووە و هەندێک جار جوولەکەکان لەتاو نەبوونی گلەییان لە موسڵمانان ناوی موسڵمانانیان لە خۆیان ناوە، کەسانی ئەدیبی وەک یەعقوبی کوڕی نەسنائیل و داودی کوڕی عیمرانی نەجید و نەسنائیلی ئیبراهیمی کوڕی حەلفون و سەمۆئیلی کوڕی عادیا و کەعبی کوڕی ئەشرەف دەرکەوتن، تەنانەت هەیانبووە ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ ناوی موسڵمانەکان وەک صەمۆئیل لاوی کوڕی یوسف کە ناوی خۆی گۆڕی بە ئیسماعیل، یان یەهودای کوڕی صەموئیل کە ناوی خۆی گۆڕی بە ئەبولحەسەن، بەڵکوو لە ئەندەلووس حکومەتی خۆیان هەبوو و دەوڵەتی ئیسلامی دەستی وەرنەدایە کاروباریان، بەڵکوو نازناوی سەرۆکی ئەکادیمیان لە میسری ئیسلامیدا پشکێکی جوولەکەکان بوو وەک «ڕوش یشیفت یەعقوب» واتە سەرۆکی ئەکادیمیای یەعقوب، مووسای کوڕی مەیموون پزیشکی تایبەتی نورەدین عەلی کوڕە گەورەی صەلاحەدینی ئەیووبی بوو. دەستەیەکی زۆری جوولەکەش لە سەردەمی صەلاحەدینی ئەیووبیدا پەنایان هێنا بۆ جیهانی ئیسلامی و صەلاحەدینیش پەنایدان. هەروەها صەلاحەدینیش کە قودسی ڕزگارکرد تەواوی مافی مەسیحییەکانی پاراست و نەیهێشت هیچ ستەمێکیان بەرانبەر بکرێت. ئیدی ئەگەر بمانەوێت نموونە لەسەر مێژووی ئیسلامی بهێنینەوە، دەبێ کات و پەڕەی تایبەتی بۆ تەرخان بکەین.

دووەم: ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی: لە مێژووی پێغەمبەراندا ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی مەودای خۆی هەبووە و لە بازنەی بەدەر لە بەرهەڵستکاری چەکداریدا

گوتاریان ئەوە بووە (ئیشی خۆتان بکەن، ئێمەش ئیشی خۆمان دەکەین) بە هاتنی پەیامی ئیسلامیش دامەزراندنی و چەسپاندنی دەوڵەتی ئیسلامی بەرنامەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) بوو، بەڵام وەک تەواوکەری پەیامی پێغەمبەرانی پێشوو جووڵایەوە و پلەی کەماڵی پەیامی خواییش لەو قۆناغەدا بوو، سەرچاوەی بیرو پەیڕەوی سیاسی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) لە دەوڵەتەکەیدا سرووشی خوایی بوو، لە دەوڵەتی ئیسلامی دواتریشدا قورئان و سوننەت سەرچاوە و ئیجماع و ئیجتهادیش لە مەیداندا بوون. واتە بە پشتبەستن بە دوو سەرچاوەی تەشریعی قورئان و سوننەت دەرگای ئیجتیهاد و ڕادەربڕینەکانی زانایان کراوە بوو، هەر ئەمەش جیاوازی ڕا و زۆری و قەڕەباڵغی پەرتووکخانەی فکری سیاسی ناو مێژووی ئیسلامی هێنایەکایەوە.

لە دەوڵەتی مەدینەدا ئازادی ڕادەربرینی سیاسی لە سێ لایەنەوە بوو:

١-ئازادی ناموسڵمانان: ئەمەش زیاتر جوولەکەکانی دەگرتەوە کە مافی بەشداری ڕا و بڕیاری ناو دەستورەکەی مەدینەیان بەڵگەی ئازادی سیاسییان بوو، تیایاندا مافی جۆرە سەربەخۆییەکی سیاسی و چارەسەری کێشەکان لای خۆیانیان هەبوو، هاوکات مافی بەشداری سیاسی ناو موسڵمانانیش هەبوو بۆنموونە بۆیان هەبوو ئەگەر ویستیان کێشەکانیان ببەنە لای سەرکردەی ئیسلامی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) بەڵام وەک موسڵمانانی دیکە لە چەند لایەنێکی بنەڕەتی سیاسیدا ملکەچ بوون وەک هەنگاونان بۆ پاراستنی دەوڵەت و دژایەتی نەکردنی و ڕێنەدان بە دەستدرێژی ناحەزان.

٢- ئازادی دووڕووەکان: ئەمانە کە لە ڕوخساردا خۆیان بە موسڵمان دەزانی و لە ناخدا دژیان بوون نیاز و کاریان لای سەرکردەی دەوڵەتی ئیسلامی ڕوون بوو، بەڵام ڕێیان لێ نەدەگیرا و دژایەتی و سووکایەتییان بەرەوڕوو نەدەکرایەوە. بەڵکوو لەبری لێدان وریابوون لە پیلانیان دەگیرایە بەر، بۆ وەڵامی هێرشە

ژێربەژێرەکانیشیان خوا قورئانی دانا. وەک چۆن بۆ هێرشی بێباوەڕان چەکی دانابوو، بۆ وەستان لە ڕووی دووڕووەکاندا قورئان بوو: (وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا)[1]. واتە: بەم قورئانە هەوڵ و کۆشش و خەباتێکی گەورەیان لەگەڵدا بکە.

٣-ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی موسڵمانان: ئەمەش خۆی دەبینییەوە لە ڕاوێژ و ڕاوەرگرتن وەک پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) لە جەنگی خەندەقدا ڕای سەربازی سەلمانی وەرگرت، لە بەدردا موسڵمانانی کۆکردەوەو ڕای وەرگرتن، کە ئایا جەنگ هەڵدەبژێرن یان دەگەڕێنەوە. لە ئوحوددا ڕای لەسەر ئەوە بوو لە مەدینە بمێننەوە، بەڵام کە دەستەیەکی موسڵمانان ڕایان وابوو بچنە دەرەوەی مەدینە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) ڕاکەی ئەوانی هەڵبژارد، یان ڕادەربڕینی ئەبووبەکری سدیق سەبارەت بە دیلەکانی بەدر، یان ڕاوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) لە مەسەلەکانی دیکەی مەدینەدا و ئازادی دەربڕینی ڕای تاکەکان و گوێگرتنی سەرکردە لێیان. هەموو ئەمانە بوونە بەڵگە و بنەڕەت بۆ ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی موسڵمانان.

لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدینیشدا سەرەتای ئازادی ڕادەربڕین لە پەیامی یەکەم خەلیفەدا دەرکەوت کە وتی: "ئەگەر ڕاست بووم، شوێنم کەون. ئەگەر هەڵە بووم، ڕاستم بکەنەوە". بەڵام لەبەردەم مەسەلەکانی پەیوەست بە لەناوبردنی دەوڵەتدا ڕێی نەدا و دژی هەڵگەڕاوەکان وەستا و سەرکەوت. ڕاوێژی بەردەوامیش لە سەردەمی عومەردا بەردەوام بوو، بە جۆرێک ناوی لەگەڵ وشەی دادپەروەریدا لێکئاڵاوبوو لەلایەن موسڵمان و ناموسڵمانەکانیشەوە. لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا هێندە ئازادی ڕادەربڕین هەبوو تا ئەوەی بێترسانە کەوتنە ساختەی بەڵگەنامە بە ناوی سەرکردەی وڵاتەوە، ئیمامی عوسمان هەوڵیدا بە گفتوگۆ لە گەڵیان ڕێ بکات، کە داوای گۆڕینی سەرکردەکانیان دەکردن. ئەویش یەک یەک دەیگۆڕین و بە گوێی دەکردن،

---

(١) الفرقان: ٥٢.

بەڵام دواجار ئەو ماوە فراوانییەی ئازادییەکە گەیشتە ئەوەی چەکیان لە دژ هەڵگرت و دواجاریش شەهیدیان کرد.

لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبو تالیبیشدا بارەکە گەیشتە ئەوەی خەواریجەکان جیاکارییان دەویست، ئیمامی عەلیش بۆ پاراستنی سنووری ئازادی ڕێپێدراو ئەو پێشنیارەی بۆ کردن: "سێ مافتان لەسەرمان دەبێت، ڕێتان لێ ناگرین لە مزگەوتەکانی خوادا یاد و پەرستشی خوای تێدا بکەن، دەستپێشخەری جەنگتان لەگەڵ ناکەین، تا دەستتان لە گەڵمان بێت لە داهاتی جەنگ (فەیئ) و زەوی بێبەشتان ناکەین". بەڵام خەواریجەکان سنووری جیاکاریشیان تێپەڕاند و چوونە قۆناغی جەنگەوە، بەوەی کاربەدەستی عەلییان لە نەهرەوان کوشت. ئیمامی عەلی کە داوای کرد ئەو کەسەی بدەنە دەست تا تۆڵەی لێ بکرێتەوە ئەوان وتیان بەس ئەو نەیکوشتووە و هەمووومان کوشتوومانە و ئەم کەسە نادەینە دەست، ئەوکات ئیمامی عەلی هێرشی بردە سەریان چونکە ئەوان ئەو بەڵێنەی نێوانیان شکاند و جەنگیان لە دژی ڕاگەیاند.

بەڵام لە سەردەمی ئومەویدا سنووری ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی تا ئاستێک کۆت کرا بە داخستنی دەرگای خیلافەت و کردنەوەی دەرگای میراتگری. بۆیە نەیاری ئومەوی لێی دەدرا، بەڵام سەرەتا هەنگاوی گفتوگۆ دەگیرایە بەر، ئەگەر ئەوە سوودی نەبووایە، ئینجا لێی دەدرا. واتە ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی تا ئەو سنوورە بوو کە باسی لابردنی بنەماڵەی ئومەوی نەکرێت.

لە سەردەمی عەبباسیدا هەمان داخران هەبوو، بەڵام جۆرێک ئازادی زیاتر بەخشرا بەوەی پلەی بنەماڵەیی کرا بە نیمچە هێما و دەسەڵاتە خۆجێییەکان هێنرانە مەیدان بە دامەزراندنی میرنشینەکان و بەشداری ڕەگەزە جیاجیاکانی فارس و تورک و عەرەب، تاکیش جگە لە پلەی خیلافەت بۆی هەبوو هەوڵی هەر پۆستێک بدات تەنانەت ئەمە کۆیلەکانیشی دەگرتەوە، بۆنموونە ئەحمەدی

کوڕی تۆڵۆن کە لە میسر دەوڵەتی دامەزراند سەرەتا کۆیلەیەک بوو کە موسڵمانان کڕییان و پەروەردەیان کرد و ڕایانهێنا، ئەویش لە ئاسۆی بەرفراوانی ئازادی سیاسی دەوڵەتی ئیسلامیدا پێشکەوت تا دواجار توانی ببێتە سەرکردە، پاشان چەندین نموونەی زانایان دەبینین کە بەتوندی ڕەخنەیان لە سەرکردە سیاسیەکانی دەوڵەتی ئیسلامی گرتووە، چونکە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا هەر سێ دەسەڵاتی خەلیفە و زانایان و جەماوەر جیابوون و پەیوەندی زۆریشیان پێکەوە هەبوو، مەزهەبەکانیش بەشداری سیاسییان هەبوو و پۆستی گەورەیان وەرگرت و بە ڕای سیاسی خۆیان کاریان دەکرد.

لە سەردەمی عوسمانیشدا میراتگری ستەمێک بوو کە مافێکی سیاسی خەڵکی دەبرد، بەڵام مافەکانی خوار ئەوە بۆ هەر تاکێک دەبوون، بۆنموونە شێخی گۆرانی پاڵنەر و کەسی کارای هەنگاونان بۆ فەتحی قوستەنتینییە بوو کە کەسایەتییەکی کورد بوو، چەندین کەسی مەسیحی ڕاوێژکاری سوڵتان و سەرکردەی سەربازی بوون. بەڵکوو زۆرجار ئازادییە سیاسییەکان دەگەیشتنە ئاستی پشتگوێخستن و بێسەروبەرییان لێدەکەوتەوە. بەرهەڵستکاریش لە دەوڵەتدا هەبوو، تەنیا ڕێگەنەدەدرا بە بەرهەڵستکاری سەربازی.

بە گشتی ئازادی سیاسی لە سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) و خەلیفە ڕاشدینەکاندا بەرفراوان بوو و لە سنووری پەیامی خواییدا بوو، بەڵام لە سەردەمی ئومەویەوە تا ڕووخانی عوسمانی پۆستی کەسی یەکەم کرا بە بنەماڵەیی و لەگەڵ ئەوەشدا پۆستەکانی دیکە کراوە بوون و چەند جار کۆیلە کڕاوەکان گەیشتوونەتە بەرزترین پلە سیاسییەکان، هەندێک جار ستەمی سیاسی و کۆتی بیروڕای سیاسی هەبوو، بەڵام دەروازەی ڕێپێدانی ئازادی سیاسی زیاتر بووە لەو لایەنە داخراوانە، لە بەرانبەردا ئەزموونی نوێی دیموکراتی لە جیهانی ئیسلامیدا پەیڕەو کرا. لە جەزائیر موسڵمانان کە بە دەربڕینی ڕای خۆیان زۆرینە دەرچوون ڕۆژئاوا پێی وتن ئازادی سیاسی لە زمانتان نابێت زیاتر

بڕوات بۆیە کەمینەیان پێشخست، لە سۆماڵ موسڵمانان زۆرینە بوون خێرا فرۆکەی وڵاتانی دیموکراسی بۆیان هەستا، لە فەلەستین کە موسڵمانان بوونە زۆرینە ئابڵووقەی هەمەلایەنە دران و لە بری هەر ڕادەربڕینێکی موسڵمانێکدا فیشەک یان مووشەکێکیان پێوەنرا، لە تورکیاش چەند جارێک کوودەتا بەسەر موسڵماناندا کرا کە بە زۆرینەش دەرچووبوون. هەروەها لە زۆر وڵاتی دیکەش...

سێیەم: ئازادی ڕادەربڕینی فکری: مەیدانی فکری لە تێڕوانینی ئیسلامدا بەرفراوانترین ماوەی هەیە، بەڵکوو کراوە بە پێویستی و ئەرکی سەرشان (لأولی الألباب) (لقوم یتفکرون...) (یتفکرون فی خلق السموات والارض...) تەنانەت ئیسلام بێباکانە لایەن و ئایینەکانی دی بانگ دەکات تا مشتومڕ لەسەر مەسەلەکان بکەن (تعالوا ندع أبناءنا وأبناءکم .... ثم نبتهل....) پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێت.) زۆر هەوڵیداوە بیری هاوەڵان بجوڵێنێت تا زیاتر بیریان فراوانتر بکەن، بۆیە ئەو ئازادییە ڕادەربڕینە فکرییەی لە مێژووی ئیسلامدا بە هەموو ماوە و سەردەمەکانییەوە بەدیدەکرێت پێویستی بە نووسینی چەند بەرگێکە لەسەری، بەڵام چەند نموونەیەکی سەرەکی ئاستی بەرفراوانی ئازادی فکری لە مێژووی ئیسلامدا دەخەینەڕوو:

١-زۆری مەزهەب و ڕەوتەکانی ناو مێژووی ئیسلامی و بوونی چەندێکیان لە یەک سات و شوێندا بەبێ ڕوودانی توندی لە نێوانیاندا وەک شیعە و موعتەزیلە و ئەهلی سوننە و سۆفی و.... هتد، بە جۆرێک هەرکامیان پەرتووک و نووسین و وتار و کۆڕی تایبەت بە فکری خۆیان هەبوو و دەسەڵاتی ئیسلامیش ڕێی لێ نەدەگرتن.

٢-قسەکردن لەسەر پیرۆزییەکانی ئیسلام بە پێچەوانەی پەیامی خودایی بەبێ ئەوەی توندی و ڕێگرتن بەرانبەریان هەبێت، بۆنموونە سەبارەت بە قورئانی پیرۆز موعتەزیلە بە مەخلوقیان دەزانی و شیعەش بە دەسکاریکراویان

دادەنا و بانگەشەشیان بۆ ئەو بیرە دەکرد کەچی ڕێیان پێ دەدرا.

٣-سەرەڕای ڕاجیاوازەکانی ناو جیهانی ئیسلامی وەرگێڕان و هێنانی هەردوو کلتووری یۆنانی فەلسەفەگەرا و هیندی جادووگەرا تێکەڵ بە ڕیشەی ئاگرپەرستی و ڕەگی بتپەرستی لە شکڵی فەلسەفێنراویدا لە جیهانی ئیسلامیدا تێکەڵ ببوون و کەچی ڕێیان لێ نەدەگیرا، بەڵکوو زانایانی وەک غەزالی و ئیبن تەیمیە و چەندێکی دی بە بنەڕەتی زانستی بەرپەرچیان دەدانەوە.

٤-نووسەر و کەسایەتیە دیارە فکریەکانی ناو جیهانی ئیسلامی تەنیا ئەندامانی دەستە ئیسلامییەکان نەبوون، بەڵکوو وەک پێشتر ناوی هەندێکیان هێنران بەدەیان کەسایەتی و نووسەری دیاری جوولەکە دیارن.

ئەمە بەو واتایە نا کە پاکانە بۆ دەسەڵاتی ناو مێژووی ئیسلامی بکەین، چونکە لادان و قەتیسکردنی ئازادی ڕادەربڕین لە چەند سات و شوێنێکی دەسەڵاتی ئیسلامیدا هەبووە و حاشای لێ ناکرێت، بەڵام لە هێڵی گشتی مێژووی ئیسلامیدا بازنەی ئازادی ڕادەربڕین لە بازنەی ڕاسەپێنی گەورەتر و فراوانتر بووە.

چەند لایەنێکی دیکەی ئازادی ڕادەربڕین هەن کە ئێمە لێرەدا باسیان ناکەین لەبەر ئەوەی پێویستی بە مەودای زیاتر هەیە، بۆیە بە نموونە سێ لایەنمان هێنان، ئەگەرنا ئازادی ڕادەربڕینی کۆمەڵایەتی لە مێژووی ئیسلامیدا جێی باسە وەک ئازادی کچ یان کوڕ لە دیاریکردنی هاوسەریدا یان ئازادی ڕادەربڕینی منداڵ کە بۆنموونە منداڵ بۆی هەیە وەک کەسێکی گەورە بە تێڕوانینی خۆی پەنای کەسایەتیەکی نەیار یان بەدەر لە میللەتی ئیسلام بدات. یان ئازادییە مەیدانی و تیۆرییەکانی ئابووری کە لێدوان و لەسەر نووسین لەسەریان پێویستە.

# زانست و فەلسەفەی جوانی

وەک باسمانکرد، فەلسەفەی ئاکار یان فەلسەفەی ئەخلاق (بەئینگلیزی: Ethics یان Moral Philosophy) بەشێکە لە فەلسەفە کە ئەرکی وەڵام دانەوەی پرسیارە سەرەتاییەکانی ئەخلاقیی لە ئەستۆیە. یان دروست و نادروست، خێر و شەڕ و حەق و ڕاستی و جوان و ناجوان.

فەلسەفەی بەهاکان (مبحث القيم) دابەش دەبێت بۆ سێ بابەت و زانستی سەرەکی:

١. **بەهای ڕاستی و حەق**: کە زانستی لۆژیک (علم المنطق) لێی دەکۆڵێتەوە.

٢. **بەهای خێر و چاکە:** کە زانستی ڕەوشتناسی (علم الاخلاق) لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکات.

٣. **بەهای جوانی:** کە زانستی جوانیناسی (علم الجمال) لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکات.

دەستەواژەی زانستی جوانی (Aesthetics) گوزارشتێکە بۆ لقێک لە لقەکانی باس و فەلسەفەی بەهاکان (القيم)، فەلسەفەی جوانی وەک بەشە کردەییەکەی لەگەڵ بوونی مرۆڤدا بوونی هەبووە، بەڵام وەک فەلسەفە و لایەنە تیۆریەکەی لەگەڵ بوونی فەلسەفەدا ئەویش بوونی هەبووە، بەڵام زاراوەی «ئیستاتیکس» زارەوەیەکی تازە بەکارهاتووە و کۆن نییە، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژەیەم، یەکەم کەس کە بەکاری هێنا فەیلەسووفی ئەڵمانی «باومگارتن» (Baumgarten) بوو، (١٧٦٢ م)، ئەم زاراوەیە ئەسڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وشەیەکی یۆنانی (Aesthetics) کە بەواتای «پەیبردنی هەستی» دێت.

زانستی جوانی (جوانی ناسی) لە ماهییەت و بنەڕەتی شتەکان دەکۆڵێتەوە، جا ئەو شتانە شتی سروشتی بن یان شتانێک بن کە مرۆڤ خۆی بەلێزانی و کارامەییەکەیەوە دروستی کردوون، ئینجا هەڵدەستێت بە دیاریکردنی جوانی و ئاستەکەیان و هەڵسەنگاندنی ئاستی جوانییەکەیان، ئینجا باسی پێوەرەکانی هەڵسەنگاندنی جوانی و ناشیرینی شتەکان دەکات و پێوەرەکان دادەنێت، بۆ ئەوەی بڵێی ئەوە جوانە یان دزێو و ناشیرن، جێی سەرسوڕمانە یان جێی گاڵتەپێکردن، لەناوەڕک و حەقیقەتدا قەشەنگی و جوانی تێدایە یان بەپێچەوانەوە و تەنیا عەقڵ و چاوی فریوداوە و بێ ناوەڕۆکە و پڕیەتی لە خراپی و نابووتی و دزێوی و بێبەهایی و بێئاکاری و ئاکاری بەلارێدابەر.

جوانی شتێکی زگماکی و فیترییە و شتێکی گشتی و خوارسکە، هیچ کەسێک نییە فیترەتی تێک نەچووبێت و هەست بەجوانی نەکات، جوانیناسی پێویستی بەفێرکردن نییە، چونکە شتێکی زگماکییە و هەموو مرۆڤێک لە ناخیدا چێنراوە، کەواتە بەرلەوەی فەلسەفەی جوانی هەبێت، جوانی هەبووە و جوانبینانیش هەبوون، بەڵام زانست و فەلسەفەی جوانی هات بابەتەکەی فەلسەفاند و پاشان خستییە بەردەم عەقڵکاری و بنەما بۆدانان و لێکۆڵینەوە و میتۆدەکانی.

وەک باسمان کرد فەلسەفەی جوانی وەک شتێکی فیتری و زگماکی بوونی هەبووە، هەر لەسەرەتای هاتنەبوونی مرۆڤەوە، بەڵام وەک باسکردن و نووسین و دوان و قسەکردن لەبارەیەوە دەگەڕێتەوە بۆ یۆنان، لەوێوە سەرەتا باسی لێوەکراوە، هەرچەند سەرەتای دەرکەوتنی بەسەربەخۆیی نەبوو، بەڵکوو بەتێکەڵی لەگەڵ فەلسەفەی ئاکار و مێتافیزیک و... بوو، واتە زانستێکی سەربەخۆ نەبوو، بەڵکوو لەمیانەی باسەکانی دیکەوە باسی لێوەکراوە، یەکەم کەسێکیش کە کە لێکۆڵینەوەی لەبارەوە کردبێت و لەبارەیەوە دوابێت. ئەفلاتوون، دوای ئەو قوتابییەکەی خۆی ئەرستۆ، هەستا بەدانانی تیۆرێێک لەبارەی سروشتی هونەر و جوانییەوە.

بەم شێوەیە هات و ئەم دوو فەیلەسووفە بوونە دامەزرێنەری بەردی بناغەی ئەم زانست و فەلسەفەیە، دواتر کەم تازۆر قسەی لەبارەوە کراوە، تاگەیشت بەسەدەی هەژدەیەم و بابەتەکانی جوانی و جوانیناسی پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، دیارترین ئەو کەسانەی کە دەستیان هەبوو لەم بەرەوپێشچوونە لە ئینگلتەرا: «شافستەبەری»، لە ئوسکوتلەندا: «بێرگ و هیوم»، لە ئەڵمانیا: «ئیمانوێل کانت»، کە بەدامەزرێنەری حەقیقی و ڕاستەقینەی جوانناسی دادەنرێت لەشێوە زانستییەکەیدا.

دوای «کانت» ئاراستەیەکی تیۆری لە لێکۆڵینەوەدا باڵدەکێشێت بەسەر فەلسەفەی جوانیدا و لە ماوەی سەدەی نۆزدەدا بەردەوام بوو.

بەردەوامی میتۆدی لێکۆڵینەوە (منهج البحث) لەلای فەیلەسووفانی جوانی لەسەر هەڵێنجان دادەمەزرێت کە بە بابەتە گشتییەکان (القضايا الكلية) دەست پێدەکات و بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر ڕاستی حوکمە بەشەکییەکان (جوزئییەکان) (الاحكام الجزئية)، ئەوەش بەڕوونی لەلای «هیگڵ» دەردەکەوێت.

لەسەدەی نۆزدەدا ڕێبازی «ڕۆمانسی» لەسەر دەستی «شلینگ» و «شلیگڵ» و «شۆبنهاوەر» دەرکەوت، ئەوانە گرنگییەکی زۆریان دەدا بەجوانی و زۆر بەرز دەیان نرخاند.

بەڵام لەسەردەمی ئێستادا و لە سەدەی بیستەمدا بەناوبانگترین تیۆریای جوانی تیۆریاکەی فەیلەسووفی ئیتالی «کرۆتشە» یە، کە لە کتێبەکەیدا «جوانناسی» «ئیستاتیکا» دا باسی کردووە و دەیچوێنێت بە وێنەیەکی جەوهەریانەی ئەو تیۆرەی کە فەیلەسووفی ئینگلیزی «کۆڵنگۆد» لە کتێبەکەیدا «بنەڕەتەکانی هونەر» باسی لێوەکردووە، هەمان شتیش بەنیسبەت ئەو تیۆرەی کە فەیلەسووفی ئەڵمانی «ئیرنست کاسێرەر» باسی کردووە و لە کتێبەکەیدا «فەلسەی شێوە هێماییەکان» دەیخاتەڕوو، بەتایبەت بەو شێوەیەی کە دووبارە

خرایەوە ڕوو لە کتێبەکەیدا «س. ل. لانگە» بەناونیشانی «هەست و شێوە»، هەموو ئەم تیۆریایانە لەوەدا هاوبەشن کە ئەزموونی جوانی وا هەژمار دەکەن لە جەوهەریدا گوزارشتێکە لە هەست (شعور) یان هێما و ئاماژەیە بۆی[1]

## جیاوازی فەلسەفەی جوانی و فەلسەفەی ئەخلاق

فەلسەفەی جوانیی کار لەسەر ئەوە دەکات، ئەوە جوانە و بۆ جوانە؟ یان ئەوە دێزێو و ناشیرینە و بۆ دزێو و ناشیرینە؟ واتە پێوەرێکە بۆ جیاکاری نێوان جوان و ناجوان.

بەڵام فەلسەفەی ئەخلاق پێوەری خێر و شەڕ و باشە و خراپە دیاری دەکات.

## فەلسەفەی جوانی لەلای ئەرستۆ

نازناوی مامۆستای یەکەم و پیاوی گەورەیان لە «ئەرستۆ» ناوە، «تۆماس ئەکویناس» لە بەرهەمەکانیدا ناوی «مامۆستا» یان «فەیلەسووف» ی لێناوە و «خواجە نەسیری توسی» یش ناوی «حەکیم» و «حەکیمی یەکەم» ی لێناوە.

«ئەرستۆ» شاگرد و قوتابی «ئەفلاتۆن» لەساڵی (٣٦٧) ی پێش زایین، واتە، (١٨) ساڵ پاش مەرگی مامۆستاکەی چووە ناو ئەکادیمیاوە، ئەو لەوکاتەدا (١٨) ساڵ بووە.

وردە وردە بوو بە کۆنترین و بەرجەستەترین فێرخوازی ئەکادیمی، بە جۆرێک «ئەفلاتۆن» ی مامۆستای ناوی «عەقڵی ئەکادیمیا» ی لێنابوو. تاکوو مامۆستاکەی زیندوو بوو وازی لە قوتابخانەکەی نەهێنا. چواردە ساڵ پاش

---

(١) الفلسفة لمن يريد، د. نبيل، ل ٦٧.

مەرگی «ئەفلاتۆن»، «ئەرستۆ» پاش ئەوەی (٧) ساڵ مامۆستای ئەسکەندەری مەکدۆنی بوو و چەندین گەشتی جۆراوجۆری کردبوو، لە ساڵی (٣٣٥) پ.ز قوتابخانەی تایبەتی خۆی واتە، «لوکیوم- Lyceum» ی دروستکرد و لەوێدا (١٢) ساڵ خەریکی وانەوتنەوە بوو. ئەو قسەیە لەبارەی وانە وتنەوەیدا دەکرێت زۆر بەناوبانگە کە دەڵێت: "لەگەڵ قوتابیەکانیدا لە ژێر درەختەکانی «لوکیوم» بەرێگادا دەڕۆیشتن و وانەی دەوتەوە. پەیڕەوانی بە پیادەڕۆکان (مەشائیەکان) و بە فەلسەفەکەی ناوی «فەلسەفەی مەشایی» یان لێناوە."

ئەرستۆهەموو بەشەکانی زانستەکانی یۆنانی دەوتەوە (جگە لە بیرکاری). بە گوتەی «دیوجۆنس لائرتیوس»، خاوەنی (٣٦٠) سێ سەدو شەست بەرهەمی نووسیوە کە لەنێوان ئەوانەشدا تەنیا (٤٠) بەرگ یان پەیامیان بە دەستی ئێمە گەیشتوون کە گرنگترینیان: سەماعی سروشتی، مێتافیزیک، ئەخلاق، نیکۆماخۆس، لەبارەی ئاژەڵانەوە، لەبارەی نەفسەوە، سیاسەت و دواجاریش لە لۆژیکدا «هونەری ڕەوانبێژی و هونەری شیعر» دوو کتێبی ترن.

دەڵێن ئەرستۆبە پێچەوانەی ئەفلاتوون کە بەرهەمەکانی بە زامنێکی ڕەوانبێژی شاعیرانە و بە شێوەیەکی گفتوگۆی سەرنجراکێش و سەرگەرمکەر بۆ خەڵکە گشتییەکەی دەنووسی و ئەو وانانەی لە ئەکادیمیا دەیوتنەوە، شتێک نەماوەتەوە و کەس نازانێت دەقەکەیان چی بووە، بەڵام لایئەرستۆ بابەتەکە پێچەوانەیە. دەڵێن ئەرستۆپەیام و نووسینەکانیشی بۆ خوێندنەوەی گشتی و خەڵکە گشتییەکە نووسیوە، بەڵام هیچکامیان لەوانە نەگەیشتوونەتە ڕۆژگاری ئێمە و ئەو بەرهەمانەی لەبەردەستماندانزۆربەیان کورتەی تیۆریا و بۆچوون و بیروباوەڕەکانی ئەون کە دیارە بۆ وانەوتنەوە ئامادەکراون و هەندێکیان وەکوو هونەری شیعر وەکوو پاداشتی کورتن بۆ یارمەتیدانی بیرو زەینی مامۆستا و نووسینی سەرەخاڵ و خاڵە گرنگەکان کە دەبوو لە دوو توێی وانەکاندا بیانخاتەڕوو.

## ئەرستۆ و جوانی

ئەرستۆ وشەی جوانی هەر بەو جۆرە بەکاردەهێنێت کە یۆنانییە دێرینەکان بەکاریان دەهێنا، ئەو هەرگیز لە کاتی لێکۆڵینەوە لەبابەتە هونەرییەکاندا، ئەم بابەتە لە دوو توێی چەمکی جوانیدا باس ناکات. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا ئەرستۆچ لە «مێتافیزیک» و چ لە «بوتیقا» دا ئەندێشەی پەرش و بڵاو و پێناسەگەلێکیش لەبارەی جوانییەوە بەدەستەوە دەدات. بنەمای ئەم پێناسەیە زۆر لایەنی فەلسەفییان نییە، بەڵکوو زیاتر ماتماتیکین. هێندە دەتوانرێت بوترێت ئەم پێناسانەی ئەرستۆلەبارەی جوانییەوە زیاتر لە تێبینی و وتەکانی قۆناغی پیری مامۆستاکەی ئەفلاتۆنلەبارەی جوانییەوە هاوڕاو یەکسان دەکات. چونکە لە بۆچوونی ئەرستۆدا جوانی بریتیە لە گونجاوی و چەمکێکە کە دەتوانرێت بە شێوەیەکی ماتماتیکیانە پیشان بدرێت. ئەمەش شتێک نییە جگە لەو ڕوونکردنەوە نوێیەی بۆچوونی ئەفلاتۆن لەبارەی جوانییەوە لە قۆناغی پیریدا کە ئەویش لە فیساگورسییەکانەوە وەریگرتووە. هەڵبەتە دەبێت بوترێت ئەفلاتوون بەشێوەیەکی گشتی لە سێ بەش و لە سێ قۆناغی جیاوازدا ژیانی گەشەی کردووە، ئەوانیش:

**قۆناغی یەکەم:** سەردەمی لاوی ئەفلاتوونە، لەم قوناغەدا لەژێر کاریگەری مامۆستاکەی خۆی سوکراتدا بووە، هەروەها تایبەتمەندی ئەو گفتوگۆیانەیلەم قۆناغەدا نووسراون بە «گفتوگۆ سوکراتییەکان» بەناوبانگن. گەرچی لەم قۆناغەدا گەڕان بەدوای «ئایدیا» (مثل) بوونی هەیە، بەڵام هێشتا لە حاڵەتی لۆژیکی نەهاتبوویەدەرەوە و حاڵەتی بوونناسی وەرنەگرتبوو.

**قۆناغی دووەم:** قۆناغی کامڵبوون و پێگەیشتنی ئەفلاتوون لەم قۆناغەدا مەیدانی لۆژیک بەجێدەهێڵێت و پێ دەخاتە ناو مەیدانی بوونناسییەوە.

**قۆناغی سێیەم و کۆتایی:** ئەم قۆناغە، قۆناغی پیری و کۆتاییەکانی تەمەنییەتی،

لەم قۆناغەدا بەجۆرێک دەکەوێتە ژێر کاریگەری بەهێزی «فیساگۆرسییەکان» بەجۆرێک تەنانەت دونیای نموونە (مثل) ەکەی دەکەوێتە ژێر هەڕەشەوە.

ئەرستۆچ لە «مێتافیزیک» و چ لە «پۆتیقا» دا، هەندیک بیرۆکەی ڕێکنەخراوی لەبارەی جوانییەوە خستووەتەڕوو. ئەم بیرۆکانە زیاتر لەسەر بنەمای بیرکاری «ماتماتیک» وەستاون و هەر بەوجۆرەی باسکراوە، بیروبۆچوون و بیروباوەڕی لەم ڕووەوە لە بیروباوەڕی قۆناغی پیری مامۆستاکەیەوەئەفلاتوون دوور نین. چونکە بە بۆچوونی ئەرستۆش، جوانی جۆرێک گونجاوییە و چەمکێکە دەتوانرێت بە شێوەی ماتماتیک بسەلمێنریت. لە مێتافیزیکدا بۆچوونی بەمجۆرە ڕوون دەکاتەوە:

بەڵام لەبەرئەوەی جوانی و چاکی لەگەڵ یەکدا جیاوازن، چونکە چاکی هەمیشە لە حاڵەتی کرداردا دەردەکەوێت، بەڵام جوانی لەو شتانەشدا دەردەکەوێت و بوونی هەیەکە لە حاڵەتی کرداردا نین، لەم ڕووەوە ئەو کەسانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن زانستە ماتماتیکییەکان شتێک لەبارەی چاکی و جوانییەوە ناڵێن، لە هەڵەدان. گومانی تێدا نییە زانستە ماتماتیکییەکان قسە لەبارەی چاکی و جوانییەوە دەکەن و دەیانخەنەڕوو. بەڵام ئەگەر ئەوکارە بەبێ ناوهێنان ئەنجام دەدەن و بەکارهێنانیان و چەمکەکانیان باس دەکەن، بەومانایە نییە قسەیان لەبارەوە نەکردوون. شێوە بنەڕەتییەکانی جوانی ڕێکخستنە و زانست دیاریکردن و سنووردارکردنی دیاریکراو، واتە ئەو شتانەی زیاتر بەهۆی زانستەکانی ماتماتیکەوە دەسەلمێن. هەروەها ئەم بۆچوونە، واتە بۆچوونی ماتماتیکی لەبارەی جوانییەوە لە «بوتیقا» دا دەبینین کە دەڵێت: "لە گیاندارەکان و لە هەر شتێک تەواو «کامل» دا کە لە چەند بەشێک پێکهاتبن جوانی تەنیا لە ڕێکخستن و ڕێکخراوی نێوان بەشەکاندا نییە، بەڵکوو دەبێت تاکوو ڕادەیەکی دیاریکراو و گەورەیش بوونی هەبێت. چونکە جوانی لەمەزنی و ڕێکخستندایە. لەبەر ئەوە گیاندارێک ئەگەر زۆر بچوک و ورد بێت، ناتوانێت

جوان بێت، چونکە هەموو ساتێک لە ڕوانین و بینین ڕادەکات و دەرکەکانمان لێڵ و نادیار دەکات و شت نابینین و هەروەها گیانەوەری گەورە -بۆ نموونە، ئەگەر گیانەوەرێک درێژییەکەی (١٠٠) م بێت- ناتوانێت جوان بێت، چونکە هەموو بەشەکانی لە ساتێکدا و بەتەنیا جارێک ڕوانین دەرناکەون و تەواوی و کەماڵبوونی دەرک ناکرێت.

جوانی و چاکی لەگەڵ یەکدا جیاوازن، چونکە چاکی هەمیشە لە حاڵەتی کرداردا دەردەکەوێت، بەڵام جوانی لەو شتانەشدا دەردەکەوێت و بوونی هەیەکە لە حاڵەتی کرداردا نین. هەڵبەتە ئەم شێوازەی ئەرستۆ و ڕوانینەی لەبارەی جوانییەوە زیاتر گونجاوە لەگەڵ ڕۆحیەتی یۆنانییەکان کە خۆی تیایدا ژیاوە، لەبەرئەوە هەر بەو جۆرەی کە دەزانین شتە زۆر گەورەکانیش ناتوانن بە شێوەیەکی گشتی لەڕووی جوانیناسییەوە، ناشرین بن. بەڵکوو ئەو ناونیشانەی پێیان دەدرێت وشەی بە شکۆ (sublime) یە کە سەدەها ساڵ پاش ئەرستۆ چووە ناو بابەتی جوانناسییەوە و دەبێت پێناسەکەی لە فەلسەفەی «کانت» دا ببینین. [١]

## بابەتە سەرەکییەکانی فەلسەفەی جوانی

١. چییەتی جوانی و سروشتییەکەی

٢. پێوەرەکانی جوانی و دیاریکردنی و هەڵسەنگاندنی

٣. پەیوەندی نێوان جوانی ئەخلاق، ئاکار

---

(١) سەرچاوە: فصلنامەی هنر، زمستان، ١٣٧٨، مقالەی ارسگو، ص ١٠-١٤. وەرگێڕانی موسعەب ئەدهەم.

## یەکەم: چییەتی جوانی و سروشتەکەی (ماهیة الجمال وطبیعته)

بابەتی چییەتی جوانی و سروشتەکەی (ماهیة الجمال وطبیعته)، هەر لە کۆنەوە قسە و باس و خواسی زۆری تێداکراوە و ڕاجیایی و جیاوازی زۆر هەبووە لە نێوانیاندا، بەڵام ئێمە لێرەدا لە دوو ئاراستە و بۆچووندا کۆیان دەکەینەوە:

١. **ئاراستەی بابەتی (الموضوعی):** ئەم ئاراستەیە پێیوایە جوانی شتێکی سەربەخۆیە و لە سیفەت و تایبەتمەندی خودی بابەتی خۆی دەنوێنێت، واتە سەربەخۆیە لە خودی خۆیدا و سەربەخۆیە لەو عەقڵەی کە پەی پێدەبات. ئەم ئاراستەیە ڕەگ و ڕیشە و بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەفلاتوون و فەلسەفەکەی، وتارەکانیشی ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە جوانی بوونێکی سەربەخۆ و بابەتی هەیە، بۆیە لەم سۆنگەیەوە، هاوڕان لەسەر ئەوەی کە هەموو خەڵک لە هەموو کات و شوێنکدا دەتوانن هەستی پێبکەن و چێژ و تامی خۆیانیان لێ ببینن.

پێوەر لای ئەم ئاراستەیە بۆ جوانی و شتی جوان بریتییە لەو خەسڵەتانەی کە دەبنە هۆی وروژاندنی سەرسوڕمان بە جوانی شتەکان.

٢. **ئاراستەی خودی (الذاتی):** ئەم ئاراستەیە پێی وایە جوانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەس و هێزەی پەی پێدەبات، واتە بەهیچ شێوەیەک بوونێکی سەربەخۆ و بابەتیانەی نییە، ئەم ئاراستەیە - کە فەیلەسووفە خودییەکان نوێنەرایەتی دەکەن- بۆیە پێیان وایە جوانی سەربەخۆ و بابەتی نییە و خودییە، چونکە دەڵێن جوانی بەردەوام لەگۆڕاندایە بەپێی کات و شوێن وسەردەمەکان و ڕەگەز و جیل و نەوە و ژینگەو هەتا بەپێی تاکەکان و کەسانیش، بەڵکوو زۆرجار بەپێی تەمەن و قۆناغەکانی ژیان، ئەمەش لە میانەی هەڵسەنگاندنی تابلۆ و هۆنراوە و وێنە و گۆرانی و پەخشان و پارچە مۆسیقا و... دەردەکەوێت، کە بەپێی کەس و شوێن و تەمەن و قۆناغی ژیان و... دەگۆڕێت.

دیارترین کەس کە نوێنەرایەتییەکی پەڕگیرانە و زێدەڕۆیی کارانەی خود و زاتی دەکات لە تێگەیشتنی جوانیدا بریتییە لە «تۆڵستۆی»، ئەو پێی وایە

بەهای شتی جوان -جا شیعر بێت یان تابلۆی هونەری یان... - کۆی گشتی دەوەستێتەسەر کاریگەری بەسەر گوێگرەکانییەوە.

لەنێوان ئەم دوو ئاراستەیە «خودیبوون» «بابەتیبوون» دا، ئاراستەی سێیەم سەریهەڵدا، کە ئاراستەیەکی کۆمەڵاتییە، ئەم ئاراستەیە ویستی تەباییەک و لێک نزیکییەک دروست بکات لەنێوان ئەم دوو ئاراستە دژبەیەکەدا، ئەم ئاراستە کۆمەڵاتییە کار لەسەر سڕینەوە جیاوازییە تاکەکەسییەکان و بەرجەستەکردنی حەزی دەستەجەمعی دەکات، فەلسەفەی وەزعی «پۆزەتیڤیزم» کە جەختی لەسەر بەکارهێنانی میتۆدی زانستی دەکرد لە توێژینەوەی دیاردەکاندا وەک ئەوەی لە واقیعدا هەیە، پشتگیری ئەم ئاراستە کۆمەڵاتییەی کرد و بەهێزی کرد، کە داننانێت بە تاکایەتی هونەرمەندان، هەستکردن بە جوانیش دەگەڕێنێتەوە بۆ حەزی کۆمەڵگە [1].

## دووەم: هەڵسەنگاندنی جوانی

وەک بابەتی چییەتی و سروشتی جوانی، ئەم بابەتی هەڵسەنگاندنی جوانییەش ڕاجیایی زۆری تێدایە لەنێوان بیرمەندان و فەیلەسووفاندا، بەڵام ئێمە کورتیان دەکەینەوە لە دوو ئاڕستەی سەرەکیدا:

١. **ئاراستەی عەقڵی:** ئەم ئاراستەیە پێی وایە هەڵسەنگاندنی جوانی کاری عەقڵە، واتە حوکمێکی عەقڵییە نەک حوکمێکی سۆزی، حوکمدان لەلای ئەم ئاراستەیە تەواو تەواو عەقڵییە، وەک هەموو حوکمەکانی تر، بۆیە پێویستە هەموو شتە جوانەکان بهێنرێنە ژێر بنەما و یاسا و پێوەرە عەقڵییەکان، نەک پێوەری دیکە.

٢. **ئاراستەی سۆزیانی - خودی (العاطفي - الذاتي):** ئەم ئاراستەیە پێی وایە پێوەری

---

(١) الفلسفة لمن يريد، د. نبيل، ل ٦٩ _ ٧٠.

هەڵسەنگاندنی جوانی بریتییە لە سۆزی ڕۆمانسی، یان ویژدان، دژی دانانی بنەما و یاسای عەقڵین بۆ داهێنانی هونەری و هەڵسەنگاندنی جوانی، حوکمدان لەسەر جوانی شتەکان، تەنیا دەوەستێتە سەر هۆشیاری ڕاستەوخۆ بەجوانی یان حەدسی ڕاستەوخۆ بەبەهای جوانی کە شتە جوانەکان لەخۆدەگرێت.

**٣. ئاراستەی هەستی (الحسی):** ئەم ئاراستەیە پێی وایە هەستەکان پێوەرن بۆ هەڵسەنگاندنی جوانی و ناجوانی[١].

## سێیەم: پەیوندی جوانی بە ئەخلاق و ئاکارەوە

ئەم بابەتی پەیوندی جوانی بە ئەخلاق و ئاکارەوەش یەکێکە لە بابەتە کێشە لەسەرەکانی نێوان فەیلەسووفان، بەڵام کرۆکەکەی ئەوەیە کە ئایا شتێکی جوان یان کارێکی هونەری، پێویستە بۆ ئەو نیازەی زانستی ئەخلاق مەبەستییەتی ملکەچ بکرێت؟ یان پێۆیستە لەسەرووی ئەوەوە بێت؟ واتە دەبێت بخرێتە ژێر ڕێکێف و بنەماکانی ئەخلاق یان نا؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسە گرنگە فەیلەسووفان بوونە دوو بەشی سەرەکی:

بەشێک پێیان وایە هونەر و جوانی دەبێت ئاخلاقیانە بن، بۆنموونە «ڕسکن» ئەو ڕایەی هەیە. پێیان وایە دەبێت هونەرمەندیش ڕاستگۆ و ئەخلاقی بێت و نابێت غەیری ئەخلاقیبوون مەبەستێکی دیکەی هەبێت.

بەشێکی دیکە بەپێچەوانەوە و پێیان وایە دەبێت هونەر تەنیا بەدوای جوانیدا بگەڕێت نە شتێکی دیکە، بۆیە ئەوەی دەبێت هونەر بەدوایەوە بێت بریتییە لە شێوە و دەرەوە نەک بابەت و ناوەڕۆک، لەوانەی لەگەڵ ئەم بۆچوونەدایە «سلڤاندۆر دالی» یە. نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو هەندێک لە فەیلەسووفان

---

(١) الفلسفة لمن يريد، د. نبيل، ل ٧٠ _ ٧١.

پێیان وایە جوانناسی زۆر بەرزترە لە زانستی ئەخلاق، جوانناسی و لێکۆڵینەوە لێی و تێروانین لە جوانی، بەرزترین و باڵاترینی شتێکە کە مرۆڤ دەکرێت پێی بگات، بۆیە حەزی ڕەنگەکان لە بڵندبوونی مرۆڤدا، گرنگترە لەو هەستەوەرانەی کە پەی بە باشە و خراپە دەبەن!

کەواتە فەیلەسووفان بوونە دوو بەش یەکەم: هونەر و هونەرمەند دەبێت ئەخلاقی بێت و شتی نائەخلاقی بەکارنەهێنێت بەناوی جوانییەوە، دووەم: مەرج نییە هونەر و هونەرمەند ئەخلاقی بێت، ئەوەی مەرجە جوانییە، نە شتێکی دیکە.

کەواتە بەپێی تێڕوانینی یەکەم جوان کاتێک جوانە، کە ئەخلاقی بێت، هەر شتێکیش نائەخلاقی بێت جوان نییە و نابووت و دزێوە، هەرچەندە لەڕووکەشیشدا جوان بێت، بەپێچەوانەوەشەوە، بەپێی تێڕوانینی دووەم، ئەخلاقی بوون بە هیچ شێوەیەک مەرج نییە بۆ جوانی و جوانبوون.

بەڵام لەڕاستیدا لەزۆر شتدا مەرج نییە بەم ڕەاییە قسەبکرێت، چونکە ڕاستە ئەخلاقیبوون، لوتکەی جوانییە، بەڵام مەرج نییە، ڕووکەشەکەی جوان بێت، بۆنموونە نەشتەرگەری ئەنجامدان بۆ کەسێک کە ژیانی کەتۆتە مەترسییەوە، شتێکی ئەخلاقییە و ئەوپەڕی ئەخلاقیبوونە، بەڵام مەشهەد و ڕووکەش و دیمەنەکەی جوان نییە، نەک هەر جوان نییە، بەڵکوو هەتا بڵێی ناشیرینە، چونکە خوێن و لەفاف و پێچان و برین و...، جونییان لەکوێدایە؟! لەگەڵ ئەوەی خودی کارەکە کارێکی ئەخلاقییە، کەواتە خودی کارەکە جوانە و ئەخلاقیشە، بەڵام مەشهەد و دیمەنەکەی جوان نییە.

[٥] بۆیە مەرج نییە بۆ جوانی تەنیا بڕوانییە ڕووکەش و دیمەنی شتەکان، بەڵکوو ناوەڕۆک و جەوهەری شتەکان لەپێشترە، کەواتە بەکورتی و بەکوردی دەتوانین بڵێین جوانی پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە ئەخلاقەوە هەیە، بەڵام

ئەم پەیوەندییە تاک لایەنە نییە و بەپێی تێڕوانینی کەسەکانیش بۆ ئەخلاق دەگۆڕێت، چونکە کەسێک بڕوای بەڕێژەیی بوونی ئەخلاق هەبێت و پێیوابێت ئەخلاقی جێگیر بوونی نییە، لای ئەو ناکرێت جوانی ببەستییەوە بە ئەخلاقەوە، چونکە ئەو هەر لە ئەساس و بنەڕەتەوە بڕوای بە ئەخلاق نییە.

## سوود (سوودگەرایی) و جوانی

ئەم بابەتەش یەکێکی دیکەیە لە بابەتە کێشە لەسەرەکان لە فەلسەفەی جوانیدا، بە شێوەیەکی گشتی دوو ئاراستەیە:

١. جوانی واتە سوود، سوود واتە جوانی، واتە جوانی و سوود لێک گرێدەدات و بە تێڕوانینێکی سوودگەرای ئەنجامگەرای ماددیگەرا لێی دەڕوانێت، بۆیە پێی وایە ئێمە هەموو شتێک لەبەر سوودەکەی وەردەگرین و داوا دەکەین، بۆنموونە داوای خواردن دەکەین بۆ تێربوونمان، داوای جلوبەرگ دەکەین بۆ پاراستنمان لە سەرما و گەرما و...، داوای سواری و سەیارە دەکەین بۆ بارسووکی و کات گەڕانەوە و پشوودان و ئیسراحەت، کەواتە جوان ئەوەیە کە سوودبەخش بێت.

بەڵام لە ڕاستیدا ئامانجی سەرەتا و کۆتایی سوودەکە نییە، ئیجا جوانی و سوودەکە لێک جودان، بۆنموونە ئێمە سەیری خواردنەکە ناکەین بەس بەلایەنی سوودەکەیی و چۆن بێت بەدەستەوە ڕێک وا بیخۆین، بەڵکوو دەیڕازێنینەوە و سفرەی بۆ ڕادەخەین و...، یان جلوبەرگ، بەس بەچاوێکی سوودەوە سەیری ناکەین، بەڵکوو ئوتووی دەکەین و ڕەنگ و شکڵ و شێواز و... لەبەرچاو دەگرین، یان ماڵ و خانوو، ناڵێین بەس با دیوار و سەقفێک بێت، بەڵکوو هەزارویەک تەرتیبات و جوانکاری بۆ دەکەین.

بۆیە زۆرشت هەیە سوودی هەیە بەڵام جوانی لێ نابینرێت، زۆرشتیش هەیە جوانە بەڵام سوودی نییە، یان زۆر کەمە، ئەگەر هەردووکیان کۆببنەوە شتێکی

باشە، بەڵام زۆرجاریش کۆنابنەوە، کەواتە مەرج نییە ئەوەی سوودبەخش بێت، جوان بێت. بۆنموونە گوێدرێژ جوان نییە (بەپێی پێوەری زاهیری مرۆڤ)، بەڵام هەتا بڵێی سوودبەخشە، یان بولبوول زۆرجوانە، بەڵام سوودێکی ئەوتۆی نییە، کەواتە مەرج نییە، ئەوەی جوان بێت سوودبەخش بێت، نەک ئەوە بەڵکوو زۆرجار جوانی لەسەر حیسابی سوود دەبێت، بۆنموونە پارەیەکی زۆر لە ڕووی دەرەوەی خانووەکەت دەدەی، بەڵام سوودێکی وای نییە، بەڵکوو سوودیشت لەدەستداوە.

یان زۆر شت و کەلوپەل، جوان نیین بەڵام سوودیان زۆرە، یان جوانن بەڵام هیچ سوودێکیان نییە، شتی وا هەیە، پارەیەکی لەڕادەبەدەری پێدەدرێت، بەڵام هیچ سوودێکی نییە، تەنیا ئەوەندەیە کە جوانە[1].

## جیاوازی کاری هونەری و بەهای جوانی

زۆرجار کاری هونەری لەگەڵ جوانیدا تێکەڵ دەکرێن، بەڵام لە ڕاستیدا جیاوازن، چونکە جوانی زیاتر پەیوەستە بە هەست و شعور و ویژان و دیوی ناوەوە، بەڵام هونەر یان دروستکردنە یان دووبارەکردنەوە و لاسایی کردنەوەی دروستکردن، بەزۆرییش شتی ماددی و بەرهەستە، بۆنموونە تابلۆ و بت و...، یان ئەگەر وەک مۆسیقا و هۆنراوەش بێت، وایە ناتوانیت دەست لە خودی دەنگەکە بدەیت، بەڵام دەتوانیت دەست لە ئالەت و ئامێرەکانی مۆسیقا بدەیت، یان ئەو قەڵەم و پێنووسەی هۆنراوەکەی پێ نووسراوە.

بەڵام دەربارەی ڕاڤەکردنی پەیوەندی نێوان کاری هونەری و بەهای جوانی سێ ڕێبازی سەرەکی هەیە:

---

(١) تبسيط الفلسفة، د. رجب بو دبوس، ل ٩٥.

١. **ڕێبازی واقیعی:** پێی وایە هونەر تەقلید و لاسایی کردنەوەی سروشتە، بەوپێیەی سروشت بەرزترین وێنەی بەرجەستەبوونی بەهای جوانییە.

٢. **ڕێبازی کەماڵی و تەواوی:** پێی وایە هونەرمەند ناتوانێت تەقلید و لاسایی سروشت بکاتەوە وەک ئەوەی کە هەیە، ڕێک (بزرەبت) وەک خۆی، بەڵکوو وێنای کەماڵی و تەواوی تێدا دەکات و واقیع تێکەڵ بە وێناکردنەکانی خۆی دەکات.

٣. **ڕێبازی عاتیفی و سۆزی:** پێی وایە هونەرمەند سۆزی هەیە، ئینجا ئەم سۆزە دەگۆڕێت بۆ کارێکی هونەری. کەواتە کارە هونەرییەکە تەقلید و لاسایی کردنەوەی سروشت نەبوو، وەک ڕێبازی یەکەم دەیڵێت، تەواوکاری سروشتیش نییە وەک ئەوەی ڕێبازی دووەم دەیڵێت، بەڵکوو تەعبیرە لە سۆز و عاتیفە. هونەرمەند ئەو کەسەیە کە دەتوانێت هەست و شعوورەکانی لە کاری هونەریدا بەرجەستە بکات، کەواتە ئێمە لەبەرانبەر کارێکی هونەریدا ناکرێت بپرسین هونەرمەند دەیەوێت چی بڵێت، بەڵکوو دەبێت بپرسین هونەرمەند هەست بەچی دەکات و لە چ هەستێکەوە ئەم بەرهەمە هاتووەتە بەرهەم؟[١]

## جوانی و هونەر لە تێڕوانینی ئیسلامدا

جوانی لە ئیسلامدا پانتاییەکی زۆر فراوانی هەیە، بە شێوەیەک پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرموویێت: «إِنَّ اللّٰهَ جميلٌ يُحبُّ الجمالَ»[٢]. واتە: «خودا جوان و جوانی خۆش دەوێت.»

واتە: جوانبە، جوان بیر بکەوە، جوان هەڵسوکەت بکە، جوان دونیاداری بکە

---

(١) تبسيط الفلسفة، د. رجب بو دبوس، ل ٩٨.

(٢) رواه مسلم عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ٩١.

و جوانیش دینداری، چونکە خودای گەورە جوانە و جوانیشی خۆش دەوێت لە هەموو شتێکدا، هەمیشە بەدوای جوانییەوە بە، لە هەرکوێیەک بێت، هی هەر کەس و لایەنێک بێت، وەک هەنگ هەموو جوانییەکان هەڵبمژە و نابوتییەکانیش فەرامۆش بکە.

خوا گەورەش دەفەرموێت: ﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾[١].

«ئەی نەوەی ئادەم، خۆتان برازێننەوە بە پۆشاک لەبەر کردن، لەکاتی هەموو نوێژو چوونە ناو مزگەوتێکدا.»

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللَّهُ عِندَهُ حُسْنُ الْمَآبِ﴾[٢].

«ئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینە و خاوەنێتی ئاڵتوون و زێڕو زیووی زۆرو زەبەندە و ئەسپی چاک و ڕەسەن و (هۆکاری هاتووچۆ) هەروەها ماڵات و زەویوزاری کشتوکاڵ بۆ خەڵکی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە هەمووی نازونیعمەتی ژیانی دنیان، خوایش (بۆ چاکان) شوێنی گەڕانەوەی ڕازاوەو خۆشی لای خۆی ئامادە کردووە (کە بەهەشتە).»

﴿إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ﴾[٣].

«بێگومان ئێمە ئاسمانی دنیامان ڕازاندووەتەوە بە جوانی و ڕۆشنی ئەستێرە و هەسارەکان»

﴿وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ﴾[٤].

---

(١) الأعراف ( ٣١ ).

(٢) المائدة ( ١٤ ).

(٣) الصافات ( ٦ ).

(٤) فصلت ( ١٢ ).

«ئاسمانی دونیامان ڕازاندەوە بە ئەستێرە و کردوومانە چراخان.»

«ئاسمانی دونیامان ڕازاندەوە بە ئەستێرە و کردوومانە چراخان.»

جوانی لە ئیسلامدا سەرەتا جوانی بیرکردنەوە و فکرە، ئینجا بۆ ڕۆح و نەفس و ناخو دڵ و دەروون، ئینجا ڕەنگدانەوەی بۆ مامەڵە و ئەخلاق و ڕەوشت و ئاکار.

کەواتە بۆ هەموو کیانی مرۆڤە:

- بۆ فکر و عەقڵ و بیرکردنەوەی
- بۆ ڕۆح و ناخ و نەفس و دڵ و دەروونی
- بۆ جەستە و دەرەوە و مامەڵە و ئەخلاق و ڕەوشت و ئاکار

چونکە ئەم سێ بەشە سەرەکییەی مرۆڤ تەواو تەواو پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، هەتا بیرکردنەوە جوان نەبێت، چۆن دڵ و دەروون و ناخ جوان دەبێت؟! هەتا دڵ و دەروون و ناخ و بیرکردنەوەش جوان نەبێت، چۆن کردار و گوفتار و مامەڵە جوان دەبێت؟!

بەڵام وەک لایەنە فکری و فەلسەفییەکەی گۆشەنیگای زۆر هەیە بۆ ڕوانین لەم بابەتە لە ئیسلامدا، بەڵام ئێمە لێرەدا لە گۆشەنیگای فەیلەسووفان و زانایانی کەلام و ئوسوولی فیقهدا باسی دەکەین.

## جوانی و دزێوی لە فکری ئیسلامیدا

بابەتی جوانی ناجوانی لە فکری ئیسلامیدا لە چەند بابەت و زانستێکدا باسکراوە، لە ئوسوولی فیقە و زانستی کەلام و فەلسەفەدا باسکراوە، بەڵام ئەم باسکردنەیان تەواو تەواو هاوتا نییە لەگەڵ زانست و فەلسەفەی جوانیدا، کەواتە زانست و فەلسەفەی جوانی بەشێوەی جیاواز بوونی هەیە لە فکری

ئیسلامیدا. ئەوەی ئێستا باسی دەکەین چاکە و خراپە (الحسن والقبح) بابەتێکە فەلسەفەی ئەخلاق و فەلسەفەی جوانی دەگرێتەوە، لەگەڵ دیوێکی شەرعی. بۆنموونە کوشتن هەرسێ بابەتەکەی تێدایە، هەم شتێکی نائەخلاقییە، هەم دزێو و ناشیرینە و دیمەنێکی نابووت و نەخوازراوە، هەم شتێکی ناشەرعییە و ئایین لە دونیا و قیامەتدا سزای بۆ داناوە.

**چاک و خراپ، جوان و دزێو (حسن و قبح) لە فکر و کەلامی ئیسلامیدا**

پەیبردنی عەقڵ بە باشی و خراپیەکان: وروژاندنی ئەم مەسەلەیە بە یەکەمین هەوڵی نزیککردنەوەی عەقڵ و دەق دادەنرێت، زانایانی کەلام و ئوسوڵی فیقهـ گرنگییەکی زۆریان بەم بابەتە داوە، لە پێشیانەوە موعتەزیلەکان کە خۆیان داڕێژەری بیرۆکەکە بوون و چەندین مەسەلەی تریان لەسەر بنیاتناوە.

ئەوان وتوویانە: خوای پەروەردگار عەقڵی بەخشیوەتە مرۆڤەکان تا جیاوازی لەنێوان باشی و خراپیەکاندا (الحسن والقبح) بکەن، عەقڵیش توانای ئەم پەیبردنەی هەبووە لەپێش هاتنی شەرعدا، هاوکات ئەم پەیبردنە وردەکاریی مەسەلە پەرستشی و شەرعییەکان ناگرێتەوە، کە لە دەرەوەی چوارچێوەی عەقڵدان، بەڵکوو ڕەچەڵەکی باشی و خراپیەکان، حەقیقەتە سەرەتایی و سەرەکیەکان، بنەما مرۆیی و ئاکاریەکانی وەک: ناسینی خودا، ڕاستی و درۆ، داد و ستەم، ئازادی و چەوساندنەوە، ئازار و خۆشی و هاوشێوەی ئەمانە دەگرێتەوە، دواتر کە شەریعەت دێت لەلایەکەوە جەختدەکاتەوە لەسەر ئەو باشی و خراپیانەی پێشتر عەقڵ پەی پێ بردوون و دەرکی کردوون، لەلایەکی ترەوە یاریدەرە لەو مەسەلانەی عەقڵ بە باشی پەی پێنەبردووە، بەمەش شەریعەت پشتگیر و تەواوکەری عەقڵە.

بەلای موعتەزیلەوە پێش گەیشتنی شەریعەت بە مرۆڤەکان، ئەوان بەهۆی عەقڵیانەوە لێپرسراوێتیان لەسەرشانە، دەبێت بەوکارانە هەستن کە عەقڵ

بە باشی دەزانێت، لەو کارانەش دووربکەونەوە کە عەقڵ بەخراپی دادەنێت، سەرەنجام بە ئەندازەی گوێڕایەڵی و سەرپێچیکردنیان بۆحوکمی عەقڵ پاداشت و سزا وەردەگرن لەلای خودا.

ماتوریدییەکان زانینی باشە و خراپە و جوانی و ناشیرینی شتەکان لە خودی شتەکەدا دەبینن پێش ئەوەی وەحی بێت بڵێت: ئەوە باشە و ئەوە خراپە، بۆنموونە: کوشتن، دزی، درۆ، بوختان، خیانەت، زوڵم و ستەم،...، ئەمانە هەموویان مرۆڤ بە فیترەتی پاکی دەزانێت کە خراپن، هەروەها ڕاستگۆیی، دادگەری، ئەمانەتپارێزی، مرۆڤ بە فیترەتی پاکی دەزانێت کە باش و جوانن. کەواتە لێرەدا پێش ئەوەی شەرع و وەحی بێن مرۆڤ خۆی ئەوانە دەرک دەکات و دەیانزانێت، بەڵام ئەشعەرییەکان ڕایان وایە، کە باش و خراپ و جوان و ناشیرین وەحی و شەرع دیارییان دەکات و پێش هاتنی وەحی مرۆڤ دەرکیان ناکات.

بەڵام ئەوەندەش هەیە کە ماتوریدییەکان لەگەڵ ئەوەی کە دەڵێن: عەقڵ دەرکیان دەکات بەڵام هەتا شەرع نەیەت مرۆڤ موکەلەف نییە و سزای لەسەر نییە و لۆمە ناکرێت.

لەلای ئەشعەرییەکانیش چاک و خراپ (حسن و قبح) بە شەرع دەزانرێن، واتە سەرچاوەی زانینی چاکە و خراپە و جیاکردنەوە و حوکم لەسەردانیان بریتییە لە شەرع و دین، بەم پێیە عەقڵ ناتوانێت چاکە و خراپە و سەرەنجامەکانیان دیاری بکات تاوەکوو شەرع دێت و چاکە و خراپە و سەرەنجامەکانیان لە دونیا و قیامەتدا دیاریدەکات. ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە عەقڵ بەپێی کەس و کات و شوێن و بارودۆخ و بەرژەوەندی دەگۆڕێت، هەر بۆیە نایدەنە دەستی مرۆڤ هەرچەندە زۆر شتیش هەیە کە بە فیترەتی پاکی مرۆڤ دەزانرێت ئەگەر فیترەتەکەی تێکنەچووبێت و تێکنەدرابێت.

کەواتە بەپێی زۆرێک لە سەرچاوەکان چاکی و خراپی و جوانی و دزێوی شتەکان شتێکی بابەتی و سەربەخۆن و لە خود و زاتی شتەکاندان لەلای موعتەزیلە و ماتوریدییەکان، بەڵام لەلای ئەشعەرییەکان شتێکی شەرعییە و ئەوە شەرعە دیاریدەکات چ باشە و چ خراپ، چ جوانە و چ دزێو، بەڵام لە ڕاستیدا لەلای ئەشعەرییەکانیش بەو ڕەهاییە نییە و بابەتە بەشێوەیەکی دیکەیە، کە ئێستا باسی دەکەین.

پوختەی (الحسن والقبح) جوانی و دزێوی، چاکە و خراپە لە فکر و کەلامی ئیسلامیدا

١. ڕاجیایی نییە لەوەی کە شاریع و دانەری شەرع و حاکیمی سەرەکی خودایە، ئەوەی کە پێشی وایە عەقڵ حاکیمە، تەنیا مەبەستی ئەوەی کە کە عەقڵ کەشفی حوکمەکە دەکات، نەوەک حوکمەکە دابمەزرێنێت، واتە تەشریعی ناکات، بەس کەشفی دەکات.

٢. ڕاجیایی نییە لەوەی کە حوکمە شەرعییەکان بەشێوەی موفەسەڵ و وردودرشت، لەڕێی شەرعەوە نەبێت نازانرێت، ئەگەر عەقڵ دەرکی حوکمە شەرعییەکانیش بکات، بە شێوەیەکی ئیجمالی دەرکیان دەکات، نەوەک بەشێوەی تەفسیلی.

٣. ڕاجیایی نییە لەوەیدا کە هەندێک لە ئەحکامە شەرعییەکان عەقڵ دەرکیان ناکات، هەتا لەلای موعتەزیلەکانیش، بۆنموونە باشی و جوانی ڕۆژووی ڕەمەزان و ناجوانی و نادروستی بەڕۆژووبوونی ڕۆژی جەژن.

ئایا بەباش دانان و بەجوان دانان (التحسين) و بە دزێودانان و بەخراپ دانان (التقبيح) شەرعییە و سەرچاوەی ئایین و وەحییە، یان عەقڵییە و سەرچاوەکەی عەقڵە؟

١. ڕاجیایی نییە لەوەدا کە بە باش دانان و بە جوان دانان (التحسين) بەواتای

گونجان لەگەڵ سروشت و تەبیعەتی مرۆڤ، وەک خواردنی خۆش و دیمەنی جوان،... شتێکی عەقڵییە، هەروەها بە دزێودانان و بەخراپ دانان (التقبيح) بە واتای دووری لە سروشتی مرۆڤ، وەک خواردنی گۆشتی ئاژەڵی تۆپیو و مردارەوەبوو و دیمەنی نابووت و دزێو و بۆنی ناخۆش و...، شتێکی عەقڵییە و عەقڵ بڕیار دەدات ئەمە جوان و باشە و ئەمەش خراپ و نابووت و دزێو.

٢. ڕاجیایی نییە لەوەدا کە بەباش دانان و بەجوان دانان (التحسين) بەواتای سیفەتی کەمال و تەواو، وەک سەخاوەتی و ئازایەتی و دادگەری و ڕاستگۆیی و پاکی و... شتێکی عەقڵییە، هەروەها بە دزێودانان و بەخراپ دانان (التقبيح) بە واتای سیفەتی نەقس و کەمی خراپی، وەک ڕەزیلی و ترسنۆکی و زڵم و ستەم و درۆ و ناپاکی و خیانەت و...، شتێکی عەقڵییە و عەقڵ بڕیار دەدات ئەمە جوان و باشە و ئەمەش خراپ و نابووت و دزێو.

٣. ڕاجیایی نییە لەوەدا کە هەرچی خودا فەرمانی کردووە، شتێکی باش و جوانە و بۆ بەرژەوەندیی مرۆڤەکانە، هەرچیش خودا نەهی و ڕێگری لێکردووە شتێکی خراپ و نابووت و دزێو و زیانبەخشە.

٤. ڕاجیاییەکە لەم خاڵەدایە کە ئایا حوسن و جوانی و باشی بە واتا ستایش و پاداشت لە دوارۆژدا و قوبح و نابووتی و دزێوی بەواتای سەرزەنشت و سزای دوارۆژ عەقڵییە یان نەقڵییە، واتە عەقڵ دەرکی دەکات یان نا؟[1]

لێرەدا زانایان و فەیلەسووفانی ئیسلام کەوتوونە ڕاجیاییەوە، موعتەزیلەکان پێیان وایە بەڵێ مرۆڤ موکەللەفە و سزا و پاداشت وەردەگرێت، ماتوریدی و ئەشعەرییەکانیش دەڵێن: نەخێر ستایش و سەرزەنشت و سزا و پاداشت بوونی نییە تاوەکوو شەرع نەیەت و نەڵێت ئەوە چاکە و ئەوە خراپ، ئەوە جوانە و ئەوە دزێو و نابووت.

---

(١) أصول الفقه في نسيجه الجديد، د. مصفى الزلمي، ل١١٦.

## ئیسلام و هونەر

سەبارەت بە هونەریش ئیسلام هەڵوێستێکی واقیعی و ناوەندگیری هەیە و بەیەک چاو سەیری ناکات، بۆیە هەر هونەرێک لەگەڵ بنەما ئەخلاقییەکان بێتەوە ئەوە قبووڵە و هاندراوە، بەڵام هەر هونەرێکیش ڕووخێنەری بەها بەرز و بنەما ئەخلاقییەکان بێت ئەوە قبووڵکراو نییە. هونەر لە ئیسلامدا پانتییەکی زۆر فراوانی هەیە، بەهیچ جۆرێکیش دژی نیە، وەک ئەوەی کە وێنا کراوە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئیسلام _ وەک هەموو بابەتەکانی دیکە _ یاسا و ڕێوشوێنی بۆ داناوە، بۆئەوەی لە ڕێڕەوی خۆی لانەدات و نەکرێتە ئامرازێک بۆ بۆ بەلاڕێدابردن و تێکدانی ئەخلاق و عەقڵ و تاک و خێزان و کۆمەڵگە.

# زانستی لۆژیک

وەک باسمانکرد، فەلسەفەی بەهاکان (مبحث القيم) دابەش دەبێت بۆ سێ بابەت و زانستی سەرەکی:

١. **بەهای ڕاستی و حەق:** کە زانستی لۆژیک (علم المنطق) لێی دەکۆڵێتەوە.

٢. **بەهای خێر و چاکە:** کە زانستی ڕەوشتناسی (علم الاخلاق) لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکات.

٣. **بەهای جوانی:** کە زانستی جوانیناسی (علم الجمال) لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکات.

زانستی لۆژیک لە کورترین پێناسەیدا بریتییە لە یاساکانی بیرکردنەوە و جێبەجێکردنیان بۆ خۆپاراستن لە کەوتنە هەڵە و بەهەڵەداچوون.

یەکەم کەس کە بناغەی یاساکانی بۆ دانا سوقرات بوو، بەڵام ئەرستۆ بە دامەزرێنەری حەقیقی دادەنرێت، چونکە لۆژیکی کردە باسێکی سەربەخۆ و پەرتووکی تایبەتی لەسەر نووسی، یەکەم کەسیش کە لە یۆنانییەوە گواستییە بۆ عەرەبی (ئیبن موقەفەع) بوو، لەسەردەمی دەوڵەتی عەباسیدا، پاشان زانایان و فەیلەسووفان هاتن بە کورتکردنەوە و ڕاڤەکردن و ... باسیان لێوەکرد، وەک فاڕابی و ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد و ...

ئینجا زانایانی ئوسوول و کەلامیش هاتن لۆژیکی ئەرستۆیان بەکارهێنا، بەڵام بەدەستکارییەوە، هەروەها زۆرێک لە دەستەواژەکانیشیان گۆڕی و نموونە و تەتبیقەکەشیان کردە ئیسلامی، کەواتە لۆژیکی ئەرستۆیان وەک یاسا و بنەما

وەرگرت، بەڵام بەدەستکاری لە هەندێک شوێن و گۆڕینی نموونە و نوێکاری تێیدا.

نموونەی ئەوانەش کە ڕەخنەیان لە لۆژیکی ئەرستۆ گرتووە، ئیبن تەیمییە، کتێبێکی نووسی بەناوی (الرد على المنطقيين).

لۆژیکی ئەرستۆ پێی دەوترێت لۆژیکی (الاستنتاجی) ئەنجامگیری، یان (الاستدلالی) بەڵگەهێنانەوەیی، (Dedustive Ligic) چونکە پێکهاتووە لە ئەنجامگیری و بەڵگەهێناوە، ئەنجامگیری حوکمی بەشەکی (جزئی) لە حوکمە گشتییەکان (کلی). کەواتە دەتوانین بڵێین لۆژیکی ئەرستۆ لۆژیکێکی پێوانەییە، کار لەسەر پێوانە و قیاس (القیاس) دەکات.

بۆنموونە:

مادده دروستکراوە.

هەموو دروستکراوێکیش دروستکاری هەیە.

کەواتە مادده و بوون و گەردوون دروستکاریان هەیە.

کەواتە پێوانە و قیاس لە دوو پێشەکی و بەرەنجامێک پیکدێت، ئەنجامەکەش وەستاوەتە سەر پێشەکییەکان، ئەگەر پێشەکییەکان ڕاست نەبن، ئەوە بەدڵنیاییەوە ئەنجامەکەش ڕاست دەرناچێت، ئەگەریش ڕاست بێت و بسمەلمێت، ئەوە ئەنجامەکەش ڕاست دەبێت و دەسەلمێت.

ئەم جۆرە لۆژیکە پێشی دەوترێت لۆژیکی وێنەیی یان شێوەیی (المنطق الصوری أو المنطق الشکلی -Formal Logic)، چونکە گرنگی بە شێوەی حوکمەکان و وێنەی بیرکردنەوە دەدات، بەبێ بابەتەکەی یان ناوەڕۆکەکەی. کێشەی لۆژیکی وێنەیی و شێوەییش ئەوەیە کە گرینکی بە تەبایی لەگەڵ واقیعدا نادات، بۆنموونە: هەموو باڵندەکان قەلەڕەشن، هەموو قەلەڕەشەکانیش

سپین، کەواتە هەموو باڵندەکان قەلەڕەشن.

کەواتە وەک بۆمان دەرکەوت لۆژیکی پێوانەیی ئەرستۆ بایەخی زۆری بە واقیع نەداوە، یان بڵێین ئەزموونی و واقیعی نەبووە، بۆیە لۆژیکی خوێندنەوەیی و شیکاری و بەدواداچوون (الاستقراء) هاتە کایەوە کە گرنگی بە واقیع دەدات، نەک شێوە و وێنەی ئەرگۆمێنەتەکان.

بەم شێوەیە لۆژیکی ئەرستۆ کورت هەڵهات لە قیاس و پێوانە، قیاس و پێوانەش جۆری یەکجار زۆرە، کە من لە کتێبی (الکافی فی المنطق الاسلامی) دا، بەدرێژی باسم کردووە.

بەڵام لۆژیک دواتر گەشەسەندنی زۆری بەخۆیەوە بینی، بەتایبەت لەسەردەمی نوێدا، بۆیە دووجۆری دیکە لە لۆژیک هاتنە مەیدان.

**١ـ لۆژیکی خوێندنەوەیی و شیکاری و بەدواداچوون (الاستقراء).**

**٢ـ لۆژیکی بیرکاری (الریاضی).**

لۆژیکی ئەرستۆیی لەسەدەکانی ناوەڕاستیش هەر بە زیندوویی مایەوە تاوەکوو دوای ئەوەی کۆمەڵگەی ئەوروپی لە کوتاییەکانی سەدەی ڕێنساسەوە گەشەسەندنی زۆری بەخۆیەوە بینی، لە هەموو بوارەکان بەگشتی و بواری زانستی بەتایبەتی، هەستیان بە کەموکوڕی و بێتوانایی لۆژیکی ئەرستۆیی کرد، بۆیە کاتێک زانستەکان هاتنە میدان، لۆژیکی ئەرستۆیان خستە کەنارەوە، چونکە پێیان وابوو نازانستی و ناواقیعییە و شتێکی ئەزموونی و زانستی نییە، بەڵکوو نەک هەر ئەوەندە، پێیانوابوو بەربەستیشە، بۆیە پێوەر بووە ماددی و واقیعی و زانستی و ئەزموونی و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون، هەربۆیە لۆژیکی ئیتستیقرا و تەحلیل و شیکاری و هاتە کایەوە، کە بە پێچەوانەی لۆژیکی پێوانەیی ئەرستۆیە، چونکە لە شتە جوزئییەکانەوە دەچێت بۆ شتە کولییەکان،

دێت شتە جوزئییەکان دەپشکنێت و شیکاریان دەکات بۆ ئەوەی بگات بە دەرەنجامێکی گشتی[1].

وەک باسمانکرد بناغەی لۆژیک بۆ وەڵامی حەق و باتڵە، ڕاستی و ناڕاستی، بۆیە پرسیارە جەوهەرییەکانی ئەوەیە کە سروشتی حەق چۆنە و پێوەرەکانی چیین، واتە چۆن حەق و ناحەق، حەق و باتیڵ لەیەک جیابکەینەوە؟

## سروشتی حەق

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە هەر لەکۆنەوە وەڵامی جیاواز جیاواز دراونەوە، بەم شێوەیە:

### یەکەم: سوفستائییەکان

سوفستائییەکان پێیانوابوو حەق سروشتی زاتی و بابەتی و خودی و مەوزوعی و ڕەها و سەربەخۆی نییە، بەڵکوو شتێکی ڕێژەیی کەسین، واتە بەپێی کەس و شوێن و کات دەگۆڕێت و شتێکی نییە بەناوی ڕاستی و حەقی ڕەها و هەموو مرۆڤایەتی لەسەری هاوڕابن، بۆیە گومان لە هەموو شتێک دەکەن. (گومانی ڕەها) گومانێکە متمانەی بە هیچ سەچاوە و ئامرازێکی مەعریفە نییە و زانین و مەعریفەی شتەکان لای شتێکی ئەستەم و مەحاڵە، گومانی لە هەموو شتێک هەیە و یەقین بوونی نییە لەلای، گومان لەلای مەبەستە نەک ئامراز بۆ گەیشتن بە حەقیقەت، بە گومان دەستپێدەکات و بە گومانیش کۆتایی دێت. ئەم قوتابخانەیە پێی وایە هەوڵ و تێکۆشانی مرۆڤ بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و مەعریفەیەکی یەقینی شتێکی پڕوپووچ و بێسوود و بێئەنجامە.

لەو فەیلەسووفانەی ئەو بۆچوونەیان هەبووە، فەیلەسووفی یۆنانی

---

(١) الفلسفة لمن يريد، د. نبيل، ٧٣ _ ٨٠.

«گۆرگیاس_ ٣٨٠ پ.ز» کە بۆچوونی خۆی بەم شێوەیە دەربڕیوە:

١. هیچ شتێک بوونی نییە.

٢. ئەگەر هەشبێت مرۆڤ ناتوانێت پەیان پێ ببات و بیانزانێت.

٣. ئەگەر گریمان زانیشی و پەیشی پێبرد ئەوا ناتوانێت بیگەیەنێت و گوزارشت لەو مەعریفەیە بکات کە پێی گەیشتووە و بیگەیەنێت بە خەڵکانی دیکە.

هەروەها فەیلەسووفی یۆنانی «بیرۆن _ ٢٧٥ پ. ز» گومانی لە هەموو شتێک هەیە، وەک دەڵێت: پێویستە متمانەمان بە عەقڵ و هەستەکان نەبێت و ڕا و بۆچوونمان نەبێت، پێویستە لەیەک کاتدا شتەکان ڕەت بکەینەوە و بیشیان سەلمێنین، یان نە ڕەت بکەینەوە نە بسەلمێنین.

ئەگەر سەیری زانای ئیسلام و زانستی کەلام بکەین ئەم قوتابخانەیان دابەشکردووە بۆ سێ گرووپ:

١. نکووڵیکارییەکان (العنادیة): ئەوانە پێیان وایە هیچ شتێک بوونی نییە و هەمووی خەون و خەیاڵە، کەواتە ئەوان دڵنیان و بێگومانن کە نازانن! دەزانن کە نازانن! سەرەتای ئەم گرووپە دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسووفی یۆنانی «گۆرگیاس_ ٣٨٠ پ.ز» کە دەیوت: "هیچ شتێک بوونی نییە. ئەگەر هەشبێت مرۆڤ ناتوانێت پەیان پێببات و بیانزانێت. ئەگەر گریمان زانیشی و پەیشی پێبرد ئەوا ناتوانێت بیگەیەنێت و گوزارشت لەو مەعریفەیە بکات کە پێی گەیشتووە و بیگەیەنێت بە خەڵکانی دیکە."

٢. لایمنییەکان (العندیة): لایمنییەکان ئەوانەن دەڵێن: لای من ئەو شتە بەو شێوەیەیە، لای تۆش هەرچۆنە کێشە نییە و هی هەردووکیشمان هەر ڕاستە، کەواتە لای ئەوان مەعریفە پەیوەندی بە خود شتەکانەوە نییە، بەڵکوو

پەیوەندی هەیە بە خودی کەسەکان، واتە لای من و لای تۆ و لای ئەوی تر و ...، ئەم جۆرەش بیرێکی مەعریفە ڕوخێنەرە و هەر لەسەردەمی یۆنانەوە تائێستاشی لەگەڵدا بێت بوونی هەیە، پێی دوترێت (نسبیة الحقیقة) واتە ڕێژە بوونی حەقیقەت و ڕاستی، واتە هیچ حەقیقەتێکی ڕەها بوونی نییە و هەمووی نسبیی و ڕێژەییە، ئەم بیرۆکەیە بنەمایەکی سەرەکیی ئیلحادیشە، چونکە لە ئیلحادیشدا تەنیا باوەڕبوون بە ئیلحاد ڕەهایە، ئەگەرنا هەموو شتێک: ئەخلاق، حەقیقەت، جوانی، ... ڕێژەیی و نسبییە.

٣. نازانمکارییەکان (اللاأدریة):نازانمکار (لائەدری) کەسێکە کە بڕوای وایە ناتوانێت دان بە بوونی هیچ شتێکدا بنێت، هەروەها ناشتوانێت نەفی بکات، لەبەرئەوەی کەسی نازانمگەرا خۆی یەکلایی نەکردووتەوە و نازانێت بەڵگەکانی هەبوون بەهێزترن یان نەبوون و لەمەڕ باسەکە نەگەیشتووەتە هیچ ئەنجامێک.

نموونەی ئەم ئاڕاستە و تەوژمە (ئاڕاستەی باوەڕ نەبوون بە جێگیری حەق) لە سەردەمی نوێدا: هەموو قوتابخانە ماددییە ئەزموونییەکان، داروینییەکان، وجودییەکان، وەزعییە مەنطیقییەکان، فۆریدییەکان، پراگماتییەکان، قوتابخانەی کۆمەڵایەتی ئوگست کۆنت و دۆرکایم.

## دووەم: عەقڵانییەکان

عەقڵانییەکان پێیان وایە حەق جێگیرە و بوونێکی سەربەخۆی هەیە و ناگۆڕێت بەپێی کەس و شوێن و کات، سوقرات یەکەم کەس بوو لەبەرانبەر سوفستائییەکاندا وەستایەوە و هەوڵی سەلماندنی ئیمکانی مەعریفە و توانای مرۆڤی دا بۆ زانین و ناسین و مەعریفە و توانای عەقڵ، چونکە سوفستائییەکان بڕوایان نە بە عەقڵ بوو نە بە هەستەکان و پێیان وابوو هەردووکیان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێن و هەردووکیان مرۆڤ فریو دەدەن، کەواتە چارەسەر

ئەوەیە بڕوایان پێنەکەین! سوقرات هات وتی: ئێمە شتی بەدیهی و یاسای عەقڵی نەگۆڕمان هەیە و عەقڵ توانای گەیشتن بە مەعریفەی هەیە، پاشان ئەفلاتوون و ئەرستۆ و ... هاتن هەمان بەرگرییان لە عەقڵ کردوو و دژی ئەم ئاڕاستە گومانگەرا ڕەها ڕووخێنەرە وەستانەوە. ئەم ڕەوتە بەردەوام بوو تاوەکوو ئیسلام هات و ئەویش بەهەمان شێوە جەختی لە توانای سنوورداری مرۆڤ کرد بۆ زانین و ناسین و مەعریفە و ڕۆڵی بۆ عەقڵ گێڕایەوە و دژی ڕەوتی گومانگەرا وەستایەوە. ئەم ڕەوتە هەر بەردەوامبوو و تا گەیشتە دیکارت و ئەویش لە کۆتایی گەیشتەکەیدا گەیشتە ئەم دەرەنجامە و هەموو ئاڕاستە و ڕەوت و فکرەکەی بۆ سەلماندنی عەقڵ و توانای مەعریفی مرۆڤ بوو. کەواتە بەدرێژایی مێژوو ڕەوتی باوەڕگەرا زۆرینە بوون و هەمیشە لەبەرانبەر ڕەوتی گومانگەراکاندا وەستاوەنەوە. ئەگەریش دوورتر بچین هەر لەسەرەتای مرۆڤایەتییەوە ئەم ڕەوتە زاڵ بووە و بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانیش (دروودی خوای لەسەر بێت.) پڕبووە و لە یەقین و یەقین بەخشین و بانگەوازی بۆلای یەقین و مەعریفە و دوورخستنەوەی خەڵکی لە گومان و گومانگەرایی و خۆونکردن و ڕێ لێونبوون و گومڕابوون و سەرلێشێواوی.

بەڵام ئەوەشمان بیرنەچێت کە زۆربەی زۆری فەلسەفە نوێکان لە ئەوروپادا لەکۆتاییدا زیندووکەرەوەی فەلسەفەی سوفستائی بوون و ڕێبازی گومان و گومانگەراییان زیندووکردۆتەوە و هەوڵیانداوە هەموو شتێک بەگومانەوە سەیر بکەن و هیچ شتێکی نەگۆڕ نەمێنێت و هەمووی ببێتە نسبی و ڕێژەیی، وەک براگماتی و وجودی و وەزعی مەنطقی و ...

## هەڵوێستی ئیسلام لەبارەی زانستی لۆژیکەوە

زانایان لەبارەی لۆژیکی یۆنانی و ئەرستۆییەوە کەوتوونە ڕاجیاییەوە:

١. نابێت بخوێندرێت و دروست نییە، بەبەڵگەی ئەوەی زەرەری زیاترە لە سوود، یان تێکەڵە بە فەلسەفەی ئیلحادی و ناباوەڕی و خوێنەرەکانی دەخاتە گومانەوە.

٢. دروستە بۆ ئەو کەسەی بناغە و پێشەکییەکی فکری باشی هەیە و خۆی پی دەپارێزرێت، نادروستە بۆ ئەو کەسەی سیقەی بەخۆی نییە و بناغەیەکی ئەوتۆی نییە.

٣. فەرز و واجب و پێویستە، فەڕزی کیفایەیە، واتە دەبێت هەندێ کەس هەر بیزانن، بۆیە ئیمامی غەزالی وتوویەتی: "من لا معرفة له بالمنطق لا ثقة بعلمه"واتە: "هەرکەسێک زانستی نەبێت بە لۆژیک متمانە بە زانستەکەی ناکرێت."

بۆ ڕاجیایی و بەڵگە و ناوی زانایان و ... ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ کتێبی (الکافی فی المنطق الاسلامی) لە نووسینی خۆم..[1]

---

(١) قبل أن نبدأ بالحديث عن حكم الاشتغال بعلم المنطق وأقوال العلماء وآرائهم فيه لابد أن ننبه على مسألة مهمة غائبة عن أذهان بعض من تصدى للكلام على هذه المسألة، وهي أن علم المنطق المدوَّن في هذا الكتاب وما شابهه من الكتب ک (معيار العلم) و (مِحک النظر) للغزالي، و (تهذيب المنطق) للتفتازاني، (الرسالة الشمسية) للكاتبي، و (إيساغوجي) للأبهري، و (السلم المرونق) للأخضري، وغير ذلک، وشروحاتهم، لم يختلف فيه أحد من أهل العلم المعتبرين في جواز تعلمها و تعليمها، وليست محل خلاف بينهم، وما سنذكره من الخلاف بينهم إنما هو في المنطق اليوناني المشوب بشوائب الفلسفة الباطلة و أفكار الحكماء الخاطئة، فليس هناک خلاف بينهم في دراسة المنطق الإسلامي الخالي من هذه الشوائب، المفيد للرد على أهل الشبه والشكوک الذين يطعنون في دين الاسلام ، عقيدة وشريعة، وصون الذهن عن الخطأ في الفكر واستنتاجه لقواعد العلوم وفقه الحياة في كل المجالات.
حكم تعلم علم المنطق الإسلامي:
تعلم علم المنطق الإسلامي فرض من فروض الكفاية، و ربما يكون تعلمه فرض عين إذا انحصر من واحد، وذلک لأن من لا معرفة له بالمنطق لا يستطيع أن يفهم كلام كثير من العلماء الذين استعملوا المصطلحات المنطقية والعبارات الصعبة في كتبهم، وكذلک لا يستطيع أن يَرُدَّ على التعريفات والأقيسة والأفكار والشبه والشكوک الباطلة بشكل جيد وحسن.
حكم تعلم علم المنطق اليوناني:
اختلف العلماء فيه على المذاهب التالية:

المذهب الأول: التحريم
وممن قال بهذا: ابن قتيبة (ت ٢٧٩ه)، وأبو الوفاء بن عقيل (ت ٥١٣ه)، والمازري (ت ٥٣٦ه)، المرغيناني (ت ٥٩٣)، وابن الأثير (ت ٦٠٦ه)، وابن الصلاح (ت ٦٤٣ه)، وأبو شامة (ت ٦٦٥ه)، والنووي (ت ٦٧٦ه)، وابن تيمية (ت ٧٢٧ ه)، والسيوطي (ت ٩١١ه)، وغيرهم، رحمهم الله تعالى أجمعين.
سبب تحريمهم لعلم المنطق يرجع إلى:
١.تغليبهم جانب المفسدة على جانب المصلحة.
٢.رؤيتهم بأن علم المنطق اليوناني مخلوط بضلالات الفلاسفة، ويخشى على الشخص المتعلم إذا اشتغل به أن يتمكن من قلبه بعض العقائد والشبه الباطلة والزائغة والمخالفة للعقائد الإسلامية.
٣.رؤية بعضهم بأن المنطق من علوم وخرافات اليهود والنصارى وضلالتهم التي ابتدعوها من عند أنفسهم لا من الوحي، والاشتغال بهذه غير جائز.
ومعلوم أن في قولهم نظرا، ولكن هنا ليس محل رد عليهم.
ولهؤلاء العلماء _ رحمهم الله _ موقفان :
١.الاكتفاء بالفتوى والتحريم، دون الرد والنقد للمنطق الأرسططاليسي، هذا مثل ما فعل (ابن الصلاح ، والنووي)، وغيرهما، راجع إلى فتوى ابن الصلاح في كتابه (فتاوى ابن الصلاح في التفسير والحديث والأصول والعقائد، ص : ٣٤ ، ٣٥ ).
٢.عدم الاكتفاء بالفتوى والتحريم له، بل الأخذ بالرد والنقد المنهجي والكتابة عليه، هذا مثل ما فعل (ابن تيمية، وابن القيم الجوزية ، والسيوطي) وغيرهم، راجع إلى كتاب (مجموعة الفتاوى لابن التيمية، المجلد التاسع (المنطق) ، ص : ٤٤ ، ٦٩ ) و(الرد على المنطقيين ، ص : ٧)، و(تقض المنطق لابن تيمية، ص: ١٨٦وما بعدها) وصون المنطق والكلام عن فن المنطق والكلام للسيوطي، ص :٢٠٢ وما بعدها).
المذهب الثاني: الجواز
فالذكي ومن وثق من نفسه بصحة ذهنه، ويستطيع أن يميز بين المثال الصحيح السليم وبين ما يجره إلى الإلحاد والانحراف والشكوك والشبه والأفكار المخالفة للعقائد الإسلامية، وله إلمام بالقرآن والسنة ، وله أيضا عقيدة راسخة، وإيمان ثابت فهذ يجوز له الاشتغال به وتعلمه.
والمنع لمن لم يكن متصفا بالصفات السابقة، لأنه يخشى عليه من الانحراف والضلال والزيغ.
وممن قال بهذا (تقي الدين السبكي) في كتابه (الفتاوى الكبرى ، ص : ٦٤٤/٢) وكتابه (معيد النعم ومبيد النقم ، ص : ١١١ و ١١٢).
المذهب الثالث: فرض من فروض الكفاية
هذا لأن هؤلاء يرون أن تعلم المنطق يسد الطرق والذرائع التي قد يقع فيها بعض الناس، ولا يميزون الضلال من الهدى، والحق من الباطل، والمنطق ميزان يعصم الأذهان من الخطأ والزلل والشبه، وكذلك معلوم أن الدفاع عن العقائد الإسلامية ودفع الشبه عنها واجب، وهذا الواجب لا يتم إلا به، وكل ما لا يتم إلا به فهو واجب، لذا تعلم المنطق واجب.

وقول الشاعر ينسجم مع رئيهم:
عرفت الشر لا للشر
لكن لتوقيه
ومن لم يعرف الشر
من الخير يقع فيه
وممن قال بهذا (الغزالي ).
وذكر (الأخضري) في منظومته المشهورة (السلم المرونق في علم المنطق) هذه الأقوال الثلاثة:
والخلف في جواز الاشتغال
به على ثلاثة أقوال
فابن الصلاح والنواوي حرما
وقال قوم : ينبغي أن يعلما
والقولة المشهورة الصحيحة
جوازه لكامل القريحة
ممارس السنة والكتاب
ليهتدى به إلى الصواب
وقال محمد الأمين الشنقيطي:
وجئنا بتلك الأصول المنطقية خالصة من شوائب الشبه الفلسفية، فيها النفع الذي لا يخالطه ضرر البتة، لأنها من الذي خلَّصه علماء الإسلام من شوائب الفلسفة، كما قال العلامة شيخ مشايخنا وابن عمنا المختار بن بوية في نظمه في فن المنطق :
فإن تقل حرمه النواوي
وابن الصلاح والسيوطي الراوي
قلت نرى الأقوال ذي المخالِفة
محلها ما صنف الفلاسفة
أما الذي خلَّصه من أسلما
لابد أن يعلم عند العلما
ثم انقسم موقف العلماء _ بعدما قبلوا المنطق _ إلى أربعة مذاهب:
المذهب الأول: قبِل المنطق كوحدة فكرية كاملة ، واعتبره قانون العقل.
ومن هؤلاء: الكندي ، والفارابي ، وابن سينا ، وأبو البركات البغدادي، وعمر بن السهلان الساوي، وابن الرشد الأندلوسي، وخواجه نصرالدين الطوسي، وفخرالدين الرازي، وسعد الدين التفتازاني، وقطب الدين الرازي، وصدر الدين الشيرازي.
المذهب الثاني: رفضوا كثيرا من عناصر منطق أرسطو، وأضافوا أبحاثا خاصة بهم.
المذهب الثالث: قبِل المنطق الأرسططاليسي وقام بشرحه من أجل استيعابه، ومن ثم الرد عليه بالنقد والتصويب.
المذهب الرابع: قبل المنطق الأرسططاليسي أولا، ثم وضع منطقا جديدا يخالفه ثانيا، وهو مشهور بـ(المذهب المزدوج).

بەڵام لە ڕاستیدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرموێت: «احْرِصْ على ما يَنفَعُك»[1].

«سووربە لەسەر هەموو ئەو شتانەی سوودبەخشن.»

پێوەرێکی گرنگ هەیە بۆ کارکردن: هەمیشە سەرقاڵی کارێک بە کە سوود بە خۆت و خەڵک و نیشتمان و وڵات و تاک و خێزان و کۆمەڵگە دەگەیەنێت، دووربە و خۆت خەریک مەکە بە کارێک کە سوودی بۆ خۆت و غەیری خۆت نییە، چونکە خەسارەتمەندی دونیا و قیامەتە. ئینجا ئەگەر وردبینەوە لە فەرموودەکە، دەفەرمووێت: «سووربە لەسەر هەموو ئەو شتانەی سوودبەخشن» نەیفەرمووە بیکە، دەفەرمووێت: سووربە، کەواتە بەس کردن نییە، بەڵکوو سووربوونیشە.

کەواتە بەم پێیە لۆژیک و هەموو زانست و ... دیکەش، نابێت حوکمی ڕەهایان بەسەردا بدرێت، بەڵکوو دەبێت ورد بکرێتەوە و جیاکاری بکرێت لەنێوان شتەکاندا، بۆیە لۆژیکیش وەک هەر بابەت و زانستێکی دیکە نە

تنبيهان:
١.ألف علماء أصول الفقه والكلام منطقا إسلاميا جديدا، ورفضوا المنطق الأرسطوطاليسي، ووضعوا منهجا إسلاميا خاصا بهم، وصاغوه بصياغة إسلامية جديدة متكاملة خالية من شائبة يونانية أو أرسطوطية للمنطق الإسلامي، لكن استفادوا من بعض أطاريحه واساليبه.
٢.أدخل بعض علماء أصول الفقه والكلام بعض المباحث المنطقية في أصول الفقه والكلام على نوعين مختلفين :
أولا: الاكتفاء بإدخال بعض المباحث المنطقية دون الصياغة الجديدة أو المزج لمنطق إسلامي.
ومنهم: إمام الحرمين الجويني.
ثانيا: عدم الاكتفاء بالإدخال فقط، لذا وضعوا منهجا منطقيا أصوليا.
ومنهم الغزالي، ومن تجديداته قيامه بعملية قلب المصطلحات المنطقية إلى مصطلحات إسلامية، مثلا: أبدل (التصور) بالمعرفة ، و(التصديق) بالعلم، و(الجزئي) بالمعين، و(الكلي) بالمطلق، و(الموضوع) بالمحكوم عليه، و(المحمول) بالحكم، و(الشكل) بالنظم، و(المقدمة) بالأصول، و(النتيجة) بالفرع.

(١) مسلم ٢٦٦٤.

هەمووی ڕەتکرایەوە نە هەمووی وەرگیراوە، چونکە میتۆد و مەنهەجەکان لێک جیاوازن، وەک باسمانکرد، لەناو لۆژیکیشدا چەندان میتۆد هەیە، بۆیە ئیسلامیش وەک ئایینێکی واقیعی هەڵوێستی خۆی هەیە دەربارەی هەموو بابەتە زانستی و لۆژیکی و فکری و فەلسەفییەکان، بەڵام ئەوەی کۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە کە ناکرێت وەحی و پەیامی خودایی پێچەوانە یان دژ بێت لەگەڵ ڕاستییەکی زانستی یان سەلمێنراوێکی عەقڵی، واتە نەقڵی سەحیح و ڕاست لەگەڵ عەقڵ و فکری ساغ و سەلیم هەرگیز تێک ناگیرێن، هەرکاتێک لە ڕووکەشدا ئەم تێکگیرانە بەدیکرا، دەبێت لێکۆڵینەوە بکەین، چونکە یان نەقڵەکە سەحیح و ڕاست نییە، یان عەقڵەکە ساغ و سەلیم نییە و بەهەڵەدا چووە و میتۆدێکی هەڵەی هەڵبژاردووە.

لەکۆتاییدا ئەوەی ڕاست و دروستە بریتییە لە مامەڵەکردن لەگەڵ قسە و وتە و هزر و نەوەک خاوەنەکانیان، وەک وتراوە: "أُنْظُرْ إِلَى مَا قِيلَ وَلاَ تَنْظُرْ إِلَى مَنْ قَالَ"، واتە: "بڕوانە ئەوەی کە وتراوە نەوەک ئەوەی کە کێ گوتویەتی،"چونکە ئەگەر ڕوانیتە قسەکەرەکە حەتمەن شتێکی دەروونی تێکەڵ دەبێت و زۆر جار حەقیشە، بەڵام ئامادە نیت ملی بۆ بدەی تەنیا لەبەر ئەوەی کەسێک وتویەتی کە کەیفت پێی نایەت یان لەگەڵی نیت یان لەحیزب و پێڕی تۆ نییە، تەنانەت ئەوە پەڕیوەتەوە بۆ کتێبیش، زۆر کەس و لایەن هەن سەیری ناوەڕۆکی کتێب ناکەن بەڵکوو سەیری خودی نووسەرەکە دەکەن!

بۆیە لۆژیکیش وەک باسمانکرد کە یاسای بیرکردنەوەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەی تێدایە و ڕاستی ڕەها نییە، بۆیە ئەوەی ڕاستە وەردەگیردرێت، ئەوەشی هەڵە و ناواقیعییە وەرناگیردرێت.

## پێوەری حەق

ئەم بابەتە وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە: پێوەر و قیاس و ئامرازی گەیشتن بە حەق کامەیە؟ بە چ پێوەرێک دەتوانین بڵێین ئەمە حەقە و ئەوە ناحەق؟

فەیلەسووفەکان هەر لە کۆنەوە ویستوویانە پێوەری حەق دیاری بکەن، هەریەکە و شتێکی دیاریکردووە، بەڵام ئێمە لێرەدا زۆر بەکورتی باسی سێ پێوەری سەرەکی دەکەین، کە دەتوانین بڵێین ئەم سێ پێوەرە بوون بە سێ قوتابخانە و تیۆریا.

**یەکەم:** ئەرستۆ وەک یەکەم کەس لەڕووی فەلسەفەییەوە کاری لەسەر ئەم بابەتە کردووە، ویستوویەتی پێوەری جێگیر دابنێت بۆ جیاکاری لەنێوان حەق و ناحەقدا، بەپێی توانای عەقڵی مرۆڤ:

**١.** یاسای خودی و زاتی، پێی دەوترێت یاسای موتابەقە و هاوشێوەیی و هاوتایی و هەوییە، واتە هەموو شتێک خودی خۆیەتی، یان بڵێین ڕاستی و حەقیقەتی هەموو شتەکان جێگیرن و ناگۆڕێن بەگۆڕانی پێشهات و شتە دەرەکییەکان (حقائق الأشياء ثابتة، والعلم بها متحقق)، مرۆڤیش دەتوانێت بگات بە حەقیقەتی شتەکان و بیانزانێت.

**٢.** یاسای ئەستەمبوون و مەحاڵبوونی دژیەکی، واتە دوو شتی دژ بەیەک لە کات و شوێندا و لە یەک کەسدا کۆنابنەوە، بۆنموونە بڵێی ئەو شتە هەیە و لە هەمان کاتیشدا نییە!

**٣.** یاسای مەحاڵبوونی نەمانی دوو دژ بەیەک لە یەک کاتدا، بۆ نموونە بڵێی ئەم شتە نە هەیە، نە نییە!

بەم شێوەیە ئەرستۆ ویستی چەند یاسا و بنەمایەکی گشتی دابنێت بۆ حەق و ڕاستی و حەقیقەت، کەواتە لەکۆتاییدا بڕوای بە جێگیری و هەبوونی حەق هەبووە، نەوەک وەک سوفستائییەکان کە بڕوایان بە هیچ حەقێکی جێگیر نەبووە.

**دووەم:** دوای بەردەوامبوونی ئەم میتۆدەی ئەرستۆ بۆ دەیان سەدە و گرنگی دانی زانایان و فەیلەسووفانی ئیسلام پێی، دواتر قوتابخانەیەکی دیکە هاتە مەیدان، بە ناوی «براگماتیزم»

پوختە و کورتەی ئەم قوتابخانەیە بەم شێوەیەیە: هیچ شتێک لە زات و خودی خۆیدا نە حەقە نە باتیڵ، واتە ڕێک بەپێچەوانەی ڕای ئەرستۆ کە بڕوای بە خودیبوون و زاتیبوونی حەق هەبوو (حقائق الاشياء ثابتة، والعلم بها متحقق).

پێوەری پڕاگماتیزم بۆ حەق بریتییە لە سوود و قازانج، واتە قوتابخانەیەکی تەواو سوودگەرا و قازانجگەرایە، کەواتە حەق بە سوود دەپێورێت، نەک بە لۆژیکی عەقڵ، هەربۆیە پێیان وایە حەق واتایەکی جێگیری نییە، بەڵکوو بەردەوام لە گۆڕاندایە بەپێی کات و شوێن و بارودۆخ و کەس و سوود و بەرژەوەندی و ....، کەواتە حەق لەلای ئەمانە نە شتێکی خودی و زاتییە، نە شتێکی جێگرە، بەڵکوو گۆڕاوە و بەردەوامیش لە گۆڕاندایە و پێوەری سەرەتا وکۆتاییش بۆ دیاریکردنی حەق بریتییە لە سوود و ئەنجامە ماددییەکان.

**سێیەم:** قوتابخانە و میتۆدی شیکاری و تەحقیق (التحقيق والتحليل)

ئەم قوتابخانەیە پێی وایە زۆربەی کێشەکانی ئایین و فەلسەفە هەر کێشە نیین، چونکە ئەگەر بێین شیکارییان بۆ بکەین و تەحلیل و تەحقیقێکی لۆژیکییان بۆ بکەین، یان بڵێین ئەو زمانەی کە ئەم کێشانەیان پێ نووسراوە تەحلیل و شیکاری لۆژیکییان بۆ بکەین، ئەوە هیچ کام لەم کێشانە نامێنێن.

پوختەی ئەم تیۆریا و قوتابخانەیەش بەم شێوەیەیە:

هەموو بابەتەکان دابەش دەکەن بۆ دوو تەوەر و بابەتی سەرەکی

١. بابەت و باسە شیکارییەکان: ئەو بابەتانەن کە (پاڵدراوە، المحمول) هیچ شتێکی نوێ بۆ (پاڵ بولادراوەکە، الموضوع) زیاد ناکات، بەڵکوو تەنیا ڕاڤە و

ڕوونکردنەوەیە بۆ پاڵدراوە، بۆنموونە: الاسد هو الليث، لێرەدا (الأسد) و (الليث) هەردووکیان شێرن، کەواتە هیچ شتێکی نوێی نەوت، یان بڵێی سێگۆشە ئەوەیە کە لە سێ لا پێکهاتووە، یان سەرێکە بە سێ لا دەورەدراوە، یان بڵێی ٤+٤= ٨، هەموو ئەمانە ڕستە و جوملەی تەحلیلی و شیکاری بوون، چونکە پاڵدراوەکە هیچ واتەیەکی بۆ پاڵ بولادراوەکە زیاد نەکرد، بەڵکوو تەنیا ڕاڤە و شیکار و تەحلیل بوو، بۆیە هەموو بابەتە بیرکارییەکانیش هەمان شتن.

ڕێگەی زانینی ڕاستی و ناڕاستی ئەم بابەتانە بەوە دەبێت بزانرێت: پاڵدراو چەند دێتەوە و هاوتایە لەگەڵ پاڵ بۆلادراو، ئەگەر هاوتایی و گونجان و هەبوو ئەوە بەڕاست دەگەڕێت. ئەگەرنا، ناڕاست دەردەچێت.

٢. بابەت و باسە لێکدراو و تەرکیبییەکان: ئەوەیە کە پاڵدراوەکە مانای نوێ دەبەخشێت بە پاڵ بۆلادراوەکە.

بۆنموونە: کانزا بە ئاگر و گەرمی لێک دەکشێت. ئاسن بە ساردبوونەوە دێتەوە یەک.

ڕێگەی تەحقیق لەم بابەتە لێکدراو و تەرکیبیانە بریتییە لە ئەزموونی هەستی و ماددی، هەر شتێک ئەزموونی هەستی و ماددی سەلماندی، ئەوە حەقە و بوونی هەیە، هەر شتێکیش ئەزموونی هەستی و ماددی نەیسەلماند ئەوە حەق نییە و باتیڵە و بوونی نییە، بۆنموونە ئەگەر ئەزموونی هەستی و زانستی سەلماندی کە بەڕاستی کانزا بە گەرمکردن و ئاگر دەکشێت ئەوە ڕاستە، ئەگەریش نەیسەلماند، ئەوە بوونی نییە و ناڕاست و ناحەق و درۆیە.

بۆیە دێن ئەم میتۆدە ماددییە هەستییە ئەزموونییە جێبەجێ دەکەن بەسەر هەموو بابەتەکانی فەلسە و ئایین و ئەخلاقدا، بۆیە بانگەشەکارانی ڕێبازی وەزعی مەنطیقی دەڵێن: هەموو ئەم بابەتانە «فەلسەفی، ئایینی، ئەخلاق» بابەتی وەهمین، چونکە تەحقیقیان لێ ناکرێت، وایە ئەمانە (پاڵدراوەکەیان،

المحمول) واتایەکی نوێ دەدات بە (پاڵ بۆلادراوەکە، الموضوع)، بەڵام چونکە گەیشتن پێیان لەڕێی ئەزموونی زانستی نییە، کەواتە بوونیان نییە و هیچ نیین!

بۆنموونە: خودا بوونی هەیە.

زوڵم و ستەم و ناپاکی و خیانەت حەرام و خراپن.

ڕاستگۆیی و دادگەری و ئەمانەتپارێزی واجب و پێویستن.

ئەمانە سەدان بابەتی هاوشێوەی ئەمانە، لێکدراو و تەرکیبی نیین، چونکە لەڕێی ئەزموونی هەستی و زانستییەوە ناسەلمێن، کەواتە بوونیان نییە و هەموویان درۆ و ناڕاستن و شتانێکی جێگیر و سەلمێنراو نیین!

کەواتە بەم پێیە هەموو شتێکیان کورتهەڵێنا لە لۆژیکێکی بیرکاریانە و زانستە سروشتییەکان و ئەزموونی ماددی و زانستی، عەقڵ و میتۆدی عەقڵی و میتۆدی ئایینی و حەدسی و ڕۆحی و وەحی هیچ ئەرزشێکیان نییە.

بەم پێیە حەق لەلای پۆزەتیڤیستەکان بوو بە شتێکی ماددی و هەستی و زانستی، لەلای پڕاگماتیزمەکانیش بوو بە شتێکی سوودی و قازانجی و کاڵا.

واتە بەپێی هەردووکیان حەق شتێکی سەربەخۆ و خوودی نییە و وەستاوەتە سەر مادده و ئەزموون و زانست و سوود و قازانج و بەرژەوەندی.

بەم پێیەش هەمان ڕای سوفستائییەکانیان هەیە، بەڵام لە بەرگێکی زانستی و سەردەمیدا، ئەگەرنا لە بنەڕەتەوە هەموویان درێژکراوەی سوفستائییەکانن[1].

---

(١) قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين، ل ٢٥٠ _ ٢٥٥.

## حەق لە فکری ئیسلامیدا

فکری ئیسلامی پێی وایە، پێوەرەکانی حەق جیاجیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەواو تەواو داندەنێت بە عەقڵی سەلیم و ساغ، چونکە هەموو مرۆڤێک لەسەر زگماک و فیترەتی پاک خولقێنراوە، کەواتە بەم پێیە حەق سیفەتێکی خودی هەیە و جێگیرە، ناکرێت بنەما ئەخلاقی و عەقڵییەکان بەپێی کات و شوێن و بارودۆخ و کەسەکان بگۆڕێن، لەگەڵ ئەوەی کە ڕەچاوکردن هەیە، بەڵام هەر نەگۆڕن، بۆنموونە: ڕاستگۆیی و دادگەری و ... نەگۆڕن.

# مێژووی فەلسەفە

فەلسەفە وەک باسمانکرد وشەیەکی یۆنانییە هاتووەتە ناو زمانەکانی دیکەوە، لە دوو بەش پێکدێت «فیلا + سۆفیا» یان «فیلۆ + سۆفیا»[1] وشەی «فیلا یان فیلۆ»، واتا: خۆشویستن، وشەی «سۆفیا»، واتا: حیکمەت و دانایی، یان واتا: مەعریفە و زانین و ناسین، «فەلسەفە» هەمووی بە یەکەوە واتا: خۆشویستنی حیکمەت و زانین و ناسین، گەڕان بە دوای زانین و ڕاستی و حەقیقەتدا.

فەیلەسووفیش ئەو کەسەیە کە: فەلسەفە، فیکر، حیکمەت، بیرکردنەوە، تێڕامان و پرسیارکردنی خۆش دەوێت.

فیساگۆرس، فەیلەسووف و زانای بیرکاری (٥٧٠ - ٤٩٥)، بە یەکەم کەس دادەنرێت کە وشەی فەلسەفەی بەکارهێناوە.

ناساندنی فەلسەفە لە ڕووی زاراوەوە شتێکی قورسە، هەتا وای لێهاتووە هەندێک لە نووسەران وتویانە مەحاڵە پێناسەی فەلسەفە بکەی، پێناسەی فەلسەفە زۆر زۆرە، چونکە پێناسەی فەلسەفە بەپێی فەیلەسووف و کات و سەردەم و شوێن و بابەتەکانی فەلسەفە دەگۆڕێت، بۆ نموونە: سەردەمی پێش سوقڕات: فەلسەفە بریتی بووە لە تێڕامان و لێکۆڵینەوە لە بوون و گەردوون و سروشت، بۆیە گرنگییەکەیان بریتی بوو لە زانینی ئەسڵی ئەم گەردوونە، ئاخۆ لە چی دروستبووە، بیروڕایان جیاواز بوو، کەواتە: فەلسەفە لە پێش سوقڕات لە ئەسڵی بوونی دەکۆڵییەوە. دوایی لە سەردەمی سۆفستاییەکان و سوقڕات

---

(١) موسوعة الفلسفة والفلاسفة للدكتور عبدالمنعم الحفني (٩٨٣/٢)، والمعجم الفلسفي، المصطلح الفلسفي عند العرب، للدكتور عبدالأمير الأعسم (٢٠٦).

فەلسەفە کورت هەڵاتبوو لە: مرۆڤ، حەقیقەت و ڕاستی، حەق، دادگەری، خێر و شەڕدا، هەر بۆیە سوقڕات بەوە بەناوبانگە کە فەلسەفەی لە ئاسمانەوە دابەزاندە سەر زەوی و تایبەتی کرد زیاتر بە مرۆڤ و بابەتەکانی خێر و شەڕ و ... هتد. بۆیە پێناسەی سوقڕات (٤٦٩ - ٣٩٩ پ. ز) بۆ فەلسەفە: گەڕانی ئەقڵە بە دوای نێوەڕۆکی ئەو شتانەی دەمانگەیێننە چاکە. دوایی ئەفلاتوون (٤٥٧ - ٣٤٧ پ.ز) هات و وتی فەلسەفە: گەڕانە بۆ کرۆکی بوونەکان و یاسا جوانەکان تا یەکەم بەدیهێنەریان بناسرێت، شەرەفی سەرکردایەتی هەموو زانستەکانی هەیە. دوای ئەم ئەرستۆ (٣٨٤ - ٣٢٢ پ.ز) هات وتی: فەلسەفە: زانستێکی بیردۆزییە بۆ بنەما و هۆکارە سەرەتاییەکان.

فەلسەفە لە لای ئەرستۆ زۆر زۆر فرەوانبوو، تا وای لێهات یەکسان بوو بەزانست، واتا: زانستەکانی هەمووی لەخۆ دەگرت. الفلسفة النظرية، الحكمة النظرية، العلم النظري، فەلسەفەی بیردۆزی نەزەری،کە سێ بەش دەگرێتەوە: (الطبيعيات) سروشت، وەک: فیزیا و کیمیا و بایەلۆژی و فەلەک و...هتد. (الرياضيات) ڕیازیات، وەک حیساب و ئەندازیاری و... هتد. (الإلهيات) ئیلاهیات بە دوو واتا بەکارهاتووە، (عام، گشتی)، کە بوون دەگرێتەوە، (خاص، تایبەت) کە ناسینی خودا دەگرێتەوە.الفلسفة العملية، الحكمة العملية، العلم العملي، فەلسەفەی کردەیی، ئەویش سێ بەش دەگرێتەوە:(الأخلاق) ڕەوشت، کە بۆ ڕێکخستنی تاکە. (الاقتصاد) ئابووری، بۆ ڕیکخستنی خێزان. (السياسة) سیاسەت، بۆ ڕێکخسنی شار و دەوڵەت. کەواتا لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە فەلسەفە لای ئەرستۆ ماناکەی زۆر فراوانە، بە شێوەیەک کە زانست و غەیری زانستیش دەگرێتەوە.

دوای ئەمان چەندان فەیلەسووفی ئیسلامی هاتن و فەلسەفەیان ناساندەوە، بۆنموونە: فاڕابی (٨٣٧ - ٩٥٣ ز): پێناسەی فەلسەفە دەکات بە: زانینی ئەو بوونانەیە کە هەن و زانستێکی کۆمکارە کە وێنەیەکی تێروتەسەلی بوونەوەر

دەبەخشێتە مرۆڤ. دوایی ئیبن سینا (٩٨٠ - ١٠٣٧ ز)وتی:فەلسەفە: وەستانە لەسەر ڕاستیی هەموو شتەکان بەو ئەندازەیەی دەگونجێت مرۆڤ لەسەری بوەستێت. دوایی ئیبن ڕوشد (١١٢٦ - ١١٩٦) وتی:فەلسەفە: سەرنجدانە لە بوونەوەر لە لایەنی بەڵگەبوونییەوە لەسەر بەدیهێنەرەکەی. دوایی لەسەردەمی نوێدا ڕینێ دیکارت (١٥٩٦ - ١٦٥٠)وتی: فەلسەفە: وەک درەختێک وایە ڕەگەکەی مێتافیزیکە (ئەودیو سروشت)، قەدەکەی فیزیکە، لق و پۆپەکانی کە لەو قەدە دەردەچن هەموو زانستەکانن، کە دەگەڕێنەوە بۆ سێ زانستی سەرەکی: زانستی پزیشکی، ماتماتیک، ئەخلاق.

فەلسەفە بەواتای بیرکردنەوە و تێڕامان و بەدواداچوون و پرسیارکردن و ...، هێندەی مرۆڤ کۆنە و مێژووەکەی بۆ یەکەم مرۆڤ دەگەڕێتەوە، چونکە مرۆڤ خۆی بوونەوەرێکی بیرکەرەوەیە، پرسیار دەکات و تێڕادەمێنێت و ...، بۆیە فەلسەفە ناکرێت بکرێتە موڵکی کەسێک یان گەل و نەتەوەیەک یان وڵات و ئیمپڕاتۆریەتێک.

دەربارەی ئەم بابەتی سەرهەڵدانی فەلسەفە سێ ڕامان هەیە:

بۆچوونی یەکەم: پێیان وایە فەلسەفە لە ڕۆژهەڵاتەوە سەریهەڵداوە و شارستانیەتی ڕۆژهەڵات خاوەنییەتی، وەک: میسر و فارس و بابل و چین و هیند و ...هەربۆیە چەندان فەیلەسووف هەبوون کە بابەتەکانی فەلسەفەیان تاوتوێ کردووە، بۆنموونە لە میسر «بتاح حتب و أبور»، لە چین «لاهوتسیە، کونفوشیوس، مانسیوس...)، لە فارس «زرادشت، مانی، مزدک»، لە هیند« بوذا، سیکیا مونی، کابیلا».

بۆچوونی دووەم: پێیان وایە فەلسەفە لە یۆنانەوە سەریهەڵداوە و یەکەم فەیلەسووفیش «تالیس»ە، یەکەم کەسیش کە زاراوەی فەلسەفەی بەکارهێناوە هەر لە یۆنان بووە کە فیساگۆرسە.

بەڵام دەتوانین بۆچوونی سێیەمیشی بۆ زیاد بکەین، کە پێی وایە فەلسەفە بە مانا کرداری و فراوانەکەی لە ڕۆژهەڵاتەوە سەریهەڵداوە، بەڵام بەمانا تایبەتەکەی لە یۆنانەوە سەریهەڵداوە، چونکە فەلسەفە دەبێت خاوەنی میتۆد و ڕێبازی تایبەت بەخۆی بێت، کە ئەمەش دیارە لە یۆنان بووە نەک لە خۆرهەڵات.

بەڵام لە ڕاستیدا وەک «ویل دیورانت» لە کتێبی «چیرۆکی شارستانیەت» (قصة الحضارة)دا دەڵێت: "شارستانییەتەکانی ڕۆژهەڵات (مەبەست لێی چین، هیند، فارس، میسر، شام و میزۆپۆتامیا و ...) پێش شارستانییەتی یۆنان کەوتوون لە هەشت بواردا: «بواری ئایین، کردەوە، ڕێکخستنی سیاسی و کۆمەڵایەتی، ڕەوشت و ئاکار، زانست، فەلسەفە، ئەدەب، هونەر»، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین ئەمانە هەموویان موڵکی مرۆڤایەتین، بەڵێ دەکرێت بڵێین یەکێکیان لەپێش یەکێکی دیکەیانەوەیە لە بوارێک لە بوارەکان، بەڵام ناتوانین بڵێین تاپۆیە لەسەر یەکێکی.

.ئێمە لێرەدا باسی چەند شوێنێک دەکەین کە فەلسەفە وەک بیر و تێڕامان بوونی هەبووە تێیدا، ئەگەرچی ناوی لێ نەنراوە بەتایبەتی، بەڵام وەک کردەیەکی فەلسەفی هەژمار دەکرێت.

## فەلسەفە لە پێش یۆنان (لە خۆرهەڵات)دا

### یەکەم: میسڕ

میسڕ یەکێکە لە کۆنترین شوێنەکانی جیهان، بۆچوونەکانیان لەو بارەوە بۆ پێنج هەزار ساڵ پێش زاین دەگەڕێتەوە. هەندێک لە بۆچوونەکانیان:

١. میسڕییەکان لە بارەی خوداوە بۆچوونی جیاوازییان هەبووە، هەندێکیان بڕوایان بەیەک خودا و پەرستراو هەبووە، هەندێکیشان بڕوایان بە چەند

خوایەک هەبووە، هەشیان بووە بتپەرست بووە.

٢. لەبارەی دروستکار و بەدیهێنەری بوون و بوونەوەریش ڕاجیاییان هەبووە، هەندێکیان بڕوایان بەیەک دروستکاری گەردوون هەبووە، هەندێکیشان بڕوایان بە زیاتر لە یەک بووە.

٣. لێکۆڵینەوەیان هەبووە دەربارەی مرۆڤ، جەستە، ڕۆح، ژیان، مردن، دوای مردن و ...، زۆربەشیان باوڕیان بە ژیانی دوای مردن و نەمری ڕۆح هەبووە.

٤. چەندان پەرستراویان هەبووە، (راع، ئاموون، ئوزوریس، ئیزیس، ...).

کەواتە لە میسرِی کۆندا بیرکردنەوە هەبووە دەربارەی بەدیهێنەری گەردوون و ....

## دووەم: «میزۆپۆتامیا» وڵاتی نێوان دوو ڕووبارەکە (دیجلە و فوڕات)

لەم ناوچەیەشدا چەندان شارستانییەت بوونیان هەبووە، وەک: سۆمەری، ئەکەدی، بابلی، ئاشووری، کەنعانی، ...

ئەمانەش وەک میسرِییەکان بۆچوونی خۆیانیان هەبووە لەبارەی خودا و پەرستراو و مەرگ و ژیانی دوای مەرگ و ...، هەروەها وەک میسرِییەکان باوەڕیان بە ژیانی دوای مردن هەبووە.

## سێیەم: فارس

لە وڵاتی فارسیش فەلسەفە بە جۆرێک لە جۆرەکان بوونی هەبوو، بەتایبەت بیروڕاکانی زەردەشتییەکان، لە بیروڕاکانی زەردەشتییەکان:

١. خودا لای ئەوان تەنیا خولقێنەری چاکە و جوانییە، خراپە و خراپەکاری

ناخولقێنێت، ئەم خودای چاکەیە لەلای ئەوان ناوی «ئاهورامەزا/ یان یەزدان، یان مەزدک، یان مەزدا» بووە.

خودای شەڕیش ناوی «ئەهریمەن بووە».

٢. زەدەشت لەلای زەردەشتییەکان پێغەمبەر بووە و کتێبیشی هەبووە.

٣. ئاگر لەلای زەردەشتییەکان پیرۆز بووە.

زەردەشتییەت قسە و باسی زۆری دەوێت، قۆناغ و بۆچوونی زۆری هەبووە، بەڵام لەبەر درێژنەبوونەوە چیتر لەسەری ناڕۆین.

## چوارەم: چین

لە چینیشدا جورێک لە فەلسەفە و فەلسەفەکاری بوونی هەبووە، (بەواتای بیرکردنەوە و تێڕامان و پرسیارکردن و ...).

لە چینی کۆندا کەسایەتی و بۆچوونی زۆر هەبووە، بەڵام ئێمە لێرەدا دوو کەسایەتی هەڵدەبژێرین کە بەناوبانگترینیانن

**یەکەم: «کۆنفشیۆس»** کە لە ساڵی (٥٥١ پ.ز) لەدایک بووە و لە ساڵی (٤٧١ پ.ز) کۆچی دوایی کرووە، کۆنفشیۆس یەکێک لە گەورەترین بیرمەندانی چینی کۆن بووە، هەندێک بە پێغەمبەری دادەنێن، بەڵام ئەمەیان پشتڕاست نەکراوەتەوە، لە بۆچوونەکانی:

١. چارەنووسی مرۆڤ لە ئاسمانەوە دیاریدەکرێت، مرۆڤەکانیش یان چاکەکارن، یان خراپەکار، چاکەکارەکان دەبێت ڕێزیان بگیردرێت، خراپەکارانیش بەپێچەوانەوە.

٢. بەپێی زۆربەی سەرچاوەکان باوەڕداربووە و باوەڕی بە خودا هەبووە،

بەڵام پێی وابووە عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت پەی پێببات و لێی تێبگات، بۆیە با عەقڵی خۆی بەکاربێنێت بۆ ژیانی دونیا و بەختەوەرکردنی خۆیی و دادگەری و سەقامگیری و ئاشتەوایی و ڕێکخستنی کۆمەڵگە و ...

**دووەم:** «لاوتزو» یەکێک بووە لە بەناوبانگترین بیرمەندانی چینی کۆن، لە ساڵی (٦٠٤ پ. ز) لەدایک بووە، ڕێبازێکی دامەزراندووە بە ناوی «طاویزم» یان (طاوية). لاوتزو زۆر بڕوای بە دونیابەکەمگری و سادەیی و ڕۆحانی بوون هەبووە، پێی وابووە ڕۆح زۆر بەهێزترە لە عەقڵ و عەقڵ لەوە بچووکترە بتوانێت پەی بە نهێنییەکان بەرێت، بۆیە بووە کەس و ڕێبازێکی ڕۆحی تائەوەی عەقڵی.

## پێنجەم: هیند

هیندیش وەک هەر وڵات و ناوچەیەکی دیکەی ڕۆژهەڵات فەلسەفە و بیروبۆچوونی جیاجیای لێ بووە، بەڵام دیارترینیان دوو ئایین بوون: بووزایی و هیندۆسی.

### یەکەم: بووزایی

بووزایی دامەزرێنەرەکەی (بوذا)یە، کە لە ساڵی (٥٦٠ پ.ز) لەدایک بووە و لە ساڵی (٤٨٠ پ. ز) یش کۆچی دوایی کردووە، (بوزا واتە پیاوی ڕۆشنبیر، ئەو کەسەی گەیشتووە بەڕووناکبوونەوە)، بووزایی سەرەتا لە هیند سەری هەڵدا، بەڵام دوایی بەدرێژایی مێژوو بە شوێنەکانی وەک یابان و چین و بۆرما و .... بڵاوبووەوە.

### کورتەی فەلسەفەی بووزا

کورتەی فەلسەفەی بووزا بریتییە لە ڕۆحانی بوون و گەڕانەوە بۆ ڕۆح و کونترۆڵکردنی ئارەزوو و غەریزە جەستەییەکان بە لایەنی ڕۆحی، بە شێوەیەک

بگاتە حاڵەتی (نیرڤانا)، نیرڤانا واتە کوژانەوە، لەم حاڵەتەدا مرۆڤ هەست بە بوونی خۆی ناکات، بەڵکوو دەتوێتەوە لە بووندا.

**دووەم: هیندۆسی**

هیندۆسی دامەزرێنەرێکی دیاریکراوی نییە، بەڵکوو هەوڵی کۆمەڵگەی هیندی بووە بۆ گەیشتن بە ڕاستییەکان، بەدایکی هەموو ئایینەکانی دیکەی هیند دادەنرێت و ئەوانی دیکە هەموویان لق و پۆپن بۆ هیندۆسی، پوختەی بۆچوونەکانیان:

١. جەستە خستنە ژێر کۆنترۆڵی عەقڵ و ڕۆح و کوشتنی ئارەزووەکان و خۆبێبەش کردن لە تێرکردنی غەریزە جەستەییەکان، ئەمەش هەمووی بۆ ڕزگاربوونە لە ئازار، ڕزگاربوون لە ئازار لەلای ئەوان بەمە دەکرێت.

٢. بڕاوایان بە گیانگۆڕکێ بووە (تناسخ)، واتە مرۆڤ بەپێی کردەوەکانی لە دوای مردن ڕۆحەکەی دەچێتە ناو کەسێکی باش، یان خراپ، یان ژیاندار و ئاژەڵێک، یان دڕەندەیە، یان ...

٣. بڕوایان بە سزا و پاداشتی دوای مردن هەبووە.

٤. هەوڵدان بۆ گەیشتن بە «نێرڤان» واتە کوژانەوە و توانەوە، مرۆڤ دەتوێتەوە لە بووندا، حاڵەتی یەکێتی بوونی (وحدة الوجود)ی بۆ دروست دەبێت، دەگات بە حاڵەتێک هەست بە غەریزەکانی ناکات.

٥. دونیا بەکەمگری و ڕەشبینی.

٦. خودا بوونی هەیە، خودا بوونی نییە، قسەی لێ ناکەین، ئەمە سێ ڕای هیندۆسەکان بووە لە بارەی خوداوە.

هەندێک لە توێژەران پێیانوایە یەکتاپەرست بوون، بەڵام دواتر شێوێنرا.

ئەوەی باسکرا، هەمووی لە ڕۆژهەڵات بوو و پێش یۆنانیش بوو، بەڵام ئەوەشمان بیرنەجێت، پێش هەموویان پێغەمبەران ئەم باسانەیان باسکردووە، باسی خودا و پەرستراو و پەرستش و دروستکاری بوون و دوارۆژ و زیندووبوونەوە و ئامانجی مرۆڤ و بنەما ئەخلاقییەکان و ...[1]

## سەردەم و چاخەکانی فەلسەفە

سەردەم و چاخەکانی فەلسەفە بە کۆی گشتی ئەمانەن

١. فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتی کۆن

٢. فەلسەفەی یۆنانی

٣. فەلسەفەی سەدەی ناوەڕاست (مەسیحی)

٤. فەلسەفەی سەدەی ناوەڕاست (ئیسلامی)

٥. فەلسەفەی ئەوروپی لە سەردەمی ڕێنیسانس

٦. فەلسەفەی نوێی ئەورووپی

٧. فەلسەفەی هاوچەرخ

بەڵام زۆربەی توێژەران سەردەم و چاخەکانی فەلسەفە دەکەن چوار

١. سەردەم و چاخی کۆن

٢. سەردەم و چاخی ناوەڕاست

٣. سەردەم و چاخی نوێ

---

(١) بۆ هەموو ئەوەی کەباسکرا لەم ئاییینەکۆنانەبگەڕێوەبۆ پەرتووکی: موسوعة الأديان في العالم. وتاريخ الفلسفة من قبل سقراط إلى ما بعد الحداثة. والموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة.

٤. سەردەم و چاخی ئێستا

هەر یەکێکیش لەم سەردەمانە دەیان تەوژم و قوتابخانە و ڕەوون و ڕێبازی تێدا دەرکەوتووە.

## سەردەم و چاخی کۆن (دێرین)

سەردەم و چاخی دێرینی یۆنانی ئەو سەردەمە بوو کە فەلسەفە بە مانا تایبەت و دیاریکرا و وردەکەی تێیدا سەریهەڵدا، بە شێوەیەک گەیشتە لوتکە و بنەما گشتی و هێڵە گشتییەکانی ڕەگیان داکوتا، ئەم سەردەمەش دابەش دەبێت بۆ چەند قۆناغێکی سەرەکی:

**١. قۆناغی هیلینی**

**٢. قۆناغی هیلینستی**

## یەکەم: قۆناغی هیلینی

هیلینی لە «هیلین»ەوە وەرگیراوە، یۆنانییەکان پێیان وایە باپیرە گەورەیانە، بەڵام لە ڕووی زاراوەوە واتە ژیانی یۆنانی بە هەموو ڕواڵەت و چالاکییەکانی، بەتایبەت فەرهەنگی و فکری بە مۆرکێکی تەواو یۆنانییەوە، بۆیە کە دەوترێت فەلسەفەی هیلینی واتە ئەو فەلسەفەیەی کە شتەکانی لە ژیانی یۆنانییەوە وەرگرتووە، هەرچەندە هەندێک کارتێکەری دەرەکیش بوون و بەژدارییان هەبووبێت.

فەلسەفەی هیلینی هەموو قوتابخانە و ئاراستەکان دەگرێتەوە کە لە سایەی شارستانی یۆنانی دەرکەوتوون، هەر لەسەرەتاوە هەتا دەستپێکردنی

داگیرکارییەکانی «ئەسکەندەری مەکدۆنی» لە ساڵی (٣٣١ پ.ز) بۆ ڕۆژهەڵات، لەم قۆناغی «هیلینی»یەدا سێ ئاراستە سەریان هەڵدا:

**١. ئاراستەی کۆزمۆلۆژی**

**٢. ئاراستەی ئەنسرۆپۆلۆژی**

**٣. ئاراستەی کۆکەرەوە و هەمەلایەن و گشتگیر**

## یەکەم: ئاراستەی کۆزمۆلۆژی

کۆزمۆلۆژی زاراوەیەکی لێکدراوە لە دوو بەش:

«کۆزمۆ یان کۆزمۆس» لە زمانی یۆنانی کۆندا واتە «گەردوون» (الكون).

«لۆژیا» واتە «زانست»

هەمووی بەسەریەکەوە «کۆزمۆلوژیا» واتە: زانستی گەردوون، یان گەردوونناسی، یان زانستی شتانی ناو گەردوون.

کەواتە ئەم قۆناغە لە گەردوون و سروشت و سەرەتای گەردوون و مادده دەکۆڵێتەوە.

ئاراستەی کۆزمۆلۆژیش دابەش دەبێت بۆ دوو قوتابخانە:

**١. قوتابخانەی سروشتی یەکەم یان سەرەتا یان تاکخوازی (الطبيعيون الاولى) (الواحدية).**

**٢. قوتابخانەی سروشتی دووەم یان فرەیی (الطبيعيون الثانية) (التعددية).**

## یەکەم: قوتابخانەی سروشتی یەکەم یان سەرەتا یان تاکخوازی (الطبيعيون الاولى) (الواحدية)

بۆیە بە سروشتی ناونراوە، چونکە لە سروشت و سەرەتاکانی سروشت و بنەڕەتەکانی سروشتی دەکۆڵییەوە، بۆیەش بە «یەکەم و سەرەتا» ناو دەبرێت چونکە یەکەم قوتابخانە بووە کە لە شارستانییەتی یۆنانی سەریهەڵداوە، بۆیەش بە «تاکخواز» ناودەبرێت، چونکە بڕوایان وابووە کە بنەڕتی بوون یەک بنەما و جەوهەر و ئەسڵە، بەڵام لەم بنەڕەت و جەوهەرە کەوتوونە ڕاجیاییەوە:

«تالیس» دەیوت: "ئەسڵی بوون ئاوە."

«ئەنەکسیمەندر»یش دەیوت: "ئەسڵی بوون «ئاپایرۆن»ە.

«ئەناسکیمنس» دەیوت: "ئەسڵی بوون هەوایە."

«ئەمبادوکلیس» دەیووت: "ئەسڵی گەردوون ئاگر و هەوا و گڵ و ئاوە."

## دووەم: قوتابخانەی سروشتی دووەم یان یان فرەیی (الطبيعيون الثانية) (التعددية)

بۆیە بە سروشتی ناودەبرێت، چونکە لە سروشت و سەرەتاکانی سروشت و بنەڕەتەکانی سروشتی دەکۆڵییەوە، بۆیەش بە «دووەم» ناودەبرێت، چونکە لە ڕووی مێژووییەوە دەکەوێتە دوای قوتابخانەی سروشتی یەکەم، بۆیەش بە «فرەیی» ناودەبرێت، چونکە پێیان وابوو بنەڕەت و بنەما و جەوهەر و ئەسڵی بوون و ئەوەی گەردوون و بوونی لێوە پەیدابووە، یەک دانە نییە و چەندان جەوهەر و بنەڕەتی جیاجیان، دیارترینیان:

١. **ئەنکساگۆراس** (٥٠٠ - ٤٢٨ پ.ز)، پێی وابووە کە بنەڕەت و سەرچاوە و

ئەسڵی گەردوون بریتییە لە ژمارەیەکی بێ کۆتا لە توخمەکان، یان ژمارەیەکی بێ کۆتا لە تۆوەکان، کە عەقڵێکی زانای سەر ڕاست دەیانجوڵێنێت، کەواتە ئەو بە شێوەیەک لە شێوەکان دانی ناوە بە هێزێکی دەرەکی کە خودایە، ئەو بە زانای مەزن و سەرڕاست دەری دەبڕێت، کەواتە ئەو فەیلەسووفێکی سروشتی فرەیی بووە، چونکە بڕوای بە فرەیی بنەڕەتی بوون بووە، نەک تاکە بنەڕەتێک.

٢. **ئەمبادۆکلیس** (٤٨٣ - ٤٢٣ پ.ز) ئەو بنەڕەتی گەردوون و بوونی گەڕاندەوە بۆ دووجۆر بنەڕەت و ئەسڵ، یەک: چوار توخمەکان «ئاو، هەوا، گڵ، ئاگر» (الإسطقسات الاربعة)، دوو: بنەڕەتگەل و بنەماگەل و جەوهەرگەلی جووڵەیی حەرەکەیی کە بریتین لە هەردوو هێزی «خۆشەویستی و ڕقوکینە» هێزی خۆشەویستی دەبێتە هۆی ئاوێتەبوونی چوار توخمەکە و دواییش لەئەنجامی ئەم ئاوێتەبوونەوە سروشت و بوونەوەرەکان دروست دەبن، هێزی «ڕقوکین»یش دەبێتە هۆی لێکجیابوونەوەی توخمە پێکهێنەرەکانی شتەکان و دورخستەوەیان لەیەکتری، کەواتە ئەم فەیلەسووفەش فەیلەسووفێکی سروشتی فرەیی بوو، چونکە بڕوای بە فرەیی بنەڕەت و ئەسڵی بوون هەبوو.

دەربارەی بنەچە و بنەڕەتی گەردوون و بوون و بوونەوەر، بۆچوون و قسەی زۆرمان هەیە، بەڵام ئەوەی باسمانکرد پوختەکەی بوو، کەواتە دەتوانین بڵێین: سەرەتای پەیدابوونی فەلسەفە لە یۆنان لێکۆڵینەوە و بەدوواچوون بوو بۆ بنەڕەت و ئەسڵی بوون و گەردووننانسی و سروشتناسی، واتە هەموو هەوڵەکانیان چڕکردبووەوە لە سروشت و گەردوون و مادده، نەدەچوون بەلای مرۆڤ و ئەخلاق و سیاسەت و جوانی و لۆژیک و مەعریفە و ....، کۆی هەموو بۆچوونەکانیشیان دوو شت بوو، یان بنەڕەتی گەردوونیان دەگەڕاندەوە بۆ یەک سەرچاوە، یان بۆ زیاتر لە سەرچاوەیەک، دوای ئەم فەیلەسووفە سروشتیانە فەیلەسووفانێکی دیکە هاتن کە زیاتر کاریان بە مرۆڤ خۆی بوو، نەک سروشت و بوون و گەردوون، دیارترینی ئەو ئاراستە و تەوژمەی دوای ئەم فەیلەسووفە

سروشتیانە تەوژم و قوتابخانەی سوفستائییەکان بوو[1].

## دووەم: ئاراستەی ئەنسرۆپۆلۆژی

## (سۆفستائیەکان و سوقرات)

دوای قۆناغی کۆزمۆلۆژی قۆناغی ئەنسرۆپۆلۆژی هات، کە ئاڕاستەی فەلسەفەی لە سروشتەوە برد بەرەو: «مرۆڤ، حەقیقەت و ڕاستی، حەق، دادگەری، خێر و شەڕ» دەتوانین بڵێین ئەم قۆناغە سەرەتا بە سوفستائییەکان دەستی پێکرد، سوفستائییەکان گومانی ڕەهایان هەبوو، گومانی ڕەها گومانێکە متمانەی بە هیچ سەچاوە و ئامرازێکی مەعریفە نییە و زانین و مەعریفەی شتەکان لای شتێکی ئەستەم و مەحاڵە، گومانی لە هەموو شتێک هەیە و یەقین بوونی نییە لەلای، گومان لەلای مەبەستە نەک ئامراز بۆ گەیشتن بە حەقیقەت، بە گومان دەستپێدەکات و بە گومانیش کۆتایی دێت، ئەم قوتابخانەیە پێی وایە هەوڵ و تێکۆشانی مرۆڤ بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و مەعریفەیەکی یەقینی شتێکی پڕوپووچ و بێسوود و بێئەنجامە.

لەو فەیلەسووفانەی ئەو بۆچوونەیان هەبووە فەیلەسووفی سۆفستائی (گۆرگیاس_ ٣٨٠ پ.ز) کە بۆچوونی خۆی بەم شێوەیە دەربڕیوە:

١. هیچ شتێک بوونی نییە.

٢. ئەگەر هەشبێت مرۆڤ ناتوانێت پەی پێببات و بیانزانێت.

٣. ئەگەر گریمان زانیشی و پەیشی پێبرد، ئەوا ناتوانێت بیگەیەنێت و گوزارشت

---

(١) فجر الفلسفة اليونانية قبل سقراط، د. أحمد فؤاد الأهواني، ل٢٢٢.
بواكير الفلسفة، رابوبرت، ترجمة: أحمد أمين، ١٢٣.
الفلسفة لمن يريد، د. نبيل، ١٧٥.

لەو مەعریفەیە بکات کە پێی گەیشتووە و بیگەیەنێت بە خەڵکانی دیکە.[١]

هەروەها فەیلەسووفی یۆنانی (بیرۆن _ ٢٧٥ پ. ز) گومانی لە هەموو شتێک هەیە، وەک دەڵێت: پێویستە متمانەمان بە عەقڵ و هەستەکان نەبێت و ڕا و بۆچوونمان نەبێت، پێویستە لەیەک کاتدا شتەکان ڕەت بکەینەوە و بیشیان سەلمێنین، یان نە ڕەت بکەینەوە نە بسەلمێنین[٢].

سۆفستائییەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە گومانیان لەسەر بوونی خودا یان خواوەندەکان دروستدەکرد، بۆیە «پرۆتاگۆراس» قسەی خۆی لەسەر بوونی خواوەندەکان دەکات و لە کتێبی «ڕاستی و ڕاستەقینە»دا دەڵێت: "ناتوانم بزانم خواوەندەکان بوونیان هەیە یاخود نا، زۆر شت بەربەستن بۆ ئەم زانینە، بەتایبەت ناڕوونی ئەم بابەتە و کورتی ژیان."[٣]

لێرەدا توێژەران کەوتوونەتە ڕاجیاییەوە دەربارەی تێگەیشتن لەم قسەیەی «پرۆتاگۆراس»، هەندێکیان بە نازانمگەرا (لا أدری) لە قەڵەمیانداوە، هەندێکی دیکەش بە ناباوەڕ و مولحید[٤].

بەڵام «جێثری» پێیوایە «پرۆتاگۆراس» بەم وتەیەی تەئکید لەسەر نازانمگەرایی و بێ حکومدانی خۆی دەکاتەوە لە بابەتی بوونی خوادا، نەوەک ئیلحاد و بێباوەڕی و بێئیمانی بە خواوەندەکان. هۆکاری ئەم نەزانینەش لەلای «پرۆتاگۆراس» دەگەڕێتەوە بۆ سنوورداری عەقڵی مرۆڤ، یان کەموکوڕی و لاوازی عەقڵی مرۆڤ وەک ئامرازێک بۆ گەیشتن بە باوەڕ و بۆچوونێکی یەکلاکەرەوە و قەتعی لە بارەی خوداوە[٥].

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف الكرم، ل: ٦٤.

(٢) مصادر المعرفة في الفكر الديني والفلسفي، د. عبد الرحمن بن زيد الزنيدي، ل: ٦١.

(٣) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم، ل٦٨.

(٤) جدلية العلاقة بين الدين والفسفة، ل٢٦٤.

(٥) جدلية العلاقة بين الدين والفسفة، ل٢٦٦ _ ٢٦٧.

لەپاشاندا «کریتاس» هات و وتی: خواوەندەکان جگە لە شتی داهێنراو و خەیاڵی هیچی تر نیین، دەستەڵاتدارەکان دایانهێناون بۆ چەوستندنەوە و خستنەژێرباری خۆیان و بڕیارەکانیان[1].

«برودیقوس» کە یەکێکە لە سەرانی سوفستائییەکان گرنگییەکی زۆری داوە بە بابەتی خوایەتی و خواوەندەکان، لەوەی دەکۆڵیەوە ئاخۆ بیرۆکەی خوایەتی لەکوێوە پەیدا بووە؟ چ پەیوەندییەکی بە کۆمەڵگەوە هەیە؟ چۆن مرۆڤایەتی ئەم خودایانەی ناسی، ...؟ لەکۆتاییدا گەیشت بەوەی کە هەموو ئەو شتانەی سوود بە مرۆڤ دەگەیەنن، وەک ئەستێرەکان و ڕووبارەکان و کانییەکان و خواردن و ...، هەموو ئەم شتانە مرۆڤ بە چاوێکی پیرۆزەوە سەیریان دەکات، بۆیە ناویان لە نان ناوە «دیمیتر» ناویان لە ئاو ناوە «پۆسایدۆن» ناویان لە ئاگر ناوە «هیفایستونس»، ...، بۆیە هەموویان پەرستراون.

لێرەدا پرسیارێک دێتە ئاراوە، ئایا «برودیقوس» هاوڕابووە لەگەڵ ئەم خەڵکە کە ئەم شتانە خودان، یان تەنیا توێژینەوەی لە بارەیانەوە کردووە؟ لە ڕاستیدا وا پێدەچێت کە بەس توێژەر بووبێت دەربارەی ئەم خواوەندانە، نەک باوەڕی پێیان بووبێت، هیچیشی لێ نەگێڕدراتەوە کە بە دوای بیروباوەڕی ڕاستیدا گەڕابێت[2].

بەڵام «ئەنتیفۆن» بێباوەڕی و ئیلحادی خۆی ئاشکراکردووە، لە چوارچێوەی تیۆریا ماددییەکەی، کە باوەڕی پێیبوو. چونکە ئەو باوەڕی بە چوار پێکهاتە و پێکهێنەرە سەرەکیەکە بوو «ئاگر، ئاو، گڵ، هەوا»، لەمەدا هاوڕای پێش خۆی بوو، بەڵام لەوەدا جیاواز بوو کە دروستبوونی ئەمانەی نەدەدا پاڵ خودا، بەڵکوو پاڵی دەدا لای کردەی سروشت، یان سوودفە، ... لێرەوە گەیشت بەوەی کە گەردوون پێویستی بە خواوەندەکان نییە، گەردوون خۆی خۆی دروستکردووە

---

(١) على اطلال المذهب المادى، محمد فريد وجدى، ل١٥ _ ١٦.

(٢) فجر الفلسلفة اليونانية، ل٣٠٤.

و بێپێویستە لە غەیری خۆی، یاساکانی سودفە و سروشت دەیبەن بەڕێوە، «ئەنتیفۆن» دوو بەڵگە دێنێتەوە لەسەر نەبوونی خواوەندەکان:

١. نەبوونی هیچ پێویستییەکی گەردوونی بە خواوەندەکان، گەردوون بەپێی یاساکانی سروشت دەڕوات بەڕێوە کە هەر لە ئەزەلەوە وابووە و یەک ئاواز بووە.

٢. سروشتی خواوەندەکان لێک جیاوازن، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەگۆڕێن و دژیەکن، ئەوە مرۆڤە خواوەندەکانی دروستکردووە، نەوەک حەقیقەتیان هەبێت لە زاتی خۆیاندا، کەواتە خواوەندەکان تەنیا لە خەیاڵی مرۆڤدان و بەس[1].

## سوقرات

سوقرات یەکەم کەس بوو لەبەرانبەر سوفستائییەکاندا وەستایەوە و هەوڵی سەلماندنی ئیمکانی مەعریفە و توانای مرۆڤی دا بۆ زانین و ناسین و مەعریفە و توانای عەقڵ، چونکە سوفستائییەکان بڕوایان نە بە عەقڵ بوو نە بە هەستەکان و پێیان وابوو هەردووکیان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دەگۆڕۆن و هەردووکیان مرۆڤ فریو دەدەن، کەواتە چارەسەر ئەوەیە بڕوایان پێ نەکەین! سوقرات هات وتی: ئێمە شتی بەدیهی و یاسای عەقڵی نەگۆڕمان هەیە و عەقڵ توانای گەیشتن بە مەعریفەی هەیە، پاشان ئەفلاتوون و ئەرستۆ و ... هاتن هەمان بەرگرییان لە عەقڵ کردوو و دژی ئەم ئاڕاستە گومانگەرا ڕەها ڕووخێنەرە وەستانەوە.

کەواتە فەلسەفە لەو سەردەمەدا کورت هەڵاتبوو لە: «مرۆڤ، حەقیقەت و ڕاستی، حەق، دادگەری، خێر، شەڕ»دا، هەر بۆیە سوقڕات بەوە بەناوبانگە کە فەلسەفەی لە ئاسمانەوە دابەزاندە سەر زەوی و تایبەتی کرد زیاتر بە مرۆڤ و بابەتەکانی خێر و شەڕ و... هتد. هەربۆیە پێناسەی سوقڕات (٤٦٩ - ٣٩٩

---

(١) فجر الفلسفة اليونانية، ل٢٩٤. و جدلية العلاقة بين الدين والفسفة، ل١٨٩.

پ. ز) بۆ فەلسەفە بریتییە لە: گەڕانی ئەقڵە بە دوای نێوەڕۆکی ئەو شتانەی دەمانگەیێننە چاکە.

## سێیەم: ئاڕاستەی گشتگیر و کۆکەرەوە

دوایی سوقرات قوتابییەکەی ئەفلاتوون (٤٥٧ - ٣٤٧ پ.ز) هات و وتی فەلسەفە: گەڕانە بۆ کرۆکی بوونەکان و یاسا جوانەکان تا یەکەم بەدیهێنەریان بناسرێت، شەڕەفی سەرکردایەتی هەموو زانستەکانی هەیە.

دوای ئەم ئەرستۆ (٣٨٤ - ٣٢٢ پ.ز) هات و وتی: فەلسەفە: زانستێکی بیردۆزییە بۆ بنەما و هۆکارە سەرەتاییەکان.

فەلسەفە لە لای ئەرستۆ زۆر زۆر فرەوانبوو، تا وای لێهات یەکسان بوو بەزانست، واتا: زانستەکانی هەمووی لەخۆ دەگرت. الفلسفة النظرية، الحكمة النظرية، العلم النظري، فەلسەفەی بیردۆزی نەزەری،کە سێ بەش دەگرێتەوە: (الطبيعيات) سروشت، وەک: فیزیا و کیمیا و بایەلۆجژی و فەلەک و...هتد. (الرياضيات) ڕیازیات، وەک حیساب و ئەندازیاری و... هتد. (الإلهيات) ئیلاهیات بە دوو واتا بەکارهاتووە، (عام، گشتی)، کە بوون دەگرێتەوە، (خاص، تایبەت) کە ناسینی خودا دەگرێتەوە.الفلسفة العملية، الحكمة العملية، العلم العملي، فەلسەفەی کردەیی، ئەویش سێ بەش دەگرێتەوە:(الأخلاق) ڕەوشت، کە بۆ ڕێکخستنی تاکە. (الاقتصاد) ئابووری، بۆ ڕیکخستنی خێزان. (السياسة) سیاسەت، بۆ ڕێکخسنی شار و دەوڵەت. کەواتا لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە فەلسەفە لای ئەرستۆ ماناکەی زۆر فراوانە، بە شێوەیەک کە زانست و غەیری زانستیش دەگرێتەوە.

کەواتە لەسەردەمی ئەم دوو فەیلەسووفەدا فەلسەفە ئاڕاستەیەکی

گشتگیری وەرگرت و کورتهەڵنەهات لە سروشت یان مرۆڤ بەتەنیا، بەڵکوو وای لێهات و هەموو بابەتە فکری و فەلسەفی و زانستییەکانی گرتەوە. بۆیە دەبینین هەریەک لە ئەفلاتوون و ئەرستۆ بۆچوونی زۆریان هەیە دەربارەی مرۆڤ، خودا، بوون، گەردوون، سروشت، ئەودیوسروشت، خێر، شەڕ، ئەخلاق، ئاکار، سیاسەت، ئابووری، دەوڵەت، لۆژیک و ...[١]

سوکرات (بە یۆنانی: Σωκράτης، سۆکراتیس؛ ٤٦٩ی پ.ز - ٣٩٩ پ.ز) فەیلەسووفێکی یۆنانی کۆن بوو کە بە یەکێک لە دامەزرێنەرانی فەلسەفەی ڕۆژئاوایی دادەنرێت. سوکرات کەسایەتییەکی لێڵ و ناڕوونی هەیە لە مێژووی فەلسەفەدا. ئەو هیچ نووسراوەیەکی لە خۆی بەجێ نەهێشتووە؛ ئەوەی کە ئەمڕۆکە دەیزانین لەسەری هەمووی بەهۆی نووسراوەکانی نووسەرانی پاش خۆیەوەیە، بەتایبەت نووسراوەکانی پلاتۆن و زینۆفۆن کە دوان لە قوتابییەکانی بوون.

## ناساندنی هەندێک فەیلەسووف و قوتابخانەی فەلسەفی یۆنانی کۆن

### تاڵیس (٦٤٠ _ ٥٤٨ پ. م)

تاڵیس لە تێڕوانی ئەرستۆدا یەکەم فەیلەسووف بووە، لە سەردەمی خۆیدا بە حیکمەت و فەلسەفە ناسراوە و ناوبانگێکی زۆری دەرکردووە[٢].

تاڵیس هەموو تەرکیز و تیشکی خستە سەر سروشت (طبيعة)، بیر و فکری لەلای ئەوەبوو ئاخۆ ئەم جیهانە سروشتییە لە چی پێکهاتووە، چ شتێک یەکەم

---

(١) الفلسفة لمن يريد، د. نبيل، ١٠١.

(٢) الفلسفة الإغرقية، د/ محمد غلاب، ب ١، ل ٣٣.

ماددەی سەرەتایی بووە کە هەموو شتەکانی لێوە پەیدابووە؟ تاڵیس پێی وابوو ئەم ماددەیە دەبێت شتێکی زۆر نەرم بێت، بەشێوەیەک قبووڵی هەموو جۆرە شکڵ و شێوەیەک بکات و ببێتە هەموو شتێک، هەروەها نابێت سیفەتەکانی سنووردار بن، بۆئەوەی بۆ هەموو شتێکی ئەم جیهانە بگونجێت و هەموو شتێکی لێ دروستببێت[١].

تاڵیس زۆر بە ڕوونی دەیگوت: ئاو جەوهەری سەرەکییە، بەڵکوو ئەسڵ و بنەڕەتی یەکەمە بۆ گەردوون و بوون بە هەموویەوە، ئەو جیاوازیانەش کە لە بەشەکانی جیهان و گەردووندا دەیبینی تەنیا بەرەنجامی ئەو گۆڕانکاریانەیە کە بەسەر ئاودا دێن[٢].

دکتۆر عەلی سامی نەششار پێیوایە کە بیرۆکە و فکری سەرەکی تاڵیس بۆ ڕاڤە و تەفسیری بوون کورت دەبێتە لە: بەدیهێنەری یەکەم ئاوە، ئاویش قبووڵی هەموو شکڵ و شێوەیەک دەکات و هەر لە ئاویشەوە هەموو جەوهەرەکانی ئاسمان و زەویی و ئەوەی لەنێوانیاندایە هاتوونە بوون، ئاو هۆکاری هەموو داهێنەرێکە، هۆکاری هەموو پێکهێنەرە جەستەییەکانە، بۆیە کاتێک ئاو بەستی زەوی لێ دروستبوو، کاتێک بەستنەکە بۆوە و نەما هەوا دروستبوو، لە سافی هەواشەوە ئاگر دروستبوو.[٣]

وتەیەکی ئەرستۆ هەیە کە پاڵیداتەوە لای تاڵیس، ئەویش ئەوەیە: "هەموو شتێک پڕە لە خوداکان"[٤]

ڕاجیاییەکی زۆر هەیە دەربارەیی ڕاڤە و تەفسیری ئەم وتەیەی تاڵیس،

---

(١) قصة الفلسفة، د. زكى نجيب، ل ١٣.

(٢) الفلسفة الإغرقية، د/ محمد غلاب، ب ١، ل ٣٤.

(٣) نشأەالفكر الفلسفى فى الإسلام، د. سامى على نەششار، ب ١، ل ١١٤.

(٤) النفس، أرستو، ترجمة د. الاهوانى، ل ٤٤.

ئەرستۆ لە کتێبی نەفسدا بەشیوەیەک ڕاڤەی کردووە کە جیهان نەفسی هەیە، واتە هەموو کارێک نەفسە، نەفسیش بە هەموو جیهان و بووندا بڵاوبووەتەوە، کەواتە مادده زیندووە، د. یوسف کەرەم پێیوایە: ئەوەی پشتگیری ئەم تەئویلەی ئەرستۆ دەکات دەستەواژەیەکە کە ئەرستۆ بە حەزەرەوە دەیهێنێت، ئەویش ئەوەیە کە بەردی موگناتیسی نەفسی هەیە، چونکە ئاسن دەجووڵێنێت، کەواتە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بنەڕەتی هەموو کار و جووڵەیەک لەلای تاڵیس بریتییە لە نەفس، کاتێکیش نەفس دیاردەیەکی گشتی بوو، نەفسیش دەبێتە شتێکی گشتی و کولی[1].

مێژوونووس «ئەتیبۆس» بەم شێوەیە ڕاڤەی دەکات: تاڵیس بڕوای بە عەقڵی جیهان و گەردوون هەیە، «شیشرۆن»یش پێی وایە تاڵیس: بڕوای بە عەقڵی خودایی هەیە کە هەموو شتێکی لە ئاو دروستکردووە[2].

بۆیە تاڵیس پێیوابوو مادده زیندووە و ڕۆحی ژیانی لەخۆگرتووە، ئەم ڕۆحە دەستپێکی هەموو جووڵە و گۆڕان و گەشەسەندنەکانە کە لەسەر مادده دەیان بینین.

کەواتە: هەموو بەشێک لە بەشەکانی گەردوون ژیان یان خوداکانی تێدایە.[3]

بەم پێیە تاڵیس خوداکانی لە ئاسمانەوە هێنایە سەر زەویی و لەوێدا نیشتەجێی کردن.[4]

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوونێکی دیکە هەیە کە پێیوایە لە وتەکانی تاڵیسدا سیفەتێکی لاهوتی ڕاشکاو هەیە، هەروەک جۆرج سارتۆن دەڵێت: "پێغەمبەری

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم، ل ٢٨.

(٢) فكرة الالوهية عند أفلاتون، د. مصطفى النشار، ل ٤٥.

(٣) الفلسفة الإغرقية، د/ محمد غلاب، ب ١، ل ٣٥.

(٤) فجر الفلسفة اليونانية، د. الاهواني، ل ٥٤.

ئیسلام دوای دوازدە سەدە گەیشتووە بە دەرەنجامێکی نزیک لەو دەرەنجامەی کە تاڵیس پێی گەیشتووە، چونکە خودا لە ڕێی وەحیەوە پێی وتووە: هەموو شتێکی زیندوومان لە ئاو دروستکردووە. هیچ دوور نییە ئەم تێڕوانینەی تاڵیس دزەی پێکرابێت بۆ موحەممەد، بەڵام لە هەمان کاتیشدا زەروری نییە ئەم بانگەشەیە بەڕەهایی بکەین و بڵێین ئەم پەیوەندییە هەبووە، بەڵکوو نزیکترە لە عەقڵ کە بڵێین موحەممەد هەل و فرسەتی زۆری لەبەردەستبووە، هەروەک چۆن تاڵیس یش هەل و فرسەتی زۆری لەبەردەست بووە، بەڵام هەردووکیان بە دوو شێوەی جیاواز دەڕیانبڕیوە، چونکە موحەممەد پێغەمبەر بووە وەک پێغەمبەرانی پێشووی جوولەکە، بەڵام تاڵیس پیاوێکی زانا بووە.[1]

شەهرستانیش هەمان بۆچوونی هەیە و پێیوایە بۆچوونی تاڵیس سروشتێکی لاهوتی ئایینی هەیە، بۆیە دەڵێت: "لە تەوراتدا لە سفری یەکەمدا دەڵێت: بنەڕەتی بوونەوەر و دروستکردن جەوهەرێک بووە کە خودا دروستیکردووە، پاشان بەشێوەیەکی هەیبەتدار سەیری کردووە و هەموو بەشەکانی تواوەتەوە و بووە بە ئاو، پاشان لەم ئاوەوە بوخارێک بەرزبۆتەوە لەشێوەی دووکەڵ، پاشان لەوەوە ئاسمانەکان دروستبوون و لەسەر ڕووی ئاو کەفێک پەیدابوو وەک کەفی دەریا، پاشان لەوەوە زەوی دروستبوو، پاشان شاخەکانی لەناو زەوی چەقاند، وەک بڵێی تاڵیس ڕێبازەکەی خۆی ڕێک لە تیشکی پێغەمبەرایەتییەوە وەرگرتووە"[2]

شەهرستانی گومانی لەوە هەیە کە پاڵدراوە بۆلای تاڵیس، بەوەی کە ئاو بەدیهێنەری یەکەمە، بۆیە دەڵێت: "بەڕاستی سەیرە کە لە تاڵیس گێڕدراتەوە: کە بەدیهێنەری یەکەم بریتییە لە ئاو"[٤٢]. پاشان دێت ڕاڤەی ئەم قسەیەی تاڵیس دەکات و دڵنیایی دەدات کە بۆچوونەکەی تاڵیس لە بابەتی ئیلاهیاتدا

---

(١) تاريخ العلم، جورج سارتون، ب١، ل ٣٦٥.

(٢) الملل والنحل، الشهرساني، ب٢، ل٦٣.

زۆر جیاوازە لەمە، بۆیە دەڵێت: لە تاڵیسەوە گێڕدراوەتەوە کە وتوویەتی: "گەردوون بەدیهێنەرێکی هەیە کە هیچ عەقڵێک ناتوانێت حەقیقەتی سیفەتەکانی بزانێت، بەڵکوو لەڕێگەی ئاسار و بەدیهێنراوەکانیەوە دەناسرێت، ئەو زاتە ناوەکەی نازانرێت، چجای حەقیقەتەکەی، تەنیا لە ڕێی کار و داهێنان و درروستکراوەکانی نەبێت."[١]

ئیبنو تەیمیەش هەمان بۆچوونی شەهرستانی هەیە و دەڵێت: "تاڵیس _ یەکێکە لە کۆڵەکەکانی حیکمەت _ دەڵێت: عەقڵ ناتوانێت سیفەتاکانی خودا بزانێت تەنیا لە ڕێی دروستکراوەکانی نەبێت."[٢]

کەواتە بەم پێیە تاڵسیش پێیوایە:

١. بنەڕەتی یەکەم ئاوە.

٢. نەفس هێزێکی جوڵێنەرە، ماددەش زیندووە، ئەوەی پاڵپشتی ئەمە دەکات بریتییە لە بەردی موگناتیسی کە نەفسی هەیە، چونکە ئاسن ڕادەکێشێت.

٣. ئەو قسەیەی ئەرستۆ کە داویەتیە پاڵ تاڵیس "گەردوون پڕە لە خوداکان"، ڕاڤەی جیاواز هەڵدەگرێت، بۆیە ئەتیسۆن پێی وابوو تاڵیس باوەڕی بە عەقڵی گەردوون هەبوو، وە شیشرۆنیش پێیوابوو تاڵیس باوەڕی بە عەقڵی خوایی هەیە کە هەموو شتێکی لە ئاو دروستکردووە، هەندێک لە زانا موسڵمانەکانی وەک شەهرستانیش پێیانوابوو تاڵیس ئەم بۆچوونەی لە تیشکی پێغەمبەرایەتی وەرگرتووە، هەروەک چۆن مێژوونووسی بەلجیکیش«سارتۆن» هەمان ڕای هەبوو لە کتێبی (تاریخ العلم)[٣].

---

(١) الملل والنحل، الشهرسانی، ب٢، ل٦٣.

(٢) درء تعارض العقل والنقل، ابن تیمیة، ب ٢، ل١٦٣.

(٣) الاتجهات الفسفیة الیونانیة فی الالهیات، أحمد بن سعود بن سعد الغامدی، ٧١ _ ٧٨.

## ئەنەکسیمەندەریس (٦١٠ - ٥٤٧ پ م)

دوای تالیس، سەرکردایەتیکردنی قوتابخانەی مەڵتی کەوتە دەستی ئەنەکسیمەندەریس، دەرکەوتنی ئەو لە نیوەی سەدەی شەشەمی پێش زایین بوو لە ساڵی (٥٦٥ پ م)، ئەنەکسیمەندەریس یەکەم کەس بوو کە نووسینی لەبارەی فەلسەفەوە کرد، کتێبێکی هەیە بە ناوی «لە سروشتدا»[1]

ئەناکسێمەندەریس بە بازرگانییەوە خەریک بوو، هاوکاتیش لە بارەی سروشت و جوگرافیاوە دەینووسی و توانیشی نەخشەی زەوی بکێشێت. بەڵام ئەوەی زیاتر بایەخ بە لێکۆڵینەوەکانی دەدا پەیڕەوە ئەقلانی و ڕێکخستنە لۆژیکییەکەیەتی.

ئەمیش وەک تالیس بە دوای سەرچاوەیەکدا دەگەڕا کە هەموو بوونەوەرەکانی بچنەوە سەر، بەڵام ئەم سەرچاوەیە نابێت (ئاو)ە کەی تالیسی بێت، یا هیچ ماتریالێکی دیاریکراو و سنووردار بێت، چ لە لایەنی چۆنێتی و چ لە لایەن چەندێتییەوە، چونکە سنووردار و دیاریکراو ناتوانن بە تەواوی گۆڕان و زۆرێتی سروشت لێک بدەنەوە. کەواتە ئەناکسێمەندەریس بە دوای سەرچاوەی بوونەوەرەکاندا دەگەڕێت و لە ئەنجامدا سەرچاوەیەکی دیاری نەکراوو بێسنوور و بێکۆتایی دەدۆزێتەوە، ئەم سەرچاوەیەش پێی دەوترت «ئەپیرۆن» واتا «بێسنوور» یا «دیارینەکراو».

ئەم ئەپیرۆنە هەمیشەییە و ئەزەلییە و نەمرە و لەناو ناچێت، هەموو شتەکان لەوەوە دروست بوون و هەر بۆ ئەویش دەگەڕێنەوە، هەمیشە بزێوە و بزووتنەوەکەش دەبێتە هۆی دیاریکردن و سنووردانان؛ لەم ڕێگایەشەوە جیهان و ئاسمانەکان دروست بوون و هیچ هۆیەکیش لە دەرەوەی ئەپیرۆن و بزووتنەوەکەی دەستی لەم دروستبوونەدا نییە. کاتێک کە ئەپیرۆن و

---

(١) الفلسفة اليونانية تاريخها ومشكلاتها، ل ٥١.

بزووتنەوەکەی هەمیشەیی بن، ئەوا جیهان و ئاسمانەکان هەمیشەیی و ئەزەلیین.

بەڵام ئایا چۆن جیهانەکان لە ئەپیرۆنەوە پەیدا بوون؟

لێرەدا ئەناکسێمەندەریس دەڵێت: یەکەم شتێک کە بزووتنەوەی شتەکانی دیاریکرد، دژەکان بوون، گەرم و سارد، تەڕ و وشک ... هتد.

بزووتنەوە و ململانێی ئەم دژانەش بووە هۆی لێکجیابوونەوەی هەندێکیان و پێکەوە کۆبوونەوەی هەندێکی تریان، لە ڕێگای ئەم بزووتنەوە و لێک جیابوونەوە و کۆبوونەوەیەشەوە هەموو تەنە جیاوازەکان دروست بوون. یەکەمینی ئەم دژانەش کە دیاریکران گەرم و سارد بوون، لە گەرمی و ساردیشەوە هەواو ئاگر دروست بوون ... کاتێک کە ساردی چڕبووەوە بووە ئاو و دوایی چڕتربووەوە بووە خاک و خۆڵ و لەوەشەوە زەوی و ئاسمان ئەستێرەکان پەیدا بوون.

هەروا دەڵێن گوایە ئەنکسێمەندەریس بیری لەوەش کردۆتەوە، کە گیانەوەرە زیندووەکان لە تەڕی زەویەوە پەیدا بوون، ئەمیش کاتێک کە خۆر ئەو تەڕییەی کردووە بە هەڵم، بە یەک جاریش لەم شێوەیدا پەیدا نەبوون، بەڵکوو بە زۆر قۆناغی جیاجیادا تێپەڕیون تا ئەم شێوەیەی ئەمڕۆیان وەرگرتووە. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، ئەوا دەتوانرێت ئەناکسێمەندەریس بە یەکەم دانەر و پێشەوای تیۆری پەرەسەند دابنرێت بەر لە داروین بە ماوەیەکی زۆر.

**خودا لەلای ئەنەکسیمەندەریس**

ئەنەکسیمەندەریس پێی وابوو ئاو ناکرێت ببێتە بنەڕەتی یەکەمی بوون و گەردوون، چونکە گۆڕانی ئاو لە بەستنەوە بۆ ئاوی ڕۆیشتوو بەگەرمی، وای لێدێ کە گەرمی و سادی بکەونە پێش ئاوەوە، هەروەها ناکرێت بنەڕەتی یەکەمی

بوون و گەردوون شتێکی دیاریکراوبێت[1].

هەر بۆیە ئەنەکسیمەندەریس پێی وابوو بنەڕەتی یەکەمی بوون و گەردوون «ئەپیرۆن»ە، واتە: بێسنوور و بێکۆتا.

بیرۆکەی ئەپیرۆن دوو واتای سەرەکی لەخۆدەگرێت:

١. لەڕووی چۆنیەتییەوە دیاریکراو نییە، واتە دیار نییە چییە، نە ئاوە، نە هەوا، نە خۆڵ، نە ئاگر، نە ...، هەر وەک فەیلەسووفانی دیکە کە پێیان وابوو یەکێکە لەمانە.

٢. لە ڕووی چەندییەتییەوە بێسنوور و بێکۆتایە، واتە شتێکی ماددی نییە تاوەکوو سنووری هەبێت، زۆر ئاساییە سەرچاوەی گەردوون و بوون سنووردار نەبێت، لە ڕووی چەندییەتییەوە، چونکە ئەگەر سنووردار بێت ئەوە بە هیچ شێوەیەک ناکرێت ببێتە دەستپێک و بنەڕەتی بوون و هەڵقووڵان و پەیدابوونی ئەو هەمووە بوونەوەری پێ ڕاڤە بکرێت، بۆیە بۆئەوەی توانای هەبێت لەسەر دروستکردنی بەردەوام و نوێبووەوە، زۆر شتێکی بەڵگەنەویستە ئەگەر بڵێین شتێکی بێسنوورە لە ڕووی چەندییەتییەوە.[2]

ئەنەکسیمەندەریس ڕاڤەی ئەم ئەپیرۆنەی کردووە لە کتێبەکەیدا دەربارەی سروشت، بەڵام وەک ئەرستۆ باسیکردووە تەنیا چەند بڕگەیەکی ماوە و ئەوەی دیکەی فەوتاوە، بەڵام ئەوەی کە ماوە لەم کتێبە و ئەرستۆ باسیکردووە ناتوانێت ناڕوونی ئەم فەلسەفەیە ڕوونبکاتەوە، پێشدەچێت لەبەر ئەوە بێت کە ئەنەکسیمەندەریس مردووە پێش ئەوەی ڕوونیبکاتەوە و ناڕوونییەکانی لاببات و ڕوونکردنەوەیەکی قەناعەت پێکەر بخاتەڕوو، یان ڕوونیکردووەتەوە

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم، ل ٢٩.

(٢) موسوعة الفلسفة، د. بدوي، ب ١، ل٢٧٧ - ٢٧٨. والفلسفة الإغريقية، محمد جديدي، ل ١١٦ - ١١٨.

و فەوتاوە لەو کتێبەدا، چونکە «ئەنەکسیمانس» کە قوتابییەکی ڕاستەوخۆی ئەنەکسیمەندەریس بووە، گومانی هەبووە لە مانای ڕوونی فەلسەفەکەیی و پێی وابووە مەبەستی ئەنەکسیمەندەریس لە ئەپیرۆن بریتییە لە هەوا[1].

بەڵام ڕاڤەکارانی ئەرستۆ لە سەرووی هەمووشیانەوە «ئیسکەندەر ئەڤرۆدیسی» و «سەنبولقیوس» هەوڵیانداوە ئەو بێسنوور (اللامحدود) و نادیاریکراوە دیاری بکەن و وتوویانە شتێکە لەنێوان هەوا و ئاگردا[2].

بەشێکیش لە ڕەخنەگران پێیان وایە نابێت ئەم ئەپیرۆنە بێسنوور بێت لە ڕووی چەندییەتییەوە، چونکە ئەوان دەڵێن ئەنەکسیمەندەریس پێی وایە ئەپیرۆن بە جووڵەیەکی بازنەیی دەجووڵێت، ئەم جووڵە بازنەییەش ناکرێت وێنا بکرێت ئەگەر بێسنوور و بێکۆتا بێت لە ڕووی چەندییەتییەوە. دەشگونجێت ئەنەکسیمەندەریس نەیتوانیبێت درکی ئەوە بکات کە دژیەکیی لەنێوان ئەوەدا هەیە کە ئەپیرۆن بێسنووربێت لە چەندیەتیدا، لەگەڵ ئەوەش جووڵاو بێت بە جووڵەیەکی بازنەیی، چونکە ئەوەی جووڵابێت بە جووڵەیەکی بازنەیی، ئەوە بەدڵنیاییەوە لێیەوە لازم دەبێت کە سنووردار بێت لە ڕووی چەندییەتییەوە، ئەگەرنا دژیەکی پەیدا دەبێت لەنێوان ئەوەی بێسنوور بێت لە ڕووی چەندییەتییەوە و جووڵاویش بێت بە جووڵەیەکی بازنەیی[3].

کەواتە ئەنجامی بۆچوونی ئەنەکسیمەندەریس دەبێتە ئەوەی کە بنەڕەتی بوون و گەردوون بێسنوور و بێکۆتایە، هەم لە ڕووی چەندییەتی، هەم لە ڕووی چۆنیەتی.

«بەیجر» ڕاڤەی فکری ئەنەکسیمەندەریس دەکات بەوەی کە جۆرێکە لە

---

(١) الفلسفة الإغريقية، محمد غلاب، ب١، ل٤١.

(٢) موسوعة الفلسفة، بدوي، ب١، ل٢٧٨. والفلسفة اليونانية ما قبل السقراطية، د. طيب بو عزة، ل ٤٤٥.

(٣) موسوعة الفلسفة، بدوي، ب١، ل٢٧٨.

گەشەسەندنی ئایینی ئەفسانەیی، چونکە سیفەتی خوداکان ئاوایە «سەرەتا، ناوەڕاست، کۆتایی بۆ هەموو شتێک» پێی وایە ئەمەش ڕێک سیفەتی ئەپیرۆنە، وتەکەی ئەرستۆش هەر بەمە ڕاڤە دەکات بەوەی کە ئەپیرۆن خودایی و هەمیشەییە و تێکناچێت.[1]

شارەزووریش وتەکەی ئەنەکسیمەندەریس لەبارەی بێسنوورەوە ئاوا ڕاڤە دەکات: بۆچوونی ئەنەکسیمەندەریس بەوەی کە یەکەم بوونەوەر و دروستکراوی خودا (کە بێسنوورە و بێکۆتایە)، گەردوون لەوەوە دروستکراوە و هەمووشی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە[2].

ئەنەکسیمەندەریس پێی وایە پەیدابوونی ژیان لەسەرەتادا ژیانلەبەری وەک ماسی و ... بووە و لەئاودا ژیاوە، لەشی بە توێکڵ و پوولەکە داپۆشراوە، دوای ئەوە ئاوەکە نەماوە و کەوتووەتە سەر زەوی و وشکانی و توێکڵەکەی فڕێداوە و لەگەڵ دۆخە تازەکەدا گونجاوە و ڕاهاتووە[3].

چۆن بوونەوەر لەم ئەپیرۆنەوە پەیدابووە؟ چۆن هاتنە سەر زەوی؟

ئەنەکسیمەندەریس پێی وایە زەوی شلەمەنی بووە، دواتر وردە وردە بەستوویەتی، دواتر گەرمییەکی زۆر ڕژاوەتە سەر زەوی و لەم شلەوە بوخارێکی زۆر بەرزبۆتەوە، کە دواتر چینەکانی هەوای لێ دروستبووە، پاشان کاتێک ئەم گەرمییە لەگەڵ ئەم ساردییەی زەوی یەکیانگرتووە بوونەوەرە زیندووەکان بەدیهاتوون، ... ئەم بوونەوەرانە لەسەرەتادا شتی بچووک و کەم و نزم بوون، پاشان گەشەیان سەندووە تاوەکوو گەیشتوونە پلەیەکی بەرز.

«فلۆترخوس» پێی وایە ئەنەکسیمەندەریس دەیوت: خەڵک لەناو

---

(١) الفلسفة اليونانية، د. الأهواني، ل٦٠.

(٢) نشأة التفكير الفلسفي في الإسلام، ب١، ل١١٩.

(٣) تاريخ العلم، جۆرج سارتون، ل ٣٧٣.

ماسییەکانەوە پەیدابووە، پاشان کە گەورەبوون وەک هەنگ و سەگی دەریایی تێیدا، تواناییان هەبووە بەرگری لەخۆیان بکەن، پاشان فڕێدراونە کەنارەکان و هاتوونە وشکانی و ژیانیان دەستپێکردووە[١].

لەدوای ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆ بیرۆکەی خودا لەلای ئەنەکسیمەندەریس، ڕووندەبێتەوە کە ئەنەکسیمەندەریس جیاوازی نەکردووە لەنێوان خودا و سروشتدا، پێی وابووە کە سروشت خودایە و خوداش سروشت، چونکە تەقریبەن بێسنوور (اللامحدود)ی بە خودا حیساب کرد.

«ولیم ساهاکیان» پێی وایە خودای بێسنوور لەلای ئەنەکسیمەندەریس جیاوازە لە شکڵ و شێوازە سنووردارەکانی ماددە کە لەوەوەسەرچاوە دەگرن، خودا بە سیفەتی بێسنوورییەکەی حەقیقەتێکی ئەزەلی و ئەبەدی هەیە و دەکەوێتە ئەودیو سنووری ئەزموونی مرۆڤەوە، ئەگەر ئێمە خوداش نەبینین بەڵام کارلێکە هەستپێکراوەکانی ماددە دەبینین، ئەم بێسنوورە (اللامحدود) ئەزلیی و بێسەرەتایە و کاتی نییە، هەموو ئاسمانەکان و جیهانەکانیش لەوەوە سەرچاوەیانگرتووە، جووڵەی ئەزەلیش ئەسڵ و بنەڕەتی ئەم گەردوون و جیهانەیە، ئەم شتە ئەزەلیەش نافەوتێت، بەڵکوو سەرچاوەی هەموو شتەکانە، کاتێک خودا ئەم جیهانەی دروستکرد، ساردی و گەرمی جیابوونەوە لە ئەپیرۆن، پاشان هەموو ئەو شتانەی لەم دوانە دروستبوون شوێنی ئەمە کەوتن، بوخار بەهۆی گەرماوە بەرزبۆوە و سێ پێکهێنەرە سەرەکیەکەی سەرهتای لێوە پەیدابوو کە وشکی و هەوا و ئاگرە[٢].

کەواتە ناڕوونییەکی زۆر هەیە لەلای ئەنەکسیمەندەریس دەربارەی خودا و ئاسان نییە بەڕوونی دیاری بکرێت کامەیە خودا، چونکە وەک باسمانکرد وتە نووسراوەکانی لەو بارەوە یان نەماون یان مانای ڕوون نادەن بەدەستەوە.

---

(١) فجر الفسلفة اليونانية، د. الأهواني، ل٦٣.

(٢) تاريخ الفلسفة اليونانية، وليم ساهاكيان، ل ١٢ - ١٤.

## ئەناکسێمانس (٥٨٠ـ ٥٤٨ پ.ز)

ئەناکسێمانس سێیەم بیرمەندی ماڵتییە، قوتابی و هاونیشتمانی ئەناکسێمەندەریس بوو. لە نێوان چارەکەی یەکەمی سەدەی شەشەمی (پ.ز) و چارەکەی کۆتایی ئەو سەدەیەدا ژیاوە.[1]

ئەمیش هەروەک بیرمەندەکانی پێش خۆی لە بارەی سەرچاوەی بوونەوەر دواوە، بەڵام نە «ئاو»ەکەی تالیس و نە «ئەپیرۆن»ەکەی ئەناکسمەندەریسی پەسەند کردووە. بەڵکوو بەڕای ئەم مژادی یەکەم کە هەموو بوونەوەرەکانی لێ دروست بوون «هەوا»یە، کە ماتەرێکی دیاریکراوو بێ کۆتایی و بزێوە. هۆکاری ژیانە لە هەموو جیهانەکان و هەموو شتە بزێوەکاندا، بە هۆی چڕبوون و شاشبوونیەوە هەموو شتەکانی لێ دروست دەبن.

بەمجۆرە دەبینین ئەناکسێمانس هەر بەوەوە ناوەستێت بڕیاری بنەڕەتی یەکەم بدات و هیچی تر، بەڵکوو باسی لایەنی چۆنێتی دروستبوونی جیهانەکانیش دەکات. ئەمیش بە گەڕاندنەوەی چۆنییەتی بۆ چەندییەتی. بە ڕای ئەناکسێمانس شتەکان بۆیە لێک جیاوازن چونکە چەندییتییەکی جیاوازیان لە هەمان شت، یان هەمان ڕەگەز کە لێی دروست بوون لە خۆگرتووە، نەک لەبەرئەوەی لە چەند ڕەگەزێکی جیاواز پێک هاتوون.

بزووتنەوەی هەوا دەبێتە هۆی گۆڕانی هەواکە، شاش دەبێت و دەبێتە ئاگر، دوای چڕتر دەبێتەوە و بەپێی پلەی چڕێتییەکەی: «با، هەور، خۆڵ، بەرد» دروست دەبێت.[2]

لێرەدا مێژوونووسان توێژەران و ڕەخنەگران کەوتوونەتە ڕاجیاییەوە لە بارەی ئەم هەوایەوە، ئایا ئەم هەوایە کە ئێمە هەستی پێدەکەین؟ یان هەوایەکی

---

(١) تاریخ الفلسفة الیونانیة، یوسف کرم، ل٣٠، الموسوعة الفلسفیة الختصرة، ل٨٧.

(٢) الفسفة الإغریقیة، د. محمد غلاب، ب١، ل٤٨.

دیکەیە کە هۆکاری ژیانە؟ هەروەها کەوتوونە ڕاجیابییەوە لەبارەی سروشتی جووڵەی ئەم هەوایەی کە پێی دەجووڵێت، ئایا جووڵەیەکی بازنەییە وەک «تیشملر» دەڵێت، یان وەک گێژەڵوکەیە؟

هەوا لەلای ئەناکسێمانس بنەڕەت و هەوێنی هەموو شتێکە، ئەم هەوایەش چەند چەشنێک دەگۆڕێت، سووک بوون و خەستبوونیش هۆی ئەم گۆڕانانەن، لە ئەنجامی ئەمەشەوە هەموو شتەکان دروستدەبن، کاتێک هەوا سووک دەبێت ئاگری لێ پەیدا دەبێت، کاتێکیش خەست دەبێت ئاوی لێ دروستدەبێت، ئاوەکەش گڵ و بەرد هەڵدێنێت، زەوی وەک سفرەیەک وایە و هەوا دەوری هەموو شتێکی داوە.

لە وەڵامی ئەوەی بۆ ئەناکسێمانس هەوای هەڵبژاردووە شارەزایان پێیان وایە بۆیە هەوای هەڵبژاردووە چونکە هەوا پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە بەردەوامی و هەمیشەیی ژیانەوە هەیە. بەبڕوای ئەناکسێمانس گیانمان لە هەوا دروستبووە و یەکێتی و یەکپارچەیی بوونمان دەپارێزێت، هەواش دەوری جیهان و گەردوونی داوە و وا دەردەکەوێت جیهانیش وەک مرۆڤ هەناسە بدات.

جگە لەوەش سەرچاوەی ژیانی مرۆڤ هەناسەیە و جیاوازی نێوان مردوو و زیندووش ئەوەیە کە یەکەمیان هەناسە نادات و دووەمیان هەناسە دەدات، سەرەڕای ئەوەش گەردوون و خۆر و مانگ و خواوەندەکانیش هەر لە هەوا دروستبوون.

ئەناکسێمانس بەو هەڵوێستەی فەلسەفەیەک دەردەبڕێت کە بریتییە لە یەکەمایەتی و یەکڕەنگی ماددی سروشت، ئەویش هەوایە و هەموو دیاردە و گۆڕانەکانی سروشتیش بە خەستبوونەوە و سووکبوونی هەوا لێکدەداتەوە.[١]

---

(١) تاریخ العم، جورج سارتون، ب١، ل٣٧٤. سەرەتایەک لە فەلسەفەی یۆنان، حەمید عزیز، ل٧٠.

«ئەیتبۆس» لە «ئەناکسێمانس» دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: هەروەک چۆن نەفس لەبەرئەوەی هەوایە دەمانگرێت، بە هەمان شێوە هەناسەدان و هەواش دەوری هەموو گەردوون و جیهان دەدەن.[١]

ئەم ڕستەیە بیروباوەڕی ئەناکسێمانس ڕوونەکاتەوە، بەوەی کە هەوا تەنیا پێکهاتەیەکی ماددی نییە، بەڵکوو بە شێوەیەکی ناڕوون پەیوەستە بە بەردەوامبوونی ژیانی بوونەوەرەکان، هەربۆیە هەوا و نەفسی بەیەکەوە بەستنەوە[٢].

«هیبولیتوس»یش وتەیەک پاڵدەدات بۆلای ئەناکسێمانس: "خوداکان و هەموو شتەکانی دیش لەوەوە پەیدا دەبن"[٣]

لێرەوەیە «ئۆلف جیجن» دەڵێت: ئەناکسێمانس جیاوازی کردووە لەنێوان دوو ئاستی خوایەتیدا، بەدڵنیاییەوە وەسفی هەوای بێسنووری کردووە بەوەی کە خوداییە، هەروەک چۆن ئاماژەشی بەوە کردووە کە خوداکان لە هەواوە پەیدادەبن، لێرەدا مرۆڤ ناتوانێت هیچ لێکدانەوەیەک بکات غەیری ئەوەی کە ئەم خودایانەی کە ئاماژەیان بۆ کراوە بریتیین لە ئەستێرەکان.[٤]

لەبەرەنجامی ئەوەوە دەتوانین بڵێین فکری ئەناکسێمانس بۆ خودایەتی یان خودی هەوای بێسنوورە (اللامحدود)، یان هەوا شوێنی خوداکانە و خوداکان لەوەوە پەیدا دەبن.

«شەهرستانی» لە «ئەناکسێمانس» دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "خودا ئەزەلییە و سەرەتا و کۆتایی نییە، هەر خۆی سەرەتا و کۆتایی هەموو شتەکانە و خۆی

---

(١) فجر الفلسفة اليونانية، د. الأهواني، ل٦٥.

(٢) تاريخ الفلسفة اليونانية من منظور شرقي، د. مصطفى النشار، ل١١٠.

(٣) المرجع السابق، ل١١٠.

(٤) المشكلات الكبرى في الفلسفة اليونانية، ل ٣٨.

سەرەتای نییە، خودا تاکە، بەڵام وەک تاکی ژمارە نا، چونکە تاکی ژمارە زۆر دەبێت، بەڵام خودا زۆر نابێت و هەر یەکێکە. هیچ شتێک لە زانستی ئەو دەرناچێت و وێنەی هەموو شتەکان لەزانستی ئەو بەدەر نین و وێنەکانیش لەلای ئەو بێکۆتان."[١]

لە پاشاندا شەهرستانی دەڵێت: لە ئەناکسیمانس گێڕدراوەتەوە کە یەکێک لە بەدیهێنراوەکان هەوایە، هەر لەویشەوە هەموو بەشەکانی گەردوون دروستبوون، لە ئەجرامە بەرز و نزمەکان، بۆیە ئەوەی لە سافی هەوا دروستبوو ئەوە شتێکی نەرمی ڕۆحانییە، ئەوەشی لە لێڵی هەوا دروستبوو ئەوە شتێکی چڕی جسمانییە، ...

ئەوەی لەسەرووی هەوایە لە جیهانەکان ئەوە لە سافی هەوایە، ئەوە جیهانی ڕۆحانییەکانە، ئەوەشی لە خوار هەوایە لە جیهانەکان، ئەوە لە لێڵی هەوایە و جیهانی جیسمانییە. پاشان شەهرستانی پێی وایە ئەناکسیمانس بۆچوونەکانی لەژێر ڕۆشنایی پێغەمبەرایەتی وەرگرتووە.[٢]

## ئەپیقۆرس (ئەپیکۆرس) (ئەپیقۆرییەکان) (٣٤١ - ٢٧٠ پ ز)

ئەپیقۆرس دامەزرێنەر و ڕابەری ڕێباز و قوتابخانەی ئەپیقۆریزمە، ئەپیقۆرس لە ساڵی (٣٤١ پ ز) لە دوورگەی سامووس لەدایکبووە و لە ساڵی (٢٧٠ پ ز) مردووە.

ئەپیقۆر هێرش دەکاتە سەر ئایین و بیروڕای باوی ئەو سەردەمە و بە شتی پڕوپووچی دادەنێت. ئەپیقۆرس پێی وابوو خواوەندەکان هەن، بەڵام بەم شێوەیە

---

(١) الملل والنحل، الشهرستانی، ب٢، ل٦٦.

(٢) الملل والنحل، الشهرستانی، ب٢، ل٦٧.

نیین کە خەڵکی باسیان دەکەن، خواوەند بەیەکجار جیهانی دروستکردووە و ئینجا لێیگەڕاوە و وازیلێهێناوە، هەقیشی بەسەرەوە نییە و کاروبارەکانشیشی بەلاوە گرنگ نیین و گوێیان پێنادات، چونکە نایەوێت وەزعی خۆی تێکبدات و ئاینیش بەو جۆرەی خەڵک لێ تێگەیشتووە درۆودەلەسەیە و ئەسڵ و ئەساسی نییە و شتێکی خوڕافییە، ژیانی خوداش بەختەوەرترین و خۆشترین ژیانە، بۆیە ئاینیش دەبێت بریتی بێت لە لاساییکردنەوەی خودا و سەرنجدان لێی و گەڕان بەدوای خۆشی و چێژ و بەختەوەری.

«لۆکریتۆس» کە یەکێکە لە ئەپیقۆرییەکان دەڵێت: "ئایین شەڕە و لەسەر مرۆڤ پێویستە خۆی لە هەموو ئایینێک دابڕنێت، چونکە ئایین سەرچاوەی هەموو شەڕەکانە."[١]

بەپێی هەندێک لە مێژوونووسان و توێژەران، ئیلحاد بەڕوونی لەم قوتابخانەیە دەبینرێت، هەروەک (د. عبدالرحمن بدوی)یش هەمان بۆچوونی هەیە.[٢]

بەڵام ئەگەر بەوردی بڕوانینە هەموو بەشەکانی ئەم قوتابخانەیە، ئەوە دەبینین کە ئەپیقۆرس بوونی خواوەندەکان بە پێویست و زەرور دەبینێت.[٣]

ئەپیقۆرس بە چەند بەڵگەیەک بەڵگە لەسەر بوونی خواوەندەکان دەهێنێتەوە:

١. بیرۆکەیەکی ڕابردووی بەربڵاون لەسەرجەم مرۆڤایەتیدا، بیرۆکەی ڕابردووش بە دووبارەبوونەوەی هەستکردن پێکدێت، هەموو هەستکردنێکیش ڕاستە. بنچینەی ئەم بیرۆکە ڕابردووانەش ئەو خەیاڵانەن کە لە خەو و بێداریدا دێنە بەرچاومان، کە هەر دەبێت لە خواوەندەکان خۆیان سەرچاوەیان گرتبێت.

---

(١) موسوعة الفلسفة، بدوي، ب١، ل٨٤. والفلسفة الإغرقية، د. محمد غلاب، ب٢، ل١٧٨.
(٢) موسوعة الفلسفة، بدوي، ب١، ل٨٥.
(٣) الفلسفة الإغريقية، د. محمد غلاب، ب٢، ل١٧٩.

٢. بیرۆکەی بوونی بەختەوەری هەمیشەیی، مرۆڤ هەستی پێدەکات، کەواتە خواوەندەکان بەرانبەر ئەمانەن.

٣. هەموو شتێک دژێکی هەیە کە هاوسەنگی لە وجوددا بەدیدێنێت، بۆیە پێویستە لەبەرانبەر وجودی فانی ئازارچەشتوودا وجودێکی هەمیشەیی بەختەوەر هەبێت، هەروەها پێویستە خواوەندەکان بەباشترین شت لە خۆماندا وێنا بکەین، خواوەندەکان نامرن و نەمرن.[١]

ئەگەر لە بۆچوونەکانی بڕوانین دەربارەی خواوەندەکان دەبینین بە شێوەیەک دەیخاتە ڕوو وەک بڵێی باسی مرۆڤێک بکات، چونکە هەم جەستەیان بۆ بڕیار دەدات، هەم وێچواندنی زۆر دەکات بە مرۆڤ.[٢]

ئەپیقۆرییەکان گرنگیدانی خوایی بە گەردوون و جیهان بەتەواوی ڕەتدەکەنەوە، لەکاتێکدا یەکێکە لە بەڵگە بەهێزەکانی ئیمانداران، ئەپیقۆرییەکان پێیان وایە گرنگیدانی خوایی و خواوەندەکان بە جیهان شتێکی وەهم و خورافییە و لەگەڵ پێگە و مەقامی خواوەندەکان نایەتەوە، نکووڵی کردنیشیان لەم گرنگیدانە دەگەڕێتەوە بۆ کێشەی شەڕ.

ئەپیقۆرییەکان دەڵێن: گرنگیدانی خوایی لەکوێ لەکاتێکدا شەڕ لە جیهاندا زۆر زیاترە لە جوانی و چاکە، سەرەنجامی بکەری خێر زۆر خراپترە لە سەرەنجامی بکەری شەڕ؟ گرنگیدانی خوایی لەکوێ، لە جیهانێکدا کە مرۆڤ ناگات بە ئارامی و سوکنایی بە ئەندازەیەکی زۆر کەم نەبێت؟ گرنگیدانی خوایی لەکوێ، کە مرۆڤ بەبێ چەک جێهێڵدراوە؟ لەگەڵ چەندان پرسیاری دیکە کە دەربارەی شەڕ لە جیهاندا دەیکەن ...[٣]

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم، ل٢٧١ - ٢٧٢.

(٢) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم، ل ٢٧٢. وموسوعة الفلسفة، بدوي، ب١، ل٨٥. والفلسفة الإغريقية، د. محمد غلاب، ب٢، ل١٧٩.

(٣) موسوعة الفلسفة، بدوي، ب١، ل٨٤.

کەواتە بەم پێیە بێت ئەپیقۆرییەکان لە ڕیزی یەکەمی بیرمەندەکانن کە بابەتی کێشەی شەڕیان وروژاندووەوە و کردوویانە بەڵگە بۆ نکووڵیکردن لە گرنگیدانی خودایی بە گەردوون و جیهان.

## ڕەواقییەکان

ڕەواقییەکان هاوسەردەمی ئەپیقۆرییەکان بوون، «زینۆن» بنەماکانی دانا و دوو لە شوێنکەوتووانی پاش ئەو تەواویانکرد.

قوتابخانەی ڕەواقییەکان دابەشدەبن بۆ سێ سەردەم:

١. ڕەواقییە سەرەتایی و کۆنەکان، ماوەکەیان لە ساڵی (٣٢٢ پ ز) دەست پێدەکات بۆ ساڵی (٢٠٤ پ ز)، لە بەناوبانگترین فەیلەسووفەکانی:

زینون (٣٣٦ - ٢٦٤ پ ز)

کیلانتس (٣٣١ - ٢٣٢ پ ز)

کروسبوس (٢٧٧ - ٢٠٨ پ ز)

٢. ڕەواقیەکانی ناوەڕاست، لە بەناوبانگترین فەیلەسووفەکانی:

فنایتۆس (١٩٨ - ١١٠ پ ز)

یوزیدونیوس (١٥٣ - ٥١ پ ز)

٣. ڕەواقییە نوێکان، لە گرنگترین فەیلەسووفەکانی: «سنکا»[١]

---

(١) موسوعة الفلسفة والفلاسفة، عبدالمنعم الحنفي، ب١، ل٧٤٩. والفلسفة الرواقية، د. عثمان أمين.

ڕەواقییەکان بڕوایان بە یەکێتی بوون (وحدة الوجود) هەبوو، پێیان وابوو خودا و سروشت یەک شتن، لەگەڵ ئەوەشدا جیاکاریان دەکرد لەنێوان سرروشتی بنەڕەتی خودا و سروشت. جیهان و گەردوون لە تێروانینی ڕەواقیەکاندا جیسمێکە کە لەناو خۆیدا ئاگری عاقڵ هەیە، خوداش تواوەتەوە لەناو جیهان و گەردووندا، بەم پێیەش باوەڕیان بە (حلول)یش هەبووە، کەواتە باوەڕیان بە (وحدة الوجود والحلول) بووە..[1]

دەتوانین بڵێین دەستەواژەی خواوەند یان خودا لەلای قوتابخانەی ڕەواقییەکان بە دوو مانا بەکاردەهێنرێت: گشتی (عام)، تایبەت (خاص).

بەمانا گشتییەکەی دەستەواژەی خودا دەبێتە هاومانای گەردوون بە هەموویەوە، بە مانا تایبەتەکەشی مەبەست لێی ڕۆحی بەڕێوبەری دەستەڵاتدارە بەسەر جیسمی گەردوون، بەگوێرەی یەکەم دەبێتە (وحدة الوجود)، بەگوێرەی دووەم دەبێتە (الحلول)، واتە خودا تواوەتەوە لەناو هەموو بەشێکی جیسمی گەردووندا، بەڵام ئەگەر بەوردی لەم قوتابخانەیە بڕوانین تەنیا ئەم بۆچوونە و بۆچوونی دووەم لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، چونکە ئەسڵەکە یەکێتی بوون (وحدة الوجود)ە، لەبەرئەوەی هیچ شتێک بوونی نییە جگە لە ڕۆحی خوایی کە ئاگرە..[2]

پوختەی قوتابخانەی ڕەواقییەکان وەک «سانتێلانا» _ڕۆژهەڵاتناسێکی ئیتاڵییە_ دەڵێت بریتییە لە یەکێتی بوون (وحدة الوجود)، واتە تەنیا یەک جیهان و گەردوون و جەوهەر هەیە، ئەویش لە یەک کاتدا عەقڵ و ماددەیە، هیچیشیان لەوەی تریان جیانابێتەوە.[3]

---

(١) مجلة كلية الاداب، جامعة بنى سويف، العدد التاسع، أكتوبر سنة ٢٠٠٥م. الفلسفة الطبيعية عند الرواقيين، د. هدى الخلولى، ل٧.

(٢) الفلسفة الاغريقية، د. محمد غلاب، ب٢، ل١٤٦.

(٣) الوجود الالهى، سانتلانا، ل١٠١.

ڕەواقییەکان پەیوەندی نێوان ئایین و فەلسەفەیان بە پەیوەندییەکی بەهێز دەبینی، باسی خواوەندی زۆریان دەکرد، لەگەڵ ئەوەی باوەڕیشیان بە تەوحید و تاکخودایی هەبوو، بۆیە لاهووتی ڕەواقی لەسەر تاکخودایی دامەزراوە کە دروستکەر و خالق و پارێزەری جیهان و گەردوونە.[١]

دکتور عوسمان ئەمین پێیوایە لەگەڵ ئەوەی ڕەواقییەکان باوەڕیان بە یەکێتی بوون (وحدة الوجود) هەیە، بەڵام دەتوانین بڵێین ئەوان باوەڕیان بە تاکخواییش هەبووە، ئەوان باوەڕێکی پتەویان بە خودایەکی تاکانە هەبووە و ڕوویان تێکردووە، ئەو خوایەش لەتێڕوانینی ئەواندا بە هەموو گەردووندا بڵاوبووتەوە و ڕووکەشی گەردوونیش تەنیا کۆمەڵە ناوێکی جیاوازن بۆ «زیۆس».[٢]

ڕەواقییەکان پێیانوایە ئەم خودایە وێنا ناکرێت لەسەر شێوەی مرۆڤ یان ئاژەڵ، ئەم خودایە شکڵ و شێوەی نییە و دەشکرێت هەموو شێوەکان وەربگرێت.[٣]

ڕەواقییەکان سێ سەرچاوەیان دیاریکردبوو بۆ لاهووتی ڕەواقی، ئەوانیش بریتیبوون لە: فەلسەفە، دەستەڵاتداران یان پیاوانی دەوڵەت، لەگەڵ شاعیرەکان.[٤]

بۆ بابەتی بەڵگەکانی بوونی خوداش ڕەواقییەکان پشتیان بە سێ بەڵگە بەستووە:

١. بوونی گەردوون و جوانیەکەی بەڵگەن لەسەر بوونی شتێکی عاقڵ کە لە

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية، وليم ساها كيان، ل١٣٣ _ ١٣٤.

(٢) الفلسفة الرواقية، عثمان أمين، ل١٨١. وتاريخ الفلسفة، آمل برييه، ب٢، ل٧٢ _ ٧٣، ترجمة جورج طرابيشي.

(٣) الفلسفة الرواقية، عثمان أمين، ل١٨٣ _ ١٨٤.

(٤) تاريخ الفلسفة اليونانية، وليم ساها كيان، ل١٣٤.

مرۆڤ بەرزترە، ئەم شتە جگە لە خودا شتێکی دیکە نییە.[١]

٢. هەموو خەڵک لە هەموو نەتەوە و گەلە جیاوازەکان هاوڕان و کۆدەنگ و کۆکن لەسەر بوونی خواوەندەکان، بۆیە بوونی خوداکان شتێکی سروشتی و فیتری و زگماکییە لە ناخی هەموو کەسێکدا.[٢]

٣. لە باوەڕبوون بە خواوەندەکاندا سوودگەلی زۆر هەیە، کەواتە هەر خودی ئەم سوودە بەسە بۆ سەلماندنی بوونی خودا و خواوەندەکان.[٣]

٤. بەڵگەیەکی دیکە کە پاڵدراوە بۆلای زینون کاتێک وتوویەتی: لە عەقڵەوەیە کە خواوەندەکان بەگەورە سەیربکەین، عەقڵانی نییە «نەبوو» (اللاموجود) پیرۆز بکەین و بەگەورە سەیری بکەین، کەواتە خواوەندەکان بوونیان هەیە.[٤]

ئەفنایتوس _ نوێنەری سەرەکی و یەکەمی ڕواقییە ناوەڕاستەکانە _ ڕەخنە لە بەشی ئیلاهی دەگرێت بەم شێوەیەی کە زینون باوەڕی پێیەتی، دەشڵێت: ئەم بۆچوونەی زینون لە بابەتی ئیلاهیدا جگە لە شتێکی پڕوپوچ و بەتاڵ هیچی دیکە نییە.[٥]

«بۆزیدونیوس»یش نکوڵی لەوە دەکات کە خودا و سروشت و توانا یەک شتن بن وەک ئەوەی کە زینون دەیڵێت. بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە خودا جیایە لە توانا و سروشت، هەموو قەدەرێکیش ملکەچە بۆ خودا، سروشتیش بنەڕەت و ئەسڵ و ڕووکەشی ئەم ملکەچییەن، یان خودا تاکە و قەدەریش هێزە دیارەکەیەتی لە چەند وێنەیەکی جیاجیادا.[٦]

---

(١) الفلسفة الرواقية، عثمان أمين، ل١٨١.
(٢) الفلسفة الرواقية، عثمان أمين، ل١٨٤.
(٣) الفلسفة الرواقية، عثمان أمين، ل١٨٥.
(٤) الفلسفة الرواقية، عثمان أمين، ل١٨٥.
(٥) الفلسفة الاغريقية، د. محمد غلاب، ب٢، ل١٥٩.
(٦) الفلسفة الاغريقية، د. محمد غلاب، ب٢، ل١٦٢.

## پوختەیەک دەربارەی هزری هەرسێ فەیلەسووفی گەورە و بەناوبانگی یۆنانی «سوقرات، ئەفلاتوون، ئەرستۆ»

### سوقرات

سوقڕات یەکەم کەس بوو فەلسەفەی لە ئاسمانەوە هێنایە سەر زەوی، چونکە پێش سوقڕات فەلسەفە کورتهەڵاتبوو لە باسی سروشت و گەردوون و بنەڕەتی بوون و ...، بەڵام سوقڕات هات ئاراستەی فەلسەفەی گۆڕی بەرەو ڕووی مرۆڤ و مەعریفە و زانین، هەموو هەوڵەکانی یەک خست بۆ بەرزڕاگرتنی مرۆڤ و سەلماندنی توانای مەعریفەیی و زانینی مرۆڤ، هات بناغەی گومانی میتۆدی (منهجی) دانا، عادەتی وابوو لەڕێی دیالۆگ و پرسیارکردن لە بەرانبەرەکەی شتەکانی خۆی دەگەیاند و هەر لەناو وەڵامەکانیشی لەو نێوەندەدا وەرەگرت، ئەوەش پوختەیەک لە بیروڕاکانی:

١.مرۆڤ توانای زانین و مەعریفەی هەیە، بەپێچەوانەی سوفستائییەکان، کە نکووڵی ئەوەیان دەکرد.

٢.ڕۆح لای ئەو بوونی هەبووە و پێی وابووە کاری ڕۆح بریتییە لە تێگەیشتن و بیرکردنەوە، دژی ئەوەبووە هەستەکان هەموویان لە پێنج هەستەکاندا کورت بکرێنەوە.

٣.ڕۆحی مرۆڤ پێش ئەوەی بێتە سەر زەوی هەبووە و لەوێوە ڕاستییە زگماکییەکان فێربووە، بۆنموونە ئەو شتانەی پەیوەندییان بە خوداوە هەیە.

٤.ڕۆح نەمرە و لە دوای مردنی جەستە لە زیندانی جەستە ڕزگاری دەبێت.

٥.ژیانێکی دیکە لەدوای مردن هەیە.

٦.ئەم گەردوونە سیستەمێک بەڕێوەی دەبات.

٧.یەک دروستکار و خودا و پەروەردگار هەیە و بەس، زیاتر لە خودایەک بوونی نییە، بۆیە لەسەر باوەڕنەبوونی بە فرە خوایی و فرە پەرستراوی، ناچار بە خواردنەوەی ژەهرکراو و کوژرا. سوقرات یەکێک بووە لەو کەسانەی بەڵگەی هێناوەتەوە بۆ بوونی خودا، بڕوای تەواوی پێی بووە، پێی وابووە، خودا خودایەکی خێر و باشە، هیچ عەقڵێک ناتوانێت بگات پێی بەتەواوی، هیچ وەسفێکیش ناتوانێت وەسفی بکات، هیچ شتێکیش لەوەوە دەرناچێت مەگەر جوانی و باشی، بە هیچ شتێکیش لە دروستکراوەکانی ناچێت، لە قسە نە لە کردەوەدا، خودا تاکە و بێ هاوەڵە، ناگۆڕێت، پێویستە لەسەر مرۆڤ فەرمانەکانی خودا جێبەجێ بکات ئەگەرچی ماندوویەتی و نارەحەتیشیدا تێدابێت. سوقرات کە باسی خودا دەکات، باسی خودای تاکانە دەکات، یان باسی خودایەتی دەکات (الالوهیة) نەک (الالهة)، واتە ئەو باسی خواکان ناکات، چونکە بڕوای بە شیرک هاوبەش دانان نییە بۆ خودا، لەگەڵ ئەوەی سەردەمی ئەو سەردەمی شیرک و هاوبەشدانان بووە، چەندان خودای پەرستراو هەبوون. نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو سوقرات نەهیشی کردووە لە پەرستش بۆ بتەکان، هەرگیز نەکەوتووەتە ژێر هەژموونی شیرک و هاوبەش دانان.

کەواتە سوقرات بڕوای بە خودای تاکانە هەبووە و بەڵگەشی بۆ هێناوەتەوە و بەرگریشی لێکردووە و دژی شیریکیش وەستاوەتەوە.

٨.فەزیلەت زانست و زانینە و ڕەزیلەت نەزانین، مرۆڤ کە فەزیلەتی زانی پێیەوە پابەند دەبێت، کە نەشیزانی تێدەکەوێت.

ئەمە پوختەی بۆچوونەکانی بوو زۆر زۆر بەکورتی، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین کە سوقرات خاوەنی میتۆدێکی دیاریکراوی فەلسەفی نەبوو، بۆچوونەکانیشی کە بەدەستی ئێمە گەیشتوون لەڕێی ئەفلاتوونەوە بووە.[1]

---

(١) بۆ سەرچاوەی ئەم بۆچوونانەبگەڕێوەبۆ باسەکانی پێشوو.

## ئەفلاتوون

ئەفلاتوون «یان وەکو بە زمانی لاتینیی پێی دەڵێن پلاتۆن» لە ساڵی ٤٢٧ پ.ز لەدایک بووەو لە ساڵی ٣٤٧ پ.ز کۆچی دواییکردووە. ئەفلاتوون یەکێکە لە باشترین خوێندکاری سوکرات، هەروەها مەزنترین بیرمەندە لە مێژوودا، جگەلەوەش ئەو یەکەمین زانکۆ (ئەکادیمیا) ی دامەزراند، کە تێیدا خوێندکارەکان دانیشتن و کۆبوونەوەکانی سوکراتیان وەکو وانەی زانستی دەخوێند.

ئەفلاتوون لە ئەسینا لە بنەماڵەیەکی ئەرستۆکراتی لەدایک بووە، ناوی ڕاستەقینەی خۆی «ئەرستۆ کلیس» پاشتر ناویان لێناوە «پلاتۆن، ئەفلاتوون»، چونکە لە ڕووی جەستەییەوە کەسێکی چوارشانە و بەهێز بووە، ئەو سەرباز و زۆرانبازێکی بەهێز بووە و لە تەمەنی لاوێتیدا، چەندین خەڵاتی وەرزشی بردووەتەوە.

دیارە زۆر زەحمەتە جیاوازی لەنێوان فەلسەفەی سوکرات و ئەفلاتووندا بکەیت، بەڵام دەتوانین بڵێین کە فەلسەفەی ئەفلاتوون زیاتر مێتافیزیکی و سۆفییگەری بووە تاوەکوو فەلسەفەی سوکرات.

### پوختەی فەلسەفەی ئەفلاتوون

١. جیهان بە سیستەم بەڕێوەدەچێت، خودا بوونی هەیە، هەرچەند وەک باسمانکرد تێڕوانینی فەیلەسووفان لەبارەی خوداوە تەواو تەواو هاوتا نییە لەگەڵ ئاییندا، چونکە لەژێر ڕۆشنایی وەحی قسەیان نەکردووە.

٢. بڕاوای بە جیهانی فۆڕمەکان (عالم المثل) بووە، کە لەشوێنی خۆیدا بەدرێژی باسمانکرد.

٣. ڕۆح پێش ئەوەی بێتە ناو جەستە بوونی هەبووە، دوایی لە جیهانی سەرەوەڕا دابەزیوەتە ناو جەستە.

٤. وجود و بوونە حەقیقییەکان لەم جیهانە نیین، بەڵکوو لە جیهانی ئایدیاکانە، چونکە بوونەکانی ئێرە هەموویان ناتەواون.

٥. کە وجود و بوونی حەقیقی لێرە نەبوو، کەواتە مەعریفەی حەقیقیش لێرە بوونی نییە، بەڵکوو لە جیهانی ئایدیاکانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ ڕای سوفستائییەکاندا نییە، کە مرۆڤ بەهیچ شێوەیەک نەتوانێت مەعریفە و زانین بەدەست بێنێت.

٦. ئامانج و ئەخلاقی مرۆڤ لە فەزیلەی بەرزدایە، فەزیلەی بەرزیش بریتییە لە عەدالەت و دادگەری، دادگەریش کاتێک پەیدا دەبێت کە گونجان و ڕێککەوتن و تەوافوق لەنێوان هێزەکانی نەفسدا بێتە کایەوە، ئەمەش لەڕێی عەقڵەوە دەکرێت، کەواتە هەردووکیان دەبنە تەواوکەری یەکتری، هیچیان سەرکەشی ناکەن و لانادەن، ئەرستۆ پێی وابوو فەزیلەت ناوەندی دوو ڕەزیلەتە، بۆنموونە سەخاوەتی فەزیلەتێکە لەنێوان زێدەڕۆیی و بەهەداردان لەگەڵ ڕەزیلی، یان ئازایەتی لەنێوان ترسنۆکی و هەڵەشەییدایە.

٧. سەرکردە و سەرۆک وڵات دەبێت فەیلەسووف بێت، ئەفلاتوون کاری زۆری لە بواری سیاسەت و دەوڵەتداری کردووە و کتێبێکی گەورەی بەناوی «کۆماری ئەفلاتون» نووسیوە.

٨. ئەفلاتوون باسی لە خودا کردووە وەک بوونێکی سەربەخۆ لە بوون و گەردوون، واتە ئەو پێی وابووە خودا لەگەڵ ئەوەی هەیە و هیچ گومانی تێدا نییە، ئینجا جیاوازیشە لە ماددە و گەردوون، واتە شتێکە لەدەرەوەی گەردوون و ماددە، پێش ئەفلاتوون فەلسەفە کورتهەڵاتبوو لە ڕاڤەی گەردوون و هەموو شتێکیان دەبردەوە لای ماددە و واقیعی ماددەیی، بەڵام ئەفلاتوون پێی وایە خودا لەسەرووی ماددەوەیە، کەواتە خودا لەلای ئەفلاتوون بوونی هەیە. دوو بەڵگەی سەرەکیش دەهێنێتەوە لەسەر بوونی خودا:

بەڵگەی جووڵە، ئەفلاتوون پێی وایە جووڵە حەوت جۆرە جووڵەی بازنەیی، جووڵەی ڕاست بۆ چەپ، چەپ بۆ ڕاست، لە پێشەوە بۆ دواوە، لەدواوە بۆ پێشەوە، لەسەرەوە بۆ خوارەوە، لەخوارەوە بۆ سەرەوە، جا جووڵەی گەردوون جووڵەیەکی بازنەیی و ڕێکخراوی ئەندازەگیراوە. ئەم جووڵەیەش ناکرێت لەخودی خۆیەوە بێت، بەڵکوو بەرهۆیە بۆ هۆیەکی عاقڵ کە خودایە، کە وای کردووە جووڵەی جیهان و گەردوون جووڵەیەکی بازنەیی بێت بەدەوری خۆیدا و وای کردووە لە شەش جۆرەکەی دیکەی جووڵە نەبێت و سیستەمەکە تێک نەچێت، کەواتە جووڵە و لەناویشدا جووڵەی بازنەیی و ڕێکخراو بەڵگەیە لەسەر بوونی خودا.

بەڵگەی ڕێکسازی و سیستەم، واتە ئەم گەردوون و جیهانە هەمووی لەسەر سیستەم و ڕێکسازییەکی زۆر سەرسوڕهێنەر دەڕوات، کەواتە ناکرێت ئەم هەموو ڕێکسازییە لەخۆیەوە بێت، حەتمەن دەستەڵاتێکی زۆر گەورە و جوان لە پشتییەوەیەتی کە خودایە.

ئەفلاتوون بڕوای وایە خودا تاکە، ڕێکساز و مشورخۆری هەموو شتەکانە، ڕۆحێکی عاقڵە، یەک پارچە جوانی و خێر و دادگەری و تەواوی کەمالە، جێگیرە و نەگۆڕە، ڕاستگۆیە و درۆ ناکات، شوێن و کات دەورەی نادەن، ئامادەیی بەردەوامی هەیە، مشورخۆری بوونەوەر و گەردوونە.

نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو پێی وایە بوونی خودا و تەواویەکەی ئەوەندە بەڵگەنەویستە، نکۆڵی لێکردنی تاوانە و دەبێت دەوڵەت سزای بۆ دانێت، بۆیە پێی وایە هیچ گەلێک ناتوانێت بەهێزبێت هەتا بڕوا بەخودا دەهێنێت، ئینجا باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەبووە، چونکە پێی وابووە، باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی هێز و ئازایەتیمان پێدەبەخشێت لەبەرانبەر مردندا، هەتا ئەگەر وامان دانا، نە خودا هەیە و نە ڕۆژی دوایی، ئەوە لەکوتاییدا هەر هیوا و خۆشەویستییە.

کەواتە ئەفلاتوونیش وەک مامۆستاکەی (سوقرات) بڕوای بە بوونی خودا و سیفەتەکانی هەبووە.[1]

## ئەرستۆ

ئەرستۆ (بە یۆنانی: Ἀριστοτέλης، ئاریستۆتێلیس؛ ٣٨٤ی پ.ز - ٣٢٢ی پ.ز) فەیلەسووفێکی یۆنانی بوو؛ ئەو قوتابیی ئەفلاتوون و مامۆستای ئەسکەندەری مەزن بوو. نووسراوەکانی زۆر بابەتیان گرتووەتە خۆ، وەک: فیزیک، مێتافیزیک، شیعر، شانۆ، مۆسیقا، لۆژیک، سیاسەت، حوکوومەت، ئەخلاق، ... و هتد. هاوڕێ لەگەڵ ئەفلاتوون و سوقرات (مامۆستای ئەفلاتوون)، ئەرستۆ یەکێک لە گرنگترین بناغەدارێژانی فەلسەفەی ڕۆژاواییە.

### پوختەی بۆچوونە فەلسەفییەکانی

**١.** بڕوای بە توانای مرۆڤ بووە بۆ زانین و مەعریفە، بنەمای عەقڵی بوونی هەیە، ئەو بنەمایانە یەقینین، وەک دوو دژیەک کۆنابنەوە لە یەک کات و شوێن و کەسدا، مەعریفەی حەقیقی ئەو مەعریفەیەیە کە لە بنەما عەقڵییەکان سەرچاوە بگرێت، مەعریفە هەستییەکان مەعریفەی یەقینی نیین.

**٢.** زۆرێک لە توێژەرانی فەلسەفە پێیان وایە ئەرستۆ بڕوادار بووە و بڕوای بە خودا هەبووە، ڕاستە ناتوانرێت نکۆڵی لەوە بکرێت کە ئەرستۆ باوەڕی بە شتێک هەبووە وەک زەرورەتێکی عەقڵی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خودایەی کە ئەرستۆ باسی دەکات جیاوازە لەو خودایەی وەحی و دین باسی دەکەن، چونکە ئەرستۆ پێی وایە خودا جووڵێنەری یەکەمە، خودا جوڵێنەرە و خۆی ناجووڵێت و جێگیرە، ئەزەلی و ئەبەدییە، سەرەتا و کۆتایی نییە، دوورە لە هەموو نەقس و ناتەواوییەک، لێکدراو نییە و بەش بەش نییە، بێپێویستە لە هەموو بوون و

---

(١) بۆ سەرچاوەی ئەم بۆچوونانەبگەڕێوەبۆ باسەکانی پێشوو.

بوونەوەر، ئەم جووڵێنەری یەکەمە لە ڕووی کاتەوە لەپێش بوونەوەر و ماددەوە نییە، چونکە وەک باسمان کرد ئەرستۆ باوەڕی بە ئەزەلیبوون و بێسەرەتایی مادده هەیە.

**٣.** ئەرستۆ پێی وایە هیچ پەیوەندییەک لەنێوان خودا و گەردووندا نییە، جووڵاندنی خوداش جووڵاندنێکی حەقیقی و ڕاستەقینە نییە، بەڵکوو هەر ئەوەیە کە گەردوون تامەزرۆی خودا دەبێت و دەخرۆشێت و دەجووڵێت. واتە خودا وەک «مەعقوول» و مەعشووق وایە، «مەعقوولە» چونکە عەقڵێکی ڕووتە، کارەکەشی عەقڵاندنە، مەعقوول و بیرلێکراوەکەش خودی خۆیەتی نەک شتێکی تر، چونکە خۆی تەواوترین شتەکانە و غەیری ئەو هەموو شتەکانی دیکە ناتەواون، کەواتە خودا بەس ئاگای لە خۆیەتی، خۆی عاقل و مەعقوول و عەقلە، واتە هەموویان یەک شتن.

**٤.** ئەرستۆ پێی وایە خودا زۆر گەورەترە لە گەردوون تاوەکوو زانستی بە گەردوون هەبێت، خودا تەواوی ڕەهایە ناکرێت زانستی بەشتێک هەبێت کە ناتەواوە! کەواتە بەس ئاگای لەخۆیەتی، چونکە هیچ شتێک لەخۆی کامڵتر نییە کە زانستی پێی هەبێت، پێی وایە ئەگەر زانستی بە شتێک هەبێت کە ناتەواوە کەواتە خۆشی ناتەواوە و کامڵ نییە! بۆیە بۆئەوەی خودا کامڵێکی ڕەها بێت، دەبێت دووربێت لە ناکامڵ و نابێت پەیوەندی پێوە هەبێت، بۆیە یاسا بەناوبانگەکەی دانا (عقل وعاقل ومعقول) واتە عەقڵێکی ڕەهایە، عاقلیشە، بەس تەعەقول و بیریش لەخۆی دەکاتەوە و بەس.

**٥.** پەیدابووونی بوونەوەر لە خوداوە وەک پەیدابوونی گەرمییە لە ئاگر، یان ڕووناکییە لە خۆر، بەبێ زانستی ئاگر و خۆر، ئەمەش ئاوایە، واتە ئەم بوونە لە خوداوە پەیدابووە بەبێ ویست و زانستی خودا.

**٦.** گەردوون و ماددەش ئەزەلی و ئەبەدین، چونکە خودا ئەزەلی و ئەبەدییە، هۆ (العلة) ئەزەلی و ئەبەدییە، کەواتە بەرهۆش (المعلول) دەبێت ئەزەلی و ئەبەدی بێت، چونکە پەیوەستن بەیەکەوە، بەرهۆ دەمێنێتەوە تا هۆ مابێتەوە،

«هۆ» یش هەر دەمێنێتەوە، کەواتە بەرهۆش دەمێنێتەوە بە ئەبەدی. بەکورتی و بە کوردی خودا لەلای ئەرستۆ جیاوازە لە تێگەیشتنە ئایینەکە و پێی وایە خودا هیچ پەیوەندییەکی بە بوونەوەرەوە نییە و زانستیشی پێی نییە و شتێکە عەقڵ داخوازی دەکات بەڵام تا ئەو شوێنەی عەقڵ دەیەوێت، دوایی هیچ ڕۆڵێکی نامێنێت و دەبێتە بوونێکی عەقڵی بێ کاریگەر و دوور لە بوونەوەر و گەردوون.

٧. بەختەوەری پەیوەستە بە حیکمەت و زانست و زانین و فکرەوە، چونکە حیکمەت (زانست و زانین و فکر) بەرزترین فەزیلەتە، چونکە حیکمەت شتێکی ئازادە و عەقڵ پێیەوە هەڵدەستێت، بەبێ ئەوەی مەبەست و بەرژەوەندی و سووی عەمەلی و ماددی لە پشتەوە بێت، لەکاتێکدا چێژ شتێکی هاتوو و ڕۆیشتووە، گەوەرەیی و پلە و پۆستیش دێت و دەڕوات و نامێنێتەوە. پارە و سەروەت و سامانیش ئەگەری لەناوچوون و فەوتانی نامانی زۆرە. ناوبانگیش وەستاوەتە سەر خەڵکی دیکە. کەواتە بەس حیکمەتە کە شتێکی کامڵ و تەواوە و دەمێنێتەوە و مرۆڤ بەرەو پلە خۆایەتی دەبات.

٨. فەزیلەت بریتییە لە هاوسەنگی و دادگەری، واتە دووربوون لە ئیفراط و تەفریط، زێدەڕۆیی و کەمڕەوی.

ئەرستۆ جیا لە هەموو فەیلەسووفانی دیکە نووسراو و کتێبی یەکجار زۆری هەیە، بۆیە ئێمە ناتوانین لێرەدا زیاتر درێژەی پێبدەین..[1]

---

(١) بۆ ئەم بۆچوونانەبگەڕێوەبۆ باسەکانی پێشوو.

## دووەم: قۆناغی هیلینستی

ئەم قۆناغ لەدوای ئەرستۆ و کۆتاییەکانی ماوەی یۆنانی و درێژبووونەوەی بۆ سەردەمی ڕۆمان دەست پێدەکات، لە ساڵی (٣٣١ پ.ز) ئەسکەندەری مەکدۆنی دەستی بە داگیرکارییەکانی کرد بەرەو ڕۆژهەڵات، تورکیای ئێستا، سووریا، وڵاتی فارس، هیند و...

ئەسکەندەری گەورە دوای ئەوەی ناوچەگەل و وڵاتگەلێکی زۆری ڕۆژهەڵاتی داگیر کرد، لە ئەنجامی ئەم وڵات خستنەژێر دەستەڵاتی یۆنانییەوە، تێکەڵاوییەکی زۆر لەنێوان وڵاتانی ڕۆژهەڵات و یۆنان دروستبوو، ئەم تێکەڵاوییە زۆربواری گرتەوە، لەناویشیاندا تێکەڵاوی فکری و فەلسەفی. هەرچەندە ئەو هێرش و شۆڕش و داگیرکاریانە، زیاتر پاڵنەری سیاسی و ئابووری و سەربازی لەپشتەوە بوو، بەڵام لێکەوتەکانی تەنیا ئەوە نەبوو، بەڵکوو فەلسەفە و کلتوری یۆنانی گەیشت بە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و کلتوری ڕۆژهەڵاتیش گەیشت بە یۆنان، لە هەموو دیارتر ئەو سۆفیزم و زوهدەی ڕۆژهەڵات و هیند بوو، کە زۆر بە شێوەیەکی بەرچاو گەیشتە یۆنان و ڕەگی داکوتا، بەڵام زۆری نەبرد ئەسکەندەر مرد لە ساڵی (٣٢٣ پ.ز)، دوای ئەسکەندەر وردە وردە ئیمپڕاتۆریەتەکە تێکشکا و هەرەسی هێنا و بووە کێشە لەسەر میرات و دەستەڵاتی ئەسکەندەر، بۆیە پارچە پارچە بوو و دەستەڵاتی ڕۆمانی هاتە پێش و لە ساڵی (٨٣ پ. ز) تەواو تەواو زاڵبوو بەسەر ناوچەکەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەهۆی ئەو باڵادەستییەی یۆنانی لە ناوچەکەدا، بۆیە کەلەپووری زانستی و فەلسەفی یۆنانی هەر بە زیندووی مایەوە و نەکەوت، بۆیە لەسایەی دەستەڵاتی ڕۆمانیشدا کەلەپووری یۆنان کاریگەری خۆی هەر هەبوو، دوای ئەو هەمووە گۆڕانکاریانە فەلسەفەی یۆنانی مۆرکێکی نوێی دەستخست کە بە «مۆرکی هیلینستی» ناودەبرێت.

دوای هەرەسهێنانی یۆنان و هاتنەمەیدانی ڕۆمان ئەم «مۆرکی هیلینستی»

بیە زیاتر ڕوون بۆوە، دوای ئەوەی ئایینی یۆنانی هاتە لەرزین و بنچینەی باوەڕ بە خودای یەکەم هەرەسی هێنا و بنەما ئاکاری و ئەخلاقییەکانیش وردەوردە لاوازبوون، خەڵک دەستی کرد بە گەڕان بەدوای شتێک کە ڕێنماییان بکات لە ژیانیاندا، بەڵێ دوای ئەوەی ئایین ڕۆڵی نەما، فەلسەفە ویستی ببێتە بەدیل و شوێنگرەوە بۆ ئەم بۆشاییە، هەر لەم سەروبەندەدابوو کە دوو قوتابخانەی فەلسەفی لەم قۆناغەدا سەریانهەڵدا، ئەوانیش «ڕەواقی و ئەپیکۆر» بوون.(١)

بەهۆی نەمانی دەستەڵات و ژێردەستەییەوە بوو کە تەوژمی خۆبەستەوەدان و قبووڵکردنی ژێردەستەیی و تێکشان و بەچۆکداهاتن و... لە فەلسەفەدا سەریهەڵدا بۆ لەبیربرنەوەی ئەم تێشکان و بنکەوتنە. هەربۆیە بۆ لەبیرکردنی ئەم شتانە، فەلسەفە ڕێچکەی چێژ و لەزەت و بەختەوەری و خۆشبەختی و گەیشتن بە کەیف خۆشی ئاسوودەیی وەرگرت، ئەمەش بە دوو ڕێگە:

١. گەڕانەوە بۆ ناخ و دەروون و نەفس و ڕۆح و جیهانی ناوەوە و دوورکەوتنەوە لە جیهانی دەرەوە، هەربۆیە گۆشەگیر و کڕبوون بەسەر خود و ناخ باڵی کێشا و تەشەنەی کرد.

٢. ئاسوودەیی دەروون و هەڵنەچوون و دوورکەوتەنەوە لەهەر شتێک کە کار بکاتە سەر دەروون و نەفس و ویژدان.

دوای ئەوەی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی گەیشتە لوتکەی هێز و دەستەڵات، خەڵک هەستی بەوەڕەزبوون و نەبوونی ئارامی دەکرد، چونکە چینایەتی دورستبوو و دەستەڵاداران لە ژیانێک و خەڵکی دیکەش لە ژیانێکی دیکە، هەر لەم سەروبەندەشدابوو کە هەستی ئومێدبوون بە ژیانێکی دیکە هاتەکایەوە، ژیانێک کە لە داهاتووودا تێیدا دەژیێن و دادوەرێکی دادگەر و بەویژدان حوکم لەنێوان خەڵکیدا دەکات، ئەو دادوەرەی دادگەریترینی داوەرەکانە و قەرەبووی

---

(١) الفلسفة لمن يريد، د. نبيل، ١٠٧ _ ١١١.

ئەو بێبەشییە دەکاتەوە کە لە ژیانی دونیادا بەسەر ئەم خەڵکە هەژار و بێدەستەڵاتەدا هاتووە.

بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم قۆناغە قۆناغی پاییزی فەلسەفەی یۆنانی بوو، قۆناغی کەوتنی فەلسەفەی یۆنانی بوو، هەربۆیە ئەپیکۆرییەکان ئەوەیان ڕەتدەکردەوە کە خۆیان سەرقاڵ بکەن بە فەلسەفە و لۆژیک، چونکە ئەمانە تەنیا مێشکی مرۆڤ پڕ دەکەن و سەرقاڵی دەکەن بە شتێکی کە هیچ سوودێکی نییە، هیچ کردەوەیەکی لێوەپەیدا نابێت، هیچ کاریگەرییەکی بەسەر ژیانی ڕۆژانەدا نییە، بۆیە هەموو مێشک و بیری خۆیانیان برد بەرە و خۆشبەختی و ئەخلاق و دڵنیایی و دەروون ئارامی و دووربوون لە کێشەکانی فەلسەفە. خۆشبەختی و بەختەوەریش لەلای ئەپیکۆر تەنیا لەڕێی چێژەوە بەدەست دێت، کە لە باسی بەختەوەری و چێژدا لە فەلسەفەی بەهادا بەدرێژی باسمان کرد وتێڕوانینی ئەپیکۆرییەکان و ڕەواقییەکانمان خستەڕوو.[1]

## ئەفلاتۆنیزمی نوێ

ئەفلاتۆنیزمی نوێ کۆتا قوتابخانەی فەلسەفی یۆنانی کاریگەر بە کەلتوری ڕۆژهەڵاتییە، دوای قۆناغی هیلینیستی سەریهەڵدا، لەم سەردەمەدا فەلسەفە و فکر و هزری یۆنانی ئەم تایبەتمەندیانەی هەبوو:

١. پشتبەستن بە فەیلەسووفە کۆنەکان بەتایبەت ئەفلاتوون.

٢. کاریگەربوون و هێنانی بیروباوەڕی بوزی و زەردەشتی و یەهوودی و نەسرانی.

٣. پشتگوێخستنی لێکۆڵینەوەی فکری و فەلسەفی و پشتبەستن بە ئیلهام و خۆبەدەستەوەدان و خۆتەسلیم کردن.

---

(١) الفلسفة لمن يريد، د. نبيل، ١٠٧ _ ١١١.

**٤.** بڵاوبوونەوەی تەوژمی سۆفی و سۆفیگەری و سیحر و جادو و ئەستێرەناسی.[1]

**ئەم شتانەش هەموویان سێ هۆکاری سەرەکیان لەپشتەوە بوو:**

**١.** پێویستی دەروون دوای خەفەکردنی عەقڵ بە ئیمان و تەسلیمبوون و خۆبەدەستەوەدان.

**٢.** ماندووبوونی عەقڵ دوای شەش سەدە لە توێژینەوەی فەلسەفی و بێئومێدبوون لە هێنانی شتی نوێ.

**٣.** میتۆد و مەنهەجی لاهووتی مەسیحی و قۆستنەوەی ئەم بارودۆخە بۆ بنیاتنانی بیروباوەڕەکانیان لەسەر بنەمای پشتگوێخستنی عەقڵ و خۆتەسلم کردن و خۆبەدەستەوەدانی ڕەها.[2]

هەموو ئەمانە پێشەکی بوون بۆ مردن و کەوتنی فەلسەفە لەدوای ئەرستۆوە، بۆیە لەکۆتاییدا «جۆستنیان» هات و هەموو قوتابخانە فەلسەفییەکانی داخستن لە ساڵی (٥٢٩ م)، بەڕەسمی مردنی فەلسەفەی ڕاگەیاند، هەرچەند لەدوای ئەرستۆوە مردبوو، چونکە لەدوای ئەو هیچ قوتابخانە و میتۆدێکی فەلسەفی بەهێز و نوێ نەهاتە مەیدان.

دوو فەیلەسووف نوێنەرایەتی ئەم قۆناغە دەکەن «فیلۆن، ئەفلۆتین»[3]

## فیلۆن (٣٠ _ ٥٠ پ.ز)

فیلۆن بەناوبانگترین فەیلەسووفی یەهودییە لە سەدەی یەکەمی میلادی، ئەفلۆتین زۆر سەرسام بووە بە فەلسەفەی ئەفلاتوون، لە هەمان کاتیشدا

---

(١) قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين، ل ٦٤ _ ٦٥.

(٢) قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين، ل ٦٥.

(٣) قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين، ل ٦٥.

باوەڕداربووە و باوەڕی تەواوی بە شەریعەتی مووسا (علیه السلام) بووە، هەربۆیە هەوڵی گونجاندنی داوە لەنێوان ئایین و فەلسەدا، چونکە پێیوابووە ئەوەی ئەفلاتوون بەعەقڵی خۆی پێیگەیشتووە هەمان شتە لەگەڵ ئەوەی مووسا (علیه السلام) پێیگەیشتووە لەڕێی وەحیەوە، بۆیە هەموو هەوڵەکانی چڕکردەوە بۆ تەئویل کردنی تەوڕات بەگوێرەی بۆچوونەکانی ئەفلاتوون، واتە بە شێوەیەک تەواڕات بێتەوە لەگەڵ فەلسەفەی ئەفلاتوون.

بۆیە دەیوت: فەلسەفەی یۆنانی و شەریعەتی یەهوودی هەردووکیان گوزارشت لە حەقیقەت دەکەن، بەڵام ڕێگە و گوزارشتی ئایین جیاوازە لە فەلسەفە، ئایین حەقە و فەلسەفەش حەقە، بەڵام ئایین تەواوتر و کامڵترە، هەرچەندە وردەکاری و تەفسیلی کەمترە، ئایین وەحیە و ئەرکەکەی تەنیا ڕوونکردنەوەی تەواوە، نەوەک چوونە ناو تەفاسیل و وردەکاری شتەکانەوە، فەلسەفەش وەحییە، بەڵام وەحییێکی قووڵ و ناڕوون، کەم گشتگیرتر لە ئایین، بەڵام تەفسلیتر و وردتر لە داڕشتندا، هەربۆیە تەوڕاتی ملکەچ کرد بۆ زاراوە و بۆچوونە فەلسەفییەکان و تەواو تەواو تواندییەوە تێیدا.[1]

## ئەفلۆتین (٢٠٥ - ٢٧٠ ز)

ئەفلۆتین بەئەسڵ یۆنانییە و لە میسڕدا ژیاوە، لەلای میسڕییەکان زانیاری وەرگرتووە، لەدوای ئەرستۆ بەدامەزرێنەری تیۆری «هەڵڕژان، سەرڕێژ» (فیض) دادەنرێت، (لە باسی دەعەقڵەکاندا بەدرێژی باسمان کردووە)، ئەفلۆتین فەلسەفەکەی تێکەڵەیەک بووە لە فەلسەفەی ئەفلاتوون و ڕەواقییەکان و فیلۆن و فەلسەفەی هیندی و...، هات هەرسێ ئاراستە سەرەکییەکەی کۆکردنەوە و تێکەڵی کردن: هەستی سۆفیگەری، میسالی ئەفلاتوونی، یەکێتی بوونی (وحدة

---

(١) مع الفلسفة اليونانية، د. محمد عبدالرحمن مرحبا، ل ٢٢٢.

الوجود) هیندییەکان. لەلای ئەفلۆتین وجود و بوونی حەقیقی بریتییە لە وجود و بوونی یەکەم، پاشان وجود و بوونی عەقڵ، پاشان نەفس، مادده تەنیا سێبەری وجود و بوونە و لە بنەڕەتدا حەقیقەتی نییە و نەبووە (عدم). لەسەر ئەم بنەمایە بوو تیۆری هەڵڕژانی پەرەپێدا کە پێیوابوو خودا گەردوونی بەدینەهێناوە، بەڵکوو گەردوون لە خوداوە بێ ئیرادەی خودا هەڵڕژاوە و سەرڕێژ بووە، پاشان عەقڵ و نەفسی گشتی لێوە پەیدابووە، پاشان لەوانەوە ماددەی نەبوو (المادة العدمية) پەیدابووە.[1]

لێرەوە قۆناغی فەلسەفەی یۆنانی کوتایی هات و لەمەودوا قۆناغێکی نوێ دەست پێدەکات، کە قۆناغی تێکەڵبوون و ئاوێتەبوونی فەلسەفەیە بە ئایین، ئەم قۆناغەش بە سەدەکانی ناوەڕاست ناسراوە و دوو ئاراستەی سەرەکی و گەورە هاتە کایەوە، ئەوانیش ئاراستەی مەسیحی و ئاراستەی ئیسلامییە.

## خودا لەلای ئەفلۆتین

قوتابخانەی ئەفلۆتین لەسەر ئیمان بە خودای تاکانە دامەزراوە، ئەم خودایەش لەسەرووی عەقڵ و وجوودەوەیە، بوونی خودا لەلای ئەوانە بوونێکی ئەسیل و سادە (واتە: لێکدراو نییە و یەک شتە و بەس) و یەکەمە (أصيل، بسيط، أولى). کەواتە خودا لە تێڕوانینی ئەواندا تاکە لە زات و سیفەتدا و لە تەسەوریشدا هەر تاکە و ناکرێت بە لێکدراوی یان هەر شتێکی دیکە کە بۆنی شتێکی دیکەی غەیری خودای لێدێت وەسف بکرێ و وێنا بکرێت[2].

ئەفلۆتین خۆی لە (التساعية السادسة) دا پێیوایە کە: ئەستەم و مەحاڵە خودا بەهیچ سیفەتێک وەسف بکرێت، بەڵکوو دەبێ بێدەنگ بین لە وەسفکردن.[3]

---

(١) قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، د. سعد الدين، ل ٦٦.
(٢) الجانب الالهى من التفكير الاسلامى، ل١٠٨.
(٣) التاسوع السادس، ل٥٠٩ _ ٥١٢.

ئەفلۆتین لە وەسفکردنی خودادا ڕێگە و ڕێبازی داماڵین و نەفی کردنی گرتەبەر، واتە وەسفنەکردنی خودا بەهیچ سیفەتێک، چونکە ئەگەر بەهەر وەسفێک وەسفی بکەی، ئەوە دەیچوێنی بە یەکێک لە مەخلوقات و دروستکراوەکان، بە واتایەکی دیکە ئەو وەسفە دەبێتە سنووردارکردن بۆ ئەو، لەکاتێکدا خودا کۆتایی نییە و هیچ سنوورێکیش سنووورداری ناکات.[١]

لەگەڵ ئەوەی ئەفلۆتین دژی وەسفی خودایە لەبەر ئەو هۆکارەی کە باسمانکرد، بەڵام خۆی خودا بە (خیر) وەسف دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەتی دەکاتەوە ئەوەیان سەربکێشێت بۆ زۆری و لێکدراوی لە زاتی خودادا، چونکە ئەو پێیوایە ئەم سیفەتە ڕێک خودای زاتە نەک غەیری زاتی خودا، واتە زاتی خودا و (خیر) یەک شتن، نەوەک دوو شتی لێک جودا[٢].[٣]

---

(١) قصة الفلسفة، د. زكي نجيب محمود، ل٢٣٢.

(٢) الجانب الالهي من التفكير الاسلامي، ل١٠٩.

(٣) ئەم بیرۆکەیەش نزیکەلەبیرۆکەی موعتەزیلەکان، ئەوانیش لەدەرەوەی زاتی خودا سیفەتەکانی خودایان نەفی دەکرد، بۆئەوەی چەند شتێکی ئەزەلی لێنەکەوێتەوە(تعدد القدماء)، واتەباوەڕیان وابوو خودا زانایەو سیفەتی زانین هەیە(العلم)، یان بەتوانایەو سیفەتی توانای هەیە(القدرة)، بەڵام ئەم سیفەتانە هەموویان خودی زاتی خودان نەک شتێک لەدەرەوەی زات، ئەمەش بۆئەوەی چەند شتێکی ئەزەلی لێنەکەوێتەوە(تعدد القدماء).
کەواتەموعتەزیلەکانیش بەرەتکردنەوەی سیفاتی زیادە لەسەر زاتی خودا ناسرابوون: لە سەر بنەمای باوەڕبوونیان بە یەکتاپەرستی و پاکو بێگەرد راگرتنی خوای پەروەردگار لەهەر شتێک کە شایانی نەبێت، موعتەزیلەکان سیفاتی هەربوویی (أزلی) و زیادە بەسەر زاتی خودایان ڕەتکردووەتەوە، چونکە چەسپاندنی ئەو سیفاتانە دەبێتە مایەی هێنانەکایەی فرە هەربوویی (تعدد القدماء) کە ئەمەش هاوبەشی پەیداکردن بۆ خودای لێدەکەوێتەوە.
ئەوان باوەڕیان وایە کە سیفاتی هەربوویی تایبەتمەندترین سیفەتی زاتی خودایە، نابێت هاوبەشی لەم سیفەتەدا هەبێت، تۆ کە دەڵێیت: خودا زانایە و سیفەتی زانین جیایە لە زاتی خودا، خودا بەتوانایە و سیفەتی توانین جیایە لە زاتی خودا، ئەمە هەڵەیە، بەڵکوو کە دەڵێین زاتی خودا، ئیتر سەرجەم ئەو سیفەتانە لەخۆدەگرێت، واتە زاتی خودا و ئەو سیفەتانە یەکێکن نابێت جیابکرێنەوە.
واسڵی کوڕی عەتا-لە (١٣١ک مردووە)-، بۆ یەکەمجار ئەم بیرۆکەی جیانەبوونەوەی سیفات لە زاتی خودای دارشت و رەتی هەر سیفەتێکی کردەوە کە جیا بێت لە زاتی خودا، مەبەست لەمەش بەرگریکردن بوو لە بنەمای یەکتاپەرستیو چەسپاندنی زاتێکی تاکو تەنیا و بەدوور

ئەفلۆتین بە دوو ڕێگە وەسفی خودا دەکات:

١. لەڕێگەی ئاسەوارەکانی، وەسفی دەکات بە (الخیر)، ئەفلۆتین لەگەڵ ئەوەی دژی ئەوەیە خودا وەسفبکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە دوو سیفەت وەسفی دەکات، بە تاکانەیی و (الخیر).(١)

٢. لەڕێگەی داماڵین و دارنینی خودا لە سیفەتەکان (السلب)، لە تێڕوانینی ئەفلۆتیندا ناکرێت و نابێت خودا سوورەت و وێنەی هەبێت، چونکە وجودی خودا پێش سوورەت و وێنەیە. لەبەرئەوەی هەر شتێک سوورەتی هەبێت، ئەوە بەدڵنیاییەوە مەحدوود و سنووردارە، خوداش قبووڵی سنوورداری ناکات، چونکە خودا بێکۆتایە، کە بشڵێین خودا سوورەتی هەیە، ئەوە وادەگەیەنێت کە خودا لێکدراوە (المرکب) و لەناو خۆیدا لە زۆر شت پێکدێت (الکثرة)، ئەمەش تەواو تەواو لەگەڵ وەحدانیەت و تاکانەیی و خودا و نالێکدراوی خودا دژیەکە.

کەواتە کە خودا سوورەتی نەبوو، ناکرێت بڵێین جوانە، چونکە خودا لەسەرووی هەمووی جوانییەکەوەیە، ناشکرێت خودا بە ژیان یان بە توانا، یان بە ئیرادە و ویست وەسفبکرێت. ناکرێت بە ئیرادە و ویست وەسفبکرێت،

---

لە هەر دابەشبوون و کەرتبوون و چواندنێک، ڕەتدانەوەی دوالیزمی فارسەکان و سیانەی مەسیحیەکان، چواندنی موشەبیهەکان، بەجەستەکردنی موجەسیمەکان بوو، کە هەرکام لەمانە بە شێوازێکی نەشیاو وێنای خوایان کردووە.

زۆرینەی زانایانی موعتەزیلە سیفاتە زاتیەکانیان لە دوو سیفەتدا کۆکردۆتەوە کە سیفەتی: زانین و توانینە (العلم والقدرة)، یان ئەبوحوسەینی بەسری-لە (٤٣٦ک مردووە)- لەیەک سیفەتدا کۆیکردوونەتەوە، کە سیفەتی زانایەتیە (العالمیة). هەوڵیانداوە لەژێر ڕۆشنایی ئایەتی {لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ}. زاتێکی تاک و تەنیا و هەربوو بچەسپێنن، بەدووریان گرتووە لە هەر دابەشبوونو هاوبەشیداری و چواندنو بەجەستەکردنێک.

کەواتە موعتەزیلەکان سیفاتێک ڕەتدەکەنەوە کەجیا بێت لە زاتی خوداو بوونی سەربەخۆی هەبێت.

(١) موسوعة الفلسفة، د. بدوی، ب١، ١٩٩.

چونکە ئەگەر بڵێین خودا ویستی هەیە، ئەوە مانای وایە خودا پێویستی بە غەیری خۆی هەیە، پێویستیش دژی وەحدانییەت و تاکانەیی و نالێکدراوی خودایە. هەروەها سیفەتی ژیان لەلای ئەو لەسەر سیفەتی ویست دامەزراوە، چونکە ژیانیش نابێت ئەگەر لەلای ئەو ویست و ڕەغبەت نەبێت، هەروەها ڕەتیدەکاتەوە خودا وەسف بکات بە زانین، چونکە سیفەتی زانین زانین و زانراو دەخوازێت، لەمەشدا دابەشکاری هەیە، دابەشکاریش تەنیا بۆ شتێک دەبێت کە لێکدراوبێت، خوداش لێکدراو نییە. هەروەها ناکرێت بڵێین خودا تواناداره، چونکە توانا وا دەخوازێت کاریگەری ڕاستەوخۆی لێوە دەرچێت، کاریگەری ڕاستەوخۆش گواستنەوەی لێوە پەیدا دەبێت لە بارودۆخێکەوە بۆ بارودۆخێکی دیکە، لەمەشەوە گۆڕان بەسەرداهاتن پەیدا دەبێت، هەموو ئەمانەش لێکدراوی دەخوازن و دەبێت ئەو شتەکە لێکدراوبێت لە چەند شتێک، خوداش لێکدراو نییە، کەواتە خودا ناکرێت بەم سیفەتە وەسفبکرێت.

بەهەمان شێوە ئەم تاکانەییە لە تێڕوانینی ئەفلۆتینندا ناکرێت وەسفبکرێت بە بوون (وجود، موجود) واتە ناکرێت بڵێین خودا هەبووە، چونکە هەموو هەبوویێک و هەموو بوونێک سەرەتایەکی هەیە، ئەم بوونەی خودا لەسەرووی بوونەوەی و پێش ئەویشە، کەواتە کە ئێمە سیفەتی وجود و بوون پاڵبدەینە لای خودا، ئەوە خودامان کردە دووەم نەک یەکەم، هەروەها کردمانە ئەنجامی بوونێکی دیکە، ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ حەقیقەتی خودا، چونکە خودا هەم یەکەمە و هەم پێش هەموو شتێکیشە.[1]

کەواتە بنەمای فکری ئەفلۆتین بۆ خودا بریتییە لە داماڵین و داڕنینی خودا لە هەموو سیفەتێک. ئێمە هیچ شتێک نازانین لەبارەی سروشتی خوداوە، ئەوە نەبێت کە خودا جیاوازە لە هەموو شتێک و لەسەروی هەموو شتێکیشەوەیە.[2]

---

(١) موسوعة الفلسفة، بدوی، ب١، ل١٩٨ _ ١٩٩.

(٢) قصة الفلسفة، د. زکی نجیب محمود، ل ٢٣٢ _ ٢٣٣.

ئەفلۆتین دەڵێت: خودا هۆکاری بوونی گەردوونە، لەلایەکی دیکەشەوە دەڵێت: خودا لەسەرووی گەردوونەوەیە و ناکرێت هیچ پەیوەندییەک هەبێت لەنێوان خودا و گەردووندا، ئەم بۆچوون و وتەیەی ئەفلۆتین دژبەیەکن، چۆن ئەم گەردوونە لە خوداوە پەیدابوو؟ یان چۆن ئەم هەموو شتە زۆرانەی گەردوون لە یەک زاتەوە پەیدابوون؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بگەڕێوە بۆ تیۆری هەڵڕژان (فیض).

# فەلسەفە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

## فەلسەفە لە باوەشی ئاییندا

فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست دەستەواژەیەکە بەکاردێت بۆ ئەو فەلسەفەیەی هەڵکەوتبوو لە کۆتا ساڵەکانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لە سەدەی پێنجەمی زایینی هەتاوەکوو سەردەمی رێنیسانس لە سەدەی پانزدەهەمی زایینی.

پێناسەدەکرێت بە دووبارە دۆزینەوە و ژیانەوەی کلتووری کۆن کە لە یۆنان و رۆمادا گەشەی کردبوو لە سەردەمی کلاسیکدا، بە شێوەیەکی کەمیش بۆ وروژاندنی کێشە ئایینەیەکان و تێکەڵکردنی ڕێبازە پیرۆزەکان لەگەڵ وانە عالەمانییەکان.

مێژووی فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست دابەش دەبێت بەسەر دوو سەردەمی سەرەکیدا: سەردەمی ڕۆژئاوای لاتینی کە دوابەدوای سەدەکانی ناوەڕاستی کۆندا هات تاوەکوو سەدەی بیستەم، کارەکانی ئەرستۆ و پلاتۆ دووبارە پەردەیان لەسەر لا درایەوە، وەرگێردران و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کرا.

سەردەمی ئاڵتوونی سەدەی دوانزدەهەم، سیانزدەهەم و چواردەهەم لە ڕۆژئاوای لاتینی، کە بە بە لوتکەی هەڵسانەوەی فەلسەفەی دێرین دادەنرێت لەگەڵ پێشوازی کردن لە نووسەر و ڕەخنەگرانی عەرەب و پێشکەوتنی بەرچاو لە بوارەکانی فەلسەفەی ئایینی، ژیربێژی و بابەتی دەرەوەی سروشت (مێتافیزیک).

مێژوونووسە نوێیەکان، سەدەکانی ناوەڕاست بە یەکێک لە گەشەسەندووترین

سەردەمی فەلسەفیی دادەنێن کە بیروباوەڕی ئایینی مەسیحی کاریگەرییەکی زۆری لەسەر هەبووە. یەکێک لە دیارترین بیرمەندەکانی ئەم سەردەمە، تۆماسی ئەکویناس هەرگیز خۆی بە فەیلەسووف دانەناوە و ڕەخنەی لە فەیلەسووفەکان گرتووە کە هەموو کاتێک کەمترخەمییان هەبووە و تێنەگەیشتوون لە ژیری و دانایی ڕاست و دروست.

کێشە و ململانێ باسکراوەکانی ئەم سەردەمە پەیوەندی نێوان ئەم بابەتانەوە بووە: باوەڕ لەگەڵ ژیربێژی، بوون لەگەڵ سادەیی خودا، ئامانجی ئایین لەگەڵ دەرەوەی سروشت (مێتافیزیک) و کێشەکانی زانیین.

فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست پێداگرییەکی زۆر دەکات لەسەر ئایین. ئیبن سینا و ئیبن ڕوشدی لێ دەرچێت، فەیلەسووفی سەدەکانی ناوەڕاست خۆیان بە فیلەسووف نەدەزانی، بەڵکوو لای ئەوان فەیلەسووف بریتیی بوو لە نووسەرە دێرینەکانی وەک پلاتۆ و ئەرستۆ. هەرچەندە ڕێگاکانیان بۆ ڕوونکردنەوەی پرسیار و بابەتە ئالۆزەکانی ئایین بەند بوو لەسەر شێواز و ڕێگا ژیربێژیەکانی فەیلەسووفە دێرینەکان. تۆماس ئەکویناس و پیتەر دامیان پێیان وابوو کە فەلسەفە خزمەتکاری ئایینە. سەرەڕای ئەم تێڕوانینانە، ڕێگری دروست نەبوو لەبەردەم فەیلەسووفەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لە پەرەسەندن و نوێکردنەوەی فەلسەفەی جیاواز لە پرۆژە ئایینیەکان. بۆ نموونە، بیرمەندەکانی وەک ئۆگستین هیپۆ و تۆماس ئەکویناس سەرکەوتنێکی بەرچاویان بەدەست هێنا لە بابەتەکانی فەلسەفەی دەرەوەی سروشت (مێتافیزیک)دا.

ئەو بنەمایانەی کە فەیلەسووفانی سەدەکانی ناوەڕاست پێی تایبەتمەندن بریتین لە:

ڕێزگرتن لە تێڕوانینەکانی فەیلەسووفە دێرینەکان و بەرگری کردن لێیان، زۆر بە تایبەتی لە ئەرستۆ و ئەفلاتون.

دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان تێڕوانینە فەلسەفەییەکان لەگەڵ وانە ئایینییەکان و بەستنەوەی بابەتە ئایینییەکان بە بابەتە فەلسەفییەکان یەکێک لە گرنگترین و سەرەکیترین بابەتەکانی ئەو سەرەدەمە کە گفتوگۆی لەسەر دەکرا بریتیی بوو لە باوەڕ لەگەڵ ژیربێژیدا. ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد زیاتر مەیلیان بەرەو لایەنی ژیربێژی هەبوو. ئۆگستین دەیگووت کە هەرگیز ڕێگە نادات لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکانی لە دەسەڵاتی خوداوەند تێپەڕببێت.

فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست بەشێوەیەکی بەرچاو ئایینین. بابەتەکانی لەم سەردەمەدا باس دەکرا ئەمانە بوون:

کێشەی خراپەکاری (شەیتان): فەیلەسووفە کلاسیکەکان پێشبینیان دەکرد دەربارەی سروشتی شەیتان، بەڵام کێشەکە بەلایانەوە ئەوە بوو کە چۆن خودایەکی هێندە بەهێز، خۆشەویست و خاوەن هەموو زانینێک هەڵدەستێت بە دروست کردنی سیستەمێک کە شەیتان (خراپە) بوونی هەبێت. ئەمە بە یەکەم بابەت دادەنرێت کە لە فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاستدا سەری هەڵداوە.

کێشەی خواستی ئازاد: بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم کێشەیە بەم شێوەیە ڕوون دەکرایەوە، کە چۆن «زانینی تەواوەتی پێشینەی شتەکان لەلایەن خوداوە» یان زانینی ڕوودانی شتەکان لەلایەن خوداوە چۆن دەگونجێت لەگەڵ باوەڕی مرۆڤ بە خواستی ئازادی خۆی.

نەقڵ و عەقڵ و پەیوەندییان بەیەکەوە، نەقڵ پێش عەقڵ دەخرێت؟ یان عەقڵ پێش نەقڵ دەخرێت؟

پرسیاری ئەوەی کە ئایا دەکرێت شتگەلێک بوونیان هەبێت کە مادی نەبن، وەک فریشتەکان.

### فەلسەفەی سروشتی

لە فەلسەفەی سروشتی و فەلسەفەی زانستدا، فەیلەسووفی سەدەکانی ناوەڕاست بەزۆری کاریگەری ئەرستۆیان لەسەر بووە. هەرچەندە لە دوای سەدەی چواردەهەم بەدواوە، زیادبوونی بەکارهێنانی ژیربێژی بیرکارییانە لە فەلسەفەی سروشتیدا بووە هۆی ئامادەکردنی گەشەکردنی زانست لە سەرەتای سەدەکانی نوێدا. شێوازەکانی ژیربێژی بیرکارییانە لەلایەن «ویلیەم هەیتسبێری و ویلیەم ئۆکهام» نیشانەن بۆ بەربڵاووی ئەم ڕەوتە. نووسەرەکانی تری فەلسەفەی سروشتی بریتیین لە «ئەلبێرتی ساکسۆنت، جۆن بیوریدەن، نیکۆلاسی ئۆتریکۆرت.»

## بۆچوونەکانی سەدەی ناوەڕاست لەهەمبەر زانین و مەعریفە و پەیوەندی ئایین و عەقڵ

١. هەندێکیان پێیان وابوو تاکە سەرچاوەی مەعریفە و زانین بریتییە لە ئایین و وەحی، بێپێویستن لە هەستەکان و عەقڵ و ...

٢. هەندێکیان پێیان وابوو وەحی ئامانجە و عەقڵ هۆ و سەبەبە، لەڕێی عەقڵەوە وەحی وەردەگرین، بەڵام دەبێت عەقڵ خزمەتکاری وەحی بێت، کاری عەقڵ ئەوەیە وەحی وەربگرێت و لێی تێبگات.

٣. هەندێکی دیکە پێیان وابوو هەرکام لە عەقڵ و وەحی بوار و بابەتی خۆی هەیە، عەقڵ بۆ شتە سروشتی و بەرهەستەکانە و وەحیش بۆ شتە ئیمانی و ئایینییەکانە.

٤. هەندێکی دیکە پێیان وابوو کێشە نییە با عەقڵ و وەحی هەردووکیان هەبن، بەڵام عەقڵ لەپێشترە و دەبێت لەکۆتاییدا بگەڕێینەوە بۆ عەقڵ، بۆنموونە هەرکاتێک وەحی و عەقڵ تێکگیران، ئەوە دەبێت عەقڵەکە زاڵ بکەین.

ئەمە پوختەی بۆچوونەکان بوو دەربارەی عەقڵ و نەقڵ و پەیوەندی نێوانیان، بەڵام ئەوەی لەکۆتاییدا زاڵبوو، بریتی بوو لە دژایەتی کردنی عەقڵ و زانست و زانایان و فەیلەسووفان و بیرمەندان و ڕێگری لێکردنیان و ئازاردان و کوشتنیان، هەمووشی بە پاڵپشتی کڵێسا و دەسەڵاتی ئایینی، ئیجا دەسەڵاتی سیاسی.

دوایی لەسەردەمی ڕێنساس و شۆڕشی فەڕەنسیدا، ئەورووپا وەرچارخان و ڕزگاربوونێکی گەورە و زۆرباشی بەخۆیەوە بینی، کە لەو ڕێیەوە توانیان خۆیان ڕزگار بکەن لە هەرسێ دەسەڵاتی ستەمکار:

١. دەسەڵاتی ئایینی و کەنیسە، پاپا و قەشە

٢. دەسەڵاتی ئابووری، دەرەبەگ

٣. دەسەڵاتی سیاسی، ئمپڕاتۆر

دوایی

پەرلەمان جێی ئیمپراتۆری گرتەوە.

فەیلسووف و زاناکان شوێنی پاپا و دەسەڵاتی دینیان گرتەوەوە.

سەرمایەدارەکان شوێنی دەرەبەگەکانیان گرتەوە.

یەکێ لە دروشمەکانی شۆڕشێ فەڕەنسی بریتیبوو لە "بە ڕیخۆڵەی کۆتا قەشە کۆتا پادشا لەسێدارە بدەن."

## پەیوەندی نێوان ئایین و فەلسەفە

لە نێوان فەلسەفە و ئاییندا پەیوەندییەکی توندوتۆڵ هەیە کە هیچ کەمتر نییە لەو پەیوەندییەی کە لەنێوان فەلسەفە و زانستدا هەیە، هەروەها هیچ

ناکۆکییەک لە نێوانیانیدا نییە، چونکە فەلسەفە لە بنەڕەتدا لە باوەشی ئایینەوە سەری هەڵداوە و باشترین بەڵگە بۆ ئەم وتنە بریتییە لە مێژووی فەلسەفە کە بەڕوونی دەیسەلمێنێت پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لەنێوان ئایین و فەلسەفەدا هەیە هەر لە مێژەوە. بۆنموونە دەوترێت ئایینە کۆنەکانی وەک ئایینی میسری و میسۆپۆتامیا و هیندۆسی و چینی و ... هتد، ڕێخۆشکەر بوونە بۆ سەرهەڵدانی فەلسەفە لە وڵاتی یۆنان، کەواتە ئایین بنەما و بنچینەی هەموو هزرینێکی فەلسەفییە، ئەمەیش واتای ئەو دەربڕینەیە کە دەڵێت: "فەلسەفە کچی ئایین و دایکی زانستە، بەوەی کە ئایین ڕێخۆشکەری فەلسەفە بووە و فەلسەفەیش زانستی بەرهەم هێناوە"، بەڵام لێرەدا گەر ئێمە بڵێین ئایین ڕێخۆشکەری فەلسەفەیە، ئایا دەگونجێت بڵێین ئایین و فەلسەفە یەک سەرچاوەیان هەیە؟ نەخێر ناکرێت بڵێین ئایین و فەلسەفە یەک سەرچاوەیان هەیە، هەڵبەتە سەرچاوەی فەلسەفە بریتییە لە ئەقڵ، ئایینیش (ئاسمانییەکان) پشت بە سروش ـ وەحی دەبەستن.

## پەیوەندی نێوان ئایین و فەلسەفە لە سەدە دێرینەکاندا

ئاشکرایە ئایین بەر لە فەلسەفە هەبووە، چونکە سەرجەم تۆژینەوەکان لەبارەی ژیار و شارستنییەکان ئەوە دەسەلمێنن کە ئایین بەر لە فەلسەفە هەبووە و هیچ گومانی تێدا نییە.

هەروەها سەرچاوەی ژیاری و شارستانییەکانی وەک میسر، هیند، چین، فارس و بابل دەگەڕێتەوە بۆ بناخە گیانییەکان کە گرنگییان بە ئاسمان و زەوی داوە، گیان بەلای ئەوانەوە دەسەڵاتی بەسەر هەموو لایەنەکانی ژیانەوە هەیە، هەروەها بڕوایان بە پەیامبەران و سرووش هەیە، کە زانست و هونەرەکان لەپێناو خزمەتکردنی ئاسمان تەرخانکردووە، بەڵام کاتێک فەلسەفە لە یۆنان

سەریهەڵدا لە سەدەی شەشی پ.ز، بووە هۆی دروستبوونی ناکۆکی لەگەڵ ئایینیدا. ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ڕێکخراوێک لە پیاوانی ئایینی کە کار بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی نەگۆڕ بکەن لە ناو کۆمەڵگەدا. لە کاتێکدا کە ئایین تێکەڵ ببوو بە ئەفسانە. بۆ نموونە، لە نووسینەکانی «هۆمیریۆسدا» دەبینین کە چۆن باس لە خوداوەندەکانی یۆنان دەکات، بە تایبەتی لە چیرۆکی «ئەلیادە»، ئەم خوداوەندانە هیچ جیاوازیان نییە لەگەڵ مرۆڤدا، تەنیا بەوەی نەبێت کە ئاوێکی شین بە ناو لەشیاندا دێت و دەڕوات و دەبێتە هۆی نەمرییان. کەواتە خوداوەندەکانی یۆنان وەک مرۆڤ وان لە سەرجەم خەسڵەتەکانیاندا کە تەنیا بە نەمری جیادەکرێنەوە، هەر بۆیە فەیلەسووفە بەراییەکانی یۆنان پەیان بەو ڕاستییە برد، کە ئەو ئەفسانانە تەنیا بریتین لە ئەندێشە و خەیاڵی مرۆڤەکان و لەسەر فۆڕمی خۆیان خوداوەندەکانیان چێکرد، بۆنموونە فەیلەسووفی یۆنانی «ئیکسانۆفان» سەر بە قوتابخانەی ئیلییەکان ئەوەی ڕەتکردەوە کە مرۆڤەکان فۆڕمی خوداوەندەکانیان لەسەر شێوەی خۆیان وێنا بکەن، بۆنموونە خەڵکی «تراقیا» خوداوەندەکانی خۆیان بە چاو شین و پرچ سوور وێنا دەکرد. بۆیە گەر ئەسپەکان توانای ئاخافتنیان هەبووایە، ئەوا ئەوانیش خوداوەندەکانیان لە سەر فۆڕمی خۆیان وێنا دەکرد. هەروەها دەبینین «ئینکساگۆراس» بە زەندیق تاوانبار کرا، کە دەیوت خۆر پارچەیەکی گڕگرتووە و مانگیش برێتییە لە زەوی نەک هەردووکیان خوداوەند بن، بەڵام گەر بڕوانینە سوکرات و ڕێزلێنانی ئەو بۆ دابونەریتە ئایینییەکانی سەردەمەکەی و ڕێزلێنانی بۆ یاساکانی ئەسینا دەبینین کە سوکرات بەوە تاوانبارکراکە خوداوەندەکانی شاری ئەسینای ڕەتکردەوە و هەوڵی دەدا بیروباوەڕی نوێ بهێنێتە نێو ژیانی ئەسیناوە. سزای ئەم جۆرە تاوانەش بریتی بوو لە لەداردان، هەر بۆیە سوکرات بڕوای بە نەمری گیان هەبوو، تاکە ڕێگەش بۆ بە دەستهێنانی چاکە بریتییە لە زانین.

سەبارەت بە ئەفلاتوون و فەلسەفەکەی دەبینین کە ئەم فەیلەسووفە،

لەسەر هەمان ڕێچکەی مامۆستاکەی خۆی سوکرات پەرەی بە فەلسەفاندن دەدا، فەلسەفەکەی لە ڕووی فۆڕمەوە دەربڕینی ئەفسانەیی قبووڵ دەکرد، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆکەوە پلاتوون ئایین سەرچاوەی ئیلهامی بووە. هەروەها ئەسیناییەکان ئەرستۆیان بە ئیلحاد تاوانبارکرد، چونکە هیچ شوێنەوارێکی بە فەلسەفەکەیەوە دیار نییە بە تایبەتی لە تێڕوانینیدا بۆ جووڵێنەری یەکەم، بەڵام سەبارەت بە گونجاندنی پەیوەندی نێوان ئایین و فەلسەفە لە کۆندا دەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانەی ئەفلاتوونیزمی نوێ کە بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە: -

**١-قۆناخی یەکەم:** - ئەم قۆناغە بەوە جیاوازە کە جۆرە هاوسەنگێکی لە نێوان ئایین و فەلسەفە ئەنجامدا، بەنموونە، فەلسەفەی ئەفلۆتین بە دەوری دوو کێشەدا دەخولێتەوە، کە بریتین لە کێشەیەکی ئایینی وەک چارەنووسی دەروون و ڕێگەی گەڕانەوەی بەرەو پاکژیی یەکەم کە دەروون تیادا بووە، بەڵام کێشەی دووەم، کێشەیەکی فەلسەفەیە، پەیوەستە بە ڕێکخستنی گەردوونەوە و ڕاڤەکردنی بە شێوەیەکی ئەقڵانی، ئەم دوو کێشەیەش پێکەوەگرێدراون.

**٢-قۆناغی دووەم:** - لەم قۆناغەشدا ئایین بە تەواوی زاڵ دەبێت بەسەر فەلسەفەدا، ئەم جۆرە زاڵبوونە لە فەلسەفەی «یامبلیخۆس» دا دەردەکەوێت، کە فەلسەفە و ئایین پێکەوە دەبەستێتەوە، بۆنموونە، کاتێک پلاتوون و ئەرستۆ دەخوێنێتەوە بە فیساگۆرسەوە گرێیان دەدا، لە دواجاردا هەڵدەستێت بە ڕاڤەکردنی بەشێوەیەک کە لەگەڵ ئایین و سۆفیگەرایی ڕۆژهەڵاتدا بگونجێت.

**٣-قۆناخی سێیەم:** - لەم قۆناخەدا پلاتوونیزمی نوێ کاریگەرە بە ئاراستەی (المشائون، پیاسەکاران) بەرئەنجامی ئەم کاریگەرییەش ئەوەبوو کە پلاتوونیزمی نوێ زیاتر وردی و ڕێکخستنی پێوە دیارە لە دەقەکانیدا.

## فەلسەفە و ئایین لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

سەدەکانی ناوەڕاست بەوە جیادەکرێتەوە لە سەدەکان دیکە، پتر لاهووت زاڵبووە، هەر بۆیە پرسەکان تا ئەندازەیەکی زۆر پرسی ئایینین، بە تایبەتی هەوڵدان بۆ گونجاندن لە نێوان ئەقڵ و نەقل یاخود فەلسەفە و ئایین یان دانایی و شەریعەت، لێرەوە ئایینە ئاسمانییەکان ڕووبەڕووی ئەم پرسانە بوونەتەوە، لەوانە ئایینی جوولەکە، مەسیحی و ئیسلام.

**١- ئایینی جوولەکە:** بەناوبانگترین فەیلەسووفی جوولەکان لە سەدەی یەکەمی زاینی کە هەوڵی گونجاندنی نێوان ئایینی جوولەکە و فەلسەفەی ئەفلاتوونی دابێت (فیلوونی ئەسکەندەریی)، کە لە شاری ئەسکەندەریی قوتابخانەیەکی هزری دامەزراند، ئەم کارەی بە پشت بەستن بە میتۆدی هێرمۆنتیکای هێمایی بە ئەنجام گەیاند، بۆنموونە لە جێبەجێکردنی میتۆدەکەی دەبینین فیلوون لە وەسفکردنی گەشتی ڕۆح و گەڕانەوەی بۆ پایەی ئیلاهی، بە کەشیشی بلیمەتی دەچووێنێت، لێرەدا گەر ئێمە بڕوانینە دەربڕینێکی فیلوون دەبینین چوونە ژوورەوەی کەشیشی بلیمەتی جوولەکانی بۆ لای پیرۆزی پیرۆزییەکان بە گەیشتنی دەروونی دەچووێنێت بۆ جیهانی ماقووڵ، هەروەها کاتێک کەشیش پۆشاکەکەی دادەکەنێت، واتە دەروون خۆی لە خەڵەتە زەمینییەکان دادەماڵێ، کەواتە لێرەوە تێکڕای چیرۆکەکە بەشێوەیەکی هێمایی ئاماژە بە ئەزموونی سۆفیگەری دەدا، ئامانجی فیلوون لە بەکارهێنانی میتۆدی هێرمۆنتیکای هێمایی بۆ شرۆڤەکردنی دەقە پیرۆزەکانی تەورات لە پێناو گشتاندنی شەریعەت و ئایینی جوولەکە بووە، کە پابەند نەبێت بە هیچ کات و شوێنێکەوە.

**٢- ئایینی مەسیحی:** لە کۆتایی چاخەکانی کۆنەوە ئایینی مەسیحی لە ڕێگەی مژدەدەرەکانەوە لە ڕۆمای پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ڕوما بڵاوبوەوە، مژدەدەری وەک بزاڤێکی نهێنی لە سەدەی یەکەمی زاینی لە ڕۆما سەریهەڵدا، یەکێک

لە مژدەدەرەکان «قدیس بووترس»ـە، یاریدەدرەکەیشی فەیلەسووفی ڕۆمانی «قدیس بۆڵس»، بەڵام لە میسردا قدیس (مرقس) هەڵسا بە بڵاوکردنەوەی، ئایینی مەسیحی سەرجەم قورساییەکانی لەسەر شانی مرۆڤی وەلاناوە، هەروەها ئازادییەکی ڕەهای بە مرۆڤان بەخشیوە و ڕێگەی ڕزگاربوون و پاکژبوونەوە لە تاوانەکانی بۆ ڕوونکردووەتەوە، دەکرێت بڵێین ئەم فۆڕمە لە لێبووردن لە ئایینی مەسیحیدا بۆ مرۆڤ دانراوە.

هەروەها لە کۆتاییەکانی سەدەی دووی زایینیدا لە شاری ئەسکەندەرییە قوتابخانەی ئەسکەندەرییە بۆ فێرکردنی بناغەکانی ئایینی مەسیحی سەریهەڵدا، کە مەسیحییەتی تێکەڵ بە فەلسەفەی یۆنانی کرد، دوو زانای مەسیحی بەناوبانگیش «کلمینتی ئەسکەندەری و ئۆریجینی ئەسکەندەری» بەدەرکەوتن.

کلیمنتی ئەسکەندەری:- یەکێک بوو لەو کەسانەی داکۆکی لە ئایینی مەسیحی دەکرد و پێی وابوو کە فەلسەفە دژی ئایین نییە، چونکە بڕوابوون بریتییە لە ئەزموونێک کە بە شارەزایی کۆتایی دێت و مرۆڤ دەگەیێنێت بە ڕووناکی، هەروەها دەیووت پێویستە هەموو مەسیحییەکی ڕۆشنبیر شارەزا بێت لە ئایین و باشترین ڕێگەش بۆ ئەم کارە، کە بتوانێت خزمەت بەم ئاراستەیە بکات فەلسەفەیە.

ئۆریجینی ئەسکەندەری: یەکێکی دیکەیە لە شرۆڤەکارانی کتێبی پیرۆز، کە فەلسەفەی وەک ئامرازی ڕاڤەکردنی بیروباوەڕی ئایینی بە کاردەهێنا.

دواتر دوو گرووپ لەبارەی پەیوەندی نێوان ئایین و فەلسەفە هاتنە کایەوە، یەکێکیان هەوڵی ئەوەی دەدا، کە فەلسەفە وەک ئامرازی داکۆکیکردن لە ئایین پێناسە بکات و هیچ جیاوازێک نابینن لە نێوانیاندا، هەروەها فەلسەفە برێتییە لە ئامرازێک بۆ تێگەیشتن لە بڕوابوون، لەو فەیلەسووفانەی کە سەر بەم گرووپەن «سان ئۆگستین» کە پێی وایە هیچ ناکۆکییەک نییە لە نێوان

ئایین و فەلسەفە یاخۆ لەنێوان بڕوابوون و ئەقڵ، چونکە ڕاستییە ئیلاهییەکان بابەتی راستەقینەن بۆ هەر یەک لە فەلسەفە و ئایین، گەر ڕێگەکانیشیان جیاواز بێت، بەڵام فەیلەسووفی ئەقڵانی«تۆماس ئەکوینی» کە سەر بە گرووپی دووەمە هەوڵی جیاکردنەوەی ئایین و فەلسەفەی دەدا، بەوەی کە ڕاستییەکانی بڕوابوون بۆ لاهوت گەڕاندەوە، ڕاستییە ئەقڵییەکانیشی بۆ فەلسەفە، چونکە پێی وابوو کە فەلسەفە و بڕوابوون لە ڕووی بابەت و میتۆدەوە جیاوازن، بابەتی فەلسەفە سروشتییە و لە ڕێگەی ئەقڵەوە چنگ دەخرێت، بەڵام بابەتی بڕوابوون یاخۆ ئایین لە ڕێگەی ئیلهامی ئاسمانییەوە سرووش و نەقڵەوە وەردەگیرێت، بەڵام سەبارەت بە میتۆدی فەلسەفە بریتییە لە سەلماندن و بەڵگەهێنانەوە، میتۆدی بڕوابوون پشت بە سرووش دەبەستێت.

**٣. ئایینی ئیسلام:** پرسی گونجاندن لە نێوان فەلسەفە و ئایینی ئیسلام یان ئەقڵ و نەقڵ بە یەکێک لە پرسە مەزنەکانی مێژووی هزری ئیسلام ناسراوە، ئەم پرسەش لەلایەن فەیلەسووفان و زانایانی کەلامەوە هەوڵی چارەسەرکردنی زۆری بۆ درا.

## پەیوەندی نێوان ئەقڵ و نەقڵ لای زاناکانی کەلامی ئیسلامی

زانایانی ئیسلامی باس لە پەیوەندی نێوان ئەقڵ و نەقڵ دەکەن، ئاخۆ کامیان لە پێش ئەوی دیکەیانە، هەروەها تا چ ڕادەیەک دەتوانرێت پشت بە ئەقڵ ببەسترێت لە بابەتەکانی شەریعەت و بڕوا، ئەوان لێرەدا پشت بە دەقەکانی قورئانی پیرۆز دەبەستن، کە بانگەشە بۆ بیرکردنەوەی ئەقڵی دەکات سەبارەت بە گەردوون و نیشانەکانی دیکە دنیا، بەکارهێنانی ئەقڵ لەپێناو گەیشتن بە بڕوابوون، ئەم پرسەی نێوان ئەقڵ و نەقڵ خۆی لە سێ ئاڕاستەی سەرەکیدا دەردەخات:

**١. ئاراستەی زاهیرییەکان**، ئەم گرووپە تەنیا دەسەڵاتی شەریعەت وەک دەروازەیەک دەبینین بەرەو بڕوا، بەڵام سەبارەت بە ئەقڵ بەلای ئەم گرووپەوە هیچ ڕۆڵێکی وای نییە.

**٢- ئاراستەی موعتەزیلە:** ئەم گرووپەش دەسەڵاتی ئەقڵ لە پێش لە نەقڵەوە دادەنێن بۆ گەیشتن بە هەقیقەتی بڕوا.

**٣- ئاراستەی ئەشعەرییەکان یان ئەهلی سونە و جەماعەت:** ئەم گرووپەش گونجاندنێک لە نێوان ئەقڵ و نەقڵدا پێکدەهێنن، کە پێیان وایە لە ڕوویەکەوە شەریعەت دەکەوێتە پێش ئەقڵ لە بابەتەکانیدا، بەڵام هەندێک جاریش لە ڕێگەی ئەقڵەوە لە دەقەکانی نەقڵ تێدەگەین.

## فەلسەفە و ئایین لای فەیلەسووفە موسڵمانەکان

فەیلەسووفە موسڵمانەکان بەردەوام هەوڵی نزیکردنەوەی فەلسەفە و ئایینییان داوە، کە فەلسەفە زانستی هەقیقەتە لە ڕێگەی ئەقڵەوە، هەروەها ئایینیش زانستی هەقیقەتە لە ڕێگەی سرووشەوە. کەواتە ئەو ڕاستییانەی کە ئەقڵ دەیخەنەڕوو هیچ ناکۆکی و دژایەتی نییە، لەگەڵ ئەوەی کە ئایین باسی دەکات، بەم پێیە هیچ جیاوازێک نییە لەنێوان فەلسەفە و ئایین.

## لە فەیلەسووفە موسڵمانەکان لەو سەردەمەدا:

**کیندی:** یەکەم فەیلەسووفە، کە هەوڵی گونجاندنی نێوان فەلسەفە و ئایینی داوە بەوەی کە بابەتە بنەڕەتییەکانی ئایین ئەو بابەتانەن کە فەلسەفە لەبارەیانەوە دەدوێت، ئەوانیش بریتین لە: ناسینەوەی یەزدان، یەکتاپەرستی، ناردنی پەیامبەران، بڕواکردن بە دوارۆژ و زیندووبوونەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا

دەبینین کە کیندی هیچ جیاوازییەک نابینێت لەنێوان فەلسەفە و ئاییندا، بەڵام ئەو زانینەی لە ڕێگەی سرووشەوە پێمان دەگات لەپێش ئەو زانینەیە، کە لە ڕێگەی ئەقڵەوە پێی دەگەین.

**فارابی**: بە یەکێک لە گەورەترین فەیلەسووف ئەژمار دەکرێت لە مێژووی فەلسەفەی ئیسلامدا کە هەوڵی گونجاندنی داوە لەنێوان فەلسەفە و ئاییندا، فارابی پێیوایە ئیسلام لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانیدا هیچ تێکگیرانێکیان نییە، ئەگەر هەشبێت ئەوە هەر لە ڕووکەشدا وادەردەکەوێت، ئەگەرنا لە حەقیقەت و لەناوەڕۆکدا هیچ تێکگیرانێک نییە، دەبێت تەئویلی فەلسەفی بەکاربهێنرێت بۆ لابردنی تێکگیرانە ڕووکەشەکان، فارابی بۆیە ئەم بۆچوونەی هەیە، چونکە پێیوایە ئایین و فەلسەفە لە یەک سەرچاوەوە سەرچاوە دەگرن کە سەرچاوەی «عەقڵی کارا» یە (العقل الفعال)، بۆیە هیچ جیاوازییەکیان نییە، هەروەها هیچ خیلافێکیش نییە لەنێوان فەیلەسووفان و پێغەمبەراندا، یان ئەرستۆ و موحەممەد (درוودی خوای لەسەر بێت.) دا. لەکۆتاییدا فارابی هەموو هەوڵێکی داوە بۆئەوەی ئەوە بسەلمێنێت کە خیلاف نییە لەنێوان ئیسلام و فەلسەفەدا، چونکە هەردووکیان سەرچاوەیەکەیان یەکە کە عەقڵی کارایە، هەردووکیشیان حەقن و ئامانجیان حەقە، حەقیش دژی حەق ناوەستێتەوە. بەڵام دەکرێت گەیاندنی پێغەمبەران بەشێوازێک بێت و گەیاندنی فەیلەسووفانیش بەشێوازێکی دیکە، چونکە پێغەمبەران بە زمانێک دواون کە هەموو کەسێک لێیان تێبگات. کەواتە لێرەوە بۆمان ڕوونبۆوە کە فەلسەفە و ئایین لەلای فارابی هیچ خیلافێکیان نییە، بەڵکوو یەک شتن، چونکە هەردووکیان لە سەرچاوە و ئامانجدا یەک شتن، هەردووکیان سەرچاوەکەیان خودایەو ئامانجیان گەیشتنە بە ڕاستی و حەقیقەت و بەختەوەری و خۆشبەختی.

**ئیبن سینا**: ئیبن سینا یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسووفە موسڵمانەکان کە زۆر کاریگەر بووە بە فەلسەفەی یۆنانی و هەوڵی زۆری داوە بۆ گونجاندنی

فەلسەفە و ئیسلام، ئەویش بەهەمان ڕێچکەی کیندی و فارابیدا ڕۆیشتووە و ویستوویەتی بنەما ئایینییەکان بگونجێنێت لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانیدا، هەتا وای لێهات ئەوەندە تەئویلی فەلسەفی کرد، تا لەکۆتاییدا و لەلایەن ئیمامی غەزالیی و چەندان زانای دیکەدا تەکفیر بکرێت.

**غەزالی**: ئەم وەکوو سۆفیگەرێک سەر بە ڕێبازی ئەشعەرییەکانە، پێی وایە کە شەرع دەکەوێتە پێش ئەقڵ، بەڵام دەکرێت ئێمە ئەقڵ وەک دەروازیەک وەربگرین بۆ تێگەیشتن لە دەقەکانی ئایین، کەواتە لێرەدا غەزالی دژ بە زانستە ئەقڵییەکان نەبوو، وەک چۆن هەندێک کەس پێیان وایە کە غەزالی ناکۆکە لەگەڵ زانستە ئەقڵییەکان، بۆیە دەڵێت "ئەوەی مەزندەی ئەوە بکات، کە زانستە ئەقڵییەکان دژی زانستە شەرعییەکانە، ئەوە مەزندەکەی لە ناڕوونییەوە سەرچاوە دەگرێت."

**ئیبن ڕوشد**: مەزنترین هەڵوێستەکانی ئیبن ڕوشد لە بواری هزری فەلسەفیدا بریتییە لە هەوڵدان بۆ گونجاندنی نێوان فەلسەفە و ئایین. لێردا ئیبن ڕوشد دەڵێت: ئەوەی لە قورئاندا هاتووە بریتییە لە هەقیقەت و باوەڕهێنان پێی ئەرکە، هەروەها ئایین تێڕوانینی فەلسەفەی ئەقڵی وەک ئەرک بەسەر مرۆڤدا واجیب دەکات، کەواتە هیچ نەسازانێک نییە لەنێوان فەلسەفە و ئایین، بگرە فەلسەفە هێماکانی ئایین شرۆڤە دەکات.

شەرع و فەلسەفە گەر جیاوازی هەبێت لەنێوانیاندا، ئەوە دەبێت دەقەکان تەئویل بکرێن. بەڵام تەئویلکردنی دەق تایبەتە تەنیا بە ئەهلی فەلسەفە، چونکە ئەوان دەتوانن لەژێر ڕۆشنایی ئەقڵ ئامانجی دەقەکان ڕوون بکەنەوە.

هەربۆیە کتێبێکی تایبەتی نووسی لەم بارەی گونجان و سازانی ئایین و فەلسەفە، بەناوی (فصل المقال فيما بين الحكمة والشريعة من الاتصال).

لەکۆتاییدا دەتوانین بڵێین فەیلەسووفە موسڵمانەکان کاریگەری فەلسەفەی

یۆنانییان لەسەر بووە، هەربۆیە بەهیچ جۆرێک نەیانتوانیوە لەژێر ئەو کاریگەرییە دەربچن، بۆیە هەموویان هەوڵی گونجاندنی دەقەکانیان داوە لەگەڵ بۆچوونی فەیلەسووفە یۆنانییەکان، بەردەوامیش تەئویلی فەلسەفییان کردووە بۆ هەموو ئەو دەقانەی کە لەگەڵ ئەو فەلسەیە نەهاتوونەتەوە. کەواتە یەکێک لە هەوڵ و بابەتە گرنگەکانی فەیلەسووفە موسڵمانەکان بریتی بووە لە پەیوەندی نێوان ئایین و فەلسەفە و گونجاندنیان بەیەکەوە، بەڵام لەبەرانبەر ئەم فەیلەسووفانەدا موتەکەلیمەکان هەن (زانایانی کەلام)، ئەوان بەپێچەوانەوە لەزۆربەی بابەتە فەلسەفییەکان پێچەوانەی فەلسەفەی یۆنانی بوونە و وەڵامیان داونەوە و کتێبی زۆریان نووسیوە لەسەر ئەم بابەتانە، بۆیە زۆرێک لە توێژەران موتەکەلیمەکەن بە فەیلەسووفی ڕەسەنی ئیسلامی دادەنێن و زانستی کەلامیش بە فەلسەفەی ڕەسەنی ئیسلامی دادەنێن، چونکە کاریگەر بوونە بە خودی ئیسلام و وەحی نەک فەلسەفەی یۆنانی، پێیانوایە فەیلەسووفانی وەک «ئیبن سینا و فارابی و ئیبن ڕوشد و...» تەنیا دووبارەکەرەوەی فەلسەفەی یۆنانی بوونە بەبەرگێکی ئیسلامیانە.

## پەیوەندی نێوان ئایین و فەلسەفە لە سەردەمی ڕێنیسانس و نوێدا

ئەم سەردەمە لە دوای ڕووخانی قوستەنتینییە لە ساڵی ١٤٥٣ لەسەر دەستی تورکەکان بە کۆتایی هێنانی سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتای سەردەمی ڕێنیسانس دێتە ناسین، ئەو بزاوتەی بە بزاڤی مرۆیی ناسراوە، زۆر لایەنی لە خۆگرتبوو، لەوانە لایەنی ئایینی بەتایبەتی سەرهەڵدانی بزاڤی چاکسازی ئایینی، کە سەرەتا لە ئینگلتەرا هاتە ئاراوە لە سەدەی چواردەی زاینی، بەڵام ئەم بزاڤە بە تەواوی لە ساڵی ١٥٢١ لەسەر دەستی هەر یەک لە «مارتن لۆتەر و جۆن کالڤین» لە ئەڵمانیا و فەڕەنسا سەریهەڵدا، کە بریتی بوو لە بزاڤێکی ئایینی

پەتی دژ بە هونەر و دابونەریت، لایەنگرانی ئەم بزاڤە بڕوایان وایە کە ئایینی تەندروست لە شارەزیی مرۆڤەوە لە ژیاندا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ سەرچاوە دەگرێت، هەروەها هەوڵی جیاکردنەوەی پەیوەندی نێوان تاک و دەسەڵاتی ئایینی (کڵێسا) و دژایەتی لاهوتی دەکرد، هەروەها بانگەشەی بو ئازادی بیرکردنەوە و سەربەخۆیی هزر دەکرد.

## ڕووەکانی ڕێکەوتنی نێوان ئایین و فەلسەفە

ئایین هیچ دژایەتێکی تێڕوانین یاخۆ تێڕامان و هزرینی ئەقڵی ناکات، ئەو کەسەی بە مێژووی فەلسەفدا بڕوانێت ئەوە پەیوەندییەکی تووندوتوڵ لە نێوان ئەقڵ و نەقڵ یان فەلسەفە و ئایین دەبینێت، بەڵگەش بۆ ئەمە بریتییە لە ئایینەکانی وەک میسری، بابلی، هیندی و چینی و ...هتد، کە زەمینەسازیان کرد لەپێناو سەرهەڵدانی فەلسەفەی گریکەکان.

هیچ ناکۆکییەک لەنێوان فەلسەفە و ئایینی ڕاستەقینەدا نییە، گەر هەبێت ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ بوونی دەمارگیری لەنێو فەیلەسووفان و پیاوانی ئایینی، کەواتە خوێندنەوەی فەلسەفە نابێتە هۆی لەقبوونی بیروباوەڕکان تەنیا لە یەک دۆخدا نەبێت، ئەویش کاتێک ئەو بیروباوەڕە بەرتەسک و چەق بەستوو بێت، فەلسەفە و ئایین لە ڕووی بابەتەوە هاوتان یاخود کۆکن، چونکە هەردوو کایە ئامانجیان گەیشتنە بە هەقیقەت بە شێوەیەکی گشتی.[1]

---

(1) http://www.historyofkurd.com/14/03/2016/

## قۆناغەکانی فەلسەفەی مەسیحی

به شێوەیەکی گشتی فەلسەفەی مەسیحی دوو قۆناغی سەرەکی هەیە:

**١. قۆناغی باوکان (الاباء):** ئەم قۆناغە لە ناوەڕاستی سەدەی دووەمی زایینییەوە دەستپێدەکات تاوەکوو سەدەی نۆیەم، سەرەتا لەسەر دەستی (کلیمانت ئەسکندەری یەکەم) دەستی پێکرد، لە واقیعدا زۆرێک لە «باوکان»ی کەنیسە، بەر لەوەی ببنە پیاوانی ئایینی فەیلەسووف و بیرمەندبوون، ئەم قۆناغی باوکان بە باوکە «ئۆگستین» (٣٥٤ - ٤٣٠) کۆتایی هات.

**٢. قۆناغی فەلسەفەی قوتابخانەیی (المدرسی):** ئەم قۆناغە لە سەدەی نۆوە بۆ سەدەی پانزە درێژ دەبێتەوە، ئەم قۆناغە بە قوتابخانەیی و مەدرەسی ناوسراوە، چونکە پیاوانی ئایینی و ڕەهبانەکان لە قوتابخانە پاشکۆکانی کەنیسەدا هەڵدەستان بە فێرکردنی فەلسەفە، «سکۆتس ئەریجینا» بە دامەزرێنەری ئەم فەلسەفەیە دادەنرێت، کە لە سەدەی نۆدا ژیاوە، پاشان لەلایەن هەریەک لە «ئەنسلیم» (١٠٣٣ - ١١٠٩ ز) و «ئەبیلارد» (١٠٧٩ - ١١٤٢ ز) و «دینس سکۆت» (١٢٦٥ - ١٣٠٨ز)ەوە، قووڵبووەوە و ڕەگی داکوتا، بەڵام لە هەموویان کاریگەرتر «تۆما ئەکوینی» بوو (١٢٢٤ - ١٢٧٤ ز)، تا وای لێهات هەوڵەکانی بوون بە ئاراستەیەکی سەربەخۆ لەناو ئەم قۆناغەدا، بە «تۆماویزم» ناوبرا.

لەناو قۆناغی قوتابخانەییدا دوو ئاراستەی سەرەکی لە دوو کاتی جیاوازدا سەریانهەڵدا:

١. لەسەدەی نۆوە تاوەکوو سیانزە خاوەن مۆرکێکی ئەفلاتوونی بوو.

٢. لە سەدەی سیانزەوە تاوەکوو سەدەی پانزە خاوەن مۆرکێکی ئەڕستۆیی بوو.

تۆما ئەکوینی کاریگەری گەورە و گرنگی هەبوو لە دەرخستنی فەلسەفەی ئەرستۆدا.

لەکۆتاییدا دەتوانین بڵێین هەردوو ئاراستەکە زۆر پێداگرییان لەسەر گونجاندنی مەسیحییەت و عەقڵ دەکرد، بنەما ئایینییەکانیان بە بۆچوونە فەلسەفەییەکان ڕاڤەدەکرد و پشتیوانی عەقڵی و فەلسەفییان بۆ پەیدا دەکرد.[1]

## قەدیس ئۆگستین وەک دیارترین فەیلەسووفی ئایینی مەسیحی، سەدەکانی ناوەڕاست

لە سەرەتادا و لە کەلتوری ئایینی مەسیحیدا «ئۆگستین» زۆرترین کاریگەری هەبووە. کاریگەری بیروباوەڕی ئەم قەشەیە بە جۆرێک بوو کە تا بەراییەکانی سەدەی دوانزدە بڕ بکات. بۆچوونێک کە ئەوی پێدەناسرایەوە لە کتێبی «شاری خودا»دا ڕەنگی داوەتەوە. جیهان لای ئەم قەشەیە، دوو بەش بوو.

جیهانی شەیتان و جیهانی خودا، کە پێی وابووە سەرەنجام شاری خواوەندی زاڵ دەبێت بەسەر شاری شەیتانیدا و ئەمەیش ئەنجامی ئاراستەی کارکردنێکە، کە هەڵگرانی ئایینی مەسیحی پەیامەکەی بڵاودەکەنەوە.

وێنەیەک، کە ئەم قەشەیە بۆ مرۆڤی کێشاوە، وێنەی مرۆڤێکی داماو و دەستەوەستان بووە، کە دەبێت ژیانی خۆی بۆ قەرەبووکردنەوەی یەکەمین گوناه، یان گوناهە گەورەکە، تەرخان بکات. لای ئەو، مرۆڤ هیچ ڕێگایەکی لەبەردەمدا نەبووە بۆ ئەوەی ببێتەوە بە هاوڵاتی شاری خودایی، مەگەر بە ڕێگای پاکبوونەوە نەبێت لە ئۆباڵی ئەو گوناهە، ئەو بەمشێوەیە گوناهە یەکەمینەکەی مرۆڤی تیۆریزە کرد.

بە شێوەیەکی گشتیش بۆچوونەکانی ئەو بە دوو دەورەدا تێپەڕ دەبن:

**یەکەمیان:** بڕواداربوونە، بەپێی ئەمەیان، دەبێت سەرەتا مرۆڤ بڕوا بە

---

(١) الفلسفة لمن يريد، د. نبيل، ١١٣ _ ١١٥.

ئایینی مەسیحی بهێنێت و بە شێوەیەکی سەراپایی و بێ هیچ گومانێک ئەو ئایینە قبووڵ بکات. کاتێک، کە باوەڕی هێناو بووە خاوەنی باوەڕێکی ئایینی و مەسیحی، ئەمە ڕێگای بۆ فەراهەم دەکات کە عەقڵی ئەو کەسە لەژێر ئاراستەیەکی باوەڕدارانەدا بڕوات بەڕێوە. بەم شێوەیە کاتێک، کە عەقڵ کەوتە ژێر ڕێنمایی باوەڕ، خاوەن عەقڵەکە دەتوانێت بەرەو گەیشتن بە حەقیقەت هەنگاو بنێت.

شتێکی تر، کە لای ئەم قەشەیە روون بووە ئەوەیە، کە لەبنەڕەتدا گەیشتن بە زانست مەرج نەبوو تەنیا بۆ کەسی باوەڕدار بێت. مرۆڤ باوەڕدار بێت یان یان بێباوەڕ، لە ئەنجامە زانستییەکاندا هاوبەشە. لای کەسێکی بڕوادار (١+١=٢) هەمان ئەنجامیش بۆ کەسێکی بێباوەڕ هەر هەمان ژمارە (٢) دەکات. کەواتە باوەڕ مەرجی سەرەکی، یان تەنیا مەرجێک نییە بۆ گەیشتن بە زانست، ڕێگای زانست ڕێگایەکی هاوبەشە. ئەوەی، کە لای «ئۆگستین» کەسی باوەڕدار لە کەسانی تر جیا دەکاتەوە، زانست نییە، بەڵکوو گەیشتنە بە حەقیقەت. مرۆڤ ئەگەر بتوانێت بەبێباوەڕ دەستی بە زانست و ئەنجامە بیرکارییەکان بگات، بەڵام ئەوا ئەو مرۆڤە هیچ کاتێک ناتوانێت دەستی بە حەقیقەت بگات، مەگەر ئەوەی بڕوا بە ئایینی مەسیحی بهێنێت. بەمشێوەیە باوەڕ دەبێتە تاکە ڕێگای گەیشتن بە حەقیقەت. کەواتە حەقیقەت تەنیا واتایەک و تەنیا لێکدانەوەیەک وەردەگرێت و پاوانی ئەو کەسانە دەبێت بە شێوەیەکی زۆر دڵسەختانە بڕوا بە مەسیح دەهێنن.

لە دەورەی **دووەمدا**، بۆچوونەکانی گۆڕانکارییان بەسەردا هات. کاتێک کەوتە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی بەو رایە گەیشت کە ناکرێت زانست و ئەنجامە زانستییەکانیش لە سنووری بڕواهێنان دەرباز بکرێن، چونکە زانست ئەگەر ڕێنماییەکی ئایینانە و باوەڕانەی نەبێت، ئەوا دەتوانێت زۆر بە ئاسانی بەلاڕێدا بڕوات. بۆ ئەوەی، کە زانست و عەقڵ مرۆڤ بە لارێدا نەبەن، دەبێت سەرەتا

باوەڕ بهێنرێت. تەنیا بەم رێگایەیە، کە باوەڕ دەتوانێت ببێتە چاودێر بەسەر عەقڵەوە. عەقڵ ناتوانێت لە دەرەوەی سنوورەکانی باوەڕ پەی بە حەقیقەتی رەها بەرێت و تەنیا لەم دۆخەدایە، کە عەقڵ بەرەو ڕووی بەلاڕێداچوون و لادان نابێتەوە.

بەمشێوەیە، فەلسەفە لای «ئۆگستین» ئەو پشت ئەستوورییە دێرینەی خۆی لەدەست دا کە یۆنانییەکانو رۆمانییەکان پێیان بەخشی بوو. دەقە ئایینەکان، ئینجیل و نامەکانی پۆڵس جێگای «سوقرات و ئەفلاتوون و شیشیرۆن و ڕواقییەکان...»ی گرتەوە. لای ئەو هیچ جیاوازییەک لەنێوان کایەی فەلسەفە و کایەی تیۆلۆژیادا نەبووە. فەلسەفە جگە لە خزمەتکارێکی گوێڕایەڵی تیۆلۆژیای مەسیحی، شتێکی تر نەبووە. کەواتە ئەمە یەکمجار بووە، کە ئایین بەو فراوانییە باڵی خۆی بەسەر پانتایی فەلسەفەدا کێشابێت.

ئەوەندەی پەیوەندی بە ناسینی خوداوە هەبووبێت، هەوڵی ئەم قەشەیە بۆ پاراستنی یەکتاپەرستی بووە. ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی، کە مەسیحییەتی کردبووە ئایینی رەسمی خۆی، لە هەناوی ئەو کەلتورەوە هاتبوو، کە خاوەنی ژمارەیەک خوداوەندی زۆر و لەیەکتر جیاواز و خاوەن دەسەڵاتی جیاواز بووە. ئەم دۆخەیە کە وا دەکات بۆ هێشتنەوە و پاراستنی ئەم ئایینە تازەیە، رێگا نەدرێت یەکێتی چەمکی خواوەندی تێکبچێت. هەربۆیە دەبینین، کە بەشداری ئەو لە باوەڕی «سیانە»ی مەسیحیدا بە جۆرێکە کە بەبێئەو لایەنە بە ناڕۆشنی دەمێنێتەوەو، هەروەها دەشتوانێت مایەی سەریەشەو کێشەیش بێت بۆ ئایینی مەسیحی.

بەخشینی یەکێتی بە هەر سێبەشەکەی خواوەندێتی لە ئایینی مەسیحی، واتا بەشەکانی «باوک، کوڕ، گیانی پیرۆز» بووە یەکێک لە کارە فکرییەکانی ئەم قەشەیە. لای ئەو، تەنیا شتێک، کە بڕواداران لە بێبڕوایان جیا کردەوە، ئەوە بووە کە باوەڕێکی بەهێزی بە یەکێتی خواوەندی هەبێت. واتا دەبێت

هەر باوەڕدارێک پێی وابێت کە خودا بەسەر ئەم سێبەشەدا جیا نەبووەتەوە و نەبووەتە سێدەسەڵات و سێبوونی لە یەک جیا. بیری فەلسەفی_ئایینی ئەو لەسەر ئەوە کاری دەکرد، کە ئەم سێبەشە لەجەوهەردا یەک شتن.

هەروەک پێشووتریش ئاماژەمان پێدا. چەمکی شاری خواوەندی و جیاکردنەوەی ئەو شارە خواوەندییە لە شاری شەیتانی بنەمای تێڕوانینە فەلسەفی_ئایینەکەی ئۆگستینە، کە تێیدا نەتەوەکان لە ڕەوتی مێژوودا دەکەونە ناو ئەم دابەشکردنەوە. لای ئەو خەڵکانی شاری خودا ئەو کەسانەن کە ناوەندەکەیان هەمان ئۆرشەلیم واتا زادگای عیسای مەسیحە. ئەوانە کەسانێکی خوداوەندین کە بڕوایان بە یەکتاپەرستی هەیە و عیشقیان بۆ خودا هەیە. لەبەرانبەر ئەم شارەیشدا شاری دنیا هەیە کە ناوەندەکەیان شاری بابلە و ئەم کارەیش دەگەڕێتەوە بۆ خراپی و گەندەڵییەک، کە لە بابلی ئەو سەردەمەدا باو بووە. بە بۆچوونی ئەو، خەڵکانی شاری دنیا مرۆڤە لەخۆبایی و ئایینەکەیان ئایینە فرە خواوەندییەکان بووە، واتا شەریکەر دانەر (مشرک) بوون. ئەو تەنیا بەم دابەشکردنەوە نەوەستایەوە. لای ئەو کەسانیکیش هەبوون، کە بە کردەوە دانیشتووی شاری خودایین، بەڵام لەناخدا هێشتا لە شاری دنیایدان. ئەم جیاکردنەوەیە، جیاکردنەوەیەک نەبووە تەنیا لەسەر جوگرافیای ئایینی، بەڵکوو جیاکردنەوەیەکیش بووە لە ناخی مرۆڤەکاندا. نامۆیی مرۆڤ گەیشتووەتە ئەو حاڵەتە، کە بە زارەکی بڕوا بە ئایینێک بهێنێت، بەڵام لە ناخەوە خەیاڵی لای ئایینێکی تر بێت.

ئۆگستین سەرباری ئەو شتانەی بەسەریدا هاتوون و قۆناغی جیاواز جیاوازی بڕیوە، بەڵام وەک خۆی دەڵێت: هەرگیز گومانی لە بوونی خودا نەبووە، بەڵکوو بیرۆکەی خودا هەمیشە بەردی بناغەی ڕێباز و فەلسەفەکەی بووە، نەوەک هەر هی فەلسەفە و ڕێبازەکەی، بەڵکوو هی ژیانیشی، ئۆگستین پێی وابووە بوونی خودا ئەوەندە ڕوون و ڕۆشنە مەگەر لەلایەن کەسانێکی زۆر کەمەوە و

لەژێر فشار و کاریگەری هەوا و ئارەزوودا، ئەگەرنا ئینکاری لە بوونی ناکرێت، ئەمەش هەر بە شێوەیەکی بێبنەما نا، بەڵکوو بە بەڵگەی بەدیهی و کۆدەنگیی هەموو خەڵک و فەیلەسووفە چاکەکان. نموونەش بۆ ئەمە زۆر زۆرە، وەک خۆی دەڵێت: "تەماشای زەوی و ئەو هەموو هێز و جوانییەی زەوی بکە کە تێیدایە، بە هیچ جۆرێک ناکرێت بە خودی خۆی ئەو هێزەی دەستکەوتبێت." هەروەها دەڵێت: "جیهان خودی خۆی بە گۆڕانە ڕێکوپێک و سەیرەکانی و شێوە و جوانییە دڵڕفێنەکانی، بەبێدەنگی ڕایدەگەیەنێت کە ئەو دروستکراوە."

هەروەها دەڵێت: "زەوی و ئاسمان بە گۆڕانەکانیان ڕایدەگەیەنن کە ئەوان دروستکراو و مەخلوقن ...، ئاسمان و زەوی دەگۆڕێن، کەواتە مەخلوق و دروستکراون."

دەربارەی مولحیدانیش دەڵێت: "مولحیدەکان بەهۆی ئارەزووەکانیانەوە نکووڵی لە بوونی خودا دەکەن، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوان ژمارەیەکی کەمن و حیسابیان بۆ ناکرێت."[1]

ئۆگستین بەڵگەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە کە ئەمە پوختەکەیەتی:

حەقیقەتەکان بە جیاوازییانەوە عەقڵ دەیاندۆزێتەوە، بەڵام عەقڵ دایاننانێت، حەقیقەت بە نەگۆڕێکی زەرووری دەبینێت، هەر دەشبێت وەک حەقیقەتێکی سەربەخۆ لەم نەگۆڕی و لەم زەروورەتەیش تێبگەین، دیارە عەقڵی مرۆڤ ئەو حەقیقەتە نییە، چونکە عەقڵ بەرکردار و ناتەواوە و پێش و پاش دەکات، کەواتە جەوهەرێکی باڵاترە لە عەقڵ، واتە خودا. ئەم بەڵگەیە لەسەر بەشداری ئەفلاتوون دامەزراوە کە لەو حیکمەت و خێر و جوانی و سیستم و یەکێتیەی

---

(١) بۆ هەموو ئەم وتانە بگەڕێوە بۆ: تاريخ الفلسفة الأوروبية في العصر الوسيط، يوسف كرم، ل ٥٦ . مێژووی فەلسەفەی ئەورووپی لەچاخی ناوەڕاستدا، ن: یوسف کەرەم، و: عومەر عەلی غەفوور، ل٣٧.

لە نەفس و سروشتدا دەردەکەوێت، بۆ ئایدیاڵ (مثال)ێکی سەربەخۆ بەرز دەبێتەوە. ئۆگستین بە کردەوە ئەم مانایانە بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێنێت وەک ئەفلاتوون و ئەفلۆتین کردیان، بەڵام مانای حەقیقەت وادەکات چوونەکەی لە یەقینەوە ڕاستەوخۆ بۆ خودا بەردەوام بێت، چونکە پوختەی بەڵگەکە ئەوەیە نەفس کە بیردەکاتەوە پەی بە حەقیقەت دەبات، پاشان بە پەیبردن بە حەقیقەت پەی بە خودا دەبات، ئەویش بە پشتبەستن بەوەی هیچ شتێک حەق نییە بە حەقیقەت بەخود نەبێت، وەک چۆن هیچ شتێک خێر نییە بە خێر بە خود نەبێت و بەم شێوەیە ...

ئەگەر بڵێین خودا شوێنی ماناکانە، ئەگەر هەندێک سیفەتمان خستە پاڵی، ئەمە مانای ئەوە نییە خودا فرەیی تێدایە و سیفەتەکانی بەو شێوەیەی لە دروستکراوەکاندا هەن لەویشدا دەبن، چونکە خودا سادە و ئەوپەڕی سادەیە، ئەوەی تێیدا وێنای دەکەین خودی جەوهەری ئیلاهییە، بگرە دەبێت پارێز بکرێت لە ناونانی بە «جەوهەر»یش، تاوەکوو بیر و فکر بۆ ئەوە نەچێت خودا بابەتی هەندێک سیفەت و نیشانە(عەرەز)ی جیا لە خۆیەتی، شیاوتر ئەوەیە بڵێین: خود، چونکە ئەم وشەیە تەنیا مانای وجودی تێدایە، خوداش تا ئەوپەڕی سنوور مەوجودە، بۆیە دەبێت سیفەتەکانی خودا زاتی بن، چونکە ئەوەی کەماڵێکی بەدەستهێنابێت بەبێ ئەوەی خۆی ئەو کەماڵە بێت، ئەوا تێیدا بەژدارە و هەمووی هی ئەو نابێت، هەروەها کەماڵاتەکەی یەک لەیەک جیاواز دەبن، کەواتە خودا مەزن و گەورەیە (بۆنموونە) نەک بە مەزنییەکی جیا لەخۆی، بەڵکوو بە مەزنییەک کە خودی خۆیەتی، هەمان شت سەبارەت بە سیفەتەکانی ژیان و عەقڵ و بەختەوەری و قودرەت دەوترێت، هەروەها هەر بەم شێوەیە هەموو سیفەتێکی ئیلاهی لەگەڵ زاتی ئیلاهیدا یەک دەگرێت، لێرەیشەوە سیفەتەکانی لەناو خۆیاندا لە تەک یەکتر یەک دەگرن.

ئەوە کە خودا مەعقوولە، مانای ئەوە نییە ئێمە بەتەواوی پەی پێ دەبەین.

هەروەها قسەکردنمان لە بارەیەوە بەسەریدا جێبەجێ دەبێت، هیچ لەفز یان شتێک بەم شێوەیە بە خودا ناوترێت کە بۆ خودا پێویستە. لەفز پاش ئەوە بۆ خودا گونجاو و لەبار دەبێت کە ماناکەی بە قووڵی بێتە گۆڕین، بۆنموونە: وەک تووڕەیی کە هیچ نییە جگە لە توانای سزادان بەبێ ئەو شڵۆقییەی لە تووڕەبووندا لە ئێمەدا دروست دەبێت، وەک غیرە کە هیچ نییە جگە لە دادپەوەری ڕووت، وەک پەشیمانی کە هیچ نییە جگە لە زانینی پێشوەختەی خودا بە ڕوودانی شتێک پاش شتیک، هەوەها وەک زانست کە هیچ شتێک نییە جگە لە جوانی حەقیقەتێکی نەگۆڕی گشتگیر، دیارە بەبێ ئەو گۆڕانە و گواستنەوەیەی لە بیرکەیەکەوە بۆ بیرۆکەیەکی تر و هەروەها بیرکەوتنەوە و قەتیسبوون لە هەندێک بابەتدا، کە لای مرۆڤ دەیبینین، لەفزەکان بۆ ئەوە دەستدەدەن دەلالەت بۆ خودا بکەن بەو مەرجەی ئەو ناتەواوییە لە مەدلولەکانیاندا دوور بخەینەوە کە لە باسکردنی مەخلوقاتدا پێیانەوە لکاوە، ئەوکاتە دەتوانین لە خودا ڕابمێنین بەبێ هەوڵدان بۆ گوزارشت لێکردنی، بە شێوەیەک هەڵوێستمان لەم دەستەواژە سەرتاپاگیرەدا کورت ببێتەوە: "وێنامان بۆ خودا لە ناونانمان بۆی ڕاستترە، هەروەها بوونی خودا لە وێنامان بۆی ڕاسترە، ئەمەیش هەڵوێستی دورستە لەنێوان تەجسیم و جەستە بڕیاردان (التجسیم) و چواندن و وێچواندن (التشبیە) لەلایەک و بە پاک ڕاگرتنی لەسەر شێوەی ئەفلۆتین.

جیهان و گەردوون وێنەی خودا نییە، بەڵکوو شوێنەواری خودایە و سیفەتەکانی خودای تێدا دەدرەوشێتەوە. جیهان و گەردوون بە شێوەیەکی زەروری و ئەزەلی لە خوداوە سەرچاوەی نەگرتووە، وەک ئەفلۆتین و مانەوییەکان بۆی چوون، چونکە ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێت کە زاتی خودا بەش بەش دەبێت و بەشێکی سنووردار و گۆڕاو دەبێت، لەکاتێکدا خودا سادە و ناکۆتا و نەگۆڕ و کامڵە، کەواتە بە کردەیەکی ئازاد بوونەوەرەکانی لە نەبوونەوە دروستکردووە، بەڵگەیش لەسەر ئەوە ئەمەیە کە جیهان ئەزەلی نییە، ئەو پرسیارەش کە دەڵێن

ئاخۆ خودا بەر لە دروستکردنی گەردوون چی کردووە، وەک لە بەرپەرچدانەوەی پەیدابوونی گەردووندا دەڵێن، شتێکی بێمانا و بێسوودە، چونکە ئیرادە و ویستی خودا ئەزەلییە، هەروەها کردەیشی بەدڵنیاییەوە ئەزەلییە و پێش و پاش تەنیا لە بەرکار (مفعولات)ەکانیدا هەیە. کات و زەمان بە بوونی گەردوون پەیدابووە. لەو ڕووەوە کە کات و زەمان ژمارەی جووڵەیە و بە خود بەدوای یەکدا دێت، بەدوای یەکداهاتوویش ئەزەلی و ناکۆتا نابێت، بەڵکوو بەزەروورەت ژمێردراوە، چەندە ئەندازەی بۆ دابنێین ئەو هەمیشە هەر سنووردارە. ئەی لەبەر چییە ناپرسن: بۆچی خودا گەردوون و جیهانی لەم شوێنەدا دروستکردووە و لە شوێنێکی دیکەدا دروستینەکرد؟

لە ڕاستیدا بەبێ گەردوون نە شوێن بوونی هەیە نە کات، ئەوە خەیاڵگەیە خەیاڵی کات و شوێنی سەربەخۆ لەو دەکات. کەواتە باسکردن لە ئەزەلیبوونی گەردوون تەنانەت لەگەڵ دانان بە دروستکردنیشدا، هێندەی دژی وەحییە دژی عەقڵیشە، ئەوە کە ئەفلۆتین دروستکردی ئازادی بە نەکردە دەبینی، لەبەر ئەوە بوو پێی وابوو گریمانەی مەزندە و حیسابکردنێک لە خودادا دەکات، ئەو گریمانەیەش گۆڕان دەباتە ناو دروستکەر و بۆ ئاستی ئێمە دایدەبەزێنێت، بەڵام مەزندە و حیسابکردن لە دروستکردن لە دروستکراودا جیاوازە، وەک کە مەزندە و باقی کردە و سیفەتەکان جیاوازن.

بەپێی سەرچاوەکان ئۆگستین پێی وابووە فەلسەفە و لاهووت پێچەوانەی یەکتری نیین و فەلسەفە لەگەڵ ئایینی مەسیحی دێتەوە، چونکە "فەیلەسووفی ڕاستەقینە شەیدای خودایە"[1].[2]

---

(1) Weischedel، Wilhelm. der Got der philosophen Erster Band. wb. Daemstadt 1971، s. 101،

(٢) بۆ هەموو ئەوەی کەڕابرا بگەڕێوەبۆ: تاريخ الفلسفة الأوروبية فى العصر الوسيط، يوسف كرم، ل ٥٥ . مێژووی فەلسەفەی ئەورووپی لەچاخی ناوەڕاستدا، ن: یوسف کەرەم، و: عومەر عەلی غەفوور، ل ٣٨ _ ٤٠.

## تۆماس ئەکوینی

ژیان و چالاکی «ئەکوینی» دەکەوێتە قۆناغێک کە فەلسەفەی مەسیحی یان وردتر بڵێین تیۆلۆژیای مەسیحی دەکەوێتە قەیرانەوە. لەم دەورانەدا بیری ئایینی دەکەوێتە بەردەم چەندان پرسیار و جارێکی تر لەنێوان عەقڵ و باوەڕدا بەرەو ڕووبوونەوە دروست دەبێتەوە.

یەکەمین شتێک کە «ئەکوینی» بەرەو رووی وەستاوەیەوە، رەوتی فەلسەفی ناسراو بە ئەفلاتوونییە نوێیەکان بوو، لەبەرانبەردا روویکردە بۆچوونە فەلسەفییەکانی ئەرستۆ و ئەوی بە تاکە فەیلەسووف دەزانی کە دەتوانرێت پشتی پێببەسترێت. گرنگی ئەرستۆ بۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جۆرە تێڕوانینە فەلسەفییە کە پێی وابووە خۆناسینی مرۆڤ بەهۆی قووڵبوونەوە دەروونییەکەیەوە نییە، بەڵکوو ناسینی ئەوانی ترە کە مرۆڤ تێدەگات نەفسی هەیە و دەژیێت. لەبە ئەوەی ناسین و مەعریفە پشت بە هەست دەبەستێت، واتا بەهۆی یەکێک لە هەستەکانەوە شایانی بەدەستهاتنە، کەواتە بیرکردنەوەکانی مرۆڤ کە دەبنە کەرەستەیەکی زەینی لە پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە دروست دەبن. تێڕوانینێکی وایش بە کردەوە دەکەوتە بەرانبەر ئەو بە ئەسڵ دانانەی نەفس کە پێش جەستە هەبووە و لە ئەفلاتوونەوە گەیشتبووە ئۆگستین) و ئەفلاتوونییە نوێیەکان کاریان لەسەر دەکرد.

لای ئەکوینی زەین و عەقڵ شتێک بوون لە دەرەوەی جیهانی ماددی و نەدەکەوتنە ناو سنوورەکانی ماددەوە. زەین لەبەرئەوەی ناکەوێتە ژێر دەسەڵاتی مادەوە، کەواتە نایشبێتە کارلەسەرکراوێک، بەڵکوو خۆی بەبەردەوامی وەک بکەرێک دەمێنێتەوە. زەین دوو کردەی تەواو جیاواز ئەنجام دەدات کە ئەکوینی لەسەر شێوەی ئەرستۆ ئەوانەی بە عەقڵی چالاک یان بە عەقڵی هەڵچوو یان مەیسەر ناوناوە، بەڵام پێی وابووە تەنیا عەقڵێک کە کردەی تەواوییەتی هەیە

عەقڵی خواوەندییە، چونکە خودا کردەی پەتی و تەواوی بوونە. لەبەرئەوەش، کە بوون پەتییە کەواتە عەقڵیش پەتییە. عەقڵەکانی تر واتە عەقڵی داهێنەر بەگوێرەی جێگا و شوێن و پلەوپایەی خۆیان خاوەنی عەقڵی ئاستێک لە هێز و کردەن. ئەم عەقڵانە، چونکە لەلایەنی بوونەوە سنووردارن و کردەگی پەتی بوونیان نییە بە نیسبەت تەواوی مەعقوولاتێک، کە بەبەراورد بەوان لە لایەنی بوونەوە وەک یەک نیین. لەنێوان ئەم عەقڵانەدا عەقڵی جیاکەرەوە، واتا فریشتە ، چونکە لەلایەنی پلەی بوونەوە لە عەقڵی پەتییەوە نزیکترە و هێزێکە، کە هەمیشە کردەگییانە چەمکەکان یان شێوەی عەقڵیان هەیە و پێویستیان بە ئەزموونی هەستی نییە، بەڵام عەقڵی مرۆڤ، چونکە لەلایەنی بوونەوە لە عەقڵی خواوەندییەوە دوورە هەروەک بوونەوەرە مادییەکان لە هێزەوە بەرەو کردە دەڕوات، واتا بە نسیبەت مەعقوولاتەکانەوە بیلقوەن و ئەوانە بەشێک نین لەخۆی و کەواتە لە ئەزموونی هەستییەوەیە، کە دەخرێتە پاڵیان. عەقڵی هەڵچوو یان مومکینیش هەمیشە لەچاو شێوەکانی معقول بالقوەن.

لێرەدا دەبینین چۆن جیاکردنەوەیەک لەنێوان عەقڵی پەتی، کە عەقڵی خواوەندییە و دەکەوێتە ئەو دیو سنوورەکانی ئەزموون، لەگەڵ عەقڵی کردەگیدا، کە بەرئەنجامێکی هەستین، دروست دەبێت. ئەم جیاکردنەوەیە لەنێوان دوو عەقڵدا خۆبەخۆ دەبێتە کێشانی سنوورێک لەنێوان دراوەکانی ئایین وەک بەشێک لە کارەکانی عەقڵی خودایی و زانست و فەلسەفە وەک بەرئەنجامێکی عەقڵی کردەگی مرۆڤ کە سەرچاوەکەی دەورووبەرە، واتا بەرئەنجامی هەستەکان و پەیوەندییە لەگەڵ ئەوانی تردا.

لێرەدایە کە لای ئەو عەقڵی مرۆڤ هەرچەندە داهێنەرانەیش بێت. لەدواجاردا، لە کەموکوڕی بەدەر نەبووە. عەقڵی مرۆڤ دەتوانێت توانایەکی جیاکەرەوانەی هەبێت، واتا بەشوێن چییەتی بوونەوەکانەوە بێت، نەک کار لەسەر دۆزینەوەی شتەکان بکات، ئەمەیش رێک بە پێچەوانەی ڕەوتی بیرکردنەوەی

ئەفلاتوونییە نوێیەکانەوە بووە کە بەشوێن دۆزینەوەی حەقیقەتەکان لە نموونەی خواوەندییەوە بوون بە ڕێگا خۆرهەڵاتییەکەی خواناسییەوە.

ئەکوینی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی عەقڵ و باوەڕ، دەچێتە سەر سەربەخۆیی و جیایەکی دیاریکراوی هەردوو کایەی فەلسەفی و تیۆلۆژی و دوو کایەی مەعریفە و دەسەڵاتی لەیەکتری جیاکردەوە: کایەی خوداناسی کە لەبواری ئایینذایە، لەگەڵ کایەی فەلسەفە و زانست کە سەر بە بواری عەقڵ و عەقڵانییەتە. لەبەرئەوەیش، کە باوەڕ شتێکە سەروو سروشتی و سەرچاوەکەی دەکەوێتە ئەودیو سروشتەوە و لە ڕێگای وەحی و بەهۆی کتێبە ئاسمانییەکانەوە گەیشتووەتە دەست مرۆڤ، واتە بەرئەنجامی دۆزینەوەی عەقڵی مرۆڤ نییە، هەربۆیە ناتوانرێت عەقڵ بکرێتە سەرچاوەی بەدەستهێنانی باوەڕ. لای ئەو زۆر حەقیقەتی خوداوەندی هەن کە ناتوانرێت بەبێگەڕانەوە بۆ وەحی بناسرێنەوەو. پێی وابووە وەحی پێمان دەڵێت کە دیاریکراوە مرۆڤەکان بەرەو لای خودا بڕۆن، حەیقیقەتێکی لەم جۆرەیش لای ئەو بەهۆی فەلسەفەوە نایەتە دی و ناناسرێتەوە، چونکە فەلسەفە سەر بە جیهانێکە، کە تەنیا پشت بە عەقڵ دەبەستێت.

ئەو وەک هەر مەسیحییەکی تری دڵسەخت پێی وابووە کە بابەتی باوەڕ کارێکی خواوەندییە و واوەترە لە سنووری تواناییەکانی عەقڵ و سروشتی مرۆڤ. خوا باوەڕی بە مرۆڤەکان بەخشیووە تا ڕێنماییان بکات بۆ پاکبوونەوە لەو گوناهەی کەوتووەتە ئەستۆیان. کەواتە باوەڕ بەخشراوێکە بە مرۆڤ و لە دەرەوەی خۆی بۆی ڕەوانە کراوە. هەر بۆیە باوەڕ و عەقڵ دوو سەرچاوەیان هەیە. کەواتە ئاساییە دوو جۆر ئەنجامیش بێتە دی. ئەگەر باوەڕ و فەلسەفە هەردووکیان گەیشتن بن بە حەقیقەت، کەواتە ئاساییە بە دوو شێوەیش ڕێگاکە بگرنە بەر. لێرەدا ئەکوینی دەکەوێتە سەر ئەوەی بڵێت کە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی عەقڵەوە پەی بە حەقیقەتەکان بەرێت، بەڵام ئەو حەقیقەتانە

هەرچەندێکیش گەورە و گرنگ بن، هێشتا لە سنووری عەقڵی مرۆڤدان. زۆر حەقیقەت دەمێننەوە کە تەنیا بەهۆی باوەڕەوە دەتوانرێت پەیان پێ ببرێت. بەڵام لەڕاستیدا، خودی ئەم کارە دانان نەبووە بەوەی فەلسەفە ئازادانە مومارەسەی پرسەکانی خۆی بکات، بەڵکوو ئەم کارە بۆ خۆی جارێکی تر دابینکردنەوەی دەسەڵاتی تیۆلۆژیا بووە بەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفەیدا. کاتێک دوو پرسی گەورەی فەلسەفە، واتا دروستبوونی جیهان و مەسەلەی ڕۆح لەدەستی فەلسەفە دەردەهێنێت. بەم کارە، سنووری بیرکردنەوەی فەلسەفی لە شوێنێکدا بەرتەسک دەکاتەوە و بەم جۆرەیش ڕێگای ئەوەی لێ دەگیرێت کە ببێتە کێشە و مەترسی بۆ سەر تیۆلۆژیا و ئیلاهیات. لەم لایەنەوە ئەو پێی وایە خوڵقاندنی جیهان و نەمری ڕۆح، دوو حەقیقەتن سەر بە کایەی ئایینن و فەلسەفە پەیوەندی پێیانەوە نییە. بۆیە دەبێت بێهیچ پرس و مشتومڕێک باوەڕیان پێ بهێنێت. واتا ئەقڵ توانای ئەوەی نییە بە شێوازی تایبەتی خۆی پەی بەو شتانە بەرێت، لەبەرئەوە نابێت دەروون و ڕۆحی خۆمان بە شتێکەوە ماندوو بکەین، ئاکامی نابێت. لەلایەکی ترەوە تاوتوێکردنی دیاردەکانی سروشت و پەیبردن بە یاسا ناوەکییەکانی، شتگەلێکن دەبێت ئەقڵ پێیان هەڵبسێت و ئەنجامیان بدات. ئەگەر «ئۆگستین» دەسەڵاتەکانی فەلسەفەی کەم کردەوە و لەبری ئەوە دەسەڵاتی دایە ئەو لێکدانەوانەی تەنیا پشت بە ئایینیپەتی دەبەست، ئەوا ئەکوینی شێوە دەسەڵاتێکی دیاریکراو بۆ فەلسەفە دەگێڕێتەوە و لە کایەی تایبەت بەخۆیدا خودموختاری دا بە فەلسەفە.

ملکەچبوونی فەلسەفە بۆ ئایین، لای ئەو، ملکەچبوونێک بوو کە دەبێت لە دواجاردا فەلسەفە چاوەڕوانی خوداناسی بکات تا بڕیار لەسەر ئەوە بدات ئەنجامە بەدەستهاتووەکانی خۆی کە بۆخۆیان دەستکەوتێکی عەقڵیانەیە، پەسندن یان ڕەتکراوەن. فەلسەفە، گەرچی ئازادکراوە لەوەی، کە لە سروشت و یاساکانی سروشت بکۆڵێتەوە، بەڵام ئەم ئازادکردنە سنووردار و کاتییە.

فەلسەفە دەتوانێت لەبارەی شتەکان و دیاردەکان و پرسەکان بگاتە ئەنجامێک، یان بگاتە حەقیقەتێک، بەڵام ئەکوینی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە حەقیقەتی بەدەستهاتووی فەلسەفە دەبێت بە فیلتەرەکانی ئایین و تیۆلۆژیادا گوزەر بکەن. ئەمە بە شێوەیەک فەلسەفەی کردە خزمەتکاری ئایین کە دەقە فەلسەفییەکانیش بە قازانجی دەقە ئایینەکان لێکدەدرانەوە، لەوانە کتێبی «سەروو سروشت - میتافیزک»ی ئەرستۆ لە چوارچێوەیەکی تەواو کەلامی و بۆ مەبەستێکی ئایینی بەکار دەهات.

ئەکوینی پێی وابووە ئەو حەقیقەتەی لەڕێی فەلسەفەوە پێی دەگەین، ناشێت لەگەڵ پێدراوەکانی باوەڕدا ناکۆک بێت. بەڵام ئەگەر حەقیقەتی فەلسەفی لەگەڵ بیروباوەڕی ئایینیدا ناکۆک بوو، ئەوا ئەو کات دەبێت حەقیقەتی فەلسەفی بەخۆیدا بچێتەوە و ڕەخنە لە خۆی بگرێت، تا وای لێدێت لەگەڵ بیروباوەڕی ئاییندا دەگونجێت، واتا فەلسەفە و لۆژیکی بیرکردنەوە هەرچییەک بن، دەبێت ملکەچییەتی تەواوی خۆیان بۆ ئایین دەربڕن.[1]

## چۆنیەتی پێکەوە گرێدانی مەسیحییەت و فەلسەفە لای توماس ئەکوینی

لە سەدەکانی یازدە و دوازدەی زاییندا بەرهەمەکانی ئەرستۆ لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا ناسران. لە ڕاستیدا لای بیرمەندان ئەوەندەیلێک گرێدانی ئەفلاتوون بە بیری مەسیحییەوە ئاسان دەینواند، لێکگرێدانی ئەرستۆ ئاسان نەیدەنواند. هۆکاری ئەمە بە پلەی یەکەم بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئەرستۆ لە سێ بواردا لەگەڵ ڕوانگەی مەسیحی ناتەبا بوو:

١. ئەرستۆ پێی وابوو کە جیهان بوونێکی ئەزەلی و ئەبەدییە، واتە کەس نەیخوڵقاندووە.

٢. ڕۆح لە گەڵ جەستە دەمرێت. واتە ڕۆح لە دوای مردنی جەستە ناتوانێت بژیێت.

---

(1) http://dengekan.ca/archives/16146.

٣. ئەو خودایەی کە ئەرستۆ باوەڕی پێی هەیە بەدوورە لە وێنای خودایەکی خوڵقێنەر و خودایەک کە دەتوانێت لە دەرەوەی جیهان بوونی هەبێت.

سەبارەت بە ڕوانگەی یەکەم، ئەکویناس دەڵێت ناتوانین بە شێوەی فەلسەفی تێیبگەین، بەڵام سەبارەت بە دوو ڕوانگەکەی دیکە هەوڵ دەدا کە بە گوێرەی بۆچوونی مەسیحیانە لێکیان بداتەوە.

ئەرستۆ لە سەر «جووڵێنەری بێجووڵە» قسە دەکا کە دەستەواژەیەکی گەلێک ناڕوونە. بەڵام ئەرستۆ مەبەستی پتر لەمە ئەو وزەیە کە شتێک دەخاتە جووڵە و حەرەکەت لە زنجیرەیەک ڕووداودا کە هەرکامیان دەشێت هۆکاری ئەوی دیکەیان بێت. ئەکویناس ئەم بۆچوونە وا لێک دەداتەوە کە ئەمە ئێمە دەباتەوە سەر یەکەمین جووڵێنەر، واتە ئەو بوونەوەرەی کە یەکەمین هۆکاری هەموو جیهانە. لە درێژەی ئەمەدا دەڵێت کە ئەمە ڕێک ئەو پرسیارەیە کە باسی خوڵقێنەری سروشت دەهێنێتە ئاراوە. ئەکویناس پێی وایە کە ئەرستۆ وێنایەکی لە سەر خودا وەک یەکەمین هۆکاری هەموو شتێک هەیە، واتە ئەو وێنایەی کە لە گەڵ خودای مەسیحیدا دێتەوە.

تێگەیشتنی توماس لە توانا سروشتییەکانی ناسین لای مرۆڤ: توانای سروشتیانەی ناسین لای مرۆڤ لەم دوو بەشە پێک هاتووە: هەست و بیر. تۆماس وەک ئەرستۆ پێی وایە کە وشیاریی مرۆڤ سەرەتا دەبێت سەرچاوەی زانیاریەکانی خۆی لە هەستەکانەوە دەستەبەر بکا. بەبێ هەستەکان مرۆڤ هیچی بۆ بیرکردنەوە پێ نییە. وشیاری بەبێ هەست تەختەڕەشەیەکە کە هیچی لەسەر نەنووسرابێت. وشیاریی ئەگەرچی بەبێ شتە بەرهەستەکان هیچی نییە، بەڵام شتە بەرهەستەکان تەنیا کەرەسەی خاون بۆ بیرکردنەوە. وشیاریی مرۆڤ ئەم کەرەسە خاوانە دەکات بەو وێنایانەی کە خەسڵەتی وشیارییان دەخرێتە پاڵ.

بە کورتی: ئەکویناس بە پشتبەستن بە دەقێکی ئەرستۆ پێی وایە کە ڕۆح نەمر و ئەبەدییە. ئەو پێی وایە کە «جوڵێنەری بێجووڵە»ی ئەرستۆ، یەکەمین هۆکار یاخود خوڵقێنەری هەموو جیهانە و ئەم دەستەواژەیە لەگەڵ خودای مەسیحی دەگونجێنێت. توانا سروشتییەکانی ناسین لای مرۆڤ بریتین لە هەست و عەقڵ. عەقڵ لە سەر ئەو کەرەستە خاوانە کار دەکات کە هەست پێی دەدات و دواتر دەتوانێت وشە و دەستەواژە گشتییەکانی لە سەر بنیات بنێت. وێنا عەقڵییەکان تەواو جیاوازن لە وێنا هەستییەکان.

## خودا لەلای تۆماس ئەکوینی

بابەتی بوونی خودا یەکێکە لە بابەتە هەرە سەرەکییەکان لە فەلسەفەی مێتافیزیکی تۆماس ئەکوینی، چونکە توانای زانین و بڕکردنی هەستەکی و ئەزموون و شارەزایی سنووردارە، بۆیە بۆ بابەتەی ناسینی خودا دەبێت پەنا ببرێتە بەر وەحی خوایی کە لە تەوڕات و ئینجیلدا هاتووە.

تۆماس ئەکوینی وردەکارییەکی زۆری لە بەڵگەکانی بوونی خوادا کردووە و گرنگییەکی زۆری پێداوە.

ئەگەر شوێن ڕیزبەندی سروشتی وجود بکەوین، بابەتی بوونی خودا یاخود سەرەتای شتەکان یەکەم بابەتە پێی دەگەین، چونکە خودا یەکەمین مەوجود و چاوگ و سەرچاوەیانە، ئایا خودا هەیە؟ ڕای باو ئەوە زوو کە خودا بەخوی خۆی ڕۆشن و ڕوونە، قەشە تۆماس سێ بەڵگە بەم مانایە باس دەکات و وەڵامیان دەداتەوە و نموونەیەکی ڕۆشنمان لەسەر ئەو جیاوازییەی نێوان عەقڵ و ئیمانیدا دادەنێت، پێشکەش دەکات.

بەڵگەی یەکەم: مرۆڤ بە سروشتی خۆی تامەزرۆی بەختەوەرییە، خودایش

بەختەوەری مرۆڤە، ئەوەیش بەسروشت تامەزرۆ بێت، بەسروشتیش دەناسرێت.

بەڵگەی دووەم: (کە بەڵگەی قەشە ئەنسلمە) ئەوەی بزانێت مەبەست لە ناوی خودا چییە، دەستبەجێ دەزانێت خودا هەیە، لەبەرئەوەی مەبەست لە ناوی خودا ئەوەیە تەسەوری لەو گەورەتر ناکرێت، ئەوەیش لە زەین و لە دەرەوەدا هەیە لەوە گەورەترە کە تەنیا لە زەیندایە.

بەڵگەی سێیەم: کە بەڵگەی قەشە ئۆگستینە، ئەوەیە بوونی ڕاستی بەخودی خۆی ڕۆشنە، جا ئەوەی ئینکاری بکات دانی پێدا دەنێت، لەبەرئەوەی ئەگەر ڕاستی نەبێت، ئەوا لەڕاستیدا نییە، خودایش خودی ڕاستییە، کەواتە بوونی خودا بەخۆی ڕۆشن و ڕوونە.[1]

ئەکوینی پێنج بەڵگەی سەرەکی دێنێتەوە لەسەر بوونی خودا:

**بەڵگەی یەکەم:** بەڵگەی جووڵان، یان جووڵێنەری نەجووڵاو(برهان المحرک الأول).

ناکرێت شتێکی دیاریکراو خۆی جووڵێنەری خۆی بێت، بەڵکوو هەموو جووڵاوێک بە یەکێکی ترەوە جووڵاوە. ناشکرێت ئەمە تاکۆتایی بەردەوام بێت، چونکە زنجیرەی بێکۆتای لێ دەکەوێتەوە، واتە ئەم زنجیرەیە بەبێ کۆتا هەر دەڕوات، ئەمەش شتێکی ئەستەمە و عەقڵ قبووڵی ناکات، بەڵکوو دەبێت ئەم پرۆسەیە لە شوێنێک بوەستێت کە جووڵێنەری نەجووڵاوە، ئەوەش بریتییە لە خودا. ئەم بەڵگەیە سەرەتا لەلایەن ئەرستۆوە باسکراوە.

**بەڵگەی دووەم:** عیللەی و هۆکاری یەکەم، یان عیللەی بکەرانە (برهان السبب الأول).

---

(١) تاريخ الفلسفة الأوروبية فى العصر الوسيط، يوسف كرم، ل ١٢٥ . مێژووی فەلسەفەی ئەوروپی لەچاخی ناوەڕاستدا، ن: یوسف کەرەم، و: عومەر عەلی غەفوور، ل ١٧٥.

هەرچی تۆ دەیبینی هۆکارێکی لە پشتەوەیە، لەکۆتاییشدا هەموویان دەبنە بەرهۆ (معلول) بۆ هۆکاری یەکەم کە خودایە. ئەگەر ئەمە نەڵێین، یان دەبێت بڵێین هەموو شتێک لە زاتی خۆیدا عیللە و هۆکاری یەکەم و بکەرانەیە، یان دەبێت ئەم زنجیرەیە بەبێ کۆتا هەر بڕوات، هەردووکیشیان ئەستەمی عەقڵین و عەقڵ قبووڵیان ناکات.

**بەڵگەی سێیەم:** بەڵگەی وجود، یان مومکین و واجب (برهان الوجود).

ئەم بەڵگەیە دەڵێت هەموو شتێک کە تۆ دەیبنی لە سروشتدا بوونەکەی مومکینە، واتە دەکرێت هەبێت، دەشکرێت نەبێت، دەکرا هەبا دەشکرا نەبا، بەڵام کە ئەمانە هەن و وجودەکەشیان مومکینە، بەدڵیاییەوە پێویستیان بە وجودێکی واجب هەیە، واتە وجودێک کە وجودەکەی نەوەستاوەتە سەر وجودێکی دیکە، واتە خودی خۆی بوونەکەی واجبە و ناکرێت نەبێت، چونکە ئەگەر ئەو نەبێت هیچ شتێک بوونی نابێت، چونکە هەموو شتەکان غەیری ئەو بوونەکەیان مومکینە، واتە دەکرێت هەبن، دەکرێت نەبن. ئەگەر واجب الوجود بوونی نەبێت، ئەوە زنجیرەی بێکۆتای لێدەکەوێتەوت، یان هیچ شتێک نایەتە بوون کە هەردووکیان ئەستەمی عەقڵین.

**بەڵگەی چوارەم:** بەڵگەی تەواوی و کەماڵ (برهان الکمال).

هەموو بوونەوەرەکان پلەیەکیان لە کەماڵ هەیە و جیاوازیشن تێیدا، بۆنموونە مرۆڤ لە سەگ کامڵترە، سەگیش لە زۆر شتی دیکە کامڵترە، بەم شێوەیە دڕوات ...، هەموو ئەمانەش کەماڵە ڕێژەییەکەیان لە کەماڵێکی ڕەها وەردەگرن کە خودایە، واتە دەبێت کەماڵیش لە شوێنێک بوووەستێت کە کۆتایی کەماڵەکان و کۆتایی خودی کەماڵە، ئەو کەماڵەش کەماڵەکەی لە خودی خۆیدایە نەک لە شتێکی دیکە وەریگرتبێت.

**بەڵگەی پێنجەم:** بەڵگەی ئامانجەکی (برهان الغاية)

هەموو شتێک لە سروشتدا بەرەو مەبەست و ئامانجێکی هەنگاو دەنێت، هەتا ئەو شتانەی عەقڵ و زیرەکیشیان نییە هەر وەهان، بڕوانە درەخت، گەشە دەکات و لق و پۆپ دەردەکات و بەروبووم دەدات بۆئەوەی ببێتە خۆراک و مرۆڤ بیخوات، یان گوڵ گوڵ دەردات بۆئەوەی مرۆڤ دڵخۆش بکات و چێژی لێوەرگرێت، هەموو ئەمانەش ناکرێت پاڵ بدرێت بۆ لای خودی ئەو شتانە. کەواتە دەبێت زاتێکی ئەوپەڕ شارازە و لێزان و زانا هەبێت کە ئەمانە ئاراستە بکات بۆ لای ئەم ئامانجانە.

کەواتە بەڵگەکانی بوونی خودا لەلای ئەکوینی دەمانبەن بەرەو جووڵاوی نەجووڵاو، هۆکاری یەکەم کە خۆی بەرهۆی هیچ شتێکی دیکە نییە، کەماڵی ڕەها، ئاراستەکەری بوونەوەرە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەکوینی شارەزاییەکی باشی هەبووە، هەم لە فەلسەفە، هەم لە لاهووت، هەرچەندە سوودی لە ئەرستۆ و ئەفلاتوون و ئەفلاتوونیزمی نوێ و سانت ئۆگستین بینیوە، بەڵام هیچ ساتێک بێئاگا نەبووە لە ئایینەکەیی و پشتگوێی نەخستووە.[1]

## سیفەتەکانی خودا

دەتونین تێڕوانینی تۆماس ئەکوینی بۆ سیفتەکانی خودا لە پێنج خاڵدا کورت بکەینەوە:

١. خودا سادەیە (بسيط) واتە بەش بەش نییە و لێکدراو نییە، بۆیە جەستە و ڕۆح و شکڵ و شێوە و ... نییە.

---

(١) تاريخ الفلسفة الأوروبية فى العصر الوسيط، يوسف كرم.. مێژووی فەلسەفەی ئەوروپی لەچاخی ناوەڕاستدا، ن: یوسف کەرەم، و: عومەر عەلی غەفوور، ل١٧٧ _ ١٨٠.

٢. خودا کامل تەواوە و دوورە لە هەموو کەموکوڕییەک، بەهۆی ئەم تەواوی کاملە ڕەهاییەوە جیاوازە لە هەموو بوونەوەرەکان.

٣. خودا بێکۆتا و بێسنوورە و هیچ موقەیەد و مەرجدار و سنوورداری نەکردووە، هیچ سنوورێکی نییە جەستە و فکر و عاتیفە و سۆز و ... بۆ دابتاشێت، بۆیە پویستە ئەم بێسنوور و بێکۆتایە لە هەموو شتەکانی دیکە جیابکرێتەوە، چونکە هەموو شتەکانی دیکە سنووردارن.

٤. جودا جێگیرە و گۆڕان و گۆڕانکاری بەسەردا نایەت.

٥. خودا تاکە و بێ چۆنیەتیە، تاکانەیی خودا وا دەکات جەوهەری خودا خودی زات و وجودی خودا بێت.

لەدوای داماڵین (سلب)ی خودا لە تەرکیب و پێکەوەنان و ناتەواوی و ... تەماشای سیفەتە ئەرێیینییەکان دەکەین، ئەمانیش دەبن بە دوو بەشەوە:

١. ئەو سیفەتانەی بەشێکن لە خودی خودا خۆی.

٢. ئەو سیفەتانەی کە وا دەردەکەوێت بەپێچەوانەی سادەیی خوداوە بن و بەشێک نەبن لە خودی خۆی.

سیفەتەکانی **جۆری یەکەم** بێکێشە و گرفتن و بێ خۆپارێزی دەکرێت بەکاربهێنرێن، چونکە سیفتەکان خودی خودان و هیچ زیاد و کەم ناکەن لەسەر زاتی خودا، بۆنموونە دەڵێی: خودا چاکە و خێری ڕەهایە، تەواو و کامڵە، بێسنوور و بێکۆتایە، نەگۆڕە و بەردەوامە و هەمیشەییە و هۆکاری هەموو ئەنجامەکانە.

**جۆری دووەم** لە سیفەتە ئەرێنییەکان وا دەگەیەنێت کە پێچەوانەی سادەیی و هۆکار و عیللەی یەکەمە، بۆنموونە ژیان، توانا، زانست و زانین، ویست و ئیرادە، بایەخدان و عینایە و ....، ئەم جۆرە سیفەتانە وا دەردەخەن کە چەند سیفەت و کردار و هێزێکن زیاد لە جەوهەر، بۆیە دەبێت بە پارێزکاری ئاگادارییەوە بۆ خودا

بەکاربهێنرێن و سەیربکرێت تاچەند لەگەڵ خودادا دێنەوە و گونجاون لەگەڵیدا، بەتایبەت کە بۆچوونەکان لەم بابەتەدا ناکۆکن و ڕاجیاییان لەسەرە. ئەکوینی لێرەدا پەنای بردۆتە بەر خۆدووگرتن لە پاڵدانی ئەم سیفەتانە بۆ لای خودا، ئەمەش بۆ بەدووگرتنی خودا لە هەرشتێک کە پێچەوانەی سادەیی (بسیط) خودا بێت. بۆنموونە کە مرۆڤ باسی ژیان و زیندوویی خودا دەکات، مەبەستی مرۆڤ ئەوەیە کە بێگیان نییە، یان کە دەوترێت زانست و زانین، مەبەست ئەوەیە: خودا لە زاتی خۆیدا تەواو و کامڵە، واتە هەموو دەبێتەوە خودی خودا، نە شتێک زیاد لەسەر زاتی خودا.[١]

## فەلسەفەی ئیسلامی لەڕووی کات و شوێنەوە

چالاکی فەلسەفی ئیسلامی لەڕووی کاتەوە نزیکەی چوار سەدە درێژبوویەوە، لە سەدەی دووەمی کۆچییەوە (هەشتی زایینی) تاوەکوو شەشەمی کۆچی (دوانزەی زایینی) بەدیاریکراوی لە (١٨٥ ک) کاتێک یەکەم فەیلەسووفی موسڵمان لەدایک بوو تاوەکوو (٥٩٥ ک) کاتێک «ئیبن ڕوشد» دوا فەیلەسووفی ئیسلامی کۆچی دوایی کرد، ئەوەی باسکرا لە ڕووی کاتەوە بوو، لە ڕووی شوێنیشەوە پۆلێندەکرێت بۆ دوو شوێنی سەرەکی:

**١. فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی:** دیارترین فەیلەسووفەکانی «کیندی، فاڕابی، ڕازی، ئیبن سینا، ئیخوان سەفا، غەزالی.»

**٢. فەلسەفەی ڕۆژئاوای ئیسلامی:** دیارترین فەیلەسووفەکانی: ئیبن باجە، ئیبن توفەیل، ئیبن ڕوشد.

---

(١) تاریخ الفلسفة الأوروبية في العصر الوسيط، يوسف كرم. مێژووی فەلسەفەی ئەوروپی لەچاخی ناوەڕاستدا، ن: یوسف کەرەم، و: عومەر عەلی غەفوور، ل١٨١ _ ١٨٥.

غەیری ڕازی هەموویان پێیانوابوو تێکگیران نییە لەنێوان ئیسلام و فەلسەفەدا و هەوڵی گونجانیان داوە لەنێوانیاندا.

## هۆکارەکانی نەبوونی فەلسەفەی تیۆری لەسەرەتای ئیسلامدا

لەسەردەمی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دا، بارودۆخی فکری و عەقیدەیی زۆر جیاواز بوو، چونکە ئەم هۆکارانەی پاڵنەربوون بۆ پەیدابوونی بیری فەلسەفی تیۆری (فەلسەفە بەمانا فراوانەکەی بوونی هەبوو، چونکە هەموو پرسە عەقیدەیی و فکرییەکانی ناو قورئان و فەرمووده فەلسەفەن) بوونیان نەبوو، هەروەها خودی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) لەناویاندا بوو و هەر شتێک هەبا، بە زووترین کات وەڵامی دەدانەوە و هەمووانیش پێی ڕازی دەبوون و دڵ و عەقڵیان لەسەری گرێ دەدا! هەر بۆیە لەسەردەمی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دا، جیاوازی و ڕاجیایی زۆر کەمبوو. ئەوەندەی سەرقاڵ بوون بە عەمەل و کار و کردەوە و دەعوە و بانگەواز، ئەوەندە نەدەپرژانە سەر گفتوگۆی بێبەرهەم و نەزۆک، ئەوان کۆمەڵگەیەکی دامەزراو و عەمەلی بوون، کاریگەرییان بە وەحی و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) بوو، نەک بە فیکرە بیانی و دەرەکییەکان، هەر بۆیە بارودۆخی عەقیدە لەم کاتەدا باردۆخێکی ئارام و بێگرێوگۆڵ بوو، بارودۆخێکی فکری عەمەلی قورئانی پێغەمبەرانە بوو.

## هۆکارەکانی پەیدابوونی ڕاجیایی و جیاوازی عەقیدەیی و کەلامی و فکری و فەلسەفی

لە سەرەتاکانی سەدەی دووەمی کۆچییەوە تا دەهات گرفت و کێشە فیکری

و عەقیدەییەکان لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا لە برەو و گەشەکردندا بوون. شەڕی ناوخۆی موسڵمانان هەر لە سەردەمی ئیمام عەلی و موعاویەوە تا شەهیدبوونی ئیمام حوسەین و دواتر، ڕاپەڕینە بەردەوامەکانی خەواریج، شیعەکان، زوبەیرییەکان و عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەشعەس دژی ئومەوییەکان، چەندین پرسو کێشەی فیکرییان بەدوای خۆیاندا هێنا، لەوانە، پرسەکانی: ئیمان، کافربوون، جەبریەت، سەرپشکایەتیی، ئەنجامدانی تاوانی گەورە و کاریگەریی لەسەر ئیمان، مەرجی پێشەوایەتیی، ڕاپەڕین دژی خەلیفە و چەندینی تر.

هەروەها لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بە زۆربەی ناوچەکاندا، موسڵمانبوونی زۆرێک لە نەتەوە خاوەن کەلتوور و ئایینە جیاوازەکان، چەندین پرسیاری جۆربەجۆری فەلسەفی و ئایینی کەوتە بەرباس و لێکۆڵینەوە سەبارەت بە مەسەلەکانی: زیندووبوونەوە، ئاڵوگۆڕی گیان، یەکگرتن(الاتحاد) تێکەڵبوون(الحلول) گەڕانەوەی مردوو بۆ دنیا، دوالیزم، سیانەیی ... تاد.

هەر لە هەمان باسدا و بەهۆی لەدەستدانی شکۆ و دەسەڵاتیان، هەندێک لە هەوادار و لایەنگرانی پاشماوەی ئایینە هیندیو ئێرانییەکان کاریان دەکرد لەسەر بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی ئیباحییەتو بێدینیو گومان لەسەر بنەمای یەکتاپەرستیو دادی خواییو زەروورەتی پێغەمبەرایەتی و ڕاستییەتی ڕۆژی دوایی.

لەلایەکی ترەوە لەناوچەکانی بەسرە و کوفە و هەندێک ناوچەی شام دیاردەی هەڵبەستنی فەرموودە بەدەم پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێت) لە دەرکەوتن و گەشەکردندا بوو، لەم سەروبەند و بارودۆخە ئاڵۆز و پڕکێشەیەدا، گرووپە کەلامییەکانی وەک موعتەزیلە و ئەشعەری و ماتوریدی سەریانهەڵدا.

**کەواتە دەتوانین هۆکارەکان بەم شێوەیە کورت بکەینەوە**

١. قورئان، خودی قورئان خۆی هۆکارێکە بۆ ڕاجیایی، چونکە هەم قیرائەتەکان هەم تێگەیشتن لە ئایەتەکان هەم خودی زمانی عەرەبی کە پێی دابەزیوە هەم

مەنهەجی هەڵێنجانی ئەحکام و تێگەیشتنەکان لە ئایەتەکان هۆکارێکن بۆ ڕاجیایی.

٢. سوننە، حەدیس، فەرمووده، سووننە هۆکارێکە بۆ ڕاجیایی، هەم لە ڕووی جێگیربوونییەوە، هەمیش لەڕووی مانا و ڕاڤەکانی، هەمیش لە ڕووی گەیشتن بە زانایان و نەگەیشتن پێیان، هەمیش لە ڕووی کارکردن بە هەندێک حەدیس لەلای هەندێک کەس و کارپێنەکردنی لەلای هەندێکی تریان.

٣. هۆکاری سیاسی، بۆنموونە کێشەی ئیمامەت و سەرۆک و کێشەی خەواریج و ئیمامی عەلی و موعاوییە، یان سەرەتای سەرهەڵدانی شیعە، کە پێیان وابوو ئیمامی علی لە هەموو کەس شایەنترە بۆ خەلیفایەتی، یان گرووپەکانی تر کە زۆربەیان دوورنەبوون لەو هۆکارە، هەربۆیە دواتر دەوڵەتیان هەبووە، وەک موعتەزیلەکان.

٤. زمان، چونکە وشە و دەستەواژەکان مانای جیاواز جیاوازیان هەیە کە لە کۆتاییدا سەردەکێشت بۆ ڕاجیایی. بۆنموونە ڕێبازی تەشبیە و تەنزیە (وێچوێنەرەکانی خودا بە دروستکراوەکانی) (پاک ڕاگرەکان) بەهۆی جیاوازی لە دەستەواژەی ئایەتەکانی ناو و سیفەتەکانی خودا پەیدا بووە، یان ڕێبازی قەدەرییەکان و جەبرییەکان بەهۆی جیاوازییان لە دەقەکانی قەدەر و قەزا پەیدابووە، یان جیاوازی گرووپە کەلامییەکان و تێڕوانینیان بۆ ئیمان بەهۆی جیاوازییان بووە لە تێڕوانینی زمانەوانی بۆ ئیمان.

٥. شوێن و باردۆخ و ژینگە و کات و سەردەم.

٦. بەرژەوەندیی هەندێک کەس و زانا.

٧. وەرگێڕانی کتێبە فەلسەفیەکان، کە کتێبە فەلسەفییەکان وەرگێڕدران لەلایەن خودی موسڵمانانەوە، هەبوو پێی کاریگەر بوو، هەبوو دژی بوو و ڕەدی دەدایەوە، هەشبوو ڕاڤە و شەرحی دەکرد، هەشبوو دەیویست هەماهەنگی دروست بکات لەنێوان ئایین و فەلسەفەدا.

**٨.** هاتنە ناوەوەی غەیرە موسڵمانان بۆ ناو ئیسلام و موسڵمانان، کە ئەم جۆرانە دەهاتنە ناو ئیسلامەوە پاشخانێکی تری فکرییان هەبوو، ئیدی بەم هۆیەوە زانستی کەلامیش هاتە مەیدان بۆ وەڵامدەنەوەیان.

**٩.** خودی عەقڵ خۆی، چونکە عەقڵیش لە خودی خویدا هۆکارێکە چونکە عەقڵەکانیش جیاوازن.

دەربارەی پاڵنەرەکان توێژەرانی زانستی کەلام بوونە دوو بەشەوە:

**یەکەم:** هۆکار و پاڵنەری دەرەکی بوونی نییە، ئەوەی هەیە ناوخۆییە.

**دووەم:** هۆکار و پاڵنەری دەرەکی بوونی هەیە، وەک نەسرانییەت و یەهوودییەت و غەنووسییەت و فەلسەفەی یۆنانی.

د. عەلی سامی نەششار زانای کەلام و توێژەر لەم بابەتەدا پێی وایە بەهیچ جۆرێک پاڵنەری دەرەکیبوونی نییە و ئەوەی هەیە بریتییە لە پاڵنەری ناوخۆیی، ئەویش دوو شتە: سیاسی و زمان، واتە زمانی دەق، چونکە کە ڕاجیایی لە زمانی دەقدا دروستبوو، ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی دەبێت بەسەر تێڕوانینیەکاندا، لەگەڵ سیاسەت.

بۆ کاریگەری فەلسەفەی یۆنانیش پێی وا نییە زانستی کەلام و زاناکانی پێی کاریگەر بن، یازدە قوتابخانە ئەسڵییەکەی فەلسەفەی یۆنانی باس دەکات، پاشان ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە کەلام و زاناکانی پێی کاریگەر بووبن، بەڵکوو وەڵامیان داونەتەوە، بۆیە ئەو زانستی کەلام بە فەلسەفەی ئیسلامی ناوزەند دەکات، زاناکانیشی بە «فەیلەسووفە موسڵمانەکان»، فەیلەسووفانی تری وەک ئیبن سینا و فارابی و... بە «فەیلەسووفە ئیسلامییەکان» ناوزەند دەکات، چونکە پێی وایە ئەوانە فەلسەفەی یۆنانییان هێناوە و پاشان بەرگێکی ئیسلامییان کردووەتەبەر، ئەمە ڕای د. عەلی سامی نەششارە، پەرتووکە بەناوبانگەکەشی ناو ناوە «گەشەکردنی هزری فەلسەفی لە ئیسلامدا» (نشأة الفكر الفلسفي في الإسلام).

# قوتابخانە ئیسلامییە عەقیدەیی و فکرییەکان

قوتابخانە بریتییە لە تەوژمێک کە خاوەن مەنهەج و میتۆدێکی دیاریکراو و تایبەت بە خۆیەتی کە جیای دەکاتەوە لە غەیری خۆی لەبارەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانستێک لە زانستەکان.

جیاوازی هەیە لەنێوان قوتابخانەی عەقیدەیی و تەوژوم و گرووپی عەقیدەیی، چونکە گرووپی عەقیدەیی واتە: کۆمەڵێک کە بیروبۆچوونێک یان چەند بیروبۆچوونێک یان وتەیەک کۆی کردوونەتەوە، بەڵام مەرج نییە وەک قوتابخانە میتۆد و مەنهەجێکی دیاریکراوی هەبێت، بۆنموونە ئەگەر بەوردی سەیری بکەین و زاراوەکان لەشوێنی خۆیان بەکار بێنین، نابێت دەستەواژەی قوتابخانە دەرببڕدرێت بەسەر خەواریج و قەدەری و مورجیئە، چونکە ئەمان میتۆد و مەنهەجێکی دیاریکراویان نەبووە بۆ بابەت و پرسەکانی عەقیدە، بەڵکوو بیروبۆچوون و ڕایان هەبووە لەم بارەیەوە، بۆ نموونە خەواریج هەندێک ڕایان هەبووە دەربارەی حوکم و تاوانبار و...، قەدەرییە سەرەتاییەکانیش ڕایان هەبووە دەربارەی زانستی ئەزەلی خودا و ئینکارییان لێی کردووە، مورجیئەکانیش ڕایان دەربڕیوە دەربارەی ئیمان و پێکهاتەکەی.

هەرچەندە ئەوەش خۆی ڕاجیایی تێدایە کە ئەمانە قوتابخانەبوون یان نا، بەڵام ئەگەر قوتابخانەشیان بۆ بەکاربێنین، دەتوانین وەک حوکمی زۆرینە بۆیان دەرببڕین.

گرووپی کەلامی دوو جۆرە:

١. هیچ بنەمایەکی گشتی نییە بۆی بگەڕێتەوە.

٢. بنەمای گشتی هەیە و بۆی دەگەڕێتەوە و دەقە شەرعییەکانی پێ دەپێوێت.

کەواتە دەکرێت هەندێک لە گرووپەکانیش بە قوتابخانە دابنرێن، بەڵام هەموویان نا، بەتایبەت قوتابخانە کۆنە سەرەتاییەکان، وەک قەدەرییە سەرەتاییەکان و مورجیئەکان.

کەواتە دەتوانین بڵێین: هەموو قوتابخانەیەک گرووپە، بەڵام هەموو گرووپێک قوتابخانە نییە.

قوتابخانە فراوانە و زۆربەی زانستەکان قوتابخانەیان هەیە، بۆ نموونە لە فقیهدا قوتابخانەی ئەهلی ڕەئی و ئەهلی حەدیس هەیە، لە ئوسووڵی فیقە قوتابخانەی موتەکەللیمەکان و فوقەها هەیە، لە نەحو قوتابخانەی بەسرییەکان و کوفییەکان هەیە.

ئینجا ڕاجیایی ئەم قوتابخانانە یان دەگەڕێتەوە بۆ بنەما گشتی و ئوسوڵییەکان، یان دەگەڕێتەوە بۆ بنەما لاوەکی و فەرعییەکان، قوتابخانەکانیش لەسەر ئەم بنەمایە یان زۆر لێک نزیکن یان زۆر لێک دوورن، یان لەو نێوەندەدان.

## قوتابخانە عەقیدەیی و فکرییەکان

ڕاجیایی هەیە لە دابەشکاری قوتابخانە عەقیدەییەکاندا، بۆنموونە ئیمامی غەزالی دابەشیان دەکات بۆ چوار قوتابخانە: موتەکهللیمەکان، باطینییەکان، فەیلەسووفان، سۆفییەکان.

بەڵام ئێمە لێرەدا دابەشکارییەکی تری بۆ دەکەین:

١. قوتابخانەی کەلامی

٢. قوتابخانەی فەلسەفی

٣. قوتابخانەی کەشفی و سۆفیگەری

٤. قوتابخانەی سەلەفی

## یەکەم: قوتابخانەی کەلامی

لەپێشەوە باسی هۆکاری ناونانی زانستی کەلام بەم ناوەمان کرد و بیروبۆچوونەکانمان باس کردن.

قوتابخانەی کەلامی لە کۆن و نوێدا دوو میتۆد و جۆر بووە، لەگەڵ ئەوەی لەکۆتاییدا هەر یەک شتن، بەڵام ئەم جیاوازیەشیان هەیە:

١. میتۆدێکی تێکەڵ بە فەلسەفەی یۆنانی و لۆژیکی ئەرِستۆیی و جەدەل و گفتوگۆی فەلسەفی و ڕۆچوون لە عەقڵانییەت و ڕەددانەوەی تەوژمەکانی بەرانبەر.

٢. میتۆدێکی عەقڵی بەڵام خۆپارێز لە ڕۆچوون لە فەلسەفە و لۆژیکی یۆنانی.

کەواتە قوتابخانەی کەلامی یەک جۆر و شێواز نییە.

بەڵام بەگشتی دەتوانین بڵێین قوتابخانەی کەلامی: قوتابخانەیەکی عەقیدەیی فکری عەقڵییە، بۆ چەسپاندن و وەڵامدانەوەی پرسە عەقیدەییەکان پشت بە عەقڵ و نەقڵ دەبەستێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی تێکنەگیرانی ئەو دوانە دەدات و عەقڵ دەکاتە حەکەم و عەقڵکاری لە زۆربەی پرسە عەقیدەیی و کەلامییەکاندا دەکات.

کەواتە قوتابخانەی کەلامیش قوتابخانەیەکە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پرسە عەقیدەییەکاندا بە میتۆد و مەنهەجێکی عەقڵی.

زەقترین میتۆد و بنەمای کەلامی بریتییە لە: پشتبەستن بە نەقڵ و عەقڵ بۆ پرسە عەقیدەییەکان، بەڵام لەکۆتاییدا دەبێت دەق و نەقڵیش بخرێتە ژێر ئەو بنەما عەقڵییانەی کە دایان ناوە و نابێت زاهیری دەق وەربگیردرێت و ڕاستەوخۆ تەسلیمی هەموو دەقێک ببی بەبێ گەڕانەوە بۆ بنەما عەقڵییەکان.

ئەوەی شایەنی باسە، زانایانی ئیسلام زۆربەی زۆریان سەر بەم قوتابخانەیە بوون، چونکە نوێنەری سەرەکی و زەقی ئەم قوتابخانەیە ئەشعەری و ماتوریدییەکانن، زانایانیش زۆربەی زۆربەریان لە زانای فیقهـ، تەفسیر، حەدیس، زمانەوانی، ئوسووڵ، ... سەر بەم دوو قوتابخانەیە بوون.

لە گرنگترین قوتابخانە کەلامییەکان: قەدەری، موعتەزیلە، ئەشعەری، ماتوریدی،.، هەر یەکێکیش لەم قوتابخانە و گرووپانە چەندان تاقم و پێڕی تریان هەیە..، هەر یەکێکیشیان بنەمای فکری تایبەت بەخۆیانیان هەیە. هەیانە زۆر لێک نزیکن، وەک: ئەشعەری و ماتوریدییەکان، هەشیانە زۆر لێک دوورن وەک قەدەرییەکان و ئەشعەرییەکان، هەمووشیان مێژوو و سەرهەڵدان و بنەما و... خۆیانیان هەیە. لەبەر درێژبوونەوەی کتێبەکە ناتوانین باسیان بکەین، بەڵام کتێبی زۆر هەیە، هەم بە کوردی هەم بە عەرەبی، هەر کەسێک ویستی لێیان شارەزا بێت، با بگەڕێتەوە بۆیان.

## تایبەتمەندی و بنەماکانی قوتابخانەی کەلامی

١. تاوتوێکردن و چەسپاندنی بیروباوەڕی ئیسلامی بە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی.

٢. تەئویل، تەئویلی ئەو دەقانەی مانای ڕوون و عەقڵی نادەن بەدەستەوە، یان گومان و پرسیار دەخەنە سەر دین و خودا و وەحی، بەشێوەیەک تێکگیران نەبێت لەنێوان عەقڵ و نەقڵدا.

٣. وەڵامدانەوەی بەرانبەرەکان بە مەنهەج و میتۆدی عەقڵی و کەلامی و فکریی و فەلسەفی، واتە بەکارهێنانی میتۆدی عەقڵی و فکری.

٤. ڕۆچوونی هەندێکیان لە عەقڵکاری و فەلسەفاندن بۆ چەسپاندنی و عەقیدە و وەڵامدانەوەی گومان و پرسیارەکان.

## دووەم: قوتابخانەی فەلسەفی

ئەم قوتابخانەیە ناوی خۆی بەخۆیەوەیە، چونکە فەلسەفییە و پشت بە فەلسەفە دەبەستێت بۆ پرسە ئایینی و عەقیدەییەکان.

فەیلەسووفان وەک کیندی (٢٥١ ک) و فارابی (٣٣٨ ک) و ئیبن سینا (٤٢٨ ک) و ئیبن ڕوشد (٥٩٥ ک) و ...، ئەمانە ناودارانی فەیلەسووفە موسڵمانەکان بوون و خاوەنی ئەم قوتابخانەیەن.

بنەمای بیرکردنەوە لای ئەم قوتابخانەیە و فەیلەسووفەکانی دەربارەی عەقیدە و بیروباوەڕ بریتییە لە فەلسەفە و فەیلەسووفانی یۆنانی و غەیرە یۆنانی، بەتایبەتتریش ئەرستۆ، زۆربەیان دەگەڕانەوە بۆ ئەرستۆ و فەلسەفەی مەششائی (الفلسفة المشائية) بۆیە پێی وتراوە مەششائی چونکە ئەرستۆ عادەتی وابوو بە ڕۆیشتنەوە وانەی دەوتەوە و قوتابییەکانی لەدەوری کۆدەبوونەوە.

### قوتابخانەی فەلسەفیش دابەش دەبێت بۆ دوو ئاراستە

١. فەلسەفەیان کردووەتەوە بنەمای هەموو شتێک و شەریعەت و ئایینیان وەک بنەما سەیرنەکردووە، هەتا گەیشتووە بەوەی هەندێکیان ئەوەندە سەرسام بن بە ئەرستۆ بڵێن پێغەمبەر بووە یان کەمتر نەبووە، کەواتە ئەم ئاراستەیە زێدەڕۆیی زۆری کردووە لە پێگەی فەلسەفە و عەقڵدا و هەموو شتێک بە پێوانەی فەلسەفە دەپێوێت.

٢. هەوڵیان داوە هەماهەنگی دروست بکەن لەنێوان ئیسلام و فەلسەفەدا، بەتایبەت فەلسفەی یۆنانی. واتە بەحیسابی خۆیان نەهاتوون وەحی پێشتگوێ بخەن و وەلای نێن و ڕەتی بکەنەوە، بەڵکوو هەوڵی گونجانیان داوە و بۆ پرسە ئایین و عەقیدەییەکان، بنەمای فەلسەفی و ڕای فەلسەفی و فەیلەسووفیان

هێناوە و هەوڵی ئەوەیان داوە بەزۆریش بێت پرسە ئایینییەکان ببەنەوە بۆ بنەما فەلسەفی و فەیلەسووفەکان بەتایبەت یۆنانییەکان.

کەواتە ئاراستەی یەکەمیان زۆر زیاتر ڕۆچوون لە فەلسەفە و فەلسەفاندنی پرسە ئایینییەکان و فەلسەفە و فەیلەسووفانیان کردووە بە پێوەر بۆ وەرگرتنی وەحی و نەقڵ و دەق.

### بنەما و تایبەتمەندی قوتابخانەی فەلسەفی

١. ڕۆچوون لە عەقڵکاری و فەلسەفە و فەلسەفاندندا.

٢. هەماهەنگی دروستکردن لەنێوان فەلسەفە و ئاییندا و گونجاندنیان ئەگەر بەزۆریش بێت.

٣. فەلسەفە کردنە حەکەم بۆ یەکلاکردنەوەی پرسەکان.

٤. زێدەڕۆیی کردن لە پێگەی فەیلەسووفان، بەتایبەت فەیلەسووفانی یۆنانی.

٥. ڕۆچوون لە هەندێک بابەتی ناکردەیی ناپێویستی فەلسەفی.

٦. هێنانە ناوەوەی هەندێک پرسی فەلسەفی یۆنانی بۆ ناو عەقیدە و فکری ئیسلامی و ڕاپێچکردنی عەقیدە و فکری ئیسلامی بۆ ژێر ئەم پرسانە.

٧. دوورکەوتنەوە لە قورئان و وەحی و ڕۆحی قورئان (بەرەهایی نا).

٨. کەم گرنگیدان بە لایەنی ڕۆحی.

٩. تێکەڵکردنی عیرفان و تەسەوفی ئیسلامی بە فەلسەفەی یۆنانی و ونکردنی ڕۆحانییەتە ئیسلامییەکە تێیدا. ئەمە لای فەیلسوفە عیرفانییەکان.

## سێیەم: قوتابخانەی کەشفی و عیرفانی و تەسەوفی

ئەم قوتابخانەیە قوتابخانەیەکی ئاڵۆز و سەختە و ئەمیش دوو ئاراستەی هەیە:

### ١. ئاراستەی کەشفی ئیلهامی سۆفی عیرفانی

ئەم ئاراستەیە پێی وایە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) حەقی ڕوونکردووەتەوە و گەیاندوویەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت هاوتا بێت لەگەڵ ئەوەی ڕۆح و دەروون پێی دەگات، ئەگەر دژ بوەستێتەوە لەگەڵ کەشف، ئەوە دەبێت یان تەئویل بکرێت یان بسپێردرێت بە خودا، ڕێگای بەدەستهێنانی کەشفیش بریتییە لە جیهادی نەفس و دڵ و دەروون و پاککردنەوە و پاڵفتەکردنی.

کەشف واتە: واتا و مانا و مەعریفە کە بەبێ بیرکردنەوە و تێڕامان بەدەست دێت، لەڕێگەی تەزکیەی نەفس و دڵ و دەروون، کە بەچەندان ڕێگە بەدەست دێت.

تایبەتمەندی ئەم ئاڕاستەیەش خۆی لە زۆر ڕۆچوون لە عیرفان و تەسەوفدا دەبینێتەوە، هاوکات لەگەڵ زێدەڕۆیی کردن لە لایەنی ڕۆحی و کەم گرینیگدان بە لایەنی عەقڵی و فکری و زێدەڕۆییکردن لە بەگەورە سەیرکردنی شەخس و کەساتییە ئایینییەکان (بەڕەهایی نا و هەمووشیان وا نیین)، هەروەها هەوڵدان بۆ چەسپاندنی لایەنە فکرییەکان بە بنەمای ڕۆحی.

### ٢. ئاراستەی ئیشڕاقی فەلسەفی:

ئەم ئاراستەیە پشت بە کەشف دەبەستێت بەڵام بە لایەنی فەلسەفی و ڕوونکردنەوەی دەروون لە لایەنی ماددی، نەک لەڕێی خۆبرسی کردن و ...

کەواتە ئەم ئاراستەیە تێکەڵەیەکە لە کەشف و ڕۆحانییەت لەگەڵ عەقڵ و فەلسەفە، واتە تێکەڵکردنی کەشف و عیرفان بە فەلسەفە.

فاڕابی و ئیبن سینا و ئیبن طوفەیل و سوهرەوەردی (٥٨٧ ک) ئەم ئاراستەیان تەبەننی کردووە، بەتایبەت سوهرەوەردی کە بەردی بناغەی دانا و چەسپاندی.

بەڵگە و پشت پێبەستراو لای ئەم ئاراستەیە بریتییە لە کەشف و فەیزی نوورانی کە هەڵدەڕژێتە ناو دەرونییانەوە لەڕێی دەروون و فەلسەفەوە، وەحی و دەق سەرچاوەی یەکەم نیین، بەڵکوو دەبێت وەحی و دەقەکانیش بەم کەشف و فەیزە نوورانییە فەلسەفییانە بپێورێن.

تایبەتمەندی ئەم ئاڕاستەیەش خۆی لە زۆر ڕۆچوون لە فەلسەفە و تەئویلی دوور دەبینێتەوە، هاوکات لەگەڵ ڕۆچوون لە عیرفان و تەسەوفێکی پشتئەستوور بە کەشف و فەیز و هەڵڕژانی ڕۆحی، لەگەڵ قورسی و تەعقیدات لە داڕشتن و نووسین و دەربڕیندا.

## چوارەم: قوتابخانەی سەلەفییەت

سەلەفیەت لە (سلف، یسلف، سلفا)ەوە هاتووە، لە ڕووی زمانەوانییەوە واتە: تێپەڕی و بەسەرچوو.

سەلەف واتە: پێشینان و باو و باپیران، خزمانی پێشین، یان هەموو شتێک دەگرێتەوە کە ڕۆیشتووە و تێپەڕیوە لەو سەردەم و واقیعە نەماوە کە مرۆڤ تێیدا دەژیێت.

(سَلَف) لەڕووی زاراوەوە واتە: هاوەڵان و شوێنکەوتووان و شوێنکەوتووی شوێنکەوتووان.

بەڵام ئەگەر وەک قوتابخانەیەکی فکری عەقیدەیی وەریبگرین، دەتوانین ئاوا پێناسەی بکەین:

قوتابخانەیەکی فکری عەقیدەیی فیقهی دەقگەرایە، بۆ تەفسیری ئیسلام دەگەڕێتەوە بۆ قورئان و سوننە بە تێگەیشتنی سەلەف و پێشینان.

سەلەفیەت لە خودی خۆیدا یەک تەوژم و یەک ڕەوت و یەک شێواز و یەک مەنهەج و میتۆد و یەک جۆر نییە، بەڵکوو جۆراوجۆرن و بەپێی کەس و شوێن و کات و سەردەم و ژینگەش گۆڕاون و دەگۆڕێن...

## مێژووی سەلەفییەت

سەلەفییەت وەک مەنهەج و میتۆد دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ئیسلام و سەردەمی هاوەڵان، چونکە هەر لە سەردەمی هاوەڵانەوە ئەو جۆرە لەبیرکردنەوە هەبووە کە بەتەواوی بگەڕێیەوە بۆ دەق و بەدوای فەلسەفە و حیکمەتی ئەحکامەکاندا نەچێت، واتە بێ چەندوچوون بگەڕێوە بۆ دەق و تەئویل مەکە و زاهیری دەق وەرگرە.

بەڵام دوایی لەدوای هاوەڵانیش قوتابخانەی یارانی فەرموودە (اهل الحديث) پەیدا بوون، ئەمانیش دووبارە ئەم میتۆدەیان هەبوو: بگەڕێیەوە بۆ دەق و خۆت دووربگری لە تەئویل و زاهیری دەق یان نزیک لە زاهیر وەربگریت.

دیارترین کەسایەتی بەهێز ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو، کە لەو سەردەمەدا زۆر بە بەهێزی و ڕاوەستاوی بەرگری کرد لەم تەوژمە و تا دوا هەناسە بڕوای پێی بوو و بڵاوی کردەوە و قوربانیشی بۆ دا ...

دوایی لەسەدەی حەوت شەیخی ئیسلام ئیمام ئیبنو تەیمییە کە لە ٧٢٨ کۆچی دوایی کرد، توانی بەهێزترین بەرگری لەم تەوژم و قوتابخانەیە بکات!

ئیبنو تەیمییە کەسایەتییەکە وێنەی کەم بووە لە مێژووی ئیسلام و موسڵماناندا، لەگەڵ تێبینی لەسەری، بەڵام بەتەنیا توانی لە ڕووی هەموو تەوژمە فکری و کەلامی و عەقیدەیی و فەلسەفییەکانی سەردەمی خۆیی و پێش خۆشی بوەستێتەوە و وەڵامی هەمووان بداتەوە و نووسین لەسەر هەمووان بنووسێت و بیروڕا و بنەما فکرییەکانی خۆیشی وەک ڕەگ دابوکتێت و دەیان پەرتووکیان لەسەر بنووسێت و وەک شاخ پتەو و لەسەر پێ وەستاو و بەهێز بوەستێت و قوربانی بۆ بیروڕاو بۆچوونەکانی و فکرەکانی بدات و بۆ ساتێکیش تەنازول و سازشیان لەسەر نەکات! تا لەکۆتاییدا لە زینداندا کۆچی دوایی کرد!

دوای ئەم ئیمام ئیبنو قەییمی جەوزی هات کە قوتابی ئیبنو تەیمییە بوو، ئەویش زۆر بە لێبڕاوانە بەرگری لەم ڕێباز و قوتابخانەیە کرد، تا دوا هەناسە تێکۆشا لەپێناویدا، تا لە ٧٥١ کۆچیداماڵئاوایی کرد.

دوای ئەمانیش دیاترین کەسایەتی کە هات و وەک فریادڕەس ئەم قوتابخانەیەی جارێکی تر دوای دابڕان و لاوازبوون و غائیببوون هێنا ناو گۆڕەپان و جیهانی ئیسلامی و هەتا ڕۆژئاواش شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب بوو، ئەویش لە ساڵی ١٢٠٦ ک ماڵئاوایی کرد.

دوای ئەمانیش دەیان و سەدان زانایان پەیدابوو، بەتایبەت بە هۆی پاڵپشتییە بەردەوام و زۆرەکانی وڵاتانی کەنداو بەگشتی و سعودییە بەتایبەتی.

لە ئێستاشدا دەیان ڕەوتی جیاجیان هەیە، خاوەن دەیان قوتابخانە و ئاراستەی جیاوازن.

سەلەفییەت یەک جۆر نییە، سەلەفییەت لە خودی خۆیدا یەک تەوژم و یەک ڕەوت و یەک شێواز و یەک مەنهەج و میتۆد و یەک جۆر نییە، بەڵکوو جۆراوجۆرن و بەپێی کەس و شوێن و کات و سەردەم و ژینگەش گۆڕاون و دەگۆڕێن ...

## بنەما و تایبەتمەندییە گشتییەکانی سەلەفییەت

سەلەفییەت وەک هەر قوتابخانە و تەوژم و ڕێبازێکی تر بنەمای خۆی هەیە بۆ تێگەیشتن لە ئایین، بەڵام دەکرێت بڵێین ئەو بنەمایانە بەپێی کەس و لایەن و ئاراستە و شوێن و کات ڕەهای تەواوەتی نیین، بەڵام لەیەکەوە زۆر نزیکن:

١. سەرچاوەی ئایین و عەقیدە و بیروباوەڕ و فکر بریتییە لە قورئان و سوننە بە تێگەیشتنی سەلەف، واتە هاوەڵان و شوێنکەوتووی هاوەڵان و شوێنکەوتووی شوێنکەوتووان.

٢. بەکارهێنانی عەقڵ بۆ تێگەیشتن لە ئایین ئاساییە، بەڵام بە سنووورداری و بە ئەندازەی ئەوەی کە ببێتە خزمەتکاری نەقڵ، واتە عەقڵ دانپێدانەر و پشتگیریکەری نەقڵە، کەواتە بۆی نییە نەقڵ ڕەتبکاتەوە و بە هەبوونی نەقڵ خۆی بێنێتە مەیدان، یان لە زاهیری دەق لابدات و تەئویل یان تەحریف بکات. هەربۆیە سەلەفییەت دژی ڕێبازی عەقڵانییەت و کەلام و فەلسەفەیە، یان بڵێین زانایانی کەلام و فەلسەفە و موعتەزیلەکان، هەروەها هاوڕانین لەگەڵ ئەشعەرییەکان و ماتووریدییەکان و باقی قوتابخانەکانی تر، چونکە پێیان وایە ئەمانە هەموویان زێدەڕۆییان کردووە لە پێگەی عەقڵ و بەکارهێنانی.

٣. دووربوون لە تەئویل و بەکارنەهێنانی، سەلەفییەت بەگشتی پێی وایە، تەئویل دوورکەوتنەوەیە لە زاهیر و دەق و مانا و مەبەستی حەقیقی خودای گەورە و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.)، پێی وایە دەق نابێت بەرەو تەئویل ببردرێت و دووربکەوێتەوە لە زاهیر، هەربۆیە تەئویلکەران لە ڕێباز و قوتابخانەکانی تر بە موبتەدیع و زەندیق و زۆرجار کافر و دژە دینیش ناودەبەن.

٤. سەلەفییەت بەگشتی دژی مەجازە، چونکە پێی وایە لەژێر ناوی مەجازدا حەقیقەت دەشاردرێتەوە.

٥. داهێنان لە دیندا (بدعة) بەهیچ جۆرێک دروست نییە، ئایین هەمووی براوەتەوە و کۆتایی هاتووە، هەموو جۆرە داهێنانێک لە ئاییندا دروست نییە و

هەمووی خراپە.

٦. ئیجتیهاد داشنەخرابێت نزیکە لەوەی دابخرێت، چونکە ئەوان پێیان وایە ئەوەی هەیە خوای گەورە و پێغەمبەر (د. خ) و زانایانی سەلەف هەموویان بڕاندووەتەوە، ئیدی ئیجتیهاد لەپای چی؟!

٧. نوێگەری لە ئاییندا ناکرێت و تەجدید و نوێگەری تەحریفە.

٨. خیلاف و جیاوازی و ڕاجیایی قبووڵکراو نییە لە عەقیدە و بیروباوەڕدا.

٩. پێویستە لە عەقیدەدا پەیوەست بی بەو لەفز و وشە و دەستەواژانەی کە لە قورئان و سوننەدا هاتوون، دوور بکەویەوە لە هەر وشە و دەستەواژەیەکی عەقیدەیی و کەلامی و فەلسەفی کە لە قورئان وسوننەدا نەهاتبێت.

# بنەما عەقیدەیی و کەلامی و فکرییەکانی جەماوەری موسڵمانان

١- باوەڕ بە خودا

٢- باوەڕ بە فریشتەکان

٣- باوەڕ بە پەڕتووکەکانی خودا

٤- باوەڕ بە پێغەمبەران

٥- باوەڕ بە ڕۆژی دوایی

٦- باوەڕ بە قەزاو قەدەر

**١- پوختەی باوەڕ بە خودا بریتییە لە:**

أ. باوەڕی تەواو بەوەی کە خوای گەورە حەقە و بوونی هەیە.

ب. هەروەها تاک و تەنیا و بێهاوەڵە.

ج. وەسفکراوە بە هەموو تەواوییەک (صفات کمال)، پاک و بێگەردە لە هەموو کەم و کوڕییەک.

د. تەنیا و تەنیا ئەو شایەنی ئەوەیە بپەرسترێت و گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بکرێت.

٢- **پوختەی باوەڕ بە فریشتەکان بریتییە لە:** باوەڕی تەواو بە هەبوونیان، باوەڕ بێنین کە لە ڕووناکی و نوور دروستکراون، هەرگیز سەرپێچی و بێفەرمانی خودا ناکەن لە شتێک کە فەرمانیان پێ کرابێت، چیان پێ بگوترێت دەیکەن.

٣- **پوختەی باوەڕ بە پەرتووکەکانی خودا بریتییە لە:** باوەڕبوونی تەواو بەوەی خوای گەورە چەندین پەرتووکی ناردووە بۆ پێغەمبەران کە هیدایەتی بەندەکان و چاکەی دونیا و قیامەتیانی تێدایە، ئەو پەرتووکانە وەحی خوای گەورەن و حەق و ڕاستن لەلایەن خوای گەورەوە هاتوون.

٤- **پوختەی باوەڕ بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة و السلام) بریتییە لە:** باوەڕی تەواو بەوەی کە خوای گەورە بۆ هەر ئوممەت و میللەتێک پێغەمبەرێکی لە خۆیان ناردووە کە بانگیان دەکات بۆ خودا بەیەکگرتن و بە تەنیا پەرستنی. ڕێنموونیان دەکەن بۆ هەموو چاکەیەک بۆ دونیا و قیامەتیان. هەروەها لە هەموو زیانێکی دونیا و قیامەتیان ئاگاداریان دەکەنەوە.

٥- **پوختەی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی بریتییە لە:** باوەڕبوونی تەواو بە ڕاستی و دروستی هەموو ئەو هەواڵانەی کە خوای گەورە و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) ڕایانگەیاندووە لەبارەی هەموو ئەو ڕووداوانەی کە لەدوای مردنەوە ڕوودەدەن، لەناویاندا پرسیاری ناوگۆڕ و ئەوەی بە دوای دادێت لە زیندووکردنەوە و حەشر و حیساب و وەرگرتنەوەی پەرتووک و تەرازوو و پردی سیڕات و بەهەشت و دۆزەخ.

٦. **پوختەی باوەڕ بە قەزا و قەدەر بریتییە لە:** باوەڕبوونی تەواو بەوەی کە هەرچی ڕوودەدات لە خێر و زیان لە ژێر ویست و دەسەڵاتی خوای گەورەدایە.

# بنەمای ئایینی و بنەمای مەزهەبی

ئایین شتێکە و مەزهەب شتێکی تر، ئایین خواییە و مەزهەب ڕا و تێگەیشتنی مرۆڤەکانە بۆ ئایین.

**بنەمای ئایینی:** بریتین لەو بنەما و پڕەنسیپانەی کە ئەسڵ و بنەمای ئایینن و لادان لێیان بە لادان لە ئایین هەژمار دەکرێت.

**بنەمای مەزهەبی:** بریتین لەو بنەما و پڕەنسیپانەی کە ئەسڵ و بنەمای ئایین نیین، بەڵکوو ئەسڵ و بنەمای مەزهەبین، لادانیش لێیان بە لادان لە ئایین هەژمار ناکرێت، بەڵکوو بە لادان لە مەزهەب هەژمار دەکرێت.

کەواتە لادان لە بنەمای ئایین لادانە لە خودی ئایین و چوونە دەرەوەیهلە بازنەکەی.

لادانیش لە بنەمای مەزهەبی لادانە لە مەزهەب و چوونە دەرەوەیە لە بازنەی ئەم مەزهەبە.

بۆنموونە باوەڕبوون بە خودا و پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەر و ڕۆژی دوایی بنەمای ئایینین، ئەگەر کەسێک باوەڕی پێیان نەبێت لە بازنەی ئایین و ئیسلام دەچێتەوە دەرەوە و بە ئیماندار و موسڵمان هەژمار ناکرێت.

بەڵام باوەڕبوون بە پلەیەک لەنێوان دوو پلەدا (المنزلة بين المنزلتين) ی موعتەزیلەکان و «ئیمامەت»ی شیعەکان، بنەمای مەزهەبین، واتە ئەگەر موعتەزیلییەک باوەڕی بە پلەیەک لەنێوان دووپلەدا (المنزلة بين المنزلتين) نەبێت، لە بازنەی ئیعتیزال دەچێتەدەر و بە موعتەزیلە هەژمار ناکرێت لای

موعتەزیلەکان، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە بەس لە مەزهەب چووەتە دەر نەک لە ئایین، واتە لای ئەوان موعتەزیلە نییە، بەڵام ئیماندار و موسڵمانە و لە بازنەی ئیسلام و ئیمان نەچۆتەدەر، تەنیا لە بازنەی ئیعتیزال چووەتە دەر.

بۆنموونە «ئیمامەت» لای هەندێک لە شیعەی دوازدە ئیمامی بنەمای مەزهەبییە _لای هەندێکی تریان بنەمای ئایینییە_، کەواتە بەم پێیە ئەگەر کەسێک باوەڕی بە ئیمامەت نەبێت ئەوە لە بازنەی شیعەی دوازدە ئیمامی چووەتەدەر و بە شیعە هەژمار ناکرێت، بەڵام بە موسڵمان و ئیماندار هەژمار دەکرێت، چونکە لە بنەمای ئایینی دەرنەچووە.[1]

## بنەمای لادانە عەقیدەیی و کەلامی و فکرییەکان

١. باوەڕنەبوونی دروست بە خودا و ماهییەت و حەقیقەتی

٢. باوەڕنەبوونی تەواو بە وەحی و پەیامی خوایی

٣. باوەڕنەبوونی تەواو بە کامڵی و تەواوی شەریعەت و ئایین

٤. باوەڕنەبوون بە کۆتاییهاتنی پێغەمبەرایەتی

٥. ڕاڤەی نادروست بۆ زیندووبوونەوە و ڕۆح

٦. تەحریف و لادان لە مەبەستە سەرەکییەکانی ئایین

٧. تەحریف و لادان لە ڕۆحی قورئان

٨. تەکفیر

٩. خۆبینینەوە لە بازنەی حەق و خەڵک بینین لە بازنەی ناحەق

---

(١) القعيدة الإسلامية ومذاهبها،

١٠. تەقلید و چاولێکەری و تەمبەڵی مەعریفی و گەڕان بە دوای ڕاستی ڕێباز و قوتابخانەکان

١١. لادانی ئەخلاقی و نەهێشتنی سنووری بەهاکان

١٢. عەقڵگەرایی زێدەڕۆیانە

١٣. بێویست کردن و بێئەرزش کردنی مرۆڤ

١٤. بەخوا کردنی مرۆڤ

١٥. دەقگەرایی و زاهیریبوون

ئەوەی کە باسمان کردن پوختەی بنەماکانی لادانە کەلامی و عەقیدەیی و فکرییەکان بوون، کە تەوژم و ڕێبازە کەلامی و عەقیدەیی و فکری و فەلسەفییەکانی ناو مێژووی موسڵمانان تێی کەوتبوون.

## هەڵوێستی دروست بەرانبەر تەوژوم و قوتابخانە کەلامی و عەقیدەیی و فکرییەکان

سەرەتا دەبێ بیانکەینە دوو جۆر

**جۆری یەکەم:** نییەتیان پاکە و بەهەڵەداچوون.

**جۆری دووەم:** هەڵەن و خەڵکیش بەهەڵە دەبەن و مەبەستیشیان بەلاڕێدابردن و سەرلێشێواندنی خەڵکە.

جۆری دووەم نابێت بێنینە ناو مامەڵەی جۆری یەکەمەوە.

١. هەمووان بە تێگەیشتن بە ڕاڤە و تەفسیر و هەوڵ و ... بۆ ئایین تێبگەین نەک وەک خودی ئایین.

٢. دەبێت بیروڕاکان لێک جیا بکەینەوە، بزانین ئەو ئیجتهادەی کە کردوویانە لە ئوسووڵدایە یان لە فروع، لە قەتعییاتدایە یان لە ظەنییا؟ ئەگەر لە ظەنییاتدا بوو، ئەوە دەبێت بە سینگێکی فراوانەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، مەرج نییە هاوڕایان بین، بەڵام ئەگەر ئیجتیهادەکەیان لە قەتعیاتدا بوو، ئەوە دەبێت هەڵوێستە بکەین و نابێت تەسلیم بین، بۆ نموونە بڵێن خودا نەزانە، یان هەموو شتێک نازانێت، یان بڵێن مرۆڤ دەگاتە ئاستی خودا یان تێیدا دەتوێتەوە، یان قورئان دەستکاری کراوە، یان پێغەمبەرایەتی بەردەوامە، یان ...، لەم جۆرانە نابێت سازش بکرێت و دەبێت ڕاست بکرێنەوە.

٣. هەتا بکرێت گومانی باشیان پێ ببەین.

٤. ڕا و بۆچوون و بنەماکانیان وەک خۆی ڕاڤە بکەین و لێیان تێبگەین و بەلاڕێیاندا نەبەین.

٥. بۆ ڕاوبۆچوونەکانیان بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەکانی خۆیان.

٦. جیاوازی بکەین لە نێوانیاندا، چونکە هەر قوتابخانەیەک بە دەیان و جاری وا هەیە بە سەدان ئاراستەی تێدایە، کەواتە ناکرێت قسەیەک کە کراوە پاڵی بدەیە لای هەموویان.

٧. هۆکار و پاڵنەرەکانی پشت ڕاوبۆچوونەکانیان بخوێنینەوە، چونکە هەموو شتێک پاڵنەر و هۆکاری خۆی هەیە.

٨. هەتا دڵنیا نەبین لەوەی کە ئەم شتەیان کردووە یان وتووە نەیاندەینە پاڵ.

٩. وەک مرۆڤ سەریریان بکەین.

١٠. لەسەردەم و کات و شوێن و ژینگە و بارودۆخی خۆیاندا خوێندنەوەیان بۆ بکەین.

١١. هەوڵی لێک نزیکبوونەوەیان بدەین.

١٢. نەوروژاندنی خیلاف و جیاوازی نێوانیان لەناو خەڵکی سادە و غەیرە

تایبەتمەند بەم بابەتانەوە.

١٣. بەدین نەکردنی بیرورای قوتابخانەکان، چونکە لە کۆتاییدا هەمووی ڕاوبۆچوونی مرۆڤە.

١٤. دروستکردنی گفتوگۆ و دیالۆگ لەنێوانیاندا

١٥. مامەڵە نەکردنی بەرژەوەندیخوازانە لەگەڵیاندا

١٦. نەبوونی دەمارگیری بۆ لایەک و قوتابخانەیەک

## جیاکاری نێوان (مذهب، منهج، عقیدة)

(مذهب) ڕێباز (منهج) میتۆد (عقیدة) بیروباوەڕ، لێک جیاوازن و یەک شت نیین، کە بەداخەوە زۆرجار تێکەڵ بەیەکتری دەکرێن و حوکم لەسەر ئەم تێکەڵییە بنیات دەنرێت!

قوتابخانە کەلامی و عەقیدەییەکان (مذهب) ڕێباز (منهج) میتۆدیان لەیەک جیاوازە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی عەقیدەیان یەک شتە، چونکە عەقیدە تەنیا بیروباوەڕە نەگۆڕە قەتعییەکان دەگرێتەوە، نەک گۆڕاو و جوزئییەکان، واتە ئەوانەی قبووڵی ئیجتیهاد و تێڕامان دەکەن، ناکرێت کەسی لەسەر تەکفیر بکرێت و بە بنەما و ئەسڵی عەقیدە و دین دابنرێن و خەڵکیان لەسەر موحاسەبە بکرێت. کەواتە جەماوەری موسڵمانان لەسەر بنەما نەگۆڕە قەتعییەکانی وەک «بوونی خودا، زیندووبوونەوە، وەحی، پێغەمبەرایەتی،...» هاوڕان، ئەوەی تر دەبێتە مەزهەب و مەنهەج. مەنهەجی یەکێکیان عەقڵییە و هی یەکێکی دیکە نەقڵی و هی یەکێکی دیکە تێکەڵ لە نەقڵ و عەقڵ، هی یەکێکیان نزیکتر لە وەحی و هی یەکێکی تر دوورتر، هەروەک چۆن لە فیقهیشدا ئەهلی ڕەئی و ئەهلی حەدیس هەیە، ئەم دووانەش مەنهەج و مەزهەبیان جیاوازە، نەوەک

دینیان لەیەک جیاواز بێت. کەواتە ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئێمە جیاکاری بکەین لە نێوان (مذهب) ڕێباز و (منهج) میتۆد و (عقیدة) بیروباوەڕ و قەتعییات و ظەنییات و کولییات و جوزئییاتدا.

## ئیمامی غەزالی و کاریگەری لەسەر فەیلەسووفی گومان «ڕینێ دیکارت» (١٥٩٦-١٦٥٠ز)

ڕینێ دیکارت، کەسایەتی سەرەکی فەلسەفەی عەقڵانییەت و باوکی فەلسەفەی نوێیە لە ڕۆژئاوا. کەسێک ئەم نازناوەی لێنابێت فەیلەسووفانی ئەڵمان و لەسەرووی هەموویانەوە هیگڵ و شلینگ. خاوەن وتەیەکی بەناوبەنگە لەسەر میتۆدی گومان کە دەڵێت: "من گومان دەکەم، کەواتە من هەم". ئەو هات و گومانی لەسەرجەم ئامێرەکانی ناسینی مەعریفە دەکرد کە خۆی لە پێنج هەستەکان وعەقڵدا دەبینییەوە. بڕوای وا بووە کە هەستەکان زۆربەی جار خەڵەتێنەرن و پێویست ناکات پشت بە شتێک ببەستینکە تەنیا بۆ یەک جاریش هەڵمان خەڵەتێنێت، بۆ نموونە: هەستەکانمان وێنەی مانگ و ئەستێرەکانمان بۆ دەکات لە شێوەی شتێکی بچووکدا کە لەڕاستیدا زۆر لەوە گەورەترە کە وێنەیمان بۆ دەکات، وێنەی تراویلکەمان لەشێوەی ئاو بۆ دەکات لە ڕاستیدا ئاو نییە.

سەبارەت بە عەقڵیش دیکارت وای دەبینی، کە عەقڵ دەگونجیت تووشی ڤایرۆسێک ببێت کە پێی دەوترێت «شەیتانی فێڵباز»، ئەم ڤایرۆسە، یان ئەم شەیتانە هەر لەبوونمانەوە خەریکی تەفرەدانی ئێمەیە، زۆرێک لە شتەکانمان بە پێچەوانەی ڕاستییەوە پێدەڵێت. بۆنموونە عەقڵەکان زۆربەی جار فریودەری ئەو خەونانەن کە لەماوەی نووستندا وێنامان بۆ دەکات، یاخود ئەو ڕاستییانەی کە تائێستا ئەزموونمان نەکردووە و عەقڵ بە پێچەوانەی ڕاستییەوە وێنەیمان

بۆ دەکات، یاخود بۆچوونە جیاوازەکانمان لەسەر بابەتە عەقڵییەکان بەڵگەیە لەسەر سنوورداری عەقڵ.

لە پاش ئەم گومانەی دیکارت لە دەزگاکانی دۆزینەوەی مەعریفە، هەموو مەعریفەی تووشی گومان کرد، چونکە ڕای وابوو پاڵپشتی ئێمە بۆ دۆزینەوەی مەعریفە هەستەکان و عەقڵە، بە گومان بردنمان لەم دوو ئامێرەی مەعریفە هەموو مەعریفە دەکەوێتە ژێر گومانەوە کە لە ئەنجامی ئەم دوو ئامێرەوە بەدەستمان هێناوە، لای دیکارت گومان دەروازیەکی مەعریفییە بۆ گەشتن بە یەقین، چونکە ئەو مەعریفەی لەسەر بنەمای پتەو و بەهێز دروست نەبێت لە هەر لەحزەیەکدا ئەگەری ڕووخان و لەناوچوونی هەیە، وەک ئەوەی تۆ لەسەردەمی بورکانێک خانوویەک دروست بکەیت.

میتۆدی دیکارت میتۆدی گومانە کە دەڵێت: "من گومان لە هەموو شت دەکەم، پاشان حەقیقەتی هەموو شت ڕەد دەکەمەوە، تاکە حەقیقەتێک کە بەرپەرچی نادەمەوە ئەوەیە کە 'من گومانم هەیە'".

گومان بەشێکە لە بیر کردنەوە لەبەر ئەوەیە دەڵێت "من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم", چونکە بیرکردنەوە بەبێ بوون ناگونجێت، بەهۆی بیرکردنەوەوە دەتوانم بوونی خۆم بسەلمێنم، هەر بەهۆی ئەم بنەمایەیەوە بوونی خۆی سەلماند، پاشان بوونی خودا و بوونی عالەمی سەلماند.

لەڕاستیدا نابێت ئەوە لەبیر بکەن، کە میتۆدی گومان لەپێش دیکارت کەسانی تر کاریان لەسەر کردووە و باسی پێویستی گومانیان کردووە بۆ گەشتن بە یەقین، لەوانە ئیمام ئەبوحامیدی غەزالی (١٠٥٨ز - ١١١١ز)، کە لە کتێبی (المنقذ من الضلال)، کە لە وتە بەناوبانگەکەیدا دەفەرموێت: "هەر کەس گومان نەکات تێنافکرێت، هەر کەسێکیش تێنەفکرێت بەرچاوڕوونی بۆ پەیدانابێت، هەر کەسێکیش بەرچاوڕوونی بۆ پەیدانەبێت، لە گومڕایی و

کوێرەوەریدا دەمێنێتەوە"، بەڵام ئەوەی لە گومڕایی و کوێرەوەریدا دەیبینین خودی مەعریفەیە.

غەزالی لە کتێبەکەیدا باسی ئەوە دەکات چۆن گومانی کردووە لەبەرانبەر ئەو بەهاو باوەڕە باوانەی کە لەسەردەمەکەیدا هەبوون و دژ بە یەک بوون، کە ئەمەش ناگونجێت بڕوای پێ بهێنین، چونکە هەندێکیان هەندێکی دیکەیان بە درۆ دەخەنەوە، یان ئەوەیە هەموویان پووچن، یاخود هەندێکیان ڕاستین و هەندێکی دیکەیان پووچن، هەربۆیە پێویستە گومان بکەین، تاوەکوو بە سەربەخۆیی خۆمان بۆچوونمان هەبێت.

غەزالی بەهەمان شێوە لە پێش دیکارت گومانی لە دەزگاکانی ناسینی مەعریفە دەکات لەوەی مەعریفەی هەستەکان ملکەچی وەهم وخەیاڵاتن، چونکە فریودەرن بەوەی ئێمە ئەستێرەکان بە بچووکی دەبینین کە بە ئەندازەی دینارێکی ئاسنن، بەڵام لەڕاستیدا زۆر پێچەوانەیە کە زۆربەیان لە زەوی گەورە ترن، ئێمە چۆن باوەڕ بە هەستەکانمان بکەین؟!

پاشان دێت و گومان لە ئامێری عەقل دەکات بۆ دۆزینەوەی مەعریفە و وای دەبینێت، گومانکردن لە هەستەکان دەبێتە هۆی ئەوەی گومان لە عەقڵیش بکەین، چونکە عەقڵ لە خەودا زۆر شت وەک ڕاستی جێگیر دەبینێت، کاتێک بە خەبەر دێت تێدەگات کە هیچ ئەسڵ و بنەمای نییە. هەر بۆیە غەزالی لە ئەزمەی عەقڵی و نەفسی تا ماوەی دوو مانگ بەردەوام دەبێت تا کتێبی (میزان العمل) دەنووسێت، بێگومان غەزالی عەوداڵانی حەقیقەت دەکات بە چوار بەشەوە ئەوانیش:

• موتەکەلیمەکان: ئەوانە کە ئەهلی بۆچوون و تێڕوانینن.

• باطینیەکان: ئەوانەن کە خاوەنی زانستن و تایبەتن بە وەرگرتنی زانست لە ئیمامی خۆیان.

• فەیلەسووفەکان: ئەوانەن کە ئەهلی لۆژیک و بەڵگەی پەتیین.

• سۆفییەکان: ئەوانەن کە ئەهلی تایبەتن و ئەهلی کەشفی دڵ و بینینی ڕاستین.

سەبارەت بە کاریگەری غەزالی لەسەر دیکارت توێژەرێکی تونسی بە ناوی دکتۆر (عثمان الكعاك) کە ئەمینی مەکتەبەی نیشتمانی بووە لە پاریس و پەیوەندی پتەوی لەگەڵ زانای میصری دکتۆر موحەممەد عەبدولهادی (أبو ریدە) داوای لێکردووە هاوکاری بکات لەسەر کاریگەری غەزالی لەسەر دیکارت، ئەویش خۆی گەیاندە مەکتبەکەی دیکارت کە کتێبی (المنقذ من الضلال) غەزالی بینیوە وەرگێڕدراوە بۆ لاتینی بە قەلەمی دیکارت چەندین دەقی غەزالی دیاری کراوە و نووسراوە "بخرێتە میتۆدی ئێمەوە" کە ئەمە وەرگرتنێکی زۆر ڕوونە.

لەهەمووی ترسناکتر، لە ڕۆژی دواتر، ڕووداوێکی کتوپڕی ترسناک ڕوویدا ئەویش مردنی کعاک بوو لە ڕۆژی (١٩ی ڕجب ١٣٩٦کۆچی بەرانبەر بە١٥ی یولیو ١٩٧٦ز) لە ژوورەکەی خۆی و پاشان نەمانی کتێبەکەی (المنقذ من الضلال) غەزالی لە مەکتبەی دیکارت! کە ئایا دەست درێژیکراوەتە سەری، یان مردنی ئاسایی بووە؟!

کعاک باسی ئەوە دەکات، کە یەک لەو عیبارەتە بەناوبانگانەی کە دیکارت لە کتێبەکەی غەزالی دیاری کردووە عیبارەتی:»الشك أولى مراتب اليقين» کە بە حاشیە نووسراوە: "بخرێتە میتۆدی ئێمەوە."

بێگومان کعاک یەکەم کەس نییە باس لەم بابەتە بکات، تاوەکوو ئاسان بێت بەرپەرچدانەوەی، بەڵکوو (د. محمد البهبيتی) لە کتێبەکەی (المدخل إلى دراسة التاريخ والأدب العربيين) و (د. زكی نجيب محمود) لە (ڕؤية إسلامية) جەخت لەسەر کاریگەری فیکری غەزالی لەسەر ڕێنێ دیکارت دەکەنەوە.

جگە لەمانەش (د. محمد حمدی زقزوق) لە ساڵی (١٩٦٨) نامەی دکتۆراکەی لە زانکۆی میونخ لە ئەڵمانیا لەسەر غەزالی بەدەست هێنا بەناوی (المنهج الفلسفي بين الغزالي وديكارت) یەک لە موعجەبانی فەلسەفەی دیکارت بە ناوی «ڕاینهارد لاوت» (reinhard lauth) ئیشرافی ڕیسالەکەی کرد، کە لە محازەرەکانیدا وای پیشان دەدا کە فەلسەفەی نوێ لە دیکارتەوە دەست پێدەکات. ئەم ڕیسالەیەی «زقزوق» شتێکی کتوپڕ بوو بۆ موشریفەکەی و هیچ ڕەخنەی لێ نەگرت، تاوەکوو بەدواداچوونی بۆ بابەتەکە کرد، ڕیسالەکەی دا بە یەکێک لە ڕۆژهەڵاتناسەکان بۆ ئەوەی بۆ ئەڵمانی وەریگێڕێت، چونکە موشریفەکەی عەرەبی نەدەزانی، ئەوەبوو (أنگون اشبيتالر) (A.spitaler) کە یەکێکە لە ڕۆژهەڵاتناسەکانی ئەڵمان، دەقەکانی وەرگێڕاو جەختی لەسەر لێکچواندنەکانی کردەوە، بەڵام نەیگێڕایەوە بۆ کاریگەری غەزالی لەسەر دیکارت، بەڵکوو تەنیا لێکچونی خەیاڵ و ئەندێشەیە لە نێوانیاندا.

زەقزوق لە کتێبەکەیدا ڕوونی دەکاتەوە مەبەستم نییە کە بابەتی کاریگەری و موعجەببوون لەم ڕیسالەدا ڕوون بکەمەوە، بەڵکوو ئەمە بابەتێکی مێژووییە و پێویست بە بەڵگەی ماددی دەکات، ئەوەی گرنگە بەلامەوە موقارەنەی فەلسەفییە.

پاش ئەوەی ڕیسالەکە بە زمانی ئەڵمانی لە ئەڵمانیا بڵاوکرایەوە، نووسەرێکی سویسری بەناوی «کریستوف فون فولتسوجن» (chtistoph von wolzogen) لە ساڵی (١٩٩٣) وتارێکی بڵاو کردەوە بەناونیشانی «ئایا غەزالی دیکارت بووە پێش ئەوەی دیکارت بێتە دونیاوە؟» لەم بابەتەدا ئاماژەی بۆ دەرخستنی ڕاستییەک کرد، ئەویش میتۆدی گومانە کە پەیوەستە بە فیکری ئیسلامییەوە لە سەدەبیازدەی زاینییەوە باسکراوە، واتە بەزیاد لە پێنج سەدە پێش دیکارت، وەک چۆن ئاماژە دەکات بە لێکچوونێکی زۆر لەنێوان (المنقذ من الضلال) غەزالی و (التأملات) و (مقال في المنهج) ی دیکارت.

زەقزوق، ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم بابەتە پێویست بە توێژینەوەی زیاتر دەکات، تاوەکوو دەگەینە بەڵگەی یەقین و یەکلاکەرەوە. مەبەستمان ئەوە نییە لە پشت دەرخستنی ئەم بابەتەوە شانازی بە پێشینەمان بکەین و بە شان و باڵیان هەڵدەین و عاتیفە و سۆزمان بخەینە گەڕ بۆیان، بەڵکوو بە عەقڵانییەتەوە لە هەوڵی پڕکردنەوەی کەموکوڕییەکانمان بین بەرانبەر بە پێشکەوتنی ڕۆژئاوا و گەڕانەوەی متمانەبەخۆبوون بە ئامانجی دەرچوون لە دۆخی چەقبەستوویی و گەیشتن بە شۆڕشی فیکری نوێ لە فەلسەفەی ئیسلامیدا.

لە کۆتاییدا نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت، کە کەلەپووری مرۆڤایەتی بریتییە لە بەخشین و وەرگرتن. بەمانایەکی دیکە، بریتییە لە کارلێکەرو کارلێکراو. هیچ گەل و کۆمەڵگەیەک نییە مەگەر لەبەردەوامی ژیانیدا بە ئەندازەی بەخشینی بە کەلەپووری مرۆڤایەتی ئەوەندەی وەرگرتووە، ناشگونجێت ئێمە شارستانییەتی ئیسلامی لەبیر بکەین کە پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە، ئەگەر لە سەدەکانی دواییەوە تا ئێستا شارستانیەتی ئیسلامی لە دۆخی چەقبەستووی و دواکەوتوویدایە چەندین فاکتەرو هۆکاری دیکە هەیە کە ڕێگرن لە گەشەکردنیدا، کە لێرەدا دەرفەتی باسکردنی نییە.

ئەم بابەتەش تەنیا لە غەزالی دا کورت نەکراوەتەوە، بەڵکوو چەندین فەیلەسووفی دیکە هەن بۆچوونیان لەیەکەوە زۆر نزیکە، لەوانە: بۆچوونی سەبەبی لای غەزالی هەمان بۆچوونە کە لای «دفید هیوم» هەیە، مەزهەبی زەڕری ڕۆحی لای «لیبنتز» هەمان بۆچوونی «جەوهەری فەرد» ە کە لای فەیلەسووفە موسڵمانەکان و موتەکەلیمەکان هەیە.

چەندین پەیوەندی پتەو هەیە لەنێوان «اسبینوزا» و فیکری ئیسلامی لە ڕێگەی وەرگێڕانی کتێبەکانەوە بۆ لاتینی، لە ڕێگەی مووسای کوڕی مەیمون و ئیبن عەرەبی کە زۆر لەیەک دەچن، هەروەها ئیبن سینا چەندین بۆچوونی

هەیە هاوشێوەی بۆچوونەکانی دیکارت.

ئەمەی باسکرا تەنیا چەند نمونەیەک بوو لەسەر کاریگەری فەلسەفە، ئەم بابە کورت نەکراوەتەوە و یەک لا نەبووەتەوە، بەڵکوو بەهیوای ئەوەی زیاتر بگونجێت کار لەسەر گرنگی پەیوەندی نێوان فەیلەسووفانی ئیسلامی و فەیلەسووفانی ئەورووپی نوێ بکرێت و کاریگەرییان لەسەر یەکتر ئاشکرا بکرێن، چونکە هیچ هۆزو نەتەوەیەک لەوانی دی زیاتر، یان کەمتر نییە، لەوەی بتوانن توێژینەوەی فەلسەفی بکەن و بەرەو پێشەوە بچن، هەر وەک دیکارت دەڵێت: "عەقڵ باشترین شتە کە بە یەکسانی لەنێوان خەڵکان بەش کراوە."[1]

---

(١) www.historyofkurd.com (لەنووسینی: مەهدی حەمەسەعید موحەمەد، بەم سەرچاوانەوە:

المنقذ من الضلال، لأبي حامد الغزالي، المحقق: عبدالحليم محمود، الناشر: دار الجيل- بيروت، السنة:٢٠٠٤.

لمقال عن المنهج لديكارت، الترجمة العربية: محمود محمد الخضري، الناشر: دارالكاتب العربى للطباعة والنشر- مصر، السنة: ١٩٧٨.

التأملات فى الفلسفة الأولى لديكارت، ترجمةد. عثمان أمين، الناشر:

المركز القومي للترجمة.

المنهج الفلسفى بين الغزالى وديكارت، المؤلف: دكتور محمد حمدى زقزوق، دار المعارف ، السنة : ١٩٩٨م.

المدخل إلى دراسةالتاريخ والأدب العربيين، دكتور محمد البهبيتى، الناشر: دار الثقافة البيضاء، ١٩٨٥م.

فلاسفة المسلمين القدماء وفلاسفة أوربا المحدثين ..... هل من علاقة؟ بقلم أ. زكي الميلاد ، مجلهالمسلم المعاصر، منشور في العدد ١٥٢.

موقع ويكيبيديا : https://ar.wikipedia.org/wiki/رينيه- ديكارت.

## ئیبن ڕوشدی ئەندەلووسی و کاریگەری لەسەرهەڵدانی ڕۆشنگەری وعەقڵانییەت لە فکری ئەورووپادا

ئیبن ڕوشدی ئەندەلووسی (٥٢٠ هـ- ٥٩٥ هـ) فەیلەسووف و پزیشک و فەقیهـ و فەلەکناس و فیزیاناس، یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسووفانی ئیسلامی و پاڵپشتی فەلسەفە بووە و قازی شاری ئیشبیلییە بووە کە ئێستا هاوتای وەزیری داد و شێخی ئەزهەرە پێکەوە[1]. یەکێکە لەوانەی کە شەرحی کتێبەکانی ئەرستۆو ئەفلاتوونی کردووە ڕاو سەرنجی خۆی هەبووە لەسەر بۆچوونی فەیلەسووفەکانی پێش خۆی وەک بۆچوونەکانی ئیبن سینا و فارابی و نەزەرییەکانی ئەفلاتوون و ئەرستۆ، لە سەرەتای منداڵییەوە هەموو قورئانی لەبەر کردووە لەگەڵ سەرجەم کتێبی (الموطأ) ی ئیمامی مالک[2]، هەروەها لەسەر مەزهەبی ئیمامی مالک زۆربەی بۆچوونە فیقهییەکانی خۆی بەرجەستە کردووە.

مێژووی فەلسەفەی ئیسلامی هیچ فەیلەسووفێکی بە ئەندازەی ئیبن ڕوشد تۆمار نەکردووە، کە خاوەن پێگەو ناوبانگی تایبەتی خۆی بێت (بەتایبەت لە ڕۆژئاوا)، بە شێوەیەک زۆرێک لە بیرمەندانی ڕۆژئاوای کەمەند کێش کردووە لەوەی تێزەکانی جیگەی توێژینەوەو قسە لەسەرکردن بێت[3].

ئیبن ڕوشد زیاتر لایەنی دیرایەت و عەقڵگەرایی زاڵە بەسەریدا وەک لەوەی ئەهلی ڕیوایەت و نەقڵ بێت، لەگەڵ ئەوەی کە پشکی زۆری لە بواری ڕیوایەتدا هەیە، خاوەنی کتێبی (البيان والتحصيل والشرح والتوجيه والتعليل فی المسائل المستخرجة) کە کتێبێکی بەنرخ و بەپێزە لە مەزهەبی مالیکیدا[4].

بە بۆچوونی زۆربەی بیرمەندان گەیشتنی بیرو هزری ئیبنو ڕوشد بۆ ناو

---

(١) الفلسفة الإسلامية مدخل وقضايا، لأستاذ الدكتور حامد طاهر، ل٢٨٠.

(٢) الفكر السامی فی تاريخ الفقه الإسلامی، لمحمد الحسين الحجوی، ب٤، ل٥٤.

(٣) قضية الألوهية بين الدين والفلسفة، الاستاذ الدكتور محمد السيد الجليند، ل ٣٠٩.

(٤) الفكر السامی فی تاريخ الفقه الإسلامی، لمحمد الحسين الحجوی، ٥٤\٤.

فیکری خۆرئاوا لە سەدەی سێزدە پەڕەیەکی نوێ هەڵدرایەوە لە مێژووی هزری ئەورووپادا و ئامادەکارییەکی گەورەی جێهێڵا بۆ دەرکەوتنی سەردەمی ڕۆشنگەری لە سەدەی پازدە، کە دەبێتە سەرەتای سەردەمی نوێ لە بواری فیکری لە ئەورووپادا، هەر وەک چۆن دەبینین فەلسەفەی ئیبنو ڕوشد بەتایبەتی ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕێت لە دەرکەوتنی ئەقڵگەرایی و زانستگەرایی نوێ لە ئەورووپادا.

لە گرنگترین ئەو کارانەی کە لەسەر ئیبن ڕوشد لە سەدەی بیستدا کرابێت بە زمانی عەرەبی ئەو تێزەی کۆچکردوو پرۆفیسۆر دکتۆر محمود قاسم کردوویەتی بە ناونیشانی «تیۆری زانین لای ئیبن ڕوشد و تەئویل کردنی لەلایەن تۆماس ئەکوینی»، بەشێوازێکی میتۆدی ئەکادیمی زانستی هەموو ئەو بەڵگانە دەخاتە ڕوو کە بیرمەندی گەورەی مەسیحیی «تۆماس ئەکوینی» (٦٢٢-٦٧٣ھ) کە شوێنکەوتووانی بە «دوکتۆری فریشتەیی» ناوی دەبەن، تیۆرەکەی لە بواری زانستی ئیلاهی هیچ شتێک نییە جگە لە تەرجەمەی حەرفی ئەو بۆچوونانەی ئیبن ڕوشد، کە چەند سەدەیەک لەپێشوودا خستوویەتییە ڕوو[1].

ئەم تێزەی د. محمود قاسم نامەی دکتۆراکەیەتی کە لەپاش هەشت ساڵ لە خوێندن و دیراسە لەفەرەنسا و خۆ پڕ چەک کردن بەوشارستانییەتەی ڕۆژئاوا وەک وەسیلەیەک بۆ پێشکەوتن، لە زانکۆی سۆربۆن لە ساڵی ١٩٤٥ ڕیسالەکەی پاش تاوتێکردن لەزانکۆی ناوبراو بە پلەی (الشرف الأولى) قبووڵ کرا.

ئیبن ڕوشد خاوەنی چەندین کتێبی دانسقەو بەنرخە لە بواری فیقهـ و فەلسەفەو زانستی کەلام، لەوانە لە بواری فیقهدا خاوەنی (بدایه المجتهد ونهایه المقتصد)، هەر وەک چۆن لە بواری پزیشکیدا خاوەنی کتێبی (الكليات)ە کە بەردەوام لە ئەورووپا دەخوێنرێت لەگەڵ دانراوەکانی ئیبن سینا وڕازی تاوەکوو

---

(١) نظرية المعرفة عند ابن رشد وتأيلها لدى توماس الأكويني، د. محمود قاسم، ل ٢٧.

سەدەی شانزەی زایینی.

سەرەتای بەگەڕخستنی وزە و تواناکانی ئیبن ڕوشد بە داواکارییەک لەلایەن خەلیفەوە هەستا بە شەرح کردن و سادەکردنی کتێبەکانی لە سێ شەرحدا، ئەوانیش: (مختصر، ومتوسط، وموسّع) کە بوون بە مەرجەع بۆ ئەورووپییەکان، کاتێک بۆ زمانی لاتینی وەرگێڕدرا.

لە بواری فەلسەفەی ئیسلامیشدا دیارترین کارە گرنگەکانی لەم سێ بەشەدا خۆی دەبینێتەوە ئەوانیش:

بەشی یەکەم: پتەوکردنی پەیوەندی لەنێوان فەلسەفەو ئاییندا.

بەوەی کە بڕوای وەها بوو عەقڵی ڕاست هیچ کات دژایەتی وەحی ڕاست و دروست ناکات، هەروەها ساڵی (١١٧٨م) کتێبێکی نایاب و بەپێزی لەو بارەیەوە دانا بەناونیشانی (فصل المقال، فيما بين الحكمه والشريعه من الاتصال)، ئەم کتێبە ئەگەرچی قەبارەی بچووکە، بەڵام زۆر گەورە و بەبەهایە، بە شێوەی گشتی تاکە کتێبێکە دانراوە بەرگری لە فەلسەفە و ئازادی فەلسەفە بکات.

کتێبەکە باسی گرفتی ئەساسی سەردەمی خۆی دەکات، ئەویش خوێندنی فەلسەفەیە ئایا واجبە و ئێمە موکەلەفین بە خوێندنی؟ یان زیانبەخشە و پێوستە حەرام بکرێت؟ ئیبن ڕوشد چارەسەری کۆتایی باس دەکات بەوەی کە هەر خودی دەقە دینییەکان بانگهێشتی مرۆڤەکان دەکەن بۆ بیرکردنەوە لە بوونەوەر، قورئان زۆر پڕە لەم بانگهێشتانە، فەلسەفەش هەروەک خاوەنی (فصل المقال) باسی دەکات هیچ نییە جگە لە خوێندنەوەیەکی زانستی بەڵگەیی بۆ بوونەوەر[1].

بابەتی گونجاندنی عەقل و وەحی وەک زانراوە بابەتێکی زۆر گرنگە، ئیبن

---

(١) أثر ابن رشد في فلسفة العصور الوسطى، دكتورة زينب محمود الخضيري، ل ١١٨.

ڕوشد بەرهەمی باشی پێشکەش کردووە بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە، بۆچوونی ڕەخنەگرانەی بە زانایانی ئەهلی کەلام لەم کتێبەیدا بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر بڕوای تەواوی بە فەلسەفە. هێرشێکیشە بۆ هێرش بەرانی فەلسەفە، لە سەرووی هەمووشیانەوە زانایانی ئەهلی کەلام لە ئەشاعیرە کە کاریگەرن بە ئیمام غەزالی[1].

لە گرنگترین کارێک وەک بەرگری کردن لە فەلسەفە کردبێتی دانانی کتێبی وەک (تهافت التهافت) کە وەک بەرپەرچدانەوەی کتێبی ئیمامی غەزالی (تهافت الفلاسفة) نووسیویەتی، کتێبەکانی تری وەک (مناهج الادلة فی عقائد الملة)، (ومقالة فی العلم الإلهی)، (فصل المقال فیما بین الشریعة والحکمة من الاتصال) پوختەی دەرەنجامی لەو بوارەیەوە ئەوەیە کە حەقیقەت یەک شتە، پێغەمبەران لە ڕێگەی سرووشەوە وەریدەگرن، خەڵک و فەیلەسووفانیش لە ڕێگەی عەقڵەوە دەرکی دەکەن[2]، لە ڕێگەی ئەم میتۆدەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئامانجی عەقڵ و وەحی یەک شتەو هیچ دژایەتییەک لە نێوانیاندا نییە.

بەشی دووەم: بە پێویست زانینی جیاوازی و جیا کردنەوە لەنێوان عالەمی پەنهان (عالم الغیب) کە زۆر بە کورتی لە قورئان باس کراوە و مرۆڤەکان تەنیا لەڕێگەی وەحییەوە دەیزانن و مرۆڤ موکەلەف نییە بگەڕێت بە دوایدا و عالەمی بینراو (عالم الشهادة) دا کە پانتاییەکی زۆری لە قورئاندا گرتووە و مرۆڤ موکەلەفە لەم بوارەدا ئیش بکات.

عالەمی پەنهان: ئەو دنیایەیە کە خوای گەورە تایبەتی کردووە بە زانستی خۆیەوە، ئێمە تەنیا دەبێت پابەند بین پێوەی و ڕۆناچین لە بارەیەوە، بەهۆی

---

(١) أثر ابن رشد في فلسفة العصور الوسطى، دكتورة زينب محمود الخضيري ل١١٨-١١٩.
(٢) الفيلسوف المفترى عليه، لدكتور محمود قاسم، ل ٢٢.

نەگەیشتنی ئاوەزمان بە نهێنییەکانی زانستی خودای گەورە. ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾(١).

﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾(٢).

عالەمی بینراو: هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە ئەچێت بە عەقڵماندا وهەستی پێ دەکەین، مافی خۆشمانە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین.

پەیوەندی عەقڵ بە عالەمی بینراو لە سەر بنەمایەکی دیار قورئان بەواجبی داناوە کە عەقڵ لەم بوارەدا بکەوێتە گەڕ، لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە: _

عەقڵ توانایەکی باشی هەیە بۆئەوەی لەم بوارەدا زانست وەرگرێت و کەشفی یاساکانی گەردوون بکات و پەیوەندییە هۆکارییەکان لەنێوان جۆرەکاندا دیاری بکات بۆئەوەی زانست وەرگرێت لەو مەملەکەتەی کە خودای گەورە کردوویەتییە جێنشین لەسەری.

خودای گەورە مرۆڤی بەهرەدار کردووە بە پێنج هەستەکان وەک جوندی بۆ خزمەتی عەقل بۆ ئەوەی هەموو شتە هەستیارەکان بناسێت، لە هەمان کاتیشدا بەرپرسیاری خستووەتە سەرشانی ئەگەر خراپ بەکاری بهێنێت، یاخود کەمتەرخەمی تێدا بکات، ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾(٣)

هەستەکان بەهرەیەکی زانستی عەقڵیین لە عالەمی بینراو،، جاسوسی عەقڵن، بەبێ هەستەکان عەقڵ ناتوانێت هیچ شتێک لە عالەمی بینراو بزانێت، کە هەر هەستێک پەیوەستە بە عالەمێکی دیاری کراوەوە. بیهێنە پێش چاوی

---

(١) الأنعام:٥٩.

(٢) النمل:٦٥.

(٣) الإسراء: ٣٦.

خۆت مرۆڤێک ئەم هەستانەی نەبوو چۆن دەتوانێت زانستی یەقینی وەرگرێت؟!

بێهودەیە پرسیاری ڕەنگ لە نابینایەک بکەی، یاخود پرسیاری جیاوازی دەنگی دوو گیاندار لە کەسێک بکەیت کە نابیسێت.

ئەوەی نادیار بێت لە هەستەکانی مرۆڤ و ئەزموونی کەسایەتی، بێگومان نادیارە لە عەقڵ و زانستی یەقینی[1].

بەشی سێیەم: ئیبن ڕوشد بڕوای وایە خەڵکی لە بەرانبەر ئاییندا یەک جۆر نین، ئایینی ئیسلام کە ئایینێکی خواییە، ئاڕاستەی هەموو جۆرە خەڵکێک کراوەو هەر یەکەیان بەپێی ئاستی تێگەیشتنی خۆی، بانگەوازی خواییش چەند ڕێگەیەکی هەیە، بەڵگەش بۆ ئەمە بەو ئایەتە دەهێنێتەوە کە دەفەرموێت: ﴿ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ﴾[2]

ئیبن ڕوشد لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا پێیی وایە خەڵکی بە گشتی لە سێ ئاستدان، ئەوانیش:

(البرهانیون) ئاستی بورهانییەکان: کە تایبەتە بە ئاوەزمەندەکان، ئەوانەن کە بەفەلسەفەو بەڵگەی عەقڵی و تێڕوانینی عەقڵی و بورهان باوەڕ دەهێنن.

(الخطابییون) ئاستی ئامۆژگاری و ویژدان: ئەوانەن تەنیا بە ڕێگەی وتار و ئامۆژگاری باوەڕ دەهێنن، ئەمانەش خەڵکی گشتی و ئاساییین.

(الجدلییون) ئاستی گفتوگۆی جوان و ئاست بەرز، تایبەتە بە بەشی ڕۆشنبیران و ئەوانەن کە ئاستیان لە لە خەڵکی گشتی و ئاسایی بەرزترە.

ئەو بڕوای وەها بوو کە سەرجەم خەڵکانی سەر زەوی پێویستە لەسەر سێ پۆلێن مامەڵەیان لەسەر بکرێت، لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتی قورئان، بەوەی کە

---

(١) قضية الالوهية بين الدين والفلسفة، د. محمد السيد الجليند، ل ٥٧.

(٢) سورة النحل:١٢٥.

وتاری خیطابی وتاری جەدەلی وتاری فەلسەفی هەیەو هەر بەشەیان ئەهلی تایبەتی خۆی هەیە. ناکرێت وتاری بەشێک بۆ غەیری ئەهلی خۆی باس بکرێت، وەک ئەوەی کە ئەهلی خیتاب باسی وتاری فەلسەفییان بۆ بکرێت[1].

لێرەدا کاریگەری ئیبن ڕوشد دەردەکەوێت لە گەشەکردنی فیکری ڕۆژئاوا، سەرەڕای کاریگەری لە زیندووکردنەوەی فەلسەفەی ئەرستۆ، لە دوای لەبیرچوونەوەی لەلایەن ئەورووپای ڕۆژئاواوە، کە بێگومان فەلسەفەی ئەرستۆ لەدوای ئیبن ڕوشدەوە جموجوڵ و پەرەپێدانی زۆری بە خۆوە بینی، بەهۆی لێکدانەوەکانیەوە لەسەر ئەرستۆ.[2]

ئێمە لێرەدا نامەوێ بۆچوون و فەلسەفەی ئیبن ڕووشد بخەینە ژێر تەرازووەوە و بە تەرازووی فکری ئیسلامی ڕەسەن بیپێوین، بەڵکوو دەمانەوێ بڵێین ئیبن ڕوشد وەک فەیلەسوفێکی موسڵمان کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر خۆرئاوا.

## ململانێی نێوان ئایین و زانست

گرنگترین هۆکارە کە پاڵنەربێت بەرەو ئیلحاد، متمانەی خەڵکی لاواز ئەکات بە ئایین، لە ئەنجامی ئەو ململانێیەی لە نێوانیاندا هەیە. لە کاتێکدا ئەو دژیەکیە تەنها لەسەر ئاستی ڕوکارە، یان ئەوەتا زانست نەگەیشتۆتە خاڵێکی بڕەر لەو بابەتەدا، یان پێدراوەکانی زانست لەو کاتەدا ڕێگەنادات بە بۆچوونێکی دی، یان ئەوەتا تێگەیشتنمان بۆ دەقە ئایینییەکە تێگەیشتنێکی دروست و ورد نییە.

ئەوەی جێگەی مەترسیە بەشێک لە پیاوانی ئایینی دەستدەگرن بە

---

(١) فصل المقال فيما بين الشريعة والحكمة من الاتصال، لابن رشد، تحقيق: دراسة وتحقيق: محمد عمارة، ل٥٣ _ ٥٧.

(٢) www.historyofkurd.com لەئامادەکردنی: مهدی حەمەسەعید موحەمەد

هەڵوێستێکی زانستی دیاریکراوە و، لێی لانادەن بە هیچ جۆرێک، وەک هەڵوێستی کەنیسە بەرانبەر گالیلۆ، یان وەک هەڵوێستی زۆرێک بەرانبەر تیۆری پەرەسەندن، ئەوەش هەڵەیەکی گەورەیە.

بوونی تێگەیشتن و بیروباوەڕی هەڵە لە لای مرۆڤ کارێکی ئاساییە، بە نیسبەت زانستەوە، پێدراوەکان دەگۆڕێن و بیرۆکە گەلاڵە دەبن و دەشرۆخێن، پاشان دروست دەبنەوە و دەڕوخێنەوە. گرفتەکە لەوێوە سەرچاوە دەگرێت تیۆرێک یان بۆچوونێکی دیاریکراو مۆرکی ئایینی لێدەدرێت، بە پیرۆز سەیر دەکرێت و ڕێگە نادرێت گفتوگۆی بکەن، وەک ئەوەی پێیان وابوو زەوی چەقی گەردوونە، کۆپەرنیکۆس هات سەلماندی کە زەوی هیچ نییە هەسارەیەک نەبێت لە نێو چەندین هەسارەی تر، کە هەموویان بەدەوری خۆردا دەسووڕێنەوە، وا مامەڵە نەکرا لەگەڵ کۆپەرنیکۆس کە دەگونجێت بۆچوونەکەی ڕاست یان هەڵەبێت، بەڵکوو ڕەتکرایەوە، نەک تەنها لە ڕووی زانستییەوە بەڵکوو لە ڕووی ئایینیشەوە چونکە پێچەوانەی بۆچوونی کەنیسە بوو.

ئەم بۆچوونانە وای کرد خەڵک وا لە ئایین بڕوانێت کە خەڵکی ئایین لە ناخیدا کاڵبێتەوە، پێیان وابێت ئایین تێگەیشتنێکی دواکەوتنانەیە، چونکە بە پیرۆز تەماشای ئەو بۆچانانەیان کردبوو کە ناکرێت گومانیان لێبکرێت، کەچی ئەوەتا ئێستا زانست شتێکی تر دەڵێت.[1]

ئەورووپییەکان هەتا سەدەی دوانزە، زانستی گەردووناسییان لەسەر فیزیای ئەرستۆیی داڕێژابوو کە بەتلیمۆس ڕەواجی پێدا، بەتلیمۆس زانای فەلەکی میصری پێی وابوو زەوی جێگیرە لە چەقی گەردوون، وەک پیاز وایە، لە هەشت بەرگی خڕ پێکهاتووە، ئەو بەرگانە لە ماددەیەکی نەبینراو پێکهاتوون پێی دەڵێن ئەثیر. باوەڕی وابوو ئەو ئەستێرانە دەسووڕێنەوە بەیەک شێوە بە دەوری زەویدا.

---

(١) بیان الفساد، ل ٧٨-٨٠.

پێی وابوو لەنێو هەر بەرگێک لەو بەرگانەی دەوری زەویان داوە، یەکێک لە حەوت ئەستێرە ئاسمەنەکەی تێدایە: مانگ، عەتارد، زوهرە، خۆر، مەریخ، موشتەری و زوحەل.[1]

لە ساڵی ١٥١٤ کۆپەرنیکۆس دەستنووسێکی کورتی نووسی و پیشانی چەند هاوڕێیەکی نزیکی متمانەپێکراوی خۆی دا. بەڵام نەیوێرا بڵاویان بکاتەوە، کۆپەرنیکۆس گەیشتبووە ئەوەی شوێنگەی زەوی شوێنگەی گەردوون نییە، ئێمە وەک هەر هەسارەیەکی تر بەدەوری خۆردا دەسووڕێینەوە. کۆپەرنیکۆس بە هێمنی کاری لەسەر ئەوە دەکرد کە خۆر چەقی گەردوونە نەک زەوی.

کۆپەرنیکۆس دەیزانی توێژینەوەکانی خەڵکی تووشی شۆک دەکات، بەڵام کاتێک چووە تەمەنەوە بە پێویستی زانی توێژینەوەکەی بڵاو بکاتەوە، لەساڵی ١٥٤٢ کتێبە گەورەکەی (ثورات الاجسام السماوية) تەواو کرد، بەڵام ئەو کاتە پیاوێکی بەساڵچووی نەخۆش بوو، وا بڕیار بوو هاوڕێیەکی کتێبەکەی بۆ بڵاو بکاتەوە، بە ناوی ریتشیوش، رتشیویشیش کارەکەی سپارد بە ئەندریاس ئۆسیاندەر، ئۆسیاندەر پێی وابوو بۆچوونەکانی کۆپەرنیکۆس مەترسیدارن، بۆیە پشێشەکییەکی بۆ زیادکرد و لە ساڵی ١٥٤٣ چاپکرا، ئۆسیاندەر لە پێشەکییەکەیدا نووسیبووی بۆچوونەکانی کۆپەرنیک ڕاستنین لە واقیعدا، بەڵکوو تەنها هۆکارێکە بۆ تێگەیشتن لە هەندێک ئاستەنگ کە ڕووبەڕووی زانایانی فەلەکی دەبووەوە.[2]

لە ڕاسیدا کۆپەرنیکۆس وەک کەسێکی بەڕێوەبەری کەنیسە پێویست بوو تەماشای ئاسمان بکات، هەتا ڕۆژەکانی جەژن دیاریبکات، بەڵام وەک پیاوێکی سەردەمی بینی کە تیۆری بەتلیمسی کەم و کورتی تێدایە، ئەوەش تووشی قەلەقی دەکرد، لە خۆی دەپرسی چۆن دەبێت خودا گەردوونێک بێنێتە دی

---

(١) الله لماذا، كارن ارمستونگ، ل ٢٧٧.

(٢) مختصر تاريخ العلم، وليام بينوم، ل ٩٧-٩٨.

بەبێ بوونی ڕێکوپێکی و ڕێکخستن؟ بۆیە گەڕایەوە بۆ سەردەمە کلاسیکیەکان، بینی «ئەریستارخوس» تەرحی ئەوەی کردووە ئەستێرەکان بە دوری خۆردا دەسووڕێنەوە، زەویش بەدەوری خولگە تایبەتەکەی خۆیدا دەسووڕێتەوە، ئەوەی دۆزیەوە لە فەلسەفەی کلاسیک، کە فیساگۆرسیەکان پێیان وایە، بیرکاری کلیلی تێگەیشتنی جیهانی سروشتییە نەک فیزیا، هەروەها بینی یەکێک لە خوێندکارەکانی فیساگۆرس پێی وابوۆە زەوی و هەسارەکان و خۆر هەموویان، بە دوری (نارکونیة مرکزیة) دەسووڕێنەوە.[1]

لەگەڵ ئەوەی کۆپەرنیکس خۆی وەک دەرچوو لە ئایین نەدەبینی، بەڵام کەنیسە هەستان بە دەرکردنی بەیانێک کە تێیدا هاتووە ئەوەی دەڵێت: خۆر جێگیرە و چەقی گەردوونە و ناسووڕێتەوە بەدەوری زەویدا وتەیەکی پووچ و بێمانایە، کوفرە و پێچەوانەی کتێبی پیرۆزە، ئەوەشێ دەڵێت: زەوی بەدوری خۆردا دەسووڕێتەوە لە دوو لایەنەوە ڕەتکراوەیە، لایەنی ئەقڵی و لایەنی نەقڵی.

ئەمە جگە لەوەی کەنیسە بەیانێکی تری دەرکرد کە تێیدا کتێبەکانی کۆپەرنیکۆسی قەدەغەکرد، خستنیە لیستی کتێبە ڕێگەپێنەدراوەکانەوە، لەگەڵ هەموو ئەو کتێبانەی باسیان لە سووڕانەوەی زەوی دەکرد، هەموویانیان خستە لیستی ڕەشەوە، هەتا ساڵی ١٨٣٦ لە لیستەکە دەرهێنران.

کەنیسە تەنها بەوەشەوە نەوەستا، بەڵکوو هەستا بە پرۆسەی سزادان، بەسەر ئەو زانایانەی پشتگیری ئەو ئەو تیۆر و بۆچوونانەیان دەکرد کە پێچەوانەی بۆچوونی کەنیسە بوون، لەسەدەی پانزە زانایەک دەرکەوت بە ناوی باقون، گرنگی دەدا بە مێژووی سروشتی، بۆچوونە سروشتییەکانی پێچەوانەی بۆچووونەکانی کەنیسە بوو، هەڵمەتێکی توند دژی دەستپێکرا، هەڕەشەی کوشتنیان لێکرد، هەتا پەشیمانی دەربڕی و وتی هەرچیم وتووە لە کتێبەکانم پێچەوانەی کەنیسە

---

(١) الله لماذا، ل ٢٧٨-٢٧٩؟

و کتێبی پیرۆزە هەڵەن و لێی بەریم.[١]

یەکێکی تر لەوانەی تووشی سزا بوو «جیۆردانۆ برۆنۆ» بوو، برۆنۆ هێرشێکی توندنی کردە سەر فیزیای ئەرستۆیی، برۆنۆ پێی وا بوو کە لەپشت واقیعی ماددییەوە ڕۆحێکی ناوەکی هەیە، هەر ئەوەش واتای ڕاستی تیۆری مەرکەزی بوونی خۆرە کە کۆپەرنیکۆس نەیتوانی هەزمی بکات.[٢]

برۆنۆ چەندین جار ئاگادار کراوەتەوە و زیندانیش کراوە، شەش ساڵ زیندانی کراوە، لە ساڵی ١٥٩٢ بڕیاری گرتنی دەرچوو، دوای ئەوەی یەکێک لە خوێندکارەکانی شکاتی لێ کردبوو. برۆنۆ بەشێک لەو وتانەی ڕەتدەکردەوە کە دەدرانە پاڵی، ڕای دەگەیاند کە ئەو بەردەوام لە قووڵایی دڵیەوە سوورە لەسەر بیروباوەڕی کاسۆلیکی خۆی.

برۆنۆ هەشت قەزییەی لەسەر بوو، پاپا داوای لێکرد لەو بۆچوونانەی پاشگەزبێتەوە کە پێچەوانەن بە بیروباوەڕی بڕیارلێدراو، بەبێ ئەو بابەتانەی پەیوەستن بە بۆچوونەکانی کۆپەرنیکەوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەنیسە ئامادەیی وەرگرتنی زانستی نوێ بوو، پێش ئەوەی کتێبەکەی کۆپەرنیک قەدەغەبکرێت و گالیلۆ ئاگادار بکرێتەوە و هەشت ساڵ سزای زیندانی بدرێت، دواتر گالیلۆ بە سی و پێنج ساڵ سزا درا ، بەڵام برۆنۆ ئامادە نەبوو پاشگەز ببێتەوە، دەیوت بۆچوونەکانی پێچەوانە نین بە باوەڕ. بۆیە بڕیاری سووتاندنی بۆ دەرچو و، لە ساڵی ١٦٠٠ سووتێنرا.[٣]

لە ڕاستیدا ئەوەی برۆنۆی جیاکردەوە لە کۆپەرنیکۆس ئەوەبوو، برۆنۆ بەوە بەناوبانگ بوو کە بەرگری لە تیۆری کۆپەرنیک دەکرد، بە شێوەیەکی ئاشکرا،

---

(١) ظاهرة نقد الدين في الفكر الغربي الحديث، سلطان العميري، ب١ ل ٦٨-٦٩.
(٢) الله لماذا، ل ٢٨٢-٢٨٣.
(٣) تاريخ الفلسفة الحديثة، يوسف كرم، ل ٣٨-٣٩.

برۆنۆ نموونەی دەنگی ڕاگەیاندنکاری دیاربوو، خاوەنی زمانێکی تیژ بوو بەرانبەر نەیارەکانی، ئەو بەرپرسیارەیشی وەرگرت کە کۆپەرنیک لە ژیانی خۆی لێی دەترسا و هەتا مردنی کتێبەکەی بڵاو نەکردەوە.

برۆنۆ سووتێنرا هەتا ببێتە پەند بۆ ئەوانەی پەند بەردەگرن، ئەوەش کاریگەری هەبوو، گالیلۆ لە بەردەم کەنیسەدا چۆکی دادا و وتی: من گالیلۆ تەمەنم حەفتا ساڵی تێپەڕاندوە، وام لە بەردەم فەخامەتتدا، کتێبی پیرۆز وا لە بەردەمم و دەستی لێدەدەم، ئەو وتە هیچ و ئیلحادیانە س،وک و ڕسوا دەکەم و ڕەتیان دەکەمەوە کە باسی خولانەوەی زەوی دەکەن.[1]

ئەم بەریەککەوتنە لەگەڵ زانست بزووتنەوەی چاکسازیش چارەسەری نەکرد، بەڵکوو زۆر توند بوون بەرانبەر ئەو تیورانە، پرۆستتانەتەکان پێیان وابوو کتێبی پیرۆز دوورە لە هەڵە و دژیەکی، تاکە سەرچاوەی زانست و مەعریفە بوو لایان، هەر تیۆرێک دژی ئەو باوەڕەیان بووایە، بە پووچیان دادەنا.

هۆبز فیشەر دەربارەی لۆسەر دەڵێت: لۆسەر باوەڕی بە توێژینەوەی ئازاد نەبوو، باوەڕی بە یەکتر قب،وڵکردنیش نەبوو، باوەڕی وابوو چارەسەری هەموو گرفتە فکرییەکان و ئەوانەشی پەیوەستن بە ژیانەوە لە کتێبی پیرۆزدا هەن.

بەگشتی هەموو نەیارەکانی مەزهەبی پرۆتستانت دژی پێشکەوتنە زانستییە نوێکان بوون، پرۆتستانتەکان حەماسەتیان کەمتر نەبوو دژی زانستی نوێ، بە بەراورد بەنەیارە کاسۆلیکەکانیان، هەموو گرووپەکانی کەنیسەی پرۆتستانت لە لۆسەریەکان و کالڤنییەکان و ئەنگلیکانییەکان، دژایەتی مەزهەبی کۆپەرنیکۆسیان دەکرد، باوەڕیان وابوو کە دژی کتێبی پیرۆزە.

تەنانەت خودی لۆسەریش گاڵتەی بە کۆپەرنیکۆس و تیۆرەکەی ئەهات،

---

(١) العلمانيه، سفر الحوالي، ل ١٥١.

پرۆستتانتیەکان تەنها بە دژایەتی ئاشتییانە نەوەستان بەڵکوو هەڵمەتی چەوساندنەوەیان دەستپێکرد، بە شێوەیەک بڵاوبوونەوەی زانست زیاتر بوو لە بەشە کاسۆلیکییەکەی هەتا بەشە پرۆستتانتییەکەی. ئەم دژایەتییە توندەش پەیامێکی بێزراوی گەیاند بە خەڵک، پێی وتن: ئایین تەنانەت لە دۆخە چاکسازیەکەشیدا هەر دژی زانست و پێشکەوتنە، ئەمەش یارمەتیدەر بوو بۆ ڕاکردن لە ئایین لە کۆمەڵگای ڕۆژئاواییدا[1].[2]

## هەڵوێست لەبەرانبەر فەلسەفەدا لە فکری ئیسلامیدا

ئەگەر سەیری مێژووی زانایانی موسڵمان بکەین، چەند هەڵوێستێک دەبینین دەربارەی فەلسەفە، کە لە باسی لۆژیکیشدا بەدرێژی باسمانکرد:

١. **حەڕامە و نابێت بخوێندرێت،** ئەمە ڕای هەندێک لە زایان بووە، وەک ڕێگرییەک بۆ چوونە ناو ئەم بابەتە فەلسەفیانە، ئەمە زیاتر مەبەستیان بۆ خەڵکی ناپسپۆر، ئەگەرنا بۆ خەڵکی پسپۆر و شارەزا و بناغە داکوتاو کێشە نییە، بۆنموونە ئیبن تەیمیە خۆی ئەم ڕایەی هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەکێک بووە لە شارەزاترین زایانایان دەربارەی فەلسەفە و زۆر وەڵامی فەیلەسووفانی یۆنانی و ئیسلامی داوەتەوە.

٢. **واجب و پێویستە،** زۆربەی فەیلەسووفە موسڵمانەکان تەئویلی فەلسەفییان بە واجب زانیوە بۆ دەقە ئایینییەکان، هەربۆیە هاتن دەقەکانیان لەژێر ڕۆشنایی فەلسەفەی یۆنانیدا تەئویل و تەفسیر کرد.

٣. **خوێندنی دروستە** و دەبێت بەچاوی ڕەخنەوە سەیر بکرێت، زانایانی

---

(١) ظاهرة نقد الدين، ب١ ل ٧٨-٧٩.

(٢) ئەم بابەتەلەئامادەکردنی: ئاڤار قەرەداغییە.

کەلام زۆربەیان ڕەخنەیان لە فەلسەفەی یۆنانی گرتووە و گفتوگۆیان کردووە و زۆر کەم پێی کاریگەر بوونە.

کەواتە دەتوانین بڵێین سێ ئاراستە هەبووە:

دژایەتی کردووە و حەڕامی کردووە.

پیرۆزی کردووە و پێی کاریگەر بووە.

ڕەخنەی لێ گرتووە و پێی کاریگەر نەبووە.

## هۆکارەکانی ڕەتکردنەوەی فەلسەفەی یۆنانی لەلایەن موسڵمانانەوە

کاریگەری فەلسەفەی یۆنانی نادیدە ناگیرێت لەسەر فەیلەسووفە موسڵمانەکاندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەوتێکی دیار و گەورە هەبووە کە دژی فەلسەفەی یۆنانی بووە، هۆکارەکانیشیان هەم دینی و هەم عەقڵی بووە، بۆنموونە:

١. ئیسلام تەواو و کامڵە و پێویستی بە غەیری خۆی نییە، بۆ بنیاتانی فەلسەفە و بنەما فکری و عەقیدەیییەکانی.

٢. ئیسلام سەرچاوەکەی وەحییە و پارێزراوە، بەڵام فەلسەفەی یۆنانی لە ژینگەیەکی وەسەنی و شیرک و ئیلحاد و بێباوەڕی و دوور لە وەحی گەشەی کردووە.

٣. نەگەیشتن لەڕێی فەلسەفەوە بەرەو یەقین و دڵنیایی تەواو، بەڵام ئیسلام یەقین دەبەخشێت.

٤. پەرتوبڵاوی و تێکەڵی و قورسی و ناڕوونی فەلسەفە. فەلسەفە و فەیلەسووفان پەرتوبڵاون و تێکەڵی و قورسی و ناڕوونییەکی زۆری تێدایە، بەڵام ئیسلام ڕوون

و ئاسانە و هەموو کەسێک دەتوانێت پێی بگات.

٥. سەرکێشانی فەلسەفە لە زۆرێک لە حاڵەتەکاندا بەرەو و بێباوەڕی و ئیلحاد و تێکچوونی بیروباوەڕ، بۆنموونە ئەزەلیبوونی مادده و گەردوون و ڕێژەییبوونی زانستی خودا و وەسفکردنی بە وەسفی نابەجێ و پێناسەکردنی بە شتێکی زۆر بچووک و لێسەندنەوەی دەستەڵات و ئیرادە و زانست لێی یان هەر بڕوانەبوون پێ و مردنی ڕۆح و زیندونەبوونەوە و ...

٦. نکۆڵی کردن لە وەحی و پێغەمبەرایەتی و موعجیزە لەلایەن فەلسەفەوە.

٧. نکۆڵی کردن لە شتە غەیبییەکان، بۆنموونە فریشتە و جنۆکە و بەهەشت و دۆزەخ و ...

٨. واقیعی نەبوونی فەلسەفەی یۆنانی، چونکە شتەکانی زۆربەی زۆری شتی زیهنی و خەیاڵی دوور لە واقیعن.

٩.نازانستیبوون، فەلسەفەی یۆنانی لە زۆرێک لە زانستەکانی وەک گەردووناسی، فیزیک، کیمیا، بیرکاری، پزیشکی، هەندەسە و ... قسەی کردووە، بەڵام دوایی زۆرێکیان وا دەرنەچوون.

١٠. دابڕان لە ژیانی کردەیی، بەهۆی سەرقاڵبوونی زۆری فەلسەفەی یۆنانی بە «مێتافیزک، ئەودیوسروشت»ەوە زۆر دابڕا لە ژیانی کردەییەوە و سەرقاڵ بوو بە شتی ناکردەیی و خەیاڵی و ناواقیعی.

١١. گرتنەبەری میتۆدی ناوەحیانە، فەلسەفەی یۆنانی بەهۆی دووربوونی لە وەحییەوە، تێکەڵ بەچەندان شتی دیکە بوو، بەڵام ئیسلام سەرچاوەکەی وەحی و پەیامی خواییە.[1]

ئەمانە و چەندان هۆکاری دیکە وایانکرد کە فەلسەفەی یۆنانی لەلایەن زۆرێک لە زانایانی ئیسلام ڕەتبکرێتەوە و وەڵامبدرێتەوە و دەیان کتێبی لەسەر

---

(١) دراسات في الفلسفة اليونانية والإسلامية، د. صالح الرقب، ٧٤ _ ٧٧.

بنووسرێت. کار گەیشت بەوەی هەندێک لە زانایان حەرامیشان کرد، چونکە پێیان وابوو فەلسەفەی یۆنانی پڕیەتی بۆچوونی ئیلحادی و بێباوەڕی و پێویست ناکات موسڵمانان خۆیان بەو شتانەوە سەرقاڵ بکەن، لەکاتێکدا وەحی و پەیامی خوایی و زانستە ئیسلامییەکانیان لەبەر دەستە.

## فەلسەفە و ئایین

فەلسەفە و ئایین پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان بەیەکەوە هەیە، هەروەک لە پێشووتردا بەدرێژی باسمانکرد،[١] ئەم پەیوەندییەش لە چەندان ڕووەوەیە، هەربۆیە لەناو هەرسێ ئایینە سەرەکییەکە (یەهودی، مەسیحی، ئیسلام) فەیلەسووفی زۆر هاتوون و هەوڵیانداوە گونجاندن دروست بکەن و پەیوەندی پەیدا بکەن لەنێوانیاندا، نموونەی زۆرمان باسکرد لە سەردەمی مەسیحی و ئیسلامدا، لێرەوە پێم باشە باسی دوو فەیلەسووفی دیکەش بکەم کە هەمان ڕایان هەبووە، ئەوانیش (کانت و هیگڵ)ن.

ئیمانوێڵ کانت یەکێ لە فەیلەسووفە دیارەکانە کە پێی وایە ئایین و فەلسەفە تێک ناگیرێن، چەند شتێکی وتووە لەوبارەوە:

١. پێویستە پەرتووکی پیرۆز بخوێندرێت بەڵام پێویست نەکرێت لەسەر گرووپە ئەخلاقی و بڕوادارەکان.[٢]

٢. فەلسەفە ئامرازی تێگەیشتنە لە ئایین، بۆیە جیاوازیکردن لەنێوان ئایین و فەلسەفە و نیشاندانی فەلسەفە وەک چەمکێک کە دژی خوداناسین و وەرع و تەقوایە، هەوڵێکی بێبەرهەمە و بەهیچ شێوەیەک دانی پێدا نانرێت.[٣]

---

(١) لەبابەتی (ئیسلام و فەلسەفەدا) بەدرێژی باسی پەیوەندی ئیسلام و فەلسەفەمان کردووە.

(٢) الدین فی حدود مجرد العقل، کانت، ٢١٥.

(٣) الدین فی حدود مجرد العقل، کانت، ٥٤.

٣. فەلسەفە و ئایین لە ڕووی ناوەڕۆک و بابەتەوە هاوتان، کە مەبەستی ئەوەیە هەردووکیان گرنگی بە حەق و حەقیقەت و خودا و مرۆڤ و ... دەدەن.[١]

٤. هەماهەنگی و یەکگرتوویی کتێبی پیرۆز (ئینجیل و تەورات) لەگەڵ عەقڵ و فەلسەفە، بە جۆرێکە کە هەر کەسێک دوای یەکێکیان بکەوێت، ئەوەی دیکەشیان دەدۆزێتەوە.[٢]

بەهەمان شێوە، فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمانی «هیگڵ»، زنجیرەیەک پەرتووکی دەربارەی ئایین و مێژووی ئایین نووسیوە لەژێر ناونیشانی (محاضرات في فلسفة الدين)، هیگڵ ئاماژە بە چەند شتێک دەکات لەم بارەیەوە:

١. ئایین و فەلسەفە هەردووکیان گرنگی بە خودا دەدەن، کەواتە لەناوەڕۆکدا هاوتان، ئەمەش هەمان بۆچوونی کانتە، کە پێی وابوو ئایین و فەلسەفە گرنگی بە خودا و مرۆڤ و حەقیقەت دەدەن.[٣]

٢. دواجار فەلسەفە هەرگیز نایەوێت ئایین لەناوبەرێت، چونکە ئایین حەقیقەتە[٤].

## تێکگیرانی عەقڵ و نەقڵ لە فکری ئیسلامیدا

پرسی تێکگیرانی عەقڵ و نەقڵ پرسێکی یەکجار هەستیار و گرنگە لە فکر و فەلسەفە و ئوسوولی فیقهی ئیسلامیدا، لەم بارەیەشەوە چەندان ئاراستە و تەوژم پەیدابوون[٥]:

---

(١) الدين فى حدود مجرد العقل، كانت، ٥٦ - ٥٧.

(٢) الدين فى حدود مجرد العقل، كانت، ٥٧.

(٣) محاضرات في فلسفة الدين، هيگڵ: ١٤٧ - ١٤٨.

(٤) فلسفة الدين، هيگڵ: ل ٩٠.

(٥) بۆ پێگەو ڕۆڵی عەقڵ لەئیسلامدا بگەڕێوەبۆ (ئیسلام و عەقڵ) کەلەباسەکانی سەرەتادا بەدرێژی باسمانکردووەوە.

١. نەقڵ پێش عەقڵ دەخرێت، بەڕەهایی.

٢. عەقڵ پێش نەقڵ دەخرێت، بەڕەهایی.

٣. قەتعی پێش دەخرێت، جا عەقڵ بێت یان نەقڵ، واتە حوکمی ڕەهایی نادات بە هیچیان، بەڵکوو لەوە دەکۆڵێتەوە کامە لایە قەتعییە و کامە زەنییە، چونکە مەرج نییە هەموو کاتێک نەقڵەکە قەتعی بێت، زۆرجار زەنییە، بە هەمان شێوە عەقڵیش زۆرجار بڕیارەکەی زەنییە و قەتعی نییە، جا هەرگیز ناکرێت نەقڵێکی قەتعی دژی شتێکی عەقڵی قەتعی بێت، ئیللا لەکاتی تێکگیراندا یەکێکیان زەنییە و یەکێکان قەتعی.

کەواتە بەکورتی ئەوەی زۆربەی زانایان لەسەر کۆکن، ئەوەیە کە هەرگیز عەقڵی سەلیم و ساغ تێکناگیرێت لەگەڵ نەقڵی سەحیح و ڕاست و دروست، هەرکاتێک تێکگیران ڕوویدا لەنێوانیاندا، ئەوە دەبێ بگەڕێین، چونکە ئیللا کێشە لە یەکێکیاندا هەیە، یان نەقڵەکە سەحیح و ڕاست نییە، یان عەقڵەکە سەلیم و ساغ نییە و تێگەیشتنەکەی ناڕاست و ناتەواوە.

کەواتە دەتوانین بڵێین عەقڵ و نەقڵ دوو دۆڵی لێک جودا نیین، بەڵکوو هەردووکیان سەرچاوەکەیان خودایە، وەحی و عەقڵ هەردووکیان سەرچاوەکەیان خودایە، بۆیە ناکرێت تێکبگیرێن، نەقڵ بەبێ عەقڵ نابێت و عەقڵیش بەبێ نەقڵ نابێت. ئەگەر عەقڵ چاو بێت، نەقڵیش ڕووناکییە، واتە نە چاو بەبێ ڕووناکی دەبینێت، نە ڕووناکیش بەبێ چاو دەبینرێت، وەک ئەنیشتاینیش دەڵێت: زانست بەبێ ئایین شەلە و ئایینیش بەبێ زانست کوێرە. کەواتە هەردووکیان تەواوکاری یەکترین و هیچ دژی یەکتر نیین، یان وەک وتراوە: (العقل قائد والدين مدد) واتە: عەقڵ ڕابەرە و ئایینیش هاریکار، چونکە ئەگەر عەقڵ نەبایە ئایینیش نەیدەتوانی خۆی ڕابگرێت و بمێنێتەوە.

ئەو تێڕوانینەش زۆر هەڵەیە کە بەردەوام بەربەستێک دروستکراوە

لەنێوانیاندا، چونکە عەقڵ و نەقڵ لە تێڕوانینی باوەڕداردا دوو شتن، هەرگیز لێک دانابڕێن و بە دابڕاندنیان لە یەکتری مرۆڤ تووشی گرفتی گەورە دەبێت و لە زۆر شوێندا وەڵامەکان یان نادرێنەوە، یان بەهەڵە دەدرێنەوە.

زاراوەی عەقڵانی و نەقڵانیش لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی کە باسمانکرد، زۆر هەڵەیە، چونکە ئەگەر عەقڵانی بی و نەقڵانی نەبی، ئەوە زۆر نا عەقڵانی و نانەقڵانی، ئەگەریش نەقڵانی بی و عەقڵانی نەبی، هەم دووبارە زۆر ناعەقڵانی و نانەقڵانییە.

ئەم بابەتی دژیەکی عەقڵ و نەقڵە سەرەتا لەلای مەسیحی و جوولەکانەوە دەستی پێکرد، چونکە ئینجیل و تەورات هەردووکیان دەستکاری زۆریان کراوە، تاگەیشتووە بەوەی ژمارەی ئینجیلەکان بگات بە ٧٠ ئینجیل، هەرکەسێک دەهات بە ئارەزووی خۆی شتی لێ زیاد و کەم دەکرد و چۆنی ویستبا ئاوا دەیگۆڕی، هەروەها لەلایەن کڵێساوە زۆرجار دژایەتی زۆری عەقڵ و زانست و زاناکان و فەیلەسووفان کراوە، بەڵام لە ئیسلامدا ئەم جۆرە کێشانەمان نیین، وەحی دەستکاری نەکراوە و پڕیەتی لە پشتگیری و هاندانی عەقڵ و عەقڵکاری و زەمکردنی بەکارنەهێنانی عەقڵ.

راغیبی ئەصفەهانی لە کتێبی (الذريعة إلى مكارم الشريعة) دا دەفەرمووێت: خوای گەورە دوو نوێنەری خۆی ناردووە بۆ لای مرۆڤ، یەکەمیان: شاراوەیە و لەناو خۆیدایە کە بریتییە لە عەقڵ، دووەمیان: بەدەرەوەیە و دیارە کە بریتییە لە پێغەمبەر. مرۆڤ ڕێگەیەکی دیکە شک نابات پێی بگاتە ئەو نوێنەرە دیارە کە هەیە تا سوودی لێوەربگرێت لە ڕێگەی نوێنەرە شاراوەکەوە نەبێت کە عەقڵ. نوێنەرە شاراوەکە دەرک بەوە دەکات کە نوێنەرە ئاشکراکە ڕاست دەکات، ئەگەر عەقڵ نەبووایە پێغەمبەر بەتەنیا نەدەبووە بەڵگە؟ لەسەر خەڵکی!

ئیمامی غەزالیش کە زۆرجار بە دژە فەلسەفە ناوزەند دەکرێت (لە ڕاستیدا ئەو دژی هەندێک بۆچۆنی هەڵەی فەیلەسووفان بووە نەک خوودی فەلسەفە)

لە چەند شوێنێک و لە چەند پەرتووکێکیدا زۆر بەجوانی باسی عەقڵ دەکات، بۆنموونە لە پێشەکی کتێبی (المستصفى)دا دەفەرمووێت: "عەقڵ وەک دادوەر وایە، کە هەرگیز ناکرێت لەسەر کار لاببرێت و شتێکی بخرێتە جێی، شەرعیش وەک شایەتحاڵێکی متمانەدار و دادپەروەر وایە کە عەقڵ دەکات بە کەشتی دینداری و هەڵگری سپاردەکانی خودا."

لەکوتاییدا ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێ بکرێت ئەوەیە کە عەقڵ لەگەڵ ئەو هەموو گرنگی و گەورەیەی، بەڵام ناکرێت بکرێتە سەنتەر و سەرچاوەی سەرەکی و حاکم و بڕیاردەری ڕەها، چونکە عەقڵەکانیش لە کەسێکە و بۆ کەسێکی دیکە و لە شوێنێک و سەردەمێک بۆ شوێن و سەردەمێکی دیکە دەگۆڕێت، بۆنموونە عەقڵی فەیلەسووفەکان لەگەڵ عەقڵی پزیشکەکان، یان عەقڵی عەوام لەگەڵ عەقڵی زانایانی ئەزموون، یان عەقڵی کەسێکی مارکسی لەگەڵ کەسێکی لیبراڵ، یان کۆمەڵناسێک و ئابووریناسێک، لەیەک جیاوازە، یان سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ، کە هەرسیکیان مامۆستا و قوتابی یەکتر بوون، بەڵام لە زۆر شتدا جیاوازبوون. کەواتە ئێمە عەقڵێکی ڕەهای جێگیری نەگۆڕی کۆدەنگی لەسەرمان نییە (غەیری چەند یاسەیاکی گشتی عەقڵی کە پێویستە هەموو مرۆڤێکی عاقڵ بڕوای پێیان بێت، وەک یاسای: دوو شتی دژ بەیەک لەیەک کات و شوێن کەسدا کۆنابنەوە، یان ...)، کەواتە ناکرێت ئێمە عەقڵی چەند کەسێک یان بەرژەوەندیی دەستە و تاقمێک بکەینە دادوەر و هەموو شتەکان بکەینە قوربانی، بەتایبەتی لە دونیا ماددیگەرایی و سەرمایەداریدا هیچ بنەمایەکی عەقڵی ئەخلاقی بوونی نامێنێت غەیری ماددە و بەرژەوەندی و شەهوەت و ئارەزوو ....، کەواتە دەبێت بەهاوسەنگییەوە سەیری ئەم بابەتە بکرێت و نە عەقڵ بەڕەهایی نە نەقڵ بەڕەهایی، بەڵکوو وەک دوانەیەکی دەستەملان سەیربکرێن و مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، لە ژێر عەقڵی ساغ و نەقڵی ڕاست و واقیع و زانست و سەردەم و بارودۆخدا.

## ئاراستە و تەوژم و ڕێباز و قوتابخانەکان دەربارەی عەقڵ لە مێژوودا

لە مێژوودا (زیاتر مەبەستمان مێژووی موسڵمانانە) ئاراستە و ڕێباز و گرووپ و فکری جیاواز جیاواز پەیدابوون، کە ئەمانیش بریتیبوون لە:

### ١. ڕەوتی عەقڵگەراکان

عەقڵگەراکان بریتبوون لە قەدەرییەکان و بەشێکی موعتەزیلە و بەشێکی فەیلەسووفەکان، ئەمانە عەقڵیان کردبوو بە سەنتەر و لە لوتکە دایاننابوو، وەحی بووبوو بە شتێکی لاوەکی و عەقڵ بووبوو بە ئەسڵ و سەرچاوەی یەکەم! عەقڵ سنووری خۆی نەدەزانی و بانگەشەی سەربەخۆبوونی دەکرد![1]

### ٢. ڕەوتی فەلسەفەگەراکان

فەلسەفەگەراکان ئەوانە بوون فەلسەفەیان کردبوو بە ئەسڵ و وەحییان کردبوو بە شتێکی لاوەکی! ئەوەندە زێدەڕۆییان کردبوو لە پیرۆزکردنی فەلسەفە هەتا گەیشتبووە ئەوەی بڵێن فەیلەسووفەکانی یۆنانیش پێغەمبەر بوونە و فەلسەفەش لە وەحی زیاتر بێت کەمتر نییە! ئەوەندە زێدەڕۆییان کردبوو لە پیرۆزکردنی فەلسەفە تاوەکوو گەیشتبوو بەوەی بڵێن: وەحی بە تەرازووی فەلسەفە دەبێت بپێورێت! واتە دەبێت هەرچۆنێک بێت فەلسەفە بکەینە تەرازوو و هەموو ڕوکنەکانی ئایینی پێ بپێوین!

---

(١) موعتەزیلەکان لەگەڵ عەقڵانیبوونیان بەڵام زۆر جیاواز بوون لەقەدەری و فەیلەسووفەکان، عەقڵانیبوونی ئەوان عەقڵانیبوونێکی کەلامی ناوخۆیی بوو، بۆ وەڵامدانەوەی تەوژمەکانی سەردەمی خۆیان، ئەوانەنەک کاریگەر نەبوون بەفەلسەفەی یۆنانی، بەڵکوو بنەماکانیان بۆ وەڵامی تەوژم و بیرەفەلسەفییەلادەرەکانی سەردەمی خۆیان بوو، هەموو هەوڵەکانیان بۆ بەرگری کردن بوو لەئیسلام و بنەماکانی، بەڵام بەمیتۆدێکی عەقڵی تایبەت بەخۆیان، هەرچەند لەهەندێک شتیشدا زێدەڕۆییان کردوو و تێکەوتن و بەهەڵەداچوون.

### ٣. ڕەوتی ناخ و ڕۆح گەراکان

ناخ و ڕۆح گەراکان ئەوانە بوون ناخ و ڕۆحیان لێ بوو بوو بە ئەسڵی ئایین و هیچ ئەرزشێکیان بۆ شتەکانی تر دانەدەنا! حاڵ گەیشتبوو بەوەی ناخ و ڕۆح ببنە پێوەر و سەچاوەی سەرەکی مەعریفە، واتە مەعریفەشیان لە ڕۆحەوە وەردەگرت، ئەم ئاراستەیە زۆر لە عیرفان و تەسەوف و ڕۆحانییەت ڕۆچووبوو، ناخ و ڕۆح بوو بوو بە سەنتەر لای ئەوان! لای زۆرێکیان عەقڵ و کردەوە ئەرزشی نەمابوو، هەموو گرنگییەکان چڕکرابوونەوە لە ڕۆح و ناخدا.

### ٤. ڕەوتی دەقگەراکان

دەقگەراکان بە پێچەوانەی عەقڵانییەکان هەموو شتێکیان لە دەقدا کورت کردبووەوە! زاهیری دەق بوو بوو بە سەنتەر! لادان لە زاهیری دەق یەکسان بوو بە لادان لە ئایین! زاهیری دەق پیرۆز بوو، عەقڵ ڕۆڵێکی نەمابوو، تەئویل و تەفسیر و...، بە لادان لە دەق و لە ئایین پێناسە دەکرا!

### ٥. ڕەوتی مودێرنەی ڕۆژئاوایی

مۆدێرنەخوازەکان زێدڕۆییان بە شێوەیەک کردبوو لە عەقڵدا تاوەکوو ئاستی بەخوداکردن، واتە (تألیە الانسان) لای ئەمان عەقڵ و مرۆڤ خودان و هیچ شتێک لە سەرووی عەقڵ و مرۆڤەوە بوونی نییە! کەواتە عەقڵ کۆتایی هەموو شتێکە! مرۆڤ چەق و لوتکەیە و نابێت شتێک لە سەرووی ئەمانەوە هەبێت! ئەمانە لەخۆیانەوە وەهمی دژیەکی عەقڵ و نەقڵیان ڕاگەیاند! بانگەشەی بێبنەمای تێکگیرانی ئایین و عەقڵییان دەکرد! هەربۆیە هەموو بابەتەکانی وەک موعجیزە و شتە غەیبی و پەنهانەکان لای ئەمان ڕەتکراوە و باوەڕپێنەکراوە!

### ٦. ڕەوتی پۆست مۆدێرنە

پۆست مۆدێرنەش درێژکراوەی مۆدێرنەیە بەڵام زۆر بە خەستر و خراپتر،

مۆدێرنە مرۆڤی دەکردە خودا! بەڵام پۆست مۆدێرنە مرۆڤ دەکات بە شت (تشيئ الانسان)! واتە مرۆڤیش وەک هەموو شتەکانی تر شتێکە و هیچی تر! هەربۆیە هیچ بنەمایەکی عەقڵی و ڕەوشتی و ئایینی و هەتا عەقڵیش لای ئەمان بوونی نییە! واتە دەبن بە پووچگەراییەکی تەواو تەواو و ئەوپەڕی بوونی مرۆڤ وەک شتێک لە شتەکان دەبینن! کەواتە هیچ ئامانجێک لە بوون و نەبووندا نییە! هیچ شتێکی ڕەها بوونی نییە! هیچ شتێک بە ناوی حەقیقەت و حەق بوونی نییە و هەمووی هیچە!

## ٧. ڕەوتی میانڕە و مامناوەند

ئەم ڕەوتە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێت.) هاتووە و بەدرێژایی مێژووش ڕێبەر و هەواداری خۆی هەبووە، ئەم ڕەوتە ڕەوتێکی میانڕەوە، ناوەڕاستی شتەکانی گرتووە، هاوسەنگی لەنیوان وەحی و عەقڵ و ڕۆح و جەستە و زانست و واقیع و مەقاسیددا ڕاگرتووە و زێدەڕەویی و کەمڕەوی لە هیچیاندا ناکات.

کەواتە ئەگەر بڕوانین، هەموویان بەدرێژایی مێژوو لە زێدەڕۆیی و کەمڕەوی (ئیفراط و تهفریط)دا ژیاون!

باشترین مەنهەج مەنهەجی قورئانە، باشترین مەنهەج مەنهەجی کۆتاییيە، باشترین مەنهەج مەنهەجی میانڕەوی و وەسەتیەتە.

# چاخی سێیەم
# سەردەمی نوێ
# سەردەمی بووژانەوەی عەقڵانییەت

لەدوای سەدەی ناوەڕاست، کە سەردەمی مەسیحی و ئیسلامی بوو، سەردەمی نوێ دەست پێدەکات، سەردەمی لەو کاتەدا دەست پێدەکات کە فەلسەفەی ئیسلامی لە کۆتایی تەمەنیدا بوو لە ئەندەلووس (واتە ئیسپانیای ئێستا)، بەڵام لەدوای لاوازبوونی فەلسەفەی ئیسلامی لە ئەندەلووس، قۆناغێکی دیکە لە خودی ئەورووپادا دەستی پێکرد، ئەویش ئیتالیا بوو، چونکە لەوێ هەلومەرج و هۆکارەکان ڕەخسان، بۆئەوەی قۆناغیکی نوێ لە فەلسەفە دەستپێبکات، ئەویش بە قۆناغی «ڕێنسانسی ئیتالی» ناسرابوو.

ڕێنسانسی ئیتالی ئەو ماوەیەیە کە دەکەوێتە نێوان هەردوو ساڵی (١١٤٠ - ١٥٤٠) لە مێژووی ئیتالیادا، چەندین هۆکار بوونە پاڵنەر بۆ دروستبوونی ئەم قۆناغە، بۆنموونە خۆڕزگارکردن لە دەستەڵاتی دینی و کەنیسە و ئەو باردۆخەی سەدان ساڵ بوو باڵی کێشابوو بەسەر ئەورووپادا لەژێر هەژموون و دەستەڵاتی کڵێسادا.

**لەم قۆناغەدا دوو ئاراستەی سەرەکی پەیدابوون:**

١. **ڕەتکردنەوەی هەموو ڕواڵەتەکانی سەدەی ناوەڕاست**، لەناویاندا ملکەچبوون بۆ دەستەڵاتی دینی و کڵێسا، هەروەها دەستەڵاتی ئەو فەیلەسووفانەی کە مەیلیان بەلای کڵێسادابوو و هەموو ئەو کتێب و بۆچوونانەی کە لە چاوی دەستەڵاتی دینی و کڵێسادا بەبەرز سەیر دەکران، بەتایبەت و

ئەرستۆ و کتێبەکانی، کەواتە ئەم ئاراستەیە ئاڕەستەیەکی ڕەتکەرەوەبوو بۆ هەموو هەژموونەکانی سەردەمی خۆی.

**٢. هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی بەدیل و ئەلتەرناتیڤ،** بە شێوەیەک ئەم بەدیلە بتوانێت لەبەرانبەر ئەرستۆ و هەژموونەکانی بوەستێت و عەقڵ لە دەستی هەژموونەکانی ئازاد بکات، ئەم بەدیلەش بەلای ئەوانەوە بریتیبوو لە بووژاندنەوەی ئەفلاتوون و فەلسەفەکەی، پاشان دیموکریتس و ئەرخەمیدس و ئەمبۆلۆنیۆس و ...، ئەم هەوڵ و بایەخدانە کاریگەی گەورەی هەبوو لە ئاراستەکردنی بایەخدان بە زانستە سروشتییەکان و توێژینەوە لە جیهان و نەهێنییەکانی سروشت بەڕێکار و شێوازی نوێ، هەر ئەمەش بوو بووە هۆی دەرکەوتنی زانایانی وەک «گالیلۆ، کۆپەرنیکۆس، کیپلەر، ...» بۆ ڕاڤەکردنی دیاردەکانی سروشت و زۆر بابەتی پەیوەست بە گەردوونناسی و زانستە سروسشتییەکان[1].

هەموو ئەو هەوڵانە بوونە هۆی ڕاپەڕین و شۆڕشێکی گەورەی فەلسەفی فکری و مەعریفی زانستی لە ئەورووپادا، بەرەنجامی ئەو شۆڕشە گەورەیە، سێ ئاراستەی فکری فەلسەفی بوو:

**١. ئاراستەی ئەزموونگەرایی:** لەسەر دەستی فرانسیس بیکۆن (١٥٦١ - ١٦٢٦).

**٢. ئاراستەی عەقڵگەرایی:** لەسەر دەستی دیکارت (١٥٩٦ - ١٦٥٠ ز).

**٣. ئاراستەی ڕەخنەیی (ئایدیالی):** لەسەر دەستی کانت (١٧٢٤ - ١٨٠٤ ز).

ئەم بزووتنەوەی ڕێنساسە هەموو هەوڵێکی بۆ بەرزکردنەوەی سروشتی مرۆڤایەتی ژیانی دونیایی بوو، هەوڵەکانی خستە خزمەتکردنی مرۆڤ خۆی،

---

(١) الفلسفة لمن يريد، د. نبيل، ١٢٤.

هەروەها هەستا بە جیاکردنەوەی فەلسەفە لە ئایین و دەستەڵاتی ئایینی و کڵێسا، فەلسەفە و فکری کردە باسێکی سەربەخۆی دونیاییانە، ئەم ئاراستەکردنەش لەلایەن کۆمەڵێک لە بیرمەندانەوە کرا کە خۆیان بۆ توێژینەوەی ئەدەب و زانستە کۆنەکان تەرخان کردبوو،کە لە یۆنان و ڕومانەوە جێمابوو. یارانی ئەم ئاراستەیە بە (مرۆڤدۆستەکان، هیومانییەکان، Humanism) ناسران، چونکە هەوڵەکانیان چڕکردبۆوە بۆ گەشەسەندنی تاکگەرایی، واتە مرۆڤ خۆی ببێتە سەنتەر، دوور لە هەموو دەستەڵاتێکی دەرەکی ئاسمانی و زەمینی، خوایی و مرۆڤی، واتە پشت بەستن بە عەقڵ مرۆڤ خۆی، بۆیە ئاراستەیەکی فراوانی عەقڵگەرایی هاتە کایەوە، کە دواتر سپینۆزا (١٦٣٢ - ١٦٧٧ ز) و لایبنیتز (١٦٤٦ - ١٧١٦ ز) و ...، هاتنە مەیدان.

زاڵبوونی ئەم ئاراستەیە و ملکەچ کردنی هەموو شتێک بۆ عەقڵ بووە هۆی لێکۆڵینەوە لە خودی عەقڵ، لێکۆڵینەوە لە جیهانی ماددی و جیهانی عەقڵی، پاشان لێکۆڵینەوە لە بابەتی زانین و مەعریفە و سەرچاوەکانی و ئامرازەکانی و کەرەستەکانی و سروشتەکەی، بۆیە پرسیارە سەرەکییەکە بووە ئەوەی کە ئایا سەرچاوە و کەرەستەی زانین و مەعریفە عەقڵە یان هەست و ئەزموون و یان هەردووکیانە؟ هەر ئەم پرسیارانەش بوون بوونە هۆی پەیدابوونی هەرسێ ئاراستە سەرەکییەکەکە: عەقڵی، ئەزموونی و ماددی، ڕەخنەیی و میسالی.

هەربۆیە سێ ڕێبەری جیاواز هاتن، هەریەکەیان تێڕوانینێکی هەبوو، دیکارت عەقڵانی بوو و عەقڵی لەلا سەنتەر بوو. فرانسیس بیکۆن ئەزموون و ماددەی لەلا سەنتەر بوو. کانتیش هەردووکی وەرگرتن و ڕەخنەی لە هەردووکان گرت، بەڵام لەگەڵ ئەواشدا هەموویان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە عەقڵ متمانە پێکراوە و دەسەڵاتی خۆی هەیە، بەڵام لە سنووری ئەم دەستەڵاتەدا ڕاجیاییان هەبوو، عەقڵگەراکان هەموو زانین و مەعریفەیان دەگێڕایەوە بۆ عەقڵ، ئەزموونگەرانیش باوەڕیان بە عەقڵ هەبوو، بەڵام بەم ڕەهاییە نا، چونکە ئەوان

دەستەڵاتی عەقڵیان دەگێڕایەوە بۆ ڕێکخستن و تاقیکردنەوە و جیاکردنەوەی زانیارییەکان کە مرۆڤ بەدەستیان دێنێت، بەهۆی ئەزموون و هەستەکانەوە.

دوای ئەم ناکۆکییەی عەقڵگەراکان و ئەزمونگەراکان، ڕەخنەگەراکان هاتن، بە ڕێبەرایەتی کانت. کانت هات ویستی هەردوو ئاراستەکەی پێشوو یەکبخات و جیاوازییەکانیان نەهێڵێت، ئەویش بە پێدانی دەستەڵات و بوار بە عەقڵ و ئەزموون و کۆکردنەوەیان بەیەکەوە، ڕێبازەکەی کانت وایکرد دواتر ڕێبازی میسالی (ئایدیالی) ئەڵمانی نوێ لەدایک ببێت، ئەمەش بە هەوڵی هەر یەک لە فیختە (١٨١٤ - ١٧٦٢ ز) شلینگ (١٨٥٤ - ١٧٧٥ ز) هیگڵ (١٨٣١ - ١٧٧٠ ز).

دوایی لە سەدەی حەڤدە وردە وردە هەوڵی جیاکردنەوەی فەلسەفە و زانست درا، بۆئەوەی چیتر زانستەکان بە فەلسەفە ناو نەبرێن و زانستەکان سەربەخۆ بن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەئاسانی نەتوانرا لێک جیابکرێنەوە و لێک دابڕنرێن.

کەواتە دەتوانین بڵێین ئەم قۆناغە قۆناغێکی نوێ بوو بۆ جیاکردنەوەی فەلسەفە لە ئایین و دەسەڵاتی ئایینی و کڵێسا و چوون بەرەو عەقڵگەرایی، ئینجا دواتر هەوڵی جیاکردنەوەی زانست و فەلسەفەش درا، بەڵام وەک جیاکردنەوەی فەلسەفە و ئایین ئاسان و جێبەجێکراو نەبوو.[1]

---

(١) الفلسفة لمن يريد، ١٢٥ _ ١٢٧.

# ئاراستەی ئەزمونگەرای هەستگەرا

دوای ئەوەی هەر لە کۆنەوە ئەفلاتوون هاوشێوەکانی باوەڕیان بە هەستەکان نەکرد و بە سەرچاوەی مەعریفەیان نەدەزانی و پێیان وابوو ئەوەی لە هەستەکانەوە وهردەگیرێت گوماناوییە و جێی متمانەی نییە، قوتابخانەی ئەزمونگەرای هەستگەرا هات و هەست و ئەزموون و ماددەی کردە سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە و زانین. پێی وایە ناگونجێت هیچ جۆرە بۆچوون و فکرێک دروست ببێت بەبێ هەست و هەستەوەرەکان و ئەزموون، هەربۆیە ئەوەی هەستی نەما زانین و زانستیشی نامێنێت، لەلای هەستگەراکان هەموو ئەفکارەکان بەرهەمی هەستەکانن، ئەوە ئەزموونی هەستییە وێنەی هەموو شتەکان لە زیهن و عەقڵدا دەکێشێت بۆ جیهانی دەرەکی، کەواتە عەقڵ ڕەنگدانەوەی ماددە و هەست و ئەزموونە بەپێچەوانەی قوتابخانەی عەقڵگەرا.

ڕیشەی ئەم قوتابخانەیە بەشێویەکی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەرستۆ، کە وتی: "ئەگەر ئێمە هەستەکان لەدەست بدەین، ئەوە بەدڵنیاییەوە زانین لەدەست دەدەین"[1]

بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوە بین کە ئەم قوتابخانەیەش جۆر و ئاراستەی جیاوازی تێدایە، هەیە بەڕەهایی ماددی و ئەزموونگەرایە، هەشە بەم ئەندازەیە نییە، واتە هەیانە زیاتر ڕۆڵی عەقڵ دەبینێت، هەشیانە بەڕەهایی ڕۆڵی عەقڵ بەلادەنێت و تەنیا وەک خزمەتکارێکی هەستەکان دەیبینێت.

بۆنموونە خودی ئەرستۆ کە ئەم قسەیە دەکات مەبەستی ئەوە نییە

---

(١) منطق أرسطو، تحقيق: عبدالرحمن بدوي ٢/ ٣٨٥.

هەست و ئەزموون هەموو شتێکە، نەخێر، هەربۆیە لەلای ئەرستۆ بەڵگە عەقڵییە بەدیهییەکان بەرهەمی هەستەکان نیین، بەڵکوو بەرهەمی خودی عەقڵن. کەواتە ئەرستۆ هەستگەرایەکی ڕەها نییە، بەڵام ڕیشەی هەستگەرایی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو، پاشان ئەم قوتابخانەیە بە ئەندازەی جیاواز لە هەست و ئەزموون و ماددەدا ڕۆچوون و تا گەیشت بە ماددییە ڕەهاکان کە لە غەیری ماددە باوەڕیان بە هیچ شتێکی تر نییە و پێیان وایە عەقڵ کاغەزێکی سپییە و هەست و ئەزموون نەخشەی لەسەر دەکێشێت و عەقڵ و فیترەت هیچ ڕۆڵێکیان نییە و ئەوەی هەیە ماددە و ئەزموون و هەستەکانن و بەس.

قوتابخانەی ئەزمونگەرا بە شێوەیەک لە شێوەکان بەدرێژایی فکر و فەلسەفە بوونی هەبووە، ئەوەتا ئیخوانو سەفاش لە مێژووی ئیسلامیدا هەمان ڕای ئەرستۆیان هەبووە.

ئەم قوتابخانەیە گەشەی کرد تا لە سەردەمی نوێدا بە شێوەی تیۆریایەک هاتە مەیدان لەسەر دەستی کۆمەڵە فەیلەسووفێک، دیارترینیان:

فرانسیس بیکۆن: (١٦٢٦ ز)

جۆن لۆک (١٧٠٤ز)

دێڤید هیۆم (١٧٧٦ ز)

دانانی بەردی بناغەی قوتابخانەی ئەزموونگەرایی نوێ فەزڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ فرانسیس بیکۆن، لەسەدەی سێزدەوە فەلسەفەی قوتابخانەیی زاڵ بوو بەسەر ئەورووپادا، بەڵام بە هاتنی فرانسیس بیکۆن ئەم هەژموونەی نەما، چونکە فرانسیس بیکۆن هەوڵەکانی چڕکردەوە لە چەند شتێکدا:

١. زیندووکردنەوەی فەلسەفەی ماددیگەرایی یۆنانی و هەڵسەنگاندنی هەموو ڕێبازە فەلسەفییەکانی پێشوو لەژێر ڕۆشنایی فەلسەفەی ماددیگەرایی و

دەرخستنی کەموکوڕی و کەلێنەکانی فەلسەفەی میسالی و ئایدیالیزمی.

**٢.** زانین و مەعریفەی ڕاستەقینە و حەقیقی ئەوەیە کە لە واقیع و مادده و ئەزموون و هەستەکانەوە سەرچاوەی گرتبێت.

**٣.** مەبەست لە زانین و مەعریفە بریتی نییە لە خودی مەعریفە و زانین، بەڵکوو مەبەست لێی کۆنترۆڵکردنی سروشت و دەستەمۆکردنیەتی بۆ خزمەتی مرۆڤ.

ئەم ئاڕاستە ئەزموونگەرابییە ماددییە نوێیەی فرانسیس بیکۆن دایمەزراند زیاتر فراوانبوو و پایەکانی و هێڵە گشتییەکانی لەلایەن جۆن لۆکەوە دامەزرا.

جۆن لۆک بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی قوتابخانەی ئەزموونگەرای هەستگەرا دادەنرێت، چونکە یەکەم کەس بوو توێژینەوەیەکی تایبەت لەسەر تیۆریای مەعریفە بنووسێت بە ناوی «وتارێک لەسەر عەقڵی مرۆڤ» لەوێدا جۆن لۆک وەڵامی دیکارتی دایەوە دەربارەی بیرۆکە فیتری و زگماکی و پێشوەختەکان و پێی وابوو بەهیچ شێوەیەک مرۆڤ زانیاری پێشوەختەی نییە و هەموو زانیارییەکان لە هەستەکانەوە وەردەگرێت، عەقڵی وەک پەڕەیەکی سپی وایە، هیچی لەسەر نییە و هەستەکان نەخشەی لەسەر دەکێشن و زانیارییەکانی بۆ دەنێرن.

دوای جۆن لۆک، دێڤید هیوم هات و هەمان فەلسەفەی هەستگەرای بیاتنا و دوو پەرتووکی نووسی بەناوەکانی «وتارێک دەربارەی سروشتی مرۆڤ» و «توێژینەوە دەربارەی زیهنی مرۆڤ»، ئەویش هەمان ڕای هەبوو و پێی وابوو بۆ ڕاستی هەر بیر و فکرێک دەبێت بگەڕێنەوە بۆ هەستەکان، چونکە سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە بریتییە لە هەستەکان، ئەوە هەستەکانن بیرۆکەکان دروست دەکەن، کەواتە بۆ ڕاستیان دەبێت بگەڕێنەوە بۆ ئەزموون و هەستەکان و بەوەوە بیان پێوین.[1]

---

(١) الفلسفة لمن يريد، ١٢٧ _ ١٢٩.

## قوتابخانەی ئەزموونگەرا لەلای جۆن لۆن

جۆن لۆک لە پەرتووکەکەیدا «وتارێک لەسەر عەقڵی مرۆڤ» وەڵامی دیکارت دەداتەوە و نکۆڵی لە زانین پێشوەختە و فیتری دەکات، پێی وایە هەموو زانیارییەکانی ئێمە لە ئەزموون و هەستەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە، عەقڵیش پەڕەیەکی سپییە و هەستەکان زانیاری تێدا دەنەخشێنن، بەڵگەش بە مرۆڤە سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتی و منداڵ دەهێنێتەوە، کە هیچ بنەمایەکی فیتری عەقڵی لەلایان بوونی نییە.[1]

لە بەشی دووەمی پەرتووکەکەیدا سەرچاوەی بیرۆکە و ئەفکارەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ دوو سەرچاوە:

١. هەستکردنی ڕاستەوخۆ: بۆنموونە کاتێک پرتەقاڵێک لەبەرانبەرتە تۆ ڕەنگ و شێوە و بۆنەکەی بەتەواوی هەست پێدەکەی، پاش ئەم هەستکردنە، ڕاستەوخۆ دەگوازرێتەوە بۆ عەقڵ، کەواتە عەقڵ ڕەنگدانەوەی هەستەکان بوو.

٢. تێڕامانی باتینی و ناوەکی: وەک وێناکردن و بیرکردنەوە و بیرکەوتنەوە، ئەمەشیان بە هەمان شێوە سەرچاوەکەی هەستەکانن و بەبێ ئەو بوونیان نابێت و هەمووی ڕەنگدانەوە و بەرهەمی هەستەکانە.

کەواتە عەقڵ لای جۆن لۆک کارتێکراوە نەک کارکەر، واتە ناتوانێت هیچ بیرۆکەیەک گەڵاڵە بکات بەبێ وەرگرتنی لە هەستەکانەوە.

### جۆرەکانی مەعریفە لای جۆن لۆک

**١. مەعریفەی حەدسی و بۆهاتوو:** مەبەست لێی ئەو مەعریفە بەدیهییە بەڵگەنەویستانەیە کە لە خودی خۆیاندا زۆر ڕوونن، واتە ئەوەندە ڕوون عەقڵ

---

(١) تاريخ الفلسفة الغربية، رسل، ل ١٧٨.

ڕاستەوخۆ دەركیان دەكات بەبێ پەنابردنەبەر هیچ بەڵگەیەک.

٢. **مەعریفەی بورهانی بەڵگەیی:** مەبەست لێی ئەو مەعریفەیە كە بۆ گەیشتن پێی پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە یان بیرۆكە و ئەفكاری دیكە هەیە.

٣. **مەعریفەی هەستی:** ئەو مەعریفەیەیان پشت بە هەستەكان دەبەستێت.

هەربۆیە دەڵێت: مەعریفە بەخودی خۆمان مەعریفەیەكی حەدسییە، مەعریفە بە بوونی خودا مەعریفەیەكی بورهانی و بەڵگەییە، مەعریفە بەو شتانەی بە لای هەستكردنەوەن مەعریفەیەكی هەستییە.

لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت كە داننانی جۆن لۆک بە مەعریفەی حەدسی داننانە بە عەقڵ و تواناكانی بەڵام لە سنوورێكی دیاریكراودا، كەواتە جۆن لۆكیش بەتەواوی و بەڕەهایی ڕۆڵی عەقڵی بەلاوە نەناوە و بە جۆرێک لەجۆرەكان ڕۆڵی پێداوە، هەر ئەوەش بوو وای لە بێرتراند ڕاسل كرد پێی وابێت جۆن لۆك دژیەكی هەیە لە بیر و وتەكانیدا، چونكە سەرەتا هەموو مەعریفەیەک دەگەڕێنێتەوە بۆ هەستەكان، بەڵام دوایی دێت دان بە مەعریفەی حەدسی دادەنێت، كە دیارە ئەمە بەڕای ڕاسل دژیەكییەكی تەواوە.[1]

كەواتە هەستگەرایی جۆن لۆک لە هی ئەرستۆ خەست تر بوو، بەڵام هێشتا نەگەیشتووەتە لوتكە، دوایی لەسەر دەستی دێڤید هیۆمدا گەیشتە لوتكە و هەستگەراییيەكی ڕەها و تەواو هاتە كایەوە.

## قوتابخانەی ئەزمونگەرای هەستگەرا لەلای دێڤید هیۆم

دێڤید هیۆم (١٧٧٦ م) بە گرنگترین سمبول و ڕێبەری قوتابخانەی ئەزموونگەرای هەستگەرا دادەنرێت، چونكە ئەوەی فەیلەسووفە هەستگەراكانی

---

(١) تاریخ الفلسفة الغربیة، رسل، ل ١٨١.

پێش خۆی نەیان وت ئەو وتی، ئەو بۆشایی و کەلێنە غەیرە ئەزموونییە هەستگەراییە مابووەوە، لە سەردەمی جۆن لۆک ئەویشی پڕکردەوە، هەربۆیە قوتابخانەی هەستگەرای ئەزموونگەرا لەسەر دەستی هیۆم گەیشتە لوتکە و هەر بۆشاییەکی مێتافیزیکی مابێتەوە نەیهێشت و دایماڵی لە هەموو جۆرە مەعریفەیەکی ناهەستی و نائەزموونی.

بەڵگەی سەرەکیش لەلای هیۆم بریتییە لەوەی کە سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە ئەزموون و هەستەکانن، هەرکەسێک هەستەکان لەدەست بدات، ئەوە بەدڵنیاییەوە فکریش لەدەست دەدات و ناتوانێت وێنای شتەکان بکات.

ئەزموونگەرایی و هەستگەرایی هیۆم گەیشتە ڕادەیەک یاسا هۆکاری (السببية) ڕەتبکاتەوە، بەبەڵگەی ئەوەی ئەم یاسا هەستپێکراو نییە، بۆنموونە کاتێک دەبینی تۆپێک دەجووڵێت و بە تۆپێکی تر دەکەوێت و ئەویش دەجووڵێنێت، لەتێڕوانینی هیۆم ئەم ڕووداوە هەر ئەوەندەیە کە تۆپێک جووڵاوە و بەر تۆپێکی دیکە کەوتووە و جووڵاندوویەتی، کەواتە لێرەدا (بەتێڕوانینی هیۆم) هیچ شتێکی ئەزموونی هەستپێکراومان نەبینی بە ناوی هۆکارەکی (السببية) بەڵکوو تەنیا دوو جووڵە یەک لەدوای یەکەکەمان بینی، بەم پێیەی هیۆم یاسای هۆکارەکی تەنیا شتێکی زیهنییە و مێشک دروستی دەکات، ئەگەرنا لەواقیعدا هیچ بنەمایەکی نییە، چونکە ئەزموونکراوی هەستپێکراو نییە.

دوای هیۆم فەیلەسووفی نەمساوی «ئەرنست ماخ» (١٩١٦ م) هەمان ڕای هەبوو و یاسای هۆکارەکی ڕەتکردەوە، بە بەڵگەی ئەوەی لەژێر ئەزمووندا جێی نابێتەوە.

دوای ئەمانە «ئەنگلز» لە پەرتووکی «دژی دوهرنج» و «لینین» لە پەرتووکی «ماددیگەرایی و قوتابخانەی ئەزموونگەرای ڕەخنەیی» وەڵامی دانەوە.[1]

---

(١) الموسوعة الفلسفية، وضع لجنة من العلماء والأكادميين السوفياتيين، بإشراف روزنتال ويودين، ل ٤٢٧ _ ٤٢٨.

لە سەدەی بیست قوتابخانەی پۆزەتیڤزمی لۆژیکی «وەزعیەی مەنطیقی» هاتە مەیدان، کە درێژکراوەی ئەزموونگەرایی هیۆم بوو، یەکەم دەرکەوتنیشی لەسەر دەستی «موریتس شلیک ١٩٣٦ م»کە سەرپەرشتی کۆڕی ڤێنای کرد لەساڵی (١٩٢٩ م) لە دیارترین ئەندامەکانیشی «کارناب» (١٩٧٠ م) و «کۆرت گۆدل» (١٩٧٨ م)، ئەمانە بنەمای «هاتنەجێ» (تحقق) یان دانا، کە پوختەی ئەمەبوو: هەر بیرۆکە و وتە و ... نەتوانین بە ئەزموون و هەست بیسەلمێنین ئەوە شتێکی پڕوپووچە و هیچ ئیعتیبارێکی بۆ ناکرێت،.ئەوەی ماناداربێت، دەبێت بە ئەزموون بسەلمێنرێت، ئەگەرنا بوونی نییە.[1]

---

(١) مشكلات الفلسفة، ماهر عبد القادر محمد علي، ل ١١٢.

# ئاراستەی عەقڵگەرا

قوتابخانە و ئاراستەی عەقڵگەرا لەبارەی سەرچاوەی مەعریفە پێی وایە تاکە سەرچاوە بۆ مەعریفە و بەدەستهێنانی زانین بریتییە لە عەقڵ و بەس، دوور لە هەستەوەرەکان و ئەزموون و وەحی و ...، واتە عەقڵ بەتەنیا لە توانایدایە بگات بە مەعریفەی یەقینی.

ئاراستەی عەقڵگەرا دەڵێن خۆمان ڕادەستی هەستەکان ناکەین، چونکە هەستەکان زۆرجار فێڵمان لێدەکەن و نامان گەیەنن بە مەعریفەی یەقینی، ئەوەتا جاری وا هەیە قەڵەمێک لە ئاودا بە شکاوی دەبینی بەڵام کە لە ئاوەکە دەیهێنییە دەرەوە، دەبینی نەشکاوە، یان لە کەشێکی گەرمادا لە دوورەوە تراویلکەیەک دەبینی بەڵام وادەزانی ئاوە، کەلێی نزیک دەبییەوە دەبینیت هیچ ئاوێکی لێ نییە، یان تام کردن و بۆنکردن و ...، زۆرجار وەک خۆی شتەکەت پێناگەیەنن و دەتخەنە هەڵەوە ...، کەواتە بەم پێیە ناکرێت تەسلیمی هەستەوەرەکان بین و دەبێت تەواو تەواو بگەڕێینەوە بۆ عەقڵ.

بنەمایەکی گشتی قوتابخانەی عەقڵگەرا بریتییە لە زانینی پێشوەختە (المعرفة القبلية) واتە هەموو مرۆڤێک لە سروشت و فیترەت و زگماکی خۆیدا زانینی خۆی هەیە و هەندێک شتی گشتی دەزانێت، کە هیچیان لە ئەزموون و هەستەکانەوە بەدەست نەهاتوون. سەرەتاکانی ئەم ڕایە دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسووفی یۆنانی «ئەفلاتوون» کە هەمان ڕای هەبووە، ئەمەش وەک وەڵامێک بۆ سوفستائییەکان کە بڕوایان بە مەعریفەی یەقینی و سابیت و جێگیر نەبوو، بەڵام ئەفلاتوون بڕوای بەوەبوو کە هەموو مرۆڤێک زانینی پێشوەختەی هەیە و لە نەفس و فیترەتیدا چێنراوە. ئەفلاتوون بڕوای وایە زانین بیرکەوتنەوەیە و

نەزانین لەبیرچوونەوەیە، چونکە مرۆڤ پێش لەدایکبوونی لە جیهانی ئایدیاکان (عالم المثل)دا ژیاوە. ئەم جیهانەش جیهانێکی حەقیقی و ڕاستەقینەیە، لەوێدا هەموو ڕاستییەکانی بە چاوی خۆی بینیوە، پاشان مرۆڤ دابەزیوەتە جیهانی ماددە و کە جیهانێکی خەیاڵی و ناحەقیقییە و شوێنکەوتەی جیهانی ئایدیاکانە. بەلەدایکبوونی لەگەڵ جەستەدا یەکی گرتووە و ڕاستییەکانی بیرچووەتەوە، کەواتە ئەو زانینە فیتری و زگماکییە ئێستا بیرکەوتنەوەی جیهانی ئایدیاکانە کە جیهانێکی حەقیقی و ڕاستەقینەیە.

لەبەرانبەر ئاراستەی فیتریدا ئاراستەی ئیکتیسابی هەیە، واتە زانین و مەعریفە شتێکی بەدەستهاتووە نەک پێشوەختە و فیتری و بەدیهی، ئەمەش لە سەردەمی یۆناندا ئەرستۆ ڕێبەرایەتی کردووە.

کەواتە ئاراستەی فیتری ئەفلاتوون ڕێبەڕایەتی کردووە لە سەردەمی یۆناندا.

ئاراستەی ئیکتیسابی و بەدەستهاتوو و ئەزموونی و هەستەوەری ئەرستۆ ڕێبەڕایەتی کردووە.

دواتر زانایانی ئیسلام و فەیلەسووفان لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا هەمان ڕایان هەبووە کە مەعریفە بەشێکی فیترییە، چونکە پێیان وابوو ناسینی خودا و بنەما گشتییە ئەخلاقییەکان فیتری و زگماکین، کەواتە ئەوەش ڕێک ئەو زانینە پێشوەختەیە کە ئەفلاتوون و فەیلووسەفە عەقڵانییەکان باوەڕیان پێی بوو، لە فەیلەسووفە موسڵمانەکان کە بە زەقی باسیان کردووە ئیمامی غەزالی و ئیبن سینا، غەیری ئەمانیش هەن، بەڵام لەناو مەیدانە فەلسەفییەکەدا ئەوان زەقن لەو باسەدا.

لەبەرانبەر ئاراستەی فیتریدا ئاراستەی ئیکتیسابیشمان هەیە کە ئیخوان سەفایە، ئەوانیش وەک ئەرستۆ پێیان وایە مەعریفە ئیکتیسابییە و لە ئەزموون و هەستەکانەوە بەدەست دێت.

دواتر لەسەردەمی نوێدا دیکارت هاتوو وەک ڕێبەری قوتابخانەی عەقڵانییەت لە سەردەمی نوێدا

هەمان ڕای خستەڕوو، چونکە ئەمیش وەک ئەفلاتوون ڕێبەری وەڵامگۆی گومانگەراکان بوو، هەمان ڕاشی هەبوو دەربارەی بوونی خودا و پێی وابوو فیترییە و چێنراوە لە ناخیدا وەک لە باسەکانی پێشوودا باسمان کرد.

## رێنێ دیکارت (١٥٩٦-١٦٥٠ ز)

فەیلەسووفێکی فەڕەنسییە بە باوکی فەلسەفەی نوێ ناسراوە، دیکارت بە دامەزرێنەری قوتابخانەی عەقڵگەرا نوێ دادەنرێت، چونکە عەقڵی کردە سەرەچاوەی یەکەم و سەرەکی.

گرنگترین بابەتی فەلسەفی کە دیکارتی پێ دەناسرێتەوە بریتییە لە بابەتی گومان و گومانی میتۆدی مەنهەجی، چونکە دیکارت لەگومانە دەستی پێکرد بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و یەقین.

دیکارت سەرەتا گومانی لەخۆی کرد، وتی: تا گومان بکەم بیردەکردنەوەم زیاد دەکەم، لەوێوە یەقینم بە بوونم زیاد دەبێت.

من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم.

بۆ هەموو گومانێک گومانبەرێک هەیە.

گومانبردن بیرکردنەوەیە، بیرکردنەوە پێویستی بە کەسێک هەیە بەبیرکردنەوەکە هەستابێت.

**بنەمای ئەفکار و بیرکردنەوەکان لەلای دیکارت سێ جۆرە:**

**١. ئەفکارە ناڕوونەکان (أفكار غامضة)**

ئەفکارە ناڕوونەکان (أفكار غامضة) بریتین لەو ئەفکارانەی کە لە مەوجود و شتە دەرەکییە ماددییەکان و هەستەوەرەکانەوە بەدەست دێن، بۆنموونە ڕەنگ و دەنگ و ساردی و گەرمی و ...، ئەم جۆرە ئەفکار و بیرانە جێی متمانە و ئیعتیبار نیین، چونکە سەرچاوەکەیان هەستەکانن و هەستەکانیش زۆرجار هەڵە دەکەن و بەهەڵەماندا دەبەن، کەواتە ناکرێت وەک سەرچاوەی مەعریفە و زانین سەیریان بکەین.

**٢. ئەفکارە داهێنراوەکان (أفكار مختلقة)**

ئەفکارە داهێنراوەکان (أفكار مختلقة) ئەو ئەفکار و بیرانەن کە خەیاڵ دروستیان دەکەن، بۆنموونە بزنێکی باڵدار، دەریایەک جیوە، یان ...، ئەم جۆرە ئەفکار و بیرانەش هیچ بەهایەکیان نییە، چونکە لەبنەڕەتەوە بوونیان نییە.

**٣. ئەفکاری فیتری و زگماکی (أفكار فطرية)**

ئەفکاری فیتری و زگماکی (أفكار فطرية) بریتین لەو ئەفکارانەی کە بەدیهی و زگماکی و پێشوەختەن و لە هەستەکان و هەستەوەرەکان و مادده و ئەزموونەوە بەدەست نەهاتوون. ئەم ئەفکارانە لای دیکارت ئەفکاری ڕوون و بێ گرێ و گۆڵن، چونکە سەرچاوەکەیان خودایە و خودا چاندوونی لە ناخی مرۆڤدا و قابیلی فێڵ و هەڵخەتاندن نین، چونکە خودا پاکە لەو شتانە کەواتە ئەوەی لەویشەوە سەرچاوەی گرتبێت هەر وایە.[1]

دوای دیکارت هەریەک لە سپینوزا (١٦٧٧م) و مالبرانش (١٧١٥م) و لایبنیتز (١٧١٦م) هەمان ڕایان هەبوو.

---

(١) التأملات في الفلسفة الأولى، ديكارت، لا ١٣٧ _ ١٣٨.

دیکارت چونکە زانایەکی بیرکاری بوو بۆیە هات زانستی بیرکاری بەکارهێنا بۆ بابەتە فەلسەفییەکان، بۆیە لە کتێبی «وتارێک دەربارەی میتۆد» باسی «چوار ڕێسای میتۆد»ی کرد.

**دەقی چوار یاساکە:**

١. شتێک وەرنەگرم و بە حەقی نەبینم گەر بە یەقین نەزانم حەقە، بەو مانایەی خۆم لە سەرکەشی و پەلەکاری و پێشینە بڕیار بەدووربگرم و تەنیا ئەو شتانە بخەمە ناو بڕیارمەوە کە بە ڕۆشنی لەبەر عەقڵم بەرجەستە دەبن، بە جۆرێک هیچ بوارێک بۆ گومان نەمێنێتەوە.

ئەمە پێی دەوترێت یاسای یەقین.

٢. بەپێی توانا هەر یەک لەو کێشانەی ئەزموونیان دەکەم (تاقیاندەکەمەوە) دابەش دەکەم بۆ چەند بەشێک بەپێی ئەو بڕەی پێویستی هەیە بۆ چارەسەر و شیکار.

ئەمە پێی دەوترێت یاسای شیکردنەوە.

٣. بیرم بەڕێکی و ڕێکخراوی بەڕێوە ببەم لە ئاسانترین و سادەترین شتەوە -لە ڕووی مەعریفییەوە- دەست پێ بکەم بۆ ئەوەی کەم کەم بەرز ببمەوە تا دەگەمە مەعریفەیەکی زیاتر و زۆرتر ڕێکخراو، بەڵکوو شتەکان (مەعریفەکان) بە جۆرێک ڕێکبخەم هەندێکی پێش هەندێکی نەکەوێت، بەڵکوو هەریەکەیان لەجێگەی خۆیدا سەرنج بدرێت.

ئەمە پێی دەوترێت یاسای پێکهێنان یان ڕێکخستن.

٤. لە هەموو بارەکاندا ئامار و پێداچوونەوەی گشتگیر بکەم تاکوو متمانەم هەبێت شتێکم لە یاد نەکردووە.

ئەمەش پێی دەوترێت یاسای پێداچوونەوە و خوێندنەوەی تێر و تەواو.

کەواتە پوختەی چوار یاساکە بریتییە لە «یەقین، شیکردنەوە، لێکدان، پێداچوونەوە».

کەواتە دیکارت هەمان میتۆدی بیرکاری بەکارهێنا بۆ گەیشتن بە یەقین.

دیکارت دوای سەلماندنی بوونی خۆی لە ڕێگەی "من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم" بوونی خودا و جیهان و نەمری نەفس لە "من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم" هەڵدێنجێت و دەردەهێنێت، میتۆدی دیکارت میتۆدێکی نوێ بوو، بە هۆی ئەم میتۆدەوە بوو دیکارت ئەوەندە ناسرا، میتۆدەکەی لەسەر دوو کۆڵەکە ڕاوەستاوە:

١. **پێشهەست (البداهة)**، واتە ئەو وێناکردنەی لە ڕۆشنایی عەقڵێکی پەتی و ڕووت نەفسێکی تەندروست لەدایک دەبێت.

٢. **هەڵێنجان و دەرهێنان و ئەنجامگیری**، واتە کردەی عەقڵی کە لە بیری پێشهەستەوە دەمانگوزێتەوە بۆ ئەنجامێکی دیکە کە بە زەرورەت لێیەوە سەر هەڵدەدات.

بەکورتی دیکارت لە کۆتایی گەشتە گومانگەراییەکەیدا خۆیی، خودا، بوون، گەردوون و نەفس (ڕۆح) دەسەلمێنێت، گەشتەکە لە گومانەوە _لە مانە_ دەستیپێکرد و بە سەلماندنی ئەوانە کۆتایی پێهێنا.

دیکارت وەک زۆرێک لە فەلەسوفان دیکە زۆر ڕقی هەستابوو لە دۆخی فەلسەفە و زانست لە سەدەمی خۆی، بۆیە بە بۆچوونی ئەو تەنیا توێژینەوەیەک کە لەسەر بناغەیەکی پتەو دامەزرابێت بریتییە لە بیرکاری.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە میتۆدی بەکارهێنراو لە بیرکاریدا میتۆدێکی بەستراوەیە بە فکر و هزرە ڕوون و ئاشکرا و بەڵگەنەویستەکان، لەوێوە دەست

پێدەکات بە ڕێگەیەکی بەڵگەهێناوەیی هەڵێنجانی دەڕواتە پێشەوە تا دەگاتە بەرئەنجامگەلێک کە شیاوی گومان نیین، هەر لەم سۆنگەیەوە بوو کە بیرکاری بەکارهێنا بۆ پرسە فەلسەفییەکان.

دیکارت لە بابەتی بوونی خودادا شوێن پاساوەکانی ژمارەیەک لە فەیلەسووفە قوتابخانەییەکان کەوت، لە نموونە: «ئەنسلیم» و «کامبانێلا»، بە پشت بەستن بە کامڵی خودا، لەوێشەوە باوەڕی کرد بە جیهانی بەرهەست، چونکە بوونەکەی ڕوون و ئاشکرا دەردەکەوێت، پێی وابوو تەنیا دروستکراوی خودایە و لەژێر دەستی ئەویشدایە، پێی وابوو ئەم جیهانە پێکهێنەرەکانی تەنیا دوو جۆرن: جەستەکان و عەقڵەکان، بۆیە پێی وابوو کۆبوونەوەی جەستە و ڕۆح لە مرۆڤدا موعجیزەیە، کە دروستکراوەکان لێی بێبەشن.

عەقڵ تایبەتمەندی خۆی هەیە کە هزرەکان بەرهەم دێنێت، عەقڵ ڕەنگ و شوێن و قەبارە نییە، بەپێچەوانەی مادده و جیهانی دەرەکی و خاریجی کە ئەوانەی هەن.

## گومانی میتۆدی (الشک المنهجی)

گومانی میتۆدی یان زانستی ئەو گومانەیە کە مرۆڤ خۆی دروستی دەکات بۆ پاڵفتەکردن و گوڵبژێرکردن و هەڵبژاردنی ئەو زانیارانەی لایەتی، کەواتە گومانێکی دوستکراوە بە مەبەستی گەیشتن بە حەقیقەت و ڕاستی و یەقین، کەواتە گومانێکی ئەرێنی و بنیاتنەرە و نەرێنی ڕووخێنەر نییە، چونکە ئەم گومانە کاتییە و مرۆڤ خۆی دروستی دەکات بەمەستی گەیشتن بە مەعریفەیەکی یەقینی و ڕاستگۆیانە و زانستی و خۆخاڵی کردن لە هەموو مەعریفە و زانیارییەکی نادروست و نایەقینی و گوماناوی.

سەرەتای ئەم جۆرە گومانە بەشێوەیەکی ناسەربەخۆ و بەئەندازەیەکی کەم لە سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆوە هاتووە، واتە ئەمان بەجۆرێک لە جۆرەکان پەیوەندییەکیان دروستکردووە لەنێوان گومان و یەقین و مەعریفەدا، بەڵام وەک میتۆد و مەنهەجی مەعریفی دیار و سەربەخۆ نەیان وتووە، تاوەکوو قەشە ئۆگستین هات و سێ ساڵ گومانی بەکارهێنا بۆ گەیشتن بە یەقین، ئەوەش دوای ئەوەی خوێندنەوەی بۆ پەرتووکی (المقالات الاكادمية) ی شیشرۆن (٤٣ م) کرد، لە بەناوبانگترین بیرمەند و فەیلەسووفان لە جیهان و شارستانییەت و فکری ئیسلامیدا کە بە دامەزرێنەری حەقیقی گومانی میتۆدی دادەنرێت بریتییە لە ئیمامی غەزالیکە گومانی بەکارهێنا بۆ گەیشتن بە مەعریفەی یەقینی (هەرچەندە هەندێک دەڵێن گومانەکەی ئەو بە دەستی خۆی نەبووە لائیرادی بووە و بۆی پەیدابووە، بەڵام هەرچۆنێک بێت هەر بە دامەزرێنەری دادەنرێت) ئیمامی غەزالی سەرەتا گومانی لە هەستەکان پەیدابوو، پاشان گومانی لە عەقڵیش پەیدابوو، تا وای لێهات سیقە و یەقینی بەهیچ شتێک نەما، بەڵام دواتر وەک خۆی دەڵێت: "خودا شیفای بۆ ناردم و نوورێکی خستە دڵمەوە و ڕزگارم بوو لەم گێژاوە و یەقینم پەیدابوویەوە لەبەرانبەر شتە بەدیهی و زەرووریيە عەقڵییەکان (الضرورات العقلية)، ئەمەش هەمووی نوورێکی خوایی بوو و منی ڕزگار کرد".[1]

ئەمە لەسەردەمانی پێشووی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی، بەڵام لەسەردەمی نوێدا فەیلەسووفی بەناوبانگی فەڕەنسی «دیکارت» (١٦٥٠م) بە دامەزرێنەری گومانی میتۆدی دادەنرێت، دیکارت ویستی فەلسەفەکەی لەسەر بنەمایەکی یەقین و پتەو بنیات بنێت، بۆیە گومانی بەبەهێزترین هۆکاری یەقین زانی و لە گومانەوە دەستی پێکرد بۆ گەیشتن بە مەعریفەیەکی یەقینی. لە سەردەمی دیکارتدا شکگەراکان زۆر بەهێزبوون بە سەرکردایەتی «مێشێل مۆنتانی» (١٥٩٢

---

(١) المنقذ من الضلال، الغزالی، ١١٣.

م)، هەربۆیە دیکارت ویستی بە هەمان ڕێچکەی ئەوان وەڵامیان بداتەوە، بۆیە سەرەتا گومانی کرد لەو مەعیفەیەی کە لە منداڵیدا وەریگرتووە و بە بەدیهی زانیوە، پاشان هەستەکانی ڕەتکردنەوە و وەک سەرچاوەی مەعریفە هەژماری نەکردن چونکە دەیوت هەندێک جار هەستەکان فێڵمان لێدەکەن، هەرشتێکیش یەک جار فێڵی کرد، زۆر نزیکە هەموو جارانی تریش فێڵ بکات، پاشان گومانی لە عەقڵ و خەیاڵیش کرد، هەر بەوە نەوەستا و گەیشت بەوەی کە گومانی لە خودی خۆیشی کرد. لەدوای ئەو هەموو گومانە یەک لەدوای یەکانە، دیکارت هەست دەکات خۆی جۆرێک لە بیرکردنەوە و تێڕامان پەیڕەو دەکات، بۆیە دەڵێت: "من گومان دەکەم کەوایە من جۆرێک لە بیرکردنەوە و تێڕامان دەکەم"، کەوایە خودی گومان کردنەکە بەڵگەیە لەسەر بیرکردنەوە و بوونی خۆم، نەک هەر ئەوە بەڵکوو ئەگەر گومان لە گومانەکەشم بکەم هەر بەڵگەیە لەسەر بیرکردنەوە، دوایی گەیشتە وتە بەناوبانگەکەی کە دەڵێت: "من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم."[١]

کەواتە «دیکارت» لە گومانەوە دەستپێیدەکات بۆ گەیشتن بە یەقین، گومان لەخۆی ئینجا لە هەموو شتەکانی تر، دواییش سەلماندنی بوونی خۆیی و خودا و بوون و گەردوون و حەقیقەت و مەعریفە.

**دیکارت لەم گەشتەیدا بەسێ قۆناغدا تێپەڕی:**

**قۆناغی گومان:**

لەم قۆناغەدا گومانی لە هەستەکان و عەقڵ دەکرد و پێی وابوو هەردووکیان زۆرجار فریوت دەدەن و فێڵت لێدەکەن و بەرەو ڕاستی و یەقینت نابەن،

---

(١) دکتۆر عەلی حسێن جابری لەکتێبەکەیدا (دروس فی الفكر الفلسفی الاسلامی) لەلاپەڕە(١٠٠) دا دەڵێت: (ئەم وتەیەی دیکارت: أنا أفكر إذن أنا موجود) لەهزری (ئیبن سینا) باس و خواسەکانی وەرگیراوە.

کەواتە ئەو گومانی لەپێناو گوماندا نەبوو، بەڵکوو گومانی لەپێناو گەیشتن بوو بە حەقیقەت و مەعریفەی یەقینی، چونکە لەم سەردەمەی ئەویشدا گومانگەراکان و پیاوانی ئایینی و دەستەڵاتی ئایینی و کەنیسە دژی عەقڵ و زانست و بیرکرنەوە دەوەستانەوە و ڕێگر بوون لە بیرکردنەوە و زانست و مەعریفە!

### قۆناغی بیرکردنەوە و لێکجیاکردنەوە:

وەک باسمان کرد دیکارت وتی: من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم، کەواتە قۆناغی وەستان لە گومانی جێهێشت و گومانی کردە بەڵگە لەسەر بیرکردنەوە و بیرکردنەوەشی کردە بەڵگە لەسەر بوونی و دوایی گەیشت بە بوونی خویی و خودا و بوون و گەردوون.

دیکارت لەم قۆناغەیدا جیاکاری و لێکجیاکردنەوەی بەکارهێنا، واتە جیاکردنەوە مەعریفە و زانیارییەکان، بۆیە لە نامەیەکیدا بۆ هاوڕێکەی «میلاند» دەڵێت: "ئەگەر سەبەتە سێوێکت لابوو، هەندێکیان بۆگەن و هەندێکیان ساغ بوون، بۆگەنەکان ساغەکانیشیان بۆگەن کرد، چی دەکەیت بۆئەوەی سێوە بۆگەنەکان فڕێ بدەیت و ساغەکان بهێڵیەوە؟ هیچ ڕێگەیەت نییە غەیری بەتاڵ کردنی سەبەتەکە لە هەموو سێوەکان و پاشان پشکنینی دانە دانەی سێوەکان، تاوەکوو ئەوەی ساغە بیخەیە ناو سەبەتەکە و ئەوەشی بۆگەن و ڕزیو و خراپە فڕێی بدەی. کەواتە دیکارت لەم ڕێیەوە (گومان و پاڵفتە کردن) دەیەوێت بگات بە مەعریفەی یەقینی."

### قۆناغی گرەنتی خودایی:

قۆناغی گرەنتی خودایی واتە ئەو مەعریفەیەی خودا لە دەروونی هەموو مرۆڤێکیدا چاندووە، واتە ئەو فیترەتە پاکەی خودا هەموو مرۆڤەکانی لەسەر

دروستکردووە، دیکارت لە وتەکانیدا بە ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات کە نووری خوایی و خوداناسی بەرەو خودناسی و مەعریفەناسیت دەبات..

## دیکارت و بوونی خودا

بەڵگەی دیکارت لەسەر بوونی خودا پێشووتریش بوونی هەبووە کە بە بەڵگەی داواکردنی بەرزیی و ڕێگای تەواوکردن (استکمال) یاخود بە ڕێگای نموونەی هەرە بەرز (المثل الأعلى) ناو دەبرێت، قەشە «ئەنسلیم» لە وێنەی یەکەمیدا دایڕشتووە، سەرچاوەیگرتووەلە بنەمایەک کە دانی پێدانراوە لەلایەن باوەڕدار و بێ باوەڕەوە، ئەویش بریتییە لەوەی کە هزر و بیرۆکەی خودا لە ناو عەقڵدا بوونی هەیە، هەتا خودانەناسانیش نکووڵی لە پێشبینیکردن و ئەندێشەکردنی خودا ناکەن، بەڵکوو نکووڵی لە بوونی خودا دەکەن.

ئەوانەی دوای قەشە «ئەنسیلم» هاتن ئەو بەڵگەیەیان بە جوانی تۆکمە کرد، تا وایلێهات تەواو کامڵ بوو لە ناو چوارچێوەی فەلسەفەی دیکارتدا، بۆیە وایلێهات ئەو بەڵگەیە بدرێتە پاڵ دیکارتجا ناوەڕۆکی ئەو بەڵگەیە بەم شێوەیەیە:

عەقڵیمرۆڤ هەر کە ئەندێشەی شتێکی گەورە بکات، ئەوا ئەندێشەی شتێکی گەورەتر لەو دەکات، چونکە وەستان لە پلەیەک کە بێتوانایی و دەستەوەسانی تێدا بێت پێویستی بە هۆ هەیە، عەقڵی مرۆڤیش هۆی بێتوانایی و دەستەوەسانییەکە نازانێت، چونکە هەر شتێکی تەواو و کامڵ هەبێت ئەوا عەقڵیی مرۆڤ هەوڵی گەیشتن دەدات بە شتێک لەو تەواوتر و کامڵتر، تا دەگاتە کۆتایی کۆتاییەکان، کە ئامانج و مەبەستی کامڵبوونی ڕەهایە کە نە زیاد و نە کەم دەبێت، ئەو بوونە کامڵە ڕەهایە بە بێ چەند و چوون هەیە، چونکە وێناکردنی بە عەقڵ و ئەندێشەکردنی کەمترە لە بوونە ڕاستەقینەکەی، چونکە لە ڕاستیدا بوونی هەیە، لەبەرئەوە سیفەتی کامڵی ڕەهای لێ دەستێنرێتەوە، بەهۆی نەبوونی بوونەکەی، بەو هۆیە نابێتە خاوەنی هیچ پلەیەکی کامڵ و

تەواو، بەڵکوو تەنیا کەموکورتی ڕەها دەمنێتەوە کە کامڵی نییە، جا تەنیا وێنە و ئەندێشەکردنی ئەو کامڵە بەڵگەی بوونەکەیەتی.[1]

«ڕینێ دیکارت» خودی خۆی دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودا، واتا: پەنا ناباتە بەر دەرەوەی خۆیی و گەردوون (بەشێوەیەکی گشتی)، بەڵکوو خۆی دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودا، چونکە دەڵێت: من ئەو هەموو کەموکورییەم هەیە، بەردەوام هەست بەو کەموکورییەی خۆم دەکەم، بەڵام لە هەمان کاتدا هەست بە زاتێکی زۆر گەورە و کامڵ دەکەم، کە دیارە ئەو هەستکردنە لە خۆوە نییە، بەڵکوو دەبێت هێزێکی دەرەکی لە دەرەوەی خودی خۆم ئەو هەستەی لەنێو مندا ڕواندبێت و چەسپاندبێتی، ئەگەرنا ئەو هەستە چۆن لە خۆوە دروستدەبێت؟ کەواتا ئەو زاتە کامڵ و تەواوە بریتییە لە خودای گەورە، ئەو زاتە تەواوە ئەو هەستەی لای من دروستکردووە کە هەست بە زاتی کامڵ و تەواویی ئەو بکەم.

دیکارت دەڵێت: لەگەڵ ئەوەی بیرۆکەیەک بیرۆکەیەکی دیکە دێنێتە بوون، بەڵام ئەمە ناکرێت تا کۆتایی (إلى ما لا نهاية) بەردەوام بێت، بەڵکوو دەبێت لەشوێنێک بوەستێت کە تەواوی ڕەهایە (الكمال المطلق). نووری زگماکی و فیتری ڕێنموونیم دەکەن بۆ ئەوەی بە زانینێکی بەڵگەنەویست (مەعریفەی بەدیهی) بگەم بەوەی کە ئەفکار و هزر و بیرۆکەکان لە ناخی خۆمدا وەک چەند تابلۆ و وێنەیەک وان، بەڵام لەکۆتاییدا کورتهەڵاتوون لە وێناکردنی کەمال و

---

(1) st. Anselm proslogium، Monologium، an appendex in behalf of the fool By Gaunilon، P: .7Translated from Latin by Sidney Norton Dean، Edition 1910 .2، Chicago.

Yandell، Keith، God، Man and Religon - readings in the philosophy of religion McGrtaw - Hill Book Company، 1978، p: 397.

الله، عباس محمود العقاد، ل ٢٠٠. ودراسات في الفرق، دراسات في الفرق والعقائد الإسلامية، د. عرفان عبد الحميد، ل ١٨٦.

تەواوی ئەو شتانەی کە لێیانەوە سەرچاوەیان گرتووە و لێیانەوە ڕەنگیانداوەتەوە، بەڵام بەهیچ جۆرێک ناتوانرێت شتێک گەورەتر و تەواوتر لە خۆیان لەخۆبگرن[١].

کەواتە بەم پێیە دیکارت پێیوایە مرۆڤ بێتوانایە لە داهێنانی ئەم بیرۆکە و فکرەیە، هەر بۆیە بە نووری زگماکی (النور الفطری) ناوی دەبات، کەواتە بەهیچ جۆرێک لە خودی مرۆڤ خۆیەوە نییە، بەڵکوو لە سەرچاوەیەکی دەرەکییەوەیە کە خودایە.[٢]

لە دواتردا دیکارت دەڵێت: کەواتە هیچ شتێک نەمایەوە غەیری بیرۆکەی خودا، مەبەستم لە خودا جەوهەرێکی بێکۆتای ئەزەلی پاکە لە گۆڕان، کە خودی خۆی ڕاوەستاوە بێ پێویستی بۆ دەرەوەی خۆی، دەورەی هەموو شتێکیشی داوە و هیچ شتێک لەژێر دەستەڵاتی دەرناچێت، بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا، من و هەموو شتێکی دروستکردووە[٣].

کەواتە (دیکارت) خودی خۆیی و خودی خودا دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودا، وە پەنا ناباتە بەر دەرەوەی زاتی خودا (بەشێوەیەکی گشتی) بۆ سەلماندنی خودی خودا.

## جیاوازی نێوان گومانی مەزهەبی و گومانی مەنهەجی

لە بەشی (تیۆری مەعریفە) دا باسمانکرد.

---

(١) تأملات فی الفلسفة الأولی، ترجمة وتقديم وتعليق: عثمان أمين، ل ١٤٨.
(٢) تأملات فی الفلسفة الأولی، ترجمة وتقديم وتعليق: عثمان أمين، ل ١٤٨.
(٣) تأملات فی الفلسفة الأولی، ترجمة وتقديم وتعليق: عثمان أمين، ل ١٤٨.

## فەیلەسووفی هۆڵەندی باروخ دی سپینۆزا (Barouch de Spinoza ١٦٣٢ _ ١٦٧٧ ز)

سپینۆزا یەکێک لە ڕێبەرانی عەقڵگەراییە، کە بەهۆیەوە بەرەنگاری بیری «ڕێبازی ڕێزلێنانی دەقەکان» بووەتەوە، لە چاخەکانی ناوەڕاستدا باڵی کێشابوو بەسەر ئەورووپادا، سپینۆزا جەختی لەسەربەخۆیی عەقڵ دەکردەوە و دژی هەموو دەستەڵاتێک بوو لەسەرووی عەقڵەوە، پێی وابوو هەموو شتێک هەتا کتێبە پیرۆزەکانیش دەبێت بخرێنە ژێر تاقیکردنەوە و پشکنین و ساغکردنەوە (الامتحان والفحص والتحقق).

سپینۆزا یەکێ لەو عەقڵانیانە بوو کە پێبوابوو سەرچاوەی سەرەکی زانین و مەعریفە بریتییە لە عەقڵ نەک هەستەکان، بۆیە پێویستە فەلسەفە لەسەر بەدیهیات و بەڵگەنەویست و هەڵێنجان بنیاتبنرێت، نەک ئەزموون و هەست، چونکە ئەو مەعریفەیەی لە ڕێگەی هەستەکانەوە دێت، مەعریفەیەکە بە هیچ جۆرێک جێی متمانەی تەواو نییە و یەقین نادات بەدەستەوە. پێی وابوو دەبێ فەلسەفە لەسەر یاسا و ڕێسای پتەو بنیان بنرێت، وەک یاساکانی هەندەسە و بیرکاری، بۆیە ئەویش وەک دیکارت فەلسەفەی لەسەر بیرکاری و جەبر و هەندەسە بنیاتنا. بۆیە سپینۆزا لە شتە بەڵگەنەویستەکانەوە دەستی پێدەکرد، ئەو شتانەی کە بۆ سەلماندنیان پێویستین بە بەڵگە هێنانەوە نییە.

سپینۆزا سەربە گرووپی ئایینی جوولەکەی ئەمیستردام بووە، بەڵام لەپەرستگا دەریانکردووە و سووکایەتیان پێ کردووە و هەوڵیانداوە بیکوژن، ناوبراو ڕەخنەی گرتووە لە ئایینەکان و وتویەتی: جگە لە ڕووپۆشێکی دەرەکی و بڕوایەکی وشک هیچی تر نین، سپینۆزا لە ڕوانگەی «ڕەخنەی مێژووییبیەوە» یەکەم فەیلەسووف بووە لە ئایینەکانی ڕوانیوە و نکۆڵی لەوە کردووە کە نووسراوە ئاسمانییەکان سەراپایان لەلایەن خواوەندەوە هاتبن، جۆرە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی لە ناتەبایی نێوان نووسراوە جیاوازەکانی ڕوونکردووەتەوە، ئەم کارەی

بووە بە هۆی گۆشەگیرکردنی و هەموو ژیانی بۆ فەلسەفە تەرخانکردووە، بژێوی ژیانی بە دروستکردنی شوشە زەرەبینی چاویلکە دابینکردووە، بە هەمان شێوە فەلسەفەکەشی بریتبووە لەوەی خەڵک بە شێوەیەکی ورد و نوێ بڕواننە شتەکانی دەوروبەریان، وا هەست بکەن کە بەشێکی بچکۆلەی هەموو ژیانی سروشتن و سەر بە شتێکی یەگجار گەورەن.

لە فەلسەفەکەیدا «میتۆدی ئەندازە»ی بەکارهێناوە و بەهۆیەوە ویستوویەتی یاساکانی سروشت نیشانبدات، بڕوای بە یەک مادده هەبووە، بوونی هەموو شتێکی گەڕاندووەتەوە بۆ یەک شت، بەو شتەی وتووە «مادە ڕەسەنەکە» یان «خودا» یان «سروشت» ناویبرووە، بە لای سپینۆزاوە تەنانەت شتە ڕۆحانییەکانیش «خودا» بە شێوەی «بیرکرنەوە، ڕۆح» یان بە شێوەی «درێژبووەوە، مادده» خۆی دەردەخات، لەوانەشە خودا خاوەنی تایبەتمەندی بێپایانیش بێت، بەڵام مرۆڤـەکان تەنیا ئەو تایبەتمەندییە دەناسن. بەبڕوای ئەو مادده درێژبووەوەی ڕۆحە بەڵام لە ڕەچەڵەکدا هەردووکیان دەربڕینێکی خودان، تێڕوانەکەی لەم ڕووەوە پێچەوانەی دیکارت بوو، چونکە دیکارت دەیگوت دوو جەوهەرمان هەیە: عەقڵ و مادده، هەردووکیشیان سەربەخۆن، بەڵام سپینۆزا پێی وابوو یەک جەوهەر هەیە ئەو جەوهەرەش بێکۆتا و بێسنوورە، ئەو جەوهەرە خودایە، هەموو ئەو شتانەی لە دەوروبەرمان دەیان بینین لە شێوەی جیاوازدا. بۆنموونە ئاژەڵ و مرۆڤ و خانوو و ...، هەموو ئەم وێنانە تەنیا شەپۆلێکن لەناو کات و شوێندا، هەموویان لە جەوهەری بێکۆتا سەرچاوەیان گرتووە کە خودایە، واتە گەردوون خودایە و خوداش گەردوونە، هەموو شتێک خودایە و خوداش هەموو شتێکە، واتە بڕوای بە یەکانەیی و یەکیێتی بوون، (وحدة الوجود) بووە[1]. هەر بۆیە دەڵێت: "ناکرێت لە سروشتدا دوو یان زیاتر

---

(١) سبينوزا: رسالة في اللاهوت والسياسة، ترجمة: د. حسن حنفي، مراجعة: د. فؤاد زكريا.
قصة الفلسفة الحديثة، د. أحمد أمين وزميله، ل ١٠١.
تاريخ الفلسفة الحديثة، يوسف كرم، ل ١٨٠.الفلسفة .=

لە جەوهەر بوونی هەبێت، واتە هەمان خەسڵەت و تایبەتمەندییان هەبێت."[1] لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت: "لە خودا بەولاوە ناکرێت جەوهەرێکی دیکە بوونی هەبێت و پەی پێ ببرێت."(٢) لەم دەقانەی سپینۆزا و دەقەکانی دیکەی بەڕوونی ئەوە دەردەکەوێت کە: خودا و سروشت و جەوهەر یەک شتن. بۆیە «سروشتی داهێنەر» (natura naturans) خۆی لەخۆیدا بۆخۆی هەیە و هەموو تایبەتمەندیی و خەسڵەتێکی هەرە کۆنی بێسنووری لە ڕادەبەدەری هەیە، ئەو خۆی هۆکاری هەموو شتێکە و هۆکاری خۆشیەتی، هەر بەهۆی خۆیەوە دەناسرێت و پەی پێدەبرێت، جەوهەر و داهێنەرە و بەرهەمهێنەرە و خودا خۆیەتی. سروشتی داهێنراو (natura naturta) لە سروشتی داهێنراو و بەرهەمهێنرا بەولاوە نییە کە بە ناچاری لە سروشتی خوداوە پەیدابووە و کەوتووەتەوە[3] و تایبەتمەندی و خەسڵەتی خودایە، ئەگەر وەک شمەک و شتیش سەرنج بدرێت، لە دەرەوەی خوداوە نییە و بەبێ خودا ناکرێت و ناشێت هەبێت و پەی پێ ببرێت و بناسرێت و بزانرێت. کەواتە بەم پێیە لە بووندا یەک تاکە جەوهەر هەیە و بەس، ئەم جەوهەرە خەسڵەت و تایبەتمەندی دیاری هەیە، لەلایەکەوە خودای داهێنەرە، لەلایەکەی دیکەوە سروشتی داهێنراوە! کەواتە ئەگەر خودا لەسۆنگەی خەسڵەتە بێسنوورە بێکۆتاییەکانییەوە سەرنج بدرێت، کاریگەرە و داهێنەرە «natura naturans»، ئەگەریش سەرنجی ڕەوشە دیار و بەرچاوەکانی بدرێت، سروشتی داهێنراو دەبێت «natura naturta».

---

الفلسفة الحديثة، د. كريم متي، ل ١٠٢.

(1) Spinoza Ethik. Lehrasatz. 5. S. 8.

(2) Spinoza. Def. I

(3) Spinoza. Lehrsataz. 29. S. 34.

بۆ هەمووی بگەڕێوەبۆ: فەلسەی نوێ لەئەوروپا، د. حەمید عزیز، ل ١١٤.

## گۆتفریت ڤۆن ڤیلهێلم لایبنیتس (١٦٤٦- ١٧١٦)

فەیلەسووف، بیرکاریزان ، فیزیکزانی ئاڵمانی بوو کە ڕۆڵێکی بەرچاوی بوو لە سیاسەتی سەردەمی خۆیدا.

لایبنیتس یەکێک لە ڕێبەرانی عەقڵگەرای چاخی نوێ بوو، بەیەکێ لە ڕابەرانی لۆژیکی بیرکاری دادەنرێت.

لایبنیتس وەک سپینۆزا ویستی هەندێک لە بۆچوونە مێتافیزیکەکانی دیکارت ڕاستبکاتەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی کۆڵەکە بنەڕەتەکانی بڕووخێنێت، لەگەڵ سپینۆزاشدا نەبوو لە بابەتی یەکێتی بوون، چونکە ئەو پێی وابوو مرۆڤ بوونێکی سەربەخۆی هەیە، خوداش لە دەرەوەی سروشتە و بوونێکی سەربەخۆی هەیە، نەک خودی سروشت بێت.

لە بابەتی مەعریفە و زانینیشدا زۆر دژی ئەزموونگەرایی و هەستگەرایی بوو، چونکە سەر بە قوتابخانەی عەقڵگەرا بوو.

### مۆناد: ئەتۆمی گیانی

مۆناد چ وەک بابەت چ وەک چەمک، بە خاڵی سەرەکی جیهاندیدی فەلسەفەی لایبنیتس دادەنرێت، وشەکە خۆی یۆنانییە (Monad) بە واتای یەکەی دابەش نەبوو دێت، گوایە لە «گیوردانو برۆنۆ» خواستوویەتی، لایبنیتس بەم شێوەیە پێناسەی مۆنادی کردووە: جەوهەرێکی سادە و ساکارە کە لە پێکهاتەکاندا هەیە. سادە و ساکار مەبەستی ئەوەیە کە هیچ پارچەیەکی نییە و سادەیە.

ئەم بۆچوونەی لایبنیتس پێچەوانەی بۆچوونی دیکارت و سپینۆزا بوو، چونکە دیکارت بڕوای بە دوو جەهەری هەبوو «مادده و ڕۆح» «جەستە و عەقڵ»،

سپینۆزاش باوەڕی بە تاک جەوهەری هەبوو.[1]

---

(١) بنەڕەتی بوون
ئایا بنەما و بنەڕەتی بوون یەکێکە یان یان زیاترە لە یەکێک و زۆر و زەبەندە و جۆراوجۆرە؟
بە شێوەیەکی گشتی فەیلەسووفان بۆ وەڵامی ئەم پرسە دابەشبوون بۆ چەند ئاراستەیەکی جیاواز:
١. تاکخوازەکان (الواحدیون): ئەم ڕێبارە پێی وایە بنەڕەت و بنەما وجود و بوون دەگەڕێتەوە بۆ «یەک جەورهەر»، بەڵام ئەم ئاراستەیەش لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی ئاخۆ ئەم «یەک جەوهەرە» چییە و سروشتی چییە و چۆنە دابەش دەبن بۆ دوو ئاراستەی تر:
أ. یەکیانەی ماددی (الواحدیة المادیة): ئەمانە پێیان وایە بنچینە و بنەڕەت و بنەمای بوون و وجود بریتییە لە «تاکە جەوهەرێکی ماددیی، جەوهەرێکی تاکی ماددی»، ئینجا دەربارەی ئەم تاکە جەوهەرەش ڕاجیاییان هەیە، بۆنموونە لە کۆنەکان: تالیس دەیوت: ئەسڵ و بنەڕەتی بوون «ئاو»ە، ئەناکسیمینس دەیوت: «هەوا»یە، لە سەردەمی نوێدا لودفیگ فیۆرباخ پێی وایە هەموو ئەوەی هەیە بریتییە لە «مادده و جەستە» یەک، کە ژمارەیەک ڕەهەندی هەیە.
ب. تاکیانەی ڕۆحی (الواحدیة الروحیة): ئەمانە پێیان وابوو ئەسڵ و بنەڕەتی بوون و وجود بریتییە لە «تاکە جەوهەرێکی ناماددی، جەوهەرێکی تاکی ناماددی» لەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەبووە لە کۆنەکان: ئەکسانۆڤان، زینۆن ئەلایلی، لە نوێیەکانیش: ردولف هیرمان لوتزە، هیگڵ، تۆماس گرین.
٢. ڕێبازی زۆرییێتی (زەبەندی و جۆراوجۆری) (مذهب الکثرة والتعدد): ئەم ڕێبازە پێی وایە بنەڕەت و بنچینەی بوون و وجود دەگەڕێتەوە بۆ «چەندەها جەوهەری زۆر و جۆراوجۆر» نەک تەنیا جەوهەرێک وەک ڕێبازی یەکەم، بەڵام دەربارەی چییەتی و سروشتی ئەم جەوهەرانە دابەش بوونە بۆ دوو ئاراستەی تر:
أ. زۆری و زەبەندی ماددی (مذهب الکثرة المادیة): ئەم ئاراستەیە پێی وایە بنەڕەت و بنچینەی بوون و وجود «چەندان جەوهەری ماددی»یە، واتە بنەڕەتی بوون تاکە جەهەرێک نییە و بەس، بەڵکوو چەندین جەوهەرە، فرە جەوهەرە، لە فەیلەسووفە کۆنەکان کە ئەم ڕایەی هەیە: ئەمبادۆکلیس، کە بوون و وجود بۆ چوار توخمی بنەڕەتی دەگەڕێنێتەوە «ئاو، هەوا، خاک، ئاگر»، واتە وەک ڕێبازی «تاک جەوهەر» نییە، بیگەڕێنێتەوە تەنیا بۆ یەک بنەڕەت، هەروەها «دیمۆکریتس و لۆکیبۆس»یش سەر بەم ئاراستەیەن، چونکە بوون دەگەڕێننەوە بۆ «بەشەکییە ماددییە بچووکەکان» (الجزئیان المادیة الصغیرة) کە پێیان دەوت (Atoms) واتە ئەو گەرد و بەشانەی کە دابەش نابن، لە فەیلەسووفە نوێکانیش کە ئەم ڕایەیان هەیە «تۆماس هۆبز و ولیەم جیمس».
ب. زۆری و زەبەندی ڕۆحی (مذهب الکثرة الروحیة): ئەمانە پێیان وایە بنەڕەت و بنەمای بوون و وجود بریتییە لە «چەندین جەوهەری ناماددی ڕۆحی»، واتە بنەڕەت و بنچینەی بوون یەک جەوهەری ناماددی نییە، بەڵکوو چەندان جەهەری ناماددییە، بۆنموونە فەیلەسووفی ئەڵمانی «لایبنیتز» ئەم ڕایەی هەیە و پێی وایە بوون لە جەوهەرە سادە ڕۆحییەکان پێکهاتووە، واتە «هێزەکان» یان (یەکەکانی وزە، وحدات للطاقات) وەک بڵێی (گەردە ڕۆحییەکان، ذرات

### تایبەتمەندییەکانی مۆناد:

### ١. هیچ مۆنادێک لە هیچ مۆنادێکی دیکە ناچێت

لە هەموو بوون و گەردووندا مۆنادێک نادۆزیەوە لە هەموو شتێکدا وەک مۆنادێکی دیکە بێت، وەک پەنجەمۆری کەسەکان و گەڵای درەختەکان، چۆن ئەوان لەیەک ناچن، مۆنادیش بە هەمان شێوە، بۆیە پێی وایە دوو مۆناد نابینی وەک یەک بن لە هەموو شتێکدا، چونکە ئەگەر دوو شت وەک یەک بن، ئەوە یەک شت دەبن، نەک دووشت. تەنانەت مرۆڤ دەتوانێت زیاتر بڕوات و بڵێت: لە سروشتدا دوو ڕووداو نییە کە ئەوەندە لە یەکتری بچن جۆرە دووبارە بوونەوەیەک پشتڕاست بکاتەوە، بۆیە ئەوەی ڕوودەدات شتێکی نوێیە، نوێیە لە پێش خۆی و دوای خۆشی.

### ٢. مۆناد پەنجەرەی نییە

لایبنیتس پێی وایە هیچ مۆنادێک ناتوانێت کار لە مۆنادێکی دیکە بکات و بە ئاسانیش ناتوانرێت لێک بدرێتەوە کە چی لەنێو مۆناد خۆیدا ڕوودەدات،

---

روحية) ناویان «مۆنادەکان»ە، (Monads).

٣. دووانەکییەکان (الثنائية): ئەم ڕێبازە بنەڕەت و بنەچەی هەموو بوون و وجود و بوونەوەر بۆ «دوو جەوهەر»ی لێک جیاواز دەگەڕێننەوە، واتە پێیان وایە بوون بنەڕەتەکەی دوو جەهەری سروشت جیاوازە، وەک «مادده» و «ڕۆح» یان «هزر، فکر» و «عەقڵ»، لەکاتێکدا جەوهەری یەکەم (مادده) سروشتی وایە دەکشێت، بەڵام جەوهەری دووەم (ڕۆح یان فکر و هزر یان عەقڵ) سروشتەکەی وایە کە «وەعی و ئاگایی» هەیە، واتە پەی بە شتەکان دەبات و خاوەن دەرککردنە، بۆنموونە لە فەیلەسووفانی کۆن کە ئەم ڕایەیان هەبووە «ئەفلاتوون»، ئەفلاتوون پێی وابووە بنەڕەتی بوون هەم ماددییە هەم نامادی، جیهانی ماددی و هەستپێکرا لەگەڵ جیهانی نامادی و نموونەبەرزەکان و ئایدیال (عالم المثل)، هەروەها «ئەرستۆ»ش باوڕی بە هەمان بۆچوون هەیە و پێی وایە جیهان دوو بنەڕەتی سەرەکی هەیە «هیولا» و «وێنە» (الهيولى والصورة). لە فەیلەسووفە نوێکانیش دیارترین فەیلەسووف کە ئەم ڕایەی هەیە دیکارتە، دیکارت پێی وایە بنەڕەتی بوون مادده و هزرە، مادده درێژدەبێتەوە و دەکشێت، هزریش ئاگایی هەیە.

چونکە هیچ شتێک لەناویدا ناگوێزرێتەوە و ناکرێت تێیدا بزووتنەوە و جووڵەیەکی ناوەکی وێنا بکرێت، چونکە هیچ مۆنادێک پەنجەرە و دەلاقەی نییە و ناکرێت شتێک بچێتە ناویەوە، یان لێی بێتە دەرەوە، کەواتە هەر مۆنادێک لەخۆیدا بوونێکی سەربەخۆی هەیە و لە ئەنجامدا هەر مۆنادێک لە سۆنگەی تایبەتی خۆیەوە جیهان بەرجەستە دەکات.

### ٣. مۆناد بوونەوەرێکی گیانی و ڕۆحییە

لە فەلسەفەی پێش لایبنیتسدا وا بوو سروشت دوو بەشی سەرەکییە:

ماددی، ڕۆحی، یان لەشی و گیانی.

سروشتی ڕۆحی و گیانی لە هزر و بیرکردنەوە پێکدێت، هی لەش و ماددەش لە کشان، بەم پێیە دوو جەوهەر لە بووندا هەیە:

١. گیان و ڕۆح، کە هزرمەندی بیرکەرەوەیە.

٢. لەش و جەستە و ماددە کە کشاوە.

ئەوەی پەیوەندی بە پرۆسەی زانینەوە هەیە، ئەم دوو ڕەنگییەی جەوهەر لە بووندا ئەنجامێکی دوو خاڵی لێدەکەوێتەوە:

١. لەچوارچێوەی جیهانی ڕۆحی و گیانیدا هەموو شتێک بەهۆی بیرۆکە و فکر و بۆچوونەوە ڕاڤە و شرۆڤە دەکرێت. واتە لێرەدا پەیڕەوی ڕێبازی ئایدیالیستی دەکرێت.

٢. لە جیهانی لەش و جەستە و ماددەدا، ئەوەی هەیە بە ڕەگەزی جەستەیی و ماددی لێکدەدرێتەوە، واتە لێرەدا بەپێچەوانەی پێشووترە و بە ڕێبازی ماتریالیستی لێکدەدرێتەوە.

لێرەوە لایبنیتس دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە مۆناد جەوهەری ڕاستەقینەیە و

سروشتێکی گیانی و ڕۆحی هەیە، ڕەدی فرە ڕەنگی فرە جۆری جەوهەر دەداتەوە، مۆناد ئەتۆمی ڕاستەقینەی سروشتە و ڕەگەزی بنەڕەتی هەموو شتێکە، چونکە پارچەدار نییە، لە شتی ترەوە پێک نەهاتووە و دروست نەبووە، بەڵکوو سادە و ساکارە و یەکەیەکی یەکڕەنگە، مۆناد بەپێی پێناسەکەی لایبنیتس جەوهەرە، جەوهەریش کەخۆی لەخۆیدا ناوەندی هێز و توانا و وزەیە، هیچ شتێک، هیچ جەستە و لەشێک بەبێ هێز و وزەی بزووتنەوە ناکرێت بوونی هەبێت، چونکە هەر یەکێک لەوانە بەشێوازێک دەبێت چالاک و کاریگەر بێت و کار لە هی تر بکات، بۆیە مۆناد بە جەوهەرێکی گیانی ڕۆحی بەهێز و بەتوانا و نامادی دادەنرێت.

بەلای لایبنیتس ژمارەیەکی بێسنوور و لەڕادەبەدەر مۆناد هەیە و هەر یەکێکیان لەوی دیکە جیاوازە، هەربۆیە جیهان و گەردوون ئەوپەڕی فرە ڕەنگی و هەماهەنگی دەنوێنێت و بەرجەستەی دەکات.

مۆنادەکان وەک زنجیرەیەکی ئاڵقە لە ژمارە نەهاتوو وان، لە زنجیرەی ژمارەکان دەچن، هەر ژمارەیەک لەوی پێش خۆی و دواتری جیاوازە و بەبێ ئەوانیش نابێت، مۆنادەکانیش ڕێک ئاوهان.

کەواتە دەتوانین بڵێین:

هەر مۆنادێک سەربەخۆیە و بوونێکی تایبەت بەخۆی هەیە.

بەڵام لەنێوان جەوهەرەکاندا جۆرە پەیوەندییەک هەیە، پەیوەندییەکی هەماهەنگیانە.

ئەوەی لە جەوهەرێکدا ڕوودەدات ڕەنگدانەوەی دەبێت بەسەر ئەوانی تردا.

هێزێکی دەرەکی، سەرووسروشت، کە داهێنەری مۆنادەکان، لە هەموو شتێکدا دەست دەخاتە ناو کاروباری فرە لایەنی مۆنادەکان.

ئەوەی لەناو مۆنادێک ڕوودەدات وەک ئەوە وایە لەناو مۆنادێکی تردا ڕوویدات، بەبێ ئەوەی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ و کار لەیەکتری کردن لەناو مۆنادەکاندا هەبێت.

هەموو ئەم پرۆسەیە بەلای لایبنیتس لەلایەن خوداوە دانراوە و ڕەنگرێژکراوە و بەڕێوەدەبرێت.

کەواتە پوختەی هزری لایبنیتس:

١. فەیلەسووفێکی عەقڵانی بووە و دژی ئەزموونگەرایی بووە.

٢. میتۆدێکی لۆژیکی بیرکاریانەی هەبووە و خۆشی یەکی لە ڕابەرانی لۆژیکی بیرکاری بووە.

٣. هەموو بوون گەردوون لەلای ئەو لە مۆنادەکان «ئەتۆمی گیانی، جەوهەری ڕۆحی» پێکدێت.

٤. خودا بوونی هەیە و هەموو ئەو مۆناد و بوونە بەڕێوە دەبات، لایبنیتس باوەڕی زۆر بە خودا قایم بووە و چەندان بەڵگە لەسەر بوونی خودا دەهێنێتەوە، بەڵام لەبەر درێژبوونەوە باسی بەڵگەکانی ناکەین[1].

لایبنیتس دەربارەی خودا و بوونی خودا هەڵوێستەکەی ڕوون بووە و هیچ کاتێک گومانی لە بوونی خودا نەبووە و لەسەر دوو بنەما کاری لە بابەتەدا کردووە:

١. ئەگەر خودا بوونی نەبێت، هیچ هۆکارێکی سەربەخۆی «بەس بوو» ی بوونی شتەکان لە گەردووندا بوونی نابێت.

---

(١) رسالة في الميتافيزيقا، لايبنتز، ترجمة: د. الطاهر بن قيزة.
قصة الفلسفة الحديثة، د. أحمد أمين وزميله، ل ١١١.
تاريخ الفلسفة الحديثة، يوسف كرم، ل ١٩٠.الفلسفة .
الفلسفة الحديثة، د. كريم متي، ل ١١٣.

٢. بەبێ بوونی خودا هیچ هۆکارێکی سەربەخۆی بەس بوو بوونی نابێت کە ببێتە هۆی ئەوەی شتەکان هەماهەنگی تەواویان لەنێواندا بێت لە جیاتی نارێکی و ناهەماهەنگی و شێواوی.

کەواتە هەموو گەردوون پێویستی بە هۆکارێکە کە ئەو هۆکارە پێویستی بە هۆکارێکی دیکە نییە، ئەو هۆکارەش بریتییە لە خودا.

بەڵگەکانی بوونی خودا لەلای لایبنیتس:

لایبنیتس بۆ سەلماندنی بوونی خودا چەند بەڵگەیەک دەهێنێتەوە:

**یەکەم: بەڵگەی بوون (وجود - ontologie)**

ئەم بەڵگەیە بە بەڵگەی داواکردنی بەرزیی و ڕێگای تەواوکردن (استكمال) یاخود بە ڕێگای نموونەی هەرە بەرز (المثل الأعلى) ناو دەبرێت.

قەشە «ئەنسلیم» لە وێنەی یەکەمیدا دایڕشتووە، کە سەرچاوەیگرتووە، لە بنەمایەک کە دانی پێدانراوە لەلایەن باوڕدار و بێباوەڕەوە، ئەویش بریتییە لەوەی کە هزر و بیرۆکەی خودا لەناو عەقڵدا بوونی هەیە، هەتا خودانەناسانیش نکووڵی لە پێشبینیکردن و ئەندێشەکردنی خودا ناکەن، بەڵکوو نکووڵی لە بوونی خودا دەکەن.

ئەوانەی دوای قەشە ئەنسیلمهاتن ئەو بەڵگەیەیان بە جوانیی تۆکمە کرد، تا وایلێهات تەواو کامڵ بوو لە ناو چوارچێوەی فەلسەفەی دیکارتدا، کە بە باوک و ڕێبەری فەلسەفەی نوێ ناسراوە وزانای فیزیا و بیرکاری بووە. بۆیە وایلێهات ئەو بەڵگەیە بدرێتە پاڵ دیکارتجا ناوەڕۆکی ئەو بەڵگەیە بەم شێوەیەیە:

عەقڵی مرۆڤ هەر کە ئەندێشەی شتێکی گەورە بکات، ئەوا ئەندێشەی شتێکی گەورەتر لەو دەکات، چونکە وەستان لە پلەیەک کە بێتوانایی و دەستەوەسانی تێدا بێت پێویستی بە هۆ هەیە، عەقڵی مرۆڤیش هۆی بێتوانایی

و دەستەوەسانیەکە نازانێت، چونکە هەر شتێکی تەواو و کامڵ هەبێت ئەوا عەقڵیی مرۆڤ هەوڵی گەیشتن دەدات بە شتێک لەو تەواوتر و کامڵتر، تا دەگاتە کۆتایی کۆتاییەکان، کە ئامانج و مەبەستی کامڵبوونی ڕەهایە کە نە زیاد و نە کەم دەبێت. ئەو بوونە کامڵە ڕەهایە بەبێ چەند و چوون هەیە، چونکە وێناکردنی بە عەقڵ و ئەندێشەکردنی کەمترە لە بوونە ڕاستەقینەکەی، چونکە لە ڕاستیدا بوونی هەیە.

کەواتە چەمکی گریمانکراوی کامڵ و تەواوەتی بە ناچاری بوونی هەیە، ئەگەر وانەبێت خودی کامڵ و تەواوەتی بوونی نابێت، بۆیە ئەو بوونە تەواو و کامڵە بوونێکی ناچارییە، خوداش خۆی ئەوپەڕی کامڵ و تەواوەتییە، کەواتە خودا بوونی هەیە. لایبنیتس پێیوایە ئەم بەڵگەیە جۆرە دەستکارییەکی دەوێت، کە لە «گوتارێک دەربارەی مێتافیزیک» خستوویەتیەڕوو، بەڵام لە ڕاستیدا لایبنیتس شتێکی گرینگی زیاد نەکردووە بۆ بەڵگەکە...

## دووەم: بەڵگەی گەردوونی (kosmologie)

بەڵگەی پێشووتر «بەڵگەی بوونی گشتی» (ontologie) (دليل الوجود) لە مرۆڤەوە بۆ بەڵگەکانی بوونی خودا دەچوو، واتە خودی مرۆڤی دەکردە بەڵگە لەسەر بوونی خودا، بەڵام «بەڵگەی گەردوونی» (kosmologie)) خودی گەردوون و بوونەوەرەکان دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودا، لایبنیتس پێیوایە هەموو ئەم بوونەوەرانە و گەردوون پێویستییان بە هۆکار هەیە بۆ هاتنەبوون، ئەو هۆکارەش یان لە ناو خۆیانە و خوودی خۆیانە، یان لە دەرەوەی خۆیانە و جیایە لە خۆیان، ئەگەری یەکەم مەحاڵ و ئەستەمە، چونکە ناکرێت شتێک هۆکاری بوونی خۆی، کەواتە دەمێنێتەوە ئەگەری دووەم کە هۆکاری هەموو بوون و گەردوون هۆکاری سەربەخۆی جیا لە بوون و بوونەوەر و گەردوون کە خودایە.

لایبنیتس لە پرسیاری: بۆ بوون و گەردوون هەیە؟ بۆ لەجێی ئەم بوونە (عدم)

«نەبوو» «هیچ» (nichts) لەجێی ئەم بوونە نەدەبوو؟ واتە بۆ «هیچ» بەگشتی «هەبوو» نەبوو؟ چونکە بوون و نەبوون هەردووکیان بوونێکی (مومکین) یان هەیە و هەبووە، واتە ئەوەی تۆ دەیبینی دەکرا هەبا دەکرا نەبا، ئێستا کە هەیە و نەبوو نییە، ئەم بوونە پێویستی بە هۆکاری دەرەکی هەیە کە خودایە.

**سێیەم: هۆکاری ئامانج (غاية) teleologie**

وەک لە بەڵگەی پێشووتر باسمانکرد گەردوون و هەموو شتەکان بوونێکی (مومکین) یان هەیە، هۆکاری هەموو ئەم بوون و بوونەوەرانەش لە دەرەوەی خۆیانە، ئەم جیهانەی ئێستا باشترین جیهانی مومکینی لەتوانادا بووە، کەواتە کە ئەم جیهانە هەڵبژێردراوە بۆئەوەی هەبێت و ببێت، دەبێت ئەم هەڵبژاردن و بڕیاردانە ئامانجێکی ڕوون و ئاشکرا و دیاری لە پشتەوە بێت، خودی ئەم ئامانجەش بوونی جەوهەرێکی ئامانجەکی دەسەلمێنێت، چونکە ئەو جەوهەرەی ئەو ئامانجەی هەیە و لە پشت ئەم ئامانجەوەیە خودی خودا خۆیەتی، کەواتە لایبنیتس لە ئامانجەکی بوونی جیهانی ئێمە کە گوایە باشترین جیهانی لەتوانادا بووە، دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بوونی بوونەوەرێکی ئامانجەکی کە ئامانجی دروستکردن و داهێنانی هەموو شتێک بووە بەو جیهانەی ئێمەوە، ساغ بکاتەوە. کەواتە ئەوەی مرۆڤ دەیبنێت لە دەرووبەریو لەو هەموو شتانەی کە ڕوودەدەن و داهێنراون ئامانجێکیان هەیە، وەک چۆن نەدەکرا ئەو شتانە خۆیان هۆکاری بوونی خۆیان بن، ئاواش ناکرێت ئەو شتانە خۆیان هۆکاری ئامانجی بوونی خۆیان بن، ناکرێت ئامانجەکە پاڵبدەیە لای خوودی شتەکان خۆیان، بەڵکوو دەبێت ئامانجدارێک هەبێت لە پشتی ئەو ئەو ئامانج و شتانەوە و ئامانجیان بۆ دیاری بکات، ئەو ئامانجە دەرەکییەش تەنیا و تەنیا خودایە.

**چوارەم: بەڵگەی هۆکاری یەکەم و غەیرە بەرهۆ و بە خۆ بەس بوو**

پوختەی ئەم بەڵگەیە بەم شێوەیەیە:

هەرچی هەیە و ڕوودەدات پێویستە هۆکارێکی هەبێت، ئەو هۆکارەش پێویستە هۆکارێک بێت خۆی بەرهۆ نەبێت بۆ هۆکارێکی دیکە و هۆکاری یەکەم و بەس بوو بە خۆ بێت، چونکە هیچ شتێک بەبێ ئەم جۆرە لە هۆکار ڕوونادات، ئەو هۆکاری یەکەم و بەس بوو بەخۆیە دوایەمین هۆکاری نجیرەی هۆکارەکانە و هۆکاری هەموو شتەکانە، ئەو دوا هۆکارەش پێیدەوترێت خودا.[1]

---

(١) فەلسەفەی نویێ لە ئەورووپا، حەمید عزیز، ل١٥٨ - ١٦٢. ئەویش ئەمەسەرچاوەکەیەتی: G. W. Lebniz Para

# ئاراستەی ڕەخنەگەرا

دوای ئەوەی فەلسەفە دوو ئاراستە و قوتابخانەی سەرەکی بەخۆیەوە بینی، ئەوانیش «عەقڵگەرا» و «هەستگەرا» ئاراستە و قوتابخانەیەکی تریش هاتە مەیدانەوە بەناوی «ڕەخنەگەرا»، ئەم قوتابخانەیە ویستی عەقڵ و هەست بەیەکەوە کۆبکاتەوە و هیچیان پشتگوێ نەهات، ویستی ئەو دژیەکییەکەی کە لەنێوان هەست و عەقڵدا دروستکراوە نەیهێڵێت و تێکی بشکێنێت، کەواتە ڕەخنەکانی ئاراستەی هەردوو قوتابخانەی «عەقڵگەرا» و «هەستگەرا» کرد.

**ئیمانوێڵ کانت**

دیارترین فەیلسووف کە کاری گەورەی لەسەر کرد ئیمانوێڵ کانت (١٨٠٤ م) بوو.

ئیمانوێل کانت (بە ئەڵمانی: Immanuel Kant)، (١٧٢٤-١٨٠٤) بەناوبانگترین بیرمەندی سەردەمی ڕۆشنگەرییە. کاریگەری گەورەی لەسەر بیری خۆرئاوا کرد، لەسەرەتادا فەسلەسووفێکی عەقڵگەرا بوو، کاریگەر بوو بە «بلیبنتز» و «ڤۆلف»، پاشان لە ساڵی (١٧٦٥م) کاریگەر بوو بە قوتابخانەی ئەزموونگەرا، لەپاش ئەم قۆناغەش قۆناغێکی نوێ دەستپێکرد بەناوی ڕەخنەگەرایی، ئەمەشی لە ساڵی (١٧٧٠) بەدواوە بوو، هەر لەم قۆناغەشدابوو، پەرتووکە بەناوبانگەکەی نووسی بەناوی «ڕەخنەی عەقڵی پەتی».

پوختەی فەلسەفەی کانت دەربارەی مەعریفە ئەوەیە کە: مەعریفە لە ئەزموونکردنەوە پەیدانابێت، بەڵکوو لەگەڵ ئەزموونکردنەوە دەست پێدەکات، ئەم زانیاریانەی لە ئەزموون و هەستەوە دێن، پێویستیان بە ڕێکخەر و قالب

و چوارچێوەیەک هەیە بۆئەوەی لەخۆیان بگرێت، ئەم چوارچێوە و قالبانەش بریتین لە بنەما عەقڵییە بەدیهییە گشتییە زگماکییە پێشەکییەکان، واتە ئەم بنەمایانە لە فیترەتەوە هەن و بەدیهی و بەڵگەنەویستن، کەواتە ئەو مەعریفانەی لەڕێی ئەزموونەوە دێن دەبێت بەم یاسا عەقڵییە گشتیانە ڕێکبخرێن، کەواتە کۆکردنەوەی عەقڵ و ئەزموون، نەوەک یەکیان بەتەنیا.

کەواتە ئەمە پێچەوانەی قوتابخانەی عەڵگەرا (ئەفلاتوون و دیکارت و..ر) و ئەزموونگەرا (ئەرستۆ و جۆن لۆک و دێڤید هیوّم) بوو.

نموونەیە بۆ کۆکردنەوەی هەست و عەقڵ لای کانت: پرتەقاڵێک لەبەردەممان بێت، بەچەند هەستێک دەتوانین هەستی پێبکەین، بەدەست دەتوانین دەستی لێبدەین و هەست بە توێکڵەکەی بکەین، بەچاویش ڕەنگەکەیی و شێوەکەی دەبنین، بە لوتیش بۆنی دەکەین و بە زمانیش تام، هەموو ئەمانە بە تێکەڵی و پەرتەوازەییەوە دەچنە ناو مێشک و پێویستیان بە لێکدانەوە و جیاکاری و کۆکردنەوە هەیە. هیوّم پێی وایە ئەم کۆکردنەوە و لێکدانەوە و گردێنەی مێشک بۆ هەموو بەشکانی خودکارییە و ڕاستەوخۆ وێنەی پرتەقاڵە لە مێشکدا دروست دەبێت، بەڵام کانت پێی وایە ئەو لێکدانەوە و گرێدانەوە عەقڵ دەیکات، کەواتە هەم هەست و هەم عەقڵ وێنەی پرتەقاڵەکەی لە مێشکماندا دروستکرد، چونکە تەنیا بۆن یان ڕەنگ یان شێوە یان تام ناتوانێت ئەم وێنەیە لە مێشکدا دروستبکات، ئەوە عەقڵ دێتە مەیدان و وێنەی ئەم پرتەقاڵە دروستدەکات و هەستەکان لێک گرێدەدات.

لێرەوە بۆمان دەرکەوت کانت نە هەستگەرایە نە عەقڵگەرا، بەڵکوو هەردووکیانە بەیەکەوە و ڕەخنەی لە هەردوو ئاراستەکە هەیە.

## کانت و بوونی خودا

کانتپێی وایە هەموو ئەو بەڵگانەی پێشووتر هێراونەوە لەسەر بوونی خودا، بەبەڵگە ناشێن و نابنە بەڵگە لەسەر بوونی خودا. پێی وابوو عەقڵی تیۆری (العقل النظری) هەرگیز ناتوانێت بوونی خودا بسەلمێنێت، هەروەک چۆن ناشتوانێت نەبوونی خودا بسەلمێنێت، کەواتە عەقڵ سەلماندنی بوون و نەبوونی خودای لە تواناداا نییە و ناتوانێت[1]، هەربۆیە لەو سەردەمەدا هێرشێکی زۆری کرایە سەر و بە زندیق و بێباوەڕ و دووڕوو ناوبرا، چونکە دەیان وت لەژێر ناوی دینداریدا دەیەوێت ئیلحاد و ناباوەڕی بڵاوبکاتەوە. بەدرێژایی چەندان ساڵ ئەم بۆچوونەی کانت وەک دەسکەلایەک بووە بەدەستی مولحیدانەوە و دەڵێن ئەوەتا کانت باوەڕی بە خودا نەبووە و پێی وابووە هیچ بەڵگەیەک نییە لەسەر بوونی خودا، بەڵام ئەمە ڕاست نییە، چونکە:

١. کانت چۆن وتوویەتی بەڵگەی عەقڵی نییە لەسەر بوونی خودا و ناتوانرێت بەعەقڵ بسەلمێنرێت، ئاواش وتوویەتی عەقڵ ناتوانێت بیسەلمێنێت کە خودا بوونی نییە، واتە سەدا پەنجا بە پەنجایە.

٢. کانت بە عەقڵی عەمەلی و کردەیی و بەڵگە لەسەر بوونی خودا دەهێنێتەوە، واتە بە بوونی بنەمای ئەخلاقی لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا، هەر لێرەوە بەڵگەی ئەخلاقی لەسەر بوونی خودا چەکەرەی کردوو بووە بەهێزترین بەڵگە لەسەر بوونی خودا، پوختەکەی:

بەڵگەی ڕەوشتی (ئەخلاقی) بریتییە لە بەڵگە هێنانەوە بە هەبوونی چەند شتێکی ڕەوشتی کە هەندێک شت بە باش و جوان و چاک دەزانێت، هەندێک شتی تریش بە خراپ و ناشیرین و بێزراو دەزانێت، ئەوە لەسەر بنەمایەکی سەربەخۆ کە هیچ پەیوەندییەکی بە زەوقی کەسی یان عادەت و عورفەوە نییە،

---

(١) موسوعة الفلسلفة، عبد الرحمن بدوي، ب ٢، ل ٢٨١.

کەواتە ئەو ڕەوشتانە ڕەوشتی بابەتین (الأخلاق الموضوعی) و سەربەخۆن و هێزێکی دەرەکی لە دەرەوەی ماددە لە ناو دڵ و دەروون و ناخ عەقڵ و هۆشی مرۆڤدا سەپاندوویەتی و چاندوویەتی، ئەو چەسپێنەر و چێنەرە ئەگەر هەبێت، دیارە حەتمەن خوای پەروەردگارە؛ ئەگەرنا ماددە بۆ خۆی ڕەوشتی لە کوێ بوو تاوەکوو ڕەوشت ببەخشێت؟! (فاقد الشئ لا یعطیە) واتا: نەبوویی شتێک ناتوانێت ئەو شتە ببەخشێت.

بۆنموونە کێ لە دڵی مرڤیدا چاند و چەسپاندنی کە:

١- دادگەری، ڕاستگۆیی، ئەمانەتپارێزی و چاکەکردن، بەزەیی هاتنەوە، میهرەبانی، دڵسۆزی، یارمەتیدان، لێبووردەیی، عیزەت،... هتد، باشن؟!

٢- ستەم، درۆ، خیانەت،... هتد، خراپن؟!

کەواتە کێ ئەو هەست و ڕەوشتانەی لە مرۆڤدا چاندن؟ بۆ نموونە چ شتێک وا لە مرۆڤ دەکات حەزی بە ڕاستگۆیی و دادگەری و ئەمانەت پارێزی و... بێت؟ چ شتێک وا لە مرۆڤ دەکات ڕقی لە ستەم و درۆ و خیانەت و... بێت؟

جا ئەوەی کە زۆر سەیرە، زۆرجار ئەو شتە لە زیانی مرۆڤیشە بەڵام هەر دەیکات، بۆ نموونە دەفتەرێک دۆلاری دۆزیوەتەوە، یان کەسێک دە دەفتەر دۆلاری لا داناوە، بەڵام ئەو ڕاستگۆیە و خیانەت ناکات. لەگەڵ ئەوەی لە چاوی مرۆڤ وایە ئەگەر ئەو دە دەفتەر دۆلارە ببات و خیانەت بکات، قازانج دەکات، بەڵام ئەو مرۆڤە شتێک لە ناخیدا هەیە کە ڕێی پێ نادات، ئایا ئەو هەستە کێ دروستی کرد؟! ماددە دەتوانێت ئەو هەستە دروست بکات؟! یان کەسێک هەیە دەتوانێت ستەم بکات و قازانجێکی زۆر بەدەست بهێنێت بە هۆی ئەو ستەمەیەوە، بەڵام شتێک لە ناخیەوە هاوار دەکات و ناهێڵێت ئەوکارە بکات، ئەگەرچی ڕەنگە ئەگەر ستەمەکە بکات، بە سەدان ملیۆن دۆلار قازانج بکات و بەدەستی بهێنێت.

یان زۆر جار مل دەدات بۆ بڕیارێک کە زیانییەتی بەڵام تەنیا بۆ چەسپاندنی دادگەری وادەکات، واتا ناخی داوای دادگەری دەکات، لەگەڵ ئەوەی کە زەرەریشیەتی. ئایا کێ ئەو هەستە دادگەرییەی لە دڵدا چەسپاند؟! مادده دەزانێت دادگەری چییە تاوەکوو لە ناخی مرۆڤدا بیچەسپێنێت؟!

یان زۆر جار کەسێک بەهۆی ڕاستگۆییەوە قازانجێکی زۆر لەدەست دەدات، یان زەرەرێکی زۆر زۆر دەکات، بەڵام هەستێک لە ناخییەوە هاوار دەکات دەڵێت: درۆ مەکە، چونکە نارەوشتییە، زۆر جار بە درۆیەک ڕەنگە بە دەیان دەفتەر دۆلار قازانج بکات، یان زەرەر لەسەر خۆی لاببات، بەڵام ئامادە نییە درۆیەکە بکات، ئایا مادده دەزانێت ڕاستگۆیی چییە تاوەکوو بیبەخشێت بە مرۆڤ؟!

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی ڕەوشتە بابەتییە نەگۆڕەکان چەند سیفەتێکیان هەن:

١- **گشتیبوون**، واتا ئەو جۆرە ڕەوشتە گشتییە و هەمەلایەنە و هەموو مرۆڤەکان تێیدا بەشدارن بەبێ جیاوازی، واتا ئەگەر فیترەتی ئەو کەسە تێکنەچووبێت و لەسەر فیترەت مابێتەوە، ئەوا حەزی بە دادگەری و ڕاستگۆیی و ئەمانەت پارێزری و میهرەبانی و... هەیە، هەروەها ڕقی لە ستەم و درۆ و خیانەت و دڵرەقییە. کەواتە هەموو مرۆڤەکان تێیدا بەژدارن و ئەو ڕەوشت و سیفاتانە گشتین لە نێوان هەموو مرۆڤەکان و بەپێی کەس، کات، شوێن، بارودۆخ، ژینگە، سەردەم و کۆمەڵگاکان ناگۆڕێت.

٢- **پێویستیان بە فێرکردن نییە**، واتا: ئەو ڕەوشت و سیفتانە پێویستییان بە فێرکردن نییە بە شێوەیەکی گشتی، مەبەستمان وردەکاری ئەو ڕەوشتانە نییە، مەبەستمان خودی خۆیانە، کەواتە مرۆڤ پێویستی بەوە نییە فێری دادگەری بکرێت، بۆیە منداڵێک ئەگەر تۆزێک فامی کردبێت، بێ ئەوەی فێرکرابێت

دژی ستەمە، بۆ نموونە شتێک بدە بە یەکێکیان بەڵام مەیدە بە ئەوی تریان، دەبینین پێی ناخۆشە و تووڕە دەبێت، یان زیاتر بدەی بەو و کەمتر بدەی بەم، دەبینی پێی تووڕە دەبێت و پێی ناخۆش دەبێت، بێ ئەوەی فێرکرابێت دادگەری چییە و ستەم چییە، یان کەسێک ستەم لە باوکی بکات لە بەردەمی ئەو، ئەگەر یەکەم جاربێت ئەو حاڵەتە ببینێت و فێریش نەکرابێت دەبینین پێی ناخۆشە و تووڕە دەبێت و دەگرییێت.

**٣- ئەو هەست و سیفەت و ڕەوشتانە ئەگەر هەلومەرجی گونجاوییان بۆ نەڕەخسێت لە گەشەکردن دەوەستن و گەشە ناکەن و بەرەو نەمان ون بوون دەچن،** (بالفعل) واتا بە کردەیی، بەڵام (بالقوة) بە حاڵەتی توانایی و ئامادەبوون، هەر هەن، هەر ئامادەن و نامرن، هەروەک پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت (مامن مولود إلا يولد على الفطرة، فأبواه يهودانه أو ينصرانه أو يٌمَجسانه)[1].

واتا: «هەموو منداڵێک لەسەر زگماک و سروشت و فیترەتی خواناسی لەدایک دەبێت، بەڵام دوایی باوک و دایکی دەیکەنە جوولەکە، یان دەیکەنە نەسرانی، یان دەیکەنە مەجووسی.»

کەواتە ژینگە و بارودۆخ کاریگەری دەبێت لەسەر لاوازکردنی ئەو هەست و سیفەت و ڕەوشتانە و کەمیان دەکات و ونیان دەکات و خامۆشیان دەکات بەڵام هەرگیزا و هەرگیز نامرن و کاتێک هەردێت دەربکەون.

٤- ئەو سیفەت و ڕەوشت و هەستانە، دەکرێت کپ بکرێن، بەڵام بە تەواوی نامرن. (بالقوة) هەر دەمێنن، بۆیە دەبینن هەیە درۆزنە، ستەمکارە، خیانەتکارە، وەنەبێت ڕاستگۆیی و دادگەری ئەمانەت لە دڵ و دەروونیدا نەمابێت، نەخێر (بالقوة) ماون، بەڵام خەفەکراون و کپی کردوون، بەڵام هەر هەست دەکات کە

---

(١) متفق عليه، البخاري، برقم (١٢٩٢)، ومسلم برقم (٦٩٢٦)، عن أبي هريرە.

کارێکی هەڵە دەکات.

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی ئەو چوار سیفەت و تایبەتمەندییانەی هەن ڕەوشت و خوڕەوشتی بابەتی.

کەواتە مادام ئەو ڕەوشت و سیفەتانە بەو شێوەیە بن، گشتین و پێوستیان بە فێرکردن نییە، هەربۆیە پێویستە سەرچاوەکە ئەو سێ سیەفەتانەی هەبن:

١- توانای ڕەها، واتا: دەبێت تواناکەی توانایەکی ڕەها بێت، چونکە ئەو بەها (قیەمە) ڕەوشتیانە و ئەو هەست و سیفەتانە بە کردەیی بوونیان هەیە لای هەر هەموو خەڵک و گشتین لە نێوان هەموو مرۆڤ و مرۆڤایەتی وکۆمەڵگا جیاوازەکان و شوێنە جیاوازەکان. کەواتە مەحاڵە و ئەستەمە کە سەرچاوەی مرۆڤ بێت یان کۆمەڵگایەک لە کۆمەڵگاکان بێت، چونکە ئەو کەسە دەبێت ئەو توانایەی هەبێت کە ئەو ڕەوشت و هەست و سیفەتانە بگشتێنێت، هەروەها شتێکی حاشا هەڵنەگرە کە کەس ناتوانێت ئەو کارە بکات، کەواتە تەنیا خوای گەورە مایەوە، کە ئەو کارەی کردبێت و بیکات.

٢- زانستێکی ڕەها و گشتی، واتا سەرچاوەی ئەو ڕەوشت و سیفەت و هەستانە دەبێت زانستێکی ڕەهای هەبێت و گشتی بێت و بگات بە هەموو خەڵک، چونکە گشتاندنی ئەو ڕەوشت و سیفەت و هەستانە و کردنیان بە یاسایەکی گشتی بەدڵنیاییەوە زانستێکی ڕەهای دەوێت کە ئەو زانستە ئەوەندە گشتی بێت، ئیحاتەی هەموو کەس و حاڵەکان بکات و بیانگرێتەوە. کەواتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت سەرچاوەی ئەوانە ناکرێت غەیری خوا بێت، چونکە هیچ کەسێک ئەو جۆرە زانستەی نییە کە بتوانێت هەموو کەس و بارودۆخ و کات و شوێن و کۆمەڵگە و ژینگە جیاوازەکان بگرێتەوە بەبێ جیاوازی. شتی وا هەرگیز ناکرێت و نابێت، کەواتە ئەوەی خاوەن ئەو جۆرە زانستە بێت تەنیا خودای پەروەردگارە.

٣- حیکمەت و دانایی ڕەها، واتا سەرچاوەی ئەو ڕەوشت و سیفەت و هەستانە دەبێت خاوەن حیکمەت و داناییەکی ڕەها بێت، بە شێوەیەک تەواو تەواو یەک بێتەوە لەگەڵ فیترەت و سروشتی مرۆڤ و خاوەن ویست و داناییەکی وەها بێت کە ئامانجدار و مەبەستدار بێت، بەرەو ئاڕاستەیەکی وا بڕوات کە سەد لە سەد لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤایەتی بێتەوە و تێگ نەگیرێت. بۆیە لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە ناکرێت سەرچاوەی ئەو هەموو ڕەوشتە جوان و گونجا و پەسەندانە ماددە بێت، چونکە ماددە نە زانستی هەیە، نە توانای هەیە، نە حیکمەت و دانایی هەیە کە بتوانێت ئەوانە لەناو ناخی مرۆڤدا بچێنێت و بچەسپێنێت، بەیەک ئاڕاستە ئاڕاستەی هەموو مرۆڤ و مرۆڤایەتی بکات لەگەڵ جیاوازی کات و شوێن و سەردەم، کۆمەڵگە و ژینگە و...، کەواتە کێ ئەوانەی چاند؟!

**دەتوانین بەڵگەی ڕەوشتی بەو شێوەیە کورت بکەینەوە:**

١- پەیوەستکاری ڕەوشتی بوونی هەیە.

٢- ناکرێت ئەو پەیوەستکارە سروشت و ماددە بێت.

٣- ناکرێت ئەو پەیوەستکارە پاڵنەری کۆمەڵایەتی بێت.

٤- ناکرێت ئەو پەیوەستکارە غەیری کەسی بێت (شخص)، واتا دەبێت کەسێک بێت کە پەیوەستی بکات.

٥- پەیوەستکاری ڕەوشتی پێویستە سەرچاوەیەکی شەخسی بێت و ئەو سەرچاوەیە هێز و زانست و داناییەکی زۆر زۆری هەبێت کە بتوانێت لە ناو ناخی مرۆڤدا بیسەپێنێت و بیچەسپێنێت و بیروێنێت.

**دەتوانین کورتتری بکەینەوە، بەم شێوەیە:**

١- ئەگەر خوا نەبێت، بەها (قیەم) ی ڕەوشتی بابەتی بوونی نابێت.

٢- قیەمی ڕەوشتی بابەتی بوونی هەیە.

٣- کەواتە: خوا بوونی هەیە.

کەواتە ناوەڕۆکی بەڵگەی ڕەوشتی بە باش و خراپیەوە، ناکرێت لە ئەندامێکی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتبێت، ناشکرێت لە ویست و هەڵبژاردەی زەوقی کەسییەوە سەرچاوەی گرتبێت، ناشکرێت لە عادەت و عورف و کۆمەڵگە و ئابووری... سەرچاوەی گرتبێت. چونکە ئێمە گوتمان دەبێت سەرچاوەکە زانست و توانا و حیکمەتی ڕەهای هەبێت. ئێ دیارە کە هیچ کام لەوانە و غەیری ئەوانەش ئەو تایبەتمەندییەیان نییە، کەواتە تاکە ڕێگەچارە و تاکە تەفسیر بۆ ئەو ڕەوشتانە ئەوەیە کە بڵێین:

ڕاستییەکی گەردوونی جەوهەری بەرز هەیە بەسەر هەموو شتە ماددییەکان لە ناویشیاندا مرۆڤ، ئەوانە هەر هەموویان تەسەوری کەماڵی خوای گەورەن، کە دڵ و دەرون و ناخ و فیکر و عەقڵ و سروشتی مرۆڤی لەسەرئەم ڕەوشتانە دامەزراندووە و تێیدا چاندووە و پەیوەستی کردووە.

دەتوانین بەڵگەی کانتی لەسەر بوونی خودا بەم شێوەیە کورت بکەینەوە

١. خێر و چاکەی هەرە بەرز و گەورە لەلای مرۆڤ بریتییە لە هێنانەدی بەختەوەری و جێبەجێکردنی ئەرک و واجبەکان.

٢. هەموو کەسێکیش لەسەری پێویستە هەوڵی خێر و چاکەی هەرە گەورە بدات.

٣. مرۆڤیش لەتوانایدایە ئەوە جێبەجێ بکات کە لەسەری واجب و پێویستە.

٤. بەڵام مرۆڤ و مرۆڤایەتی بێتوانان لە هێنانەدی ئەم خێر و چاکە هەرە گەورە و مەزنە لەم دونیایەدا.

٥. کەواتە مرۆڤ پێویستی بە ژیانێکی دیکەیە لە جیهانێکی دیکەدا بۆ ئەم

مەبەستە (هێنانەدی خێر و چاکەی هەرە گەورە و مەزن)، ئەم جیهان و ژیانەش بریتییە لە ژیانی قیامەت و دوارۆژ.

٦. ڕۆژی دواییش پێویستی بە خودا هەیە و بەبێ خودا نابێت.

٧. کەواتە خودا بوونی هەیە.

بەڵگەی کانتی ئەوەندەی پشتدەبەستێت بە عەقلانیەتی میتۆدی ئەخلاقی، ئەوەندە پشت نابەستێت بە سروشتی ئەخلاق، بۆیە دەتوانین بڵێین بەڵگەی کانت بەڵگە نییە لەسەر بوونی خودا، بەڵکوو بەڵگەیە لەسەر دادگەری و عەدالەتی خودا لە دوای مردن، بۆیە دەشتوانین بەم شێوەیە بەڵگەی کانتی بخەینەڕوو:

١. مامەڵە لەگەڵ ئەخلاقدا مامەڵەیەکی عەقڵانییە.

٢. مامەڵەی ئەخلاقی تەنیا کاتێک عەقڵانی دەبێت کە عەدالەت و دادەگەری بێتەدی.

٣. دادگەری و عەدالەتیش تەنیا کاتێک دێتەجێ کە خودا بوونی هەبێت.

٤. کەواتە: خودا بوونی هەیە.[1]

## کانت و ئەخلاق

کانت بە کۆڵەکەی قوتابخانەی وەزیفەتگەرا دادەنرێت، قوتابخانەی وەزەیفەتگەرا یان ئەرکگەرا «Denotologism» جەخت لەسەر ئەرک و وەزیفە دەکاتەوە و پێی وایە دەبێت مرۆڤ بە ئەرک و وزیفە (واجب) ی خۆی هەستێت، ئیدی دەرەنجام چی دەبێت گرینگ نییە، واتە بۆ بڕیاردان لەسەر ئەخلاقیبوون

---

(1) The Kantian Moral Argument
http://WWW.philosophyofreligion.info/theistic-proofs/ the-moral-argument/ the kantian-moral-argument/

و ئەخلاقی نەبوونی کارەکان دەڕوانێتە خودی کارەکان، بۆنموونە کانت دەڵێت: ڕاستگۆبە ئەگەر بەهۆیەوە هەموو گەردوون لەناوبچێت! واتە لێرەدا کانت ڕووانییە خودی کارەکە، جا سەرەنجامەکەی چی دەبێت و چی نابێت، سوودی دەبێت یان زیان، ئەوە بەهیچ جۆرێک نابێت لەبەرچاو بگیردرێت.

ئەم تیۆرەیە لەسەر دوو بنەمای سەرەکی وەستاوە:

١. هەموو ڕێسا ئەخلاقییەکان شتی عەقڵین، واتە عەقڵ دەیانسەلمێنێت.

٢. مادام یاسا و ڕێساکان عەقڵین، ئەرکی هەموو مرۆڤێکە لە هەموو کاتِ و شوێنێکدا و بەبێ ڕیزپەڕ (استثناء) بەگوێیان بکات.

کەواتە بەم پێیە ئەگەر هەموو دونیا وەستا بێت لەسەر شتێکی نائەخلاقی وەک درۆ، نابێت بیڵێی، چونکە ئەمە شتێکی عەقڵی و گشتییە، کە عەقڵی و گشتی بوو ئیدی لێ لادانی ناکرێت.[1]

---

(١) بەڵام ئەم تیۆرییە چەند کێشەیەکی زۆر زەقی هەیە:
کێشەی یەکەم: ئەم تیۆرییە تیۆرییەکی تایبەتە و گشتی نییە، بە واتایەکی تر نوخبەگەرا و دەستەبژێرگەرایە، واتە هەموو کەس نە پێی دەکرێت، نەدەشیکات، چونکە ئەمانە زۆر کەمن، کە لانەدەن لە یاسا عەقڵییە گشتییەکان، لە سنوورە ئەخلاقییەکان، کەواتە هەر لەسەرەتاوە ئەم تیۆرییە بوو بە نوخبەگەرا و دەستەبژێرگەرا و شۆڕنەبووەوە بۆ ناو هەموو چین و توێژ و ئاستەکان.
کێشەی دووەم: ئەم تیۆرییە دژە شهودییە، واتە حیساب بۆ شتە جوزئی و بەشەکییەکانی ناو کۆمەڵگە ناکات، حیساب بۆ بارودۆخ و سیاق و ....، جیاوازەکان ناکات، چونکە دەکرێت شتێک بەپێی یاسا گشتی و عەقڵییەکان شتێکی ئەخلاقی بێت، بەڵام لە سیاق و بارودۆخێکی دیاریکراودا وانەبێت، بۆنموونە کەسێک نەخۆشی دڵی هەیە و بەرگەی هەواڵ و کارەساتی لەناوکاو ناگرێت، بەڵام تۆ بێی ڕاستەوخۆ و بێ چەندوچوون هەواڵی کوژرانی کوڕەکەی، یان وەرگەڕانی ئۆتۆمبێلەکەی، یان خنکانی، یان ....، پێ بدەی! باشە لێرەدا دەکرێت بڵێی با حەقیقەت دەرخەم و نەیشارمەوە، چونکە دەرخستنی حەقیقەت یاسایەکی گشتییە؟! نەخێر، لێرەدا هەستە شهودییەکەت دێت و پێت دەڵێت کامە گونجاوتر و ڕاستر و باشترە. کەواتە ئەوەش یەکێکی دیکە لە کێشەکانی ئەم تیۆرییە.
کێشەی سێیەم: هاودژی و تێکگیرانی ئەخلاقییە گشتییەکان، بۆنموونە ڕاستگۆیی و وەفا، هەردووکیان دوو شتی ئەخلاقی بەرزن، بەڵام هەندێک جار لە کات و شوێن و بارودۆخ و

## پێناسەی پێویست (واجب) لەلای کانت

کانت بەم جۆرە پێناسەی واجب دەکات: "زەرورەتی جێبەجێکردنی کارێکە وەک ڕێزنان لە یاسای عەقڵی لە خودی خۆیدا."

کانت دەستەواژەی واجب دیاریدەکات لەڕێگەی پووچکردنەوەی هەموو ئەوەی ئەخلاقی نییە، هەروەها لەڕێگەی هەموو ئەوەی بەرهەڵستکارە لەگەڵ پێویست (واجب)، وەک درۆ، ستەم، خیانەت و ناپاکی، دزی، تا بگاتە ئەوەی تەنیا ئەخلاقییە و بەپێی (واجب) ڕێگە بگرێتەبەر. مرۆڤ درۆ دەکات، چونکە دەخوازێت کەسی بەرانبەر بخەڵەتێنێت، وەک چاوبڕین لە سوود و قازانجێک، بەڵام ئەوەی کارەکە ئاڵۆز دەکات ئەوەیە کە کانت هەموو ئەو کارانەش وەلا دەنێت کە ڕواڵەتیان کاری چاک و پاکن، بەڵام لە ویستی خێرەوە (لە واجبەوە) سەرچاوەیان نەگرتووە و هەڵنەقووڵاون، چونکە پێی وایە مەیلێکی دیکە هەیە (لە سوود و قازانج) لە پاڵنانیان بۆ ئەو جۆرە کارانە، وەک ڕەفتاری شیرین و جوانی خاوەن کار لەگەڵ کرێکار فەرمانبەرەکانی بەردەستی، کە دەکرێت هۆیەکەی هاندانی بەردەستەکانی بێت بۆ دڵسۆزی و باش کارکردن و لەوێشەوە سوود و قازانج بە خاوەن کارەکە، هەرکات ئاکارێک لە هەستکردن بە پێویست (واجب)ەوە سەرچاوە نەگرێت لەلای کانت کارێکی ئەخلاقی نییە.

بۆ پێویست (واجب) لەلای کانت ئەوەیە کە بۆئەوەی کارێک ئەخلاقی خێر بێت، دەبێت بەپێی بنەمای واجب بێت، واتە لە ڕێزگرتن لە بنەمای واجب

---

سیاقی جیاوازدا تێکدەگیرێن، بۆنموونە کەسێک ڕایکردووە و هاتووە بۆ لای تۆ، لە ترسی ئەوەی بیکوژن، تۆش بەڵێنت پێی داوە، دوایی ئەوانەی بەدوایەوەن، دێن و دەڵێن: فڵان کەس لەلای تۆیە؟ تۆ چی وەڵام دەدەیەوە؟ ئەگەر بڵێی نەخێر، ناڕاستت وتووە، ئەگەریش بڵێی بەڵێ، وەفات نەبووە و خیانەتت لە بەڵێنەکەت کردووە. کەواتە لێرەدا ڕاستگۆیی و بەوەفابوون تێکگیران، بەڵام کامیان ڕاستە؟ کەواتە دیسانەوە بەپێی ئەم یاسایە تووشی کێشە و تێکگیران بووینەوە، کە دەربازبوون لێی ئەستەمە.

کارەکە هەڵقوڵابێت، چونکە زۆرن ئەوانەی حەزێک سوود و قازانجێک پاڵیان پێوەدەنێت بۆ کردنی کارەکە، واتە ئەوەندە بەس نییە کە ئەنجامەکان و ڕواڵەتەکان پڕاوپڕبن لەگەڵ داخوازی واجب، بەڵکوو دەبێت کارەکە لە واجبەوە سەرچاوەی گرتبێت.

کەواتە هەموو ئەو کارانەی لە مەیل و حەزەوە سەرهەڵدەدەن بەبێ پاڵنەری واجب خاڵین لە بەهایەکی ئەخلاقی.

کەواتە کە ڕێزی بۆ کارەکە نەبوو و هەموو پاڵنەرەکەی سوود و قازانج بوو، ئەوە بەهایەکی ئەخلاقی نییە.

**تایبەتمەندییەکانی واجب**

١. واجب یاسایەکی گشتی و گشتگیرە و هیچ پەیوەندییەکی بە گۆڕانە ئەزموونییەکانەوە نییە.

٢. واجب پاکە و دوورە لە هەموو مەبەستێک، واتە هیچ پاڵنەرێکی لە پشتەوە نییە بۆ گەیشتن بە سوود و قازانجێک یان گەیشتن بە بەختەوەری، بەڵکوو لە خودی خۆیدا داواکراوە. واجب بەهاکەی لە خودی واجبەکە خۆیدایە، بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ شتێکی دەرەکی، مرۆڤ تاکە بوونەوەرە کە واجبێک دەکات لە کاتێکدا دەزانێت بەهای فەزیلەت زیاد دەکات بە زیاد بوونی ئەرک و زەحمەتییەکەی، بەبێ ئەوەی هیچ سوودێکیشی بۆ بێت.

٣. واجب یاسایەکی پێشینەییە (اولی وسابق) لەسەر هەموو وێناکردنێکی تەجریبی و ئەزموونی، یاسایەکە مەرجدار نییە بەهیچ مەرجێکەوە، هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ دامەزراندن و چەسپاندنی واجب لەسەر هیچ شتێکی تر، یان گەڕاندنەوەی بۆ شتێکی تر، چونکە واجب ئەو کۆڵەکەیەیە کە هەموو نرخاندنێکی کردەیی و عەمەلی و هەموو حوکم و بڕیارێکی ئەخلاقی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

**لە بۆچوونەکانی کانت**

ڕێسا و یاساکانی باوەڕ لەسەرووی عەقڵەوەن.

هەموو مەعریفەیەک کاری هەستەکان نییە.

مەعریفە نە هەستییە بەتەنیا نە عەقڵییە بەتەنیا، بەڵکوو هەردووکیانە بەیەکەوە.

عەقڵ ناتوانێت بەڵگە لەسەر بوونی خودا بێنێتەوە، بەڵگە لەسەر بوونی خودا عەقڵێکی خۆڕسکی فیترییە و بەناخمدا ڕۆچووە.

لەناخمدا دەنگێک هەیە بانگ دەکات بۆئەوەی خێر و فەزیلەتمان نیشان بدات، ئەو دەنگە لە دەرەوەی مەملەکەتی عەقڵە و لە ناخماندا خۆڕسکە، ئەوەش بریتییە لە دەنگی پێویست (واجب)[1].

---

(١) كانت أو الفلسفة النقدية، د. زكريا إبراهيم.
قصة الفلسفة الحديثة، د. أحمد أمين وزميله.
تاريخ الفلسفة الحديثة، يوسف كرم.
الفلسفة الحديثة، د. كريم متي.
فلسفة كانت، أميل بوترو، ترجمة: د. عثمان أمين.

# ئاڕاستەی میسالی (ئایدیالیزم)

میسالی پێچەوانەی واقیعگەرایە[1]، چونکە واقیعگەرا بڕوای بە بوونی سەربەخۆ و بابەتیانەی واقیعی خاریجی و شتەکان هەبوو لەدەرەوەی مێشک و زەینی مرۆڤ، بەڵام میسالی بەپێچەوانەوە و بڕوای بە بوونی سەربەخۆ و بابەتیانەی واقیعی خاریجی و شتەکان نییە لەدەرەوەی مێشک و زەینی مرۆڤدا. واتە داننانێت بەشتێک لەدەرەوی عەقڵدا، کەواتە ئەوەی عەقڵ دەرکی نەکات بوونی نییە، بەم پێیەش مەعریفە و وجود، زانین و بوون دەبنە یەک شت، زانینی هەر شتێک بوونەکەیەتی، زانین و بوون دوو ڕووی یەک دراون. کەواتە بەم پێیە سروشتی مەعریفە هەمان سروشتی بوونە، بۆنموونە تۆ کاتێک سەیری گڵۆپی ماڵەکەی خۆت دەکەی، بنین و هەستکردنی تۆ بۆ گڵۆپە خودی گڵۆپەکەیە، کەواتە لێرەدا ئەوە نییە بڵێی شتێکی سەربەخۆ هەیە لەدەرەوەی مێشکمدا و وێنەیەکیش لەدەرەوە، بەڵکوو هەموو بوونی گڵۆپەکە بریتییە لەو وێنەیەی کە لە مێشکدایە و بەس.

---

(١) ڕێبازی واقیعگەرا (ڕیالیزم)
واقیعی دەرەوە و خاریجی و هەستپێکراو (وەک دار و بەرد و ئاو و ڕووەک و ئاژەڵ و ...) بوونی سەربەخۆیان هەیە، ئەوە ئەوانن سەرچاوەی هەست و وێناکانمان، جا زەینی مرۆڤ پەی پێیبات یان نا، بۆنموونە تۆ هەست بەم شاخە بکەی یان نا، شاخ بوونی هەر هەیە. تۆ دەرکی درەخت بکەی یان نا درەخت بوونی هەیە. کەواتە واقیعی دەرەوە ناوەستێتە سەر دەرک و زەین و مێشکی تۆ، بەڵکووخودی خۆی بوونی هەیە بەبێ وەستانە سەر تۆ.
ئەم ڕێبازەش دوو لقی لێ دەبنەوە:
١. واقیعگەرای سادە
٢. واقیعگەرای ڕەخنەگرانە
هەموو ئەمانەمان لەباسی مەعریفەتناسیدا بەدرێژی باسکردن.

ڕێبازی میسالی ئایدیالیزم چەند جۆرێکی هەیە:

١. ئایدیالیزمی (میسالی) مەوزوعی و بابەتی

٢. ئایدیالیزمی (میسالی) زاتی و خودی

٣. ئایدیالیزمی (میسالی) ڕەخنەیی

٤. ئایدیالیزمی (میسالی) ڕەها

٥. ئایدیالیزمی (میسالی) فیزیایی

هەموو ئەمانەمان لە باسی مەعریفەتناسیدا بەدرێژی باسکردن.

# ئاراستەی ناعەقڵانی

هەروەک لەسەردەمی نوێدا و بەدیاریکراوی لەسەدەی حەڤدەیەمدا، گەشەسەندنی ئاراستەی عەقڵانی بەخۆوە بینی، لە پاشان لەسەدەی هەژدە کە گەشەسەندنی ئاراستەی ئایدیالیزمی ئەڵمانی بەخۆوە بینی، ئینجا دواتر و لەسەدەی نۆزدەدا ئاراستەیەکی دیکە دەرکەوت کە لە ئایدیالیزم نزیکبوو و لە عەقڵانییەت دوور، ئەم ئاراستەیە بە ئاراستەی «ناعەقڵانی» ناسرا، چونکە لەلای ئەم ئاراستەیە و فەیلەسووفەکانی حەقیقەتی ڕەها شتێکی دیکە و عەقڵ نییە، ئەو شتەش پێی دەوترێت ویست (الارادة، Wil)، بەناوبەنگترین فەیلەسووفەکانی ئەم ئاراستەیە «شۆبنهاوەر و نیچە»ن.

## شۆبنهاوەر (١٧٨٨ - ١٨٦٠)

شۆبنهاوەر بناغەی فەلسەفەکەی لەسەر فەلسەفەی کانت بنیاتنا، لە تێڕوانینی شۆبنهاوەرەوە دوو فەیلەسووفی زۆر گەورە و کاریگەر هەبوونە، یەکیان ئەفلاتوون و ئەوی تریان کانتە، پێی وابوو بناغەی فەلسەفەی ڕۆژئاوا لەسەر ئەم دوانە بنیاتنراوە، پێی وابوو فەیلەسووفانی تر لە فەلسەفەکەیاندا ناوڕۆکێک و ناواخنێک بوونی نییە، بۆیە هات فەلسەفەکەی خۆیشی لەسەر ئەم دوانە و بەتایبەت کانت دامەزراند. کانت پێی وابوو دوو جیهان هەیە، نۆمێن و فینۆمێن، نۆمێن واتە جیهان لەخودی خۆیدا، جیهان وەک ئەوەی کە هەیە، بە چاوپۆشی و بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە چۆن دێنە ناو هەست و عەقڵمانەوە. جیهانی فۆنۆمێنیش جیهانی هەست و زانینی ئێمەیە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی خودی

شتەکان خۆیان، واتە جیهانی ڕووکەش، جیهانی دیار لە ئێمە، واتە نزیک لەو دوو جیهانەی لە ئاییندا باسکراوە، جیهانی غەیب و جیهانی شەهادەت، جیهانی دیار و جیهانی نادیار. شۆبنهاوەر ئەو بۆچوونەی کانتی قبوڵکرد و پێی وابوو بەڵێ دوو جیهان هەیە و هیچ شتێکیش تاوەکوو کات و شوێن و کاتیگۆرەکان تێنەپەڕێنێت نایەتە ئەم جیهانە بەرهەستە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازییەک هەیە لەنێوان کانت و شۆبنهاوەردا کە ئەم جیاوازییە بووە هۆی جیابوونەوەی شۆبنهاوەر و گرتنەبەری ڕێچکەیەکی تایبەت بەخۆی، چونکە کانت پێی وابوو لەپشت ئەم جیهانەوە دەکرێت وێنای گەشبینی بکرێت، لەڕێی بڕوابوون بە ئەخلاق و خودا و نەمری ڕۆح و نەفس و ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە، چونکە وەک باسمانکرد، کانت لەگەڵ ئەوەی دەیگوت ناتوانین لە ڕێی عەقڵەوە بوون و نەبوونی خودا بسەلمێنین، بەڵام لەڕێی ئەخلاق و خۆشبەختی و گەشبینی و دەکرێت بڕوامان پێی بێت و دەبێت بڕوامان پێی بێت، ئەگەرنا ڕۆژی دوایی و ئەم دونیایەش هیچ مانایەکی نامێنێت. کەواتە کانت پێی وایە بڕوابوون بە ئەخلاق و خودا و نەمری ڕۆح کە لە پشت جیهانی بەرهەستەوەن ژیان خۆش و بەختەوەر گەشبین دەکەن، بەڵام ڕێک لەم خاڵەوە شۆبنهاوەر جیادەبێتەوە لە کانت، چونکە تا سەر ئێسقان شۆبنهاوەر فەیلەسووفێکی ڕەشبینە، بەپێچەوانەی کانت کە فەیلەسووفێکی گەشبین بوون. کەواتە هەتا ئێرە یەک شت بوون، لە گەشبینی و ڕەشبینییەوە لێک جیابوونەوە، لە خاڵێکی دیکەوە کانت و شۆبنهاوەر هاوڕابوون، چونکە هەردووکیان دژی دۆگماتیزم بوون، کانت یەکەم فەیلەسووف بوو، هات وتی حەتمەن هەندێک شت دەمێنێت، کە مرۆڤ پێیان ناگات و دەستی پێیان ناگات، واتە جیهانێکی غەیبی هەیە کە مرۆڤ ناتوانێت دەستی پێی بگات، بەڵام یەکێکی وەک دیکارت، پێی وابوو ئەگەر هەموو شتێک بۆ مرۆڤ فەراهەم بێت و تواناکانی بێ گرێ و گۆڵ بن، دەتوانێت پەی بە هەموو شتە نەزانراوەکان ببات. لێرەوە شۆبنهاوەر وەک کانت بیردەکاتەوە و پێی وایە

شتانێک هەن، یان جیهانێکی غەیبی هەیە، کە مرۆڤ دەستی پێڕاناگات، بەڵام ئەو جیاوازییەی کە هەیە ئەوەیە، کە جیهانی پشت پەردەی کانت جیهانێکی زۆر ڕوون و گەشە، بەڵام لەلای شۆبنهاوەر جیهانێکی هەتا بڵێی توندوتیژ و نابووتە، لەلای شۆبنهاوەر لەم جیهانە غەیبییەدا هێزێک هەیە ناوی «ئیرادە، ویست»ی لێدەنێت، ئەو ئیرادەیە هەتا بڵێی ئیرادەیەکی شەڕانگێز و خراپ و توندوتیژ و نامرۆڤانەیە، کە نەک مرۆڤ، بەڵکوو هەموو بوونی خستووەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، تاکە شتێک کە ئەو ئیرادەیە بیری لێدەکاتەوە، بریتییە لە زیاتر ویستن و بەرەوپێش چوون، واتە هەموو ئەو شتانەی کە خۆی دروستی کردوون، زیاتری دەوێت و دەیەوێت نەبڕێنەوە و زیاد بن، بۆیە ئەو شتەی دروستی دەکات، سەرەڕای ئەوەی لەسەررا وێرانی دەکات، ئینجا دووبارە دێتەوە و بنیاتی دەنێتەوە بەزیاتر لەپێش خۆی، بۆنموونە وەک کەسێک زۆر دەوڵەمەند کە بێت بە هەموو توانایەوە خانوییەکی ئەوپەڕ جوان و گرانبەها دروستبکات، بەهەموو وردەکارییەکانەوە، ئینجا دوای تەواوبوونی بێت بیڕوخێنێت و خانوویەکی جوانتر و باشتر دروستبکات. بەم شێوەیە، دروستبکات و وێران بکات. شۆبنهاوەر پێوایە گەردوون هەمووی ڕەنگڕێژکراوی ئەم ئیرادەیەیە و ئەم ئیرادەیەیە کە نەخشەی هەموو شتێک دەکێشێت، واتە پێش نەخشەکێشانی ئەم ئیرادەیە هیچ شتێک دیاریکراو نییە، ئەوە ئەم ئیرادەیەیە کە دێت و نەخشەی هەموو شتێک دەکێشێت و بە کەیفی خۆی تەسەروفی تێدا دەکات، کەواتە کاری ئەم ئیرادەیە، زیاتر ویستن و تێکدان و وێرانکردنە، واتە دێت شتەکان تێکدەشکێنێت و جارێکی تر بەمەبەستی زیاتر ویستن دروستی دەکاتەوە، لە ڕووکەشدا وادەر دەردەکەوێت ئەم ئیرادەیە زۆر کوێر و نەزان بێت، بەڵام شۆبنهاوەر پێی وایە نەخێر، ئەم ئیرادەیە زۆر زانایە، چونکە لەگەڵ ئەوەی ئەم ئیرادەیە کاری وێرانکردن و لەناوبردن و زیاتر ویستنە، بەڵام وای لە خەڵک گەیاندووە کە بۆ ئەوان و لەپێناو ئەواندا کار دەکات، زیرەکی ئیرادە لەلای شۆبنهاوەر لەوەدایە

کە هەڵماندەخەڵتێنێت. ئەوەتا لەناومان دەبات و بەڵام واتێدەگەین دەرفەتمان پێدراوە بۆ گەیشتن بەبەختەوەری، کەواتە ئەم ئیرادەیە کاری زیاتر ویستنە لەپێناو زیاتر ویستندا، بەڵام تا بڵێی شەڕانگێز و بێبەبەزەییە و واشمان نیشان دەدات زۆر بەبەزەییە و بۆ بەختەوەری ئێمە کار دەکات، شۆبنهاوەر بۆ ڕوونکردنەوەی هەموو ئەوەی کە وتی، چەند نموونەیەک لە سروشتدا دەهێنێتەوە، بۆنموونە جۆرە پەپوولەیەک کە ئەم ئیرادەیە دەیخولقێنێت و لە قۆزاخەکەی دێتە دەرەوە، هەموو ئەندامێکی هەیە و بەتەواوی دەیهێنێتە بوون، ئەندامی هەرسیشی هەیە، دوای ئەمە دێت گەرایەکی یەکجار زۆر دادەنێت، دوای گەرا دانانەکە برسی دەبێت، دەچێت دەگەرێت بۆئەوەی خواردن بخوات، بەڵام سروشت لەبیری چووە ئەندامی خواردنی بۆ دابنێ، کە دەم و زارە. ئەم پەپولەیە ئەندامی هەرسی هەیە، بەڵام زاری نییە، کەواتە دوای گەرا دانان و زۆرکردنی جنسی خۆی، لەبرسا دەمرێت. شۆبنهاوەر پێی وایە لێرەدا ئەم ئیرادەیە تەنیا مەبەستی زیادبوونی ئەم پەپولەیەیە و هیچ گوێ لێ نییە دوایی تووشی چ نارەحەتی و ئازارێک دێت، لەخەمی ئەوەدا نییە، دەنکە گەنمێکی بۆ فەراهەم بکات و بتوانێت شتێک بخوات، یان نموونە بە جۆرە کیسەڵێک دەهێنێتەوە کە لە کەنارە ئاوەکانی زەریای هێمندایە، ئەم کیسەڵانە دەچن بۆ ئەوێ بەمەبەستی زاوزێ، دوای ئەوەی ئامانجەکەیان پێکا و خۆیان زیاد کرد، ڕەشەبای زۆر بەهێز دێت هەموویان بەو بەردانەی کەنارە ئاوەکاندا دەکێشێت و هەموویان دەمرن. واتە ئەم ئیرادەیە هێنانی بۆ ئەم شوێنە و لەسەریان وەستا تاوەکوو خۆیان زۆرکرد، هەرکە خۆیان زۆرکرد، هەموویانی لەناوبرد، کەواتە لە هەموو ئەمانەدا دەیەوێت پێمان بڵێت ئەم ئیرادەیە تەنیا مەبەستی زیاتر و زیادکردنە و بەس، بەبێ بەزەیی و ....، شۆبنهاوەر هەمان شت لەسەر مرۆڤیش جێبەجێ دەکات و دەڵێت مرۆڤیش بە هەمان شێوەیە، هەرکە ئەرکی زیادبوونی وەچە و نەوەی تەواوبوو، ئیدی وردەوردە بەرەو گۆڕ دەڕوات و دەمرێت، لەکاتێکدا

وا هەست دەکات خۆشبەختی دیوە، واتە ئەم ئیرادەیە لەگەڵ ئەم هەموو دڕەندەیی و بێبەزەییەشی بەڵام وا لەمرۆڤ دەگەیەنێت کە چاکەی لەگەڵدا کراوە، کەواتە مرۆڤ هەمووی بۆتە کۆیلەی ئەم ئیرادەیە، لە هەموو ئەمەی کە ڕابرا، ئەوە دەخوێندرێتە کە تاکە چارەسەر بریتییە لە خۆکوشتن و خۆکوژی (هەروەک لە زۆر سەرچاوەدا بەم شێوەیە ڕاڤەی بۆچوونەکانی شۆبنهاوەر کراوە)، بەڵام لە ڕاستیدا وانییە، ئەو دژی خۆکوژییە، چونکە پێی وایە خۆکوژی ڕێک جێبەجێکردنی حەزی ئەم ئیرادەیە بەبێ چەندوچوون، واتە ڕێک خۆتەسلیم کردنە بەم ئیرادەیە، کەواتە پێی وایە بەدوورکەوتنەوە لە خۆکوژی بەشێک لە حەزی ئەم ئیرادە شەڕانگێزە لەگۆڕ دەنێین. لەکۆتاییدا چارەسەریشی بۆ ڕزگاربوون لە چنگی ئەم ئیرادەیە بریتییە لە مۆسیقا. لەگەڵ ئەم هەموو ڕەشبینییەی شۆبنهاوەردا، کە وێنەی نەبووە لە مێژووی فەلسەفەدا بەڵام خۆی زۆر ژیانخۆش بوو، ژیانی بەخۆشی بەڕێکردووە و کەمترین ناخۆشی بینیوە ئەگەر نەڵێین نەیبینوە، لەگەڵ ئەوەی تەمەنیشی زۆربووە.

شۆبنهاوەر لەدوای خۆی کاریگەری زۆری داناوە لەسەر چەندان بیرمەند و فەیلەسووف، دیاترینیان نیچە و فرۆیدن. چونکە کرۆکی فەلسەفەی نیچەش بریتییە لە ئیرادەی دەسەڵات چوون بەرەو سەرە. بەنسەت فرۆیدیشەوە، فرۆید وتوویەتی ئێمە بەبێ ئەوەی هەستیش بکەین لەبەر دەرگای شۆبنهاوەرەوە لەنگەرمان گرتووە، بۆیە لەچەندا شوێن پێی کاریگەر بووە لێی وەرگرتووە، بۆنموونە «ناخودئاگایی» لەوەوە وەرگرتووە، کە دوایی بوو بە کرۆکی فەلسەفەکەی، ناخودئاگایی ئەوەیە کە شتێک دەکەی بێ ئەوەی بتەوێت، یان لە بابەتی سێکس و جنسەوە، کە بابەتێکی سەرەکی فرۆیدە، شۆبنهاوەر پێی وابوو ئەم ئیرادە شەڕانگێزە لە دوو ڕووەوە ئامانجی خۆی دەپێکێت، یەکەم: سێکس، دووەم: تووندوتیژی، چونکە دەیوت ئەم دوانە هەتا خەریکیان بی تێرنابن، تێربوونیان نییە. دەڵێت ڕێک ئەوە بریتییە لە دەسەڵاتی ئەم

ئیرادەیەیە کە هەمووومانی کردووە بەکۆیلەی خۆی، بێ ئەوەی هەست بەخۆمان بکەین، کەواتە بابەتی سێکس میراتی شۆبنهاوەرە بۆ فرۆید ماوەتەوە.

ئەگەر بشمانەوێت ئەو ئیرادەیەی کە شۆبنهاوەر باسی دەکات لە چوارچێوەیەکی ئاینی ببینینەوە ئەوە دەتوانین لە «شەیتان»ەوە وێنەیەکی نزیک لەومان دەست بکەوێت (ئەگەرچی لە زۆرشتیشدا جیاوازن، چونکە شەیتان نە خالقە، نە شۆبنهاوەریش بڕوای بەخودا هەبووە)، شەیتانیش هێزێکی خراپەکاری هەڵخەڵەتێنەرە.

کەواتە کرۆکی فەلسەفەی شۆبنهاوەر «ئیرادە»یە، نەوەک عەقڵ، هەربۆیە لە ئاراستەی ناعەقڵانی ژمێردراوە.[1]

## پوختەی فەلسەفەی شۆبنهاوەر

**١.** بوون بریتییە لە ماددەیەکی ڕەها، ئەوە هەیە بریتییە لە ماددە و بەس، هەربۆیە شتێک بوونی نییە بە ناوی خودا.

**٢.** زانست بریتییە لە هزر و ویست.

**٣.** ویست و ئیرادەی گشتی (الإرادة الكلية) لە سروشتدا هەوڵی تەنیا بۆ مانەوەی جۆرەکانە، واتە گرنگی دەدات بە مانەوەی جۆری هەموو شتێک، وەک: ڕووەک، ئاژەڵ، مرۆڤ، ....، واتە ئەم ئیرادە گشتییە مەبەستی مانەوەی تاکەکان نییە، تاکەکان چیان لێدێ با لێیان بێت، چیان تووش دەبێت لە ئەزیەت و ئازار و ناڕەحەتی و ....، کێشە نییە. ئەوە گرنگە هەر یەک لەم جۆرانە نەفەوتێن و بمێنن، بۆنموونە ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە جۆرێک لە زیندەوەر کە ناوی مرۆڤە بمێنێت، جا کێشە نییە تاک تاکیان چیان لێدێت و تووشی چ ناڕەحەتی و ئازارێک دەبن، ئەوەی گرنگە بەردەوام ئەم جۆرە لە زیندەوەر بوونی هەبێت و نەفەوتێت.

---

(١) کۆرسی مێژووی فەلسەفەی ڕۆژئاوا، د. ڕەهبەر مەحمود زادە.

٤. بۆ ئەم مەبەستەش «مانەوەی بەردەوامی جۆرەکان» ئەم ئیرادە گشتییە لەڕێی وەچەخستنەوە و زاوزێوە قەرەبووی ئەم کورتهێنانە دەکاتەوە کە لەناوچوون و مردن بەسەریان دەهێنێت. بۆیە ژیان و ژیانداران هەر دەمێنن بۆ جێبەجێکردن و هێنانەدی ئارەزووی ئەم ئیرادە و ویستە گشتییە.

٥. ژیان و بوون هەمووی شەڕ و ئازار و ناڕەحەتییە، خێر لە بووندا بوونی نییە.

٦. ئامرازی ویستی گشتی بۆ هێشتنەوەی مرۆڤ بریتییە لە عەقڵ و جینس.[١]

## نیچە

فرێدریش ویلهێلم نیچە (بە ئنگلیزی Friedrich Wilhelm Nietzsche) فەیلەسووفی بەناوبانگ، خەڵکی ئەڵمانیا (لە دایکبوون ١٨٤٤-کۆچی دوایی ١٩٠٠)؛ خاوەن بیر و ڕای ڕەخنەگر لە ئایین و فەرهەنگ.

نیچە پێش هیتلەر کۆچی دوایی کرد، بەڵام نازییەکان زۆرترین سوودیان لێوەرگرت، بەتایبەت خوشکێکی نیچە بە ناوی «ئێلیزابێت» لەگەڵ نازییەکاندا بووە و ویستوویەتی بۆچوونەکانی نیچە بۆ لای نازیەت پەلکێش بکات، بۆیە دەیوت: ئەگەر نیچە مابا یەکێک بوو لە سەرکردە و ڕێبەرانی نازییەت. نیچە بە جیاکاری لەنێوان دوو ئەخلاقدا دەستپێدەکات، یەک: ئەخلاقی هەڵکەوتووەکان، دوو: ئەخلاقی کۆیلەکان، یان ئەخلاقی سالاران و ئەخلاقی مێگەل.

ئەخلاقی هەڵکەوتووەکان لەسەر: ویستن، زۆر، زیاترویستن، تێپەڕاندن،

---

(١) ویکیبیدیا.
ومذاهب فكرية معاصرة، د. محمود مزروعة.
قصة الفلسفة الحديثة، د. أحمد أمين وزميله.
تاريخ الفلسفة الحديثة، يوسف كرم.
الفلسفة الحديثة، د. كريم متي.

خولقاندن، ئافراندن، جووڵە و حەڕەکە، ملنەدان و تەسلیم نەبوون دادەمەزرێت.

ئەخلاقی کۆیلەکان لەسەر: قانیع بوون، تەسلم بوون و شوێنکەوتەبوون دادەمەزرێت.

دوای نیچەش بۆ ڕەچەڵەکناسی زۆر سوود لە نیچە بینراوە، چونکە نیچە ڕەچەڵەکی ئەخلاقی هەڵکەوتووەکان دەگێڕێتەوە بۆ یۆنانی کۆن و پێش سوقرات، بەڵام پێی وایە دەردەسەری و چارەڕەشی لە سوقراتەوە دەست پێدەکات، چونکە کاتێک بڕیاری کوشتنی سوقرات درا، قوتابیەکانی و زیندانوانەکان و ئەوانەی بڕیارەکەشیان بۆ دابوو، وتیان بڕۆ و خۆت ڕزگار بکە و لە زیندان هەڵبێ، بۆئەوەی خۆیان لە بەژداری کوشتنی سوقراتدا ڕزگار بکەن، بەڵام سوقرات بەگوێی نەکردن و بێ سێ و دوو جامە ژەهرەکەی وەرگرت و خواردییەوە و مرد. لێرەوە نیچە دەڵێ سوقرات ژیانی لەلا هیچ بووە (چونکە فەلسەفەی نیچە فەلسەفەی ژیانە)، هەر ئەمەش شۆڕبۆتەوە بۆ قوتابییەکانیشی، بەتایبەت ئەفلاتوون، چونکە ئەمانە ژیانیان لەلای شتێکی بێ هودە بووە، بەڵام نیچە بەپێچەوانەوە پێی وایە ژیان لە هەموو شتێک گرنگترە، لە زانست و مەعریفە و ...، هەتا گەیشتووە بەوەی بڵێ هەموو شتێک خزمەتکاری ژیانە بە عەقڵیشەوە. لێرەوەیە دەڵێت هەموو شتێک بۆ پێناسەکردنی دەبێت بخرێنە ژێر ڕێکێفی عەقڵەوە، بەژیانیشەوە، بەڵام من ئەم کارە ناکەم، چونکە کە وامکرد واتە ژیانم خستە ژێر ڕێکێفی عەقڵەوە، بەڵام لەلای من دەبێت عەقڵ بێتە ژێر ڕکێفی ژیانەوە نەک بەپێچەوانەوە. بۆیە لێرەوە ڕەخنە لە هەموو فەیلەسووفان دەگرێت، چونکە پێی وایە هەموویان ژیانیان کردووەتە قوربانی حەقیقەت، وتوویانە بۆ حەقیقەت و لەپێناو حەقیقەتدا دەژیێین، لەکاتێکدا دەبێت حەقیقەت بکرێتە قوربانی ژیان، چونکە ژیان لە هەموو شتێک گرنگترە. لێرەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ یۆنان و دەڵێت: هەتا سوقرات و قوتابییەکانی نەهاتن، یۆنانییەکان، خەڵکێک بوون، بەدوای کەیفخۆشی و ڕابواردن و کێبڕکێ و ویستی دەستەڵات و توندوتیژ و ... بوون.

بەڵام کاتێک سوقرات و ئەوان هاتن، ژیانی هاوسەنگانە و موعتەدیل و هێمنانە و ... هێنا، لێرەوە ئەخلاقی کۆیلەکان هاتە پێشەوە و ئەخلاقی هەڵکەوتەکان وردە وردە کپ بوو، جا نیچە دەیەوێت ئەو ئەخلاقی هەڵکەوتانە بگەڕێنێتەوە کە خۆی لە زاڵبوون و دەستەڵات و جووڵە و ملنەدان و تەسلیم نەبوون دەبینێتەوە.

نیچە مەسیحیەتیش دەبەستێتەوە بەم بابەتەوە و پێ وایە لەسەر هەمان فەلسەفە و ئەخلاق بنیاتراوە، بۆیە وتەیەکی بەناوبانگی هەیە: مەسیحیەت هیچ نییە غەیری کوپییەکی ئەفلاتوونییەتی عەوامانە، بەڵام لە بەرگێکی نوێدا، چونکە دواتریش وەک باسمانکرد لە بابەتەکانی پێشوودا کە ئەفلاتوونیزمی نوێ تێکەڵبوو بە مەسیحەت و ...

نیچە بەوەشەوە نەوەستاو وتی فەلسەفەی مۆدێرنەش هەمووی درێژکراوەی فەلسەفەی پێشوو و مەسیحیەتە، هەموو ڕێبازەکانی وەک لیبڕالیزم و سووشیالیزم و ...، چونکە فکرێکی وەک سۆشیالیزم داکۆکی لەسەر دادگەری و کەمکردنەوەی چینەکان دەکات، دیموکراسیش بە هەمان شێوە، زۆر دژی دەوەستێتەوە، چونکە پێی وایە دیموکراسی ڕێگەخۆشکەری هاتنەپێشەوەی مرۆڤە مامناوەند و کەمەکانە، کە دیارە هەموویان سەربە ئەخلاقی کۆیلەکانن، دوای بەهۆی ئەم دیموکراسییەوە مرۆڤە هەڵکەوتووەکان دەخرێنە کەنارەوە.[1]

### پوختەی فەلسەفەی نیچە

١. نیچە بڕوای وایە بوون هەمووی لە بوونێکی ماددی بەرهەست کورتهەڵاتووە، پشت ماددە ڕەتدەکاتەوە.

٢. هەموو جێگیربوونێک لە بووندا ڕەتدەکاتەوە، لەوێوە هەموو بنەماکانی

---

(١) کۆرسی مێژووی فەلسەفەی ڕۆژئاوا، د. ڕەهبەر مەحمود زادە.

دەرەوەی مادده ڕەتدەکاتەوە، وەک بنەما ئەخلاقییەکان و بنەما لۆژیکی و عەقڵییەکان، لەکۆتاییدا دەبێتە عەدەمی و پوچگەراییەکی تەواو و هەموو بەها و قیەمەکان تێکدەشکێنێت.

٣. حەقیقەت بوونی نییە و تەنیا وەهم و خەیاڵێکە و هیچی تر، ئەوەی هەیە هەموو وەهمە و مرۆڤ لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی مێژوودا بۆخۆی بنیاتناوە، بەپێی ئارەزوو فکرییەکان و شعوور و هەستە ئەخلاقییەکان، لەکۆتاییدا بڕوای وایە حەقیقەت نسبی و ڕێژەییە.[١]

٤. پێی وایە مرۆڤ لەئێستادا بتپەرستە، بتەکانیش ئەمانەن: ئەخلاق، بەها سیاسییەکان، بنەما عەقڵییەکان، ئایینەکان، هەوڵی بۆ ئەوە بووە مرۆڤ لەوانە ڕزگار بکات، هەربۆیە کتێبێکی نووسی بە ناوی «ئاوابوونی بتەکان» (أفول الاصنام).[٢]

٥. مرۆڤ پیرۆزە، هەربۆیە دەبێت خۆی داهێنەری هەموو بنەما ئەخلاقی و عەقڵییەکان بێت، هەر ئەو دەبێت حوکم و بڕیار لەسەر هەموو شتێک بدات کە لە بووندا هەیە.[٣]

٦. خودا بوونی نییە، ئەو باوەڕەی کە هەیە تەنیا گریمانە و داهێنراوی خەڵکە و هیچی تر.[٤]

٧. سوپەرمانی کردە بەدیلی خودا، سوپەرمان واتە مرۆڤی مەزن و گەورە، پێی وایە مرۆڤێکی ئاسایی چەندە بەرزتر و باشترە لە مەیموونێک، مەزنەمرۆڤیش ئەوەندە باشترە لە مرۆڤێکی ئاسایی، مەزنەمرۆڤ (سوپەرمان) مرۆڤێکە خاوەنی ئەخلاقی هەڵکەوتەکانە و سنووری مرۆڤە کۆیلەکانی تێپەڕاندووە، کەسێکە

---

(١) نيتشه، عبد الرحمن بدوي، ل ١١٠.

(٢) نيتشه، عبد الرحمن بدوي، ل ١٦٣.

(٣) نیتشه، فؤاد زكريا، ل ٥٣.

(٤) غسق الأوثان، نيتشه، ل ٧٤.
أفول الأصنام، نيتشه، ل ٥٦.

شوێنکەوتەی کەس نییە و ژیانی خۆی لەسەر ویستی خۆی دادەمەزرێنێت. گوێ ناداتە ویستی کەسانی دەوروبەر، ئەو کەسەیە دەتوانێت ژیانی کۆیلانە بڕوخێنێت سەرلەبەر دووبارە خۆی بنیاتی بنێتەوە لەسەر بنەماکانی مەزنەمرۆڤ و ئەخلاقی هەڵکەوتەکان، ئەوکەسەیە خودا و عورف و ئایین و هەموو بیروباوەڕ و ئەخلاقەکان وەلا دەنێت و خۆی ژیانی خۆی بنیات دەنێت.(١)

٨. ئایین تەنیا لە ڕاڤەی مرۆڤە سەرەتاییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، واتە مرۆڤ لە سەرەتادا بۆ ڕاڤەی ڕووداوە سروشتییەکان هیچی دەستنەکەوت و پاڵیداوە بۆ لای خودا و دواتر ڕێگەیەکی داناوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خوادا و بەم شێوەیە وردە وردە ئایین گەشەی کرد.(٢)

٩. ئەخلاق داهێنراوی لاواز و کۆیلە و بێدەستەڵاتەکانە، بۆ ڕێگری کردن لە بەهێز و دەستەڵاتداران.

١٠. عەقیدەی ئایینی ڕێز و شکۆی مرۆڤ دەشکێنێت، چونکە دەیکاتە کۆیلەی سەرچاوەگەلێک کە لەسەرووی خۆیەوەن، ئەو سەرچاوانە حوکمی بۆ دەدەن و بڕیار لە ژیانی دەدەن، لەکاتێکدا مرۆڤ خۆی دەبێت داهێنەری بنەما عەقڵی و فکر و ئەخلاقییەکانی خۆی بێت.(٣)

١١. ئایین کاری خەڵکی عەوام و سادە و گەمژەکانە، عیبادەت و پەرستشیش بۆ کەسە لاوازەکان دانراوە، ئەوانەی ناتوانن بیربکەنەوە و عەقڵی خۆیان ڕادەستی عەقڵی غەیری خۆیان کردووە.(٤)

١٢. ئیمان بە ڕۆژی دوایی و قیامەت تەنیا هەڵاتنە لە ژیانی دونیا، ئایینەکان

---

(١) هكذا تكلم زرادشت، نيتشه، ل ٧٠.
(٢) العلم المرح، نيتشه، ل ١٤٢ _ ٢١٥.
(٣) هكذا تكلم زرادشت، نيتشه، ل ٧٣.
ونيتشه، فؤاد زكريا، ل ١٣١.
(٤) العلم المرح، نيتشه، ل ١٣٤.
هوكذا تكلم زرادشت، نيتشه، ل ١٥٢.

خورافەی ڕۆژی دواییان داهێناوە.[١]

**١٣.** ڕەخنەگرتنی لە مەسیحیەت زۆر توند بووە، کتێبێکی نووسی بە ناوی «دژەمەسیح» (نقیض المسیح)[٢] هەرچی جنێو و هێرش و .... دەیکاتە سەر مەسیحیەت و کڵێسا.[٣]

**١٤.** زۆر دژی باوەڕداران بووە، لە شوێنێکدا دەڵێت: کاتێک بگەم بە کەسێکی دیندار واجبە لەسەرم دەستم بشۆم! من باوەڕدارانم ناوێت![٤]

**١٥.** ئێمە خودامان کوشت، من و تۆ و هەموومان بکوژەکەی ئەوین، هەموو خواکان مردن.[٥]

ئەمە وتەی نیچەیە، کە هەندێک پێیان وایە، سەردەمی ئەو بەولاوە سەردەمی مردنی خودایە، مردنێکی کلتوری فەرهەنگی ڕەمزی، نەک مردنێکی فیزیایی، ئەم وتەیە لێکدانەوەی زۆری بۆ کراوە. هەندێک پێیان وایە بەڵێ خودا لە ڕووی فەرهەنگی و کلتوری و ڕەمزییەوە مردوو، تیۆریە زانستییەکانی وەک داروین و تیۆریاکانی فیزیک و ... جێیان گرتەوە ....، هەندێکی تر دەپرسن: ئایا نیتشە خۆشحاڵانە جاڕی ئەم مەرگە دەدات یان با بڵێین ئاشکرای دەکات؟ یاخود ئەم ئاشکراکردن و جاڕدانەی بەلاوە ناخۆشە؟

کەسانێک هەن پێیان وایە کە ئەو دەربڕینانەی کە نیتشە بەکاری هێناون بۆ جاڕنامەکەی ئەوە دەردەخات کە نیگەرانە بەم دۆخە لە هەمان کاتیشدا توانای هێنانی بەدیلیشی نییە گەرچی سوپەرمانەکەیشی هێنا، چونکە نیچە پێی

---

(١) غسق الأوثان، نيتشه، ل ٤٢.
نيتشه، فؤاد زكريا، ل ٢٠٩.
(٢) بەناوی (عدو المسيح) وەرگێڕدراوەبۆ عەرەبی.
(٣) نقيض المسيح، نيتشه، ل ٢٧.
(٤) هذا هو الإنسان، نيتشه، ل ١٥٩.
(٥) هكذا تكلم زرادشت، نيتشه، ل ٦٥.

وابوو مرۆڤی پێشوو و سەدەکانی ناوەڕاست، بەهۆی خوداوە دڵگەرمییەکیان پەیداکردبوو و بووبووە هۆی جووڵە و حەرەکەیەک (هەرچەند لەکۆتاییدا باوڕبوون بەم خودایەش هەر هۆکاربوو بۆ هاتنەکایەی ئەخلاقی کۆیلەکان)، بەڵام مرۆڤی مۆدێرن خوداشی لەدەستدا و خوداشی کوشت و ئەوەشی نەما، تاوەکوو تۆزێک دڵگەرمی و حەرەکەی تێدابێت و بتوانێت هەڵسووڕێت، دوایی نەشی توانی شتێک لەجێی خودا دابنێت، کەواتە حاڵی مرۆڤی مۆدێرن زۆر خراپترە لە حاڵی مرۆڤی پێشوو، هی پێشوو هێشتا باشتربوو، چونکە شتێکیان داهێنابوو بە ناوی خوداوە و تۆزێک دڵگەرمییان بۆ پەیدابووبوو، لەگەڵ سلبیاتەکانیشی.

هەندێکی دیکەیش پێیان وایە لەوەدا پێی خۆشحاڵە کە خودای کڵێسە دەمرێت بەڵام نیگەرانە بەوەی کە خودا «وک سیستمێکی بەها» بمرێت.

بۆیە زۆرێک پێیان وایە جاڕدانی مەرگی خودا لای نیتشە جاڕدانی مەرگی خودای تەورات و ئینجیلە.

بەڵام هەرچۆنێک بێت وتەکەی ئەوە دەگەیەنێت کە بێباوەڕ بووە.

هەموو ئەمانە لە کتێبەکانیدا بە ڕوونی وتووە و هیچی نەشاردۆتەوە و لە دەربڕینی بۆچوونەکانیدا بوێر بووە.

## فرۆید

«فرۆید» لە باوک و دایکێکی جوولەکە، لە نەمسا لەدایکبووە، دامەزرێنەری دەزگای شیکاری دەروونییە، هەوڵیداوە بۆچوونەکانی خۆی لە ڕاڤەکردنی گەشەی کۆمەڵگەدا جێبەجێ بکات، لەگەڵ ئایین و شارستانییەت و پەرەسەندن و خاوەنی چەندین پەرتووکە.

فرۆید بڕوای بە خودا نەبوو و ئینکاری هەموو کایەیەکی غەیبی دەکرد و لە

ڕێبازەکەی ئەودا مرۆڤ دیاردەیەکی ماددییە و بەس.

هەموو پاڵنەرەکانی مرۆڤ بریتین لە پاڵنەری (جنس) سێکس و شەهوەت و ڕێگەدانی ڕەهایی بە تێرکردنی ئارەزووی سێکسی بە هەموو شێوەیەک و بەبێ هیچ بەربەستێکی ڕەوشتی و ئایینی و کەلتووری و کۆمەڵایەتی. واتا بۆی هەیە خۆی تێر سێکس بکات هەر چۆنێک بیەوێت. نابێت بە هیچ جۆرێک ڕێگری لە تێرکردنی بکرێت بە نە بە ناوی ڕەوشت، نە ئایین، نە کۆمەڵگە، نە کلتوور، نە خێزان، نە یاسا، چونکە مرۆڤ تووشی نەخۆشی نەفسی دەبێت و زەرەر و زیانی پێدەگات.

تەنانەت هەموو منداڵێکی کوڕ تووشی نەخۆشی «ئۆدیب» دەبێت، چونکە هەر لە منداڵییەوە ئارەزوی بۆ دایکی دەچێت کە سێکسی لەگەڵدا بکات. هەروەها هەموو منداڵێکی کچ تووشی نەخۆشی «ئەلکترا» دەبێت، چونکە ئارەزووی بۆ ئەوە دەچێت سێکس لەگەڵ باوکیدا بکات.[1]

### چەند ڕەخنەیەک لە فرۆید:

١ - «پۆڵ ڤیتزی» دەروونناس دەڵێت: "تیۆری فرۆید پێش چەندین ساڵ پێش فرۆید بەڕووونی لە پەرتووکی جەوهەری مەسیحییەت لەلایەن فیورباخەوە دارێژراوە، لێکدانەوەکەی فیورباخ ناسراو بووە لە نێوەندی فکری ئەورووپی، فرۆیدیش کاتێک گەنج بووە زۆر بەتامەزرۆییەوە فیورباخی خوێندۆتەوە. فیورباخ کاریگەریەکی ڕوونی هەبووە بەسەر فرۆیدەوە و لە زۆر شوێن بەو چەمکانەی لای فرۆید ناسراون گوزارشتی لە ئایین کردووە، ئەوەی فرۆید کردوویەتی زیندووکردنەوەی هەڵوێستی فیورباخ بووە. کەسایەتی فیورباخ لە هەڵویستی فرۆید لە پەرتووکی «ئاییندەی وەهمێک»دا دەردەکەوێت، لە چوارچێوەی ئەو

(١) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة.

ڕستانەی بەکاریهێناون، وەک: هێزی سروشتی بەرزی تێکشکێنەر، هەروەها هەستی مەترسیداری نەتوانایی لە قۆناغی منداڵیدا. کەواتا بەم پێیە بێت ئەم بۆچوونانەی فرۆید کە دەربارەی ئایین وەرگیراون، پێش ئەوەی لە ئەنجامی تاقیکردنەوەوە پێی بگات، بەم پێیەش ناتوانرێت پێی بوترێت بۆچوونێکی زانستی.

٢ - فرۆید خۆی دەڵێت کە تیۆری «لەکارخستن» (اسقاط) بەشێک نییە لە شیکاری دەروونی، لە نامەیەکیدا لە ساڵی ١٩٢٧ بۆ هاوڕێی ئۆسکار فیستر، دەڵێت: "بۆچوونەکانی نێو پەرتووکی «ئاییندەی وەهمێک» ناچنە نێو شیکاری دەروونییەوە و بۆچوونی کەسی خۆمن". هەر بۆیە هاوسەردەمەکانی فرۆیدیش هەستیان بەوە کردووە، بۆیە کەسێکی وەک «میخایل باختین» دەربارەی فرۆید دەڵێت: "فەلسەفەی فرۆید، بێگومان هەندێک لە خوێنەران ناڕەزایی لەبارەیەوە دەردەبڕن لەبەرئەوەی فرۆیدییەت فەلسەفە نییە، بەڵکوو زانستیکی بێلایەنە. فرۆید باوەڕی بە نەزعەیەکی سروشتی هەیە، بەڵکوو ماددیگەراشە، لەبەرئەوە ڕێبازی بابەتی بەکاردەهێنێت. ڕاستە فرۆیدییەت پشت بە هەندێک شت دەبەستێت کە ناتوانرێت لە ڕووی زانستییەوە تانەی لێبدرێت، هەندێک تێبینی تاقیکاری کەمی زیاد کردووە". باختین پێی وایە کە فرۆیدییەت زانست نەبووە، بۆیە بە فەلسەفە ناوی دەبات و پێشی وا نییە دیدێکی بابەتی بێت، بەڵکوو دیدێکی خودی هەیە، لەگەڵ هەندێک دیدگای بابەتی.

٣ - فرۆید زانیارییەکی زۆر کەمی هەبووە بە دەروونناسیی باوەڕداران، چونکە ئەزموونێکی کەمی هەبووە لەگەڵ ئەو نەخۆشانەی بە ڕاستگۆیی باوەڕدار بوون، یان ئاییندار بوون. «عەمرو شەریفیش» دەڵێت: "فرۆید لە «ئاییندەی وەهمێک» وای دەردەخات هۆشیارییەکی تەواوی دەربارەی پاشخانەکانی باوەڕهێنان بە خودا هەیە، بەڵام لەڕاستیدا پێچەوانەیە. چونکە ئەزموونی فرۆید لە شیکاری دەروونیدا دەربارەی نەخۆشانی باوەڕدار زۆر زۆر کەمە، چونکە تەنانەت شیکاری دەروونیی بۆ تەنیا حاڵەتێکی باوەڕداریش نەکردووە. جگە لەیەک دانە نەبێت لە نەخۆشەکانی فرۆید کە کەسیکی کاسۆلیکی باوەڕدار بووە، ئەم نەخۆشە زۆر

گرنگ بووە لە لای فرۆید، بەڵام فرۆید بەرواری نەخۆشی نەخۆشەکەی دیاری نەکردووە، بۆیە هیچ بەڵگەیەکی شیکاری بۆ بیردۆزەکەی نەخستووەتە ڕوو، بەڵکوو پاشخانە دەروونییە ڕەتکەرەوەکەی بۆ خوایەتی وای لە فرۆید کردووە بەڵگەی ئەنسرۆپۆلۆژی و مێژوویی و فەلسەفی دابڕێژێت. ئەو تاکە حاڵەتەش نابێتە ئەوەی کە بڵێین: فرۆید لە دەروونناسی باوەڕداردا شارەزابووە. بۆیە تیۆرەکەی لە «فیورباخ» وەرگرتووە و هیچ بەڵگەیەکی پزیشکیشی لە شیکاری دەروونی پێشکەش نەکردووە.

٤ - «پۆڵ ڤیتز» کاتێک دێتە سەرباسی فرۆید لە پەرتووکەکەی دەڵێت: "ئەو پەرتووکانەی لەسەر ژیانی تایبەتی فرۆید نووسراون یەکدەنگن لەسەر ئەوەی باوکی فرۆید یەعقوب جێگەی بێئومێدی و بێزاری کوڕەکەی بووە. باوکی فرۆید پیاوێکی لاواز بووە، نەیتوانیوە سەرپەرشتی خێزانەکەی بکات، بەڵکوو لەلایەن کەسوکاری ژنەکەی و خەڵکی دیکەوە پارەیان پێدراوە. لە سەروو ئەوەشەوە باوکی فرۆید لاواز و هەڵوێستی نەرێنیی بووە دەربارەی ڕووبەڕووبوونەوەی دژە سامییەکان (دژە جوولەکە). باوکی فرۆید جارێک ڕێگەی داوە پێی بڵێن «جوولەکەی بێزراو» و بەوە بانگی بکەن. کاتێک فرۆید ئەوەی گوێ لێبووە هەستی زۆر بە شەرمەزاری کردووە. فرۆید کەسێکی ئاڵۆز بووە لە چەندین لایەنەوە، بەڵام ژیاننامەنووسەکانی کۆکن لەسەر ئەوەی کەسێکی بەجەرگ و ئازا بووە و بۆ چەندین جار لەگەڵ دژە سامییەکاندا ڕووبەڕوو بووەتەوە، لە سەر ئاستی فکریش یەکێک بووە لە جەنگاوەرەکان."

فرۆید دەڵێت باوکی کەسێک بووە لە ڕووی جنسییەوە لادەر بووە. «پۆل ڤیتز» دەڵێت: "هەر بۆیە لە کاتی داهێنانی چەمکی گرێی ئۆدیب و دانانی لە چەقی زانستە دەروونناسییەکەی، ئەوە بەلایەنی کەمەوە گوزارشتە لەو دژایەتییە زۆرە خۆنەویستانەیەی بەرانبەر بە باوکی هەیبووە."

پەیوەستبوونی یەعقوب بە خودا و ئایین لەبەرچاو کوڕەکەی بووە و جۆرێک بەشداری لە چاکسازی جوولەکەی کردووە کاتێک فرۆید منداڵ بووە. چەندین

کاتژمێریان پێکەوە لە خوێندنەوەی پەرتووکی پیرۆز سەرف کردووە، هەروەها باوکی فرۆید زۆر پەیوەست بووە بە خوێندنەوەی تەلمود و گفتوگۆی پەرتووکی پیرۆزی جوولەکە.

بە کورتی ئەم پیاوە لاواز و نەرمونیان و نەرێنییە بە نیسبەت کوڕەکەیەوە، بە ئاشکرا بە یەهوودییەت و خوداوە پەیوەست بووە. لەگەڵ ئەوەشدا هەم جەربەزەیی کەم بووە هەم لادانی سێکسی هەبووە، جگە لە کەموکورتی دیکە، کە جێگای ئازار بوون بۆ فرۆید. بۆیە ئەوە نامۆ نییە کە دەڵێت: "شیکاری دەروونی سەلماندوویەتی کە چۆن گەنجان تەنها بە داتەپینی دەسەڵاتی باوک باوەڕە ئایینییەکانیان لەدەست دەدەن."

دەبینین فرۆید بۆ خۆی کەوتووەتە ژێر ڕوانینە نەرێنییەکانی خۆیەوە کە بۆ باوکی هەیبوون، بۆیە ئەمە زۆر ڕوونە، وەک «پۆل ڤیتز» جوان ڕوونی کردەوە کە تیۆری فرۆید، باوک ڕۆڵێکی نەرێنی تێدا دەبینێت. ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵکردنی ڕوانینە کەسییە تایبەتەکانی خۆی و تێکەڵکردنی بە ڕوانینەکانی فیورباخ و ڤۆڵتیر. لێرەشەوە تیۆرەکەی فرۆید دەربارەی ئایین دەکەوێت و ڕەتدەکرێتەوە.

٥ - ئەگەر ڕێگەیەکیشمان دۆزییەوە بۆ تێپەڕاندنی گرفتی یەکتاپەرستی، تیۆرەکەی فرۆید تووشی گرفتی دیکەش دەبێت، بابەتێکی گرفتاویی لە لێکچواندنە ئەقڵییەکەیدا هەیە. بۆ نموونە وەکوو لە تەوتەم و تابۆ و مووسا و یەکتاپەرستیدا بینیمان، ئارگیومێنتی نێو هەردوو پەرتووکەکە دەگەڕێتەوە بۆ بەراوردکردنێکی فرهوان لەنێوان گەشەکردنی سایکۆلۆژییانە و پەرەسەندنی تاکایەتی و مێژوویی گرووپێکی کۆمەڵایەتی گەورە. ئەوەی لە ماوەی چەند ساڵێکدا ڕوودەدات، یاخود لە چەند دەیەیەکدا، ژیانی تاکە کەسێک بەراورد بکرێت بە چەندین سەدە لە مێژووی کۆمەڵگەیەک یاخود تەنانەت شارستانییەتیش، بەڵام لەو بابەتەدا ئێمە چ بەڵگەیەکی لۆجیکیانەمان هەیە،

بۆ ئەوەی گریمانەی لێکچوونێکی ڕاستەقینە یاخود پەیوەندییەکی ڕوون لەنێوان ئەم دوو شتە لێک جیاوازەدا بکەین؟[1]

---

(١) مرۆڤە بێویستەکان، ل ٥٧٣-٥٧٨. ئاڤار قەرەداغی.

# ئاراستەی ماددی (ماتریالیزم)

پوختەی بۆچوونی ئەم ئاڕاستەیە بریتییە لە: سەنتەربوونی ماددە و سەربەخۆبوونی، عەقڵیش تەنیا ئاوێنەیەکە بۆ وێناکردنی ئەو شتانەی کە هەستەکان وەریدەگرن و دەیان گەیەنن، عەقڵ تەنیا ڕەنگدانەوە و دەنگدانەوەی واقیع و ماددەیە و بەس. نموونەی ئەم تیۆریایە لە کۆندا: قوتابخانەی سروشتگەرا سەرەتایی و کۆتاییەکانی یۆنان، سوفستائییەکان، ڕەواقییەکان، ئەبیقۆرییەکان...

نموونەی ئەم تیۆریایە لە سەردەمی نوێدا: هەموو قوتابخانە ماددییە ئەزموونییەکان، داروینییەکان، مارکسییەکان، وجودییەکان، پۆزەتیڤیزمە لۆژیکییەکان (وەزعییە مەنطیقییەکان)، فۆریدییەکان، براگماتییەکان، قوتابخانەی کۆمەڵایەتی ئوگست کۆنت و دۆرکایم.

فەلسەفەی ماددیگەرایی بەئەندازەی فەلسەفە کۆنە و هەر لەسەرەتاکانی دەرکەوتنی فەلسەفەی یۆنانییەوە چەکەرەی کردووە و بەئەندازەی جیاواز خۆی دەرخستووە بە درێژایی مێژوو و ئێساشی لەگەڵدابێت، بەڵام لەسەردەمی کۆندا و لەسەرەتاکانی فەلسەفەی یۆنانییەوە ڕاڤەیەکی ماددی بۆ گەردوون و بوون دەکرا، هەریەکە و ڕایەکی هەبوو، هەبوو دەیوت ئەسڵی بوون ئاوە، یان ئاگر، یان خۆڵ و خاک، یان هەوا، یان هەموویان بەیەکەوە، بەڵام ماددیگەرایی لەلای «دیمۆکریتس» (٣٦١ - ٤٧٠ پ. ز) بەتەواوی دەرکەوت، چونکە ئەو پێی وابوو، هەموو بوونەوەرەکان لە جەوهەرە تاکییەکان پێکدێن.

بەڵام زۆری نەبرد و سوکرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ هاتن و دژی ئاراستەی

ماددیگەرایی وەستانەوە، هەرچەندە ئەرستۆش بە شێوەیەک لەشێوەکان ماددییە، بەڵام وەک دیمۆکریتسیش نابێت.

دوای ئەمانە ئەبیکۆر (٢٧٠ پ. ز) و لۆکریتیۆسی شاعیری ڕۆمانی کاریان بۆ زیندووکردنەوە ڕێبازی ماددیگەری کرد.

لەسەدەکانی ناوەڕاست و لە فەلسەفەی مەسیحی و ئیسلامیدا بەتایبەتی ئەم تەوژمە وردەوردە خامۆش بوو، تاوەکوو سەدەی حەڤدەیەم و دیسانەوە سەریهەڵدایەوە، بەڵام ئەم جارەیان لەژێر ناوی زانست و فیزیادا، ئەم تەوژمی ماددیییە هەم زانایانی گرتەوە هەم فەیلەسووفان، بۆنموونە: گالیلۆ، نیوتن، هۆبز، دێڤید هیۆم، مارکس، لینین و...، هەموو ئەم هێز و گرووتینەی پەیداشی کرد بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ بانگەشی زانست و پشتیوانەکانی، وەک زانستی جیۆلۆجی و فیزیا و بایەلۆژی، هاتن تیۆری پەرەسەندنی داروینیشیان بەکارهێنا و هەموو زیندەواران و عەقڵ و هۆش و مرۆڤیان گەڕاندەوە بۆ ماددەی کەڕ و کوێر و بێ ژیان و گیان!

## پوختەی بیر و ڕای ئاڕاستەی ماددی[1]

**١.** گەردوون پێک هاتووە لە یەک پێکهاتە کە بریتییە لە ماددە، غەیری ماددە و سروشتی هەستپێکراو شتێکی دیکە بوونی نییە.

**٢.** نکووڵی کردن لە هەموو غەیبیات و شتە پەنهانەکان، هەرچی ئەودیو سروشت و ماددە و واقیع بێت بوونی نییە، نکووڵیکردن لە خودا، واتە ئەوانە بڕوایان بە دروستکار و بەڕێوەبەری گەردوون نییە، دەڵێن: بە هیچ شێوەیەک خودا گەردوونی دروست نەکردووە بەڵکوو گەردوون هەر هەبووە، یان بۆ خۆی خۆی هێناوەتە بوون، یان بە ڕێکەوت دروستبووە، یان طەبیعەت و سروشت

---

(١) ئەمەماددی ئیلحادییە، ئەگەرنا ئێمەماددی باوەڕداریشمان هەیە کەبڕوای بەخودا یان ئایین یان ئەخلاق یان ....، هەیە، کەواتەئەم بنەمایانەهی هەموو ماددییەکان نییە.

ئەم گەردوونەی هێناوەتە بوون، یان ئەم گەردوونە خەون و خەیاڵە و لە واقیعدا بوونی نییە.

ماددییەکان و ئەزموونگەراکان بەشێوەیەکی گشتی بڕوایان بە یەکێک لە مانە هەیە. هەروەها نکووڵی لە سەرجەم ئایین و پێغەمبەران و وەحی و ڕۆح و زیندووبوونەوە و کتێبە ئاسمانییەکان دەکەن، چونکە وەک ئاماژەمان پێدا ئەوان بڕوایان بە خودا نییە، کەواتا ئاشکرایە باوەڕیان بە خودا نییە تا بگاتە سەر لق و پۆپەکانی باوەڕداری و ئایین و کتێبە ئاسمانییەکان، چونکە ئەمانە هەموویان نامادد‌ی و هەستپێنەکراو و ئەزموون نەکراون، نەک هەر ئەمە بەڵکوو پێیان وایە ئایین و پێغەمبەران شتێکی خوڕافی و ناڕاستن و بۆ خەڵکی ساویلکە و نەزان و نەفامە، تەنیا بۆ خەڵەتاندنی مرۆڤ و مرۆڤایەتی هاتووە. نەک هەر ئەوەش، بەڵکوو ئایین بە سەرچاوەی گێلکردنی مرۆڤایەتی دەزانن، وەک مارکس دەڵێت: (الدين أفيون الشعوب)، واتا: "ئایین تریاکی گەلانە" و بۆ سەرخۆشکردن و مەستکردنی نەتەوەکان و مرۆڤ و مرۆڤایەتی دروستکراوە، دیارە پێناسەکەیان لە تێڕوانینیان لە ئایینی مەسیحییەت و ئینجیل و قەشە و کڵێساوە سەرچاوەی گرتووە و دواتریش ئەو جیهانبینییەیان بەسەر سەرجەم ئایینەکاندا گشتاندووە. ئەم تیۆرییە بۆ هەموو شتێک تەفسیر و ڕاڤەی ماددی دەکات.

٣. ماددییەکان پێیان وایە ئەخلاق نیسبی و ڕێژەییە و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک و لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت. بەمەش هەر کەس لە ئاست خۆی و کۆمەڵگەکەی بۆ ئەخلاق دەڕوانێت. کەواتە نەگۆڕی ئەخلاقی و بنەمای ئەخلاقی لای ئەوان نییە.[1] ئەمەش کاریگەری نێگەتیڤ و سەرلێتێکدەری بۆ زۆربەی کۆمەڵگەکان پێشنیار کردووە، خۆ ئەگەر هاتو ئەوەی مولحیدان پێیان

(١) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب المعاصرة، (٨٠٥)، صراع مع الملاحدة، عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني (١٥٠)، كواشف زيوف في المذاهب الفكرية المعاصرة (٥١١).

ئاساییە و بۆ خۆیان بە ڕەوای دەبینن بوو بە یاسا و لە وڵاتان جێبەجێ بوو، ئەوە کارەساتی مرۆیی ڕوودەدات و دەبێتە کاری سەرپێیی و هیچ بەهایەک بۆ هیچ هەبوویەک لەنێو هیچ کۆمەڵگەیەکدا نامێنێتەوە. ئەوەتا ئەوان هیچ پێیان شەرم نییە کە مومارەسەی هەوا و ڕەگەز و ئارەزووی خۆیان لەگەڵ خوشک و دایک و کەسە نزیکەکانی خۆیان بکەن و گۆشتی منالّ بکوڵێنن و لەگەڵ گیانداران دەست تێکەڵاو بکەن و ئەوەی بووە مایەی ئاسوودەییان دەستی بۆ بەرن، ئەگەر ئاسوودەیی ئەوان لەسەر شانی بەدبەختی چواردەوریش بێت، بەڵام ئەوەی باسکرا وەک فیکر، ئەگەرنا مەرج نییە هەموویان بە کردار بییکەن یان هەموویان بەکردەیی باوەڕیان پێبێت.

٤. زانست ئەو زانستەیە کە ئەزموونی بێت نەوەک تیۆری و نەزەری. پێیانوایە هەر شتێک لە ڕێی دۆزینەوەی زانستییەوە نەزانرێت و دەرنەکەوێت بڕوای پێناکرێت، هەر شتێکیش لە ڕێگەی تاقیگە و زانستە جیاوازەکان نەدۆزرێتەوە بوونی نییە، هەربۆیە خودا دەخەنە بەر ئەو پێوەرە زانستیبانە، بۆیە باوەڕی پێناهێنن. لای ئەوان یاسا گەردوونییەکان خودان، بۆیە «داوکینز» ڕێبەری گەورەی مولحیدەکانی ئەم سەردەمە دەڵێت: "ئەگەر دەڵێن خودا بریتییە لەو سیستەمانەی ئەو بوونەوەرە بەڕێوەدەبات، ئەوا ئێمەش بڕوامان بەو خودایە هەیە، بەڵام پێمانوایە ئەو سیستەمانە پێویستیان بەوە نییە لێیان بپاڕێینەوە بۆ ئەوەی بە هانامانەوە بێن."

٥. سەرچاوەی مەعریفە و زانین تەنیا هەست و میتۆد و مەنهەجی ماددییە و غەیری هەست و ماددە و ئەزموون هیچ شتێکی تر جێگەی متمانە پێکردن نین بە عەقڵیشەوە، عەقڵ تەنیا بۆ لێکدانەوەی ئەمانەیە.

٦. زۆربەی ماددی و ئەزموونگەراکان بۆ ڕاڤەی گەشەسەندنی ژیان بڕوایان بە تیۆری داروین هەیە و پێیان وایە زیندەوەران بە پەرەسەند بەمرۆ گەیشتوون و هیچ هێز و دەستەڵاتێکی دەرەکی لەدەرەوەی ماددە و بوون و گەردوون کاریگەری نەبووە و بوونی نییە، بەڵکوو بۆخۆی گەشەی سەندووە و پەرەی سەندووە!

# ئاراستەی پۆزەتیڤیزم (وەزعی)

پۆزەتیڤیزم لەو ئاراستانەبوو کە دوور کەوتەوە لە مێتافیزیکا، ئەم ئاراستەیە و هاوشێوەکانی بەرەو ئەوە ڕۆیشتن کە وا لە جیهان و بوون بڕوانن کە سیستەمێکی سروشتییە و بەگوێرەی یاساگەلێکی دیار و دەستنیشانکراو دەڕوات بەڕێوە، لە گرنگترین فەیلەسووفەکان: «ئۆگست کونت، جۆن ستیوارت میل، هربر سپنسەر»: ئەم ئاراستەیە لەلایەکەوە بە جۆن لۆک لە لەلایەکی دیکەوە بە کانت کاریگەرە.

## ئۆگست کۆنت

ئۆگست کۆنت (١٧٩٨ - ١٨٥٧ ز) فەیلەسووفێکی فەڕەنسییە، لە خێزانێکی مەسیحی زۆر پابەند بە کاسۆلیکییەوە هاتووەتە دونیاوە[1]، دامەزرێنەری

---

(١) «ئیزادۆر ئوگست ماری فرانسۆ گزاویە کۆنت»، بە فەڕەنسی: (Auguste Comte) لە ساڵی ١٧٩٨ لە شاری مونپیلیە لە باشووری وڵاتی فەڕەنسا لە خیزانێکی کاسۆلیکی ئیماندار لەدایک بووە. لە سەردەمیکدا کە بارودۆخیکی دژوار و ناسەقامگیر باڵی بەسەر ولاتدا کێشا بوو. شۆرشی فەڕەنسی لە هەڵگیرساندا بوو. باوکی «کۆنت» فەرمانبەرێکی حوکوومی بوو لە وەزارەتی دارایی کاری دەکرد و یەکێک بوو لەو کەسانەی کە دژی شۆرشی فەڕەنسی بوو. دایکیشی ئافرەتێکی ئیمانداری کاسۆلیکی بوو کە ژیانی خۆی تەرخان کردبوو لەپێناو خزمەتکردنی خێزانەکەیدا. لە تەمەنی لاویەتیدا دوو ڕووداوی گرنگ لە ژیانی کونتدا بەرجستە دەبێت یەکەم ڕووداوی گرنگ لە تەمەنی (١٦) ساڵیدا بوو کاتێک پەیوەندی کرد بە قوتابخانەی «پۆلی تەکنیک»ەوە کە یەکێک بوو لە قوتابخانە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە، بەتایبەت لە زانستەکانی وەک «بیرکاری، فیزیا، کیمیا، بایۆلۆژی»، بەڵام ئەم قوتابحانەیە گرنگی ئەوتۆی نەدەدا بە زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان کە خولیای کۆنت بوو، بەڵام ئەمە نەبووە ڕێگر لەبەردەم کونتدا بەلکوو بە پێچەوانەوە لە ماوەیەکی کورتدا توانی خۆی بگونجێنێت لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا و یەکیک بوو لە خوێندکارە لێهاتووەکانی هەمان

قوتابخانە. ئەو دەیویست نەک هەر ئەوەی کە قوتابخانە تەواو بکات، بەڵکوو دەیویست دوای تەواوکردنی خوێندن لە هەمان قوتابخانە وانە بڵێتەوە، بەڵام بەهوی بەشداری کردنی کۆنت لە خۆپیشاندانێکی خوێندکارانی ئەو قوتابخانەیە کە لە ساڵی (١٨١٦)دا ڕووی دا، چیدی کۆنت نەیتوانی بەردەوام بێت لە خویندن لەو قوتابخانەیدا بەهۆی ئەوەی کە کۆنت لەگەڵ هەندی لە هاوڕێیانیدا لە خوێندن بێبەش کران, مافی خوێندنیان لەو قوتابخانەیەدا نەما. دووهەمین ڕووداوی گرنگ لە ژیانی ئوگست کونت لە هاوینی (١٨١٧) ڕووی دا کاتێک ئاشنایی پەیدا کرد لەگەڵ یەکێک لە زانا و فەیلەسووفەکانی ئەو سەردەمەدا کە ئەویش «کلود ئەنری سان سیمۆن» بوو، هەرچەندە «سان سیمۆن» سەر بە ئەرەستۆکراتییە فەرەنسییەکان بوو، بەڵام لەمیانی شۆرشی فەرەنسیدا بووە یەکێک لە ئیشتراکییە نموونەییە بەناوبانگەکان، ئەو کاتەی کۆنت ئاشنایی پەیدا کرد لەگەڵ سان سیمۆندا، تەمەنی سان سیمۆن لە سەرووی (٦٠) ساڵییەوە بوو، یەکیک بوو لەو بیریارانەی کە چاوەڕوانی لێدەکرا دەستێکی باڵای هەبێت لە چاکسازیکردن و ڕێکخستن و چارەسەرکردنی بەشێکی زۆری کێشەکانی ئەو سەردەمەدا. پەیوەندییەکانی نێوان ئەم مامۆستا و سکرتێرە ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتر دەبوو بەتایبەت لە بواری زانستیدا بە ڕادەیەک کە زۆر ئەستەمە کارەکانیان لە یەک جیا بکەینەوە ئەمەش لە کارە هاوبەشەکەیاندا دەردەکەوێت بە ناوی «پلانی پرۆسە زانستییە پێویستەکانی دووبارە ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگا». خاڵی سەرەکی سەنتەری کاریان بریتیی بوو لە یەکخستنەوەی سیاسەت و فیزیای کۆمەڵایەتی، بە واتایەکی دیکە سیاسەت ببێت بە فیزیای کۆمەڵایەتی کە لقێکە لە لقەکانی فیزیۆلۆژیا، بەڵام لە ساڵی(١٨٢٤) پەیوەندییەکانی نێوان ئەم مامۆستا و شاگردە بەرەو نەمان ڕۆشت تا گەیشتە ڕادەی هێرش کردنە سەر یەکتر و یەکتر تۆمەتبارکردن. کۆنت هەوڵی دەدا کە خۆی دەرباز بکات و نەکەوێتە ژێر کاریگەری هزرەکانی مامۆستاکەیەوە، بەڵکوو بتوانێتهزرێکی تایبەت بە خۆی بونیاد بنێت، لەو قۆناغەدا سان سیمۆن جەختی دەکردەوە لە سەر چاکسازی لە ڕێی پیاوانی خاوەن سامان و پیشەوەرانەوە، لەکاتیکدا کۆنت پەرەسەندنی کاری تێۆری پرەنسیپە زانستییەکانی بەلاوە گرنگ بوو، بە بنەمای سەرەکی ڕیفۆرمی ڕاستەقینەی دادەنا. هەروەها کۆنت هاتنە کایەی زانستێکی نوێی بە ناوی «فیزیای کۆمەڵایەتی» بە پێویست دەزانی. پاش پچڕانی پەیوەندییان کۆنت لە بارودۆخێکی دارایی و گوزەرانێکی خراپدا دەژیا و لەسەر فێرکردنی بابەتی ماتماتیک دەژیا. لە ساڵی(١٨٣٠-١٨٤٢) کۆنت دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی وتار و نووسینەکانی، لێکۆڵینەوەی هێندە قووڵ و بەرفراوان بوون کە ژمارەیەکی زۆر لە بیرمەندانی ئەو سەردەمە ئامادەی کۆڕەکانی دەبوون هەر لەو قۆناغەدا بوو کە وانەی فەلسەفەی پۆزتیفیزمی دەوتەوە، بەڵام پاش ماوەیەک لە وتنەوەی وانەکاندا کۆنت تووشی نەخۆشی دەرونی بوو تا وای لێهات گەشتە ئەو ڕادەی کە هەوڵی خوکوشتنی دا بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. تا لەکۆتاییدا نەخۆشی تەنگی بە کۆنت هەڵچنی و لە ساڵی(١٨٥٧) لە تەمەنی (٥٩) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. ئەو بیرمەندانەی کە کاریگەرییان هەبوو لە سەر کۆنت بریتیی بوون لە: «فرانسیس بیکن، گالیلۆ، تۆماس هۆبز، مۆنتسکیۆ، کانت، سان سیمۆن، ئادەم سمس، دیوید هیوم، هیگل».

گرنگترین بەرهەمەکانی ئۆگست کۆنت:

- چەند وانەیەک لە سەر فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم لە پەرتوکیکی شەش بەرگیدا لە (١٨٣٠-١٨٤٢) بلاوی کردەوە.
- ڕێچکەیەک لە سیاسەتی پۆزەتیڤیزم لە چوار بەرگ پێکهاتووە کە تێیدا تیۆرەکانی کۆمەڵناسی پراکتیزەکردبوو، لە ساڵی (١٨٥١- ١٨٥٤).
- تێڕوانینەکانی دەربارەی دەوڵەت و کۆمەڵگا کە لە دوو بەرگدا بلاوی کردووەتەوە.
- تەندروستی عەقلی.

ئوگست کۆنت و یاسای سێقۆناغەکە : ئوگست کۆنت لە زۆر بواری جیاواز بیروبۆچوونەکانی خۆی خستووەتەڕوو یەکیک لەو تەوەرانەی کە باسی لێوە کردووە و لە دونیای فیکردا ناوبانگی پێ دەرکردووە باس کردنە لەو یاسا و قۆناغانەی کە مێژووی کۆمەڵگاکان و مرۆڤایەتی پێدا تێپەڕبووە.

ئوگست کۆنت لە ماوەی ساڵانی (١٨٣٠- ١٨٤٢) بەرهەمی لێکۆلینەوەی چەندین ساڵەی خۆی لەژێر ناوی «فەلسەفەی پۆزەتیڤیزمدا» بلاوکردەوە. ئەو لەو کتێبەدا سەرجەم بۆچوونە فەلسەفی و کۆمەڵناسییەکانی خۆی لەبارەی ڕەوتی مێژووی مەعریفە و زانینە مرۆڤییەکانی خستەڕوو، ئەو لەو کتێبەدا ئاماژەی بەوە کرد کە هزری مرۆڤایەتی بە سێقۆناغدا تێپەڕی کردووە کە ئەمانەن:

١-قۆناغی لاهووتی (ئایینی) Theological Stage

لە تێڕوانینی کونتدا قۆناغی لاهووتی یەکەمین قۆناغە کە هزری مرۆڤایەتی بە خۆیەوە دیویەتی. مرۆڤایەتی لە سەرەتادا بەم قوناغە مێژوویدا گوزەری کردووە و پاشان چەندین قۆناغی دیکەی گوزەراندووە و تاوەکوو گەیشتووەتە ئەم ئاستەی ئەمرۆ. ئەم قۆناغە پێش ساڵی(١٣٠٠ م) سەری هەڵداوە و بە کۆمەڵێک خسڵەت لە قۆناغەکانی دواتر جیا دەکرێتەوە، یەکێک لەو خسلەتانە پشت بەستنی مرۆڤە بە پرێنسیپی ئایینی بۆ شرۆڤەکردنی جیهانە کۆمەڵایەتییەکە و دیاردە کۆمەڵایەتیەکان، واتە ئایین دەستی گرتبوو بەسەر سەرجەم لایەنەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا و هەموو شتەکانیان دەبەستەوە بە ئایینەوە و خوێندنەوەی ئایینیان بۆ دەکرد. تەنانەت ئایین زاڵ بووبوو بەسەر ڕاڤەکاری سروشتی و کۆمەڵایەتی و ڕۆحییەکاندا. لەم قۆناغەدا عەقڵی مرۆڤەکان بە شێوەیەک لە شێوەکان ون بووبوو، یاخود کاریان پێ نەدەکرد، هەموو شتەکانیان دەگێڕایەوە بۆ «هێزە سروشتییەکان و ویستی خودا»، ئەفسانە و خورافیات (غەیب) ڕۆڵێکی بەرچاوی دەگێڕا لە ژیانی ئەو سەردەمەدا و باڵادەستی خۆی سەلماندبوو لە بەرانبەر عەقڵی مرۆڤدا، سۆز و هەڵچوونەکان کونترۆڵی هزری مرۆڤیان کردبوو تا گەیشتبووە ئەو رادەیەی کە مرۆڤەکان هەست بە لاوازی و بێئیرادەیی خۆیان بکەن لە بەرانبەر ئەو شتانەی کە دێنە سەر ڕێگای ژیانیان. خەسڵەتێکیتری ئەم قوناغە ئەوەبوو کە وا مرۆڤەکان هەوڵیان دەدا هۆکارەکانی سەرەتا و ئاکام و مەبەستەکانی ئاخیرەت لێک بدەنەوە. بە شێوەیەکی گشتی ئەم قۆناغەش دابەش دەکرێت بۆ سێبەش یا خود سێقۆناغی دیکە کە ئەوانیش:

- بتپەرەستی : کە کۆنت پێی وابوو مرۆڤ لەم قوناغەدا سەرجەم ئەو گرفت و کێشانەی کە لە چوارچێوەی ژیانیدا ڕوو دەدەن بەبێبیرکرنەوە قبووڵی دەکات.

- فرە خودایی (تعددیە) لەم قوناغەدا مرۆڤ پێویستی بە ڕوون کردنەوە و بیرکردنەوە زیاتر بوو بۆ تێگەیشتن.
- تاک خودایی (توحیدیە) کۆتا قۆناغی لاهوتی (ئایینی)یە کە لە سەرەتای دەرکەوتنی ئایینی مەسیحەوە دەست پێدەکات تاوەکوو ئایینی ئیسلام.
٢- قۆناغی مێتافیزیک (ئەودیو سروشت Metaphysical or Abstract Stage )
دووهەمین قۆناغە لە قۆناغەکانی مێژووی هزری مرۆڤایەتی دەکەوێتە نێوان هەردوو قۆناغی لاهووتی (ئایینی) لەگەڵ قۆناغی زانستی. لە سالی (١٣٠٠) دەست پێدەکات و لە ساڵی (١٨٠٠) کۆتایی پێدێت پێی دەوتریت قۆناغی «بەرزەخ» واتە ئەو قۆناغەی کە لە دوای لاهوتییەوە دەست پێدەکات و بە هاتنی «زانستی» کۆتایی پێدێت. لەم قۆناغەدا هزری مرۆڤایەتی پلەیەک پێشکەوت و عەقڵی مرۆڤەکان هاتە سەر خەت، بەڵام نەیتوانی تەفسیری دیاردەکانی پێ بکات. کۆنت گرنگی کەمتری دەدا بەم قۆناغە بە بەراوردکردن لەگەڵ قۆناغەکانی دیکە، ئەو پێی وابوو ئەم قۆناغە تەنها پردێکە بۆ تێپەربوون و گواستنەوە لە قۆناغی «لاهووتییەوە» بۆ قۆناغی «زانستی» بە واتایەکی تر ئەو قۆناغەیە کە خۆری قۆناغی لاهوتی بەرەو ئاوابوون برد خۆری قۆناغی زانستی درەوشاندەوە.
٣- قۆناغی زانستی (پۆزەتیفیزمPositive Stage )
ئەم قۆناغە کۆتا قۆناغی یاساکەی کۆنتە کە مێژووی سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی(١٨٠٠) ڕاستەوخۆ دوای قۆناغی «مێتافیزیک» دەست پێدەکات، ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە ئەم قۆناغە دوا قۆناغە کە هزری مروڤایەتی پێدا تیپەڕ دەکات، دوا قۆناغەی گەشەی عەقڵی مرۆڤە. عەقڵی مرۆڤ لەم قۆناغەدا دەگاتە بەرزترین ئاستی گەشە و پێشکەوتن، ئەو لەو باوەڕدا بوو کە هزری مرۆڤ لەو دوو قۆناغەی پێشوودا حاڵەتێکی وەهمی و خەیالاوی هەبووە، بەڵام لەم قۆناغەدا گەیشتووەتە حاڵەتی زانستی و پشتیان پێ بەستووە لە کاتی شیکردنەوەی دیاردە کۆمەڵایتییەکاندا، جێگای سروشت و خورافاتی گرتووەتەوە. کەواتە یاسای سێقۆناغە لە هزری کۆنتدا ئەوە دەگەینێت کە هەر بوارێک لە بوارەکانی مەعریفە لە کاتی پەرەسەندن و گەشەکردندا بەو سێقۆناغەدا تێپەڕیووە؛ واتە یاسای سێقۆناغە شتێکی حەتمییە و هەر دەبێت ڕوو بدات.
ئۆگست کۆنت و پۆلێنکردنی زانستەکان:
یەکێکیتر لەو بوارانەی کە کۆنت قسەی لە سەر کردووە، باس کردنە لە زانستەکان و شێوازی پۆلێن کردنیان و چۆنیەتی دابەش کردنیان، ئەو زانستەکان دابەش دەکات بۆ دوو جۆری سەرەکی:
یەکەم: زانستە وەسفییەکان: ئەم جۆریان هەموو ئەو زانستانە دەگرێتەوە کە هەڵدەستن بە وەسفکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان.
دووەم: زانستە موجەڕەدەکان: ئەمەش سەرجەم ئەو زانستانە دەگرێتەوە کە هەڵدەستن بە دۆزینەوەی یاسا سروشتییەکان و دیاریکردنی بوونی دیاردەکان و بەردەوامبوونیان.
بە کورتی دەتوانین بڵێین گرنگترین ئەو زانستانەی کە ئۆگست کۆنت بایەخی پێداون و وەک زانستێکی سەربەخۆ سەیری کردوون بریتین لەم زانستانەی خوارەوە:

یەکەم: بیرکاری Mathematics، دووەم: ئەستێرەناسی Astronomy ، سێهەم: فیزیا Physics، چوارەم: کیمیا Chemistry، پێنجەم: زیندەوەرزانی Biology، شەشەم: کۆمەڵناسی Sociology
ئۆگست کۆنت و زانستی کۆمەڵناسی:
هەرچەندە ئۆگست کۆنت نازناوی باوکی زانستی کۆمەڵناسی وەرگرت و بووە داهێنەری زانستی کۆمەڵناسی، بەڵام تاوانێکی زانستی گەورەیە گەر بڵێین کۆمەڵناسی لەو ساتەوەختەوە سەری هەڵداوە کە کۆنت ناوی لێنا، چونکە بەم وتەیەمان لە لایەکەوە مێژووی کۆمەڵناسی کورت دەکەینەوە،لە لایەکی دیکەوە ناحەقییەکی ئاشکرا ئەنجام دەدەین بەرانبەر ئەو زانا و فەیلەسووفانەی کە لەسەر کۆمەڵگا بۆچوونیان هەبووە و نووسیویانە و بەم کارەشیان خزمەتێکی بەرچاویان بە زانستەکە کردووە، ئێمە نابێت ڕۆڵی «ئەفلاتوون، ئەرستۆ، ئیبن خەلدون، فارابی.. هتد» لە بواری خزمەتکردن بە زانستی کۆمەڵناسی پشت گوێ بخەین.
کارەکانی ئەو کەڵەزانا و فەیلەسووفانە هیچی لە کارەکانی کۆنت کەمتر نییە، بەڵام ئەوان نەیانتوانی وەک کۆنت بۆچوونەکانیان بخەنە ناو چوارچێوەی زانستێکەوە، بەڵام لە کۆتاییدا کۆنت بە لێهاتوویی و پسپۆڕی خۆی توانی سەرجەم بۆچوون و هەوڵەکانی خۆی کۆ بکاتەوە و بیخاتە ناو چوارچێوەی زانستێکی نوێ و ناوی لێ بنێت «زانستی کۆمەڵناسی». بە ئەنجام دانی ئەم کارەی توانی تەواوی نازناوەکان بۆ خۆی کۆ بکاتەوە، تاگەیشتە ئەو ڕادەیەی کە نازناوی «باوکی کۆمەڵناسی، داهێنەری کۆمەڵناسی» وەرگرت.
کۆنت حەزێکی زۆری بۆ لێکۆلینەوە و تێگەیشتن و سروشتی کێشەکانی کۆمەڵگا هەبوو، بەتایبەت لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسیدا، هەمیشە هەستی بە پێویستی چاکسازی کردن دەکرد لە نێو سیستەمەکانی ناو کۆمەڵگا، ئەم بیرۆکەشی زیاتر پەرەی سەند کاتێک بە تەواوی لەگەڵ مامۆستاکەی سان سیمۆن جیابوونەوە, هەر لەم کاتەدا بوو کە هەستی بە هاتنەکایەی زانستێکی نوێ دەکرد تا دواجار لە ساڵی (١٨٣٩) زانستێکی نوێدامەزراند کە ناوی لێنا «فیزیای کۆمەڵایەتی» وا ناساندی کە زانستی شیکردنەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانە، بەڵام دوای ئەوەی «ئارۆلف کیتیلە» ئەم ناوەینا لە هەندێک ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی خۆی، بۆیە کۆنت دەستبەجێلەو بۆچوونەی خۆی پاشگەزبوویەوە و زانستی «سۆسیۆلۆژیا، کۆمەڵناسی» هێنایە کایەوە. لەو باوەڕەشدا بوو کە زانستێکی گشتگیرە و سەرجەم بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگەکان دەگرێتەوە و زانستێکی ئاڵۆزە و هەر بۆیە لە سەرووی لوتکەی هەرەمەکەدا جێگیری کرد. لەو باوەڕەشدا بوو کە کۆمەڵناسی زانستێکە توانای ئەوەی هەیە زانستەکانی وەک: مێژوو، سیاسەت، ئابووری، لەخۆ بگرێت. کۆنت پێناسەی کردووە بۆ زانستی کۆمەڵناسی و دەڵێت: "کۆمەڵناسی زانستێکە لێکۆلینەوە دەکات دەربارەی ڕەوتە فیکری و مەعنەوییەکانی مرۆڤ."
هەروەها کۆنت لە کتێبەکەیدا پێناسەیەکی دیکەش بۆ ئەم زانستە دەکات و دەڵێت: "بریتییە لەو بابەتەی کە تایبەتە بە لێکۆلینەوەی گشت دیاردەکانی عەقڵی مرۆیی و ئەو کردارە مرۆییانەی دەبنە بەرئەنجامی ئەم عەقڵە"، بەڵام ئەم پێناسەیە ئەوە ناگەیەنێت کە کۆمەڵناسی تەنها لێکۆلینەوە بێت لە عەقڵ، بەڵکوو بایەخیش دەدات بە دەرئەنجامە کەڵەکەبووەکانی عەقڵ و مومارەسەکانی. (ویکیپیدیا)

پۆزەتیڤیزمە، هەروەک چۆن کانت پێی وابوو زانینی مرۆڤ کورتهەڵدێت لە «دیاردەکان» ئەوانەی لە مرۆڤەوە دیارن، ناتوانێت (نۆمینا) شتەکان لە خودی خۆیدا پەیپێببات، لێرەوە ئۆگست کۆنت بە کانت کاریگەرە، چونکە کانتیش پێی وابوو ئەوەی دەزانرێت بریتییە لە جیهانی بەرهەست و هەستپێکرا و دیار، ئۆگست کۆنتیش هات و وتی زانین و مەعریفە کورتهەڵدێت لە شتە ماددییە بەرهەستە ئەزموونکراوەکان، هەروەها هەرچی بەرهەست نەبێت و نەتوانرێت بە پێنج هەستەکان پەی پێببرێت ئەوە بوونی نییە، ئەوەیشی پێی دەوترێت زانینی پێشوەختە و بەڵگەنەویستەکان (بەدیهیات) و زانینە فیتری و زگماکییەکان، ئەوە بوونیان نییە و بڕوای پێیان نییە، بەڵکوو پێی وایە عەقڵ لاپەڕەیەکی سپییە و هیچی لەسەر نییە، هەستەکان دێن شتی لەسەر دەنەخشێنن، هەر لێرەوەشەوە دەچێت بۆ جیهانی پەنهان و غەیب و نکۆڵیان لێدەکات.

کەواتە دەتوانین ئاوا پێناسەی بکەین: ڕێبازێکی فەلسەفی بێباوەڕە کە پێی وایە زانیاری یەقینی تەنیا و تەنیا بریتییە لە زانینی ڕووکەش و زاهیری شتەکان کە لەسەر واقیعی ئەزموونی (تەجریبی) دامەزراوە، نکووڵی هەموو زانیارییێک دەکات کە نەکەوێتە سنووری ئەزموونی و هەستییەوە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە ماددەوە نەبێت. هەروەها پێیان وایە ئەقڵی مرۆڤ پێش دەکەوێت و لە قۆناغی ئایینی پێش کەوتووە بۆ قۆناغی پۆزەتیڤیزم (وەزعی). قۆناغی پۆزەتیڤیزم (وەزعی)یش بریتییە لە خۆداماڵین لە هەموو عەقیدە و فیکر و بیروباوەڕێکی ئایینی.

قۆناغەکانی هزری مرۆڤایەتی لەلای ئۆگست کۆنت و پۆزەتیڤیزمەکان

١. **قۆناغی لاهووتی:** لەم قۆناغی لاهوتییەدا مرۆڤ دیاردەکانی گەردوونی دەدا پاڵ «ڕۆحگەلێک» و وایدادەنا کە ئەم ڕۆحانە نهێنی ئەم ڕووداوانەن، پاشان بڕاوایان چوو بەرەو ئەوەی بڵێن «خوداکان» لەوێ هەن و ئەم ڕووداوانە

هەڵدەسووڕێنن، وایلێهات هەموو شتێک خوای بۆ دانرا، «خۆر، مانگ، زەریا، دەریا، ...» هەموو شتەکان خوای تایبەت بەخۆیان بۆ دانرا، دوای ئەم قۆناغە قۆناغی یەکتایی و تاکانەیی خودا هاتە کایەوە و هەموو خواکان یەکخران و بوون بە یەک خودا و باوەڕی تاک خودایی هاتە کایەوە.

٢. **قۆناغی مێتافیزیکی:** ئۆگست کونت پێی وایە مرۆڤ لەو قۆناغەدا بەرەو پێش چوو، چونکە توانی خۆی ڕزگار بکات لە خوداکان و ڕاڤەکردنی دیاردەکانی گەردوون بە دەستەڵاتی خوداکان و خودا، هزری مرۆڤ لەم قۆناغەدا لەجیاتی خودا دیاردەکانی سروشتی دەدا پاڵ هێزە مەعنەوی و زاراوە مەعنەوییەکانی وەک «هۆکار، عەقڵ، ماهییەت، ...»، لێرەوە دیاردە سروشتییەکان داماڵران لە خودا و ڕاڤە دەکران بە شتی مەعنەوی دیکە کە لەناو واقیع و بووندا شاراوەن. بۆنموونە ئاگر دەسووتێنێت، نەک لەبەر ئەوەی خودا وایلێدەکات بەڵکوو چونکە ئاگر لەخۆیدا خەسڵەتی سووتانی هەیە، کەواتە لەم قۆناغەدا دیاردە سروشتییەکان بە هێزی سیحراوی و غەیبی و مەعنەوی نائامادە و نەبینراو لێکدەدرایەوە، ئەم هێزە پەنهانە لەناو دیاردەکاندا بوو.

٣. **قۆناغی پۆزەتیڤیزم:** ئۆگست کونت پێی وابوو کە هزری مرۆڤایەتی لەم قۆناغەدا تەواو تەواو پێشکەوتوو و گەیشتە لوتکە، چونکە خۆی ڕزگار کرد لە هەموو شتێکی مێتافیزیکی نابەرهەستی و هەستپێنەکراو، واتە قۆناغی خودا و هێزە مەعنەوییەکان و هێزە سیحراوییە نەبینراوەکان و نابەرهەستەکان کۆتایی هات، ئەم قۆناغە قۆناغی لێکدانەوەی زانستی و هەستییە، واتە هەموو شتێک بخرێتە ژێر هەستەکان و ئەزموونەوە و دوورەپەرێزبی لە ڕاڤەیەکی نازانستی و نائەزموونی ناهەستی.

ئۆگست کونت پێی وایە ئەم قۆناغە قۆناغی ڕزگاربوونی مرۆڤایەتییە، چونکە ڕزگاری بووە لە هەموو شتێکی نائەزموونی و نابەرهەست و گیشتووە بە لوتکەی

زانست و مەعریفەت.

ئەم ئاراستەیە بۆیە پێی دەوترێت وەزعی (الوضعی، دانان) چونکە هەموو زانین و مەعریفەی مرۆڤ کورتهەڵدێنێت لەسەر ڕاڤەی «دانان»ی هەموو شتێک وەک ئەوەی کە هەیە لە جیهانی واقیع و بەرهەستدا، هەروەها فڕێدان و بەلانانی هەموو شتێک کە بەرهەست نییە و ناتوانرێت هەستی پێ بکرێت و بهێنرێتە ژێر هەستەکانەوە.

پۆزەتیڤیزم و ڕێبازی وەزعی و واقیعی لەگەڵ کۆکبوونیان لەسەر هەستگەرایی و ڕۆچوون لە هەستەکان و ڕاڤەی ڕووکەشدا، دابەش بوون بۆ چەندان گرووپ و کۆمەڵی جۆراوجۆر، لە هەموویان بەناوبانگتر و گرینگتر پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی (الوضعية المنطقية)یە کە دواتر باسی دەکەین.[1]

### ئایینی مرۆڤایەتی

ئۆگست کۆنت لەگەڵ ئەوەی بێباوەڕ بوو بە هەموو ئایینەکان، بەڵام پێی وابوو ئایین سوودبەخشە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی و پێشخستنی، چونکە مەدبدەئەکان یەک دەخات و هەست و سۆزیش بۆ خێر و خۆشی کۆمەڵگە بەگەڕ دەخات، هەروەها دەیپارێزێت لە هەڵوەشان و خۆخۆیی و خراپەکاری.

بۆیە هەستا بە داهێنانی ئایینێک کە مرۆڤایەتی تێیدا سەنتەر بوو لەجێی خودا، واتە مرۆڤ ببێتە خودا و لەجێی پیرۆزکردن و پەرستش بۆ خودا، مرۆڤ پیرۆز بکرێت و بپەرسترێت، چونکە مرۆڤ گەورەترین بوونەوەرە کە هەموو نەوەکانی بەنی ئادەم بەژداریان تێدا کردووە.

---

(١) الفلسفة لمن يريد، د. نبيل، ١٤٨ _ ١٤٩.

# چاخی چوارەم
# سەردەمی ئێستا

چاخی ئێستا مەبەستمان ئەم کاتەی ئێستا نییە، بەڵکوو مەبەستمان کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە و سەدەی بیستە، ئەم سەردەمەش کۆمەڵە ڕێباز و قوتابخانەیەکی فەلسەفی گەورە و گرینگی بەخۆیەوە بینی، ئێمە لێرەدا گرینگترینان باس دەکەین.

## مارکسییەت

مارکسییەت ڕێبازێکی فەلسەفی، ئابووری و کۆمەڵایەتییە، دامەزرێنەری سەرەکی «کارڵ مارکسە» ە کە لە ساڵی (١٨١٨) لە ئەڵمانیا لەدایکبووەو بە دامەزرێنەری شیووعییەت دادەنرێت، لە ساڵی (١٨٨٣) شمردووە، خاوەنی چەند پەرتووکێکە لەوانە «سەرمایە)» (رأس المال) کە بووە سەرچاوەیەکی گرنگی شیوعییەت.

### دروشمەکانی مارکس:

١- (لا إله والحياة مادة)، واتا: «هیچ خودایەک بوونی نییە و ژیانیش بەس بریتییە لە مادده.»

٢- (الدين أفيون الشعوب)، واتا: «ئایین تریاکی گەلانە»، واتا: چۆن تریاک مرۆڤ سەرخۆش دەکات، ئایینیش بە هەمان شێوە مرۆڤ و نەتەوە و گەلەکان سەرخۆش دەکات.

**هەندێک لە بیروڕاکانی مارکسییەت و شیووعییەت:**

١- نکووڵی (ئینکاری) کردن لە بوونی خودا و دواڕۆژ و دین.

لێرەدا وتەی سێ ڕێبەری مارکسییەکان دێنین کە بە ئاشکرا نکووڵی لە بوونی ئایین و خودا دەکەن.

مارکس دەڵێت: "من ڕقم لە هەموو خوداکانە."[١]

لینین دەڵێت: "بەهیچ شێوەیەک ئەوە ڕاست نییە کە خودا بوون ڕێکدەخات، بەڵکوو ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بیرۆکەی خودا بیرۆکەیەکی خورافی ئەفسانەییە! مرۆڤ خۆی دروستی کردووە بۆ ئەوەی بەهانە بۆ نەتوانینەکانی بهێنێتەوە، بۆیە هەر کەسێک بەرگری لە بیرۆکەی خودا بکات، ئەوا کەسێکی نەزان و بێتوانایە."[٢]

ستالین دەڵێت: "پێویستە ئەوە ڕوون بێت کە ئایین شتێکی خورافی و ئەفسانەییە، بیرۆکەی خوداش بەهەمان شێوە بیرۆکەیەکی خورافی و ئەفسانییە، ناباوەڕی و ئیلحادیش ڕێباز و مەزهەبمانە."[٣]

٢- مادده ئەزەلییە، واتا: مادده سەرەتای نییە و هەر شتێکیش سەرەتای نەبوو پێویستی بە دروستکار نییە، کەواتا: گەردوون و مادده دروستکاریان نییە.

٣- ئەخلاق و بەهای باڵا بوونیان نییە، ئەوەی کە هەیە بریتییە لە مادده و دەوڵەتی شیوعی و ئابووری و پارە و بەرەوپێشچوونی پیشەسازی.[٤]

---

(١) الفرقُ بين فلسفة الطبيعة عند ديمقريط وفلسفة الطبيعة عند أبيقور، ل (١٨٤١).

(٢) النظام الشيوعی، ل ٥٣، وحركات ومذاهب، فتكي يكن، ل ١٥.

(٣) النظام الشيوعی، ل ٥٣.

(٤) - بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی مارکسییەت و هەڵسەنگاندنی سەیری ئەم پەرتووکانە بکە: ١ – نارێکییەکانی مارکس، فاضل قەرەداغی، ڕێنوێن، ٢٠١٨. ٢ – نقد الفكر الماركسی عند السيد محمد محمد صادق الصدر، علاء شنون مطر العتابی، مركز العين ٢٠١٩. ئیلحاد وەک خۆی، صلاح الدين.

## فەلسەفەی مارکسیزم

بەشەکانی مارکسییەت

مارکسییەت دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

**١- ماتریالیزمی دیالێکتیکی (المادية الجدلية)**

ئەوە ڕووە فەلسەفییەکەی مارکسییەتە بۆ بوون و مادده و زانین و پەیوەندی نێوان مادده و بیر.

**٢- ماتریالیزمی مێژوویی (المادية التأريخية)**

ئەوەش تەفسیری مارکسییەتە بۆ گەشەسەندنی کۆمەڵگە و مێژوو و مرۆڤ و مرۆڤایەتی.

**٣- ماتریالیزمی سیاسی و ئابووری (المادية السياسية والاقتصادية)**

ئەوەش ڕووە سیاسی و ئابوورییەکەی مارکسییەت ڕوون دەکاتەوە کە پەیوەندی بە ئابووری و بەرهەمهێنان و دابەشکردنی سەروەت و سامانەوە هەیە.

**بەشی یەکەم: ماتریالیزمی دیالێکتیکی:**

ماتریالیزم یان مادییەت تیۆرێکی فەلسەفییە باوەڕی وایە کە تەنها شت بتوانرێت پێی بوترێت هەیە یان بوونی هەیە بریتییە لە مادده، بە جۆرێک هەموو شتەکان لە مادده دروست بوون لە بنەڕەتەوە. فەلسەفەی ماددیی دەچێت بۆ ئەوەی کە مادده شتێکی سەرەتایی و یەکەمینە و مێشک (هەست) شتێکی لاوەکی و دووەمییە، بە واتایەکی دیکە: هەست بەرهەمی ماددەیە نەک بە پێچەوانەوە.

بە واتایەکی دیکە و بە فرەوانتر:

ماتریالیزم (فەلسەفەی ماددی ـ materialism)

ماتریالیزم لە وشەی (matere) بە واتای مادده و لە ڕیشەی لاتینی (materio) بە واتای فەلسەفەی ماددی وەرگیراوە و بە لایەنگرانیشی دەگوترێت: ماتریالیست (materialiste)، واتا ئەو کەسەی کە مادده بە بنچینەی ژیان دەزانێت.

فەلسەفەی ماتریالیزم باوەڕی بە ماددەگەرایی هەیە و تەنیا مادده بەڕاست و گرنگ دەزانێت و بە بناغەی ژیانی دادەنێت و لەو باوەڕەدایە کە هەموو نیشانە و بەرهەمەکانی ژیان لەپێناوی ماددەدان.

لە ڕاستیدا ماتریالیزم نوێ نییە و پێشینەیەکی دوو هەزار ساڵەی هەیە و هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی زانست و فەلسەفەوە سەرەنجی جیهانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە.

هەر بۆیە بەشی هەرە زۆری فەیلەسووفەکانی یۆنان و بەشێکی بەرچاوی فەیلەسووفە ئەورووپییەکان ماتریالیست بوون و هەموو گۆڕانکارییەکانی جیهانیان دەدایە پاڵ مادده، وەک: ئەپیکور، دیمۆکریت، تۆماس هۆبز، بیکۆن، فیورباخ، مارکس، ئەنگلس، دیدرۆ و جۆن لۆک.

لەسەدەکانی هەژدە و نۆزدە بەهۆی پێشکەوتنی خێرا لە بواری زانست و توێژینەوە لە ئەورووپا، فەلسەفەی ماتریالیستی سەرنجی زۆربەی زانایانی بەرەو لای خۆی ڕاکێشا و زەمینەیەکی باشتر بۆ پەروەردەکردنی ڕەخسا.

لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە لەو باوەڕەدان کە فەلسەفەی ماتریالیزم هاوشان لەگەڵ زانستی مرۆیی لە جووڵاندایە و پەرەدەسێنێت و گەشە دەکات.

هیراکلیت (heraclite) کە بە باوکی دیالێکتیک بەناوبانگە، لە سەردەمی خۆیدا دەیگوت: "هیچ شتێک لە جیهاندا ڕاوەستاو نییە و هەموو شتێک لە جووڵەدایە."

ئەم وتەیە نیشانەی ئەوەیە کە ئەم فەیلەسووفە باوەڕی بە مادده هەبووە و هەموو گۆڕانکارییەکانی بە ماددەوە پەیوەستکردووە.

ماتریالیستەکان دەڵێن: لەنێوان ڕۆح و ماددەدا پەیوەندێکی ڕاستەوخۆ هەیە، جگە لەوەش مادده لە سەرووی ڕۆحەوەیە. هەر بۆیەش لەو باوەڕەدان کە ئەگەر مرۆڤ بیربکاتەوە لەبەرئەوەیە کە خاوەن مێشکە و ئەم فکر و ئەندێشانە لە مێشکەوە هەڵدەقووڵێن و ئەندێشە و فکر بەبێ مێشک نایەنەدی.

هەر ئەم سەربەخۆییەش بەسەر بوونەوەرەکان و سەرانسەری ژیانی مرۆییدا گشتگیر دەکەن و مادده بە بنەمای هەموو شتەکان دەزانن و بە حەقیقەتی ئەم جیهانەی لە قەڵەم دەدەن و لەو باوەڕەدان کە مادده هەتاهەتایی و بێکۆتاییە و ئەم ڕەگەزە سەرەکییە کە سەرانسەری ژیانی ئێمەی گرتۆتەوە هەرگیز لەنێو ناچێت و هەمیشە هەیە و بۆ هەتا هەتاش هەر دەمێنێتەوە.

ماتریالیزمی زانستی هۆبز کە بە «میتۆدساینتیفیک Scientfic materialism» بەناوبانگە، لەلایەن تۆماس هۆبز، فەیلەسووفی سەدەی ١٧ لە ئینگلتەرا دامەزراوە.

هۆبز یەکەمین فەیلەسووفی گەورەی سەدە نوێیەکانە کە هەوڵیدا فەلسەفەی ڕامیاری لەگەڵ سیستەمی نوێی فکری و شێوازی نوێی بیرکردنەوە لێک گرێ بدات و لەسەر بنەمایەکی زانستی بنیاتی بنێت و نەک تەنیا ڕاستییەکانی سروشت، بەڵکوو هەموو ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ چ تاک و چ کۆمەڵایەتی بە سەرنجدان بەو خاڵانەی سەرەوە لە فەلسەفەکەی خۆیدا بگونجێنێت.

زاراوەیەکی دیکەش بە ناوی ماتریالیزمی دیالێکتیک (dialectic materialism) هەیە کە لە لایەن مارکسەوە لە بەرانبەر دیالێکتیکی ئایدیالیزمی هیگڵ دانراوە لەسەر بنەمای پێویستی مێژوویی و کامڵبوون وهەر سێ فاکتەری

تێز و ئانتی تێز و سەنتێز دامەزراوە. بەو جیاوازییە لەجیاتی ڕەگەزی ئایدیالیزمی هیگڵ کە باوەڕی بە ئاوەزێکی باڵا و سەروو سروشتی هەبووە لە مێژوودا کە بەسەر هەموو ڕووداوەکانی جیهانی مرۆییدا زاڵە، مارکس باوەڕی بە هێزی ئابووری هەبووە و بە بەردی بناغەی ڕووداوەکانی مێژووی مرۆڤی داناوە و هێزی بەرهەمهێنان و ئابووری بە هێزی هاندەر زانیوە، بەڵام هیگڵ بە پێچەوانەوە هێزی ڕۆحی بە هاندەری جیهانی مرۆیی دادەنا.

لە ڕاستیدا مارکس ئابووری و ماتریالیزمی خستە نێو هەمان چوارچێوەی لۆژیک و دیالێکتیکی هیگڵەوە و شێوازەکانی ئەوی بۆ سەلماندنی بیروبۆچوونەکانی خۆی بەکارهێناوە و تیۆری کۆمۆنیزمی نوێی بنیاتناوە.

**بە کورتی ماتریالیزمی دیالێکتیکی واتا:**

١- مادده بنەما و ئەساسی بوونە.

٢- هیچ شتێک جگەلە مادده بوونی نییە و سەرچاوەی هەموو شتێکە.

٣- مادده ئەزەلییە و سەرەتای نییە.

٤- هۆش و وەعی کە کۆکەرەوەی بیرکردنەوە و زانین و هەست و وێناکردن و ویستە هەموویان وەزیفەی ماددەیەکی وەزیفەداری بەرزن کە بریتییە لە دەماغ، کەواتا سەرچاوەی هەموویان بریتییە لە مادده نەوەک شتێکی دیکە.

٥- سروشت و بوون ڕاوەستاو نین، بەڵکوو بەردەوام لە جووڵەدان و دەجووڵێن و گەشە دەسەنن، ئەو جووڵانەش ئەزەلییە و پێویستی بە هێزێکی دەرەکی (خودا) نییە.

٦- لەنێو هەموو شتێکدا صیراع و ململانێ هەیە، دوایی بەهۆی ئەم ململانێیەوە گۆڕانکاری و گەشەسەندن ڕوودەدات.

٧- گەشەسەندن و گەشەکردن لە چەندەوە (کم) دەچێت بۆ چۆن (کیف)، لەچەندیێتییەوە دەچێت بۆ چۆنییەتی.

## یاساکانی ماتریالیزمی دیالێکتیکی

ماتریالیزمی دیالیکتیکی سێ یاسای سەرەکی هەیە:

١- یەکێتیی و ململانێی دژەکان

٢- گۆڕانی چەند بۆ چۆن

٣- نەفی نەفی

١. قانون وحدة الاضداد وصراعها

٢. قانون الانتقال من التراكم الكمي الى التغير الكيفي أو النوعي

٣. قانون نفي النفي

**یەکەم: یەکێتی و ململانێی دژەکان.**

واتا: هەموو شتێک لەنێو خۆیدا سەرەتا بەیەکەوەیە و یەکێتی بوونی تێدایە، پاشان دەبنە دژی یەکتر و دژ پەیدا دەبێت، بۆ نموونە: ئاوی کوڵاو، دوو هێزی تێدایە، هێزێک گەردەکان ڕادەکێشێت بەرەو یەکتری، هێزێک گەردەکان لە یەکتری دوور دەخاتەوە، بەڵام لە ئەنجامی گەرمی بەردەوامدا هێزی جیاکردنەوە زاڵ دەبێت بەسەر هێزی ڕاکێشان و ئاوەکە دەبێت بە هەڵم.

هەر بەم شێوەیەش لەنێو کۆمەڵگەدا بۆرژوازییەت و پرۆلیتاریا بەیەکەوە لە یەک کۆمەڵگەدا دەژین، بەڵام ئەم پێکەوەژیانە کاتییە و لە کۆتاییدا لە ئەنجامی ململانێی بەردەوامدا و لە ئەنجامی شەڕ و جەنگدا پرۆلیتاریا بەسەر سەرمایەداریدا سەردەکەوێت.

**دووەم: گۆڕانی چەند بۆ چۆن:**

واتا چەندێتی ماددەیەک دەگۆڕێت بۆ چۆنییەتی، بۆ نموونە: کۆمەڵە بەردێک فڕێ بدەیتە نێو ڕووبارێک، دوایی لەو چەند بەردانە شتێک پەیدا دەبێت پێی دەوترێت: بەنداو، کەواتە لەو چەندێتییە چۆنییەتییەکی نوێمان دەسکەوت.

یان ئاوێک زۆر گەرم بکە، لەناکاو دەبێت بە هەڵم؛ یان ساردی بکە، دەبێت بە سەهۆڵ.

یان بۆ دروستکردنی ماددەیەکی دیاریکراو ماددەیەک یان چەند ماددەیەک دەتوێننەوە تا ماددەیەکی نوێ دەست دەکەوێت، کەواتە بەم شێوەیەشە کاتێک «پڕۆلیتاریا» زۆر دەبێت و زاڵ دەبێت بەسەر «بۆرژوازییەت».

**سێیەم: یاسای نەفی نەفی**

ئەوە یاسای سێیەمە لە یاساکانی ماتریالیزمی دیالێکتیکی، واتا هەموو شتێک دژی خۆی دروست دەکات ئەو دژەش نەفی ئەو شتە دەکات، بەڵام ئەویش نەفی دەبێت و شتە یەکەمەکە پەیدا دەبێتەوە بە شێوەیەکی دەوڵەمەندتر، بۆ نموونە: دەنکە گەنمێک کە نەفی دەبێت و دەبێت بە ڕووەک، دوایی ئەو گوڵە گەنمەی دروست دەبێت نەفی ڕووەکەکە دەکات و بەمەش گەڕایەوە سەر دەنکە گەنمەکە، بەڵام بە ژمارەیەکی زۆرترەوە.

**سەرچاوەکانی بیری ماتریالیزمی دیالێکتیکی**

مارکس فەلسەفەکەی لە بنەڕەتدا هی خۆی نەبوو، بەڵکوو لە فەیلەسووفانی پێش خۆی وەریگرتبوو، پاشان بە شێوازێکی نوێ دایڕشتەوە کە گشتگیر بێت بۆ گەردوون، بوون، ماددە، مرۆڤ، ئابووری، سیاسەت و ژیان بۆیە سەرچاوەکانی فیکری مارکس بریتین لە:

١- ماددییەت: دیارە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی یۆنانی پێش سوقڕات،

وەک «دیموکریتس» هەروەها «ئەپیکۆر» دواییش «تۆماس هۆبس» دواتر «فیورباغ»، کەواتا پێش مارکسیش ئاراستەی ماددی بوونی هەبووە لە فەلسەفەی ئەورووپیدا.

٢- دیالێکتیک: (جدل) یان (الجدلیة)، دیارە مارکس ئەوەشی لە هێگڵ وەرگرتووە، بەڵام وەک خۆی دەڵێت: "هی ئەو لەسەر پێ بوو، من خستمە سەر سەر." دیارە هێگڵ فەیلەسووفێکی میسالی بووە، جەدەلەکەشی جەدەلێکی ڕۆحی و فکری و عەقڵی بووە، بەڵام ئەوەی مارکس جەدەلێکی ماددی بووە و هێناویەتە نێو ماددە و واقیع و کۆمەڵگە و مێژوو و ئابووری هەروەها دیارە هێگڵ باوەڕدار بووە، بەڵام مارکس بێباوەڕ و مولحید بووە.

٣- پەرەسەندن (التطور): دیارە کە گەشەسەندن و پەرەسەندنیشی لە «داروین» وەرگرتووە.

٤- شیوعییەتی سەرەتا (الشیوعیة الأولی) ئەوەشی لە «فریزر» وەرگرتووە کە خاوەنی پەرتووکی (الغصن الذهبي)یە، دیارە «فریزر» پێش «مارکس» هەمان شتی وتووە دەربارەی (الشیوعیة الأولی). هەروەها شیوعییەتی لەو سێ فەیلەسووفەش وەرگرتووە و پێیان سەرسام بووە «تۆماس مۆر، سان سیمۆن، ڕۆبەرت ئۆین»، گەر چی ناوی دیکەش هەن کە پێش مارکس دەمیان لە سۆسیالیزم داوە، بەڵام زۆرینەیان کۆکن کە مارکس کاریگەرە بەم سیانە و دواتر سۆسیالیزمەکەیانی گۆڕیوە بۆ ئەو شێوازەی خۆی بەڕاستی زانیوە.

## جیاوازی دیالێکتیکی هێگڵ و مارکس:

چەمکی دیالێکتیک پێشتر لای «هێگڵ» هەبووە و پێشی ئەویش لە یۆنانی دێریندا، واتا «مارکس» داهێنەری چەمکەکە نییە.

مارکس خۆی لە ژیانیدا تا ئەو شوێنەی من خوێندبێتمەوە ئەم چەمکەی بەکارنەهێناوە، بەڵام زەمینەسازییەکان و میتۆدێکی ناولێنەراوی هەبووە کە دواتر وابزانم لە سەردەمی یەکێتی سوڤیەتیدا ئەم چەمکە دادەتاشرێت.

کەواتە بۆ تێگەشتن لەوەی دیالێکتیک چییە، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ یۆنان. بەڵام بۆ تێگەیشتن لە دیالێکتیک لای «مارکس» دەبێت بگەڕێینەوە بۆ «هێگڵ». بۆ ماتریالیزمەکەش پێویستمان بە تێگەشتن لە «فیورباخ» هەیە.

بە هەر حاڵ، ماتریالیزمی دیالێکتیک لای «مارکس» میتۆدێکە بۆ تێگەشتن لە واقیع و جیهانی دەورووبەر، «مارکس» ڕای وەهایە کە هێزەکان، واتا هێزە مادییەکان لە ململانێ و گۆڕانکارییەکی بەردەوامدان، ئەم گۆڕانە بەردەوامەش هەمیشە دەردەکەوێت و بونیادی نوێ دەهێنێتە ئاراوە. خودی پرۆسەی ململانێی هێزە مادییەکان بریتییە لە ماتریالیزمی دیالێکتیک.

ئەم میتۆدە لای «مارکس» واقیعیترین میتۆدە بۆ خوێندنەوەی واقیع، ئەو بە پێچەوانەی هێگڵ و فەیلەسووفە ئایدیالیستەکان پێی وایە ئەوە واقیعی مادییە کە بیرکردنەوە و چوارچێوەی کۆمەڵایەتی مرۆڤ دیاریدەکات نەک بە پێچەوانەوە، یان بە دەربڕینێکی دیکە ئەوە ژێرخانە کە سەرخان دیاری دەکات. جا مادام پرۆسەکەش بەم شێوەیە مادییەیە نەک ئایدیالیستی، بۆیە پێویستیشمان بە میتۆدێکە کە ماتریالیستی بێت.

هێگڵ ململانێکەی لە ئاستی فکردا دەبینی، مارکس پێی وا بوو مەسەلەکە لە واقیع و بنەماکانی بەرهەمهێناندایە نەک فکر، چونکە ئەو ئەسڵی پێکهاتنی لە ماددەدا دەبینییەوە نەک فکر، بۆیە دیالەکتیکی لە هێگڵ و ماتریالیزمی لە فیورباخ وەرگرت تا ئەو میتۆدە بەرهەم بهێنێت، چونکە ئەو باوەڕی بە پرۆسەی دیالێکتیکی هەبوو، بەڵام باوەڕی بەوە نەبوو کە دیالێکتیکەکە لە ئاستی فکر و ئایدیادا بێت، بەڵکوو لە ئاستی ماددەیدا دەیبینی.

بە پوختییش: هێگڵ پێی وایە کە کۆی بوونەوەر لە گۆڕان و ئاڵوگۆڕێکی بەردەوامدایە بۆ گەیشتن بەو کامڵێتییەی کە ئەو ناوی نابوو عەقڵ یان ڕۆحی ڕەها کە لە شوێنێکی ئەم گەردوونەدا ئامادەیە و هەیە، گەشتنی شتەکانیش

بەو ڕۆح (عەقڵ)ە ڕەهایە کۆتایی مێژووە و...هتد.

جا جیاوازییەکەی هێگڵ و مارکس لە مەسەلە دیالێکتیکییەکەدا لەوەدایە کە هێگڵ ئەسڵی گۆڕانەکە و دروستبوون بە ئایدیا دەبینێت و غایەتی پرۆسە دیالەکتیکییەکەش هەر بۆ گەیشتنە بەو، بەڵام مارکس بە پێچەوانەوەیە و غایەتەکەش لە گەیشتن بە کۆمۆنیزم دەبینێتەوە.

لەکۆتاییدا ئەوەی بەرهەم دێت لە ماتریالیزمی دیالێکتیکی بریتییە لە:

١- ماددە بنەمای هەمووشتێکە.

٢- غەیری ماددە بوونی نییە.

٣- ماددە ئەزەلییە، کەواتا پێویستی بە خودا نییە و خودا بوونی نییە.

٤- ڕۆح و ڕەوشت و بەها و شتە مەعنەوییەکان و ئایین و هونەر و فەلسەفە و ... هتد، هەموویان سەرچاوەکەیان ماددەیە و هیچ شتێکی جێگیر و سابتمان نییە، کەواتە ئایین و ڕەوشتیش دەگۆڕێن و جێگیر نین و بەرهەمی ماددەن.

بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کە ماتریالیزمی دیالێکتیکی فکرێکی زانستی نییە، ئەگەر چی لە سەرەتادا بە بیرێکی زانستی ناسرابوو.

بۆ نموونە لەسەر ئەزەلییەتی ماددە

باوەڕبوون بە ئەزەلییەتی ماددە بەهێزترین بەڵگەی ماددی و مارکسی و مولحیدەکان بوو، بەڵام کە بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە (Big Bang) (الانفجار العظيم ) دۆزرایەوە، ئەم گریمانەیە بە تەواوی هەرەسی هێنا.

**بەشی دووەم: ماتریالیزمی مێژوویی (المادية التأريخية):**

ماتریالیزمی مێژوویی هەوڵێکە بۆ ڕاڤەکردنی مێژوو لەسەر بنەما ماددییەکان.

بەپێی ماتریالیزمی مێژووی گەشەی مرۆڤایەتی، کۆمەڵایەتی، کۆمەڵگە، بیر، ئایین، ڕەوشت، یاسا، هونەر و ... هتد، هەموویان بە هۆکاری ماددی بووە، هەر بۆیەش پێی وایە ئەو گۆڕانکارییە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەی کە بە چەند قۆناغێک ڕوویداوە هەمووی بە هۆکار و پاڵنەری ماددیی بووە.

**قۆناغەکانیش بریتین لە:**

١- شیووعییەتی سەرەتا یان مەشاعەی سەرەتایی (الشيوعية الأولى، المشاعة الابتدائية)

٢- کۆیلایەتی (الرِّق)

٣- دەرەبەگایەتی (الاقطاع)

٤- سەرمایەداری (الرأسمالية)

٥- سۆشیالی ڕێخۆشکەر بۆ شیووعییەت (الاشتراكية الممهدة للشيوعية)

٦- شیووعییەتی کۆتایی یان دووەم (الشيوعية الأخيرة، الشيوعية الثانية)

کەواتا ماتریالیزمی مێژوویی پێی وایە هەر یەک لەم قۆناغانە بە ململانێ دروست بوون، ململانێکەش بە هۆکاری ماددی بووە، بۆیەش پێی وایە هەر یەک لەم قۆناغانە ڕەوشت و بیروباوەڕ و عادەت و عورفی خۆیان هەبووە.

هەروەها باوەڕیان وایە ئایین و ڕەوشت دەرهاویشتەی ماددە و ئەو جۆرە ژیانەن کە لەم قۆناغانەدا بوونیان هەیە، هەر بۆیەشە باوەڕیان بە جێگیری ئاکار و ڕەوشت و بەهاکان نییە.

بۆ نموونە: دەڵێن لە سەردەمی هەژاری و نەداری و کۆیلایەتی و

دەرەبەگایەتییدا ئایین هەبووە و گەشەی کردووە، چونکە ئامرازێک بووە بۆ پەناگە و پەنابردنە بەر خوداوەند و ئایین بۆ خۆپارێزیی و بەرهەم پارێزی، بەڵام دوایی کە سەردەمی پیشەسازی هات و ئامێرەکان پێشکەوتن و هۆکارەکان گەشەیان کرد، ئیدی وردە وردە ئایین لاواز بوو و پێویستی ئایین بوونی نەما! چونکە کرێکار توانی زاڵبێت بەسەر هەموو هۆکارەکانی بەرهەمهێنان و ئیدی پێویستی بە هێزێکی دەرەکی نەما بۆئەوەی داوای لێبکات بۆی بپارێزێت.

یان دەڵێن: ئایین دروستکراوی سەرمایەدار و دەستەڵاداران بووە بۆ چەوساندنەوەی پرۆلیتار و کرێکار و کۆیلەکان، بەڵام بە بڕوای ئەوان دوایی کە کۆمەڵگە بوو بە کۆمەڵگەیەکی شیووعی، ئیدی ئەو شتانە وندەبن و شتێک نامێنێت بە ناوی ئایین، چونکە چینەکان (طبقات) نامێنن و خاوەنداریهتی تایبەت بوونی نامێنێت، بۆیە کە خاوەنداریی تایبەت بوونی نەما و چینەکان کۆتایی هاتن، ئیدی ئایینیش ڕۆڵی نامێنێت و کۆتایی پێدێت، دواییش ململانێی نێوان چینەکانیش نامێنێت و خەڵکی دەچنە سەر ئەو کۆمەڵگە فریشتەییەی کە لە سەرەتای ژیان و مرۆڤایەتی هەبووە!

ئیدی بەهەشتی شیووعییەت دێتە کایەوە!

(هەرکەسێک مێژووی مارکسییەتی خوێندبێتەوە دەزانێ چ دۆزەخێکی بنیاتناوە لەجیاتی بەهەشت!)

### ماتریالیزم مێژوو دابەش دەکات بۆ پێنج قۆناغ:

#### ١- شیووعییەتی سەرەتا (الشیوعیة الأولی، المشاعة الابتدائیة)

کرۆکی ئەم شیووعییەتی سەرەتاییە بریتییە لەوەی کە: ئەوکات خاوەنداریەتی تایبەت بوونی نەبووە (الملکیة الفردیة) هەتاوەکوو نەک هەر لەماڵ و سەروەت و سامان، بەڵکوو لە ژنیشدا خاوەنداری نەبووە، واتا ژنیش تەنیا

ژنی یەک کەس نەبووە، بەڵکوو پیاوەکان هی هەموو ژنەکان بوون، ژنەکانیش هی هەموو پیاوەکان بوون، واتا کەس خاوەنی هیچ شتێک نەبووە و خاوەنی هەموو شتێکیش بووە، هەر بۆیەش لەو کاتەدا خێزان بوونی نەبووە. هەروەها لەبەر سادەیی هۆکارەکان و هێزەکانی بەرهەمهێنان مرۆڤ شتێکی نەبووە کە لێی زیاد بێت و خاوەندارییی تایبەت نەبووە و هەمووی وەک یەکی هەبووە، هەر بۆیەش چینایەتی پەیدانەبووە و بوونی نەبووە، هەر بۆیەش دەوڵەت بوونی نەبووە، کەواتە مارکسییەت دەڵێت: ئێمە دەبێت بگەڕێینەوە ئەو سەردەمە کە:

١- خاوەندارییی تایبەت بوونی نەمێنێت

٢- چینایەتی نەمێنێت

٣- دەوڵەت نەمێنێت

٤- ڕەوشت نەمێنێت

٥- ئایین و حەرام و حەڵاڵ نەمێنێت

ئیدی کە وای لێهات، نابێتە کۆمەڵگەیەکی فریشتەیی! دەبێتە باخچەی ئاژەڵان نەک بەهەشت.

**٢- کۆیلایەتی (الرّق)**

دەڵێت: دوایی چوون بۆ ئەم قۆناغە، ئەمەش وەک ئاشکرایە بە هۆکاری ماددی، چونکە وەک وتمان ئەوان دەڵێن: لە هەموو قۆناغەکاندا گۆڕانکارییەکان بە هۆکاری ماددی و ئابووری ڕوودەدەن، بۆیە ئامێرەکانی بەرهەمهێنان بە جۆرێک گەشەیان سەند کە زیادە لە بەرهەم پەیدابوو، دەسکەوتنی ئەو زیادەیە (کە وەختی خۆی لە قۆناغی یەکەمدا بوونی نەبووە) بووە هۆی ئەوەی مرۆڤێک یان چەند مرۆڤێک ئیش بە خەڵک بکەن و ئەوکات کرێکار و خاوەنکار دروست بوو، تا دوایی کرێکار بوو بە کۆیلە و دواییش بەهۆی شەڕەوە دیلەکان

دەکران بە کۆیلە و کاریان پێ دەکرا. ئیدی بەم جۆرە کۆیلایەتی پەیدا بوو و قۆناغی یەکەم (شیووعییەتی سەرەتایی) کۆتایی هات. دوای ئەوەی کارکردن بە کۆیلەکان شێوازی کۆیلایەتی پەیداکرد، وردە وردە ژمارەی کۆیلەکان زیادی کرد، هەتا زۆر سەردەم هەبوو کۆیلە زیاتر بوو لە ئازاد، ئیدی دوایی بۆئەوەی ئەو هەموو کۆیلانە ڕانەپەڕن و دژی خاوەنەکانیان نەوەستنەوە، دەوڵەت دروستکرا بۆ ئەوەی هەر ڕاپەڕین و جووڵەیەک بکەن سەرکوتیان بکەن، هەر بۆیەش لە ئەنجامی ئەو زیادەیەی لە ئامێرەکانەوە دەستکەوتن پیاو بوو بە خاوەن دەسکەوت و بەرهەم، ئیدی پیاو سەرکەوت و پلەیەک لەقۆناغی یەکەم بەرزتر بووەوە و بوو بە خاوەن خێزان و ژن.

هەر بۆیە لە فیکری مارکسییەتدا نابێت دەوڵەت و خێزان بوونیان هەبێت و کۆتاییان دێت.

### ٣- دەرەبەگایەتی(الاقطاع)

دوای قۆناغی کۆیلایەتی، هۆکارەکان و هێزەکانی بەرهەمهێنان زیاتر گەشەیان سەند و بەهۆی شۆڕشی کۆیلەکان و پەلاماردانەکانی خێڵە دڕندەکان دەوڵەت لەنێوچوو و دەرەبەگایەتی هاتە کایەوە، کە هەر یەکێکیان لە ناوچەیەک فەرمانڕەوایەتی دەکرد و دەسەڵاتدار بوو، کەواتا کۆیلەکان بەرە بەرە حاڵیان گۆڕا و بوون بە خاوەنی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان لەگەڵ پارچە زەوییەک، بەڵام لەژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی دەرەبەگەکان، واتا دەبووایە کاریان بۆ ئەوان بکردایە، هەر بۆیە دوو چین دروست بوون: سەپان و دەرەبەگ.

### ٤- سەرمایەداری (الرأسمالية)

دوای قۆناغی دەرەبەگایەتی سەرمایەداری هات، ئەوەش دوای ئەوەی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان گەشەیان سەند و ئامێری زۆرتری پێشکەوتوو پەیدابوو، ئیدی ئەم حاڵە کەوتە دژایەتی و ململانێ لەگەڵ دەرەبەگایەتی،

بۆیە ئیدی سەپان و دەرەبەگایەتی لەنێوچوون و بۆرژوازی و کرێکار پەیدابوون، واتا سیستهمی سەرمایەداری هاتە کایەوە و سەرمایەدارەکان (بۆرژوازییەکان) بە یارمەتی خەڵک پەیداب بوون و سەرکەوتن و ئیدی لەگەڵ پەیدابوونی سەرمایەداری و سەرمایەداران (بۆرژوازییەکان) زیاتر هۆکارەکان و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان پەیدابوون و پێشکەوتن و پەیدابوون. بەڵام هەتا سەرمایەداری پێش دەکەوت چینی کرێکار زیادی دەکرد و زیاتر دەچەوسێنرانەوە، بۆیە وای لێهات ژمارەیەکی زۆری خەڵک بوو بە کرێکار و ژمارەیەکی کەمیش بوون بە سەرمایەدار، ئیدی دوو چین پەیدابوو:

١- پرۆلیتار (کرێکار)

٢- بۆرژوازی (سەرمایەدار)

**٥- شیووعییەت، شیووعییەتی کۆتایی یان شیووعییەتی دووەم (الشیوعیة، الشیوعیة الأخیرة، الشیوعیة الثانیة)**

دوای سەرمایەداری ئیدی شیووعییەت دێت، ئەمەش لەبەرئەوەی ململانێی نێوان سەرمایەدار و کرێکار پەیدا دەبێت و دوایی کرێکارەکان سەردەکەون بەسەر سەرمایەدارەکان و حوکم و دەوڵەت دەگرنە دەست و خۆیان دەبنە خاوەنی هۆکار و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان. ئیدی چیتر خاوەندارێی تایبەت بوونی نامێنێت و ماڵ و سەروەت و سامان دەبێتە هی هەمووان و دوایی چینەکانیش نامێنن و دەوڵەت و خێزانیش هەڵدەوەشێنەوە و ژنیش هی هەمووانە! ماڵ و سەروەت و سامانیش هی هەمووانە و کەس لە کەسی زیاتر نابێت و دەبێت چەندەی کارت پێدەکرێت بیکەی و چەندەی پێویستتە ببەی، بۆیە کۆیلە، جوتیار، کرێکار، هەژاری، دەوڵەمەندی بوونیان نامێنێت و ئیدی صیراع و ململانێش بوونی نامێنێت و دوایی کە وای لێهات جەنگ و شەڕیش بوونی نامێنێت.

ماتریالیزمی مێژوویی چی لێدەکەوێتەوە؟

بەپێی تەفسیری ماتریالیزمی مێژوویی کە دەیکات بۆ مێژوو واتا: ئایین، ڕەوشت، خێزان، دەبێت بە ماددییانە تەفسیریان بۆ بکرێت، کە بە ماددییانەش تەفسیرکران بەم شێوەیەیان لێدێت:

١- ئایین و ڕەوشت و خێزان نە جێگیرن نە پیرۆزن، واتا بەپێی سەردەم و بارودۆخ و ژینگەکان دەگۆڕێن، واتە ڕەوشت جێگیرییێتی لەدەست دەدات، ڕەنگە لای تۆ شتێک نارەوشتی بێت و لای ئەو ئاسایی دەبێت، چونکە باوەڕی بەوە نییە کە ڕەوشت جێگیر و نەگۆڕ بێت.

٢- ئایین و ڕەوشت و خێزان زادە و بەرهەمی بارودۆخی ماددی و ئابوورین. کەواتە هەرکاتێک بارودۆخی ماددی و ئابووری گۆڕا، ئەوانەش دەگۆڕێن چونکە زادە و بەرهەمی ماددە و ئابوورین.

ئێستا با بێین بزانین چۆن ماتریالیزمی دیالێکتیکیان بەسەر مێژوودا جێبەجێ کردووە و ماتریالیزمی مێژوویی لێکەوتووەتەوە.

**١- یاسای گۆڕانی چەند و چۆن:**

لە ماتریالیزمی دیالێکتیکی باسمان کرد کە چۆن «چەند» دەبێت بە «چۆن» یان چەندێتی دەگۆڕێت بۆ چۆنێتی، وەک ئاو دەبوو بە هەڵم، یان چەند بەردێک چۆنییەتییەکی نوێیان دروست دەکرد و دەبوون بە بەنداو، بە هەمان شێوە زیادبوونی ژمارەی پڕۆلیتار (کرێکار) دەبێتە هۆی زاڵبوونیان بەسەر بۆرژوازییەت (سەرمایەداری)دا، ئیدی لە گۆڕانی ئەو چەندێتییەوە چۆنێتییەکی نوێ پەیدا دەبێت کە بریتییە لە شیووعییەت و ئەو بۆرژوازی و پڕۆلیتارییە بوونیان نامێنێت و هەمووی دەبێت بە کۆمەڵگەیەکی شیووعی.

**٢- یاسای یەکیەتیی و ململانێی دژەکان:**

بە هەمان شێوە ئەو یاسایە ماددییە کە لە ماتریالیزمی دیالێکتیدا باسمانکرد، کە وتمان: دوو شت بە یەکەوەن، بەڵام دوایی دەکەونە ململانێ و لایەک زاڵ دەبێت بەسەر لایەکەی دیکەدا، وەک گەردی ئاوی گەرم کە هێزی لێک هەڵوەشان و دوورکەوتنەوە زاڵ دەبێت بەسەر هێزی ڕاکێشاندا و ئاوە گەرمەکە دەبێت بە هەڵم، بە هەمان شێوە دەرەبەگ و بۆرژوازی ململانێیان لەنێوان پەیدابوو و بۆرژوازی سەرکەوت، دوایش ململانێی نێوان پرۆلیتار و بۆرژوازی دەست پێدەکات و پرۆلیتار سەردەکەوێت و شیووعییەت دێتەکایەوە.

**٣- یاسای نەفی:**

هەر وەک لە ماتریالیزمی دیالێکتیکیدا باسمانکرد کە ڕووەکەکە دەنکە گەنمەکە نەفی دەکات، دوایش گوڵەگەنمەکە ڕوەکەکە نەفی دەکات، بەهەمان شێوە خاوەندارێتی تایبەت هات و خاوەندارێتی گشتیی لابرد، دوایی خاوەندارێتی گشتی بە بەهێزتر دەگەڕێتەوە و خاوەندارێتی تایبەت لادەبات و نەفی دەکات.

لە ڕاستیدا ماتریالیزمی مێژوویش حاڵی لە ماتریالیزمی دیالێکتیکی باشتر نییە، چونکە بانگەشەکانی نازانستی و ناواقعی و نالۆژکین، ئەگەرنا چۆن دەبێت هەموو بزوێنەرە مێژووییەکان کورت هەڵێنی لە ئابووری و ماددە و ململانێی نێوان چینەکان، دوایی بێی هەرچی ڕەوشت و ئایین و بەهای جوان و ... هتد هەیە هەمووی بگەڕێنییەوە بۆ ماددە و ئابووری و ململانێ و ... هتد.

هەر بۆ نموونە یەکێک لە حەتمییاتەکانی مارکسییەت بریتییە لە ئینتقال لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە کە ئەم ئینتیقالە حەتمییە و دەبێت هەر ڕووبدات، بەڵام واقیع ئەمە بەدرۆ دەخاتەوە، بۆ نموونە مارکس بەپێی ئەم یاسایە پێشبینی کرد بەریتانیا یەکەم دەوڵەت دەبێت کە شیووعییەت تێیدا بەرجەستە دەبێت، چونکە لە سەردەمی ئەودا لە لوتکەی سەرمایەداریدا بوو، هەروەها وتی: "لە پێش هەموو شوێنەکاندا ململانێی نێوان چینەکان ڕوودەدات

و دەگۆڕێت بۆ شیووعییەت"، بەڵام وا دەرنەچوو و هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەر سەرمایەدارییە و ڕۆژێک شیووعییەتی بەخۆیەوە نەبینی.

بەکورتی و بە کوردی مارکسییەت و مارکسییەکان ئەوە بیروباوەڕو و فکر و فەلسەفەکەیانە:

١- نکووڵیکردن لە خودا، واتا: ئەوانە بڕوایان بە دروستکار و بەڕێوەبەری گەردوون نییە، دەڵێن بە هیچ شێوەیەک خودا گەردوونی دروست نەکردووە، بەڵکوو گەردوون هەر هەبووە و ئەزەلییە.

٢- نکووڵی لە وەحی و پەرتووکە ئاسمانییەکان دەکەن، چونکە ئەوان بڕوایان بەخودا نییە، کەواتە مادام بڕوایان بە خودا نەبێت ئەوە بەدڵنیاییەوە باوەڕیان بە وەحی و پەرتووکێکیش نییە کە لەلایەن خوداوە نێردرابێت.

٣- نکووڵیکردن لە پێغەمبەرایەتی: واتا ئەوان بە هیچ جۆرێک بڕوایان بەوە نییە کە خودا پێغەمبەری بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی ناردبێت، چونکە ئەوان بڕوایان بەخودا نەبوو جا چ جای ئەوە، بۆیە بە هیچ جۆرێک بڕوایان بە موعجیزەی پێغەمبەران نییە.

٤- نکووڵیکردن و دژایەتی ئایین: بە هیچ جۆرێک بڕوایان بە ئایین نییە، جا هەر ئایینێک بێت، بەڵکوو پێیان وایە ئایین شتێکی خوڕافی و ناڕاستە و بۆ خەڵکی ساویلکە و نەزان و نەفامە و تەنیا بۆ خەڵەتاندنی مرۆڤ و مرۆڤایەتی هاتووە. هەر وەک مارکس دەڵێت: (الدین أفیون الشعوب)، واتا: "ئایین تریاکی گەلانە" و بۆ سەرخۆشکردن و مەستکردنی نەتەوەکان و مرۆڤ و مرۆڤایەتی دروستکراوە، دیارە ئەوان لە تێڕوانینیان بۆ دیینی مەسیحییەت و ئینجیل و قەشە و کڵێسا، هەستاون ئەو بڕیارەیان گشتاندووە بەسەر ئیسلامدا، ئەمەش قیاسی کەشکە لەسەر مەشک (القیاس مع الفارق)، واتا: یەکسانکردنی دوو شت کە جیاوازییەکی زۆر زۆر لەنێوانیادا هەیە.

٥- نکووڵیکردن لەزیندوبوونەوە و ڕۆژی دوایی و ڕۆح: بە هیچ جۆرێک بڕوایان

بە ڕۆژی دوایی و زیندوبوونەوە نییە، پێیان وایە مرۆڤ کە مرد کۆتایی بە هەموو شتێک دێت.

٦- ڕەوشت نیسبی و ڕێژەییە: پێیان وایە ڕەوشت ڕێژەییە و هەر کەس لە ئاست خۆی و کۆمەڵگەکەی بۆ ڕەوشت دەڕوانێت، کەواتە نەگۆڕیی ڕەوشتی و بنەمای ڕەوشتی لای ئەوان نییە.

**بەشی سێیەم: ئابووری و سیاسی**

وەک لە دوو بەشی پێشوو باسمانکرد مارکسیزم فەلسەفەیەکی گشتگیرە بۆ گەردوون و ژیان و مرۆڤ و مێژوو و ئابووری و سیاسی، لەم بەشەدا زۆر بەکورتی باسی فەلسەفەی مارکسیزم دەکەین بۆ ئابووری و سیاسی:

١. ڕەتکردنەوەی خاوەندارێتی تایبەت (الملكية الفردية): وەک لە پێشەوەدا باسمانکرد کە مارکسییەت باوەڕی وایە لە سەرەتای مرۆڤایەتیدا شیووعییەتی تەواو هەبووە وماڵ و سامان و ژن هی هەمووان بوون! هەر بۆیە چینی هەژار و دەوڵەمەند، کرێکار و خاوەنکار، بۆرژوازی و پرۆلیتاری، کۆیلە و جوتیار و...هتد، بوونیان نەبووە.

کەواتا خاوەنداریی گشتی ئەسڵە و خاوەنداریی تایبەت شتێکی نەگریس و پیس و خراپە، بۆیە دەبێت بگەڕێینەوە سەر ئەسڵەکە بۆ ئەوەی چینایەتی نەهێڵین، ململانێ لەنێوبەرین.

بۆیە خاوەنداریی تایبەت لە سەردەمی «لینین» و بەشێک لە سەردەمی «ستالین» لەنێوبرا و نەما.

٢. ڕەتکردنەوەی ململانێی (صراع) نێوان چینەکان: واتا وەک شیووعییەتی سەرەتایی (الشيوعية الأولى)، کە نابێت کەس خاوەنی شتێکی تایبەت بە خۆی بێت، بەڵکوو هەمووی هی دەوڵەتە (ئەگەر دەوڵەت هەبوو) یان هی هەموو خەڵکە، واتا وەک شیووعییەتی سەرەتایی کەس خاوەنی ژنی خۆیشی نییە! ژن

ژنی هەمووانە! ماڵ ماڵی هەمووانە! کە وایشی لێهات ئیدی ململانێ (صراع) نامێنێت.

٣. ڕەتکردنەوە و ئیلغاکردنی دەوڵەت،:بەو پێیەی کە خاوەنداریی تایبەت نەما، دوایی ململانێی نێوان چینەکانیش نەما، ئیدی نابێت دەوڵەتیش بمێنێت، چونکە دەوڵەت ئامڕازی ستەمی ستەمکارانە، کەواتا دەبێت وەک شیووعییەتی سەرەتایی لێبێت و نابێت شتێک بمێنێت بە ناوی دەوڵەتەوە.

٤. ڕەتکردنەوەی چینایەتی و چینەکان: چینی هەژار و دەوڵەمەند، کرێکار و خاوەنکار، بۆرژوازی و پڕۆلیتاری، کۆیلە و جوتیار، نابێت بمێنێت و دەبێت هەمووی لە یەک ئاستدا بن.

٥. کەفالەتی دەوڵەت بۆ هەموو خەڵک: یەکێک لە بنەماکانی شیووعییەت ئەوەیە کە دەبێت دەوڵەت لە بەرانبەر کارکردنی خەڵکدا زامنی خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگ و پێداویستییەکان بکات، بەڵام ئەوەی لە ئەرزی واقیعدا بەرجەستەیان کردووە بریتی بووە لە دەستەبرکردنی نزمترین ئاستی ژیان و پێداویستییەکان، وەک کوردەواری دەڵێت: نانە زگە بووە.

٦. یەکسانی لە کرێ: وەک وتمان دەبێت خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگ و شوێنی نیشتەجێبوون وەک یەک بن، وەک ئەوەی لە شیووعییەتی سەرەتاییدا هەبووە، بە هەمان شێوە دەبێت کرێی هەموو کرێکار و ئیشکەرەکان وەک یەک بێت، بۆیە شیووعییەت لە سەرەتادا زۆر بەتوندی ئەوەی جێبەجێکرد! بەڵام دوایی نەگونجا لەگەڵ هەموو کرێکرەکان، ئاخر چۆن دەبێت کرێی پزیشکێک وەک کرێی پەرستارێک بێت یان ئەندازیار وەک کرێکار... هتد؟!

٧. چەند کارت پێ دەکرێت دەبێت بیکەی: چەندت پێویستە ئەوەندەی دەبەی، ئەوە بەپێی ئەو خەیاڵەی دایان نابوو، دەیان وت: وای لێدێت لە سیستهمی شیووعییەتدا خەڵک ئەوەندە بەزر دەبێت لە ڕووی مەعنەویی و فکرییەوە، هەر چی لە توانایدا هەیە دەیکات و لەکار ناوەستێت، دواییش بە بەشێکی دیاریکرا و کەم یان بەپێی ئەندازەی خۆی قەناعەت دەکات!

٨. هیچ شتێک بە ناوی حیزب و دامەزراوەی سیاسی و ڕێکخراو و ... هتد، نابێت بوونی هەبێت.

٩. ڕەتکردنەوەی ئایین، وەک وتمان: لای مارکسییەت ئایین زادە و بەرهەمی مادده و ئابووری مێژوو و چینەکانە، هەروەها پەناگە و دڵنەوایی چینی کۆیلە و کرێکار و هەژار و جوتیارەکانە، وەک بڵێیت خۆیان دروستیان کردووە بۆ دڵنەوایی و پاڵپشتی مەعنەوی خۆیان، یان دروستکراوی سەرمایەدارەکانە بۆ چەوساندنەوەی کرێکار و هەژارەکان، بەڵام ئێستا ئەو پێویستییە نەماوە و چینەکان کۆتاییان هاتووە و ململانێ نەماوە و بارودۆخەکە گۆڕاوە و هیچ پێداویستی و حاجەتێک بە ئایین نەماوە، بۆیە دەبێت لاببرێت و ڕەشبکرێتەوە و ئاسەواری نەمێنێت و هەموو ئامراز و هۆکارەکانیشی قەدەغە بکرێت. بۆیە بینیمان لە هەموو سیستەمە شیووعییەکاندا دژایەتی ئایین و ئاییندار بوو بوو بە بنەما و هیچی خراپ و ناشیرین و قێزەون نەما نەیکەن بە ئاییندااران و ئایین.

بەڕاستی ئەوەی سەیرێکی مێژووی شیووعییەت بکات دەزانێت کە ئەو شتانەی وەک بیر و فەلسەفە خستیانەڕوو وەک خەیاڵێک مایەوە و غەیری کاولکاری و کوشتار و ستەم و خراپەکاری هیچی دیکەیان نەکردووە.

بۆیە بینیمان چۆن دەوڵەت و سیستەمەکانیان لێک هەڵوەشاند و ئەسڵ و ئەساسیان نەما.

لە ڕاستیدا سیستەمی شیووعییەت لەو لا و سیستەمی سەرمایەداری لەم لا، دنیایان وێرانکرد و مرۆڤایەتییان بەرە و کۆیلەبردن برد.

ئەو دوو سیستەمە هاتن مرۆڤیان لە مرۆڤبوون شۆرد و کردیان بە ماددەیەکی موجەڕڕەد و کردیان بە کاڵا بۆ بەرهەمهێنانی کاڵا، کردیان بە مادده بۆ بەرهەمهێنانی مادده، لە هەموو بەهایێکی ڕەوشتی و مرۆڤایەتی شۆردیانەوە، هاتن مرۆڤیان لە لووتکەوە هێنایە ئاستی ئاژەڵ.

# ئاراستەی پراگماتیزم

پراگماتیزم ناوی ڕێبازێکی فەلسەفەیە کە لە ئەمریکا سەریهەڵداوە، ناوەکە یەکەمجار «چارلس پێر» (١٩١٣م) بەکاریهێناوە و بناغەی فەلسەفەکەی دارشتووە، وتارێکیشی نووسی بە ناوی «چۆن وابکەین ئەفکار و بیروکەکانمان ڕوون بن؟»، لەدواییدا لەلایەن «ولیام جەیمس» (١٩١٠ م) کراوە بە ناونیشانی ئەم ڕێبازە، «جۆن دیوی»یش ڕۆڵی باشی هەبووە لە دامەزراندنی.

وشەکە لە پڕاگما (PRAGMA) وەرگیراوە، کە خۆی یۆنانیی و لاتینییە و بە واتای کار دێت، بۆیە مرۆڤی پڕاگماتی بە کەسێک دەوترێت کە سەرگەرمی گەڕان بێت بەدوای سوودبەخشدا و خەریکی کار و کاردن بێت و کەسێکی کردەیی و کردەکی بێت.

پوختەی فەلسەفەی پڕاگماتیزم: هەموو پڕاگماتییەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە پێوەری ڕاستەقینە بۆ دیاریکردنی حەقیقەت بریتییە لەو بەرووبووم و کاریگەریانەی لەدوایەوە پەیدا دەبێت، ڕاستی هەموو بیرۆکە و ئەفکارەکانیش بەو سوودە دەپێورێت کە لێیەوە پەیدا دەبێت، واتە سوود و قازانج سەنتەرن، لەم ڕووەوە هاوڕایە لەگەڵ تەوژمی ئەزموونگەرا کە بەس پشتی بە ئەزموون و هەست و واقیع دەبەست و بەس. ئەزموونگەرا مەعریفە دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕیشەکەی کە لێیەوە پەیدابووە، واتە دەگەڕێتەوە بۆ دواوە. بەڵام پڕاگماتیزم وانییە، سەیری بەرووبووم و ئەنجام و کاریگەری و سوودی ئەفکارەکان دەکات، واتە چیان لێ پەیدا دەبێت و سوود و کاریگەرییان چییە. کەواتە پڕاگماتیزم کاری بەهیچ شتێکی ئەفکار و مەعریفە نییە، چۆنە و چۆن بووە و ....، کاری بەوەیە بەروبووم و ئەنجام و سوودەکەی چییە.

بەڵام جۆن دیوی شێوەیەکی ترمان لە پڕاگماتیزم نیشان دەدات، کە پێی دەوترێت (الذرائعية) (الاداتية) واتە ئامراز، کەواتە بەم پێیە مەعریفە تەنیا ئامرازە بۆ ئیش و کار و بەس، بیر بیرۆکە و فکری ڕاست ئەویە کە دەتبات بەرەو چارەسەرکردنی کێشەکان.

## هەڵوێستی ولیەم جیمس دەربارەی خودا و ئایین

دەربارەی خودا و ئایین هەڵوێستی ولیەم جیمس ناڕوون و ناڕێکە، چونکە هەندێک قسە و بۆچوونی هەیە وای لێ دەخوێندرێتەوە کە باوەڕی بە بوونی خودا وەک بوونێکی سەربەخۆ هەیە، زەمی ئیلحادیش دەکات. بەڵام لەولاشەوە هەندێک بۆچوون و قسەی دیکەی هەیە وا دەگەیەنن کە بڕوای بە بوونی سەربەخۆی خودا نییە لە دەرەوەی زەینی مرۆڤدا، واتە تەنیا شتێکی زەینییە و فکرێکە و بەس، یان گریمانەیەکە لە مێشکی مرۆڤدا و بەس. هەربۆیە توێژەران ڕاجییان لە دیاریکردنی هەڵوێستەکەی دەربارەی خودا، چونکە ئەم ناڕوونییە هەیە لە وتە و بۆچوونەکانیدا[1]، بەڵام ئێمە بۆ ڕوونکردنەوە هەڵوێستەکەی جیاکاری دەکەین لەنێوان دوو پێگەدا:

١. **پێگەی باوەڕ بە بوونی خودا:** ولیەم جیمس نکۆڵی ناکات لە بوونی خودا، بەڵکوو بانگەوازی بۆ دەکات و پێی وایە شتێکی ڕاستە، چونکە ئەگەر عیبادەت و پەرستش ببەستینەوە بە سەرەنجام و ئەنجامە باشەکانی، ئەوە زۆرترین کاریگەری باشی هەیە لەسەر سلووک و مامەڵەی باوەڕداران، چونکە وەک باسی دەکات ئەگەر ئێمە بەراوردێک بکەین لەنێوان سلووک و مامەڵەی ئەوانەی باوەڕیان بە خودا هەیە، لەگەڵ ئەوانەی بێباوەڕن بە خودا، ئەوە دەبینین

---

(١) تاريخ الفلسفة الحديثة، وليم كلي رايت ل (٤٩٨). والفلسفة والاعتقاد الديني (وليم جيمس نموذجا) محمد عبد الحفيظ (٩٥، ١١٨، ١٣٣).

باوەڕدارەکان گەشبین و هیوا و ئومێد و ئەمەلی زۆریان هەیە، بەڵام بێباوەڕەکە ڕەشبین و پڕە لە بێئومێدی.[1]

**٢. پێگەی سروشتی بوونی خودا:** ئایا خودا بوونێکی سەربەخۆی هەیە لە دەرەوەی زەین و مێشکی مرۆڤدا؟ وتەکانی ولیەم جیمس ئەوە دەگەیەنن کە ئەو بڕوای بە بوونی سەربەخۆی خودا نییە لە دەرەوەی زەین و مێشکی مرۆڤدا، بەڵکوو پێی وایە خودا بوونێکی زیهنییە، تەنیا گریمانەیەکی زەینییە مرۆڤ خۆی بۆ خۆی دایهێناوە لە زەینی خۆیدا.[2]

دەربارەی هەڵوێستی ولیەم جیمس دەربارەی ئایین و پابەندبوون پێیەوە، ئەو نکۆڵی لەوە ناکات، بەڵکوو بانگەشەی بۆ دەکات و ستایشی دەکات، چونکە ئایین کاریگەری زۆر باشی هەیە لەسەر ژیانی مرۆڤ، گەشبینی پێدەبەخشێت، ڕەشبینی لەناو دەبات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی وانییە ئایین و بنەماکانی حەقیەتێکی مەوزوعی و بابەتییان هەبێت، کە لە زاتێکی بەرزەوە هاتبێت، سەربەخۆ بێت لە زەینی مرۆڤ و بوونێکی سەربەخۆی هەبێت، واجب و پێویست بێت گوێڕایەلی بکرێت و عیبادەت و پەرستشی بۆ بکرێت، بەڵکوو شتێکی لاوەکییە و لەسەر هیچ بنەمایەکی عەقڵی دانەمەزراوە و هیچ بەڵگەیەکی یەقینی لەسەر نییە.[3]

کەواتە لێرەوە دەردەکەوێت «ولیەم جیمس» لە چوارچێوەی ئیلحادی دیندار جێی دەبێتەوە کە باوەڕی بە خودا و هیچ غەیبێکی دیکە نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا دژایەتی ئایین ناکات بەڵکوو بانگەوازی بۆ دەکات بۆ دینداری و مانەوە لەسەری و دەست پێوەگرتنی، چونکە کاریگەری باشی هەیە لەسەر تاک و کۆمەڵگە، هەڵوێستەکەی زۆر نزیکە لە فیورباخ.

---

(١) البراجماتية، وليم جيمس ل (١٠٦، ٣٤٧).

(٢) البراجماتية، وليم جيمس، ل ١٠٥.

(٣) البراجماتية، وليم جيمس، ٩٦٩.

## بوونگەرایی (وجودییەت) (ئیگزستانشیالیزم)

**بوونگەرایی**[١]، وجودیەت خاوەنەکەی «جان پۆل سارتەر» ە کە فەیلەسووف و ئەدیبێکی جوولەکەی فەرەنسییە لە ساڵی (١٩٠٥) لەدایکبووە، چەندین لێکۆڵینەوەو پەرتووکی هەیە لە بوارەکانی سیاسەت و ئەدەبدا و لە ساڵی (١٩٧٩) مردووە.

**هەندێک لە بیروڕاکانی وجودییەت:**

مرۆڤ سەنتەرە و بوونی مرۆڤ وەک خودی خۆی لە هەموو شتێک بەرزترە، هیچ شتێک نییە لە بوونی مرۆڤ بەرزتر، هیچ هێزێکیش لە دەرەوەی مرۆڤ مافی ئاڕاستەکردنی مرۆڤی نییە بە هیچ جۆرێک، جا ئەو هێزە خودا بێت یان ئایین یان ڕەوشت یان کۆمەڵگە یان کلتوور.

مادام مرۆڤ هێندە بەبەهایە، دەبێت ئازادی ڕەهاش بۆ مرۆڤ هەبێت، ئازاد بێت بۆ تێپەڕاندن و بەزاندنی هەموو سنوورە جیاواز و جۆراوجۆرەکان.

وجودییەکان نکووڵی لە خودا و دواڕۆژ و ئایین و ڕەوشت دەکەن، پێیان وایە ئایین هۆکاری دواکەوتنی مرۆڤ و مرۆڤایەتییە، ئایین چارەسەر نییە بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی، ئەوەی چارەسەرە بریتییە لە بوونگەرایی (وجودییەت). بۆیە لای ئەوان مرۆڤ خودای خۆیەتی. لەلای بوونگەراکان ڕەوشت ڕێژەییە و پێیان وایە هیچ شتێک نییە بە ناوی ڕەوشت و خێر و شەڕ و چاکە و خراپە، ئەوە مرۆڤە دیاری دەکات چی باشە و چی خراپە، یان چی دەکات و چی ناکات[٢].

---

(١) لێرەدا مەبەستمان لە وجودییەتی ناباوەڕییە، چونکە دوو جۆر وجودیمان هەیە، بێباوەڕ (مولحد)، باوەڕدار. باوەڕدارەکەوەک: کارل یاسپەرز، گابرێل مارسێل. ناباوەڕەکەوەک: جان پۆل سارتەر، مارتن هایدگەر.

(٢) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة.

# ئاراستەی (ڕێبازی) پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی (الوضعية المنطقية)

ئەم ڕێبازە لەلایەکەوە درێژکراوەی ڕێبازی پۆزەتیڤیزمی کلاسیکی «ئۆگست کۆنت» هەژمار دەکرێت، لەلایەکی دیکەشەوە درێژکراوەی ڕێبازی ئەزموونییە کە لە سەدەی هەژدەدا لەسەر دەستی: «هیوم و لۆک» و لەدوای ئەوانیش «جۆن ستیوارت میل» لەدایک بوو.

پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی (الوضعية المنطقية) لەسەر بنەمایەکی ئەساسی دامەزراوە، ئەویش بنەمای (تحقق) هاتنەجێیە، واتە بۆ ڕاستی هەر بابەت و وتە و بۆچوونێک پێویستە لە ڕووی ئەزموونییەوە بتوانی بیهێنییە جێ و ئەزمونکراو بێت، واتە هەموو بابەتە میتافیزکییەکان و غەیبییەکان و نابەرهەستەکان درۆ و پووچ و بەتاڵن! چونکە ناتوانی لەڕێی ئەزموونەوە بیانهێنییەجێ. هەر لێرەوە پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی (الوضعية المنطقية) بە هەموو تەوژمەکانییەوە هێرشێکی توند دەکەنە سەر هەموو بابەتە دینییەکان و دینەکان، پێیان وایە هەموو بابەتە ئایینییەکان و ئایینەکانیش درۆ و دەلەسە و شتی پڕوپووچن، چونکە ئەم بنەمایەی ئەوان دایان ناوە بۆ ڕاستی هەر بابەتێک نایەتە جێ و نایەتە بوون لە بابەتە ئایینییەکاندا.[1]

بۆنموونە کە دەڵێیت: خودا بوونی هەیە، ئەم ڕستەیە ڕستەیەکی بەتاڵە، ڕستەیەکی بێبنەمایە! چونکە ناتوانین لەڕووی ئەزموونییەوە بیهێنینە بوون!

---

(١) نحو فلسفة علمية، زكي نجيب محمود، ل ٢٧٤.
والموسوعة الفلسفية المختصرة، ٥٣٨ _ ٥٣٩.

هەربۆیە پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی (الوضعیة المنطقیة) بەئاشکرا ناباوەڕی و ئیلحادی خۆی دەرخستووە و نەیشاردووەتەوە، ئەوەتا یەکێک لە ڕێبەرانیان بە ناوی «کارناب» دەڵێت: وشەی (الله) خودا وشەیەکی مێتافیزیکییە و بەتاڵە لە هەموو مانایەک.[١]

لەوێوە دێن هەموو بنەما ئایینەکانی وەک «وەحی، پێغەمەرایەتی، ڕۆح، نەفس، ڕۆژی دوایی، ...» نکۆڵی دەکەن و پێیان وایە خورافەن و شتی پڕوپووچن و هیچ مانایەکیان نییە، چونکە لە جیهانی بەرهەست و ئەزموون و واقعیدا ناتوانرێت بسەلمێنرێن.[٢]

**لە تایبەتمەندییەکانی پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی (الوضعیة المنطقیة)**

**١.** پیرۆزکردنی زانست و تواناکانی.

**٢.** ڕەتکردنەوەی مێتافیزیک، بەبیانووی خاڵیبوونی لە واتا.

**٣.** دەمارگیری توند بۆ ئاڕاستەی ئەزموونگەرایی بە پشت بەستن بە لۆژیکی نوێ.[٣]

---

(١) المیتافیزیقا عند الفلاسفة المعاصرین، ل ٢٤٠.

(٢) نحو فلسفة علمیة، زکي نجیب محمود، ل ٢٤٨.

(٣) الفلسفة لمن یرید، ١٦٩.

## ئەمیل دۆرکهایم و ئایین (١٨٥٨-١٩١٧)

دۆرکهایم فەیلەسووف و زانای گەورەی فەڕەنسی بواری کۆمەڵناسی بوو، ئەوە دۆرکهایم بوو مەنهەجێکی تایبەتی بۆ کۆمەڵناسی دانا. دۆرکهایم کتێبێکی دەربارەی میتۆدەکانی کۆمەڵناسی دانا بە ناوی (قواعد المنهجية السوسيولوجي). دەربارەی ئایینیش بەشداری کارای کردووە و هەوڵی داوە لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە شرۆڤەی ئایین بکات. لەو بارەیەشەوە کتێبێکی نووسیوە بە ناوی «شێوە سەرەتاییەکانی ژیانی ئایینی»، ئەم کتێبەی لەساڵی ١٩١٢ نووسیوە، هەروەها یەکێکی تر لە کتێبە بەناوبانگەکانی کتێبی «خۆکوشتن، ١٨٩٧»، هەروەها دەربارەی دابەشکردنی کار کتێبێکی گرنگی هەیە بە ناوی دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتی کە لە ساڵی ١٨٩٣ نووسیویەتی.[1]

بۆئەوەی بە دروستی لە دیدی دۆرکهایم بگەین، سەرەتا پێویستە بزانین مەبەستی لە دیاردەی کۆمەلایەتی چییە؟

١. دیاردەی کۆمەڵایەتی دیاردەیەکی بابەتییە و بوونێکی تایبەتی لە دەرەوەی هەستی ئەو تاکانە هەیە کە تێبینی دەکەن و هەستی پێ دەکەن، چونکە لە دروستکراوی ئەوان نییە، بەڵکوو وئەوان لەو کۆمەڵگەیەدا وەریدەگرن کە تێیدا پەروەردە دەبن.

٢. دیاردەی کۆمەڵایەتی شتێک نییە بەرهەمی بیرکردنەوەی تاک بێت، بەڵکوو هەڵقووڵاوی ژینگەی کۆمەڵایەتییە و پێش لەدایکبوونیان هەیە.

٣. دیاردەی کۆمەڵایەتی وەک شتە. ئەمە ئەو خەسڵەتەیە کە دۆرکهایم لە دامەزراندنی کۆمەڵناسی پشتی پێبەستووە. چونکە فاکتە کۆمەڵایەتییەکان بە فاکتەکانی جیهانی دەرەکی چواند. دیاردە کۆمەڵایەتییەکان شتگەلێکی دەرەکین سەبارەت بە هەستی تاکەکان. تاک دیاردەی کۆمەڵایەتی وەردەگرێت

---

(١) علم الاديان، ميشال مسلان، ت: عز الدين عناية، ل ١٤٤-١٤٨).

و بۆی ملکەچ دەبێت و خۆی بەدەستەوە دەدات وەک ئەوەی هێزێکی دەرەکی هەبێت. ئەویش بێتوانایە لە گۆڕینی دیاردە، یاخود پێچەوانەکردنەوەی ئاراستەکەی، تا ئەوکاتەی فاکتەری بابەتی ویستی خۆی بەسەر تاکەکان دەسەپێنێت و وایان لێدەکات ڕەفتار بکەن بەپێی حوکم و دەقەکان، هەروەک ئەمە حاڵەتی ئایین زمان و یاسایە.

٤. دیاردەی کۆمەڵایەتی خەسڵەتی پابەندییتی، یاخود ناچاری هەیە، بەو مانایەی کە لەبەر ئەوەی دیاردەی کۆمەڵایەتی جۆرێک لە هەست، یاخود بیرکردنەوە و لەدەرەوەی ویژدانی تاک بوونی هەیە، بۆیە دەبێت خۆی بەسەر هەست و ڕەفتاری تاکەکە بسەپێنێت. بەزانینی ئەوەی کە زۆرجار تاک هەست بەو ناچارییە ناکات، چونکە ئەو وەڵامی دیاردەکان دەداتەوە لە ڕێگای نەریت و عورفەکان.

٥. دیاردەی کۆمەڵایەتی دیاردەیەکی مرۆییە، دروست دەبێت بە دروستبوونی کۆمەڵگە. بەم خەسڵەتەش لەو دیاردانە جیادەبێتەوە کە زانستە سروشتییەکان توێژینەوەی لەبارەوە دەکەن، وەک: ماتماتیک، فەلەکناسی، فیزیا، کیمیا، بایۆلۆژی، جیۆلۆجی، جوگرافیا و ... هتد. بەهۆی ئەوەی کۆمەڵگەی مرۆیی وەک شانیشینێکی بچووک لەنێو گەردوونێکی گەورەدا، ئەو گەردوونەش ملکەچی یاسای جێگیر و پێویستە لە چەندین زانستی سروشتی پێگەیشتوو، بۆیە کۆمەڵگەی مرۆیی ملکەچی ئەو یاسا کۆمەڵایەتییانەیە کە گوزارشت لە خۆی دەکات لەسەر شێوەی ئەو دیاردە کۆمەڵایەتییانەی کە نەوەکانی کۆمەڵگە تێیدا دەژی.

٦. دیاردەی کۆمەڵایەتی جیادەکرێتەوە بەوەی گوزارشتە لە ئامرازەکان و ڕێساکان و بارودۆخەکانی بیرکردنەوە و کاری مرۆیی. ئەو خەسڵەتەش سیفەتی مرۆییمان بۆ دیاری دەکات، وەک چوارچێوەیەک بۆ دیاردەی کۆمەڵایەتی.

٧. دیاردەی کۆمەڵایەتی جیادەبێتەوە بەوەی کە لەخۆوەیە، بەو واتایەی کە تاک یاخود تاکەکان دروستیان نەکردووە، بەڵکوو دروستکراوی کۆمەڵگەیە و

بەشێوەی عەقڵێکی گشتی دێتە سەر شانۆ.

٨. دیاردەی کۆمەڵایەتی دیاردەیەکی گشتییە، گشتگیری ئەو دیاردەیەش بەرهەمی خەسڵەتی ناچارییە کە پێی جیادەکرێتەوە. دیاردە دەبێتە گشتی چونکە خۆی بەسەر تاکەکان دەسەپێنێت لەسەرجەم لایەنەکانی کۆمەڵگە، یاخود لە هەندێک ناوچەدا.

٩. دیاردەی کۆمەڵایەتی جیادەکرێتەوە بەوەی کە خەسڵەتی بەیەکەوەگرێدانی هەیە. بەو مانایەی کە هەموو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بەیەکەوە گرێدراون لەگەڵ دیاردەیەکی تر لەکاتی ئێستادا، وەک پەیوەستی دیاردەی ئابووری بە دیاردەی سەربازی و سیاسی. هەروەها دیاردەی کۆمەڵایەتییەکان بەردەوامییان هەیە بە درێژایی ئەو قوناغە مێژووییانەی کە کۆمەڵگە پێیدا گوزەردەکات.[1]

دەتوانین لەو خاڵانەی خستمانەڕوو بزانین دۆرکهایم چۆن دەڕوانێت بۆ دیاردەی کۆمەڵایەتی، دیاردەی کۆمەڵایەتی مرۆییە، واتە بان سروشت نییە، دیاردەی کۆمەڵایەتی جەبرییە، ئیختیاری نییە، دیاردەی کۆمەڵایەتی فاکتە ...

لە دیدی دۆرکاییمەوە کۆمەڵگە سەنتەرە نەک تاک، دەڵێت: ئەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەسنیشان دەکات ئێمە نین، ئەو ستراکتۆرە مۆراڵیانەیە کە لە مێژووی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکانماندا دروستبوون و پێش لە دایکبوونی ئێمە لێرەن و دوای مردنی ئێمەش درێژە بە تەمەنی خۆیاندەدەن. ئەوە ژیانی تاکانەی ئێمە نییە کە ژیانی کۆمەڵایەتی دروستدەکات، بەڵکوو ئەوە ژیانی کۆمەڵایەتییە کە ژیانی تاکانەی هەر یەکێک لە ئێمە دروستدەکات.[2]

دۆرکهایم پێی وایە تاک زمان و ئایین و نەریت وترادسیۆنەکان و پێوەرەکان

---

(١) تیۆرە کۆمەڵایەتییە پێشکەوتووەکان، د. ئیحسان محمد حسن، دیدار ئەبوزێد، ل ٢٩٩-٣٠١.

(٢) ئایین چییە، دانیاڵ هێرڤیۆ لێژێ، ژان پۆڵ ویلەم، ئیروان دیانتەڵ، میشل لووی، و: عادل باخەوان، ل ١٨٤.

و ئارەزووەکانی لە گرووپ وەردەگرێت، ئەو گرووپانەی پەیوەندییان لەگەڵ دەبەستێت و کارلێکیان لەگەڵ دەکات. فێربوونی ئەو دیاردە و ئەزموونە کۆمەڵایەتییانەش لە میانەی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە ئەنجام دەدرێت کە لە قوتابخانە و کۆمەڵگەی لۆکاڵی وەریدەگرێت.[1]

ئێستا تارادەیەک دیدی دۆرکهاییمان ڕوونکردووەتەوە دەربارەی کۆمەڵگە و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، هێدی هێدی دەچینە نێو بابەتەکەمانەوە ئایین لە دیدی دۆرکهاییمەوە. ئایین لە دیدی دۆرکهاییمەوە دۆرکهایم لە کتێبی شێوە سەرەتاییەکانی ژیانی ئایینی و خۆکوشتندا، لە سەر ئەو بۆچوونە پێدادەگرێت کە پێناسەی وردی دیاردەکان لە لێکدانەوە و شرۆڤەی کۆمەڵناسانە گرنگترە. دۆرکهایم پێی وایە، لەنێوان پێناسە و ڕوونکردنەوەی تیۆریدا پەیوەندییەکی بەرچاو و حاشاهەڵنەگر هەیە، ئەگەر بە ڕوونی پێناسە بکرێن، لە ئەنجامدا ڕوونکردنەوە زۆر بە ئاسانی جێبەجێ دەکرێت.

میتۆد و شێوازی زاڵ لە کتێبی شێوە سەرەتاییەکانی ژیانی ئایینی بەم شێوەیەیە، سەرەتا چەمکەکان پێناسە دەکات، داواتر ڕەخنە لە توێژینەوەکانی پێش خۆی دەگرێت و ڕەتیان دەکاتەوە، لە کۆتاییشدا بیر و بۆچوونەکانی خۆی دەسەلمێنێت.[2]

دۆرکهایم ئایین دەبەستێتەوە بە سروشت و گەوهەری گرووپە کۆمەڵایەتییەکانەوە. ئایین ئەوەندە پەیوەستە بە کۆمەڵگەوە کە بەبڕوای دۆرکهایم، ڕەگ و ڕەچەڵەکی تەواوی چەمک و گوتەزا و چینەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئایین[3]. هەر ئەم ڕوانینەیە هەندێک لە هاوڕێ هەرە نزیکەکانی لێی تووڕە بین، زۆر بەڕوونیش لە نامەیەکی «جۆرج لاپی» لە (٧ مێی ١٨٩٧) بۆ «بۆگلێی»

---

(١) تیۆرییە کۆمەڵایەتییە پێشکەوتووەکان، ل ٣٠٢- ٣٠٣.

(٢) کۆمەڵناسی ئایین، خالید علیزادە، ل ٣٨-٣٩.

(٣) تیۆرەکانی کۆمەڵناسی، ئەحمەد غولامی، ل ١٠١.

هاوڕێی دەنووسێت: دۆرکهایم ئێستا هەموو شتەکان بە ئایین ڕاڤە دەکات. هەموو شتەکان. قەدەغەکردنی ژنخوازی لە نێوان خانەوادەیەکدا، تەنانەت خەمۆکییش دەباتەوە سەر ئایین[1]. هەر لەبەر ئەمەشە دۆرکهایم لە بری توێژینەوە لە ئایینە گەورەکانی وەک ئیسلام و مەسیحییەت، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاییترین ئایینەکان. دۆرکهایم هەوڵدەدات بە جۆرێک پێناسەی ئایین بکات هەموو ئایینەکان بگرێتە خۆی، بە بڕوای دۆرکهام پێناسەی ئایین لە سەر بنیاتی باوەڕ بە جیهانی نادیار و سەروو سروشتی بووەتە هۆی ئەوەی ناسینی ئایین لە لایەن زانایانەوە تووشی ئاستەم و دژوارییبێت و ناسینی دروستی ئایین بە دی نەیەت[2]. دۆرکهایم پێی وایە پێناسەیەکی دروست نییە کە بڵێین ئایین باوەڕبوونە بە بوونەوەرە ژوور سروشتییەکان، لە وێنەی خودا و خوداوەندەکان. چونکە لە بنەڕەتدا ئەو کەسانەی لەژیانی سەرەتایی و چاخە بەراییەکاندا ژیاون بەو شێوەیە بیریان نەکردووەتەوە. لە ژیانی بەراییدا خەڵکی نەهاتوون بیر لە جیهانی جیاواز بکەنەوە، جیهانیان دابەش نەکردووە بۆ جیهانی ژوور سروشتی و جیهانی سروشتی. ئەوەی وابیردەکاتەوە خەڵکە ئاییندارەکانی نێو کلتورە پێشکەوتووەکانن. هاوچەرخەکان زۆر لە ژێر کاریگەری گریمانە و یاسا سروشتییەکانی زانستدان، لە کاتێکدا خەڵکە بەراییەکان وانین، بەلای ئەوانەوە هەموو ڕووداوەکان چ سیحر ئامێز و چ ئاسایی هەردووکیان سەر بەیەک چەشنن. لەوەش زیاتر چەمکی خوداوەند بۆ خۆی گرفتێکە، چونکە هەموو ئاییندارەکان باوەڕیان بە بوونی خوداکان نییە، ئەگەر چی باوەڕیان بە ژووور سروشتیش هەبێت. بۆنموونە بوداییەک، نکووڵی لە بوونی خودا دەکات، لە کاتێکدا خەڵکانی تر بەشێوەیەکی ڕۆتینی مومارەسەی ئەو ڕۆتینانە دەکەنکە بە هیچ شێوەیەک پەیوەندییان بە ڕۆحەکان یان خواوەندەکانەوە

---

(١) ئایین چییە، ل ١٨٦-١٨٧.

(٢) تیۆرەکانی ئایین، ل ١٠١.

نییە[١]. کەواتە بەلای دۆرکهاییمەوە شتێکی حاشا هەڵنەگرە ئایین پێویستی بە پێناسەیەکی تازەتر هەیە، وەلێ لە هەنگاوی یەکەمدا پێویستە دەستبەرداری پێناسە کۆنەکە ببێت. دۆرکهاییم بە دوای شتێکدا دەگەڕێت کە لە هەموو ئایینەکاندا هاوبەشبێت و زۆرترین تەرکیزی لەسەر بێت.ئەو پێی وایە هەموو ئایینەکان جیهان و شتەکان دابەش دەکەن بۆ بەش، پیرۆز و ناپیرۆز، هەر بۆیە پێناسەی ئایین دەکات و دەڵێت: سیستەمێکە لە باوەڕ و ئاکاری پەیوەست بە شتە پیرۆزەکان، ئەو باوەڕ و ئاکارانەی کە هەموو پێڕەوکارانی لە چوارچێوەی کۆمەڵێکی یەکگرتوودا کۆدەکاتەوە. (تیورەکانی کۆمەڵناسی ئایین، ل ١٠١)، دۆرکهایم لە پێناسەکەیدا سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ دوو خاڵی جیاکەرەوەی ئایین لە شتەکانی تر ئەوانیش:

أ - جیاکردنەوەی جیهان بۆ دوو بەش: بە بۆچوونی ئەو لە ئاییندا جیهان جیادەکرێتەوە بۆ پیرۆز(ساکریە) و ناپیرۆز (پروڤان). واتە هەموو شتێکی ناپیرۆز و نائایینی دەگرێتەوە. بەگشتی ئەم بۆچوونە پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە هەموو شتەکان بەشکراون بۆ پیرۆز و ناپیرۆز، بۆنموونە لە کۆندا عەرەب پێش ئیسلام بەلایانەوە باش نەبوو لە دوای نیوەڕۆ کار بکەن، چایان دەخواردەوە و قسەیان دەکرد، بەڵام کارنا. هەروەها تەنانەت ڕۆژەکانیساڵیش دابەشکراون بۆ پیرۆز و ناپیرۆز بۆنموونە ڕۆژی ١٣ مانگ بە ڕۆژێکی شوم دادەنرێت لەلای ئێرانییەکان لەسەرەتای هەموو ساڵیکی ئێرانی. یاخود گۆڕی کەسێک پیرۆزدەکرێت و دەستلێدان و جۆرێک لە ئاهەنگ گێڕان لەدەوری شتێکی پیرۆزە. پروڤان یان ناپیرۆز بەواتای ئەوە نایەت شتێکی پیسە، یان خراپە، بەڵکوو شتێکی ماددی و ئاساییە.[٢]

ب - کۆبوونەوە لە گرووپێکدا: لە توێژینەوە کۆمەڵناسی و ئەنسرۆپۆلۆییەکانی

---

(١) حەوت تیۆر دەربارەی ئایین، دانیاڵ ل. پاڵس، و: ئاوات ئەحمەد، ل ١٦٦-١٦٧.

(٢) تاریخ معریفة الادیان، الاعمال الکاملة لشریعتی، ب ٨ ، ل ١٦٠-١٦١.

پێشیندا پێیان وابوو کە ئایین و سیحر یەک شتن، هەردووکیان بە یەک شێوە کاردەکەن، بەڵام زانایانی نوێی کۆمەڵناسی و بەتایبەتی دۆرکهایم دەڵێن لە بنەڕەتدا سیحر و ئایین دوو شتی تەواو جیاوازن و دژی یەکن، سیحر حاڵەتێکی تاکییە، بەڵام ئایین وێنەیەکی کۆمەڵی و گرووپی وەردەگرێت. هەموو طقوس و سروتەکان بەشێوەیەکی گرووپی ئەنجامدەدرێن، تاکەکانی کۆمەڵگە وا دەڕوانن کە ئەم کارانە پیرۆزن، هەروەها یەک هەست و شعوریان هەیە، ئامادەن هەندێکیان لە پێناو هەندێکی تریان بکەنە قوربانی، وەک چۆن ئامادەن لەپێناو گرووپیش خۆیان بە قوربانی بکەن. بەڵام سیحر کاردەکات بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیی تاک بەپێچەوانەی ئایینەوە، ئایین دەتوانێت یەک ڕۆحی گشتی دروستبکات و پیرۆزییەکی تایبەت ببەخشێت بە کۆمەڵگە.[1]جیاکردنەوەی پیرۆز و ناپیرۆز بە واتای ئەوە نایەت کە پیرۆز باشە و ناپیرۆز خراپە، ئەم جیاکردنەوەیە جیاکردنەوەیەکی ئاکاری نییە، دەشێت پیرۆز باش بێت یان خراپ بێت، شتی ناپیرۆزیش دەگونجێت باش بێت یان صخراپ بێت. پیرۆز بە گشتی لە پاڵ ئەو شتانەدا سەرهەڵدەدات کە کۆمەڵگە گرنگییان پێدەدات، بەڵام ناپیرۆز بە گشتی پەیوەندی بە کاروبارە تایبەتییەکانی تاکەکانەوە هەیە[2]. تەوتەم: وشەی تۆتەم بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٧٩١ بە کارهێنرا لە لایەن «ج. لونگ»، لە سەرەتادا وا گومان دەبرا کە تەوتەمیەت پەیوەستە بە هۆزەکانی ئەمریکاوە، بەڵام لە ساڵی ١٨٤١ توێژەر غەیری ئەوەی خستەڕوو کە مومارەسەی هاوشێوە هەیە لەنێو هۆزەکانی ئوستورالیا[3]. دۆرکهایم کە پێناسەی ئایین دەکات و پێی وایە ئایین جیاکردنەوەی پیرۆزە لە ناپیرۆز. پێی وایە کە ئەو پێناسانەی تر کە بۆ ئایین کراون پێناسەی دروست و تەواو نین، دۆرکهایم پێیی وایە بۆ ئەوەی بە ڕێکی و دروستی لە ئایین و جەوهەری ئایین بگەین، پێویستە بگەڕێینەوە

---

(١) تاريخ ومعرفة الاديان، الاعمال الكاملة لشريعتى، ب ٨ ،ل ١٨٥-١٨٧.

(٢) حەوت تیور دەربارەی ئایین، ل ١٦٧-١٦٨.

(٣) موسوعة تاريخ الاديان، ب١ ل ٤٣.

بۆ سەرەتاییترین شێوەی ئاییندارى، بە بۆچوونى دۆرکهایم هۆزەکانى ناوەڕاستى ئوستوراليا کۆنترین و سادەتریین هۆزن، بە بەراورد بە هۆزەکانى تر، دۆرکهایم هۆزەکانى ناوەڕاستى ئوستوراليا وەردەگرێت و دەیانکاتە بنەما و بنەڕەتى توێژینەوەکەى، دۆرکهایم سەرنجى دا ئەو هۆزانە سیسەمێک لە نێویاندا هەیە گرنگییەکى گەورەى هەیە لەژیانیاندا، ئەویش سیستەمى هۆزە، پەیوەستى و پێکەوەیى ئەو هۆزانە لەڕێگەى خوێنەوە نییە، بەڵکوو ناوێک بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە، ئەو ناوە شتێکى ماددیى دیاریکراوە، کە هۆزەکە لە ژێر سێبەریدا پێکەوە پەیوەست دەبن. بەو شتە دەوترێت تەوتەم، ئەو تەوتەمە، تەوتەمى یەک بە یەکى هۆزەکەیە، هەموو هۆزێکیش تەوتەمێکى تایبەت بە خۆى هەیە، تەوتەم هەندێک جار ئاژەڵە یان ڕووەکە، هەندێک جاریش ماددەیەکى مردووە، تەوتەمەکە خواردن و کوشتنى حەرام دەبێت لە لایەن هۆزەوە، جگە لە چەند بۆنەیەکى دیاریکراو کە دەتوانن تەوتەمەکە بخۆن و ڕاوى بکەن، ئەگەر کەسێکیش تۆتەمەکەى خوارد ئەوا سزاى مردنى بەسەردا دەسەپێنرێت، چونکە بە بۆچوونى ئەوان ئەو تۆتەمە پیرۆزە و نابێت بچێتە شوێنێکى ناپیرۆزەوە، بەڵام هەندێک لە هۆزەکان بۆ هەندێک لە تاکەکانیان کە دەگەنە تەمەنێکى دیاریکراو ڕێگەیان پێدەدرێت ئەو ئاژەڵە یان ڕووەکەکە بخۆن[1]. دۆرکهایم سەرنجى دا کە لە هۆزە سەرەتاییەکانى ئوستوراليا گیانەوەرەکانى تر جگە لە تەوتەمەکە، هەموویان نا پیرۆزن و هۆزەکە دەتوانێت بە شێوەیەکى ئاسایى بیانکوژێت و بیانخوات، بەڵام گیانەوەرە تەوتەمەکە نا، چونکە ئەو پیرۆزە، بە تەواوەتى لە هۆزەکە قەدەغەکراوە، جگە لە بۆنە دیاریکراوەکاندا نەبێت کە وەک بەشێک لە نەریتە تایبەتەکان ئەنجامدەدرێت، دەکرێت بە قوربانى و دەخورێت. بەمەش خودى هۆزەکە بە پیرۆز لە قەڵەم دەدرێت، چونکە لەگەڵ تەوتەمەکەدا بووە

---

(١) العقيدة الدينية نشأتها وتطورها، فرج الله عبد الباري، ل ٦٨-٦٩، بە دەستکاریەوە.

بەیەک[١]. بە بۆچوونی دۆرکهایم تەوتەم بەرهەم نییە، درێژکراوەی فۆڕمێکی بنەڕەتیتری ئایین نییە، ئەو خۆی سەرچاوەیەکە هەموو شێوەکانی تری پەرستشی ئایینیی چ ئانیمزم بێت یان پەرستنی خواوەندەکان، ئاژەڵ، ڕووەک یاخود ئەستێرەکان بێت لە تەوتەمەوە سەرهەڵدەدەن. لە یەکەمین تێڕوانیندا وا دەردەکەوێت تەوتەمیزم یەکێک بێت لە تەرزە باوەکانی ئایین: جۆرێک لە پەرستنی گیانەوەر یان ڕووەکە نەک زیاتر، بەڵام دۆرکهایم پێ دادەگرێت و پێی وایە کە ئێمە کاتێک لیی ورد دەبینەوە، دەردەکەوێت شتێکی تەواو جیاوازە، شوێنکەوتووانی قەلەڕەش ناچن بۆق یان تووتی سپی بپەرسن، بەڵکوو خەریکی پەرستنی هێزێکی نەناسراوی نا کەسی دەبن، لە هەریەکێک لە وانەدا بوون دەدۆزنەوە، بەڵام لەگەڵ هیچیاندا تەبا نابن[٢]. تەوتەمیزم دەبێتە هێزێکی بێ شووناسی ناکەسی و خۆی فڕێدەداتە نێو بوونی هەر یەکێک لە باوەڕدارەکانی، بە بێ ئەوەی تێکەڵ بە هیچ کامیان ببێت. هیچ کەسێک لە باوەڕدارەکان ناتوانێت بە تەواوی دەستی لێ گیر بکات، چونکە هەمیشە بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە هەموو لایەک خۆی دەردەخات، هەر باوەردارێک پێی وایە کە خاوەنیەتی، بەبێ ئەوەی هیچ کەس خاوەنی سەد لە سەدی بێت. لێرەوە تەوتەم دەبێت بە خودا، بەڵام خودایەکی ناکەس و بێناو و بێمێژوو[٣]. لێرەوە دۆرکهایم دەگاتە ئەوەی کە خودا و هۆز یەک شتن، سەرەتا ئەوەمان خستە ڕوو کە دیاردەی کۆمەڵایەتی چی دەگەیەنێت، وتمان دیاردەی کۆمەڵایەتی جەبریە و ئیختیاری نییە، دۆرکهایم هەموو شت دەگەڕێنێتەوە بۆ کۆمەڵگە، هەر بۆیە ڕەخنە دەگرێت لەوانەی کە ئایین یان هاوسەرگیری و خێزان دەگەڕیننەوە بۆ فیترەت، دەڵێت: هیچ یاسا و ڕێسایەکی ڕەوشتیمان نییە لە خودی خۆیدا، بەڵکوو ئەوە کۆ و یژدانە هەموو شتێک دەگۆڕیت لە ژیانی تاک، دەسەڵاتی هەیە بەسەریاندا

---

(١) حەوت تیۆری دەرباەری ئایین، ل ١٧١.

(٢) حەوت تیۆری دەربارەی ئایین، ل ١٧٣.

(٣) ئایین چییە؟ ل ٢٠٠.

و هەڵیان دەسووڕێنێت، دەیسەپێنێت بەسەریاندا لە بیروباوەڕ و ڕەفتار[١]. بە کورتی تەوتەم لە یەک کاتدا هێمای خواوەند و هۆزیشە، چونکە خوداوەند و هۆز یەک شتن، لە فۆڕمێکی تۆکمەدا دڵسۆزی بۆ خوداوەندێکی نێر یان ژنە خوداوەندێک ئەوەیە مرۆڤەکان گوزارشت لە دڵسۆزی خۆیان بۆ هۆزەکەیان بکەن[٢]. لەم ڕوانگەیەوە:

١. ئایین داهێنراوێکی کۆمەڵگەیە، کۆمەڵگە دای هێناوە.

٢. خودا خودی کۆمەڵگەیە، ئەوە کۆمەڵگەیە بەرز بووەتەوە و براوەتە ئاسمان، ئەوەش لەپێناو پاراستن و بەرژەوەندیی کۆمەڵگەدا بووە.

٣. ڕەوشت و خێزان و پرۆسەکانی هاوسەرگیری هەموویان کۆمەڵگە دیاریکردوون و ڕەهەندێکی سەروو (بان) سروشتیان نییە.

٤. خودا بوونی نییە، ئایینەکان دروستکراوی دەستی کۆمەڵگەن.

## ڕەخنە لە دۆرکهایم

دۆرکهایم وەک هەر زانایەک و توێژەرێکی بواری کۆمەڵناسی ڕووبەڕووی ڕەخنە بووەتەوە کە دەتوانین بە چەند خاڵێک بیانخەینە ڕوو:

١- دۆرکهایم خەسڵەتی بەرچاوی لێکۆڵینەوەکەی بایەخدانە بە یەک دانە کلتور، واتە کۆمەڵگەڕەسەنەکانی ئوستورالیا، ئایینیشی هەر بەو ئاقارەدا لێکداوەتەوە، دۆرکهایم پشت بە ڕاپۆرتە ئەتنۆگرافییە زۆر ناودارەکانی سیبنسەر و فیلین دەبەستێت. بە شێوەیەکی تۆکمە تیۆرەکەی لەسەر ئەو بەڵگانە دادەمەزرێنێت کە ئەوان دەستیان خستووە. ئەم خەسڵەتە لاوازی ناوەکی تیۆرەکەی دۆرکهایمە، هەر لە سەردەمی خۆشیدا ڕەخنەی لێ گیرا، «گاستۆن

---

(١) حول التأصيل الإسلامي للعلوم الاجتماعية، محمد قطب، ل ١٠٥، بە دەستکاریەوە.
(٢) حەوت تیۆر، ل ١٧٥.

ڕیچارد»ی سۆسیۆلۆجیست، کە پێشتر لەگەڵ دۆرکهایمدا کاری کردبوو، بە وردی ڕاپۆرتە ئوستورالیەکانی تاقیکردەوە و دەریخست کە دەتوانرێت ئەو بەڵگانە لە چەند جێگایەکدا تەواو بە پێچەوانەی بەرئەنجامەکانی دۆرکهایمەوە بسەلمێنرێت، ڕایگەیاند کە بەشی زۆری تیۆریەکەی دۆرکهایم پێش ئەوەی سەیری ڕاپۆرتە ئوسورالیەکان بکات دارێژراوە، جگە لەوەی هەندێک پرسیار دەکەن کە ئایە ڕاپۆرتە ئوسورالیەکان بۆ خۆیان دروستن؟[1]ئەو پرسیارە گرنگە ئایە بە ڕاست خودی ڕاپۆرتەکان بۆخۆیان دروستن؟ هەموو ئەو تیۆریانەی لەسەر هۆزە سەرەتاییەکان بیناکراون جێگەی گومانن، چونکە ئەو کەسانەی چوونەتە ئەو شوێنانە لە هەموو ڕووەکانەوە نەیانتوانیوە توێژینەکانیان ئەنجامدەن لەسەر هۆزەکان، جگە لەوەی گەشەنەکردنی زمان بە شیوەیەکی بەرچاو ڕەنگە ڕێگر بووبێت لە تێگەیشتن لەو هۆزانە، بەتایبەت کە ئەو هۆزانە خاوەنی کەلەپوورێکی نووسراو نین، ئەمەش وادەکات تێگەیشتن لەو هۆزانە ئاسان نەبێت و گومان بکرێت لەو زانیاریانەی لەسەریان دەگویزرێتەوە بۆمان.

نموونەشمان هەیە کە دوو زانا توێژینەوەیان لەسەر یەک شوێن کردووە و ئەنجامی جیاوازیان داوە پێمان، «مستر مان» چەندساڵیک لە دورگەکانی ئاندمان توێژەنەی کرد و لە ساڵی ١٨٨٢ توێژینەوەکەی بڵاو کردەوە، دواتر «مستر براون» لە هەمان شوێن واتە دورگەکانی ئاندمان توێژینەوەی کرد و لە ساڵی ١٩٢٢ توێژیەوەکەی بڵاو کردەوە، زۆرینەی زۆری کتێبەکەی براون پێچەوانەی کتێبەکەی مستر مان بوو[2]. هەروەها بەشێک لە توێژەران گومان لەوە دەکەن، کە ئەو هۆزانەی دۆرکهایم بە سەرەتاییترین هۆزیان دادەنێت وا نەبێت، یەکێک لەو توێژەرانە ڕۆبێرت شمیتە کە لە ئوستورالیا توێژینەوەی کردووە و گەیشتووە بەوەی کە ئەو هۆزانە بە پێچەوانەی بۆچوونی دۆرکهایمەوە، پێشکەوتوترین و

---

(١) حەوت تیۆر، ل ١٩٦-١٩٧.

(٢) الدين، محمد دراز، ل ١٤٨.

گەشەسەندوترین هۆزەکانن، کۆنترین هۆزەکان هۆزەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتن، کە ئەو سیستەمی ئەلقابی ئاژەڵییەیان تێدا نییە، لە هەمان کاتدا لە لای ئەوان باوەڕی خودای باڵا بوونی هەیە بە شێوەیەکی ڕوون.[1]

٢- بە پێچەوانەی دۆرکهایمەوە چەند توێژەری دی ئەوەیان خستووەتە ڕوو، کە بیرۆکەی خودای باڵا لە نێو زۆرێک لە هۆزە سەرەتاییەکاندا هەبووە. ئەندرێ لانج باوەڕی خودای باڵای لە لای هۆزە هەمەجیەکانی ئوستورالیا خستووەتەڕوو، هەروەها هەمان بیری لە لای هەمەجیەکانی ئەفریقیا و ئەمەریکاش خستووەتە ڕوو. شریدەر باوەری خودای بالای خستووەتە ڕوو لە لای ئاریە کۆنەکان، برۆکلمانیش لە لای سامیەکانی پێش ئیسلام هەمان باوەڕی دووپات کردووەتەوە. هەریەک لە لاڕواهـ و کاترفاج هەمان باوەڕیان لەلای هۆزەکانی ناوەڕاستی ئەفەریقیا خستووەتە ڕوو[2]. جگە لەوەی زانای بە ناوبانگی بواری ئایین و زمان و ئەنسرۆپۆلۆجیستی نەمساویی و فیلهیلم شمیدت، هەستاوە بە توێژینەوەیەک لەسەر هۆزە سەرەتاییەکان، پرۆژەکەی لە ساڵی ١٩١٢ دەستپێکرد و لە ساڵی ١٩٥٤ کۆتایی پێهێنا، لە دووتویی ١٢ بەرگدا. واتە بۆ ماوەی ٣٢ ساڵ پێوەی خەریک بووە، شمیدت لە ئەنجامی توێژیەوەکەیدا گەیشتە ئەو باوەرەی کە هۆزە سەرەتاییەکان بە گشتی باوەڕیان بە خودایەکی تاک هەیە لە ئاسمان، خودایەک خاوەنی هەموو چاکەیەکە و زانستی بێ ئەندازەیە. شمیدت باوەری وا بوو کە هۆزە سەرەتاییەکان لە بنەڕەتدا باوەڕیان بە یەک خودا هەبووە، دواتر بەرەو فرە خوایی ڕۆشتوون، بە پێی توێژینەوەکەی شمیدت کۆنترین سیستەمی ئایینی یەکتاپەرستی بووە[3]. جگە لەوەی شمیدت دەڵێت: کە بەشێک لە هۆزەکان بە سیستەمی تەوتەمدا نەڕۆیشتوون و پێی

---

(١) الدين، محمد دراز، ل ١٥٠.

(٢) الدين، محمد دراز، ل ١١٠.

(٣) علم الاديان، ل ٢٣٥.

ئاشنا نین، لەگەڵ ئەوەشدا ئاییندارن و ئایینیان هەیە[١]. هەروەها «ئیدوین ئۆلیڤەر جەیمس» ئەنسرۆپۆلۆجیستی بەریتانی هاورایە لەگەڵ «لانج و شمیدت»، لە خستەنە ڕووەکەیان و پەیڕەوی لەو بۆچوونە دەکات کە خودای تاقانەی بەرز بنچینەیە لەلای مرۆڤی سەرەتایی، لە ئێستایشدا ئەمە بارودۆخی هۆزە سەرەتاییەکانی سەر زەویە، کە هێشتا لەسەر ڕاوشکار و کۆکردنەوەی بەروبوومەکان دەژین، هۆزەکانی ئەپۆرجینالْ لە ئوسوتورالیا و فوێگیانس لە ئەمریکای باشوور و هۆزەکانی کالیفۆڕنیا، کورتە باڵاکان لە ئەفرقیا، هەموو ئەو هۆزانە پارێزگارییان لە سەرەتایی خۆیان کردووە و بە هیچ قۆناغێکی پەرەسەندندا تێنەپەڕیون. هەروەها «ئینرایچ» بە هەمان شێوە دوای توێژینەوەکەی لەسەر هندییە سوورەکان ئەنجام دا گەیشتە ئەو باوەڕەی خودای تاکی باڵا بنەڕەتە. فەیلەسووفی ئەڵمانی «فریدریک سچێڵینگ» لە کتێبەکەیدا فەلسەفەی میسۆلۆجیا، پێی وایە لە سەرەتادا یەکخواپەرستی هەبووە بەر لەوەی بچێتە قۆناغی فرە خوداییەوە[٢]. ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە خودی دۆرکهایمیش ئاماژەی بە هەمان باوەڕ کردووە لەلای هۆزەکانی ئوستورالیا، دۆرکهایم دەڵێت: بەشێک لە هۆزەکانی ئوستورالیا گەیشتوون بە باوەڕی خودای باڵا، یان خودای تاک، ئەو خودایە بوویەکی هەربوویی و ئەبەدی بووە، خۆر و مانگ و ئەستێرەکان بە فەرمانی ئەو سووڕاون، هەورەگرمە و بروسکەی ناردووە، ئاژەل و ڕووەکی دروستکردووە، مرۆڤی لە خۆڵ دروستکردووە و ڕوحی کردووە بە بەریدا، مرۆڤی فێرکردووە و پەرستشی بۆ داناوە و دوای مردن لێپرسینەوە لە مرۆڤ دەکات لەسەر کردەوەکانیان. دۆرکهایم پێی وایە بە پێچەوانەی باوەڕی تایلۆرەوە، هەموو ئەم باوەرانە لە موژدەدەرە مەسیحیەکانەوە وەرنەگیراون[٣]. وەک دەبینین بۆچوونەکان هەمەچەشن و فرەن، بۆیە زۆر نازانستییە ئەو

---

(١) نفسية الالحاد، پول سی، فیتز، ترجمة: مرکز الدلائل، ل ٣٥.

(٢) ئیلحاد گرفتێکی دەروونییە، ل ١٠٤.

(٣) الدین، ل ١٥١.

بۆچوونانەی دۆرکهایم، کە لەسەر ئەو هۆزانە وەری گرتوون لە سیبنسەر و گیلینەوە وەک ڕاستییەکی ڕەها تەماشا بکرێن، چونکە بۆچوونی پێچەوانە هەن و ئەوانیش بەڵگەیان پێیە، تەنانەت «ئەندرۆ لانگ» کە خوێندکاری تایلۆر بوو، دوای توێژیەوەیەکی قووڵ لە کتێبەکەیدا[1]. گەیشت بەوەی زۆرێک لە هۆزە سەرەتاییەکان باوەڕیان بە هێزی باڵا هەبووە، یانی ڕۆحی گەورە، یان خودای دروستکار، هەر بۆیە بەتوندی دژایەتی تیۆری تایلۆری مامۆستای کرد، ڕەخنەی لە زنجیرەی پەرەسندنەکەی تایلۆر گرت، کە پێی وایە لە ڕۆحانیاتەوە ڕۆیشتووە بۆ فرەیی و دواتر بۆ یەکخواپەرستی. توێژینەوەکانی لەسەر هۆزەکانی باشوری ئوستورالیا و سامانگی مالیزیا ئەنجام دا، کە هۆزانێکن پەرستشی سروشت یان گەورە لە نێویاندا نییە، هەر ئەمەش دەکاتە نموونە بۆ بە درۆخستنەوەی وێنە تەتەوریەکەی تایلۆر، لانگ پێی وابووە کە مرۆڤ شتێکی دروست کردووە لۆژیکیەن بۆ ئەوە چووە کە دەبێت کائینێک هەبێت شتانێک دروستبکات مرۆڤ پێی دروست نەکرێت، هەرچەند لانگ پێی وایە مرۆڤ ئایینی هێناوەتەدی.[2]

کۆتایی ئەم ڕەخنەیە بە وتەیەکی ئەنسرۆپۆلۆجیستی هۆڵندی ناسراو لە بواری ئەفریقیا ئارنۆڵد ڤان جینیبی دەهێنین، ئارنۆڵد دەڵێت: لە ماوەی دە ساڵدا سەرلەبەری شیکردنەوەکەی دۆرکهایم بۆ ماددە ئوسورالییەکە بە تەواوی ڕەتدەکرێتەوە، ئەمە گەورەترین خەرمانی فاکتە ئەتنۆگرافیە بێکەڵکەکانە کە تائێستا بینیبێتم.[3]

٣- دۆرکهایم پێی وایە مرۆڤی سەرەتایی نەیتوانیوە بیربکاتەوە، واتە بە شیوەیەکی هۆکاری بیربکاتەوە و بگەڕێت بە شوێن دروستکاردا، یان بیر لە دیاردەکان و بوونەوەر بکاتەوە. بەڵام ئەوە پووچەڵ بووەتەوە، جەستین باریتی

---

(١) صناعة الدين، ١٨٩٨.

(٢) علم الاديان، ل ٦٥.

(٣) حەوت تیۆر دەربارەی ئایین، ل ١٩٧.

دەروونناس بیرکردنەوەی هۆکاری لای منداڵیش دەسەلمێنێت نەک گەورە، باریت دەڵێت: ڕەنگە جیاوازی نێوان منداڵان و کەسانی پێگەیشتوو بریتیبێت لە ڕیزبەندی شتەکان کە مەبەستەکان دەدرێنە پاڵیان، خەڵکی بە هەموو تەمەنەکانەوە پێشبینی ئەوە دەکەن کە بەشەکانی ئاژەل یان درەخت مەبەست و هۆکاریان هەیە، هەروەها ئامێر و ئامراز و دروستکراوەکانی تری مرۆڤ هۆکار و مەبەستیان هەیە. باریت ئاماژە بە چەندین تاقیکردنەوە دەکات کە پشتڕاستی ئەوە دەکاتەوە. بۆنموونە تاقیکردنەوەیەکی کیلیمنمان بۆ دەخاتەڕوو، کە دوو کەسی خەیاڵی بە ناوەکانی بێن و جەین پێشەکەش بە منداڵان کرد، یەکێکیان دەیوت کە شتێک بۆ مەبەستێک دروست بووە، ئەوی تر لەگەڵی ناکۆک بوو، منداڵە چوار بۆ پێنج ساڵانەکان پرسیاریان لێکرا کامیان ڕاستن، بین یان جەین. ڕەنگە سەرسوڕهێنەربێت ئەم منداڵە ئەمریکییە چوار بۆ پێنج ساڵانە هاوران کە شتە سروشتییەکان و زیندووەکان هاوشیوەی شتە دەستکردەکانی مرۆڤ بۆ مەبەستێک دروستکراون[1]. زۆر نموونە هەن لە کتێبەکەی باریت، کە منداڵان دەتوانن بیر لە خوداش بکەنە و منداڵ بە سروشت باوەڕدارن. بۆیە دەتوانین بڵێین ئەو بۆچوونە بۆخۆی نارێکە کە پێمان وابێت مرۆڤە سەرەتاییەکان نەیانتوانیوە بیر لە بوون بکەنەوە، بەڵکوو بیریان لێکردۆتەوە، بوونی ئەو هەموو ئەفسانەیە لە هەموو کلتورە جیاوازەکان، دەرخەری ئەو ڕاستییەن مرۆڤە سەرەتاییەکان بیریان کردووەتەوە و بەدوای وەڵامی پرسە وجودیەکانیش گەڕاون، جا بە شیوازی جۆراوجۆر گوزارشتیان لێ کردووە.

٤- یەکێکی تر لە هەڵەکانی دۆرکهایم ئەوەیە کە مادەم ئایین ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی هەیە، بڕیاری داوە ئایین تەنها ڕۆڵی کۆمەڵایەتییە، ئەمەش دروست نییە، یەکێک لە ڕۆڵەکانی ئایین کۆمەڵایەتییە، نەک ئایین تەنها لە چوارچێوەی ڕۆڵە کۆمەڵایهتیەکەیدا قەتیس بکرێت، ئەو ڕوانینەش لەوەوە

---

(١) لە دایکبوون بە باوەرداری، د. جەستین ل. باریت، و: ئاراس عز الدین، ل ٥٣-٥٥.

سەرچاوە دەگرێت دۆرکهایم هەموو دیاردەکان لە چوارچیوەی کۆمەڵگەدا شیکار دەکات، لەژێر سێبەری کۆویژداندا، وەک لەسەرەتاوە خستمانەڕوو، دیادرەی کۆمەڵایەتی لای دۆرکهایم جەبریە، کۆ ویژدان دەیسەپێنێت بەسەر تاکدا، لێرەوە دەڵێت: ئایین هەمان ئەو کۆ ویژدانەیە سەرخراوە بۆ ئاسمان، ئایین لە ڕوانگەی دۆرکهایمەوە ئاراستە دەکرێت، کارتێکراوە، نەک کارتێکەر بێت، واتە ئایین لەلایەن کۆمەڵگەوە ئاراستە دەکرێت ئاراستە ناکات. خوێندنەوەکەی دۆرکهایم دەچێتە چوارچێوەی خوێندنەوە دوورییەکانەوە، ئەو جۆرە خوێندنەوانەش خوێندنەوەیەکی ئاسان و کەموکورتن، لەم زەمەنەشدا کە زۆرێک لە زانستەکان ئەوەمان بۆ تۆخ دەکەنەوە کە ناکرێت تاکە خانەیەک لە خۆوە هاتبێتە بوون، ئەوا داماوییە بە خوێندنەوەیەکی یەک دووری دۆرکهایم قەناعەت بکەین.

٥. عەلی شەریعەتی ڕەخنەیەکی ورد لە دۆرکهایم دەگرێت، شەریعەتی دەڵێت: زانایانی وەک «تایلۆر و سیبنسەر و مۆلەر» ئەوەیان خستووەتەڕوو کە لە ئوستورالیا و ئەمریکای باکور هۆزێک باوەڕ و ئایینی هۆزێکی تری وەرگرتووە، ئەوەیان بەیان کردووە کە چۆن هۆزێک کاریگەر دەبێت بە ئایینی هۆزێکی دی لە ئەنجامی تێکەڵاوبوون پێی. ئا لێرەدا دژیەکیەک هەیە لە فکری دۆرکهایمدا، ئەگەر تەوتەم دەرەوشانەوەی قەومی و کۆمەلایەتی بێت، ئایینیش جگە لەوە شتێکی دی نەبێت، چۆن هۆزێک ئامادەیە تەوتەمی هۆزێکی دی وەربگرێت کە گوزارشتە لە گیانێکی کۆمەڵایەتی جیاواز؟ چۆن لە هەمانکاتدا تەوتەمێک دەبێتە ئاڵا و پێناس و جیاکردنەوەی هۆزی ئەلف لە هۆزی باء، بەڵام هۆزی ئەلف تەوتەمی هۆزی باء وەردەگرێت؟ کاتێک دۆرکهایم و خوێندکارەکەی «فیلیسن چالی» پێمان دەڵێن لە ویلایەی ملانزی پێنج هۆزی لێکدابڕاو هەن، واتا پێنج کۆمەڵگەی جیاوازمان هەن، پێویستە پێنج تەوتەمی سەربەخۆشمان هەبێت، پێنج گیانی کۆمەڵایەتی سەربەخۆ، هەتا لێک جیاببنەوە و هەر یەکە و گوزارشت

لە خۆی بکات. ئا لێرەدا کاتێک ئەو هۆزانە باوەر و نەریتی یەکتر وەردەگرن دەبێت بڵێین تەوتەم درەوشانەوە و پەیوەستی تاکە بە کۆمەڵەوە، بەڵام هەستی ئایینی هەستێکی جیاوازە[1]. ئەگەر نموونەیەک لەسەر ئەمە بهێنینەوە، کورد خاوەنی هەستی نەتەوەیی و ئالای تایبەتی خۆیەتی، ئەڵمانییەکیش بەهەمان شێوە، ئەڵمانیا ئالای کوردوستان قبووڵ ناکات، بە پێچەوانەشەوە، بەڵام فکر و کلتور و ئایینی یەکتر کاریگەری دەبێت لەسەرییان، دەشگونجێت قبووڵی بکەن و پەیڕەوی لێ بکەن، ئالاکە تەوتەمەکەیە، کە تایبەتە بە هۆز یان گەلێکی تایبەت، بەڵام ئایین جیهانییە و پەیوەست نییە بە هۆز و گەلێکی تایبەت و دەگوێزرێتەوە و لەلایەن گەلە جۆراوجۆرەکانەوە وەردەگیرێت.[2]

---

(١) (الاعمال کاملة لشرعتی، ج ٨، تریخ ومعریفة الادیان، ص ١٥٢-١٥٤.

(٢) ئەم بابەت لەئامادەکردنی ئاثار قەرەداغییە .https://astane.org/CatDetail ٨=FolderID&١=MapID&٢٨=aspx?id

# پاشکۆ
# عالەمانییەت

عالەمانییەت[1] سیکیۆلاریزم ( Secularism) واتا: دنیاگەرایی و دابڕین و داڕنینی سیاسەت و دەوڵەت لە ئایین یان دابڕین و داڕنینی ژیان لە ئایین.

## جۆرەکانی عالەمانییەت

١. عالەمانییەتی جوزئی یان هەندەکی: ئەوەیە کە بەس ئایین لە دەوڵەت جیادەکاتەوە.

٢. عالەمانییەتی کوللی و گشتی، هەمەکی: ئەوەیە کە ئایین لە دەوڵەت و لە هەموو کایەکانی ژیانیش جیادەکاتەوە.

٣. عالەمانییەتی باوەڕدار: ئەوەیە کە باوەڕی بە خودا هەیە و بێباوەڕ نییە.

٤. عالەمانییەتی بێباوەڕ: ئەوەیە کە باوەڕی بە خودا و ئایین و پایەکانی ئایین نییە.

٥. عالەمانییەتی میانڕەو و ئازادی بەخش: وەک لیبراڵیبیەت، کە ئازادی دەدات بە تاک و کۆمەڵ تا بەئازادانە بیربکەنەوە و ئایین هەڵبژێرن و ئاییندارى خۆیان بکەن، وەک ئەوەی کە لە ئەورووپا و ئەمریکا هەیە.

٦. عالەمانییەتی توندڕەو و ئازادی نەدەر: وەک مارکسییەت و شیووعییەت، ئەم

---

(١) عالەمانییەت خودی خۆی زیاتر فکرێکی سیاسییە، بەڵام ڕەهەندی فەلسەفی زۆریشی هەیە، بۆیەبە پێویستم زانی باسی بکەین.

جۆرە عالەمانییەتە بڕوای بە ئازادی ئایین و ئاییندارى نییە و کەس بۆی نییە ئاییندارى بکات ئەگەر لە مزگەوت و پەرستگا و کڵێساکانیش بێت، وەک ئەوەی کە لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران دەگوزەرا یان ئەوەی کە ئێستا لە کۆریای باکور و بەشێکی زۆری چین دەگوزەرێت.

## هۆکارەکانی سەرهەڵدانی عالەمانییەت:

١. ئایینی تێکدراوی مەسیحییەت، بە تایبەت لە ڕووی عەقیدەیی و فکری و ڕەوشتییەوە کە بەتەواوی تێکدرابوو.

٢. نەبوونی شەریعەت لە مەسیحییەتدا

٣. ستەمی پیاوانی ئایینی و دەرەبەگ و ئیمپراتۆر، بە واتایەکی دیکە ستەم و ستەمی دەستەڵاتی ئایینی و ئابووری و سیاسی، کە ئەو سێ کوچکەیە یەکیان گرتبوو بۆ دژایەتی کردنی خەڵک و ستەمکردن لێیان.

٤. دژایەتی کردنی پیاوانی ئایینی و کەنیسە بۆ زانست و زانایان و فەیلەسووفان

٥. سەرهەڵدانی ماددیگەرایی و فەلسەفەی ناباوەڕی و ماددی

٦. ڕێدانی خودی ئایینی مەسیحییەت بە جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت و سیاسەت، ئەوەتا لە ئینجیلدا دەڵێت: (أعط ما لقيصر لقيصر، وما لله لله) واتە: "ئەوەی هی قەیسەرە بیدە بە قەیسەر ئەوەشی هی خودایە بیدە بە خودا."

٧. گەشەی سەرمایەداری و کەرت و بەرژەوەندیی تایبەت

٨. وەرچەرخانی ئیمپراتۆرییەت بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی و دروستبوونی یەکەم ئەزموونی عالەمانی لە ئەورووپادا.

٩. ڕووخانی خیلافەتی عوسمانی و وەستانی بزووتنەوەی وشیاری ئیسلامی

١٠. گەشەی زانست و دۆزینەوە گەردوونییەکان و بیردۆزی پەرەسەندن

بەڵام بەڕاستی عالەمانییەت بۆ ئەورووپا وەرچەرخان و ڕزگاربوونێکی گەورە و زۆرباش بوو، کە لەو ڕێیەوە توانیان خۆیان ڕزگار بکەن لە هەرسێ دەسەڵای ستەمکار:

١. دەستەڵاتی ئایینی: کەنیسە و پاپا و قەشە

٢. دەستەڵاتی ئابووری: دەرەبەگ

٣. دەستەڵاتی سیاسی: ئیمپراتۆر

دوایی:

پەڕلەمان جێگای ئیمپراتۆری گرتەوە.

فەیلسووف و زاناکان شوێنی پاپا و دەستەڵاتی دینیان گرتەوە.

هەروەها سەرمایەدارەکان شوێنی دەرەبەگەکانیان گرتەوە.

یەکێک لە دروشمەکانی شۆڕشی فەڕەنسی بریتیبوو لە: "بە ڕیخۆڵەی کۆتا قەشە کۆتا پادشا لە سێدارە بدەن."

بەڵام لە ڕاستیدا لە جیهانی ئیسلامیدا هیچ پاساوێک نییە بۆ بوونی عالەمانییەت، چونکە ئەو هۆکارانەی کە بەهۆیەوە سەری هەڵدا لە ئەورووپادا هیچیان بوونیان نییە و ئیسلام هیچ کام لەو خراپە و ناشیرنیانەی تێدا نییە.

## بیروڕاکانی عالەمانییەت:

١. نکووڵی کردن لە بوونی خودا لای هەندێکیان

٢. باوەڕبوون بە خودایێک کە بەس دروستکاری گەردوونە، بەڵام هیچ پەیوەندییێکی بە دنیایەوە نییە، هەر بۆیە نە پەیام و وەحی ناردووە، نە پێغەمبەر،

نە ئایین، هەندێکیان باوەڕیان بە زیندوبوونەوەش نییە.

٣. دامەزراندنی ژیان لەسەر بنەمای زانست و ئەقڵ و دوور لە ئایین و پەیامی خودایی

٤. جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت و سیاسەت

٥. جیاکردنەوەی ئایین لە ژیان لای زۆرێکیان

٦. ماددی بوون و بەرژەوەندیخوازی لە هەموو شتێکدا

٧. مرۆڤ ئاژەڵێکی سروشتییە نەک جێنیشین ( خلیفە)ی خودا لەسەر زەوی.

٨. مرۆڤ کوڕی ئەو دنیایەیە نەک دنیایەکی دیکە.

٩. ئایین دەرهاویشەی مرۆڤە نەک سەرووی مرۆڤ و خودا.

١٠. بڵاوکردنەوەی بێڕەوشتی و بەڕەڵایی و زینا.

١١. ڕەوشت ڕێژەیی و نیسبییە و بەپێی کەس و بارودۆخ دەگۆڕێت.

١٢. مێژوو ڕزگار بکرێت لە دەستی خودا و بدرێتە دەستی سروشت.

١٣. دانانی بەربەست و ڕێگرێکی گەورە لەنێوان جیهانی مادده و ڕۆحدا

١٤. ئازادی ڕەهای ئافرەت

١٥. جێگرتنەوەی ئایین بە یاسا

## بەرهەمی عالەمانییەت لە جیهانی ئیسلامیدا:

١. دارمانی ڕەوشت و نەهێشتنی یان بە ڕێژەیی کردنی

٢. شەهوەتبازی و کورت هەڵێنانی ژیان لە خواردن و سێکس و ڕابواردن و ...

هتد

٣. سوککردنی مرۆڤ و بێڕێزی کردن پێی

٤. کوشتن و کوشتار

٦. وێرانکاری

٧. داگیرکاری

٨. ستەم و ستەمکاری

٩. قۆرخکاری سیاسی

١٠. قۆرخکاری ئابووری

١١. لێک هەڵوەشانی خێزان

١٢. لێک هەڵوەشانی کۆمەڵگە

١٣. نەهێشتنی گیانی هاوکاری

١٤. نەهێشتنی سیلەی ڕەحم

١٥. هەڵگیرساندی شەڕ لەگەڵ میللەتان یان لەنێو میللەتان

١٦. تێکدانی ئاسایشی مرۆڤەکان

١٧. بڵاوکردنەوەی برسییەتی

١٨. پشتگیری کردنی ستەمکاران

١٩. بە کەرەستەکردنی مرۆڤ بۆ بەرهەمهێنانی کەرەستە

٢٠. بە ماددی کردنی ژیان و پەیوەندییەکان

٢١. نەهێشتنی لایەنی ڕۆحی

٢٢. تێکدانی دەروون

٢٣. زیادەڕەوی و کورتڕەوی لە هەموو بوارەکان، بۆ نموونە: ماددی، ڕۆحی، واقیعی، میسالی، شیووعی، سەرمایەداری، ... هتد.

٢٤. بەکارهێنانی هەموو ئامڕازە ناڕەوشتییەکان بۆ گەیشتن بە ئامانج و دەستەڵات

٢٥. بردن و دزین و بەهەدەردانی سەروەت و سامانی وڵات

٢٦. پیس و پۆخڵی و گوێنەدان بە زۆرێک لە شتە پیسەکان

٢٧. برەودان و هاندان و ئاسانکاری بۆ ئەو شتە خراپانەی مرۆڤ بە فەوتان دەبات، وەک عارەق و مادده هۆشبەرەکان و ... هتد

٢٨. بە کاڵاکردنی مرۆڤ، بە تایبەت ئافرەت

٢٩. دوورخستەوەی مرۆڤ لە پەیامی ڕاستی خودایی و بەلاڕێبردنی و ئاراستەکردنی بەرەو ئاراستە لادەر و خوار و چەوتەکان

## بۆ عالەمانییەتمان قبووڵ نییە و ڕەتی دەکەینەوە؟

چونکە:

١. باوەڕی بە ئیسلام نییە

٢. پێی وایە مرۆڤ ئاژەڵێکی سروشتییە نەک جێنیشینی خودا

٣. کورت هەڵێنانی مرۆڤ لە جەستە و ئەقڵ و لانەکردنەوە بەلایدا لە ڕووی فیتری و ڕۆحییەوە

٤. جیاکردنەوەی ئیسلام لە دەوڵەت و سیاسەت و ئابووری و ژیان

٥. بڵاوکردنەوەی بەدڕەوشتی و بەڕەڵایی و زینا

٦. بە ڕێژەیی کردنی ڕەوشت

٧. دەیەوێت بە ڕۆژئاواییانە بیربکەینەوە و واز لە ئیسلام و دابونەریتە جوانەکان بێنین

٨. بڵاوکردنەوەی ناباوەڕی

٩. ئەو بۆ شوێن و باردۆخێک هاتووە کە زۆر جیاوازە و ئەو هۆکار و پاڵنەرانەی بە هۆیەوە هاتووە لە ئیسلامدا پاساویان نییە.

**تێبینی**

١. عالەمانییەتی زۆرێک لە وڵاتانی ئیسلامی عالەمانییەتێکی نیفاقی و دووڕووییە، چونکە ئەوان دەڵێن: بڕوای تەواومان بە ئیسلام هەیە، لەولاشەوە دەڵێن: عالەمانیین!

٢. وەک باسمان کرد، هەموو عالەمانییێک بێباوەڕ نییە.

٣. عالەمانییەت بۆ ئەورووپا ڕزگارکەر بوو لە ستەم و ستەمکاری و دواکەتوویی، بەڵام لە جیهانی ئیسلامیدا بە پێچەوانەوە لە غەیری نەهامەتی و ماڵوێرانی و ستەم شتێکی دیکەی نەهێناوە.

٤. بە نسبەت کوردیش، عالەمانییەت هەر لە سەرەتاوە مایەی ماڵوێرانی و کوێرەوەری بووە.

٥. ئەوەی ستەمی لە کورد کردووە لە نێوهوە و دەرەوەی کوردستان عالەمانییەت بووە نەوەک ئیسلام.

٦. عالەمانییەت و عالەمانییەکان هەموویان یەک جۆر نین وەک باسمان کرد، چونکە توندڕەو و میانڕەو و ئیماندار و بێباوەڕیان هەیە، لە ڕووی ڕەوشتیشەوە

وەک یەک نین، لە ڕووی ئینسانی و مرۆڤایەتیشەوە وەک یەک نین و جیاوازییان هەیە، بۆیە ئێمەش وەک موسڵمان دەبێت ئینسافمان هەبێت و بە یەک چاو سەیریان نەکەین، بۆ نموونە ناکرێت عالەمانی ئەورووپا و کۆریای باکوور بە یەک چاو سەیر بکرێت.

٦. گەورەترین کێشەی عالەمانییەکانی جیهانی ئیسلامی بەکوردستانیشەوە بریتییهلە:

* تێنەگەیشتن لە ئیسلام

* قیاس کردن و بەراوردکردنی ئسلام بە مەسیحییەت

* قیاس کردن و بەراوردکردنی جیهانی ئیسلامی بە ئەورووپا و ڕۆژئاوا

* خۆلادان لە ڕاستی و جوانییەکانی ئیسلام و بە ناشیرین نیشاندانی ئیسلام

# لیبڕالیەت

لیبڕالیزم: ڕەوتێکی هزری و فکرییە بانگەشە دەکات بۆ ئازادی ڕەها لە کارکردن و بیرکردنەوە و ئابووری و بازرگانی و سیاسی و، ... بانگەشەی قبووڵکردنی بیروڕای جیاواز دەکات ئەگەر دژی ئەویش بێت، بە هیچ جۆرێک دان نانێت بە هیچ ئایین و پیرۆزییێک.

**لیبڕاڵیەت پێناسەی جیاواز جیاوازی بۆ کراوە لەوانە:**

**١**- لیبڕاڵییەت دەستەواژەیەکی لاتینییە، وەرگیراوە لە (LIBER) واتا ئازادی، بەبێ پەیوەست بوون بە هیچ جۆرە قەیدێک.

**٢**- لیبڕاڵییەت ڕەوتێکی سەرمایەداری ئابووریە بانگەشە بۆ ئازادی ڕەها دەکات لە کارکردن و بازرگانیدا.

**٣**- لیبڕاڵییەت بریتییە لە ئازادی ڕەها و بێلایەن، کە دان نانێت بە ئایین و هیچ دەقێکی پیرۆز و هیچ عادەت و عورف و تەقالید و کلتور و هەموو ئەو شتانەی ئازادیی ڕەهای مرۆڤ سنووردار دەکەن.

**٤**- لیبڕاڵیەت لادانی هەموو بەربەست و سنوورە دەرەکییەکانی مرۆڤە، کە سنوور بۆ مرۆڤ دادەنێن.

**٥**- لیبڕاڵییەت ئازادییهلە جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەی مرۆڤ خۆی دایان دەنێت.

زۆرجار لەبری لیبڕاڵییەت سەردەمیبوون و عەقڵانییەت و ڕۆشنگەری بەکاردێت.

## مێژووی لیبراڵییەت:

لیبراڵییەت مێژووەکەی نوێ نییە، بەڵکوو ڕیشەیەکی عەقڵانی و عالەمانی و وجودی هەیە کەواتە دەتوانین بڵێین: لیبراڵییەت تێکەڵەیەکە لە عەقڵانییەت و عالەمانییەت و وجودییەت، بەڵام وەک ڕێباز مێژووەکەی زۆر ڕوونە.

### هــۆکارەکانی سەرهەڵدانی لیبراڵییەت:

لیبراڵیەت پاڵنەر و هۆکاری زۆری هەیە بەڵام بەشێوەیەکی گشتی پاڵنەر و هۆکارەکان دەگەڕێنەوە بۆ سێ هۆکاری سەرەکی:

١- سەرکەشی و ستەمی کڵێسا و کەنیسە: دەسەڵاتی کڵێسا و کەنیسە بەتەواوی دەسەڵاتی کێشابوو بەسەر ئەورووپادا و هیچ ئازادییێکی بۆ مرۆڤ نەهێشتبوویەوە نە بۆ بیرمەندان, نە فەیلەسووفان وزاناکان، ڕێگربوون لەبەردەم ئازادیی و زانست و پێشکەوتندا.

٢- ستەمی دەسەڵاتی سیاسی: دەسەڵاتی سیاسیش بەهەمان شێوە هیچ ئازادییێکی نەهێشتبوویەوە، دیارە ئەمەش بە دەستەملێ لەگەڵ دەسەڵاتی ئایینی و کڵێسادا.

٣- ستەمی دەسەڵاتی دارایی و مالی: دەسەڵاتی دارایی و ئابووریش هیچ ئازادییێکی نەهێشتبوویەوە، هەموو سەرچاوەکانی دارایی و ئابوورییان داگیر کردبوو، بەهەماهەنگی لەگەڵ دەسەڵاتی ئایینی و کڵێسا.

دیارە لە ئەورووپادا سێ دەستەڵات هەبووە:

١. دەستەڵاتی ئایینی و کەنیسە، پاپا و قەشە.

٢. دەستەڵاتی ئابووری، دەرەبەگ.

٣. دەستەڵاتی سیاسی، ئمپڕاتۆر.

دوایی

«پەرلەمان» جێی ئیمپراتۆری گرتەوە.

«فەیلسوف و زاناکان» شوێنی پاپا و دەستەڵاتی دینیان گرتەوەوە.

«سەرمایەدارەکان» شوێنی دەرەبەگەکانیان گرتەوە.

یەکێک لە دروشمەکانی شۆڕشی فەڕەنسی بریتیبوو لە "بە ڕیخۆڵەی کۆتا قەشە کۆتا پادشا لەسێدارە بدەن."

**دیارترین کەسایەتییە دیارەکانی لیبراڵییەت:**

**١**- جۆن لۆک ( ١٦٣٢م - ١٧٠٤م) جۆن لۆک بانگەشەی بۆ ئازادبوون لە دەسەڵاتی ئایینی و سیاسی و ئابووری کڵێسا دەکرد.

**٢**- فرانسوا ڤۆڵتێر ( ١٦٩٤م - ١٧٧٨م) ئەویش بانگەشەی بۆ ئازادیبوونی عەقڵییەتی ئەورووپی دەکرد بەتەواوی لەعەقیدە و بیروباوەڕی مەسیحی و کاسۆلیکی.

**٣**- ئادەم سمیث ( ١٧٢٣م - ١٧٩٠م) کە بە باوکی ئابووری نوێ ناودەبرێت.

ئەوە پێشڕەوی لیبراڵییەتی ئابووری بوو ئەو بانگەشەی بۆ ئازادی ڕەهای ئابووری دەکات، بانگەشە بۆ سوود و قازانج و بەرژەوەندیی تاک دەکات بەڕەهایی، دەڵێت: تاک باشترین بڕیاردەرە بۆ بەرژەوەندی و سلووک و هەڵسوکەوتەکانی، بۆ ئەم مەبەستەش ئازادی ڕەهای پێدەدات و ڕێگە بەهیچ بەربەست و سنووردانەرێک نادات.

**٤**- جۆن ستیوارت مل ( ١٨٠٦م - ١٨٧٣م) ئەوەشیان بانگەشەی بۆ ئازادی ڕەها دەکرد بەشێوەیەک کە بەرژەوەندیی زاتی بۆ مرۆڤ دەستەبەر بکات، بەبێ زۆرەملێ و تۆبزی کردن لەکردنی شتێک یان ڕێگری کردنی لە شتێک.

## کایەکانی لیبڕاڵییەت:

لیبڕاڵییەت کایەی زۆر و جیاوازی هەیە بەم شێوە:

١- لیبڕاڵییەتی کلاسیکی: ئەم جۆرە لە لیبڕاڵییەت بانگەشە بۆ ئازادی تاک دەکات بەرەهایی، سنووردارکردنی دەسەڵاتەکانی حوکوومەت، پشتگیری کردنی ئازادییەکانی تاک بەبێ هیچ سنوورێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی و عورفی و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و پارێزگاریکردن لە ئازادییە مەدەنییەکان.

٢- لیبڕاڵییەتی سیاسی: واتا ئازادی سیاسی بۆ هەموو تاکەکان بەبێ جیاوازی بۆ هەموو چین و توێژە جیاوازەکان, هەروەها سەروەربوونی یاسا بەسەر هەموو تاکەکاندا بەبێ جیاوازی، کەواتە هەمووکەسێک یەکسانە بەرانبەر بە یاسا, هەموو کەسێک ئازادی سیاسی و خۆهەڵبژاردنی هەیە و دەبێت ڕێ بدرێت بە هەبوونی حیزبی سیاسی جیاواز.

٣- لیبڕاڵیەتی ئایینی: ئەم جۆرە لە لیبڕاڵییەت بانگەشە بۆ ئازادی ڕەها دەکات لە هەڵبژاردنی هەر ئایینێک کە مرۆڤ پێی وایە چاکە و باشە و بەرژەوەندیی لەوەدایە. ئازادە چ خودایەک دەپەرستێت ئەگەر بەردێک یان مشکێکیش بێت. ئازادی بۆ ئەوانەش کە نایانەوێت ئایندار بن، هەروەها ئازادی ڕەها بۆ ڕاڤەکردنی دەقە ئایینییەکان بەبێ هیچ سنوورێک.

٤- لیبڕاڵیەتی ئابووریی: ئەو جۆرەش دووبارە واتا ئازادی، بەڵام ئەمجارەیان واتە ئازادی ئابووری و سەرمایەداری، واتە: تاک ئازادی ڕەهای هەیە لەبازرگانی کردن و پارە پەیداکردن، واتە نابێت هیچ سنوورێک بۆ تاک دابنرێت لە ڕووی ئابوورییەوە، نابێت حوکوومەت تەداخول بکات و سنوور بۆ تاک دابنێت، ئینجا حەڵاڵ و حەرام بوونی نییە و کێ ئازایە با دەستی خۆی بوەشێنێت با لەسەر حسابی ئەوانی تر و کۆمەڵگەش بێت.

٥- لیبڕاڵیەتی کۆمەڵایەتی: ئەو لیبڕاڵیەتە، واتە دەستەبەرکردنی هەموو پێداویستییە بنەڕەتی و ئەساسییەکان بۆ تاک بەشێوازێکی وەها کەژیانێکی

سەربەرزانە بەڕێ بکات، دەبێت یەکسانییێکی ڕەها هەبێت، دەبێت دادگەرییێکی کۆمەڵایەتی بەرجەستە ببێت لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا, ژیانکردن بە شێوازێکی ئازادانەی ڕەهای وەها هەموو کەسێک چۆنی بوویت وەها بژییێت بەبێ ڕەچاوکردنی ئایین و کلتوور.

٦- لیبرالیەتی هزری و ڕۆشنبیری: واتە هەموو کەسێک ئازادە چۆن بیردەکاتەوە و چ جۆرە هزرێک هەڵدەبژێرێت، هەموو جۆرەکانی هونەر ڕێگە پێدراوە و هیچ سنوورێک نییە سنوورداری بکات.

## بیروباوەڕ و ڕاکانی لیبرالییەت:

١- ئازادیی ڕەها لە بیرکردنەوەدا

٢- ئازادیی ڕەها لە هەڵبژاردنی ئاییندا

٣- ئازادیی ڕەها لە ئابووری و پارە پەیداکردندا

٤- ئازادیی ڕەها لە هونەردا

٥- دوورخستنەوەی هەموو ئاراستە و سنوورە ئایینییەکان لە سیاسەت و دەوڵەتدا.

٦- ئایین پەیوەندی نێوان تاک و خودایە و بەس، نابێت بێتە ناو ژیان و سیاسەت و دەوڵەت و ئابووری.

٧- تاک خۆی ژیانی خۆی دروست دەکات بە دوورخستنەوەی هەموو سنوورە ئایینی و کۆمەڵایەتی و کلتورییەکان.

٨- ئازادی ڕەهای سیاسی

٩- سەروەری بۆ عەقڵ لە ڕاڤەکردنی دەقە ئایینییەکاندا و دەبێت ئایین و دەقە ئایینییەکان بخرێنە ژێر دەسەڵاتی عەقڵەوە.

١٠- دوورکەوتنەوە لە هەموو شەریعەتە ئایینییەکان چونکە ئەوانە زەوتکەری

ئازادیی مرۆڤن.

١١- ئازادبوون لە دەسەڵاتی زانایانی ئایینی و پیاوانی ئایینی

١٢- حوکمە شەرعییەکان بۆ سەردەم و شوێن و بارودۆخ وکاتەکانی خۆیان بوون و ئێستا یان دەبێت ڕەتبکرێنەوە یان ڕاڤەبکرێن بە شێوەیەک لەگەڵ بەرژەوەندیی مرۆڤ بێنەوە.

١٣- یەکسانی ژن و پیاو لەهەموو ڕووەکانەوە

١٤- باڵادەستی سیستمی سەرمایەداری

١٥- یەکسانی بەرانبەر بە یاسا

١٦- بەرژەوەندیی تاکە کەسی بنەما و ئەساسە

١٧- سەرچاوەی زانیاری بریتییە لەعەقڵ و هەست و زانست، وەحی وئایین بە سەرچاوەی زانیاری دانانرێن.

١٨- شارستانی ڕۆژئاوایی لیبراڵی دەبێت باڵبکێشێت بەسەر هەموو جیهاندا.

١٩- هەرچی هەیە قەناعەتی شەخسییە و جەنگی فکری بوونی نییە.

٢٠- تۆمەتبارکردنی ئیسلام بەوەی کە دژی بەها مرۆییەکان و ئازادییەکانە و ناتوانێت پێکەوەژیانی مرۆییانە بنیات بنێت.

٢١- هەوڵدان بۆ بەتاڵکردنەوەی ئیسلام لەناوەڕۆکە ئەساسییەکان و نەهێشتنی ڕۆڵ بۆی.

٢٢- بەراوردکردنی ئیسلام بە ئایینەکانی تر

٢٣- بڵاوکردنەوەی ڕەوتە فکرییە لادەرەکان

لەکۆتاییدا ئەوەی وایکردووە لیبراڵییەت زۆر پەرە بسەنێت و زۆر بڵاو ببێتەوە ئەوەیە کە لیبراڵییەت تێکەڵەیەکە لە عالەمانییەت و وجودییەت و دیموکراسییەت و سەرمایەداری.

# ئیلحاد (ناباوەڕی)

## پێناسەی ئیلحاد (ناباوەڕی) (Atheism)

ئیلحاد وشەیەکی عەرەبییە، لە زمانی عەرەبیدا بە دوو واتا دێت:-

١ - لادان لە شتێک

٢ - مەیلدان بە شتێک

کەواتا ئیلحاد لە ڕووی زمانەوانییەوە واتا: لادانی هەر شتێک لە ڕێگای ڕاستی خۆی.[١]

بۆیە قورئانیش ئیلحادی بە هەمان واتا بەکارهێناوە کە دەفەرموێت: {وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ}[٢]. واتە: «واز لەو کەسانە بێنن کە لادەدەن لەو ڕێگەیەی کە پێویستە لە سەری بن و لێی لانەدەن لەمەڕ ناوە پیرۆزەکانی خودا.»

هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: {إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِ ۚ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ}[٣]

ڕاڤەکارانی قورئان کەوتوونەتە جیاوازییەوە لە ڕاڤەکردنی واتای ئەم ئایەتەدا، هەندێک فەرموویانە: هەر شتێک دەگرێتەوە کە نەهی لێ کرابێت. هەندێکی

---

(١) تهذيب اللغة، الأزهري (٢٤٤/٤)، ومعجم مقايس اللغة (٢٣٦/٥).

(٢) الأعراف: ١٨٠.

(٣) الحج: ٢٥.

دیکە دەفەرموون: هاوبەش دانانە بۆ خودای گەورە. هەندێکی دیکە دەفەرموون: کوشتن و ستەم و زۆردارییە. هەندێکی دیکە دەفەرموون: قۆڕخکردنی خواردنە. بەڵام خاڵی هاوبەش و کۆکەرەوەی هەموویان بریتییە لە لادان لە ڕێی ڕاست و دروست، بەو شێوەیەی کە خودای گەورە دایناوە بۆ (البیت الحرام).

بەڵام واتا و مەفهومی ئیلحاد لە زمانە ئەوروپییەکاندا لە وشەیەکی یۆنانی وەرگیراوە کە لە دوو بەش پێکدێت، یەکەمیان واتا: «نەفیکردن» دووەمیان واتا: «خودا»، کەواتە ماناکەی دەبێتە: «نەفیکردنی خودا».

بەڵام لە ڕووی زاراوەوە قسەی زۆر و پێناسەی زۆر کراوە بۆ ئیلحاد، ئەفلاتوون یەکێک بووە لەوانەی کە هەوڵیداوە ئەو مانا و واتایانەی بۆ وشەی ئیلحاد بەکاردێت کۆبکاتەوە، بۆیە دەڵێت: ئیلحاد لە ژینگەی یۆنانیدا بە سێ مانا دێت:

١ - نکووڵی (ئینکاری)کردن لە هەبوونی خودا، یان خوداکان

٢ - نکووڵیکردن لە گرنگیدانی خودایی یان خوداکان بە گەردوون. واتە: خودای گەورە گەردوونی دروستکردووە و وازی لێهێناوە.

٣- بڕوابوون بەوەی کە دەتوانرێت خوداکان ڕازیبکرێن بە قوربانیکردن و بانگکردن و داواکردن لێیان.[1]

بەڵام ئیلحاد لە فیکر و ئەدەبیاتی ئیسلامیدا بە فرەوانتر بەکارهێنراوە، بە ڕەچاوکردنی مانا زمانەوانییەکەی کە بە واتای «لادان» دەهات، بۆیە لە فیکری ئیسلامیدا بە واتای لادانی گەورە و زەق بەکارهاتووە، جا ئەو لادانە بڕوانەبوون بێت بە خودا یان بە پێغەمبەرایەتی یان نەفیکردنی سیفەتەکانی خودای گەورە.

لە بەناوبانگترین ئەو کەسایەتیانەی کە بە ناباوەڕ وەسف کراون «ئەحمەد

---

(١) الفكر الديني عند اليونان، عصمت نصار (١٤٠)، وموسوعة الفلسفة، عبدالرحمن بدوي (٢١٩/١).

کوڕی یەحیای کوڕی ڕاوەندی»[١]یە، لەگەڵ ئەوەی ئەو نکووڵی لە بوونی خودا نەکردووە، بەڵام نکووڵی لە پێغەمبەرایەتی کردووە و ڕەخنەی لێ گرتووە، هەروەها گاڵتەی بە دینەکان کردووە و باوەڕی پێیان نەبووە. هەروەها «موحەممەدی کوڕی زەکەریای ڕازی» دیارە ئەویش بە بێباوەڕ وەسفکراوە، بەڵام نکووڵی لە بوونی خودا نەکردووە، بۆیە پەرتووکێکی هەیە بە ناوی «بەندە خودایەکی حەکیمی هەیە»، بەڵکوو ئەویش تەنیا نکووڵی لە پێغەمبەرایەتی کردووە.[٢]

ئەگەر بڕوانینە فەرهەنگ و پەرتووکە فەلسەفییەکان، دەبینین هەموویان پێناسەی ناباوەڕی دەکەن بە: "ئینکاریکردن و نکووڵیکردن لە بوونی خودا."

کەواتە دەتوانین بڵێین ناباوەڕی لە ڕووی زمانەوانییەوە واتا: لادان لە شتێکدا و مەیلکردن بە لای شتێکدا.

لە بەکارهێنانی قورئانیدا بە واتای: نکووڵیکردن لە ڕاستییەک لە ڕاستییەکانی شەرع، وەکوو بوونی خودای گەورە یان سیفەتەکانی یان موحکەمێک لە موحکەمەکانی شەرع.

ناباوەڕی لە زاراوەی گشتی ئەمڕۆدا ماناکەی بریتییە لە: نکووڵیکردن لە بوونی خودا و دروستکار و پەروەردگار.[٣]

بەڵام هەر ئەو واتایەی نییە، بەڵکوو کۆمەڵێک میتۆد و مانای جیاواز لەخۆ

---

(١) - یەکێک لە شیعرە هەرە بەهێزەکانی ڕاوەندی ئەم شیعرەیە کە مەفهوومێکی هەڵەی لە تەقسیماتی خوا بۆ دروست بوو بوو دەیپرسی بۆچی زۆر کەسی نەزان پارەدارن و زۆر کەسی زانا و ئاقڵ بێپارە و بەدبەختن:
کم عاقل عاقل اعيت مذاهبه*** وجاهل جاهل تلقاه مرزوقا
هذا الذى ترك الاوهام حائرة *** وصير العالم النحرير زنديقا

(٢) سير أعلام النبلاء، الذهبي (١٤/ ٥٩-٦٥)، وإخبار العلماء بأخبار الحكماء، القفطي (٢٠٧)، وسير أعلام النبلاء، الذهبي (١٤/ ٣٥٤).

(٣) معجم لالاند للفلسفه(١٠٧/١)، ومعجم أكسفور للفلسفه (٩٠/١)، والمعجم الفلسفي، مجمع اللغة العربية بالقاهرة (٢٠)، والمعجم الفلسفي، جميل صلبيا (١١٩/١).

دەگرێت، کە لەمەودوا بە ڕوونی باسی دەکەین.

## مێژووی ئیلحاد (ناباوەڕی)

کاتێک لە زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان دەگەڕێیت بۆ یەکەم بێباوەڕ، چاوت بە ناوی «دایاگۆڕاسی مێلۆس» (Diagoras of Melos) دەکەوێت کە فەیلەسووف و سۆفیستێکی سەدەی پێنجەمی پێش زایینە کە خەڵکی «مێلۆس»ی یۆنان بوو، هەرچەندە ئەو هیچ شتێکی لەسەر خۆی نەنووسیوە، بەڵام سەرگوزەشتەی بێباوەڕییەکەی وا دەردەخەن کە کەسێکی باوەڕبەخۆ بوو و بێزار و زۆر ناسراو بووە، نهێنییەکانی ڕێوەڕەسمی ئێلیوسینیانی[1] بۆ هەمووان ئاشکرادەکرد و وەک شتێکی ئاسایی نیشانیدەدا.

وا دیارە ئاشکراکردنی نهێنییەکانی ڕێوڕەسم و نەریتە پیرۆزەکانی بۆ مەبەستێکی دیاریکراو کردووە تاوەکوو هاوسەردەمانی بەهۆش بهێنێتەوە. یەکێک لە بەناوبانگترین چیرۆکەکانی بریتییە لەوەی کە هاوڕێیەکی پێی دەڵێت: وا بیردەکەیتەوە کە خوداکان گرنگی بە مرۆڤەکان نادەن لەم وێنانەدا نابینی کە چۆن چەندان خەڵک بە پاڕانەوە لە خودا لە تووڕەیی زریانی دەریاکاندا ڕزگاریان دەبێت و بەرەو بەندەرێکی سەلامەتیان دەبات، دایاگۆڕاس وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: بەڵێ ڕاستە بەڵام ئەی چی دەربارەی ئەو کەسانەی کە کەشتییەکانیان نووقمبووە و لە شەپۆلەکاندان تیاچوونە.[2]

هەر لە دەوروبەری ساڵانی ٤١٥ی پێش زایین بوو کە شاعیر «دایاگۆڕاسی مێلۆس»بە تۆمەتی ناباوەڕی تۆمەتبار کرا کە پێشتر ڕایگەیاندبوو نەبوونی سزا

---

(١)- Eleusinian Mysteries کۆمەڵە نهێنییەکی پیرۆزی ئایینی ئەو کاتە بوون.

(٢)- Jennifer Hecht، Doubt: A History: The Great Doubters and Their Legacy of Innovation، لە ساڵی ٢٠١٠ لە Harper Collins، بڵاوکراوەتەوە، لاپەڕە ٩.

بۆ جەور و ستەم سەلمێنەری ئەوەیە کە هیچ خودایەک نییە[1]، جەور و ستەم وەک سەربڕین و قەسابخانەی میلۆسییەکان بە دەستی ئەسین ابییەکان لە ساڵی ٤١٦ پێش زایین.

ئەسین ابییەکان بەم قسەیە هەڵچوون و بە شتێکی کەسی و سیاسیان لێکدایەوە زیاتر لەوەی شتێکی ئایینی بێت، بۆیە دادگای ئەسینا لە ٤١٦ی پێش زایین سزای قورسی دانا بۆ بێباوەڕەکان و ئەوانەی کە سووکایەتییان بە نهێنییەکانی «ئێلیوسینیان» کردووە کە لە تۆمەتی ئەم سووکایەتییە «ئەلسیبایتیس» و ئەوانی دیکە تێوەگلابوون، «دایاگۆڕاسی مێلۆس» هەر لەم تۆمەتەوە گلابوو، بەڵکوو هی ئەو زیاتریش بوو کە بە تۆمەتی سووتاندنی داری پەیکەری هێرقل[2] بۆ لێنانی شێلم دەستگیرکرابوو، دواتریش وا دەردەکەوێت دایاگۆڕاس توانیویەتی ڕابکات.[3]

ڕەنگە جیا لە «دایاگۆڕاسی مێلۆس»ئەوەش ڕەوابێت کە بوترێت یەکەم بێباوەڕ لە هیندستان بووە چونکە بەشێک لە مێژووناسان وای لێک دەدەنەوە کە یەکەم بێباوەڕی مێژووی مرۆڤایەتی کەسێک بووە بە ناوی «سومیخا» کە تەنانەت پێش «تالیسیش» بووە، دەوترێتیش «سومیخا» کەسایەتی نییە، بەڵکوو قوتابخانەیەکی ناباوەڕی بوون و بڕوایان بە خودا نەبووە، جیا لەوەش «ئەپیکۆر»(Epicurus) یەکەم فەیلەسووفە بەڕوونی دژایەتی خودا دەکات و ئارگومێنتی لە دژ دێنێتەوە.

---

(١) دیارە مەبەست لێی دەستەواژەی کێشەی شەڕە کە بۆچی مرۆڤەکان تووشی ناخۆشی و سەختی دەبن و هەندێک جار ژیانیان لێ تاڵ دەبێت و ئاژاوە و بەربەختی و ماڵوێرانی بەسەریاندا دێت.

(٢) Hercules کوڕی خوداوەند زووسە کە خۆشی یەکێکە لە خوداوەندەکانی یۆنان

(3)John Mackinnon Robertson، A history of freethought، ancient and modern، to the period of the French revolution، لەساڵی 1936لە Watts & Company، بڵاوکراوەتەوە لاپەڕە: ( Volume 1) 173

بەڵام بەشێوەیەکی گشتی توێژەران کۆک نین و ناتوانین مێژوویەکی دیاریکراو بۆ ناباوەڕی (ناباوەڕی بە واتای ئینکاریکردن لەبوونی خودا، نەوەک لادان لەڕێی ڕاست) دیاری بکەین و بڵێین: ئەم ساڵە یاخود ئەم سەردەم و کات و ساتە بە سەرەتای سەرهەڵدانی ناباوەڕی دادەنرێت، ئەوەش لەبەر نەبوونی کۆدەنگی لەسەری.

ئەوەی کە ڕوونە و نکۆڵی تیایدا ناکرێت ئەوەیە کە لە سەدەی حەڤدەهەم لە ئەورووپا بەئاشکرا بانگەشە بۆ ناباوەڕی دەکرا و ناباوەڕان چوست و چالاک بووبوون و هەوڵ و سیمینار و کۆڕ و کۆبوونەوەیان دەکرد.

**بەڵام لە مێژوودا باوەڕداری سەنتەر بووە، تا ناباوەڕی چونکە:**

١- مروڤ لە بنچینەدا لەسەر زگماک و خوداڕسک (فیترەت) دروستکراوە، هەر وەکوو پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموویت: «ما من مولود إلا يولد على الفطرة فأبواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه»[1]، واتا: «هەموو مرۆڤێک لەسەر فیترەتی پاک و ڕاستەقینە دروستدەکرێت و لەدایکدەبێت، بەڵام دەوروبەر و دایک و باوک لەسەر ئەم فیترەتە لای دەدەن و دەیکەنە جوو و نەصرانی و مەجووسی.» پاشان لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنیدا، مرۆڤ لە دەسەڵاتی خودا تێدەگات ئەگەر هەر لە تەنیاییشدا بێت و ئاراستەش نەکرێت بەرەو لای خوداناسی، بەڵگە و توێژینەوەکانیش لەسەر ئەم باسە زۆر و زەبەندەن.

لێرەشەوە بەشێک لە زانایانی دەروونناسی دەڵێن: چوار شت لە مرۆڤدا زگماک و خوداڕسک و فیترین و لەگەڵ سروشتی مرۆڤدان کە بریتین لە: زانستخوازی، جوانیخوازی، چاکەخوازی، خوداپەرستی.

---

(١) متفق عليه: البخاري ١٢٩٢، ومسلم: ٦٩٢٦

٢- مێژوونووسان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە دینداری و خوداناسی ئەسڵن و مێژوویان لەگەڵ مێژووی مرۆڤ و مرۆڤایەتیدایە، بۆ نموونە قسەیەکی بەناوبانگی مێژوونووسی گەورەی یۆنانی «پلۆتارک» هەیە دەڵێت: "زۆر شارمان لە مێژوودا بینیوە بەبێ قەڵا، شوورە، کۆشک و تەلار و قوتابخانە، بەڵام هەرگیز شارێکمان نەدیوە بەبێ پەرستگا."

هەروەها فەیلەسووفی فەڕەنسی «هێنری برگسۆن» دەڵێت: "کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دوور لە زانست و هونەرو فەلسەفە ژیانیان بەسەربردووە، بەڵام هەرگیز هیچ کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی نەبووە دوور لە ئایین ژیانیان بەسەربردبێت."[١]

٣- فەیلەسووفە بەناوبانگەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بڕوایان بە بوونی خودا هەبووە، بۆ نموونە: سوقڕات، ئەفلاتوون، ئەرستۆ، ڤۆلتێر، فارابی.[٢]

٤- مێژوونووسی گەورە «ویل دیۆرانت» لە پەرتووکی (قصة الحضارة)دا دەڵێت: "هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەو بیروباوەڕە کۆنە ڕاست و دروستە کە دەڵێت: "ئایین دیاردەیەکە کە هەموو مرۆڤایەتی گرتووەتەوە"، واتە: خوداناسی شتێکی گشتی بووە، ئیلحاد ئەگەر هەبووبێتیش شتێکی تاکەکەسی بووە و نەبووە بە دیاردە و خاوەن قوتابخانە و کۆمەڵە و مەزهەب.

## ناوی بەناوبانگترین فەیلەسووف و زاناکان لە کۆن و نوێدا کە بێباوەڕ بوون:

دیمۆکریتس،ئەپیکۆر،تۆماس هۆبز، دایڤد هیوم، شۆپنهاوەر، کارڵ مارکس، فیورباخ، نیچە، سپنسەر، بێرتراند ڕاسل، ستیڤن هاوکینگ، ڕیچارد داوکینز،

---

(١) الدين، بحوث ممهد لدراسة تاريخ الأديان، عبدالله دراز، (٨٣)

(٢) االإسلام يتصدى للغرب الملحد، الدكتور محمد نبيل النشواني (١١).

کریستۆڤەر هیچنز، لۆرانس کراوس، سام هاریس، دانییل دێنیت.[١]

«کارڵ مارکس» (١٨١٨ - ١٨٨٣) پێی وایە، کە «دیموکریتس» یەکەم ئەقڵی مەوسوعی بووە لەنێو یۆنانییەکاندا، هەروەها «لینین» (١٨٧٠ - ١٩٢٤) دەڵێت: "«دیموکریتس» جوانترین بانگەوازکاری ماددیەت (ماتریالیزم) بووە لە جیهانی کۆندا."[٢]

لە دوای ئەو، لە سەدەی چوارەمی پێش زایینیدا (٣٤١ - ٢٧٠ پ.ز) فەیلەسووفی یۆنانی «ئەپیکۆر» دامەزێنەری «قوتابخانەی ئەپیکۆری» بە دووەم فەیلەسووفی بێباوەڕ دادەنرێت،[٣] کۆمەڵێک پرسیاری گوماناوی دەربارەی خودا و شەڕ و خراپە وروژاندووە، بۆ نموونە دەیگوت:

• ئەگەر خودا دەیەوێت ڕێگری لە شەڕ بکات، بەڵام لە توانایدا نییە؟ کە وا بێت توانای بەسەر هەموو شتێکدا نییە.

• ئەگەر دەتوانێت ڕێگری لە شەڕ بکات، بەڵام نایەوێت؟ کە وا بێت شەڕانییە و خودایەکی چاک نییە.

• ئەگەر دەتوانێت و دەشیەوێت ڕێگری لە شەڕ بکات؟ بەڵام ئاگای لە شەڕەکان نییە، ئەوە خودایەکی بێئاگا و نازانیارە.

کە وا بێت ئەی شەڕ لە کوێوە هاتووە؟

• ئەگەر خودا نایەوێت و ناشتوانێت ڕێگری لە شەڕ بکات و ئاگای لە شەڕەکانیش نییە؟ کە وا بێت بۆچی قسە لەسەر خودایەکی وەها بێدەسەڵات بکەین؟

لە دوای سەردەمی یۆنانییەکان، سەردەمی ڕۆمانییەکان دێت. دیارە لەو

---

(١) ئیلحاد وەک خۆی، صلاح الدین أحمد، ل ١١ _ ١٥.

(٢) وهم الإلحاد، أ. د. عمرو شریف (٣).

(٣) كواشف زيوف في المذاهب الفكرية المعاصرة، عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني (٤٤٣).

سەردەمەشدا ناباوەڕی بە مانای ئینکاری بوونی خودا نەبووە، بەڵکوو ئەوەی کە بووە، خودای خێر و خودای شەڕ یان خودای ئاسمان و خودای زەوی بوون، دواتر لە مێژووی شارستانییەتی عەرەبیدا ئەوەی کە هەبووە ئینکاریکردنی ڕۆژی دوایی و چەند چەمکێکی جیاواز بووە نەوەک ئینکاریکردن لە بوونی خودا.

هەروەک قورئان باسی کردووە: ﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُمْ بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ مَا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّا أَنْ قَالُوا ائْتُوا بِآبَائِنَا إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ اللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾[١]

دیارە کە ئەمانە بە (الدهريين) دەهرییەکان ناسراون.

بەڵام دواتر کە ئیسلام هات بەتەواوەتی بیری ناباوەڕی هەرەسی هێنا، ئەوەی کە باسیش دەکرێت دەربارەی «ئەبوبەکری ڕازی و ئیبن ڕاوەندی و... هتد» ئەوانە هیچیان ئینکاری بوونی خودایان نەکردووە، بەڵکوو ڕەخنەیان لە پێغەمبەرایەتی و چەند حوکم و چەمکێکی نێو ئایینی ئیسلام گرتووە.[٢]

کەواتا ئەوەی کە هەبووە لە مێژووی نوێدا، زۆرینەی مێژوونووسان پێیان وایە دەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی فەڕەنسی لەساڵی (١٧٨٩ز)، دواتریش لە کاتی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ساڵی (١٩١٧ز) ڕووسیا زیاتر پەرەی سەند، هەروەها شتێکی زانراوە کە ئەم قۆناغە قۆناغێکی تا بڵێی ناتەندروست بوو، کڵێسا دەستی خستبووە نێو هەموو کایەکانی ژیان، ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستی و سەربازی، هەروەها کڵێسا و پیاوانی ئایینی بەتەواوی دژی خەڵک و چینی هەژار و فەیلەسووف و زاناکان بوون و هەموویانیان چەوساندبوونەوە و ڕێگەیان بە

---

(١) [الجاثية: ٢٤ – ٢٦]

(٢) سير أعلام النبلاء، الذهبي (١٤/ ٥٩-٦٥)، وإخبار العلماء بأخبار الحكماء، القفطي (٢٠٧)، وسير أعلام النبلاء، الذهبي (١٤/ ٣٥٤).

هیچ بەرەوپێشچوونێکی زانستی و فیکری و فەلسەفی نەدەدا، بۆیە دەبینین لەو سەردەمەوە چەندان فەیلەسووفی بێباوەڕ پەیدا بوون، وەک: «نیتچە، کارل مارکس... هتد» دوایی خەڵکیش پشتگیریکردن و شوێنیان کەوتن.

دەتوانین بڵێین: لە کۆتاییەکانی سەدەی (١٧) تاوەکوو سەدەی (١٩) ناباوەڕی لە ئەورووپا بەتەواوەتی پەرەی سەند و گەشەی کرد، بوو بە خاوەنی چەندان قوتابخانەی فیکری، فەلسەفی، زانستی، دەروونی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی، کە بە هەموو شێوەیەک ئینکارییان لە بوونی خودا دەکرد، بۆ ئەمەش زۆر سوودیان لە ڕۆڵی خراپی کەنیسە و پیاوانی ئایینی مەسیحی و خوڕافیاتی نێو ئینجیل و پەرتووکە ئایینییەکان بینی.

سەبارەت بە مێژووی ئیلحاد لە جیهانی ئیسلامی و لە مێژووی نوێدا، دەگەڕێتەوە بۆ دوای چارەکی یەکەمی سەدەی (١٩) کاتێک جیهانی ئیسلامی بەتەواوی بە ڕووی ڕۆژئاوادا کرایەوە و داگیرکاری ئینگلیز و دەستکاری کردنی جیناتی مامەڵەی کەلتووری و ڕەوشتییانەی کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکان کەوتە سەر سکەی جێبەجێ کردن و دوای جێهێشتنی وڵاتیش وازیان لە خێروبێر و لە هەوڵدان بۆ لەقاندنی بنچینە کلتوری و ئایینی و ڕەوشتییەکانی نێو کۆمەڵگە هەر نەهێنا.

ئەوەش بڵێین کە ژمارەیەکی زۆر قوتابی ڕوویانکردە ئەورووپا بۆ خوێندن، پاشان بەهۆی ڕوانین لە شکستی کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکان و بەزیووی ناخی خۆیان و تەواونەبوونی ئەزموون و زانیاری لەمەڕ شارستانییەتەکان، کەوتنە ژێر کاریگەری فیکر و فەلسەفەی ناباوەڕییەوە، دواتر کە دەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان و لەژێر ناوی کرانەوە و ئەقڵانییەت و پێشکەوتن و پەرەپێداندا، سەرەتا ڕاستەوخۆ بانگەشەی ناباوەڕییان نەدەکرد، چونکە دەیانزانی کە فیکرێکی نامۆیە بە کۆمەڵگەکانیان، بەڵکوو لە ڕێگەی ئەم بانگەشانەوە پەرەیان پێدەدا.

وڵاتانی تورکیا و میسرِ دوو نموونەی زۆر زەقن کە بە ڕێژەیەکی بەرچاو ناباوەڕی تێیاندا گەشەی کرد و چەندان بیرمەند و پشتیوان و دامەزراوە و پەرتووک و نووسین و بڵاوکراوەیان هەبوو.دواتریش هەتا ئێستاشی لەگەڵدابێت، ناباوەڕی بوونی هەیە و بانگەشەکار و پشتیوانی خۆی هەیە، کە زیاتر لە ڕێگەی ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە فیکری خۆیان بڵاودەکەنەوە.

زۆرێک لە توێژەران پێیان وایە کە سەردەمی زێڕینی ئیلحاد کۆتایی پێهاتووە کە لە سەدەی حەڤدەدەستی پێ کرد و لە ساڵی (١٩٩١ز) بە داڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت کۆتایی پێ هات. هەر بۆیە لە یاسای زۆربەی زۆری وڵاتانی جیهان، ئایین لە دەستوور و ئاڵا و دروشمدا جێگیرکراوە و بە تەواوی ڕێزلێگیراوە.

بەڵام ئەوەی لە دوای ساڵی دوو هەزارەوە هەیە و دەیەوێت خۆی بسەپێنێت و خۆی جێگیر بکات، ئیلحادی زانستی و ڕۆحییە کە بە ناوی فیزیک و مەعنەویەت ... قسە دەکات، بەڵام لە هەمان کاتیشدا زانست لەگەڵی نییە، ئەوەی کە هەیە قسەکردنە بە ناوی زانست و بانگەشەکردن و چەواشەکارییە و بەس.

**بۆیە دەتوانین مێژووی ناباوەڕی بەم شێوەیە پۆلێن بکەین:**

١. سەردەمی پێش یۆنان

٢. سەردەمی یۆنان

٣. سەردەمی سەدەی ناوەڕاست (مەسیحی)

٤. سەردەمی سەدەی ناوەڕاست (ئیسلام)

٥. سەردەمی نوێ و ڕێنساس و شۆڕشی فەڕەنسی

٦. سەردەمی یەکێتی سۆڤیەت

٧. سەردەمی داڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت

٨. سەردەمی نوێ و بەزانستیکردنی ناباوەڕی

## دوو جۆرە سەرەکییەکەی ئیلحادی ناو فەیلەسووفان

ئەگەر بڕوانینە ئیلحادی ناو فەیلەسووفان، دەبینین دوو جۆر ئیلحادی سەرەکی هەیە:

**یەک:** ئیلحادی یەقینی

**دوو:** ئیلحادی گومانی

واتە هەندێکیان بە قسەی خۆیان یەقینیان هەیە لە نەبوونی خودا و ڕاستەوخۆش بێ پێچوپەنا دەریدەبڕن، هەندێکی دیکەشیان گومانیان هەیە و بەگومانەوە نکوڵی لە بوونی خودا دەکەن.

## یەکەم: ئیلحادی یەقینی

### بارۆن دی هۆلباخ (٣٢٧١ - ٩٨٧١ ز)

هۆلباخ لە بەناوبانگترین کەسایەتیە ماددیەکانی سەدەی هەژدەبوو، کاریگەرییەکی زۆر هەبوو لەسەر دژایەتیکروونی ئایین و سەرکەشبوون لێی، لە ساڵی (١٧٦٧ ز) کتێبێکی نووسی بە ناوی المسيحية بد أن أميط عنها اللثام) لەم کتێبەدا زۆر بە خەستی دابەزیە سەر مەسیحیەت و مەسیحیەتی بە نەهامەتی هەموو گەردوون دانا!

لە پاشاندا هەر بەردەوامبوو لە هێرشەکانی و کتێبێکی دیکەی نووسی بەناوی

(نظام الطبيعة)، ئەم کتێبە وەسفی زۆری کرا:

"نیشاندانی سەرەکی هەڵوێستی ماددی لە سەدەی هەژدەیەمدا."[١]

"ڕوونترین نیشاندانی تەوژمی ئیلحادییە، لە هەمووانیش لۆژیکی ترە.."[٢]

"تەواوترین و کامڵترین و ڕاشکاوترین نیشاندانە بۆ ماددییەت و ئیلحاد لە مێژووی هەموو فەلسەفەدا."[٣]

بناغەی ئەم کتێبە لەسەر ئەمە وەستاوە کە هەموو دیاردە سروشتییەکان بگەڕێندرێنەوە بۆ هۆکارە ماددیەکان بەبێ پێویستی بە هۆکار ناماددی، هەروەها چەسپاندنی ئەوەی کە سیستەمی گەردوونی بە هیچ جۆرێک بەرەنجامی نەخشەی خوایی نییە، بەڵکوو هەموو لە سروشتی ماددی شتەکان خۆیانەوە سەرچاوەیان گرتووە، هەروەها هەوڵی ئەوەی داوە ڕەخنە لە هەموو ئەو بەڵگانە بگرێت کە ئیمانداران لەسەر بوونی خودا دەیهێننەوە، جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە عەقڵی کۆتاییهاتوو و سنووردار ناتوانێت هیچ جۆرە بیرۆکە و فکرێت دەربارەی بێکۆتا و بێسنوور بێنێتە کایەوە.[٤]

هۆلباخ پشتی بە تیۆرییە زانستییەکانی سەردەمی خۆی دەبەست بۆ نکووڵی لە بوونی خودا و ڕەتکردنەوەی بەڵگەکانی و ڕەتکردنەوەی غەیری وجودی ماددی، بەمەش هۆلباخ بە یەکەم کەس دادەنرێت کە کتێبێکی تایبەتکراوی لەم بارەیەوە نووسیبێت و بەڕاشکاوی و بە زمان و تەعبیرێکی ڕوون و ئاشکرا ئیلحادی خۆی دەربخات.[٥]

---

(١) تاريخ الفلسفة، فريدك كوبلستون ب٦، ل٧٦.
(٢) معجم الفلاسفة، جورج طرابيشي، ل ٧١٧.
(٣) قصة الحضارة، ويل ديورانت، ب ٣٨، ل١٥٦.
(٤) الله في الفلسفة الحديثة، جيمس كولينز، ل٢١٩.
(٥) الله في الفلسفة الحديثة، جيمس كولينز، ل٢٢٠.

هۆڵباخ بەوە نەوەستا تەنیا نکووڵی لە بوونی خودا ڕابگەیەنێت، بڵێ گەردوون هیچ پێویستییەکی نییە بە خودا، بەڵکوو شانازی بەوەوە دەکرد کە ئەو "دوژمنی شەخسی خودایە."[١]

هەر بەوە نەوەستا و داوای دەکرد هەرکەسێک بیەوێت قسەکانی ڕوون بن، دەبێت هەردوو وشەی «خودا، دروستکردن» ون بکات.[٢]

جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئایین دژی بەختەوەری مرۆڤایەتییە، دژی پێشکەوتنە. بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە باوەڕووبوون بە خودا زۆر دوورە لەوەی مرۆڤەکان خۆشبەخت و بەختەوەر بن و قەلەقی و دڵەڕاوکێ و بەدبەختی و ... زیاد دەکات. هۆلباخ پێی وابوو نەزانی و ترسی مرۆڤە سەرەتاییەکان وایکردووە بیرۆکەی خودا و خواوهندەکان بێتە کایەوە، پەرستشی خواوەندەکانی بە سادەبیری و لاوازی و فەقیرحاڵی وەسف دەکر، بەردەوام جەختی لەوە دەکردەوە کە خۆسەپێن و ستەمکاران بەرگری لە ئایین دەکەن لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتەکەنیان، بەڵگەشەی لەسەر ڕەخنەگرتن و دژایەتیکردنی ئایین بەوە دەهێنایەوە کە زیانی زۆری هەیە بۆ مرۆڤ و سەردەکێشێت بۆ زۆری ڕاجیایی و شپرزەیی و جەنگ لەنێوان خەڵکیدا، هەروەها بەکارهێنانی لەلایەن بەدکاران و خراپەکاران لە سیاسییەکان و غەیری ئەوانیش، بۆ پاڵپشتیکردنی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان.[٣]

---

(١) الله في الفلسفة الحديثة، جيمس كولينز، ل٢١٨، والفكر الاوروبي الحديث - القرن الثامن عشر -، فزانكلين باومر، ل٦١، وقصة الحضارة ويل ديورانت، ب٣٨، ل١٤٥.

(٢) قصة الحضارة ويل ديورانت، ب٣٨، ل١٤٧.

(٣) تاريخ الفلسفة، فرديک كوبلستون، ب٦، ل٨١. بۆ زیاتر زانیاری لەسەر ئیلحادی هۆلباخ بڕوانە: تاريخ الفلسفة - القرن الثامن عشر - إميل برهيية، ل١٦٠. والموجز في تارخ الفلسفة، جماعة من الأساتذة السوفيات (٢٠٩ - ٢١١). والفكر الاوروبي الحديث - القرن الثامن عشر -، فرانكلين باومر (٦١ - ٦٣). قصة الحضارة، ويل ديورانت، ب ٣٨، ل ١٣٣ - ١٤٧. تاريخ الالحاد في الغرب، رمسيس عوض، ل١٣٦. ومعجم الفلاسفة، جورج طرابيشي، ل٧١٧ - ٧١٦.

لە کۆتاییدا هۆلباخ گەیشتە لوتکە لە دژایەتی ئایین و خودا، بۆیە ڤۆلتێر و غەیری ئەویش هەستان وەڵامدانەوە و بەرڵستیکردنی و ڕەخنەبارانکردنی، ڤۆلتێر کتێبکی دانا بە ناوی «خودا» لەوێدا وەڵامی ڕەخنەکانی هۆلباخی دایەوە[1]. [2]

## فیورباخ (١٨٠٤ _ ١٨٧٢ ز)

فیورباخ یەکێکە لە بەناوبانگترین فەیلەسووفەکانی سەدەی نۆزدەهەم، لە هەمان کاتدا یەکێکە لە نوێنەرە ناودارەکانی تەوژمی چەپی هیگڵی، کە بە دژە ئایین ناسراوە، بیروڕاکانی کاریگەری زۆریان جێهێڵا لەسەر هاوسەردەمەکانی و دوای خۆشی، هەربۆیە ئەنگڵز دەڵێت: "فیورباخ کەسێکی حەمماسی و ئیشکەر و کۆڵنەدەر بوو، بۆیە ئێمە هەموومان بە تێکڕا فیورباخین.."[3]

سەرەڕای ئەوەی فیورباخ لەسەرەتای قۆناغەکانی فکریدا لەسەر بیروڕاکانی هیگڵ پەروەردەبوو، بەڵام دواتر لێی هەڵگەڕایەوە و ڕەخنەی لە فەلسەفەکەی گرت و لێی جیابوویەوە و فەلسەفەیەکی تایبەت بەخۆی بنیاتنا کە تەواو تەواو لەگەڵ بنەماکانی فەلسەفەی هیگڵ تێکدەگیرا، دواتر فەلسەفەکەی بە «فەلسەفەی سروشتی»[4] ناسرا، کە فەلسەفەیەکی تەواو ماددییە، بناغەکەی بریتییە لە پیرۆزکردنی سروشت (الطبيعة)، سروشت لەلای فیورباخ بوونەوەرە

---

(١) الموجز في تاريخ الفلسفة، جماعة من الأساتذة السوفيات، ل٢١٥، وتاريخ الفلسفة الحديثة، وليم كلي رايت، ٢٣٧.

(٢) بۆ هەموو بابەتەکەبگەڕێوەبۆ: ظاهرة نقد الدين في الفكر الغربي الحديث، د. سلطان عبد الرحمن العميري، ل ١٨٥ _ ١٨٧.

(٣) فلسفة فيورباخ، أحمد عبد الحليم عطية، ل٩ _ ١٢. والموسوعة الفلسفية، جماعة من العلماء السوفيات، ل٣٦٥.

(٤) فلسفة فيورباخ، أحمد عبد الحليم عطية، ل٩١.

هەرە بەرز و گەورە و بڵندەکەیە، سەرەتا و کۆتایی هەموو شتەکانە، نە شتێک لە پێش ئەوەوە هەبووە، نەشتێکیش لە دوای ئەوەوە هەیە و دەبێت.

ڕووکەشی ماددی و شتە بەرهەستەکانی گەردوون و بوون بناغەی هەموو شتەکانن، وەک هەوا، ئاو، زەوی، ئاژەڵ، ڕووەک و هەموو بوونەوەرە هەستپێکراوەکان کە مرۆڤ لە خۆیانی جیادەکاتەوە.[١]

فیورباخ پێی وایە سروشتی ماددی (الطبیعة المادیة) بنەما و بناغەی هەموو شتەکانە، فکر و هزر لە مادده و سروشتی ماددییەوە سەچاوە دەگرن و لەوێوە هەڵدەقووڵێن، مەعریفە و زانینی مرۆڤیش لەوەوە کورتهەڵاتووە. لێرەوە بناغەی ڕێبازەکە بەپێچەوانەی هیگڵ دادەنێت، چونکە هیگڵ پێیوایە فکر و هزر بنەمای وجود و بوونن، بەڵام فیورباخ سروشت بە بنەمای بوون و وجود دادەنێت.

فیورباخ زۆر بەسەرسەختی دژایەتی میسالی دەکرد، پێی وابوو دەبێت فەلسەفە دابماڵرێت لە غەیری تێڕوانی هەستی و ماددی و مرۆڤیش هەموو کورتهەڵبێنێت لە هەستەکانی، چونکە مرۆڤ لە هەموو بوونەوەرەکانی دیکە زیاتر هەستەکییە و ئیحساس و هەستیشی لە هەمووان بەهێزترە.[٢]

فیورباخ هەر بە پیرۆزکردنی سروشت نەوەستا، بەڵکوو خودی مرۆڤیشی پیرۆز کرد و پێی وابوو بەرزترین بوونەوەرە، هەوڵیدا فەلسەفە کورتهەڵێنێت لە لێکۆڵینەوە لە مرۆڤ و بوونەکەی، بۆیە دەیگوت: "کێشەی ئەمڕۆ ئەوە نییە خودا هەیە یان نا، بەڵکوو کێشەی ئەمڕۆ ئەوەیە ئاخۆ مرۆڤ هەیە یان نا."[٣]بەس زاتی مرۆڤ بەتەنیا نوێنەری بوونی ڕاستەقینەیە (الوجود الحقیقی)[٤]، بەم پێیە

---

(١) فلسفة فیورباخ، أحمد عبد الحلیم عطیة، ل٨٠.

(٢) الموجز فی تاریخ الفلسفة، لجنة من الأساتذة السوفیات، ل٢٩٧ _ ٢٩٨. و فلسفة فیورباخ، أحمد عبد الحلیم عطیة، ل١١٦ _ ١٢١.

(٣) فلسفة فیورباخ، أحمد عبد الحلیم عطیة، ل١٣.

(٤) الموجز فی تاریخ الفلسفة، لجنة من الأساتذة السوفیات، ٢٩٦ _ ٢٩٧.

فیورباخ بە دامەزرێنەری «ئیلحادی مرۆڤی و مرۆڤبوونی بێباوەڕ» (الانسانية الملحدة) دادەنرێت.

فیورباخ یەکێکە لەو فەیلەسووفانەی سەدەی نۆزدەهەم کە زۆرترین گرینگی داوە بە بابەتەکانی پەیوەست بە ئایین، بۆچوونەکانیشی زۆر کاریگەربوون بە ڕێبازی ماددی، لە بەناوبانگترین کتێبەکانی: (ماهية المسيحية)، کە بە یەکێک لە کتێبەکانی تەوژمی ئیلحاد دادەنرێت، ڕەواجێکی زۆریشی پەیداکرد، یەکێکی دیکەش لە کتێبە گرینگەکانی: (نسب الالهة تبعا للمصادر القديمة الكلاسكية والعبرانية والمسيحية)، لەوێدا جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەو خودایەی لە ئایینەکاندا هەیە تەنیا بەرجەستەکردنێکە کە مرۆڤ بۆخۆی ئاواتەخوازیەتی و نەشی توانیوە بیسەلمێنێت.[1]

لە بەرەنجامی ئەو پیرۆزکردنەوەی فیورباخ بۆ سروشت و مرۆڤ، سروشتی کردە بنەمای ئایینیش، چونکە لەلای ئەو سروشت خودایە، خودا لەلای فیورباخ شتێک نییە غەیری سروشت، بۆیە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە دەڵێت: "خودا بوونەوەرێکە هەموو بوون لەخۆ دەگرێت، گشتیشە، قابیلی گۆڕانیش ناکات، بەڵام خودا بریتییە لە خودی خۆر و هەموو بوونەوەرەکانی دیکە و خودی زەوی و ئاسمان ..."[2]

لە تێڕوانینی فیورباخدا هەموو ئەو سیفەتانەی پاڵدراون بۆلای خودا لە ئایینەکاندا، هەموویان هی سروشتن بەڵام لێی سەندراوەتەوە و پاڵدراوەتە لای خودا! حەقیقەتی خودا دەگەڕێتەوە بۆلای پیرۆزکردنی سروشت و بەرگکردنەبەری سیفاتگەلێک کە لەسەرووی مرۆڤەوەن.[3]

---

(١) موسوعة الفلسفة، عبد الرحمن بدوی، ب١، ل٢١١.
(٢) أصل الدين، فيورباخ، ل٥٠. والدفاتر الفلسفية، لينين، ب٢، ل٥٤.
(٣) فلسفة فيورباخ، أحمد عبد الحليم عطية، ل٩٦.

فیورباخ بە هەموو شێوەیەک ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە خودا بوونێکی بەرزتری هەبێت لە سروشت یان لەسەرووی سروشتەوە بێت، یان لە دەرەوەی سروشت بێت، چەندان جار ئەوەی دووبارە کردووتە کە خودا غەیری سروشت شتێکی دیکە نییە، واتە خودی سروشتە[١]. بۆیە دەڵێت: "هەتا ئەگەر خودایەکت بینی لە سروشتدا، دەبێت یەکەمجار بیخەیە سروشتەوە، بەڵگەکانی بوونی خودا لەڕێگەی سروشتەوە هیچ شتێک نیین غەیری بەڵگەی نەزانی و لاوازی.."[٢]

خودا لە فەلسەفەی فیورباخدا تەنیا ڕەنگدانەوەی خودی مرۆڤە، حەقیقەتی بوونی خودا بەرجەستەبوونی حەقیقی بوونی مرۆڤ خۆیەتی، خودا تەنیا وێنایەکی مرۆڤی تەواو و کامڵە، خودا بوونی نییە مەگەر بە پاڵدانی نەبێت بۆ لای مرۆڤ، بۆیە مرۆڤ خودای مرۆڤە.[٣]

ناسینی خودا ناسینی خودی مرۆڤە، هۆشیاری و وەعی و یەکەم و ناڕاستەوخۆیە بۆ مرۆڤ.[٤]

سەرچاوەی ئایین تەنیا بریتییە لە بەجێهێنانی ویستە سایکۆلۆژییە دەروونیەکانی مرۆڤ کە پەیوەستن بە ترس و خۆشەویستی و پێخۆشبوون و هیواو و ئومێدی گرێدراو بەو سروشتەی کە دەورەی ژیانی مرۆڤی داوە.[٥]

سەرەڕای ئەوەی کە فیورباخ جەخت لەسەر فکری ناباوەڕی و ئیلحاد دەکاتەوە کە نکووڵیکردنە لە بوونی خودایەک جیاواز لە گەردوون و خودایەک

---

(١) أصل الدين، فيبورباخ، ل٤٢.

(٢) تاريخ الفلسفة (القرن التاسع عشر)، إميل برهيية، ل٢٥٤.

(٣) أصل الدين، فيورباخ، ل٤٨. تاريخ الفلسفة (القرن التاسع عشر)، إميل برهيية، ل٢٥٤. وفلسفة فيورباخ، أحمد عبد الحليم عطية، ل٢١١.

(٤) أصل الدين، فيورباخ، (مقدمة المترجم)، ل١٠.

(٥) فلسفة فيورباخ، أحمد عبد الحليم عطية، ل٩٥، الموجز في تاريخ الفلسفة، لجنة من الأساتذة السوفيات، ل٣٠٠، وتاريخ الفلسفة الحديثة، وليم كلي رايت، ل٣٣٩، وموسوعة الفلسفة، عبد الرحمن بدوي، ب٢، ل٢١٣.

لەسەرووی گەردوون و بوون کە دروستکەریەتی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا نکووڵی لە دینداری و تەدەیین ناکات و داوای دەستبەرداربوون و وازهێنان لێی ناکات. بەڵکوو هەوڵی گەورەکردن و جوانکردنی دەدات، هەربۆیە هەندێک لە توێژەران بە ئیماندار و باوەڕداری دادەنێن، هەندێک لە پرۆتستانتەکانیش پێیانوایە فیورباخ ئەوەی کە وتوویەتی دژی مەسیحییەت نییە.[1]

بەڵام لە ڕاستیدا ناتوانرێت فیورباخ بە ئیماندار دابنرێت (ئیمان بە مانای ئیمان لەلای ئیمانداران و دینداران)، بۆیە هەندێک لە توێژەران ناوی دەبەن بە "مولحیدی بە تەقوا"[2]، بە واتای ئەوەی کە فیورباخ بڕوای بە خودایەکی سەربەخۆ لە گەردوون و دروستکەر و بەڕێوەبەری گەردوون نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا هەوڵدەدات مرۆڤ بکات بە بەندەی خۆی، «لینین» لە فیورباخەوە قسەیەک دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: "بێگومان ئەنجامی لۆژیکی من ئەوەیە کە هیچ خودایەک بوونی نییە.."[3].[4]

## دووەم: ئیلحادی گومانی

### دەیڤید هیۆمم (١١٧١ _ ٦٧٧١ ز)

دەیڤید هیۆم یەکێکە لە بەناوبانگترین فەیلەسووفانی میتۆد و تەوژمی گومانگەرا، هەروەها یەکێکیشە لە بەرنامە و بناغە دارێژەرانی ئەم ڕێباز و توژمە. لەسەرەتای ژیانییەوە بە قۆناغ و پێگەیشتنێکی ئایینی تێپەڕبوو و لەسەر ڕێبازی

---

(١) فلسفة فيورباخ، أحمد عبد الحليم عطية، ل٢١١ _ ٢١٢.

(٢) فلسفة فيورباخ، أحمد عبد الحليم عطية، ل٢١٣.

(٣) الدفاتر الفلسفية، لينين، ب٢، ل٥٠.

(٤) بۆ هەموو بابەتەکەبگەڕێوەبۆ: ظاهرة نقد الدين في الفكر الغربي الحديث، د. سلطان عبد الرحمن العميري، ل١٨٧ _ ١٩١.

«کافیلینی» بوو، پاشان چووە سەر بیرورا و ڕێبازی گومانگەرا، یەکێک لە گرینگترین کاریگەرییەکان لە هاتنەکایەی ئەم گۆڕانکارییە بریتیبوو لە خوێندنەوەی کتێبی «کلارک» بەناوی: «بەڵگە لەسەر بوونی خودا و سیفەتەکانی»، ئەک کتێبە لەسەر چەسپاندنی بوونی خودا و بەڵگەکانی نووسراوە، بەڵام لەبەر لاوازیەکەی دەیڤید هیۆم گومانی لە ئایین و باوەڕەکەی پەیدابوو.[1]

دەیڤدهیۆم گرینگیەکی زۆری دەدا بە ئایین و بابەتەکانی پەیوەست پێیەوە، هەر بۆیە دوو کتێبی لەم بارەوە نووسی: یەکیان «مێژووی سروشتی بۆ ئایین»، لەم کتێبەیدا باسی مێژووی ئایینەکان دەکات لەلای مرۆڤایەتی، هەروەها باسی گەشەسەندن و سروشتی ئایینەکان دەکات.

کتێبەکەی دیکەی بەناوی «چەند گفتووگۆیەک دەربارەی ئایینی سروشتی»، ئەم کێبەی دەیڤید هیۆم بە کامڵترین و وردترین کتێبی دادەنرێت، چونکە چەندان ساڵ پێیەوە خەریکبووە و بەردەوام دەستکاریکردووە و زیاد و کەمی بۆی کردووە، هەتا دوای مردنیشی بڵاو نەکرایەوە. ئەم کتێبەی دەیڤید هیۆم گفتووگۆیەکی زۆر درێژە دەربارەی سێ کەسی ڕەمزی، کە هەرسێکیان خاوەنی تەوژمی جیاوازن، ئەوانیش:

«کلیانش»: نوێنەری ئاڕاستەی عەقڵی، کە پشتی بە عەقڵ بەستووە و پێیوایە لە ڕێگەیەوە دەگەین بە حەق.

«فیلۆن»: نوێنەری ئاڕاستەی گومانگەرا کە نە ئیمانی بە ئایین هەیە نە بە عەقڵ، بەڵکوو لە بازنەی گوماندا دەخولێتەوە.

«دیمان»: نوێنەری لاهووتە کە وەسفدارە بە چەقبەستوویی و نەرمی نەنواندن، ڕەتیدەکاتەوە بابەتی ئایین ملکەچ ببێت بۆ هیچ شیکردنەوە و

---

(١) الدين والميتافيزيقا في فلسفة هيوم، عثمان الخشت، ل٨.

ڕەخنەیەک.

دەیڤید هیۆم لەم کتێبەدا زۆر بەبێلایەنی شتەکانی نووسیویەتی، بەشێوەیەک توێژەران کەتوونە ڕاجیاییەوە لە دیاریکردنی نوێنەری دەیڤید هیۆم، بۆیە هەندێک وتوویانە لەگەڵ «کلیانش»ە، هەندێکی دیکە وتوویانە نەخێر لەگەڵ «فیلۆن»، هەندێکی دیکە وتوویانە نەخێر لەگەڵ هەردووکانە[1]. بەڵام ئەوەی دەردەکەوێت ئەوەیە کە زیاتر لەگەڵ «فیلۆن»ە، چونکە لەگەڵ بنەما فەلسەفی و مەعریفیەکانیدا دەگونجێت، لەبەرئەوەی زۆرجار دەڤید هیۆم خۆی بە «گومانگەرا» (شاک) وەسف دەکات.[2]

ئەم کتێبە بووە بە یەکێک لە گرینگترین و پشتپێبەستراوترین کتێب لەلای تەوژم و ڕێبازی ئیلحاد و ناباوەڕی، ئەو گومان و ڕەخنانەی لەوێدا خراونەڕوو بەشێوەیەکی یەکجار زۆر بڵاوبوونەوە.

لە میانەی ڕیبازە ئەزموونی و تەجریبی و گومانەراییەکەی دەیڤید هیۆم گومانی لەسەر هەموو ئەو بەڵگانە دروستکرد کە دەکرێنە بەڵگە لەسەر بوونی خودا، حوکمی لەسەر هەمووياندا بە شتی بەتاڵ و پووچ و بێبنەما، چونکە پێی وابوو هەموويان لەسەر بنەمای هۆکاری (العلية) و سەربەخۆبوونی بوونی خودا لەوەی زیهن و مێشک پێی هەڵدەستی دامەزراون.

ئێمە کاتێک کاتژمێر دەکەینە بەڵگەی بوونی کاتژمێر دروستکەر، کاتژمێر دروستکەرمان بینیوە کە کاتژمێر دروستدەکات، کاتێکیش لە بوونی خانووەوە بەڵگە دەهێنینەوە لەسەر بوونی وەستا، وەستامان بینیوە کە خانوو دروست دەکات و هەموو پێداویستیەکان ڕێک دەخات و وێکدەخات، بەڵام لە بابەتی

---

(١) محاورات فی الدين الطبيعی، ل٦. وديفيد هيوم، زکی نجيب محمود، ل١٦٤، وتاريخ الفلسة، فريديک کوبلستون، ب٥، ل٣٨٩. ودراسات فی الفسفة الحديثة والمعاصرة، محمد عبد الحفيظ، ل٧٩.

(٢) شخصيات ومذاهب فلسفية، عثمان أمين، ل١٣١.

بوونی گەردووندا کەسمان هیچ یەکێک لە بەش و پێکهێنەرەکانی گەردوونی نەبینیوە تاوەکوو حوکم و بڕیار بدات کە چۆن و کێ دروستیکردووە، کەواتە ناکرێت بوونی گەردوون و سیستمەکانی بکەینە بەڵگە لەسەر بوونی خودا، هیچ مەعقول و لۆژیکیش نییە قیاس و بەراوردی سیستم و ڕیکسازی گەردوون بکەینە سەر خانوو و کاتژمێر، چونکە ئێمە نە هۆکاری بوونی خودامان بینیوە، نە ڕێگە و ڕێکاری دروستکردنەکەی بۆ گەردوون!

هەربۆیە دەیڤید هیۆم لەسەر زمانی «فیلۆن» لەگەڵ «کلیانش» دەدوێت کە بە سیستم و ڕێکسازی گەردوون بەڵگە لەسەر بوونی خودا دەهێنێتەوە، لەم گفتوگۆیەدا ئەمە بەڕوونی دەردەخات:[١]

هەڵوێستیشی دەربارەی ئایینەکان هەر لە میتۆدە گومانگەراییەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە، هەربۆیە پێیوایە ئایینەکان لەلای مرۆڤەکان لە تێڕامانی فەلسەفی یان پێویستی عەقڵییەوە سەرچاوەیان نەگرتووە، بەڵکوو لە ئەنجامی خورافە و ئەفسانە و خەیاڵەوە سەرچاوەیان گرتووە، مرۆڤە سەرەتاییەکان لە ڕۆحە نەبینراوەکانەوە بیرۆکەی خودا و خواوەندەکانیان بۆ دروست بوو، ئەمەش بۆ ئەوە بوو پێداویستییەکانیان پڕببێتەوە، دوایی وایان دانا ئەم ڕۆحە لەم ڕۆحە گرینگتر و گەورەترە، یان ....، بەم شێوەیە خواوەندەکان جۆراوجۆر و جیاواز بوون، چونکە ئەرک و کارەکانیشیان جۆراوجۆر و جیاواز بوون، بۆیە ئەو پێی وابوو بنەڕەت و بنەما و ئەسڵ لە ئایینەکاندا بریتییە لە شیرک و چەندییەتی و هابەشدانان نەک تەوحید و یەکتاپەرستی و تاک پەرستی.[٢]

---

(١) محاورات فی الدین الطبیعی، هیوم، ل٤٥ _ ٤٨. وتكوين العقل الحديث، جون هرمان، ب١، ل٤٥٨. والله فی الفلسفة الحديثة، جيمس كولينز، ل١٧٠. وتاريخ الفلسفة الحديثة، فردريک كوبلستون، ب٥، ل٣٨٧ _ ٣٩١.

(٢) تاريخ الفلسفة الحديثة، وليم كلی رايت، ل٢٢٣. والموجز فی تاريخ الفلسفة، لجنة من الأساتذة السوفيات، ل١٧٨.

لەسەر زمانی «فیلۆن»ەوە پێیوایە ئایینەکان سەرچاوەی خورافە و خراپەکانن.[١]

سەبارەت بە پێغەمبەرایەتی و وەحییەوە، هەڵوێستی دەیڤید هیۆم بریتییە لە ئینکار و نکوڵیکردن و جەنگی لە دژ ڕاگەیاندووە. هەروەها چەندان گومانیشی لەبارەیانەوە وروژاندووە، هەربۆیە نووسینێکی تایبەتی نووسی لەبارەی موعجیزەوە بەناوی: «وتارێک دەربارەی موعجیزەکان»، لەوێدا هەرچی موعجیزەی پێغەمبەران هەیە نکووڵیان لێ دەکات، پێی وایە دانان بە ڕوودانی موعجیزە باوەڕێکە کە لەسەر هیچ بنەمایەکی ڕاست و دروست دانەمەزراوە، چونکە: یەکەم: ئەزموون سەلماندوویەتی کە گەردوون لەسەر سیستەمێکی بەدوای یەکداهاتووی دیاریکراو دەڕوات، کەواتە بەڕاستدانانی بەردەوامبوونی ئەم سیستەمە زۆر ئاسانتر و نزیکترە لە تێکچوونی و لادان لەم سیستەمە. دووەم: موعجیزەیەکت دەستناکەوێت کەسانێکی متمانەپێکراو گێڕابیانەوە کە لە پلەیەکی عەقڵی بەرز و پێگەیەکی بەرزدابن لە ڕووی پەروەردەیی و ... . سێیەم: مرۆڤ بە سروشتی خۆی مەیلی بەلای شتی سەیروسەمەرە و سەرسوڕهێنەر دەچێت، هەربۆیە زوو باوەڕیان پێدەکات و قبووڵیان دەکات[٢].

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەیڤید هیۆم نکووڵی لە مومکینبوونی موعجیزە ناکات، چونکە مومکینبوونی موعجیزە بەرەنجامی ڕێبازەکەی خۆیەتی کە نکووڵی لە بەدوای یەکداهاتنی هۆکاری (التتباع السببی) لەنێوان شتەکان و ڕووداوەکاندا دەکات، کەواتە مادام شتەکان بە سیستەمێکی دیاریکراو بەدوای یەکدا نایەن ،دروستە هەر شتێکی نائاسایی لە سروشتدا ڕووبدات.[٣]

---

(١) محاورات فی الدین الطبیعی، دیفید هیوم، ل١٤٩.

(٢) دیفید هیوم، زکی نجیب محمود، ل١٦٦ _ ١٧٠. وتاریخ الفلسفة الحدیثة، ولیم کلی رایت، ل٢١٧. ومدخل الی الفلسفة، هرمان راندال، ل١٩٢. ومدخل إالی الفلسفة، جون لویس، ل١١٥. والالحاد فی الغرب، رمسیس عوض، ل١٢٦ _ ١٢٨.

(٣) قصة الفسفة الحدیثة، زکی نجیب محمود، ل٢٤٥.

دەیڤید هیۆم گاڵتە بە کتێبە ئایینیەکان دەکات، قسەیەکی بەناوبانگی هەیە: "ئەگەر هەر کتێبێک لە کتێبەکان لاهووت یان مێتافیزیکی قوتابخانەیی بەدەستەوە بگرین و بڵێین: ئەمانە هیچ شتێکی ئەزموونی و تەجریبی دەربارەی چەندییەتی و ژمارەیان تێدایە؟ نەخێر، یان هیچ شتێکی دەربارەی ڕووداوەکانی بوون تێدایە؟ نەخێر، کەواتە فڕێیدە ناو ئاگر، چونکە هیچیان تێدا نییە غەیری سەفسەتە و و وەهم و خەیاڵات!"[١].[٢]

## سپنسەر (١٨٢٠ _ ١٩٠٣ ز)

سپنسەر زانایەکی و دەروونی و کۆمەڵناسی بووە، هاوسەردەم و هاوڕێ و هاودیدی داروین بووە، پشتگیرییەکی زۆری لە بیردۆزی پەرەسەندن کرد و زۆر جەختی لێدەکردەوە، هەتا وای لێهات بە «پێغەمبەری پەرەسەندن» ناویدەکرد، بەڵام ئەو پەرەسەندنی تەنیا لەبواری بایۆلۆژی نەهێشتەوە، بەڵکوو گشتاندی بەسەر هەموو دیاردە سروشتییەکان، لەکاتێکدا لە پێش ئەودا تەنیا کورتهەڵاتبوو لە بواری بایۆلۆژی.[٣]

سپنسەر لە میتۆدی مەعریفیدا کەسێکی «نازانمگەرا» (لا أدری) بوو، پێی وابوو مرۆڤ تەنیا ڕووکەشی شتەکان دەبینێت، هەربۆیە لەژێر ڕۆشنایی ئەم میتۆدەیدا هێرشی زۆر توندی دەکردە سەر ئایینەکان و شوێنکەوتووانی، لە

---

(١) مبحث فى الفاهمة البشرية، هيوم، ل٢٢١. وتكوين العقل الحديث، جون هرمان، ب١، ل٣٠٢. والفكر المادى الحديث، محمود عثمان، ل١٣٨ _ ١٤٠. وعقائد المفكرين فى القرن العشرين، عباس العقاد، وموسوعة الفلسفة، عبد الرحمن بدوى، ب١، ل٤٧٤.

(٢) بۆ هەموو بابەتەکەبگەڕێوەبۆ: ظاهرة نقد الدين في الفكر الغربي الحديث، د. سلطان عبد الرحمن العميري، ل٢١٦ _ ٢١٩.

(٣) تاريخ الفلسفة الحديثة، وليم كلى رايت، ل٤٣٦. والموسوعة الفلسفية المختصرة، ل٢٤٧. والموسوعة الفلسفية، لجنة من علماء السوفيات، ل٢٤٧.

هەمان کاتیشدا ڕەخنەی زۆری لە ئاڕاستە و تەوژمی ئیلحادی یەقینی دەگرت. ئەوانەی بڕیاری یەکلاکەرەوە و کۆتاییان دابوو کە خودا بوونی نییە، ئەمەشی دووبارە بەرەنجامی میتۆدە گومانگەرایەکەی بوو، چونکە ئەو پێی وابوو ئێمە ناتوانین بوون یان نەبوونی خودا بسەلمێنین، بۆیە دەبێت بڵێین نازانین خودا هەیە یان نا، واتە حوکمی یەقینی و یەکلاکەرەوە نییە.[1][2]

### بەرتراند ڕاسل (١٨٧٢ _ ١٩٧٠ ز)

بەرتراند ڕاسل یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسووفە گومانگەراکان، ناوبانگەکەی هەموو خۆرئاوای داگیرکرد، وەک هەندێک لە توێژەران دەڵێن: "بەرتراند ڕاسل پێگەیەکی گەورەی لە لێکۆڵینەوە و گرینگیدانی فەلسەفی ئینگلیزی هەبووە، لە ناو فەلسەفەی ئینگلیزیدا لە هەموویان دیارترە، لە هەمووشیان زیاتر کێشە و گفتووگۆ و دەمەتەقێی فەلسەفی هێناوەتە کایەوە. هەروەها بەهێزترین وێتەبێژی ڕۆحی فەلسەفی بووە لە جیهانی ئینگلیزی لەم سەردەمەدا، تاکە بیرمەندی ئینگلیزییە لەم سەردەمەدا کە ناوبانگێکی نێودەوڵەتی هەیە، تاکە کەسە کە ناسراوە لە هەموو شار و وڵاتەکان"[3]

گومانەکانی و ڕەخنەکانی بەرتراند ڕاسل بەشێوەیەکی یەکجار فراوان بوون بە بنەما و پشت پێبەستراو لەلای تەوژمی ئیلحادی، لەدوای ئەوەی وتارەکەی «پەرستشی مرۆڤی ئازاد» بڵاوکردەوە، بیروڕا و بۆچوونەکانی دەربارەی ئایین

---

(١) تاريخ الفلسفة الحديثة، وليم كلي رايت، ل ٤٣٩ _ ٤٥٥. الموسوعة الفلسفية المختصرة، ل٢٤٧. والموجز فى تاريخ الاديان، جماعةمن علماء الأساتذة السوفيات، ل٥٠٦.

(٢) بۆ هەموو بابەتەکەبگەڕێوەبۆ: ظاهرة نقد الدين في الفكر الغربي الحديث، د. سلطان عبد الرحمن العميري، ل٢٢٠ _ ٢٢١.

(٣) الفلسفة الانجليزية فى مائة عام، رودلف متس، ب٢، ل١٦٣.

زۆرترین ئاماژەی پێدەکرا لە سەدەی بیستدا.[١]

بەرتراند ڕاسل گرینگیەکی یەکجار زۆری دەدا بە بابەتە ئایینیەکان، لە زۆر شوێن و لە زۆرێک لە نووسینەکانەکانیدا هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی دەدا، بەخۆی دەوت «گومانگەرا» (لا أدري)[٢]، هەروەها دەیوت: «من پێموا نییە خودای مەسیحییەت ئەگەری بوونی زیاتر بێت لە خوداکانی «ئۆلامپ»_ خواوەندەکانی یۆنان.[٣]

بەرتراند ڕاسل لە سێ بابەتی سەرەکی و گرینگی دەکۆڵییەوە: »خودا، نەمری (خلود)، ئازادی و ویست و ئیرادە»، لە کۆتاییدا گەیشتە ئەوەی هیچ هۆکارێکی بەجێ نییە بۆ بڕواهێنان بەم سێیانە.[٤]

بەرتراند ڕاسل دەربارەی قۆناغە فکرییەکانی دەڵێت: "من ئەوەی پەیوەستە بە ئایینەوە گەیشتم بەوەی کە یەکەم شت بڕوام بە ئازادیی ویست و ئیرادە نەمێنێت، پاشان بڕوام بە ڕۆحیش نەمێنێت، لە کۆتاییدا بە خوداش."[٥]

دەربارەی بوونی خودا و دروستکەر دەڵێت: "تایبەت بە بابەتی بوونی خودا، بەڵگەی زۆر و جۆراجۆر خراونەتەڕوو، بەڵام من بڕوام وایە کە هیچیان هیچ بایەخێکیان نییە، هیچ کەسێکیش ئەگەر لە ناچاری نەبێت قبووڵیان ناکات."[٦]

بەرتراند ڕاسل نموونەیەک دەهێنێتەوە لەسەر گومانگەراییەکەی لە بوونی خودا، دەڵێت: "هیچ کەسێک ناتوانێت بیسەلمێنێت لەنێوان زەوی و مەریخدا

---

(١) مختارات من أفضل ما كتب برتراند رسل، ل٣٣.

(٢) مختارات من أفضل ما كتب برتراند رسل، ل٥١.

(٣) حوارات مع برتراند رسل، ل٢٥.

(٤) حوارات مع برتراند رسل، ل٢٣

(٥) فلسفتي كيف تطورت، برتراد رسل، ل٣.

(٦) حوارات مع برتراند رسل، ل٢٤.

قۆرییەکی چا نییە و کە لە خولگەیەک دەسووڕێتەوە، بەمەرجێک قۆریەکە ئەوەندە ورد بێت هیچ تەلیسکۆبێک نەیدۆزێتەوە، بەڵام کەسیش باوەڕ ناکات، من بڕوام وایە خودای مەسیحیەتیش بە هەمان پلەیەیە و ناتوانرێت بسەلمێنرێت."[١]

لە ساڵی (١٩٢٧ ز)دا بەرتراند ڕاسل سیمینارێکی پێشکەشکرد بە ناونیشانی «بۆ مەسیحی نیم؟!»، لەوێدا ئەو هۆکارانە باس دەکات کە وایلێکردووە باوەڕی بە خودا نەبێت و چەند ڕەخنە و گومانیش دەربارەی بەڵگەکانی بوونی خودا دەوروژێنێت.

بەرتراند ڕاسل بەڵگەی هۆکار و سەبەبیەت و هۆکاری یەکەم (المسبب الأول) باسدەکاتکە یەکێکە لە بەڵگە بەهێزەکانی بوونی خودا، بنەمای بەڵگەکە بریتییە لەوەی کە هەموو هۆکارێک هۆکردێکی هەیە، هەموو شتێک هۆکارێکی لەپشتەوەیە، بەرتراند ڕاسل ڕەخنە لەم بەڵگەیە دەگرێت و دەڵێت ئەگەر وابێت، دەبێت لەکۆتاییدا بڵێین خوداش پێویستیی بە هۆکارێک هەیە! پاشان باسی بەڵگەی سیستم و ڕیکسازی دەکات کە بنەماکەی بریتییە لەوەی کە ئەم سیستم و ڕێکسازییەی لە گەردووندا هەیە پێویستی بە سیستمدانەر و ڕێکساز هەیە، ئەو دەڵێت: سیستم و ڕیکسازی نییە لە گەردووندا، ئەوەی ئێمە پێیدەڵێین سیستم، تەنیا مواسەفاتگەلێکی مرۆییە و بەس.[٢]

ئا بەم شێوەیە مامەڵە دەکات لەگەڵ هەموو بەڵگەکانی بوونی خوا کە ئیمانداران دەیهێننەوە لەسەر بوونی خودا، بەردەوام ڕەخنە و گومان دەخاتەڕوو دەربارەیان، هەربۆیە ئەم گومان و ڕەخنانەی بەرتراند ڕاسل بوونە پشتپێبەستراوی مولحیدەکان لەدوای خۆی.

---

(١) مختارات من أفضل ما كتب برتراند رسل، ل٥١، ئەم کتێبەخودی بەرتراند ڕاسل پێشەکی بۆ نووسیوە.

(٢) مختارات من أفضل ما كتب برترانداا رسل، ل٤٠.

بەرتراند ڕاسل پێی وایە ئایینەکان لەسەر بناغە و بنامەیەکی بابەتی و عەقڵی دانەمەزراون، بەڵکوو بناغە و بنەڕەت و بنەماکەیان بریتییە لە لایەنێکی نەفسی و دەروونی و وەهمی و خورافی. ئایینەکان لەلای بەرتراند ڕاسل بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەسەر ترس لە سروشت دامەزراون، هەروەها لەسەر حەز و ویستی مرۆڤ بۆ کەسێک یان هێزێک کە یارمەتی بدات لەسەر ناخۆشی و زەحمەتیەکان، بەرتراند ڕاسل پێیوایە مرۆڤ خودا و ئایینی داهێناوە بۆئەوەی ئەم بۆشاییانەی بۆ پڕبکاتەوە، پاشان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە زانست یارمەتیمان دەدات کە ئەو ترسەی زاڵە و سەپێنراوە بەسەر مرۆڤدا بڕەوێتەوە، هەروەها فێرمان دەکات پەیوەست نەبین بە هاوکاری و یارمەتییەکی وەهمی و خورافی کە لە ئاسمانەوەیە.[1]

بەرتراند ڕاسل عەقیدە و بیروباوەڕ پێناسە دەکات و دەڵێت: "باوەڕێکی قووڵە بە شتێک کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە.[2]

بەرتراند ڕاسل بەردەوام دەبێت لە ڕەخنەی ئایین و دەڵێت: "پێموایە کۆی هەموو ڕووەکانی ئایین بە درێژایی مێژوو زیانبەخش بووە". لەدوای ئەوەی داندەنێت بە هەندێک سوودی ئایین، دەڵێت: "بەڵام سەرەنجامی ئایینەکان لە زۆربەی بارودۆخەکاندا نەرێنیە ...، پێموایە ئایین هۆکاری زۆربەی زیان و زەرەرەکانە."[3]

بەرتراند ڕاسل هەستکردنی مرۆڤ بە پێویستی ئایین بە ترسنۆکی و ترس لێکدەداتەوە، بۆیە دەڵێت: "ئەوانەی وا هەست دەکەن پێویستە لەسەریان

---

(١) حورات مع برتراند رسل، ل٢٧، ولماذا لست مسيحيا _ ضمن مجلة أنا أفكر _ العدد (٧)، ل٢٧. ومختارات من أفضل ما كتبه برتراند رسل، ل٣٣ _ ٤٥.

(٢) مختارات من أفضل ما كتب برتراند رسل، ل٣٦.

(٣) حورات مع برتراند رسل، ل٢٦، ولماذا لست مسيحيا _ ضمن مجلة أنا أفكر _ العدد (٧)، ل٢٧. ومختارات من أفضل ما كتبه برتراند رسل، ل٣٤ _ ٣٦ _ ٥٠).

ئایین یان عەقیدەیان هەبێت بۆئەوەی ڕووبەڕووی ژیان ببنەوە، ئەوانە تەنیا جۆرێک لە ترسنۆکی دەردەخەن."[١]

لە ژێر ڕۆشنایی میتۆدە گومانگەرایی و ماددییەکەی نکووڵی لە مانەوەی هەمیشەیی بوونی ڕۆح دەکات و دەڵێت: "دەزانم جەستە لێکهەڵدەوەشێت و شی دەبێتەوە و دەڕزێت، بۆیە بەهیچ شێوەیەک هیچ داواکارییەک نابینم بۆ بڕواهێنان بەوەی کە ڕۆح دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێت کاتێک جەستە شی دەبێتەوە و دەڕزێت.."[٢].[٣]

## ناباوەڕی (ئیلحاد) لە کوردستان

ناباوەڕی لە کوردستان مێژوویەکی کۆن و دوور و قووڵی نییە، بەڵکوو دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سییەکانی سەدەی بیست و سەرەتای چلەکان کاتێک مارکسییەت و شیوعییەت لە ساڵی (١٩٣٤ز) لە عێراق دامەزرا.

بۆیە هەر دوای ئەمە زۆری نەبرد ئەم فیکرە ماددییە مارکسییە شیوعییە پەڕییەوە بۆ کوردستان و بە بەهێزی و شکۆوە مابوویەوە و خەڵکی بەشانازییەوە باسی فکرەی مارکسییان دەکرد و بە تەوژمی ڕزگاری کوردی ناویان دەهێنا، بەوشێوەیەش مایەوە لەنێو بەشێک لە چینی سیاسی و ڕۆشنبیردا هەتاوەکوو کۆتایی ساڵانی هەشتاکان، بەڵام لە دوای ساڵانی نەوەد بانگەشەکاری دیار و بەهێز و سیاسی و حیزبی نەما، ئەوەی کە هەیە لە چوارچێوەی تاکە کەسی و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و هەندێک پەرتووک و بڵاوکراوەدایە.

---

(١) أفضل ما كتبه برتراند رسل، ل٥٠. وحوارات مع برتراند رسل، ل٣٠.

(٢) حوارات مع برتراند رسل، ل٣٣.

(٣) بۆ هەموو بابەتەکەبگەڕێوەبۆ: ظاهرة نقد الدين في الفكر الغربي الحديث، د. سلطان عبد الرحمن العميري، ل٢١ _ ٢٤.

جیا لەوەی لەو ساڵانەدا تا دەگاتە دوای داگیرکردنی عێراق، ناباوەڕی بە هەموو پەل و پۆ و لقەکانییەوە لەنێو نەتەوەی کورددا سست و لاواز و بێسەنگ بوو، کە بە دەگمەن خەڵکی ئەو باسەیان دەهێنایە پێشەوە و خەڵک زیاتر و توندتر دەستیان بە ئایینی ڕەسەنی باوک و باپیرانیان دەگرت، ئەوەش ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ئەو کاریگەرییە دەرەکی و نێوخۆییانەی کە کوردی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، لەوانە:

کاریگەریی حیزبە ئیسلامییەکان

نەمانی متمانەی خەڵک بەرانبەر بانگەشەکارانی مارکسییەت و لادینییەکان

شەڕی نێوخۆ و براکوژی کورد

ڕەنگە هۆکارێکی دیکە ئەوە بێت کە خەڵکی لەو سەردەمەی کوردستان لەنێو سانسۆرێکی (حسار) دەرەکی و حوکوومەتی عێراقیدا بوو، هەروەها سەرقاڵی ژیانی سادە و بەڕێوەبردنی باری سەختی ئابووری خۆی بوو، بەمەش کەمتر دەپرژایە سەر بابەتە فکرییە ئاڵۆزەکان و لێکدانەوەکان، بەڵکوو ئەو جیهانبینییە ڕوونەی کە پێشتر دەربارەی ناڕاستی فکرە ناباوەڕییەکە بۆی دروست بوو، بەسی بوو و زیاتر کاتی هەنگاونانی نەبوو. تەنانەت بۆ ئەوەشی وەڵامی چەواشەکارییە بێنێوەڕۆکەکانی فکرە مارکسییەکە بداتەوە.

ئەوەی کە ناکرێت لەبەرچاو نەگیرێت، کوردستانی دوای داگیرکردنی عێراقە لەلایەن ئەمەریکاوە، کە ئەگەر چی ئەمریکا پێش ئەوەی دەست بداتە جەنگەکە نییەتی خۆی بۆ خەڵک شیکردەوە و وتی کە بەدوای چەکی ئەتۆمی چەند خاڵێکی دیکەدا دەگەڕێت کە کێشەی بۆ ئاسایشی نێونەتەوەیی هەیە.

بەڵام جەنگە ئیلحادییەکە ڕاست ئەو کاتە دەستی پێکرد کە جەنگی عێراق کۆتایی پێ هات. ڕوویەکی دیکەی تازەی نەبینراوی جیهان بەڕووی کورددا

کرایەوە، خەڵکی زۆر بەپەلە و وازیان لەوشتانە دەهێنا کە بووبوونە قەید و بەند و کەلتور، بەمەش دەرگایەکی نوێ بە ڕووی تەوژمی ئیلحاددا کرایەوە و هەموو کەس بە ڕاست و ناڕاست دەیتوانی هەموو ئەو بیروڕایانەی باوەڕی پێی هەیە و باوەڕی پێی نییە لە لای خۆی بڵاو بکاتەوە. دواتر دیسان بەهۆی کاریگەری تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان گوڕی شەپۆلەکە توندتر و بەهێزتر بوو کە هەتا ئەم ساڵانەی دواییش بەردەوام بوو.

## بنەما فیکرییەکانی ئیلحاد (ناباوەڕی)

١- نکووڵیکردن لە خودا، واتە ئەوانە بڕوایان بە دروستکار و بەڕێوەبەری گەردوون نییە، دەڵێن: بە هیچ شێوەیەک خودا گەردوونی دروست نەکردووە بەڵکوو گەردوون:

ا- هەر هەبووە.

ب- بۆ خۆی خۆی هێناوەتە بوون.

ج- بەڕێکەوت دروستبووە.

د- طەبیعەت و سروشت ئەم گەردوونەی هێناوەتە بوون.

هـ- ئەم گەردوونە خەون و خەیاڵە و لە واقیعدا بوونی نییە.

بێباوەڕەکان بەشێوەیەکی گشتی بڕوایان بە یەکێک لە مانە هەیە، کە دیارە هەر پێنجیان زۆر زۆر نازانستی و نائەقڵانین، هەر کەسێک ئەقڵی خۆی بخاتە کار، دەزانێت کە هیچیان ناتوانن مانای ڕاستەقینەی ئەو واقیعە بن کە ئێستا لەنێو گەردوون و ژیاندا بوونی هەیە، بەڵکوو دەگونجێت وەلامەکە حەقیقەتێکی دیکە بێت لە پشتیەوە.

٢- نکووڵی لە سەرجەم ئایین و پێغەمبەران و وەحی و ڕۆح و زیندووبوونەوە و پەرتووکە ئاسمانییەکان دەکەن، چونکە وەک ئاماژەمان پێدا، ئەوان بڕوایان بە خودا نییە. کەواتا ئاشکرایە باوەڕیان بە خودا نییە، تا بگاتە سەر لق و پەلەکانی باوەڕداری و ئایین و پەرتووکە ئاسمانییەکان.

بەڵکوو پێیان وایە ئایین و پێغەمبەران شتێکی خوڕافی و ناڕاستە، بۆ خەڵکی ساویلکە و نەزانە و تەنیا بۆ خەڵەتاندنی مرۆڤ و مرۆڤایەتی هاتووە. نەک هەر ئەوەش، بەڵکوو ئایین بە سەرچاوەی گێلکردنی مرۆڤایەتی دەزانن، وەک مارکس دەڵێت: (الدين أفيون الشعوب)، واتا: "ئایین تریاکی گەلانە و بۆ سەرخۆشکردن و مەستکردنی نەتەوەکان و مرۆڤ و مرۆڤایەتی دروستکراوە"، دیارە پێناسەکەیان لە تێڕوانینیان لە ئایینی مەسیحییەت و ئینجیل و قەشە و کڵێساوە سەرچاوەی گرتووە و دواتریش ئەو جیهانبینییەیان بەسەر سەرجەم ئایینەکاندا گشتاندووە.

ئەوەی زۆر ئاشکرایە ئەوەیە کە بەڵێ لە هەندێک لێکدانەوەی ڕووکاردا ئیسلام و مەسیحییەت لە یەک گۆشە نیگاوە دەڕواننە ژیان و گەردوون و لێکدانەوەی خەڵکیش بۆ هەردووکیان هاوتایە، بەڵام ئەوە ڕوونە و بەڵگەنەویستە کە لە بواری فکر و یاسا و هەڵوێستی مرۆڤ بەرانبەر ژیان و گەردوون و دەوروبەر لەنێوان ئیسلام و مەسیحیدا قیاسی کەشکە لەسەر مەشک (القياس مع الفارق)، کە ناکرێت بەشێوەیەکی گشتی مامەڵە و تێڕوانینی مەسیحی لە هیچ سەودا و تێفکرینێکدا یەکسان بکرێت لەگەڵ ئیسلام.

٣- ناباوەڕان پێیان وایە ڕەوشت نیسبی و ڕێژەییە و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت، بەمەش هەر کەس لە ئاست خۆی و کۆمەڵگەکەی بۆ ڕەوشت دەڕوانێت. کەواتە نەگۆڕیی ڕەوشتی و بنەمای

ڕەوشتی لای ئەوان نییە.[1] ئەمەش کاریگەری نێگەتیڤ و سەر لێ تێکدەری بۆ زۆربەی کۆمەڵگەکان پێشنیار کردووە، خۆ ئەگەر هات و ئەوەی بێباوەڕان پێیان ئاس ایییە و بۆ خۆیان بە ڕەوای دەبینن بوو بە یاسا و لە وڵاتان جێبەجێ بوو، ئەوە کارەساتی مرۆیی ڕوودەدات و دەبێتە کاری سەرپێیی و هیچ بەهایەک بۆ هیچ هەبوویەک لەنێو هیچ کۆمەڵگەیەکدا نامێنێتەوە. ئەوەتا ئەوان هیچ پێیان شەرم نییە کە مومارەسەی هەوا و ڕەگەز و ئارەزووی خۆیان لەگەڵ خوشک و دایک و کەسە نزیکەکانی خۆیان بکەن و گۆشتی مناڵ بکوڵێنن و لەگەڵ گیانداران دەست تێکەڵاو بکەن و ئەوەی بووە مایەی ئاسوودەییان دەستی بۆ بەرن، ئەگەر ئاسوودەیی ئەوان لەسەر شانی بەدبەختی چواردەوریش بێت.

«موحەممەد مزوغی»، بێباوەڕی عەرەب دەڵێت: "زەوی و ئەستێرەکان و ئاژەڵ و ڕووەک دروستکراوی دەستی سروشتن، بەڕێکەوت هاتوونەتە بوون و ئەقڵێک لە پشتیانەوە نییە. هیچ خودایەک و دروستکەرێک دەستیان نییە لە هێنانەبوونی گەردوون. تەنانەت یاسا مەدەنییەکان و بڕیارە سیاسییەکان هیچ پەیوەندییان نییە بە خوداوە، بەڵکوو پەیوەستن بە ئەزموونی مرۆڤ و لە ئەزموونەوە هاتوونەتە ئاراوە. بڕوابوون بە خودا لەگەڵ بووندا ناگونجێت و هاوتا نییە، بەڵکوو تەنیا داهێنانی دەستی مرۆڤە، پێکهێنەرەکانی هزری ناباوەڕی بەگشتی بریتین لە: نکووڵیکردن لە بوونی خودا، نکووڵیکردن لە چاودێری خودا، نکووڵیکردن لە دروستکردن لە نەبوونەوە، نکووڵیکردن لە خودی نەفس و زیندووبوونەوە."

دەتوانین لە وتەکانی موحەممەد مزوغییەوە جەوهەری ئیلحاد دەربهێنین و بەم شێوەیە بیخەینە ڕوو: گەردوون لە مادده و وزە و فیزیا و کیمیا پێکهاتووە

---

(١) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب المعاصرة، (٨٠٥)، صراع مع الملاحدة، عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني (١٥٠)، كواشف زيوف في المذاهب الفكرية المعاصرة (٥١١).

و جگە لەوەش هیچی دیکە بوونی نییە، هەروەها تەنیا بە ڕێکەوت گەردوون هاتووەتە بوون وهیچ ئامانجێک لە بوونی گەردوون و مرۆڤ بوونی نییە.

دیسانەوە پێمان دەڵێت کە ڕەوشت بوونێکی بابەتی نییە و بە گەشەکردنی کۆمەڵگە و بەرەوپێش چوونی، ڕەوشتیش گۆڕانی بەسەردا هاتووە و گەشەی کردووە، بۆیە مرۆڤ پێویست ناکات لە لێپرسینەوە بترسێت، چونکە هیچ لێپرسینەوەیەکی لەگەڵ ناکرێت و دنیاکەی دی بوونی نییە.

ئەوەی کە هەیە لەو پابەندییە کەلتورییەی بە ناوی ئایینەوە داڕێژراوە لە خودا و ئایین و وەحی و پەرتووکی ئاسمانی و لێپرسینەوە، هەمووی مرۆڤەکان دروستیان کردووە و لە حەقیقەتدا بوونیان نییە.

لە ڕاستیدا زۆرینەی هەرە زۆری بێباوەڕەکان باوەڕیان بە هەر بوویی ماددە هەیە، بەڵام هەیانە بەڕوونی گوزارشتی لێ دەکات، وەک «موحەممەد مزوغی»، کاتێک دەڵێت: مەبدەئی سەرەکی کە ئایینە تەوحیدییەکان لەسەری وەستاون بەدیهێنانە لە نەبوونەوە، فەیلەسووفەکان ئەمە ڕەت دەکەنەوە و وای دەبینین دەرچوونە لە بەدیهاتەکانی ئەقڵ.

بەڵام هەندێک لە ئاییندارەکان هەوڵی ئەوە دەدەن بەهانە بۆ ئەو باوەڕە بهێننەوە و مەنهەج و هۆکارەکانی فەیلەسووفەکانی بۆ بەکار بهێنن. بیرۆکەی خودای دروستکەر لە نەبوون بیرۆکەیەکی نافەلسەفییە، ئەگەر تەواو پێچەوانەی فەلسەفە نەبێت. هەشە بە پێچ و پەناوە دەریدەبڕێت، وەک ئەوانەی باوەڕیان بە فرە گەردوونی هەیە.

## جۆرەکانی ئیلحاد (ناباوەڕی) (أنواع الإلحاد)

لە سەردەمی تازەدا زاراوەکانی ناباوەڕی زۆر بوون و چەندین شێوە و شێوازیان هەیە، ئەمەش لەبەرئەوەیە ناباوەڕی ڕێڕەوێکی ئازادە و هەرکەس کە بووە ناباوەڕ ئیتر چی دەکات و چی دەخوات و گرنگی بە چی دەدات خۆی بەرپرسە، بە پێچەوانەی ئایینەکانەوە، زاراوەکانیش وەک:

**ناباوەڕیی خودازانی (ڕبوبی):** ئەوانەی دەچنە ژێر ئەم جۆرە ناباوەڕییەوە ئەو کەسانەن کە بە عەقڵیان بگەن بەوەی کەوا خولقێنەرێک هەیە، بەڵام شوێنی هیچ ئایینێک ناکەون، بەهۆی ئەوەی گومانی لە هەموو ئایینەکان هەیە و پێی وایە کە دروستکراوی دەستی مرۆڤن، «کەسی خوداناس» نەیتوانیوە وەڵامی پرسیارەکانی لەنێو ئایینەکاندا بدۆزێتەوە، یان هیچ ئایینێکی پێ نەگەیشتووە، بەڵام بە عەقڵ و خۆرسکییەکەی گەیشتووە بەوەی کە دەبێت بەدیهێنەر و دەسەڵاتدارێک هەبێت.

**ناباوەڕیی ڕەهایی و ناباوەڕیی ڕێژەیی:** ناباوەڕی ڕەهایی بریتییە لە نکۆڵی کردن لە بوونی خودا بەڕەهایی و بەبێ هیچ مەرج و بەندێک کە ڕێڕەوێکی دیکەی جیا لە ڕێڕەوە ئایینییەکان دەگرنە بەر لە فەلسەفە و فکر و زانست، بەڵام ناباوەڕی ڕێژەیی ڕێژەیەک باوەڕی بە خودایەتی خودا هەیە و بەڕەهایی نکۆڵی لە بوونی خودا ناکات.

**ناباوەڕیی زانستی:** ئەم جۆرە ئیلحادە پێی وایە هەر شتێک لە ڕێی دۆزینەوەی زانستییەوە نەزانرێت و دەرنەکەوێت، بڕوای پێ ناکرێت. هەر شتێکیش لە ڕێگەی تاقیگە و زانستە جیاوازەکان نەدۆزرێتەوە ، بوونی نییە. ئەم جۆرەیان زانستە جیاوازەکان لە: کیمیا و فیزیا و گەردووناسی و زیندەزانی بەکاردەهێنن بۆ ناباوەڕییەکەیان، هەروەها خودا دەخەنە بەر ئەو پێوەرە زانستییانە، بۆیە باوەڕی پێ ناهێنن. لای ئەوان یاسا گەردوونییەکان خودان، بۆیە «داوکینز»

ڕێبەری گەورەی بێباوەڕەکانی ئەم سەردەمە دەڵێت: "ئەگەر دەڵێن خودا بریتییە لەو سیستەمانەی ئەو بوونەوەرە بەڕێوەدەبات، ئەوا ئێمەش بڕوامان بەو خودایە هەیە، بەڵام پێمان وایە ئەو سیستەمانە پێویستیان بەوە نییە لێیان بپاڕێینەوە بۆ ئەوەی بە هانامانەوە بێن!"

**ناباوەڕیی نەرێنی و ناباوەڕیی ئەرێنی:** ناباوەڕی نەرێنی بریتییە لە نەبوونی هیچ بیروباوەڕێک وەکوو منداڵ. بەشێک لە بێباوەڕەکان پێیان وایە منداڵ بەبێ هیچ بیروباوەڕێک لە دایک دەبێت، بەڵام ناباوەڕی ئەرێنی دوای تێگەیشتن و پێگەیشتن هەژمار دەکرێت.

**ناباوەڕیی بەهێز و ناباوەڕیی لاواز:** وەکوو ناباوەڕی ئەرێنی و ئاشکرایە، نکۆڵی لە بوونی خودا دەکات وەکوو مەسەلەیەکی بڕاوە، بەڵگەش لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە. ناباوەڕی لاوازیش بە شێوەیەک دەژییێت وەکوو ئەوەی خودا بوونی نەبێت و بۆی گرنگ نییە خودا بوونی هەبێت یاخود نا، چونکە ئەو لەبەر حەز و خولیاکانییەتی ئەو شێوە لە ژیانی هەڵبژاردووە.[1]

**ناباوەڕیی فیکری (الإلحاد الفكري):** ئەم جۆرەیان کێشەکەی لە فیکریدایە و فیکری تێکچووە، وەک سۆفستائییەکان لە فەلسەفەی یۆنانیدا، کە گومانیان لە هەموو شتێک هەبوو بە خۆشیانەوە، حەتمەن گومانیان پەیدا دەبێت لە خودا و شتە پەنهان و غەیبییەکان کە پێیان دەوت «مێتافیزیک»، واتا: ئەودیو سروشت.

**ناباوەڕیی ئەقڵی (الإلحاد العقلي):** ئەم جۆرە ئیلحادە بەس ناوەکەی ئەقڵییە ئەگەرنا زۆر نائەقڵانییە، چونکە ئەم جۆرە دەڵێت: هەرچی ئەقڵ دەرکی پێ نەکات، نییە. کەواتە دەڵێن: خوداش ئەقڵ دەرکی پێ ناکات، چونکە پەنهان و غەیبییە، کەواتا نییە، کە دیارە ئەوە وەک پەرچەکردار (ڕەد فیعل) لە دژی

---

(١) پاکانەی هەبوون- موحەممەد صالح – ٢٠٢٠- نووسینگەی تەفسیر.

کەنیسە و پیاوانی ئایینی مەسیحییەت سەریهەڵدا، چونکە ئەوان دژی ئەقڵ و زانست و زانا و فەیلەسووف و بیرمەندان بوون، زۆر دژایەتییان دەکردن و ئازاریان دەدان، بۆیە ئەمانیش هاتن هەموو شتێکیان ڕەتکردەوە جگە لە ئەقڵ و زانست.

**ناباوەڕیی فەلسەفی (الإلحاد الفلسفی):** ئەم جۆرە ناباوەڕییە فەلسەفە بەکاردەهێنێت بە قوتابخانە جیاوازەکانییەوە، بۆیە دەبینین هەر لە کۆنەوە لە سەردەمی یۆنانەوە تاوەکوو ئەمڕۆش هەندێک فەیلەسووف هەبوون کە بڕوایان بە خودا نەبووە، بۆ نمونە: دیمۆکریتس، ئەپیکۆر، نیچە، مارکس،... هتد.

**ناباوەڕیی ئاشکرا (الإلحاد العلنی):** ئەم جۆرەیان واتا ئاشکرایە و خاوەنەکانیان بەئاشکرا بانگەشەی بۆ دەکەن و دەڵێن: بڕوامان بە خودا و... هتدنییە.

**ناباوەڕیی شاراوە (الإلحاد السری):** ئەم جۆرەیان نهێنییە و خاوەنەکانیان بانگەشەی بۆ ناکەن و دەریناخەن، جا لەبەر هەر هۆکارێک بێت.

**ناباوەڕیی ئارەزووبازی (إلحاد الشهوات):** ئەم جۆرەیان سەرچاوەکەی شەهوەت و ئارەزووبازییە، کە ئەم کەسە بۆ ئەوەی خۆی ئازادکات و لە چوارچێوەی دین و حەڵاڵ و حەرام بێتە دەرەوە، خۆی دەخاتە بازنەی ناباوەڕی و دەڵێت: باوەڕم بە خودا و ئایین نییە، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە هەموو بەربەستە ڕەوشتی و ئایینییەکان ببەزێنێت و شەهوەت و ئارەزووی خۆی تێر بکات بە هەموو ڕێگایەک.

بێباوەڕی ئارەزووباز ڕەنگە باوترینی باوی بێباوەڕ و ناباوەڕەکانی سەردەم بن، هۆکارەکەشی بۆ ئەو قەید و بەندە دەگەڕێتەوە کە ئایینەکان و خوداباوەڕی قەید و بەند بۆ مرۆڤەکان دادەنێت و ناهێڵێت بەئازادی ڕەها مامەڵە بکەن، تا هەر چی خۆیان پێیان خۆشبوو ئەنجامی بدەن، ئیتر ئەو پێخۆشبوونە ستەم بێت یان دادگەری، هێرش بێت بۆ سەر مافی خەڵکی یاخود نا!

بەمەش هاوڕێی بێباوەڕ ئۆقرەی دەبڕێت و دەست لەو قەید و کۆت و بەندانە بەردەدات و هیچ یاسایەکی دەرونی بەرۆکی ناگرێت و ویژدانی ئازار نادات.

ئیتر بەو هەنگاوەیان ڕزگاریان دەبێت لە دەستدرێژی چەندین مامەڵە و وا دەکات ئەوان غەریزە و ئارەزووەکانیان ڕێگایان بۆ خۆش بێت و دەستکراوە بن بۆ هەر چییەک کە پێیان دەکرێت و پێیان خۆشە. ئیتر ئەوان گرنگی پێنەدەر و ئازادن، ڕەنگە بەهانە بۆ باوەڕە ئیلحادییەکەشیان دەست بخەن و خۆیان بخەنە ژێر چەتری ناونیشانێکی دیکەی ناباوەڕی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان ئارەزوو و خواستەکەیان پاڵی پێوەناون هەتا بگەن بە کاروانی دەستەپاچەی ئیلحاد و خۆیان لە ئیمان هەڵاوێرن.

دەبێت بیرمان بێت کاتێک ئەیان دوێنین ئەوان بەکەمی دان بەوەدا دەنێن کە لە ژێر فشاری ئارەزوو و حەزەکانیان ئیلحادیان هەڵبژاردووە، بەڵکوو باسی ئەوە دەکەن کە باوەڕیان بە خودایەکی زاڵم نییە، باسی شەل و کوێر و نابینا و ئەو کەموکوڕییانە دەکەن (کێشەی شەڕ) کە لە چواردەوریان بوونی هەیە و ئەوان بە کەموکوڕی دەیبینن، ئیتر ڕەنگە باسی فەلسەفە و زانستیش بکەن هەتا دەگاتە ئەدەب و شارستانییەتی دەوڵەتان.

**ناباوەڕیی ڕۆحی:** بزووتنەوەی سەردەمی نوێ (حركة العصر الجديد) بریتییە لە تەبەنی کردنی فەلسەفەی وەثەنی، باتینی، ڕۆژهەڵاتی، یۆنانی و هەموو ڕەوت و گرووپە باتنییەکان و فەلسەفەی بێباوەڕی و ئیلحادی، کە باوەڕیان بە (وحدة الوجود) و هێزی گەردوونی هەیە و باوەڕیان بە خودا و پێغەمبەر و وەحی و ئایین و ڕەوشت نییە، دواتریش دێن ئەو فەلسەفە ئیلحادییە وەثەنییە جێبەجێ دەکەن و تێکەڵی دەکەن بە:

١- پەرەپێدانی مرۆیی و خود

٢- ڕێککردنی جەستە و لاشە و ڕجێم

٣- ئاسوودەیی و خۆشبەختی و بەختەوەری و ئازادی و... هتد

٤. یۆگا

هەروەک ئاماژەشمان پێدا لەبەر پابەند نەبوونی ناباوەڕان بە ڕێباز و ڕێگەیەکی دیاریکراو هەر کەسە و لە ئاستی خۆی دەکرێت ناوێک بۆ خۆی داتاشێت و بیەوێت بەو ناوە ئیلحادییە بانگی بکەن، زۆربەشیان هەوڵیان وایە کە نازناوە ئیلحادییەکەیان لەگەڵ زانست و فیزیا و پێشکەوتنی ئەمڕۆدا یەکانگیر بێت، وەک ئەوەی بێباوەڕەکان بەرگریکاری یەکەمی زانست بن و ئایین پاشکۆیەکی نارەسەن و نەویستراو بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ناوەکانیان بێنێوەڕۆکن و ناتوانن هیچ کاریگەرییەکی مانادار و بە بەهانە دروست بکەن، چونکە زانست باکی بە ئایین و ناباوەڕ نییە و خەریکی جۆرێکی دیکە لە مامەڵەیە لەگەڵ ماددەکان، نەک تەرکیز بخاتە سەر ڕووی ناباوەڕی و تەرازووی باوەڕ بنەوێنێت.

بۆیەش دەکرێت لە پەرتووک و سەرچاوەکان، چەندین جۆر و ناوی ئیلحادمان بەردەست و بەرچاو بکەوێت کە هەموویان لەنێو ئەو جۆرە گشتیانەدا جێگایان دەبێتەوە.

ئەوەتا بێباوەڕ و ناباوەڕان بۆ بەرگری کردن لە خۆیان دەیان بەهانە و سەرەلەقێ دەکەن و وا پیشان دەدەن ئیلحادەکەیان قایلکەرە و ئەوان بەڵگەیان هەیە بۆی:

١- مارکسییەکان دەڵێن: ئایین و خودا داهێنراوی سەرمایەدارەکانە بۆ چەوساندنەوەی چینی هەژار، بۆ ئەوەی بە ناوی ئایین و خوداوە بەکاریان بێنن و بیانچەوسێننەوە و لێیان بەهرەمەندبن.

٢- هەندێکی دیکە پێیان وایە خودا و ئایین بەرهەم و زادەی ترسن، دەڵێن: پێش هەزاران ساڵ لەمەوبەر مرۆڤ لە ترسی لافاو و بورکان و هەورە تریشقە و برووسک و گێژەڵوکە و باران و بومەلەرزە و ڕووداوەکانی دیکە کە مرۆڤ

دەسەڵاتی نەشکاوە بەسەریاندا پەنای بردووەتە بەر ئەودیو سروشت و خودا، بڕوایان وا بۆ دروست بووە کە خودایەک یان چەند خودایەک هەن و بتوانن ڕزگاری بکەن. واتا بەم پێیەش بێت، مرۆڤ خودا و ئایینی دروستکردووە.

٣- هەندێکی دیکە دەڵێن: خودا و ئایین لە ئەنجامی نەزانییەوە سەریان هەڵداوە، بۆ نموونە کاتێک مرۆڤ دیاردەیەکی سروشتی بینیوە، هەوڵیداوە هۆی پەیدابوونی بدۆزێتەوە، جا کاتێک نەیتوانیوە هۆکەی بدۆزێتەوە، پەنای بردووەتە بەر ئەودیو سروشت و هێزێکی دەرەکی، ئیتر خودا و ئایین بەم شێوەیە پەیدا بوون و هاتوونە نێو کۆمەڵگە و مرۆڤایەتییەوە.

٤- هەندێکی دیکە دەڵێن: خودا و ئایین بە پاڵنەری جنسی (سێکس) پەیدابوون، وەک فرۆید کە هەموو دیاردەکانی ژیانی مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ پاڵنەرە ئارەزووییەکانی مرۆڤ.

٥- هەندێکی دیکە دەڵێن: خودا و ئایین پیاوانی ئایینی و کاهینەکان دایانهێناوە، بۆ چەوساندنەوەی خەڵک و سوود وەرگرتن لێیان.

٦- بەشێکیان دەڵێن: خودا و ئایین لە ئەنجامی ئەوەوە پەیدا بوون کە مرۆڤە سەرەتاییەکان خۆیان پەیوەستکردووە بە ڕۆحی مردووەکانەوە، کاتێک هەندێکیان بینیون لە خەودا وایان زانیوە کە ئەو ڕۆحانە دەسەڵات و کاریگەرییان هەیە بەسەر ژیانی دنیادا، بۆیە هەوڵی ڕازیکردنیان داون بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لە زەرەر و زیانیان و لەپاشاندا هەندێک دروشمی دیاریکراویان داهێناوە. هەروەها قوربانیان بۆ کردوون، بە هیوای ئەوەی یارمەتیان بدەن و خۆشبەختیان بکەن و بیانپارێزن، بۆیە بەم پێیە ئایین سەرچاوەکەی بریتییە لە عیبادەتکردن بۆ پێشینان و مردووان.

٧- هەندێکی دیکە دەڵێن: خودا و ئایین دەستکردی کۆمەڵگەن، ئەوە کۆمەڵگەیە خودا و ئایینی دروستکردووە و کۆمەڵناسی فەرەنسی «دۆرکهایم» بە دامەزرێنەری ئەم بیردۆزە دادەنرێت.

٨- بەشێکیشیان ئەوە دەخەنە ڕوو کە ئایین و خودا مردوون[1] و هەموو ئەوەی ئەمڕۆ هەیە بەس زانستە و پێویستیمان بە هەبوونی خودا نییە[2]، دەشڵێن: هەموو ئەو پرسیارانەی هەمانە لە زانستی دەکەین نەک لە ئایین، ئەگەر ئەمڕۆش زانست وەڵامەکەی نەزانی، ئەوا بەدڵنیاییەوە لەگەڵ گەشەی مرۆڤایەتیدا سبەی وەڵامەکەمان وەردەگرینەوە لەنێو خودی زانستدا.

## مێژووی بزووتنەوەی سەردەمی نوێ

سەرەتاکانی ئەم بزووتنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتی و یۆنانی و گرووپە باطینییە کۆنەکان، بەڵام لە سەردەمی تازەدا بە شێوازێکی دیکە هاتنەوە مەیدان و لە شەستەکانی سەدەی بیستدا لە ئەمریکای باکوردا سەری هەڵدایەوە لەژێر ناوی پەیمانگای «ئیسالن» (Esalen)، ئەم پەیمانگایە کاری بڵاوکردنەوەی بیر و فکری ڕۆحانی بوو وەک جێگرەوەیەک بۆ ئایین، ئەو بڵاوکردنەوەیەشیان بۆ هەموو چینەکانی کۆمەڵگە بوو بە بەکارهێنانی ئامرازی جۆراوجۆر.

دواتر بزووتنەوەیەکی دیکە پەیدابوو بە ناوی «توانا مرۆییە شاراوەکان» (Human potential more ment) بە سەرۆکایەتی »کارلۆس کاستنیدا» (Carlos castneda) (١٩٢٥ - ١٩٩٨) لەگەڵ دامەزرێنەرەکانی پەیمانگای (Esalen) «ئیسالن»، ئەم بزووتنەوەیەش کارەکانی بریتیبوون لە هەمان کارەکانی پەیمانگای «ئیسالن» (Esalen).

لەپەیمانگای (Esalen) ئیسالن زیاتر لە (١٠٠٠٠) دە هەزار توێژینەوە کران بۆ ئەم مەبەستە، هەر بۆیە فکری باطینی ڕۆحانی بە شێوەیەکی بەرچاو پەرەی

---

(١) - قسەی نیتچەیە.

(٢) قسەی ستیڤن هاوکینگە.

سەند لە ڕۆژئاوادا، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێک:

١- ئەم بزووتنەوەیە هیچ ئیلتیزاماتێکی تەشریعی و ئایینی نییە.

٢- ڕەوشت نسبییە و چی پێت خۆشە بیکە.

٣- هەموو دەرگاکان بەسەر خەڵکدا دەکاتەوە بەبێ هیچ سنوورێکی ئایینی و ڕەوشتی و عورفی و کۆمەڵایەتی.

٤- مرۆڤ دەکات بە خوای خۆی و هیچ شتێک نامێنێتەوە لە سەرووی مرۆڤ.

بۆیە ئەم بزووتنەوەیە پێی وایە مرۆڤ خوای خۆیەتی و بە هیچ جۆرێک پێویستی بە خوای دیکە و ئایین نییە، بەڵکوو لەگەڵ سروشت و عەقڵ و توانا بێسنوورەکانی دەتوانێت ژیانی خۆی بنیات بنێت و دروستی بکات بەو شێوەیەی کە خۆی دەیەوێت بەبێ ڕەچاوکردنی پرەنسیپە ئایینی و ڕەوشتی و کلتوری و عورفی و کۆمەڵایەتییەکان.

★ لە کورتیدا (بزووتنەوەی سەردەمی نوێ): بریتییە لە چالاکییێکی دامەزراوەیی و سەردەمی کە کار لەسەر بونیاتنانی بیروباوەڕی باطینی و غنووسی و فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتی و یۆنانی و ناباوەڕی دەکات، تێڕوانینی بۆ بوون و گەردوون و ژیان و مرۆڤ و ڕەوشت و پەیوەندی لەنێوانیاندا بەپێی ئەمانەیە، هەروەها کاردەکەن بۆ بڵاوکردنەوەی فەلسەفەی باطینی و عیرفانیی ئیلحادی و شکاندنی سنووره ئایینی و ڕەوشتی و کۆمەڵایەتییەکان لەژێر ناوی تەندروستی، یۆگا، خۆشبەختی، ئارامی، بەختەوەری، ئەرێنیبوون و گەشەپێدانی خود و خشتەی خۆراکی (ڕێجیم) و ڕێک کردنی لاشە و مێدیتەیشن و ڕیلاکسەیشن و پەروەردەی دەروونی و ڕاهێنان.

**گرنگترین بنەما و بیروباوەڕەکانیان:**

١ـ مرۆڤ خوای خۆیەتی یان بەشێکە لە خوا یان خوا بەشێکە لەو.

٢ـ مرۆڤ خۆی واقیعی تایبەتی خۆی دروست دەکات، خۆی بیروباوەڕ و ڕەوشت و ڕەفتار و بەهاکانی خۆی دیاری دەکات دوور لە ئایین و ڕەوشت و کۆمەڵگە.

٣ـ بوون هەمووی یەک شتە، هەمووی خوایە و خواش هەموویەتی.

٤ـ مرۆڤ نامرێت، بەڵکوو ڕۆحەکەی دەچێتە نێو بوونێکی بەرزتر یان نزمتر لە خۆی بۆ پاداشت و سزا.

٥ـ ئینکاری کردنی خوایەکی خاوەن زات و سیفات و دەسەڵاتدار، کە شایانی پەرستن بێت، هەروەها نکۆڵی کردن لە هەموو پێغەمبەر و ئایین و بوونێکی جیاواز بەدەر لەمادە.

٦ـ ڕێژەییبوونی ڕەوشت، هەر کەس و کۆمەڵگەو شارێک دەتوانن جۆرێکی جیاواز لە ڕەوشتنامە بەکاربهێنن و لەسەری بڕۆن، یان دەکرێت هیچ شتێک بوونی نەبێت بە ناوی ڕەوشت، وەک بەرەی تازەی بزووتنەوەی ناباوەڕی نوێ نایشارنەوە و دانی پێدا دەنێن.

**ئامڕازەکانی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانیان:**

ئەوەی ڕوونە ئەوەیە کە ئەوان شەڕەنگێزییە مەترسیدارەکەیان بە ناوی ناسکی قەبە و تەڕ و ئاودارەوە بەستووەتەوە، هەتا ئەو کاتەی کە ئەو نێچیرانەی مەبەستیانە دەکەونە داویان، پاشان بابەتە ڕەوشتی و ئازادییەکان تەنانەت لەنێو کلتورە سەنگین و بە بەهاکانیشدا بەو ئاراستەیە دەجەڕێنن کە خۆیان بەرنامەڕێژییان بۆ کردووە و وا دەکەن کەسی پابەند و ناپابەند بە کەلتور و ئایین و ڕەوشت هەر زوو لەو قەید و بەندانە دابماڵن کە کەلتور و ئایین بۆیان دروست کردووە و پاش ماوەیەکیش کەسی تێوەگلا و هەموو ئەو کارانەی پێشتر بە قێزەونی دەزانی لای ئاسایی و سادە دەبێتەوە و تەواو کەسایەتی و

بیرکردنەوەکانی گۆڕاوە.

بۆ ئەوەش ئەوان لەژێر چەتری چەند ناو و ئامرازێکدا ئەو پەیامەی هەیانە دەیگەیەنن بە خەڵکی و بە کلتورە جیاوازەکان. لەوانە:

١- پەرەپێدانی خود

٢- ڕێککردنی جەستە و (ڕێجیم)

٣- دروشمەکانی بەختەوەری، ئاسوودەیی، ئازادی و خۆشبەختی، وەک: مێدیتەیشتن و ڕیلاکسەیشن و ئارامی.

٤. یۆگا[١]

## ناباوەڕی نوێ

چەمکێکە بۆ یەکەم جار «جیری ولف» لە ساڵی ٢٠٠٦، لە ڕۆژنامەی وایرد بەکاری هێنا، لە ژێر ناونیشانی کەنیسەی بێباوەڕەکان[٢]، ناباوەڕی نوێ لە دوای ڕووداوەکەی یانزەی سێپتەمبەرەوە دەست پێدەکات، دوای ئەوەی تاوەرە بازرگانییەکانی ئەمەریکا تەقێنرایەوە.

ئەمجۆرەی ناباوەڕی بە چەند سیفەتێک دەناسرێتەوە:

١ - پشتبەستن بە زانستی سروشتی و خۆبێنیازکردن لە خودا

٢ - بانگەشە کردن بۆ ژیان لەسەر ئەساسی زانستی سروشتی بە تەنها

٣ - ئیختیزالین، واتە مرۆڤ تەنها لە سروشتە ماددییەکەیدا قەتیس دەکات.

---

(١)- حركة العصر الجديد، د. فوز كردي. وەهەروەها: حركەالعصر الجديد مفهومها ونشأتها وتطبيقاتها، هيفاء بنت ناصر الرشيد.

(٢) ميليشيا الالحاد لاپەڕە ١٧

٤ - زمانێکی دوژمنکارانەیان هەیە بەرانبەر ئایینەکان، سەر ڕەمزەکانیان بە دژە ئایین و بێباوەڕ خۆیان دەناسێنن.

٥ - ئایین بە سەرچاوەی کوشتن و پەشێوی و وێرانکردنی جیهان دادەنێن.

٦ - ئایین بە مەترسی دادەنێن لەسەر کۆمەڵگا و نەوەی نوێ و دەڵێن: پێویستە منداڵ لە ئایین و پەروەردەی ئایینی بپارێزین.

٧ - وا گومان دەبەن کە فکری ناباوەڕی فکرێکی بەرزە و پێویستە بەرگری لێ بکەن و بە هەموو ڕێگەیەک دژایەتی ئاییندارى بکەن.

٨ - زمانێکی شەعبی بەکاردەهێنن کە جیاوازە لەو زمانە نوخبەییەی پێشتر ناوە دیارەکانی ناباوەڕی بەکاریان دەهێنا.

٩ - بێئاگایی سەرانی ناباوەڕی نوێ بە زانستە ئایینییەکان.

«سی جەی ویرلیمان» لەسەر چەمکی ئیلحادی نوی دەڵیت: "بێباوەڕە ئوسووڵییەکان هەوڵ دەدەن بۆ ڕێگرتن لە ئایین، ئەوان توندوتیژی دەبینن لە جیهاندا و دێن سەرزەنشتی ئایین دەکەن، هەروەها لەو بارەیە دەدوێن، چونکە بە چەندین ڕێگا لە وتە بەناوبانگەکەی «هیتشینز»یان خواردووەتەوە کە دەڵێت: ئایین هەموو شتێکی ژەهراوی کردووە. ئەو گوزارەیە لەسەر هەست و سۆز وەستاوە نەک ڕاستییەکان، ئەگەر بە گوزارشتێکی سادە ناباوەڕی نوێ بناسێنین، دەڵێین: ئەو باوەڕەیە کە ئایین بە بنەڕەتی هەموو یان زۆرینەی کێشەکانی جیهان دادەنێت، هەروەها ئایین بە بەربەست دادەنێن لەبەردەم یۆتۆبیای ڕۆژئاوایی و گەیشتنی مرۆڤایەتی بە کەماڵ. ئەم باوەڕە هەڵخەڵەتێنەرە بە بێگومان، بەهەرحاڵ ئیلحادی نوێ تەنها دەرچوون نییە لە بازنەی باوەڕ، بەڵکوو چوونە بەرەی دوژمنانی ئایینە."

«دان هارمون» لە جیاوازی کردن لەنێوان هەردوو ناباوەڕییەکە دەڵێت: "ناباوەڕی دەڵێت من باوەڕم بە خودا نییە، یان من خودام نییە. بەڵام ناباوەڕی

نوێ دەڵێت: تۆ خودات نییە. تەنها بەخۆیەوە ناوەستێت، بەڵکوو پەلاماری بەرانبەرەکەیشی دەدات."

«ویرلیمان» ئاماژە بەوە دەدات کە لە ئێستادا زیاتر لە ٢٠٠ کۆمەڵە و گرووپی ناباوەڕی بوونی هەیە، هەروەها دەڵێت: "کۆنگرەکانی ئەمڕۆی ناباوەڕی بازرگانییەکی گەورەیە، لە ساڵی ٢٠١٠ ژمارەی پێوانەییان شکاند کە تێیدا گەورەترین کۆبوونەوەی بێباوەڕان ئەنجامدرا کە ٢٥٠٠ کەس بەشدار بوون لە مولبورن بۆ گوێگرتن لە ڕیچارد دۆکینز، کە بە هەزاران دۆلاریان لەو کۆنگرانەدا دەستکەوتووە."

هەروەها دەڵێت: "ئەگەر تێبینی ئەو کۆبوونەوە و کۆنگرانە بکەیت، تێبینی چەند شتێک دەکەیت:

١ - زۆرینەی هەرە زۆریان سپیپێستن.

٢ - زۆرینەیان سەر بە چینی نێوەڕاست، یان نێوەڕاستی بەرزن.

٣ - زۆرینەیان لە ڕەگەزی نێرن.

ویرلیمان دەڵیت: "بەو پێیەی لە کۆنگرەکانیاندا بەشدار بووم و قسەم کردووە، شۆک بووم کاتێک هەمان ئەو کەسانەم بینیوەتەوە کە لە کۆنگرەکانی دیکەدا بینیومن، دەتوانم بە دڵنی ایییەوە بڵێم تێبینی ٢٤ کەسم کردووە کە بینیومن، لە کاتێکدا لە ئەمەریکا ١٠ - ١٥ ملیۆن بێباوەڕ هەیە." هەروەها دەڵێت: "بێباوەڕە نوێکان بازنەیەکی ئارامیان دروستکردووە کە لێی نایەنە دەرەوە، ئەوان گوێ لە هەمان کەسەکان دەگرن، تەماشای یەک جۆر ڤیدیۆ دەکەن لە یوتوب، یەک جۆر پەرتووک دەخوێننەوە، لە یەک بازنەدا دەسووڕێنەوە.

دەبێت بزانین کە ناباوەڕی کلاسیک، خاڵی نییە لە ڕوانینی سلبی بۆ ئایین و هەوڵیان بۆ کۆتایی هێنان بە ئایین، هەردوو ناباوەڕییەکە نزیکن لە

یەک، هێڵە گشتییەکانیان یەکە، بەڵام ئەوەی جیاوازە ئەوو میکانیزمانەیە کە دەیگرنەبەر، بە تایبەت ئەم بێباوەڕە نوێیانە هەوڵدەدەن بە هەموو شێوەیەک ناباوەڕی بڵاوبکەنەوە، هەر لە بەکارهێنانی کەناڵەکانی تەلەفیزیۆن و ئینتەرنێت و کۆبوونەوە و چاپکردنی پەرتووک و... هتد، هەتا دەگاتە نووسین لەسەر پشتی پاس و بڵاوکردنەوەی پەیامی ناباوەڕی یان نووسین لەسەر بلوس و دانانی لۆگۆی ئیلحاد لەسەر جلوبەرگ و کەرەستەکان، بە تایبەت «ڕیچارد دۆکینز» لەو بوارەدا زۆر بەجددی کاردەکات.

بۆیە دەبینین کە لە جادە و بانەکاندا بێباوەڕەکان تابلۆکانی ڕیکلام بەکرێ دەگرن و پەیامی ئیلحادی تێدا بڵاودەکەنەوە. لە بەریتانیا دۆکینز کرێی هەندێک پاسی دەدا کە لە سەریان نووسراوە: "ڕەنگە خودا نەبێت، واز لە دووڵی بێنە چێژ لە ژیانت وەربگرە"، دواتر ئەم بیرۆکەیە گوێزرایەوە بۆ ئەمەریکا و وڵاتانی دیکە.

جگە لەوە تابلۆی ڕیکلامی دیکە زۆر هەبوون، کە بە چەندین شێوە لەسەریان نووسراوە، وەک:

- هەموو ئایینەکان چیرۆکی ئەفسانەیین.

- باوەڕت بە خودا نییە؟ تۆ تەنیا نیت. باوەڕت بە خودا نییە؟ وەرە بۆ یانە.

- لە سەرەتا مرۆڤ خودای دروستکرد. ملیۆنان کەس باشن بەبێ خودا.

ئەمانە و دەیان وێنە و نووسراوی دیکەکە زۆریان خۆی لە سوخریە و گاڵتەپێکردندا دەبینێتەوە. ئەمە جگە لەو بلوسانەی بە هەمان شێوە لەسەریان نووسراوە و لۆگۆی ئیلحادیان لەسەرە. هەتا یەکێک لە گفتوگۆکانی دۆکینزم بینی بۆینباخەکەی وێنەی ئاژەڵی لەسەر بوو، وەک هێمایەک بۆ بیردۆزی

پەرەسەندن.[(١)(٢)]

---

(١) مرۆڤە بێویستەکان، ئاڤار جەبار، ناوەندی ڕێنوێن، ٢٠٢٠، ل ٢٥-٣٠. ئاڤار قەرەداغی

(٢) دەتوانین بەم جۆرەش ئیلحاد پۆلێن بکەین

جۆرەکانی ئیلحاد (أنواع لإلحاد)

١- ناباوەڕیی گشتی و هەمەکی (الإلحاد الكلي): ئەم جۆرە ناباوەڕییە نکووڵی لەخودا و وەحی و پێغەمبەرایەتی و زیندووبوونەوە و هەموو جۆرەئایینێک دەکات، بڕوای بەهیچ کامێک لەمانە نییە.

٢- ناباوەڕیی هەندەکی و جوزئی (الإلحاد الجزئي): ئەم جۆرە ناباوەڕییە نکووڵی لەهەموو شتێک ناکات، بۆ نموونە نکووڵی لە بوونی خودا ناکات یان دانی پێدا دەنێت، بەڵام وەک زاتێکی تەواو وەسفکراو بە هەموو سیفەتێکی تەواوەتی و گەورەیی و جوانی نا، بەڵکوو وەک هێزێکی دەرەکی، یان دانی پێدادەنێت بەڵام دەڵێت لەگەڵ گەردوون جیاوازییان نییە، دیارەئەمە بەپێناسە زاراوەییەکە پێی ناوترێت: ناباوەڕی، بەڵام لەژێر پێناسەزمانەوانییەکە جێی دەبێتەوە، چونکەئەم جۆرە بیروباوەڕانە هەموویان لە ڕێ ڕاستەکە لایانداوە.

٣- ناباوەڕیی فیکری (الإلحاد الفكري): ئەم جۆرەیان کێشەکەی لە فیکریدایەتی و فیکری تێکچووە، وەک سوفستائییەکان لە فەلسەفەی یۆنانیدا، کە گومانیان لەهەموو شتێک هەبوو بە خۆشیانەوە، کەوایە حەتمەن گومانیان پەیدا دەبێت لە خودا و شتە پەنهان و غەیبییەکان کەپێیان دەوت: «میتا فیزیقیا»، واتە: ئەودیو سروشت.

٤- ناباوەڕیی زانستی (الإلحاد العلمي): ئەم جۆرە ناباوەڕییە پێی وایەهەر شتێک لەڕێی دۆزینەوەی زانستییەوەنەزانرێت و دەرنەکەوێت بڕوای پێناکرێت، هەروەها هەر شتێک لە ڕێگەی تاقیگە و زانستەجیاوازەکان نەدۆزرێتەوە بوونی نییە، ئەم جۆرەیان زانستە جیاوازەکان لە: کیمیا و فیزیک و گەردوونناسی و زیندەزانی بەکاردەهێنن بۆ ناباوەڕییەکەیان، خوداش دەخەنە بەر ئەو پێوەرە زانستییانە، بۆیە باوەڕی پێناهێنن. لای ئەوان یاسا گەردوونییەکان خودان، بۆیە «داوکینز» ڕێبەری گەورەی ناباوەڕەکانی ئەم سەردەمە دەڵێت: "ئەگەر دەڵێن خودا بریتییە لەو سیستەمانەی ئەو بوونەوەرەبەڕێوەدەبات، ئەوا ئێمەش بڕوامان بەو خودایە هەیە، بەڵام پێمان وایەئەو سیستەمانە پێویستییان بەوە نییە لێیان بپاڕێینەوە بۆ ئەوەی بە هانامانەوە بێن!"

٥- ناباوەڕیی ئەقڵی (الإلحاد العقلي): ئەم جۆرە بەس ناوەکەی ئەقڵییە ئەگەرنا زۆر نائەقڵانییە، چونکە ئەم جۆرە دەڵێت: هەرچی ئەقڵ دەرکی پێ نەکات نییە، کەواتە دەڵێن: خوداش ئەقڵ دەرکی پێ ناکات، چونکە پەنهان و غەیبییە کەواتا نییە. دیارەئەوە وەک پەرچەکردار (ڕەد فیعل) لە دژی کەنیسە و پیاوانی ئایینی مەسیحییەت سەریهەڵدا، چونکەئەوان دژی ئەقڵ و زانست و زانا و فەیلەسووف و بیرمەندان بوون و زۆر دژایەتییان دەکردن و ئازاریان دەدان، بۆیە ئەمانیش هاتن هەموو شتێکیان ڕەتکردەوەجگە لە ئەقڵ و زانست.

٦- ناباوەڕیی دەروونی (الإلحاد النفسي): ئەم جۆرە، ئەقڵی و فیکری و زانستی و فەلسەفی نییە، بەڵکوو شتێکی دەروونییەو کەسەکەدەروونی تێکچووەو بەدوای وەسوەسە کەوتووە، وەک

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرمووێت: «شەیتان دێتە لای هەر یەکێک لە ئێوە و دەڵێت: کێ ئەوەی دروستکردووە؟ کێ ئەوەی دروستکردووە؟ تا دەڵێت: ئەی کێ خودای دروستکردووە؟ ئەگەر گەیشتنە ئەم حاڵەتە پەنا بگرن بە خودای گەورەو وازی لێ بێنن.»

٧- ناباوەڕیی تەقلیدی، شوێن کەوتوویی یان ئیلحادی نەزانین (الإلحاد التقليدي): ئەم جۆرەناباوەڕییەش نەفیکری و نەئەقڵی و نە زانستی و نە هیچ جۆریکی تریانە، بەڵکوو لەسەر بنەمای شوێنکەوتنی کوێرانەو نەزانین و بێزانستی دامەزراوە، کە کەسەکەهەر وا بەدوای کەوتووەبەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی پێ بێت و هیچ لەم بیروباوەڕەی خۆی بزانێت.

٨- ناباوەڕیی فەلسەفی (الإلحاد الفلسفي): ئەم جۆرەناباوەڕییە فەلسەفە بەکاردەهێنێت لەگەڵ قوتابخانەجیاوازەکانی، بۆیە دەبینین هەر لە کۆنەوە لە سەردەمی یۆنانەوە تاوەکوو ئەمڕۆ هەندێک فەیلەسووف هەبوون کە بڕوایان بە خودا نەبووە بۆ نموونە«دیمۆکریتس، ئەپیکۆر، نیچە، مارکس،... هتد.»

٩- ناباوەڕیی ئاشکرا (الإلحاد العلني): ئەم جۆرەیان ئاشکرایەو خاوەنەکانیان بەئاشکرا بانگەشەی بۆ دەکەن، دەڵێن: بڕوامان بەخودا و... هتد، نییە.

١٠- ناباوەڕیی شاراوە(الإلحاد السري): ئەم جۆرەیان نهێنییەو خاوەنەکانیان بانگەشەی بۆ ناکەن و دەری ناخەن، جا لەبەر هەر هۆکارێک بێت.

١١- ناباوەڕیی کۆمەڵایەتی (الإلحاد الاجتماعي): ئەم جۆرەیان لە باگراوندێکی کۆمەڵایەتییەوەهاتووە، واتاناباوەرییەکی ئەقڵی و زانستی و فەلسەفی نییە، بەڵکوو دەرهاویشتەیەکی کۆمەڵایەتییە، کەپێی وایە کۆمەڵگە دەبێت دوور بێت لەئایین و خودا ئەوجا پێشدەکەوێت، کە دیارە ئەمەش لەپەرچەکرداری (ڕەد فیعل)ی هەڵسوکەوتی کڵێسا و پیاوانی ئایینی مەسیحییەتەوەسەری هەڵداوە، بۆیە زۆر جار بێباوەڕەکانی خۆشمان دەڵێن: "هەتا کۆمەڵگە دانەڕنین لە ئایین، پێش ناکەوین. وەک ئەورووپا کەنەیانتوانی پێش بکەون هەتاوەکوو دەستبەرداری ئایین بوون." کە دیارەئەمەش قیاسی کەشکەلەسەر مەشک (قیاس مع الفارق)، چونکەخۆ ئیسلام نەدژی ئەقڵەو نەزانست و نەفیکر و نە زانا و نە بیرمەند، بەڵکوو هانی ئەمانە دەدات و زەمی کەسێک دەکات کە ئەقڵ بەکار ناهێنێت، هەروەک لە قورئاندا خودای گەورە زەمی کەسانێک دەکات و دەفەرمووێت: تێرانامێنن و بیرناکەنەوە.

١٢- ناباوەڕیی ئەنسرۆپۆلۆجی، مرۆڤناسی (الإلحاد الأنثروبولوجي): ئەنسرۆپۆلۆجی واتە: زانستی مرۆڤناسی، ئەو زانستەیە کە توێژینەوە لە مرۆڤ و هەڵسوکەوتی کۆمەڵگەو مرۆڤ و مرۆڤایەتی کۆن و تازەدەکات، ئەم جۆرە بێباوەڕی بەحیسابی خۆی کە توێژینەوەی کردووە، بۆی دەرکەوتووە کە ئایین بەرهەمی یەکێ لە مانەیە:

١- مارکسییەکان دەڵێن: ئایین و خودا داهێنراوی سەرمایەدارەکانە بۆ چەوساندنەوەی چینی هەژار، بۆ ئەوەی بە ناوی ئایین و خوداوە بەکاریان بێنن و بیانچەوسێننەوە و لێیان بەهرەمەند بن.

٢- هەندێکی دیکەدەڵێن: خودا و ئایین بەرهەم و زادەی ترسن، دەڵێن: پێش هەزاران ساڵ لەمەوبەر مرۆڤ لەترسی لافاو، بورکان، هەورەتریشقە، برووسک، گێژەڵوکە، باران، بومەلەرزە و ... هتد، پەنای بردووەتەبەر ئەودیو سرووشت و خودا، بڕوای وا بووە کەخودایەک یان

چەند خودایەک هەن کە بتوانن ڕزگاری بکەن، واتا بەم پێیەش بێت مرۆڤ خودا و ئایینی دروستکردووە.
٣- هەندێکی دیکەدەڵێن: خودا و ئایین لە ئەنجامی نەزانینیەوە سەریان هەڵداوە، بۆ نموونە کاتێک مرۆڤ دیاردەیەکی سروشتی بینیوە، هەوڵیداوەهۆی پەیدابوونی بدۆزێتەوە، جا کاتێک نەیتوانیوەهۆکەی بدۆزێتەوە، پەنای بردووەتە بەر ئەودیو سروشت و هێزێکی دەرەکی، ئیدی خودا و ئایین بەم شێوەیە پەیدابوون و هاتوونەنێو کۆمەڵگە و مرۆڤایەتییەوە.
٤- هەندێکی دیکەدەڵێن: خودا و ئایین بەپاڵنەری جنسی (سێکس) پەیدا بوون، وەک فرۆید کە هەموو دیاردەکانی ژیانی مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ جنس و ئارەزوو.
٥- هەندێکی دیکەدەڵێن: خودا و ئایین پیاوانی ئایینی و کاهینەکان دایان هێناوە، بۆ چەوساندوەی خەڵک و سوودوەرگرتن لێیان.
٦- هەندێکی دیکەدەڵێن: خودا و ئایین لەئەنجامی ئەوەوە پەیدا بوون، کە مرۆڤە سەرەتاییەکان خۆیان پەیوەست کردووە بە ڕۆحی مردووەکانەوە، کاتێک هەندێکیانیان بینیون لە خەودا وایان زانیوە کە ئەو ڕۆحانە دەسەڵات و کاریگەرییان هەیە بەسەر ژیانی دونیادا، بۆیەهەوڵی ڕازیکردنیان داون بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لە زەرەر و زیانیان و لەپاشاندا هەندێک دروشمی دیاریکراویان داهێناوەو قوربانییان بۆ کردوون، بەهیوای ئەوەی یارمەتییان بدەن و خۆشبەختیان بکەن و بیانپارێزن، بۆیە بەم پێیە ئایین سەرچاوەکەی بریتییە لەعیبادەت کردن بۆ پێشینان و مردووان.
٧- هەندێکی دیکەدەڵێن: خودا و ئایین دەستکردی کۆمەڵگەن، ئەوە کۆمەڵگەیە خودا و ئایینی دروستکردووە، کە کۆمەڵناسی فەرەنسی «دۆرکهایم» بە دامەزرێنەری ئەم بیردۆزەدادەنرێت.
١٣- ناباوەڕیی هەستەکی، هەستگەرا، (الإلحاد الحسي): ئەم جۆرەئیلحادە بڕوای بە هیچ شتێک نییە کە نەکەوێتە بەر پێنج هەستەکە، بۆ نموونەدەڵێن: ئێمە نە خودا دەبینین نە گوێمان لێیەتی نە بۆنی دەکەین نە تامی دەکەین نە بەدەست لێدانیش دەتوانین هەستی پێ بکەین، کەواتانییە. بەو پێیە بێت نابێت بڕوایان بە ئەقڵ و فیکر و خۆشەویستی و... هتد، بێت، چونکە ئەوانەش ناکەونەبەر پێنج هەستەکە.
١٤- ئیلحادی نەبوونی وێناکردن و تەصەوڕ (الحاد عدم التصور): ئەم جۆرەتەنها بەڵگەی لەسەر نەبوونی خودا وێنانەکردن (تەصەوڕنەکردن)ە، کە دەڵێن: ناتوانین وێنا (تەصەوڕ)ی خودا بکەین، یان ناتوانین تەصەوڕی خودایەک بکەین کە دروستکەری نەبێت، یان هەر هەبوو و ئەزەلی بێت، یان ناتوانم وێنای خودایەک بکەم زانستی بە هەموو شتێک هەبێت و ئاگای لە هەموو شتێک هەبێت.
١٥- ئیلحادی ئارەزووبازی (إلحاد الشهوات): ئەم جۆرە ئیلحادە سەرچاوەکەی شەهوەت و ئارەزووبازییە، کە ئەم کەسە بۆ ئەوەی خۆی ئازاد بکات و لە چوارچێوەی دین و حەڵاڵ و حەرام بێتەدەرەوە، خۆی دەخاتە بازنەی بێباوەڕی و دەڵێت: باوەڕم بەخودا و ئایین نییە، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوەهەموو بەربەستە ئەخلاقی و ئایینیەکان بەزێنێت و شەهوەت و ئارەزووی خۆی تێر بکات بەهەموو ڕێگایەک.
١٦- ناباوەڕیی تۆمەت بەخشینەوە (إلحاد الشبهات): ئەم جۆرەناباوەڕییە پشت بە تۆمەت

بەخشینەوە و گومان دروستکردن دەبەستێت، لەسەر خودا و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و قورئان و... هتد، زۆر جار کەسەکە بووە بە بێباوەڕ بەهۆی ئەم تۆمەتەبێبنەمایانەوە، کە دیارەبەدواداچوونی بۆ نەکردووەو لێکۆڵینەوەی بۆ نەکردووەو کوێرانە بەدوای کەوتووە.

١٧- ناباوەڕیی خودایەکی دیکە(إلحاد إلهآخر): ئەم جۆرەناباوەڕییە دەڵێت: من چوزانم ئەو خودایەی ئێوە باوەڕتان پێیەتی عیبادەتی بۆ دەکەن و خۆشتان دەوێت و دەڵێن کە ڕۆزیدەرە و شیفاهێنەو ... هتد خودایە؟ کێ ناڵێت خودایەکی دیکەئەم کارانەناکات یان چەند خودایەک ئەم کارانەناکەن بەیەکەوە؟

١٨- ناباوەڕیی خودایەکی ستەمکار (إلحاد الإله الظالم): ئەم جۆرەناباوەڕییە هەر لە کۆنەوەهەبووە، کە باسمان کرد کە «ئەپیکۆر» فەیلەسووفی یۆنانی هەندێک گومانی وروژاند لەسەر خودا و هەبوونی خراپە و شەڕ، ئەوان پێیان وایەکە ئەو هەموو نەهامەتی و ناخۆشی و نەخۆشی و تەنگوچەڵەمە و دیاردە سروشتییانەوەک بورکان و بومەلەرزەو سزادانی خەڵکی لە دۆزەخ نیشانەی خودایەکی ستەمکارن، دەڵێن: دیارەئەو خودایە زۆر ستەمکارە و زۆر بێبەزەییە،ئەگەرنا چۆن دەبێت ئەو شتانە ڕووبدەن لەژێر دەستەڵاتی خودادا؟!

هەروەها دەڵێن: نابێت خوداش ستەمکار بێت، کەواتا هەر لە بنەڕەتەوەخودا بوونی نییە.

١٩- ناباوەڕیی ناوبانگ (إلحاد الشهرة): ئەم کەسەی هەڵگری ئەم جۆرە ناباوەڕییەیە مەبەستی تەنها خۆدەرخستن و ناوبانگ و جیاواز بوونەلەنێو خەڵک، ئەگەرنا زۆر کات هیچ بەڵگەیەک ناخاتەڕوو لەسەر بیروڕاکانی و ناتوانێت بەرگرییان لێ بکات.

٢٠- ئیلحادی ئەدەبی (الإلحاد الأدبي): ئەم جۆرە ناباوەڕییە، بۆ سنووربەزاندن و چوونەدەرەوەیە لەهەموو کۆت و بەند و سنوورەڕەوشتی و ئایینییەکان و وروژاندنی غەریزەکان بەڕێگەی جیاواز، تا وای لێدێت هیچ پیرۆزییەک نامێنێت، تا دەگاتە ئەوەی نکووڵی لەبوونی خودا دەکەن و گومان دەخەنە سەری، ئەمەش لەڕێگەی هۆنراوەو پەخشان و ئەدەب، بۆیە لە کۆمەڵگەی خۆشمان هەندێک بەناو شاعیر دەبینین کەهیچ سنوورێکیان نەهێشتووەتەوە و ئیلحادەکەیان لە ڕێگەی ئەدەب و شیعر و پەخشان بڵاو دەکەنەوە، زۆر جاریش بەشێوەی خوازەیی (مجازی) و ناڕاستەوخۆ.

٢١- ناباوەڕیی نازانم (الإلحاد اللا أدري): هەڵگرانی ئەم جۆرەناتوانن بڕیاری بوونی خودا بدەن و ناشتوانن نەفی بکەن، دەڵێن: نە دەڵێین هەیە نەدەڵێین نییە، بەڵکوو دەڵێین: نازانین.

٢٢- ناباوەڕیی گرنگی پێنەدەر (الإلحاد اللا إكتراثي): ئەم جۆرە ئیلحادە پێی وایە بابەتی بوونی خودا یان نەبوونی خودا جێی گرنگی پێدان نییە، پێویست ناکات بڕوامان پێی بێت، چونکەهەر شتێک بەرهەست و سوودبەخش و بەرچاو نەبێت شایستەی گرنگی پێدان نییە.

٢٣- ناباوەڕیی بەرژەوەندیخواز (الإلحاد المصلحي): ئەم جۆرەئیلحادەمەبەستی سەرەتا و کۆتایی بەدەستهێنانی سوود و قازانجێکی دونیایی و بەرژەوەندییە، بۆ نموونە بەدەستهێنانی ڕەگەزنامەی وڵاتانی ئەوروپی یان کارکردن بۆ هێزێکی دیاریکرا و بە پارە یان ... هتد.

٢٤- ناباوەڕیی عاتیفی و هەڵچوو (الإلحاد العاطفي والانفعالي): ئەم جۆرە ناباوەڕییە لەسەر هیچ بنەمایەک دانەمەزراوە، بەڵکوو پاڵنەری عاتیفی یان تووڕەبوون و هەڵچوون لەکەسێکی دیندار یان زانایەک یان حیزبێکی ئیسلامی یان هەڵە تێگەیشتن لە دەقێک گەیشتووەبەوەی

نکوولّی لەهەموو شتێک بکات بەخوداشەوە.
٢٥- ئیلحادی گوماناوی (الإلحاد الشكي): هەڵگری ئەم جۆرەئیلحادە گومانی لە بوونی خودا هەیە، بۆیە زۆر جار دەڵێت: (٪٥٠) بڕوام بە خودا هەیە، زۆر جار دەڵێت: (٪٨٠) بڕوام پێیەتی، جاری واش هەیە دەڵێت: (٪٢٠) باوەڕم پێیەتی، بەڵام (٪٨٠) گومانم لەسەری هەیە.
٢٦- ناباوەڕیی دووڕوویی (الإلحاد النفاقي): هەڵگری ئەم جۆرەناباوەڕییە دووڕووەو خۆی بە مولحید پیشان نادات، بەڵکوو خۆی بەباوەڕدار پیشان دەدات، بەڵام لەناخیدا بێباوەڕە، ئیلحادەکەی شاردووەتەوە لەبەر بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی و سیاسی و... هتد.
٢٧- ناباوەڕیی کاتی (الإلحاد المؤقت): ئەوەش جۆرێکی دیکەیە کە کەسەکەماوەیەک دەبێتە بێباوەڕ و مولحید و سەرلێشێواو، بەڵام دواتر دێتەوەسەر باوەڕ و دەبێتەوە باوەڕدار، وەک «ئەنتۆنی فلۆ» فەیلەسووفی گەورەی بەریتانی کە لەسەرەتادا بێباوەڕ بوو دواتر سێ کتێبی لەسەر ناباوەڕیی نووسی و زیاتر لە (٥٠) ساڵ بێباوەڕ بوو وەبە ڕابەرێکی گەورەی بێباوەڕی دادەنرا لە ئەورووپا، بەڵام پاشان باوەڕی هێنا و بوو بەباوەڕدار و کتێبێکی نووسی بە ناوی «خودایەک هەیە» (There is a God)
٢٨- ناباوەڕیی گەڕاو بەدوای ڕاستیدا (الإلحاد الباحث عن الحق): هەڵگری ئەم جۆرەئیلحادەدەڵێن کە بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێن و هەتاوەکوو ئێستا نەگەیشتوون پێی، بۆیە هەندێکیان لەکۆتاییدا دەبنە باوەڕدار هەندێکیشیان بە بێباوەڕی سەر دەنێنەوە.
٢٩- ناباوەڕیی لەخودایەتیدا (الإلحاد في الإلهيات): ئەم جۆرە بریتییە لە لادان لەمەفهومی ڕاستی خودای گەورە، بە شێوەیەک کە کەسەکە یان یەکسانی دەکات بە گەردوون و دەڵێت کە خودا و گەردوون و سروشت یەک شتن، یان خودای گەورەدەچوێنێت بەیەکێک لە دروستکراوەکانی، یان خودای گەورە دەکات بەجیسم و جەستەی وەک مرۆڤی بۆ بڕیار دەدات، یان نەفی سیفاتەکانی خودا دەکاتْ و دەڵێت کە خودا زاتێکی ڕووت و موجەڕڕەدە، یان خودا وەسف دەکات بەهێزێک یان ڕۆحێک یان نوورێک، یان لە پاڵ خودادا چەند خودایەکی دیکەبڕیار دەدات وەک: خودای خێر و خودای شەڕ، خودای ڕووناکی و خودای تاریکی، خودای زەوی و خودای ئاسمان، خودای دونیا و خودای دواڕۆژ...
٣٠- ناباوەڕیی لە پێغەمبەرایەتیدا (الإلحاد في النبوات): ئەم جۆرەلە پێغەمبەرایەتیدا تێکەوتووەو لایداوە، یان ئەوەتا نەفی پێغەمبەرایەتی و پەیوەندی نێوان خودا و پێغەمبەر دەکات، یان پێی وایە پێغەمبەرایەتی شتێکە مرۆڤ بەهەوڵدان دەتوانێت پێی بگات و بەدەستی بهێنێت، واتا: (اکتسابی)یە، هەر ئەم لادانەیە«ئەبوبکری ڕازی و ئیبن ڕاوەندی و... هتد» پێی وەسفکراوەکە دیارە ئەمانەنەفی پێغەمبەرایەتییان کردووە و بڕوایان پێی نەبووە.
٣١- ناباوەڕیی لە شتە بیستراوەکان (الإلحاد في السمعيات): ئەم جۆرەبریتییەلە بڕوا نەبوون بەو شتانەی کە بە بیستن پێمان گەیشتوون و ئەقڵ دەرکیان ناکات و ناتوانێت بیان زانێت، وەک فریشتەکان و جینەکان و هەبوونی دۆزەخ و بەهەشت و... هتد.
٣٢- ناباوەڕیی لە ڕەوشت و ئاکاردا (الإلحاد في الأخلاق والسلوك): ئەم جۆرەهیچ بەهایەک بۆ ڕەوشت دانانێت، پێی وایەڕەوشت نسبیو ڕێژەییە و بەپێی کەس و شوێن و کات و بارودۆخ دەگۆڕێت و هیچ بنەما و ئەساسێکی نییە، ئەوەمرۆڤ و کۆمەڵگەیەڕەوشت دروستدەکەن

و سنووری بۆ دادەنێن، بۆیە زۆر پێیان ئاساییە لەهەموو بنەما ڕەوشتییەکان لابدەن و پەیوەست نەبن بە هیچ ئەخلاقێکەوە، چونکە پێیان وایەمرۆڤیش وەک زیندەوەرانی دیکەیەو دەتوانێت هەموو شتێک بکات بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی و بەدەستهێنانی سوود و قازانج و بەرژەوەندی.

٣٣- ناباوەڕیی لەشەریعەی ئیسلامی (الإلحاد في الشريعة الإسلامية): ئەم جۆرە بڕوای بە شەریعەی ئیسلامی و سەرچاوەکانی هەڵێنجانی شەریعەی ئیسلامی (أصول الفقه) و فیقهی ئیسلامی نییەو پێیان وایەشەریعەت بەعیبادات و موعامەلاتەوە هەمووی قابیلیەتی دەستکاریکردن و لابردن و زیادکردن و کەمکردنی هەیە، تەحریف و تەئویلی بێبنەما دەکەن بۆ دەقەکان و هیچ شتێک لایان قەطعی نییەهەموو شتێک قابیلیەتی تەئویل و دەستکاری و تەعدیل و زیادکردن و کەمکردنی هەیە، هەتا زۆرێکیان دەستیان بردووەبۆ نوێژ و حەج و زەکات و ڕۆژوو، تەئویلی پووچ و باطیل و لادەریان بۆ کردوون کە بە شێوەک هیچ پەیوەندی بەخودی ئەو شتانەوەنەمێنێت. هەروەها لە بابەتی موعامەلات و نیکاح و ئەوانەشدا بەتەواوەتی هەموو سنوورێکیان شکاندووەو بەزاندووە، بە شێوەیەک کە ڕیبا و نێربازی و... هتد، حەڵاڵ کردووە، هەروەها بڕوایان بە هیچ کام لەئەحکامەکانی دزی و زینا و کوشتن و بوختان و... هتد، نەماوەو تەئویلی پووچ و باطیلی بۆ دەکەن، لەبواری سیاسی و ئابووریشدا بڕوایان وایە کەئایین بەهیچ شێوەک بۆی نییەدەست بخاتەئەم بابەتانەوە. ئەوەی جێی داخەئەوەی کە باسمان کرد زۆر جار هەڵگرانی ئەم بیروڕایانەخۆیان بە موسڵمان دەزانن و بانگەشەی موسڵمانبوون دەکەن.

٣٤- ناباوەڕیی لەسوونەتی پێغەمبەر g (الإلحاد في السنة النبوية): ئەم جۆرەیان بریتییە لەنکوولّی و ئینکاری لە سوونەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بەتەواوی، بەهیچ شێوەیەک بڕوایان بەسوننە نییە و دەڵێن: قورئان سەرچاوەی سەرەکی و سەرەتا و کۆتاییە، کە دیارە لەم بانگەشەیاندا ڕاست ناکەن و زۆر شت لە قورئانیشدا ڕەتدەکەنەوە. کەواتائەوانەبڕوایان وایەکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) کاری بەس گەیاندنی قورئانەو بەس، بەهچ شێوەیەک بۆی نییە شتێک زیاد بکات لەسەر بڕیارەکانی قورئان، بەڵکوو کاری گەیاندنی قورئانە بەبێ کەم و زیاد، هەندێکی دیکەیان بۆیە بڕوایان بە سوننە نییە، چونکە دەڵێن: سوننەپارێزراو نییە و خودای گەورە بەڵێنی پاراستنی سوننەی نەداوەو سوننە یان فەوتاوە یان هەڵبەستراوە.

# چارەسەرەکانی ئیلحاد

چارەسەر بۆ ئیلحاد و هەموو هەموو تەوژم و ڕەوتە ئیلحادییەکان و هەموو لادانە فکرییەکان بریتییە لەمانە:

١- چاندن و بەهێزکردنی بیروباوەڕ (عەقیدە)یەکی ڕاست و دروست، پشت بەستوو بە قورئان و سوننەی صەحیح و بەڵگەی ئەقڵی و فیکری و زانستی، نەک عەقیدەیەکی وشک و سادە و ساکار کە بەرگەی گومانی بێباوەڕان نەگرێت، چونکە بەڕاستی ئێمە کێشەیەکمان هەیە ئەویش بریتییە لەوەی کە عەقیدە دەخوێنرێت، بەڵام کەم جار وایە پشت ئەستوور بێت بە بەڵگەی ئەقڵی و لۆژیکی و زانستی. زۆر جار هەندێک کەس حەساسییەتیان بە ئەقڵ هەیە، کە لە ڕاستیدا نابێت وا بێت، چونکە کە ئەوان دێنە مەیدان بانگەشەی فیکر و ئەقڵ و زانست دەکەن ئەگەر چی نە فیکر و نە ئەقڵ و نە زانست پشتگیرییان ناکات، دەی ئەوەش بانگەشەیەکی بێبنەمایە.

لە پاشاندا گشتاندنی ئەم جۆرە عەقیدەیە بە نێو ئاستە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا، بەتایبەت جیلی گەنجان، ئەمەش بە ڕێگای جیاواز جیاواز، بۆ نموونە لە ڕێگای دەرسی تاکەکەسی، دەرسی گشتی، موحازەڕات، بەرنامەی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنی، تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، بڵاوکراوە، گۆڤارو... هتد.

٢- بەهێزکردنی بنەما ئایینی و فیکری و عەقیدەیییەکان بە بەڵگەی ئەقڵی، فەلسەفی، فیکری، زانستی و لۆژیکی.

٣- سوود وەرگرتن لە ئامڕازە جیاوازەکان بۆ گەیاندن و بڵاوکردنەوە و ڕەواندنەوەی گومانەکان، هەروەها ئامڕازی نووسین و ڕاگەیاندن و دروستکردنی ڕێکخراو و سەنتەر و قوتابخانە و... هتد.

٤- ئاگادارکردنەوە و هۆشیارکردنەوەی خەڵکی بەگشتی و گەنجان بەتایبەت لە تێکەڵبوون و خوێندنەوەی پەرتووکی ناباوەڕی و بێباوەڕی کە بەس گومانیان خستووەتەڕوو بەبێ وەڵامدانەوە و ڕەواندنەوەی گومانەکان، چونکە ئەم کەسە یان ئەم گەنجە تاوەکوو ئێستا بۆ خۆی شارەزاییەکی وای لە ئیسلام و قورئان و فیکر و فەلسەفەی ئیسلام نییە، چ پێویست دەکات تۆ هێشتا لەوانە شارەزاییت نەبێت بچیت خەریکی ئەوانی دیکە بیت؟!

٥- زیندووکردنەوەی زانستە ئیسلامییەکان و شەرعییەکان، نوێکاری تێیاندا و خستنەڕوویان بەشێوازێکی جوان و ئاسان و سەردەمییانە و خۆشەویستکردنیان لەبەر چاوی خەڵک و هاندانیان بۆ نزیکبوونەوە لێی و خۆ تەرخانکردن بۆیان.

٦- گرنگیدان بە بابەتە ئیمانی و ڕۆحییەکان و زیندووکردنەوەی دڵ و دەروون و ڕاهێنانی خەڵکی لە تام و چێژ وەرگرتن لە عیبادەت، نەوەک وەرگرتنی ئەمانە وەک عادەتێک، بۆیە دەبینین زۆربەمان کە نوێژ دەکەین ئاگامان کەم لە نوێژەکانمانە کە دیارە نوێژ قسەکردن و موناجاتە لەگەڵ خودای گەورە، بۆیە کەم تام و چێژی لێوەردەگرین و ڕەنگدانەوەی دەروونی و ڕۆحی و دەرەکی و کردەیی زۆر کەمە -بەداخەوە-.

٧- تێگەیشتن لە قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنێکی ڕاست و دروست و واقیعییانە و دوور لە شلگیری و توندڕەوی، هەروەها ڕەچاوکردنی مەبەستەکانی شەریعەت (مقاصد الشريعة) لە کاتی تێگەیشتن و جێبەجێکردن و دابەزاندنی بۆ نێو کۆمەڵگە.

٨- دەرخستنی جوانییەکانی ئیسلام (محاسن الإسلام) لە هەموو بوارەکاندا، وەک: بواری فیکری، عەقیدەیی، تەشریعی، یاسایی، عیبادەتی، سیاسی، ئابووری، ڕەوشتی و... هتد.

٩- گرنگیدان بە زانستە ئەزموونییەکان (تەجریبییەکان)ی وەک فیزیا و... هتد، هەروەها بەکارهێنانیان بۆ پشتگیری و پاڵپشتی بنەما عەقیدەیی و دینییەکانی ئیسلام، چونکە تا ئێستاش زۆرێک لەم زانستانە لە دەستی ڕۆژئاوادان و بە

کەیفی خۆیان بەکاری دەهێنن.

١٠- گرنگیدان بەو کەسانەی لە وڵاتانی دەرەوە و ڕۆژئاوادا دەژین، بۆ تێگەیاندنیان و پێگەیاندنیان و پاراستنیان لە لادان و بە لاڕێدا بردن.

١١- بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە بۆ ئامڕاز و هۆکارەکانی ناباوەڕی و هەوڵدان بۆ وشککردن و نەهێشتنیان.

١٢- وەڵامدانەوەی گومانەکان بە شێوازێکی جوان و زانستی و فیکری و قەناعەتپێکەر.

١٣- بەکارهێنانی حیکمەت و دانایی لە وەڵامدانەوەی ناباوەڕی و بێباوەڕان، دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی مەنهەجی نازانستی و نالۆجیکی و جنێو و تەشهیر و زمانی زبر.

١٤- هەتا بکرێت گفتوگۆکان تاکەکەسی و پەنهان بێت لەگەڵ بێباوەڕان، بە ئامانجی هیدایەتدان و ڕێنموونیکردنیان. بەڵام ئەگەر بە ئاشکراو لەبەر چاوی خەڵک بێت، ڕەنگە ئەم ئامانجە نەپێکێت و کەسەکە لەبەر کەسایەتی خۆی نایسەلمێنێت و داننانێت بە ڕاستییەکاندا. ئەمە بەشێوەیەکی گشتی وایە، ئەگەرنا ڕەنگە هەندێک بارودۆخ وا بخوازێت کە ڕووبەڕوو لەنێو خەڵک لەگەڵیان دانیشی و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەی و بەتایبەت کاتێ ئەوان داوای دیبەیت و گفتوگۆ دەکەن و تەحەددا دەکەن و بەبەهێزی خۆیان نیشان دەدەن.

١٥- کەسانی شارەزا و تایبەتمەند هەستن بە وەڵامدانەوە و گفتوگۆکردن و دیبەیتکردن، نەوەک کەسانێکی نەشارەزا کە بابەتی گومانەکە پسپۆڕی ئەوان نەبێت. لە ڕاستیدا دەبێت بوارەکان لێک جیا بکرێنەوە نەوەک بەو تێکەڵییەی ئێستا دەبینرێت کە کەسێک لە هەموو بوارەکان قسە و گفتوگۆ و دیبەیت دەکات. بە ڕاستی ئەگەر بمانەوێت گفتوگۆ و دیبەتەکان و وەڵامدانەوەکان بەرهەمدار و قەناعەت پێکەر بن پێویستە کەسانی لێکۆڵەر و پسپۆڕ بەو کارە هەستن.

گوێگرتن بۆیان و وەڵامدانەوە و ڕەواندنەوەی گومانەکانیان.

٣٠- گرنگیدان بە نوێکاری لە شێواز و ئامرازەکانی بانگەواز

٣١- هاندانی گەنجان لەسەر خوێندنی زانستی شەرعی و خۆشەویستکردنی لایان

٣٢- هاندان و هۆشیارکردنەوەی گەنجان لەسەر هاوڕێیەتیی هاوڕێی باش و بیر و فیکر سەلامەت، بەتایبەت بۆ کەسانێک کە بەرگری و بەرگری فیکرییان نییە و ناتوانن وەڵامبدەنەوە، بەتایبەت لە بەشە نێوخۆیی زانکۆ و پەیمانگاکان، بەڵام ئەگەر ئەم کەسە بەرگری فیکری باشی هەبوو، کێشە نییە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە تێکەڵ ببێت، بەڵکوو زۆر جار ڕەنگە لە سەریشی پێویست بێت بۆ ئەوەی وەڵامیان بداتەوە و ڕێنموونیان بکات و هیدایەتیان بدات.

٣٣- دروستکردنی سایت و پەیج و... هتد، تایبەت بە وەڵامدانەوەی ئیلحاد و گومان و شوبهە، بۆئەوەی ئەو کەسانەی کە گومانیان هەیە یان بۆیان دروستدەکرێت، بەزووترین کات دەستیان پێی بگات و وەڵامی قەناعەتپێکەر وەرگرن.

٣٤- دانانی بەرنامەی مۆبایل (ئەپڵیکەیشن)ی تایبەت بە وەڵامدانەوە و ڕەواندنەوەی گومانەکان، کە بەشێوەی پێڕست (فەهرەست) ڕێکخرابێت و گومانەکانی بەپێی بابەتە جیاوازەکان جیاکرابنەوە، بۆ نموونە گومانەکان لەسەر بوونی خودای گەورە یان قورئان، یان لەسەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) یان... هتد.

٣٥- نوێکردنەوەی فیکری ئیسلامی بە شێوازێک کە لەگەڵ داواکارییەکانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و سەردەمی نوێ و داواکاری کۆمەڵگە و چینە جیاوازەکان بگونجێت، بەبێ لادان و تەنازولکردن لە بنەما عەقیدەیی و ڕەوشتی و تەشریعییەکان.

٣٦- بەهێزکردنی پەیوەندی لەنێوان زانستە ئیسلامییەکان و زانستە

مرۆڤایەتییەکان و کۆمەڵایەتییەکان وەک: دەروونناسی و کۆمەڵناسی... هتد

٣٧- چارەسەرکردنی کێشە و خەلەل و گرفتی مەنهەجی لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەق و واقیع، واتا چۆن بتوانین دەق دابەزێنین بۆ سەر واقیعە جیاوازەکان، دیارە ئەمە کارێکی قورسە و کاری زۆر باشی دەوێت، باشترین ڕێگەش بۆ ئەمە، ڕەچاوکردنی مەبەستەکانی شەریعەتە (مقاصد الشريعة).

٣٨- پلەبەندی لە ئەولەویاتی فیکری و سیاسی و بانگەوازی

٣٩- کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ و ڕەخنەی مەنهەجی، سنگ فرەوانی بەرانبەری و دژایەتی نەکردنی

٤٠- ڕێگری لە تەوژمی تەکفیری و ڕووبەڕووبوونەوەی بیری توندڕەوی و ئیرهاب، یان بیری شلگیری و تەوژمی نەهێشتن و ڕووخاندنی بنەما فیکری و عەقیدەیی و ڕەوشتی و تەشریعییەکانی ئیسلام. تەتەڕووف هەر توندڕەوی نییە، بەڵکوو تەتەڕووف واتە تەرەفگیری و لایەنگیری، واتا لایەنێک بگری، جا بە لای توندڕەوی یان بە لای شلگیریدا بێت، کە هەر دووکیان دژی مەنهەجی ڕاستی ئیسلامن. مەنهەجی ڕاستی نێوەندگیرییە نەک تەرەفگیری.

٤١- یەکخستنی تواناکان و کەفائەتەکان و چالاککردنیان لە هەموو بوارەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، زانستی، بۆ دروستکردنی ئوممەتێکی یەکگرتوو کە فەرمان بکات بە چاکە و ڕێگری بکات لە خراپە.

٤٢- پێشکەشکردنی نموونە و قودوەی چاک لە هەموو بوارەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، زانستی، فیکری... هتد.

٤٣- گرنگیدان بە ئەدەب و شیعر و پەخشانی ئامانجدار بەتایبەت ڕۆمان چ بە نووسین، چ بە وەرگێڕان.

٤٤- ئاگاداری و هۆشیاری لە فێڵ و تەڵەکە و بەهەڵەدابردنی لۆژیکی (المغالطات المنطقية)، چەواشەکاری.

# فەلسەفەی قورئان
# (مەبەست و ئامانجەکانی قورئان)

مەبەست و ئامانجەکانی قورئان (مقاصد القرآن): هەموو ئەو ئامانج و مەبەست و حیکمەتانەن کە قورئان دەیەوێت بیانهێنێتەدی لە میانەی دەقەکانی و کۆی بابەتەکانیکە ئەوەندە فراوانە کۆ ناکریتەوە و (حصر) ناکرێت.

هەندێک پێناسە بۆ مەبەست و ئامانجەکانی قورئان (مقاصد القرآن).

(الغايات اللتى أنزل القرآن لأجلها تحقيقا لمصالح العباد).

• معظم مقاصد القرآن الامر باكتساب المصالح وأسبابها، والزجر عن اكتساب المفاسد وأسبابها.

• هى المقاصد اللتى دارت عليها سور القرآن الكريم وآياته تعريفا برسالة الاسلام، وتحقيقا لمنهجه فى هداية البشر.

لەم سێ پێناسەیەوە دەردەکەوێت کە قورئانی پیرۆز بە سوورەت و ئایەتەکانییەوە هاتووە بۆ ڕێنمایی مرۆڤ و بەختەوەر کردنی و جێبەجێ کردنی بەرژەوەندیەکانی و لێدورخستنەوەی مەفسەدە و خراپەکان لە دونیا و دوا ڕۆژ، کەواتە مەقاصیدی قورئانیش هەر ئەو ئامانجانەن کە لە پێناسەی مەقاصیدی شەریعەدا هاتووە، بەڵام دەبێت بزانین مەقاسیدی قورئان فروانترە لە مەقاسدی شەریعە و بێ چەند و چوونە، سەرچاوەکەشی بێ گرفتە، بەڵام کە باسی شەریعە بکەین سەرچاوەکانی تریش دێنە ناو، کە ڕوونە زانایان لەسەر هەموویان کۆک نین.

مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی قورئان:

مەبەست و ئامانجەکانی قورئان یەکجار زۆرن بەڵام ئێمە لێرەدا چەند دانەیەکی گرینگ باس دەکەین:

١. معرفة الله وعبادته وتوحيده: ناسین و پەرستشی خوای گەورە، گەورەترین ئامانجی قورئان ئەوەیە کە ئێمە خاوەنی خۆمان بناسین، بیپەرستین، ڕەزامەندی ئەو بەدەست بێنین، خۆشمان بوێت، لێی بترسین، بزانین مافی چییە بەسەرمانەوە، ئەرکمان چییە بەرانبەری، بەکام ڕێگایە پێی بگەین، چ کەسێک بە ئەومان شاد دەکات، چۆن بۆی بژین، چۆن لەدەستی نەدەین، چۆن تامەزرۆی لیقای بین، چۆن بەختەوەریمان لە ناسینیدا بدۆزینەوە؟ ... ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾.[١]

٢. تزكية النفس وتربيته: پاککردنەوەی نەفس و دڵ و دەروون، دووەم ئامانجی قورئان پەروەردەکردنی مرۆڤە، ئەوەیە کە ئەم مرۆڤە پێگە و پایەی خۆی بزانێت، ئەرکی خۆی بزانێت، چۆن ببێتە ڕەحمەت بۆ دروست کراوەکانی تر، نەبێتە زەحمەت و مەینەت و ئازار، چۆن دەوری خۆی ببینێت، چونکە ئەگەر مرۆڤ پەروەردەکراو بێت ژیان خۆش و ئارام دەبێت، ستەم و بێدادی نابێت، مرۆڤەکان تام لە بوونیان دەکەن، تەمەننای مردن ناکەن وەک ئەمڕۆ کە دەبینین و دەبیستین. ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا﴾.[٢]

٣. تعمير الارض: ئاوەدانکردنەوەی زەوی و خۆش کردنی ژیان و ژینگە. ﴿هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ﴾.[٣]

٤. مقصد ابتلاء الانسان: ئامانجی تاقی کردنەوەی مرۆڤ، بەداخەوە زۆر

---

(١) (الذاريات: ٥٦).

(٢) (الشمس: ٩).

(٣) (هود: ٦١).

کەس بە هەڵە لەمە تێدەگات، بەڵام بەڕاستی تاقی کردنەوەی مرۆڤ و دەرفەت پێدان و ئازادی پێدانی گەورەترین ڕێزە بۆ مرۆڤ، چۆن؟ چونکە هەموو مرۆڤایەتی تاقیکردنەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان بەشانازی دەزانێت، ئەگەر کەسێک بێ تاقیکردنەوە پلەیەک، پۆستێک، شەهادەیەک، بەدەست بێنێت خەڵک متمانەی پێ ناکەن و گاڵتەی پێ دەکەن، تاقیکردنەوەکە لە توانای مرۆڤ دایە، پرسیارەکان بە هەموو کەس وەڵام دەدرێنەوە، ئەوەی کە ژێری هەبێت و (مكلف) بێت، پرسیارەکان: خوات کێیە؟ پیغەمبەرت کێیە؟ دینت چییە؟ لەسەر ئەم زەوییە پرسیاری ئەوا ئاسان نییە، بەمەرجێک پرسیارەکان وەڵام دراونەوە، بەس بیان پارێزە، هەموو ئەو کەسانەش کە دەرفەتی پێگەیشتن و تێگەیشتنی ئەو پرسیارانەی نەبوو خوای گەورە سزای نادات. ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[1]، بەڵگەکانی ئامانجی تاقیکردنەوە زۆرن لەوانە: {الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾.[2]

٥. مقصد تحقيق العدالة: ئامانجی پیادەکردنی دادگەری لە هەموو بوارەکان یەکێکە لە ئامانج و مەبادیئە بنچینەییەکان. ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۖ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾.[3]

٦. مقصد كرامة الإنسان: هێنانەدی ڕێز بۆ مرۆڤ، ئەم کەرامەتە بۆ هەموو مرۆڤێکە، ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾.[4]

٧. مقصد التعارف فى جعل الناس شعوبا وقبائل مختلفا: یەکترناسینی هەموو

---

(١) [الإسراء: ١٥]

(٢) [الملك: ٢].

(٣) (الحديد: ٢٥).

(٤) (الإسراء: ٧٠).

مرۆڤەکان و مرۆڤایەتی، ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾.[1]

٨. مقصد التعاون بين الناس وإن كانوا مختلفين فی العقائد والمصالح: یارمەتیدانی یەکتری با جیاوازیش بین لە یەکتری لە بیرکرنەوە و ئایین و بیروباوەڕ و...، ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾.[2] مرۆڤەکان ناتوانن بەبێ یەک بژین، پێویستییان بەیەک دەبێت، با لە بیروباوەڕ و بیروڕاش جیاواز بن.

٩. مقصد الحرية: هێنانەدی ئازادی، ئازادی چ لە بیروباوەڕ بێت یان لە بیروڕا بێت، شەریعەت هاتووە دابینی بکا، بوونی مرۆڤ بە بیروباوەڕیەتی، ئەگەر نەتوانێت مومارەسەی بیروڕا و بیروباوەڕی بکات، بوونی هیچ واتایەکی نییە.[3]

ئەم ئایەتە پیرۆزە و ئایەتەکانی پێشتر بێ پێچ و پەنا باسی ئازادی بیروباوەڕ دەکەن، یەکێک لە ئامانجەکانی ئیسلام بەرگری کردنە لە پیرۆزییەکانی خەڵک جا شوێنی جوولەکە بێت وەک (بیع)، یان مەسیحییەکان (صوامع)، یان هی موسڵمانەکان بێت وەک (مسجد)، یان هی هەموو دینەکان بێت وەک (صلوات)، هەرچەند موفەسیرەکان ڕاڤەی جۆراوجۆریان بۆ ئەم وشەیە کردووە، بەڵام من پێم وایە باشترین ڕاڤە ئەوەیە کە مەبەست لە پیرۆزییەکانی دینەکانی هەموو دونیا بێت نەوەک دینێک بە تەنیا، چونکە هەرکەس دینی هەبوو هەر دینە با ڕاستیش نەبێت، مادام بەلایەوە پیرۆزە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾.[4]

---

(١) (الحجرات: ١٣).

(٢) (المائدة: ٢).

(٣) (الحج: ٤٠).

(٤) (الكافرون: ٦).

هەندێک ئایەت دەربارەی ئازادی:

قورئان پڕیەتی لە ئازادی و ڕێپێدانی بۆنموونە:

١. ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾[١]. «بە هیچ جۆرێک زۆرلێکردن لە دیندا نییە (بۆ هاتنە ناو ئیسلام).»

٢. ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾[٢]. ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە بڕوای دەهێنا ئەو (خەڵکەی) وا لە زەوی دا هەموو تێکڕا، دەی ئایا تۆ (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) زۆر لە خەڵکی دەکەیت هەتا ببنە بڕوادار.»

٣. ﴿قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كُنْتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي وَآتَانِي رَحْمَةً مِنْ عِنْدِهِ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنْتُمْ لَهَا كَارِهُونَ﴾[٣] نووح وتی: «ئەی گەلەکەم هەواڵم بدەنێ ئەگەر من بەڵگەی ئاشکرام هەبێت لەلای پەروەردگارمەوە و ڕەحمەتێکی پێ بەخشیبم لەلایەن خۆیەوە بەڵام ئەوە لە ئێوە شاردرابێتەوە ئایا بە زۆر پابەندتان بکەین پێیەوە لە کاتێکدا ئێوە حەزی لێ ناکەن.»

٤. ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ ۖ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾[٤] «بڵێ حەق (ئەم قورئانە) لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتووە جا هەرکەسێک دەیەوێت با باوەڕبێنێت و هەرکەسیش دەیەوێت با کافر بێت.»

٥. ﴿فَاعْبُدُوا مَا شِئْتُمْ مِنْ دُونِهِ ۗ قُلْ إِنَّ الْخَاسِرِينَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ﴾[٥]

---

(١) [البقرة: ٢٥٦]

(٢) [يونس: ٩٩]

(٣) [هود: ٢٨]

(٤) [الكهف: ٢٩]

(٥) [الزمر: ١٥]

٦. ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنْتَ مُذَكِّرٌ ۝ لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُصَيْطِرٍ﴾ [الغاشية: ٢١-٢٢]

٧. ﴿مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ [النحل: ١٠٦]

٨. ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنْ كُنْتُمْ فِي شَكٍّ مِنْ دِينِي فَلَا أَعْبُدُ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلَكِنْ أَعْبُدُ اللَّهَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ [يونس: ١٠٤]

٩. ﴿فَلِذَٰلِكَ فَادْعُ ۖ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ ۖ وَقُلْ آمَنْتُ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنْ كِتَابٍ ۖ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ۖ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ۖ لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ ۖ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ۖ اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا ۖ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ [الشورى: ١٥]

١٠. ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ ۖ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ [البقرة: ١٠٩]

١١. ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ [التوبة: ٧٣]

١٢. ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا ۚ وَمَا نَقَمُوا إِلَّا أَنْ أَغْنَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِنْ فَضْلِهِ ۚ فَإِنْ يَتُوبُوا يَكُ خَيْرًا لَهُمْ ۖ وَإِنْ يَتَوَلَّوْا يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِي الْأَرْضِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ [التوبة: ٧٤]

١٣. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ﴾ [محمد: ٢٥]

١٤. ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُمُ الرَّسُولُ بِالْحَقِّ مِنْ رَبِّكُمْ فَآمِنُوا خَيْرًا لَكُمْ ۚ وَإِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ [النساء: ١٧٠]

١٥. ﴿قَدْ جَاءَكُمْ بَصَائِرُ مِنْ رَبِّكُمْ ۖ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِ ۖ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا ۚ وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِحَفِيظٍ﴾ [الأنعام: ١٠٤]

١٦. ﴿وَأَنْ أَتْلُوَ الْقُرْآنَ ۖ فَمَنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ۖ وَمَنْ ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَا أَنَا مِنَ الْمُنْذِرِينَ﴾ [النمل: ٩٢]

١٧. ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ لِلنَّاسِ بِالْحَقِّ ۖ فَمَنِ اهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِ ۖ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِوَكِيلٍ﴾ [الزمر: ٤١]

١٨. ﴿مَنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ۖ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ [الإسراء: ١٥]

١٩. ﴿مَنْ كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِأَنْفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ﴾ [الروم: ٤٤]

٢٠. ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ ۚ فَمَنْ كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ ۖ وَلَا يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا ۖ وَلَا يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا﴾ [فاطر: ٣٩]

٢١. ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ لِلنَّاسِ بِالْحَقِّ ۖ فَمَنِ اهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِ ۖ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِوَكِيلٍ﴾ [الزمر: ٤١]

٢٢. ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾ [الأعراف: ١٩٩]

٢٣. ﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ۖ وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِجَبَّارٍ ۖ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَنْ يَخَافُ وَعِيدِ﴾ [ق: ٤٥]

٢٤. ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ وَالنَّصَارَىٰ وَالْمَجُوسَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا إِنَّ اللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ [الحج: ١٧]

٢٥. ﴿أَفَمَنْ زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ فَرَآهُ حَسَنًا ۖ فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ ۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ [فاطر: ٨]

٣٦. ﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ۚ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾ [الزمر: ٣]

٣٧. ﴿فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنْتُمْ بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوْا ۖ وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ [البقرة: ١٣٧]

٣٨. ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾ [هود: ١١٨]

٣٩. ﴿ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ۖ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ [النحل: ١٢٥]

٤٠. ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُمُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ ۖ فَمَنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ۖ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ﴾ [يونس: ١٠٨]

٤١. ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْآنًا سُيِّرَتْ بِهِ الْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ الْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ الْمَوْتَىٰ ۗ بَلْ لِلَّهِ الْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَيْأَسِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنْ لَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَهَدَى النَّاسَ جَمِيعًا ۗ وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا تُصِيبُهُمْ بِمَا صَنَعُوا قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِنْ دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِيَ وَعْدُ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ [الرعد: ٣١]

٤٢. ﴿وَقُلْ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ﴾ [هود: ١٢١]

٤٣. ﴿أَفَمَنْ زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ فَرَآهُ حَسَنًا ۖ فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ ۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ [فاطر: ٨]

٤٤. ﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ [الممتحنة: ٨]

لەگەڵ چەندان بەڵگە و ئایەتی دیکە ...

**کەواتە لە هەموو ئایەتەکاندا چەند شتێک وەردەگیرێت:**

**١.** هەموو کەسێک ئازادی بیروباوەڕی هەیە، وەک لە ئایەتەکاندا ئاماژەی بۆ کرا: کێ باوەڕدێنێت با باوەڕبێنێت، کێش بێباوەڕدەبێت با بێباوەڕبێت.

**٢.** تۆبزی و زۆر لە کەس ناکرێت بۆ ئیمان و باوەڕهێنان و پابەندبوون بە ئایینەوە.

**٣.** هەر سزایەک هەبێت بۆ بێباوەڕان لە قیامەتدایە نەک لە دونیا، بۆیە ئەگەر لە ئایەتەکان وردبینەوە سزای دونیایی بۆ دانەناون و لە هەموویاندا دەفەرمووێت: لە قیامەتدا سزا دەدرێن.

**٤.** ئاشتی ئەسڵە و هەتا هێرش نەکرێت هێرش نابرێت، هەتا شەڕ نەخوازرێت شەڕ ناکرێت، هەتا ئاشتی هەڵبژێرن پێکەوە ژیانیان لەگەڵدا دەکرێت.

١٠. مقصد حفظ الدين: پاراستنی ئایین، دیارە ئەوەیان جیاوازە لە خاڵەکەی پێشتر، ئەوەی پێشتر بۆ ئازادییە، بەڵام ئەوەیان بۆ پاراستنە، پاراستن بە دوو شێوە دەبێت: شێوەی یەکەم، بۆ دامەزراندن و بڵاوکردنەوە و ڕوونکردنەوەی. شێوەی دووەم، بە بەرگری لێکردن و پاراستنیەتی، ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ انْتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ﴾.(١)

١١. مقصد حفظ النفس: پاراستنی گیانی مرۆڤ، جا هەر بیروباوەڕێکی هەبێت لە ئامانجە گەورەکانی قورئانە، بۆیە خوای گەورە سزای قورسی داناوە بۆ ئەو کەسانەی دەستدرێژی دەکەنە سەرگیانی مرۆڤ یان ئەندامێکی یان مافێکی.(٢) (٣)

---

(١) (البقرة: ١٩٣).

(٢) (البقرة: ١٧٩).

(٣) (الإسراء: ٣٣).

١٢. مقصد حفظ العقل: پاراستنی ژیری مرۆڤ یەکێک لە ئامانجە گەورەکانی ئیسلام و قورئانە، چونکە مرۆڤ بەهۆی ژیرییەکەی بەرپرسیارە لە دونیا و دوارۆژ، بۆیە هەرشتێک زیان بە ژیری مرۆڤ بگەیەنێت شەریعەت قەدەغەی کردووە، وەک مەی خواردنەوە، تریاک، حەشیش، هەموو ئەو دەرمانانەی بێ پێویستی مرۆڤ بەکاریان دەهێنێت.[١]

١٣. مقصد حفظ المال: پاراستنی ماڵ و سەروەت و سامان، ژیان بە ماڵەوە بەردەوامە و ڕاوەستاوە و پێش دەکەوێت.[٢].[٣]

١٤. مقصد حفظ النسل: پاراستنی وەچەی مرۆڤ لە ئامانجەکانی قورئان و ئیسلام و شەریعەتە، بۆئەوەی جۆری ئینسانی بە شێوەی تەندروست بمێنێتەوە خوای گەورە هەموو جۆرەکانی لادانی جنسی قەدەغە کردووە، خوای گەورە زینای حەرام کردووە و سزای بۆ داناوە کە جەڵدە لێدانە. هەتا بوختان کردنی قەدەغە کردووە و سزای بۆ داناوە.[٤][٥] [٦] [٧] [٨]

١٥. مقصد الهداية: یەکێک لە ئامانجە پیرۆز و سەرەکییەکانی قورئان هیدایەتە.[٩]

١٦. مقصد الشفاء: یەکێک لە وەسفی قورئان ئەوەیە کە شیفا و چارەسەرە

---

(١) (المائدة: ٩١).

(٢) (النساء: ٥).

(٣) (المائدة: ٣٨).

(٤) (النور: ٢).

(٥) (النور: ٣).

(٦) (النور: ٢٦).

(٧) (النور: ٣٢)

(٨) (الإسراء: ٣٢).

(٩) (الإسراء: ٩)

بۆ ڕۆح و بۆ لاشە، بەڕاستی قورئان شیفایە بۆ نەخۆشی بیروباوەڕ، دەردی بەدڕەوشتی، کۆمەڵایەتی، خێزانی، تاکی.[١]

١٧. مقصد الرحمة والتراحم: ڕەحم و سۆز و بەزەیی و بەزەیی هاتنەوە بە یەکتری، قورئان وەسفێکی ئەوەیە کە ڕەحمەتە بۆ تاک و کۆمەڵگە و...، دەیەوێت ئەم ڕەحمەتە ڕەنگ بداتەوە لە دەیان دەقدا.[٢]

١٨. مقصد إقامة الحجة على الإنس والجان: عوزر نەهێشتن بۆ مرۆڤ و جنۆکەکان، قورئان هاتووە بۆئەوەی ڕێنمایی بێت بۆ مرۆڤایەتی و بەرچاو ڕوونییان بکات لە هەموو پێداویستییەکانی ژیان بۆ دین و دونیا، بۆ دونیا و دوا ڕۆژ.[٣]

١٩. مقصد تعليم وتعلم الجدال باللتى هى أحسن: گفتوگۆ فێرکردن بە جوانترین شێوە، لەوانەیە هەندێک کەس ئینکاری ئەو ئامانجە بکات، بەڵام بەراستی زۆر ئامانجێکی گەورەیە، چونکە گەورەترین جۆری هیدایەت لەڕێی بەیان و گفتوگۆوە دەبێت.[٤]

٢٠. مقصد الانصاف مع الموافق والمخالف: ئینساف بوون لەگەڵ هەموو خەڵک، قورئان زۆر پێداگری دەکات لەسەر دادگەری و ئینساف هەتا لەگەڵ ناحەزەکانیش.[٥]

٢١. مقصد تحقيق الاعجاز: چەسپاندن و هێنانی ئیعجاز، چونکە هەرکات ئیعجازی قورئان ئیسپات کراو سەلمێنرا ئەوە بەرانبەر یان دانی پێدا دێنێت،

---

(١) (الإسراء: ٨٢).

(٢) (يونس: ٥٧).

(٣) (النساء: ١٦٥).

(٤) (النحل: ١٢٥).

(٥) (سبأ: ٢٥).

یان بێ دەنگ دەبێت و ناتوانێت قسە بكات، بۆیە دەبێت كار بكرێت لەسەر ئەم ئامانجە گەورەیە، قورئانی پیرۆزیش چەندین جار ئەم ڕاستییەی دووپات كردووەتەوە.[1]

٢٢. مقصد الفقه والفهم: تێگەیشتن، ئەم قورئانە بۆیە هاتووە تا ئێمە لە شتەكان تێبگەین بەوردی، بۆیە پێویست دەكات خەڵكانێک تایبەت بكەین و هاوكاریان بین لە تێگەیشتنی ورد لە قورئان.[2] [3]

٢٣. مقصد إحقاق الحق وإبطال الباطل: چەسپاندنی حەق و پووچەڵكردنەوەی باتڵ و شتی پووچ، خوای گەورە ڕووداوگەلێک دێنێتە پێش بۆ ئەو ئامانجە چ لەسەر ئاستی تاک چ لەسەر ئاستی كۆمەڵگە، یان لەنێوان دوو گرووپی ناكۆک و دژ بەیەک.[4]

٢٤. مقصد إزالة الشبهات: ڕەواندنەوەی گومانەكان، قورئانی پیرۆز بەشێوەیەكی گشتی كار لەسەر دوو تەوەرە دەكا، یەک: سەلماندن و چەسپاندنی حەق. دوو: پووكاندنەوە و پووچەڵ كردنەوەی ناحەق.

بۆیە زۆر بەرچاومان دەكەوێت كە خوای گەورەی گومانەكان پووچەڵ دەكاتەوە، یان لەڕێی پێغەمبەرەكانییەوە، یان لەسەر زمانی پیاو دانا و زاناكانەوە.[5]

٢٥. مقصد إثبات العقيدة بإيراد الحجج وإزالة الشبه: چەسپاندنی عەقیدە بەهێنانەوەی بەڵگە و ڕەواندنەوەی گومانەكان، بیروباوەڕ لە هەموو شتێک گرنگترە، بەردی بناغەی شەریعەت و پابەندییە، بۆیە قورئان پریەتی لە

---

(١) (الإسراء: ٨٨).
(٢) (التوبة: ١٢٢).
(٣) (الأنبياء: ٧٨).
(٤) (الأنفال: ٨).
(٥) (الرعد: ١٦).

گفتووگۆی عەقیدە و بیروباوەڕ، بۆنموونە باسی ئیسپاتی ڕبووبیەت و ئولوهییەت بەچەندین شێوە بەڵگە دێنێتەوە.[1]

٢٦. مقصد التجاوب مع الفطرة السليمة: گەڕانەوە و هەماهەنگی بۆ فیترەت و سروشتی ساغ و سەلیم، قوڕئان ئامانجی ئەوەیە مرۆڤ بگێڕێتەوە بۆسەر فیترەت و سروشت پاکی خۆی، چونکە دینەکەی موافیقی ئەم سروشتەیە.[2]

٢٧. مقصد تعليل الاحكام والاحداث: گەڕان بە دوای حیکمەت و فەلسەفە و هۆکاری ئەحکامەکان و ڕووداوەکان، قوڕئان زۆر هانمان دەدات بۆ ئەوەی حیکمەتی شتەکان بزانین و پشتی ڕووداوەکان بخوێنینەوە، هەم بۆ ئەوەی بزانین بۆ ڕوویدا؟ هەم بۆئەوەی بزانین سەرنجامەکەی چی بوو، هەم بۆ چارەسەرکردن و دەستخستنە سەر برین، بۆ حوکمەکانیش هەر ڕاستە، هیچ حوکمێک نییە لە قوڕئانی پیرۆزدا یان بە وردی یان بەگشتی حیکمەت و فەلسەفەی دیار نەبێت، جا بەندایەتی بێت، یان ئەخلاق، یان عەقیدە و تەشریع یان ڕووداو.

٢٨. مقصد تجاوز الزمان والمكان والاشخاص فی سرد القصص والأمثال: تێپەڕاندنی کات و شوێن و کەسەکان لە هێنان و گێڕانەوەی ڕووداو و چیرۆکەکان، گرنگە لەوە تێبگەین سەربردە و ڕووداوەکان تەنیا مێژوویەکی ڕووت و تایبەت بەکات و شوین و خەڵکانێک نین کە بووە، بەڵکوو بۆ ئەوەیە هەمیشە ئەم شتانە زیندوو بمێنن و بیانکەین بە پێوەر و مەحەک بۆ ڕووداوەکان. ﴿فَٱعۡتَبِرُواْ يَـٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾[3]

٢٩. مقصد التوازن فی العمل والمواقف: هاوسەنگ بوون لە کاروکردەوە و

---

(١) (النمل: ٦٤).

(٢) (الروم: ٣٠).

(٣) (الحشر: ٢).

هەڵوێستدا، هاوسەنگی زۆر گرنگە، هەتا لەبەخشینیشدا هەر پێویستە.[١]

٣٠. مقصد تقرير حقوق الانسان: چەسپاندن و پێدانی مافەکانی مرۆڤ، لەو خاوەن مافانە: مافی باب و دایک، مافی خێزان، مافی مێرد، مافی هاوبەشی هەردووکیان، مافی منداڵ، مافی بەساڵاچووان، مافی نەخۆشەکان، کەم ئەندامان، مافی کرێکار، مافی ژێردەستەکان، مافی پەنابەر، مافی ڕێبوار، مافی گیراو و ئەسیر، مافی زیندانی، مافی گەورەی وەڵات، مافی هاوڕێ، مافی جیران، مافی غەیرە موسڵمان، مافی تۆمەتبار، مافی تاوانبار، مافی مردوو، مافی ئەوانەی نەخۆشی دەروونییان هەیە، مافی بێوەژنەکان، مافی قەیرەکان، مافی سەفیر و نوێنەرەکان، مافی کارمەند. جا ئەو مافانە هەموو جۆرە مافەکان دەگرێتەوە.

٣١. مقصد حق الدفاع: مافی بەرگری لەخۆکردن، قورئان لە چەندین دەقدا ئەم مافەی باس کردووە و یەکێکە لە ئامانجەکان.[٢]،[٣]

٣٢. مقصد تقرير مصير الشعوب: مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان، گەلێک مادام خوای گەورە دروستی کردووە، مافی ئەوەشی هەیە کە سەرەوەری، وڵات، ماف، ئاڵا، سیادەی هەبێت.[٤]

٣٣. مقصد تحقيق الأمن: دابینکردنی ئەمن و ئارامی و ئاسایش، ئەمن و ئاساییش یەکێکە لە نیعمەتە گەورەکان نەوەک بۆ ئینسان، بەڵکوو بۆ زیندەوەران بە گشتی، بەڵکوو بۆ ژیان و ژینگشە.[٥]

٣٤. مقصد التعلم والتعليم: فێربوون و فێرکردن، قورئانی پیرۆز لە یەکەم

---

(١) (الرحمن: ٧).

(٢) (النساء: ٧٥).

(٣) (البقرة: ١٩٤).

(٤) (الحجرات: ١٣).

(٥) (قريش: ٤).

ئایەتێک کە دابەزیوە باسی خوێندنەوە و خوێندەواری کردووە.[1]

٣٥. مقصد أكل الحلال والطيبات: خواردنی حەڵاڵ و پاک، پێکهاتەی لاشەی مرۆڤ ئەو شتانەیە کە دەیخوا بۆیە پێویستە مرۆڤ شتی پاک و خاوێن بخوات.

٣٦. مقصد تكوين الاسرة: دروستکردنی خێزان.[2]

زەواج چەندین ئامانجی گەورەی تێدا لەوانە: بەجێهێنانی فەرمانی خوا، سوننەتی پێغەمبەرانە، تەواو بوونی دینداری، فراوانبوونی بازنەی بەرپرسیاریەتی، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، بەردەوامبوونی جۆری مرۆڤ بەشێوە هەرە جوانەکەی، دەرگای ڕزق و ڕۆزی، ئارامی، خۆشەویستی، بەزەیی و میهرەبانی، تەندروستی، کەمکردنەوەی تاوان، بەتایبەت تاوانە جنسییەکان، دیاربوونی نەسەب و کەسووکار و بنەماڵە، پارێزران لە نەخۆشییە جنسییەکان، هەروەها نەبوونی جێگرەوەی ڕاستەقینە بۆ زواج.

٣٧. مقصد إنصاف المرأة: ئینساف بوون لەگەڵ ئافرەت، پێش کەوتنی هەر کۆمەڵگەیەک بە ئافرەت پێوانە دەکرێت، هەر کۆمەڵگەیەک ڕێزی ئافرەتی گرت و مافی پێدا و لەشوێنی شایەنی خۆی دانا پێشکەوتووە، ئەگینا بە بانگەشە و قسەی گەورە گەورە نییە.[3]

### ئافرەت لە قورئاندا

قورئان لە چەند ڕوویەکەوە کاری لەسەر پرسی ئافرەت کردووە، بۆنموونە:

١.گێڕانەوەی ڕێز و پێگە و ڕۆڵ و مافە خوراوەکانی

---

(١) (العلق: ١).

(٢) (النور: ٣٢).

(٣) (آل عمران: ١٩٥).

٢.ڕاستکردنەوەی تێڕوانینە هەڵەکان لەبەرانبەریدا

٣.دژایەتی کردن و حەرام کردنی هەموو نادادی و ناحەقییەک بەرانبەر ئافرەت و دانانی سزا بۆی.

٤.ئەم سەر بۆ ئەوسەری قورئان بگەڕێی غەیری ڕێز و ماف و بەرزڕاگرتنی قەدری ئافرەت شتێکی دیکەی دژی ئەمە بەدی ناکەیت، وشەیەک، دەستەواژایەک، فەرمایشتێک نابینیت بۆنی سووکایەتی یان... لێبێت.

قورئان پڕیەتی لە ماف و ڕێز و بەرگری لە ئافرەتان، بۆنموونە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾(١)

واتە: «هاوژینییان بەجوانی لەگەڵدا بەرنەسەر. مامەڵەتان با جوان و باش و چاک بێت لەگەڵیاندا.»

یان لە مەقامی بەرگری لە ئافرەتدا دەفەرموویێت: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾(٢)

ئەوانەی کە بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاک و خاوەن مێرد، پاشان ناتوانن چوار کەسیش بە شایەت بهێنن، ئەوانە هەشتا قامچیان لێ بدەن و هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن، ئەوانە لە ڕیزی تاوانبارو لە سنوور دەرچوو و یاخییەکاندان.

کەواتە ئەوەی بەبێ چوار شایەت (کە مەرجێکی یەکجار قورسە) بوختان بۆ ئافرەتێک بکات، ئەو شتانەی تووش دەبێت:

١. دەبێت هەشتا داری لێبدرێت.

---

(١) النساء ١٩.

(٢) النور ( ٤ ).

**٢.** هەرگیز شایەتی لێوەرناگیرێت.

**٣.** دەبێتە فاسیق و مۆری فاسیقی لێدەدرێت.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ الذُّكُورَ﴾[1].

واتە: خوای گەورە بەهەرکەس کە بیەوێت تەنیا کچ دەبەخشێت و بە هەرکەس کە بیەوێت کوڕ دەبەخشێت.

لێرەدا خوای گەورە کچی پێشخستووە: «بەهەرکەس کە بیەوێت تەنیا کچ دەبەخشێت»، خوای گەورەش هەرگیز شتێک پێش ناخات بەبێ هۆ و حیکمەت. کەواتە کچ بەخشش و دیاری خوایە و دەبێت ماف و ڕێز و پێگە و قەدری بپارێزرێت.

**ئافرەت لە فەرموودە و تێڕوانینی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت.)**

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بە کردار و گوفتار ماف و ڕێزی ئافرەتی گێڕاوەتەوە و پاراستووە، لەوە زیاتر چی بفەرموێت: «خِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِكُم»[2]. واتە: «باشترینتان باشترینتانن بۆ ژنەکانتان (هاوسەرانتان).»کەواتە پێوەری باشبوونی بە باشبوون بۆ ئافرەتان داناوە!

ئێمە لێرەدا چەند فەرموودەیەک باس دەکەین، بۆ سەلماندنی ئەوەی کە پێغەمبەر بە کردار و گوفتار ماف و ڕێزی ئافرەتی گێڕاوەتەوە و پاراستووە، ئەم ڕێز و قەدر و پاراستنەش لەسەر هەموو ئاستەکان بووە، دایک، هاوسەر (ژن)، کچ، خوشک، پوور.

**١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟

---

(١) الشورى (٤٩).

(٢) أخرجه أحمد: ١٠١١٠، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: حديث صَحِيح.

قَالَ: «أُمَّکَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمَّکَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أَبَاکَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێت: گوترا: (واتە: یەکێک گوتی:) ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ کێ زۆر چاکەکار بم؟ فەرمووی: «دایکت»، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: «دایکت»، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: «دایکت»، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: «باوکت». (کەواتە: دایک سێ پلە لە پێش باوکەوەیە بۆ چاکە لەگەڵ کردن).

٢- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ إِذَا ذَبَحَ الشَّاةَ، فَيَقُولُ: «أَرْسِلُوا بِهَا إِلَى أَصْدِقَاءِ خَدِيجَةَ»[٢].

واتە: دایکمان عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) عادەتی وابوو کە مەڕێکی سەردەبڕی، بەش بەشی دەکرد و دەیفەرموو: «بینێرن بۆ دۆستەکانی خەدیجە» (وەک وەفا و ڕێز و خۆشەویستی بۆ خەدیجە).

٣- «إِنَّ أَكْمَلَ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَاناً أَحْسَنُهُمْ خُلُقاً، وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِكُمْ»[٣].

واتە: «بێگومان ئیمان تەواوترینی بڕواداران ڕەوشت جوانترینیانە، باشترینتان باشترینتانن بۆ ژنان، (ژنەکانتان) (هاوسەرانتان).»

٤- «فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ.»[٤]

واتە: «دەربارەی ژنان لە خوا بترسن.»

---

(١) أخرجه البخاري في «الأدب المفرد»: ٥، والحديث في الصحيحين بلفظ من أحق الناس بحسن صحابتي الحديث.

(٢) أخرجه البخاري: ٣٨٢١، ومسلم: ٦٤٣١.

(٣) أخرجه أحمد: ١٠١١٠، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: حديث صَحِيح.

(٤) أخرجه مسلم: ١٢١٨، وابن حبان: ١٤٥٧، عَنْ جَابِرِ.

٥- «اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا»[1]

واتە: «(ئامۆژگارییتان دەکەم) ئامۆژگاری یەکتری بکەن دەربارەی ئافرەتان بە چاکە (واتە: بە چاکە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن).»

٦- عَنِ الْعِرْبَاضِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ يَقُولُ: «إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا سَقَى امْرَأَتَهُ مِنَ الـمَاءِ أُجِرَ»، فَأَتَيْتُ امْرَأَتِي فَسَقَيْتُهَا، وَحَدَّثْتُهَا بِـمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ[2].

واتە: «عیرباض دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بوو فەرمووی: ئەگەر پیاو ئاو بداتە ژنەکەی، پاداشتی دەدرێتەوە، (جا دەڵێ:) چوومەوە بۆ لای ژنەکەم و ئاوم پێدا، ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت) بیستبووم، بۆم باسکرد.»

٧- عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ فِي مَسِيرٍ لَهُ، فَحَدَا الْحَادِي، فَقَالَ النَّبِيُّ: «وَيْحَكَ يَا أَنْجَشَةُ! رُوَيْدَكَ بِالْقَوَارِيرِ»[3].

واتە: «ئەنەس، (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەبێت) لە سەفەرێکدا بوو، وشتەوانەکەش وشترەکانی خستبووە پێشی خۆی و گۆرانی دەگوت تاکوو هانیان بدات لەسەر ڕۆیشتن، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: هاوار بۆ تۆ ئەی ئەنجەشە! لەسەرخۆ و هێواش بە لەگەڵ شووشەکان (واتە: لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی سواری پشتی وشترەکان بوون!»

٨- «عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَابَقَنِي النَّبِيُّ فَسَبَقْتُهُ، فَلَبِثْنَا حَتَّى إِذَا أَرْهَقَنِي اللَّحْمُ سَابَقَنِي فَسَبَقَنِي، فَقَالَ النَّبِيُّ: هَذِهِ بِتِلْكَ»[4].

---

(١) أخرجه البخاري: ٣١٥٣، ومسلم: ١٤٦٨، عَنْ أبي هُرَيْرَةَ.

(٢) أخرجه أحْمَد: ١٧١٩٥، قَالَ شعيب الأرنؤوط: صحيح بِشَوَاهِدِهِ.

(٣) أخرجه أحمد: ١٣٦٩٥، والبخاري: ٦٢٠٩، ومسلم: ٢٣٢٣.

(٤) أخرجه أحمد: ٢٤١٦٤، وابن حبان: ٤٦٩١، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على

واتە: «عائیشە دەڵێت: پێغەمبەر (د.خ) پێشبڕكێی لەگەڵ كردم، منیش پێشی كەوتم (لێم بردەوە)، پاشان بەو شێوە ماینەوە هەتا (ماوەیەک، دواتر كە من قەڵە و بووم) قەڵەوی ماندووی كردم، ئینجا پێشبڕكێی لەگەڵ كردم و پێشمكەوتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەمە بە ئەوە (واتە: جارێک تۆ لە منت بردەوە و پێشمكەوتی، جارێكیش من تۆڵەی خۆم كردەوە و پێشتكەوتمەوە).»

٩- «لاَ تَكْرَهُوا الْبَنَاتِ، فَإِنَّهُنَّ الْمُؤْنِسَاتُ الْغَالِيَاتُ»[١].

واتە: «ڕقتان لە كچان نەبێتەوە (خۆشتان بوێن)، چونكە كچەكان دڵخۆشكەری (خێزان و خانەوادەن) و ڕێزدار و بەهادارن.»

١٠- «لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي يَعُولُ ثَلاَثَ بَنَاتٍ، أَوْ ثَلاَثَ أَخَوَاتٍ، فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ، إِلاَّ كُنَّ لَهُ سِتْرَاً مِنَ النَّارِ»[٢].

واتە: «هیچ یەكێک نییە لە ئوممەتی من سێ كچ، یان سێ خوشک بە خێو بكات، چاكەكار بێت لەگەڵیان، ئەوە بە دڵنیایی بۆی دەبنە پەرچ و دەیپارێزن لە ئاگر (دۆزەخ).»

٣٨. مقصد تحصين الأسرة: پاراستنی خێزان، ئەوەی پێشوتر باسی دروستكردنی خێزان بوو، بەڵام ئەم ئامانجە باسی پاراستنییەتی، شەریعەت یاسا و ڕیسای زۆری داناوە بۆ پاراستنی خێزان، لەكاتی پێویستدا سزاشی داناوە، لە شەریعەت دا بەدرێژی باسی مافی ژن، مافی پیاو، مافی منداڵ، مافی باوک و دایک و خزمان و ئادابی چوونە ماڵان و تێكەڵاوبوون و باسی مەحرەم و بێگانە

---

شرط الشيخين.

(١) أخرجه أحمد: ١٧٣٧٣، والطبراني في «الكبير»: ٨٥٦، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، قال الهيثمي (١٥٦/٨): فيه ابن لهيعة، وحديثه حسن، وبقية رجاله ثقات، انظر الصَّحِيحَة: ٣٢٠٦ للألباني.

(٢) أخرجه البَيْهَقيُّ في «شعب»: ١١٠٢٣، عَنْ عَائِشَةَ، وَصَحَّحَهُ الألباني في «صحيح الجامع»: ٥٣٧٢.

و هەتا ئەدەبی هەڵسووکەوتی مناڵیش باسکراوە.

٣٩. مقصد التربية: پەروەردە، پەروەردەی مرۆڤ یەکێکە لە ئامانجە گەورەکان کە لەسەرەتادا ئاماژەمان پێدا، بەڵام مەبەستمانە لێرەدا ڕوونتر ناوی جۆری پەروەردەکان بێنین، بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕوون بێت و کاری لەسەر بکەین، لەوانە: پەروەردەی ئیمانی، پەروەردەی بەندایەتی، پەروەردەی ئەخلاقی، پەروەردەی کۆمەڵایەتی، پەروەردەی ژیریی، پەروەردەی تەندروستی وەرزشی، پەروەردەی دەروونی، پەروەردەی بەسزا، پەروەردە بە ئامۆژگاری، پەروەردە بەهاندان، پەروەردە بەدیاری پێدان، پەروەدە بەگێرانەوەی چیرۆک، پەروەردە بە کردەوە، پەروەردە بەهۆی هاوڕێ و شوێنی باش، پەروەدە بە خۆشویستن، پەروەردە لەڕێی مامۆستای باش، پەروەردە لەڕێی گەشەکردنی مرۆیی، پەروەردەی زاستی، پەروەردەی میدیایی.

بەڕاستی دەکرێت بواری پەروەردە زۆر فراوان بکرێت و گرنگی زیاتری پێ بدرێت، ئەوەی کە باس کرا بەس بۆ بەرچاوڕوونییە، لەم بوارەوە شتی زۆر جوان و بەسوود نووسراوە و بەردەوام خول و سیمینار هەیە لەم بوارانەدا.

٤٠. مقصد حوار الأديان: گفتوگۆی ئایینەکان، ئەم بابەتە جیاوازە لە ئازادی بیروباوەڕ، مەبەست لێرەدا ئەوەیە گفتوگۆمان هەبێت لەگەڵ دینە جیاوازەکاندا، چونکە قورئان باسی دینەکانی تریشی کردووە و ڕەخنەی لێگرتوون و تەحەددای کردوون و پرسیاری لێکردوون و وەڵامی پرسیاری ئەوانیشی داوەتەوە لە: جوولەکە، مەسیحی، مەجووسی، موشریک، دەهری، مولحید، صابیئە وچەندین بیروباوەری تر.

٤١. مقصد تكوين الامة الشهيدة: دروستکردنی ئوممەتی شایەتیدەر، {وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا}.[1]

---

(١) (البقرة: ١٤٣).

ئوممەت نابێتە چاوەدێر بەبێ ئەوەی ئیسلام جێبەجێبکات.

٤٢. مقصد تكوين خير الامة: دروستکردنی باشترین ئوممەت، لەکاتێکدا ئەم ئوممەتە چاکترین ئوممەت بوو بە شاهێدی نەیارەکانیشیەوە، ئەو کاتانە بوو فەرمانی بەچاکە دەکرد، نەهی لە خراپە دەکرد، ئیمانی ڕاستەقینەی بە خوا بە دوارۆژ هەبوو.[١]

٤٣. مقصد تكوين الامة الواحدة: دروستکردنی ئوممەتی یەکگرتوو، هەتا هەنگاوێک لە خوا نزیک تر بین نزیک تر دەبین لە یەکتری.[٢]

٤٤. مقصد تكوين الامة الوسطية: دروستکردنی ئوممەتی میانڕەو و ناوەندگیر، میانەڕەوی ئەو خەسڵەتەیە کە دەبێت هەم تاک هەم کۆمەڵگە پێیەوە پابەند بێت، چونکە زیادەڕەوی، یان کورتڕەوی، (إفراط یان تفريط) هیچیان مەقبوول نیین.

٤٥. مقصد السلام العالمی: دروستکردنی ئاشتی جیهانی، ئەگەر بێت و ئاشتی و ئەمنییەت هەبێت، ئیسلام لە هەموو دینەکانی تر زیاتر سوود دەبینێت و گەشە دەکات، خوای گەورە ناوی ( السلام)ە، ئیسلام ناوی (السلم )ە، بەهەشت ناوی (السلام)ە، پەیوەندی نیوان خەڵک دەبێ سەلام و سەلام کردن بێت، ئەسڵ لە پەیوەندی نێوان خەڵک تەعاروف و سەلام و سیلم و ئاشتییە، شەڕکردن حاڵەتی نائاس اییە.

٤٦ مقصد التسامح الدينی والانسانی: لێبوردەیی ئایینی و مرۆیی، لێبوردەیی ئەو بنەمایەیە کە هەموو مرۆڤایەتی لەسەری کۆکە، کەس نییە بانگەشەی بۆ نەکات و شانازی پێوە نەکات، هەتا خوای گەورە لەگەڵ بێباوەڕانیشدا باسی ئەو ئامانجەی کردووە، وەک دەفەرمووێت: {فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ} [الحجر: ٨٥]

---

(١) (آل عمران: ١١٠).

(٢) (الأنفال: ٤٦).

صفح ڕوو لێوەرگێرانە بەجوانی، هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا﴾ [المزمل: ١٠] دان بە خۆتدا بگرە لەسەر ئەو قسانەی کە دەیڵێن و وازیان لێ بێنەو لێیان گەڕێ بە وازلێهێنانێکی جوان. هەروەها دەفەرموویت: ﴿فَٱصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا﴾.[1] واتە: «کەوا بوو خۆت ڕابگرە (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) بە خۆڕاگرتنێکی چاک و جوان. »

کەواتە (الصفح الجميل، والصبر الجميل، والهجر الجميل) لەگەڵ کافرانیشدا فەرمان پێکراوە چ جای لەگەڵ موسڵمانان.

٤٧. مقصد تكوين القوة: دروستکردنی هێز و قووەت، ئێمە کە باسی ئاشتی دەکەین مانای ئەوە نییە کە بڕوامان بە هێز نییە، بەڵام هێز بۆ بەرگریکردن و پاراستنی چەوساوە و موقەددەسات و مافی مرۆڤەکان و ڕەتکردنەوەی دەستدرێژییە، نەوەک داگیرکردن و خۆسەپاندن و قۆرخکردن و گەندەڵیکردن و مافی خەڵک بردن و...، وەک ئەوەی لە مرۆدا دەیبینین.[2]

٤٨. مقصد التعرف على الاعداء من الداخل والخارج: ناسینی دووژمنی ناوخۆیی و دەرەکی، هەرکەسێک ناحەزی دین و ژینی نەناسێت، دەکەوێتە داوی دوژمن بێ ئەوەی هەستی پێبکات، بەڵکوو جاری وایە خزمەتی دوژمن دەکەی بەخۆت نازانی.[3]

٤٩. مقصد ترتيب الاولوية في المصالح والمفاسد: ڕیزبەندی بۆ ئەولەویەت و سوودبەخش و زیان بەخشەکان، ئەمەش ئامانجێکی گەورەی قورئانییە، نابێت فرامۆش بکرێت، هەرکەس ئەولەویەت فەرامۆش بکات، دەستی خۆی دەبەستێت لە کارەکانی دین و دونیای، بەسەرهاتی مووسا لەگەڵ پیاو چاکەکە

---

(١) (المعارج: ٥).

(٢) (الأنفال: ٦٠).

(٣) (الممتحنة: ١).

کە ناوی «خدر» بوو ئەوەمان فێر دەکات: کە ئەم بەسەرهاتە لە ئایەتی ( ٦٠_٨٢،) واتە بیست و دوو ئایەتی لەم سوورەتە پیرۆزە گرتووە، لە چەندین شوێنی قورئاندا لە موناسەبەی جیاوازدا باسی کراوە.

٥٠. مقصد مراعاة الرخص والضروريات: ڕەچاوکردنی ڕوخسەت و پێویستییەکان، ئەسڵ ئەوەیە موسڵمان پابەند بێت بە عەزیمەت و فەرمان و نەهییەکان، ئەگەر هۆکارێک نەبوو لامان بدا لەم ئەسڵە، بەڵام ئەگەر هۆکارمان، هەبوو دەتوانین ڕوخسەت بەکاربێنین، بەڵکوو جاری وایە پێویست دەبێت، ئەسڵ وایە لە مانگی ڕەمەزاندا بەڕۆژوو بین، بەڵام ئەگەر نەخۆش بووین، یان لە سەفەر بووین، یان ئافرتان بیانووی تایبەتی خۆیان هەبوو بەڕۆژوو نابن. نوێژیش هەر وایە، بەڵام لە سەفەردا کۆدەکریتەوە و کورت دەکریتەوە، یان بەهۆی باران و نەخۆشی کۆی دەکەینەوە، یان بەهۆی شەڕ و مەترسی گۆڕانکاری زیاتریشی بەسەردا دێت. مردارەوەبوو حەڕامە بەڵام ئەی ئەگەر ناچار بووین؟ کوفر کردن جائیزە نییە بەڵام ئەدی ئەگەر فشارێکی ئەوەندە زۆرمان لەسەر بوو پێمان تەحەممول نەدەکرا؟ لە سیاسەتیشدا هەروایە، جاری وایە ناچاری لەگەڵ نەیارەکەت ڕێک بکەوی و بەڕواڵەت دەبێت تەنازوولیشی بۆ بکەی!

٥١. مقصد الاهتمام بالشئ على قدر اهتمام القرآن به: گرینگیدان بە شتەکان بە ئەندازەی گرینگیدانی قورئان پێی، ئەم ئامانجە زۆر گرنگە، جاری وایە ئێمە لەسەر شتێک شەڕ دەکەین کە بەلای قورئانەوە هەر گرنگ نییە، وەک ناوی سەلەفییەت، سۆفییەت، ئەشعەری، ماتووریدی، فڵان مامۆستا، فڵان مەنهەج، کە دانراوی فڵان کەسە، لە کاتێکدا قورئان داکۆکی لەسەر یەکبوون و شوێن قورئان کەوتن و ڕازیبوون بە ناوی موسڵمان و مردن بە موسڵمانییەتییە، بۆیە دەبێت ئێمە گرنگی بەوە بدەین کە ئیسلام گرنگی پێی داوە، ئەم خاڵە بابەتی هاوسەنگی و ئەولەوییەت دەیگرێتەوە.

٥٢. مقصدالاهتمام بالمادية والروحية: گرینگیدان بە هەردوو لایەنی ماددی و ڕۆحی، مرۆڤی موسڵمان دین و دونیا بەیەکەوە کۆدەکاتەوە بەبێ ئەوەی ناکۆکی بخاتە نێوانیان، دونیا و دواڕۆژ بەیەکەوە کۆدەکاتەوە، بێ ئەوەی پێی وابێت پێکەوە هەڵناکەن، پیکهاتەی ئێمە جەستە و ڕۆحە، نابێت بەشی هیچیان فەرامۆش بکەین. موسڵمان با دەوڵەمەند بێت، بەڵام بە حەڕام و لەسەر حسابی خەڵک نا، نابێت لە ڕێی خراپدا سەرفی بکات، ناکرێت بەشی هەژاران نەدات. هەربۆیە هەرکاتێک زەمی دونیا کرا، ئەوکاتەیە کە دەبێتە تاکە هیوا و ئامانج، قیامەت لەبیردەکرێت، دەنا دونیا کێڵگەی دوا ڕۆژە، پردی پەڕینەوەمانە بۆ دواڕۆژ، تاکە دەرفەتە بۆ ڕەزامەندی خوا و بردنەوەی گرەو لە شەیتان و شەیتان سیفەتەکان.[1]

٥٣. مقصد ضرورة تطبيق الشريعة: جێبەجێکردنی شەریعەت، قوڕئان بۆیە هاتووە تا کاری پێ بکرێت، نەوەک وەلا بنرێت، بۆئەوە هاتووە سەرچاوەی دەستووری یاساکانی ژیان بێت، نەوەک لەناو مزگەوتەکان و سەر ڕەفتەکان. دەیان ئایەت باسی جێبەجێکردنی یاساکانی قوڕئان دەکەن. دوو جۆرە کەس دەیانەوێت لەم بوارەدا فێڵمان لێ بکەن، یەکەمیان: ئەوانەی وادەزانن شەریعەت تەنیا پەیوەندی مرۆڤە بە خواوە و هەندێک بواری مەدەنی ئەحوال شەخسییە. دووەمیان: دەزانن بەڵام خۆیان لێ بواردووە لەبەر بەرژەوەندی. دوژمنە گەورەکانیش تەنانەت بە بوونیشمان قەڵسن چ جای فکر و تێڕوانینمان. بە دوو بەڵگە ئەم دینە بۆ جێبەجێکردن و تەتبیقە، یەکەم: دەقەکان زۆرن، دووەم: بەکردەیی زیاتر لە سێزدە سەدە جێبەجێکراوە. ئێمە ناڵێین کەم و کورتی نەبووە،بەڵام بە بەراورد بە بەرانبەرەکانی زۆر جوانتر و بەهێزتر و زانستیتر و واقیعیتر بووە. لەبەرانبەریشدا دەستمان بۆ شتێکی باشتر نەبرد، عەلمانییەت لە وڵاتانی خۆمان ئەوەی هەشمان بوو نەیهێشت، ئەو وڵاتانەی عالەمانییەتیان

---

(١) (الأعراف: ٣٢).

بەسەردا سەپاندین هەرئەوان سەرچاوەی نەهامەتی و پارچە پارچەبوون و هەژاری و ناکۆکیمان بوون.

٥٤. مقصد التيقن من خصائص القرآن: دڵنیایی بەرانبەر تایبەتمەندییەکانی قورئان، دەبێت دڵنیا بین کە قورئان چەند خاسیەت و تایبەتمەندییەکی هەیە کە لە هیچ پەرتووک و شەریعەتێکی تردا بوونی نییە، لەوانە:

خاصية مصدره الالهي: تایبەتمەندی ئەوەی کە لە خواوە سەرچاوەی گرتووە. (خاصية الحفظ): تایبەتمەندیی پاراستن. (خاصية التيسير): تایبەتمەندیی ئاسانکران. (خاصية الاعجاز): تایبەتمەندیی تەحەددا و ئیعجاز. (خاصية البيان): تایبەتمەندیی بەیان و ڕوونکردنەوە. (خاصية الكمال): تایبەتمەندیی تەواوی. (خاصية العموم): تایبەتمندیی گشتگیری. (خاصية الشمول): تایبەتمەندیی هەمەلایەنی. (خاصيه كونه خاتما للكتب السماوية): تایبەتمەندیی کۆتا پەیام بوون و کۆتاهێنەر بە پەیامە ئاسمانییەکان. (خاصية كونه واقعيا): تایبەتمەندیی واقعی بوون. (خاصية كونه مثاليا): تایبەتمەندیی میسالی ئەوەیە تا مرۆڤ بیەوێ باڵا بڕوا، قورئان مەجالی بۆ کردۆتەوە، بەس نابێتە پێغەمبەر. (خاصية حصول الاجر العظيم لقرائته): تایبەتمەندیی دەستکەوتنی پاداشتی زۆر بە خوێندنەوەی. (خاصية التناسق والسلامة من التناقض): تایبەتمەندیی بەیەکەوە گونجان و هەماهەنگی و بەبێ بوونی ناکۆکی و دژبەیەکی.

٥٥. مقصد الاهتمام باليوم الآخر: گرینگیدان بە دواڕۆژ، بەڵگەکان لەسەر ئیمان بە دواڕۆژ یەکجار زۆرن، لەقورئانی پیرۆز زۆر باسیکراوە، زۆر ناوی لێنراوە، دیمەنەکانی بە وردی بۆ ئێمە باسکراون، باسی قۆناغەکانی کراوە لە دەستپێکەوە کە دەستپێدەکات، نیشانەکانی دواڕۆژ، باسی تێکچوونی دونیا، باسی زیندووبوونەوە، قوناغەکانی دوای زیندووبوونەوە، تا کۆتا هەوار باسی دۆزەخ و بەهەشت. من سەر ژمیرم نەکردووە، بەڵام بەسەدان ئایەت باسی

دوارۆژمان بۆ دەكات. قیامەت گرنگە چونكە شوینی ڕەنگدانەوەی تەواوی فەزڵ و دادگەری پەروەردگارە، لەوێدا ڕاستییەكان هەموو دەردەكەون و وەڵامی هەموو پرسیارەكان وەردەگرینەوە.

٥٦. مقصد الایمان بالرسل: باوەڕ بە پێغەمبەران، پێغەمبەران _ سەلامی خوایان لێبێت _ ڕاستترین و زاناترین و دڵسۆزترین و پاكترین و لێهاتووترینی مرۆڤایەتین، ئەوان نوێنەری خوان بۆ مرۆڤایەتی، هەتا ئێستاشی لەگەڵدابێت ئەم مرۆڤە گەورانە بێ هاوتا و مونافیسن، ئەگەر لە هەموو ئەورووپا پرسیار بكەیت، بڵێیت كەسایەتی بێ ڕكابەر كێیە؟ بێگومان لە وەڵامدا دەڵێن: عیسای كوڕی مەریەمە، ئەگەر لە هەموو جیهانی سێهەم و زۆربەی وەڵاتان پرسیار بكەی كەسایەتی بێ ڕكابەر كێیە؟ دەڵێن: موحەممەدە، جا لای هیندۆسەكان و بوزاییەكان و... هەر وایە.

٥٧. مقصد الایمان بالكتب: باوەڕبوون بە پەرتووک و پەیامە ئاسمانییەكان، خوای پەروەردگار پەیتا پەیتا شەریعەتی ڕەوانە كردووە بۆ مرۆڤەكان، یاسای بۆ داناون بۆ ئەوەی سەریان لێ نەشێوێت و دین و دونیایان بە ڕێكوپێكی ڕایی بكەن، ئەم پەرتووكانە بەپێی پێداویستی و ئاستی خەڵكەكە بووە تا گەیشتە دوا قۆناغ كە قوڕئانی پیرۆز دابەزی، قورئان لە توانایدا هەیە _ بەكردەوەش سەلمێنراوە بەدەقە كانیش ڕوونە _ دوا پەیام بێت و وەڵامگۆی هەموو پرسیار و پێداویستییەكان بێت.

٥٨. مقصد الایمان بالملائكة: باوەڕبوون بە فریشتەكان.[1]

٥٩. مقصد الایمان بالقدر: باوەڕبوون بە قەدەر و قەزا. ئیمان بە قەدەر بریتییە لە چوار شت، یەكەم: بڕوابوون بە زانستی خوا، بڕوات بەوە هەبێت كە خوای گەورە هەموو شتێک دەزانێت. دوو: نووسینی پەورەردگار بۆ هەموو شتەكان،

---

(١) (البقرة: ٢٨٥).

ئەم نووسینە هەندێکی فریشتەکانی لێ ئاگادارکردووەتەوە، بەڵام زانیاری تەواو بەس لای خۆیەتی. سێیەم: ویستی خوا لەسەر بەدیهێنانی شتەکان. چوارەم: وەدیهێنانی شتەکان بەپێی زانست و نووسین و ویستی خۆی، خوای گەورە ستەم لە کەس ناکات، خوای گەورە تاوان بە کەس ناکات بە ناچاری، خوای گەورە مرۆڤی ئازادکردووە لە هەڵبژاردنی ڕێگای خۆی، لە کوێدا توانای مرۆڤ پەکی کەوت یان زۆر لەژێر فشاردابوو تاوانێکی ئەنجامدا گوناهبار نابێت.

٦٠. بۆیە باسی ئیمان (بالله) ناکەین، چونکە هەموو بابەتەکان باسی ئیمان بە خوای پەروەردگارن.

٦١. مقصد النهی عن الغلو فی الدین والصالحین: نەهی کردن لە زێدەڕۆیی لە ئایین و پیاوچاکاندا، هیچ دینێک نییە پارێزراوبێت لەوەی کە شوێنکەوتووەکانی زیادەڕەوی نەکەن، خوای پەروەردگاریش ئاگادارمان دەکاتەوە لەڕێی ئەهلی کتابەوە کە زیادەڕەوییان کردووە لە بەرزکردنەوەی مرۆڤەکان بۆ ئاستی بەخواکردن، وەک مەسیحییەکان کە کردیان. [1]

٦٢. مقصد الزجر عن التفریط فی حق الله والصالحین: ئاگاداری لە کەمتەرخەمی کردن لە مافی خودا و پیاوچاکان، ئەوەیان پێچەوانەی پێش خۆیەتی لە جاری یەکەمدا زیادەڕەوی دەکرا لە حەقی پێغەمبەران و پیاوچاکاندا، بەڵام لێرەدا باسی کەمتەرخەمییە لە حەق و مافی خوای گەورە، لە حەقی پێغەمبەران و پیاوچاکان، لەڕاستیدا جوولەکەکان پێشەنگی ئەم بوارەن.[2]

٦٣. مقصد الاهتمام بالمقاصد والعلل والاسرار والحکم والغایات: گرینگیدان بە مەبەست و هۆکار و نەهێنییەکان.[3]

---

(١) (النساء: ١٧١).

(٢) (المائدة: ٦٤).

(٣) ئا. حسن علی بۆسکێنی، بەدەستکارییەوە.

٦٤. مقصد إنشاء المجتمع السليم الراقي الحضاري: دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی ساغ و سەلیم و ڕاقی و شارستانی. هەربۆیە پێویستە کۆمەڵگەی موسڵمانان بەم شێوەیە بێت:

١. هەموو کەس ئازادی ئایینی هەبێت، هەرکەس ئازادە چ ئایینێکی هەبێت و کەس بۆی نییە زۆر لە کەس بکات بۆ ئایین گۆڕین و هەریەکێک لەوانە دەتوانن پەیڕەوی ئایینی خۆیان بکەن. بۆنموونە کەنیسە ومزگەوتوشوێنیپەرستنی خۆیان هەبێت و بەئازادی مومارەسەی ئاییندارى خۆیان بکەن.

٢. ئازادی بیروڕا، هەموو کەس ئازادە چۆن بیردەکاتەوە، هەتا کەسی مولحیدیش ئازادە، وەک خودای گەورە دەفەرمووێت:{فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر} واتە: «کێ باوەڕ دێنێت با باوەڕ بێنێت و کێش باوەڕ ناهێنێت با باوەڕ نەهێنێت و ئازادە.» هەرچەند ناباوەڕ بڕوای بە خودا و قورئان و پێغەمبەر و ئایین و دواڕۆژنییە، بەڵام ئازدە و کەس ناتوانێت ڕێی لێبگرێت و ئازادی لێ زەوت بکات، بەو مەرجەی سنووری خۆی تێنەپەڕێنێت و سووکایەتی نەکات بە بەرانبەرەکانی.

٣. مافی ئابووری، هەموو کەسێک دەبێت مافی ئابووری و کارکردن و ئیشکردنی هەبێت و نابێت ڕێگری لە هیچ کەسێک بکرێت لەبەر ئایین و بیروڕای جیاواز.

٤. مافی سیاسی، مافی سیاسی کراوەیە و نابێت بەهیچ جۆرێک قۆخکاری سیاسی هەبێت.

٥. مافی خاوەنداری ماڵ و موڵک.

٦. مافی خوێندن و بەدەستهێنانی زانست و زانیاری.

٧. مافی کۆمەڵایەتی.

٨. ڕێز، هەموو کەسێک دەبێت ڕێزی تەواوی لێبگیررێت و کەس نابێت بێڕێزی پێبکرێت لەبەر جیاوازی ئایین و بیروڕا و دەنگ و ڕەنگی جیاواز.

٩. مافی ژیان، هەموو کەسێک مافی ژیانی هەیە.

**١٠.** یەکسانی بەرانبەر یاسا، هەموو کەس وەک یەکە بەرانبەر یاسا، وەک پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت: «وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا ».[1] «ئەگەر فاتیمەی کچم دزی کردبا، دەستم دەبڕی.»

**١١.** یەکسانی بەرانبەر قەزا.

**١٢.** یەکسانی بەرانبەر وەزیفە و دامەزراندن.

**١٣.** یەکسانی نێوان ژن و پیاو. پیاو و ژن یەکسانن، یەکسانن بەرانبەر خودا، خەڵک، ئایین، حوکوومەت، دەستەڵات، سیاسەت، ئابووری و... هتد، ژن و پیاو لە تێڕوانینی ئیسلامدا هیچ جیاوزییێکیان نییە و کەسیان لە کەسیان بەڕێزتر و گەورەتر نییە، بەڵکوو گەورەیی بە خوداناسی و تەقوا و خۆپارێزی و ڕەوشتە وەک خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾. [الحجرات١٣] بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتان کەزۆرتر لەخواترسەو فەرمانبەرداری خوایە. مەبەستمان لە یەکسانی ئەوە بوو کە باسمانکرد، نەک بە مانا جێندەرییەکەی کە پێیانوایە دەبێت لە هەموو شتێکدا یەکسان بن و نابێت جیاوازی ڕەگەزی بمێنێت!

**١٤.** ڕەچاوکردنی لێهاتوویی و کارامەیی لە پلە و پۆست

**١٥.** دژایەتیکردنی گەندەڵی و خراپەکاری، واجبە لەسەر هەموو کەسێک لە ئاست خۆیی و بەپێی توانای خۆی دژایەتی گەندەڵی بکات، وەک پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت: «من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه وذلک أضعف الإيمان.»[2]

**١٦.** دژایەتیکردنی ستەم، واجبە هەرکەسە و لە ئاست خۆیی و بەپێی توانای

---

(١) رواه البخاري (٣٤٧٥)، ومسلم (١٦٨٨).

(٢) رواه مسلم: ٤٩. وأبو داود: ١١٤٠. والترمذي: ٢١٧٢. والنسائي: ٥٠٠٩. وابن ماجة: ١٢٧٥. وأحمد ١١٠٧٣.

خۆی دژایەتی ستەم ستەمکاری بکات، بەڵام بە حیکمەت و لێزانی نەک بە کوێرانە، بۆیە پێغەمبەر ( دروودی خودای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت: «أفضل الجهاد: كلمة حق عند سلطان جائر».[1] «باشترین جیهاد وشەی حەقە لەلای دەستەڵاتدارێکی زاڵم.»

١٧. ژنان بۆیان هەیە بەژداری تەواو و کارایان هەبێت لە کایەجیاوەزەکانی پەروەردە، فێرکردن، فێربوون، ئابووری، حکومەت و دەستەڵات و چەندین بواری تر.

١٨. هیچ کەس مافی دەستدرێژی بۆ سەر کەسی بەرانبەر نییە. هەرکەسێک دەستدرێژی بکات، دەبێت بە ئەندازە و ڕێکاری تایبەتی خۆی سزا بدرێت.

١٩. پێکەوە ژیان، نابێت ئایین و بیروڕا و بۆچوون و ڕەنگ و دەنگی جیاواز و پێکەوە ژیان و بەیەکەوە ژیان تێک بدات و دوژمنایەتی دروست بکات، بەڵکوو پێویستە هەموویان بەیەکەوە بژین. ژیانی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێت.) مەزنترین نموونەی ئەو پێکەوە ژیانەیە.

٢٠. پەیوەندی هەبوونی وڵات و کۆمەڵگەی موسڵمان بە وڵات و کۆمەڵگە جیاوازەکانی جیهان

٢١. دەرگاکردنەوە و واڵاکردنی وڵات و کۆمەڵگە بەسەر جیهان و سوود بینین لە شارستانییە جیاوازەکان و سوود بینین لە زانست و بوارە سوودبەخشەکانیان.

٢٢. یارمەتیدانی موسڵمانان لە نێوان خۆیان و غەیری خۆیان، هەتا ئەگەر بیروڕاشیان جیاواز بێت، یان کەسێکی دورەدەست لەو سەری دونیا پێویستی بە یارمەتی هەبێت و کارەکەی مەشروع بێت، پێویستە یارمەتی بدرێت.

٢٣. کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ بە ڕووی ئایین و بیر و ڕا جیاوازەکان بە ئازادانە، ئیسلام هەرگیز نەترساوە و ناشترسێت لە گفتوگۆ و گەنگەشەکردنی پرس و بابەتە جیاوازەکاندا، بۆیە پێویستە دەرگا واڵا بکرێت بۆ هەموو بیروڕا

---

(١) النسائي: ٤٢٠٩. وأحمد: ١٨٨٢٨.

جیاوازەکان، خودای گەورە ڕێی بە شەیتان دا گفتوگۆی لەگەڵدا بکات و هەمووشی تۆمارکردووە لە قورئاندا و ئەو گفتوگۆیە هەتایە دەمێنێتەوە. بۆیە ئەگەر بڕوانییە قورئان پڕیەتی لە گفتوگۆی نەیاران و دوژمانان، کەواتە ئەگەر دوژمنیشت بێت، حەقی گفتوگۆی هەیە و دەبێت بواری تەواوی پێبدرێت کە بیروڕای خۆی دەرببڕێت بەبێ هیچ فشار و ڕێگرییەک.

٢٤. ئازادیدان بە ڕێبازە جیاوازەکان، ڕێبازە جیاوازەکانی ناو ئیسلام، بۆنموونە هەرکەس ئازادە لە ڕووی فقهییەوە پەیڕەوی چ مەزهەبێک دەکات، «حنفی، مالکی، شافعی، حنبلی،...» هەروەها لە عەقیدەدا «ئەشعەری، ماتریدی، سلفی،...» و مەزهەبەکانی تریش، واتە کەس بۆی نییە مەزهەبێکی فیکری و عەقیدەیی یان فقهی و تەزکیەیی و تەسەوفی زاڵ بکات. هەروەها بۆ ئایینەکانی تریش ئازادن پەیڕەوی لە چ مەزهەبێکی خۆیان دەکەن، بۆنموونە نەسرانییەکان ئازادن لە «کاسۆلیکی، ئەرسۆذوکسی، پرۆتستانت،...»

کەواتە بە کوردی و بەکورتی دەبێت: ئازادی، دادگەری، ڕێز، یەکسانی، برایەتی و تەبایی پارێزراوبن و هەرشتێک دژی ئەوانە بن، دەبێت بە پێی ڕێکار و ڕێ و شوێنی خۆی دژایەتی بکرێن و ڕێی لێ بگیردرێت[1].

---

(١) بەڵگەی ڕوونیش بۆ ئەوەی کە ئیسلام باوەڕی بە پێکەوە ژیان هەیە ئەوەیە کە بڕوانە هەموو وڵاتانی ئیسلامی هەموو ڕەنگ و ئایینە جیاوەزەکانی تێدا بوون، بڕوانە کوردستانی خۆمان کە مەسیحی و جوولەکە و یەزیدی و ...هتد، هەبوون و هەشن و بە هاوڵاتی پلە یەکیش چاویان لێکراوە و پەرستگا و شوێنە ئایینییەکانیشیان ماوە و پارێزگاریان لێکراوە.
بەڵام دەبێت ئەوەش بوترێت: ئازادی سنووردارە و نابێت سنوورەکان ببەزێنرن و بە ناوی ئازادییەوە مرۆڤایەتی تووشی ناهەمەتی و ئازاردان بکرێت.

# فەلسەفەی «مەبەستی» شەریعەت (فلسفة ومقاصد الشريعة)

فەلسەفە و مەبەستەکانی شەریعەت بریتینلەو مەبەستانەی لە پشتی دەقەکانەوەن، یان لە پشتی هەموو فەرمان و نەهێیکەوەن، یان لە پشت هەموو حوکمەکانی ئایینەوەن، لە حەرام و حەڵاڵ و واجب و سوننەت و...، هەموو حوکمەکانیش بۆ ڕاستەڕێبوون و خۆشبەختیی دونیا و قیامەتە، لە ژیانی تاک و خێزان و نەتەوە و ئوممەتدا.

کەواتە بەرنامە و ئایینی خودا هەمووی مەبەستدارە، لە کۆتاییشدا هەمووی بۆ بەرژەوەندیی دونیا و دواڕۆژی خۆیەتی.

**مەبەستەکانی شەریعەت**

## مەبەستەکانی شەریعەت بۆ تاک

**١.** پاراستنی ئایین، بە عەقیدە و ڕەوشت و عیبادەت و مامەڵەوە[1]

**٢.** پاراستنی نەفس[2]

**٣.** پاراستنی عەقڵ و هۆش[3]

---

(١) هەموو ئەم مەبەستانە بەڵگەی خۆیانیان هەیە:
{وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ} [الذاريات، ٥٦.]
{رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا}. [ النساء، ١٦٥.]

(٢) {وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ}. [ البقرة، ١٧٩]
{وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا} [الفرقان، ٦٨]

(٣) {وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا} [ طه، ١١٤]

٤. پاراستنی نەسل[١]

٥. پاراستنی ماڵ و سەروەت و سامان[٢]

هەر بۆیە ئیسلام هەموو شتێکی داناوە و هانیداوە کە خزمەتی ئەم پێنجانە بکەن، هەروەها هەموو شتێکیشی حەرام کردووە کە زیان بەم پێنجانە بگەیەنێت.

## مەبەستەکانی شەریعەت بۆ خێزان

١. ڕێکخستنی پەیوەندی ژن و مێرد

٢. دانانی ئەرک و ماف لە نێوانیاندا و ڕەچاوکردن و پاراستنی هاوسەنگی لە نێوانیاندا

٣. پاراستنی نەسل و وەچە و منداڵ

٤. دابینکردنی ڕەحمەت و خۆشەویستی و هاوکاری و ...، لەنێوان ژن و مێرددا

٥. پاراستنی نەسەب

٦. پاراسەنی ئایین و ڕەوشتی خێزان

## مەبەستەکانی شەریعەت بۆ ئوممەت

١. ڕێکخستنی کاروباری ئوممەت

٢. پاراستنی ئاسایش

---

(١) ﴿وَلاَ تَقْرَبُوا الزِّنَا إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً﴾ [الإسراء: ٣٢]

(٢) ﴿وَلاَ تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا﴾. [النساء، ٥]

٣. دادگەری

٤. یەکسانی

٥. پاراستنی ئایین

٦. پاراستنی ڕەوشت

٧. پاراستنی نەسل و نامووس

٨. پاراستنی بیروباوەڕ و فکری ئوممەت

٩. پاراستنی سەروەت و سامانی ئوممەت

١٠. هاوکاری و یارمەتیدان

١١. برایەتی و خۆشەویستی

١٢. بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری

١٣. ئاوەندانکردنەوەی زەوی

١٤. خزمەتکردی مرۆڤایەتی بە هەموو جۆرەکانییەوە

## مەبەستەکانی شەریعەت بۆ مرۆڤایەتی

١. یەکترناسین

٢. پێکەوەژیان

٣. هاوکاری و یارمەتیدانی یەکتری

٤. ئاشتی جیهانی

٥. پاراستنی مافەکانی مرۆڤ

٦. بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلام

ئەمانە بریتی بوون لە مەبەستەکانی ئیسلام بۆ تاک و خێزان و ئوممەت و جیهان.

ئەمانەی کە باسمانکردن زانایانی ئیسلام ناویان ناوە (مقاصد الشريعة)، واتە مەبەست و مەقاصیدی شەرع و دین، ئیسلام و هەموو دینەکانی مرۆڤایەتیش بۆ پاراستن و پاریزگاریکردن لەو هێڵە گشتی و بنچینە و زەروریات و پێداویستیانە هاتوون کە مانەوە و بەردەوامی بوون و بەردەوامی ژیان لە سەر زەوی بەمانەوەی ئەو مەبەستانەوە بەستراوە.

جورجانی «مەبەست» بەوە پێناسە دەکا: بریتییە لەو ئامانجەی کە شتەکە لەپێناوی بوون و مانەوەی ئەو ئامانجەدا بەدیهێنراوە.

مەبەستەکانی دین و شەریعەتەکانیش ئەو تێگەیشتن و مەبەستانەن کە دین وشەرع و یاسا و ڕێساکان لە پێناوی مانەوە و بەردەوامی و پاراستنی ئەو مەبەستانە دانراون. تێگەیشتنی مەبەستەکانیش هەروا ئاسان نییە، چونکە لەنێوان هاتنی قورئان و دۆزینەوەی پێنج مەبەست و مەقصەدی شەریعتی ئیسلام نزیکەی ٤٠٠ ساڵە، چوار نەوە و سەدە ئیسلام تاووتوێ دەکرا، ٤٠٠ ساڵی ئوممەتێکی بڵاوبووەوە لە سێ کیشوەری جیهانی کۆن کۆکردەوە، ئەو پێنج مەبەستەی دەرک پێکرد کە بریتین لە: پاراستنی دین، عەقڵ، ژیان – نفس-، وەچە، نەسل و ماڵ.

پاراستنی ئەم پێنج پایانە لەناو هەموو ئایینە ئاسمانییەکاندا مەبەستە، ئیستاش مەرج نییە ئەمە کۆتایی بێت و هاتنی شەرع و دینەکان هەر بۆ ئەم پێنج مەبەستە بێت، ئێمە لێرەدا حەوت مەبەستی دیکە باس دەکەین، ئەگەرچی هەندێکیان بچنە ناو هەندێکی تریان.

**مەبەست و مەقصدەکانی شەریعەت:-**

**یەکەم:** ژینگەپارێزی و پاراستنی ژیانی سروشتی: ژینگەپارێزی بریتییە لە پاراستنی هەموو بوارەکانی ژینگە لە پاراستنی ڕووەک و درەخت و... هتد. ئەم مەبەست و مەقسەدە زۆربەیدەقەکانی شەرع و دینەکان و بەتایبەتیش شەریعەتی ئیسلام خەڵکی هەڵناوە لەسەر پاراستنی دارودرەخت و ڕووەکەکان:

لە حەجدا لێکردنەوەی پەلکە گەڵایەک و پنجە گیایەک حەجەکە لە کەدار دەکا، لە ڕاسپاردەی خەلیفە ئەبووبەکر بۆ ئەو سوپایەی بۆ جیهاد دەنێردرێت، ئەوەبوو کە دارودرەخت مەبڕن. هەروەها زۆر فەرموودە و ڕووداوی دیکەش هەن مرۆڤ هەڵدەنێن لەسەر پاداشتی گەورەی چاندن و ئاودانی کشتوکاڵ ودرەختەکان، پەیامبەر - علیه السلام - بۆ خۆی شتڵە دارخورماکانی لە گەڵ سەلمانی فارسی چاندن، چوو بۆ ناوباخەکەی جابری کوڕی عبدالله و دوعای بەرەکەتی فەرموو لەسەر مشتاغی خورماکە، ئەو هەموو ئایەت و فەرموودانەی هاتوون بۆ ڕێکخستنی شێوەی ژیانی: جوتیاران لە جوتیاری ومزارعە و ئاودێری مساقات و قەرزی سەلەم و زەوی بەکرێدان وهەڵنان لەسەر زیندووکردنەوەی زەوییە مردوەکان، گرنگیدانی ئیسلام بە سوودگەیاندن بە باڵندە و گیاندار و مێروولەکان کە ئەوانیش ئوممەتن وتەسبیحات دەکەن، ژیان و بژێوی ئەوانیش لەسەر کەرتی کشتووکاڵە، ئەمە جگە لە وەی کە ئێستا زانست دەریخستووە کە درەخت و ڕووەکەکان هەوای هەناسەی ئێمە و گیانەوەران بەرهەمدێنن، کەمبوونەوەیان دەبێتە هۆی نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەناسە و جۆرەها نەخۆشی کوشندە و ترسناک. جا بەپێی ڕێسای: (ما لا یتم الواجب إلا به فهو واجب.) ئێمە دەزانین کە پاراستنی ژیانی مرۆڤ و ماڵی مرۆڤ بەشێکە لە زەرووریيەتەکان و مەبەستەکان، ئەم دووانەش ناپارێزرێن تا دارستان و ڕووەکەکان پارێزراو نەبن، کەواتە ژینگەپارێزی بەم ڕێیەش هەر یەکێکە لە مەبەستەکان.

**دووەم:** پاراستنی ژیان و زیندەگی ئۆرگانی و زیندەوەران لە مرۆڤ و باڵندەکان و ئاژەڵەکان و هەموو جۆری گیانەوەران، تەنیا چەند گیانەوەرێک لەم هاوکیشە جیاکراوەن لە هەندێک شەرع و دین، وەک لە ئیسلامدا فەرمان کراوە بە کوشتنی سەگی هار و مار و دوپشک و...

ئەم مەبەستە لای زانایانی پێشین بەتەنیا باسی پاراستنی مرۆڤی کردووە، بەڵام هەموو ئاژەڵ و گیانەوەر و پەلەوەرەکان لە ناو شەرع و لە دەقەکانی قورئان وسونەت و ئیجتهادی فەقیهەکان باس لە ڕێکخستن و بەخێوکردن و بەڕێوەبردنی ئاژەڵداری و پەلەوەر کراوە و لە فقهی موعامەلات جێی دیاری هەیە، هەروا لە بەشی عیباداتیش قوربانی و فیدیە و هەدیەی حەج بە جۆرە ئاژەڵێک دەکرێت کە چاودێری تەواوی کرابێت و مافی لەوەڕ و جێی حەوانەوەی باشی بۆ دابین کرابێت. جا کە حەج فەرزبێت، ئەو فەرزەش بێ سەربڕینی ئاژەڵی بێ لەکە و کەموکوڕی تەواو نابێت. کەواتە دەبێت پاراستنی گیانەوەران و ئاژەڵانیش فەرز بێت و مەبەستێکی شەرع بێت.

**سێیەم:** پاراستنی پاکیێتی ناوەندی بەرگە هەواو وشکانی و دەریایی.

ئایەت و فەرموودە و فیقهناسەکان زۆر باسی پاکوخاوێنی و مەرجەکانی ئاوی پاکیان کردووە، سووتاندنی گژوگیا و مێروو و تەنانەت تاوانباریشیان بەئاگر حەرامکردووە، تا نەبێتە بیانوو بۆ پیسکردنی ژینگەی ئاو و هەوا. شەرع کوشتنی بۆقی حەرامکردووە چونکە مێش و مەگەزە زیانبەخشەکان دەخوات، هەر یاسا و پاوانکاریەک کە ئەمڕۆ دابنرێت و زاناکان بۆ کەمکردنەوەی پیسبوونی بەرگەهەوا هەر جۆرە پابەندی و یاساغێک لەسەر کارگە و سووتەمەنی ژەهراویکەر و هەر دروستکراوێک کە هەڕەشە بێت بۆ هێلانەی مرۆڤایەتی، ئەوە گوێڕایەڵی فەرزە، چونکە مانەوەی هەموو مەبەستەکانی دین و مرۆڤایەتی بەندن بە مانەوەی سەلامەتی هێلانەکەیەوە لە دەریا و وشکانی و هەوادا. زۆر هاوکێشەی قورئانیش دەرکەوتنی بەدکاری و خراپی و گەندەڵی لە دەریا و وشکانیدا دەگێڕنەوە بۆ

ئەو کارانەی کە مرۆڤ بەدەستی خۆی دەیکا ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾[1] هۆی لەناوچوون و بنەبڕبوونی میللەتانیش دەبەستێتەوە بە بەدکاری دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتو و دەسەڵاتدارانی ئەو میللەتانە ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا﴾[2]

**چوارەم:** پاراستنی وەچە و نەوە و ناموس. پاراستنی ناموسیش بۆ پاراستنی وەچەیە، چونکە خێزان و داوێنپاکی باوەشی گەرمی منال و جێی پەروەردەبوون و بەخێوکردنیانن، بە پێچەوانەی منالّی زۆڵ کە ئەگەر فڕێ نەدرێتە لاکۆڵان و نەمرێت بە مەلۆتکەیی، بە گەورەیی و گەنجی هەروای لێدێ و لە ئەنجامی ئەوە یان دەبێتە قین لە دڵ بەرانبەر مرۆڤایەتی، یان دەبێتە بار بەسەر کۆمەڵگاوە و بەمەش مشەخۆری لەناو جیهان دروست دەبێت، نموونەی پاراستنی نەسل و وەچە:

بیگومان لەسەدەکانی کۆن نە منداڵی بلوری -أنبوب- و نە بانکی مەنی و سپێرم و نە چاندن و زەرعکردنی منالّ لە ڕەحم و نەکۆپی کردن لە خانەی خودی مرۆڤ... ئەمانە هیچی نەبوو، ئا لێرەدا شەرع و نوژداری و پێوەرەکانی ڕەوشت کۆدەبنەوە و بڕیارێک بۆ ئەو داهینراوە نوێیانە دەردەکەن کە ئەوانیش تاچەند بەشداری لە پاراستنی نەسل بکەن، بەشداری ئەم ڕەوتە دەبن و دەبنە پارێزەری مەبەستێکی شەرع؟

ئەم مەبەستەش لای زانایانی کۆن بە یەکێک لە مەبەستەکان دانراوە و لەبەر ئەو حەددی زینا و مارەکردن و خێزانداری و یاسا و و شەرعی- فقهی باری کەسێتی و ئەحواڵی شەخسی - بۆ دانراوە.

**پینجەم:** پاراستنی ئەخلاق و ڕەوشت و باو و نەریتە ئەرێنی و ئیجابییەکان

---

(١) الروم: ٤١.

(٢) الإسراء: ١٦.

ئەوەی کە زانایانی ئوسوول پێی دەڵێن: مەسالیحی مورسەلە و بەرائەی ئەسڵی، دینەکان کاتێک هاتوون کە مرۆڤایەتی لە هەندێک ڕووەوە لەو بەرائە ئەسلییە لای داوە و زیادەڕەوی کردووە، دین و شەرعەکان هاتوون ئەو لادانەیان چاککردووەتەوە، هەر بۆیە زانایان کە باس لەهاتنی دین دەکەن، دینی نووح بەیەکەم دین دادەنێن، چونکە ئادەم و وەچەکانی لە سەر ڕەوشتی فیتریی پاک بوون، بۆیە قورئان کە باسی تەشریعی دین دەکا لە نووحەوە دەستپێدەکات. کەواتە ئەخلاق و ڕەوشت و نەریت و باو و تەقالید و عادات لە دینەکان کۆنترن. هەر ڕەوشتێک و نەرینێک شەرع باسی نەکردبێت بەدیاردەیەکی خراپ باسی نەکربێت و هەمواری نەکردبێت، ئەوە مانەوەی فەرزە و لە جێی خۆی ماوەتەوە و لە ڕێسا گشتگیرە ئیسلامیەکانیش ئەوەیە: (العادةُ مُحَكَّمَةٌ). واتە: عادەت و عورفی باش و چاک حەکەمە لە نێوان خەڵکیدا و دەبێت کاری پێ بکرێت، هەر بۆیە عورف یەکێکە لە سەرچاوەکانی شەریعەت.

کەواتە مادام عادەت حوکمی پێ بکرێت و فەرمانێکی پەیڕەوکراو بێت، مانەوە و پاراستنی ئەرکێکی دینییە و مانەوەی مەبەست و پێویستە.

پەیامبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت: «إنَّما بُعْثتُ لِأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الأَخْلاقِ»[1] «تەنیا بۆ ئەوە نێردراوم پایەکانی ڕەوشتە باڵاکان تەواو بکەم.»

**شەشەم:** پاراستنی دینەکان و بنەما ئیمانی و بیروباوەڕی و فقهی و تیگەیشتن و شەرعی و ئوسوولی و هەر بنەمایەک کە دەبێتە هۆی پاراستنی دین و یاسا و و شەرع, هەڵبەت پاراستنی هەموو دین و شەرعەکان مەبەستە، بۆیە دەبینین کە ئەوەی دینی ئیبراهیم و کوڕانی ئیسرائیل و یەهوودییەتی لە دینێکی ناوچەگەریی و شوێنێک کردە دینێکی بڵاوبووەوە، ئەو نسکۆیانە بوو کە بەهۆیەوە ناچاربوون بچنە میسر و شام و سەبی بکرێن بۆ عیراق و ئێران، تا دینەکە بڵاوببێتەوە، لە

---

(١) أخرجه أحمد (٨٩٣٩)، والبخاري في }الأدب المفرد)) (٢٧٣) واللفظ لهما، والبزار (٨٩٤٩) باختلاف يسير.

ئیسلامدا وا بۆ هەزاران ساڵ دەچێت کە هەموو دینەکان پەرستگا و شەرع و بازاڕ و ژیانی تایبەتییان پارێزراوە، ئەوە دەیسەلمێنێت کە مانەوە و پاراستنی شەرع ودینەکان مەبەستێکە لە مەبەستەکانی ئیسلام.

**حەوتەم:** پاراستنی ژیان و گیان و ڕۆحی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و بەتەنگەوەبوونی.

بۆ ئەم مەبەستەش هەموو (فقهی جنایات) لە «قیساس» و تۆڵە کردنەوە و خوێن وەرگرتن و هەموو جۆرەکانی تۆڵە بۆ پاراستنی گیانی مرۆڤ لە شەریعەتدا هاتوون.

**هەشتەم:** پاراستنی عەقڵ و بیر و هۆش و بۆچوون و دانایی و زانست و هەموو چەشن و لقەکانی زانست، ئەم مەبەستەش لە لایەن زانایانی ئوسووڵ باسکراوە، دەڵێن: حەرامکردنی مەیی و بێهۆشکەرەکان بۆیە حەرامە، چونکە زیان لە عەقڵ دەدات، هەموو جۆرەکانی قومار بۆیە حەرامن چونکە مرۆڤ بەکاری نەشیاو خەریک دەکەن و ناهێڵن بە وەرگرتنی زانست و پەرەدان بەعەقڵ و هۆشی خەریک بێت، لەگەڵ ئەوەش کە خواردنی ماڵ و سامانی یەکدییە بە ناحەق.

لەم سەردەمەش هەرچی ببێتە هۆی بێهۆشکردنی مرۆڤ لە مادە هۆشبەرەکان قەدەغە دەکرێن بۆ پاراستنی عەقڵ و هۆش.

هەروەها کردنەوە و نۆژەنکردنەوە و پاراستنی خوێندنگا و زانکۆ و بنکەی لێکۆڵینەوە و کتێبخانە و تاقیگە و مۆزەخانەکان و هەر دامەزراوەیەکی تریش کە ببێتە هۆی پاراستنی یادەوەری و ڕۆشنبیری و ئەرشیفی کەلەپووری عەقڵ و هزری مرۆڤایەتی پاراستن و مانەوەی فەرزە و مەبەستێکە لە مەبەستەکانی شەریعەت.

**نۆیەم:** پاراستنی سەروەت و سامان و ماڵ و موڵکی جێگیر و گوازراوەکان، ئەم مەبەستەش لە ناو شەرعدا چاودێریکراوە، ڕیبا و هەموو جۆرە گزیکاری و قومار و بەفیڕۆدانی ماڵ لەپێناوی پاراستنی ئەم مەبەستە حەرامکراوە و بۆ پەرەپێدانی

کڕین و فرۆشتن و بازرگانی و کەرتی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و پیشەسازی ڕێکخراوە.

فقهی سەودا و ئاڵوگۆڕ _ فقه المعاملات _ سەدان بەرگ و کتێبی بۆ نووسراوە بۆ پاراستن لە حەرام. پاراستنی مەبەستی ماڵ لە قورئان وسونەت باسکراون و زانایانیش زۆر گرنگیان پێداون.

لەسەردەمی پەیامبەر و ئەبووبەکر بەیتولمال نەبوو، هەروەک (دیوان الجند) و سەربازیش نەبوو، بەڵام هورموزانی فارسی ئەم ئەزموونانەی دەوڵەتی فارسی بە ئیمامی عومەر گوت، ئیمامی عومەر کە دەیزانی دین و شەریعەت بۆ پایەدارکردنی دادگەری و نەهێشتنی ستەم و مافپارێزی بۆ هەموو چینەکان هاتوون، ئەگەر دیوانی سەربازی و بەیتولمال لە پاراستن و بەدیهاتنی ئەم مەبەستانەمان نزیکتربکاتەوە و بەرکەوتەشی نەبێ لەگەڵ مەبەستەکانی تر، کەواتە هێنانی بۆ ناو ئیسلام بەشێکە لە شەرع.

لەم سەردەمەشدا بانک و پەرلەمان و زۆر ئەنجومەن و دەسەڵات و دەزگای دیکە ئەوانیش ئەم مەبەستانە دەپارێزن بانک ماڵ دەپارێزێت، دەکرێت بانک لە ڕیبا پاک بکرێتەوە، بانقیش وەک فەرمانگەی کەسێتی وایە، لەو فەرمانگەیە دەتوانیت قەسامە و دابەشکردنی میرات بەشەرعی دەرکەیت و گرێبەستی نێوان هاوسەران بەپێی مەرجەکانی شەرع بێت، دەشکرێت لەو فەرمانگەیە گرێبەستی هاوڕەگەزبازی و دابەشکردنی میراتی ناشەرعییشی لێدەکرێت.

بەمشێوە هەموو وەزارەت و دەزگا و دامەزراوەکان دوولایەنەن و دەتوانرێت چاک وخراپیان تێدابکرێت، پەرلەمان کە هەندێک بە شوێنی شەرعدانانی دەزانن، دەتوانرێت بکرێتە ئەنجومەنی موجتەهید و شەرعزانەکان و پسپۆڕان لە دەقەکانی قورئان وسونەت مەبەست و بنچینەکان بدۆزنەوە و هەڵێنجن و ڕێکاری پاراستنیان بۆ فراوان بکەن، بوونی ئەنجومەنێکی لەو شێوەیە بۆ

حوکمڕانی ئیسلامی فەرزی عەینە و بەبێ بوونی ئەنجومەنی موجتەهیدان فەرمانڕەوای ئیسلامی تووشی هەرەسهێنان دەبێت.

**دەیەم:** پاراستنی عەدالەت و دادگەری و ئەمن و ئاسایش و تەناهی و مافەکان و هاوسەنگی هاوکێشەکان، یەکێک لە مەبەستە هەرە سەرەکیەکانە بۆ هاتنی وەحی و شەرع و دین، چونکە یەکێک لە سەرەکیترین ئەرکی پەیامبەران و هەواڵدەرەکان بریتی بووە لە بەرقەرارکردنی تەرازوی عەدالەت و داد و ژیانی موعتەدیل و هەموار و هاوسەنگ و دوورکەوتنەوە بووە لە توندڕەوی و دەمارگیری و ئاستەنگی و قڕی و پڕی، هەموو دینەکان و شەرعەکان، کە سەیری ژیانی کاریزما و دامەزرێنەرانیان بکەی بە نواندنی هەڵسوکەوتی هەموار و هاوسەنگ و دادگەرانە دەناسرێنەوە. خودا لە قورئاندا ئەم مەبەستەی زۆر بە ڕوونی فەرمووە، کە هەموو دین و شەرع و پەیامبەرەکانی بۆ نەهێڵانی ستەم و بەرقەرارکردنی دادگەری ڕەوانە کردوون.

کەواتە مانەوە و پاراستی دادگەری مەبەستێکە لە مەبەستەکانی شەرع ودین.

هەر دام ودەزگا و ئەنجومەن و هۆکار و ڕێوشوێنێکیش ئەم مەبەستە بپارێزێت، ئەویش بوون و مانەوەی شەرعییە وبەشێکە لە دینداری.

**یازدەیەم:** پاراستنی پیشە، کار، بەهرە، هونەر، خولیا، ئەدەب، شارەزایی و داهینان و هەموو ئەو ئامێر و هۆکارانەش کە یارمەتی مانەوە و بەردەوامی ئەم مەبەست و بوارانەی سەرەوە دەدەن.

ئەم بوارانە زۆربەیان بۆ پارێزران و مانەوەی یەکێک یان چەند دانەیەک لەو مەبەستە شەرعیانەی پێشوو کە باسکران پێویستن و بەبێ مانەوەیان کەشتی ژیان ژێرئاو دەبێت و هێلانەی جیهان وێران دەبێت.

جا بە ڕێسای (ما لا يَتِمُّ الواجِبُ إلا بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ)، ئەم خاڵی یازدەمەش

دەبێتە شتێکی واجب و پێویست لە لیستی مەبەست و پارێزراوەکانی دین وشەرع.

**دوازدەیەم:** پاراستنی تەندروستی و هێز و سەروەری و سەرداری و سەربڵندی و شکۆمەندی و پاراستنی توانا جەستەیی و عەقڵی و بیری و کرداری و و پاراستنی ئامرازەکانی داهێنانلە هەموو بوارێکدا، چونکە عەقڵی سەلیم و دینداری سەلیم و کۆمەڵگەی سەلامەت پێویستی بەتەندروستییە. چونکە عەقڵی ساغ و سەلیم لە جەستەیساغ و سەلیم دایە، بەبێ بوونی عەقڵی ساغیش، ناتوانین بەساغی لە دین و شەرع و جیهانبینی بگەین، کەواتە تەندروستی و هۆکارەکانی تەندروستی جەستەیی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و ڕۆحی و ڕەوشتی پێویستن و مانەوە و پاراستنیان بەشێکە لە دین وشەرع.

### پوختەی مەبەستەکان

**یەکەم:** ژینگەپارێزی

**دووەم:** پاراستنی ژیان و زیندەگی

**سێیەم:** پاراستنی پاکێتی ناوەندی بەرگە هەوا و وشکانی و دەریایی

**چوارەم:** پاراستنی وەچە و نەوە و نامووس

**پینجەم:** پاراستنی ئەخلاق و ڕەوشت

**شەشەم:** پاراستنی دینەکان

**حەوتەم:** پاراستنی عەقل و بیر و هۆش

**هەشتەم:** پاراستنی سەروەت و سامان

**نۆیەم:** پاراستنی عەدالەت و دادگەری

**دەیەم:** پاراستنی پیشە و کار و بەهرە و هونەر

**یازدەیەم:** پاراستنی تەندروستی

**دوازدەیەم:** پاراستنی گیان و ڕۆح[1]

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم وتەیەکی ئیمام ئیبنو قەییم باس بکەم لەسەر ئەم بابەتە:

(فإن الشريعة مبناها وأساسها على الحكم ومصالح العباد في المعاش والمعاد وهي عدل كلها ورحمة كلها ومصالح كلها وحكمة كلها.

فكل مسألة خرجت عن العدل إلى الجور، وعن الرحمة إلى ضدها وعن المصلحة إلى المفسدة، وعن الحكمة إلى العبث فليست من الشريعة وإن أدخلت فيها بالتأويل.

فالشريعة عدل الله بين عباده، ورحمته بين خلقه، وظله في أرضه، وحكمته الدالة عليه وعلى صدق رسوله صلي الله عليه وسلم أتم دلالة وأصدقها)[2].

واتە: "شەریعەت و یاسا و ڕێسا و بنەماکانی ئیسلام بناغە و بنەڕەت و ئەساسەکەیان لەسەر حیکمەت و دانایی و بەرژەوەندیی مرۆڤ دامەزراوە لە دونیا و دوارِۆژا، هەربۆیە هەمووی عەدل و عەدالەت و دادگەرییە، هەمووی ڕەحمەت و بەزەییە، هەمووی بەرژەوەندی و سوودە، هەمووی حیکمەت و داناییە.

هەر بابەتێک لە عەدل و دادگەرییەوە چوو بەرەو زوڵم و ستەم و ستەمکاری، یان لە ڕەحمەت و بەزەییەوە چوو بەرەو پێچەوانەکەی، یان لە بەرژەوەندی و سوود و قازانج چوو بەرەو زرەر و زیان و خراپە، یان لە لە حیکمەت و داناییەوە چوو بەرەو بێهوودەیی و پڕوپووچی و بێحیکمەتی و بێسەروبەری، ئەوە بەهیچ

---

(١) ئا: محمد عزیز لۆتەری، بەدەستکارییەوە.

(٢) إعلام الموقعين، ابن القيم الجوزية: ل ١.

شێوەیەک نە شەریعەتە و لە شەریعەتیشدا جێی دەبێتەوە، هەرچەندە بە تەئویل و تەفسیر و ڕاڤەی جیایاش بخزێنرێتە ناو شەریعیەتەوە.

شەریعەت دادگەری و عەدلە لەنێوان مرۆڤەکاندا، ڕەحمەت و بەزەییە لەنێوانیاندا، سایەوسێبەری خودایە لە زەویدا، حیکمەت و داناییە کە بەڵگەیە لەسەر خۆیی و لەسەر ڕاستی پێغەمبەرەکەی بە تەواوترین و ڕاسترین بەڵگە و شێوە."

# سەرچاوەکان

١ _ مبادئ الفلسفة، **أ. س. رابورت**

٢ _ فلسفة فيورباخ، **أحمد عبدالحميد عطية**

٣ _ مدخل الفلسفة القديمة، **آرمستورنغ**

٤ _ مدخل إلى الفلسفة، **إمام عبدالفتاح إمام**

٥ _ الفلسفة اليونانية تاريخها ومشكلاتها، **أميرة حلمي مطر**

٦ _ تاريخ الفلسفة، **إميل برهييه**

٧ _ موسوعة لالاند الفلسفية، **أندريه لالاند**

٨ _ فجر الفلسفة اليونانية، **الأهواني**

٩ _ مصادر وتيارات الفلسفية المعاصرة في فرنسا، **د. عبدالرحمن بدوي**

١٠ _ موسوعة الفلسفة، **بدوي,** عبدالرحمن بدوي

١١ _ تاريخ الفلسفة الغربية، **برتراندرسل**

١٢ _ الفلسفة المعاصرة في أوروبا، **بوشنسكي**

١٣ _ المذاهب التوحيدية والفلسفات المعاصرة، **البوطي,** محمد سعيد رمضان البوطي

١٤ _ موجز تاريخ الفلسفة، **توفيق سلوم ترجم,** , جماعة من علماء الاتحاد السوفيتي

١٥_ الموسوعة الفلسفية، **جماعة من العلماء السوفيات**

١٦ _ المعجم الفلسفي، **جميل صلبيا**

١٧ _ معجم الفلاسفة، **جورج طرابيشي**

١٨ _ ما قبل الفلسفة، **جون ولسون وآخرون**

١٩ _ دراسات في الفلسفة اليونانية، **حسين صالح حماد**

٢٠ _ موسوعة الفلسفة والفلاسفة، **الحنفي**، عبدالمنعم الحنفي

٢١ _ دراسات في الفلسفة المعاصرة، **زكريا إبراهيم**

٢٢ _ نحو فلسفة علمية، **زكي نجيب محمو**

٢٣ _ الوجود الإلهي بين انتصار العقل وتهافت المادة في تاريخ المذاهب الفلسفية، **سانتلانا**, تح: د. عصام الدين محمد علي

٢٤ _ قضايا فلسفية في ميزان العقيدة الإسلامية، **سعد الدين السيد صالح**

٢٥ _ الوضعية المنطقية في فكر زكي نجيب، **عبدالله الدعجاني**

٢٦ _ الفكر الديني عند اليونان، **عصمت نصار**

٢٧ _ ديموقريطس فيلسوف الذرة، **علي سامي النشار وزملائه**

٢٨ _ الفكر الفلسفي، **الغامدي**, د. سعيد بن أحمد الأفندي الغامدي

٢٩ _ الفلسفة الإغريقية، **غلاب**, محمد غلاب

٣٠ _ الفلسفة الشرقية، **غلاب**, محمد غلاب

٣١ _ تاريخ الفلسفة اليونانية، **فخري**، د. ماجد فخري

٣٢ _ الفكر الأوربي الحديث، **فرانكلين باومر**

٣٣ _ تاريخ الفلسفة، **فريديك كوبلستون,** , ترجمه: محمد سيد أحمد

٣٤ _ آفاق الفلسفة، **فؤاد زكريا**

٣٥ _ الموسوعة الفلسفية المختصرة، **فؤاد كامل وآخرون**

٣٦ _ الفلسفة االفرنسية من ديكارت إلى سارتر، **فؤاد كامل.**

٣٧ _ حركة العصر الجديد، **فوز كردي**

٣٨ _ الفلسفة اليونانية، **كريم متي**

٣٩ _ المعجم الفلسفي**, مجمع اللغة العربية**

٤٠ _ فكرة الألوهية عند أفلاطون، **النشار,** مصطفى النشار

٤١ _ الفلسفة أنواعها ومشكلاتها، **هنتر ميد**

٤٢ _ البراجماتية، **وليم جيمس**

٤٣ _ بعض مشكلات الفلسفة، **وليم جيمس**

٤٤ _ تاريخ الفلسفة الحديثة، **وليم كلي رايت,** ترجمه: محمود سيد أحمد

٤٥ _ الفلسفة الوضعية المنطقية، **يحيى هويدي**

٤٦ _ مقدمة في الفلسفة العامة، **يحيى هويري**

٤٧ _ تاريخ الفلسفة اليونانية، **يوسف كرم**

٤٨ _ تاريخ الفلسفة الأوروبية في العصر الوسيط، **يوسف كرم**

٤٩_ تاريخ الفلسفة الحديثة، **يوسف كرم**

٥٠ _ القضية الخالق، **لي ستروبل**

٥١ _ العلم ووجود الله، **جون لينكس**

٥٢ _ نشأة الفكر الفلسفي في الإسلام، **علي سامي النشار**

٥٣ _ الأخلاق النظرية، **د. عبد الرحمن بدوي**

٥٤ _ قضايا من رحاب الفلسفة والعلم، **د. توفيق الطويل**

٥٥ _ مقدمة في علم الأخلاق، **د. محمود حمدي زقزوق**

٥٦ _ تاريخ الأخلاق، **د. يوسف موسى**

٥٧ _ مباحُ ونظريات فى علم الأخلاق، **أبو بكر ذكرى**

٥٨ _ المدارس الفلسفية، **د. الأهواني**

٥٩ _ الأخلاق، **أحمد أمين**

٦٠ _ المشكلة الخلقية، **د. زكريا إبراهيم**

٦١ _ الأخلاق لأرسطو، **ترجمة لطفي السيد باشا**

٦٢ _ تهذيب الأخلاق، **ابن مسكويه**

٦٣ _ فلسفة الأخلاق في الإسلام، **د. محمد يوسف موسى**

٦٤ _ تبسيط الفلسفة، **د. رجب بو دبوس**

٦٥ _ الفلسفة لمن يريد، **د. نبيل**

٦٦ _ أصول الفقه فى نسيجه الجديد، **د. مصفى الزلمى**

٦٧ _ بواكير الفلسفة، رابوبرت، ترجمة: **أحمد أمين**

٦٨ _ نيتشه، **عبد الرحمن بدوي**

٦٩ _ نيتشه، **فؤاد زكريا**

٧٠ _ غسق الأوثان، **نيتشه**

٧١ _ أفول الأصنام، **نيتشه**

٧٢ _ العلم المرح، **نيتشه**

٧٣ _ هكذا تكلم زرادشت، **نيتشه**

٧٤ _ نقيض المسيح، **نيتشه**

٧٥ _ هذا هو الإنسان، **نيتشه**

٧٦ _ الفرق بين فلسفة الطبيعة عند ديمقريط وفلسفة الطبيعة عند أبيقور

٧٧ _ حركات ومذاهب، **فتكي يكن**

٧٨ _ نقد الفكر الماركسى عند السيد محمد محمد صادق الصدر

٧٩ _ تاريخ الفلسفة، **فريدريک كوبلستون**

٨٠ _ درء تعارض العقل والنقل، **ابن تيمية**

٨١ _ الاتجهات الفسفية اليونانية فى الالهيات، **أحمد بن سعود بن سعد الغامدى**

٨٢ _ تاريخ الفلسفة اليونانية، **وليم ساهاكيان**

٨٣ _ الفلسفة الطبيعية عند الرواقيين، **د. هدى الخلولى**

٨٤ _ الوجود الالهى، **سانتلانا**

٨٥ _ الفلسفة الرواقية، **عثمان أمين**

٨٦ _ تاريخ الفلسفة، **آمل بربيه**

٨٧ _ على اطلال المذهب المادى، **محمد فريد وجدى**

٨٨ _ الله في الفلسفة الحديثة، **جيمس كولينز**

٨٩ _ الفكر الاوروبي الحديث - القرن الثامن عشر -، **فزانكلين باومر**

٩٠ _ تاريخ الفلسفة، **فرديک كوبلستون**

٩١ _ أصل الدين، **فيورباخ**

٩٢ _ الدفاتر الفلسفية، **لينين**

٩٣ _ الدين والميتافيزيقا فى فلسفة هيوم، **عثمان الخشت**

٩٤ _ ديفيد هيوم، **زكى نجيب محمود**

٩٥ _ شخصيات ومذاهب فلسفية، **عثمان أمين**

٩٦ _ تاريخ الفلسفة الحديثة، **وليم كلى رايت**

٩٧ _ تكوين العقل الحديث، **جون هرمان**

٩٨ _ محاورات فى الدين الطبيعى، **ديفيد هيوم**

٩٩ _ مدخل الى الفلسفة، **هرمان راندال**

١٠٠ _ مبحث فى الفاهمة البشرية، **هيوم**

١٠١ _ الفكر المادى الحديث، **محمود عثمان**

١٠٢ _ عقائد المفكرين فى القرن العشرين، **عباس العقاد**

١٠٣_ الفلسفة الانجليزية فى مائة عام، **رودلف متس**

١٠٤_ مختارات من أفضل ما كتب برتراند رسل

١٠٥ _ حوارات مع برتراند رسل

١٠٦ _ لماذا لست مسيحيا _ ضمن مجلة أنا أفكر _ العدد (٧)

١٠٧ _ الله في الفلسفة الحديثة، **جيمس كولينز**, ترجمه: فؤاد كامل

١٠٨ _ الفلسفة والاعتقاد الديني، **محمد عبد الحفيظ**

١٠٩ _ في الفلسفة الاسلامية، **د. محمد السيد نعيم**

١١٠ _ في تاريخ الفلسفة اليونانية، **د. محمد السيد نعيم**

١١١ _ الفلسفة اليونانية، **محمد بيصار**

١١٢ _ تمهيد للفلسفة، **د. محمد زقزوق**

١١٣ _ مع الفلسفة اليونانية، **د. محمد عبد الرحمن مرحبا**

١١٤ _ دروس في الفسفة الإسلامية، **د. حسن الشافعي، د. عبد الحميد مدكور**

١١٥ _ الله لماذا، **كارن ارمستونگ**

١١٦ _ مختصر تاريخ العلم، **وليام بينوم**

١١٧ _ العلمانية، **سفر الحوالى**

١١٨ _ العلمانية، طاعون العصر، **سامي العامري**

١١٩ _ صراع مع الملاحدة، د. **عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني**

١٢٠ _ علم الاديان، ميشال مسلان، **ت: عز الدين عناية**

١٢١ _ العقيدة الدينة نشأتها وتطورها، **فرج الله عبد الباري**

١٢٢ _ حول التأصيل الاسلامى للعلوم الاجتماعية، محمد قطب

١٢٣ _ نفسية الالحاد، پول سى، فيتز، ترجمة: **مركز الدلائل**

١٢٤ _ عيون الأنباء في طبقات الأطباء، **ابن أبي أصيبة**

١٢٥ _ تاريخ معريفة الاديان، **الاعمال الكاملة لشريعتى**

١٢٦ _ نظرية المعرفة بين القرآو والفلسفة، **د. راجح الكردي**

١٢٧ _ نظرية المعرفة، **زكي نجيب محمود**

١٢٨ _ مدخل إلى نظرية المعرفة، **أحمد الكرساوي**

١٢٩ _ مصادر المعرفة في الفكر الديني والفلسفي، **د. عبد الرحمن بن زيد الزنيدي**

١٣٠ _ دروس فى الفكر الفلسفى الإسلامى، **د. على حسين الجابرى**

١٣١ _ التأملات فى الفلسفة الأولى، **ديكارت**

١٣٢ _ موقف ابن تيمية من المعرفة القبلية وشيء من آثاره الفلسفية، **يوسف سمرين**

١٣٣ _ منطق أرسطو، تحقيق: **عبدالرحمن بدوي**

١٣٤ _ مدخل جديد إلى الفلسفة، **عبد الرحمن بدوي**

١٣٥ _ مقدمة الفلسفة الإسلامية، **د. عمر التوتي الشيباني**

١٣٦ _ انهيار الشيوعية أمام الإسلام، **د. سعد الدين السيد صالح**

١٣٧ _ من فلسفتنا، **د. محمد باقر الصدر**

١٣٨ _ نقد العقل المحض، **إيمانويل كانت**

١٣٩ _ الدين فى حدود مجرد العقل، **إيمانويل كانت**

١٤٠ _ المسامرة شرح المسايرة، **ابن أبي شريف,** كمال الدين محمد بن محمد بن أبي بكر, المعروف بابن أبي شريف القدسي الشافعي

١٤١ _ شرح معالم أصول الدين، **ابن التلمساني,** شرف الدين أبو محمد عبد الله بن محمد بن علي

١٤٢ _ الصفدية، **ابن تيمية,** تقي الدين أحمد بن عبد الحميد بن عبدالسلام الحراني

١٤٣ _ معجم مقايس اللغة، **أحمد بن فارس بن زكريا القزويني الرازي**

١٤٤ _ التحقيق والبيان في شرح البرهان في أصول الفقه، **علي بن اسماعيل بن علي بن عطية الأبياري**

١٤٥ _ تهذيب اللغة، **أبو منصور محمد بن أحمد بن الأزهري بن طلحة الأزهري الهروي**

١٤٦ _ رسالة إلى أهل الثغر، **الأشعري**

١٤٧ _ أبكار الأفكار في أصول الدين، **سيف الدين أبو الحسن علي بن علي بن محمد الامدى**

١٤٨ _ المواقف في علم الكلام، **عضد الدين أبو الفضل عبد الرحمن بن ركن الدين أحمد بن عبدالغفار بن أحمد الإيجي**

١٤٩ _ جوهرة التوحيد، **برهان الدين إبراهيم بن محمد بن أحمد الجيزاوي الشافعي الباجوري**

١٥٠ _ تمهيد الأوائل وتلخيص الدلائل، **الباقلاني**

١٥١ _ أصول الدين، **البغدادي**

١٥٢ _ تفسير البغوي، **الحسين بن مسعود البغوي**

١٥٣ _ شرح المقاصد، **أبو سعيد مسعود بن عمر بن محمد بن أبي بكر بن محمد الغازي التفتازاني السمرقندي الحنفي**

١٥٤ _ شرح المواقف، **السيد الشريف علي بن محمد بن علي الجرجاني**

١٥٥ _ التعريفات، **علي بن محمد بن علي الشريف الحنسي الجرجاني**

١٥٦ _ الفيزياء ووجود الخالق.. مناقشة عقلانية إسلامية لبعض الفيزيائيين والفلاسفة الغربيين، **جعفر شيخ إدريس**

١٥٧ _ الإرشاد إلى قواقع الأدلة في أصول الاعتقاد،" أبو المعالي بن عبدالله بن يوسف بن محمد بن عبدالله بن حيوة الجويني

١٥٨ _ العقيدة النظامية، **الجويني**

١٥٩ _ التفسير العلمي للآيات الكونية في القرآن، **حنفي أحمد**

١٦٠ _ العقيدة الإسلامية _ أركانها _ حقائقها _ مفسدها، **مصطفى سعيد الخن ومحي الدين ديب مستو**

١٦١ _ شرح الخريدة البهية، **أبو البركات أحمد بن محمد بن أحمد الدردير العدوي المالكي**

١٦٢ _ العقيدة الاسلامية ومذاهبها، **د. قحطان الدوري**

١٦٣ _ مدخل إلى القرآن الكريم، **محمد عبدالله دراز**

١٦٤ _ التفسير الكبير أو مفاتيح الغيب، **فخر الدين محمد بن عمر التميم الرازي**

١٦٥ _ الإلحاد في الغرب، **رمسيس عوض**

١٦٦ _ موقف من الميتافيزيقا، **زكي نجيب**

١٦٧ _ فلسفة الشريعة، **مصطفى إبراهيم الزلمي**

١٦٨ _ تاريخ أكثر موجز للزمن، **ستيفن هوكينج،**

١٦٩ _ الملل والنحل، **محمد بن عبدالكريم بن أبي بكر أحمد الشهرستاني**

١٧٠ _ نهاية الإقدام في علم الكلام، **محمد بن عبدالكريم بن أحمد أبو الفتح الشهرستاني**

١٧١ _ براهين وجود الله في النفس والعقل والعلم، **د. سامي عامري**

١٧٢ _ شموع النهار، **عبدالله بن صالح العجيري**

١٧٣ _ ظاهرة نقد الدين في العصر الحديث، **د. سلطان بن عبد الرحمن العميري**

١٧٤ _ الأدلة العقلية والنقلية على أصول الاعتقاد، **سعود بن عبدالعزيز العريفي**

١٧٥ _ الفيزيائيون والخالق، **عماد علي هلال**

١٧٦ _ المنقذ من الضلال، **أبو حامد محمد بن محمد بن محمد الغزالي**

١٧٧ _ الاقتصاد في الاعتقاد، **أبو حامد محمد بن محمد بن محمد الغزالي**

١٧٨ _ الحكمة في مخلوقات الله عز وجل، **أبو حامد محمد بن محمد بن محمد الغزالي**

١٧٩ _ وجود الله، **القرضاوي,** يوسف القرضاوي

١٨٠ _ إخبار العلماء بأخبار الحكماء، **جمال الدين أبو الحسن علي بن يوسف القفطي**

١٨١ _ العلم يدعو للإيمان، **كريسي موريسون**

١٨٢ _ كتاب الكندي إلى المعتصم في الفلسفة الأولى، **أبو يوسف يعقوب بن إسحاق الكندي**

١٨٣ _ الإلحاد, أسبابه, طبائعه, أسباب ظهوره, علاجه، **محمد الخضر حسين**

١٨٤ _ ظاهرة الإلحاد، **محمد عبدالمنعم عبدالسلام حسن**

١٨٥ _ الميتافيزيقا عند الفلاسفة المعاصرين، **محمود رجب**

١٨٦ _ تاريخ العلم، **مصطفي لبيب**

١٨٧_ الله يتجلى في عصر العلم، **مجموعة من العلماء الأمريكيين**

١٨٨ _ الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، دار الندوة

العالمية للطباعة والنشر والتوزيع

١٨٩ _ العقيدة الإسلامية وأسسها، **عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني**

١٩٠ _ كواشف زيوف في المذاهب الفكرية المعاصرة، **عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني**

١٩١ _ ظاهرة الإلحاد في المجتمعات الإسلامية، **ناصر بن سعد بن سيف السيف**

١٩٢ _ الرسالة التسعينية في الأصول الدينية، **الهندي**، صفي الدين محمد بن عبدالرحيم بن محمد الأرموي

١٩٣ _ عصر الإيدولوجية، **هنري أيكن**، ترجمة: فؤاد زكريا

١٩٤ _ الرد على الملحدين العرب، **هيثم طلعت**

١٩٥ _ عيادة الملحيدن، **هيثم طلعت**

١٩٦ _ حركهالعصر الجديد مفهومها ونشأتها وتطبيقاتها، **هيفاء بنت ناصر الرشيد**،

١٩٧ _ قصة الحضارة، **ول ديورانت**، ترجمة: محمد بدران

١٩٨ _ وهم الإلحاد، **عمرو شريف**

١٩٩ _ الدين، بحوث ممهد لدراسة تاريخ الأديان، **عبد الله دراز**

٢٠٠ _ الأرض، **زغلول النجار**

٢٠١ _ السماء، **زغلول النجار**

٢٠٢ _ مبادئ علم الفلک الحديث، **عبد العزيز بكرى أحمد**

٢٠٣ _ الموسوعة العلمية الشاملة

٢٠٤ _ معجزة خلق الانسان، **هارون يحيى**

٢٠٥ _ بيولجيا الانسان، **حميد أحمد الحاج**

٢٠٦ _ الانسان من الابداع الى البعث، **زغلول النجار**

٢٠٧ _ الردعلى الملحدين العرب، **هيثم طلعت**

٢٠٨ _ حضارة العرب، **غُوستَاف لُوبون**

٢٠٩ _ تاريخ العلم والإنسية الجديدة، **جورج سارتون**

٢١٠ _ حاضر الإسلام، **ستودَارد**

٢١١ _ كيف نفهم الإسلام، **محمد الغزالي**

٢١٢ _ دراسة في فقه مقاصد الشريعة بين المقاصد الكلية والنصوص، **القرضاوي**

٢١٣ _ المجتمع الإسلامي، **القرضاوي**

٢١٤ _ أخلاق الإسلام _ **القرضاوي**

٢١٥ _ المستصفى من علم الأصول، **الغزالي**

٢١٦ _ إحياء علوم الدين، **الغزالي**

٢١٧ _ قواعد الأحكام في مصالح الأنام، **عزّ الدين بن عبد السلام**

٢١٨ _ نظرية المقاصد عند الشاطبي، **أحمد الريسوني**

٢١٩ _ مقاصد الشريعة الإسلامية، **ابن عاشور**

٢٢٠ _ لسان العرب، **ابن منظور**

٢٢١ _ إعلام الموقعين عن رب العالمين، **ابن القيم الجوزية**

٢٢٢ _ الموافقات، **الشاطبي**

٢٢٣ _ تجديد الفكر الإسلامي، **محسن عبد الحميد**

٢٢٤ _ منهج الإسلام في التغير والتنمية، **محسن عبد الحميد**

٢٢٥ _ الفكر الإسلامي في مواجهة الغزو الثقافي، **مصطفى حلمي**

٢٢٦ _ مذاهب فكرية معصرة، **محمد قطب**

٢٢٧ _ منهج الفن الإسلامي، **محمد قطب**

٢٢٨ _ في ظلال القرآن، **سيد قطب**

٢٢٩ _ العدالة الاجتماعية في الإسلام، **سيد قطب**

٢٣٠ _ الحضارة الإسلامية، **عبد الرحمن حسن حبنكة الميداني**

٢٣١ _ مجموعة فتاوى، **ابن تيمية**

٢٣٢ _ الكافي في المنطق الإسلامي، **صلاح الدين أحمد**

٢٣٣ _ ماذا قدم المسلون للعالم، **راغب السرجاني**

٢٣٤ _ رسائل النور، **سعيد النورسى**

٢٣٥ _ تەفسیری ئاسان، **برهان محمد أمين**

٢٣٦ _ تفسير القرآن العظيم _ **ابن كثير**

٢٣٧ _ تفسير جامع البيان عن تأويل آي القرآن _ **الطبري**

٢٣٨ _ تفسير أنوار التنزيل وأسرار التأويل _ **البيضاوي**

٢٣٩ _ تفسير الجلالين _ **جلال الدين السيوطي وجلال الدين المحلي**

٢٤٠ _ تفسير زاد المسير _ **ابن الجوزي**

٢٤١ _ يتفسير مدارك التنزيل وحقائق التأويل _ **النسفي**

٢٤٢ _ تفسير الجامع لأحكام القرآن _ **القرطبي**

٢٤٣ _ تفسير مفاتيح الغيب _ **الرازي**

٢٤٤_ تفسير النابلسي _ **النابلسي**

٢٤٥ _ تفسير المنير _ **وهبة الزحيلي**

٢٤٦ _ صحيح البخارى

٢٤٧ _ صحيح مسلم

٢٤٨ _ سنن النسائى

٢٤٩ _ سنن أبى داود

٢٥٠ _ سنن الترمذى

٢٥١ _ سنن ابن ماجة

٢٥٢ _ مسند أحمد

٢٥٣ _ سنن الدارمى

٢٥٤ _ موطأ مالک

٢٥٥ _ السنن الكبرى للبيهقى

٢٥٦ _ سلسلة الأحاديث الصحيحة، محمد ناصر الدين الألباني

٢٥٧ _ گەنج و ئیلحاد، **ئیکرام کەریم**

٢٥٨ _ بوونی خودا، **یوسف قەرزاوی**

٢٥٩ _ گەشتی عەقڵ، **عمرو شەریف**

٢٦٠ _ ئیمان و ئیلحاد، **علی باپیر**

٢٦١ _ خوداناسی ئایین ئیمان، **علی باپیر**

٢٦٢ _ نارێکییەکانی مارکس، **فاضل قەرەداغی**

٢٦٣ _ پاکانەی هەبوون، **موحەممەد صالح**

٢٦٤ _ پەیامەکانی نوور، **سعید نورسی**

٢٦٥ _ لب العقیدة الإسلامیة، اختصار: **صلاح الدین أحمد**

٢٦٦ _ مختصر مدخل لمعرفة الإسلام، اختصار: **صلاح الدین أحمد**

٢٦٧ _ ئیلحاد وەک خۆی، **صلاح الدین أحمد**

٢٦٨ _ یاسا قورئانییەکان، **صلاح الدین أحمد**

٢٦٩ _ یاسا گەوهەرییەکان، **صلاح الدین أحمد**

٢٧٠ _ بوونی باڵا، ٣٠ بەڵگە لەسەر بوونی خودا، **صلاح الدین أحمد**

٢٧١ _ نیگایەک بۆ فەلسەفەی ئەخلاق, **موسعەب ئەدهەم**

٢٧٢ _ فەلسەفەی نوێ لە ئەوروپا، **حەمید عزیز**

٢٧٣ _ فەلسەفەی ئەخلاق، **تەحسین حمە غریب**

٢٧٤ _ مێژووی فەلسەفەی ئەوروپی لە چاخی ناوەڕاستدا، ن: یوسف کەرەم، و: **عومەر عەلی غەفوور**

٢٧٥ _ کۆرسی مێژووی فەلسەفەی ڕۆژئاوا، **د. ڕەهبەر مەحمود زادە**

٢٧٦ _ ئایین چییە، **دانیاڵ هێرڤیۆ لێژێ، ژان پۆڵ ویلەم، ئیروان دیانتەڵ، میشل لووی**، و: عادل باخەوان

٢٧٧ _ سەرابستانی بیردۆزی پەرەسەندن لە ڕوانگەی چەرخی کامبەری بە بەردبووەکانەوە، **کۆسار ڕەئوف مەعروف**

٢٧٨ _ مرۆڤە بێویستەکان، **ئاڤار قەرەداغی**

٢٧٩ _ کۆمەڵناسی ئایین، **خالید علیزادە**

٢٨٠ _ بتیۆرە کۆمەڵایەتییە پێشکەوتووەکان، **د. ئیحسان محمد حسن، دیدار ئهبوزێد**

٢٨١ _ تیۆرەکانی کۆمەڵناسی، **ئەحمەد غوڵامی**

٢٨٢ _ لە دایکبوون بە باوەرداری، **د. جەستین ل. باریت،** و: ئاراس عز الدین،

٢٨٣ _ حەوت تیۆر دەربارەی ئایین، **دانیاڵ ل. پاڵس**، و: ئاوات ئەحمەد

# پەرتووکە چاپکراوەکانی نووسەر

١. ئیلحاد وەک خۆی
٢. ئیسلام وەک خۆی
٣. یاسا قورئانییەکان
٤. هەستانەوەی ئوممەت
٥. نەخۆشییەکانی ئوممەت
٦. ڕۆڵەی شیرینم
٧. یاسا گەوهەرییەکان لە فەرموودەکانی سەروەرمان
٨. بوونی باڵا، (٣٠) بەڵگەی عەقڵی، زانستی، لۆژیکی، فەلسەفی، زگماکی، لەسەر بوونی خودا
٩. پەڕەی گوڵ، وەڵامی گومانەکان لەسەر پرسەکانی ئافرەتان لە ئیسلامدا
١٠. مانای ڕەوان بۆ واژەکانی قورئان
١١. فەلسەفە لەنێوان ئیسلام و خۆرئاوادا
١٢. الكافي في المنطق ال‌إسلامي
١٣. الوجيز في شرح المقدمة الآجرومية
١٤. تقريب المعاني في إيضاح وإعراب عوامل الجرجاني
١٥. لب العقيدة ال‌إسلامية في ضوء النقل والعقل
١٦. الكافي في شرح وإعراب عوامل البركوي
١٧. تعلم النحو في خمسين يوما
١٨. مختصر الوجيز في أصول الفقه للدكتور عبد الكريم زيدان
١٩. المختصر الميسر في القواعد الفقهية

٢٠. الشرح الجديد على متن البناء في علم الصرف

٢١. الشرح الجديد على تصريف الزنجاني في علم الصرف

٢٢. الشرح الجديد على قطر الندى

## پەرتووکە چاپنەکراوەکان

١. مەوسوعەی ڕۆشنبیری و فیکری ئیسلامی

٢. ڕێبازە فەلسەفی و سیاسی و هزرییە هاوچەرخەکان

٣. زانستی کەلام و گرووپە کەلامییەکان

٤. ئیماننناسی، عەقیدەی ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی و عەقڵ و وەحیدا

٥. یاساکانی هاوسەرداری

٦. القياس بين علمي المنطق وأصول الفقه

٧. الإلحاد وجذوره الفلسفية

٨. الخلاصة في علم البلاغة. قسم البيان

٩. مدخل إلى الفكر المقاصدي ومقاصد الشريعة

١٠. الشرح الجديد على متن إيساغوجي في علم المنطق

١١. القواعد الصرفية

١٢. فقه الدعوة إلى الله

١٣. المدخل الى قواعد اللغة العربية (بەهاوبەشی لەگەڵ: د. أحمد محمود).

١٤. الاستحسان وأثره على الفكر المقاصدي

لەگەڵ چەند پەرتووکێکی دیکە

# ناوەڕۆک




ئەم کتێبەکەمان بەسەر دوو ئاستدا دابەشکردووە:

ئاستی یەکەم: هەرسێ باس و بابەت و تەوەرە سەرەکییەکەی فەلسەفە: «زانین، بوون، بەهاکان».

ئاستی دووەم: شێوە مێژووییەکەی، لە پێش یۆنانەوە تاوەکوو سەردەمی هاوچەرخ.

ئەمە جگە لە پێشەکییەکی تێروتەسەل بۆ ناساندنی فەلسەفە و پەیوەندی بە بابەتەکانی تری وەک: زانستی کەلام و ئیسلام و ...

هەروەها ختستنەڕووی قوتابخانە و فەیلەسووفە بەناوبانگەکان، هەوڵمانداوە زۆربەی تەوژم و قوتابخانە و ڕێچکە سەرەکییەکانی فەلسەفە بخەینەڕوو، هاوکات لەگەڵ فەیلەسووفە بەناوبانگ و خاوەن قوتابخانەکان، لە پاشاندا بەراوردی هەرسێ تەوەر و باس و بابەتە سەرەکییەکەی فەلسەفە: زانین، بوون، بەهاکان، بە هزری ئیسلامی و قورئان.







نرخ : ١٧٠٠٠ دینار